# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی سی و دووەم

سوورەتەکانی

(عبس) و(التكوير) و(الإنفطار) و(المطففين)
و(الإنشقاق) و(البروج) و(الطارق) و(الأعلى)
و(الغاشية) و(الفجر) و(البلد) و(الشمس)
و(الليل) و(الضحى) و(الشرح) و(التين)

عەلی باپیر

# تەفسیری شازدە سوورەتەکانی

# عَبَسَ تاکو التِّينِ

نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٥ک - ٢٠٢٣ز

٨٩٧ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ باللَّهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللَّـهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضلِـلْ فَـلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاّ اللَّـهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّـا بَعْـدُ: فـإنَّ أَصْـدَقَ الحَديـث كَلامُ اللَّـه، وَخَـيْرَ الْهَـدِي هـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[1].

**خوێنـەرە بەڕێـزو خۆشـەویستەکان!**

هیـچ گومـانی تێدانیــە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - کـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دواییـن کتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هــەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی لە خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفکریـن و ڕامـان، فێرکـردن، کارپێکـردن ... هتـد، بـە باشتــرین جێگرتـن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەکـەی لـە دنیـاو دواڕۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) کـە پێغـەمبـەر ﷺ هـاوەڵانی بەڕێـزی فێـردەکرد، پێـش هــەر قسـەیەکی گرنگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعــەو داخــوازییکردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتــارە، هــەرکام لە: التــرمذي: (١١٠٥)، النســائي: (١١٠٤)، ابن ماجـە: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطّبــراني: (٢٤١٤) هێنــاویانەو (مسلم)یش بەشـێکی هێنـاوە.

منیـش - كـە وەك باسـكردنی چاكـەی خـوا (**التحـدّث بنعمـة اللّـه**) دەیخــەمەڕوو- لــەوەتی فامــم كردۆتــەوە، خــوای بەبەزەیــی و بەخشــەر چاكــەی لەگــەڵ كــردووم و، بــە فەرمایشــتی بــەرزو بــێ وێنــەی خۆیــەوە ســەرگەرمی كــردووم و، بــەر لــە تەمــەنی بیســـت ســاڵییەوە هیدایــەتی داوم، قوڕئــانی بەڕێــزو پێــز لەبــەر بكــەم و، ســەرقــاڵی خوێندنــەوەی تەفسـیرەكانی قوڕئـان و، تێوەڕامـانی ئایەتـە پـڕ بەرەكەتەكانی و، لێوردبوونەوەیــان بــم.

هــەر بۆیــەش تێكـڕای كتێـب و نامیلكـەو وتـارو دەرسـەكانم، كـەم و زۆر لەبـەر ڕۆشـنایی قوڕئـان دابـوون، كـە دیـارە هــەر ئەمـەش شـتێكی سرووشـتییە؛ ئاخـر ئایـا ئیسـلام، بێجگــە لــە قوڕئــان پاشــان ســوننەتی پێغـەمبــەر ﷺ، كــە ئەویــش هـــەر ڕوونكردنــەوەی قوڕئـان و چۆنیـەتی جێبەجێكـردن و كارپێكردنیـەتی، شـتێكی دیكەیـە؟! بێگومـان نەخێـر.

ئنجـا لەمێـژ سـاڵیش بـوو، كـە بـراو خوشـكانێكی دڵســۆزی نزیـك و ئاشـنام، داوایـان لێدەكـردم كـە دەسـت بكـەم بـە دانـانی تەفسـیـرو لێكدانەوەیـەكی قوڕئـان، هــەتا لــە ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٢٨)دا هاتـە دڵمــەوە، كـە نـاوی خـوای لێبهێنـم و دەسـت بـەو كارە گـەورەو گرنگـە بكـەم، بەڵكـو وردە وردە بەپێـی بـوارو دەرفـەت، هــەرساڵە هــەندێكی لـێ ئەنجـام بـدەم، لەگـەڵ سـەرقاڵیی زۆرو جـۆراو جۆریشــدا، هــەتا دەرفەتێـكی وام بۆ دەڕەخسـێ كـە بتوانـم خێرایـی تێـدا بكـەم و خۆمـی بـۆ یەكلایـی (**متفـرِّغ**) بكەمـەوەو، خـوا پشـتیوان بـێ تـەواوی بكـەم، ئەگــەر تەمـەن بەبەریــەوە مابێ.

سـەرچاوەی دانـانی ئـەم تەفسـیرو لێكدانەوەیەشــم، وێـڕای سـەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیــرانەی كـە بـاون و، دەسـتم پێیان گەیشــتوە، بریتیە لـە وردبوونـەوەو تێوەڕامانی خــۆم لە خــودی قوڕئان، چونكە بێگومان قوڕئان: هــەندێكی هــەندێكی ڕوون دەكاتەوە: (**القرآن يُفَسِّــر بَعضُهُ بَعْضَــاً**)، پاشان ســوننەتی پێغـەمبـەری خوا ﷺ، چونكە پێغـەمبـەری خــواش ڕوونكەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قوڕئــانە، وەك خـــوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتـە: هەروەهـا زیکرمـان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تاكـو ئـەوەی بـۆ خـەڵكی نێرراوەتـە خـوار، بۆیـان ڕوون بكەیـەوە، وە بەڵـكو خۆشـیان بیـربكەنەوە.

ئومێدیشـم وایـە - بـە یارمـەتی خـوای بەخشـەر ﷻ - شـایسـتەیی ئـەوەم هـەبێ تەفسـیـرو لێكدانەوەیەكی وا بۆ قورئـان پێشـكەش بە مسـوڵمانانی كوردسـتان بكەم، كـە لـە قورئـان بوەشـێتەوەو، مایـەی بەهـرەو سـوودی خوێنـەران بـێ، بەتایبـەتیش كـە زیاتـر لـە سـی (٣٠) ساڵە لەگـەڵ قورئانی بـەرزو مـەزن و تەفسیـرەكانی و كتێبەكانی سـوننەتدا خـەریكم و، دەیـان كتێـب و بەرهـەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بـوارەكانی زانسـتەكانی شـەریعەتدا پێشـكەش كردوون.

شـایانی باسیشـە كـە ئەو بیسـت و دوو مانگ زیندانیـی كرانەم لەلایـەن ئەمریكاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاكـو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێـكی گـەورەو گرنـگ بـوو، بـۆ زیاتـر پێدا قووڵـبوونەوەی كتێبـی خـوا (تبـارك و تعالـی) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبـارەی زۆرێـك لـە ئایەتـەكانییەوە، ئـەم ڕاسـتییەش لـە مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجـلّى فـي كتـاب اللّـه تعالـى**)دا زۆر چـاك دەرەوشـاوەتەوە[1]، بـەڵام هـەڵبەتە ناڵـێم و هیچكەسیش بـۆی نیە بڵـێ: كـە ئـەم تەفسیرەی من تێروتـەواوە، چونكـە وێـڕای سـنوورداربوونی توانـاو بڕسـتم، لـە بەرانبـەر كتێبـی لـە هـەموو ڕوویێكـەوە ڕەهـا (مطلـق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشـمویسـتوە كـە زۆر بەمـلاولادا بچـم و بچمـە نێو هـەندێك وردەكارییەوە، كە یان من تێیـدا پسپۆڕو

---

(١) ئـەو مەوسـووعەیە ئێسـتا چـاپ كـراوەو، كەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنـەران و، سـەرجەم هەشـت بەرگ و دەوری سـێ هـەزارو پێنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هـەوڵـمداوە بەگشـتی تێیدا باسـی سـەرجەم لایەنـەكانی ئیسـلام بكـەم و، تاكـە سـەرچـاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەكانی سـوننەت، كـە لـە هـۆش (ذاكـرة)دا بـووون.

شـایانی باسـە ئەو مەوسـووعەیە لە چاپی دووەمی دا، كراوە بە دوازدە (١٢) كتێبـی سـەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسـانتـر سـوود لێ بینـرانی .

شـــارەزا نیـم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قورئان تێبـگات و، بزانـێ خـوا (تبـارك وتعـالـی) ڕاسـتەوخۆ چـی پـێ فـــەرمووە؟!

ئنجـا هـــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شـێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشتـرین شـــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیـرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هـــەر ســـووڕەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی ســـەربەخۆیـــەو، ســـەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیرەشـدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســـووڕەتەکان، بەرگـــەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵسـۆزە ئێســـتاش پاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمـان بەردەوام بێ، هەتـا کۆتـایی ئەم تەفسیـرە سـەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسـڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکاریییم کـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون[1]، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمیة) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

---

(١) دوایی وا بەباش زانرا ناوی تەفسیرەکان لابرێن و، لە کۆتایی کۆی بەرگەکانی [تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز]دا دەیاننووسین.

شایانی باسیشـە جاری وا هەیـە بیـرۆکەو تێگەیشـتنێکی تایبەتیـی خـۆمم، دەربارەی کۆمەڵـە ئایەتێـك یـان ئایەتێك یـان ڕسـتەو بڕگـەیەکی ئایەتێـك، بۆ دروسـت دەبێ، وەك تێگەیشـتن و بۆچـوونـی خـۆم دەینووسـم، کەچـی ڕەنگـە لـە تەفسیـرەکانی دیکـەش - یەکێکیـان یـان زیـاتر - دا هەبێ، ئەویـش بەهـۆی ئەوەوەیـە کـە مـن ئەو تەفسیـرەم نەکەوتـۆتـە بەر دیـدە، یان دیتوومـەو لەیـادم نەمـاوە.

# پێشەكی ئەم بەرگە

**الحمدلله الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا أحد، والصلاة والسلام على محمد خاتم النبين المبعوث رحمة للعالمين، وآله أجمعين من الصحب والأزواج والقرابة إلى يوم الدين.**

ئەم بەرگە -لەچاپی یەكەمدا- بەرگی سی و دووەم (٣٢)ە لەتەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز و شازدە سوورەتی گرتوونە خۆی و هەمووشیان دەكەونە جوزئی سییەم (٣٠)ەوە، بەپێی دابەشكردنی زانایان بۆ قورئان بە سی بەش (جزء).

ئەم بەرگەش وەک سەرجەم بەرگەكانی دیكەی ئەم تەفسیرە، بە حەوت قۆناغ ئایەتەكانی سوورەتەكان ڕووندەكەینەوە و، وێڕای ئەوەش ژمارەیەک كورتە باسیشی گرتوونە خۆی، بەم شێوەیە:

## یەكەم: لەسوورەتی (عبس) دا:

١- كورتەباسێک دەربارەی حەوت حیكمەت لەو گلەییەی خوادا كە لە پێغەمبەری كردوە.

٢- كورتەباسێک لەبارەی ئەندازەگیریی خواوە بۆ نوتفە.

٣- كورتەباسێک دەربارەی ئاسانبوونی لەدایک بوونی كۆرپەلە.

٤- دوو قسەی پاڵدراو بۆ ئەبوبەكر و عومەر و بەرپەچدانەوەی قسەی بەدگوماناوی شیعەكان.

## دووەم: لەسوورەتی (التكوير)دا:

١- قووڵەباسێک دەربارەی حوكمی منداڵان لە ڕۆژی دواییدا.

٢- كورتەباسێک لەبارەی پەیوەندی نێوان و ویستی ڕەهایی خوا و ویستی بەشیی مرۆڤەوە.

**سێیەم: لەسوورەتی (الإنفطار) دا:**

کورتەباسێک لەبارەی دروستکردنی جەستەی مرۆڤەوە.

**چوارەم: لەسوورەتی (الإنشقاق) دا:**

کورتەباسێک لەبارەی پانتایی زەوی و کیشوەر و ئۆقیانوسەکانییەوە.

**پێنجەم:** لەسوورەتی (البروج) دا:

١- قسەیەکی کورت لەسەر بورجەکان.

٢- قسەیەک لەبارەی (لوح المحفوظ)ەوە.

**شەشەم: لەسوورەتی (الطارق) دا:**

کورتەباسێک لەبارەی چۆنییەتی دروستبوونی مرۆڤەوە.

**حەوتەم:** لەسوورەتی (الأعلى) دا:

کورتەباسێک لەبارەی ڕێکو پێکی ڕێنمایی خواوە لەدروستکراوەکانیدا.

**هەشتەم: لەسوورەتی (الغاشیة) دا:**

١- کورتەباسێک: حەوت بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە ﴿ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ ﴾. بێگار پێکرانە بێبڕوایانە لە دۆزەخدا.

٢- کورتەباسێک لەبارەی تایبەتمەندییەکانی حوشترەوە.

٣- پێنج هەڵوەستە لەئاقار ئەو شەش ئایەتەی کۆتایی (الغاشیە)وە.

**نۆیەم: لەسوورەتی (الفجر) دا:**

١- کورتەباسێک لەبارەی دۆزەخ و دۆزەخییەکانەوە.

٢- کورتەباسێک دەربارەی بەهەشت و ئەو نازونیعمەتانەی تێیدان بۆ بەهەشتیان.

**دەیەم: لەسوورەتی (البلد) دا:**

**١-** کورتەباسێک دەربارەی کۆئەندامی بینین و سەرنجدانێکی زمان و لێوەکان.

**٢-** هەڵوەستەیەک لەبەرانبەر نەهێشتنی ستەمی سیاسی و ئابوورییدا.

**یازدەیەم: لەسووڕەتی (الشمس) دا:**

**١-** کورتەباسێک دەربارەی خۆروپەیوەستبوونی ژیانی مرۆڤ پێیەوە.

**٢-** کورتەباسێک دەربارەی تەزکییە.

**دوازدەیەم: لەسووڕەتی (الليل) دا:**

١- کورتەباسێك: شەش وردە سەرنج.

٢- کورتەباسێک: چوار جۆرە وەڵامی ئیشکالێک.

**سێزدەیەم: لەسووڕەتی (الضحی) دا:**

١- قسەیەکی کورت لەبارەی (ضلال) ڕاڵانە پێغەمبەری خواوە.

٢- چەند دەقێکی سوونەت لەبارەی هەتییوو سواڵکەر و باسکردنی چاکەی خواوە.

**چواردەیەم: لەسوورەتی (الشرح) دا:**

١- سێ گێڕدراوە لەبارەی سینە بۆ گوشادکرانی پێغەمبەر لەڕووی جەستەییەوە.

٢- حەوت سەرنجدان لەو ئایەتانە.

**پازدەیەم: لەسووڕەتی (التين) دا:**

کورتەباسێک لەبارەی هەنجیرەوە.

# دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ کـە (١٣)ی مانگـی (**ذي القعـدة**)ی سـاڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٤)ی حوزەیرانـی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زاینیـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (**عَبَسَ**)، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـووڕەتەو، هێڵـە گشـتییەکانی و چوارچێوەکـەی و سـەرو سـیماو کەسـایەتییەکەی، لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو:

## پێناسەی سووڕەتی (عبس) و بابەتەکانی

### یەکەم: نـاوی:

نـاوی هـەرە بـاوی ئـەم سـووڕەتە ئەوەیـە کـە: (**سُـورَةُ عَبَـسَ**)ی پـێ دەڵێـن، بـەڵام هەندێـك لـە زانایـان چەنـد ناوێکـی دیکەشـیان بـۆ بەکارهێنـاون، وەك: (**سـورة الصاخَّـة، سـورة السَّـفرة، سـورة الأعمـى، سـورة ابْـنِ أُمِّ مَكْتُـومٍ**)، ئـەو وشـانەش لـەو سـووڕەتە موبارەکـەدا هاتـوون، جگـە لـە هـی کۆتایـی، بـەڵام زیاتـر هـەر سـووڕەتی (عەبەسـە)ی پـێ دەڵێـن.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

زانایـان لەسـەر مەککەیـی بوونـی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە یەکدەنگـن، لـەو بـارەوەش بەڵگـە زۆرن، ئـەم دەقـەش وەك نموونـە دێنیـن: {**عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ﷺ، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ عَبَـسَ بِمَكَّـةَ**} (**ذكـره السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٨، ص٤١٥، ونسـبه لابـن**

**الضريس والنحاس وابن مردويه والبيهقي، وقال: أَخرج ابن مردويه عن ابن الزبير رَضِي اللهُ عَنْهُمَا مثله).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ، گوتوویەتی: سووڕەتی (**عَبَسَ**) لە مەککە دابەزیوە، ئەمە (**السيوطي**) لە (**الدرُّ المنثور**)دا هێناویەتی و، گوتوویەتی: (**إبن مردويه**) هەمان شت کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕاویەتەوە {کە گوتوویەتی: ئەم سووڕەتە لە مەککە دابەزیوە}، لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریشی (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گێڕاوەتەوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ئەم سووڕەتە موبارەکە لە (موصحەف)دا، ڕیزبەندییەکەی هەشتا (٨٠)یە، کە لە سووڕەتی (**فاتيحة**)ەوە دێی، لە دابەزینیشدا ژمارە بیست و چوار (٢٤)یان بۆ داناوە، پێش سووڕەتی (**القدر**)و دوای سووڕەتی (**النجم**).

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

زانایان (زانایانی ژمێرەری ئایەتەکانی قوڕئان)، سێ ژمارەیان بۆ باسکردووون:

أ- زۆربەیان خەڵکی مەککەو خەڵکی مەدینەو خەڵکی کووفە، گوتوویانە: ژمارەی ئایەتەکانی چل و دوو (٤٢)یە.

ب- بەڵام خەڵکی بەسرا، ژمارەی ئایەتەکانیان بە چل و یەك چل (٤١) داناوە.

ج- خەڵکی شامیش بە چل (٤٠)یان داناوە، بەڵام ژمارەی چل و دوو (٤٢) زیاتر تەبەننیی کراوەو، پێشتریش زۆرجار گوتوومانە: جیاوازیی لە ژمارەی ئایەتەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکان، نەك زانایەك بڵێ: فڵان ڕستە لەو سووڕەتەدا هاتوە، یان فڵان دوو ڕستە هاتوون و، یەکێکی دیکە بڵێ: نەخێر نەهاتوون، چونکە زانایان نەك لەسەر ئایەتەکان و ڕستەکانی قوڕئان، بەڵکو لەسەر وشەکانی و پیتەکانیشی یەکدەنگن.

## پێنجەم: نێوەڕۆكی:

ئەم سووڕەتە سێ تەوەری سەرەكیی گرتووەنە خۆی:

**تەوەری یەكەم:** كە ئایەتەكانی: (١ - ١٦)، شازدە (١٦) ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (عبس)ن، باسی ڕووداوی ڕووگرژكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕوو لێوەچەرخاندنی لە (**إِبنُ أُمِّ مَكتُوم**)، كە دەڵێن ناوی (عەبدوڵڵا) بووە، یاخود ناوی (عەمر) بووەو، كوڕە خاڵی دایكمان (خدیجە) بووە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەویش لە كاتێكدا كە پێغەمبەر ﷺ قسەی كردوە بۆ ژمارەیەك لە ناوداران و قسە ڕۆیشتووانی قوڕەیش، بە ئومێدی ئەوەی بەرەو ئیسلامیان بێنێ و تێیان بگەیەنێ.

هەروەها بەو بۆنەوە باسی قوڕئانیش كراوە، هەر لەو شازدە (١٦) ئایەتە موبارەكەداو، پێناسەی قوڕئان كراوەو، پێگەی بەرزی قوڕئان خراوەتەڕوو.

**تەوەری دووەم:** كە ئایەتەكانی: (١٧ - ٣٢)ن و، ئەوانیش هەر شازدە (١٦) ئایەتن، باسی مرۆڤی بێبڕواو چۆنیەتیی دروستبوونی، ئنجا فەرمان پێكردنی بە سەرنجدانی خۆراكەكەی و پێكهاتەكانی خۆراكەكەی و، ئەو هەموو چاكانەی خوا ﷻ لەگەڵیدا كردوون.

**تەوەری سێیەم:** كە ئایەتەكانی: (٣٣ - ٤٢)ن و، دە (١٠) ئایەتی كۆتایی ئەم سووڕەتەن، باسی قیامەت و ڕاكردنی مرۆڤ لە نیزیكترین كەسەكانی لە: برای، لە بابی، لە دایكی، لە هاوسەری، لە ڕۆڵەكانی، پاشان دابەش بوونی خەڵك بۆ دوو كۆمەڵ:

كۆمەڵی یەكەم: ڕووگەشانی دڵخۆش بە پاداشتی خواو، بەوەی سەر بەرزو ڕوو سوورن، كە ژیانی دنیایان بە جۆرێك گوزەراندوە، جێگای ڕەزامەندیی و پەسەندیی خوای پەروەردگار بووە.

کۆمەڵی دووەم: خەمبارانی ڕووگرژو تاڵ، کە خەفەتبارن و تەمی خەم لە دەم و چاویان نیشتوە، بەهۆی ئەوەوە کە ژیانی دنیایان دۆڕاندوەو، لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیا دەرنەچوون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

چوار تایبەتمەندییم لەم سوورەتە موبارەکەدا کەوتوونەتە بەرچاو، کە وەك ئیمتیازو جیاکەرەوەیەکی ئەم سوورەتە لە سوورەتەکانی دیکە، دەیانخەینە ڕوو:

١- گلەیی کردنی خوا ﷻ لە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، بەڵام بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و زۆر بە نەرمیی، لەسەر ڕوو گرژکردنی و پشتتێکردنی بابایەکی کوێر، کە هەموو زانایان دەڵێن: بریتی بووە لە (**إبنُ أُمّ مَكْتُوم**)، کوڕی ئوممو مەکتووم کە ناوی عەبدوڵلا بووە، یاخود ناوی عەمرٍ بووەو، لە ئایەتەکانی (١ - ١١)دا هاتوە.

٢- فەرمانکردنی خوا بە مرۆڤ کە سەرنجی خۆراکەکەی بدات و، باسکردنی حەوت شت لە پێکهاتەکانی خۆراکەکەی، کە لە هەموو قورئاندا، ئەو شێوە تەعبیرە بەس لێرەدا هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٢٤ - ٣٢)دا.

٣- باسی ڕاکردنی مرۆڤ لە قیامەتدا لە برای و بابی و دایکی و هاوسەری و کوڕەکانی، یاخود ڕۆڵەکانی، کە لە ئایەتەکانی: (٣٤ - ٣٧)دا هاتوە.

٤- چەند وشەو تەعبیرێك، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

١- وشەی: ﴿ عَبَسَ ﴾.

٢- وشەی: ﴿ تَصَدَّىٰ ﴾.

٣- وشەی: ﴿ تَلَهَّىٰ ﴾.

٤- وشەی: ﴿ مُّكَرَّمَةٍ ﴾.

٥- وشەی: ﴿ سَفَرَةٍ ﴾.

٦- وشەی: ﴿ فَأَقْبَرَهُۥ ﴾.

٧- وشەی: ﴿ وَقَضْبًا ﴾.

٨- وشەی: ﴿ غُلْبًا ﴾.

٩- وشەی: ﴿ وَأَبًّا ﴾.

١٠- وشەی: ﴿ ٱلصَّآخَّةُ ﴾.

١١- وشەی: ﴿ مُّسْفِرَةٌ ﴾.

١٢- وشەی: ﴿ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴾.

١٣- وشەی: ﴿ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴾.

١٤- وشەی: ﴿ ٱلْفَجَرَةُ ﴾.

دوایی ئێمە مانای ئەم وشانە دەکەین.

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە کۆی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە دەکەینە دەرسێك، چونکە هەرچەندە سێ تەوەری سەرەکیی پێکدێنن، بەڵام ئەو سێ تەوەرە، هەرسێکیان پێکەوە پەیوەست و تێکهەڵکێشن، هەرچەندەش زۆر سەرنجمدا، بگونجێ بیانکەینە زیاتر لە دەرسێك، بەڵام ئایەتەکان زۆر تێکهەڵکێشن و پێکەوە پەیوەستن، بۆیە کردمانن بە دەرسێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرســەمان - وەك گوتـم: هەمـوو سـوورەتەكە دەكەینـە دەرسـێك - لـە كـۆی چـل و دوو (٤٢) ئایەتەكـەی ئـەم سـوورەتەی (**عبس**)، پێكهاتـوەو، ئـەو چـل و دوو ئایەتـە موبارەكـەش دابـەش دەبـن بـۆ سـێ تـەوەری سـەرەكیی تێكهەڵكێـش و پێكـەوە پەیوەسـت:

**تـەوەری یەكـەم:** لـە سـازدە (١-١٦)ی سـەرەتا پێكهاتـووە، باسـی ڕووگرژكردنـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و، ڕوو وەرچەرخانـدن و ڕوووەرگێڕانیەتـی لـە بابایەكـی كوێـر (**إبـنُ أُمِّ مَكْتُـوم**)، كـە نـاوی عەبدوڵـڵا یاخـود عەمـق بـووەو، كـوڕە خاڵـی دایكـمان (**خدیجـة**) بـووە، ئەویـش لـە كاتێكـدا كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەرقاڵی قسـە كـردن بـووە بـۆ كۆمەڵێـك لـە دەستڕۆیشـتووان و زلەزلانـی هـۆزی قورەیـش، كـە بێبڕوابوون، لـەو كاتـەدا ئەویـش هاتـوە بـۆ خزمەتـی و وەك دوایـی باسـی دەكەیـن، لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەكەیـدا، گوتوویەتـی ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! خـوا چ ئایەتێكـی دیكـەی بـۆ دابەزانـدووی پێـم بڵـێ! دەبـێ ئـاگای لـێ نەبـوو بـێ كـە پێغەمبـەر ﷺ سـەرقاڵی قسـەكردنە، ئەویـش ڕووی لـێ گـرژ كـردوەو ڕووی لێوەرگێـڕاوە، هەروەهـا بـەو بۆنـەوە باسـی قورئانیـش كـراوە.

**تـەوەری دووەم:** ئەویـش لـە شـازدە ئایەتـی دووەم ئایەتەكانـی: (١٧ - ٣٢)دا، باسـی مرۆڤـی بێبـڕوا دەكات، چۆنیەتیـی دروسـتبوونی مـرۆڤ و فەرمـان پـێ كردنـی كـە سـەرنجی خواردنەكـەی خـۆی بـدات و تییـەوە ڕامێنـێ و لێـی وردبێتـەوە، دوایـی باسـی پێكهاتەكانـی خۆراكەكـەی لـە حـەوت بڕگـەدا، كـردووە.

**تـەوەری سـێیەم:** كـە لـە دە ئایەتـی كۆتایـی پێـك دێ، ئایەتەكانـی: (٣٣ - ٤٢)، باسـی قیامـەت و ڕاكردنـی مـرۆڤ لـە نیزیكتریـن و خۆشەویسـترین كەسـانی، لـە دنیـادا، كـە بریتیـن لـە: بابـی و دایكـی و بـرای، ئنجـا هاوسـەری و ڕۆڵەكانـی، دواییش

دابەشبوونی کۆی خەڵك و مرۆڤایەتیی بۆ دوو کۆمەڵ: ڕوو گەشانی دڵخۆش و، خەمبارانی ڕوو گرژو تاڵ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾ قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٢﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ڕووی گرژ کردو وەرچەرخا ﴿١﴾ لە سۆنگەی ئەوەوە کە (پیاوە) کوێرەکە هاتە لای ﴿٢﴾ چ شتێك بە تۆی دەزانێنێ، ڕەنگە خۆی پاك و چاك بکات! (لە ئەنجامی قەسەکردنیدا لەگەڵ تۆدا) ﴿٣﴾ یان بیری بکەوێتەوەو بیرکەوتنەوەکە سوودی پێ بگەیەنێ! ﴿٤﴾ بەڵام کەسێك

کە بێنیازیی نواند (لە هیدایەتی خوا) تۆ ڕووی تێدەکەی (و لێی دەچیە پێش)! ﴿٥﴾ ئنجا ئەگەر (ئەو کەسە) خۆی پاك و چاك نەکات ﴿٦﴾ چ (بەرپرسیارێتییەك) لەسەر تۆیە؟ ﴿٧﴾ بەڵام کەسێك کە بە گرنگیی پێدانەوە دێتە لات ﴿٨﴾ لە حاڵێکدا بە مەزنگرتنییشەوە (لە خوا) دەترسێ ﴿٩﴾ کەچی تۆ خۆتی لێ دەخافڵێنی! ﴿١٠﴾ نەخێر (جارێکی دیکە وامەکە)، بێگومان ئەم (ئامۆژگاریی)ە بیرخەرەوەیە ﴿١١﴾ هەر کەس ویستی یادی دەکات (و پەند وەردەگرێ) ﴿١٢﴾ (ئەو قورئانە) لە چەند پەڕەیەکی ڕێز لێنراو دایە ﴿١٣﴾ (ئەو پەڕانە، پایە) بەرز کراوەو پاککراوەن ﴿١٤﴾ بە دەست نوێنەرانێکەوەن (لە فریشتان) ﴿١٥﴾ (لە لای خوا) بەڕێزو قەدرن، چاکەکارن ﴿١٦﴾ مرۆڤ (ی بێبڕوا) بە کوشتبچێ چەندە بیبڕواو سپڵەیە! ﴿١٧﴾ (خوا) لە چی دروستیکردوە؟ ﴿١٨﴾ لە تۆویلکەیەك دروستیکردوە، ئنجا ئەندازەگیریی کردوە ﴿١٩﴾ دواییش ڕێی (لەدایک بوون و ژیانی) بۆ ئاسانکردوە ﴿٢٠﴾ ئنجا مراندوویەتی و خستوویەتە گۆڕەوە (شوێنی خستنەگۆڕی بۆ ڕەخساندوە) ﴿٢١﴾ دوایی هەر کات ویستی (زیندووی دەکاتەوەو) بڵاوی دەکاتەوە ﴿٢٢﴾ نەخێر (با واز لە سپڵەیی بێنێ)، ئەوەی (خوا) فەرمانی پێکردوە جێ بەجێی نەکردوە ﴿٢٣﴾ دەجا با مرۆڤ بۆ خۆراکەکەی بڕوانێ (و لێی وردبێتەوە) ﴿٢٤﴾ (خۆراکەکەی بەو جۆرە هاتۆتە دی:) ئێمە (لە سەرێوە) بە خورزەم ئاومان هەڵڕشتوە ﴿٢٥﴾ دوایی بە لەتکردن زەویمان قڵیشاندوە ﴿٢٦﴾ ئنجا دانەوێڵە(ی جۆراو جۆر)مان تێدا ڕواندوە ﴿٢٧﴾ هەروەها ترێ و سەوزەو تەڕەکار﴿٢٨﴾ دیسان زەیتوون و دارخورما ﴿٢٩﴾ هەروەها باخە چڕو پڕەکان ﴿٣٠﴾ هەروەها میوەو لەوەڕ ﴿٣١﴾ بۆ بەهرەگەیاندن بە خۆتان و ئاژەڵەکانتان ﴿٣٢﴾ ئنجا هەر کات هاڕژنەکە (ی ڕۆژی دوایی) هات ﴿٣٣﴾ ئەو ڕۆژەی مرۆڤ لە برای ڕا دەکات ﴿٣٤﴾ هەروەها لە دایکی و بابی ﴿٣٥﴾ دیسان لە هاوسەری و ڕۆڵەکانی ﴿٣٦﴾ بۆ هەر کەسێك لەوان کارێك هەیە سەرقاڵی دەکات (نەیپەڕژێتە سەر کەس) ﴿٣٧﴾ ڕووانێك لەو ڕۆژەدا ڕوون و پڕشنگدارن ﴿٣٨﴾ پێکەنیوو شادمانن ﴿٣٩﴾ ڕووانێکیش لەو ڕۆژەدا تۆزو گەردیان لەسەرە ﴿٤٠﴾ ڕەشایی و تڵخیی (خەم و پەژارە)یان لێنیشتوە ﴿٤١﴾ ئا ئەوانە بێبڕوا تاوانبارەکانن ﴿٤٢﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(عَبَسَ): ڕووی گـرژ كـرد، (العُبُـوسُ: قُطُـوبُ الوَجْـهِ مِـنْ ضِيْـقِ الصَّـدْرِ)، (عُبُـوس): بریتیـە لـە نێوچـەوان تێكنـان و خـۆ مۆنكـردن و ڕووگـرژ كـردن، لـە ئەنجامـی سینە تەنـگ بوونـدا، مـرۆڤ كـە شـتێكی بـە دڵ نەبـوو، خەمـی لـە شـتێك خـوارد، ئـەو خەمـەی لـە دڵیدایـە، لەسـەر دەم و چاویشـی ڕەنـگ دەداتـەوە.

(تَصَدَّىٰ): (التَّصَـدِّي: أَنْ يُقَابَـلَ الـشَّيءُ مُقَابَلَـةَ الصَّـدَى، أي: الصَّـوْت الرَّاجِـع مِـنَ الجَبَل)، (تَصَدِّي): ئەوەیـە شـتێك وەك دەنگدانـەوە، ڕووبـەڕووی بكرێتـەوە، (صَدَى): بریتیـە لـە دەنگی چیـا، (دەنگدانـەوە).

(يَسْعَىٰ): (السَّـعِيُ: المَـشْيُ السَّرِيْـع، وَهُـوَ دُونَ العَـدْو، وَيُسْـتَعْمَلُ لِلْجِـدِّ فِي الأَمْـرِ خَـيْراً كَانَ أو شَرّاً)، (سَـعِي): بریتیـە لـە ڕۆیشـتنی خێـرا، بـەڵام نەگاتـە گورگـە لۆقـەو ڕاكـردن، وشـەی: (سَـعِي) بەكاردەهێـنرێ بـۆ چـاك ئەنجامدانـی كارێـك، ئنجـا ئـەو كارە چـاك بـێ، یـان خـراپ بـێ.

(تَلَهَّىٰ): (اللَّهْـو: مَـا يَشْـغَلُ الإنسَـانَ عَـمَّا يَعنِيـهِ ويُهِمُّـهُ، يُقَـالُ: لَهَيْـتُ عَـنْ كَـذَا، وَلُهِيْـتُ بِكَـذَا)، (لَـهو): بریتیـە لـەوەی مـرۆڤ بخافڵێنـێ و بێئـاگای بـكات لـە شـتێك، كـە پێیـەوە پەیوەسـتەو بـۆی گرنگـە، بـۆی مایـەی بایەخـە، دەگوتـرێ: (لَهَيْـتُ عَـنْ كَـذَا)، واتـە: لـە فـلان شـتە خافـڵام، (لُهِيْـتُ بِكَـذَا)، واتـە: بـە فـڵان شـت خافـڵ بـووم.

(كَلَّا): (كَلاّ: كَلِمَـة رَدْعٍ وَزَجْـرٍ وَإِبْطَـالٍ، لِقَـولِ القَائِـل، وَذَلِـكَ نَقِيـضُ «إِي» فِي الإِثْبَـاتِ)، (كَلاّ): وشـەیەكە بەكاردەهێـنرێ بـۆ بەرپەرچدانـەوەو تێوەخوڕیـن و هەڵوەشـانەوەی قسـەی كەسـێك، یـان ڕەفتـاری كەسـێك.

{ئـەو گوتوویەتـی: (لقـول القائـل)، بـۆ قسـەی بێژەرێـك، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا (كلاّ) تەنیـا بـۆ بەرپەرچدانـەوەی قسـەی بێژەرێـك بەكارنایـەت، بەڵكـو وێـڕای قسـە، بـۆ

بەرپەرچدانەوەی هەڵسوکەوتی بابایەکیش کە هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی نواندوە، بەکاردێ، لێرەش دا پێغەمبەر ﷺ هیچی نەگوتوە لەگەڵ (**إبن أم مكتوم**)دا، بەس ڕووی لێ گرژ کردووەو ڕووی لێ وەرچەرخاندوە، کەواتە: (**كلاّ**)، تەنیا بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەی قسەکەرێك نەهاتوە، بەڵکو بۆ هەڵوەشاندنەوەو ڕەخنە لێگرتنی ڕەفتارێکیش دێ}.

ئنجا وشەی: (**كَلاّ**)، دژو پێچەوانەی (**إِي**)یە، (**إِي**): لە چەسپاندنداو (**كلاّ**): لە ڕەخنە لێگرتن و هەڵوەشاندنەوەدا، (**إِي**)، یانی: بەڵێ، یاخود: ئەرێ.

(تَذۡكِرَةٞ): (**التَّذْكِرَةُ: مَا يُتَذَكَّرُ بِهِ الشَّيءُ، وَهُوَ أَعَمُّ مِنَ الدَّلاَلَةِ وَالأَمَارَةِ**)، (**تَذْكِرَة**): بریتیە لەوەی شتێکی پێ بێتەوە یاد، کە گشتییترە لە وشەی (**دلالة**)، ڕێ پێشاندان و (**أَمارة**)، نیشانە.

(صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ): (**الصَّحِيْفَةُ: المَبْسُوطُ مِنَ الشَّيءِ كَصَفْحَةِ الوَجْهِ، وَالصَّحِيْفَةُ الَّتِي يُكْتَبُ عَلَيْهَا وَجَمْعُهَا صَحَائِف وَصُحُف**)، (**صَحِيْفَة**): بریتیە لە هەر شتێك پان کرا بێ، یاخود ڕاخرا بێ، وەك (**صفحة الوجه**)، واتە: پەڕەی دەم و چاو، (**صحيفة**)، بەوەش دەگوترێ کە لە سەری دەنووسرێ، کە بە (**صحائف**)و (**صُحُف**) کۆ دەکرێتەوە، واتە: پەڕ، یاخود هەرشتێك شتی تێدا بنووسرێ، مەرج نیە هەر کاغەز بێ.

(سَفَرَةٖ): (**السَّفَرَةُ جَمْعُ سَافِر، كَكَاتِب وَكَتَبَة، وَالسَّفِيرُ: الرَّسُولُ بَيْنَ القَوْمِ يَكْشِفُ وَيزِيلُ مَا بَيْنَهُمْ مِنَ الوَحْشَةِ، فَهُوَ فَعِيل بِمَعْنَى الفَاعِل**)، وشەی: (**سَفَرَة**) کۆی (**سَافِر**)ە، وەك (**كَتَبَة**) کە کۆی (**كَاتِب**)ە، (**كَاتِب**)، واتە: نووسەر، {(**سَافِر**)، هەم بە مانای خوێنەرەوە (**قارِيء**) و، هەم بە مانای نوێنەریش دێ}، بەڵام (**سفير**): بە نێردراوێك دەگوترێ، کە دەکەوێتە نێوان خەڵکێکەوەو ئەوەی لە نێوانیاندا هەیە، لە ناکۆکیی و نا تەبایی لایدەبات، بۆیە (**سفير**)، لەسەر کێشی (**فعيل**)ە، بەڵام بە مانای بکەر (**فاعل**)ە، ئەو کەسەی ئەو کارە ئەنجام دەدات کە بریتیە لە لابردنی ناتەبایی لە نێوان خەڵکێکدا.

(كِرَامٍ): (جَمْعُ كَرِيم: مَا شَرُفَ فِي بَابِهِ، وَهُوَ اسْم للأَخْلاَقِ المَحْمُودَةِ تَظْهَرُ مِنْهُ)، (كِـرَام) كـۆی (كَرِيـم)ە، (كَرِيـم): هـەر شـتێكە لـە جـۆری خـۆی باشـترین بـێ، هەروەها (كريم): نـاوی ئـەو ڕەوشـت و كـردارە پەسـند كراوانەیـە كـە لـە مرۆڤـەوە دەردەكـەون.

(بَرَرَةٍ): (بَرَرَةَ جَمْع بَرّ، وَأَبْرَار جَمْع بَارّ، وَبَرّ أَبْلَغُ مِنْهُ، كَمَا أَنَّ العَدْل أَبْلَغُ مِنْ عَادِل)، (بَرَرَة) كـۆی (بَرّ)ە، واتـە: چـاك، بـەڵام (أَبْرَار) كـۆی (بَارّ)ە، بـە مانـای چاكـەكار.

وشـەی: (بـرّ) مانایەكـەی بەهێزتـرە لـە (بـارّ)، هـەروەك (عَـدْل) كـە چاوگـە، مانایەكـەی بەهێزتـرە لـە (عَـادِل)، واتـە: دادگـەر، كـە مەبەسـت لـە (عَدْل)یـش هـەر دادگـەرە، یـانی: ئـەو كەسـە دادگـەرە و، بۆتـە خـودی دادگەریـی، هـەروەك (بـرّ) یـش بـە مانـای چاكەكارییـەو چاوگـە، بـەڵام وەك ئـەو كەسـە خـودی چاكەكاریـی و سـەرچاوەی چاكـە كاریـی بـێ.

(فَأَقْبَرَهُ): (قَبَرْتُهُ: جَعَلْتُهُ فِي القَبْرِ، وَأَقْبَرْتُهُ: جَعَلْتُ لَهُ مَكَانَاً يُقْبَرُ فِيهِ)، (قَبَرْتُهُ)، واتـە: خسـتمە گـۆڕەوە، بـەڵام (أَقْبَرْتُهُ)، واتـە: شـوێنێكم بـۆ دانـا تێیـدا بخرێتـە گـۆڕەوە، كەواتـە: (فَأَقْبَرَهُ)، واتـە: خـوا زەوی بـۆ ڕەخسـاندوە كـە تێیـدا بخرێتـە گـۆڕەوە، (قَابِـر): كەسـێكە كەسـێك دەخاتـە گـۆڕەوە، بـەڵام (مُقْبِر): كەسـێكە شـوێنێك دەڕەخسـێنێ بـۆ ئـەوەی تێیـدا بخرێتـە گـۆڕەوە.

(أَنْشَرَهُ): (نَشَرَ وَأَنْشَرَ): هەردووكیـان هاتـوون، واتـە: بـڵاوی كـردەوە، (نَشَرَ: مُسْتَعَارٌ مِنْ نَشْرِ الثَّوْبِ)، (نَشْر): خوازراوەتـەوە بـۆ بڵاوكردنـەوەی پۆشـاكێك كـە هەڵدەخرێ، یـان بڵاودەكرێتـەوەو پێشـانی كڕیـار دەدرێ، بـەڵام (أَنْشَرَهُ): هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: تەنیـا بـۆ بڵاوكردنـەوەی مـردووان و زینـدوو كردنەوەیـان، بـەكاردێ.

(صَبَبْنَا): (صَبَّ المَاءَ: أَرَاقَهُ مِنْ أَعْلَى، صَبَّهُ فَانْصَبَّ)، ئاوەكەی لەسـەر ڕا هەڵبڕشـتە خـوارێ، ڕشـتی ئەویـش ڕژا، (الصُّبَابَةُ وَالصُّبَّةُ: البَقِيَّةُ الَّتِي مِنْ شَأْنِهَا أَنْ تُصَبَّ)،

(**صُبَابَـة وصُبَّـة**) ئـەو بەرمـاوەی پێویسـتەو حاڵـی وایـە بڕژێـنرێ، کەسـێك شـتێك دەخـوات، یـان شـتێك دەخواتـەوە، هەندێکـی لـێ دەمێنێتـەوە، مـاوەو خڵتەکـەی کـە دەیرێـژێ، پێـی دەگوتـرێ: (**صبابـة**).

(شَقَقْنَا): (**الشَّـقُّ: الخَـرْمُ الوَاقِـعُ فِي الـشَّيء**)، (**شَـقّ**): بریتیـە لـە قڵیشـێك و درزێـك کـە لـە شـتێکدا پەیدادەبـێ، زۆر لـە زانایـان گوتوویانـە: (**الشَّـقُّ: هُـوَ الصَّـدْعُ طُـوْلاً**)، (**شـق**) ئەوەیـە بـە بـاری درێژییـدا شـتێك بقڵیشـێ، یـان درزی تێـدا پەیدابـێ.

(وَقَضْبًا): (**القَضْـبُ: كُلُّ شَـجرَةٍ طَالَـتْ وَبَسَـطَتْ أَغْصَانَهَا**)، (**قَضْـب**): هـەر درەختێکـە درێـژ بـێ و لـق و پۆپەکانـی بـڵاو بکاتـەوە، هەروەهـا (**القَضْـب**): **الشَّـجَرُ الرَّطْـبُ يُقْطَـعُ مَـرَّة بَعْـدَ أُخْـرَى**)، (**قَضْـب**): بریتیـە لـە هـەر ڕووەکێکـی تـەڕەکار جـار لـە دوای جـار ببـڕدرێ، بـۆ وێنـە: وێنجـەو سـێوەڕەو، ئەوانـە، دیسـان (**قَضْـب**)، بـە مانـای سـەوزەو تەڕەکاریـش هاتـوە، واتـە: هەمـوو ئـەو شـتانەی مـرۆڤ بـە قـەپ و قەپاڵتـە دەیانخـوات، ڕاسـتەوخۆ، چونکـە دەگوتـرێ: (**قَضَبَـهُ يَقْضِبُـهُ قَضْبَـاً**)، بـڕی، دەیبـڕێ، بڕیـن، واتـە: بـە زارو بـە قەپاڵتـە بـڕی، بۆیـەش هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: (**قَضْـب**) مەبەسـت پێـی ئـەو شـتانەیە کـە بـە زار دەخورێـن وەك: ترۆزیـی و خەیـارو کاڵـەك و شـووتیی، بۆیـە ئەگـەر بـۆ مانـای (**قَضْـب**) بگوتـرێ: سـەوزەو تـەڕەکار، وا پێ دەچـێ مانایەکـەی ڕاسـتتر بـێ.

(غُلْبًا): (**جَمْـعُ أَغْلَـب، وهـو الغَلِيـظُ الرَّقَبَـة**)، (**أَغْلَـب**): بـە مرۆڤێك دەگوتـرێ گەردنـی قەبـەو ئەسـتوور بـێ، بۆیـە بـە گەردنـی شـێر دەگوتـرێ: (**أَغْلَـب**)، لەبـەر ئـەوەی شـێر کورتـەو تێـك سـڕماوەو، ناتوانـێ مـل بسـووڕێنێ، دەبـێ هەمـوو جەسـتەی بسـووڕێنێ، (**غُلْبَـاً**): ئـەو دارو درەختانـەن کـە تێکسـڕماون و هەموویـان وەك یـەك دێنـە بەرچـاو.

(وَأَبًّا): (**الأَبُّ: المَرعـى المتهَيِّـيءُ للرَّعـي**)، (**أبّ**)، بریتیـە لـەو لەوەڕگایـەی ئامـادە کـراوە بـۆ تێـدا لـەوەڕان.

(ٱلصَّآخَّةُ): (الصَّاخَّـةُ: شِـدَّةُ صَوْتِ ذِي النُّطْقِ، وعِبَـارَةٌ عَـنِ القِيَامَـةِ)، (صَاخّـة): بریتیـە لـە دەنگـی بەهێـزی، شـتێك دەنگـی هەبـێ و قسـەی هەبـێ، هەروەهـا بریتییـە لـە قیامەت.

هەڵبەتە (راغب الأصفهاني)، وا دەڵێ.

بـەڵام مـن پێـم وایـە (صاخّـة)، بـە هـاڕژن و دەنگێکـی گـەورە دەگوتـرێ و، مـەرج نیـە، هـی خـاوەن نوتـق و بێژتـن بـێ، بێگومانیـش (صاخّـة) لێـرەدا مەبەسـتی پـێ ڕۆژی دواییـەو، یەکێکـە لـە ناوەکانـی ڕۆژی دوایـی، چ ئـەوەی دوای فـووی یەکـەم ڕوو دەدات، کـە ئاخیـر زەمانـە، چ ئـەوەی دوای فـووی دووەم ڕوو دەدات، کـە هەڵسـانەوەو قیامەتـە، یـانی: کـۆی ڕۆژی دوایـی.

(مُّسْفِرَةٌ): (السَّـفْرُ: كَشْـفُ الغِطَـاءِ)، (سَـفْر)، لابردنـی داپۆشـەرێکە لەسـەر شـتێك، (أَسْـفَرَ: أَشْرَقَ لَوْنُـهُ)، ڕووی درەوشـایەوەو گـەش بـوو، کەواتـە: (مُسْـفِرَة)، یـانی: کەسـانێك کـە ڕووگـەش و ڕووخۆشـن.

(غَبَرَةٌ): (كِنَايَـةٌ عَـنْ تَغَيّرُ الوَجْـهِ عَـنْ غَـمٍّ)، (غَـبَرَة): کنارەیـە بـۆ گۆڕانـی دەم و چـاو لـە ئەنجامـی خـەم و خەفەتـدا.

(تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ): (القُتَـارُ وَالقَـتْرُ: الدُّخَـانُ السَّـاطِعُ مِـنَ الشِّـوَاءِ، وَالعُـودِ وَنَحْوِهِـمَا)، (قُتار، قَـتْر): بریتیـە لـەو دوو کەڵـەی بـەرز دەبێتـەوە لـە ئەنجامـی برژاندنـی گۆشـت و سـووتاندنی دارو چڵـوێ و شـێوەی ئەوانـدا.

(القَـتَرَةُ: شِـبْهُ دُخَـانٍ يَغْـشَى الوَجْـهَ مِـنَ الكَـذِبِ)، (قَـتَرَة): شـێوەی دوو کەڵـە دەکەوێتـە سـەر دەم و چـاو، لـە ئەنجامـی درۆکردنـدا، کەسـێك کـە درۆ دەکات و، دەشـزانێ درۆیەکـەی بەسـەردا ساغ بۆتـەوەو لێـی ئاشـکرا بـووە، لـە شـەرمەزارییان ڕووی ڕەش دادەگـەڕێ.

## هۆی هاتنه خوارەوەی ئایەتەکان

له بارەی دابەزینی سەرەتای سوورەتی (عَبَسَ)وە سێ گێڕراوان دێنین:

**١- {عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: أُنْزِلَتْ: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾ فِي ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَجَعَلَ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! أَرْشِدْنِي، وَعِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ مِنْ عُظَمَاءِ الْمُشْرِكِينَ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعْرِضُ عَنْهُ، وَيُقْبِلُ عَلَى الْآخَرِ، وَيَقُولُ: أَتَرَى بِمَا أَقُولُ بَأْسًا؟ فَيَقُولُ: لَا، فَفِي هَذَا أُنْزِلَ}، (أخرجه الترمذي: ٣٣٣١، والطبري في جامع البيان: ج٣٠، ص٣٢، و أبو يعلى في مسنده: ٤٤٤٨، وابن حبان: ٥٣٥، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط مسلم).**

واتە: دایکمان خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: سوورەتی ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾، لە بارەی (**ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ**)ی کوێرەوە هاتە خوار، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ڕێنماییم بکە، لەو کاتەشدا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ پیاوێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرە مەزنەکان هەبوو، (واتە: ئەوانەی قسە ڕۆیشتوو گەورەو پایەدار بوون)، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی وەرگێڕا لە (**عبد الله بن أُمِّ مَكْتُوم**) و ڕووی کردە ئەو کابرا خاوەن پێگەیە، {کە بێبڕوا بوو} و دەیگوت: ئایا ئەوەی دەیڵێم هیچ نارێکیی تێدایە؟ ئەویش دەیگوت: نەخێر، ئیدی لەو بارەوە ئەمە هاتە خوار.

**٢- {عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُكَلِّمُ أُبَيَّ بْنَ خَلَفٍ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ۝٢ ﴾، فَكَانَ النَّبِيّ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ يُكْرِمُهُ} (أخرجه أبو يعلى: ٣١٢٣، فتح القدير: ج٥، ص٥٤٤، وقال مؤلِّفا الإستيعاب في بيان الأسباب: سندهٌ صحيح).**

واتە: ئەنەس دەڵێ: قسەی خوای بەرز: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ۝٢ ﴾ لەو بارەوە هاتە خوار کە (**ابْنِ أُمِّ مَكْتُوم**)، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا

ﷺ و، لەو کاتەدا قسەی لەگەڵ ئوبەییەی کوڕی خەلەف دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لە (ابْـنِ أُمِّ مَكْتُـوم) وەرگێڕا، ئیدی لەو بارەوە خوا (عزوجل)، ئەم ئایەتە موبارەکانەی ناردنە خوار، ئنجا دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوممو مەکتووم، دەگرت.

لە هەندێك شوێنەواراندا هاتوە: هەر کاتێك پێی دەگەیشت، پێی دەفەرموو: (مَرْحَباً بِمَـنْ عَاتَبَنِـي فِيـهِ رَبِّي)، سڵاو لەو کەسەی لەسەر وی پەروەردگارم گلەیی لێکردم.

**٣- {عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله ﷺ فِي مَجْلِسٍ مِن نَاسٍ مِن وُجُوهِ قُرَيْشٍ مِنْهُمْ: أَبُو جَهْل بنِ هِشَام، وَعُتْبَة بن رَبِيْعَة، فَيَقُولُ لَهُمْ: أَلَيْسَ حَسَنَاً أَنْ جِئْتُ بِكَذَا وَكَذَا؟ فَيَقُولُونَ: بَلَى وَاللهِ، فَجَاءَ ابنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوْ مُشْتَغِلٌ بِهِم، فَسَأَلَهُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ:** ﴿أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾﴾**، يَعْنِي ابْنُ أُمِّ مَكْتُوم} (ذكره الدر المنثور: ج٨، ص٤١٦، ونسبه لابن المنذر وابن مردويه).**

واتە: دایکمان خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر خوا ﷺ لە کۆڕێکدا بوو لەگەڵ ئەوانەی خاوەن پێگەن، لە هۆزی قورەیش، ئەبوو جەهلی کوڕی هیشام و عوتبەی کوڕی ڕەبیعەیان تێدابوون، پێی دەفەرموون: ئایا باش نیە فڵانە شت و فڵانە شتەم هێناوە، (باسی ئیسلامی بۆ دەکردن)؟، ئەوانیش، دەیانگوت: با، سوێند بە خوا، لەو کاتەدا (ابْـن أُمِّ مَكْتُـوم) هات، ئەویش سەرقاڵی قسە کردن لەگەڵ ئەوان بوو، پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش ڕووی لێوەرگێڕا، ئیدی خوا (عزوجل) لەو بارەوە ئەو ئایەتانەی ناردنە خوار: ﴿أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾﴾، تۆ خۆت دەخافڵاند لە (ابْـنِ أُمِّ مَكْتُـوم).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای میهرەبان دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجا خوا ﷻ یەکسەر باسی ڕووداوێکی ژیانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، کورتەکەی ئەوەیە: کە ڕۆژێك پیاوێکی نابینا، پیاوێکی کوێر، بە ناوی (**ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ**)، کە هەندێك دەڵێن: ناوی عەبدوڵلایە و، هەندێکی دیکەش دەڵێن، ناوی عەمرەو دەڵێن: کوڕە خاڵی خەدیجە بووە، هاوسەری یەکەمی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، خوا لێی ڕازی بێ، لە کاتێکدا وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی باسمان کرد، ئەو پیاوە نابینایە (خوا لێی ڕازی بێ) دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو، داوای لێ دەکات ڕێنمایی بکات و فێری بکات و، لەوەی خوا بۆ دابەزاندوە ئاگاداری بکاتەوە، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ سەرقاڵی دواندنی یەکێك یان زیاتر لە سەرانی هۆزی قوڕەیش دەبێ، لە قسە بە دەست و دەستڕۆیشتووەکانیان، لە کاتێکدا کە گەرمەی قسەو باسە لەگەڵیانداو، تەماعی ئەوەی تێیاندا دەبێ، خوا دڵیان نەرم بکات و بەرەو ئیسلامیان بێنێ، لەو کاتەدا ئەو هاوەڵە نابینایەش دێ، دەبێ گوێی لێ نەبووبێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەریکی گفتوگۆیە لەگەڵ ئەواندا، یاخود گوێی لێ بووە، بەڵام هەر چۆن بێ پرسیارکردنەکەی خۆی نێواخنی قسەکان و دیالۆگەکە کردوە، پێغەمبەریش ﷺ خۆی گرژ کردوەو ڕووی

لێوەرگێڕاوە، باس نەکراوە هیچی فەرموو بێ، بەڵام ڕووی خۆی لێ گرژ کردوەو خۆی لێوەچەرخاندوە، ئیدی بەو بۆنەوە سەرەتای ئەم سوورەتە موبارەکە دابەزیوە، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کردوەو، دوایی زیاتریش قسەی لێ دەکەینەوە.

دەفەرموێ: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾، ڕووی خۆی گرژ کردو خۆی وەرسووڕاند، دیارە ئەو هاوەڵە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەگەر لە پێشەوە هاتبێ، یان لە لای ڕاست، یان لە لای چەپ، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووبەڕووی بووە، بەڵام کاتەکەی نەگونجاو بووەو، ئەویش نابینا بووەو نەیزانیوە پێغەمبەر ﷺ خەریکی چییە، یان ئەگەر زانیبێتیشی خەریکی چییە، ڕەنگە پرسیار کردنەکەی خۆی پێ گرنگتر بووبێ، بە ئیجتیهادو بۆچوونی خۆی، بۆیە کە قسەکان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەکات، پێغەمبەری خوا ڕووی گرژ دەکات، یانی: لە دڵی خۆیدا تووڕە دەبێ و، ڕووشی لێ وەردەگێڕێ.

لێرەدا خوا ﷻ بە شێوەی نادیار ئەو گلەییە لە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات و نافەرموێ: (**عَبَسْتَ وَتَوَلَّيْتَ**)، دەفەرموێ: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾، ڕووی خۆی گرژ کردو خۆی وەرسووڕاند، ﴿ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴾، لە سۆنگەی ئەوەوە کە کوێرەکە هات بۆ لای ﴿ ٱلْأَعْمَىٰ ﴾، (أل)کەی بۆ ناساندنە، بەڵام مەبەست پێی (**عهد**)ە، واتە: ئەو کوێرەی زانراوەو ناسراوە، کوێرەکە (**ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ**)ە، ناوەکەی وا زیاتر ڕۆیشتووە، کوڕی ئوممی مەکتووم، (أم مكتوم)، نازناوی دایکیەتی، یانی: کوڕی دایکی مەکتووم، ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴾، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: چ شتێك بە تۆی زانانـدوە، ﴿ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴾، لەوانەیە، نیزیکە پاك و چاك بێ (واتە: بەهۆی ئەوەوەی لە تۆی وەردەگرت)، ئەگەر تۆ ڕووت تێکردبایەو گوێت بۆ گرتبایەو ڕێنماییت کردبایە، ئەوەی تۆ پێت دەگوت، دەبووە هۆی پاك و چاك بوونی، واتە: بەردەوام بوونی لەسەر پاك و چاك بوون، یاخود زیاد کردنی پاکیی و چاکیی، ئەگەرنا بە دڵنیایی (**ابْنِ أُمِّ مَكْتُوم**) یەکێك بووە لە هاوەڵان و،

بڕواداریش بووەو خاوەنی پاکیی و چاکیی (**تزكية**) بووە، بەڵام پاکیی و چاکیی یەك پلە نیەو، مرۆڤ دەبێ لەسەری بەردەوام بێ و، هەوڵ بدات لێشی زیاد بکات.

﴿ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴾، یان (بەلای کەمەوە) ئەگەر پاکیی و چاکییشی پێ زیاد نەکردبایە، پەندی وەردەگرت و بیری دەهاتەوەو، ئەو وەبیر هاتنەوەو پەند وەرگرتنەش سوودی پێ دەگەیاند.

﴿ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴾، بەڵام کەسێك کە بێنیازەو خۆی بێنیاز پێشانداوەو بێمنەتە لە پەیام و بانگەوازەکەی تۆ، لێرەدا (**إستغنى**)، بە مانای ئەوە نیە - وەك هەندێك لە توێژەرەوان و ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە - ماڵ و سامانی هەیەو بە ماڵ و سامانەکەیەوە نازیوە، چونکە سیاقەکە ئەوە ناگەیەنێ، بەڵکو یانی: بێ نیازیی پێشانداوە بەرانبەر بە پەیامەکەی تۆ.

﴿ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴾، تۆ ڕووی تێدەکەی و، بایەخی پێدەدەی و، لێی دەچیە پێش، ﴿ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴾، (ما): أ-دەگونجێ بۆ لابردن (**نفي**)بێ، (**ما النَّافية**)بێ، یانی: (**لَيْسَ عَلَيْكَ شَيء ألاَّ يَزَّكَّى**) ئەگەر ئەو خۆی پاك و چاك نەكات، بەهۆی وەرگرتنی پەیامی خواوە لە تۆ، هیچ بەرپرسیارییەتییەکت لەسەر نیە.

ب-یاخود (ما) بۆ پرسیار کردن، (**ما الإستفهامية**)بێ، یانی: (**أيُّ شَيءٍ عَلَيْكَ ألاَّ يَزَّكَّى**)، چ شتێك، چ بەرپرسیارییەتێکت دەکەوێتە سەر، ئەگەر ئەو کەسە خۆی پاك و چاك نەکات؟

بێگومان ﴿ يَزَّكَّىٰ ﴾ی پێشێ و، ئەم ﴿ يَزَّكَّىٰ ﴾ی ئێرە لە ئەسڵدا (**يَتَزكَّى**)ن، بەڵام (**ت**)کە لە (ز)کەدا دەغم کراوەو بۆتە ﴿ يَزَّكَّىٰ ﴾، ئەگەر نا (**يتزكّى**)یە لەسەر کێشی (**تَفَعُّل**)، واتە: ئەگەر ئەو کەسە خۆشی پاك و چاك نەکات، تۆ هیچ بەرپرسیارییەتییەکت لەسەر نیە، یاخود: تۆ چ بەرپرسیارییەتییەکت لەسەرە! ﴿ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ ﴾، بەڵام کەسێك کە بە

گرنگیی پێدانەوە دێ بۆ لات، یاخود ﴿ يَسْعَىٰ ﴾، یانی: بە خێرایی دێ، لە ئەسڵدا (**سعي**): بریتیە لە ڕۆیشتنی خێرا (**المشِي السَّرِيع دُونَ العَدْوِ**)، ڕۆیشتنێکی خێرا بەڵام کەمتر لە ڕاکردن، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ ڕۆیشتن بەرەو مەبەستێك بە گرنگیی و بایەخ پێدانەوە، واتە: کەسێك کە بە بایەخ پێدان و گرنگییەوە دێ بۆ لات، ﴿ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴾، لە حاڵێکیشدا ترس و سام و هەیبەتی هەیە، بە مەزنگرتنەوە بەرانبەر بە خوا، (**خشية**) و (**خوف**) جیاوازییەکەیان ئەوەیە: (**الخَشْيَةُ: هُوَ الخَوْفُ مَعَ التَّعظيم**)، (**خَشْيَة**) ترسانە لەگەڵ بەمەزنگرتن دا، بەڵام (**خوف**) یانی: ترس، یانی: لە حاڵێکدا کە بە مەزنگرتنەوە لە خواش دەترسێ.

یاخود: ﴿ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴾، لە حاڵێکدا کە مەترسییشی هەبوو لە بێبڕوایەکان ئازاری بدەن، یاخود: ﴿ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴾، لە کاتێکدا کە دەشترسا لەبەر ئەوەی نابینایە هەڵبنگوێ و بکەوێ و تووشی ناڕەحەتیی بێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەهات بۆ لات.

﴿ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴾، کەچی تۆ خۆتی بەسەرەوە نابەی، خۆتی لێ دەخافڵێنی، چونکە ﴿ تَلَهَّىٰ ﴾، ئەسڵی خۆی (**تَتَلَهَّى**)یە، یانی: (**تتشاغل**)، دەخافڵای، دەگوترێ: (**لَهَوْتُ بِكَذا وَلَهَيْتُ عَن كَذا**)، بەو شتە خافڵام و لەو شتە بێئاگابووم، یانی: خۆتی لێ بێئاگا دەکەی، یان خۆت بە شتێکی دیکەوە سەرقاڵ دەکەی، بۆ ئەوەی ئاگات لەو نەبێ.

﴿ كَلَّآ ﴾، واز بێنە لەوە، جارێکی دیکە ئەو ڕەفتارە دووبارە مەکەوە، ئەی موحەممەد ﷺ! چونکە وشەی: ﴿ كَلَّآ ﴾: (**كَلِمَةُ رَدْعٍ وَزَجْرٍ وَإِبطَالٍ**)، (**كلاّ**) وشەیەکە بۆ بەرپەرچدانەوەو تێوەخوڕین و هەڵوەشاندنەوە، لێرەش بۆ هەڵوەشانەوەی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، ئنجا زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: (**كَلاَّ**)، بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەیەکە کە لە پێشدا کرابێ، بەڵام وەك پێشتریش گوتوومە: نەخێر بەڵکو (**كَلاَّ**)، هەم بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەیەکە کە پێشتر کرابێ (قسەیەکی هەڵە) یاخود ڕەفتارو هەڵوێستێکی پێشتر نوێنرابێ، مەرج نیە، بەس

قسـە بـێ، چونکـە لێـرەدا پێغەمبـەر ﷺ هیچـی بـە (**ابْـنِ أُمِّ مَكْتُـومٍ**) نەگوتـوە، بەڵکـو بـەس ڕووی لـێ گـرژ کـردوەو ڕووی لـێ وەرگێـڕاوە، کەواتـە: خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: جارێکـی دیکـە ڕوو لـە پیـاوی وا گـرژ مەکـەو، ڕووی لێـوەر مەچەرخێنـە.

ئەگـەر ورد سـەرنج بدەیـن، دەزانیـن ئـەوە گلەییەکـی زۆر نـەرم و میهرەبانانـەی خوایـە ﷻ بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ.

دوایـی خـوا ﷻ دێتـە سـەر باسـی ئـەو قورئانـەی (**ابْـنِ أُمِّ مَكْتُـومٍ**) بـە پێغەمبـەری خـوای گوتـوە: ئـەو پەیامـەی خـوام بـۆ بخوێنـەوە!، کـە پێغەمبـەر ﷺ ویسـتوویەتی بـە هەندێـك لـە سـەرانی قورەیـش و، زلەزلـەو دەسترۆیشـتووەکانی ئەوانـی بگەیەنێ، بۆیـە ڕووی موبـارەکی لـە (**ابْـنِ أُمِّ مَكْتُـومٍ**)، گـرژ کـردوە، لـە پێنـاوی ئـەوەدا قسـە بـۆ ئـەوان بـکات، خـوا لـە بارەیـەوە دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەو قورئانـە، یـان ئـەو ئایەتانـە بیرخـەرەوەن، ﴿تَذْكِرَةٌ﴾: بریتیـە لـەوەی مـرۆڤ بەهـۆی ئـەوەوە شـتی بێتـەوە یـاد، واتـە: بیرخـەرەوەیـە، هەروەهـا (**تذكـرة**) بـە مانـای پەنـدو ئامۆژگارییـش دێ.

﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾، ئنجـا هـەر کەسـێك بیـەوێ یـادی دەکاتـەوە، ﴿ذَكَرَهُۥ﴾، (ه)ی (**ذكـره**) ڕانـاوی نێرینەیـە و بـۆ قورئـان دەچێتەوە، پێشـێ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ﴾، ئـەو ئایەتانـە بیرخـەرەوەن، ئایەتـەکان مێینـەن، بۆیـە ڕانـاوی مێینـەی بەکارهێنـاوە، بـەڵام دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾، ڕانـاوی نێرینـەی بەکارهێنـاوە، لەبـەر ئـەوەی دەچێتـەوە بـۆ قورئـان، یـان لەبـەر ئـەوەی ئایەتەکانـی قورئـان، ئەگـەر ڕانـاوی مێینەشـیان بـۆ بەکارهاتبـێ، مێینـەی (**مجازي**)یـن و، مێینـەی (**مجازي**)یـش دەگونجـێ ڕانـاوی نێرینەشـی بـۆ بەکاربـێ.

هەروەهـا دەشـگونجێ ڕانـاوی سـەر(ذَكَرَهُۥ)، بـۆ خـوا بچێتـەوەو هەندێکیـان ئاوایـان لێکداوەتـەوە: هـەر کەسـێك بیـەوێ یـادی خـوا دەکات.

ئنجا دوایی باس دەكات ئەو ئایەتانە پێگەكەیان چۆنە لە لای خوا، دەفەرمویّ:

﴿ فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴾، ﴿ صُحُفٍ ﴾، كۆی (**صحیفة**)یە، یانی: پەڕ، یاخود هەر شتێك لەسەری بنووسریّ، مەرج نیە هەر پەڕی كاغەز بیّ، لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا كاغەز زۆرە، بەڵام كاتی خۆی لە سەر چەرم و پێست و توێكڵی دارو گەڵای دارو بەردی تەنك و ئەوانەیان نووسیوە، گرنگ ئەوەیە: ﴿ صُحُفٍ ﴾، كۆی (**صحیفة**)یەو ئەویش هەر شتێكە لەسەری بنووسریّ، ﴿ مُّكَرَّمَةٍ ﴾، ڕێز لێگیراوەكان، لە پەڕە ڕێز لیّ گیراوەكاندایە، لە نووسراوە ڕێز لێگیراوەكاندایە، ﴿ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ ﴾، بەرزكراوەو پاككراوەن، (**مرفوعة**)، یانی: ئەو پەڕانەی ئەو قورئانەیان تێدا نووسراوە، لە لای خوا زۆر بە قەدر و خاوەن پێگەن، ﴿ مُّطَهَّرَةٍ ﴾، یانی: پاككراوەشن، لەوەی دەستی شەیتانەكانیان بگاتیّ، یان: لەوەی هەڵەو كەم و كووڕییان بچێتیّ.

﴿ بِأَيْدِي سَفَرَةٍ ﴾، بەدەستی چەند سەفیرێكەوەن، (**سفیر**)، نوێنەر، كۆیەكەی: (**سُفُر**)ە، وەك (**كُتُب**) كۆی (**كاتب**)، (**سَفَرة**)ش كۆی (**سافر**)ە، كە:

**١-** بە مانای نوێنەر دیّ..

**٢-** هەروەها بە مانای نووسەر دیّ.

**٣-** دیسان بە مانای خوێنەریش دیّ، بە دڵنیاییش مەبەست پێی فریشتەكانن.

هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست پێی هاوەڵانن (خوا لێیان ڕازی بیّ)، كە ئەو قورئانەیان بەدەستەوەیەو دەینووسنەوەو دەیخوێننەوەو، بەڵام ئەم مانایە بێهێزە، چونكە بە پێی سیاقەكە دەردەكەویّ كە هەمووی قسەكە لەگەڵ فریشتەكانە، چونكە دوایی دەفەرمویّ: ﴿ كِرَامٍ بَرَرَةٍ ﴾، ئەم تەعبیرە لە قورئاندا لە شوێنی دیكەشدا هاتووەو بۆ فریشتەكان بەكارهێنراوە ﴿ كِرَامٍ ﴾، كۆی (**كریم**)ە، واتە: زۆر پەسەندو چاك، (**الكريم هو الجيِّدُ من نوعه**)، شتێكی هەرە چاك لە جۆری خۆی: (**شَخْصٌ كريم**)، (**مَلَكٌ كريم**)، (**كتاب كريم**)، یانی: كەسێكی زۆر پەسندو چاك، فریشتەیەكی زۆر پەسندو چاك، نووسراوێكی زۆر پەسند و چاك.

﴿ بَرَرَةٍ ﴾، كـۆی (بَـرّ)ە، كـە لـە ئەسـڵدا بـە مانـای چاكەكاریـی دێ و، چاوگـە ﴿ بَرَرَةٍ ﴾، واتـە: هـەرە چاكـەكان، كـۆی (بَـرّ)ە.

هەندێكیش گوتوویانە: (**بَرَرة**) كۆی (**بارّ**)ە، واتە: چاكەكار.

بـەڵام بۆچوونـی ڕاسـت ئەوەیـە كـە: ﴿ بَرَرَةٍ ﴾، كـۆی (بَـرّ)ە و، (**أبـرار**) كـۆی (**بـارّ**)، (**أبـرار**)، واتـە: چاكـەكان، ﴿ بَرَرَةٍ ﴾یـش هـەر یـانی: چاكـەكان، بـەڵام (**بـررة**) مانایەكـەی بەهێزتـرە، چونكـە (**بَـرّ**) یانـی: خـودی چاكیـی و چاكەكاریـی، چاوگـەو وەك نـاو بەكارهاتـوە.

چۆنیەتیـی پێكـەوە پەیوەسـت بوونـەوەی ئـەم ئایەتانـەش، ئاوایـە: ئـەم قوڕئانـە ئـەی موحەممـەد ﷺ! كـە خـوا بـۆ تـۆی دابەزانـدوە، ئـەوە پێگەكەیەتـی و ئـەوە حاڵەكەیەتـی:

بیرخەرەوەیـەو پەنـدو ئامۆژگارییـە، ئنجـا هـەر كەسـێك بیـەوێ، دەتوانـێ بەهۆیـەوە یـادی خـوا بـكات، یـان: دەتوانـێ تێیبـگات، یـان: پەنـدی لێوەربگـرێ، هەروەهـا ئـەم قوڕئانـە لـە پـەڕە ڕێـز لێگیراوەكاندایـە، دەگونجـێ مەبەسـت ئـەوە بـێ: ئـەم قوڕئانـە بەرلـەوەی دابەزێنرێتـە سـەر زەوی لـە لای جیبریـل و فریشـتە پـاك و چاكـەكان بـووە بـە نووسراویـی، یـان مەبەسـت تەختـە پارێزراوەكـە (**لـوح محفوظ**)یـە، یـان مەبەسـت دوای نووسرانەوەیـەتی لـە لایـەن هاوەڵانـەوە، یـانی: ئـەو پـەڕو شـتانەی قوڕئانیـان تێـدا نووسراوەتـەوە: ﴿ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ ﴾، ئـەو پەڕانـە خـاوەن پێگـەی بـەرزو پاككـراوەن، هەڵبەتـە دوو ئایـەتی دوایـی: ﴿ بِأَيْدِي سَفَرَةٍ، كِرَامٍ بَرَرَةٍ ﴾، مانـای یەكـەم زاڵ دەكات، بگـرە سـاغی دەكاتـەوە، واتـە: ئـەم قوڕئانـە بـە دەسـتەكانی نوێنەرانێكەوەیـە، یەكجـار بەڕێـزو پەسـندو چاكـەكارن كـە مەبەسـت پێی ئـەو پەڕانـەن بـە دەسـت فریشـتەكانەوەن، ئنجـا چ ئەمـە تەعبیرێكـی مەجازیـی بـێ، واتـە: وەك لـە پەڕانـدا نووسرابێتـەوەو فریشـتەكان دایبەزێنـن، هێنـدە بـە وردەكاریـی و ڕێكیـی دایدەبەزێنـن، بێگومـان جیبریـل لەگـەڵ ژمارەیـەك لـە فریشـتاندا، وەحیـی

و سرووشی خـوای پـەروەردگاری هێنـاوە بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، چ هـەروەك خـوای پـەروەردگار هەواڵیـداوە، مانـا ڕواڵەتییەکـەی مەبەسـت بـێ و ئـەم قورئانـە پێشـتر لـە ئاسـمان دا نووسرابێتـەوە، کـە هەندێـك لـە زانایـان دەڵێـن، ئـەم قورئانـە بـەر لـە دابەزێنرانـی لـە تەختـی پارێـزراو (لـوح محفـوظ)دا نـووسراوەو، دواییـش کـە دابەزێـنراوە لـە پەڕانێکـی دیکـەدا، یـان لـە شـتانێکی دیکـەدا نـووسراوەو بـە نووسراویـی دابەزێـنراوە، بـەڵام ئـەوە پەنهـان (غیـب)ەو ئێمـە نایزانیـن.

کەواتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ! قورئانێـك وابـێ، پێویسـت بـەوە نـاکات بـۆ گەیاندنـی بـە کەسـانێك کـە لێـی بـێ منەتـن و، بێنیازیـی لـە بەرانبـەردا پێشـان دەدەن، ڕووی خـۆت گـرژ بکـەی لـە بڕوادارێکـی نابینـاو، ڕووی لـێ وەرچەرخێنـی، چونکـە قورئانێکـی هێنـدە بـەرزو بەڕێـزو خـاوەن پێگـە، شایسـتەی هەمـوو کـەس نیـەو، تـۆش کـە گەیەنـەری ئـەو قورئانـەی، پێویسـتە لـە خـۆت وریابـی، لـە هەڵـەو پەڵەیـەك کـە لەگـەڵ پێگـەو پایـەی بـەرزو پاکـی و چاکیـی ئـەم قورئانـەدا نەگونجێ، بـا ئـەو هەڵـەو پەڵەیـە ئیجتیهادییـش بـێ، کـە بـە دڵنیایـی هەروایـە، وەك دوایـی باسـی دەکەیـن، پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ وەك بـۆ چـوون و ئیجتیهادێـك پێـی وابـووە، لـەو کاتـەدا کـە خەریکـی بانگەوازکردنـی ئەوانەیـە، ئـەو کارە تـەواو بـکات باشـترە، چونکـە (ابْـنِ أُمِّ مَكْتُـومٍ)، دەرفـەت و هەلـی دیکـەی دەبـێ، گـوێ بـۆ پێغەمبـەر ﷺ بگـرێ و، پەیامـی خـوای زیاتـر لـێ وەربگـرێ، بـەڵام بـۆ ئەوانـە دەرفەتێکـەو هەڵکەوتـوەو وا باشـە بیقۆزیتـەوەو زایـەی نـەکات، بـەڵام دیـارە خـوای پـەروەردگار ئیجتیهـادو بۆچوونەکـەی پێغەمبـەری ﷺ لـەو بـوارەدا، بـە هەڵـە دانـاوەو بـۆی ڕاسـت کردۆتـەوە، تاکـو جارێکـی دیکـە، دووبـارەی نەکاتـەوە.

ئنجـا خـوا ﷻ دێتـە سـەر بابەتێکـی دیکـەی هـەر پەیوەسـت بـە بابەتی پێشـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ﴾، ئینسـان بـە کوشـتبچێ، بـە دڵنیایـی مەبەسـت پێـی ئینسـانی بێبڕوایـە، کـە دەسـتی نەگەیشـتۆتە هیدایەتـی خـواو، هیدایەتـی خـوای وەرنەگرتـوە، ئـەو جـۆرە مرۆڤـە بـە کوشـتبچێ، یـان: نەفرینـی لـێ بکـرێ،

﴿مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾، چ شتێك وای لێكردوە بێبڕوا بێ؟ ئەگەر (ما) لێرەدا پرسیاركردەنیی (**إستفهامية**) بێ، چ شتێك وای لێكردوە بێبڕوا بێ، یاخود: ﴿مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾، هەمووی بەسەریەكەوەیە وەك: (**ما أحسنه! ما أروعه!**)، ئەوەش ڕێژگەی سەرسوڕمانە، واتە: چەند بێبڕوایە! (**كفر**)یش لێرەدا دەگونجێ بە مانای: نادیدەگرتن (**كفران**)ی نیعمەت بێ، واتە: چەند سپڵەو ناسپاسە! یاخود بە مانای بێبڕوایی بێ، واتە: چەند بێبڕوایە! چ شتێك وای لێكردوە سپڵەو ناسپاس بێ؟ یاخود: چ شتێك وای لێ كردوە بێبڕوا بێ! یان: چەن بێبڕوایە! یان: چەندە سپڵەو ناسپاسە!

﴿مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ﴾، لەچی دروستی كردوە؟ واتە: خوای ﷻ بەدیهێنەری لە چی هێناویەتە دی؟ ﴿مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ﴾، لە تۆویلەكەیەك هێناویەتە دی، ئنجا ئەندازەگیریی كردوە، ﴿نُّطۡفَةٍ﴾: بریتیە لەو زیندەوەرە گچكەیەی لە ئەنجامی پێكەوە ئاوێتە بوونی زیندەوەری تۆویی (حیمن)ێكی پیاوو هێلكۆڵە (**بویضة**)ی ئافرەتدا، لە نێو منداڵدانی ئافرەتدا، یەكدەگرن و دەبێتە زیندوەرێكی دیكە، ئەگەرنا ئەوانیش هەردووكیان زیندەوەرن و، ژیاندارن، بەڵام بە هەردووكیان زیندەرەوەرێكی دیكە پێكدێنن، كە پێی دەگوترێ: تۆویلكە ﴿نُّطۡفَةٍ﴾، خوا ئەوی لە ﴿نُّطۡفَةٍ﴾، تۆویلكەیەك دروستكردوە، ئنجا ئەندازەگیریی كردوە، دوایی باسی ئەو ئەندازەگیرییە دەكەین، لە كورتە باسێكدا.

﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ﴾، دوایی ڕێی بۆ ئاسان كردوە، زۆرێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان، گوتوویانە: ڕێی هاتنە دەری لە منداڵدان و سكی دایكی بۆ ئاسان كردوە، بۆ لە دایك بوون، دوایی لەو بارەشەوە لە مەسەلە گرنگەكاندا ڕوونكردنەوەیەك دەدەین، چونكە لە دایك بوونی منداڵ، پرۆسەیەكی زۆر ئاڵۆزەو، خوا ﷻ سیستم و ڕێك و پێكییەكی سەرسوڕهێنەری بۆ داناوە، ئەگەرنا لە دایك بوونی منداڵ و هاتنە دەری لە منداڵدان و سكی دایكی شتێكی ئاسان نیە، بەڵام خوا بۆی ئاسان كردوە.

واتایەکـی دیکـەی: خـوا ڕێـی چاکـەو خراپـەی بـۆ ئاسـانکردوە، دەتوانـێ هـەر ڕێیـەك بگرێتـە بـەر.

منیـش پێـم وایـە مانایەکـەی گشـتییترە، یانـی: هەمـوو شـتێکی بـۆ ئاسـان کـردوە، بـۆ ئـەو منداڵـە:

أ- هاتنە دەری لە سکی دایکی.

ب- مژینی مەمکی دایکی.

ج- فێربوونی خواردن و خواردنەوە.

د- فێربوونی قسە کردن.

هـ- ئنجا ڕۆیشتن و گەشەکردن و...هتد، ئەوە لە ڕووی ماددییەوە، لە ڕووی مەعنەوییشەوە خوا ﷻ بۆی ئاسان کردوە، ڕێی ڕاستی خوا بگرێتەبەر، هەم عەقڵی پێداوە، هەم پێنج هەستەکانی پێداون، هەم ناخ و زگماکێکی باشی پێداوە کە هەقی پێ بناسێ، ئنجا وێڕای ئەوەش خوا ﷻ وەحیی و سرووشیشی بۆ ناردوە بە پێغەمبەراندا.

﴿ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴾، دوایـی خـوا مراندوویەتـی و کردوویەتـی بـە خاوەنگـۆڕ، واتـە: کارێکـی وایکـردوە شـوێنێك هەبـێ تێیـدا بخرێتـەوە گـۆڕەوە، ﴿ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴾، دوایـی هـەر کاتێکیـش ویسـتی، بـڵاوی دەکاتـەوەو زینـدووی دەکاتـەوە.

﴿ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴾، نەخێـر، مرۆڤـی بێبـڕوا، ئـەوەی خـوا فەرمانـی پێکـردوە، جێبەجێـی نەکـردوە، بـا واز بێنـێ لـە لاف لێـدان و نکووڵییکـردن لـە پەیامـی خـوا، یـان: واز بێنـێ لـەوەی گوایـە زینـدوو ناکرێتـەوە، ئـەوەی خـوا فەرمانـی پێکـردوە، جێبەجێـی نەکـردوە، کەواتـە: دەبـێ چاوەڕێـی سـزا بـێ.

ئنجـا خـوا ﷻ دێتـە سـەر بابەتێکـی دیکـە، دەفەرمـوێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴾، بـا مـرۆڤ بـۆ خواردنەکـەی بڕوانـێ، بـا سـەرنجی بداتـێ و لێـی وردبێتـەوە،

پێشی فەرمووی: با مرۆڤ بزانێ چۆن دروست بووە؟ ئەگەر بزانێ چۆن دروست بووە، لە خوا یاخیی نابێ، هەر کەسێك خۆی بناسێ، خواش دەناسێ..

دوایی دەیگوازێتەوە بۆ سەرنجدانی دەوروبەری تاکو ئەو خواردنەوەو خۆراکەی دێتە بەردەستی، لێی ورد بێتەوەو تەماشای پێکهاتەکانی بکات، چۆن دروست بووە، ئنجا باسی پێکهاتەکان و باسی دروست بوونی ئەو خواردنە دەکات و دەفەرمویٚ:

﴿ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴾، ﴿ أَنَّا ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**إنّا** صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا)، ئێمە بەهەڵڕژتن ئاومان هەڵڕژاندۆتە خوارێ، واتە: لە هەورەکان لەسەرێوە لە شێوەی باران و بەفر و تەزرەدا، ﴿ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴾، دوایی زەوییمان بە قڵیشاندن، قڵیشاندوە، ئەو نەمامە، ئەو دەنکە تۆوەی دەخرێتە زەوییەوە، دوایی چەکەرە دەداو دێتە دەرێ و زەوی دەقڵیشێنێ، بگرە نێوك (**نواة**)و، دەنك (**حبّ**) و چەکەرە بەردی سەخت دەقڵیشێن، ﴿ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴾، ئنجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواندوە، دوای ئەوەی ئاوێکی زۆرمان هەڵڕژاندۆتە سەر زەوی و، زەویمان پێقڵیشاندوە، کە دەگونجێ مەبەست لە زەوی قڵیشاندنەکە ئەوەبێ: زەوییمان وا لێکردوە ئەو ئاوەی پێدا بچێتە خوارو، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ: زەوییمان وا لێکردوە بقڵیشێ، ئەو دەنکە تۆوەو ئەو چەکەرەیە بتوانێ تێیدا بڕوێ و گەشە بکات، ﴿ حَبًّا ﴾، ناوی کۆ (**اسم جمع**)ە، تاکەکەی بریتیە لە (**حبة**)، واتە: یەك دەنکە تۆو (**حبة قمح، حبة شعير، حبة رُز**)، دەنکە گەنمێك، دەنکە جۆیەك، دەنکە برنجێك.

کەواتە: (**حب**) واتە: دانەوێڵە بە گشتیی و هەموو جۆرەکانی دانەوێڵە دەگرێتەوە، ﴿ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴾، هەروەها ترێمان تێدا ڕوواندوەو سەوزەو تەڕەکار، ﴿ وَقَضْبًا ﴾، زانایان زۆریان قسە لێکردوە، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست پێی سەوزەو تەڕەکاربێ، ئەو شتانەی بە زارو قەپاڵتە دەخورێن، کە مرۆڤ

ڕاستەوخۆ دەیانخوات، سەوزەیە، وەك: كەوەرو پیازو كاهوو، تەڕەكارە، وەك: ترۆزیی و خەیارو شووتیی كاڵەك و ئەوانە، ﴿ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴾، هەروەها درەختی زەیتوون، درەختی دارخورمامان تێدا ڕواندوە، ﴿ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴾، باخە چڕو پڕو لێك ئاڵاوەكانیش، ﴿ وَحَدَآئِقَ ﴾، كۆی (حَدِيقة)یە، كە بریتیە لە باخێك دیوارو شووورای بەدەوردا كرابێ، ﴿ غُلْبًا ﴾، كۆی (أغلب)ە، یانی: چڕو پڕو بە هێزو پێز، گەردن و ملی شێر (أَغْلَب)ی پێ دەگوترێ، لەبەر ئەوەی زۆر چڕ و پڕ و بەهێزە، ناتوانێ بەملاو لادا ئاوڕ بداتەوە، دەبێ بە هەموو جەستەی ئاوڕ بداتەوە، كەواتە: ﴿ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴾، یانی: باخەكان كە دارو درەختەكانیان چڕو پڕن و، لێك ئاڵاون، ﴿ وَفَٰكِهَةً ﴾، هەروەها میوە هەموو جۆرەكانی مێوە، بە نەناسراو (**نكرة**) هێناویەتی، بۆ ئەوەی هەموو جۆرەكان بگرێتەوە، ﴿ وَأَبًّا ﴾، (**أب**)، بە مانای لەوەڕگایە، ئەوەی ئاژەڵ دەیخوات و تێیدا دەلەوەڕێ.

﴿ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴾، بۆ بەهرەگەیاندن بە خۆتان و بە ئاژەڵەكانتان، یان: بۆ بەهرە وەرگرتنی خۆتان و ئاژەڵەكانتان، هەموو ئەو شتانەمان بۆ بەرهەم هێناون.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر تەوەری كۆتایی، كە باسی ڕۆژی دواییە، واتە: دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی نەرمە گلەییەكی كرد لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە سۆنگەی ئەوەوەی ڕووی گرژ كردەو ڕووی وەرچەخاندوە لە بابایەكی كوێر، كە هاتوەو داوای وەرگرتنی هیدایەتی زیاتری خوای لێ بكات، دوایی باسی قوڕئانی كرد، كە ئەو قوڕئانە پێگەیەكی چەند بەرزی هەیە، كە فریشتە پاك و چاكەكانی نوێنەرانی خوا دەیهێنن، ئنجا باسی مرۆڤی بێبڕوای كرد، كە چەند سپڵەو ناسپاسەو، چ شتێك وای لێكردوە، سپڵەو ناسپاس بێ و، چ شتێك وای لێكردوە بێبڕوا بێ، ئایا لە چی دروستی كردوە؟ دوایی خوا ﷻ سەرنجی مرۆڤی ڕاكێشا بۆ خواردنەكەی و پێكهاتەكانی خواردنەكەی و، لە كۆتاییدا، سەرنجیان ڕادەكێشێ بۆ ڕۆژی دوایی، كە ئەی مرۆڤەكان! ئەگەر ئەو پەیامەی خوا وەرنەگرن و،

پەنــدو دەرس وەرنەگـرن لـە چۆنیەتیـی دروسـتبوونی خۆتـان و، لـەو خـواردن و خۆراکـەی خـوا بۆتـان دەڕەخسـێنێ و، سوپاسـگوزاریی نەکـەن بـۆ خـوا، پـەروەردگارو بەدیهێنـەری خۆتـان نەناسـن و نەیپەرسـتن و، پەیامێـك کـە بـە پێغەمبـەری کۆتایـی دا بـۆی نـاردوون، لێـی وەرنەگـرن، ئـەو ڕۆژە سـەختە چاوەڕێتـان دەکات:

﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴾، ئنجـا هـەر کاتێـك ﴿ ٱلصَّآخَّةُ ﴾ هـات، واتـە: هاڕژنێـك و دەنگێکـی گـەورە، کـە گوێـی خەڵـك کـەڕ دەکات، یـان وادەکات خەڵـك نەیبیسـتێ، دەنگـی زۆر گـەورە مـرۆڤ کـەڕو وڕو کاس دەکات، ئەگـەر دەنگەکـە زۆر گـەورە بـێ، گوێـی وەخـۆی ناگـرێ و وڕو کاس دەبـێ، مـرۆڤ کـە گوێـی لـە تەقینەوەیەکـی گـەورە دەبـێ، دوایـی ماوەیـەك گوێـی لـە هیـچ نابـێ، چونکـە کاس و وڕ بـووە، ﴿ ٱلصَّآخَّةُ ﴾، واتـە: هاڕژنێکـی کـەڕو وڕو کاسـکەر، ﴿ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴾، ئـەو ڕۆژەی مـرۆڤ لـە برایەکـەی خـۆی ڕادەکات، ﴿ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴾، هەروەهـا لـە دایکـی و بابـی ڕادەکات، ﴿ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴾، دیسـان لـە هاوژینەکـەی، هاوسـەرەکەی و منداڵـەکانی ڕادەکات، بۆچـی لێیـان ڕادەکات؟

تاکـو داوای شـتیکی لـێ نەکـەن، چونکـە دەزانـێ هیچـی پـێ ناکـرێ لـە ڕۆژی دواییـدا، هیچکـەس هیچـی لـە دەسـت نایـەت، وەك دوایـی خـوا بـاس دەکات: ﴿ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴾، بـۆ هـەر مرۆڤێـك لـەوان، لـەو ڕۆژەدا کارێـك هەیـە، سـەرقاڵی دەکات، وای لـێ دەکات نەیپەڕژێتـە سـەر هیـچ شـتێکی دیکـە.

ئنجا خـوای پەنهانـزان لـە کۆتاییـدا باسـی ئـەوە دەکات، کـە ئـەو خەڵکـە دابـەش دەبـێ بـۆ دوو کۆمـەڵ:

﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴾، ڕووانێـك (لـەو ڕۆژەدا، ڕوون و گەشـن)، ﴿ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴾، پێکەنیـون شـادمانن و دڵخۆشـن، مـرۆڤ ئەگـەر دڵـی خـۆش و شـاد بوو، دەم بـە زەردەخەنـەش دەبـێ و ڕووشـی گـەش و جـوان و ڕوون و پڕشـنگدار دەبـێ، کۆمەڵێـك هـەن بـەو شـێوەیەن.

﴿ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴾، ڕووانێکیش هەن لەو ڕۆژەدا تەپ و تۆز (ی خەمباریی)یان لێنیشتوە، مەبەست ئەوەیە: وەك چۆن کەسێك تۆزو خۆڵ لە دەم و چاوی دەنیشێ، ئاوا دەم و چاویان لێڵ و تاریکە، ﴿ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴾، تەنوویان کەوتۆتە سەرێ.

﴿ قَتَرَةٌ ﴾ و (**قَتار**) و (**قِتار**) بە مانای دوو کەڵ دێ، واتە: وەك دووکەڵ و تەنوو نیشتبێتە سەر دەم و چاویان، بەو شێوەیە دێنە بەرچاو، تەمی خەمیان کەوتۆتە سەر دەم و چاوو، تەنووی خەم دەم و چاوی ڕەشکردوون.

﴿ أُوْلَئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ ﴾، ئا ئەوانە بێبڕوا تاوانبارەکانن، یان ئا ئەوانە کەسە سپڵەو تاوانبارەکانن.

خوا بە لوتف و کەرەمی ڕەهای خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە لەو ڕۆژەدا ڕوویان گەش و جوان شادو درەوشاوە دەبێ و، دڵیان خۆش و شادمان دەبێ، دەم بە پێکەنین و زەردەخەنە دەبن، خوا بە بەزەیی خۆی بمانپارێزێ لەوەی بەهۆی دڵتەنگیی و پەستیی و خەم و ناڕەحەتییەوە، تەمی خەم و تۆزو خۆڵی خەفەتباریی، دەم و چاومان ڕەش و تاڵ و تلخ و تاریك بكات.

بەڕێـــــزان!

بەر لەوەی مانای گشتیی ئەم سووڕەتە موبارەکە بەجێ بێڵین، ئاماژەیەك دەکەم بە مشت و مڕی زانایان لە بارەی هۆی هاتنە خواری سەرەتای ئەم سووڕەتە موبارەکەو، چۆنیەتیی گونجانی ئایەتەکان لەگەڵ پارێزراویی (**معصومية**) ی پێغەمبەردا ﷺ:

زۆربەی هەرە زۆری تەفسیرەکان لە سەر وەرگرتنی ئەو ڕیوایەتانەی ئێمە هێنامانن لە هۆی هاتنە خواردا کە ئێمە سێ گێڕدراوەمان لەو بارەوە هێناون، سەنەدیشیان ڕاست و دروستە زۆربەی هەرە زۆری تەفسیرەکان لەسەریان یەکدەنگن، ئەو تەفسیرانەی من لەبەر دەستم دان، تەنانەت خاوەنی تەفسیری

(**الكاشف**)یش كـە (**محمـد جواد مُغنية**)یـەو زانایەكـی شـیعەیە، لـە بەرگـی حەوتـی تەفسـیرەكەیدا[١]، ئەویـش ئـەو ڕیوایەتانـە وەردەگـرێ و هیـچ گـرێ و گۆتاڵێـك دروسـت نـاكات، كـە لـە سـەرەتای ئـەم سـوورەتەدا خـوای پـەروەردگار پێغەمبـەری خاتـەم دەدوێنـێ و، بـە شـێوەیەكی ناڕاسـتەوخۆ گلەیـی لـێ دەكات.

بـەڵام تەفسـیرەكانی دیكـەی شـیعەكان وەك عادەتـی خۆیـان، بـۆ وێنـە: (**محمـد حسـين الطباطبـائي**)، كـە خاوەنـی تەفسـیری (الميـزان)ە[٢]، بـە حیسـاب ڕەخنـە دەگـرێ لـەو ڕیوایەتانـە كـە ڕاسـت نیـن و دەڵـێ:

خـوا ﷻ ڕەوشـت و ئـاكاری پێغەمبـەری ﷺ بـە مـەزن دانـاوە -- مەبەسـتی پێـی سـەرەتای سـوورەتی (القلـم)ە، كـە دەفەرمـوێ: ﴿نٓ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ٤﴾، كـە پێشـتر قسـەمان لـێ كـرد - خـوا هـەر لـە سـەرەتاوە ڕەوشـتی پێغەمبـەری كۆتایی ﷺ بـە مـەزن وەسـف بـكات، كەواتـە: چـۆن دەچێتـەوە عەقڵـەوە، دوای ئـەوەی لـە سـەرەتای نـاردنی دا، خـوا ڕەوشـتی وی بـە مـەزن وەسـف كردبـێ، كەچـی دوایـی لەسـەر هەندێـك لـە هەڵسـوكەوت و ڕەوشـتەكانی گلەیـی لـێ بـكات؟!

واتـە: ئەمـە ناگونجـێ مەبەسـت پێـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـێ، لەبـەر ئـەوەی ئـەو پێـی وایـە دژ دەوەسـتێ لەگـەڵ ئـەوەدا كـە لـە سـەرەتای سـوورەتی (القلـم) دا خـوا پێغەمبـەری كۆتایـی خـۆی، بـە خـاوەن ڕەوشـتێكی مـەزن وەسـف دەكات!.

هەروەهـا تەفسـیری (نمونـە)ش كـە تەفسـیرێكی فارسـییە هـی (نـاصری مكارمـی شـیرازی) و هەندێـك زانـای دیكـەی شـیعە[٣]، لـەو بـارەوە قسـەی زۆری كـردوە، كـە ئـەو ڕیوایەتانـە قبـووڵ ناكـەن.

---

(١) ص: ٥١٥، ٥١٦.

(٢) ج٢٠، ص ٢٠٣.

(٣) ج ٢٦، ص ١٢٥ - ١٢٧.

بەڵام لە ڕاستییدا قسەكانیان هیچیان پشتبەستوو نین بە هیچ بەڵگەیەكی عەقڵیی و نەقڵیی، بەڵێ، خوا ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە مەزن وەسف كردوە، بەڵام ئەوە كە ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ مەزنە، مانای وانیە هیچ شتێك نەكات، پێویست بێ خوای پەروەردگار بۆی ڕاست بكاتەوە، ئەگەر بشگوترێ: ئەوە لەگەڵ پارێزراو بوونی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە گوناح، تێكدەگیرێ، ڕاست نیە، چونكە ئەوە گوناهێك نیە، پێغەمبەر ﷺ كردبێتی و، تەنیا هەڵەیەكی ئیجتیهادییەو، یەكەم گلەییش نیە خوای كاربەجێ لە پێغەمبەرەكەی ﷺ بكات و، ڕەخنەی لێ بگرێ، بەڵكو، ئەوە چەند جارێك لە قورئان دا دووبارە بۆتەوە:

١- لە سوورەتی (**التوبة**)دا، دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ﴿٤٣﴾﴾، واتە: خوا لێت ببورێ بۆچی مۆڵەتت دان؟ هەرچەندە لێرەدا خوای پەروەردگار لێبوردنەكەی پێش گلەییەكە خستوە!.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**الأنفال**)دا: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ ﴿٦٧﴾﴾، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە، دیلان بگرێ (لە بەرامبەر ئەوەدا كە قەرەبوویان لێوەربگرێ)، هەتا (دوژمنان) لە پەل و پۆ نەخات.

٣- هەروەها لە سوورەتی (**التوبة**)دا: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ ﴿٨٤﴾﴾، واتە: لە مەودوا نوێژ لەسەر هیچ كام لە وان (مونافیقەكان) مەكەو لەسەر گۆڕەكەشی ڕامەوەستە.

ئەوە بەڵای كەمەوە لە چوار شوێندا، خوای پەروەردگار هەڵەی ئیجتیهادیی بۆ پێغەمبەری كۆتایی ﷺ ڕاست كردۆتەوە، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەقێك نەبووە پێچەوانەی بجووڵێتەوەو بۆچوونێكی بووە، بەڵام لە بۆ چوونەكەیدا نەپێكاوە، خوای میهرەبانیش بۆی ڕاست كردۆتەوە، بێگومان ئەوەش لەگەڵ پارێزراوبوونی پێغەمبەر ﷺ لە گوناهاندا تێكناگیرێ، چونكە ئەو شتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ كردوونی، هەڵەی ئیجتیهادیی بوون و گوناح نەبوون، چونكە

کەسێك کە ئیجتیهاد دەکات، ئەگەر بیپێکێ، دوو پاداشتی هەن و، ئەگەر نەیپێکێ پاداشتێکی هەر هەیە.

ئنجا هەر کام لە شیخ (**محمد عبدة**) لە (**الأعمال الكاملة**)کەیدا هاتوە[1]، لە تەفسیری بەش (**جزء**)ی (**عمّ**)دا، هەندێ قسەی زۆر ڕێك و جوانی لەو بارەوە کردوون.

هەروەها (**إبن عاشور**)یش، لە تەفسیرەکەی (**التحرير والتنوير**)دا[2]، ئەویش لە بارەی ئەو ئایەتانەوە هەندێ قسەی زۆر جوان دەکات.

هەروەها (**سيد قطب**)یش لە تەفسیرەکەیدا[3]، هەڵوەستەیەکی زۆر جوان و ڕێك و پێك لە بەردەم ئەو ئایەتانەدا دەکات، دواییش لە کاتی خستنە ڕووی مەسەلە گرنگەکاندا لەو بارەوە، قوڵە باسێك دەکەم و حەوت (٧) حیکمەتی ئەو گلەییەی خوا ﷻ لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەخەمەڕوو.

---

(١) ج ٥، ص: ٣٢٦ ، ٣٢٧.

(٢) ج١٢، ص: ١٠٩، ١١٤

(٣) في ظلال القرآن ج٦.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

گلەیی ناڕاستەوخۆی خوا ﷻ لە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ كە بە هۆی هاتنە لای بابایەكی كوێرەوە، ڕووی گرژ كردوەو، خۆی وەرچەرخاندوە، لە حاڵێكدا ڕەنگە ئەوە هۆكاری پاك و چاكبوونی زیاترو پەند وەرگرتنی بێ، كە چی ڕووی كردۆتە كەسانێكی بێنیازیی پێشاندەر، كە ئەگەر بەهۆی گەڕانەوە بۆ لای خواشەوە پاك و چاك نەبن، پێغەمبەر ﷺ بەرانبەریان بەرپرسیار نیەو، خەتای خۆیانەو، وەسفكردنی قوڕئانیش بە پەندو بیرخەرەوەیان كە لەبەر دەستی هەموو لایەكدایە، لە چەند پەڕەیەكی بەرزو بە ڕێزو پاك داو، بە دەستی فریشتانێكی گرانقەدری چاكەكاری نوێنەری خواوەن:

خوا دەفەرموێ: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾، ڕووی خۆی گرژ كردو وەرچەرخا، وشەی: ﴿عَبَسَ﴾، (**العُبُوسُ: قُطُوبُ الوَجْهِ مِنْ ضَيْقِ الصَّدْرِ**)، (**عُبُوس**): بریتیە لە ڕووی خۆگرژ كردن لە ئەنجامی سینە تەنگ بووندا، مرۆڤ كە شتێكی بە دڵ نەبوو، كەیفی بە شتێك نەهات و خەفەتی لە شتێك خوارد، ڕووشی لە بەرانبەریدا ترش و تاڵ دەبێ، ﴿وَتَوَلَّىٰٓ﴾، (**أَصْلُهُ تَحَوّلُ الذَّاتِ مِنْ مَكَانِهَا، وَيُسْتَعَارُ لِعَدَمِ اشْتِغَالِ المرْءِ بكَلَامٍ يُلْقَى إِلَيْهِ**)، (**تَوَلِّي**): لە ئەسڵدا بریتیە لەوەی

مرۆڤ لە شوێنی خۆی لابچێ، بەڵام دوایی دەخوازرێتەوە بۆ سەرگەرم نەبوونی مرۆڤ بە قسەیەکەوە کە بۆی دەکرێ، واتە: گرنگیی پێنەدانی.

کەواتە: بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، خوا ﷻ باسی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات، کە ڕووی خۆی لە کوێرەکە گرژ کردو، خۆی خافڵاند، یان: گوێی بۆ نەگرت و گرنگیی پێنەدا.

**٢)-** ﴿ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴾، لە کاتێکدا کوێرەکە هاتەلای، ﴿ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴾، پسپۆڕانی زمان دەڵێن: (**فِي محل مَجْرُورٍ بلاَمِ جَرّ مَحْذُوفٍ مَعَ (أَنْ) وَهُوَ حَذْفٌ مُطَّرِد**)، ئەمە لە شوێنی (مجرور)دایە بە (ل)ێك کە هەمیشە لەگەڵ (**أن**)دا دەقرتێنرێ، یانی: (**لأن** جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ) بە هۆی ئەوەوەی کوێرەکە هاتە لای، ڕووی خۆی گرژ کردو، خۆی وەرچەرخاند، (**إبن عاشور**)، قسەیەکی جوان دەکات، لە مانا لێکدانەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەدا، دەڵێ:

**١-** زانیاریی هەبوون بە ڕووداوەکە، دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە هاتنەکە (هاتنی ئەو پیاوە کوێرە)، هاتنێکی تایبەت بووەو، کوێرەکەش بابایەکی ناسراوو زانراو بووە.

**٢-** خوای میهرەبان بە شێوەی هەواڵ فەرموویەتی و نەیفەرمووە: (**عَبَسْتَ وَتَوَلَّيْتَ**)، ڕووی خۆت گرژکردو خۆت وەرچەرخاند! بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾، ڕووی خۆی گرژ کردو خۆی وەرگێڕا، ﴿ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴾، بەهۆی ئەوەوەی کوێرەکە هاتە لای، شێوازی هەواڵ بەکارهێنراوە لە گلەییکردندا، لەو بێئاگاییەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە گرنگیی نەداوە بەو بابا کوێرە، بۆ ئەوەی پەیامی خوای پێ بگەیەنێ، بەڵکو مەبەستی بووە گرنگیی بدات بەوانەی دیکە کە قسەیان بۆ دەکات.

ئنجا خوا ﷻ کە بە شێوەی نادیار گلەییەکە ئاڕاستەی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات، لوتف و میهرەبانییەکی زۆری تێدایە، هەروەك لە شوێنی دیکەش دا شێوەی ئەوە هاتوە، بۆ وێنە:

**أ-** لە سووڕەتی (**التوبة**)دا دەفەرموێ: ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ﴿٤٣﴾ ﴾، لێرەدا بە شێوەی دواندنی ڕاستەوخۆیە، بەڵام لێبوردنەکە پێش دەخات و دوایی گلەییەکەی لێ

دەكات: خوا لێت ببووڕێ بۆچی مۆڵەتت دان، یانی: بۆچی مۆڵەتی دڵنەخۆشەكانت دا، نەیەن بۆ جەنگی تەبووك، ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾، {دەبووایە مۆڵەتت نەدابان}، تاكو ئەوانەی ڕاستیان كردووەو بەڕاستیی خاوەن بەڵگەو پۆزش بوون، لەگەڵ ئەوانەی درۆزن بوون، لێك جیابووبانەوە، واتە: دەبووایە مۆڵەتت نەدابانایە، نەیەن، تاكو سەرەنجام ئەوانەی ڕاست دەكەن، لەگەڵ ئەوانەی درۆ دەكەن، لێك جیادەبوونەوە.

ب- هەروەها لە سووڕەتی (**الأنفال**)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە، دیلی هەبن، هەتا كوشتاری خەست و خۆڵ نەكات لە بێبڕوایان.

بێگومان بەو واتایەنا كە نابێ بە دیلیان بگرێ و دەبێ بیانكوژێ، بەڵكو بەو واتایەی بە تەماعی قەرەبوو (**فدیة**) لێوەرگرتن، نابێ كۆتایی بە شەڕ بێنێ، كە دوژمنان ببنە دیل و دوایی بە خۆكڕینەوە دەرباز بن و، پارەیان لە بەرانبەردا لێوەربگیرێ، بەڵكو لە جیاتی تەماعی فیدیەو قەرەبوو وەرگرتن، با جەنگەكە بەردەوام بێ، هەتا لە پەل و پۆیان دەخەن، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (**الأنفال**)داو لە تەفسیری سووڕەتی (**محمد**)یشدا كە هەر لەو بارەوە هاتووەو دەفەرمووێ: ﴿ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ﴿٤﴾ ﴾، لەو بارەوە قسەمان كردووە.

بێگومان ئەوەش لوتف و میهرەبانیی بێ سنووری خوایە بۆ پێغەمبەری خۆی، كە بەر لەوەی گلەییەكەی لێ بكات، لێبوردنەكەی باسكردووە، یاخود بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ گلەییەكەی باسكردووە، وەك هەم لە سووڕەتی (**الأنفال**) داو، هەم لەم سووڕەتە موبارەكەش دا هاتووە.

**٣)**- ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّىٰ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانیوە، نیزیك بوو، لەوانە بوو، پاك و چاك ببێ، (ما) لێرەدا پرسیاركردەنیی (**إستفهامیة**)یە، ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ ﴾، واتە: تۆ چووزانی،

چ شتێك وا لە تۆ دەكات بزانی و پەی پێ ببەی، ﴿ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴾، ڕەنگە ئەوەی لێت وەردەگرێ، ببێتە هۆی ئەوەی پێی پاك و چاك بێ، ئەو پەیامەی لە تۆی وەردەگرێ، ئەو ئایەتانەی هاتوە لێتیان وەربگرێ.

٤)- ﴿ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ﴾، یاخود (ئەگەر نەشبووبایە، هۆی ئەوەی پێی پاك و چاك بێ)، هاتبایەوە بیری و پەندی لێ وەرگرتبایەو، پەند وەرگرتن و هاتنەوە بیرەكەی، سوودی پێگەیاندبایە.

وشەی: ﴿ فَتَنفَعَهُ ﴾، بە: (**فَتَنْفَعُهُ**)ش خوێندراوەتەوە.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَوۡ يَذَّكَّرُ ﴾، ئەسـڵی خـۆی (**يَتَذَكَّر**)یـە، بـەڵام (ت)كـە لـە (**ذ**) كـەدا دەغـم كـراوە، (**التَّذَكُّرُ: حُصُـولُ أَثَـرِ التَّذْكـيرِ، وهـو خطـورُ أَمْـرٍ مَعْلُـوم فِي الذِّهْـنِ بَعْـدَ نِسـيانِهِ، وهـو مُشـتقٌّ مِـنَ الذُّكْـرِ**)، (**تَذَكُّـر**): بریتیـە لـە پەیدابوونـی شـوێنەواری بیرخسـتنەوە، ئەویـش بریتیـە لـەوەی شـتێك پێشـتر زانـراوەو دوایـی لـە بیـر چۆتـەوە، بێتـەوە هۆشـی مـرۆڤ، كـە لـە ئەسـڵدا داتـاشراوە لـە (**ذُكْـر**)، یـانی: هاتنـەوە بیـر، بـەڵام (**ذِكـر**)، واتـە: باسـكردن.

٥)- ﴿ أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ﴾، بەڵام كەسێك بێنیاز بووە، بێنیازیی پێشانداوە، (**أما**)، وەك پێشتر گوتوومانە: (**حرف تفصيل**)، پیتێكە بەكاردەهێندرێ بۆ درێژەدان بە قسە، (ٱسۡتَغۡنَىٰ)، یانی: (**مَنْ عَدَّ نَفْسَهُ غَنِيّاً عَنْ هَدِيكَ**)، كەسێك خۆی پێ دەوڵەمەندو بێ نیازە لەو ڕێبازو بەرنامەیەی بە تۆدا نێرراوە.

٦)- ﴿ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴾، تۆ لێی دەچیە پێش و ڕووی تێدەكەی و بایەخی پێ دەدەی، (**التَّصَدِّي: أَنْ يُقَابَلَ الشيء مَقابَلَة الصدّى**)، (**صَدى**)، یانی: دەنگدانەوە، (**تَصَدِّي**)یش، یانی: (**تعرُّض**)، خۆ بردنە پێش و ڕوو كردنە شتێك، وەك چۆن دەنگدانەوەیەك كە بۆت دێتەوە، ڕووت تێ دەكات.

٧)- ﴿ وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴾، تۆ چیت لەسەرە ئەگەر خۆی پاك و چاك نەكرد؟ (ما)، لێرەدا:

أ- یان لابەرە (**نافِیة**)یە، یانی: هیچ شتێك لەسەر تۆ نیە، ئەگەر ئەو خۆی پاك و چاك نەکات، (**أي: عَدَمُ تَزَكِّيهِ لَيْسَ مَحْمُولاً عَلَيْكَ**)، پاك و چاك نەبوونی، خۆ پاك و چاك نەکردنی لەسەر شانی تۆ نیە، تۆ بەرپرسیاریەتییەکەی هەڵناگری.

ب- دەشگونجێ (**ما**) پرسیارکردەنیی (**الإستفهامية**)بێ، یانی: ﴿ وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴾، (**أيُّ شَيءٍ عَلَيْكَ ألاَّ يزَّكَّىٰ؟**)، چ شتێك (چ بەرپرسیارییەتییەك) لەسەر تۆیە، ئەگەر ئەو خۆی پاك و چاك نەکات! هیدایەتی خوا لەبەر دەستیەتی، ئەگەر کەسێك خۆی وەری نەگرێ و هەڵینەگرێ و لە ئەنجامدا بەهۆی ئیمان و تەقواوە، پاك و چاك نەبێ، تۆ چ بەرپرسیارییەتییەکت لەسەر شانە!.

٨)- ﴿ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ ﴾، بەڵام کەسێك کە بە گرنگیی پێدانەوە، یاخود: بە خێرایی ڕۆیشتنەوە دێت بۆ لات.

(**سعي**) بـە مانـای خێـرا ڕۆیشـتنەو، لێـرەدا بەکارهێـنراوە بـۆ سـوور بـوون لەسـەر دیـدار، واتـە: بـە جیددیـی و بـە مشـوورخواردنەوەو ڕوو تێکـردن، بـەڵام کەسـێك کـە بـە جیددیـی بـۆ لای تـۆ دێ و، بـە مشـوور خواردنـەوە دەخەفتـێ لـەوەی بـە دیـداری تـۆ بـگات.

٩)- ﴿ وَهُوَ يَخۡشَىٰ ﴾، لە حاڵێکیشدا دەترسێ، ئەمە سێ ئەگەری هەن:

أ- لە خوا دەترسێ.

ب- لە بێبڕوایەکان دەترسێ ئازاری بدەن، لەبەر ئەوەی نابینایە.

ج- دەترسێ بکەوێ، یان بکەوێتە چاڵێکەوە، چونکە بەر پێی خۆی نابینی، هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست ئەوە بێ: لە خوا دەترسێ، (**خشية**)یش وەك پێشتریش باسمان کردوە، ترسێکە لەگەڵ بە مەزنگرتندا ئاوێتەیە، بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: تەنیا بەندە زانایەکان سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا هەیە.

ئنجا کەسێك کە ئاوایە:

**١٠)-** ﴿فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ﴾، تۆ لێی بێ ئاگا دەبی و بە جگە لەوەوە دەخافڵێی، (**طبري**)، ئاوای لێکداوەتەوە: (**فَأَنْتَ عَنْهُ تُعْرِضُ وَتَشَاغَلُ عَنْهُ بِغَيْرِهِ وَتَغَافَلُ**)، ڕووی لێ وەردەگێڕێ و خۆت بە جگە لە ئەوەوە دەخافڵێنی و لەو بێئاگا دەبی.

**١١)-** ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ﴾، نەخێر (وامەکە) ئەوە بیرخەرەوەو ئامۆژگارییە، (**كَلَّا**): وشەیەکە بۆ تێوەخوڕین و گلەیی کردن و هەڵوەشاندنەوە، هەڵوەشاندنەوەی شتێك کە پێشتر باسکراوە، ئەگەر قسەیە، ئەگەر ڕەفتارە، ئەگەر هەڵوێستە، هەرچی هەیە، (**طبري**) ئاوای لێکداوەتەوە: (**ما الأَمْر كما تفعل يا محمَّد! من أن تعبس في وجه من جاءك يسعى، وهو يخشى، وتتصدّى لمن استغنى**) کار وانیە کە دەیکەی ئەی موحەممەد! کەسێك کە بە گرنگیی پێدانەوە دێ بۆ لات و دەشترسێ، ڕووی خۆتی لێ گرژبکەی، بەڵام کەسێك کە خۆی بێنیاز پێشانداوە، ڕووی تێبکەی و گرنگیی پێبدەی! (ئەوە ڕاست نیەو لەو ئیجتیهادەتدا نەتپێکاوە).

﴿إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ﴾، بە دڵنیایی ئەم قورئانە، یاخود: ئەم ئایەتە موبارەکانە بیرخەرەوەن، پەندو ئامۆژگارییـن، (**الطبري**)، دەڵێ: (**إِنَّ هَـذِهِ العِظَـة وَهَـذِهِ السُّورة تذكرة: يقول: عِظة وعبرة «فَمَنْ شَاءَ ذَكَرَهُ» يقول: فَمَنْ شاء من عباد الله ذكره**)، دەڵێ: ﴿إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ﴾، واتە: ئەم ئامۆژگارییەو ئەم سوورەتە پەندو ئامۆژگارییە، هەر کەس بیەوێ لە بەندەکانی خوا یادی دەکات.

**١٢)-** ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾، هەر کەسێك (لە بەندەکانی خوا) بیەوێ باسی دەکات، (**ذكر**)، باسی دەکات، یاخود: یادی دەکات، (**الطبري**)، دەڵێ: (**ذَكَرَ تَنْزِيلَ اللهِ وَوَحِيَهُ والهاء في قوله: «إنَّها» للسورة، وفي قوله: «ذَكَرَهُ» للتنزيل والوحي**)، واتە: دابەزێنراوی خواو سرووشی خوا یاد دەکات، ڕاناوی (**هـ**) لە: ﴿إِنَّهَا﴾دا، بۆ سوورەتەکە دەگەڕێتەوە، بەڵام ڕاناوی (هـ)، لە: (**ذكره**)دا، کە بۆ نێر (**مذكَّر**)ە، بۆ (**تنزيل**) و (**وحي**)، دەچێتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿إِنَّهَا﴾، بۆ ئایەتەکان دەچێتەوەو، (**ذكره**)، بۆ خوای بەرز دەچێتەوە، واتە:

هەر کەسێك بیەوێ یادی خوا دەکات، بەڵام ئەوەی (**طبري**) گوتوویەتی: لەگەڵ ڕەوتی ئایەتەکاندا، گونجاوترە.

**١٣**- ﴿ فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴾، لە پەڕە ڕێز لێگیراوەکاندایە، (**الطبري**) دەڵێ: (صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ) مەبەست پێی تەختەی پارێزراو (**لوح محفوظ**)ە، (**صحف**)، کۆی (**صحيفة**)یە، بەڵام مەبەست پێی ئەو تەختە پارێزراوەیە کە زانیاریی خوای هەموو تێدا تۆمار کراوە، لە بارەی دروستکراوەکانیەوە.

**١٤**- ﴿ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ ﴾، بەرزکراوەو بە پاکگیراون، ئەو پەڕە ڕێز لێگیراوانە، پێگەو پایەیان بەرزە، پاکیشن لەوەی دەستی شەیتانەکانیان بگاتێ.

هەڵبەتە جۆرە تەفسیری دیکەشیان بۆ کردوون، بە تایبەت بۆ ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿ فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴾، لەپەڕە ڕێز لێگیراوەکاندایە، یان: لەپەڕە پەسندو چاکەکاندایە.

ئەم دوو ئایەتە: ﴿ فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ، مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ ﴾، سێ مانای سەرەکییان هەن:

**١**- قورئان لە تەختی پارێزراودا بووە بەرلەدابەزێنرانی.

**٢**- قورئان بەر لە نووسرانەوەی لەلایەن هاوەڵانەوە، بە تۆمارکراویی لەلایەن فریشتەکانەوە هەبووە، هێندە بە وردیی و ڕێکیی وەك نووسرا بێتەوە، یان هەر نووسراویشەتەوە لەلایەن فریشتانەوە.

**٣**- مەبەست پێیان نووسرانەوەو تۆمارکرانی قورئانە لەلایەن هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ.

﴿ مُّكَرَّمَةٍ ﴾، زۆر ڕێز لێگیراون، زۆر پەسند کراون، ﴿ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ ﴾، بەرزکراوەن، ئەو پەڕانە زۆر بەرز کراوەن، واتە: لە ڕووی مەعنەوییی، یاخود: لە ڕووی ماددییەوە شوێنەکەیان زۆر بەرزە، یاخود: لە ڕووی مەعنەوییەوە پلەو پایەیان زۆر بەرزە، ﴿ مُّطَهَّرَةٍ ﴾: پاککراون، کە مەبەست پێی پاککرانەوەی

مەعنەوییــە، یــانی: هەڵــەو پەڵەیــان تێدانیــە، یاخــود: پاکــن لــەوەی شــەیتانەکان دەســتیان بیانگاتــێ.

**١٥)-** ﴿بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ﴾، بە دەستەکانی نوێنەرانێکەوەن، ﴿سَفَرَةٖ﴾، کۆی **(سافر)**ە، وەك **(كَتَبَة)**، کۆی **(كاتب)**ە، واتە: نووسەر، (سافر)یش بە مانای نوێنەر دێ، نوێنەرانی خوا ﷻ.

**١٦)-** ﴿كِرَامِۭ بَرَرَةٖ﴾، بەڕێزن چاکەکارن، ﴿كِرَامِۭ﴾، کۆی **(كريم)**ە، واتە: هەرە چاك لە جۆری خۆی، هەر شتێك لە جۆری خۆیدا زۆر چاك و پەسند بێ، پێی دەگوترێ: **(كريم)**، ﴿بَرَرَةٖ﴾، کۆی **(برّ)**ە، یانی: هەرە باش، هەروەك چۆن **(أبرار)**، کۆی **(بارّ)**ە، یانی: چاکەکار، **(برّ)**و **(بارّ)**، هەردووکیان بە مانای چاکەکارن، بەڵام مانای **(بَرّ)** بەهێزترە، چونکە **(بر)**، چاوگە، واتە: خودی چاکەکاریی، وەك: **(عدل)** و **(عادل)**، **(عادل)**، یانی: دادگەرو **(عدل)** یش بە مانای دادگەر بەکاردێ، بەڵام **(عَدْل)** یانی: خودی دادگەریی، ئەگەر بڵێین: **(فلان عدلٌ)**، واتە: دادگەرە، بەڵام بەو واتایەی دادگەریی لەودا بەرجەستە بوو، هەروەك **(فلان بَرٌّ)**، واتە: چاکەکاریی لەویدا بەرجەستە بووە.

هەندێکیشــیان گوتوویانــە: ﴿بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ ١٥ كِرَامِۭ بَرَرَةٖ﴾، بــە دەســتەکانی نوێنەرانێکــەوەن، بەڕێــزی چاکــەکارن، مەبەســت پێــی قورئانخوێنەکانــن، بــەڵام بێگومــان ڕەوتــی ئایەتــەکان، هــەر ئــەوە دەگەیەنــێ کــە مەبەســت پێــی فریشــتەکانە، خــوا ﷻ وەك پێشــتریش گوتمــان لــەم ئایەتانــەدا دەیــەوێ، بــە پێغەمبــەری خاتــەم ﷺ و بــە بــڕواداران بــە گشــتیی، هەروەهــا بــە بێبڕوایــان و نەیارانــی پێغەمبــەری خــواش ﷺ، بفەرمــوێ: ئــەو قورئانــەی ئێــوە لــە بەرانبەریــدا بــێ منەتیــی و بــێ باکیــی پێشــان دەدەن، بێنیازیــی پێشــان دەدەن، ئــەوە پێگەکەیەتــی و، خــوای پــەروەردگار ئەوەنــدە بــە گرنگیــی و بایــەخ پێدانــەوەو، ئەوەنــدە بــە ڕێــزو حورمــەت و بــە قــەدرو گرانییــەوە ئــەو قورئانــەی دابەزانــدوەو، بــە دەســت فریشــتەکانەوەیەو ئــەوە پێگــەو پایەیەتــی و، ئــەوە ســەرچاوەی لێــوە هاتنیەتــی، کەواتــە: شــتێکی هەڵــە دەکــەن کــە

گرنگیـی و بایـەخ بـە قوڕئـان نـادەن و، لـە بەرانبەریـدا بێنیازیـی پێشـان دەدەن.

بـە کورتیـی: ئایینـی خـوا منەتـی کـەس هەڵناگـرێ، چونکـە بەرنامـەی خـوای بـەرز بێنیـازەو، دەبـێ خەڵـك بـەرەو لای بچـێ و منەتـی هەڵبگـرێ، نـەك خەڵـك بـە منەتـەوە گـوێ بـۆ فەرمایشـتی خـوا بگـرێ و، پەیامـی خـوا وەربگـرێ.

## قوڵە باسێک دەربارەی

## حەوت حیکمەت لەو گلەییەی خوادا کە لە پێغەمبەر ﷺی کردوە

هەرچەنـدە پێشـتریش قسـەمان لـەو بـارەوە کـرد، کـە لـە ڕاسـتییدا ئـەو گلەییـەی خـوا ﷻ لـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لەسـەر گوناهێـك نەبـووە، پێغەمبـەری خـوا کردبێتـی، بەڵکـو لەسـەر ئیجتیهـادو بۆچوونێکـی هەڵـەی بـووەو، دوایـی خـوا ﷻ بـۆی ڕاسـتکردۆتەوە، بۆیـەش ئـەوە لەگـەڵ پارێـزراو بوونـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ و پێغەمبەرانـی دیکـەدا لـە گونـاح، تێکناگیـرێ، پێغەمبـەران لـە گوناهـو تـاوان پارێـزراو بـوون، بـەڵام لـە هەڵـەی ئیجتیهادیـی و بۆچوونێکیـان هەبـێ، نەیپێکـن، پارێـزراو نەبـوون، ئنجـا ئێـرەش تاکـە شـوێنێك نیـە کـە خـوا ﷻ نەرمـە گلەییـەك لـە پێغەمبەری خـۆی دەکات ﷺ، بەڵکـو وەك پێشـتریش گوتمـان: لـە هـەر کام لـە سـوورەتی **(التوبـة)** دا، لـە دوو شـوێن: ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ﴿٤٣﴾ ﴾، هەروەهـا: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ ﴿٨٤﴾ ﴾، لـە سـوورەتی **(الأنفال)**یـش دا: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴿٦٧﴾ ﴾، بە لای کەمەوە لـەو سـێ شـوێنەدا ئاشـکرایە خـوا ﷻ، پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ هەڵەیەکـی ئیجتیهادیی کـە بوویەتـی، بـۆی ڕاسـتکردۆتەوە، بـەڵام بـا تەماشـای ئـەو حـەوت حیکمەتـەی ئـەو گلەییـەی خـوا لـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ کردوویەتـی، بکەیـن:

١- حیکمەتی یەکەم ئەوەیە کە خوا ﷻ ئەم ئایینە پاك و بێ خەوشەی بە پێغەمبەری خاتەم دا ناردوویەتی، لەبەر ئەوەی دوا نوسخەی ڕێنمایی و بەرنامەی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی، بۆیە ڕێی نەداوە هێندەی نووکی دەرزیی، هەڵەو کەم و کووڕیی تێدابێ، تەنانەت هەڵەیەکی ئیجتیهادییش کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی، خوا بەسەریدا بازنەداوەو بۆی ڕاستکردۆتەوە، وەك ئێرە، ئنجا ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی تێیدا نەیپێکاوەو هەڵە بووە، بۆیەش قسەی هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قوڕئانم بە دڵ

نیە، کە گوتوویانە: ئەوە هیچ هەڵەو کەم و کووڕییەکی تێدانیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ خەریکی کارێکی گەورەترو گرنگتر بووە، بەڵام ئەو بابا کوێرە هاتوە، کە بیخافڵێنێ لەو کارە گەورەو گرنگەی! ئەو ڕایەم بە دڵم نیە، چونکە ئەگەر هەڵە نەبووایە خوای کاربەجێ گلەیی لە پێغەمبەرەکەی ﷺ نەدەکرد، ئنجا پێویست ناکات بۆ لابردنی گلەیی لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئایەتەکان لە نێوەڕۆکی خۆیان خاڵیی بکەینەوە و، وای پێشان بدەین کە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی، شتێکی زۆر ڕاست و چاك بووەو بابا کوێرەکە (إبن أم مكتوم) هەڵەی کردوە! چونکە ئەگەر وابووایە خوای پەروەردگار بەسەر کەسدا بازنادات و خاتری کەس ناگرێ و، دەیفەرموو: هەڵوێستی بابا کوێرەکە هەڵە بووە، بەڵام کە دەفەرموێ: نەدەبوو ڕووت گرژ کردباو خۆت لێوەرچەرخاندبایە، چونکە بەهۆی ئەوەوە چاك و پاك دەبوو، یاخود پەندی وەردەگرت، کەواتە: هەڵوێستی بابای کوێر لە شوێنی خۆیدا بووەو، پێکاویەتی، بەڵام ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچەندە پێغەمبەری خاتەم و سەروەری پێغەمبەرانەو، باشترین ئینسانەو، چاکترین بەندەی خوایە، بەڵام لەو ئیجتیهادەیدا نەیپێکاوە، ئەمەش شتێکی زۆر گەورەو گرنگە، کە خوا ﷻ ڕێی نەداوە هێندەی نووکی دەرزیی هەڵەو کەم و کووڕیی بچێتە نێو ئیسلامەوە.

٢- حیکمەتی دووەم بریتیە لە دەرخستنی یەکێك لە بەها بەرزەکانی بەرنامەی خوا، کە لایەنگری خەڵکی سادەو هەژارو کەم ئەندامە، ئەمە شتێکی زۆر گەورەیە: خوا لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە، گلەیی بکات لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە سەروەری پێغەمبەرانەو، کۆتایی پێغەمبەرانەو باشترین ئینسانەو چاکترین بەندەی خوایە، گلەیی لێ بکات لەسەر ئەوەی ڕووی گرژ کردوە، لە بابایەکی کوێر، کە بابای کوێر، ڕوو گرژییەکەی پێغەمبەری ﷺ نەبینیوەو ڕووی لێ وەرگێڕانەکەشی نەبینیوە، بەڵام خوا بینیویەتی، ئەگەرنا کافرەکانیش نەیانگێڕاوەتەوە بۆ خەڵك کە موحەممەد ﷺ لەبەر خاتری ئێمە ڕووی گرژ کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم، بەڵام خوا لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە بینیویەتی و بەرگریی کردوە لە بابایەکی کوێری کەم ئەندام و، گلەیی کردوە لە باشترین بەندەی خۆی و سەروەری پێغەمبەران ﷺ.

کەواتە: ئەم ئایینەی خوای دادگەر زۆر لایەنگیریی خەڵکی هەژارو نەدارو کەم ئەندام و سادەو مافخوراو دەکات.

٣- حیکمەتی سێیەم ئەوەیە کە پابەندیی بە مەبدەئەوە، لە بەرهەمی سیاسیی گرنگترو لە پێشترە، مەبدەئەکەش - لێرەدا - ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی خۆشیی و گرنگیی و بایەخی تەواو بدات بە کەسێك کە بڕوای هێناوە، بەرهەمە سیاسییەکەش ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ تەماعی بووە، ئەوانە گوێی بۆ بگرن و پەیامی خوای لێ وەربگرن، ئەوە وەدەستهێنانێکی سیاسیی بوو، بەڵام خوا ﷻ پابەندیی بە مەبدەئەکانەوە، بە ئەدەب و ڕەوشتێکی ئیسلامییەوە، کە بریتیە لە ڕوو خۆشیی و قسەخۆشیی و گرنگیی پێدان و بایەخدان بە بابایەکی کوێر، ئەوەی پێ گەورەتر بووە، لەوەی داخۆ یەکێك لە زلەزلانی قوڕەیش مسوڵمان دەبێ یان مسوڵمان نابێ؟ چونکە دوایی دەفەرموێ: چی لەسەر تۆیە؟ یان: هیچ بەرپرسیارییەتییەك لەسەر تۆ نیە: ﴿وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ﴾، ئەگەر ئەو بێبڕوایە خۆی پاك و چاك نەکات.

٤- حیکمەتی چوارەم، ئەوەیە کە بانگەواز بۆ لای خوا، نابێ لەسەر حیسابی جەوهەرو نێوەڕۆکی ئایینەکەی بێ، ئەوە دەرسێکی زۆر گەورەی تێدایە، بەڵێ، دەبێ ئێمە خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکەین و، هەوڵبدەین خەڵك بێنینە نێو باوەشی ئیسلام، بەڵام نابێ ئەوە لەسەر حیسابی جەوهەرو نێوەڕۆکی ئایین بێ و، وامان لێبکات تەنازول بکەین و دەستبەرداری جەهەورو نێوەڕۆکی ئایینەکەمان بین، یان دەستبەرداری بەشێك لە ئایینەکەمان بین، بۆ ئەوەی خەڵکی پێ ڕازیی بکەین!

٥- حیکمەتی پێنجەم کە لەو ڕووداوە وەردەگیرێ، بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر نێردراوبوونی موحەممەد ﷺو، هیچ بە دەست نەبوونی لە بەرانبەر خواو وەحیی خوادا، بەڵێ حیکمەتێکی دیکە کە لەو بەسەرهاتە وەردەگیرێ، ئەوەیە کە وەك یەکێك لە هاوەڵان گوتوویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا شتێکی شاردبایەوە، ئەوە ئایەتەی دەشاردەوە، کە خوا ﷻ ئاوا گلەیی لێ دەکات، گلەیی ناڕاستەوخۆ، کە دەفەرموێ:

ڕووی خۆی گرژ کرد و خۆی وەرچەرخاند، لەبەر ئەوەی بابا کوێرەکە هات بۆ لای، لە کۆتاییەکەش دا پێی دەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾، نەخێر، جارێکی دیکە شتی وا نەکەی!.

بێگومان ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە، لەسەر ئەوەی موحەممەد ﷺ نێردراوی خوایەو، هیچی بەدەست نەبووە لە بەرانبەر خواو وەحیی و پەیامی خوادا، جگە لە گەیاندنی، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ ٤٨﴾، تۆ تەنیا گەیاندن و پێڕاگەیاندنی پەیامی خوات لەسەرە.

٦- حیکمەتی شەشەم بریتیە لە: ڕاهێنانی مسوڵمانان بە تایبەت بەرپرسان، کە هیچ کەس لەسەرووی ڕەخنە لێگیران و هەڵە بۆ ڕاست کردنەوەوە نیە، چونکە ئەگەر خوا ﷻ هەڵە بۆ پێغەمەری خاتەم ﷺ ڕاست بکاتەوە، کە هەڵەکەشی ئەوە نەبوو، گوناهو تاوانێك بووبێ، بەڵکو هەڵەیەکی ئیجتیهادیی بووەو، پێی وابووە لەو کاتەدا کە تەرخانی کردوە بۆ قسەکردن لەگەڵ ئەو زلە زلەو قسە ڕۆیشتووانەی قورەیش دا، وا باشە قسەکانی نەبڕێ بۆ وەڵامدانەوەی بابایەکی مسوڵمان، چونکە ئەگەر یەکێك لەوانە مسوڵمان بێ، خەڵکێکی زۆری دیکەی ڕەش و ڕووت و مسوڵمان دەبێ، یان هەر بەلای کەمەوە خەڵکە ڕەش و ڕووتەکە، ئەو زەخت و زۆرەی ئەو زلە زلانەی بەسەرەوە نامێنێ، بەڵام خوا ﷻ ئەوەی پێی ڕاست نەبووەو، ئەو ئیجتیهادو بۆ چوونەی پێغەمبەری ﷺ پێ هەڵە بووەو بۆی ڕاستکردۆتەوە، ئنجا ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا هەڵەی بۆ ڕاست کردبێتەوە، مانای وایە هیچ کەس لەسەرووی هەڵە بۆ ڕاست کردنەوەو ڕەخنە لێگیرانەوە نیە، هەرچەندە بەرپرس بێ و هەر کەسێك بێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە: لە ئیسلامدا مرۆڤ تاکو بەرپرسیارێتیی زیاتر بێ، دەبێ گوێڕایەڵیی بۆ شەریعەت باشتر بێ، نەك لەبەر ئەوەی بەرپرسە، حوکمڕانە، دەسترۆیشتوویە، خەڵك زۆر بە قسەی دەکات، بگوترێ: بووراوە، یان مافی ڤیتۆی هەیە لە بەرامبەر شەریعەتدا! بە پێچەوانەوە: مسوڵمانان کێیان لە هەمووان بەرپرسترە، دەبێ لە هەمووان ملکەچتر بێ بۆ خوا ﷻ و ئایینەکەی!

٧- حیکمەتی حەوتەم و کۆتایی: حاڵیکردنی خەڵکی خۆ بەزلگر، کە ئایینی خوا لەبەر سامان و دەسەڵاتیان، خاتریان ناگرێ و نەرم کێشییان بۆ ناکات، ئەوەش دەرس و حیکمەتێکی

زۆر گەورە بوو کە هەر لە سەرەتاوە، خوا زلەزلەکان و حوکمڕان و دەسەڵاتداران و ساماندارانی حاڵییکردن، کە: بە تەما مەبن بەرنامەی خوا نەرم کێشییتان بۆ بکات و لەبەر دەسەڵاتتان، لەبەر سەروەت و سامانی حەڕامتان، لەبەر دەسەڵاتی خۆ سەپێنانەتان خاترتان بگرێ، ئەو خەیاڵە مەکەن، ئایینی خوای دادگەر نەرمکێشیی بۆ کەس ناکات و، خاتری هیچ کەس ناگرێ لەبەر سامان و دەسەڵاتەکەی.

لە کۆتایی ئەم دەرسەشماندا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، کە دەفەرموێ: {**المَاهِرُ بالقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الكِرَامِ البَرَرَة، وَالَّذِي يَقرَأُ القُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيهِ شَاقٌ، لَهُ أَجْرَانِ**} (**أخرجه مُسْلِمٌ: ١٨٥٩، وَابْنُ مَاجَهْ: ٣٧٧٩، وَابْنُ حِبَّانَ: ٧٦٧، والتِّرمِذِي: ٢٩٠٤، عَنْ عَائِشَة رَضِيَ اللهُ عَنْهَا**).

واتە: کەسێك کە شارەزاو کارامەیە لە قورئاندا (لە خوێندنی داو لە تێگەیشتنیدا)، لەگەڵ ئەو فریشتانەیە کە نوێنەرە چاکەکارە بەڕێزەکانی خوان (خوا دەیاننێرێ کە وەحییان پێدا بنێرێ)، کەسێکیش دەیخوێنێ، بەڵام لەسەر زمانی ڕاست نایەت و لەسەری قورسە (کە چاك نایزانێ)، دوو پاداشتی هەن (پاداشتی خوێندنی و پاداشتی ئەوەش کە لەسەر دڵی قورسەو هەرچەندە هەوڵ دەدا فێری نابێ، کەواتە با ئەویش هەر خەریك بێ).

کەواتە: ئەم فەرمایشتە بۆمان دەردەخات کە مەبەست لە: (**السفرة الكرام البررة**) فریشتەکانن و، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ تیشکی زیاتر دەخاتە سەر چەمك و واتای ئەو وشەیە.

**مەسەلەی دووەم:**

**هەڕەشەکردنی خوا ﷻ لە مرۆڤی بێبڕواو سپڵەو، سەرنج ڕاکێشانی بۆ چۆنیەتیی دروستکرانی لە نوتفەیەکی ئەندازەگیریی کراوی ڕێ بۆ ئاسان کراو، پاشان مرێندراوو شوێنی گۆڕ بۆ داندراو، دوایی لە کاتی ویستراودا زیندوو کراوەو، هەرچی زیاتر جێبەجێ نەکەری ئەرك و فەرمانێك کە خوا خستوویەتە سەرشانی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ﴾، مرۆڤ بە کوشتبچێ، چەند بێبڕوایە! یاخود: چەند سپڵەیە! واتایەکی دیکەی: مرۆڤ بە کوشتبچێ چ شتێك بێبڕوای کردوە؟ یان: چ شتێك وای لێ کردوە سپڵەو ناسوپاس بێ (بەرانبەر بە خوا)؟، ئایا لێرەدا مەبەست لە ئینسان کە (أل) ناساندنی لەسەرە، جینسی ئینسانەو تێکڕای مرۆڤەکان، یاخود مەبەست لەو (أل) ی ناساندنە، (أل)ی (عهد)ە، واتە: مرۆڤەکەو مەبەستی مرۆڤی بێبڕوایە؟! **(الطبري)** لە **(مجاهد)**ەوە بە ژمارە: (٣٦٤٤٥)، هێناویەتی، دەڵێ: (**مَا كَانَ فِي القُرْآنِ** (قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ) **أو فُعِلَ بالإنسانِ، فإنَّما عُنِي بِهِ الكَافِرُ**)، هەرچی لە قورئاندا وشەی: ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ﴾ هەیە، (ئینسان بە کوشتبچێ) یاخود: (**فُعِلَ بالإنْسَان**)، ئینسان وای لێ بێ، (یانی: خراپی بەسەر بێ)، مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوایە.

کە دەفەرمووێ: ﴿مَآ أَكْفَرَهُۥ﴾، وەك پێشتریش گوتمان، ئەمە زانایان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە، بۆ وێنە: **(الطبري)** دەڵێ: (**وَفِي قوله ما (أكفره) وجهان: أحدهما: التَّعَجُّب من كفره مع إحسان الله إليه وأياديه عنده، والآخر: ما الذي أكفره، أيُّ**

**شيءٍ أكفـره؟!**)، واتـە: کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾، دوو واتـای هـەن، یەکەمیـان: سەرسـوڕمانە لـە بێبڕواییەکـەی لەگـەڵ چاکـەی خـوا لەگەڵیـداو، نیعمەتەکانـی خـوا لـەلای وی، واتـای دووەمـی: چ شـتێك وای لێکـردوە بێبـڕوا بـێ؟.

کەواتـە: ﴿مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾، یـان یـەك وشـەیەو هەمـووی بەسـەر یەکەوەیـە، وەك (مـا **أَجْمَلَـهُ**)، (مـا **أَشْـجَعَهُ**)، (مـا **أكرمَـهُ**)، ئەوانـە هەموویـان ڕێژگـەی سەرسـوڕمانن، واتـە: چەنـد بێبڕوایـە! یاخـود: چەنـد سپڵەیە! ئەگـەر بڵێـی: (مـا **أكرمـه**)، یـانی: چەنـد بەخشـندەیە! ئەگـەر بڵێـی: (مـا **أجملـه**)، چەنـد جوانـە!

واتـای دووەمـی: ئەوەیـە کـە: ﴿مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾، هەمـووی پێکـەوە یـەك وشـە نەبـێ، بەڵکـو (مـا)، (**إستفهامية**)بێ و بـۆ پرسیارکردن بـێ، یانـی: (**أيُّ شيءٍ أكفـره**)، چ شـتێك وای لێکـردوە بێبـڕوا بـێ؟!

شـایانی باسـە: زۆربـەی تەفسـیرەکان گوتوویانـە: لێـرەدا (**کفـر**) بـە مانـای بێبڕواییـە، بـەڵام پێـم وایـە، وێـڕای بێبڕوایـی، سـپڵەیی و ناسپاسـییش دەگەیەنـێ، واتـە: دەگونجـێ وشـەی (کفـر) لێـرەدا مەبەسـت پێـی دژو پێچەوانـەی ئیـمان بـێ، چ شـتێك بێبـڕوای کـردوە! یـان چەنـد بێبڕوایـە! دەشـگونجێ مەبەسـت لـە (**کفـر**)، (**کفران**)بـێ، کـە پێچەوانـەی دژی سوپاسـگوزاریی و پێزانیـن و ئەمەگـە، واتـە: چەنـد سـپڵەیە! یاخـود: چ شـتێك وای لێکـردوە سـپڵەو ناسـپاس بـێ؟.

**٢)-** ﴿مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ﴾، لە چ شتێك دروستیکردوە! هەڵبەتە ڕاناوەکە بۆ خوای بەدیهێنەر دەچێتەوە، هەرچەندە باس نەکراوە، بەڵام هەر دیارە کە خوای بەدیهێنەری دروستیکردوە.

(**الطبري**)، بەمجۆرە مانای لێکداوەتەوە، دەڵێ:

(**مِـنْ أي شَيء خَلَـقَ الإنسـان الكَافِـرَ، رَبُّـهُ، حَتَّـى يَتَكَـبَّرَ وَيَتَعَظَّـمَ عَـنْ طَاعَـةِ رَبِّـهِ، والإِقْـرَار بتَوحِيـدِهِ؟**)، واتـە: مرۆڤـی بێبـڕوا پـەروەردگاری لـە چـی هێناویەتـە دی، تاکـو

خۆی بە زلبگرێ و لە بەرانبەر فەرمانی خوادا، خۆی بە مەزن بگرێ و، لە بەرانبەر دانهێنان بە یەکتایی خوادا، خۆی بە زل و گەورە بگرێ؟.

ئنجا خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە لە چی دروستی کردوە:

**٣)- ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ﴾**، لە نوتفەیەك هێناویەتە دی و ئەندازەگیریی کردوە.

**(نطفة)**، وەك زۆرجاران گوتوومانە، بە کوردیی: تۆویلکە، لە ئەسڵدا **(نُطْفَة)**، بە ئاوی کەم دەگوترێ، دوایی خوازراوەتەوە بۆ ئەو ئاوە کەمەی مرۆڤی لێ دروست دەبێ، کە ئێستا زانست دەریخستوە، مرۆڤ لە هەموو ئاوەکە دروست نابێ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریش دا ﷺ هاتوە: **{مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ}** **(أخرجه مسلم: ١٤٣٨، وأبو يعلى: ١١٥٣، وأحمد: ١١٩٠٢، وأبو عوانة: ٤٣٤٩)**.

واتە: منداڵ لە کۆی ئاوەکە (تۆوی پیاوو ژن) پەیدانابێ و، هەر کاتیش خوا دروستکردنی شتێکی ویست، هیچ شتێك ڕێی لێناگرێ.

بەڵکو ئێستا دەرکەوتوە، کە یەك سانتیمەتر سێجا (١سم³)ی تۆوی پیاوا پێنجسەد (٥٠٠) ملیۆن (٥٠٠،٠٠٠،٠٠٠) زیندەوەری گچکەی تێدایە، بە ناوی زیندەوەری تۆویی: **(الحيوان المنوي)**، کە بە کۆ دەگۆترێ: **(حيامن)** و بە یەکێکیان دەگوترێ: **(حيمن)**، کورتکراوەی: **(الحيوان المنوي)**، ئنجا یەکێك لەو زیندەوەرە گچکانە، کە لە ئاوی پیاودا هەیە، لەو (٥٠٠) ملیۆنە، لەگەڵ زیندەوەرێکی گچکەی نێو ئاوی ئافرەت دا کە پێی دەگۆترێ: هێلکۆڵە **(بويضة)**، یان هێلکۆکە، یەك دەگرن، کە ئەویش زیندەوەرێکەو ژیانی هەیەو، ژیانداری تۆوییش ژیانی هەیەو هەردووکیان ژیاندارن، یەکدەگرن و زیندەوەرێکی دیکە پێکدێنن پێی دەگوترێ: **(نطفة)**، ئنجا ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ، ئەوە ببێتە مرۆڤ، ئەو دوو زیندەوەرەی یەکیان گرتوەو **(نطفة)**یان پێکهێناوە، دەچێتە نێو منداڵدانی ئافرەتەوەو، خۆی بە دیواری ئەو منداڵدانە هەڵدەواسێ و، لەوێدا گەشە دەکات

و، لـە تۆویلکـە (**نطفـة**)وە، دەبێتـە خوێنپـارە (**علقـة**) و ئەویـش دەبێتـە زارجـوو (**مضغـة**)، هەروەهـا پـێ بـە پـێ، هەتـا دەبێتـە کۆرپەلـەو لـە دایـك دەبـێ، کەواتـە: خـوا لـە تۆویلکـە (**نطفة**)یـەك ئـەوی هێناوەتـە دی، ﴿ فَقَدَّرَهُۥ ﴾، ئنجا ئەندازەگیریـی کـردوە، ئـەو ئەندازەگیریـی کردنـە دوو واتـای سـەرەکیی هـەن:

**یەکەم:** هەموو شتێکی بۆ ئەندازەگیریی کردوە.

**دووەم:** قۆناغەکانی بۆ ئەندازەگیریی کردوون، وەك لە سووڕەتی (**المؤمنون**) لە ئایەتەکانی: (١٢ - ١٤)دا، خوا ﷻ باسی حەوت (٧) قۆناغەکەی دروستبوونی مرۆڤ دەکات، کە ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (**المؤمنون**)دا کورتە باسێکمان لەوبارەوە هێناوە، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾.

**قۆناغـی یەکـەم:** واتـە: ئێمـە مرۆڤـمان لـە پوختـەو خوڵاصەیـەك لـە قـوڕ دروسـتکردوە، ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾، ﴿ سُلَٰلَةٍ ﴾، پوختەیـەك، وەرگیراوێـك، ﴿ سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە مـرۆڤ خـواردن دەخـوات و خواردنەکـە دوای هەرسـکران دەبێتـە خوێـن، دوای ئـەوە چ ئـاوی پیـاو، چ ئـاوی ئافـرەت، لـەو خوێنـەی خواردنـی هەزمکـراوە، دروسـت دەبـێ، کەواتـە: خوڵاصـەو گوشراوێکـی قـوڕەو لـە خاکـەوە هاتـوە.

**قۆناغـی دووەم:** ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾، دوایی کردمان بە تۆویلەکەیەك لە نشینگەیەکی مەحکەمدا، کە منداڵدانـی دایکە.

**قۆناغـی سـێیەم:** ﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴾، دوایـی تۆویلکـە (**نطفة**)کەمـان کـردە خوێنپـارە (**علقـة**)، زیندەوەرێکـی گچکـەی وەك زەروو، خـۆی بـە منداڵدانـی دایـك هەڵدەواسـێ.

**قۆناغی چوارەم:** ﴿ فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴾، دوایی خوێنپارە (**علقة**)کەمان گۆڕی بۆ زارجوو (**مضغة**)یەك، پارچە گۆشتێك بە ئەندازەی ئەوەی بە زار بجووڕێ.

**قۆناغی پێنجەم:** ﴿ فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا ﴾، دوایی ئەو پارچە گۆشتە (**مضغة**)مان گۆڕی بۆ ئێسقانەكان.

**قۆناغی شەشەم:** ﴿ فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ﴾، ئنجا ئەو گۆشتەشمان بە ماسوولكەو گۆشت داپۆشی.

**قۆناغی حەوتەم:** ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ ﴾، دواییش كردمانە دروستكراوێكی دیكە، كە بە پێی بۆچوونی زۆربەی زانایان و بە پێی سیاقی ئایەتەكەش وا دەگەیەنێ، مەبەست پێی ڕووح بە بەركردنیەتی، تاكو ئێستا هەر ژیاندار بوو، ئنجا بوو بە ژیاندارێكی ڕووحدار، ڕووح لە بەر.

واتایەكەی دیكەشی: خوا هەموو شتێكی بۆ ئەندازەگیریی كردوە، وەك دوایی كورتە باسێك لەو بارەوە دەكەین، بەڵام با جارێ تەفسیری ئایەتەكان تەواو بكەین.

٤)- ﴿ ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ ﴾، دوایی ڕێی بۆ ئاسان كرد، ئەم ڕێ بۆ ئاسان كردنە، زۆرێك لە زانایان بە مانای لە دایك بوونیان لێكداوەتەوە، واتە: خوا ڕێی هاتنە دەری بۆ ئاسان كرد، دوای ئەوەی هەموو شتێكی بۆ ئەندازەگیریی كرد، ئنجا ڕێی هاتنە دەری لە منداڵدانی دایكی بۆ ئاسان كرد.

٥)- ﴿ ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ ﴾، دوایی مراندی و كردی بە خاوەن گۆڕ، (**فأقبره: جَعَلَهُ ذَا قَبْرٍ**)، وایكرد گۆڕی هەبێ، چونكە (**قَبَرَهُ**)، واتە: ناشتی، بەڵام (**أَقْبَرَهُ**)، واتە: وایكرد گۆڕی هەبێ، (**قَبَرَ المَيِّتَ: دَفَنَهُ وجَعَلَهُ فِي قَبْرٍ**)، (**قَبَرَهُ**) ناشتی و خستیە گۆڕەوە، بەڵام (**أَقْبَرَ الميّت: جَعَلَهُ ذاقَبْرٍ، أَو جَعَلَ لَهُ مَكَاناً يُقْبَرُ فِيهِ**)، (**أَقْبَرَ الميّت**)، واتە: كردیە خاوەنگۆڕ، یاخود وای لێ كرد شوێنێكی هەبێ تێیدا بنێژرێ و بخرێتە گۆڕەوە.

٦)- ﴿ ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ ﴾، ئنجا هەر كاتێكیش ویستی زیندووی دەكاتەوە، ﴿ أَنشَرَهُ ﴾، خوێندراویشتەوە: (**نَشَرَهُ**)، واتە: بڵاوی دەكاتەوە، چونكە ﴿ أَنشَرَهُ ﴾، واتە: (**أَحْيَاهُ**)،

زیندووی کردەوە، بێگومانیش مرۆڤەکان هەرکات زیندووبوونەوە، ئەو کاتە بە زەویدا بڵاو دەبنەوە، کەواتە: (أنشر) و (نشر) پێکەوە پەیوەست (متلازم)ن.

٧)- ﴿كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ﴾، نەخێر، ئەوەی (خوا) فەرمانی پێکردوە جێ بەجێی نەکردوە، ﴿كَلَّا﴾، لە ئەسڵدا (**كَلِمَةٌ رَدْعٍ وَزَجْرٍ وَإِبْطَالٍ**)، وشەیەکە بۆ بەرپەرچدانەوەو تێخوڕین و هەڵوەشاندنەوە بەکاردێ، لێرەدا دەگونجێ بە مانای (**حقاً**) بێ، واتە: بەڕاستیی (لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ)، ئەوەی فەرمانی پێ کردوە، ئەو ئەرکەی خوا خستوویەتە سەرشانی جێبەجێی نەکردوە.

یاخود: ﴿كَلَّا﴾، هەر بە مانای بەرپەرچدانەوەیە، یانی: با مرۆڤ وازبێنێ، لە سپڵەیی و بێبڕوایی، ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە جێبەجێی نەکردوە.

(**مجاهد**)، وەك (**الطبري**)، بە ژمارە: (٣٦٤٥٧) لێوەی هێناوە، گوتوویەتی: (**لَا يَقْضِي أَحَدٌ أَبَداً مَا افْتُرِضَ عَلَيْهِ، قَالَ الحَارِث: كُلّ مَا افْتُرِضَ عَلَيْهِ**)، واتە: هیچ مرۆڤێك هەرگیز ئەوەی لەسەری پێویستکراوە جێ بەجێی ناکات، بەڵام (**حارث**) کە یەکێکە لە زانایان گوتوویەتی: مەبەست ئەوەیە هەموو ئەوەی لەسەری پێویست کراوە بۆی جێ بەجێ ناکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ﴾، (**القَضَاءُ: فِعْلُ مَا يَجِبُ عَلَى الإِنْسَانِ كَامِلاً، لأَنَّ أَصلَ القضاء مُشْتَقٌّ مِنَ الإتمام**)، واتە: (قضاء)، هەر شتێکە کە مرۆڤ لەسەری پێویست بێ بە تەواویی جێبەجێی بکات، چونکە وشەی: (**قضاء**) داتاشراوە لە تەواوکردن (**إتمام**)، ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ ﴿١٢﴾﴾ فصلت، واتە: خوا حەوت ئاسمانەکانی تەواو کردن، هەروەها: ﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ﴿١٥﴾﴾ القصص، مووسا ﷺ مستێکی لێدا تەواوی کرد، کەواتە: یانی: ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە، بە تەواویی ئەنجامی نەداوە، هەڵبەتە ئەگەر مەبەست مرۆڤی بێبڕوا بێ، نە بە تەواویی و، نە بە ناتەواویی ئەنجامی نەداوە، بەڵام ئەگەر مەبەست مرۆڤ بێ بەگشتیی، واتە: هیچ کامیان بە تەواویی ئەرکی سەرشانی خۆیان جێ بەجێ نەکردوەو، وەك بۆ خوا شایستەیە بەندایەتییان بۆی نەکردوە.

## کورتە باسێک لە بارەی ئەندازەگیریی خواوە بۆ نوتفە[1]

بەڕێـــزان! ئەم کورتە باسە لە دوازدە خاڵان دا دەخەینەڕوو:

١- لەو (**نطفة**)یەدا کە بە چاو بە زەحمەت دەبینرێ و زۆر زۆر گچکەیە، وەك پێشتریش گوتمان: زیندەوەرێکی تۆو (**حيوان منوي**)ی، لەگەڵ هێلکۆڵەی ئافرەتدا یەکیان گرتوەو ئەو (**نطفة**)یان پێکهێناوەو، بۆتە زیندەوەرو ژیاندارێکی دیکەی سێیەم و، جیاواز لەو دووانەی پێشووی.

٢- ئەو نوتفەیە قەدو قیافەو باڵاو شێوەو دیمەنی ئەو مرۆڤەی هەموو تێدایەو ئەندازەگیریی کراوە، لەسەر کڕۆمۆسۆمەکانی هەرچی زانیاریی پێویستە لە بارەی ئەو مرۆڤەوە، هەمووی تۆمارکراوەو، هەموو خانەیەکی جەستەی مرۆڤ چل و شەش (٤٦) کڕۆمۆسۆمی لەسەرەو، ئەو کڕۆمۆسۆمانەش هەرچی زانیارییە لەسەریان تۆمار کراوە، زانایان دەڵێن: ئەو زانیارییانە بە ئەندازەی هەزار (١٠٠٠) بەرگ کتێب دەبن، هەر بەرگەی پێنجسەد (٥٠٠) لاپەڕە بێ، یانی: بە ملیۆنان زانیاریی لەسەر ئەو کڕۆمۆسۆمانە تۆمار کراون.

ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو دوو زیندەوەرە یەکدەگرن، هێلکۆڵەی ئافرەت لەگەڵ ژیانداری تۆویی پیاو، یەکێ (٢٣) کڕۆمۆسۆم لەگەڵ خۆیان دێنن، چونکە هەر کام لە هێلکۆڵەو زیندەوەرە تۆوییەکەش لەت دەبن و، نیوەی کڕۆمۆسۆمەکان پێکەوە یەك دەگرن: (٢٣ + ٢٣ = ٤٦)، ئەگەر کڕۆمۆسۆمێك کەم بێ و ببێتە (٤٥)، یاخود زیاد بێ و ببێتە (٤٧)، ئەو مرۆڤە، مرۆڤێکی نائاسایی دەردەچێ.

٣- خوا ﷻ لە نێو ئەو (**نطفة**)یەدا ئەوەی داناوە، دوایی جەستەی ئەو کۆرپەلەیە کە دروست دەبێ، کۆئەندامی بیستنی هەبێ، چونکە خوا ﷻ دەزانێ دوایی ئەو مرۆڤە

---

(١) ئەم کورتە باسەمان بە پوختکراوەیی و گوشراویی لە تەفسیرەکەی (الطنطاوي) وەرگرتوە، بڕوانە: الجواهر في تفسير القرآن الكريم، المجلد: ١٣، الجزء: ٣٠.

دەچێتە نێو ژینگەیەکەوە هەوای تێدایەو، دەبێ کۆئەندامێکی هەبێ لەگەڵ شەپۆلە دەنگییدا گونجاوبێ ەکان و ئەو قسانەی بە شەپۆلەکانی هەوا دەگوازرێنەوە، بتوانێ ئەو دەنگانە وەربگرێ، تاکو لێیان تێبگات و بیانگەیەنێ بە مێشك، مێشکیش شییان بکاتەوە، کەواتە: کۆئەندامی بیستن و پێکهاتەکانی هەموویان ئەندازەگیریی کراون لەو (**نطفة**)یەدا، هەروەها خوا ﷻ دەزانێ دوایی ئەو مرۆڤە دێتە نێو ژینگەیەکەوە، کە ڕووناکیی تێدایەو، پێویستیی بەوە هەیە دیمەنەکان ببینێ و دروستکراوو ڕەنگەکان ببینێ، بۆیە کۆئەندامی دیتنیش لە نێو ئەو (**نطفة**)یەدا ئەندازەگیریی کراوە، بەو هەموو سەرسوڕهێنەرییەی هەم کۆئەندامی دیتن هەیەتی، هەروەها ئەو هەموو وردەکارییەی کۆئەندامی بیستن هەیەتی، کە ئێمە تاڕاددەیەك لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، باسی هەموو ئەو کۆئەندامانەمان کردوە، کۆئەندامەکانی بیستن و دیتن و بۆنکردن و تامکردن، دەستلێکوتان.

٤- خوا ﷻ دەزانێ وەك چۆن ئەو مرۆڤە، پێویستیی بە زانیاریی هەیە، پێویستیشی بە جووڵەی کردەیی هەیە، بۆیە بۆ وەدەستهێنانی زانست، عەقڵ و پێنج هەستەکانی پێداون، هەر لەو (**نطفة**)یەدا ئەندازەگیریی کردوە، کە دەبێ پێنج هەستەکانی هەبن، بۆ ئەوەی مامەڵە بکات لەگەڵ:

١- بیستراوەکان (**مسموعات**) دا، کە دەنگەکانن.

٢- لەگەڵ بینراوەکان (**مرئیات**) دا، کە وێنەکانن.

٣- لەگەڵ بۆنکراوەکان (**مشمومات**) دا.

٤- لەگەڵ تامکراوەکان (**مذوقات**).

٥- لەگەڵ دەست لێدراوەکان (**مَلْمُوسات**)، ئەو پێنج جۆرە، خوای پەروەردگار پێنج کۆئەندامی بۆ مرۆڤ خوڵقاندوون، کە ئەو پێنج جۆرە زانیارییانە کۆ بکاتەوەو وەك کەرەستەیەکی خاو، بیانخاتە بەر دەستی عەقڵ و، لە ئەنجامدا مرۆڤ توانای شت

دەرككردوون و زانینی هەبێ، بەڵام ئایا مرۆڤ تەنیا بە زانین و دەرككردن، شتەكان، كاری پێك دێ؟ نەخێر، بەڵكو پێویستیی بە كردەوەو جووڵەو هەڵسوكەوتیش هەیە، بۆیە خوا ﷻ دەستەكان و پێیەكان و ئەندامەكانیشی بۆ مرۆڤ خوڵقاندوون، تاكو هەم لە ڕووی تیۆریی و زانینەوە، هەم لە ڕووی كرداریی و توانینەوە ئەو مرۆڤە بتوانێ ژیانی خۆی ڕایی بكات.

٥- هەر لە نێو ئەو (**نطفة**)یەدا، خوا ﷻ توانای خواردنەوەو خواردن و هەرسكردنی، داناوە، چونكە خوا ﷻ دەزانێ، ئەو كۆرپەلەیە هەر لە نێو منداڵداندا نابێ، تاكو لە ڕێی پەتی نێوك (**الحبلُ السُّريّ**)یەوە، پێداویستییەكانی دابین بكات لە نێو منداڵدانی دایكی دا، بەڵكو دوایی لە دایك دەبێ و دوو مەمكی دایكی چاوەڕێی دەكەن، بەڵام دیسان هەر لە ڕێی دوو مەمكەكانی دایكیەوە، مەداری ساز نابێ و، ناكرێ هەتا هەتایە مەمكی دایكی بمژێ، بۆیە خوا ﷻ سیی و دوو ددانی بۆ خوڵقاندوەو، زمان و مەڵاشوو و قوڕقوڕاگەو هەموو ئەوانەی بۆ خوڵقاندوون، ئنجا ددانەكانیش سێ جۆرن:

١- بڕەرەكان (**قواطع**) كە شتیان پێ دەبڕێ.

٢- كەڵبەكان (**نواجذ**) كە شتیان پێ قڵت قڵت دەكات.

٣- خڕێیەكان (**أفراس**) كە شتیان پێ دەهاڕێ، چونكە ئەو خواردنە پێشێ دەبێ ببڕدرێ، ئنجا دوایی قڵت قڵت بكرێ، دوایی بدرێتە خڕێنەكان و بیهاڕن، تاكو بە كەڵكی ئەوە بێ، زمان لە قوڕگەوە ئەو دیوی بكات بۆ دیوی گەدەو لەوێدا هەرس بكرێ و، بكرێتە وزەو تواناو بگەیەنرێ بە خانەكان.

٦- هەروەها خوا ﷻ لە نێو ئەو (**نطفة**)یەدا، ئێسقانەكانی دەست و ئێسقانەكانی پێی ئەندازەگیریی كردوون، كە هەركامیان - دەست و پێ - خاوەنی چەندان ئێسقانی وردن، بەهۆی ئەو ئێسقانانەوەو ئەو جومگانەوە، دەست دەتوانێ چەندان جۆرە جووڵە بكات، كە جگە لە پەنجە گەورە، دوو جومگەی هەن، پەنجەكانی دیكە یەكی سێ جومگەیان هەن و، بەهۆی ئەو جومگانەوە دەست جووڵەكانی دەكات، ئەگەرنا ئەگەر دەست ڕەق

و یەك پارچە بووایە، حاڵەکە دەگۆڕا، کەسی وایە تووشی هەندێ حاڵەتی نەخۆشیی دەبێ و پەنجەکانی ڕەق دەبن، هیچی بۆ ناگیرێ، کۆتایی پەنجەکانیش بە نینۆك هاتوە، ئینسان با ئەزموون بکات، کاتێك نینۆکی نامێنن، یان نینۆکێکی دەکێشرێ یان دەشکێ هیچ شتێکی پێ هەڵناگیرێ، بگرە خۆی پێ ناخورێنرێ، هەروەها ئێسقانەکانی دیکەی مەچەك و ئانیشك و شان، هەروەها لاقەکانیش بە هەمان شێوەن، تاکو ئەو مرۆڤە بتوانێ هەم بە دەستەکانی جووڵە بکات، هەم بە پێیەکانی بەملاو لادا بچێ و جووڵە بکات.

٧- هەروەها لە نێو ئەو (**نطفة**)یەدا، خوا ﷻ، ئەندازەگیریی چوار جۆرە ئاوەکەی نێو کەللە سەری کردوە: ١- لیکی شیرینی نێو زار، ٢- ئاوی مزری نێو لووت، ٣- ئاوی سوێری نێو چاو، ٤- ئاوی تاڵی نێو گوێ.

لە نێو زاردا ئاوی شیرین، لیکی داناوە، چونکە با مرۆڤ ئەزموونی بکات، ئەگەر لیك لە نێو زاردا نەبێ، یەك پارووی بۆ قووت نادرێ، گریمان بە ددانەکانی بڕی و قڵت قڵتی کردو هاڕی، بەڵام کە زار لیکی تێدا نەبێ، ئەو پاروەی بۆ قووت ناچێ، مەگەر هەموو جارێ ئاوی لەگەڵ بخواتەوە، تاکو شل بێتەوەو بتوانێ قووتی بدات، ئنجا لیکی نێو زار تامەکەی شیرینە، ئەگەر ئینسان بیهێنێتە بەرچاوی خۆی، لە جیاتی ئەوەی ئەو ئاوەی لە نێودا دەمدایە کە شیرینە، ئاوی گوێ لە نێو زاردا بووایە، کە تاڵە، یان ئاوی لووت لە نێو زاردا بووایە، کە مزرە، یان ئاوی چاو لە نێو زاردا بووایە، کە سوێرە، چۆن شتی بۆ دەخورا؟! کە هەر کامێك لەوانە بۆ شوێنەکەی خۆی باشە:

١- ئاوی تاڵی نێو گوێ بۆ وێ باشە، کە ئەو زیندەوەرانەی بەرەو گوێ دێن، دەیانکوژێ، زۆرجار ئینسان فڕە فڕێك لە نێو گوێی دێ، کە هی زیندەوەرێکی مردووە، ئەو ئاوە تاڵە یەکسەر دەیکوژێ.

٢- ئاوی نێو لووتیش مرزە، بۆ ئەوەی ئەو تۆزو تەنۆلکە نامۆیانەی لە ڕێی هەناسە هەڵمژینەوە دێنە نێو لووت، ئاوە مزرەکەی لووت بیانگرێ، دوایی دەبێتە چڵم و، فڕێ دەدرێ.

٣- هەروەها ئاوی نێو چاو سوێرە، چونکە چاو زیاتر ماددەیەکی چەورییەو، دەبێ لە نێو ژینگەیەکی سوێر دابێ تاکو بپارێزرێ.

٤- ئاوی نێو زار، لیکیش شیرینەو، هەر ئەوەش بۆ نێو زار باشە، وەك پێشتر باسمان کرد.

٨- هەروەها لەو ئەندازەگیرییانەی کراون، ئەوەیە کە خوا ﷻ سورێنچکی بۆ ئینسان خوڵقاندوە، کە وێڕای خۆراك، شلەمەنیی و خواردنەوەی لێوەدەچێ و، هەناسەشی لێوەدەچێ، بەڵام دوایی بە پێی سیستمی کارزانانەی خوا ﷻ لە لای قوڕقوڕاگە لەو شوێنەی هەوا دەچێ بۆ سییەکان، زمانەچکۆڵە هەیە، کە ڕێ دەگرێ لەوەی خواردن و خواردنەوە، بچێتە نێو سییەکان، ئەگەر ئینسان لێشی هەڵە بێ، یان زمانەچکۆڵە فریا نەکەوێ، شتێکی بچووك بچێتە نێو سییەکانەوە، هەر دەکۆکێ هەتا ئەو شتەی چۆتە نێو بۆڕی هەناسەوە، دێتە دەرێ.

٩- یەکێکی دیکە لەو ئەندازەگیرییانەی هەر لەسەرەتاوە خوا لە نێو (**نطفة**)دا کردوویەتی، بریتیە لە گەدە، گەدە وەك ئەندامی سەرەکیی هەرس، دوای ئەوەی خواردن ئەو دیو دەکەی، تۆ بەس خواردن و جوینی و ئەو دیو کردنت لەسەرە، بەڵام سەرەو بەرە کردنی و هەرسکردنی و...هتد، هەمووی خوا ﷻ مشووری خواردوە: لە نێو گەدەدا ئەو خواردنە - وەك چۆن مەنجەڵێك خواردنی تێدا دەکوڵێنرێ ئەو خواردنەی دەیخۆی هەر جۆرێکی بێ و هەرچی هەیە، دەکوڵێنرێ و وای لێ دەکرێ بە کەڵك بێ، دوایی بچێتە نێو ڕیخۆڵەکانەوەو لەلایەن ڕیخۆڵەکانیشەوە وردە وردە بمژرێ و ببێتە خوێن، ئنجا لە ڕێی خوێنیشەوە، ئەو خواردنە هەرسکراوە بگەیەنرێ بە خانەکانی جەستە، وەك زۆرجاریش گوتوومانە: خانەکانی جەستە زانایان بە سەد (١٠٠) تریلیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) خانە مەزندەیان دەکەن!.

ئنجا جێی سەرسوڕمانە، کە ئەو گەدەیە دوو دەرگای هەن: دەرگایەك بۆ لای سەرێ و دەرگایەك بۆ لای خوارێ، دەرگای لای سەرێ، هەمیشە کراوەتەوە، هەر کاتێك بتەوێ شتێك قووت دەدەی، ئەگەر خواردنە، ئەگەر خواردنەوەیە، ئەگەر چەرەزاتە، ئەگەر نوقڵێکی شیرینە، هەر کاتێك بتەوێ دەتوانی خواردن حەواڵەی ئەو دیوی گەدەت بکەی، بەڵام دەرگای خوارێ، نەخێر، تەنیا لە کاتی دیاریکراودا دەرگاکە دەکرێتەوەو، ئەگەر وانەبووایە، هەرچییەکت دەخوارد، یەکسەر دەچووە خوارێ، بەڵام لە گەدەو ڕیخۆڵەکان دا دەمێنێتەوە، گەدە سەرەوبەرەی دەکات، لە ڕێی پەنکریاسەوە، ڕژێنێکی دەڕژێنێرێتە سەرو، لە ڕێ لووی تیمۆسەوە، ڕژێنێکی دیکەی دەڕژێنرێتە سەرو، بەسەر ئەو خواردنە دا دەکرێ، تاکو بە کەڵکی ئەوە دێ، هەرس بکرێ و، دوایی بە ڕیخۆڵەکاندا بچێتە خوارو، وردە وردە بمژرێ و تێکەڵ بە خوێن بێ.

**١٠-** یەکێکی دیکە لەو شتانەی خوا ئەندازەگیریی کردوون، هەر لە نێو ئەو (**نطفة**)یەدا، مەسەلەی کۆئەندامی دڵ و دەمارەکان و دابەشکردنی خوێنە، کە لەو ڕێیەوە هەم ئەو ئۆکسجینەی هەڵیدەمژین و، هەم ئەو خواردن و خواردنەوەیەی دەیخۆین و هەرس دەکرێ، دەبنە پێکهێنەری خوێن و لە ڕێی دڵەوە خۆراکی تازە بۆ هەموو خانەکانی جەستە دەنێردرێ و، لەو سەریشەوە پاشەڕۆکەکەیان دەهێنرێتەوەو فڕێدەدرێتە دەرێ.

**١١-** یەکێکی دیکە لەو شتانەی هەر لەبەرێوە[1] لە نێو نوتفەدا ئەندازەگیریی بۆ کراوە، کۆئەندامی مێشك و دەمارە، کە وەك چۆن هەموو وڵاتێك شارێك پێویستی بە حوکمڕانێك هەیە، سەرپەرشتیی بکات و ئاگای لە هەمووی بێ، کۆئەندامی مێشك و دەماریش ئەو حوکمڕانەیە بەسەر وڵاتی جەستەو شاری جەستە ڕادەگات و، هەموو کاروبارەکان، هەندێکیان بە شێوەیەکی ویستەنیی (**إرادي**) و هەندێکیشیان بە شێوەی ناویستەنیی (**لا إرادي**)، خوا ﷻ وایکردوە ژمارەیەکی زۆر لە کۆئەندامەکانی جەستەی ئێمە بە شێوەیەکی ناویستەنیی لە ڕێی مێشکەوە فەرمانیان بۆ بنێررێ، بۆوێنە: گەدە کە خواردن هەرس دەکات،

---

(١) لە بەرێوە: لەسەرەتاوە.

گورچیلەكان كە ئاو دەپاڵێون، هەروەها سییەكان، كە هەوا هەڵدەمژن، هەروەها دڵ كە لێدەدا، بە دەست خۆمان نیە، بڵێی: دڵی خۆم ڕادەگرم، هەروەها زۆربەی كۆئەندامەكانی نێو جەستە، بە شێوەیەكی ناویستەنیی بێ ئەوەی خۆمان ئاگامان لێ بێ، مێشك فەرمانیان بۆ دەنێرێ ئەو كارانە بكەن، بەڵام هەندێك لە كارەكانمان وەك: كردنەوەی چاو، قسە كردن، خواردن و خواردنەوە، دەست جووڵاندن و پێ جووڵاندن، ئەوانە ویستەنیین، كە هەر واش باش بوو ویستەنیی **(إرادي)** بن، چونكە ئینسان بێ ئەوەی بیەوێ: دەستی بجووڵێ و چاوی بجووڵێ و، بێ ئەوەی بیەوێ قسە بكات، شتێكی زۆر سەیرو سەمەرە دەردەچوو، واتە: هەموو ئەندام و كۆئەندامەكانی دەبێ ناویستەنیی بن، مێشك فەرمانیان بۆ دەنێرێ، بێ ئەوەی ئێمە ئاگامان لێ بێ و بمانەوێ، ئنجا ئەگەر وا نەبووایە، ئینسان لە بیری دەچوو بە گەدەی بڵێ: خواردن هەرس بكات و، لە بیری دەچوو بە گورچیلەكانی بڵێ: ئەو ئاوە بپاڵێون و، لە بیری دەچوو بە دڵ بڵێ: لێبدەو دڵی دەوەستا! بەڵام هەموو ئەوانە ناویستەنیین و، مێشك فەرمانیان بۆ دەنێرێ، ئەوانی دیكەش لە ڕێی ویستنی مرۆڤ و، حاڵەتی بە هۆشیی مرۆڤەوە، ئەنجام دەدرێن.

**١٢-** شتێكی دیكەی زۆر گرنگ كە خوا ﷻ لە نێو ئەو **(نطفة)**یەدا ئەندازەگیریی كردوە، كە دەفەرموێ: ﴿ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴾، ئەوەیە كە هەر ئەندامێك لە جەستەی مرۆڤدا، تاكو گرنگترو هەستیارترو بایەخدارتر بێ، خوا لە شوێنێكی مەحكەمتردا دایناوە:

**١-** مێشك (دماغ): لەبەر ئەوەی لە هەموو ئەندامەكانی جەستەی مرۆڤ گرنگترو بایەخدارترەو، لە ڕاستییدا مرۆڤ بە مێشكەوە مرۆڤە، بۆیە خوا خستوویەتە شوێنیكی زۆر مەحكەم و، خستوویەتە سەرەوەی جەستەش و لە نێو كەللەی سەردایە، كە هەمووی ئێسقانە، زۆر كەس وا دەزانێ كەللەی سەر، یەك ئێسقانەو نازانێ چەندان پارچە ئێسقانە، ئەوەش گرنگییەكەی ئاشكرایە: تاكو ئەگەر یەكێكیان شكا، ئەوانەی دیكە نەشكێن، نەك وەك شووشەیەك یان پەنجەرەیەك، ئەگەر لە شوێنێكەوە درزێكی تێبوو، درزەكە لە هەمووی دەبێ، نەخێر كەللەی سەر، ئەگەر شوێنیكیشی بشكێ، یەكێ لە پارچە ئێسكەكان، ئەوانی دیكە ناشكێن.

٢- لە دوای مێشك، ئەو كۆئەندامانەی زۆر گرنگن لە جەستەی مرۆڤدا، بریتین لە دڵ و، سییەكان و، جەرگ و، پەنكریاس، كە خوا خستوونیە نێو قەفەسی سینگەوە.

٣- یەكێكی دیكە لەو كۆئەندامانە، بریتیە لە: دڕكە پەتك **(النخاع الشوكي)**، كە لە مێشكەوە دێ و بە هەموو جەستەدا بڵاو دەبێتەوە، خوا خستوویەتە نێو بڕبڕەكانی پشتەوە، مرۆڤ سیی و سێ (٣٣) بڕبڕەی هەیە لە پشتیدا:

١- بڕبڕەكانی مل حەوت (٧) بڕبڕەن.

٢- بڕبڕەكانی پشت كە دەكەوێتە ئاقاری پەراسووەكان دوازدە (١٢) بڕبڕەن، (٧ + ١٢ = ١٩).

٣- ئنجا پێنج (٥)یان دەكەونە بەرانبەر سك.

٤- پێنج (٥) دیكەشیان لە خوارترەوەن.

٥- چواریشیان دەكەونە كلێنجە، كە پێی دەگوترێ: **(عُصْعُصْ)**، كەواتە: (٧ + ١٢ + ٥ + ٥ + ٤= ٣٣ بڕبڕە)، ئەو دڕكە پەتكەی هەموو جەستە لەوەوە فەرمان وەردەگرێ، خوا خستوویەتە نێو ئەو ئێسكە زۆر ڕەق و پتەوانەوەی پێیان دەگوترێ: بڕبڕاگەو، بە هەر كامێكیان دەگوترێ: بڕبڕە **(فقرة)**، كە ئێسكی زۆر پتەوو مەحكەمن.

كەواتــە: وەك خــوا ﷻ: ﴿ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴾، خــوا عزوجـل ئەندازەگیریــی (تقدیــر)ی یەكجـار وردو گرنگــی بــۆ جەســتەی مــرۆڤ و كۆئەنــدام و ئەندامــەكانی لــە نوتفــەدا دانــاون، ئــەوەش كورتەیەكــی زۆر كــورت بــوو، لــە بــارەی ئــەو ئەندازەگیرییانــەوە كــە خــوا ﷻ لــەو **(نطفة)**یــەدا كردوونــی و، ئــەو زانیارییانــەی لەســەر كرۆمۆســۆمەكانی نێوجینەكانــی هــەر خانەیــەك لــە جەســتەی مرۆڤــدا، هــەن، خــوای كاربەجــێ و توانــا، هەمــوو ئــەو زانیاریانــەی تۆمــار كــردوون، كــە دوایــی بــە شــێوەیەكی كردەیــی لــە دنیــای واقیــع دا بەرجەســتە دەبــن.

## کورتە باسێک دەربارەی

## چۆنیەتیی ئاسانبوونی لە دایک بوونی کۆرپەلە(١)

بەڕێـــــزان!

یەکەمیـن شـت کـە دەبـێ لـە بـارەی لـە دایـك بوونـی مرۆڤـەوە، بیزانیـن، ئەوەیـە کـە منداڵدانـی ئافـرەت (**رحـم المـرأة**) هێنـدەی کوڵـە مسـتێك، یاخـود گچکەتریشـە، بـەڵام دوای ئـەوەی تۆویلکـە (**نطفـة**)، لەوێـدا گەشـە دەکات و دەبێتـە زارجـوو (**مضغـة**)، دوایـی دەبێتـە ئێسـك و، دوایـی ئێسـکەکە بـە گۆشـت دادەپـۆشرێ، دوایـی بـە شـێوەیەکی دیکـە خـوا دروسـتی دەکات، وای لـێ دێ قەبـارەی بـە ئەنـدازەی (٧٥٠) سـم٣ دەکشـێ، واتـە: سـەرەتا ئەوەنـدە بچووکـە، دوایـی ئەوەنـدە گـەورە دەبـێ، تاکـو جێـی ئـەو کۆرپەلەیـەی تێـدا ببێتـەوە، یانـی: خـوا ﷻ ئـەو منداڵدانـەی وا خوڵقانـدوە، بتوانـێ بکشـێ، ئنجـا نـەك تەنیـا جارێـك، ئافرەتـی وا هەیـە پـازدە (١٥) منداڵـی بـوون و هـی وا هەیـە هـەژدە (١٨) منداڵـی بـووە، کـە هەمـوو جـارێ ئـەو منداڵدانـە دەکشـێ تاکـو جێـی کۆرپەلەکـە ببێتـەوە، بەڵکـو ئافـرەتی وا هەیـە دوو منداڵـی پێکـەوە دەبـن و، هەیـە چـواری دەبـن، دوای ئـەوەی منداڵـەکان دەبـن، دێتـەوە یـەك و، جارێکـی دیکـە دەکشـێتەوەو، دوایـی دێتـەوە یـەك، واتـە: حاڵەتێکـی وەك هـی لاسـتیکی هەیـە.

ئایا منداڵ چۆن لە دایك دەبێ؟

١- لە مێشکەوە فەرمانێك دێ، لە ڕێی هۆڕمۆنێکەوە بۆ ئێسقانی حەوزی ئافرەت، کە ئەو ئێسقانانە لێکبکشێن، بۆ ئەوەی ئەو کۆرپەلە بواری هەبێ ببێتە دەر.

---

(١) ئـەم باسـە بـە تـۆزێ دەسـتکارییەوە لـە تەفسـیری (النابلـسي) بەرگـی (١٠) لاپـەڕە (٢٤٤ - ٢٤٥)، وەردەگـرم.

**٢-** دوایی فەرمانێکی دیکەی هۆڕمۆنیی دێ، بۆ ئەو کۆرپەلەیە کە سەرەوبن ببێ و هەڵگەڕێتەوە، چونکە کۆرپەلە لە سکی دایکی و لە نێو منداڵدانی دایکی دا، مرۆڤ چۆن دادەنیشێ، بەو شێوەیە دانیشتوەو سەری لە سەرێیەو ئەندامەکانی دیکەی لە خوارێن و، خۆشی کۆکردۆتەوەو ڕێکهێناوە، بۆ ئەوەی جێی ببێتەوە، بەڵام لە کاتی لە دایك بوونیدا، یەکسەر ئەو کۆرپەلە تەقڵەیەك لێدەدا، فەرمانێك لە مێشکەوە دێ، کە: کاتی ئەوە هاتوە ئێرە بەجێ بهێڵی و، بچییە دەرێ، بۆیە دەبێ خۆتی بۆ ئامادە بکەی، خۆ ئامادە کردنەکەش ئەوەیە یەکسەر تەقڵەیەك لێدەداو سەرەوبن دەبێ، سەری دەکەوێتە لای خوارێ و، دەست و پێی دەکەوێتە لای سەرێ.

**٣-** فەرمانی هۆڕمۆنیی سێیەم ئەوەیە فەرمانێك بۆ منداڵدان دێ، کە گرژببێ و بێتەوە یەك، بەڵام بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دانراو، بە شێوەیەکی کاتیی و پلە پلە، بۆ ئەوەی وردە وردە ئەو منداڵە پاڵپێوەنێ، بۆ دەرێ، کاری گەشەو دروستبوونی بەسەر چووەو، کاتی ئەوە هاتوە ئەوێ بەجێ بهێڵێ، ئیدی ئەو منداڵدانە وردە وردە دێتە حاڵەتی گرژبوون (**قبض**)و هاتنەوەیەك، بۆ ئەوەی وردە وردە ئەو کۆرپەلەیە فڕێداتە دەرێ.

**٤-** کاتێك کۆرپەلە لە سکی دایکی دێتە دەرێ، ئنجا بە پێچەوانەی حاڵەتی یەکەمەوە، کە پلە پلەو وردە وردە منداڵدان دەهاتەیەوە یەك، تاکو ئەو منداڵە پاڵ پێوە بنێ، دوای ئەوەی کۆرپەلەکە دێتە دەر، منداڵدان زۆر بە خێرایی و بەهێز دێتەوە یەك، کە ئەگەر کاتێك کۆرپەلەکە لە نێوی دابوو، ئاوا هاتبایەوە یەك، دەیکوشت، بەڵام دوای ئەوەی ئەو منداڵە دەرداوێ، ئنجا بەو جۆرە دێتەوە یەك، بۆ ئەوەی هەموو ئەو دەمارانەی پچڕاون، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو منداڵە لە سکی دایکی هاتۆتە دەرێ و، خوێنیان لێ بەربووە، ئەو منداڵدانە دێتەوە یەك، تاکو ئەو دەمارانە هەموویان بگیرێن و، ئەو ئافرەتە چی دیکە خوێنڕێژیی (**نزیف**)ی نەبێ، ئنجا ئەگەر هەروەك حاڵەتی فڕێدانە دەری کۆرپەلە، بە نەرمیی هاتبایەوە یەك، ئەو ئافرەتە لەسەر حاڵەتی خوێن لێهاتن بەردەوام دەبوو و، خوێن لە جەستەیدا نەدەما.

٥- خوای کارزان ﷻ وایکردوە کە ئەو کۆرپەلەیەی پێشێ سەری دێتەدەر، سەری لە شانەکانی گچکەتر بێ، نەك سەریشی هێندەی شانەکانی بێ، ئەگەر وابووایە نەدەهاتە دەر، ئنجا خوا ﷻ وایکردوە کە ئەو منداڵە هەڵبگەڕێتەوەو سەری بێتە لای خوارێ، کە پێشتر سەری لە سەرێ بووە، ئەگەرنا ئەگەر لاقی هاتبایە یان دەستی هاتبایە، بێگومان ئەو منداڵە، ئەو کاتە لەوێدا عاسێ دەبوو و، بە هیچ کەس چارەسەر نەدەکرا.

## دوو هەڵوەستەی گرنگ:

**هەڵوەستەی یەکەم:** لە بەردەم چەمکی گشتیی ئەم ئایەتە موبارەکەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴾، دوایی (خوا) ڕێی بۆ ئاسان کردوە، کە زۆر لە زانایان گوتوویانە: واتە: ڕێی لە دایك بوونی بۆ ئاسان کردوە، کە باسمان کرد، ڕێی لە دایك بوونەکە، چۆن ئاسان کراوەو لە سەدا سەد (١٠٠٪) وایە.

بەڵام وێڕای ئەو مانایە هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: ڕێی دینداریی و گرتنەبەری ڕێی ڕاستی، بۆ ئاسانکردوە، کە ئەوەشیان هەروایەو ئەمەیان مەبەست پێی ڕێی مەعنەوییە.

منیش دەڵێم: یەکەم: چەمکی ئایەتەکە لە ڕووی ڕواڵەتیی و جەستەییەوە، لەوەی باسکراوە فراوانترە، چونکە:

١- ڕێی لە دایك بوونی بۆ ئاسان کردوە.

٢- دوایی مەمك مژینی دایکی بۆ سانا کردوە.

٣- ڕێی خواردن و خواردنەوەی بۆ ئاسان کردوە، کە ددانەکانی دەڕوێن، کە هەرچی دەیەوێ بیخوات.

٤- ڕێی قسەکردنی بۆ ئاسانکردوە.

٥- ڕێی ڕۆیشتنی بۆ ئاسان کردوە.

٦- دوایی وردە وردە ڕێی گەشە کردنی بۆ ئاسان کردوە، هەتا دەبێتە مرۆڤێکی تێرو تەواو، هەموو ئەو ڕێیانەی بۆ ئاسان کردون لە ڕووی جەستەییەوە.

**دووەم:** لە ڕووی مەعنەوییشەوە خوا ڕێی بۆ مرۆڤ ئاسان کردوە:

١- ناخ و فیترەت و زگماکی خوا دەناسێ.

٢- لە ڕێی عەقڵەوە خوا دەناسێ و بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان (**البدهيّات العقلية**) لە مێشکی دا هەن.

٣- لە ڕێی وەحییەوەش خوا بەرچاو ڕوونی دەکات و شارەزای دەکات، کەواتە: ﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ﴾، چەمك و واتایەکەی زۆر فراوانەو شتێك و دوو شت نیە.

**هەڵوەستەی دووەم:** ئەوەیە کە (**إبن عاشور**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**التحرير والتنوير**)[1] دا دەڵێ:

**(وَفِي الْآيَةِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ وُجُوبَ دَفْنِ أَمْوَاتِ النَّاسِ بِالْإِقْبَارِ دُونَ الْحَرْقِ بِالنَّارِ، كَمَا يَفْعَلُ مَجُوسُ الْهِنْدِ، وَدُونَ الْإِلْقَاءِ لِسِبَاعِ الطَّيْرِ فِي سَاحَاتٍ فِي الْجِبَالِ مَحُوطَةٍ بِجُدْرَانٍ دُونَ سَقْفٍ، كَمَا كَانَ يَفْعَلُهُ مَجُوسُ الْفُرْسِ، وَكَمَا كَانَ يَفْعَلُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ بِمَوْتَى الْحُرُوبِ وَالْغَارَاتِ فِي الْفَيَافِي، إِذْ لَا يُوَارُونَهُمْ بِالتُّرَابِ).**

واتە: لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی پێویستە مردووەکانی خەڵك بنێژرێن و بخرێنە ژێر خاك، نەك بسووتێنرێن، وەك مەجووسییە هیندییەکان دەیانکرد، (ئێستاش ئەوە هەر هەیە، لە هەندێك شوێنی هیندو، لە هەندێك وڵاتانی ئەورووپاش دا)، هەروەها نەك فڕێ بدرێن بۆ دڕندەی باڵندان (خەرتەل و داڵاش و لاك خۆرەکان) لە مەیدانەکانی چیایەکاندا، کە بە دیوار دەورەدراون، بێ ئەوەی سەقفی هەبێ، هەروەك مەجووسەکانی فارس وایانکردوەو، خەڵکی سەردەمی نەفامییش وایاندەکرد، ئەوانەی لە جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەکاندا

---

(١) ج١٢، الجزء: ٣٠، ص ١٢٥.

دەكوژران، لـە دەشـت و چـۆڵ بەجێیـان دەهێشـتن، {بـۆ ئـەوەی باڵنـدە لاشـخۆرو درِنـدەكان وەك كەمتیـارو شـێر و گـورگ و پڵینـگ، گۆشـتەكەیان بخـۆن}، ژێـر گڵیـان نەدەخسـتن.

هـەر كەسـیش بـە ویژدانـەوە تەماشـا بـكات دەزانـێ، هەمـوو ڕێـزو حورمەتێكـی مـرۆڤ، بـە زیندوویـی یـان بـە مردوویـی لـە شـەریعەتی خـوای پـەروەردگاردا هەیـە، چ شـەریعەتی كۆتایـی كـە بـە پێغەمبـەری كۆتایـی موحەممـەد ﷺدا ڕەوانەكـراوە، چ هەمـوو بەرنامـەو شـەریعەتەكانی دیكـە كەبـە پێغەمبەرانـدا نێـردراون، لـە هەمـوو شـەریعەتەكانی ئاسـماندا، مـردوو شـۆردن و ڕێزگرتـن لـە لاشـەی مـردوو و ژێـر خاككردنـی هەیـەو، ئەوانـەی لایانـداوە لـە شـەریعەت و بەرنامەكانـی خـوا ﷻ، ئنجـا ئەگـەر مەجووسـیی فارسـن، هیندییـن، بووزاییـن، ئەورووپاییـن، ڕۆژهەڵاتیـی یـان ڕۆژئاواییـن، ئەوانـەن كـە بـەو شـێوەیە مامەڵـە ناكـەن، لەگـەڵ جەسـتەی مرۆڤـدا، كـە شایسـتەی مرۆڤـە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە مرۆڤ کە سەرنجی خواردنەکەی بدات، چۆن و لە چی ئامادە بووە؟ خوا ئاوی لەسەرێوە بە خورزەم هەڵڕشتوە، دوایی زەوی قڵیشاندوە، ئنجا دانەوێڵەو، ترێ و سەوزەو، تەڕەکارو، زەیتوون و، خورماو، باخی چڕو پڕو، میوەو، لە وەڕگای ڕواندوون، تاکو هەمووی ببێتە مایەی بەهرەی مرۆڤەکان و ئاژەڵەکانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴾، ئنجا با مرۆڤ بڕوانێتە خواردنەکەی! پیتی (ف)، لێرەدا دەگونجێ بڵێین: (ف)ی (فصيحة)یە، یانی: لە حاڵێکدا مرۆڤ، بەو شێوەیە خوا خوڵقاندوویەتی، لە (نطفة)یەك و، دوایی هەموو شتێکی تێدا ئەندازەگیریی کردوە، لەو (نطفة)یەدا، کە شتێکی زۆر بچووك و نابووتە، مادام خوا ﷻ بەو هەموو قۆناغانەدا مرۆڤی تێپەڕاندوەو، هەموو ئەو پێداویستییانەی بۆ ڕەخساندوون، ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴾، ئنجا با مرۆڤ دوای خۆی، سەرنجی خواردنەکەشی بدات، تاکو چاکەو نیعمەتی خوا، وێڕای ئەوەی لە دروستکرانی خۆیدا دەبینێ، لە خواردن و خۆراکەکەشیداو، لە دابینکردنی پێداویستییەکانیشیدا، ئەو چاکەو نیعمەتانەی خوا ببینێ.

لێرەدا زانایان بوونە دوو بەش کە ئایا مەبەست لە بابڕوانێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ﴾، چییە؟ أ-ئایا ڕوانینی چاوە (دیتن)؟ ب-یاخود ڕوانینی دڵ و عەقڵە (زانین)؟:

**١- (القرطبي)**، دەڵێ: (**كَيْفَ خَلَقَ الله طعامه؟ وهذا النَّظر نظر القلب بالفِكْر**)، با تەماشا بکات، خوا ﷻ چۆن خواردنەکەی بۆ دروست کردوە؟ لێرەدا مەبەست تەماشاکردنی دڵە بە بیرکردنەوە.

**٢-** بەڵام (**إبن عاشور**)، دەڵێ: (**تَعْدِيَةُ فِعْلِ النَّظَرِ هُنَا بِحَرْفِ إِلى، تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ مِنْ نَظَرِ الْعَيْنِ**)، کە لێرەدا ﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ﴾، وشەی: (**نظر**) تێپەڕی کردوە بۆ بەرکار، بە پیتی (**إلى**)، ﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ﴾، کە دەشگونجا خوا بفەرموێ: (**فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ طَعَامَهُ**) با ئینسان سەرنجی خواردنەکەی بدات، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ﴾، با ئینسان بۆ خواردنەکەی بڕوانێ، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لێرەدا مەبەست لە تەماشا کردن، تەماشاکردنی چاوە، (**نَظَرَ إِلَيْهِ**)، واتە: بە چاو تەماشای کرد، بەڵام (**نَظَرَهُ**)، واتە: (**عَقَلَهُ**)، واتە: زانیی و دەرکی کرد بە عەقڵ و دڵ، پێشم وایە قسەکەی (إبن عاشور) ڕاسترە.

بەڵێ لێرەدا مەبەست تەماشاکردنی چاوە، بەڵام بێگومان چاو کە دەبینێ و، گوێ کە دەبیستێ، ئەگەر عەقڵ و دڵ هوشیار و بێدار نەبن، مرۆڤ لە بیستنی گوێ و دیتنی چاو، سوود نابینێ، ئنجا دوایی خوا ﷻ باس دەکات، ئەو خواردنەی لەبەر دەستی مرۆڤە، چۆن دروست بووە؟ وەك (شێخ سەعدی شیرازیی) کە یەکێك بووە لە زانایانی پایە بەرزی ئیسلام لە ئێران، دەڵێ:

خورشید ماه و زمین همه درکارند کەتو نانی بخورید!

خۆرو مانگ و زەوی هەموویان لە کاردان، تاکو تۆ نانێك بخۆی (ئەی مرۆڤ!).

قسەکەشی زۆر ڕاستە: ئەو نانەی لەبەر دەستی تۆ دایە، نانێکی جۆ، نانێکی گەنم، کولێرەیەك بیری لێ بکەوە چۆن کەوتۆتە بەردەستی تۆ! پێشێ تیشکی خۆر لە ئاوی زەریایەکانی داوەو هەڵمی لێ پەیدا کردوون، ئنجا هەڵمەکە با هێناویەتی و بردوویەتی بۆ شوێنە ساردەکان، لەوێش ئەو پارچە بچووکانەی هەڵمەکان لە یەك نیزیك بوونەوە، ئنجا بوونە هەور، هەورەکە متوربە بووە،

ئنجا ئاو بە شێوەی باران و بەفر و تەزرە داباریوەو هاتۆتە نێو زەوی و لەوێدا خەزن بووەو، بە شێوەی کانیی و سەرچاوەو بیر هاتۆتە دەرێ، جۆگەو ڕووباری لێ هەڵبەستراون، ئنجا دانەوێڵەی سەوز کردوەو دارو درەختی سەوز کردوە، ئنجا ئەو دارو درەخت و دانەوێڵەیە دوایی پێ دەگات و گەشە دەکات، دوایی مرۆڤ وردە وردە ڕەنێوی دێنێ و دەیدووڕێتەوەو دەبێتە ئاردو...، سەرەنجام دەبێتە ئەو نانەی دەکەوێتە بەردەستی تۆ، کە بە کردەوە هەم خۆرو مانگ، هەم زەوی و با، ئەوانە هەموویان لە کاردان تاکو نانێك دێتە بەر دەستی تۆ.

**٢)- ﴿ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴾**، ئێمە ئاومان بە هەڵڕشتن هەڵڕشتوە، (**أَنّا**)ش خوێندراوەتەوەو (**إِنّا**)ش خوێندراوەتەوە، ئەگەر (**أَنّا**) بێ، واتە: با تەماشا بکات، ئێمە چۆن ئاومان لەسەرێوە هەڵرشتوە، ئەگەر (**إنا**)ش بێ، ڕستەیەکی دەست پێکردنە، (**جملة إبتدائية**)، ڕستەیەکە لە سەرەتاوە دەست پێدەکات، خوا دەفەرموێ: ئێمە ئاومان لەسەرێوە هەڵڕژاندوە بە هەڵڕشتن، (**الصَّبُّ: إراقة من أعلى**)، لەسەرێوە ئاوێك هەڵڕژێ، پێی دەگوترێ: (**صب**).

**٣)- ﴿ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴾**، دوایی زەویمان بە قڵیشاندن، قڵیشاندوە، (**الشقُّ: الصَّدْعُ والفتق**)، (**شق**) بریتیە لە قڵیشاندن و درز پێدان.

ئەمەش چەند واتایەکی هەن:

**١-** مەبەست ئەوەیە وامان کردوە ئەو ئاوە بەو زەوییەدا بچێتە خوار.

**٢-** ئەو زەوییەمان وا خوڵقاندوە بگونجێ لە ڕێی کێڵانەوە، بدڕدرێ و گۆڵ و دێراو خەت و کووزی لێ دروست بکرێن.

**٣-** بەهۆی تیشکی خۆرەوە ئەو زەوییە دەقڵیشێ و، تیخ تیخ و درز درز دەبێ و ئاوەکە لێی دەچێتە خوار.

**٤)- ﴿ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴾**، ئنجا دانەوێڵەمان لە زەویدا ڕوواندوە، وشەی: **﴿ حَبًّا ﴾**، ناوی کۆی (**حَبَّة**)یە، یانی: یەك دەنك، یەك دەنکە گەنم یان جۆ، یان نیسك، یان نۆك، یان ماش،

ماشی ڕەش و ماشی سپیی، یان زوڕات، یان هەرزن، یان برنج ...، هەمووی دەگرێتەوە، هەندێك كەس لەوانەیە، وابزانێ دانەوێڵە وەك چۆن لە لای ئێمە، تەنیا گەنم و جۆو نیسك و نۆك و برنج و ماش، هەیە، ڕەنگە وابزانێ هەر ئەوەندە جۆرە دانەوێڵە هەن، یان بەس ئەو جۆرانەی لە لای ئێمە هەن، بوونیان هەیە، بەڵام بۆ زانیارییتان بەس لە گەنم چل و پێنج هەزار (٤٥٠٠٠) جۆر هەیە، لە هەموو دنیادا، هەڵبەتە لە لای خۆمان گەنم چەند جۆرێكی هەیە، بەڵام لە نێو كۆی دانیشتووانی زەوی دا، چل و پێنج هەزار جۆرە گەنم هەیە، هەروەها جۆش بەهەمان شێوە زۆری هەن و، ئەگەر (٤٥) هەزار جۆریشی نەبن، چەند هەزارێكی هەیە، هەروەها جۆرەكانی برنج و، جۆرەكانی ماش و، جۆرەكانی هەرزن و، جۆرەكانی نیسك و، جۆرەكانی نۆك و فاسۆلیا، ئەمانە هەموویان وشەی (حب)، دانەوێڵە دەیانگرێتەوە.

خوا دەفەرموێ: ئێمە دانەوێڵەمان تێدا ڕواندوە، ئنجا مرۆڤ دەبێ سەرنج بدات: هەرچی جۆرەكانی دانەوێڵەن، هەموویان پێكەوە پێدەگەن، ئەوە شتێكی زۆر جێی سەرنجە، گەنمە هەموو پێكەوە پێ دەگات، جۆیە پێكەوە پێ دەگات، هەروەها نیسك و نۆك و ماش و برنج و ...هتد، چونكە ئەگەر هەندێكی ئێستا پێ بگات و، هەندێكی بیست ڕۆژی دیكە پێ بگات و، هەندێكی دیكەی مانگێكی دیكە، چۆن چۆنی درووبانایەوەو ڕەنێو هێنرابایە؟ بەڵام سەوزەو تەڕەكارو میوەكان بە پێچەوانەوە: ئەمڕۆ چینێك پێ دەگات، ئنجا ترۆزییە، خەیارە، شووتییە، كاڵەكە، تەماتەو باینجانە، بامیەیە، ماشە، فاسۆلیایە، چینێك پێ دەگات و، ئەو چینە دەبڕێتەوەو چینێكی دیكە پێ دەگات، ئەو چینەش دەبڕێتەوە و چینێكی دیكە پێ دەگات.

هەروەها میوەكان: خۆخ و قەیسیی و هەرمێ و توو و ترێ و گێلاس و مۆزو پرتەقاڵ و سێوو...هتد، هەمووی چین چین پێ دەگات، نەك هەمووی پێكەوە پێبگات، دانەوێڵە ئەگەر هەمووی پێكەوە پێ نەگەیبایە، ڕەنێو نەدەهات و هەڵنەدەگیرایەوە، بەڵام هی میوەو تەڕەكارو سەوزەو، ئەگەر هەمووی پێكەوە

پێ بگەیبایە، خەسار دەبوو، خاوەنەکەی چی لێ بکات، ئەو هەمووە، بەڵام ئەمڕۆ چینێك پێدەگات و، دوای سێ چوار ڕۆژ هەفتەیەکی دیکە، چینێکی دیکە، دوای چەند ڕۆژێکی دیکە، چینیکی دیکەو، دوایی چینێکی دیکە، ئەوەش بێگومان حیکمەت و نیعمەتێکی گەورەی خوای پەروەردگارە.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا کە خوا ﷻ فەرمان بە مرۆڤ دەکات، سەرنجی خواردنەکەی بدات و، لە ئایەتەکانی پێشێ دا سەرنجی مرۆڤی ڕاکێشاوە بۆ دروستبوونی خۆی، مەبەست پێی بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر ئەوە کە زیندوو کردنەوە، لە لای خوای پەروەردگار شتێکی سێناو ئاسانە، ئەو خوایەی ئاوا دروستی کردوون و ئاوا خواردن و خۆراکتان بۆ دەڕەخسێنێ، دەشتوانێ دوای مردن زیندووشتان بکاتەوە.

بەڵام من پێم وایە وێڕای ئەوەو لە پێش ئەوەدا، ئەوەی لەگەڵ ڕەوت و سیاقی ئایەتەکاندا گونجاوترە، ئەوەیە کە مەبەست ئەوە بێ: ئەو خوایەی ﷻ ئەو مشوورەی لێ خواردوون، هەم لە دروستکردنی خۆتاندا، هەم لە ڕەخساندنی خواردن و خواردنەوەتاندا، هەر ئەو خوایەش، مشووری لێخواردوون و، پەیام و بەرنامەی بۆ ناردوون، خوا وەك چۆن خەمی لە جەستەتان خواردوە، خەمی لە ڕووحیشتان و ناخیشتان خواردوە، چونکە مرۆڤ بە ڕووح و ناخەوە مرۆڤە، پێش جەستەی.

واتە: خوایەك ئەو هەموو نیعمەتەی لە ڕووی جەستەیی و ماددییەوە پێداون، هەم لە دروستکرانی خۆتاندا، هەم لە ڕەخساندنی خواردن و خواردنەوەو پێداویستییەکانتاندا، بۆ خۆتان و ئاژەڵەکانتان، هەر ئەو خوا پەروەردگارو میهرەبانە، مشووریشی لێخواردوون و لە ڕووی مەعنەوییەوەو، پەیام و بەرنامەی بۆ ناردوون و، ئەو پەیام و بەرنامەیەی لە ئایەتەکانی پێشێ دا خوای کاربەجێ باسی کردو فەرمووی: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ ﴿١٣﴾

﴿مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِي سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾﴾، بۆیە ئەو پەیامەی خوا بەو شێوەیە باسی کرد، کە لە ڕێی فریشتەکانەوە دەینێرێ لێی وەربگرن و قەدری بگرن و، وەك چۆن ئەو نیعمەتانەتان پێ خۆشن و وەریاندەگرن و لێیان بەهرەمەند دەبن، ئەو نیعمەتە مەعنەوییەش لە خوای پەروەردگار وەربگرن، بۆ ئەوەی لەسەر بوونەکەتان قەرزدار نەبنەوە.

٥)- ﴿وَعِنَبًا وَقَضْبًا﴾، هەروەها خوا ترێ و تەڕەکاریشی بۆ ڕەخساندووین.

ترێ (**عنب**) کە بە (**أعناب**) کۆ دەکرێتەوەو، مەبەست لە ترێ (**عنب**) دار مێوەکەیە کە (**كَرْم**)ی پێ دەڵێن و بە (**كروم**) کۆ دەکرێتەوە، بەڵام لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە حیکمەتی ئەوە باس بکرێ: بۆچی خوا ﷻ وەك چۆن باسی دارخورماو دارزەیتوون دەکات، بۆچی باسی درەختی مێویشی نەکردوە؟ پێم وایە هۆکارەکەی ئەوەیە دارمێو، میوەکەی کە ترێیەکەیە، زیاتر بەرچاوەو دیمەنێکی جوانی هەیە، هێشووی گەورە گەورەو جوانن، ئەگەر ترێی سپییە، ئەگەر ڕەشە، ئەگەر ترێی بێ دەنکە، ئەو هەموو جۆرە ترێیانەی هەن، ترێیەکە زیاتر سەرنجڕاکێشەو دیمەنێکی جوانی هەیە، نەك درەختی مێوەکە کە لاسکێکی باریکی هەیەو، هیچ جوانیی و ڕەونەقێکی تێدانیە، وەك وایەری کارەبا بڵاو دەبێتەوە!

(قَضْب): (**القَضْبُ: هو كل ما أكِلَ من النبات رطباً كالقثاء والخيار ونحوهما، سمِّي قضباً لأنه يُقْضَبُ أي يُقْطَعُ مرة بعد أخرى**)[1]، واتە: (قضب): بریتیە لەو ڕووەکەی بە تەڕیی دەخورێ، وەك: ترۆزیی و خەیار (هاروێ) و شێوەی ئەوان (کاڵەك و شووتیی و تەماتەو هەموو تەڕەکارەکانی دیکە، کە بە قەپاڵ دەخورێن)، بۆیەش پێی گوتراوە: (قضب)، چونکە بە زار بە قەپاڵتە دەبڕدرێ و دەخورێ.

---

(١) محاسن التأويل، جمال الدين القاسمي، المجلد: ١٠، الجزء: ٣٠، ص٦١.

هەندێکی دیکەش وشەی: (**قضب**)یان بە لەوەڕ لێکداوەتەوە، وەك: وێنجەو سێوەڕەو وێنەکانیان کە ئاژەڵ دەیانخوات.

بەڵام (**قضب**) لەو ڕووەك و تەڕەکارانەی بە قەپاڵ و زار دەخورێن، نیزیکترە چونکە لەگەڵ ترێ دا هاتووەو، ترێش مرۆڤ دەیخوات، دواییش باسی لە وەڕگای ئاژەڵ دەکات، ئاڵفێك کە ئاژەڵ دەیخوات.

**٦)-** ﴿ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴾، (هەروەها خوا) زەیتوون و دارخورماش(ی بۆ ڕواندوون لە زەویدا).

**٧)-** ﴿ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴾، دیسان باخە چڕوپڕەکان، ﴿ وَحَدَآئِقَ ﴾، کۆی (**حديقة**)یەو بە باخێك دەگوترێ جۆرەکانی مێوەی تێدابن، بەڵام دەوری بە دیوار تەنرابێ، ﴿ غُلْبًا ﴾، کۆی (**غلباء**)، (**أي ضخمة عظيمة**)، قەبەو مەزن، یانی: باخە چڕو پڕەکان کە درەختی قەبەو زلیان تێدان.

**٨)-** ﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴾، هەروەها جۆرەکانی میوەو لەوەڕ، واتە: لەوەڕێك کە ئاژەڵەکان دەیخۆن.

**٩)-** ﴿ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴾، (ئەمەش هەمووی) بەهرەگەیاندنە بە خۆتان و ئاژەڵەکانتان، وشەی: ﴿ مَّتَٰعًا ﴾، لە ڕووی ڕێزمانییەوە دوو حاڵەتی هەن:

**١-** حاڵەتی یەکەم: یان بەرکاری پێناو (**مفعول له**)ە، بۆ (**أَنْبَتْنا**)، یانی: (**أنبتنا فيها هذه الأشياء** مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ)، ئەو شتانەمان لە زەویدا ڕواندوون، بۆ بەهرە وەرگرتن و سوودمەند بوونی خۆتان و ئاژەڵەکانتان.

**٢-** حاڵەتی دووەم: {﴿ مَّتَٰعًا ﴾، **مصدر حذف فعله وجُرِّد ومن الزوائد**)، چاوگەو کردارەکەی قرتێنراوەو زیادەکانی لابراون، کەواتە: ئاوای لێدێتەوە: (**متَّعَكُم بذلك مَتَاعًا**)، خوا بەهرەمەندی کردوون بە بەهرەمەند کردن.

دوو قسەی گێڕراوە لە ئەبوو بەکرو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێ و بەرپەرچدانەوەی هەندێك قسەی شیعە:

دوو قسـەی پاڵـدراو بـۆ لای ئەبـو بەکـر و عومـەر و بەرپەچدانـەوەی قسـەی بەدگومانـاوی شـیعەکان لێـرەدا بـەر لـەوەی ئـەم مەسـەلەیەی سـێیەمە بـە جـێ بهێڵێـن و بچینـە سـەر مەسـەلەی چـوارەم و کۆتایـی، بـە باشـی دەزانـم دوو قسـە، کـە لـە زۆربـەی تەفسـیرەکاندا هاتـوون، ئێمـەش بیانهێنیـن و هەندێـك قسـەیان لەسـەر بکەیـن:

دەقـی یەکـەم: (**رُوِيَ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ سُئِلَ عَنِ الْأَبِّ: مَا هُوَ؟ فَقَالَ: «أَيُّ سَمَاءٍ تُظِلُّنِي، وَأَيُّ أَرْضٍ تُقِلُّنِي إِذَا قُلْتُ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَا لَا عِلْمَ لِي بِهِ»**)، (**فتح القدير: ج٥، ص٤٦٩، روح المعاني: ج١٥، ص٣١٨**).

واتـە: گێڕدراوەتـەوە کـە پرسـیار کـرا لـە ئەبـوو بەکـری صیددیـق (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لـە بـارەی (**أبّ**)ەوە چییـە؟ ئەویـش گوتـی: چ ئاسـمانێك سـێبەرم لـێ دەکات و، چ زەوییـەك هەڵـم دەگـرێ، ئەگـەر لـە کتێبـی خـوادا شـتێك بڵێـم کـە زانیارییـم لـە بارەیـەوە نیـە!! واتـە: نازانـم و بەبـێ زانیارییـش قسـە ناکـەم لـە بـارەی هیـچ ئایەتێکـەوە لـە کتێبـی خـوادا.

دەقـی دووەم: (**رُوِيَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَرَأَ يَوْمًا عَلَى الْمِنْبَرِ: فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا إِلَى وَأَبًّا، فَقَالَ: كُلُّ هَذَا قَدْ عَرَفْنَاهُ، فَمَا الْأَبُّ؟ ثُمَّ رَفَعَ عَصًا كَانَتْ فِي يَدِهِ، وَقَالَ: هَذَا لَعَمْرُ اللَّهِ هُوَ التَّكَلُّفُ، فَمَا عَلَيْكَ يَا ابْنَ أُمِّ عُمَرَ أَنْ لَا تَدْرِيَ مَا الْأَبُّ، ابْتَغُوا مَا بُيِّنَ لَكُمْ مِنْ هَذَا الْكِتَابِ، فَاعْمَلُوا بِهِ، وَمَا لَمْ تَعْرِفُوهُ، فَكِلُوهُ إِلَى رَبِّهِ»**) (**أخرجه ابن سعد، وسعيد بن منصور: ٤٣، عبد بن حميد، وابن جرير: ٣٦٤٩٧، والحاكم: ٣٨٩٧**).

واتـە: گێڕدراوەتـەوە کـە عومـەری کـوڕی خەتتـاب (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لەسـەر مینبـەر (ئـەو کاتـەی خەلیفـەی مسـوڵمانان و حوکمڕانیـان بـووە)، ئـەو ئایەتانـەی خوێندنـەوە: ﴿ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ﴿٣١﴾ ﴾، دوایـی گوتـی: هەمـوو ئەوەمـان زانـی، بـەڵام (**أبّاً**) چییـە؟ دوایی

گۆچانێكی بە دەستەوە بوو فڕێی داو گوتی: بە خوا ئەوە زۆر لە خۆ كردنە، چیت لەسەرە ئەی كوڕی دایكی عومەر ئەگەر نەزانی، (أَب) چییە؟ لەو كتێبەی خوادا ئەوەی بۆتان ڕوونكراوەتەوە شوێنی بكەون و كاری پێبكەن و، ئەوەش كە نایزانن، بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەكەی (كە خوای زاناو شارەزایە).

ئەم دوو دەقە هاتوون و، لە تەفسیرەكان دا كە باون، بینیم زۆربەیان هێناویانن.

لێرەدا دەمەوێ هەڵوێستەیەك بكەین، لە بەرانبەر تەفسیرەكانی شیعەكاندا، كە بە داخەوە چونكە بناغە لە لای ئەوان بەد گومانییە، بە تایبەتی بەرانبەر بە (ئەبوو بەكر و عومەر) خوا لێیان ڕازی بێ، دوو هاوەڵ و كەسایەتییە هەرە نیزیك و خۆشەویستەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ و دوو وەزیرەكەی و، بە گشتییش بەرانبەر بە هاوەڵان، لەبەر ئەوەی بناغە لەلای وان لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا كردنە، با تەماشا بكەین لەو بارەوە لە تەفسیرەكانیان دا چی دەڵێن؟

دوو نموونان دێنمەوە:

أ- تەفسیری (**الميزان**)ی (**محمد حسين الطباطبائي**)[1]، لە بارەی ڕیوایەتەكەی كە لە ئەبوو بەكرەوە هاتوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ:

**(أَنَّ أَبَا بَكْرٍ سُئِلَ عَنِ الْأَبِّ: مَا هُوَ؟ فَقَالَ: «أَيُّ سَمَاءٍ تُظِلُّنِي، وَأَيُّ أَرْضٍ تُقِلُّنِي إِذَا قُلْتُ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَا لَا عِلْمَ لِي بِهِ»فَبَلَغَ أَمِيرِ المؤمنين مَقَالَهُ فِي ذَلِكَ، فقال: سُبْحَانَ اللهِ أَمَا عَلِمَ أَنَّ الأَبَّ هُوَ الكَلَأُ المَرْعى)، (إرشاد المفيد).**

واتە: گێڕدراوەتەوە كە پرسیار كراوە لە ئەبوو بەكری صیدیق (خوا لێی ڕازی بێ)، لە بارەی (أب)ەوە چییە؟ ئەویش گوتی: چ ئاسمانێك سێبەرم لێ دەكات و، چ زەوییەك هەڵم دەگرێ، ئەگەر لە كتێبی خوادا شتێك بڵێم، زانیاریم لە

(١) المجلد: ٢٠، الجزء: ٣٠، ص: ٢١١، ٢١٢.

بارەیـەوە نەبـێ؟ (واتـە: نازانـم و بەبـێ زانیارییـش قسـە ناکـەم لـە بـارەی هیـچ ئایەتێکـەوە لـە کتێبـی خـوادا)، ئنجا ئـەوە دەگاتـەوە بـە ئەمیـری بـڕواداران عەلـی (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، ئەویـش دەڵـێ: سـبحان اللـه ئـەدی نەیدەزانـی کـە (**أبّ**)، بریتیـە لـە لـەوەڕگاو ئـەو لـەوەڕەی ئـاژەڵ دەیخـۆن!

لـە بـارەی قسـەکەی عومـەرەوەش (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، کـە گوتوویەتـی: ئـەوەی لـە کتێبـی خـوا بۆتـان ڕوونکراوەتـەوە شـوێنی بکـەون و، ئـەوی دیکـەش بگێڕنـەوە بـۆ لای خاوەنەکـەی.

دەڵـێ: (**أقـول: هـو مبنيٌّ عـلى منعهـم عـن البحـث عـن معـارف الكتـاب حتـى تفسـير ألفاظـه**)، واتـە: دەڵێـم: ئـەو قسـەیە بنیاتـنراوە لەسـەر ڕێگرتنیـان لـە لێکۆڵینـەوە لـە بـارەی زانسـتەکانی کتێبـی خـواوە، تەنانـەت ڕوونکردنـەوەی بێژەکانیـشی!!

**ب-** تەفسیری (نمونە) کە تەفسیرێکی فارسییەو (**ناصری مکارمی شیرازی**) سەرپەرشتیی دەکات، کە ئێستاش لە ژیاندایە[1]، دوای ئەوەی ئەو دوو ڕیوایەتە دێنێ، لە ئەبوو بەکرو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ:

(**إیـن نشـان مـی دهـد کـه أو مفهـوم کلمـه (أب) را** چیـز پیچیـدەاي **میدانسـت، درحـالی کـه بـا مراجعـة بـه متـون لغـت روشـن میشـود کـه مطلـب** پیچیـدەای **نیسـت**)،

واتـە: ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە ئـەو [واتـە: عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بـێ) و هەروەهـا ئەبـوو بەکریـش (خـوا لێـی ڕازی بـێ)] شـارەزای مانـای وشـەی (**أَبّ**) نەبـووەو، بـە شـتێکی ئاڵـۆزی زانیـوە، لـە حاڵێکـدا بـە گەڕانـەوە بـۆ فەرهەنەگەکانـی زمـان، ڕوون دەبێتـەوە کـە شـتێکی هێنـدەش زەحمـەت نیـە، دوایـی دەڵـێ: {بـەڵام هـەر چـۆن بـێ جێـی ئـەو پرسـیارە هـەر هەیـە، کەسـێك کـە بەناوونیشـانی پێشـەوای مسـوڵمانان و خەلیفـەو حوکمڕانـی مسـوڵمانان بیـەوێ حوکمداریـی بـکات،

---

(١) ج ٣٦، ص ١٥١، ١٥٢.

چـۆن دەبـێ وشـەیەك كـە لـە دەقـی قورئـان دا هاتـووەو هێنـدەش ئاڵـۆز نیـە، مانـای ئـەو وشـەیە نەزانـێ؟، ئەمـە بەڵگـەی ئەوەیـە كـە دەبـێ لـە هـەر ڕۆژگارو زەمانێكـدا پێشـەوایەكی خوایـی لـە نێـو خەڵكـدا هەبووبـێ، كـە لـە هەمـوو مەسـەلە شـەرعییەكاندا ئاگاداربـێ و، لـە هـەر هەڵـەو لادانێـك پارێـزراو بـێ}.

ئـەوە هـەردوو قسـەكەی تەفسـیرەكانی (المیـزان) و (نمونـە) لـە بـارەی هـەردوو هەڵوێسـتی ئەبـوو بەكـرو عومـەرەوە (خـوا لێیـان ڕازی بـێ).

منیش لێرەدا دەڵێم:

١- جارێ قسەكەی ئەبوو بەكر[1] (خوا لێی ڕازی بێ)، كە دەڵێ: چ ئاسمانێك سێبەرم لێ دەكات و، چ زەوییەك هەڵم دەگرێ، لە بارەی كتێبی خواوە شتێك بڵێم، كە نایزانم؟ لە ڕاستییدا لە جیاتی ئەوەی بە نوقصانیی بۆ ئەبوو بەكر دابنرێ، سیفەتێكی بەرزی ئەبوو بەكر بووە (خوا لێی ڕازی بێ) بووە، كە ئامادە نەبووە شتێك نەیزانێ و قسەی لێ بكات.

٢- ئایا نەك هەر ئەبوو بەكرو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، هیچ كەسێك هەیە هەرچی لە كتێبی خوادا هەیە، هەر هەمووی بزانێ، مەگەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ؟ بێگومان هیچ كەسێك نیە، نە عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)و نە جگە لە ویش و هیچ كەس، ئیددیعای ئەوەی نەكردوە بڵێ: هەرچی لە كتێبی خوادا هاتوە، هەموو مانایەكانی دەزانم، چونكە لە ڕاستییدا تەنیا خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بە هەموو نهێنییەكان و پەنهانەكانی فەرمایشتی خۆی ئاگادارە.

٣- ئەبوو بەكرو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێشەنگی هاوەڵان بوون كە خەڵكیان لە قورئان و سوننەتدا شارەزاو ئاگادار كردوە، ئەوەش كە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: شتێك كە نایزانن لێی گەڕێن و، ئەوەی دەیزانن كاری پێ بكەن، ویستوویەتی خەڵك خەریكی كاركردن بە قورئان بێ، نەك لەو شتانە بكۆڵێتەوە كە نایانزانێ و كاتی خۆیان بە فیڕۆ بدەن، وەك دوایی مسوڵمانان كردیان! بە دڵنیایی ئەوەی عومەر گوتوویەتی (خوا لێی ڕازی بێ)، هەق و ڕاستەو، دیارە عومەر (خوا لێی

---

(١) ئەگەر لە ڕووی سەنەدەوە چەسپاو و ڕاست بێ.

ڕازی بێ)، زانیویەتی کە ئەو قورئانە تەنیا بۆ ڕۆژگاری ئەوان نەهاتوە، بەڵکو بۆ هەموو ڕۆژگارەکان هاتوە، بۆیە هەندێك نهێنیی تێدان، مەرج نیە ئەو کاتە دەربکەون و دوایی دەردەکەون.

**٤-** ئایا ئەوە بەد گومانیی نیەو لە پشت پەردەوە تەماشای کردن نیە، ئەمە بکرێتە بەڵگە، لەسەر ئەوەی ئەوان نەیانویستوە خەڵك لە قورئان تێبگات؟!، بەڕاستیی ئەوە درۆیەکی شاخدارەو گومانێکی زۆر خراپە، بەداخەوەش ئەوە نوختەی بێهێزی شیعەیە، شیعەی دوازدە ئیمامیی کە گومانیان خراپە بەرانبەر بە هاوەڵان و لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشایان دەکەن، ئەگەرنا ئەو دوو هەڵوێستەی ئەبوو بەکر و عومەر، لە جیاتی خاڵی بێهێزیان بن، خاڵی بەهێزیانن، ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، کە دەڵێ: قسە لە شتێك ناکەم کە نایزانم، لە کتێبی خوادا، عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ)، کە دەڵێ: ئەگەر مانای وشەی (**أب**)یشمان نەزانی، چ زیانی هەیە؟ خەریکی ئەوە بن کە دەیزانن و کاری پێ بکەن، لەوی دیکە بگەڕێن، لە ڕاستییدا ئەوە دوو هەڵوێستی زۆر زانایانەو سەر ڕاستانەو حەکیمانەن و دەبووایە مەدح بکرێن لەسەری، بەڵام هەرکات ئینسان لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای کەسێکی کرد، هەرچەندە دیمەنێکی جوانیشی هەبێ، هەر ڕەش و تاڵخ دێتە بەرچاوی.

## مەسەلەی چوارەم و كۆتایی:

**كاتێـك هاڕژنـە بێڕەزایەكـەی قیامـەت دێ، مـرۆڤ لـە بـرای و بـابی و دایكـی و هاوسـەری و ڕۆڵەكانـی، ڕادەكات، چونكـە هـەر كەسـە بـە خۆیـەوە سـەرقاڵە، خەڵكیـش دابـەش دەبـن بـۆ دوو كۆمـەڵ: یەكەمیـان: ڕوو پڕشـنگدارانی دەم بـە پێكەنیـن و شـادمان، كـە بڕوادارانـن، دووەم: ڕوو تڵخانـی ڕەشـداگەڕاوی مەینەتبـار، كـە بێبڕوایانـی تاوانبـارن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ ﴿٤٠﴾ تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

**١)-** ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ﴾، ئنجا هەر كاتێك هاڕژنەكە (**الصَّاخة**) هات، (**الصَّاخة**)، دەڵێ: (**صيحة شديدة تصخُّ الأسماع أي تَصُمُّها**)، (**صاخّة**)، دەنگێكی گەورەیە، چریكەو هاڕژنێكی گەورەیە، گوێیان كەڕ دەكات، دەگوترێ: (**صخّ يصخُّ أي: صَمَّ يَصم**)، واتە: كەڕ بوو، كەڕ دەبێ، (**صاخّة**) یەكێك لە ناوەكانی ڕۆژی دواییەو، وا پێدەچێ بە پێی ڕەوتی ئایەتەكان مەبەست پێی قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی بێ، واتە: قۆناغی قیامەت، چونكە لە قۆناغی قیامەتدا مرۆڤ لە برای و دایكی و بابی و خێزانی و ڕۆڵەكانی، ڕادەكات.

**٢)-** ﴿يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ﴾، ئەو ڕۆژەی مرۆڤ لە چەنگ برایەكەی ڕادەكات، (**الفرارُ**): (**الهُرُوبُ مِن مُخِيف**)، (**فرار**) ڕاكردن و هەڵاتنە لە شتێك كە مەترسیی لێ دەكرێ.

**٣)-** ﴿وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ﴾، هەروەها لە دایكیشی و لە بابیشی (ڕادەكات).

**٤)-** ﴿وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ﴾، دیسان لە هاوژینەكەشی و لە كوڕەكانیشی (ڕۆڵەكانیشی) ڕادەكات، لێرەدا خوا ﷻ ڕیزبەندییەكەی بەو شێوەیە هێناون: ئەو ڕۆژەی مرۆڤ لە

برای و لە دایكی و لە بابی و لە هاوسەری و لە ڕۆڵەكانی، ڕادەكات بۆ لێ ڕاكردن، ئەوەی دوورترە پێشیخستوەو ئەوەی نیزیكترە، دوایخستوە، بۆچی؟

چونكە مرۆڤ ئەگەر كۆمەڵێك خەڵكی نیزیكی خۆی بە دەورەوە بێ، پێشێ دەستبەرداری ئەوەیان دەبێ، كە دوورترە، ئنجا دوایی ئەوی دی و، دوایی ئەوی دی و، لە دواجاردا دەستبەرداری ئەوەیان دەبێ كە لە هەموویان لێی نیزیكترو لە لای خۆشەویستترە، لێرەش دەفەرموێ: ئەو ڕۆژەی مرۆڤ لە برای ڕادەكات، پێشێ لە برای ڕادەكات، دوایی لە دایكی، ئنجا لە بابی، ئنجا لە هاوسەری و، كۆتاجار لە جگەر گۆشەكانی و ڕۆڵەكانی، چونكە لە هەموویان لە لای خۆشەویستترن.

بەڵام لە سوورەتی (**المعارج**)دا، ئایەتەكانی: (١١، ١٢، ١٣، ١٤)دا ڕیزبەندییەكەیان بە پێچەوانەوە دانراوە، لێرە لە دوورەوە بۆ نیزیك، بەڵام لە وێ لە نیزیكەوە بۆ دوور، لەوێ دەفەرموێ: ﴿يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا مرۆڤی تاوانبار خۆزگە دەخوازێ لە سزاو ئازاری ئەو ڕۆژە، ڕۆڵەكانی بكاتە بەلاگێڕی، ئنجاهاوژینەكەی، هاوەڵە هاوسەرەكەی، ئنجا برایەكەی و ئەو عەشیرەتەی ئەویان گرتۆتە خۆیان و، هەر كەسێك لە زەویدا هەیە لە دۆست و ئاشناو لە دوورو نیزیك، هەموو ئەوانە بكاتە بەلاگێڕی خۆی و ئەوە دەربازی بكات.

بۆ كردنە بەلاگێڕ، مرۆڤ لەوێ كاتەكەی هێندە سەغڵەتییە، كێ نیزیكترە، ئامادەیە بیكاتە بەلاگێڕی، بەڵام بۆ لێ ڕاكردن، مرۆڤ پێشێ لە دوورترە كە ڕادەكات، ئنجا لە نیزیكەكە، تاكو كۆتایی.

٥)- ﴿لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾، بۆ هەر مرۆڤێك لەوان لەو ڕۆژەدا، حاڵێك هەیە سەرقاڵی دەكات، (**الطبري**) لە (**قتادة**) بە ژمارە: (٣٦٥٠١)، دەڵێ: (**أُفْضِيَ إلى كل**

**إنسان ما يشغله عن الناس**)، بۆ هەر مرۆڤێك حاڵێك هێنراوەتە پێشێ سەرقاڵی دەكات و، بێئاگای دەكات و نایپەڕژێتە سەر خەڵك؟

كـە دەفەرمـوێ: ﴿لِكُلِّ ٱمۡرِيٖٕ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ﴾، یـانی: هـەر مرۆڤێـك لـەوان كارێـكی هەیـە لـەو ڕۆژەداو حاڵێـكی هەیـەو، ئـەو حاڵـەی خـۆی بەسـە بـۆ ئـەوەی گرنگیـی پـێ بـدات و نەیپەڕژێتـە سـەر كەسـی دیكـە.

٦)- ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ﴾، ڕووانێك لەو ڕۆژەدا گەش و جوان و درەوشاوەن.

٧)- ﴿ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ﴾، پێكەنیون و دڵخۆشن، موژدە پێدراون، بێگومان مرۆڤ كاتێك دڵی خۆش بێ، ڕووشی گەش دەبێ، تەنانەت پێغەمبەری خاتەم ﷺ كاتێك دڵی خۆش دەبوو، دەم و چاوی وەك پارچەیەك مانگ دەدرەوشایەوەو، ئەگەر خەفەت و ناڕەحەتییەكی ببووایە، دەم و چاوی تاریك دادەهات، بە تایبەت بۆ ئینسانی ڕاستگۆ، ئینسانێك كە ڕواڵەت و دەروونی پێكەوە جووتبن، وایەو هەر شتێك لە دڵیدا هەبێ، لەسەر دەم و چاو و ڕواڵەتیشی دەردەكەوێ، بەڵام ئینسان خاوەن دوو فلیقانەیی و دوو ڕوو، دەگونجێ ئەوەی لە دڵی داهەیە، پێچەوانەی ئەوە دەربخات، ڕقی لە كەسێك بێ، بەڵام وای پێشان بدات  خۆشیدەوێ و، شتێكی خۆشبوێ، بەڵام وا دەریبخات ڕقی لێیەتی، بەڵام ئینسانی ڕاست، دڵ و زمانی یەكن، ڕواڵەت و دەروونی یەكن.

٨)- ﴿وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ﴾، ڕووانێكیش لەو ڕۆژەدا هەن، تۆزو خۆڵیان لێ نیشتوە.

٩)- ﴿تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ﴾، دوو كەڵ چۆتە سەریان. واتە: وەك چۆن كەسێك كە تۆزو خۆڵی لێ دەنیشێ و، كەسێك كە تەم و دووكەڵ دایدەپۆشێ، بەو شێوەیە دەم و چاویان تڵخ و ناشیرینە، بێگومان لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە،  لە دەروونیان دا خەم و ناسۆرو ناڕەحەتیی هەیەو، ئەو خەم و ناسۆرو ناڕەحەتییەش لەسەر دەم و چاویان بە شێوەیەك كە ڕەش دادەگەڕێن و تڵخ دەبن و ناشیرین دەبن، ئاوا دەردەكەوێ.

(غُبـار)، تـۆزو خـۆڵ، ﴿ قَتَرَةٌ ﴾، دوو کـەڵ و ڕەشـایی، یانـی: لـە خەفـەت و ناڕەحەتییـان شـێوەی تـۆزو خـۆڵ و دووکـەڵ دەچێتـە سـەر دەم و چاویـان.

١٠)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ﴾، ئا ئەوانەن بێبڕوایان و تاوانباران، واتە: لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە خراپ بوون و، بێبڕوا بوون و، لە ڕووی کردارو ئاکاریشەوە تاوانبارو لادەر بوون.

**(الطبري)** لـە **(إبـن زيـد)**ەوە بـە ژمـارە: (٣٦٥٠٧)، دەڵـێ: **(هَـذِهِ وُجُوهُ أَهْلِ النَّارِ؛ قَـالَ: وَالقَـتَرَةُ مِـنَ الغَـبَرَةِ، قَـالَ: وَهُـمَا وَاحِـدٌ؛ قَـالَ: فَأَمَّـا فِي الدُّنْيَـا فَـإِنَّ القَـتَرَةَ: مَـا ارْتَفَـعَ، فَلَحِـقَ بِالسَّـمَاءِ، وَرَفَعَتْـهُ الرِّيـحُ، تُسَـمِّيهِ العَـرَبُ القَـتَرَةَ، وَمَـا كَانَ أَسْـفَلَ فِي الْأَرْضِ فَهُـوَ الغَـبَرَةُ)**.

واتـە: ئـەوە مەبەسـتی دەم و چاوەکانـی ئەوانەیـە کـە خەڵکـی ئاگـری دۆزەخـن ﴿ قَتَرَةٌ ﴾، لـە ﴿ غَبَرَةٌ ﴾یـە، هەریەکـن و یـەك شـتن {بـە قسـەی **(إبـن زيـد)**}، بـەڵام لـە دنیـادا ﴿ قَتَرَةٌ ﴾، بـەو تـۆزو خۆڵـە دەگوتـرێ کـە بەرزدەبێتـەوە بـەرەو سـەرێ و بـا بـەرزی دەکاتـەوە، بـەڵام ئـەوەی نـزم دەبێتـەوە بـۆ زەوی پێـی دەگوتـرێ: ﴿ غَبَرَةٌ ﴾.

بـەڵام مـن پێـم وایـە: ﴿ غَبَرَةٌ ﴾، بـە مانـای تـۆزو گـەردو خـۆڵ دێ، ﴿ قَتَرَةٌ ﴾ش بـە مانـای دوو کـەڵ و ڕەشـایی و تڵخایـی دێ، هـەر کەسـێك بـەس تـۆز و خـۆڵ لـە دەم و چـاوی بنیشـی، دەم و چـاوی تڵـخ و ناشـیرین دەبـێ، چ جـای دووکـەڵ و تەنـووش لـە دەم و چـاوی بنیشـێ!.

لە کۆتایی ئەم دەرسەشماندا ئەم دەقە دێنین:

**{عَـنْ سَـوْدَةَ رضي اللـه عنهـا، زَوْجِ النَّبِـيِّ ﷺ قَالَـتْ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: يُبْعَـثُ النَّـاسُ حُفَـاةً عُـرَاةً غُـرْلًا، يُلْجِمُهُـمُ الْعَـرَقُ، وَيَبْلُـغُ شَـحْمَةَ الْأُذُنِ «قَالَـتْ: قُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ! وَاسَـوْءَتَاهُ يَنْظُـرُ بَعْضُنَـا إِلَى بَعْـضٍ، قَـالَ: «شُـغِلَ النَّـاسُ عَـنْ ذَلِـكَ» وَتَـلَا رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: يَـوْمَ يَفِـرُّ الْمَـرْءُ مِـنْ أَخِيـهِ وَأُمِّـهِ وَأَبِيـهِ وَصَاحِبَتِـهِ وَبَنِيـهِ لِـكُلِّ امْـرِئٍ مِنْهُـمْ يَوْمَئِـذٍ شَـأْنٌ**

**يُغْنِيهِ، عبس: ٣٥} (أخرجه الطبراني: ٩١، قال الهيثمي (١٠/٣٣٣): رجاله رجال الصحيح غير محمد بن عباس وهو ثقة، والحاكم: ٣٨٩٨، وقال: صحيح على شرط مسلم، وأخرجه أيضًا: ابن أبي عاصم في الآحاد والمثاني: ٣٠٦٦).**

واتە: دایکی بڕواداران سەودە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك فەرمووی: خەڵك ڕۆژی قیامەت کۆدەکرێنەوە بە پێخواسیی، بە ڕووتیی، بە خەتەنە نەکراویی، لە کاتێکدا ئارەقەیان دەگاتە چەناگەیان و، جڵەویان دەکات و دەگاتە نەرمەی گوێیان، دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەی هاوار بۆ ئێمە، هەندێکمان تەماشای هەندێکمان دەکەین!، ئەویش فەرمووی: خەڵك لەو ڕۆژەدا سەرقاڵ دەکرێن لەوە، (نایانپەرژێتە سەر ئەوە)، دوایی ئەو ئایەتانەی خوێندنەوە: ﴿يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾﴾، تا کۆتایی.

لێرەدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (عبس) دێنین و، لە خوای پەروەردگار داواکارین یارمەتییمان بدات بە لوتف و کەرەمی خۆی، هەرچی زیاتر لەو فەرمایشتەی کۆتایی خوا تێبگەین و بە هۆیەوە پێبگەین و، هەم خۆمان پێ پاك و چاك بکەین و، هەم دەوروبەریشمانی پێ پاکسازیی و چاکسازیی بکەین.

خوا بە بەزەیی خۆی یارمەتییمان بدات، بە شێوەیەك ئەم ژیانی دنیایەمان بگوزەرێنین، لە ڕۆژی دوایی دا لەو کەسانە بین، دڵخۆشن دەم بە پێکەنین و، ڕوو درەوشاوەو گەش دەبن و، بمانپارێزێ لەوەی تەمی خەم لەسەر دەم و چاومان بنیشێ و، داخ و خەفەت و حەسرەت هەڵکێشین، لەسەر ئەوەی ژیانی دنیامان بە جۆرێك بەڕێکردوە، خوا پێی ناخۆش بووەو، خۆشمان لێی چووینە زەرەرێ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێك

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ (١٨)ی مانگـی (**ذي القعـدة**)ی سـاڵی (١٤٤١)ی كۆچیـی، بەرانبـەر (٩)ی حوزەیرانـی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زایینییـە، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەكەیـن بـە تەفسـیركردنی سـوورەتی (**التكويـر**).

## پێناسەی سوورەتی (التكوير) و بابەتەكانی

### یەكەم: ناوی:

ئـەم سـوورەتە زیاتـر بـە (**سـورة التكويـر**) نـاسراوە، بـەڵام هـەركام لـە: (**سـورة** إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ) و (**سـورة كورت**)یشـی بـۆ بەكارهێـنراوە، لـەو بارەشـەوە ئـەم دەقـە دێنیـن:

عەبدوڵـڵای كـوڕی عومـەر (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، دەگێڕێتـەوە، كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: {**مَـنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُـرَ إِلَى يَـوْمِ الْقِيَامَـةِ كَأَنَّـهُ رَأْيُ عَـيْنٍ، فَلْيَقْـرَأْ:** ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ١﴾، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١﴾، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾} (**أخرجـه أحمـد: ٤٨٠٦، قـال الهيثمـي ج٧، ص١٣٤: رواه أحمـد بإسـنادين ورجالهـما ثقـات، والترمـذي: ٣٣٣٣، وقـال: حسـن غريـب، والحاكـم: ٨٧١٩، وقـال: صحيـح الإسـناد، وأبـو نعيـم في الحليـة ج٩، ص٢٣١**).

واتـە: هـەر كەسـێك پێیخۆشـە، تەماشـای ڕۆژی قیامـەت بـكات، وەك ئـەوەی بـە چـاو ببینـێ (بـە چـاوی سـەر) بـا سـوورەتی: ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ١﴾، و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١﴾، و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾، بخوێنێتـەوە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە مەككەییە بەبێ ڕاجیایی، لەو بارەشەوە ئەم دەقە هەیە:

**(عَنْ عَبْد اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: نَزَلَتْ سُورَةُ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرت بِمَكَّةَ)(ذكره السيوطي في الدر المنثور: ج٨، ص٤٢٥، ونسبه لابن الضريس والنحاس وابن مردويه والبيهقي، وقال: أخرج ابن مردويه عن عبد الله بن الزبير رضي الله عنهما، وعائشة رضي الله عنها مثله)**[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ گوتوویەتی: سوورەتی ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ۝١﴾، لە شاری مەککە دابەزیوە.

هەروەها **(السيوطي)** هەمان قسەی لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺو، لە عائیشە (دایکی بڕوادارانەوە)ش (خوا لێی ڕازی بێ) هێناوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سوورەتە موبارەکە لە (مصحف)دا، ڕیزبەندییەکەی ژمارە (٨١)ە، لە سوورەتی **(فاتحة)**ەوە کە دێی، لە دابەزینیشدا ژمارەکەی حەوت (٧)یان بۆ داناوە، پێش سوورەتی **(الأعلى)** و دوای سوورەتی **(الفاتحة)** دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە بە بیست و نۆ (٢٩) دانراوە، نەمزانیوە ڕاجیاییەك لەو بارەوە هەبێ.

---

(١) وێڕای (الدر المنثور)، لە كتێبی: (الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٥٠٠)یش دا هاتوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سووڕەتە دوو بابەتی گەورەو گرنگی گرتوونە خۆی:

بابەتـی یەکـەم: باسـی ڕۆژی دوایـی بـە هـەردووك قۆناغـی ئاخیـر زەمـان و قیامەتـەوە، کـە هـەر کامیان بە شـەش لـە ڕووداوە گـەورەو گرنگەکانیان وەسـفکراون، لـە ئایەتەکانـی: (١ - ١٤)دا.

بابەتـی دووەم: باسـی قورئـان و هێنانـی لـە لایـەن جیبریلـەوە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ و، وەسـفکرانی جیبریـل بـە شـەش سـیفەتی گـەورەو گرنگـی و، پووچەڵکردنـەوەی تۆمەتـی شـێتیی پاڵدانـە لای موحەممـەد ﷺو، قسـەی شـەیتان بـوون پاڵدانـە لای قورئـان.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لە تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە، چوار تایبەتمەندییمان کەوتوونە بەرچاو:

١- وەسفکردنی هەردووك قۆناغی ڕۆژی دوایی، یەکی بە شەش (٦) سیفەت.

٢- پێناسەو وەسفی جیبریل بە شەش (٦) سیفەتی بەرزی.

٣- کورتهەڵێنانی ئامانجی نێررانی قورئان لەوەدا، کە خەڵکی ڕێك و ڕاست بن.

٤- چەند وشەو تەعبیرێك کە تەنیا لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوون:

١- ﴿ كُوِّرَتۡ ﴾.

٢- ﴿ ٱنكَدَرَتۡ ﴾.

٣- ﴿ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ﴾.

٤- ﴿ سُجِّرَتۡ ﴾.

٥- ﴿ٱلْمَوْءُۥدَةُ﴾.

٦- ﴿كُشِطَتْ﴾.

٧- ﴿بِٱلْخُنَّسِ﴾.

٨- ﴿ٱلْكُنَّسِ﴾.

٩- ﴿عَسْعَسَ﴾.

١٠- ﴿بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ﴾.

١١- ﴿بِضَنِينٍ﴾، (بظنين)، بە (ضاد) و (ظاء).

١٢- ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾.

حەوتەم و كۆتایی: دابەشكردنی ئایەتەكان:

ئێمە كۆی بیست و نۆ (٢٩) ئایەتەكەی ئەم سوورەتە موبارەكە دەكەینە، یەك دەرس، كە دوو تەوەری سەرەكییە:

**تەوەری یەكەم:** ئایەتەكانی: (١ - ١٤)، خستنە ڕووی دوازدە (١٢) لە نیشانەكانی ڕووداوی ڕۆژی دوایی، لە هەر دووك قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەتداو، سەرەنجامەكەی.

**تەوەری دووەم:** ئایەتەكانی: (١٥ - ٢٩)، سێ سوێند خواردنی خوا ﷻ لەسەر ئەوەی قورئان قسەی جیبریلەو، خوا پێیدا ناردوە بۆ موحەممەد ﷺو، وەسفی جیبریل بە شەش سیفەت، پاشان پووچەڵكردنەوەی تۆمەتی شێتیی بۆ موحەممەد ﷺ و، تۆمەتی قسەی شەیتان بوون بۆ قورئان و، خستنەڕووی ئامانجی دابەزێنرانی قورئان، كە بریتیە لەوەی خەڵك ڕێك و ڕاست بن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە بیست و نۆ (٢٩) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە، (**سورة التكوير**) پێك دێ، کە وەك باسمان کرد، دوو بابەتی سەرەکیی دەخەنە ڕوو:

**بابەتی یەکەم:** لە ئایەتەکانی: (١ - ١٤)دا، لە بارەی ڕۆژی دواییەوە، خوا ﷻ شەش وەسف لە بارەی قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی، کە ئاخیر زەمانەو، تێکچوونی ئەم گەردوونەیە کە ئێمە دەیبینین، خوا شەش ڕووداوی لەوە خستوونەڕوو، لە بارەی قیامەتیشەوە دیسان شەش سیفەتی دیکەی خستوونەڕوو، بە هەردووکیان دەبنە دوازدە (١٢)، سەرەنجامەکەشی ئەوەیە: ﴿ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ ﴾، هەموو کەس زانی چی ئامادە کردوە؟

**بابەتی دووەم:** لە ئایەتەکانی: (١٥ - ٢٩)دا، واتە: پازدە (١٥) ئایەت، کە خوا ﷻ تێیان دا باسی وەحیی ناردنی بۆ موحەممەد ﷺ دەکات لە ڕێی جیبریلەوەو، جیبریل عليه السلام بە شەش لە سیفەتە بنەڕەتییەکانی پێناسە دەکات، دوایی خوا ﷻ تۆمەتی شێتیی پاڵدرانە لای موحەممەد ﷺ پووچەڵ دەکاتەوە، دوایی تۆمەتی قسەی شەیتان بوونی قورئان، دەپووچێنێتەوەو، ڕایدەگەیەنێ کە خوا ئەم قورئانەی دابەزاندوە، بیرەخەرەوەو پەندو ئامۆژگاریی بێ بۆ هەموو جیهانییان، بۆ هەر کەسێك بیەوێ ڕێك و ڕاست بێ، لەگەڵ خۆی و، لەگەڵ خوا و، لەگەڵ خەڵکداو، دەروونی و ڕواڵەتی و دڵی و قسەی و کردەوەی، ڕێك و ڕاست بن، ڕاستە ڕێی خوا لە دوو توێی کۆتا فەرمایشتی، لەبەر دەستی دایە.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتْ ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ﴿١٣﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ ﴿١٤﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. هەر كات خۆر پێچڕایەوە (و كوژێنرایەوە) ﴿١﴾ هەر كاتیش ئەستێرەكان هەڵوەرین (و پرژان) ﴿٢﴾ هەر كاتیش چیایەكان ڕۆێنران (و هەڵكەنران) ﴿٣﴾ هەر كاتیش (ماڵی بە قیمەت وەك) حوشترانی ئاوس (دەی مانگە) پەكخران (و وێڵ كران) ﴿٤﴾ هەر كاتیش (ئاژەڵە) كێوییەكان كۆكرانەوە ﴿٥﴾ هەر كاتیش دەریایەكان گڕیان بەردرایە ﴿٦﴾ هەر كاتیش نەفسەكان (لەگەڵ جەستەكانیان دا) جووت كران ﴿٧﴾ هەر كاتیش كچی زیندە بە چاڵكراو لێپرسرا ﴿٨﴾ بە چ گوناهێك كوژراوە؟ ﴿٩﴾ هەر كاتیش نامەكان (ی كردەوان) كرانەوە ﴿١٠﴾ هەر كاتیش ئاسمان كەوڵكرا ﴿١١﴾ هەر كاتیش دۆزەخ نێڵ درا ﴿١٢﴾ هەر كاتیش بەهەشت وەنیزیك خرا ﴿١٣﴾ هەموو كەس زانی چی

ئامادە کردوە (لە چاکەو خراپە) ﴿١٤﴾ وانیە (وەك ئێوەی بێبڕوا دەڵێن:) سوێند دەخۆم بە (ئەستێرە) خۆ پەنهانکەرەکان ﴿١٥﴾ خێرا ڕۆیشتووە خۆ پەنادەرەکان ﴿١٦﴾ هەروەها سوێند بە شەوگار کە ڕادەبڕێ ﴿١٧﴾ دیسان سوێند بە بەرەبەیان کە (شەبەق دەدات و) هەناسە دەداتەوە ﴿١٨﴾ بە دڵنیایی ئەو (قورئانە) قسەی نێرراوێکی بەڕێزو پەسندە ﴿١٩﴾ خاوەن هێزە، لە لای (خوای) خاوەن عەرش پێگەدارە ﴿٢٠﴾ لەوێ (لە ئاسمان) فەرمانبەرییکراوی ئەمیندارە ﴿٢١﴾ (بە دڵنیایی) هاوەڵەکەشتان (موحەممەد ﷺ) شێت نیە (وەك لاف لێدەدەن) ﴿٢٢﴾ بێگومانیش (موحەمەد) ئەو (جیبریل)ی لە ئاسۆی ڕوون دا (لەسەر شێوەی خۆی) بینی ﴿٢٣﴾ هەروەها ئەو (موحەممەد) لەسەر گەیاندنی (هەواڵی) نادیار چرووك نیە ﴿٢٤﴾ ئەو (قورئان)ەش قسەی شەیتانێکی نەفرینکراو نیە (وەك لاف لێدەدەن) ﴿٢٥﴾ ئنجا بەرەو کوێ دەڕۆن؟ ﴿٢٦﴾ ئەمە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان ﴿٢٧﴾ بۆ هەر کامێك لە ئێوە بیەوێ ڕێك و ڕاست بێ ﴿٢٨﴾ ناشتانەوێ مەگەر خوای پەروەردگاری جیهانییان بیەوێ ﴿٢٩﴾}.

## ڕوونکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(كُوِّرَتْ ): (كَوْرُ الشَّيءِ: إدَارَتُهُ، وَضَمُّ بَعْضِهِ إلى بَعْضٍ كَكَوْرِ العِمَامَةِ، (يَكَوِّرُ اللَّيلَ عَلَى النَّهَارِ ويكوِّر النهار على الليل)، (كَور)، واتە: سووڕاندنی شتێک و ئەوە کە شتێك هەندێکی بخرێتەوە سەر هەندێکی، وەك پێچەکانی مێزەر، خوا دەفەرموێ: ﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ﴿٥﴾﴾الزمر، شەوگار بە دەوری ڕۆژگاردا دەسووڕێنێ و، ڕۆژگاریش بە دەوری شەوگاردا دەپێچێ، دەگوترێ: (طَعَنَهُ فَكَوَّرَهُ)، واتە: لێیداو خڕی کردەوە، کەوتە سەریەك.

(أنكَدَرَتْ ): (الكَدَرُ ضِدُّ الصَّفَاءِ)، (كَدَر) پێچەوانەی (صَفَاء)ەو، (صفاء)یش واتە: ڕوونیی، بەڵام (كَدَر)، واتە: لێڵیی، (عَيْشٌ كَدِر)، ژیانێکی لێڵ (وَالكُدْرَةُ فِي اللَّوْنِ

خَاصـة)، (كُـدْرَة): زیاتـر بـۆ ڕەنـگ بەکاردەهێـنرێ، ڕەنگـی خاکیـی (الإنْكِـدَارُ: تَغِيـرُ وانْتِشَـارُ الـشَّيءِ)، شـتێك كـە دەگـۆڕێ و پـرژو بـڵاو دەبـێ، پێـی دەگوتـرێ: (إنْكَـدَرَ)، واتـە: پـرژا.

(ٱلْعِشَارُ): (العِشَـار جَمْـع عُـشَرَاء وَهِـيَ نَاقَـةٌ مَـرَّتْ مِـن حَمْلِهـا عَشْرَة أَشْـهُرٍ)، (عِشَـار) کـۆی (عُـشَرَاء)ە، زەیسـتاندار (نِفَـاس)، کـۆی (نُفَسَـاء)ە، ئنجـا (عُـشَرَاء)، حوشـترێك كـە دە مانـگ بەسـەر ئـاوس بوونییـدا تێپەڕیبـێ و حوشـتریش بـە دە (١٠) مانگیـی دەزێ.

(عُطِّلَتْ): پەكخـرا، ویڵكـرا، (العَطَـلُ: فُقْـدَانُ الزِّيْنَـةِ وَالشُّـغْلِ)، (عَطَـل): بریتیـە لـە نەمانـی جوانیـی و نەمانـی ئیـش، دەگوتـرێ: (عَطَّلْتُـهُ مِـنَ العَمَـلِ، فَتَعَطَّـلَ، وَعَطَّـلَ الـدَّارَ عَـنْ سَـاكِنِيهَا، وَالإِبِـلَ عَـنْ رَاعِيهَـا)، (عَطـل): نەمانـی جوانیـی و نەمانـی ئیـش و كارو سـەرقاڵییە، دەگوتـرێ: (عَطَّلْتُـهُ مِـنَ العَمَـلِ) واتـە: لـە ئیشـەكەی پەكـم خسـت و لامـدا، ئەویـش بـێ ئیـش بـوو، هەروەهـا دەگوتـرێ: خانووەكـەی لەوانـەی تێیـدا نیشـتەجێ بـوون، چـۆڵكـردو، وایكـرد حوشـترەكان شـوانەكەیان نەمێنـێ، (ئەو كەسـەی دەیانلەوەڕێنـێ و ئـاگای لێیانـە).

(ٱلْوُحُوشُ): (الوَحْـشُ خِـلاَفُ الأُنْـسِ، وَتُسَـمَّى الحَيْوَانَـات الَّتِـي لاَ أُنْـسَ لَهَـا بالإِنْـسِ: وَحْشَـاً وَالجَمْـعُ وُحُـوش)، (وحـش): پێچەوانـەی (أُنـس)ە، (أُنْـس)، واتـە: ماڵیـی، كەویی، (وَحْـش)، واتـە: كێویـی، ئـەو ئاژەڵانـەی لەگـەڵ مـرۆڤ دا هەڵناكـەن و دەسـتەمۆ نابـن، پێیـان دەگوتـرێ: (وَحْـش) و كۆیەكـەی (وُحُـوش)ە، ئاژەڵـە كێوییـەكان.

(سُجِّرَتْ): (السَّـجْرُ: تَهِييـجُ النَّـارِ، سَـجَرْتُ التَّنُـورَ، سُـجِّرَت: أُضْرِمَـت النَّـار)، (سـجر): بریتیـە لـە ئاگـر خۆشـكردن، دەگوتـرێ: (سَـجَرْتُ التَّنُـورَ)، واتـە: تەندوورەكـەم خۆشـكرد، ئاگـرم دایەبـەر، (سُـجِّرَت)، (أُضْرِمَـت النَّـار)، واتـە: ئاگـری تێبـەردرا.

(زُوِّجَتْ): (قُرِنَـتِ الأَرْوَاحُ بِأَجْسَـادِهَا، أو قُـرِنَ كُلُّ شِـيْعَةٍ بِمَـنْ شَـايَعَهُمْ فِي الجَنَّـةِ وَالنَّـار)، (زُوِّجَـت): بـە مانـای جووتكـرا، ﴿ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴾، كاتێـك نەفسـەكان جووتكـران، یـان مەبەسـت پێـی جووتكرانیانـە لەگـەڵ جەسـتەكانیاندا، {كـە لـە

قیامەتدا هەڵدەستنەوە}، یان مەبەست ئەوەیە هەر کەسە کەسێك کە لە دنیادا لەگەڵیدابووەو پێکەوە بوون، پێکەوە جووت دەکرێن و دەخرێنەوە لای یەك.

(ٱلْمَوْءُۥدَةُ): زیندە بە چاڵکراو، (وَأَدَ بِنْتَهُ: دَفَنَهَا حَيَّةً، فَهِيَ مَوْءُودَةٌ، وَكَانَت كِنْدَةُ تَئِدُ البَنَاتِ)، کچەکەی خۆی بە زیندوویی خستە ژێر خاك، (فَهِيَ مَوْءُدَةٌ)، ئەو زیندە بە چاڵکراوە، هۆزی کیندەش عادەتیان وابووە کچیان زیندە بە چاڵ کردوون، {بەڵام لە هۆزی دیکەش دا، ئەو حاڵەتە هەر بووە، وەك دوایی باسی دەکەین}.

(نُشِرَتْ): (نَشَرَ المَتَاعَ: بَسَطَهُ)، (نُشِرَت): بڵاوکرایەوە، (نَشَرَ المَتَاعَ)، کەل و پەلەکەی بڵاوکردەوە، (أَنْشَرَهُ: أَحْيَاهُ)، (أَنْشَرَهُ)، زیندووی کردەوە.

(كُشِطَتْ): (كَشَطَ الجُلَّ عَنْ ظَهْرِ الفَرَسِ، وَالغِطَاءَ عَنِ الشَّيءِ: كَشَفَهُ عَنْهُ)، ئەو جلەی دەخرێتە سەر پشتی ئەسپ (پێش ئەوەی زین بکرێ)، هەروەها ئەو پۆشاکەی دەخرێتە سەر هەر شتێك، ئەگەر جلەکەت لابردو، ئەو پۆششەت لابرد، پێی دەگوترێ: (كَشْط)، (كَشَطَ البَعِيْرَ: نَزَعَ جِلْدَهُ)، حوشترەکەی کەوڵکرد، پێستەکەی لێ دارنی.

(سُعِّرَتْ): (السَّعر: إلتهَابُ النَّار)، (سَعْر): یانی: ئاگر خۆشبوون، دەگوترێ: (سَعَرْتُهَا وَسَعَّرْتُهَا وَأَسْعَرْتُهَا)، هەر سێك کارەکە بە مانای ئاگرەکەم خۆشکرد (المِسْعَرُ: الخَشَبُ الذِي يُسْعَرُ بِهِ)، (مِسْعَر): ئەو دارەیە کە ئاگری پێ خۆش دەکرێ، ئەو بزووتەیە ئاگرەکەی پێ خۆش دەکرێ، (مقاش)ی بۆ بەکاردێنین، کە دوو پارچە ئاسنی پێکەوە لکاون.

(أُزْلِفَتْ): (الزُّلْفَةُ: المنْزِلَةُ وَالحُظْوَةُ)، (زُلْفَة): بریتیە لە پێگەو نیزیکیی لە کەسێك.

(أَحْضَرَتْ): (الحَضَرُ خِلاَفُ البَدْوِ، وَالحَضَارَةُ وَالحِضَارَةُ: السُّكُون بالحَضَرِ، ثُمَّ جُعِلَ ذَلِكَ اسْمَاً لِشَهَادَةِ مَكَانٍ أو إنْسَان أَو غَيْرِهِ، أَحْضَرَ الشَّيءَ: أَتَى بِهِ، أَحْضَرَ فُلاناً الشَّيءَ: أَتَاهُ بِهِ)، (حَضَرْ): پێچەوانەی (بدو)ە، واتە: بیابانشین، بەڵام (حَضَرْ)، یانی:

شارنشـین، (حَضَـارَة) و (حِضَـارَة)ش، یـانی: نیشـتەجێ بوونـی شـار، وەك (بَـدَاوة) و (بِـدَاوة)، واتـە: بیابانشـین، دوایـی ئـەو وشـەیان بەکارهێنـاوە بـۆ ئامـادە بـوون لـە شـوێنێك، یاخـود لـە لای کەسـێك، دەگوتـرێ: (أَحْـضَرَ الـشَّيءَ: أَتَى بـهِ)، شـتەکەی هێنـا، بـەڵام ئەگـەر بگوتـرێ: (أَحْـضَرَ فُلانـاً الـشَّيءَ: أَتَـاهُ بـهِ)، یـانی: فـڵان شـتەی بـۆ فڵانکـەس هێنـا.

(بِالْخُنَّسِ): (خَنَـسَ: انْقَبَـضَ وَرَجَـعَ وَاسْـتَخْفَى)، خـۆی گـرژ کـردو گەڕایـەوەو خـۆی پەنهانکـرد، دەگوتـرێ: (أَخْنَسْـتُ حَقَّـهُ: أَخَّرْتُـهُ، خُنَّس جَمْـعُ خَانِـس، مِثْـل رُكَّـع جمـع رَاكِـع)، (أَخْنَسْـتُ حَقَّـهُ) مافەکەیـم دواخسـت، (خُنَّـس)، کـۆی (خَانِـس)ە، هەروەهـا کـۆی (خانسة)شـە، وەك (رُكَّـع) کـۆی (راكـع)ەو کـۆی (راكعة)شـە، (خَنَـسَ إِبْهَامَـهُ خُنُوسَـاً: قَبَضَهَـا)، واتـە: پەنجـە نوشـتاندنەوە، یاخـود بـە خۆیـەوە لکانـد.

(الْجَوَارِ): (جَمْـعُ جَارِيَـة مِـنَ الجَـرِي)، (جـواري) کـۆی (جارية)یـە، ڕۆیشـتوو، ئەویـش لـە (جري)یـەوە هاتـوە، (الجَـرِي: المَـرُّ السَّرِيـعُ)، ڕۆیشـتنی خێـرا.

(الْكُنَّسِ): (جَمْـعُ كَانِـس وَكَانِسَـة، كَرُكَّـع)، (كُنَّـس) کـۆی (كَانِـس و كَانِسَـة)یە، وەك (رُكَّـع) کـۆی کـە (رَاكِـع و رَاكِعَة)یـە، دەگوتـرێ: (كَنَـسَ الظَّبْـيُ، مِـنَ بَـابٍ، نَـزَلَ: دَخَـلَ كِنَاسَـهُ، وَهُـوَ بَيْتَـه الـذي يَتَّخِـذَهُ مِـنْ أغصـان الشَّـجَرِ)، ئەگـەر ئاسـك بچێتـە کونەکـەی خۆیـەوە، شـوێنەکەی خـۆی کـە لـە لـق و پۆپـی دارو درەخـت دروسـتی دەکات، دەگوتـرێ: (دَخَـلَ كِنَاسَـهُ)، چـووە شـوێنەکەی خـۆی، هێلانەکـەی خـۆی، (كَنَـس) لەسـەر کێـشی (نَزَلَ)یـە.

(عَسْعَسَ): (أَي: أَدْبَـرَ ظَلاَمُـهُ، وَأَقْبَـلَ)، (عَسْـعَسَ): تاریکییەکـەی ڕۆیشـت، هەروەهـا: هـات، ئەمـە یەکێکـە لـەو وشـانەی دوو واتـای پێکـەوە دژی هـەن و، بـە پێـی سـیاق دەزانـرێ کام مانایـە مەبەسـتە؟.

(تَنَفَّسَ): (أَضَـاءَ وَتَبَلَّـجَ، وَأَصْـلُ التَّنَفُّـسِ خُـرُوجُ النَّفَـسِ مِـنَ الجَـوْفِ)، (تَنَفَّـس): بـە مانـای ڕوون و ڕۆشـن بـوو، وشـەی (تَنَفُّـس): لـە ئەسـڵدا بریتیـە لـە دەرچوونـی

هەناسە لە هەناوی مرۆڤ، ئەو شنەبایەش کە دێ لەگەڵ هاتنی بەیانیی دا، وەك هەناسەدان بۆ ڕۆژگار دانراوە.

(مَكِينٍ): (أي: مُتَمَكِّنٌ ذِي قُدْرَة وَمَنْزِلَة)، (مَكِين): یانی: چەسپاوو خاوەن پێگەو خاوەن پلە، (مَكِنات الطَّيْرِ وَمَكُنَاتُهَا: مَقَارُهَا)، ئەو شوێنانەی باڵندە تێیاندا نشتەجێ دەبن، هێلانەکانیان.

(مُطَاعٍ ثَمَّ): لەوێ بە قسە کراوە، فەرمانبەریی بۆ کراوە، (الطَّوْعُ: الإنقيادُ ويُضَادُّه الكُرْهُ) (طَوْع): بە مانای ملکەچیی دێ و پێچەوانەکەی (كُرْه)ە، واتە: پێناخۆش نابوون، (مُطَاع مَنْ يُقَدَّمُ لَهُ الطَّاعَة)، کەسێك فەرمانبەریی بۆ بکرێ، (ثَمَّ) لەوێ (هناك)، (ظَرْفُ مَكَان)، ناوی شوێنەو مەبەست پێی کۆمەڵی سەرتر (الملأ الأعلى)ە، ئەو شوێنەی فریشتە پێگەدارو بەرزەکانی لێن.

(أَمِينٍ): (الذِي يَحْفَظُ مَا عُهِدَ لَهُ بِهِ، حتى يؤدّيَهُ دون نَقْص ولا تغيير)، (أمين): ئەو کەسەیە ئەوەی پێی سپێردراوە، دەیپارێزێ بەبێ کەم و کووڕیی و گۆڕانکاریی، (وهو فعيل بمعنى مفعول)، وشەی: (أمين) لەسەر کێشی (فعيل)ەو، بە مانای (مفعول)ە، واتە: (مأمون)، (أَمِنَهُ عَلَى كَذَا، فَهُو مَأمونٌ) واتە: لێی دڵنیابوو لە بارەی فلانە شتەوە، بۆیە ئەو جێی دڵنیاییە، کە ئەو کارەی پێ بسپێردرێ، (أو صِفَة مشَبَّهَة مِنْ (أَمُنَ)، إذَا صَارَتِ الأَمَانَةُ سَجِيَّةً لَهُ)، یان سیفەتێکی چوێنراوە بە کردارەوە و لە (أَمُنَ)وە هاتوە، هەر کاتێك دەستپاکیی بوو بە ڕەوشتێکی ڕیشەدار، لەودا (ئەو وشەیەی بۆ بەکاردێ).

(بِالْأُفُقِ): (أُفُق) کۆیەکەی (آفَاق)ە، (أُفُق)، بە کوردیی: ئاسۆ، (آفاق)، واتە: ئاسۆیەکان، لالایەکان (الأُفُق: جَمْعُهُ آفَاق، النَّاحِيَة وَالنَّوَاحِي، والأُفُقُ: الذِي يَبْلُغُ النِّهَايَةَ فِي الكَرَمِ، تَشْبيهاً بالأُفُقِ الذَّاهِبِ فِي الآفَاقِ)، (أُفُق): بەو کەسەش دەگوترێ لە بەخشندەییدا گەیبێتە قۆناغی کۆتایی، چوێنراوە بە ئاسۆیەکەوە کە لە نێو ئاسۆیەکاندا دەڕوات، واتە: سنوورەکەی دیار نیە.

(**بِضَنِينٍ**): (**يَعْنِي: بِبَخِيلٍ، الضِّنَّةُ: البُخْلُ بالشيء النفيس**)، (**ضَنٌّ**): بە مانای چرووکیی و دەستنووقاندن و، نەبەخشین دێ، بەڵام نەبەخشینی شتێکی بە نرخ، دەگوترێ: (**ضَنَنْتُ بالشيء، ضَنًّا وَضَنَانَةً، وَقِيلَ ضَنِنْتُ بالشَّيء**)، واتە: ئەم شتەم نە بەخشیی و پێم شتێکی چاك و گرنگ بوو، دڵم لەبەری نەبۆوە بیبەخشم، هەندێکیش گوتوویانە: کردار (**فعل**)ەکەی بریتیە لە (**ضَنِنْتُ**)، نەك (**ضَنَنْتُ**).

ئەم وشەیە بە (**ظَنِيْن**)یش خوێندراوەتەوە، واتە: بە خوشکی طاء (**الأخت الطاء**) ئەو کاتەش بە مانای (**مُتَّهَم**) تۆمەتبار کراو، دێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــزان!

ئەم سوورەتە موبارەکە لە چوارده (١٤) ئایەتی یەکەمیدا، خوا ﷻ باسی ڕۆژی دوایی دەکات و، لە پازده (١٥) ئایەتی دووەمیشی دا، باسی سرووشکردنی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە ڕێی جیبریلەوەی کردوە.

خوا دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، یانی:

دەست بە خوێندنی ئەم قوڕئانە دەکەم (یان هەر کارێکی دیکە) بە ناوی خواوە.

ئەم کارە بۆ خوا ئەنجام دەدەم.

بە پێی بەرنامەی خوا، ئەم کارە دەکەم.

ئەم کارە دەکەم، بە وزەو توانایەك کە خوا بۆی ڕەخساندووم،

﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾، هەر کات خۆر پێچرایەوە، (تکویر)، بە مانای پێچرانەوە دێ، کاتێك خۆر دەپێچرێتەوە، یانی: تاریك دادێ، هەندێکیان (تکویر) یان بە

تاریك داهاتن، لێكداوەتەوە، ﴿ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ﴾، هەر كاتێك ئەستێرەكانیش هەڵوەرین (پرژان)، ئەستێرەكانیش كاتێك دێ دەپرژێن و هەڵدەوەرن و، ئەوانیش ئەو گەرمیی و تیشكەیان نامێنێ، بۆیە ڕوونكەرەوان هەندێكیان (كدْرت)یان بە: تاریك داهاتن، لێكداوەتەوە، ﴿ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ﴾، هەر كاتێك چیایەكانیش ڕۆێنران، لە شوێنی خۆیان بران و، جووڵێندران، ئەوە قۆناغی یەكەمی نەمانی چیایەكان، قۆناغێكی دیكەش ئەوەیە كە وردو خاش دەبن و پێك دادەرێن و، دەبنە تۆزو گەردی وەك تراویلكە، ﴿ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ﴾، هەر كاتێك حوشتری ئاوسی دە مانگەش وێڵكرا، پشت گوێ خرا، كە ئەو كاتەو ئێستاش لە لای عەرەبەكان ماڵێكی زۆر بە نرخ بووەو هەیە، یانی: ماڵی زۆر بە نرخ وێڵكرا، بەڵام هەندێكیان: ﴿ ٱلۡعِشَارُ ﴾یان بە هەور لێكداوەتەوە، هەندێكیش گوتوویانە: بەڵێ (عشار) كۆی (عشراء)ە، وەك (نِفاسْ)ی كۆی (نُفساء)، بەڵام مەبەست پێی ماڵی بە قیمەت و نایابە، ﴿ وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ ﴾، هەر كاتێك ژیاندارە كێوییەكانیش كۆكرانەوە، ﴿ ٱلۡوُحُوشُ ﴾، كۆی (وحش)ەو، ئەویش ئەو ئاژەڵەیە كە كەویی نیە و ماڵیی نەبووە، خووگرتن و ئاشنایی و تەبایی بۆ پەیدا نەبووە لەگەڵ مرۆڤاندا، ﴿ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ﴾، هەر كاتێك دەریایەكانیش گڕیان تێپەردرا، دوایی ئەمە زیاتر ڕوون دەكەینەوە، هەندێكی دیكەش گوتوویانە: ﴿ سُجِّرَتۡ ﴾، واتە: (**ملئت**)، پڕكران، واتە: دەریایەكان ڕژانە نێو یەكدیی و، هەرچی وشكانیی هەیە كە (١/٥) ی پانتایی زەوی وشكانییەو (٤/٥)ی دەریایە، ئەو (٤/٥)ە، ئەو (١/٥)ی داپۆشیی.

بێگومان ئەمانە شەش ڕووداوەكەی قۆناغی ئاخیر زەمانن و، ئەو شەشەی دیكەش كە دێن هی قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایین كە قیامەتە:

﴿ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ ﴾، كاتێك نەفسەكانیش جووتكران، واتە: نەفسەكان لەگەڵ جەستەكاندا جووتكران و زیندوو كرانەوە، یاخود: كاتێك نەفسەكان لەگەڵ هاوێنەكانی خۆیاندا جووتكران، چاك لەگەڵ چاك و خراپ لەگەڵ خراپ، ﴿ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴿٩﴾ ﴾، هەر كاتێك كچی زیندە بە چاڵكراویش،

پرسیاری لێکرا: بە چ گوناهێك كوژراوە؟ هەڵبەتە كە دەفەرمووێ: پرسیاری لێکرا، واتە: خوا لە بارەیەوە دەپرسێتەوە: ئەو كچە گچكەیە، ئەو كچە نابالغە، بۆچی كوژراوە، بە چ گوناهێك، ئایا چ گوناهێكی كردوە؟ كە بێگومان هیچی نەكردوە، بە دڵنیاییش زۆر گرنگە كە خوا ﷻ لە نێو نیشانەو ڕووداوەكانی هاتنی ڕۆژی دواییدا، لێپرسرانەوە لە كچی زیندە بەچاڵكراوی، داناوە، ﴿ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ﴾، كاتێك پەڕەكانیش، (لیستی كردەوەكانی مرۆڤەكان) كرانەوە، ﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴾، كاتێك ئاسمانیش كەوڵكرا، ئەمە لە نیشانەكانی ڕۆژی دواییە لە قیامەتدا، كەواتە، ئەوە كە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ﴿٩﴾ ﴾المرسلات، كاتێك ئاسمان كرایەوە، یان دەفەرمووێ: ﴿ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ أَبۡوَٰبٗا ﴿١٩﴾ ﴾ النبأ، ئاسمانیش كرایەوە بوو بە دەروازە گەل، مەبەست پێیان قۆناغی ئاخیر زەمان (**ساعة**)ە، بەڵام ئەوەی ئێرە: ﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴾، واتە: ئاسمان بەو شێوەیەی هەیە، ئاوا نامێنێ و، جۆرێكی دیكە دەبێ لە قیامەت دا، هەروەها كە لە سوورەتی (**الفرقان**)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ﴾، ئەو ڕۆژەی ئاسمان لەت و پەت دەبێ و فریشتەكان بە دابەزێنران دادەبەزێنرێن، هەروەها لە سوورەتی (**البقرة**)دا خوای بێ وێنە باسی هاتنی خۆی و فریشتەكان دەكات و دەفەرمووێ: ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٢١٠﴾ ﴾البقرة.ئەمانە هەموویان لە قۆناغی قیامەتدا دەبن.

﴿ وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ ﴾، هەر كاتێك دۆزەخیش بڵێسەدار كرا، نێڵ درا، ﴿ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴾، هەر كاتێك بەهەشتیش وەنیزیك خرا، ﴿ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ ﴾، ئەمە وەڵامی هەموو ئەو (**إذا**)یانەیە، لە كاتێكدا ئەوانە ڕوودەدەن: هەموو كەسێك دەزانێ چی ئامادە كردوە، هەڵبەتە بۆخۆی ئامادەی نەكردوە، بەڵام مادام ئەو كردەوەكانی ئەنجام داون و ئێستاش ئامادەكراون، وەك خۆی ئامادەی كردبن وایە.

ئنجا دێتە سەر بابەتی دووەم و دەفەرموێ: ﴿فَلَآ﴾، وانیە ئەی بێبڕوایەکان! ﴿أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ﴾، سوێند دەخۆم بەو ئەستێرانەی خۆیان پەنهان دەکەن، ﴿ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ﴾، ئەو ئەستێرانەی بە خێرایی دەڕۆن و خۆیان پەنهان دەکەن و خۆیان پەنا دەدەن، ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ﴾، سوێند بە شەوگاریش کە ڕادەبرێ، یاخود دێ، ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾، سوێند بە بەیان کە هەناسە دەدات، کاتێك شەبەقی بەیانی دەدا.

سوێند بەوانە:

﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾، ئەو (قورئان)ە قسەی نێردراوێکی بەڕێزە، کە جیبریلە ؑ، چۆنە؟ ﴿ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ﴾، خاوەن هێزە لە لای خاوەن عەرش (کە خوای بەرزو مەزنە)و خاوەن پێگەیە، ﴿مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ﴾، لەوێ بە قسە کراوە، فەرمانبەریی بۆ کراوە واتە: لە لای کۆمەڵی باڵا (**الملأ الأعلى**)، ﴿أَمِينٖ﴾، زۆریش دەست پاکە.

ئنجا دێتە سەر باسی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ: ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ﴾، هاوەڵەکەشتان (کە لە نیزیکەوە دەیناسن)، شێت نیە، وەك ئێوە لاف لێدەدەن، ﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ﴾، بە دڵنیایی [لە خۆوەش قسە ناکات، بەڵکو (جیبریل)ی] لە ئاسۆی ڕووندا بینی (لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی)، ﴿وَمَا هُوَ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ بِضَنِينٖ﴾، (موحەممەد ﷺ) لەسەر ئەو پەنهانەش کە خوا ئاگاداری دەکاتەوە، چرووك نیە، کە پێتان نەڵێ، واتە: هەرچی خوا پێی بفەرموێ، پێتان ڕادەگەیەنێ، ﴿وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٖ﴾، ئەو (قورئان)ە قسەی شەیتانێکی دوورخراوە (لە بەزەیی خوا)و بەردبارانکراو نیە، ﴿فَأَيۡنَ تَذۡهَبُونَ﴾، بۆ کوێ دەچن؟ بۆچی سەرنجی قورئان نادەن، تاکو بزانن: جگە لە خوای زاناو توانای بێ سنوور، ناگونجێ لە هیچ کەسێکی دیکەوە هاتبێ، ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾، ئەم (قورئان)ە تەنیا بیرخەرەوەیە، پەندو ئامۆژگارییە بۆ هەموو جیهانییان،

﴿ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴾، بۆ هەر كەسێك لە ئێوە بیەوێ ڕێك و ڕاست بێ، ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، ناشتانەوێ تاكو خوا پەروەردگاری جیهانییان نەیەوێ، خوا ویستوویەتی ویستێكتان هەبێ و، بەو ویستە ئازادانەیە چاكەشتان پێی بوێ و خراپەشتان پێی بوێ، تاكو پێی تاقی بكرێنەوە، كەواتە: ویستەكەشتان كە ئازادانە شتتان پێ دەوێ، هەر خوا پێیداون.

كەواتە: وا مەزانن تەنیا خۆتانن، بەڵكو خوا ﷻ ئێوەی خوڵقاندووەو ئەو ویستەشی پێداون، كە دەتوانن شتتان پێی بوێ، شتی چاك، یان شتی خراپ، دەشتوانن ئەو شتانەتان پێی نەوێ و ڕەفزیان بكەن.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**خستنەڕووی شەش لە ڕووداوەکانی قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی (ئاخیر زەمان)، کە بریتین لە: پێچرانەوەی خۆرو، هەڵوەرینی ئەستێران و، هەڵکەنرانی چیایەکان و، وێڵکرانی حوشتران و، خڕکرانەوەی ئاژەڵانی کێویی و، گڕدرانی دەریایەکان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ۝١ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ۝٢ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ۝٣ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ۝٤ وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ ۝٥ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ۝٦﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ﴾، هەر کات خۆر (ڕۆژ) پێچرایەوە، {﴿كُوِّرَتۡ﴾: (**لُفَّت، كَوَّرَ العِمَامَةَ: لَفَّهَا وَأَدْخَلَ بَعْضَهَا عَلَى بَعْض**)، (**كُوِّرَت**) یانی: (**لُفَّت**)، هەڵوێزنەرا[1]، پێچرایەوە، دەگوترێ: (**كَوَّرَ العِمَامَةَ**)، واتە: مێزەرەکەی پێچایەوە، هەندێکی بە دەوری هەندێکی دا پێچا، بێگومان ئەو خۆرەی ئێستا دەیبینین، زانایانی گەردووناس دەڵێن: مەزەندە دەکرێ پێنج ملیار (٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ لە تەمەنی تێپەڕیبێ و، بایی پێنج ملیار ساڵی دیکەش گازی هایدرۆجینی پێ مابێ، کە دەیسووتێنێ و دەیگۆڕێ بۆ هێلیۆم، واتە: ئەگەر خوا بهێڵێتەوە، بەشی پێنج ملیار ساڵی دیکە، تیشکی پێماوە، هەر خوا ﷻ خۆیشی دەزانێ، کەی کۆتایی پێدێنێ.

---

(١) هەڵوێزنین: کۆکردنەوە سەریەك وپێچانەوە.

بـەڵام کاتێـك دێ ئـەم خـۆرە دەپێچرێتـەوە، وەك چـۆن مێزەرێـك دەپێچرێتـەوە، ئنجـا کـە دەشـپێچرێتەوە، مانـای وایـە تاریـك دادێ و، ئـەو تیشـك و ڕووناکییـەی ئێسـتای نامێنـێ.

٢)- ﴿ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ﴾، هەر کات ئەستێرەکانیش پرژان و هەڵوەرین، **(انكدار)** بە مانای: **(تناثر)** هاتوە، واتە: پرژان هەڵوەرین و، هەندێکیشیان گوتوویانە: **(انكَدَرَت)**، **(أَظْلَمَت)**، واتە: تاریك داهاتن، بێگومان ئەستێرەکانیش لە ڕۆژی دوایی دا خوا ﷻ ئەو حاڵەتەی ئێستای هەیانە، نایهێڵێ و تاریك دادێن، دەپرژێن و هەڵدەوەرن، ﴿ ٱنكَدَرَتۡ ﴾، لە **(كُدْرة)**وە هاتوە، **(الكُدْرة: ضِدُّ الصَّفَاء)**، **(كُدْرَة)**، واتە: لێڵیی دژو پێچەوانەی ڕوونییە.

٣)- ﴿ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ﴾، هەر کات چیایەکانیش ڕۆێنران، **(تَسِييرُ الجِبَالِ: قَلْعُهَا وَنَقْلُهَا مِنْ أَمَاكِنِهَا ثُمَّ انَدِثَارُهَا وَتَهشُّمها)**، مەبەست لە ڕۆێنرانی چیایەکان، هەڵکەندنیانە لە شوێنی خۆیان، دوایی وردو خاش بوون و تێکهاڕینیانە.

٤)- ﴿ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ﴾، هەر کاتێك حوشترە ئاوسە دە مانگەییەکانیش وێڵکران، **(عِشَار جَمْعُ عُشَرَاء، مِثْلُ نِفَاس جَمْعُ نُفَسَاء)**، **(نِفَاس)**، واتە: ئافرەتانێ کە لە حاڵەتی زەیستانییدان، **(نُفَسَاء)**یش تاکە، هەروەك **(عُشَرَاء)**، حوشترێکە ئاوس بێ و سکەکەی دە (١٠) مانگ بێ، حوشتر بە دە (١٠) مانگان دەزێ، **(العشراء: الناقة: الحامل ذات العشرة أشهر)**، **(عُشراء)** حوشترێکی ئاوسە سکەکەی دە (١٠) مانگ بێ.

حوشـتری ئـاواش لـە لای عەرەبـەکان ماڵەکـی خۆشەویسـت بـووە، چونکـە زۆری نەمـاوە بـزێ و بەچکـەی ببـێ و، لـەو کاتـەدا خـۆی و بەچکەکەشـی هەردووکیـان ماڵـی بـە قیمەتـن، بـەڵام لـەو ڕۆژەدا حوشـتری ئاوسـی دە (١٠) مانگـە، وێـڵ دەکـرێ و کـەس بـە لایـدا ناچـێ.

هەندێکیـش **(عِشـار)**یان بـە **(سـحاب)** لێکداتـەوە، یـانی: هەورێـك کـە بارانـی پێوەیـە، خەڵـك هەمیشـە چـاوەڕێ دەکات هـەور بێتـە ئاسـمان و، ئاویـان بـۆ ببارێنێ،

ئنجا باران بێ، بەفر بێ، تەزرە بێ، بەڵام لەو ڕۆژەدا ئەگەر هەوریش بێ و باران و بەفرو تەرزەشی پێوە بێ، کەس گوێی ناداتێ، چونکە زۆر سەرقاڵن و گرفتارن بە بارودۆخی خۆیانەوە.

٥)- ﴿وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾، [﴿حُشِرَتْ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**حُشِّرَت**)، کە مانایەکەی بە هێزتر دەکات]، کاتێك ئاژەڵە کێوییەکان لە یەك شوێن کۆکرانەوە، ﴿ٱلْوُحُوشُ﴾، کۆی (**وَحْش**)ە: (**الحَيْوَانُ البَرِّيُّ غَيْر المتَأَنِّسِ بالنَّاسِ**)، ئەو ئاژەڵە کوێیەی ئولفەتی بە خەڵکەوە نەگرتوە، ماڵیی و کەویی نەبووە، لە مرۆڤ ڕادەکات، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا خوا هەموویان کۆ دەکاتەوە، هەڵبەتە لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوییدا، واتە: لە ئاخیر زەماندا، ئەو ئاژەڵە کێوییانە، هەموویان خڕدەبنەوە سەر یەك، کاتێك ئەو گۆڕانکارییانە دەقەومن، ئەو ئاژەڵانەی لەسەر زەوی هەن، پێکدادێن و دەچن و کۆدەبنەوە.

٦)- ﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾، هەر کاتێك دەریایەکانیش گڕدران، داگیرسێنران، یاخود: پڕ کران (**ملئت**)، ﴿سُجِّرَتْ﴾، هەم بە مانای: پڕکران (**ملئت**) دێ، هەم بە مانای: گڕدران (**أُشعلت**) دێ، واتە: کاتێك دەریاکان پڕکران، یاخود دەریاکان گڕدران.

لە بارەی ئەو حوشترانەوەی تۆلدارو ئاوسن و، سکیان دە (١٠) مانگە، (**الطبري**)، دەڵێ: ﴿وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾، (**أي: تَخَلَّى عَنْهَا أَرْبَابُهَا**)، یانی: خاوەنەکانیان وازیان لێ هێنان.

هەروەها (**الطبري**) ئاواشی لێکداوەتەوە: (**لَمْ تُحْلَبْ وَلَمْ تُصَرّ**)، نەدۆشران و گوانەکانیشیان نەبەستران (بۆ ئەوەی شیرەکەیان تێدا کۆبێتەوە).

لێرەدا خوای بەرزی مەزن باسی قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی دەکات و، شەش جاران وشەی: (**إذا**)، دووبارە دەکاتەوە.

(**إذا**)ش لە ڕێزمانی عەرەبییدا تێداکراو (**ظرف**)ە، بۆ کات، بەڵام مانای مەرجیشی خراوەتە نێو، بۆیە کاتێك (**إذا**) دێ، کە کاتێکە شتێکی تێدا ئەنجام دەدرێ، وا

دەخوازێ بە شتێکەوە پەیوەست بێ، بۆیە بابایەك گوێی لە (**إذا**) بێ، چاوەڕێ دەکات، ئایا چی بەوەدا دادێ؟.

لێرەش دا کە خوا ﷻ شەش جاران هێناویەتی و، لە ئایەتەکانی دیکەشدا کە باسی ڕووداوەکانی قیامەت دەکەن، شەش جاران هێناویەتی و سەرجەم دوازدە جاران هاتووەو، بە (و)ی بادانەوە (**عطف**)ش هاتوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەر جارێك (**إذا**) دێ، ئەو ڕستانە هەموویان سەربەخۆن و، هەر کامێکیان مانای تایبەت بە خۆی هەیە.

لێرەدا خوا ﷻ باسی ئەو شەش ڕووداوەی کردوە، لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدا کە ئاخیر زەمانە، ڕوو دەدەن: پێچرانەوەی خۆر، هەڵوەرین و پڕژانی ئەستێرەکان، ڕۆێنران و هەڵقەنرانی چیایەکان و، وێڵکرانی حوشتری ئاوسی دە (١٠) مانگەو، کۆکرانەوەی ئاژەڵە کێوییەکان و، گڕ تێبەردانی دەریایەکان، یاخود: کۆکرانەوە دەریایەکان و پڕکرانیان.

## مەسەلەی دووەم:

**خستنەڕووی شەش لە ڕووداوەکانی قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی (قیامەت) کە بریتین لە: پێکەوە جووتکرانی نەفسەکان و، لێپرسرانەوەی کچی زیندەبەچاڵ کراو، کە بە چ گوناهێك کوژراوەو؟ کردنەوەی پەڕەکان (لیستی کردەوان) و، کەوڵکرانی ئاسمان و، بڵێسەدارکرانی دۆزەخ و، وەنیزکخرانی بەهەشت، سەرەنجام: زانین و پەیبردنی هەر کەسێك کە چی ئامادە کردوە؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴿١٣﴾ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ ﴿١٤﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ﴾، هەر کات نەفسەکانیش جووتکرانەوە، (**نفوس**) کۆی (**نفس**)ە، کە بە ڕووح دەگوترێ، ئەگەر لە نێو جەستەدا بێ، ئەگەر لە دەرەوەی جەستەش بێ پێی دەگوترێ: (**روح**)، کاتێك نەفسەکان جووتکران، واتە: لەگەڵ جەستەکانیاندا، یانی: (**قُرِنَتِ الأَرْوَاحُ مَعَ الأَجْسَاد**)، ڕووحەکان لەگەڵ جەستەکاندا جووتکران، واتە: ڕووحەکان خرانەوە نێو جەستەکان و، جەستەکان زیندووکرانەوە بەو شێوەیەی خوا دەیزانێ.

یاخود: (**قُرِنَتِ الأَمْثَالُ والقرناء بعضهُم مَعَ بَعَض**)، هاووێنەکان و هاونشینەکان هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیاندا پێکەوە کۆکرانەوە.

٢)- ﴿وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴿٩﴾﴾، هەر کاتێك کچی زیندەبەچاڵکراویش پرسیاری لێکرا، بە چ گوناهێك کوژراوە؟ (**الموءودة: المدفونة حَيَّة**)، مێینەی خراوە ژێر خۆڵ و گڵ بە زیندوویی، زیندە بە چاڵکراو.

ئەمە خویندراویشەتەوە: (وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سَئَلَتْ بأيِّ ذنبٍ قُتِلت؟)، کاتێك کچی زیندەبەچاڵکراو پرسیاری کرد: بە چ گوناهێك کوژراوە، چی کردبوو؟ لێرەدا ئەم دەقە دێنین:

**(عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: جَاءَ قَيْسُ بْنُ عَاصِمٍ التَّمِيمِيُّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي وَأَدْتُ ثَمَانِيَ بَنَاتٍ فِي الجَاهِلِيَّةِ ، قَالَ: «فَأَعتِق عَنْ كُلِّ وَاحِدَةٍ رَقَبَةً»، قَالَ: إِنِّي صَاحِبُ إِبِلٍ، قَالَ: «فَأَهْدِ إِنْ شِئْتَ عَن كُلِّ وَاحِدَةٍ بَدَنَةً»)(أخرجه الطبري: ٣٦٧٧٩، وعبدالرزاق في تفسيره: ٣٥١٢ واللفظ له).**

واتە: قەتادە (کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووانی هاوەڵان) دەڵێ: قەیسی کوڕی عاصیمی تەمیمیی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: من لە سەردەمی نەفامییدا هەشت کچم زیندە بە چاڵ کردوون! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: لە جیاتی هەر کامێکیان بەندەیەك ئازاد بکە، گوتی: من خاوەن حوشترم، فەرمووی: ئەگەر دەتەوێ لە جیاتی هەر کامێکیان حوشترێکی مێینە سەرببڕە، بیکە بە خێر.

ئەوە عادەتێکی سەردەمی نەفامیی بووە، لە نێو عەرەباندا کە کچیان زیندەبەچاڵ کردوە، ئایا ئەو زیندەبەچاڵکردنە، هۆکارەکەی چی بووە؟، بە پێی ئەوەی سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: دوو هۆکاری سەرەکیی هەبوون:

١- هەژاریی و نەداریی.

٢- خێڵە عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام، هەمیشە ڕاو و ڕووتیان لە دژی یەکدی کردوە، ئنجا هۆزێك کە بەسەر هۆزێکی دیکەی داداوە، ئافرەت و منداڵەکانی کە کەوتوونە بەر دەست، دوایی نەیداونەوە بەو هۆزەی دیکە، ئنجا بۆ ئەوەی ئەوانە ئافرەت و کچیان نەبێ بکەوێتە بەردەستی هۆزێکی دیکە، کە بەسەریاندا دەدا، کچەکانیان زیندە بە چاڵ کردوون.

هەندێکی دیکە: (کە ئەو ڕایەم پێ بێهێزە)، گوتوویانە: لەبەر ئەوەی هەندێ لە هۆزو تیرەکانی عەرەب پێیان وابووە فریشتەکان مێینەن و کچانی خوان، گوتوویانە: مادام خوا فریشتەکانی هەن و کچەکانی، با ئەو کچانەش هەر بە گچکەیی لە بەین بەرین و، بچنەوە خزمەتی خوا ﷻ!!.

پێم وایە هاندەرو پاڵنەری سەرەکیی بۆ زیندە بە چاڵ کردنی کچان هەڵبەتە لە نێو هەموو گەلی عەرەبیش دانەبووە، ئەگەرنا قڕە بڕ دەبوون و تەنیا لە نێو هەندێك لە هۆزەکاندا هەبووە هەر لەبەر هەژاریی و نەداریی بووە، یاخود لەبەر ئەوە بووە، دوایی عەیبەو شوورەییان نەیەتە سەر.

**٣)-** ﴿ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ﴾، کاتێك پەڕەکانیش کرانەوە، خوێنراویشەتەوە: **(نُشِّرتْ)**، ئەو کاتەش مانایەکەی بەهێزترە، **(الطبري)** دەڵێ: **(وَإِذَا صُحُفُ أَعْمَالِ الْعِبَادِ نُشِرَتْ لَهُمْ، بَعْدَ أَنْ كَانَتْ مَطْوِيَّةً عَلَى مَا فِيهَا مَكْتُوبٌ، مِنَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ، وَبِنَحْوِ الَّذِي قُلْنَا فِي ذَلِكَ، قَالَ أَهْلُ التَّأْوِيلِ)** واتە: کاتێك لیستی کردەوەکان کە پێشتر پێچراوە بووە بەسەر ئەوەدا، کە تێیدا نووسراوە، لە چاکەکان و لە خراپەکان، بۆ بەندەکان کرانەوە، بەو مانایەش کە گوتمان، ڕوونکەرەوان گوتوویانە، یانی: لیستی کردەوەکان دەکرێنەوەو پان ڕا دەخرێن، وەك لە سووڕەتی **(الإسراء)**دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ١٤ ﴾، واتە: (ئەی مرۆڤ!) نووسراوەکەت بخوێنەوە، بەسە خۆت لێپرسینەوەی لەگەڵ خۆتدا بکەی.

**٤)-** ﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴾، کاتێك ئاسمانیش کەوڵ کرا، **(الطبري)**، دەڵێ: **(وإذا السماء نُزِعَتْ وجُذِبَتْ ثم طُوِيَتْ)**، کاتێك ئاسمان داڕنراو ڕاکێشرا، دوایی پێچرایەوە، وەك لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ ١٠٤ ﴾، ئەو ڕۆژەی ئاسمان وەك چۆن ئەو تۆمارەی شتی تێدا نووسراوە، دەپێچرێتەوە، ئاوا دەیپێچینەوە، کە بێگومان ئەمە لە ڕووداوەکانی قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییە، کە ڕۆژی قیامەتە و، جیایە لەوەی خوا ﷻ لە ئایەتەکانی پێشێ دا، باسی هەڵوەرینی ئەستێرەکانی کرد.

هەروەها کە لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ٩ ﴾ المرسلات، کاتێك ئاسمان کرایەوە، یان دەفەرموێ: ﴿ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ أَبۡوَٰبٗا ١٩ ﴾، ئاسمان کرایەوە بوو بە دالان دالان، دەروازە دەروازە، ئەوە لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدایە، کە خوا ئەم گەردوونەی دەپێچێتەوەو بەم شێوەیەی نامێنێ: ﴿ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ٤٨ ﴾ **إبراهيم**، ئەو ڕۆژەی زەوی دەبێتە جیا لەم زەوییەو، ئاسمانەکانیش (دەبن بە ئاسمانانی جیا لەم ئاسمانانە)، یانی: بە شێوەیەکی دیکە خوا ﷻ ئەو گەردوونەی ئەو کاتە دروست دەکاتەوە، کەواتە: لێرەدا ﴿ كُشِطَتۡ ﴾، باسی قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی دەکات، (**كَشْط**)یش لە ئەسڵ دا ئەوەیە ئاژەڵێك: جەستەکەی لە کەوڵەکەی بهێنرێتە دەرێ، ئەو ئاسمانەش لە ڕۆژی دواییدا بەم شێوەیەی نامێنێ، وەك لە سووڕەتی (الفرقان)یش دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ٢٥ ﴾ الفرقان، ئەو ڕۆژەی ئاسمان بە هەوران (لە شێوەی هەوران دا) شەق دەبێ و، فریشتەکانیش دادەبەزێنرێن. ئەمەش لە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی دایەو قۆناغی قیامەتە.

٥)- ﴿ وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ ﴾، هەر کاتێك دۆزەخیش خۆشکرا، بڵێسەدار کرا، خوێندراویشەتەوە: ﴿ سُعِرَتۡ ﴾، کە مانایەکەی بەهێزتر دەبێ، یانی: دۆزەخ زۆر داگیرسێنرا، (**التَّسْعِيرُ: الإيقَادُ، أي: هُيِّئَتْ لِعَذَابِ مَنْ حَقَّ عَلَيهِمُ العَذَاب**)، (**تسعير**): بە مانای بڵێسەدار کردن و خۆشکرانی ئاگرەکەیەتی، واتە: ئامادە کرا بۆ سزادانی ئەوانەی سزایان لەسەر پێویست بووە.

٦)- ﴿ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴾، هەر کاتێك بە هەشتیش وەنیزیك خرا، (**الزُّلْفَى: القُرْبُ، أي: أُدْنِيَت، أي: قَرُبَت مِنْهُم، بحَيْثُ لا يَتْعَبُون للوصُولِ إِلَيْهَا**)، بە هەشتیان لێوەنیزیك خرا، بە جۆرێك ماندوونەبن تاکو پێی دەگەن.

٧)- ﴿ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ ﴾، هەموو کەسێك زانی چی ئامادە کردوە! (**النفس نكرة في سياق الشرط مرادٌ بها العموم، أي: عَلِمَتْ كُلّ نفس ما أحضرت**)، لێرەدا نەفس بە نەزانراو

(**نكرة**) هاتوە، بەڵام لە ڕەوتی مەرج داو مەبەست پێی گشتییە، واتە: هەموو نەفسێك دەزانێ چی ئامادە کردوە، بۆیە ئامادەکردنەکە پاڵدراوەتە لای نەفسەکان، چونکە نەفسەکان ئەو کردەوانەی ئەنجامیان داون، شوێنەواری سزاو پاداشتی کردەوەکان لەو ڕۆژەدا دەردەکەوێ.

(**الشوكاني**) لە مانای: ﴿عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ﴾دا، دەڵێ: (**وَمَعْنَى مَا أَحْضَرَتْ: مَا أَحْضَرَتْ مِنْ أَعْمَالِهَا، وَالْمُرَادُ حُضُورُ صَحَائِفِ الْأَعْمَالِ، أَوْ حُضُورُ الْأَعْمَالِ نَفْسِهَا، كَمَا وَرَدَ أَنَّ الْأَعْمَالَ تُصَوَّرُ بِصُوَرٍ تَدُلُّ عَلَيْهَا وَتُعْرَفُ بِهَا**) (**فتح القدير: ج٥، ص٤٧٢**).

واتە: (**مَا أَحْضَرَتْ**) واتە: کردەوەکانی کە ئامادەی کردوون، مەبەست ئامادەبوونی ئەو پەڕانەیە کە کردەوەکانیان تێدا نووسراون، یاخود ئامادە بوونی خودی کردەوەکانە، چونکە - لە شوێنەواردا - هاتوە کە کردەوەکان لە چەند وێنەیەکدا بەرجەستە دەکرێن، دەلالەتیان لەسەر دەکەن و پێیانەوە دەناسرێن.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الكهف**)دا، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (**الجاثية**)ش دا، لەو بارەوە کورتە باسێکمان کردوە، کە خوا ﷻ خودی کردەوەکان دێنێتەوە بەرچاوی مرۆڤەکان، وەك چۆن ئێستا جاری وایە کامێرای شێردراوە دانراوە، دوایی بە دەنگ و وێنەوە کەسێك ئەو کردەوەیەی دەیکات، لەسەری تۆمار کراوە.

ئنجا بە دڵنیایی خوا ﷻ ئەو فریشتانەی داناون و کردەوەکانی مرۆڤەکان و چالاکییەکانیان تۆمار دەکەن، ئامێری پێشکەوتووتر کە هەر شایستەی خوای پەروەردگارە، داویەتی بەو فریشتانە، بۆ ئەوەی هەموو کردەوەو چالاکییەکانی مرۆڤەکان، چ نیەتی دڵیان، چ قسەی زمانیان، چ جموجۆڵی ئەندامەکانیان، تۆمار بکەن.

یەکێك لە زانایان دەڵێ:

بۆیەش زانینی نەفسەکان بۆ سزاو پاداشتی کردەوەکانیان، لە کۆتایی هەموو مەرجەکاندا دانراوە، کە لە دوازدە (١٢) ڕستەکاندا باسکراون، چونکە هەندێکیان کە بریتین لە شەشەکانی کۆتایی، لە قۆناغیی دووەمی ڕۆژی دواییدا، دێنە دی، هەندێکیشیان زووتر لەوەو لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدا دێنە دی، بۆیە ئەوەی زووتر هاتۆتە دی، لەگەڵ ئەوەدا کە دواتر دێتە دی، پێکەوە کراون بە وەڵامی ئەو مەرجەی خوای پەروەردگار دوازدە (١٢) جاران دووبارەی کردۆتەوە: کاتێك ئەوە بوو، کاتێك ئەوە بوو، هەر کەسێك دەزانێ چی ئامادە کردوە، لێرەش دا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنن:

**{عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ الطَّائِيِّ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ عَمَّنْ أَيْمَنَ مِنْهُ، فَلَا يَرَى إِلَّا شَيْئًا قَدَّمَهُ، وَيَنْظُرُ عَمَّنْ أَشْأَمَ مِنْهُ، فَلَا يَرَى إِلَّا شَيْئًا قَدَّمَهُ، وَيَنْظُرُ أَمَامَهُ، فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ فَمَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِيَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَلْيَفْعَلْ} (أخرجه أحمد: ١٨٢٧٢، والبخاري: ٧٠٠٥، ومسلم: ١٠١٦، والترمذي: ٢٤١٥).**

واتە: عەدیی کوڕی حاتەمی تائیی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کامێك لە ئێوە نیە، مەگەر پەروەردگاری دەیدوێنێ لە نێوان خواو ئەودا تەرجومان نیە، (پێویست بە وەرگێڕ ناکات)، ئنجا ئەو مرۆڤە تەماشای لای ڕاستی دەکات، هەر ئەوە دەبینێ کە لە کردەوەکانی پێشیخستوەو، تەماشای لای چەپی دەکات، هەر ئەوە دەبینێ کە لە کردەوەکانی پێشیخستوە، دوایی سەرنجی پێش خۆی دەدات، ئنجا بەرەو ئاگر دەچێ، بۆیە هەر کامێك لە ئێوە، ئەگەرتوانی بە لەتکە خورمایەکیش بێ، با خۆی لە ئاگر بپارێزێ.

## قوڵە باسێک دەربارەی
## حوكمی منداڵان لە ڕۆژی دوایی دا

لە چوار بڕگەی کورتدا، ئەم قوڵە باسە دەکەین:

**١)**- منداڵەکانی بڕواداران بە ڕای زۆربەی هەر زۆری زانایان، لەگەڵ دایك و بابی خۆیاندان، لە بەهەشتدا، **(النووي)**، لە کتێبە ناودارەکەی **(شرح صحيح مسلم)**دا دەڵێ:

**(أَجْمَعَ مَنْ يُعْتَدُّ بِهِ مِنْ عُلَمَاءِ المسلمين، على أن من مات من أَطفالِ المسلمينَ، فهو من أَهل الجنَّةِ، لأنَّهُ لَيْسَ مُكَلَّفَاً)**. واتە: هەموو ئەوانەی گرنگییان پێدەدرێ لە زانایانی مسوڵمان، یەکدەنگن لەسەر ئەوەی منداڵەکانی مسوڵمانان خەڵکی بەهەشتن، چونکە هیچ کام لەو منداڵانە ئەرکدار نەکراوە (تاکو بگوترێ: گوناهێکی کردوە، یاخود ئەرکێکی چواندوە).

**٢)**- بەڵام بە نسبەت منداڵی بێبڕوایانەوە، زانایان ڕاجیاییان هەیەو، **(الآلوسي)**، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

**(الصحيح الذي ذهب إليه المحققون، أنَّهم من أهل الجنَّة، ويستدلُّ له بأشياء، منها:**

**أ- حديث إبراهيم الخليل عليه السلام حين رآه النَّبيّ ﷺ فِي الجَنَّة حَوْلَهُ أَولَادَ النَّاس قَالُوا: يا رَسُولَ الله! وأولاد المشرِكِيْنَ؟ قَالَ: وَأَوْلَادَ المشْرِكين، رواه البخاري في صحيحه**

**ب- ومنها قوله تعالى:** ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾ **الإسراء).**

واتە: منداڵی بێبڕوایان، ڕای ڕاست کە زانایان و لێکۆڵەرەوەکان بۆی چوون، ئەوەیە کە ئەوانیش هەر خەڵکی بەهەشتن و، چەند شتێك لەو بارەوە بە بەڵگە دەهێنرێنەوە:

---

(١) روح المعاني: الجزء: ٣٠، ص ٣٣٠.

أ- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ: ئیبراهیم خەلیلم بینی، لە بەهەشتدا منداڵی خەڵکی بە دەورەوە بوون، هاوەڵان لێیان پرسی: منداڵی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش؟ فەرمووی: منداڵی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش.

ب- ئەو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (**الإسراء**)یش بەڵگەیەکی دیکەیە: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾، ئێمە سزادەری خەڵك نابین، تاکو پێغەمبەر نەنێرین، (ئەو منداڵانەش جارێ عەقڵ و هۆشیان کامڵ نەبووە، تاکو لە بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ تێبگەن).

٣)- پێنج جۆرە ڕای دیکەی جیاواز لە بارەی حوکمی منداڵانەوە:

١- (**إبن تيمية**)، گوتوویەتی: وا باشە مرۆڤ بوەستێ و بە هیچ لایەکدا بڕیار نەدات.

٢- ڕایەکی دیکەش هەیە دەڵێ: ئەو منداڵانە، ئنجا چ هەموویان، چ تەنیا هی بێبڕوایان، لە شوێنێکن لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا.

٣- (**أحمد السرهندي الفاروقي**)یش، دەڵێ: ئەوانیش وەك ئاژەڵ و زیندوو دەکرێنەوە، بەڵام دوایی وەك ئاژەڵ و ژیاندارانی دیکە، دەبنەوە بە خاك و خۆڵ!.

٤- ڕایەکی دیکەش هەیە دەڵێ: ئەوانە دەبن بە خزمەتکاری بەهەشتییەکان.

٥- ڕایەکی دیکەش دەڵێ: ئەوانە خوا لە قیامەت دا تاقییان دەکاتەوەو، هەر کەس لەو تاقیکردنەوەیە دەرچوو، سەرفرازە ئەگەرنا زیانبارە.

٤)- ڕای پەسندیش لە لای من ئەوەیە کە (**الآلوسي**)، گوتوویەتی: کە منداڵەکان هی مسوڵمانان و نامسوڵمانان، مادام نەگەیشتوونە ڕاددەی باڵغ بوون و ئەرکدار نەبوون، هەموویان دەرباز دەبن لە سزای خوای دادگەرو کاربەجێ، چونکە خوا ﷻ نەیخستوونە تاقیکردنەوەو توانای تاقیکرانەوەیان نەبووە.

پێشم وایە تەنیا ئەو ڕایەی پەسندمان کردو هەڵمانبژارد بەڵگەدارەو، ڕایەکانی دیکە هیچ کامیان بە بەڵگەیەکی ڕاست و دروست پشتڕاستکراوەنین،

بۆیە ئەو ڕایەم پێ ڕاست و بەهێزە کە ئەو مندالانە هەموویان هی بڕواداران و هی بێبڕوایان، دەرباز بوون و هەموویان بەهەشتیی دەبن، ئنجا ئایا خوای پەروەردگار چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و چییان پێدەکات؟ ئەوە باس نەکراوەو، ئەوەش کە خوای کاربەجێ لە بارەی بەهەشتییانەوە دەفەرموێ: ﴿يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ١٧﴾ **الواقعة**، واتە: لاوانی هەر بە لاویی هێڵراوە، بەسەریانەوە دەگەڕێن و خزمەتیان دەکەن، خوای بەرزو مەزن باسی نەکردوە، ئەوانە کێن و چین؟ بەڵکو وا دێتە بەرچاو، وەك چۆن خوای میهرەبان حۆرییان دەخوڵقێنێ بۆ پیاوانی بەهەشتیی، ئەو کوڕە گەنجانەش بخوڵقێنێ بۆ خزمەتکردنی بەهەشتییەکان لە بەهەشتدا، یانی: خوا لە قیامەتدا دەیانخوڵقێنێ و پەیوەندییان بە خەڵکی دنیاوە نیە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە ئەستێرە خۆ پەنهاکەرە بە خێرایی ڕۆیشتووە خۆ پەنادەرەکان و، بە شەوگار کە ڕادەبرێ و، بە بەرەبەیان کە شەبەق دەدا، کە قورئان گوتراوی نێراوێکی پەسندو بەڕێزی، خاوەن هێزی، لەلای خوای خاوەن عەرش پێگەداری، لە ئاسمانێ گوێڕایەڵیی بۆ کراویی، ئەمیندارە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ۝١٥ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ۝١٦ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ۝١٧ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ۝١٨ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ۝١٩ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ۝٢٠ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ۝٢١ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ﴾، وانیە (کە ئێوە دەڵێن، ئەی بێبڕوایەکان! کە قورئان موحەممەد ﷺ لە خۆیەوە هەڵیبەستبێ، یان شەیتانەکان فێریان کردبێ)، سوێند دەخۆم بە ئەستێرە خۆ پەنهانکەرەکان، (**خُنَّس**): ئەو ئەستێرانەن کە خۆیان پەنهان دەکەن، خۆیان دەشێرنەوە، مەبەست پێیان ئەو ئەستێرانەن کاتێك خۆر هەڵدێ، کە خۆریش هەر ئەستێرەیەکە لە ئەستێرەکان، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ئێمەوە نیزیکترە، ڕووناکیی و شەوقەکەی دنیا دادەگرێ و، ڕووناکیی کەمی ئەستێرەکان دیار نامێنێ.

٢)- ﴿ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ﴾، بە خێرایی ڕۆیشتووە خۆ پەنا دەرەکان، (**الجوار جمع جارية وهي التي تَجْرِي، أي: تَسير سَيْراً حثيثاً**)، ﴿ ٱلۡجَوَارِ ﴾، کۆی (**جارية**)یە، یانی: بە خێرایی ڕۆیشتوو، واتە: ئەو ئەستێرانەی بە ڕۆیشتنێکی خێرا دەڕۆن، ﴿ ٱلۡكُنَّسِ ﴾، کۆی (**كَانِس و كَانِسَة**) یە، (**كَانِس**) بۆ نێرو (**كَانِسَة**) بۆ مێ، هەردووکیان بە ﴿ ٱلۡكُنَّسِ ﴾، کۆ دەکرێنەوە، (**كَنَس الظَّبِيُ**)، واتە: ئاسکەکە چووە نێو کونەکەی خۆیەوە، چووە نێو هێڵانەکەی خۆیەوە، ئەو ماڵ و هێڵانەیەی دروستی دەکات، بۆ شەو تێدا مانەوە، لە چرۆ و لق و پۆپی

درەختەکان، ئەستێرەکان خوای کاربەجێ وای خوڵقاندوون، کاتێك خۆر هەڵدێ، وەك بچنە دواوەو بە خێرایی بڕۆن و خۆیان لە پەنایەك بگرن، وان.

٣)- ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴾، سوێند بە شەوگاریش کاتێك ڕادەبرێ، وشەی: ﴿ عَسۡعَسَ ﴾: لەو کردارانەیە کە مانای هاتن و مانای ڕابردنیش دەگرێتەوە کەواتە: دەگونجێ بڵێی: (وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ: إذا أقبل)، شەوگار کە دێ، یاخود (**إذا أدبر**) شەوگار کە ڕادەبرێ، بەڵام لێرەدا ڕابردن گونجاوترە، چونکە دوایی دەفەرموێ:

٤)- ﴿ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴾، سوێند بە بەیانییش کە هەناسە دەدا، بێگومانیش شەوگار ڕادەبرێ، ئنجا بەرەبەیان هەناسە دەدات و شەبەق دەدا، (**التنفُّس: خُرُوجُ النَّفَسِ مِنَ الحَيْوَانِ، واسْتُعِيرَ لِظُهُورِ الضياء مع بقايا الظَّلَام**)، (**تنفس**): بریتیە لەوەی ژیاندار هەناسە دەرباوێ و، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ دەرکەوتن و ئاشکرابوونی بەرەبەیان لەگەڵ مانەوەی هەندێك لە تاریکییش، کەواتە: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴾، واتە: سوێند بە شەوگار کە ڕادەبرێ، یاخود: سوێند بە شەوگار کە دێ، یاخود: هەردووکیان پێکەوە، چونکە بە نسبەت ئێمەوە کە شەبەقی بەیانی دەدا، شەوگار ڕادەبرێ و بەیانی دێ، بەڵام بۆ دیوی ئەو لای زەوی (ئەمریکاییەکان و ئوستڕاڵییەکان) لەوێ شەوگار دێ و ڕۆژگار ڕادەبرێ، هەمیشە شەو و ڕۆژ بە دوای یەکەوەن و بە دەوری زەوییەوە دەپێچرێن، بۆیەش خوای بەرز ئەو وشەیەی بەکارهێناوە، چونکە بەنسبەت نیوەی گۆی زەوییەوە، شەوگار ڕادەبرێ و بەیانیی دێ و، بە نسبەت نیوەکەی دیکەیەوە، شەوگار دێ و ڕۆژگار ڕادەبرێ.

٥)- ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴾، ئەم (قوڕئان)ە قسەی نێردراوێکی زۆر بەڕێزو نایابە، (**الكَريمُ هُوَ الجَيِّدُ مِنْ نَوْعِهِ**)، (**كريم**) باشترینە لە جۆری خۆیدا.

٦)- ﴿ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ﴾، خاوەن هێزە، لە لای خاوەن عەڕش (خوای بێ وێنە) خاوەن پێگەیە.

٧)- ﴿ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ﴾، لەوێ بە قسە کراوە، فەرمانبەریی بۆ کراوە، زۆریش دەستپاکە، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ جیبریلی ﵇ بە حەوت سیفەتان، پێناسە کردوە:

١- **(رسول)** نێرراو، ڕەوانەکراو.

٢- ﴿كَرِيمٍ﴾، **(النَّفِيس مِنْ نَوْعِهِ)**، زۆر چاك و نایاب له جۆری خۆی.

٣- ﴿ذِى قُوَّةٍ﴾، خاوەن هێز، چ هێزی ماددیی، چ هێزی مەعنەویی، له هەندێك له تەفسیرەکاندا هاتوە، جیبریل بۆ وەسفکردنی هێزی خۆی، باسی کردوە که باڵی خستۆته ژێر شارەکانی گەلی لووتەوە، بەرزی کردوونەوەی بۆ ئاسمان و خەڵکی ئاسمان گوێیان له بارەی مەڕو بزن و وەڕینی سەگ و زەڕەی کەر بووە، ئنجا نخوونی کردوونەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾﴾، شارە هەڵگێڕاوەکانی بەردانەوە.

٤- ﴿مَكِينٍ﴾، خاوەن پێگەیە، **(صِفَة مُشَبَّهة بالفعل من (مَكُن مَكَانَةً) إِذَا عَلَتْ رُتْبَتهُ عِنْدَ غَيْرِه)**، واته: خاوەن پێگەیە، ئەمە سیفەتی چوێنراوە بە کردار له **(مَكُنَ)**وە هاتوە، **(مَكُن مَكَانَة)**، واته: بووە خاوەن پێگە، هەر کاتێك پلەی بەرز بۆوە له لای جگە له خۆی.

٥- ﴿ثَمَّ﴾، لەوێ، **(هُنَاكَ اسْم مَكَان وَالمرَادُ هنا: المكانُ المجازيّ)**، مەبەست شوێنی مەجازییە، دەشگونجێ مەبەست سەرەوەی دروستکراوەکانی خوای پەروەردگاربێ، بەو شێوەیەی شایستەی خوای بێ وێنەیە.

٦- ﴿مُطَاعٍ﴾، بە قسەکراو، فەرمانبەریی کراو، واتە: خەڵك فەرمان پێکراوی وین، بە هەر شتێك فەرمانیان پێبکات، یاخود: لەوێ فریشتەکان بە قسەی دەکەن، هەر شتێك فەرمانیان پێ بکات.

٧- ﴿أَمِينٍ﴾، دەستپاك، **(الذي يحفظ ما عُهِد له به، حتى يؤديه دون نقص ولا تغيير)**، ﴿أَمِينٍ﴾: واتە: دەستپاك، ئەو کەسەی ئەوەی پێی سپێردراوە، بیپارێزێ، دەیپارێزێ تاکو بە بێ کەم و کووڕیی و بێ گۆڕانکاریی دەیگەیەنێ.

شایانی باسە: لێرەدا، کە دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴿١٦﴾﴾، ڕوونکەرەوەیەك دەڵێ: **(الفَاءُ لِتَفْرِيعِ القَسَمِ وَجَوَابُهُ عَلَى الكَلَامِ السَّابِقِ،**

لِلْإِشَـارَةِ إِلَى مَـا تَقَـدَّمَ مِـنَ الْـكَلَامِ هُـوَ بِمَنْزِلَـةِ التَّمْهِيـدِ لِـمَا بَعْـدَ الفَـاءِ، فَإِنَّ الـكَلَامَ السَّـابِقَ أَفَـادَ تَحْقِيـقَ وُقُـوعِ البَعْـثِ وَالْجَـزَاءِ، وَهُـمْ قَـدْ أَنْكَـرُوهُ وَكَذَّبُـوا الْقُـرْآنَ الَّـذِي أَنْذَرَهُـمْ بِـهِ، فَلَمَّا قُـضِيَ حَـقُّ الْإِنْـذَارِ بِـهِ، وَذُكِـرَ أَشْرَاطُـهُ، فُـرِّعَ عَنْـهُ تَصْدِيـقُ الْقُـرْآنِ الَّـذِي أَنْذَرَهُـمْ بِـهِ، وَأَنَّـهُ مُوحًـى بِـهِ مِـن عِنـدِ اللَّـهِ)[1].

واتـە: (فـاء): لێـرەدا بـۆ بنیاتنانـی سـوێندەو، وەڵامی سوێندەکەشـە لەسـەر قسـەی پێشـێ، ئاماژەیـە بـۆ قسـەکانی پێشـێ، کـە وەك ڕێخۆشـکردن وابـوون، بـۆ ئـەوەی لـە دوای (فاء)ەکـەوە دێ، چونکـە قسـەی پێشـێ ئـەوەی گەیانـد کـە سـزاو پاداشـت دەبـێ، ئەوانیـش نکووڵییـان لـەوە کردبـوو و ئـەو قورئانـەی ئـەو هەواڵـەی داوەو لـەو بـارەوە هۆشـداریی داوە، بـە درۆیـان دانابـوو، ئێسـتاش کـە باسـی ئـەوە کـرا، لـەو ڕۆژەدا ئـەوە ڕوودەداو بـاسی نیشـانەکانیشی کـرا، ئنجـا ئـەوە بنیاتدەنـرێ کـە ئـەو قورئانـەی ئـەو هۆشـدارییەی پێـداون و ترسـاندوونی لـەو ڕۆژە، دڵنیابـن کـە لەلایـەن خـواوە (بـە هـۆی جیبریلـەوە بـۆ موحەممـەد ﷺ) نێـردراوە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٢، جزء: ٣٠، ص١٥٢.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**باسـی پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ کـە وەك بێبڕوایـان لافیـان لێـدەدا، شێت نەبـووەو، جیبریلیشـی لەسـەر شێوەی ڕاستەقینەی خـۆی لـە ئاسۆی ڕوونـدا بینیـوەو، لەسـەر گەیاندنـی نادیاریـش چـرووك، (یاخـود: تۆمەتبـار) نیـەو، قوڕئانیش قسـەی شـەیتانی نەفرینلێکـراو نیـە، بـەس بیرخەرەوەیـە بـۆ جیهانییـان، بـۆ هـەر کـەس بیـەوێ ڕێـك و ڕاسـت بـێ، بەبـێ ویسـتی ڕەهـای خـواش، هیچکـەس ناتوانـێ بیـەوێ ڕێـك و ڕاسـت بـێ، یاخـود بـە پێچەوانـەوە، لارو لادەر بـێ:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴾، هاوەڵەکەشتان شێت نیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴾، هەندێك لە بێبڕوایەکان لە ئەنجامی بێ و یژدانیی و نەسەلمێنیی و عینادییدا، تۆمەتی سەیر سەیریان پاڵداونە لای پێغەمبەری خاتەم ﷺ وەك: شێتیی، جادووگەریی، شاعیریی، کاهینیی ... هتد.

ئنجـا لێـرەدا خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: هاوەڵەکەتـان شـێت نیـە، وەك یەکێـك لـە زانایـان گوتوویەتـی: (**إِشَارَةٌ لَطِيفَةٌ إِلَى كَوْنِهِ مَعْرُوفاً بَيْنَهُمْ بِكُلِّ خُلُقٍ سَنِيٍّ وَرَجَاحَةِ العَقْلِ وسُمُوِّ الأدب**)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴾، هاوەڵەکەشـتان شـێت نیـە، ئەمـە ئاماژەیەکـی پەنهانـە بـەوەی (پێغەمبـەر ﷺ موحەممـەد) لـە نێوانـدا نـاسراو بـووە، بـە هەمـوو ڕەوشـتێکی بـەرزو جـوان و، بـە تێـرو تەواویـی عەقڵ و ئەدەبـی پەسـندو بـاڵا، خـوای زانـاو توانـا ئەوەنـدە بـە بـەس دەزانـێ کـە بفەرمـوێ: ﴿ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴾، هاوەڵەکەتـان، واتـە: خۆتـان باشـی دەناسـن

و پێی ئاشنان، لە نێوتاندا ژیاوە، هەرگیز هیچ کەسێك باسی ئەوەی نەکردوە کە ناتەواوییەك لە عەقڵ و هۆشی موحەممەددا هەیە، پێش پێغەمبەرایەتیی و، دوای ئەوەش، گومانی تێدانیە کە بەهۆی پەیام و وەحیی خوای پەروەردگارەوە، عەقڵ و هۆشەکەی تێرو تەواوتر بووەو لێی کەم نەبۆتەوە!.

٢)- ﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوی بینیوە، یانی: جیبریل، چونکە پێشێ باس باسی جیبریلە عليه السلام کە خوا لە وەسفیدا فەرمووی: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿١٩﴾ ﴾، نەخێر، سوێند دەخۆم... ئەم (قورئان)ە گوتراوی نێردراوێکی بەرزو پەسندو بەڕێزە، ﴿ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ﴿٢٠﴾ ﴾، خاوەن هێزەو لە لای خاوەن عەرش پێگەدارە، ﴿ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ﴿٢١﴾ ﴾، لەوێ گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی بۆ کراوە، دەستپاك و پارێزەری سپاردەیە.

لێرەدا خوا تعالى دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ ﴾، ئەو هاوەڵەتان کە موحەممەدە ﷺ ئەوی (جیبریلی) بینیوە، لە ئاسۆی ڕوون دا.

(**إبن كثير**)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا، دەڵێ: (**والظاهر أن هذه السورة نزلت قبل الإسراء لأنه لم يذكر منها إلاّ هذه الرؤية، وهي الأولى**)، واتە: وا پێدەچێ ئەم سوورەتە پێش سوورەتی (**الإسراء**) دابەزیبێ، چونکە تەنیا ئەو بینینەی تێدا باسکراوە، (کە پێغەمبەر خوا ﷺ جیبریلی بینیوە) ئەویش بینینی یەکەمە.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ موحەممەد جیبریلی بینیوە بە بینینێکی ڕوون و ئاشکرا، ﴿ ٱلۡمُبِينِ ﴾، بە مانای (**واضح**)، ڕوون و ئاشکرا، ﴿ بِٱلۡأُفُقِ ﴾، (**أفق**) واتە: (ئاسۆ)، لە ئاسۆی ڕووندا بینیویەتی، لە صەحیحی بوخاریی دا هاتوە، کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دوای ئەوەی لە ئەشکەوتی **حیراء** دا جیبریل بۆی دەچێتە سەر شێوەی پیاوێك و پێغەمبەری خاتەم بەخۆیەوە دەگوشێ، بەسەرهاتەکەی هەیە، دوایی خوا پشتیوان بێ لە تەفسیری سوورەتی

(**العلق**)دا پێی دەگەین و باسی دەکەین، کە جیبریل پێی دەفەرمووێ: بخوێنە! دەڵێ: خوێندەوارنیم، دووبارە جیبریل بە خۆیەوە دەگوشێت و بەری دەداو پێی دەڵێ: بخوێنە! دیسان دەڵێ: خوێندەوار نیم، بۆ جاری سێیەم بە هەمان شێوە، جاری سێیەم، یان بۆ جاری چوارەم  بە پێی جیاوازیی ڕیوایەتەکان پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: (**مَا ذا أقرأ**)، چی بخوێنم؟ ئنجا ئەو پێنج ئایەتەی سەرەتای سووڕەتی (**العلق**)ی بۆ دادەبەزێنێ: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ۝٣ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝٥ ﴾.

دوایی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ و دەفەرمووێ: دەترسم دەستم لێوەشێترابێ و بە دایکمان خەدیجە دەفەرمووێ: دامپۆشە! خەدیجەش دڵی دەداتەوە، ئنجا بۆ جارێکی دیکە، جیبریل لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی، خۆی پیشانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدات لە ئاسۆدا، ئنجا ئەوەیە خوای پەروەردگار باسی دەکات، کە موحەممەد ﷺ جیبریلی بینیوە لە ئاسۆی ڕووندا، واتە: لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی، ئەگەرنا لە ئەشکەوتی (**حراء**)دا، لەسەر شێوەی پیاوێك کە جیبریل خۆی بردبووە سەر شێوەی وی، دیبووی و ئەو پێنج ئایەتە موبارەکەی سەرەتای سووڕەتی (**العلق**)یشی پێ فەرموو بوون.

**٣)**- ﴿ وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴾، ئەو لەسەر گەیاندنی پەنهان و نادیار، چرووك نیە، (**ضنين**)، یانی: (**بخيل**)، بە مانای: چرووك و دەست قووچاو، واتە: وانیە خوای زاناو توانا شتێکی پەنهانی پێ بڵێ، بەڵام ئەو بە ئێوەی ڕانەگەیەنێ.

ئەو وشەیە بە شێوەیەکی دیکەش خوێندراوەتەوە: (**بظنين**)، یانی: (**زلمُتَّهَمٍ**)، تۆمەتبار، واتە: موحەممەد ﷺ تۆمەتبار نیە، لەسەر گەیاندنی پەنهانێك کە خوای پەروەردگار ئەوی لێ ئاگادار دەکاتەوە، بەڵکو موحەممەد ﷺ پیاوێکی ڕاستگۆو ڕاستبێژو ئەمانەت پارێزە.

لە بارەی ئەو دوو خوێندنەوەوە، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: خوێندنەوەی (**بظنين**) بەهێزترە، لە هی (**بضنين**)و، دوو بەڵگەشیان هێناونەوە:

**١-** بێبڕوایەکان موحەممەدیان ﷺ بەوە تۆمەتبار نەکردوە، کە چرووکە **(إنَّهم لَمْ يُبَخِّلُوهُ)**، ئەوان بە چرووکیان دانەنابوو، بەڵکو دەیانگوت: شێتە، یان دەیانگوت: جادووگەرە، یان دەیانگوت: کاهینە، یان دەیانگوت: شاعیرە، کەواتە: بەشتی دیکە تۆمەتباریان کردوە، نەك گوتبێتیان: چرووك و ڕژدەو هیچی لەدەست هەڵناوەرێ.

**٢-** ئەگەر وشەکە **(ضنين)** بووایە، ئەو کاتە دەیفەرموو: **(وما هو بالغيب بضنين)**، واتە: موحەممەد ﷺ بە گوتنی شتێك کە پەنهانەو خوای پەنهانزان ئەوی لێ ئاگادار کردۆتەوە، چرووك نیە، **(ضاد و ظاء)**، کە بە **(أخت الصّاد وأخت الظّاء)**، ناوبراون، کاتی خۆی کە نووسراون، لە ڕێنووسی کۆندا زۆر لێك نیزیك بوون، چونکە ئەو چوکڵەیەی سەر **(ضاد)** ەکە، دەیکات بە **(ظاء)**، بەڵام بێگومان هەردووك خوێندنەوەکان موتەواتیرن و **(الطبري و إبن كثير)** و زۆرێك لە زانایانیش گوتوویانە: باش نیە، هەڵسەنگاندن بکرێ لە نێوان خوێندنەوەکاندا، مادام هەموویان بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوون، واتە: کۆمەڵێکی زۆری هاوەڵان لە پێغەمبەری خوایان بیستوەو، ئەوانیش بە کۆمەڵێکی زۆری دوای خۆیانیان گەیاندوەو، ئەوانیش بە هەمان شێوە، هەتا گەیشتۆتە ئێمە.

ئنجا دوای ئەوەی خوای پەروەردگار تۆمەتی شێتیی لە موحەممەد ﷺ دوورخستەوە، بە بەڵگەی ئەوەی هاوەڵ و ڕەفیقتانەو لە نێوتاندایەو چاك دەیناسن، هەروەها دوای ئەوەی ڕایگەیاند کە موحەممەد ﷺ لە خۆوە قسە ناکات، بەڵکو جیبریلی بینیوە لە ئاسۆی ڕووندا، کە مەبەست ئەو جارەیە لە شێوەی ڕاستەقینەی خۆی دا بینیویەتی، وەك لەم دەقەی سوننەتیش دا هاتوە:

{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، فِي قَوْلِهِ: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩﴾، قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺ جِبْرِيلَ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ} **(اخرجه البخاري: ٤٨٥٦، ومسلم: ١٧٤، والترمذي: ٣٢٧٧، والنسائي في التفسير:٥٥٤)**، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، لە بارەی فەرمایشتی خواوە کە دەفەرموێ: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩﴾، واتە: بە ئەندازەی دوو کەوانە، یاخود نیزیکتریش لێی نیزیك بوو، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ جیبریلی بینیوە، شەشسەد (٦٠٠) باڵی هەبووە.

واتە: لێرەدا مەبەست دیتنی پێغەمبەرە ﷺ بۆ جیبریل.

وەك لە تەفسیری سووڕەتی (النجم)دا بە تەفصیلْ لەو بارەوە قسەمان کردوە.

ئنجا دوای ئەوە خوای کاربەجێ دێتە سەر باسی قورئان و دەفەرموێ:

٤)- ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ﴾، ئەو (قورئان)یش قسەی شەیتانێکی دوورخراوە نیە (لە بەزەیی خوا).

﴿رَّجِيمٍ﴾، لەسەر کێشی (**فعيل**) و بە مانای (**مفعول**)ە، واتە: بەرد بارانکراو، لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە لە بەزەیی خوا دوورخراوەتەوە، وەك چۆن کەسێك بتەوێ دووری بخەیەوە، بەردانی پێدادەی بۆ ئەوەی بڕوا، شەیتانیش ئاوا لە بەزەیی خوا دوور خراوەتەوە، ئەم قورئانەش قسەی شەیتانێکی دوور خراوە نیە لە بەزەیی خوا، وەك ئێوە لاف لێدەدەن و تۆمەت هەڵدەبەستن.

٥)- ﴿فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ﴾، ئنجا بۆ کوێ دەچن؟ بەرەو کوێ دەڕۆن، لە حاڵێکدا بەڵگەتان لەسەر تەواو کراوە؟ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەر کەسێك عەقڵی خۆی بەکاربێنێ و تەماشای قورئان بکات، دەزانێ لە جگە لە خوای پەروەردگارەوە، ناگونجێ ئەم قورئانە هاتبێ.

وەك لە کتێبەکانی مێژوودا هاتوە کە ئەبوو بەکری صیددیق (خوا لێی ڕازی بێ) دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە مسوڵمانان هەڵیان بژاردوە بە یەکەم جێنشینی پێغەمبەری خاتەم، شاندێك لە لای موسەیلیمەی درۆزنەوە هاتوونە لای و، لافی ئەوەیان لێداوە کە موسەیلیمەش سرووشی بۆ کراوەو خوا کتێبی بۆ ناردوە! ئەبوو بەکریش (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بۆم بخوێننەوە، ئەوانیش هەندێك لەوەی گوایە موسەیلیمە بۆی نێردراوە، بۆی دەخوێننەوە، ئەبوو بەکریش (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بە دڵنیایی ئەم قسەیە لە خواوە دەرنەچووە، واتە: هەروەك قسەی ئاسایین، یەکێك لەو قسانەی موسەیلیمە

گوتوویەتی: منیش بۆم نێردراوە بە وەحیی، ئەوەیە کە لاسایی سوورەتی (القارعة)ی کردۆتەوە: ﴿ٱلْقَارِعَةُ ① مَا ٱلْقَارِعَةُ ② وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ③﴾، گوتوویەتی: (**الضِّفدعُ، ما الضِّفدع، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الضِّفدع**)، یاخود گوتوویەتی: (**الفِيل، ما الفِيل، وما أدراك ما الفيل، لَهُ أُذنان عريضان، وخرطوم طويل**)، فیل چییە؟ تۆ چووزانی فیل چییە؟ دوو گوێی پان و لووتێکی درێژی هەیە!.

هەڵبەتە هەموو کەس دەتوانێ ئەو جۆرە قسەیە بکات، ئنجا ئەوە لە کوێ و ئەوە لە کوێ کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی!!

بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ﴾، بەرەو کوێ دەچن؟ واتە: ئێوە لە تۆمەتبار کردنی قورئاندا بەوەی قسەی شەیتانێکی نەفرین لێکراوو دوورخراوەیە لە بەزەیی خوا، زۆر دوور دەڕۆن، زۆر لە هەق دوور دەکەونەوە.

٦)- ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾، ئەو تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان، (**إن**)، لێرەدا بە مانای: (**ما**)ی لابەرە (**النافية**)یە، یانی: (**ما هو** إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ)، قورئان هیچ شتێك نیە، جگە لە بیرخەرەوەو پەندو ئامۆژگاریی بۆ جیهانییان، جیهانییانیش:

**أ-** دەگونجێ مەبەست پێی هەموو مرۆڤەکان بێ، لە هەر شوێنێکی گۆی زەویدا هەن.

**ب-** دەگونجێ مەبەست پێی مرۆڤ و جند بێ، (**عالَمَي الإنس و الجن**).

**ج-** دەشگونجێ مەبەست پێی جگە لە ئەوانیش بێ، چونکە ئەو پەیامەی پێغەمبەری کۆتایی هێناویەتی ﷺ لە بەرژەوەندیی زیندەوەران و ئاژەڵ و پەڕەورو ژیاندارانیش دایە، بە گشتیی، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە بە چاکە لەگەڵ ئاوو دارو درەخت و ڕێ و بان و ژینگەدا، لەگەڵ دەوروبەریاندا، لەگەڵ ئاژەڵاندا، لەگەڵ پەڕەوەران دا، لەگەڵ زیندەوەراندا، مامەڵە بکە.

٧)- ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ﴾، بۆ هەر کامێك لە ئێوە بیەوێ ڕێك و ڕاست بێ، هەڵبەتە کە دەفەرموێ: بۆ هەر کامێك لە ئێوە ڕێك و ڕاست بێ، واتە: ڕێك و ڕاست بێ لەگەڵ خوادا ﷻ، لەگەڵ خودی خۆیدا، لەگەڵ خەڵکدا، ئنجا زمانی ڕاست بێ، دڵی ڕاست بێ، کردەوەی ڕاست بێ، هەروەها دیوی پەنهانی ڕاست بێ، دیوی دەرەوەی ڕاست بێ، ڕاست و ڕێك بێ، بە مانای وشەو بە گشتیی.

٨)- ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، ناشتانەوێ تاکو خوای پەروەردگاری جیهانییان نەیەوێ.

هەندێك لە تەفسیرەکان هێناویانە دەڵێن: یەکێك لە زلەزلانی قورەیش، یەکێك لە بێبڕوا دەستڕۆیشتووەکان، گوتی: کەواتە، ئەوە عایدی خۆمانە، داخۆ ڕاست دەبین، یان ڕاست نابین، ئەگەر ویستمان ڕاست و ڕێك دەبین، ئەگەر نەشمانویست ڕێك و ڕاست نابین، دەڵێن: بۆیەش خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، ناشتانەوێ مەگەر خوای پەروەردگاری جیهانییان بیەوێ.

لێرەدا زانایان زۆریان قسەیان کردوە، وەك پێشتریش لەو بارەوە هەر دواوین، کە ئایا ئەمە مەبەست پێی چییە؟ بۆیە لەو بارەوە کورتە باسێك دەکەین.

## کورتە باسێک لە بارەی

## پەیوەندیی نێوان ویستی ڕەهای خواو ویستی بەشیی مرۆڤەوە

هەر کام لە قەدەرییە و موعتەزیلەو، جەبرییە ئەو ئایەتەیان: ﴿ وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾، بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر بیروڕای خۆیان:

قەدەرییەو موعتەزیلە، گوتوویانە: لێرەدا خوا ﷻ کارەکەی بەستۆتەوە بە ویستی خۆمانەوە، کەواتە: خوا ویستێکی داوینێ، بەو ویستە دەتوانین ڕێك و ڕاست بین و، دەشتوانین چەوت و لار بین، بۆیە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خۆمان.

جەبرییەش گوتوویانە: ئەها خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾، ناتانەوێ تاکو خوای پەروەردگاری جیهانییان نەیەوێ، کەواتە: هەر کردەوەیەك دەیکەی، دەبێ خوا بیەوێ، ئنجا دەتوانی ئەنجامی بدەی.

لێرەدا وەك جارانی دیکەش باسمان کردوە، هەر کام لە قەدەرییەو موعتەزیلەو جەبرییە، یەکێکیان تووشی کورتهێنان بووەو، یەکێکیان تووشی تێپەڕاندن بووە.

قەدەرییەو موعتەزیلە، کە دەڵێن: مرۆڤ دەتوانێ هەموو شتێك بکات و تەنانەت بەدیهێنەری کردەوەکانیشی بێ، لە ڕاستییدا ئەوە جۆرێکە لە تێپەڕاندن (**إفراط**).

جەبرییەش کە دەڵێن: مرۆڤ هیچ شتێکی بۆ ناکرێ، تاکو خوا بۆی نەکات، ئەوەش بێگومان کورتهێنان (**تفريط**)ە.

تاکە ڕای ڕاست و ڕێك کە زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئوممەت لەسەرینی، هەرچەندە شێوەی دەربڕینەکەیان جۆراو جۆرە، ئەوەیە:

خوا ﷻ ویستێکی بە ئێمەی مرۆڤ داوە، هەروەها جندیش بە هەمان شێوە، کە بەو ویستە، بەو ئیرادەیە، دەتوانین چاکەمان پێی بوێ و دەتوانین ئیمانی پێ

هەڵبژێرین و فەرمانبەریی، دەشتوانین بە پێچەوانەوە: کوفرو خراپەو بێ فەرمانیی پێ هەڵبژێرین، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ناتانەوێ تاکو خوای پەروەردگاری جیهانییان نەیەوێ، واتە: ئێوە نەتاندەتوانی ڕێی ڕاست بگرنەبەر، یان ڕێی چەوت، ئەگەر خوا ﷻ ئەو توانایەی پێ نەدابان، نەك بۆ هەر کردەوەیەکی چاك، یان خراپ کە مرۆڤ دەیکات، خوا ﷻ ڕێی بدات، ئنجا بتوانێ بیکات، نەخێر ئایەتەکە وا نافەرموێ، بەڵکو دەفەرموێ: ئێوە ناتانەوێ تاکو خوا نەیەوێ، واتە: بۆیە دەتوانن چاکەتان بوێ و، بەو ویستە بەشیی (**إرادة جزئية**)یەی پێتان دراوە بۆ تاقیکردنەوە، دەتوانن ڕووی پێ لە ئیمان و تاعەت و چاکەکاریی بکەن، یاخود بە پێچەوانەوە: ڕووی پێ لە بێبڕوایی و خراپەکاریی بکەن، چونکە خوا ﷻ ئەو ویست و توانایەی پێداون.

کەواتە: ئەنجامدانی هەر کردەوەیەکی مرۆڤەکان، ئەگەر چاك بێ، ئەگەر خراپ بێ، پەیوەست نیە بە ویستی خوای کارزان، کە لەو کاتەدا خوا بیەوێ، ئنجا مرۆڤ بتوانێ بیکات، بەڵکو خوا ﷻ ویستێکی پێداون، بەو ویستە ئەوەی بیانەوێ پێی هەڵدەبژێرن، ئنجا لەبەر ئەوەی پێدانی ئەو ویستە، بە ویستی ڕەهای خوای پەروەردگارە، بۆیە خوای پەروەردگار ئاوای فەرمووە.

بە ڕاستیی مرۆڤ دەبێ لێرەدا وریا بێ و، نە تێپەڕێنێ و سەری بە بیرۆکەی موعتەزیلەو قەدەرییە بگات، نە کورتیشی بێنێ و سەری بە جەبر بگات، کە بە داخەوە ئەشعەرییەکانیش هەتا ڕاددەیەك و ماتوردییەکانیش لە ژێر کاریگەریی بیرۆکەی جەبرییە دابوون.

مامۆستای گەورەی کۆیە لە تەفسیرەکەی خۆی و لە کتێبێکی خۆیدا دەڵێ:

{چونکە سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد

ئۆممەتی وا زەبەلاح هەمووی بە زیندوویی مرد!

بیرۆکەی جەبر دەڵێ: مرۆڤ هیچ شتێکی لەدەست نایەت و ناتوانێ هیچ شتێك ئەنجام بدا، تاکو خوا بۆی ئەنجام نەدات و بۆی نەخوڵقێنێ! ئەمەش

لـە ڕاسـتییدا پێچەوانـەی هەمـوو ئـەو ئایەتانەیـە کـە خـوای بـەرز دەفەرمـوێ: مرۆڤـەکان دەتوانـن چـاك بکـەن و خـراپ بکـەن و، لەسـەر چاکـە، لەبـەر ئـەوەی بـۆ خۆیـان ئەنجامیـان داوە، پاداشـتیان هەیـەو، لەسـەر خراپـەش لەبـەر ئـەوەی بـۆ خۆیـان ئەنجامیـان داوە، سـزایان هەیـە، ئنجـا مـادام خـوای پـەروەردگار وا دەفەرمـوێ: ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧ ﴾السـجدة، ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٨٢ ﴾**الأنعـام**، کەواتـە: مـرۆڤ دەتوانـێ چاکـە بـکات و دەتوانـێ خراپـەش بـکات، بـەو ویسـتە بەشـییەی خـوای پـەروەردگار پێیـداوە.

بۆیـە بیرۆکـەی جەبـر لەگـەڵ ئایەتەکانـدا تێـك دەگیـرێ، ئنجـا ئەگـەر ئایەتێکـی ئـاوای لەسـەر بـە بەڵگـە بێننـەوە: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، وەك پێشـتریش گوتمـان: مانـا ڕاسـت و دروسـتەکەی بەمجۆرەیـە: ئێـوە نەتاندەتوانـی بتانـەوێ، مەگـەر خـوا ویسـتبای بـەوە کـە توانـای ویسـتنتان پـێ ببخەشـێ و پێیداون، واتـە: ئەگـەر خـوا ئـەو توانایـەی پـێ نەدابـان، نەتاندەتوانـی چاکەتـان بـوێ، یـان خراپـە، بـەڵام ئێسـتا کـە دەتوانـن ڕێـی ڕاسـت بگـرن و ڕێـی چەوتیـش بگـرن، لەبـەر ئەوەیـە کـە خـوای زانـاو بەتوانـا توانـاداری کـردوون.

هەروەهـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴾، بـۆ هـەر کامێـك لـە ئێـوە بیـەوێ ڕێـك و ڕاسـت بـێ، واتـە: مـرۆڤ دەتوانـێ ڕێـك و ڕاسـت بـێ، هـەروەك دەتوانـێ چـەوت و لاریـش بـێ، هـەر بەوەشـە کـە مـرۆڤ تاقـی دەکرێتـەوەو، خراوەتـە تاقـی کردنـەوەوە.

هەڵبەتـە تێپەڕانـدن خراپـەو کورتهێنانیـش خراپـەو خەتـی نێوەڕاسـت گرتـن چاکـە، ئێمـە کـە پێنـج فـەرزە لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ ﴾، واتـە: ڕێـی ڕاسـتمان پیشـان بـدە، بمانخـە سـەر ڕێـی ڕاسـت، بێگومان دۆزینـەوەی ڕێـی ڕاسـت، ئاسـان نیـە، بۆیـەش خـوا ﷻ ئـەو هەمـوو پێغەمبەرانـەی نـاردوون، کـە ڕێـی ڕاسـت پیشـانی ئێمـە بـدەن، لـە بـواری بووناسـیی و ئیـمان و عەقیـدەدا، لـە بـواری تێڕوانیـن و بۆچوونـەکان دا، لـە بـواری کردەوەکانـدا.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، ناشتانەوێ تاکو خوای پەروەردگاری جیهانییەکان نەیەوێ، واتە: بۆتان نەدەلوا، بتوانن ڕێی ڕێك و ڕاست هەڵبژێرن، ئەگەر خوا ئەو توانایەی پێنەدابان.

لێرەدا تۆزێك چەمکی ئەم ڕێك و ڕاست بوونە: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾، ڕوون دەکەینەوە:

**یەکەم:** بەر لە هەموو شتێك مرۆڤ دەبێ کار لەسەر خۆی بکات، عەقڵێکی ڕێك و ڕاستی هەبێ، ئنجا دەبێ کار لەسەر خۆی بکات، دڵ و دەروون و ناخ و زگماکێکی پاك و ساغ و ڕاستی هەبێ و، دەروونی بژار بکات لەو شتانەی زگماك دەشوێنن و چەشماندازی تێکدەدەن، هەروەها مرۆڤ دەبێ هەوڵبدات ئەو زانراوانەی بەهۆی پێنج هەستەکانەوە پەیدایان دەکات، ڕێك و ڕاست بن، بە هەڵە دا نەچێ و، گوێی بە هەڵە زانیارییە بیستراوەکان وەرنەگرێ و، چاوی بە هەڵە بینراوەکان نەبینێ، هەروەها هەستەکانی دیکەشی.

**دووەم:** مرۆڤ دەبێ وەك چۆن لە ڕووی عەقڵ و زگماك و، بەکارهێنانی هەستەکانیەوە ڕێك و ڕاست دەبێ، ڕێك و ڕاستیش لە ئایین و بەرنامەی خوای پەروەردگار تێبگات و لێی حاڵیی بێ، چونکە چەوت تێگەیشتن لە ئایین، پابەندییەکی چەوت و لاریش بەرهەم دێنێ.

**سێیەم:** مرۆڤ دەبێ هەوڵبدات لە زاتی خۆیداو لەگەڵ خۆیدا ڕاست بێ، ئەوەی بە زمانی دەیڵێ، لە دڵیشی دابێ و، ئەوەی بە زمان گوتی، بە کردەوەش جێ بەجێی بکات، واتە: دڵ و زمان و کردەوەکانی پێکەوە جووت بن.

**چوارەم:** دەبێ هەوڵ بدات لەگەڵ خوادا ڕاست بێ و کاتێك دەڵێ: خوایە! بەس تۆ دەپەرستم و، داوای یارمەتیی تەنیا لە تۆ دەکەم، بمخە سەر ڕێی ڕاست، بە جیددیی و بە هەموو توانایەوە سەرەتا هەوڵبدات لە بەرنامەی خوا تێبگات، چونکە ئەگەر لە ئایینی خوا تێنەگات، چۆن دەتوانێ خوا بپەرستێ و، دەتوانێ بە ڕێی ڕاستی خوادا بڕوات، ئەگەر شارەزای ڕێی ڕاستی خوا نەبێ؟

**پێنجەم:** هەروەها دەبێ هەوڵبدات لەگەڵ خەڵکیشدا ڕاست بێ، چ نیزیك و دۆست بن، چ دوورو ناحەزبن، دەبێ لەگەڵیاندا ساغ و ڕاست بێ، ئەویش بە گشتیی و لە هەموو ڕوویێکەوە: لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارو هەڵسوکەوت و مامەڵەی ڕۆژانەیەوە، لە سەرجەم بوارەکانی ژیان دا.

**شەشەم:** هەروەها مرۆڤەکان دەبێ هەوڵبدەن بەگشتیی و بە کۆ لە ڕووی ئیدارەدانی کۆمەڵگاوە، بە ڕێیەکی ڕاستداو بە شێوەیەکی ڕاست و دروست کۆمەڵگایەکەیان بەڕێوەبەرن، دیسان هەر کامێکیان وەك تاك کارێکی دەکەوێتە دەست لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، هەروەها لە چوارچێوەی خێزاندا، دەبێ هەوڵبدات ماڵ و خێزانەکەی بە ڕێك و ڕاستیی بەڕێوەبەرێ، ئنجا ئایا چەندە قسەی دەڕواو کاری لەبەر دەڕوا، ئاوی لە دوا دێ، دەبێ هەوڵبدات بە شێوەیەکی ڕێك و ڕاست، ئەوانەی لەبەر دەستیدان، سەرپەرشتییان بکات و، بە ڕێی ڕاستیاندا بەرێ.

خوای پەروەردگار بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێرێ، کە هەمیشە لە زاتی خۆیاندا ڕاستن و، لەگەڵ خوادا ڕاستن و، لەگەڵ خەڵکدا ڕاستن، دیوی شێرراوەو پەنهانیان ڕاستەو، دیوی دیارو بەرچاویان ڕاستەو، لە هەموو هەڵسوکەوتیاندا هەوڵدەدەن، ڕێك و ڕاست بن، تاکو وەبەر ئەو موژدەیەی خوا بکەوین، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾التوبة، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و لەگەڵ ڕاستتان دا بن، پێشێ فەرمان دەکات بە پارێزکاریی (تقوى)، لەبەر ئەوەی تەقوا ناخی مرۆڤ دەشوات و لە دیوی نیوەوەی ساغی دەکات و سافی دەکات، هەر کاتیش وابوو دەتوانێ لەگەڵ ڕاستانیش دا بێ و، لەگەڵ ڕاستانیشدا بەرێدا بڕوات.

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (التكوير) دێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێك

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کـە (١٩)ی مانگـی (**ذي القعـدة**)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی بەرانبـەر (١٠)ی تەممـووزی سـاڵی (٢٠٢٠) زاینییـە، لـە شـاری هەولێر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (**الإنفطـار**).

## پێناسەی سووڕەتی (الإنفطار) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئــەم ســووڕەتە زیاتــر نــاوی ســووڕەتی (**الإنفطــار**)ی بــۆ بەکارهاتــوە، پێشــتر ئــەم فەرموودەیەمــان بــۆ هێنــا، لــە کاتــی تەفســیرکردنی ســووڕەتی (التکویــر)دا، کــە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویەتــی: {**مَـنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُـرَ إِلَى يَـوْمِ الْقِيَامَـةِ كَأَنَّـهُ رَأْيُ عَـيْنٍ، فَلْيَقْـرَأْ: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١﴾، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ۝١﴾، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾**}، (**أخرجـه أحمـد: ٤٨٠٦، قـال الهيثمـي ج٧، ص١٣٤: رواه أحمـد بإسـنادين ورجالهـما ثقـات، والترمـذي: ٣٣٣٣، وقـال: حسـن غريـب، والحاكـم: ٨٧١٩، وقـال: صحيح الإسـناد، وأبـو نعيـم في الحليـة ج٩، ص٢٣١**).

واتـە: هـەر کەسـێك پێـی خۆشـە، تەماشـای ڕۆژی قیامـەت بـکات، وەك ئـەوەی بـە چاو ببینـێ (بـە چـاوی سـەر)، بـا سـووڕەتی: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١﴾ و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ۝١﴾ و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾، بخوێنێتـەوە.

بەڵام وێڕای ناوی (**سورة الإنفطار**)، سێ ناوی دیکەشی بۆ بەکارهاتوون:

أ- سورة ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١ ﴾.

ب- سورة انفطرت.

ج- سورة المنفطرة.

بەڵام ناوی هەرە باوی (**سورة الإنفطار**)ە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە بە یەکدەنگیی زانایان مەککەییە، لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

(**عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنه، **قَالَ: نَزَلَتْ:** ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١ ﴾، **بِمَكَّةَ**)[1].

واتــە: عەبدوڵــڵای کــوڕی عەببــاس رضي الله عنهما گوتوویەتــی: ســوورەتی: ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١ ﴾، لــە مەککــە دابەزیــوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ئـەم ســوورەتە موبارەکـە لـە موصحەفـدا، ژمارەکـەی: (٨٢)یـەو، لـە دابەزینیشـدا هــەر ژمــارە (٨٢)یــەو، لــە ڕووی دابەزینــەوە، پێــش ســوورەتی (**الإنشــقاق**)و، دوای ســوورەتی (**النازعــات**)، دابەزیــوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بــە لای تێکــڕای ژمێرەرانــی ئایەتەکانــی قورئــان، ژمــارەی ئایەتەکانــی ئەم ســوورەتە موبارەکــە نــۆزدە (١٩)یە.

---

(١) الدر المنثور للسيوطي (٨/ ٤٣٧).

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سووڕەتە موبارەکە لە بارەی سێ بابەتی سەرەکییەوە دەدوێ:

بابەتـی یەکـەم: ئایەتەکانـی: (١ - ٥)، پێنـج (٥) ئایەتـی سـەرەتا، باسـی ڕۆژی دوایـی بـە هـەردوو قۆناغەکەیـەوە.

قۆناغی یەکەم: سێ نیشانانی لێ دەخاتەڕوو.

قۆناغی دووەم: دوو نیشانانی لێy دەخاتەڕوو.

بابەتـی دووەم: ئایەتەکانـی: (٦ - ١٢)، حـەوت (٧) ئایـەت، دواندنـی مـرۆڤ بـە سەرزەنشـتکردنیەوە، کـە بۆچـی بەرانبـەر بـە پـەروەردگاری فریـوی خـواردوەو بوغـڕا بـووە، لـە حاڵێکـدا کـە بـە چەنـدان قۆنـاغ هێناویەتـە دی، پاشـان خسـتنەڕووی ئـەو ڕاسـتییە کـە فریشـتە پارێزەرەکانـی بەسـەرەوەن و، هەرچـی مرۆڤـەکان ئەنجامـی دەدەن، لـە خولیـاو نیـازی عەقـڵ و دڵیـان و، وشـەو تەعبیـری زارو زمانانیـان و، لـە کـردەوەی ئەندامەکانیـان، هەمـووی دەزانـن.

بابەتـی سـێیەم و کۆتایـی: ئایەتەکانـی: (١٣ - ١٩) دەگرێتـەوە، حـەوت (٧) ئایـەت، باسـی سـەرەنجامی هـەر کام لـە چاکـەکاران و تاوانبـاران و، پێناسـەیەکی کورتـی ڕۆژی دوایيـە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئەم سووڕەتە موبارەکە چوار تایبەتمەندییمان لێ کەوتوونە بەرچاو:

١- تاکە سووڕەتێکە باسی ڕۆژی دوایی کردبێ، بە هەردوو قۆناغەیەکەیەوە، لە تەنیا پێنج (٥) ئایەتداو، سێ ڕووداوی ئاخیر زەمان و دووانی قیامەتی تێدا باس کرابن، لە ئایەتەکانی: (١ - ٥)دا.

٢- ئەم تەعبیرە ڕاچڵەكێنە، تەنیا لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ٦﴾.

٣- بە (چوار) قۆناغی پلە پلەیی باسی دروستكردنی مرۆڤ لە ڕووی جەستەییەوە كراوە، لە ئایەتەكانی: (٧ - ٨)دا.

٤- چەند وشەو تەعبیرێكی تایبەت بەم سوورەتەوە:

١- وشەی: ﴿ٱنتَثَرَتۡ﴾، واتە: پرژو بڵاو بوو.

٢- وشەی: ﴿فُجِّرَتۡ﴾: واتە: تەقییەوە، یاخود تێكەڵ بوو.

٣- وشەی: ﴿بُعۡثِرَتۡ﴾: شكنرایەوە، یاخود هەڵگێڕدرایەوە.

٤- وشەی: ﴿فَعَدَلَكَ﴾: كە خوێندراویشەتەوە: (فَعَدَّلَكَ)، واتە: تۆی تەعدیل كردوەو ڕێك و ڕاست كردوە، هەندێك دەڵێن: (عَدَلَك)، یانی: ڕێك و ڕاستی كردووی، هەندێكشیان دەڵێن: ﴿فَعَدَلَكَ﴾، یانی: تۆی لاداوە لە چەوتیی بەرەو ڕاستیی.

٥- هەروەها تەعبیری: ﴿يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ﴾، ئەو ڕۆژەی هیچ كەس، هیچ شتێكی بۆ هیچ كەس پێ ناكرێ و، كاروبار بە دەست خوایە، ئەم تەعبیرەش تەنیا لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوە.

## حەوتەم و كۆتایی: دابەشكردنی ئایەتەكان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە نۆزدە (١٩) ئایەتەكەی ئەم سوورەتە موبارەكە دەكەینە یەك دەرس، چونكە هەرچەندە سێ بابەتیان تێدا باسكراون، بەڵام زۆر بە كورتیی و بە تێكهەڵكێشیی و جۆشدراویی كە ناگونجێ لە یەك جیابكرێنەوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە سەرجەم لە ئایەتەکانی نۆزدە ئایەتەکە: (١ - ١٩)ی ئەم سووڕەتە موبارەکە دەگرێتە خۆی، کە وەك گوتمان: سێ بابەتی گەورەو گرنگ و سەرەکیی دەگرنە خۆیان.

بابەتی یەکەم: باسی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و هەڵسانەوەو زیندووکرانەوەوە، لە پێنج ئایەتی سەرەتادا.

بابەتی دووەم: بانگکردنی مرۆڤ و سەرزەنشتکردنی لەسەر هەڵخەڵەتان و فریو خواردنی لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا، کە لە حەوت (٧) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی: (٦ - ١٢).

بابەتی سێیەم: باسی سەرەنجامی هەر کام لە چاکەکاران و تاوانباران لە قیامەتدا، لە حەوت (٧) ئایەتی کۆتایی، ئایەتەکانی: (١٣ - ١٩) دا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ ﴿٤﴾ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ وَأَخَّرَتۡ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ﴿١٤﴾ يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

(بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. هەر کات ئاسمان لێکپچڕا ﴿١﴾ هەر کاتیش ئەستێرەکان هەڵوەرین (و پرژان) ﴿٢﴾ هەر کاتیش دەریاکان تەقێنرانەوە ﴿٣﴾ هەر کاتیش گۆڕەکان ژێرو ژوورکران (و هەڵگێڕدرانەوە) ﴿٤﴾ هەموو کەسێك دەزانێ چی پێشخستوەو چی دواخستوە! ﴿٥﴾ ئەی مرۆڤ! چی تۆی بەرانبەر بە پەروەردگاری بەخشندەت فریوداوە؟ ﴿٦﴾ ئەو کەسەی دروستیکردووی و ڕێك و پێکی کردووی و هاوسەنگی کردووی ﴿٧﴾ لە هەر وێنەیەکدا کە ویستوویەتی پێکیهێناوی؟ ﴿٨﴾ وا نیە (وەك ئێوە خەیاڵ دەکەن)، بەڵکو ئێوە ڕۆژی سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن ﴿٩﴾ بە دڵنیاییش پارێزەرانتان بەسەرەوەن (لە فریشتان) ﴿١٠﴾ پەسندو بەڕێزن و (تۆمارکەرو) نووسەرن (بۆ کردەوەکانتان) ﴿١١﴾ دەزانن چی دەکەن! ﴿١٢﴾ مسۆگەر چاکەکاران لە نێو نازو نیعمەت (ی بەهەشت)دان ﴿١٣﴾ تاوانبارانیش لە نێو کڵپە(ی دۆزەخ)دان ﴿١٤﴾ لە ڕۆژی سزاو پاداشتدا دەیچنەتێ (و بە شێوەیەکی تایبەت پێی) دەسووتێنرێن ﴿١٥﴾ (بەردەوامیش تێیدا دەبن و) هیچ کات بوێرەری نابن ﴿١٦﴾ چی بە تۆی زانادوە ڕۆژی سزاو پاداشت چییە؟ ﴿١٧﴾ دیسان چی پێی زانادووی ڕۆژی سزاو پاداشت چییە؟ ﴿١٨﴾ ڕۆژێکە هیچکەس هیچ شتێکی بۆ هیچکەس بەدەست نیەو، لەو ڕۆژەدا کارو بڕیار هەمووی هی خوایە ﴿١٩﴾).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱنفَطَرَتۡ): (الفَطْـرُ: الشَـقُّ طُـولاً، افَطَـرَ: إنْشَـقَّ، تَفَطَّـرَت: تَشَـقَّقَت وَتَصَدَّعَـت)، (فَطْـر): بریتیـە لـەوەی شـتێك بـە بـاری درێژییـدا بقڵیشـێنی، دای بـدڕی، (إنْفَطَـرَ)، یانـی: (إنْشَـقَّ)، واتـە: قڵیشـا، یاخـود پچـڕا، (تَفَطَّـرَت: تَشَـقَّقَت وَتَصَدَّعَـت)، واتـە: ئـەو شـتە لـە یـەك بـووەوەو پچـڕا.

(ٱلۡكَوَاكِبُ): (جَمْـعُ كَوْكَـب، والكَوْكَـبُ فِي عِلْـمِ الفَلَـكِ جُـرْمٌ سَـمَاوِيٌّ يَدُورُ حَوْلَ الشَّـمْسِ وَيَسْـتَضِيءُ بِنُورِهَـا والكَوْكَـبَ: النَّجْـمُ)، (کواكـب) کـۆی (كَوْكَـب)ە، کـە لـە زانسـتی گەردووناسـییدا بریتیـە لـە تەنێکـی ئاسـمانیی بـە دەوری خـۆردا دەخولێتـەوە، لـە ڕۆشـنایی خـۆر بـە هرەمەنـد دەبـێ، [خـۆر نـۆ (٩) خڕۆکـەی بـە دەوردا دەخولێنـەوە، یەکێکیـان زەوییـەو ئەوانـی دیکـە: (مەرریـخ و موشـتەریی و زوحـەل و نیبتـۆن و بلۆتـۆن و ئۆرانـۆس و عەطـاردو زوهـرە]، وشـەی: (كَوْكَـب)، بە ئەسـتێرەش دەگوترێ.

(ٱنتَثَرَتۡ): (نَـثَرَ الـشَّيءَ: رَمَـى بـهِ مُتَفَرِّقًـا)، (نَـثَرَ الـشَّيءَ)، شـتەکەی هاویشـت و بـڵاوی کـردەوە، پـرژو بـڵاوی کـردەوە، (نَـثَرَ الحَـبَّ)، دەنکـەکانی بڵاوکردنـەوە کاتێـك کەسـێك دانەوێڵـە دەچێنـێ و، دەڕێـژێ، (نَـثَرَتِ المـرأَةُ بَطْنَهَـا)، ئافـرەت کـە چەنـد منداڵێکـی دەبـن، دەڵـێ: (نَـثَرْتُ بَطْنِـي)، واتـە: سـکی خـۆم هەڵڕشـتوە.

(فُجِّرَتۡ): (الفَجْـرُ: شَـقُّ الـشَّيءِ شَـقًّا وَاسِـعًا، كَفَجْـرِ الإِنْسَـانِ السِّـكْر)، (فجـر): بریتیـە لـە لـەت کردنـی شـتێك، بـە دڕینێکـی فـراوان، وەك کاتێـك مـرۆڤ بناوانگیـر (سِـكْر)، ئـەو شـتەی بنەوانـی پـێ گیـراوەو ڕێـی ئاوەکـەی پـێ گیـراوە، لایدەبـات و ئاوەکـە بـە فراوانیـی دێ.

(بُعۡثِرَتۡ): (قُلِـبَ تُرَابُهَـا وَأُثِـيرَ مَـا فِيهَـا)، (بُعۡثِرَتۡ)، وشـەیەکە پێکهاتـوە لـە: (بُعِـثَ + أُثِـير)، یاخـود وشـەی (بُعِـثَ) پیتـی (ر)ی خراوەتـە سـەر، (بُعۡثِرَتۡ) واتـە: گڵەکـەی

هەڵگێڕدرایەوەو ئەوەی تێیدایە، دەرهێنرا، وشەی: (بُعْثِرَتْ) یان لە: (بُعِثَ وَ أُثِيرَ)، واتە: هەڵسێنراو پرش و بڵاو کرا، پێکهاتوە، یاخود: (بُعْث + ر)، بۆتە (بُعْثِرَتْ).

(مَا غَرَّكَ): (الغُرورُ: الإِطْمَاعُ بِمَا يَتَوهَّمه المغرورُ نَفْعَاً وَهُوَ ضُرٌّ)، (غرور): بریتیە لە تەمادار کردنی کەسێك بەوەی بابای تەمادار، بە قازانجی تێدەگات، بەڵام زیانیەتی، واتە: فریو خواردن.

(غَرَّكَ): (الغِرَّةُ: غَفْلَةٌ فِي اليَقْظَةِ، وَأَصْلُ ذَلِكَ مِنْ غَرّ، وَهُوَ الأَثَرُ الظَّاهِرُ مِنْ شَيء، وَمِنْهُ غُرَّةُ الفَرَسِ)، (غِرَّة): بریتیە لە بێئاگایی لە کاتی بێدارییدا، کاتێك مرۆڤ نەخەوتوەو بێدارە، بەڵام لە شتێك دەخافڵێ ئەوە پێی دەگوترێ: (غِرّة)، ئەویش لە (غُرَّة)وە هاتوە، کە بریتیە لە شوێنەواری دەرکەوتوو لەسەر شتێك، وەك: (غُرَّةُ الفَرَسِ)، ئەسپ کە بەڵەك بێ، یاخود نێوچەوانی سپیی بێ، یاخود خۆی ڕەش بێ، بەڵام قوڵ و بازووی خەتی سپیی تێدابن، کەواتە: (غَرَّكَ)، واتە: تۆی فریو داوەو هەڵخەڵەتاندوە.

(فَسَوَّىٰكَ): (السَّوِيُّ: الَّذِي صِينَ مِنَ الإِفْرَاطِ مِنْ حَيْثُ القَدَرِ والكَيْفِيَّةِ، وَتَسْوِيَةُ الشَّيءِ جَعْلُه سَواءًا)، (سَوِيّ): بریتیە لەوەی پارێزرا بێ لە زێدەڕۆیی و لە کورتهێنان، چ لە ئەندازەدا، چ لە چۆنیەتیی دا، کەواتە: (تَسْوِيَةُ الشَّيءِ)، کە دەگوترێ: (سَوَّى الشَّيء، أي: جَعَلَهُ سَوَاءً)، شتەکەی ڕێکخست و ڕێك و پێکی کرد، کە زێدەڕۆیی کەمتەرخەمیی تێدانەبێ.

(فَعَدَلَكَ): (تَعْدِيلُ الشَّيءِ: تَقْوِيمُهُ، عَدَلْتُ فُلَانَاً بِفُلَانٍ: سَوَّيْتُ بَيْنَهُمَا)، (تَعْدِيلُ الشَّيءِ)، واتە: ڕاستکردنی ئەو شتە، دەگوترێ: (عَدَلْتُ فُلَاناً بِفُلَانٍ)، واتە: فڵانکەسم لەگەڵ فڵانکەس دا یەکسان کرد.

(رَكَّبَكَ): (رَكَّبَ الشَّيءَ: وَضَعَ بَعْضَهُ عَلَى بَعْض)، هەندێکی لەسەر هەندێکی دانا، کەواتە: (رَكَّبَكَ)، واتە: تۆی پێکهێناوە، (رَكَّبَ الدَّوَاءَ: أَلَّفَهُ مِنْ المَوَادِ المُخْتَلِفَة)، واتە: دەرمانەکەی لە چەند ماددەیەکی جۆراوجۆر پێکهێناوە.

(﴿يَصۡلَوۡنَهَا﴾): (أَصْلاَهُ النَّارَ، وَأَصْلاَهُ بِهَا، وَأَصْلاَهُ فِيهَا، وَأَصْلاَهُ عَلَيْهَا، وَصَلاَّهُ)، ئەوانە هەموویان بە واتایەك دێن، ئەگەر بویستریٚ بگوترێ: خستیە نێو ئاگرەوە، دەگوترێ: (أَصْلاَهُ بِهَا، وَأَصْلاَهُ فِيهَا، وَأَصْلاَهُ عَلَيْهَا)، هەروەها وشەی: (صَلَّى) و (صَلاَّهُ)، هەردووکیان بەکاردەهێنرێن، ئنجا ئەمە ئەگەر وشەی: (صلي)، بۆ گۆشت بەکاربێ، یان وێنەی گۆشت، واتە: برژاندیی، کەواتە: (﴿يَصۡلَوۡنَهَا﴾)، بە مانای (يَدْخُلُونَهَا) دەیچنەتێ، نیە، بەڵکو یانی: پێی دەبرژێنرێن بە شێوەیەکی تایبەت، پێی دەپیشێنرێن.

(﴿وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ﴾): لێشی نادیار نابن، (غَابَ: خِلاَفُ شَهِدَ وَحَضَر، وَغَابَ أَي: بَعُدَ)، (غاب)، دیار نەبوو، دیار نەما، پێچەوانەی (شَهِد و حَضَر)یە، (شهد)، بینی، (حضر)، ئامادە بوو، کەواتە: (غاب)، یانی: (بَعُدَ)، دوورکەوتەوە، (﴿وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ﴾)، ئەو بێبڕوایانە لە دۆزەخیش دا نا ئامادە نابن، هەمیشە تێیدا ئامادەن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١- بە ناوی خوا ئەم قورئان خوێندنە دەست پێدەکەم.

٢- بە پێی بەرنامەی خوا ئەم کارە دەکەم.

٣- بۆ وەدەستهێنانی پاداشت و ڕەزامەندیی خوا، ئەم کارە دەکەم.

٤- بە هەوڵ و توانایەك کە خوا بۆی ڕەخساندووم، ئەم کارە دەکەم.

﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ﴾، ﴿إِذَا﴾، وەك پێشتریش گوتوومانە: (ظرف زمان)ە، واتە: کاتێکە کارێکی تێدا ئەنجام دەدرێ، خوا دەفەرموێ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ﴾،

هەر کاتێك ئاسمان قڵیشا، لە سەرڕا بۆ خواری، ﴿ وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ ﴾، هەر کاتێك خڕۆکەکان یان ئەستێرەکان پرژان و هەڵوەرین، ﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴾، هەر کاتێك دەریایەکان گڕیان گرت، یاخود گڕیان تێبەردراو تەقێندرانەوە.

ئەم سێ نیشانەیە: (شەق و پەق بوونی ئاسمان و قڵیشانی و، هەڵوەرینی ئەستێرەکان و پرژانیان و، گڕگرتنی دەریایەکان و تەقێندرانەوەیان)، هەر سێکیان بێگومان لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدان، کە قۆناغی ئاخیر زەمان، قۆناغی کۆتایی پێ هاتنی ئەم قۆناغەی ژیانی دنیاو، ئەم حاڵەتەی ئێستای گەردوونە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴾، هەر کات گۆڕەکان هەڵگێڕدرانەوە، واتە: ئەوەی تێیاندایە هێنرایە دەرێ، (بَعْثَرَة)، بریتیە لەوەی شتێك لای بنەوەی بێتە لای سەرێی و، لای سەرێی بێتە لای بنەوەی، واتە: هەڵگێڕدرانەوەو سەرەوبن کران، ﴿ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴾، هەموو کەسێك زانی چی ئامادە کردووەو چیشی دواخستوە، ئەم دووانە، لە ڕۆژی قیامەتدا (واتە: قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییدا) ڕوودەدەن، بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا مردووەکان لە شوێنی خۆیان دەردەهێنرێنەوەو، ڕووحیان بەبەردا دەکرێتەوەو، لەو کاتەدا هەموو کەس، دەزانێ چی پێشخستوەو دواخستوە، چونکە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ عَلِمَتْ نَفْسٌ ﴾، (**نفس**)، لێرەدا (**نفس**) بە (**نكرة**)، نەزانراو هاتوە، واتە: هەموو کەس دەزانێ چی پێش خستوە لە چاکەو خراپەو، چیشی دواخستوە لە چاکەو خراپە، یاخود: چی پێشخستوە لە چاکە و، چیشی دواخستوە لە خراپە، یاخود چی پێشخستوە بۆ ڕۆژی دوایی خۆی و، چیشی دواخستوەو ئەنجامی نەداوە لە چاکە.

ئنجا دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی ڕۆژی دوایی کرد بە هەدوو قۆناغەکەیەوە:

قۆناغی یەکەم: سێ نیشانەی لێ هەڵدان و بریتین لە: قڵیشانی ئاسمان و، هەڵوەرین و پرژانی ئەستێرەکان و، گڕ تێبەردران و تەقێنرانەوەی دەریایەکان، ئەوە قۆناغی ئاخیر زەمان.

قۆناغـی دووەم: هەڵگێڕدرانـەوەی گـۆڕەکان و هێنرانـەدەری ئـەوەی تێیانـدا هەیـەو، زانینـی هـەر کەسـێك کـە چـی پێشخسـتوەو، چـی دواخسـتوە.

هەڵبەتـە لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴾، لـە سـوورەتی **(التكویـر)** دا فەرموویـەتی: ﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ ﴾، ﴿ سُجِّرَتْ ﴾، واتـە: ئایسـێنران و سـووتێنران، گڕیـان تێبـەردرا، بـەڵام لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ فُجِّرَتْ ﴾، تەقێنرانـەوە، ئـەوە ئیعجازێکـی زانستیی تێدایـە کـە کاتـی خـۆی نەزانـراوە، بۆیـە ڕوونکـەرەوانی قورئـان: ﴿ سُجِّرَتْ ﴾ و ﴿ فُجِّرَتْ ﴾یـان بـە مانـای **(مُلِئَـت)** پڕکـران، لێکداونـەوەو گوتوویانـە: ئـەم دەریایانـە سـەر وشـکانی پـڕ دەکـەن و وشـکانی ناهێڵـن! بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وانیـەو ئـەوە ئیعجازێکـی زانسـتیی تێدایـە، چونکـە ڕەمـزە کیمیاییەکـەی ئـاو بریتیـە لـە: ($H_2O$)، واتـە: دوو گەردیلـەی هایدرۆجیـن، لەگـەڵ یـەك گەردیلـەی ئۆکسـجین دا گەردێـکی ئـاو پێـك دێنـن، بێگومانیـش هایدرۆجیـن خـۆی دەسـووتێ و، ئۆکسـجینیش یارمەتیـی سـووتان دەدات، کەواتـە: دوو مـاددەی سـووتێنەرن و کاتێـك کۆدەبنـەوە بـە ڕێژەیەکـی دیارییکـراو کـە خـوا دایناوە، دەبنـە هـۆی دروسـت بوونـی ئـاوو، کـە لێـك جیادەبنـەوە هایدرۆجیـن دەسـووتێ و، ئۆکسـجینیش یارمەتیـی سـووتان دەدا.

ئنجـا دوای ئـەوە خـوا سـبحانە و تعالـی ڕوو دەکاتـە مـرۆڤ و دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴾، ئـەی مـرۆڤ! چ شـتێك تـۆی بەرانبـەر بـە پـەروەردگاری بەخشـندەت، پـەروەردگاری بـەرزو پەسـەندت، فریـو داوەو، لـە خشـتەی بـردووی؟ چ شـتێك وای لـە تـۆ کـردوە فریـو بخـۆی لـە بەرانبـەر پەروەردگارتـدا، بـەو شـێوەیەی بـۆ خـوا شایسـتەیە مامەڵـەی لەگەڵـدا نەکـەی، ئـەو پـەروەردگارە هـەر بەخشـندەو هـەرە بـەرزو پەسـندەت؟ ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَكَ ﴾، ئـەو زاتـەی تـۆی هێناوەتـە دی، ﴿ فَسَوَّىٰكَ ﴾، ئنجـا تـۆی ڕێکخسـتوە، ڕێـك و پێکـی کـردووی، نـەك هـەر پارچـە گۆشـتێك بـی لـەو گـۆڕە، بەڵکـو چەنـدان ئەندامـی بـۆ تـۆ دانـاون، ﴿ فَعَدَلَكَ ﴾، ئنجـا هـەر ئەوەنـدەش نەبـووە تەنیـا ئەندامەکانـت بـۆ

دروست بکات، بەڵکو هاوسەنگی کردووی، ئەندامەکانت بە ئەندازەی یەکن، دەستێکت لە دەستێکت درێژتر نیە، چاوێکت لە چاوێك گەورەتر نیە، ﴿ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴾، لە هەر وێنەیەك دا کە ویستوویەتی تۆی پێکهێناوە، چ لە ڕووی قەدو قیافەوە، چ لە ڕووی ڕەنگ و دیمەنەوە، چ لە ڕووی ڕەنگی پێستەوە، چ لە ڕووی جەستەییەوە، چ لە ڕووی مەعنەوییەوە، لە هەر شێوەیەکدا کە ویستوویەتی تۆی هێناوەتە دی و تۆی پێکهێناوە.

کەواتە: خوایەك سبحانه وتعالی کە بەو شێوەیەی تۆی خوڵقاندوە، شایستەی ئەوەیە بەندایەتیی بۆ بکەی و، بیپەرستی و، سەرپێچیی لی نەکەی و، فریو نەخۆی لە مامەڵە کردن لەگەڵیدا و، بە شێوەیەك مامەڵە بکەی کە شایستەی خوا نیە.

دوایی خوا سبحانه وتعالی دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا ﴾، با واز بێنن، لە فریو خواردن لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا، یاخود: باواز بێنن لە قسەو باسانەی دەیانکەن، لەو شێوە هەڵسوکەوتەی دەیکەن، ﴿ بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴾، بەڵکو ئێوە بێبڕوان و، ڕۆژی سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن، هی ئەوەیە کە بەو شێوەیەن، بڕواتان بە ڕۆژی دوایی نیە، بۆیە خۆتانی بۆ ئامادە ناکەن و، بەو شێوەیەش کە بۆ خوا شایستەیە، مامەڵەی لەگەڵدا ناکەن.

﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە پارێزەرتان بەسەرەوەن، ئەو پارێزەرانە، چۆنن، کە بە دڵنیایی فریشتەکانن؟ ﴿ كِرَامٗا ﴾، کۆی (**كريم**) ە، ئەویش: (**الجَيِّدُ مِنْ نَوْعِهِ**)، هەر شتێك لە جۆری خۆی باشترین بێ، پێی دەگوترێ: (**كريم**)، واتە: ئەو فریشتانە زۆر باشن، زۆر بەرزو پەسندن، زۆر بەڕێزو بەخشندەن، ﴿ كَٰتِبِينَ ﴾، نووسەریشن، واتە: هەرچی ئێوە دەیکەن، هەمووی تۆمار دەکەن، چی تۆمار دەکەن؟ ﴿ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴾، هەرچی ئێوە ئەنجامی دەدەن، ئەوان دەیزانن، ئەو شتانەش کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدا، بەرلەوەی بە ڕواڵەت مرۆڤ ئەنجامیان بدات، لە دەروون و ناخی دا هەن، بۆ

وێنـە: کـە قسـەیەك دەکات پێشـتر لـە عەقـڵ و دەروونـی خـۆی ئامـادەی دەکات، پاشـان ئـەو قسـەیەی دەیـکات، هـەوڵ دەدا کاری پـێ بـکات، کەواتـە: سـەرچاوەی قسـەکانی مـرۆڤ و سـەرچاوەی کردەوەکانـی مـرۆڤ، بریتیـە لـە دڵ و دەروون، بۆیـە فریشـتەکان وەك دوایـی باسـی دەکەیـن وێـڕای ئـەوەی قسـەکانتان دەبیسـتن و، کردەوەکانیشـتان دەبینـن و، تۆماریـان دەکـەن، وێـڕای ئـەوە نیـازو مەبەسـتەکانی نێـو دڵتـان و، خولیـاو بیـرو بۆچوونەکانـی نێـو عەقڵیشـتان، ئەوانیـش دەزانـن و تۆمـار دەکـەن، ئەگـەر چـاك، ئەگـەر خـراپ، چونکـە ئینسـان جـاری وایـە نیـەت لـە شـتێکی بـاش دێنـێ، بـەڵام بـۆی ئەنجـام نـادرێ، فریشـتەکان ئـەو نیەتـە چاکـە دەزانـن، لـە شـوێنەوارێکدا هاتـوە: (**نِيَّـةُ المؤْمِـنِ خَـيْرٌ مِـنْ عَمَلِـهِ**)[1]، نیـازو مەبەسـتی بـڕوادار باشـترە لـە کردەوەکـەی، مـرۆڤ بـە نیـەت دەتوانـێ زۆر شـت بـاش لـە دڵـی خۆیـدا بچەسـپێنێ، بـەڵام بـۆی ئەنجـام نـادرێ، خـواش نیەتەکـەی دەزانـێ و فریشـتەکانیش دەیزانـن و تۆمـاری دەکـەن.

وەك لـە فەرمایشـتی صەحیحـی پێغەمبـەردا هاتـوە ﷺ دەفەرمـوێ: {**«مَـنْ هَـمَّ بِحَسَـنَةٍ فَلَـمْ يَعْمَلْهَـا كُتِبَـتْ لَـهُ حَسَـنَةً، وَمَـنْ هَـمَّ بِحَسَـنَةٍ فَعَمِلَهَـا كُتِبَـتْ لَـهُ عَـشْرًا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْـفٍ، وَمَـنْ هَـمَّ بِسَـيِّئَةٍ فَلَـمْ يَعْمَلْهَـا لَـمْ تُكْتَـبْ وَإِنْ عَمِلَهَـا كُتِبَـتْ»**} (**أخرجـه مسـلم: ٣٥٤، وابـن حبـان: ٣٨٤، قـال شـعيب الأرنـؤوط : إسـناده صحيـح عـلى شرط الشـيخين**).

واتـە: هـەر کـەس ویسـتی چاکەیـەك بـکات و نەیکـرد، چاکەیـەکی بـۆ دەنـووسرێ و، هــەر کــەس چاکەیــەکی ویســت بیــکات و کــردی، بــە دە (١٠) هێنــدە هەتــا حەوتسـەد (٧٠٠) بـۆی دەنـووسرێ و، هـەر کـەس ویسـتی خراپـەك بـکات و نەیکـرد بـۆی نانـووسرێ و، ئەگـەر کـردی، بـۆی دەنـووسرێ.

---

(١) {قـال الإمـام أحمـد: وأخبرنـا أبـو محمـد بـن يوسـف، قـال: سـمعت أبـا الحسـين بـن أحمـد بـن زكريـا الأديـب بهمـدان سـمعت أبـا الحسـن عـلي بـن عبـد اللـه يقـول : سـمعت أحمـد بـن يحيـى ثعلـب يقـول: سـمعت ابـن الأعـرابي يقـول: نيـة المؤمـن خير مـن عملـه، لأن النيـة لا يدخلها الفسـاد، والعمـل يدخلـه الفسـاد، وإنمـا أراد بالفسـاد بالريـاء} أخرجـه البيهقـي في شـعب الإيمان برقـم: ٦٨٦٠.

کەواتـە: مـرۆڤ کاتێـك دڵـی خـۆی دەچەسـپێنێ لەسـەر چاکەیـەك و، چاکەکـە ئەنجـام نـەدا، یـانی: چاکەکـەی بـۆ ئەنجـام نـەدرا، لەبـەر ئـەوەی دەسـتی نەگەیشـتێ، نـەك لێـی پەشـێمان بـوو بێتـەوە، بـە چاکەیـەك بـۆی دەنـووسرێ و، ئەگـەر ئەنجامـی دا، یـەك بـە دە بـۆی دەنـووسرێ تاکـو یـەك بـە حەوتسـەدیش دەڕوا، بـەڵام هـەر کات نیەتـی خـۆی سـاغ کـردەوە لەسـەر خراپەیـەك، ئەگـەر ئەنجامـی نـەدا، (واتـە: لێـی پەشـێمان بـووەوە)، خـوا یـەك چاکـەی بـۆ دەنووسـێ، بـەڵام ئەگـەر ئەنجامیـدا، یـەك خراپـەی بـۆ دەنووسـێ.

ئنجـا خـوا سـبحانە وتعالـی دێتـە سـەر بابەتـی کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەو دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴾، بـە دڵنیایـی چاکـەکاران لـە نێـو نـازو نیعمـەت دان، ﴿ ٱلۡأَبۡرَارَ ﴾، کـۆی (بَـرّ)، یاخـود کـۆی (بـارّ)ە، واتـە: چاکـەکار، کـۆی هـەر کامێکیـان بـێ: (بـرّ) و (بـارّ)، هەردووکیـان بـە مانـای چاکـەکار دێـن، چاکـەکاران، ﴿ لَفِي نَعِيمٖ ﴾، لـە نـازو نیعمـەت و خۆشـگوزەرانیی دان، کـە بێگومـان مەبەسـت پێـی بەهەشـتە، ﴿ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ﴾، بـە دڵنیاییـش تاوانبـاران و خراپـەکاران لـە نێـو کڵپـەی ئاگـری دۆزەخـدان، ﴿ يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴾، لـە ڕۆژی سـزاو پاداشـتدا دەیچنەتـێ، (صَلِي)یـش، بریتیـە لـە سـووتێنرانی مـرۆڤ بـە ئاگـر بەشـێوەیەکی تایبـەت، ئەویش ئەوەیـە کـە لـە هـەر چـوار لاوە ئاگرەکـە لێـی بـدات و ببرژێ، یـان ئەگـەر ئاگرەکـە لێـی دوور بـێ، ببیشـێ، ﴿ وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ ﴾، ئنجـا کـە دەخرێنـە نێـو ئاگریشـەوە لێـی نادیـار نابـن، واتـە: بـەردەوام سـزا دەدرێـن، نـەك ماوەیـەك سـزا بدرێـن و دوایـی لێـی بچنـە دەرێ و پشـوو بـدەن، بەڵکـو بـەردەوام لـە نێـو ئـەو ئاگرەدا سـزا دەدرێـن، خـوا پەنامـان بـدات، ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴾، چ شـتێك بـە تـۆی زانانـدوە، ڕۆژی سـزاو پاداشـت چییـە؟ دەگونجـێ ڕووی دوانـدن لـە پێغەمبـەری خاتـەم بـێ، یاخـود لـە هـەر کەسـێك بـێ بشـێ بدوێنرێ، واش پێدەچـێ ئەمەیـان ڕاسـتتر بـێ، ئـەی مـرۆڤ چ شـتێك بـە تـۆی زانانـدوە ڕۆژی سـزاو پاداشـت چییـە؟.

﴿ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴾، دیسان چ شتێك بە تۆی زانانـدوە ڕۆژی سزاو پاداشت چییە؟، واتە: هێندە گەورەو مەزنە، نایەتە وەسفکردن و، جگە لە خوا سبحانە و تعالی هیچ کەسێکی دیکە نازانێ چی تێدا ڕوودەدا.

﴿ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗا ﴾، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە هیچ کەس بۆ هیچ کەس، هیچ شتێکی لە دەست نایەت، ئەو ڕۆژە هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نیە، بۆ هیچ کەسێك ﴿ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ﴾، کاروبارو بڕیار لەو ڕۆژەدا تەنیا هی خوایە ﷻ.

کەواتە: ئێوە ڕۆژێکی ئاواتان لە پێشە، ئەی مرۆڤەکان و، فریشتەکانیش هەموو شتێکی ئێوە تۆمار دەکەن، هەر لە نیازو مەبەستی نێو دڵ و دەروونتان و بیرو خولیای عەقڵ و هۆشتان، هەتا دەربڕینەکانی زمانتان و، هەڵسوکەوتی ئەندامەکانتان، هەموو شتێك تۆمار دەکرێ و، لەو ڕۆژەدا هەموو شتێکتان دێتەوە بەرچاو، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ وَأَخَّرَتۡ ﴾، هەموو کەسێك دەزانێ چی پێشخستوەو چیشی دوا خستوە، چی پێشخستوە لە چاکەو، چی دوا خستوە لە چاکە! یاخود: چی پێشخستوە لە گوناهو تاوان و خراپەو، چیشی دواخستوە لە چاکە! ئەوە بە نسبەت بێبڕوایانەوە، یاخود: لەبڕواداران: چی پێشخستوە لە چاکەو ئەنجامی داوەو، چیشی دواخستوەو تەنبەڵیی و سستیی تێدا کردوە، هەموو کەس هەموو شتێکی بۆ دەردەکەوێ.

بەڕێـــزان!

بەڕاستیی ئیمان هێنان بەو ڕۆژەی ئەو سووڕەتە موبارەکانە هەموویان زۆر جەختی لەسەر دەکەنەوە، هاندەرو پاڵنەری مرۆڤ دەبێ بۆ ئەوەی هەرچی لە دەست دێ بۆ چاکە بیکات و، خۆی لە هەموو جۆرەکانی خراپە بپارێزێ، بۆیە خوا ﷻ هەم لەم سووڕەتە موبارەکەو، لە سووڕەتی **(التكوير)** و، لە سووڕەتی **(الإنشقاق)**دا و، لە سووڕەتی **(المطففين)** دا، کە دوای ئێرە پێی دەگەین، هەروەها

لـە زۆر لـە سـوورەتەکانی دیکـەدا، خـوا ﷻ زۆر باسـی قیامـەت دەکات، وەك لـە سـوورەتی (**القیامـة**)دا، کورتـە باسـێکی تـا ڕاددەیـەك تێـرو تەسـەلمان لـە بـارەی ڕۆژی دواییـەوە کـرد، خـوا ﷻ بۆیـە هێنـدە باسـی دەکات، چونکـە لـە دوای بـڕوا بـە خـوا ﷻ هێنـان، بـڕوا بـە ڕۆژی دوایـی، گەورەتریـن کاریگەریـی هەیـە لەسـەر مـرۆڤ، لەسـەر شـێوەی هەڵسـوکەوتی مـرۆڤ، کـە چاکـەکار بـێ و، لـە خراپـەو تـاوان و لادان دوور بـێ.

خـوا ﷻ لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە بـە ڕاسـتیی بڕوایـان بـە خـواو بـە دیـدار خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەیـەو، تەوفیقـمان بـدات هەرچـی چاکەیـە ئەنجامـی بدەیـن و، خۆمـان لـە هەرچـی تـاوان و خراپـەو لادانـە بپارێزیـن، تاکـو لـەو ڕۆژەدا کـە هیچکـەس هیـچ شـتێکی بـۆ هیچکـەس لـە دەسـت نایـەت، ئێمـە بـۆ خۆمـان پێشـتر کاری خۆمانمـان کردبـێ و، بـەرەی خۆمانمـان لـە ئـاوێ دەرهێنابـێ و، لـەوێ ئاتـاج و موحتاجـی کـەس نەبیـن و، ئـاوڕ لەمـلاولا بدەینـەوە، دەبـێ کـێ هاوکارییـمان بـکات؟! کـە بـە دڵنیایـی هیچکـەس هیـچ شـتێکی بـۆ هیچکـەس لـە دەسـت نایـەت.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**کاتێك ئاسمان لێك دەپچڕێ و، ئەستێرەکان بە پرژانەوە دەوەرن و، دەریایەکان دەتەقنەوەو گۆڕەکان هەڵدەگێڕدرێنەوەو، هەموو کەس دەزانێ چی پێشخستوەو چییشی دوا خستوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ٢ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ٣ وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ ٤ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ وَأَخَّرَتۡ ٥﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ﴾، هەر کات ئاسمان لێك پچڕا، (**فطر**): بریتیە لە داقڵیشانی شتێك، قڵیشاندنی لە سەر ڕا بۆ خوارێ، بە باری درێژاییدا، دەگوترێ: (**فَطَرْتُهُ فَانْفَطَر**)، قڵیشاندم ئەویش قڵیشا، هەندێك لە زانایان (**إنفطار**)یان یە(**إنشقاق**)یش لێکداوەتەوە، بەڵام وەك دواتر لە تەفسیری سووڕەتی (**الإنشقاق**)، باس دەکەین، ئەم وشانە هەموویان جیاوازیی وردیان لەگەڵ یەکدیدا هەیە، (**إنفطار**)، بریتیە لەوەی شتێك بقڵیشێنرێ و دابدڕێنرێ لەسەر ڕا بۆ خوارێ، بەڵام (**إنشقاق**)دا، بریتیە لە لەتبوون و لێك بڵاوبوونی شتێك.

وشەی: ﴿ٱلسَّمَآءُ﴾، وەك جارانی دیکەش گوتوومانە: چ بە تەنیا بێ، ﴿ٱلسَّمَآءُ﴾، چ بە کۆ بێ، ﴿سَمَٰوَٰتٍ﴾، چ بە: ﴿سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ بێ، هەموویان مەبەست پێیان کۆی گەردوونە[1]، - ئەوەی بۆ ئێمە تاکو ئێستا زانراوە - ئەگەرنا

---

(١) بەپێی زاراوەو تێگەیشتنی ئێمە، ئەگەرنا بێگومان چەمك و واتای: ئاسمان و ئاسمانەکان و حەوت ئاسمانەکان (سماء و سموات و سبع سموات) زۆر لە چەمك و واتای: گەردوون

بێگومان کاتێك دەگوترێ: حەوت ئاسمانەکان، وەك پێشتریش لە چەند شوێنێکدا باسمان کردوە، مادام خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَـٰبِيحَ ۝٥﴾ الملك، بەدڵنیایی ئاسمانی نیزیکترمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، مەبەست لە: ﴿بِمَصَـٰبِيحَ﴾ە، کە کۆی (**مصباح**)ە، ئەستێرەکانن، چونکە چرا تیشك دەداو ئەستێرەکانیش تیشك و ڕووناکییان هەیە، کەواتە: هەرچی ئەستێرەیە، کە هەر کۆمەڵە ئەستێرەیەك کەهکەشانێك پێکدێنن، هەرچی ئەستێرەیەو هەرچی کەهکەشانەو، هەرچی گەلە کەهکەشانە، ئەوانە هەموویان لە سنووری ئاسمانی نیزیکتر لە ئێمە دان، یانی: ئاسمانی یەکەم بە نسبەت ئێمەوە، ئەگەر لە خوارێ ڕا بەرەو سەرێ بچین، ئنجا لەسەرووی ئەویشەوە کە ناشزانرێ کە سنوورەکەی تاکو کوێیە، شەش ئاسمانی دیکەی: دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم، هەن، لە دوای ئەویش (**سدرة المنتهي**)، درەختی کۆتایی و، لە دوای ئەویشەوە عەرشی خوای پەروەردگار، خوا ﷻ لە دروستکراوەکانی خۆی، ئەوەندەی بۆ ئێمە باس کردوون، بەس خوا خۆشی دەزانێ چی دیکەی خوڵقاندوەو، چی دیکەش هەیەو، ئەوانیش سنووریان تاکو کوێیە؟.

خوا دەفەرموێ: کاتێك ئاسمان قڵیشا لەسەر ڕا بۆ خوارێ، بە باری درێژییدا لەتبوو.

**٢**)- ﴿وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ﴾، هەر کاتێك ئەستێرەکانیش پڕژان و هەڵوەرین، (**إنتثار**) بریتیە لە پرژو بڵاو بوون، (**نَثَرَهُ أي فَرَّقَهُ**)، پرژو بڵاوی کردەوە، ﴿ٱنتَثَرَتْ﴾، (**نَثَرْتُهُ فَانْتَثَرَ**)، پڕژاندم پڕژا، بڵاوم کردەوە بڵاو بۆوە، بۆیە زانایان وایان لێکداوەتەوە (**أي: إذا تَسَاقَطتْ مُتَفَرِّقَةً**)، کاتێك ئەستێرەکان کەوتنە خوار بە پرژو بڵاویی، هەندێکیش ﴿ٱنتَثَرَتْ﴾یان بە: (**فَانْفَجَرْت**)، واتە: کاتێك ئەستێرەکان لێك بڵاو بوون، ئایا مەبەست لە ﴿ٱلْكَوَاكِبُ﴾، کە کۆی (**کوکب**)ە، چییە؟ (**مختار الصِّحاح**)، دەڵێ: (**الکوکب: النجم**)، (**کوکب**): بریتیە لە ئەستێرە.

---

(کون) فراوانترەو، گەردوون ڕەنگە تەنیا گۆشەیەکی گچکەو تەسکی ئاسمانی یەکەم بێ!

بەڵام ئێستا لە زاراوی گەردوونناسییدا (**كواكب**)، بەو خڕۆكانە دەگوترێ كە بە دەوری ئەستێرەیەكدا دەخولێنەوە، بۆ وێنە: نۆ (٩) خڕۆكەكەی كۆمەڵەی خۆر، كە هەموویان بە دەوری خۆردا دەخولێنەوەو، تیشكی خۆریان بۆ دێ و، بە هۆی تیشكی خۆرەوە ڕووناك دەبنەوە، ئەو نۆ (٩) خڕۆكەیە: زەوی، مەرریخ، موشتەریی، زوحەل، نیبتۆن، بلۆتۆ، زوهەرە، ئۆرانۆس، پرۆتۆس، ئەو نۆیە هەموویان پێیان دەگوترێ: كۆمەڵەی خۆر، لەبەر ئەوەی هەر هەموویان بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە، هەر كامێكیان لە سووڕگەیەكی تایبەتی خۆیدا.

بەڵام لە بەكارهێنانی قورئاندا خوا ﷻ هەم وشەی: (**كواكب**) و هەم وشەی: (**نُجُوم**)ی بەكارهێناوە بۆ ئەستێرەكان و، دەگونجێ (**كواكب ونُجُوم**) وێڕای ئەستێرەكان، خڕۆكەكانیش بگرنەوە، واتە: ئەو تەنانەی بە دەوری ئەستێرەكاندا دەخولێنەوەو لە ئەستێرەكانەوە تیشك و ڕووناكییان بۆ دێ، كاتێك دێ ئەو ئەستێرانە دەپرژێن و هەڵدەوەرن.

**٣)**- ﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴾، هەروەها كاتێك دەریاكان تەقێنرانەوە، یاخود: كاتێك دەریایەكان تێكەڵ بە یەكدی بوون، پێكەوە تێكەڵ كران و ئاوێتە كران، خوا ﷻ هەندێكیانی تێكەڵ بە هەندێكیان كردو، هەموویان پڕ بوون، بەو واتایەی دەریایەكان هەمووی وشكانییان كە (١/٥)ی پانتایی ڕووی زەوی وشكانییەو، دەریایەكان كاتێك تێكەڵ بە یەكدی دەبن، ئەو وشكانییە هەمووی دادەپۆشن، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست لە: ﴿ فُجِّرَتْ ﴾، گڕدران و تەقێنرانەوەی دەریاكان بێ، وەك پێشتر باسمان كرد لە تەفسیری سووڕەتی (التكویر)دا، كە لەوێ دەفەرموێ: ﴿ سُجِّرَتْ ﴾، واتە: گڕدران و داگیرسێنران و، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فُجِّرَتْ ﴾، واتە: تەقێنرانەوە، ئاویش هێما كیمیاییەكەی بریتیە لە ($H_2O$)، واتە: دوو گەردیلەی هایدرۆجین لەگەڵ گەردیلەیەكی ئۆكسجین، گەردێكی ئاو پێكدێنن، مۆڵكۆلێك پێكدێنن، كە هایدرۆجین دەسووتێ و، ئۆكسجین یارمەتیی سووتان دەدا، كەواتە: كاتێك پێكەوە كۆ دەبنەوە بە ڕێژەیەكی دیارییكراو كە خوا بۆی داناون، ئاو پێكدێنن، بەڵام كاتێك لێك دەبنەوە، یەكیان خۆی

دەسووتێ، ئەوی دیکەش یارمەتیی سووتان دەداو، دەبنە دوو ماددەی سووتێنەر، بۆیە خوا سبحانە وتعالی کاتێك ئەو گەردیلانەی هایدرۆجین و ئۆکسجین لێك دەکاتەوە، دەریایەکان گڕ دەگرن و دەتەقنەوە.

ئەم سێ نیشانەیە - وەك پێشتریش باسمان کرد - لە ئاخیر زەماندا ڕوودەدەن، واتە: لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی دا، کە بریتیە لە تێکچوونی ئەم گەردوونەو، پێچرانەوەی ئەم ژیانە دنیاییە، بە نسبەت ئێمەی مرۆڤەوە.

ئنجا خوا دوو نیشانەی دیکە باس دەکات، کە دەکەونە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییەوەو بریتین لە:

٤)- ﴿ وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴾، هەر کات گۆڕەکان هەڵگێڕدرانەوە، ﴿ بُعْثِرَتْ ﴾، یەکێك لە زانایان دەڵێ: ﴿ بُعْثِرَتْ ﴾، واتە: هەڵگێڕدرانەوەو، ئەو مردووانەی تێیان دابوون لەو گۆڕانەدا بە زیندووی هێنرانە دەرێ، لە عەرەبیی دا دەگوترێ: (**بَعْثَرَ فُلَانٌ حَوْلَ فُلَانٍ، أَي: جَعَلَ أَسْفَلَهُ أَعْلَاهُ**)، فلانکەس دەوری فلانکەسی (**بعثرة**) کردوە، واتە: سەرەو بنی کردوە، هەڵیگێڕاوەتەوەو هی بنەوەی هێناوەتە سەرێ و، هی سەرەوەشی هێناوەتە خوارێ، ئەمە نیشانەی یەکەمی قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییە، کە قۆناغی زیندوو کرانەوەو هەڵسێنرانەوەیە.

ئنجا خوا ﷻ نیشانەی دووەمی، یاخود ڕووداوی دووەم کە تێیدا ڕوودەدا، دەخاتە ڕوو:

٥)- ﴿ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴾، هەموو کەسێك دەزانێ چی پێش خستوەو چیشی دواخستوە.

زانایان لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە: ﴿ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴾، هەڵوەستەی زۆریان کردوەو، زۆر ڕاو بۆ چوونی جۆراو جۆریان وەك لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی واتایەکەی خستوونەڕوو:

**١- (الطبري)**، ئاوا مانای لەم ئایەتە موبارەکە داوەتەوە: **(عَلِمَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَا قَدَّمَتْ لِذَلِكَ اليَوْمِ مِن عَمَلٍ صَالِحٍ يَنْفَعُهُ، وَأَخَّرَتْ وَرَاءَهُ مِن شَيْءٍ سَنَّهُ فَعُمِلَ بِهِ) (جامع البيان: ج٢٤، ص١٧٥)**، واتە: هەموو کەسێك دەزانێ لەو ڕۆژەدا، چ کردەوەیەکی باشی پێشخستوە کە سوودی پێ بگەیەنێ و، چیشی لە دوای خۆی بە جێهێشتوە، لە کردەوەیەك کە چاوی لێ بکرێ.

واتـە: لـە کـردەوەی بـاش کـە خەڵـك تەماشـای بـکات و لێـی بەهرەمەنـد بـێ و، ئەویـش خێـرو پاداشـتی بـۆ بچـێ.

**٢- هەر (الطبري)** هێناویەتی، گوتوویەتی: **(عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: مَاقدَّمت افْتُرِضَ عَلَيْهَا، وَمَا أَخَّرَتْ قَالَ: مِمَّا افْتُرِضَ عَلَيْهَا) (جامع البيان: ج٢٤، ص١٧٥)**، واتە: هەموو کەسێك دەزانێ چی پێشخستوە لەوەی لەسەری پێویست کراوەو، چیشی دواخستوە، لەوەی لەسەری پێویست کراوە، واتە: چیشی چواندوەو ئەنجامی نەداوە.

**٣- (إبن زيد)، (الطبري)** بە ژمارە: (٣٦٦٧٢)، لێیەوە هێناوە دەڵێ: **(مَا قَدَّمَتْ: عَمِلَتْ، وَمَا أَخَّرَتْ: تَرَكَتْ وَضَيَّعَتْ، وَأَخَّرَتْ مِنَ الْعَمَلِ الصَّالِحِ الَّذِي دَعَاهَا اللَّهُ إِلَيْهِ)**، دەڵێ: مەبەست لە: **(مَا قَدَّمَتْ)**، ئەوەیە پێشیخستوە، ئەوەی ئەنجامی داوە، و (ما أخرت)، وازی لێهێناوەو زایەی کردوە، ئەو کردەوە چاکەی خوا ﷻ بۆی بانگ کردوە، وازی لێ هێناوەو ئەنجامی نەداوە.

**٤- هەر (الطبري)**، مانایەکی دیکەشی بۆ لێکداوەتەوە، دەڵێ: **(مَا قَدَّمَت مِن خَيْرٍ أَوْ شَرٍّ، وَأَخَّرَتْ مِن خَيْرٍ أَوْ شَرٍّ)**، هەرچییەك پێشیخستوە لە چاکەو لە خراپەو، هەر شتێك دوای خستوە لە چاکەو لە خراپە، هەڵبەتە خوا ﷻ ڕوونی نەکردۆتەوە ئەو شتەی پێشخراوەو دواخراوە چییە؟، بۆیە ئەم مانایانەو جگە لەو مانایەش کە لە چوارچێوەی ڕێزمانی عەرەبییدا جێیان دەبێتەوە، هەڵدەگرێ.

**(الطـبري)**، لـە بـارەی وشـەی: ﴿بُعْثِرَتْ﴾ەوە، دەڵـێ: **(بَعْـثَرَهُ وَبَحْـثَرَهُ: لُغَتَـانِ)**، لـە زمانـی عەرەبییـدا **(بعـثره)**، بەکاردەهێـنرێ، واتـە: پـرژو بـڵاوی کـردەوە یـان هەڵیگێڕایـەوە، **(بحـثره)**ش بەکاردەهێـنرێ.

ئایا وشەی: ﴿ بُعْثِرَتْ ﴾، لە چییەوە هاتوە؟

پێشتریش باسمان کرد:

أ- هەندێك گوتوویانە لە: (بُعِثَ + أُثِرَ)، لەو دوو وشەیە پێکهاتوە.

ب- هەندێکی دیکەش گوتوویانە: (بعث + ر)، (الزمخشري)، وا دەڵێ.

گرنگ ئەوەیە ﴿ بُعْثِرَتْ ﴾، واتە: هەڵگێڕدرایەوەو شکنرایەوە، یاخود سەرەوبن کراو ژێرەو ژوور کرا، لێرەدا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ دێنین، کە دەفەرموێ:

{مَنْ سَنَّ فِي الإِسلامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِها بَعْدَهُ مِنْ غَيْرِ أن يُنْقَصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيءٌ} (أخرجه مُسْلِم: ٢٣٤٨، وَابْنُ مَاجَهْ: ٢٠٣) واتە: هەر کەسێك چاکەیەك دابێنێ، پاداشتی خۆی هەیەو پاداشتی هەموو ئەوانەشی هەیە کە کار بەو چاکەیە دەکەن (کە ئەو دایهێناوەو دەستپێشخەریی بۆ کردوە) بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە، (بە قەدەر هەمووان پاداشتی هەیە).

بەنسبەت دەریایەکانەوە، زۆرجاری دیکەش قسەمان لەو بارەوە کردوون، بەڵام چەند زانیارییەکی دیکەش لەو بارەوە دێنین، کە (الدكتور محمد راتب النابلسي)[1]، لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناونی:

یەکەم: دەریایەکان (٤/٥)ی پانتایی ڕووی زەوی دادەپۆشن.

دووەم: بەس لە ماسییان یەك ملیۆن جۆرە ماسیی لە دەریایەکان دا هەیە، ئنجا بەڵام بە دڵنیایی ژمارەی ماسییەکان هەر خوا دەزانێ چەندە؟!

سێیەم: قووڵایی قووڵترین شوێنی دەریا دەگاتە: دوازدە (١٢ کم)، واتە: (١٢،٠٠٠) مەتر ئەویش لە دورگەی میریانە لە ئۆقیانووسی هادیی.

---

(١) ج١٠، ص٢٥٩.

**چوارەم:** مۆڵکۆڵ (**جزء**)ێکی ئاو هێما کیمیاییەکەی بریتیە لە ($H_2O$)، واتە: دوو گەردیلەی هایدرۆجین لەگەڵ گەردیلەیەکی ئۆکسجین یەك دەگرن، گەرد (**جزء**)ێکی ئاو پێك دێنن، کە دیارە هایدرۆجین دەسووتێ، بەڵام ئۆکسجین یارمەتیی سووتان دەدات، ئەگەر مەبەست لە: ﴿ فُجِّرَتۡ ﴾، تەقینەوە بێ، بەڵام ئەگەر مەبەست لە: ﴿ فُجِّرَتۡ ﴾، پڕ بوون بێ، واتە: دەریایەکان هەموویان پڕ دەبن و سنووریان لە نێوانیاندا نامێنێ، واتە: ئەو (١/٥)ی وشکانیی کە هەیە لەسەر پانتایی زەوی، ئەویش دادەپۆشن و، هەمووی دەبێتە ئاوو دەریا.

**مەسەلەی دووەم:**

**بانگکردنی خوا بۆ مرۆڤی بێبڕوا، کە ئایا چی بۆتە هۆکاری هەڵخەڵەتانی و فریو خواردنی بەرانبەر بە پەروەردگاری بەخشەری، کە دروستیکردووە، ڕێك و پێکی کردووە، هاوسەنگی کردووە، وێنەی کێشاوە بە ویستی خۆی؟!:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ٧ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ٨﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴾، ئەی مرۆڤ! چ شتێك تۆی بەرانبەر بە پەروەردگاری هەرە بەخشەرت فریو داوە، {لە کەوڵی خۆتی دەرچواندووی و بوغڕای کردووی؟} گومانی تێدانیە، لێرەدا مەبەست لە مرۆڤ، مرۆڤی بێبڕوایە، چونکە مرۆڤی بێبڕوا بەرانبەر بە پەروەردگاری فریو دەخواو، هەڵدەخەڵەتێ و لە کەوڵی خۆی دەردەچێ و بوغڕا دەبێ، ئەگەرنا کەسێك بەڕاستیی خوا بناسێ، خۆی دەناسێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ٢٨﴾فاطر، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بە مەزنگرتنەوە سام و هەیبەتیان بە بەرانبەر بە خوا هەیە، بەندە زاناکانني.

هەڵبەتە هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: هەموو مرۆڤێك ئەندازەیەك لە فریو خواردنی تێدایە بەرانبەر بە پەروەردگاری هەرە بەخشەرو هەرە میهرەبان و بەرزو بەڕێزی، بەڵام وا پێدەچێ لێرەدا مەبەست مرۆڤی بێبڕوابێ، بە بەڵگەی ئەوەش کە خوا ﷻ لە کۆتایی ئەو ئایەتانەدا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ﴾، نەخێر بەڵکو ئێوە بڕواتان بە ڕۆژی سزاو پاداشت نیە، کە دیارە ئەو کەسەی بڕوای بە سزاو پاداشت نیە، مرۆڤێکی بێبڕوایە.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴾، ئـەی مـرۆڤ (واتـە: ئـەی مرۆڤـی بێبـڕوا)، (ال)ەکـەی بـۆ ناسـاندنە، بـەڵام بـۆ ناسـاندنی (**عهد**)ە، واتـە: ئـەی مرۆڤـە بێبڕوایەکـە! چ شـتێك تـۆی بەرانبـەر بـە پـەروەردگاری بەخشـندەو بەخشـەرت فریـو داوە، چ شـتێك تـۆی بوێـر کـردوە لەسـەر سـەرپێچیی کـردن لـە خـواو، ئەنجامدانـی ئـەو کردەوانـەی شایسـتەی پێگـەی بـەرزو بـێ وێنـەی خـوای پـەروەردگار نیـن؟ (**الغُـرورُ: الإطْـمَاعُ بِمَـا يَتَوَهَّمَـهُ المَغْـرورُ نَفْعَـاً وَهُـوَ ضُرٌّ**)، (**غُـرور**): بریتیـە لـە تەمـادار کردنێـك بـە شـتێك کـە، بابـای فریـو خـواردوو بـە قازانجـی تێـدەگات، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا هـەر زیانیەتـی.

لە بارەی (**الإنسان**)ەوە، زانایان ڕا جیایان هەیەو پێشتریش ئاماژەم پێدا:

**أ**- هەندێکیان گوتوویانە: (**أل**) کە چۆتە سەر (**الإنسان**)، بۆ ناساندنە، بەڵام بۆ تێکڕا (جنس) و، تێکڕای مرۆڤەکان دەگرێتەوە.

**ب**- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوا یاخود بڕواداری گوناهبارە.

**ج**- هەندێکیش گوتوویانە: ئەوە تایبەتە بە مرۆڤی بێبڕواوە.

واش پێدەچـێ بـەس مەبەسـت مرۆڤـی بێبـڕوا، بـێ، وەك پێشـتریش گوتمـان، ئەگەرنـا مرۆڤـی بـڕواداری سـەرپێچیکاریش دەگرێتـەوە، بـەڵام بـە پێـی ئایەتەکانـی کۆتایـی کـە دەفەرمـوێ: بەڵکـو ئێـوە بڕواتـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، بڕواتـان بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت نیـە، تەنیـا مرۆڤـی بێبـڕوا بـەو شـێوەیەو، دوێـنراو (**مخاطَـب**) بابـای بێبڕوایـە.

ئنجـا خـوا سـبحانە وتعالـی دوای ئـەوەی بـەو جـۆرە نقورچکـەی لـە مرۆڤـی بێبـڕواداو، هۆشـداریی پێـداو بانگـی کـرد، کە چ شـتێك تـۆی بەرانبەر بە پـەروەردگاری هـەرە بەخشـەرو میهرەبـان و خـاوەن کەڕەمـی بـێ سـنوورت فریـو داوە؟ چۆنیەتیـی دروسـتبوونی خـۆی بـۆ بـاس دەکات:

**٢)-** ﴿ ٱلَّذِی خَلَقَكَ ﴾، (ئەو پەروەردگارەت) كە تۆی هێناوەتە دی، (**خَلَقَكَ أي: أَوْجَدَكَ وَأَبْدَعَكَ وَقَدَّرَكَ**)، تۆی پەیداكردوەو داهێناوەو ئەندازەگیریی كردوە، (**خَلْق**)، هەم بە مانای (**إيجاد**)، پەیدا كردن دێ، بە زۆریی لە قورئاندا بەو واتایە بەكارهاتوە، هەم بە مانای داهێنان (**إبداع**) دێ، هەم بە مانای ئەندازەگیریی كردنیش دێ.

**٣)-** ﴿ فَسَوَّىٰكَ ﴾، ڕێك و پێكی كردووی، ﴿ فَسَوَّىٰكَ ﴾، (**التسويةُ: هِيَ جَعْلُ الأَشْيَاءِ عَلَى سَوَاء**)، (**تسوية**): بریتیە لەوەی شتەكان یەكسان و ڕێك و پێك بن، (**أي: جَعَلَ أَعْضَائَكَ سَوِيَّةً سَلِيمَةً مهيأةً لمنافعها عَلَى حَسَبِ مَا تقتضيهِ الحِكْمَة**)، واتە: ئەندامەكانی تۆی ساغ و چاك كردوون و، ئامادەی كردوون بۆ ئەو سوودانەی حیكمەت دەیانخوازێ، دەست بەو شێوەیە خوڵقێنراوە كە ئەو ئەرك و كارانەی مرۆڤ پەكی لەسەریان كەوتوە، بتوانێ پێیان ئەنجام بدات، هەروەها پێیەكان و چاوو گوێی و هەموو ئەندامەكان، بەهەمان شێوە.

**٤)-** ﴿ فَعَدَلَكَ ﴾، ئنجا هاوسەنگی كردووی، خوێندراویشەتەوە: (**فَعَدَّلَكَ**)، واتە: هەم بە گیرە (**شَدّة**)، هەم بەبێ گیرەش خوێندراوەتەوە، (**أي: اعْتَدَلَتِ الأَعْضَاءُ وَلَمَ تَتَفَاوَت**)، واتە: ئەندامەكان هاوسەنگن و لە یەك جیانین، دەستێك لە دەستێك درێژتر بێ، لاقێك لە لاقێك درێژتر بێ، چاوێك لە چاوێك گەورەتر بێ.... تا كۆتایی، ئەندامەكان هاوسەنگن، یان بۆ نموونە: سەر زۆر گەورە بێ و جەستە بۆی هەڵنەگیرێ، یان لاقەكان زۆر باریك بن و، جەستەیان بۆ هەڵنەگیرێ، هەموو ئەو حاڵەتانەی، ئەگەر خوا مرۆڤی (تعديل) نەكردبایە، دەگونجا هەموو ئەو حاڵەتە نەگونجاوانە هەبوونایە.

وشەی: (**عَدَلَ**)، ئەگەر بەبێ گیرە (**شَدّة**) بێ، بە سێ واتایان دێ:

**أ-** بە مانای (**تعديل**) دێ، (**أي: جَعَلَكَ مُعْتَدِلاً**)، تۆی هاوسەنگ كردوە.

**ب-** هەروەها بە مانای یەكسانكردنیش دێ: (**عَدَلَ فُلَاناً بفلانٍ أي: ساوى بينهما**)، فڵانكەسی لەگەڵ فڵانكەس دا یەكسان كردوە، واتە: وەك یەكی لێكردن.

ج- لە بنەڕەت دا وشەی: (عَدَلَ)، یانی: (مالَ)، لایدا، ئنجا ئەگەر بە مانای (مال) بێ، یانی: تۆی لاداوە لە نارێك و پێكیی بۆ ڕێك و پێكیی و، تۆی لاداوە لە ناهاوسەنگییەوە بۆ هاوسەنگیی.

بەڵام (عَدَّلَكَ)، ئەگەر بە گیرە (شَدّة)بێ، یانی: تۆی هاوسەنگ كردووەو هیچ ئەندامێكت لە ئەندامێكی دیكەت گەورەتر نیەو، لەو قەبارەیەش كە پێویست بووە لەسەری بێ، قەبەتر نیە، واتە: چ (عَدَلَك)، چ (عدَّلك)، بخوێنرێتەوە، مانایەكەیان هەریەكە.

٥)- ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾، لە هەر وێنەیەكدا ویستوویەتی تۆی پێكهێناوە، (أي: رَكَّبك فِي أي صُورَةٍ مِنَ الصّور المختلفة التي اقتضتها مَشِيْئَةُ الله)، لەسەر هەر وێنەیەك لەو وێنە جۆراو جۆرانەی ویستی خوا خواستوویەتی، تۆی هێناوەتە بوون.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش:

ئایا ئەوە كە خوا ﷻ بەخشندەیەو بەخشەرە، خوازیاری ئەوە نیە مرۆڤ لە بەخشەریی و بەخشندەیی خوا ڕا ببینێ و، سەرپێچیی لێ بكات و بە قسەی نەكات؟!

هەروەها زانایان لەو بارەوە ئەو بەسەرهاتەش دێننەوە:

ڕۆژێك عەلی كوڕی ئەبوو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ)، بانگی غوڵامێكی خۆی دەكات، بەردەستێك كە لە بەردەستی بووە، دوو سێ جاران بانگی دەكات، بەڵام وەڵامی ناداتەوە، دوایی دەڵێ ڕەنگە لەوێ نەبێ، دەچێتە دەر تەماشا دەكات لەوێ وەستاوە، دەڵێ: گوێت لێم بوو، كە بانگم كردی؟ دەڵێ: بەڵێ، دەڵێ: ئەدی بۆچی وەڵامت نەدامەوە؟ دەڵێ: لەبەر ئەوەی زۆر لە بەخشندەیی بەخشەریی و ڕێزو حورمەتی تۆم ڕا بینی و، گوتم: سزام نادەی! عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) وەك لەو گێڕدراوەیەدا هاتوە گوتی: بڕۆ لەبەر ڕووی خوا، لەبەر

ڕەزامەندیی خوا ئازاد بی، مادام هێندەت لە من ڕا بینیوە، با تۆ ڕابینینەکەت لە من، لە جێی خۆیدا بێ.

بەڵێ ئەو پرسیارە دەکرێ: ئایا ئەوە کە خوا زۆر بەخشەرو بەخشندەیەو خاوەن بەزەیی و کەرەمی بێ سنوورە، خوازیاری ئەوەنیە مرۆڤ سەرپێچیی لێ بکات؟

بۆچی خوا فەرموویەتی: ﴿مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴾و بۆچی خوا ﷻ بە سیفەتێکی دیکە خۆی نەناساندوە، بۆ وێنە فەرمووبای: (مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ العظيم)، یان: (مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ القهار)، یان: (مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الجبار)؟

هەندێك لە زانایان مانایەکی هەڵەیان بۆ ئەوە لێکداوەتەوەو دەڵێن: بۆیە خوا وایفەرموو، تاکو مرۆڤی سەرپێچییکار و تاوانبار لە ڕۆژی دوایی، بڵێ: (**غَرَّنِي كَرَمُكَ**)، بەخشندەیی تۆ منی فریودا، واتە: مادام هێندە بەخشندەی و هێندە بەبەزەیی و چاکەکاری و میهرەبانی، ئەوە وای لە من کرد، پێم وابێ هەر چۆن بم هەر دەمبەخشی و، لە تاوان و لادان و خراپەکانم دەمبووری و سزام نادەی! بەڵام بێگومان ئەم مانا لێکدانەوەیە هەڵەیە، بەڵکو ئەو پرسیارە سێ وەڵامی ڕاستی هەن، کە (**فخر الدين الرازي**)، لە تەفسیرەکەی خۆی (**التفسير الكبير**)دا، هێناونی:

**یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴾، لەبەر ئەوەی خوا زۆر بەبەزەیی و بەخشەرەو هەڵە ناکات لە سزادان دا، ماقووڵ نیە ببێتە هۆکاری فریو خواردنی مرۆڤ لە بەرانبەر خوادا، واتە: مادام پەروەردگارت خاوەنی ئەوپەڕی بەخشین و لێبوردن و چاکەکارییە، نەدەبوو، ئەو سیفەتەی بەرزەی پەروەردگارت بکەیە پاساوو دەستەچیلەی سەرپێچیی کردن و بەقسەنەکردنی.

**دووەم:** ئەوە کە خوا ﷻ بەخشەر (**كريم**)ەو خاوەن ئەوپەڕی چاکەکارییە، خوازیاری ئەوەیە سەرپێچیی لێ نەکرێ، نەك خوازیاری ئەوە بێ سەرپێچیی لێ بکرێ، چونکە زۆریی بەخشین و چاکەکاریی لە کەسێك دا، خوازیاری ئەوەیە باشتر خزمەت بکرێ و فەرمانبەریی بکرێ.

بۆ وێنە: دایك و باب بۆچی خوا ﷻ لە قوڕئاندا، لە چەند شوێنێك دا دوای فەرمان كردنی بە مرۆڤ كە بەندایەتیی بۆ خوا بكات، یەكسەر دەفەرمویٚ: لەگەڵ دایك و بابت دا چاك بە! چونكە دایك و باب لە هەموو كەس زیاتر بە منداڵیی بە مرۆڤەوە ماندوو بوون و حەقیان لەسەری زیاترە، بۆیە ئەركیشیان لەسەری زیاترە، لە هەموو كەس زیاتر پێوەی ماندوو بوون، بۆیە مافیشیان زیاترەو، ئەویش لە بەرانبەریاندا ئەركدارترە.

**سێیەم:** ئەوە كە خوا ﷻ خاوەنی ئەوپەڕی بەزەیی و بەخشین و چاكەكارییەو، ئەو چاكەكارییەشی وایكردوە ڕێی لێ نەگرێ لە بابای بێبڕوا لە نازو نیعمەتی سەخاوەتمەندانەو بەخشەرانەی خوای پەروەردگار لە دنیادا بەرهەمەند بێ، كەواتە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ مافی ستەم لێكراویش لە ستەمكار دەستێنێ، واتە: مادام خوا ﷻ ڕێی لە بابای بێبڕوا نەگرتوە، لە سفرەو خوانی چاكەكاریی خوای بەخشەر بەهرەمەند بێ لە دنیادا، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا مافی ستەملێكراو لە ستەمكار دەستێنێ.

ئەمە هۆكاری ڕاستەقینەی ئەوەیە كە خوا سیفەتی (**كريم**)ی كردوە بە ئاوەڵناو (**صفة**) بۆ پەروەردگاریتیی خۆی و ئەوەی (**الرازي**)، گوتوویەتی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، قسەكەی زۆر ڕاست و بە جێیەو بەخشەریی و بەزەیی خوا لە سێ ڕووەوە خوازیاری ئەوەیە كە مرۆڤ سەرپێچیی لە خوا ﷻ نەكات و بەرامبەری سپڵەو ناسپاس نەبێ، چ سپڵەو ناسپاسیی یەكجارەكیی كە بڕوا بە دیداری نەكات و، بڕوا بە پێغەمبەرەكەی نەكات و، بڕوا بە پەیامەكەی نەكات، چ سپڵەیی و بێ نمەكیی بەشیی (**جُزئي**)، كە بریتیە لەوەی سەرپێچیی لێ بكات، لەگەڵ ئەوەشدا كە بڕوای وایە ڕۆژێك دێتەوە خزمەتی و، دان دێنێ بە ڕاستیی پێغەمبەرەكەی ﷺ و ڕاستیی پەیامەكەی دا!! بێگومان ئەو هەڵوێست و ڕەفتارەی مرۆڤ پێچەوانەی ئەوەیە كە خوا ﷻ خاوەنی ئەو پەڕی كەرەم و بەخشندەیی و چاكەكارییە لەگەڵ بەندەكانیدا.

## کورتە باسێک لە بارەی دروستکردنی جەستەی مرۆڤەوە

ئەم کورتە باسە لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەکانی: (٦، ٧، ٨)دا، دەخەینەڕوو، کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ ﴾، ئەی مرۆڤ! چ شتێك تۆی بەرانبەر بە پەروەردگاری هەرە بەخشەرت فریو داوە، کە تۆی هێناوەتە دی، ڕێکیخستووی (ڕێك و پێکی کردووی)، هاوسەنگی کردووی، لە هەر وێنەیەك دا ویستوویەتی تۆی پێکهێناوە.

ئەم کورتە باسەش لە دوو تەوەردا دەخەینەڕوو:

**تەوەرەی یەکەم:** دروستکردنی جەستەی مرۆڤ بە چوار قۆناغ.

**تەوەرەی دووەم:** سەرنجدانێکی، سەر تاپای جەستەی مرۆڤ.

### تەوەرەی یەکەم: دروستکردنی جەستەی مرۆڤ بە چوار قۆناغ:

خوا ﷻ لەم سێ ئایەتە موبارەکەدا، بانگی مرۆڤ دەکات و دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾، ئەی مرۆڤ! پێشتر باسمان کرد، کە ئایا مەبەست لەمرۆڤ تێکڕای مرۆڤەکانە، یان مرۆڤی بێبڕوایە، یان مرۆڤی بڕواداری گوناهبارە؟ گوتیشمان ئەو ڕایەمان پێ ڕاسترە کە مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوایە، بە بەڵگەی ئایەتەکانی دوایی کە دێن، خوا بانگی مرۆڤ دەکات، دەفەرمووێ: ئەی مرۆڤ! چ شتێك تۆی بەرانبەر بە پەروەردگاری هەرە بەخشندەو بەرزو بەڕێزت فریو داوە؟ دوایی خوا خۆی پێناسە دەکات و قۆناغی یەکەمی دروستکردنی مرۆڤ باس دەکات و دەفەرمووێ:

١- ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَكَ ﴾، ئەو کەسەی تۆی هێناوەتە دی، لە سەرەتای سووڕەتی (الإنسان) یشدا هاتوە، کە کاتی خۆی تەفسیرمان کردوە: ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ

﴿لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾، هەر کامێك لە ئێمە کاتێك بووە، هیچ شتێکی باسکراو نەبووە، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: شتێکی باسکراو نەبووی، چونکە ئەو گەردیلانەی دوایی حەیمەنەکانی دروستبوونی مرۆڤیان لێ دروست دەبێ، کە لە نێو ئاوی پیاودا هەن، هەروەها هێلکۆڵەیەك کە لە نێو ئاوی ئافرەت دا هەیەو، لەو دووانە ئەو تۆیلکە (**نطفة**)یە دروست دەبێ، ئەو گەردیلانە هەر بوون، بەڵام وانەبوون شایانی باس بن و شتێکی باسکراو و ناسراو و زانراو بن.

کەواتە: گەردیلەکانی جەستەی ئێمە پێشتر دروستکراون، کەواتە: کە دەفەرموێ: (ٱلَّذِى خَلَقَكَ)، ئەو کەسەی دروستیکردووی، یانی: وەك جەستە دروستیکردووی.

٢- ﴿فَسَوَّىٰكَ﴾، ئنجا ڕێکیخستووی، (**التسوية: خَلْقُ الأَعْضَاءِ مُتَنَاسِبَة مَعَ وَظَائِفها**)، (**تسوية**): بریتیە لە دروستکردنی ئەندامە گونجاوەکان لەگەڵ ئەرکەکانیاندا، ئەگەر ئینسان تەماشا بکات دەبینێ: هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ و، هەر کۆئەندامێك لە کۆئەندامەکانی، بە شێوەیەك خوا ڕەخساندوویەتی و ڕێکیخستوە، ئەو ئەرك و کارەی بۆی دیارییکراوە بە باشترین شێوە ئەنجامی بدات، بۆ نموونە: ئەرکی چاو بینینە، خوا ﷻ چاوی وا خوڵقاندوە بتوانێ ئەو ئەرکە ببینێ، هەروەها ئەرکی گوێ بیستنەو، خواش گوێی وا خوڵقاندوە بتوانێ ببیستێ، هەروەها هەموو ئەندامەکانی دیکەو، هەموو کۆئەندامەکان کە جەستەی مرۆڤیان لێ پێکهاتوە، خوا وای ڕێکخستوون و وای لێکردوون، بتوانن ئەرکەکانی خۆیان بە باشترین شێوە ئەنجام بدەن.

٣- قۆناغی سێیەم: ﴿فَعَدَلَكَ﴾، هاوسەنگی کردووی (**جعل الأعضاء متساوية متوازنة**)، ئەندامەکانی یەکسان و هاوسەنگ کردوون، دوو دەستەکان و دوولاقەکان هەردووکیان بە ئەندازەی یەکن، هەروەها دوو چاوەکان هەردووکیان بە ئەندازەی یەکن، دوو گوێیەکان، دوو پێیەکان، هەروەها لە ڕوویەکی دیکەوە: سەرو گەردن لە قەدەر جەستەن، سەر هێندە گەورە نیەو ملیش هێندە باریك نیە، سەری بۆ هەڵنەگیرێ، هەروەها سەر

هێندە گەورە نیە جەستە نەیتوانێ، پاشان هێندەش گچکەش نیە، نەتوانێ بە ئەرکەکانی خۆی ڕابگات، هەروەها هەموو ئەندامەکان و هەموو کۆئەندامەکان پێکەڵپێکن و پێکەوە گونجاون و پێکەوە هاوسەنگن، وا نیە بۆ وێنە: مرۆڤ سینگی زۆر گەورە بێ، یان سکی زۆر گەورە بێ، لە ئەسڵی دروستبوون دا کە خوا خوڵقاندوویەتی، بەڵام دوایی کە کەسێك لە ئەنجامی زۆر خۆرییدا سکێکی گەورەی پەیدا دەبێ، ئەوە خۆی دروست کردنەکەی خوای پەروەردگاری تێکداوە، بەڵام لە ئەسڵدا کە خوا خوڵقاندوویەتی، سکی لە قەدەر سینگی و، لە قەدەر هەموو جەستەیەتی، بەڵام کە دوایی وای لێ دێ لە ئەنجامی زۆر کێش قورس بوونی دا، لاق و پێیەکانی هەڵیناگرن، ئەوە خۆی وای کردوە، ئەگەرنا خوا لە ئەسڵدا وای خوڵقاندوە کە لاقەکانی بتوانن هەڵیبگرن، بەڵام لاقەکانت خوا خوڵقاندوونی کە تۆ حەفتا (٧٠) کیلۆ هەشتا (٨٠) کیلۆیان لێ بار بکەی، وەختێك دێی (١٢٠) کیلۆ (١٤٠) کیلۆیان، لێ بار دەکەی، واتە: خۆت کێشت چەندە، هێندەی دیکەش لە خۆت بار دەکەی و بە کۆڵی خۆتی دا دەدەی، بێگومان ئەژنۆیەکانت دەسوێن و تووشی سەوەفان و دەردو نەخۆشیی دەبن، ئەوە خۆت وات لە خۆت کردوە.

٤- قۆناغی چوارەمی دروست بوونی مرۆڤ: بریتیە لە: وێنەکێشان (**تصویر**) و دیمەن پێدان، (**التَّصْويرُ: إعْطَاءُ الصُّورَةِ الَّتِي يُعْرَفُ بهَا البَشَرُ مِنْ بَيْنِ المخْلُوقَاتِ**)، (**تصویر**): وێنەکێشان وێنەدار کردن، بریتیە لەوەی مرۆڤ ئەو وێنەیەی پێ بدرێ، کە پێی لە نێو دروستکراوەکانی دیکەدا دەناسرێتەوە، وەك جۆری مرۆڤ و جگە لەوە لە نێو جۆری مرۆڤیشدا، هەر مرۆڤێك خوا ﷻ وێنەیەکی تایبەتی پێداوە، کە پێی لە خەڵکەکەی دیکە جیا دەکرێتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴾، لە هەر وێنەیەکدا، لە هەر دیمەنێکدا کە پەروەردگارت ویستوویەتی، تۆی پێکهێناوەو دروستیکردووی.

## تەوەری دووەم: سەرنجدانێکی خێرا لەسەر تاپای مرۆڤ:

مـرۆڤ ئەگـەر تەماشـای خـۆی بـکات و، تەماشـای هـەر کەسـێك بـکات، لـەلای سـەرێیەوە، پێشـێ سـەر دەبینـێ، لـە سەریشـی پێشـێ تووکـی سـەر دەبینێ، دوایـی کەللـەی سـەر، کـە مێشـکی گرتۆتـە نێـو خـۆی، دوایـی دوو گوێیـەکان دەبینـێ، لـە لای ڕاسـت و چـەپ، هەروەهـا چـاوەکان دەبینـێ، هەردووکیـان لـە پێشـەوە، ئنجـا لـووت و زارو زمـان و ددان و پـووك و مەڵاشـوو دەبینـێ، واتـە: مـرۆڤ کاتێـك تەماشـای خـۆی دەکات، دەبینـێ: بەرزتریـن ئەندامـی جەسـتەی مـرۆڤ لـە سـەری سـەرەوەی جەسـتەی مرۆڤـەوە دانـراوە، کـە بریتیـە لـە مێشـك، چونکـە مێشـك کانـگای زانیارییـە، ئەگەرنـا ئـەو ڕووحـەی خـوا بـە هەمـوو مرۆڤێکـی داوە، بەبـێ ئـەو جەسـتەیەش عەقڵ و هۆشـی هـەر هەیـە، دیتنـی هەیـە، بیسـتنی هەیـە، قسـە کردنـی هەیـە، هەمـوو ئەوانـەی هـەن، بەڵکـو توانایەکانـی زیاتریشـن، بـەڵام خوا ﷻ ئـەو جەسـتەیەی بـۆ کـردوە بـە ئامڕازێـك و، ئـەو جەسـتەیە بەکاردێنـێ، دەسـتەکان بـە کاردێنـێ، پێیـەکان بەکاردێنـێ، زمـان بەکاردێنـێ، چـاوەکان، گوێیـەکان، هـۆش و مێشـکیش بەکاردێنـێ، بەڵگەشـمان لەسـەر ئـەوە کـە ڕووحـی مـرۆڤ بەبـێ ئەوانەش، هـەر دەتوانـێ شـت بزانـێ و ببینـێ و ببیسـتێ و قسـە بـکات، بـڕواو بـێ و بچـێ، حاڵەتـی خـەوو نووسـتنە، مـرۆڤ لـە کاتـی نووستنیشـدا هەمـوو ئـەو شـتانەی هـەن، شـت دەزانـێ، دەتوانـێ قسـە بـکات، ببینـێ، ببیسـتێ، بخـوات، بـێ و بچـێ و بـڕوا، هەمـوو ئـەو حاڵەتانـەی لـە کاتـی بێداریـی دا بەهـۆی جەسـتەیەوە ئەنجامیـان دەدا، لـە کاتـی خەوتنـدا، ڕووحەکـە هەمـوو ئەوانـە، بەڵکـو زیاتریـش ئەنجـام دەدا، بـۆ وێنـە: مـرۆڤ ناتوانـێ بـە جەسـتەی بەشـێوەیەکی ئاسـایی و بـێ ئامـڕاز، بچـێ بـۆ سـەر مانـگ[1]، بـەڵام بـە خـەون دەتوانـێ بچێتـە سـەر مانـگ، بگـرە دەتوانـێ بچێتـە بەهەشـت و بچێتـە دۆزەخ، بێگومـان بـە مۆڵـەت و فەرمانـی خـوای پـەروەردگار.

---

(١) دووجـاران لەخـەون دا چوومـە سـەرمانگ، هەروەهـا بەهەشـت و دۆزەخیشـم بینیـون و.... هتـد.

ئنجا لـە دوای سـەر کـە بـە نرختریـن پێکهاتـەی مرۆڤـی تێدایـە و، بریتیـە لـە مێشـکەکەی، ئنجا گـەردن دێ، گەردنـی مـرۆڤ لـە ڕووی ئێسـکییەوە لـە حـەوت (٧) بڕگـە (فقـرة) پێکهاتـوە، ئنجـا دوایـی قـوڕگ هەیـە، لـە گـەردن و ملـی مرۆڤـدا، ئـەو قوڕگـەش هـەم بـۆ ئـەوەی خواردنـەوەو خواردنـی، پـێ ئـەو دیـو بـکات، دوای ئەوەی بـە زاری دەیجـوێ و، هـەم بـۆ ئەوەشـە کـە لـە ڕێـی زارو لووتیشـەوە هـەوا هەڵمـژێ و، هـەواش هـەر بـەو قوڕگـە دا دەچـێ، هـەم خـواردن و خواردنـەوە، هـەم هـەواش بـە یـەك شـوێن دا دەچـن، خـوا ﷻ زمانـە بچکۆڵە(مزمـار)ی دانـاوە، لـە نێو گـەرروودا بەرانبـەر بـە بـۆڕی هەناسـەدان و کاتێـك مـرۆڤ خـواردن و خواردنـەوەی دەخـوات، ئـەو زمانـە بچکۆڵەیـە ڕێـی هـەوا دەگـرێ، بـۆ ئـەوەی خـواردن و خواردنەوەکـە نەچێتـە نێـو سـییەکان و بـۆڕی هەناسـەدانەوە، ئەگـەر زمانـە بچکۆڵـە فریـا نەکـەوێ، یـان مـرۆڤ بـە پەلـە پـەل شـتێك بخـوات و هەندێکـی بـە بـۆڕی هەناسـەدان دا بچـێ، دەبـێ بکۆکـێ تاکـو ئـەو تـۆزە خواردنـەی چۆتـە نێـو بـۆڕی هەناسـەدانەوە دێتـە دەرێ، ئەگەرنـا ئەگـەر خـواردن و خواردنـەوە بچێتـە نێـو بـۆڕی هەناسـەوە، مـرۆڤ لـە ژیـان دا بـەردەوام نابـێ.

ئنجا نـۆرەی سـینگ دێ، سـینگ قەفەسـێکە، بیسـت و چـوار (٢٤) پەراسـوو ئـەو قەفەسـەیان پێکهێنـاوە، هـەر لایـەی سـینە دوازدە (١٢)، ئنجـا وەك چـۆن کەللـەی سـەرو ئێسـقانەکانی بـە نرختریـن ئەندامـی مرۆڤیـان گرتۆتـە خۆیـان کـە عەقـڵ و مێشـکە، بێگومـان دوای مێشـکیش بـە نرختریـن ئەندامەکانـی جەسـتەی مـرۆڤ: دڵ و سـییەکان و جـەرگ و پەنکریـاس و...هتـدن و، هەمـوو ئەوانـەش قەفەسـی سـینگ گرتوونیـە نێـو خـۆی.

بڕگـەکانی پشـتیش شـوێنی دڕکـە پەتـك (الحبـل الشـوکي)ن، کـە لـە مێشـکەوە دێ و بـە هەمـوو جەسـتەدا بڵاودەبێتـەوەو، لەوێـوە مێشـك فەرمانەکانـی خـۆی دەنێـرێ، چ ئـەو فەرمانانـەی ویسـتەنیی (إرادي)ن و مـرۆڤ ئـاگای لێیـان هەیـە، بـۆ وێنـە: کـە دەسـت دەجووڵێنـێ، لـە مێشـکەوە فەرمـان دێ، چ ئەوانـەی ئەوانـەی مـرۆڤ ئـاگای

لێیـان نیـەو، ویسـتەنیی نیـن و ناویسـتەنین، (**لا إرادي**)ن، وەك ئـەو فەرمانانـەی لـە مێشـكەوە دێـن بـۆ گورچیلـەكان، كـە كار بكـەن، بـۆ گـەدە، بـۆ جگـەر، بـۆ دڵ، بـۆ سـییەكان، بـۆ هەمـوو ئەندامـەكان، ئنجـا ئـەو دڕكـە پەتكـەش خـوای پـەروەردگار خسـتوویەتە نێـو بڕگەكانـی بڕبـڕەی پشـتەوە، بڕگەكانـی بڕبـڕەی پشـتیش سی و سـێ (٣٣) دانـەن:

**١-** حەوت (٧)یان لە مل دان.

**٢-** دوازدە (١٢)یان لە پشت دان، لە ئاستی سینگەوە.

**٣-** پێنج (٥) لەو بڕبڕانەش لە ئاقاری سكن.

**٤-** پێنج (٥)یشیان لە ئاستی سێبەندە (**عَجُزْ**)دان.

**٥-** چوار (٤)یشیان لە كۆتایی بڕبڕەی پشت دان كە پێی دەگوترێ: كلێنجە (**عصعص**).

كەواتـە: (٧ + ١٢ + ٥ + ٥ + ٤ = ٣٣)، خـوای بـەرزی مـەزن و كاربەجـێ، بڕبـڕەی پشـتی هـەر مرۆڤێـكی لـە سی وسـێ (٣٣) بڕگـە (**فقـرة**) پێكهێنـاوە.

ئنجـا لـە دوای پشـت، سـك دێ، سـك (**بطن**)یـش هـەم گـەدەی تێدایـەو گرتوویەتە خـۆی، هـەم ڕیخۆڵـەكان (**أمعـاء**)، هـەم گورچیلـەكان و، ئـەو شـتانەی دیكـە كـە بـە گـەدەو ڕیخۆڵـەو گورچیلەكانـەوە پەیوەسـتن.

شـایانی باسیشـە: لـە زارەوە تاكـو دەگاتـە (كـۆم) ئـەو شـوێنەی پاشـەڕۆكی لێـوە دەچێتـە دەر، نـۆ (٩)مەتـرە، بـەڵام خـوای زانـاو توانـا ئـەو ڕیخۆڵانـەی پێكـەوە پێچاونـەوە، ڕیخۆڵـە باریكـەو ڕیخۆڵـە گـەورەو قوڵـۆن، بێگومـان لـە نێـو گـەدەدا ئـەو خواردنـەی مـرۆڤ دەیخـوات هـەرس دەكـرێ و، دەكولێـنرێ، دوای ئـەوەی كۆمەڵێـك ڕژێـن و مـاددەی بەسـەر دادەكرێـن، ئنجـا دوایـی دەچێتـە نێـو ڕیخۆڵەكانـەوەو لەوێـدا، مەمیلـەكان دەیمـژن و تێكـەڵ بـە خوێـن دەبێـت و، خـواردن خۆراكـی تـازە بـۆ خانەكانـی جەسـتە دەچـێ و تـازە دەبنـەوە.

کەواتە: جەستەی مرۆڤ حەوت پێکهاتەی سەرەکیی هەن:

١- سەر.

٢- گەردن.

٣- سینگ.

٤- پشت.

٥- سك.

٦- دوو دەستەکان.

٧- دوو لاقەکان.

مرۆڤ ئەگەر بەشێوەیەکی ئاسایی بوەستێ و تەماشایەکی خۆی بکات:

١- لە سەری سەرەوە عەقڵ دەبینێ، کەواتە: دەبێ عەقڵ بەسەر هەموو هەڵس و کەوتەکانیدا حوکمڕان بێ.

٢- لە دوای عەقڵ و هۆشیش دڵ دێ، کە کانگای ویستن و نەویستن و خۆشویستن و ڕق لێ بوونەوەیە، کەواتە: دەبێ دڵ لە ژێر کۆنترۆڵ و هەیمەنەی عەقڵ دابێ.

٣- ئنجا دوایی گەدە دێ.

کەواتە: مرۆڤ لە ڕووی گرنگیی پێدانەوە، پێشێ دەبێ گرنگیی بە عەقڵی بدات، دوایی بە دڵ و دەروونی، ئنجا دوایی بە خواردن و خواردنەوە.

٤- ئنجا دوایی داوێن و کۆئەندامی جینسیی دێ، بۆ ئەوەی مرۆڤ وەچەی بەردەوام بێ، خوای پەروەردگار وای داناوە کە پیاو حەز بە ئافرەت دەکات و ئافرەت حەز بە پیاو دەکات، کەواتە: دەبێ ڕیزبەندییەکە بەو شێوەیە بێ: عەقڵ، دڵ، گەدە، ئنجا داوێن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هـۆکاری لـە خۆبایـی بوونـی مـرۆڤ بەرانبـەر بـە خـوا، بـڕوا نەبوونـە بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت، لـە حاڵێکـدا مرۆڤـەکان فریشـتە پارێزەرەکانیـان بـە سـەرەوەن، کە زۆر بەڕێـزن و هەمـوو شـتێکیان تۆمـار دەکـەن و، هەمـوو شتێکیشـیان لـە بـارەوە دەزانـن:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾، نەخێر (وازبێنن) بەڵکو سزاو پاداشت بەدرۆ دادەنێن، (كَلاَّ: كَلِمَةُ رَدْعٍ وَزَجْرٍ وَإِبْطَال)، (كَلاَّ): وشەیەکە بۆ بەرپەرچدانەوەو تێخوڕین و هەڵوەشانەوە بەکاردێ، قسەیەك پێشتر کراوە، یان کردەوەیەك یان هەڵوێستێك پێشتر نوێنراوەو، خوای پەروەردگاریش هەڵیدەوەشێنێتەوە، بەڵام جاری واشە بە پێی ڕەوتی ئایەتەکان بە مانای بەڕاستیی (حقاً)، ئەو شتە وایە، یان وانیە، دێ.

زۆرێــك لــە ڕوونکەرەوەکانــی قورئــان گوتوویانــە: لێــرەدا ﴿كَلَّا﴾، (أي: حَقّــاً)، واتــە: بەڕاســتیی وایــە، ﴿بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾، بەڵکــو ئێــوە بڕواتــان بــە ڕۆژی ســزاو پاداشــت نیــە.

﴿بَلْ﴾، لـە زمـانی کوردیـی دا دەکەوێتە بەرانبەر وشـەی (بەڵام)و لێرشـەدا: (إِضْرَابٌ عَـنْ جُمْلَـةٍ مُقَـدَّرَةٍ أي: لاَ تَرْتَدِعُـونَ عَـنْ ذَلِـكَ، بَـل تُجَاوِزونـه إلى مَـا هُـوَ أَعْظَـمُ مِنْـهُ)، بـە مانـای گواسـتنەوەیە لـە ڕسـتەیەکی مەزەنـدە کـراوەوە، یـانی: نەخێـر وانیـە، یاخـود واز بێنـن، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾، ئێـوە نـەك هـەر لـەوە وازناهێنـن، بەڵکـو بڕواشـتان بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت نیـەو، لـەوەش تێدەپەڕێنـن، واز لـەوە بێنـن کـە بەهۆیـەوە بەرانبـەر بـە پەروەردگارتان فریوتـان خـواردووەو هەڵخەڵەتـاون و کڵاوی ئیبلیسـتان چۆتـە سـەر، بەڵکـو بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـتیش بێبـڕوان.

وشـەی: ﴿ تُكَذِّبُونَ ﴾، خوێنراویشـەتەوە: (**يُكَذِّبُـون**)، بـە شـێوەی نادیـار (**غَائِـب**)، واتـە: بەڵكـو ئـەوان بڕواشـیان بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت نیـە.

وشەی: (**الدين**)، لێرەدا بە مانای (**الجَزَاء**)ە، واتە: سزاو پاداشت.

**٢)-** ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە پارێزەرانتان بەسەرەوەن.

دوایی پێناسەی ئەو پارێزەرانەش دەكات و دەفەرموێ:

**٣)-** ﴿ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴾، زۆر بەڕێزن و نووسەرن (تۆماركەری نیازو مەبەست و قسەو كردەوەكانتانن)، (**كرام**)، كۆی (**كريم**)ەو، ئەویش بریتیە لە: (**الجَيِّدُ مِنْ نَوْعِهِ، أَو الأَجْوَدُ مِنْ نَوْعِهِ**)، شتێكی باش لە جۆری خۆی، یان: باشترین لە جۆری خۆی، بە پێی ڕەوتیش مانایەكەی دەگۆڕێ، واتە: زۆر بەڕێزن و بەخشندەن و، زۆر چاكەكارن، ﴿ كَاتِبِينَ ﴾، واتە: نووسەرن، تۆماركەرن، بۆ سەرجەم كردەوەكانی مرۆڤ و هەڵسوكەوتەكانی، چ نیازو مەبەستەكانی دڵ و دەروون و خولیایەكانی بیرو زەین و، چ قسەو تەعبیرەكانی زمان و، چ هەڵس و كەوتی ئەندامەكان.

**٤)-** ﴿ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴾، هەرچی ئێوە دەیكەن دەیزانن، لێرەدا: ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴾، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە: (**فِي مَحَلِّ نَصْبٍ عَلَى الحَالِ مِن فَاعِل: تُكَذِّبون أو يُكَذِّبون**)، لە ڕووی شوێنی ئیعرابییەوە مەنصووبەو لە شوێنی حاڵ دایە لە بكەری: (**تُكَذِّبون أو يُكَذِّبون**)، بە هەردوو خوێندنەوەكان، واتە: ئێوە بێبڕوان بە ڕۆژی دوایی و، سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن، یان ئەوان ڕۆژی سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن، لە حاڵێكیشدا كە پارێزەرانتان بەسەرەوەن و ئەو پارێزەرانەش زۆر بەڕێزن و نووسەرن.

كەواتـە: وشـەی: ﴿ لَحَافِظِينَ ﴾، سـیفەتە بـۆ وەسـفكراوێكی قرتێـنراو، یانـی: (**ملائكـة حافظـين**)، ئێـوە فریشـتە پارێزەرەكانتـان بەسـەرەوەن، كردەوەكانتـان دەپارێـزن، سـەرژمێرو تۆماریـان دەكـەن.

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ:

ئایا ئەوانە هەموو شتێك تۆمار دەكەن و، هەموو شتێك لەسەر مرۆڤ دەنووسن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴾، هەر چ شتێك ئەنجامی دەدەن، ئەوان دەیزانن؟ لەو بارەوە (**سفیان الثوري**) پرسیاری لێ كراوە:

ئایا فریشتەكان چۆن دەزانن كە مرۆڤ ویستوویەتی چاكەیەك بكات، یاخود ویستوویەتی خراپەیەك بكات؟ ئەویش گوتوویەتی: ئەگەر چاكە بكات، بۆنی میسكی لێ دەكەن و، ئەگەر خراپەش بكات بۆنێكی ناخۆشی لێ دەكەن.

بەڵام پێم وایە ئەوەی سوفیانی ثەوریی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، گوتوویەتی: وەك قیاس بۆ سەر ئێمەومانان، گوتوویەتی، ئەگەرنا فریشتەكان بۆ خوای پەروەردگار ئاسانە كە توانای پێدابن، خودی نیەتەكەش ببینن و بزانن، بەڵێ بۆ ئێمە نادیارو پەنهانە، بەڵام بۆ خوای پەنهانزان ئاسانە ئەو فریشتانە وا بخوڵقێنێ نیەتەكە ببینن، ئەگەر چاكە، ئەگەر خراپە، نەك هەر لەبەر ئەوەی بۆنی دەكەن، هەڵبەتە دووریش نیە وابێ، بەڵام بە هەر حاڵ ئەوە بەڵگەیەكی لەسەر نیە.

لێرەدا زانایان پرسیارێكیان وورووژاندوە: ئایا فریشتەكان تەنیا ئەو قسانەی مرۆڤ دەیانكات و، ئەو هەڵس و كەوتانەی ئەنجامیان دەدا، تۆمار دەكەن، یاخود نیازو مەبەستەكانی نێو دڵ و دەروونیش تۆمار دەكەن؟ لەو بارەوە زانایان زۆربەیان ڕایان وایە، كە نیازو مەبەستەكانی نێو دڵ و دەروونیش تۆمار دەكەن، پێم وایە دەگونجێ لەوبارەوە سێ بەڵگان بێنینەوە دوو بەڵگەی عەقڵیی و یەكی نەقڵیی لەو بارەوە بهێنرێنەوە:

### بەڵگەی یەكەم:

ئەوەیە كە تەنیا بە هۆی نیازو مەبەست و خولیا هاندەرو پاڵنەرەوەكانەوە، كردەوەكان ئەنجام دەدرێن، كەواتە: ناگونجێ فریشتەكان ئەو پاڵنەر هاندەرانەی مرۆڤەكان پاڵ پێوە دەنێن بۆ چاكە یان خراپە، نەزانن و تۆماریان نەكەن.

## بەڵگەی دووەم:

هەردووك وشەی كردەوە (فعل) و (عمل) كە دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴾[1]، گشتگیرن بۆ نیازو مەبەستەكانی نێو دڵ و دەروون و، قسەكانی زارو زمان و، هەڵسوكەوتەكانی كە بە ئەندامە ڕواڵەتییەكان ئەنجام دەدرێن، هەر سێكیان دەگرنەوەو كە دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴾، فریشتەكان دەزانن چی ئەنجام دەدەن، چی دەكەن، واتە: چ بە دڵ بیكەن، چ بە زمان بیڵێن، چ بە ئەندامەكان ئەنجامی بدەن.

## بەڵگەی سێیەم:

لەو بارەوە، ئەم فەرمایشتە، ڕێك و ڕاستەی پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ هەیە، كە دەفەرموێ: {مَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْها، كَتَبَها اللهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِها فَعَمِلَها كَتَبَها اللهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَناتٍ، إِلى سَبْعِمائَةِ ضِعْفٍ، إِلى أَضْعافٍ كَثيرَةٍ، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْها، كَتَبَها اللهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِها فَعَمِلَها كَتَبَها اللهُ لَهُ سَيِّئَةً واحِدَةً} (أخرجه البخاري: ٦٤٩١، ومسلم: ٢٠٣).

واتە: هەر كەسێك ویستی چاكەیەك بكات، بەڵام نەیكرد، خوا لە لای خۆی بۆی بە چاكەیەكی تەواو دەنووسێ (مادام لێی پەشێمان نەبووبێتەوە، چونكە دەستی نەگەیوەتێ)، بەڵام ئەگەر كردی خوا لە لای خۆی بۆی بە دە چاكە هەتا حەوتسەد بەرانبەرو چەندان بەرانبەری زۆر دەنووسێ، هەر كەسیش ویستی خراپەیەك بكات و نەیكرد، خوا چاكەیەكی تەواوی لەلای خۆی بۆ دەنووسێ و، ئەگەر كردی یەك خراپەی بۆ دەنووسێ.

لە كۆتایی ئەم مەسەلەیەی سێیەم دا دەڵێین:

---

(١) جیاوازیی نێوان (عمل) و (فعل) ئەوەیە كە (فعل) زیاتر بۆ یەك جار ئەنجامدانی شتێك بەكاردێ و، (عمل) بۆ بەردەوامیی لەسەركردنی كارێك بەكاردێ.

خوا ﷻ فریشتەكانی بە چوار وەسفان پێناسە كردوون:

١)- پارێزەرن ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴾، واتە: پارێزەرن بۆ هەموو هەڵس و كەوت و جم و جۆڵەكانی، مرۆڤ چ پەنهان بن، چ ڕواڵەتیی و بەرچاو بن.

٢)- زۆر بەڕێزن: ﴿ كِرَامًا ﴾، واتە: زۆر بەڕێزو بە حورمەتن، لە هەندێك شوێنەواران دا هاتوە، كە فریشتەكان لە سێ كاتدا لە مرۆڤ دوور دەكەونەوە، ئەگەرنا هەر لەگەڵینی:

أ- كاتێك دەچێتە سەرئاوو تارەت دەگرێ.

ب- لە كاتێك دا خۆی دەشوات و دەچێتە گەرماو.

ج- لە كاتێكدا كە لەگەڵ هاوسەریدا جووت دەبێ، ئەگەر پیاوە، ئەگەر ئافرەتە، بەس خواش دەزانێ ئەوە چۆنەو ئەگەر فەرمایشتەكە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست بێ، واتە: لەو كاتەدا بە جۆرێك فریشتەكان خۆیانی لێ دوور دەگرن، ئەگەرنا وە نەبێ ئاگایان لێ نەبێ داخۆ چی دەگوزەرێ لەو كاتانەش دا.

٣)- نووسەرو تۆماركەرن: ﴿ كَٰتِبِينَ ﴾، مەبەست لە نووسین، مەرج نیە بەو جۆرە نووسینە ئاساییەی ئێمە بێ، كە دەزانین، بەڵام خوای كاربەجێ ئێمە تێدەگەیەنێ بەو وشانەی ئێمە لێیان حاڵیی دەبین، ئەگەرنا بەس خوا دەزانێ ئەو فریشتانە چۆن دەنووسن و، خوای پەنهانزان و بەرزی مەزن، چ جۆرە ئامێرێكی داونە دەست، كە هەموو هەڵس و كەوتەكانی مرۆڤ كە لە جەستەیدا دەردەكەون، یاخود لە دەروونیدا دەردەكەون، هەموویان تۆمار بكەن.

٤)- دەزانن چی دەكەن: ﴿ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴾، زانیارییان هەیە بە هەموو ئەوەی مرۆڤ ئەنجامی دەدا.

شایانی باسە: ئێمە كاتی خۆی كورتە باسێكمان لە بارەی فریشتەكانەوە لە سەرەتای سوورەتی (**فاطر**)دا كردوە، بۆیە لێرە هەروا بە كورتیی و بە ئەندازەی ڕوونكردنەوەی چەمك واتای ئایەتە موبارەكەكان بەسەریدا ڕۆیشتین.

### مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**باسی سەرەنجامی چاکەکاران و، بەدکاران لە ڕۆژی دواییدا، چاکەکاران، لە نازو نیعمەتی بەهەشتدان و دوورن لە ئاگری دۆزەخ و، خراپەکارانیش لە ئاگری دۆزەخدان بە بەردەوامیی و لێی نادیار نابن، ڕۆژی دواییش ڕۆژێکی سەغڵەت و قورسەو هیچکەس دادی هیچ کەس نادات و، هەموو شتێك تەنیا عایدی خوای بەرزو مەزنە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ﴿١٤﴾ يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ﴾، بە دڵنیایی چاکەکاران لە نێو نازو نیعمەت دان.

٢)- ﴿وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ﴾، بە دڵنیایی خراپەکارانیش لە نێو کڵپەی دۆزەخدان.

ئەمە دەرخستن و ڕوونکردنەوەی دەرەنجامی پاراستنی کردەوەو جم و جۆڵەکانی مرۆڤە، لە لایەن فریشتەکانەوە کە سەرەنجامەکەی ئاوا دەبێ و، بەو شێوەیە دەردەچێ، خەڵك بە گشتیی دەبنە دووبەش:

أ- چاکەکاران، ئەوانە لە نێو نازو نیعمەتدا دەبن.

ب- تاوانباران و خراپەکاران، ئەوانیش لە نێو کڵپەی دۆزەخدا دەبن، خوا پەنامان بدات.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ﴾، ﴿ٱلۡأَبۡرَارَ﴾، کۆی (بَرّ)، یان کۆی (بارّ)ە، هەندێك گوتوویانە: (بَرَرَة)، کۆی (بَرّ)ەو، ﴿ٱلۡأَبۡرَارَ﴾، کۆی (بارّ)ە، (بَرّ) و (بار)یش، هەردووکیان بە مانای چاکەکار دێن، (بِرّ)، بە مانای چاکەکارییە،

بەڵام (بارّ) بە مانای چاکەکارە، بەڵام عەرەب جاری واهەیە چاوگیان کردوە بە سیفەت بۆ مرۆڤ، واتە: ئەو مرۆڤە چاوگی ئەو سیفەتەیە.

﴿ٱلْفُجَّارَ﴾یش کۆی (فاجر)ەو بە مانای خراپەکار و تاوانبارو لادەر دێ، بێگومان چاکەکاریی بەرهەمی ئیمانەو، خراپەکارییش بەرهەمی کوفرە.

٣)- ﴿يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾، {ئەو تاوانبارانەی لە دۆزەخدان} لە ڕۆژی سزاو پاشتدا دەیچنەتێ و تێیدا دەبرژێنرێن و دەپیشێنرێن.

٤)- ﴿وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَآئِبِينَ﴾، ئەوان لێشی نادیار نابن، واتە: لەوێدا بە بەردەوامیی سزا دەدرێن، ﴿يَصْلَوْنَهَا﴾، وەك جارانی دیکەش باسمان کردوە، (صَلِي): بریتیە نیە تەنیا لە چوونە نێوی، بەڵکو بریتیە لە سووتێنرانی مرۆڤ لە نێو ئاگردا بە شێوەیەکی تایبەت کە لە چواردەورەیەوە ئاگرەکە بیگرێتەوەو، ببرژێنرێ یاخود بپیشێنرێ.

﴿يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾، یانی: (**یوم الجزاء**)، ڕۆژی سزاو پاداشت، (**جزاء**)، لە زمانی عەرەبییدا هەم بۆ سزا بەکاردێ، هەم بۆ پاداشت، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی پاداشت بێ دەگوترێ: (**ثواب**)و، ئەگەر مەبەست پێی سزا بێ، دەگوترێ: (**عقاب**)، بەڵام وشەی: (**جزاء**)، لە یەك کاتدا هەردووکیان دەگرێتەوە، بەڵام لە زمانی کوردییدا تاکو ئێستا وشەیەکم پێ شك نایەت مانای پڕ بە پێستی (**جزاء**) بێ، بۆیە هەمیشە دەڵێم: ﴿يَوْمُ ٱلدِّينِ﴾، یانی: ڕۆژی سزاو پاداشت.

شایانی باسە: وشەی: ﴿نَعِيمٍ﴾ و ﴿جَحِيمٍ﴾، کورتترین بێژەن بۆ تەعبیرکردن لەو شوێنەی چاکەکاران دەیچنێ و، لەوەش کە تاوانباران دەیچنێ.

ڕستەی: ﴿وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَآئِبِينَ﴾، وەك ئەو ئایەتە موبارەکە وایە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾﴾البقرة، ئەوان لە ئاگر ناچنە دەرێ، ئەوان دەرچوو نین لە ئاگرو هەمیشە، تێیدا بەردەوام دەبن.

٥)- ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانادوە ڕۆژی سزاو پاداشت، چییە؟ بێگومان ئەمە مەبەست پێی دەربڕینی مەزنیی ئەو ڕۆژەیە، واتە: هێندە گەورەو مەزنە، هێندە بێڕەزایە، مەگەر کەسێك بە تۆی بزانێنێ، ئەگەرنا نایزانی.

٦)- ﴿ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴾، دیسان چ شتێك بە تۆی زانادوە، ڕۆژی سزاو پاداشت چییە؟

٧)- ﴿ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗا ﴾، لەو ڕۆژەدا هیچکەس هیچ شتێکی بۆ هیچکەس لە دەست نایەت، ﴿ شَيۡـٔٗا ﴾، (**إسْمٌ يَدلُّ عَلَى جنْسِ الموجُودِ وَهُوَ مُتوغِّل، فِي الإبهام يفسره ما يقترن به فِي الكلام من تمييز أو صِفَة أو نحوها**)، واتە: (شَيء): ناوێکە مانای جینسی هەبوون دەگەیەنێ، کە شتێك هەیە، زۆر نادیارەو ئەوەی لە قسەدا لەگەڵیدا بەرانبەر کراوە، ئەگەر تەمییزە، یان سیفەتە، یان وێنەی وان، مانایەکەی دەردەخات.

﴿ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗا ﴾، ئەو ڕۆژەی هیچ کەسێك هیچ شتێکی بۆ کەس لە دەست نایەت.

٨)- ﴿ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ﴾، کارو بڕیاریش لەو ڕۆژەدا تەنیا هی خوایە ﷻ.

زۆربەی تەفسیرەکان ئەم گێڕدراوەیان هێناوە: (**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما: «**كُلُّ شَيْءٍ مِنَ الْقُرْآنِ مِنْ قَوْلِهِ: (مَا أَدْرَاكَ) فَقَدْ أَدْرَاهُ، وَكُلُّ شَيْءٍ مِنْ قَوْلِهِ: (وَما يُدْرِيكَ) فَقَدْ طُوِيَ عَنْهُ**»).

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما گوتوویەتی: هەر شتێك لە قورئاندا هەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مَآ أَدۡرَىٰكَ ﴾، (چ شتێك بە تۆی زانادوە)، دوایی خوا پێی زاناندوەو فێری کردوە (تە پێغەمبەر ﷺ) بەڵام هەر شتێك کە لە فەرمایشتی خوادا هاتوە: (**وَما يُدْرِيكَ**)، (چ شتێك بە تۆی دەزانانێ)، لێی پێچراوەتەوەو پێی نەگوتراوە.

بێگومان لە ئەنجامی تیوەڕامان (**إِسْتِقْرَاء**)ی هەموو قورئاندا، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ئەوەی وەرگرتوە.

کە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ﴾، (أل) سەر ﴿وَٱلۡأَمۡرُ﴾، بۆ تێکڕا (جنس)ەو، مەبەست لە (الأمر)، لێرەدا: سەرجەم فەرمان و کارەکانەو، وشەی: (أمر)، تاکی (الأوامر)ە، نەك هی (أمور)، بە مانای (شأن و حال)، واتە: هەموو فەرمانەکان و کارەکان و هەڵس و کەوتەکان، لەو ڕۆژەدا تەنیا بە دەست خوای پەروەردگارن، یانی: هیچکەسێك هیچ شتێکی بۆ هیچکەس لە دەست نایەت، ئەی مرۆڤەکان! خۆتان فریو مەدەن بە وەسوەسەو دنەدانی شەیتان و، بە تەمای ئەوە تێبکەون، فلانکەس شەفاعەتتان بۆ بکات و دەربازتان بکات! وەك یەکێك لە ئەوانەی بەشێوەی ناڕاست و ناشەرعییانە دەست بە هەندێك شێخ و مەشایەخانەوە دەگرن، دەڵێ:

بۆیە لە دنیا دەستم گرت بە تۆ تاکو لە قیامەت نەبم ڕەنجەڕۆ

بەڵام لە ڕاستییدا مرۆڤ دەبێ لە دنیادا تەنیا دەست بە خواو بە بەرنامەکەی خواوە بگرێ، ئنجا ئەگەر دەستی بە بەرنامەی خواوە گرت و، بە ڕێی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ ڕۆیی، بە ئەندازەی ئیمان و تەقوایەکەی، هەم شەفاعەت و تکا کردنی پێغەمبەری خوای ﷺ پێ دەبڕێ، هەم تکاکردنی جگە لە سەروەری پێغەمبەران ﷺ و جگە لە پێغەمبەرانیش، کە فریشتەکان و شەهیدەکانن و زانایان و بۆ خوا صوڵحاوانن، بەڵام مرۆڤ ئەگەر لە خودی خۆیدا دەست بە خواو بە ئایین و بەرنامەی خواوە گرتوو نەبێ و، بە تەمای ئەوە لێبگەڕێ کە بە ناهەق و بە ناشایستەیی و لە لایەن کەسێکی ناشایستەوە، شەفاعەتی بۆ بکرێ، ئەوە لە ڕاستییدا جۆرێکە لە خۆ فریودان و کڵاو لەسەری خۆ نان.

خوا بە لوتفی کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە توندو ڕێك و چاك دەست بە ئایین و بەرنامەی خواوە دەگرن و، شایستەی ئەوەش دەبن کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ تکاو شەفاعەتیان بۆ بکات، خوا بە لوتف و کەرەمی

خـۆی بــە ئیســلامەوە بمانژیەنــێ و بــە ئیمانــەوە بمانمرێنــێ و، ئــەم ژیانــە کــەم و کورتــەی دنیــا، ســەربەرزانە بەجــێ بهێڵیــن.

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**الإنفطار**) دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢٢)ی مانگـی (**ذي القعـدة**)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی، بەرانبـەر (١٣)ی تەممـووز، {مانگـی (٧)}ی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زاینییـە، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـای ئایەتـە بـە پێزەکانـی سـووڕەتی (**المطففـین**).

## پێناسەی سووڕەتی (المطففین) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

نـاوی هـەرە بـاوی: (**سـورة المطففـین**)ە، بـەڵام نـاوی: (سـورة وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ)یشـی بـۆ بەکارهێنراوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

لـەو بـارەوە مشـتومڕی زۆر لـە نێـوان زانایانـدا هەیـە: هەندێکیـان بـە مەککەیـی دادەنێـن و، هەندێکیـان بـە مەدینەیـی دادەنێـن، بـۆ وێنـە: هـەر کام لـە: (**الكلبـي و جابـر بـن زيـد**)، گوتوویانـە: لـە نێـوان مەککـەو مەدینـە دابەزیـوەو، بـە پێـی ژمـارەی دابەزینیشـی، یـان کۆتـا سـووڕەتی، سـووڕەتە مەککەیەکانـە، یاخـود سـەرەتای سـووڕەتە مەدینەییەکانـە، لـەو بـارەوەش ئـەم گێڕدراوەیـە هەیـە:

{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ﵄، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ المطفّفـينَ بِمَكَّـة}[1]، واتـه: عەبدوڵڵای کـوڕی عەبـاس ﵄ دەڵـێ: سـوورەتی (المطفّفـينَ) لـە مەککـە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە (مصحـف)دا، ژمارەکـەی (٨٣)یـەو، لـە دابەزینیشـدا ژمـارە (٨٦)ەو، ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە ڕووی دابەزینـەوە پێـش سـوورەتی (البقـرة)و، دوای سـوورەتی (العنکبـوت)، دابەزیـوە، بـە ڕای زۆربـەی زانایـان.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بـە ڕای تێکـڕای ژمێرەرانـی ئایەتەکانـی قوڕئـان، ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە سی و شـەش (٣٦) ئایەتـن.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە چوار بابەت دەگرێتە خۆی:

**بابەتـی یەکـەم:** لـە ئایەتەکانـی: (١ - ٦)، شـەش (٦) ئایەتـی سـەرەتادا، باسـی سـزای سـەخت بـۆ نـا سـاغ و فێڵبـازان لـە کێشـان و پێـوان داو، خـوای بـەرز باسـیکردووون -- هـی ئـەو جـۆرە کەسـانە -- ئەگـەر بـۆ خەڵکـی بکێشـن، یـان بپێـون، لێیـان دادەشـکێنن، بـەڵام ئەگـەر بـۆ خۆیـان بکێشـن یـان بپێـون، بـە تەواویـی وەری دەگـرن.

**بابەتـی دووەم:** لـە ئایەتەکانـی: (٧ - ١٧)، یـازدە (١١) ئایەتـدا، باسـی سـزای سـەختی خـوا بـۆ تاوانبارانـی بێبـڕوا بـە ڕۆژی دوایـی، کـراوە.

---

(١) أورده السيوطي في الدرّ المنثور ج٨، ص٤٤١، وَنَسَبَهُ للنَّحّاسِ وابن مردويه والبيهقي.

**بابەتـی سـێیەم:** لـە ئایەتەکانـی: (١٨ - ٢٨)، یـازدە (١١) ئایەتـدا، باسـی پاداشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خـوا بـۆ بڕوادارانـی چاکـەکار، کـراوە.

**بابەتـی چـوارەم:** لـە ئایەتەکانـی: (٢٩ - ٣٦)، هەشـت (٨) ئایەتەکانـی کۆتایـی دا، باسـی پێکەنیـن و گاڵتـەو جەفەنـگ پێکردنـی تاوانبارانـی بێبـڕوا، بـە بـڕواداران لـە دنیـاداو، دوایـی لـە ڕۆژی دواییـدا گاڵتـە پێکرانەوەیـان لەلایـەن بڕوادارانـەوەو سـزا درانیـان، کـراوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لە تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە، پێنج تایبەتمەندییمان کەوتوونە بەرچاو:

١- هەڕەشەکردنی سەختی خوا لە فێڵبازان لە کێشان و پێواندا، کە تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا بەم شێوەیە هاتوە، هەڵبەتە لە سوورەتەکانی دیکەش دا، لە بەسەرهاتی نێررانی شوعەیب عليه السلام بۆ گەلی مەدیەن و بۆ (**أصحاب الأيكة**)، {خاوەنانی باخەکە، یان درەختە چڕو پڕەکە}، باسی ئەوە کراوە، بەڵام وەك ئەوەی لێرەدا هاتوە، لەو شوێنانەی دیکەدا بەو شێوەیە نەهاتوە، ئەویش لە ئایەتەکانی: (١ - ٦)دا.

٢- باسی (سِجِّينٍ و عِلِّيِّينَ)، وەك شوێنی تۆماری کردەوەی تاوانباران و چاکەکاران، کە لە ئایەتەکانی: (٧ - ١٨)دا کراوە، تەنیا لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوون.

٣- باسی پەردە پۆشکرانی بێبڕوایان لە دیداری خوا: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ﴾.

٤- باسی پێکەنینی بڕواداران لە ڕۆژی قیامەتدا بە بێبڕوایان: ﴿ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾.

٥- چەند وشەو تەعبیرێك کە تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون و ئێمە سێزدە (١٣)یانمان هێناون:

١- ﴿ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴾.

٢- ﴿ ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾.

٣- ﴿ كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ ﴾.

٤- ﴿ سِجِّينٍ ﴾.

٥- ﴿ مَّرْقُومٌ ﴾.

٦- ﴿ بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾.

٧- ﴿ لَّمَحْجُوبُونَ ﴾.

٨- ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾.

٩- ﴿ رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴾.

١٠- ﴿ خِتَـٰمُهُۥ مِسْكٌ ﴾.

١١- ﴿ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَـٰفِسُونَ ﴾.

١٢- ﴿ تَسْنِيمٍ ﴾.

١٣- ﴿ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە سی و شەش (٣٦) ئایەتەكەی ئەم سوورەتە بە پێزە دەكەینە دەرسێك، هەرچەندە چوار (٤) بابەتی سەرەكیی گرتووونە خۆی، بەڵام بابەتەكان تێكهەڵكێشن و، پێكەوە پەیوەستن و، پێمان پەسندو باش نەبوو لە یەكیان دابڕین.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە كۆی سوورەتی (المطففين) دەگرێتە خۆی، كە پێشتریش گوتمان چوار بابەتی سەرەكیی دەگرێتە خۆی:

**یەكەم:** لە ئایەتەكانی: (١ - ٦)دا، كە خوا ﷻ لەو شەش ئایەتەدا، باسی سزای سەختی خۆی دەكات بۆ كەسانێك كە تەرازوو بازیی و كەم پێوان و كەم كێشیی دەكەن لە پێوان و كێشانداو، كەم بە بابای كڕیار دەدەن، بە پێچەوانەی ئەوەوە كە بۆ خۆیان بكڕن، بە كێشان بێ، یان بە پێوان، بە تەواویی مافی خۆیان وەردەگرن، ئنجا دیارە دەبێ ئەو جۆرە كەسانە پێیان وانەبێ بۆ ڕۆژێكی مەزن زیندوو دەكرێنەوە، ئەو ڕۆژەی خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانییان، بۆ خوای بەرز ڕادەوەستن، بە پێوە دەبن و چاوەڕێ دەكەن: چییان بۆ بڕیار دەدرێ؟

**دووەم:** لە ئایەتەكانی: (٧ - ١٧)دا، خوای پەروەردگار لەو یازدە (١١) ئایەتە موبارەكەدا، باسی تاوانباران دەكات، كە شوێنی نووسراوەكەیان و جێی تۆماری كردەوەكانیان ﴿سِجِّينٍ﴾ە، دواییش خوا ﷻ پێناسەی: ﴿سِجِّينٍ﴾ دەكات، بەوەی نووسراوێكی نیشانەدار كراوە، یاخود: نووسراوێكە بە زەقیی و درشتیی نووسراوە، ئنجا خوا ﷻ سزای سەخت و بێبڕەزا بۆ بە درۆ دانەران، ئەوانەی سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن، دیاریی دەكات، تەنیا كەسانێكیش ڕۆژی سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن، كە سنوور شكێن و زۆر گوناهبار بن و، كاتێك ئایەتەكانی خوایان بەسەردا بخوێنرێنەوە، بە ئەفسانەی پێشینانیان ناوزەد دەكەن، كە واش نیە، بەڵام ئەوە گوناهەكانی خۆیانن كە ژەنگ و كەمڕەی لەسەر دڵیان پەیدا كردووەو، چاوی دڵیان كوێر بووەو، ئایەتەكانی خوا وەك خۆیان بەدی ناكەن، بۆیەش ئەو جۆرە كەسانە لە بینینی پەروەردگاریان و، دیداری خوا بێ بەش و پەردە پۆش دەكرێن، دواییش بە شێوەیەكی تایبەت لە نێو ئاگری دۆزەخدا دەسووتێنرێن و، پێشیان دەگوترێ: ئا ئەوە بوو كە پێی بێبڕوا بوون!.

**سێیەم:** پانتایی ئەویش هەر یازدە (١١) ئایەتە، ئایەتەکانی: (١٨ - ٢٨)، خوا ﷻ لەو یازدە ئایەتەدا، باسی بڕوادارانی چاکەکار دەکات، کە لیستی کردەوەکانیان لە: ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾ە، کە شوێنێکی زۆر بەرزە، بە پێچەوانەی ﴿ سِجِّينٍ ﴾ەوە، کە شوێنێکی زۆر نزمە.

ئنجا خوا ﷻ پێناسەی: ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾ دەکات و پێشێ دەفەرموێ: چووزانی ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾ چییەو کێ پێی زانانددووی چییە؟ واتە: شتێکی سەرسوڕهێنەرەو ئەگەر خوا پێت نەفەرموێ، نازانی چییە؟ دوایی بەوە پێناسەی دەکات، کە نووسراوێکە نیشانەدار کراوە، یاخود بە نووسینێکی درشت و زبر نووسراوەو، ئەوانەی زۆر لە خوا نزیکن لە فریشتەکان، دەیبینن.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە چاکەکاران لە نێو نازو نیعمەتدان، لەسەر تەختان دەڕوانن، بۆ پاداشتی خۆیان، ئەو جێگاو ڕێگا خۆش و بەرزو ناوازەیەی خوا پێیداون، کە ئەگەر تۆ سەرنجیان بدەی، لە دەم و چاویاندا، لە ڕوویاندا، نازو نیعمەت دەبینی، گەشیی و شادیی دەبینی، تەڕو تۆڵیی پاراویی دەبینی و، ئەوانە لە شەڕابێك کە سەرەکەی بەستراوە، پێیان دەنۆشێنرێ، کۆتاییەکەی وەختێك دەیخۆنەوە بۆنی میسکی لێ دێ و، هەر ئەوەش شایستەیە خەڵك پێشبڕکێی تێدا بکات، ئەو شەڕابەش کە چاکەکاران دەیاندرێتێ، لە ئاوی سەرچاوەی تەسنیم، ئاوێتەی دەکرێ، ئەویش سەرچاوەیەکە زۆر لە خوا نیزیکان لێی دەخۆنەوە، واتە: ئەو سەرچاوەیەی تەسنیم زۆر لە خوا نیزیکان لە ئاوەکەی دەخۆنەوە، بەڵام لە ئاوی ئەو سەرچاوەیەی لە سەریەوە دەڕژێ، تێکەڵ دەکرێ بە ئەو شەڕابەی دەدرێ بە چاکەکاران (**أبرار**)، هی چاکەکاران بۆیان ئاوێتەو تێکەڵ دەکرێ، بەڵام هی زۆر نیزیکخراوان (مقربین) هەر وەك خۆی دەیاندرێتێ، بێ ئەوەی شتی دیکەی ئاوێتە بکرێ.

چوارەم و کۆتایی: لە هەشت (٨) ئایەتی کۆتاییش، ئایەتەکانی: (٢٩ - ٣٦) دا، خوا ﷻ باسی هەندێك لە هەڵسوکەوتی تاوانباران دەکات لە دنیادا کە بە بڕواداران پێکەنیون و، گاڵتەیان پێکردوون، کاتێك بە لایاندا تێپەڕیون چاویان

داگرتوە، وەك گاڵتـە پێكـردن و ئەزیەتدانـی ڕووحیـان، كاتێـك گەڕاویشـنەوە بـۆ لای كـەس و كارو مـاڵ و خێزانـی خۆیـان، زۆر بـە دڵخۆشـیی گەڕاونـەوە، وەك شـتێكی زۆر گەورەیـان كـرد بـێ! كاتێـك بڕوادارانیشـیان بینیـون، گوتوویانـە: ئەوانـە گومـڕان، لـە حاڵێكـدا بەسەریشـیانەوە پارێـزەر نەبـوون، داخـۆ گومـڕان، یاخـود ڕێـی ڕاسـتگرتوون!

دوایـی خـوا دەفەرمـوێ: بـڕواداران لـەم ڕۆژەدا (واتـە: لـە ڕۆژی دواییـدا)، بـە بێبڕوایـان پێدەكەنـن -- كـە دوایـی بـاس دەكەیـن، هەندێـك لـە زانایـان هـۆكاری پێكەنینەكەیـان چـۆن باسـكردوە - یـانی: ئەگـەر لـە دنیـادا بـڕواداران، گاڵتـە پێكـراوی بێبڕوایـان بـوون، لـە ڕۆژی دواییـدا خـوا ﷻ وەك سـزایەكی پێكەڵپێـك (**مطابـق**) و پـڕ بـە پێسـت، بـڕواداران دەكاتـە گاڵتـە پێكـەری بێبڕوایـان و، بێبڕوایـان دەكاتـە گاڵتـە پێكراویـان و، بـڕواداران لەسـەر تەختـان تەماشـای سـزادارانی بێبڕوایـان، دەكـەن.

لـە كۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾، ئایـا بێبڕوایـان بـە پێـی ئـەوەی دەیانكـرد پاداشـت درانـەوە؟ واتـە: ئەگـەر پاداشـتێك هەبـێ بـۆ وان، لەسـەر كـردەوە خراپەكانیانـەو بـە دڵنیاییـش كـردەوەی خـراپ، هـەر سـزای لەسـەرە، نـەك پاداشـت، بـەڵام لێرەدا خـوای بـەرز بـە توانجـەوە باسـی پاداشـت (**ثـواب**) دەكات، هەندێكیـش لـە زانایـان گوتوویانـە: (**ثـواب**): بریتیـە لـەوەی لـە ئەنجامـی كـردەوەدا بـۆ مـرۆڤ دێتـەوە (**مـا يَثُـوبُ إلى الإنْسَـان مـن عملـه**)، چ سـزا بـێ، چ پاداشـت.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ٣ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ٤ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٖ ٧ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ٨ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ٩ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ١٠ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ١١ وَمَا يُكَذِّبُ

بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّاۖ بَلْۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُواْ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرْسِلُواْ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. سزای سەخت بۆ کەمکەران (لە کێشان و پێوان دا) ﴿١﴾ ئەوانەی کاتێك بە پێوان (و کێشان) لە خەڵك دەکڕن، بە تەواویی وەریدەگرن ﴿٢﴾ بەڵام هەر کات بۆیان پێوان (یان بۆیان کێشان) لێیان کەم دەکەن ﴿٣﴾ ئایا ئەوانە پێیان وانیە کە (لە لایەن خواوە) زیندووکراوەن؟ ﴿٤﴾ بۆ ڕۆژێکی (زۆر) مەزن ﴿٥﴾ ڕۆژێك کە خەڵك تێیدا بۆ پەروەردگاری جیهانییان هەڵدەستێ و ڕادەوەستێ! ﴿٦﴾ وانیە (کە ئەوان گومان دەبەن) بە دڵنیایی نووسراوی تاوانباران لە (سِجِّينٍ) دایە ﴿٧﴾ ئایا چی پێی زاناندووی (سِجِّينٍ) چییە؟ ﴿٨﴾ نووسراوێکی نیشانەدار کراوە ﴿٩﴾ لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بە

درۆ دانەران (ی سزاو پاداشت) ﴿١٠﴾ ئەوانەی ڕۆژی سزاو پاداشتیان بە درۆ دادەنا ﴿١١﴾ جگە لە هەر سنوور شکێنێکی گوناهکاریش، کەس بە درۆی دانانێ ﴿١٢﴾ (ئەو کەسەی) هەر کات ئایەتەکانمانی بەسەردا خوێنرانەوە، دەڵێ: ئەفسانەکانی پێشینانە ﴿١٣﴾ وا نیە (با واز لەو قسانە بێنن) بەڵکو بەهۆی ئەو (خراپ)ەوە کە وەدەستیان هێناوە، دڵیان کەمرەی بەستوە (ژەنگی لەسەر پەیدابووە) ﴿١٤﴾ وانیە (با وازبێنن) بە دڵنیایی ئەوان لەو ڕۆژەدا لە پەروەردگاریان پەردە پۆشن ﴿١٥﴾ دواییش بێگومان ئەوان چووە نێو کڵپەن ﴿١٦﴾ دواییش (پێیان) دەگوترێ: ئەوە ئەو (سزای)ەیە کە بە درۆتان دادەنا ﴿١٧﴾ وانیە (با وازبێنن) بێگومان نووسراوی چاکەکاران لە (عِلِّيِّينَ) دایە، ﴿١٨﴾ ئایا چی بە تۆی زانان‌دوە (عِلِّيِّينَ) چییە؟ ﴿١٩﴾ نووسراوێکی نیشانەدار کراوە ﴿٢٠﴾ زۆر نیزیکخراوەکان (لە خوا) دەیبینن ﴿٢١﴾ بە دڵنیایی چاکەکاران لە نێو نازو نیعمەتدان ﴿٢٢﴾ لەسەر تەختان دەڕوانن ﴿٢٣﴾ شادمانیی و گەشیی نازو نیعمەت لە ڕوویاندا دەناسی (و دەزانی) ﴿٢٤﴾ لە شیلەیەکی بەستراو دەخۆنەوە ﴿٢٥﴾ بە میسك بەستراوەو، با پێشبڕکەکاران تەنیا لەوەدا پێشبڕکە بکەن ﴿٢٦﴾ لە ئاوی تەسنیمی ئاوێتە کراوە ﴿٢٧﴾ (تەسنیمیش) سەرچاوەیەکە زۆر نیزیکخراوەکان (لە خوا) لێی دەخۆنەوە ﴿٢٨﴾ بێگومان ئەوانەی تاوانیان کردوە (لە دنیادا) بەوانەی بڕوایان هێناوە پێدەکەنین ﴿٢٩﴾ ئەگەر بەلاشیاندا ڕەتبوونایە، ئاماژەیان بۆ یەکدی دەکرد ﴿٣٠﴾ هەر کاتیش بۆ لای خێزان و کەسیان گەڕابانەوە، بە شادمانیی دەگەڕانەوە ﴿٣١﴾ هەر کاتیش بینیبایانن (بڕوادارانیان دیبایە)، دەیانگوت: بەڕاستیی ئەوانەن گومڕایان ﴿٣٢﴾ هەرچەندە بە پارێزەریش بە سەریانەوە نەنێررابوون! ﴿٣٣﴾ ئنجا ئەمڕۆش ئەوانەی بڕوایان هێنابوو بە بێبڕوایان پێدەکەنن ﴿٣٤﴾ لەسەر تەختان تەماشا دەکەن (چۆن سزا دەدرێن!) ﴿٣٥﴾ ئایا بێبڕوایان سزای ئەوەیان درایەوە کە دەیانکرد! ﴿٣٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لِّلْمُطَفِّفِينَ): (الطَّفِيفُ: الشَّيءُ النَّزْرُ، وَمِنْهُ الطُّفَافَةُ لِمَا لاَ يُعْتَدُّ بِهِ، وَطَفَّفَ الكَيْلَ: قَلَّلَ نَصِيبَ المَكِيلِ فِي إِيفَائِهِ وَاسْتِيفَائِهِ)، وشەی: (مُطَفِّفين)، کۆی (مُطَفِّف)ە، (مُطَفِّف)یش: لەسەر کێشی (مُفَعِّل)ەو، ناوی بکەرە، واتە: سووککەر، کەمکەر، لە (طَفِيف)ەوە هاتووە، (طَفِيف)، واتە: شتێکی کەم، وشەی (طُفَافَة)ش، شتێکە گرنگیی پێنەدرێ، دەگوترێ: (طَفَّفَ الكَيْلَ)، واتە: بەشی بابای بۆی دەپێوێ، کەمی کرد، لەوەدا کە هەقێکی پێبداو کەمی پێدا.

(اكْتَالُواْ): (الكَيْلُ: كَيْلُ الطَّعَامِ، كِلْتُ لَهُ الطَّعَامَ: تَوَلَّيْتُ ذَلِكَ لَهُ)، (كَيْل): بریتیە لە پێوانی خواردن، [واتە: بەرە شێو، ئەوەی دەخورێ، دانەوێڵەیە، یان هەر شتێکی دیکەیە،] دەگوترێ: (كِلْتُ لَهُ الطَّعَامَ)، خۆراکەکەم بۆ پێوا، یانی: سەرپەرشتیی ئەوەم کرد بۆی بپێورێ، مەرج نیە بەدەستی خۆی بۆی پێوابێ.

(يَسْتَوْفُونَ): (تَوْفِيَةُ الشَّيءِ: بَذْلُهُ لَهُ وافياً)، (تَوْفِيَةُ الشَّيءِ) ئەوەیە شتەکە بە تەواویی پێی بدرێ، بەڵام (إستيفاء الشَّيء)، ئەوەیە شتەکە بە تەواویی وەربگیرێ.

(يُخْسِرُونَ): (الخُسْرُ والخُسْرَانُ: انْتِقَاصُ رَأْسِ المَالِ، يِنُسَبُ إلى الإنْسَانِ وإلى الفِعْلِ، خَسِرَ فُلاَن، وَخَسِرَت تِجَارَتُهُ)، واتە: (خُسْر و خُسْرَان)، هەردووکیان بە مانای کەمکردنی سەرمایەو دەستمایەن و (خُسْر و خُسْرَان) پاڵدەدرێنە لای مرۆڤ و پاڵدەدرێنە لای کردەوەکەش، دەگوترێ: (خَسِرَ فُلاَن)، فلانکەس زیانی لێکەوت، دۆڕا، هەروەها دەشگوترێ: (خَسِرَت تِجَارَتُهُ)، بازرگانییەکەی دۆڕا، زیانی لێکەوت.

(سِجِّينٌ): (السِّجِينُ: اسْمٌ لِجَهَنَّم، وَقِيلَ: اسْمُ الأَرْضِ السَّابِعَة)، (سجين): ناوێکە لە ناوەکانی دۆزەخ، یاخود ناوە بۆ زەوی حەوتەم، چینی حەوتەم لە زەوی.

(مَّرۡقُومٞ): (**الرَّقْمُ: الخَطُّ الغَلِيْظُ، وَقِيْلَ التَّعْجِيمُ للكِتَابِ، وَفِي (المطفّفين) حُمِلَ عَلَى الوَجْهَيْنِ**)، وشەی (مرقوم) لە (رقْم)ەوە هاتووە، کە بە مانای نووسینی زبر دێ، هەندێکیش گوتوویانە: بە مانای سەروبۆر بۆ کردنی نووسراوە، بۆیەش گوتوویانە: (تعجیم)، لەبەر ئەوەی بابای عەرەب ڕێنووسەکەی خۆی زانیوە، بیخوێنێتەوە، بەڵام ئەوەی جگە لە عەرەب بووە، لە فارس و کوردو ڕۆم و هەموو ئەوانەی پێیان گوتوون: عەجەم، بۆ خوێندنەوەی نووسینی عەرەبیی، پێویستی بەوە کردوە ئەو نووسراوە عەرەبییە خاڵدار بکرێ، (ت) دوو خاڵی لەسەر دابنرێن و، (یـ) دوو خاڵ لە ژێریەوەو، (ن) خاڵێك لەسەریەوەو، (ب) لە ژێریەوەو هەروەها، ئەوە پێی دەگوترێ: (**تعجیم**)، ئنجا ئەوەی (**المطففین**)، لەسەر هەردوو ڕووەکە مانا کراوە، واتە: دەگونجێ مەبەست لە وشەی: (مرقوم)، نووسینی زبر بێ، یان نووسینێك بێ کە خاڵبەندیی بۆ کراوە.

(رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم): (**الرَّيْنُ: صَدَأٌ يَعْلُو الشَّيءَ الجَلِيَّ**)، (ران)، کرداری ڕابردوو (**فعل ماضي**)یەو، لە (رین)ەوە هاتووە، (رین)یش ژەنگێکە لەسەر شتێك کە سپیی و درەوشاوە بێ، پەیدابێ و سپێتیی و درەوشاوەییەکەی نەهێڵێ، (**أي: صَارَ ذَلِكَ كَصَدَأٍ عَلَى جلاء قُلُوبهم، فَعَمِيَ عَنْ معرفة الخير مِنَ الشرِّ**)، واتە: ئەو گوناح و تاوانانەی دەیکەن، وەك ژەنگێکە لەسەر دڵیان و دڵەکانیانی کوێر کردوون، لەوەی چاکە لە خراپە جیابکەنەوە.

(عِلِّيِّينَ): کۆی (عِلِّيّ)یە، بەڵام (سِجِّينٍ)، وشەیەك نیە، لە تاکێکەوە هاتبێ، بە پێچەوانەی (عِلِّيِّينَ)ەوە، کە دوایی خوای بەرزی مەزن بە (عِلِّيُّونَ)یش هێناویەتی، (علیین) لە (عُلُو)ەوە هاتووە، بە بێ گیرە (شدة)، (**العلو: ضِدُّ السُّفْلِ والعُلْوِيّ السفليّ المنسُوبِ إِلَيْهِ**)، واتە: (**عُلو**) پێچەوانەی (**سفل**)ە، یانی: خوارێ و (**علو**)، یانی: بەرز، (**عُلْوِيٌّ**)، واتە: شتێك کە پاڵ دەدرێتە لای (**علو**) و، (**سُفْلِيٌّ**)، واتە: شتێك کە پاڵ دەدریتە لای (**سفل**)، واتە: نزمیی، (**عِلیین**)یش یانی: بەرزیی و،

ناوە بۆ باشترینی باخەكانی بەهەشت، هەروەك چۆن (سجين)، ناوە بۆ خراپترین جۆرەكانی ئاگری دۆزەخ.

هەندێكیش گوتوویانە، وشەی: (**سجين و عليين**)، هەردووكیان ناون، بۆ ئەو كەسانەی لە خوارەوەن یان لەسەرەوەن و، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە نیزیكترە، مانایەكەیان بەو شێوەیە بێ.

(ٱلْأَرَآئِكِ ): (**جَمْعُ أرِيكَة، والأرِيْكَةُ حَجَلَةٌ عَلَى سَرِيرٍ**)، جارانی دیكەش بە تایبەت لە تەفسیری سوورەتی (**الواقعة**)دا، باشمان باسی ئەو وشەیە كردوە، (ٱلْأَرَآئِكِ ) كۆی (**أريكة**)یە، كە بە تەختێك دەگوترێ پەردەی بەسەرەوە بێ، لە هەندێ شوێنان پەردە كوللەی پێ دەڵێن، بەڵام ئەگەر پەردەكەی بە سەرەوە نەبێ، پێی ناگوترێ، (**أريكة**)و پێی دەگوترێ: (سرير)، ئێستا قەنەفە هەیە، خەڵك لەسەری دادەنیشێ، كورسییش هەیە بۆ لەسەر دانیشتن، بەڵام (سرير)، جیابووە لە قەنەفەو لە كورسییش، (سرير) شوێنی لەسەر دانیشتن بووەو، هی لەسەر پاڵكەوتن و ڕاكشانیش بووەو، پانتاییەكەی فراوانترە لە قەنەفەو لە كورسیش، ئەگەر پەردەشی بەسەرەوە بوو بێ پێیگوتراوە: (**أريكة**) و بە (ٱلْأَرَآئِكِ )، كۆ دەكرێتەوە.

(نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ): (**نضرة**) بە مانای جوانیی و گەشیی دێ، وەك چۆن ڕووەك و درەخت ئاو دەدرێ و، گەش و جوانە، (نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ )، واتە: گەشیی و جوانیی ئەو نازو نیعمەتانەی ئەو مرۆڤانە تێیدان.

(رَّحِيقٍ ): هەندێكیان هەر بە مانای مەیی و شەڕابیان لێكداوەتەوەو، هەندێكیش گوتوویانە: (**رحيق**) باشترین جۆری (مەی)یە، هەندێكیش گوتوویانە: (**رحيق**) جۆرێكە لە خواردنەوە، بەس خوا دەزانێ چییەو چۆنە؟

(مَّخْتُومٍ ): واتە: (**مُغْلَق، مَسْدُود**)، گیراو، سەرەكەی بەستراوەو ئاوەڵا نیە، هەندێكیش لە زانایان گوتوویانە: (**الخَتْمُ: الطَّبْعُ وَيُتَجَوَّزُ بِهِ فِي الإستيثاقِ وَالمَنْعِ**

**مِنْـهُ اعتبـاراً بِمَـا يَحْصُـلُ مِـنَ المنْـعِ بالخَتْـمِ عَـلَى الكتابـة والأبـواب)**، واتـە: (ختـم) بـە مانـای مـۆرە، دوایـی بەکارهێـنراوە بـۆ قایمکردنـی شـتێك و ڕێ لێگرتنـی هـەر کـەس کـە دەسـتی بەگەیەنێتـێ، چونکـە نووسراوێـك دەرگایـەك مـۆری لێدرابایـە، نەدەبـوو کـەس بـە لای ئـەو نـووسراوە دابچـێ و بیکاتـەوە، یاخـود بـەلای ئـەو دەرگایـە دا بچـێ و بیکاتـەوە، بزانـێ لـە دیـوی ژووریّ چ باسـە!.

(**مِسْكٌ**): (**المِسْـكُ: مِـنَ الطِّيْـبِ، فَـارِسِيٌّ مُعَـرَّبٌ وَهِـي المشْـمُوم**)، (**مسـك**): جۆرێکـە لـە بۆنـی خـۆش و وشـەیەکی فارسـییەو کـراوە بـە عەرەبیـی، کـە بریتیـە لـە: بۆنکـراو، بۆنێکـی خـۆش، (**المعجـم الوسـيط**)، دەڵـێ: (**ضَرْبٌ مِـنَ الطِّيْـبِ اتُّخِـذَ مِـنْ ضَرْبٍ مِـنَ الغِـزْلَانِ**)، واتـە: جۆرێکـە لـە بۆنـی خـۆش لـە جۆرێـك لـە ئاسـك وەردەگیـرێ، نـەك لـە هەموویـان، دوایـی زیاتـر (مسـك) شـی دەکەینـەوە، چییـەو چۆنـە؟

(**وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ**): واتـە: بـا پێشـبڕکەکاران لـەوەدا پێشـبڕکە بکـەن، دەگوتـرێ: (**تَنَافَسَ فِي الـشيءِ: بالَـغَ فِي رَغْبَتِـه فيـه**)، (**مُنافسـة**)ی لـە شـتەکەدا کـرد: زێدەڕۆیـی کـرد لـە ئـارەزوو بـۆ دەربڕینـی دا، (**نَافَسْـتُ فُلَانَـاً فِي كَـذا، أي: سَـابَقْتُهُ وباريتـه مِـنْ غَـيْرِ أَنْ يُلْحَـقَ الـضَّرَرُ بـهِ، والتَّنَافُـسُ التَّسَـابق**)، دەگوتـرێ: لەگـەڵ فڵانکەسـدا مونافەسـەم کـرد، واتـە: پێشـبڕکێم کـرد، داخـۆ مـن پێـش دەکـەوم، یـان ئـەو؟ بـێ ئـەوەی زیانـی پـێ بگەیەنـرێ، (**تنافـس**) یـان: (**تسـابق**)، واتـە: پێشـبڕکەو مـەرج نیـە تەنیـا لـە ڕاکردنـدا بـێ، جـاری وایـە لـە زۆرانبازییدایـەو، جـاری وا هەیـە لـە یارییەکـی فیکریـی دایـە، هەمـووی وشـەی مونافەسـەی بـۆ بەکاردەهێـنرێ.

(**تَسْنِيمٍ**): (**مَـاء فِي الجَنَّـة، وَسَـنِم يَسْـنَمُ: ارْتَفَـعَ عَـلَى وَجْـهِ الأَرْضِ**)، (**تَسْـنِيم**): ئاوێکـە لـە بەهەشـت، {سـەرچاوەیەکەو کانیاوێکـەو مـەرج نیـە، وەك ئـاوی خۆمـان بـێ}، دەگوتـرێ: (**سَـنِم يَسْـنَمُ: ارْتَفَـعَ عَـلَى وَجْـهِ الأَرْضِ**)، واتـە: شـتەکە لەسـەر ئاسـتی زەوی بەرزبـۆوە، (**سَـنَام**)یش، بـە دونگـی حوشـتر دەگوتـرێ، چونکـە لـە ئاسـتی پشـتی بەرزتـرە.

(يَتَغَامَزُونَ ): (**التَّغَامُـزُ: بالعَـيْنِ أو الجُفْـنِ أو الحَاجِـبِ، أي: أَشَـارَ بَعْضُهُـم إلى بعـض بِهَـا**)، واتـە: بـە چـاو، یـان بـە پێلـووی چـاو، یـان بـە بـرۆ، هەندێکیـان ئاماژەیـان بـۆ هەندێکیـان کـرد، هەڵبەتـە ئامـاژە بـۆ یەکـدی کردنەکەیـان بـۆ گاڵتـە پێکـردن بـووە بەبـڕواداران، ئەهـا ئـاگادار بـە! بزانـە چۆنـن! یـان بزانـە چـۆن دەڕوا! یـان چـی دەڵـێ؟

(انقَلَبُوا ): واتـە: گەڕانـەوە، (**الإنقـلاب: تَحَـوّل الـشَّيءِ عَـنْ وَجْهِـهِ**)، شـتێك كـە بـەرەو شـوێنێك بـڕوا بـەرەو لایـەك و دوایـی بگەڕێتـەوە، پێـی دەگوتـرێ: (**إنقـلاب**)، کەواتـە: (**إنقلبـوا**)، یـانی: ئـەو شـوێنەی بـۆی دەچـوون، دوایـی بـە پێچەوانـەوە پشـتیان تێکـردو گەڕانـەوە بـەرەو دواوە.

(أَهْلِهِمُ ): (**الأَهْـلُ: الزَّوْجَـةُ، وَأَهْـلُ الـشَّيءِ: أَصْحَابُـهُ، أَهْـلُ الـدَّارِ وَنَحْوِهـا: سُـكَّانُهَا**)، وشـەی (**أهـل**): هـەم بـە مانـای ژن و هاوسـەر، دێ، هـەم بـە مانـای هاوەڵانـی ئـەو شـتە دێ، دەگوتـرێ: (**أَهْـلُ الـدَّارِ**)، واتـە: ئەوانـەی خاوەنـی ئـەو خانـوو و ماڵـەن و تێیـدا نیشـتەجێن، نشـینگەکانی ئـەوێ، دیسـان وێنـەی ئـەوەش وەك خەڵـکی شـارەکە (**أهـل القريـة**)، دەڵێـم: (**أهـل**) بـە مانـای خـزم و نیزیـکانی ئـەو کەسـەش دێ، بۆیـەش مـن بـە کـەس و کارو نیزیکـەکان، لێکـم داوەتـەوە.

(فَكِهِينَ ): (**الفَكِـهُ: الطَّيِّـب النَّفْـسِ الَّـذِي يُكْـثِرُ الدُّعابـة**)، (**الفَكِـهُ**): یـانی: کەسـێکی مەشـەڕەبخۆش، کـە زۆر قسـەی خـۆش دەکات و گاڵتـەو سـوعبەت دەکات و دەم بـە زەردەخەنەیـە.

(ثُوِّبَ ): (**المثُوبَـةُ وَالمثْوَبَـةُ: الجَـزَاءُ: وَثَوَّبَـهُ، أي: كَافَـأَهُ**)، (**مَثُوبَـة و مَثْوَبَـة**)، هەردووکیان بـە مانـای پاداشـت و بەرانبـەر دێـن، ئنجـا ئـەو بەرانبـەرەش بـە زۆریـی وایـە (**ثـواب**) لـە بەرانبـەر چاکـەدا بـەکاردێ، واتـە: پاداشـت، بـەڵام (**عِقَـاب**) لـە بەرانبـەر خراپـەدا بـەکاردێ، واتـە: سـزا، لـە زمانـی کوردییـدا وشـەیەکمان نیـە لـە یـەك کاتـدا، هـەم بـۆ سـزادان و هـەم بـۆ پاداشـتدانەوە بەکاربـێ، لـە عەرەبییـدا هەیـە، وشـەی: (**جَـزَاء**)،

بـەڵام عەرەبیـش ئەگـەر بیانـەوێ بڵێـن: پاداشـت، دەڵێـن: (ثَـوَاب) و، ئەگـەر بیانـەوێ بڵێـن: سـزا، دەڵێـن: (عقـاب)، بـەڵام (جـزاء)، هەردووكیـان دەگرێتـەوە، لـە كوردییـش دا وشـەیەكمان نیـە - بـە پێـی زانیاریـی مـن - پـڕ بـە پێسـتی مانـای (جـزاء) بـێ، مەگـەر بگوتـرێ: بەرانبـەر، شـتێك كـە بەرانبـەر كردەوەكـەی ئـەوە، چاكـە یـان خراپە.

(وَثَوَّبَـهُ، أي: كَافَـأَهُ)، پاداشـتی دایـەوە، لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾، ئایـا بێبڕوایـەكان پاداشـتی ئەوەیـان درایـەوە كـە دەیانكـرد، زانایـان دەڵێـن: ئـەوە بـۆ توانجـە، واتـە: ئەگـەر پاداشـتێك هەبـێ، بـۆ بێبڕوایـان هـەر ئـەو سـزایەیە كـە دەیاندرێتـێ، پاداشـتێكی دیكەیـان نیـە، چونكـە چاكەیەكیـان نەبـووە تاكـو پاداشـتیان بدرێتـەوە، هەندێكیـش گوتوویانـە: وشـەی: (ثـواب)، وەك چـۆن بـۆ چاكـە دانـەوەو پاداشـت دانـەوە، بـەكاردێ، بـۆ سـزادانەوەش بـەكاردێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

لە بارەی هاتنە خوارەوەی ئەم سووڕەتە موبارەكەوە، ئەم گێڕدراوەیە دێنین:

{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ﵄، قَـالَ: لَـمَّا قَـدِمَ نَبِـيُّ اللَّـهِ ﷺ الْمَدِينَـةَ كَانُـوا مِـنْ أَخْبَـثِ النَّـاسِ كَيْـلًا، فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ: {وَيْـلٌ لِلْمُطَفِّفِيـنَ} فَحَسَّـنُوا الكيـلَ بَعْـدَ ذَلِـكَ}[1].

واتـە: ئیبنـو عەبباس ﵄ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ كـە چوو بـۆ مەدینـە، خەڵكەكە خراپتریـن جـۆرە پێوانیـان هەبـوو (واتـە: خراپتریـن جـۆرە پێـوان و كێشـانیان هەبـووەو فێڵیـان تێـدا كـردوە)، بـەڵام كـە خـوا (عزوجـل)، ئـەم ئایەتـە موبارەكـەی دابەزاند: ﴿ وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴾، (ئایەتەكانـی دیكـەش)، دوای ئـەوە كێشـان و پێوانیـان چـاك كـرد.

---

(١) أخرجـه النسـائي في تفسـيره: ٦٧٤، وابـن ماجـه: ٢٢٢٣، وابـن حبـان: ١٧٧٠، والطـبراني في الكبـير: ١٢٠٤١، والواحـدي في أسـباب النـزول ص٢٩٨، وغيرهـم، وقـال شـعيب الأرنـؤوط: حديـث حسـن.

بەڵکو لە شوێنی دیکەدا هاتوە: لە دوای ئەوە خەڵکی مەدینە باشترین کێشان و پێوانیان هەبوو، یەکێك لە زانایان لە ڕۆژگاری خۆیدا گوتوویەتی: ئێستاش لەگەڵ دابێ خەڵکی مەدینە باشترین کێشان و پێوانیان هەیە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئەم سووڕەتە - پێشتریش باسمان کرد - زانایان مشتومڕو ڕاجیاییان هەیە، کە ئایا مەککەییە، یان مەدینەییە، یاخود هەردووکیانە؟ چونکە: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: کاتێك پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەڕێوە بووە لە نێوان مەککەو مەدینەدا، ئەم سووڕەتە دابەزیوە، پێیشم وایە هەرچۆنێك بێ، ئەم سووڕەتە یان کۆتا سووڕەتە لە قورئانی مەککەیی، یاخود یەکەم سووڕەتە لە قورئانی مەدینەیی، خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١- بە ناوی خوا، ئەم قورئانخوێندنە دەست پێدەکەم، نەك بە ناوی خۆم، یان بە ناوی هەر کەسێکی دیکە، یان هەر شتێکی دیکە، بەس خوا شایستەی ئەوەیە کاتێك کارەکانت ئەنجام دەدەی، ناوی ئەویان لێ بێنی.

٢- ئەم کارەی ئەنجامی دەدەم، بۆ خوا ئەنجامی دەدەم، واتە: لە ئەنجامدانی ئەم کارەم دا، ئنجا قورئان خوێندنە، یان هەر کارێکی دیکەیەو ناوی خوای لێ دەهێنرێ، ئامانج و مەبەستم لێی ئەوەیە خوا لێم ڕازی بێ.

٣- ئەم کارەم بە پێی بەرنامەو ئایینێك کە خوا دایناوە، ئەنجام دەدەم، نەك هەر لە خۆوە چۆنم پێخۆش بێ، وابکەم، بەڵکو تەماشا دەکەم خوا چۆنی فەرمووە، خوای کاربەجێ لە بەرنامەکەی خۆیدا، لە ئایینەکەی خۆیدا چۆنی داناوە، بەو شێوەیە ئەنجامی دەدەم.

٤- ئەم کارەم بە تواناو وزەیەك كە خوا بۆی ڕەخساندووم، ئەنجام دەدەم، بۆ ئەوەی مرۆڤ سەرسام نەبێ بە خۆی و بە تواناو وزەكانی خۆی.

لە ڕاستییدا مرۆڤ تواناو وزەكانی، هەموویان دروستكراوی خوان و ﷻ ئەو پێیداون، بەڵام خوا ویستێكی پێداوە، كە دەتوانێ بەو ویستەی ئەو توانایانەی خۆی لە چاكەدا بەكاربێنێ، یان لە خراپەداو، هەر لەسەر ئەوەشە ئەگەر لە چاكەدا بەكاریان بێنێ، پاداشتی هەیەو، لە خراپەدا بەكاریان بێنێ، سزای هەیە.

وەك بابەت و تەوەری یەكەمی ئەم سوورەتە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ﴾، وشەی: ﴿وَيۡلٞ﴾، وەك دواتریش باسی دەكەین:

أ- هەندێك لە زانایان گوتوویانە: بە مانای سزا دێ.

ب- هەندێك گوتوویانە: یانی: **(أَشَدُّ العَذَاب)**، سەختترین سزاو ئازار.

ج- هەندێك گوتوویانە: بە مانای هاوار بۆ فلانكەس، چونكە كەسێك هاوار دەكات، خەڵك لە فریای بێ، كە تووشی ناڕەحەتییەكی گەورە بووبێ.

د- هەندێك گوتوویانە: ﴿وَيۡلٞ﴾، شیوێكە لە شیوەكانی دۆزەخ.

هـ- هەندێك گوتوویانە: جۆرێكە لە سزایەكانی دۆزەخ و سزایەكی زۆر سەختە، گرنگ ئەوەیە خوای بەرز كە ئەم وشەیەی بەكارهێناوە، وەك ترساندن و هەڕەشە پێكردن و سەرزەنشتكردن بەكاری هێناوە، ﴿لِّلۡمُطَفِّفِينَ﴾، **(مطفّفين)**، كۆی **(مُطَفِّف)**ە، لەسەر كێشی **(مُفَعِّل)** و، بە مانای ناوی بكەر **(إسم فاعل)** دێ، **(طَفَّفَ، يُطَفِّفُ، تطفيفاً فَهُوَ مُطَفِّفٌ)**، واتە: كەمی كرد یان سووكی كرد، كەم دەكات یان سووك دەكات، كەمكردن یان سووك كردن، ئەو كەمكەرە یان سووككەرە.

ئنجا دوایی خوا ﷻ هەر بۆ خۆی ڕوونی دەكاتەوە، **(مطففين)**، كێن؟ بە كوردیی دەگونجێ بڵێین: ئەوانەی كاتێك دەكێشن و دەپێون بۆ خەڵك، كەمیی و ناتەواویی لە كێشان و پێوانەكەیاندا، دێننە دی، واتە: كەمكەران، یان كەم

فرۆشـان، یاخـود تـەرازوو بـازان، بۆیـەش وشـەی تـەرازووم بەکارهێنـاوە، چونکـە لـە درێـژەی ئایەتەکانـدا باسـی کێشـان (وزن)یـشی کـردوە، پێـوان (کَيْـل) ئەوەیـە شـتێك بخەیـە نێـو شـتێکەوە، بـۆ نموونـە گەنـم دەخەیـە نێـو تەنەکـەوە، یـان عەڕبـەوەو دەیپێـوی، کێشـان (وزن)یـش ئەوەیـە شـتێك لەسـەر تـەرازوو دابنێـی و بیکێشـی داخـۆ کێشـی چەنـدە؟ پێـوان بـۆ قەبارەیـە، بـەڵام کێشـان بـۆ قورسـاییە، وشـەی: (**مطففين**)یـش، خـوا بـۆ هەردووکیـانی بەکارهێنـاوە، واتـە: ئەوانـەی کەمیـی و کـەم و کوڕیـی دەکـەن، لـە پێـوان و لـە کێشانیشـدا، چونکـە دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، ئەوانـەی کاتێـك لـە خەڵکیـان پێـوا، شـتیان لـە خەڵـك وەرگـرت و خەڵکەکـە بۆیـان پێـوان، ﴿ يَسْتَوْفُونَ ﴾، بـە تەواویـی وەری دەگـرن، ﴿ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ ﴾، بـەڵام کاتێـك بۆیـان پێـوان، یاخـود بۆیـان کێشـان، ﴿ يُخْسِرُونَ ﴾، کـەم دەکـەن و زیانیـان لێـدەدەن، ئەگـەر وەربگـرن، بـە تەواویـی مافـی خۆیـان وەردەگرن، چ بـە کێشـان بـێ، چ بـە پێـوان بـێ، بـەڵام ئەگـەر بۆیـان بکێشـن، یـان بپێـون، کـەم و کورتیـی تێـدا دەکـەن.

هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: یەکێـك لـە ئەوانـەی خەڵکـی مەدینـە بـوون، دوو دەفـری هەبـوون بـۆ پێـوان، ئەگـەر بـۆ خـۆی شـتی کڕیبایـە، بـە دەفرێـك دەیپێـواو، ئەگـەر بـۆ بەرانبەرەکـەی بیپێوابایـە، دەفرێکـی دیکـە کـە گچکەتـر بـوو دەیپێـوا.

﴿ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ ﴾، ئایـا ئەوانـە نازانـن، پێیـان وانیـە، کـە زینـدوو کـراوەن، واتـە: زیندووکـراوەن لـە لایـەن خـواوەو هەڵسـێنراوەن لـە لایـەن خـواوە، کەنگـێ؟ ﴿ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾، ئـەم (ل)ە، لای کاتدانـان (لام التوقيـت) ە، واتـە: لـە ژوانگەیـەك و ڕۆژێکـی مەزنـدا، خـوا ﷻ هەڵیاندەسێنتەوەو زیندوویـان دەکاتـەوە، ئنجـا ئایـا ئـەو ڕۆژە چ ڕۆژێکـە؟ ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئـەو ڕۆژەی خەڵـك بـۆ پـەروەردگاری جیهانییـان هەڵدەسـتنە پـێ، ڕادەوەسـتن، وشـەی: (**ظـن**)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَا يَظُنُّ ﴾، ئایـا گومـان نابـەن، هـەر لەسـەر مانـا ڕواڵەتییەکـەی خۆیەتـی کـە بریتیـە لـە گومانبردن، ئایا ئەوانـە پێیـان وانیـە، گومـان

نابەن کە زیندوو کراوەن لە ڕۆژێکی مەزندا، ئەو ڕۆژەی خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانییان ڕادەوەستن و هەڵدەستنە سەر پێ؟ هەندێکی دیکەش، گوتوویانە: لێرەدا (**ظَن**)، بە مانای زانین (**عِلم**)ە، یانی: ئایا نازانن.

ئنجا دێتە سەر بابەت و تەوەری دووەم، لە یازدە ئایەتەکانی: (٧ - ١٧)دا، کە باسی تاوانباران و خراپەکارانە کە بەهۆی بێبڕواییەوە تاوان و خراپە دەکەن، باسی سەرەنجامی ئەوانەو چۆن سزا دەدرێن و چۆن لە دیداری خوا بێ بەش دەکرێن؟

دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ ﴾، وشەی: ﴿ كَلَّا ﴾، لەم سوورەتە موبارەکەدا چوار جاران هاتوە، وەك زۆر جاریش گوتوومانە: (**كَلَّآ : كَلِمَةُ رَدْعٍ وَزَجْرٍ وَإِبْطَال**)، وشەیەکە بۆ پەرچدانەوەو سەرزەنشتکردن و هەڵوەشاندنەوە، ئایا ئەوەی هەڵیدەوەشێنێتەوە چییە؟ زۆرجار خوای کاربەجێ ، بۆ عەقڵ و سەلیقەی مرۆڤی بەجێ دێڵێ، لێرەش دا دیار نیە، ئەو شتەی دەبێ وازی لێ بهێنرێ، چییە؟ بەڵام بە عەقڵ و سەلیقە دەتوانین، لێی ورد بینەوە، کە مەبەست ئەوەیە: باواز بێنن لە تەرازوو بازیی و لە پێوانبازیی، واتە: کاتێك شت بۆ خەڵك دەپێون، فێڵیان لێ بکەن، یان کەشتێکیان بۆ دەکێشن، فێڵیان لێ بکەن، با واز لەوە بێنن.

یاخود: با واز لەو بۆچوونەیان بێنن کە پێیان وایە، زیندوو ناکرێنەوە بۆ ڕۆژێکی مەزن، ئەو ڕۆژەی خەڵك تێیدا هەڵدەستێ و ڕادەوەستێ لە بەرانبەر خوای پەروەردگاری جیهانییان داو، چاوەڕێی بڕیارو حوکمی خوای دادگەر دەکەن، با وازبێنن لەوەی پێیان وابێ ڕۆژێك نایەت لێیان بپرسرێتەوەو سزاو پاداشتیان بەملدا بهێنرێ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴾، بە دڵنیایی نووسراوی تاوانباران لە: ﴿ سِجِّينٍ ﴾دایە، ﴿ كِتَٰبَ ﴾، بە مانای نووسراو دێ و، بە مانای جێگاو ڕێگاش دێ، ئەو شوێنەی بۆ تاوانباران نووسراوەو تەرخانکراوە، ﴿ ٱلْفُجَّارِ ﴾، ﴿ ٱلْفُجَّارِ ﴾، کۆی (فاجر)ە، وەك چۆن (**كُفّار**)، کۆی (کافر)ە، (فاجر)یش، واتە:

خراپەکارو تاوانبار، وشەی: ﴿ سِجِّينٍ ﴾، کە خوای بەرز دوایی ڕوونی دەکاتەوە، زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە وشەیەکی عەرەبییە، هەندێکی دیش گوتوویانە: وشەیەکی جگە لە عەرەبییە، بەڵام گرنگ ئەوەیە وشەیەکە تاکی نیە، وەك وشەی: ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾، کە لە بەرامبەر ﴿ سِجِّينٍ ﴾دایە، ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾، زانایان دەڵێن: کۆی (عِلِّي)یە، کە بە: ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾ و ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾یش، کۆ دەکرێتەوە، بەڵام ﴿ سِجِّينٍ ﴾، هەر یەك حاڵەتی هەیەو وشەیەکە کۆی نیەو، خۆی هەر بەو شێوەیە، ﴿ سِجِّينٍ ﴾، کە شوێنی نووسراوی تاوانبارانە، وا مەزەندە دەکرێ زۆر لە خوارەوە بێ، هەرچەندە بۆ ئێمە لە گەردووندا سەرەوەو خوارەوە، ڕێژەیی (نِسبيٌّ)ن، بەڵام کە خوا ﷻ ئەو وشانەی بەکارهێناون، دیارە لە ئەسڵدا سەرەو خوارەوە هەن، هەرچەندە بۆ ئێستای ئێمە ڕێژەیی بن، ئێستا ئێمە لەم بەشەی سەر زەوین، کیشوەر (قارة)ی ئاسیا و ئەمریکاییەکان لەولان و ئوسترالییەکان لەو لان، ئەوەی بە نسبەت ئێمەوە لای سەرێیە، بە نسبەت ئەوانەوە لای خوارێیەو، لای خوارەوەی ئەوانیش لای سەرەوەی ئێمەیە، لەبەر ئەوەی خڕۆکەی زەوی هێلکەیی و خڕ هەڵکەوتوە، بەڵام مانای وانیە لە ئەسڵیشدا هەروایە، مادام خوای پەروەردگار وشەکانی: سەرێ و خوارێ بەکاردێنێ، دیارە سەرو خوار هەن، لەو ڕۆژی دواییەدا، کە خوا عالەمێکی دیکە دەیهێنێتە پێش.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانا‌ندوە، ﴿ سِجِّينٍ ﴾، چییە؟ واتە: شتێکی زۆر گەورەو گرنگەو، شوێنێکی زۆر بێزەزایە، هی ئەوە نیە تۆ بزانی، مەگەر کەسێك پێت بزانێنێ و پێت بڵێ، ئنجا ڕوونی دەکاتەوەو، دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴾، نووسراوێکی نیشانەدار کراوە، (رَقْم)، بە مانای نیشانەیە، ﴿ مَّرۡقُومٞ ﴾، واتە: شتێك نیشانەی لەسەر دانرابێ.

یاخود: ﴿ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴾، واتە: نووسراوێك کە نووسینەکەی زبرەو بە زبریی و درشتیی نووسراوە، ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا، {ڕۆژێ کە خەڵك بۆ

پـەروەردگاری جیهانییـان ڕادوەسـتێ و هەڵدەسـتێ}، لـەو ڕۆژەدا سـزای سـەخت بـۆ بـە درۆدانـەران، چـی بـەدرۆ دادەنێـن؟ ڕوونـی دەکاتـەوە: ﴿ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾، ئەوانـەی ڕۆژی سـزاو پاداشـت بـە درۆ دادەنێـن، ﴿ ٱلدِّينِ ﴾ مانـای (**الجـزاء**)، وەك پێشـتریش گوتـم، ئێمـە لـە زمانـی کوردییـدا دەبـێ بڵێیـن: سـزاو پاداشـت، ڕەنگـە هەبـێ و تاکـو ئێسـتا نەمدۆزیوەتـەوە، وشـەیەکم پـێ شـك نایـەت، ڕێـك پێکەڵپێـك و پـڕ بـە پێسـت بـێ لەگـەڵ وشـەی: (**الجـزاء**)دا، کـە لێـرەدا: ﴿ ٱلدِّينِ ﴾، بـە مانـای (**الجـزاء**)ە، بـەڵام لـە ئەسـڵ دا بـە مانـای: ١- ملکەچیـی، ٢- بەرنامـە بـە گشـتیی، ٣- بەرنامـەی تایبـەت کـە بەرنامـەی خـوای پـەروەردگارە، بەگشـتیی، ٤- سـزاو پاداشـت، ﴿ ٱلدِّينِ ﴾، یانـی: (**الجـزاء**)، یـانی: ئەوانـەی بێبـڕوان، ڕۆژی دوایی، ڕۆژی سـزاو پاداشـت بـە درۆ دادەنێـن، ﴿ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ﴾، هیـچ کەسـیش ڕۆژی سـزاو پاداشـت بـە درۆ دانانـێ، مەگـەر هـەر سـنوور شـکێنێکی زۆر گوناهبـار، ﴿ مُعۡتَدٍ ﴾، واتـە: کەسـێك کـە سـنووری بەزانـدوە، سـنووری شـکاندوە، یـان: سـتەمکار، ﴿ أَثِيمٍ ﴾، ڕێژگـەی زێدەڕۆیـی (**آثـم**)ە، واتـە: گوناهـکار، بـەڵام ﴿ أَثِيمٍ ﴾، واتـە: زۆر گوناهـکار، هـەروەك (راحـم)، واتـە: بـە بەزەیـی، بـەڵام (**رحیـم**)، واتـە: زۆر بـە بەزەیـی، ئنجـا ئایـا بۆچـی کەسـێك کـە زۆر سـنوور شـکێن و زۆر گوناهـکارە، سـزاو پاداشـت بـە درۆ دادەنـێ؟ وەك لـە تەفسـیری سـوورەتی (**القیامـة**)ش دا باسـی ئەوەمـان کـرد: ﴿ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ ﴾، بەڵکـو مرۆڤـی بێبـڕوا دەیـەوێ هـەر بـە گوناهـو تـاوان بیداتـە بـەر، بۆیـە دەپرسـێ: ڕۆژی قیامـەت کەنگێیـە؟ واتـە: نکووڵیـی لـێ دەکات، بۆیـە ئەوانـەی زۆر خراپـەکارن و سـنوورەکانی خـوا دەشـکێنن و، سـنوور بـە لای خەڵکـدا دەشـکێنن، ئەگـەر بـە دڵـی ئـەوان بـێ، حـەز دەکـەن، ڕۆژی سـزاو پاداشـت و لێپرسـینەوەو لـێ پێچینـەوە نەبـێ.

ئنجـا ئایـا ئـەو جـۆرە کەسـە چۆنـە؟ ﴿ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، هـەر کات ئایەتەکانـی ئێمـەی بەسـەردا بخوێندرێنـەوە، دەڵـێ: ئـەوە ئەفسـانەی

پێشـینانە، وشـەی: ﴿ إِذَا ﴾، بـۆ (ظـرف)ە، کاتێـك کـە شـتێکی تێـدا ڕوو دەدات و، کاتێـك دەچێتـە سـەر کـرداری ڕابـردوو، دەیـکات بـە داهاتـوو: ﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، کاتێك ئایەتەکانـی ئێمـەی بەسـەردا دەخوێندرێنـەوە: ﴿ قَالَ ﴾، واتـە: دەڵـێ: دەیـکات بـە ئێسـتاو داهاتـوو، دەڵـێ: ئـەوە ئەفسـانەی پێشـینانە، ﴿ أَسَٰطِيرُ ﴾، کـۆی (أسـطُورَة)یە، (أسـطورة)ش، یانـی: (القِصَّـة المفتعلـة)، بەسـەرهاتێکی هەڵبەسـتراو، هەندێکیـش گوتوویانـە: هـەر بەسـەرهاتێك، چ هەڵبەسـترا بـێ، چ لـە ئەسـڵدا ڕاسـت بووبێـت بـەڵام دوایـی گۆڕدرابـێ، بـەڵام وا پێدەچـێ (أسـطورة) بەسـەرهاتێکی هەڵبەسـتراو یـان ئەفسـانەیی بـێ، بۆیـە بـە کوردیـی کـە دەڵێـن: ئەفسـانەی پێشـینان، ئەفسـانەی ئـەو گەلانـەی پێشـتر بـوون، وا پێدەچـێ مانایەکـی تـاڕاددەك پـڕ بـە پێسـت بـێ لەگـەڵ وشـەی: ﴿ أَسَٰطِيرُ ﴾دا.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ كَلَّا ﴾، نەخێـر {وانیـە، کـە ئـەوان دەڵێـن}، ﴿ بَلْ ﴾، بەڵکـو ﴿ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، ئـەوەی دەیکـەن، ژەنگـی لەسـەر دڵیـان پەیـدا کـردوە، ئـەوەی دەیکـەن، کـردەوە. خراپەکانیـان، بۆتـە هـۆی ئـەوەی ژەنـگ و کەمـڕە لەسـەر دڵیـان بنیشـێ، دڵـی مـرۆڤ کە ژەنگـی لەسـەر نیشـت، وەك ئاسـنی ژەنگگرتوو، ڕەونـەق و سپییەتییەکەی نامێنـێ، ئاسـن لـە ئەسـڵدا سـپییە، بـەڵام کـە ژەنگـی لەسـەر نیشـت، ڕەش دەبـێ، هەروەهـا ئاوێنـە ئەگـەر تۆزو خۆڵی لەسـەر نیشـت، شـت پێشـان نـادات، دڵـی ئەوانـەش لـە ئەسـڵدا خـوا وای خوڵقانـدوە، هـەق و ناهـەق لێـك جیـا بکاتـەوە، چاکـەو خراپـە لێـك جیـا بکاتـەوە، بـەڵام لـە ئەنجامـی ئـەو کـردەوە خراپانـەدا کـە وەدەسـتیان دەهێنـن، دڵیـان کوێـرو کوتـر بـووە چونکـە ژەنگـی لەسـەر نیشـتوە، هەڵبەتـە: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم ﴾، تەنیـا (حفـص)و، هەندێکیـان وایـان خوێندۆتـەوە، بـەڵام زۆربەیـان (ل) کـە یـان لـە (ر)کـەدا دەغـم کـردوە[1]، نەخێـر بـا واز بێنـن، ئـەوە ئەفسـانەی پێشـینان نییـە، بـەڵام ئـەوان ئـەوەی دەیکـەن لـە کـردەوە خراپەکانیـان، ژەنگـی لەسـەر دڵەکانیـان پەیـدا کـردوە، بۆیـە دڵەکانیـان بـە تەواویـی نابیسـتن و

---

(١) واتە: بۆتە: (برّان على قلوبهم).

نابینـن، ﴿ كَلَّآ ﴾، بـا وازبێنـن، یـان وانیـە وەك ئـەوان دەڵێـن، ﴿ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان لـەو ڕۆژەدا لـە پەروەردگاریـان پـەردە پـۆش دەكرێن، (حجـاب)، بـە مانـای پەردەیـە (محجوب)یـش، كەسـێكە خرابێتـە پشـت پـەردەوە، واتـە: ئـەوان ئـەو گوناهـو تاوانانـەی كردوویانـن لـە دنیـادا، بۆیـان دەبنـە پەردەیـەك و خـوا نەبینـن، ئەگەرنـا هیـچ كەسـێك نیـە خـوای پـەروەردگار لـە ڕۆژی دواییـدا، نەبینـێ، جگـە لـەو بێبڕوایانـەی بـە گوناهـو تاوانەكانیـان پەردەیەكـی مەحكـەم و ئەسـتووریان لەبەردەمـی خۆیـان دا دروسـت كـردوە، خـوای پەروەردگاریـان لـێ دەپۆشـێ و ڕێ دەگـرێ ببینـن.

﴿ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ ﴾، ئنجـا بـە دڵنیایـی ئـەوان بـە شـێوەیەكی تایبـەت لـە كڵپـەی دۆزەخـدا دەسـووتێنرێن، ﴿ لَصَالُوا الْجَحِيمِ ﴾، یانـی: (**داخلـو الجحیـم**)، چـووە ژووری كڵپـەن، بـەڵام بـە شـێوەیەكی تایبـەت دەخرێنـە تـێ، وەك زۆرجـاری دیكـەش گوتوومانــە: بۆیــە خــوا لێــرەدا نەیفەرمــووە: (إِنَّهُمْ لداخلـو الْجَحِيمِ) و دەفەرمــوێ: ﴿ لَصَالُوا الْجَحِيمِ ﴾، چونكـە (صَلِي) بریتیـە لـە سـووتاندنی شـتێك كـە لـە هـەر چـوار لاوە ئاگـری بـۆ بـێ، یـانی: دەبـرژێ لـە هـەر چـوار لاوە، وەك گۆشـت و تكـە كـە دەبرژێـنرێ، یاخـود دەپیشـێ، عـەڕەب بـەوە دەڵێـن: (مگـزوف)، كـە لـە هـەر چـوار لاوە ئاگـری دەدرێتـێ و سـەرەنجام بـە ئاگرەكـە دەپیشـێ، هەمـووی وەك یـەك دەپیشـێ و دەبـرژێ، ﴿ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴾، دوایـیش دەگوتـرێ (بـەو كەسـانە دەگوتـرێ)، ئـا ئـەوە بـوو كـە ئێـوە پێـی بێبـڕوا بـوون و بەدرۆتـان دادەنـا.

ئنجـا دێتـە سـەر تـەوەری سـێیەم و ئەویـش یـازدە (١١) ئایـەت دەگرێتـەوە، ئایەتەكانـی: (١٨ - ٢٨)، لـەو یـازدە (١١) ئایەتـەدا، خـوای بـەرزی مـەزن باسـی جۆرێكـی دیكـە لـە خەڵـك دەكات، جـۆری یەكەمیـان تاوانبارانـی بـە درۆ دانـەری ڕۆژی دوایـی بـوون، كـە ئایەتەكانـی خوایـان بـە ئەفسـانە دادەنـا، ئەوانـە لـە خـوا پـەردە پـۆش دەكرێـن و دوایـی دەخرێنـە دۆزەخـەوە، بـەڵام ئـەم جۆرەیـان بڕوادارانـی چاكـەكارن، دەفەرمـوێ: ﴿ كَلَّآ ﴾، (نەخێـر بـا وازبێنـن)، لـەو بێبڕوایـی

و ملهوڕییەیـان: ڕاسـت نیـە وەك ئـەوان دەڵێـن، ﴿إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ﴾، بـە دڵنیایـی نووسراوی چاکـەکاران لـە ﴿عِلِّيِّينَ﴾ە، دواییـش خـوای بـەزری مـەزن هـەر بـۆ خـۆی ﴿عِلِّيِّينَ﴾ینـمان، بـۆ مانـا دەکات، ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ﴾، چ شـتێك بـە تـۆی زانانـدوە (علیّـون) چییـە؟ بـە دڵنیایـی ڕووی دوانـدن بـەر لـە هـەر کەسـێك لـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەدە ﷺ لـەم ئایەتـە موبارەکـەدا، یەکەمجـار دابەزیوەتـە سـەر دڵـی موبارەکـی ئـەو، کـە پاکتریـن و چاکتریـن و شایسـتەترین دڵ و دەروون بـووە، خـوای کاربەجـێ یەکەمجـار ئـەم ئایەتانـەی دابەزێنێتـە سـەر، بـەڵام دوای پێغەمبەریـش ﷺ هـەر کەسـێکی دیکـە، کـە وەك پێغەمبـەری خـوا موحەممـەد ﷺ ئـەم ئایەتانـە دەخوێنێتـەوە، دەبێتـە دوێـنراوی خـوای میهرەبـان لـە هەمـوو دواندنەکانیـدا، مەگـەر ئـەو دواندنانـەی تایبەتـن بـە پێغەمبـەر خـواوە ﷺ و بـە بەڵگەیەکـی ڕوون و بـێ چەنـدو چـوون، تایبەتیـان بکـەن بـەوەوە، ئەگەرنـا هەمـوو ئـەو ئایەتانـەی پێغەمبـەری خاتەمیـان ﷺ پـێ دوێـنراون، ئۆممەتەکـەی و شوێنکەوتووانیشـی پێیـان دوێـنراون، کـە دەشـڵێین، ئۆممەتەکـەی و شـوێنکەوتووانی واتـە: بـڕواداران، بـەڵام بێگومـان جگـە لـە بـڕواداران هەمـوو مرۆڤەکانیـش بـە ئایەتەکانـی خـوا دوێـنراون، خـوا ﷻ بانگـی هەمـووان دەکات، مەگـەر بـە نازنـاوی ئیـمان بانگیـان بـکات: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴿٢٨﴾﴾ الحدیـد، ئـەو کاتـە ئەوانـەی بـێ ئیمانـن نایانگرێتـەوە، بـەڵام لێـرەدا ئـەم سـووڕەتە ئەگـەر ئـەوە تەبەنیـی بکـرێ، کـە مەککەییـە، کـە ئێمـە ئـەم ڕایەمـان پـێ بەهێزتـرە، ئـەوە ڕووی دوانـدن لـە تێکڕای مرۆڤەکانـە، بـەڵام ئەگـەر مەدینەییـش بـێ، لـە مەدینـەش دا خـوای پـەروەردگار مسـوڵمانان و نامسـوڵمانانی دوانـدوون: ١- ٢- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ﴾الانشـقاق(٦) ، ٣- ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾الأعـراف (٣٥).

﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ﴾، {ئـەی ئـەو کەسـەی قورئـان دەخوێنـی}، چ شـتێك بـە تـۆی زانانـدوە ﴿عِلِّيُّونَ﴾، چییـە؟ ﴿كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ﴾، نووسراوێکـی نیشـانەدار کـراوە،

یاخـود: نووسراوێکـه بـه زبریـی و درشـتیی نـووسراوە، ﴿ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴾، زۆر نزیکخـراوان دەیبینـن، یـان لـە لای ئامـادە دەبـن، زۆر نزیکخـراوان (**مقربـون**) بـه ڕای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان، فریشـتەکانن، هەندێـك لـە زانایانیـش بـۆ وێنـە: (**محمـد عبـده**) ڕای وایـە دەگونجـێ مەبەسـت: مرۆڤـە زۆر لـە خـوا نزیکـەکان بـن، وێـڕای فریشـتەکانیش.

بـەڵام زیاتـر واپێدەچـێ لێـرە لـەم سیاقەدا مەبەسـت پێـی فریشـتەکان بـن، یـانی: فریشـتەکان ئـەو نـووسراوە دەبینـن، بـۆ ﴿ سِجِّينٍ ﴾، خـوا نەیفەرمـووە: ﴿ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴾، چونکـە (**سـجين**) زۆر لـە خوارێیـە، بـەڵام ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾، لەبـەر ئـەوەی زۆر لـە سـەرێیەو فریشـتەکانیش هـەر لـە سـەرێن، دەیبینـن و لـە لای ئامـادە دەبـن، ﴿ يَشْهَدُهُ ﴾، هـەم بـە مانـای: لـە لای ئامـادە دەبـن (**يحـضروه**)، هـەم بـە مانـای: دەیبینـن، یـانی: (**يـراه**)، (**شـهود**) بـە مانـای دیـتن و بـە مانـای ئامـادە بوونیـش دێ، ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴾، بـە دڵنیایـی چاکـەکاران لـە نێـو نـازو نیعمـەت دان، ﴿ نَعِيمٍ ﴾، واتـە: نـازو نیعمـەت و خێـرو خۆشـیی، ﴿ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴾، لەسـەر تەختـان، ئـەو تەختانـەی پەردەیـان بەسـەر دادراون و ڕازێنراونـەوە، تەماشـا دەکـەن، سـەرنج دەدەن، تەماشـای موڵکـی خۆیـان دەکـەن، کـە پێیـان دراوەو، دەڕواننـە ئـەو نـازو نیعمەتـەی خـوای پـەروەردگار پێیـداون.

﴿ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴾، ئەگـەر تەماشـایان بکـەی، لـە دەم و چاویانـدا خۆشـیی و گەشـیی نـازو نیعمـەت دەبینـی، (**وجـوه**) کـۆی (**وجـه**)ە، واتـە: ڕوو، ڕووش لـەو شـوێنەوە کـە تووکـە سـەری لـێ دێ، تاکـو کۆتایـی چەناگـەو، لـە گوێـی ڕاسـتەوە تاکـو گوێـی چـەپ، هەمـووی ڕووی پـێ دەگوترێ، لە ڕووی ئەواندا شـادیی و خۆشـیی نـازو نیعمـەت دەبینـی، ﴿ تَعْرِفُ ﴾، واتـە: دەزانـی، دەناسـی، ﴿ فِى وُجُوهِهِمْ ﴾، لـە دەم و چاوەکانـی ئەوانـدا، چـی دەناسـی و دەبینـی؟ ﴿ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴾، (**نضرة**)،یانـی: مانـای جوانیـی و ڕەونـەق و بەدەویـی، گەشـیی و شـادمانیی، کـە بەهـۆی ژیانـی پـڕ نـازو نیعمەتـەوە بـۆ مـرۆڤ پەیدادەبـێ.

﴿ يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ ﴾، پێیـان دەنۆشـێنرێ لـە شـیلە ﴿ رَّحِيقٖ ﴾ێکـی بەسـتراو، ﴿ رَّحِيقٖ ﴾، زانایـان گوتوویانـە: باشـترین جـۆری شـەڕابە، یاخـود: جۆرێکـە لـە خواردنـەوە، هـەر خـوا دەزانـێ چۆنـەو لـە دنیـادا وێنـەی نیـە، یـان: باشـترین جـۆری شـەڕابە کـە بێگومـان شـەڕابی بەهەشـت، مـەی بەهەشـت، جیایـە لـە هـی دنیـا، ﴿ مَّخۡتُومٍ ﴾، واتـە: سـەرەکەی بەسـتراوەو ئـاوەڵا نیـە، هەڵبەتـە لـە بەهەشـتدا تـۆزو خـۆڵ و گـەرد و مێـش و مەگـەزو مێشـوولە نیـە تاکـو بچێتـە تێـی، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئێمـە دەزانیـن و عـادەت وایـە شـتێك ببەسـترێ، مانـای وایـە زیاتـر گرنگیـی دراوە بـە پارێزرانـی، خـوای بەرزیـش ئـەو نیعمەتانـەی لـە بەهەشـتدا داینـاون، چـۆن بـە لای عەقـڵ و زگماکـی بەشـەرەوە باشـترە، ئـاوان.

﴿ خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٞ ﴾، هەندێکیـان خوێندوویانەتـەوە: (**خاتِمُـهُ مسـك**)، ئـەوەی بەسـتوویەتی، میسـکە، قوڕەکـەی لـە بۆنـی میسـکە، یاخـود: خـۆی جۆرێکـە لـە میسـك کـە خەڵـك تۆزێکـی دەسـتناکەوێ لـە خۆیشـی بـدات، بـەڵام لـەوێ زارەوانـەی ئـەو خواردنەوانەیـە کـە دەیانخۆنـەوە.

هەندێکیـش گوتوویانـە: ﴿ خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٞ ﴾، واتـە: کاتێـك دەیخۆنـەوە، لـە کۆتایـی خواردنەوەکـەدا بۆنـی میسـك لـە دەمیـان دێ. هـەردوو واتایەکـەش بـە جێـن و، هەردووکیـان ڕواڵەتـی بێـژەکان هەڵیـان دەگـرێ.

﴿ وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ ﴾، ئەوانـەی پێشـبڕکەش دەکـەن، بـا هەر لەوەدا پێشـبڕکە بکـەن، بـەس ئـەوە شایسـتەی ئەوەیـە پێشـبڕکەی بـۆ بکـەن، بۆیـە بـا هـەر کەسـە هەوڵبـدات لـەو نیعمەتـەی خـوا زیاتـر بەدەسـت بێنـێ.

﴿ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ ﴾، تێکەڵکراوەکەیـشی لـە تەسـنیمە، ئایـا ﴿ تَسۡنِيمٍ ﴾، چییـە؟ خـوای زانـاو شـارەزا مانـای دەکات و ڕوونـی دەکاتـەوە: ﴿ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾، سـەرچاوەیەکە زۆر نیزیکخـراوەکان لێـی دەخۆنـەوە، بـە دڵنیایـی لێـرەدا مەبەسـت لـە: زۆر نیزیکخـراوەکان ﴿ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾، ئـەو بەندانـەن کـە زۆر

لـە خـوا نیزیکـن، ئەگـەر مرۆڤـن، ئەگـەر جنـدن، ئەوانـەی لـە ئەنجامـی کـردەوەی چاکـی خۆیانـدا، زۆر لـە خـوا نیزیـك خراونـەوە، ئـەوان بـە سـاغیی و بـێ خڵتەیـی لـەو شـەڕابە دەخۆنـەوە، لـە سـەرچاوەی: ﴿ تَسْنِيمٍ ﴾، دەخۆنـەوە، بـێ ئـەوەی شـتی دیکـەی لەگـەڵ تێکـەڵ کرابـێ، ﴿ ٱلْأَبْرَارَ ﴾، چاکـەکاران، بۆیـان ئاوێتـە دەکـرێ لەگەڵ ﴿ رَّحِيقٍ ﴾دا، بـەڵام سـەرچاوەی ﴿ تَسْنِيمٍ ﴾، شایسـتەی ئەوەیـە ئەوانـەی زۆر لـە خـوا نیزیکـن، بـە سـاغیی لێـی بخۆنـەوەو هیچیدیکەیـان بـۆ لەگـەڵ تێکـەڵ نەکـرێ.

ئنجـا نـۆرەی تـەوەری چـوارم کۆتاییـە، ئەویـش هەشـت (٨) ئایەتی کۆتایـی دەگرێتە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٢٩ - ٣٦): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی تـاوان و خراپەیـان کـردوە، ئەوانـە (کاتـی خـۆی لـە ژیانی دنیـادا)، گاڵتەیـان، بـە بـڕواداران دەکـردو بەوانـەی بڕوایـان هێنابـوو، دەخەنین.

واتـە: ئـەو تاوانبارانـە لـە ژیانـی دنیـادا عادەتیـان وابـوو، بەوانـەی بڕوایان هێنـاوە پێدەکەنیـن، پێیـان ڕادەبـواردن، ﴿ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴾، کاتـێ بـە لایـان دا تێپەڕیبـان، واتـە: تاوانبـارەکان بـە لای بڕوادارانـدا تێپەڕبـان، ئاماژەیـان بـۆ یەکـدی دەکـرد، بێگومـان (و)ی سـەر (مَرُّوا۟) بکـەر (فاعـل)ی (مَرَّ)یـەو، دوو ئەگـەری هـەن:

أ- مەبەست پێی تاوانبارانە، کاتێ تاوانباران بەلای بڕواداران ڕەت بووبان، بەلایاندا تێپەڕیبانایە، ﴿ يَتَغَامَزُونَ ﴾، ئاماژەیان بۆ یەکدی دەکرد، بە چاوو لووت و برۆ و ئەوانە.

ب- یاخود کاتێك بڕواداران بە لایاندا تێپەڕیبان، بە لای بێبڕوایان دا تێپەڕیبانایە.

﴿ يَتَغَامَزُونَ ﴾، وشـەی: (غمـز)، لـە ئەصڵـدا یانـی: دەسـت بەسـەر داگرتنـی شـتێك بەهێـز، (جَسُّ النَّبْض)، ئەوەیـە کـە مـرۆڤ دەسـت بـە سـەر دەمـاری کەسێك دابگـرێ، داخـۆ دڵـی چـۆن لێـدەدا؟ (غَمْـز)، بـەو مانایـە هاتـوەو، بـە مانـای ئامـاژە کـردن بـۆ یەکدیـش هاتـوە، بـە زمـان و لێـوو لـووت و چـاوو بـرۆو هـەر ئەندامێـك ئامـاژەی پـێ بکـرێ، واتـە: ئاماژەیـان بـۆ یەکـدی دەکـرد، ئەگـەر یەکێکیـان غافڵا بـێ و ئـاگای لـێ نەبووبـێ ئاماژەیـان بـۆ کـردوە: ئەهـا چـاوت لـە فڵانکەسـە چۆنـە؟!

﴿ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ ﴾، كاتێـك گەڕابانایـەوە بـۆ لای کـەس و کاریـان بـە دڵخۆشـیی و شـادمانیی دەگەڕانـەوە، بـە جۆرێـك دەگەڕانـەوە وەك شـتێکی زۆر گرنـگ و گەورەیـان کردبـێ: لـە حاڵێـك دا گاڵتەیـان کـردوە بـە بـڕواداران و، پێیـان پێکەنیـون و ئاماژەیـان بـۆ یەکـدی کـردوەو پێیـان ڕابـواردوون!!.

وشـەی: ﴿ فَكِهِينَ ﴾، خوێنراوییشـەتەوە: (**فاكهـين**)، هەردووکیشـیان بـە مانـای: (**مُتَلذِّذيـن**)، یـانی: چێـژ وەرگرانـە، یـان: زۆر خۆشـحاڵانەو شـادیی دەربڕانـە، دەگەڕانـەوە، ﴿ وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴾، کاتێکیـش تاوانبـارەکان بڕوادارانیـان ببینیایـە، دەیانگـوت: ئـا ئەوانـەن گومڕایان، یـانی: ئەگـەر گومـڕا هەبـن، لەسـەر زەوی، هـەر ئەوانـەن.

خـوای پەروەردگاریـش بـە توانجـەوە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ﴾، ئـەوان وەك پارێـزەران ڕەوان نەکراونـە سـەریان و، بەسـەریانەوە پارێزەرنیـن، ئاگایـان لێیـان بـێ، بـەوەی وەسـف و پێناسـەیان بکـەن، داخـۆ گومـڕان، یـان ڕێـی ڕاسـتگرتوون؟ ئـەوان لـە دنیـا بـەو شـێوەیە بـوون، ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴾، ئەمـڕۆش ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، بـە بێبڕوایـان پێدەکەنـن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ءَامَنُواْ ﴾، واتـە: بڕوایـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، هەروەهـا کـە دەفەرمـوێ: (**كفـروا**)، یـان (**كفـار**)، یانـی: ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، یـان بێبـڕوان بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـت بـوو بڕوایـان پـێ بێنـن، کەواتـە: ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، یـانی: ئەمـڕۆ ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، ﴿ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴾، بـە بێبڕوایـان {بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـت بـوو، بڕوایـان پـێ بێنـن}، پێدەکەنـن، هەڵبەتـە مـرۆڤ ئەگـەر بـە یـەك شـتیش لـەو شـتانەی پێویسـتە پێیـان بـڕوادار بـێ، بێبـڕوا بـێ، هـەر بـە بێبـڕوا (کافـر) دادەنرێ، بـەڵام ئەوانـە مەگـەر چـۆن، ئەگەرنـا بەهەمـوو شـتێك بێبـڕوا بـوون:

١- بە خوا بێبڕوابوون، ڕەنگە زانیبیان خوای پەروەردگار بەدیهێنەرەو پەروەردگارو خاوەنە، بەڵام بە خوا بێبڕوابوون، لەو ڕووەوە کە بە تاکە پەرستراوی خۆیانی بزانن و، بەس ئەو بە خاوەنی ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنانە بزانن، کە هەیتی.

٢- هەروەها بە ڕۆژی دوایی و بە دیداری خواش بێبڕوا بوون.

٣- دیسان بەوەش بێبڕوا بوون کە موحەممەد پێغەمبەری خوا بێ.

٤- بە فەرمایشتی خواش بێبڕوا بوون.

٥- هەروەها بە هەموو شتە بنەڕەتییەکانی دیکەش بێبڕوا بوون.

خـوا دەفەرمـوێ: ئەمـڕۆ واتـە: لـە ڕۆژی دواییـدا ئەمـە باسـی ڕۆژی دواییـە، ئەوانـەی بڕوایـان هێنابـوو (لـە دنیـادا) پێدەکەنـن، دەخەنـن، بەوانـەی بێبڕوابـوون لـە دنیـادا، ﴿ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴾، لەسـەر تەختـان، ئـەو تەختانـەی پەردەیـان بەسـەریان دادراون و ڕازێنراونـەوە، تەماشـا دەکـەن، تەماشـای چـی دەکەن؟ تەماشـای سـزادرانی بێبڕوایـەکان دەکـەن و، تەماشـای نـازو نیعمەتەکـەی خۆیـان دەکـەن، تەماشـای بەدبەختیـی و ماڵوێرانییەکـەی بێبڕوایـان دەکـەن، کـە بـە ویسـت و دەسـتی خۆیـان، خۆیـان تووشـی ئـەو دۆخـە کـردوە.

لـە کۆتایـی دا خـوای مـەزن دەفەرمـوێ: ﴿ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾، ئایا بێبڕوایـەکان ئـەوەی دەیانکـرد لەسـەری بەرانبەریـان درایـەوە، لەسـەری سـزا دران؟.

وشـەی: (**ثُوِّبَ**)، بـە دڵنیایـی لـە (**ثواب**)ەوە هاتـوە، (**ثواب**) زانایـان دەڵێـن: هـەر بـە مانـای پاداشـت دێ، واتـە: ئـەو بەرانبـەرەی دەدرێ بـە کەسـێك لـە بەرانبـەر چاکەیەکـدا کـە کردوویەتـی، پێـی دەڵێـن پاداشـت (**ثـواب**).

ئنجـا لێـرەدا خـوای بـەرزو مـەزن کـە وشـەی (**ثـواب**)، بـۆ بێبڕوایـان بەکاردێنـێ، یـانی: ئەگـەر ئەوانـە پاداشـتێك هەبـێ بیاندرێتـێ، هـەر ئەوەیـە کـە بـەو شـێوەیان

بەسـەر بـێ، چونکـە هیـچ چاکەیـان نەبـووە، تاکـو پاداشـتیان بدرێتـەوەو، ئەگـەر پاداشـتێك بـۆ ئـەوان هەبـێ، هـەر ئەوەیـە کـە باسـکرا، بـەس ئـەو سـزایەیە.

حیکمەتێـکی دیکـەش بـۆ بەکارهێنـانی وشـەی **(ثواب)** ئەوەیـە کـە وشـەی **(ثواب)** وێـڕای پاداشـت، سـزاش دەگرێتـەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾، ﴿ هَلْ ﴾، بـۆ پرسـیارکردنە، ئایـا بێبڕوایـەکان لەسـەر ئـەوەی دەیانکـرد، پاداشـت درانـەوە یاخـود: سـزا دران؟ ئـەم پرسـیارکردنەش دەگونجـێ بڵێیـن: پرسـیارکردنی دانپێپێداهێنـان **(تقریـري)**ە، واتـە: بـە دڵنیایـی پاداشـت درانـەوە، یـان: سـزا دران، دەشـگونجێ پرسـیارکردن بـێ، بـە مانـای دڵنیایـی، واتـە: بـە دڵنیایـی ﴿ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ ﴾، بێبڕوایـان پاداشـت (یـان: سـزا) درانـەوە، وەك: ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ ﴿١﴾ ﴾الإنسـان، لەوێـدا گوتمـان: جـاری وایـە (هـل)ی پرسـیارکردن بـە مانـای **(قـد)**، لـە زمانـی عەرەبییـدا، کەواتـە: ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ ﴾، بـە دڵنیایـی بەسـەر مـرۆڤ داهاتـوە، کاتێـك شـتێکی شـایانی باسـکراو نەبـووە، لێرەشـدا: ﴿ هَلْ ﴾، دەگونجـێ بـە مانـای بێگومـان (قـد) بـێ، واتە: بـە دڵنیایـی بێبڕوایـەکان لەسـەر ئـەوەی دەیانکـرد سـزاو پاداشـت درانـەوە، واتـە: ئـەو سـزایە درانـەوە کـە لـە شـێوەی پاداشـت دایـە بـۆ بـڕواداران، زانایانـی ڕێزمانـی عەرەبیـی دەڵێـن: وشـەی: ﴿ هَلْ ﴾، ئەگـەر لـە ڕەوتێـك بـێ، کـە وەڵامەکـەی دیـار دابـێ، ئـەو کاتـە بـە مانـای پرسـیارکردن نیـە، مەبەسـت ئـەوە بـێ داوای وەڵام بـکات، بەڵکـو مەبەسـت دڵنیاکردنـەوەی بەرانبەرەکەیـە، وەك تـۆ شـتێك دەدەی بـە کەسـێك، دەڵێـی: فـڵان شـتەم پـێ نـەدای! دەتـەوێ بیـری بخەیـەوە، یـان دەتـەوێ ئـەو بڵـێ: بـا، دڵنیاشـی کـە دەڵـێ: بـا، چونکـە ناتوانـێ نکووڵیـی بـکات، لێرەشـدا مەبەسـت ئەوەیـە: بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، لـە بەرانبـەر ئـەو کردەوانـەدا کـە دەیانکـردن، کـە بریتـی بـوون لـە:

١- گاڵتە کردن بە بڕواداران و توانج تێگرتنیان.

٢- بە گومڕا لە قەڵەم دانیان.

٣- پێ ڕابواردنیان.

٤- گەڕانەوەش بۆ لای کەس و کاریان بە دڵخۆشیی.

لەسەر ئەوانە هەموویان ئەو سزایە دران، کە سزای پڕ بە پێستە، خوا پەنامان بدات، لەوەی کارێ بکەین لە ڕۆژی دوایيدا شایستەی سزای دادپەروەرانەی خوای دادگەر بین.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی ئەوە کە کەسانی کەمکەر لە پێوان و کێشان دا، سزای سەختیان هەیە، ئەوانەی لە کاتی کڕیندا مافی تەواوی خۆیان وەردەگرن، بەڵام لە کاتی فرۆشتن دا، ئەگەر کێشانە، ئەگەر پێوانە، لێیان کەم دەکەن، وەك نەزانن بۆ ڕۆژێکی مەزن زیندوو دەکرێنەوە، کە خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانییان ڕادەوەستێ و چاوەڕوان دەبێ: داخۆ خوا ﷻ چ بڕیارێکیان لە بارەوە دەدات؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ۝٣ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ۝٤ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ۝٥ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ۝٦﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾، سزای سەخت بۆ کەمکەران، واتە: ئەوانەی کاتێك شت دەفرۆشن، بە کێشان یان بە پێوان، لێیان کەم دەکەنەوە، وشەی: ﴿وَيْلٌ﴾ ناوەو چاوگ نیە، چونکە وشەی: ﴿وَيْلٌ﴾، کردەوەی نیەو، ئەو وشانەی کردەوە (**فعل**)یان هەیە، ئنجا چاوگیان لێ دروست دەبێ، وەك: (**ضَرَبَ، يَضْرِبُ، ضَرْبَاً**)، بەڵام ﴿وَيْلٌ﴾، خۆی ناوەو لە بارەی چەمك و واتایەکەشیەوە زانایان زۆر قسەیان کردوون:

**١-** هەندێکیان گوتوویانە: ﴿وَيْلٌ﴾، بە مانای سزای سەخت دێ.

**٢-** هەندێکی دیکەش گوتوویانە: بە مانای خراپەو زیان دێ.

**٣-** هەندێك گوتوویانە: شیوو دۆڵێکە لە دۆزەخدا.

٤- هەندێك گوتوویانە: ﴿ وَيۡلٌ ﴾، بە مانای هاوار بۆ فڵانکەس، لەبەر ئەوەی کەسێك زۆر تینیی بۆ بێ و ناڕەحەت و سەغڵەت بێ، ئنجا هاوار دەکات.

لە بارەی واتای (مطفّفين) یشەوە، زانایان زۆر قسەیان کردوە:

أ- (الطبري)، دەڵێ: (**المُطَفِّفُ: المُقَلِّلُ حَقَّ صَاحِبِ الْحَقِّ عَمَّا لَهُ مِنَ الوَفَاءِ وَالتَّمَامِ فِي كَيْلٍ أَوْ وَزْنٍ؛ وَمِنهُ قِيلَ لِلقومِ الَّذين يَكُونُونَ سَوَاءً فِي حِسْبَةٍ أَوْ عَدَدٍ: هُمْ سَوَاءٌ كَطَفِّ الصَّاعِ، يَعْنِي بِذَلِكَ: كَقُرْبِ الْمُمْتَلِئِ عن النَّاقِصِ عَنِ المِلءِ**) (**مُطَفِّف**)، واتە: کەمکەر، ئەوەی مافی هاوەڵەکەی کەم دەکات، مافی ئەو کەسەی شتی پێ دەفرۆشێ، لەوەی بۆی بگەیەنێتە ڕاددەی پێویست، لە پێواندا، یاخود لە کێشان دا، هەر بۆیە کەسانێك لە ڕووی ژماردن، یان لە ڕووی ژمارەوە، بە ئەندازەی یەکن پێیان دەگوترێ: (**هُمْ سَوَاءٌ كَطَفِّ الصَّاعِ**)، {(**طَفُّ الصَّاع**)، دەفرێکە نیزیك بێ پڕ بێ، بەڵام پڕ نەبووبێ}، ئەوان یەکسانن وەك (**طف الصاع**) یانی: وەك نیزیکیی ڕبەی پڕ لە هی پڕ نەبوو.

ب- یەکێکی دیکە لە ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێ: (**المُطَفِّفُ: المُنْقِصُ، وَحَقِيقَتُهُ: الأَخْذُ فِي الكَيْلِ أَوِ الوَزنِ شَيئًا طَفِيفًا، أَيْ: نَزْرًا حَقِيرًا**)، واتە: (**مُطَفِّف**) بە مانای (**مُنَقِّص**) کەمکەرەوەیە، ئەسڵەکەی بریتیە لە وەرگرتن لە پێوان و لە کێشان داو، ئەوەی لە پێوان و لە کێشان وەردەگیرێ، شتێکی کەم و کەم بایەخە، بۆیە گوتراوە: (**مُطَفِّف**).

ج- یەکێکی دیکە دەڵێ: (**المُطَفِّفُ: هُوَ المُقَلِّلُ حَقَّ صَاحِبِهِ بنُقْصَانِهِ عَنِ الحَقِّ فِي كيل، أو وَزْنٍ**)، (**مُطَفِّف**): کەسێکە مافی بەرانبەرەکەی کەم دەکات، {لەو هەقەی شایستەیەتی}، چ لە پێوان دابێ، یاخود لە کێشان دا.

د- (**الزَّجَّاجُ**)یش یەکێکە لە شارەزایانی زمان و دەڵێ: (**إِنَّمَا قِيلَ لِلَّذِي يَنْقُصُ المِكْيَالَ وَالمِيزَانَ مُطَفِّفٌ، لِأَنَّهُ لَا يَكَادُ يَسْرِقُ فِي المِكْيَالِ وَالْمِيزَانِ إِلَّا الشَّيْءَ اليَسِيرَ الطَّفِيفَ**)، واتە: بۆیە بەو کەسەی لە کێشان و پێوان دا کەم دەدات، {واتە: بۆ بەرامبەرەکەی مافەکەی کەم دەکاتەوە}، پێی گوتراوە: (**مُطَفِّف**)، چونکە ئەو کەسەی لە کێشان و پێوان دا دزیی دەکات، شتێکی کەم لە مافی خەڵك بۆ خۆی دێنێ.

لێرەدا کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴾، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشی دا باسمان کرد، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: خەڵکی مەدینە لە کێشان و پێواندا فێڵ و کەم و کوڕییان زۆر بووە، بەڵکو هەیانبووە، وەك: (جوهەینە)، دوو دەفری هەبوون، یەکێکیانی بۆ ئەوە بووە پێی بفرۆشێ و گچکەتر بووە لەوی دیکە، کە پێی بکڕێ و ئەو گەورەتر بووە، خواش ﷻ سزای سەختی بۆ داناون، بۆ هەموو ئەوانەی کەم دەکەن لە کڕین و فرۆشتنداو، کاتێك دەدەن بە خەڵك، مافەکەیان لێ کەم دەکەنەوە.

٢)- ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ﴾، ئەوانەی کاتێك لە خەڵك بپێون، {لێیان بکڕن و خەڵکەکە بۆیان بپێون}، بە تەواویی مافی خۆیان وەردەگرن.

٣)- ﴿ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ﴾، بەڵام ئەگەر بۆیان بپێون، یاخود بۆیان بکێشن، کەم دەکەنەوە، واتە: لە کاتێکدا خۆیان بکڕن، بە کێشان بێ یان بە پێوان، بە تەواویی مافی خۆیان وەردەگرن، بەڵام ئەگەر بفرۆشن بە کێشان بێ، یان بە پێوان، کەم دەکەنەوە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، أ- هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (**عَلَى بمعنى مِنْ أي: اشتروهُ لأنفسهم كيلاً أو وزناً من الناس**)، (**على**) بە مانای (**مِن**)ە، یانی: کاتێك لە خەڵك دەکڕن بە کێشان یان بە پێوان.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، (**إكتَالَ عَلَيْهِ أي: أَخَذَ مِنْهُ**)، واتە: لێی وەرگرت، ﴿ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ ﴾، (**أي: كَالُو لَهُم، أَو وَزَنُوا لَهُمْ**)، کاتێك بۆیان پێوان، یان بۆیان کێشان، مافەکەیان لێیان کەم دەکەنەوە.

وشەی: (**کَیل**)، بە کوردیی پێی دەگوترێ: پێوان، بۆ وێنە: دەفرێك – وەك تەنەکە دەغڵێکی تێدەکرێ، چ پڕ بێ، چ پڕ نەبێ، بەڵام کێشان (**وَزْن**) ئەوەیە لایەکی تەرازووەکە تا تەرازووێك قورساییەکی تێدا بێ و، لایەکی دیکەش تا تەرازووەکەی دیکە ئەو شتەی تێدابێ کە دەویسترێ بکێشرێ، ئەگەر کیلۆیەکە،

ئەگەر دوو کیلۆیە، سەدە... هتد، ئەو شتەی دیکەش کە دەویسترێ کێشەکەی بزانرێ چەندە؟ لە تای تەرازووی بەرانبەریدا دادەنرێ و پێك هەڵدەسەنگێنرێن.

وشەی: ﴿يَسْتَوْفُونَ﴾، (إسْتَوْفَى أي: أَخَذَ حَقَّهُ وَافِيَاً تَمَامَاً)، مافی خۆی بە تەواویی وەرگرت.

وشەی: ﴿اكْتَالُوا﴾، (إفْتِعَال مِنَ الكَيْلِ يُسْتَعَمَلُ فِي تَسَلُّمِ ما يُكال)، (إكتيال): لەسەر کێشی (إفتعال)ە، {لە وشەی: (کیل)ەوە هاتوە {(کیل)، واتە: پێوان}، بەکاردەهێنرێ بۆ وەرگرتنی ئەوەی دەپێورێ، (إكتال)، واتە: ئەوەی پێوراوە، وەریگرت، یانی: کڕی.

٤)- ﴿أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ﴾، ئایا ئەوانە پێیان وانیە، ئەوان بۆ ڕۆژێکی مەزن هەڵسێنراوەن، زیندووکراوەن (لە لایەن خوای پەروەردگارەوە)؟!.

٥)- ﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، ڕۆژێك کە خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانییان هەڵدەستن، ڕادەوەستن.

بۆ واتای وشەی: (ظنّ) لێرەدا:

أ- هەندێك گوتوویانە: (الظن: العِلْم)، (ظن) یانی: زانین، ﴿أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ﴾، یانی: (ألاَ يَعْلَمُ أُولَٰئِكَ )، ئایا ئەوانە نازانن، کە زیندوو کراوەو هەڵسێنراوەن بۆ ڕۆژێکی مەزن.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: وشەی (ظن)، لێرەدا هەر لەسەر مانا ئەسڵییەکەی خۆیەتی، واتە: گومان و پێوابوون، یانی: ئایا ئەوانە پێیان وانیە، گومانیان وانیە، کە زیندووکراوەن بۆ ڕۆژێکی مەزن؟ ڕۆژە مەزنەکەش ئاوا پێناسە دەکات: ﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، ڕۆژێك کە خەڵك هەڵدەستن، ڕادەوەستن بۆ پەروەردگاری جیهانییان، (ل)ی سەر ﴿لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، پێی دەگوترێ: (لام للأجل)، (لامی لە پێناودا، لەبەر خاتری)، چونکە خوا ﷻ فەرمانیان پێ دەکات، ڕادەوەستن و ئەوانیش بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی وی ڕادەوەستن.

لێرەدا کە خوای بەرز ئاوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ ﴾، ئەوە پرسیارکردنی سەرسوڕماندنە، یانی: شتێکی سەیرو عەجایبە، کە نەزانن ڕۆژێك دێ، ئەوانە تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، ئەو ڕۆژەی خەڵك هەموو ڕادەوەستن و ڕادەگیرێن بۆ پەروەردگاری جیهانییان، واتە: ئەگەر ئەوان ئیمانیان بەو ڕۆژە بێ، بە ڕاوەستانیان لەو ڕۆژەدا، وەك چاوەڕوانییان بۆ بڕیاری پەروەردگاری جیهانییان، بەو شێوەیە لە کێشان و پێواندا، فرت و فێڵ ناکەن و مافی خەڵك ناخۆن.

لە بارەی ڕاوەستانی خەڵکەوە لەو ڕۆژەدا بۆ خوای پەروەردگار، ئەم سێ دەقە دێنین:

**١- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، حَتَّى يَغِيبَ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ} (أخرجه البخاري: ٦١٦٦، والترمذي: ٣٣٣٦، وغيرهما).**

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، دوایی فەرمووی: یەکێك لە مرۆڤان لە ئارەقی خۆیدا، ون دەبێ تاکو نیوەی گوێیەکانی. (تاکو لای زارو چەناگەی دەکەوێتە ئارەق و گەرمایی جەستەیەوە).

**٢- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ بِكُمْ إِذَا جَمَعَكُمُ اللَّهُ كَمَا يُجْمَعُ النَّبْلُ فِي الْكِنَانَةِ، خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ لَا يَنْظُرُ إِلَيْكُمْ} (أخرجه الحاكم: ٨٧٠٧، وقال: هذا حديث صحيح الإسناد، ولم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: حديث صحيح، قال الهيثمي (١٣٥/٧): رواه الطبراني ورجاله ثقات، وأخرجه أيضا: الديلمي (٢٩٣/٣ ، رقم ٤٨٧٧)).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنهما، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ {ئەم ئایەتەی موبارەکەی خوێندەوە: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ دوایی} فەرمووی: چی دەبێ کاتێك خوا وەك تیر لە تیرداندا کۆ دەکرێنەوە، ئاوا کۆتان دەکاتەوە، پەنجا هەزار ساڵ تەماشاتان ناکات.

بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە ئەو پەنجا هەزار ساڵە بۆ بڕواداران بە ئەندازەی نوێژێکی فەڕزە کە دەیکەن، بەس ئەوەندەی پێدەچێ، وەك پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (المعارج)دا کە باسی ئەو پەنجا هەزار ساڵە دەکات، باسمان کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ۝٤﴾، ئنجا بە پێی ئەو فەرمووودەیە، ئەو پەنجا هەزار ساڵە مەبەستی پێ ڕۆژی دواییە، کاتێك خەڵك کۆ دەکرێتەوەو سزاو پاداشتیان بۆ دیاری دەکرێ، هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە:

**٢)- {عَنْ سُمَيْرِ بنِ نَهَارٍ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُسْلِمِينَ الجَنَّةَ قَبْلَ الْأَغْنِيَاءِ، بِمِقْدَارِ نِصْفِ يَوْمٍ، قُلْتُ: وَمَا مِقْدَارُ نِصْفِ يَوْمٍ؟ قَالَ: أَوَ مَا تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قُلْتُ: بَلَى قَالَ: وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ} (أخرجه ابن حبان: ٧٣٣٣، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط البخاري).**

واتە: سومەیری کوڕی نەهار دەڵێ: ئەبوو هویرەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: مسوڵمانانی هەژار پێش دەوڵەمەندەکانان دەچنە بەهەشت بە ئەندازەی نیو ڕۆژ، گوتم: نیو ڕۆژە چەندە؟ گوتی: ئایا قورئان ناخوێنی؟ گوتم: با، گوتی: ڕۆژێك لە لای پەروەردگارت وەك هەزار ساڵە لەوەی دەیژمێرن.

## مەسەلەی دووەم:

**باسی تاوانباران کە نووسراوەکەیان لە (سِجِّين)دایەو، نووسراوێکە نیشانەدار کراوەو، لەو ڕۆژەشدا سزای دژوار بۆ بەدرۆ دانەرانی ڕۆژی سزاو پاداشتە، کە تەنیا سنوورشکێنانی گوناهکار بەو ڕۆژە بێبڕوان، کە بە ئایەتەکانی خوا دەڵێن: ئەفسانەی پێشووانن، کردەوە خراپەکانیان ژەنگیان لەسەر دڵیان پەیداکردووەو، سەرەنجام لە دیداری خوا پەردە پۆش کراون و، دوایی دەخرێنە کڵپەی دۆزەخەوەو، پێشیان دەگوترێ: ئەوە بوو کە بە درۆتان دادەنا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ﴾، نەخێر (با وازبێنن) نووسراوی خراپەکاران لە **(سجين)** دایە، لە ئایەتەکانی پێشێدا خوا ﷻ باسی کەسانێکی کرد، کە لە کێشان و پێوان دا، فێڵ و فەرەج دەکەن و مافی خەڵك بە تەواویی نادەن، پێچەوانەی ئەوەی کاتێك بۆ خۆیان دەکڕن، بە کێشان، یان بە پێوان، مافی خۆیان بە تەواویی وەردەگرن، ئنجا خوا ﷻ فەرمووی: ئەوانە سزای سەختیان بۆ هەیە، ئایا ئەوانە نازانن، یان پێیان وانیە کە زیندووکراوەن و هەڵسێنراوەن بۆ ڕۆژێکی مەزن، ئەو ڕۆژەی کە خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانییان ڕادەگیرێ و ڕادەوەستێنرێن، چاوەڕێ دەکەن: خوا چ بڕیارێکیان بۆ دەدا، ئنجا لەم ئایەتە موبارەکانەدا باسی: خراپەکاران ﴿ٱلْفُجَّارِ﴾مان بۆ دەکات، تاوانباران کە دەگونجێ مەبەست هەر ئەو کەسانە بێ، کە لە کڕین و فرۆشتن دا فرت

و فێڵ و فەرەج دەکەن، لە کاتی کێشان و پێوان دا، کە بۆ خەڵك دەکێشن و دەپێون، دەشگونجێ مەبەست ئەوانیش و جگە لەوانیش بێ و، ئەوەی دووەمیان زیاتر پێ دەچێ، چونکە خوا ﷻ بە گشتیی دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ ﴾، با وازبێنن لە تەرازووبازیی، واز بێنن لە فرت و فێڵ لە کێشان و پێوان بۆ خەڵکدا، یان ڕاست نیە، ئەوە کە ئێوە دەڵێن: هەڵناستێنرێینەوەو زیندوو ناکرێینەوەو لێمان ناپرسرێتەوەو، سزاو پاداشت لە ئارادا نیە، وانیە وەك ئەوان دەڵێن و، با وازبێنن لەو جۆرە قەناعەتە هەڵەیە، ﴿إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ﴾، بە دڵنیایی نووسراوی تاوانباران لە ﴿ سِجِّينٍ ﴾دایە، وشەی: ﴿ كَلَّآ ﴾، زۆرجار گوتوومانە: قسەیەکە بۆ هەڵوەشاندنەوەو تێوەخوڕین و سەرزەنشتکردن، ئەوەی لێرەشدا هەڵوەشێنراوەتەوە زیاتر وا پێدەچێ نێوەڕۆکی ئەم ڕستەیە بێ: ﴿ أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: با وانەزانن کە زیندوو ناکرێنەوەو هەڵناسێنرێنەوە بۆ ڕۆژێکی مەزن، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ: با وازبێنن لە فرت و فێڵ لە کێشان و پێواندا، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ ئەوە بێ کە نکووڵییان کردوە، لە زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت، چونکە مرۆڤ کە نکووڵیی لە ڕۆژی دوایی و لە قیامەت کرد، ئەو لادان و تاوان و خراپانە هەموویان ڕێیان بۆ تەخت و ئاچووغ دەبێ لەو مرۆڤە دا، وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**القيامة**)دا باسمان کرد: ﴿ بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ ﴾، بەڵکو مرۆڤ (ی بێبڕوا) دەیەوێ هەر بە گوناهو تاوان بیداتە بەر، (وەك هەتا ئێستا بە گوناه هێناویەتی، لەسەر گوناح بەردەوام بێ لەوەو دواش، بۆیە) دەپرسێ: ڕۆژی قیامەت کەنگێیە؟

وشەی: ﴿ ٱلْفُجَّارِ ﴾، کۆی (**فاجر**)ە، یانی: تاوانبار، یان کەسێك زۆر گوناهان بکات، وشەو ناوێکە زاڵ بووە بەسەر هاوبەش بۆ خوادانەرەکانداو، هەر کەسێکی دیکەش دوای ئەوەی دەشبیستێ و دەزانێ، خوا قەدەغەی کردوە، فرت و فێڵ بکرێ لە کێشان و پێواندا، هەر لەسەری بەردەوام دەبێ، ئەوانەش دەگرێتەوە.

﴿ سِجِّينٍ ﴾، وشەیەکە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەکاری هێناوەو، زانایان زۆریان قسە لەبارەوە کردوە، بەڵام بە پێی ئەوەی خوا ﷻ دەفەرموێ:

نـووسراوی تاوانبـاران لـە: ﴿ سِجِّينٍ ﴾ە، دواییـش دەفەرمـوێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ﴾، نـووسراوی چاکـەکاران لـە ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾ە، ئەویـش خـودی بێـژە (لفـظ) ەکـەی دەلالـەت لەسـەر نێـوەڕۆك و واتایەکـەی دەکات، واتـە: لەسـەرێ، کەواتـە: ﴿ سِجِّينٍ ﴾، دەبـێ لـە خـوارێ بێ و، شـتێکی مسـۆگەرە کـە ﴿ سِجِّينٍ ﴾، لە خـوارەوەی دروسـت کراوەکانـی خـوای بـەرزو باڵادەسـتە.

هەڵبەتـە ئێمـە دەزانیـن کـە ئێسـتا خـواروو و سـەروو، شـتێکی ڕێژەییـن و بـە نسـبەت ئێمـەوە، لای پێیەکانمـان کـە زەوی ڕاماندەکێشـێ، دەبێتـە خـوارێ و، لای پێچەوانـەی پێیەکانمـان، لای سـەرەوەمان دەبێتـە سـەرێ، بـەڵام بێگومـان کـە خـوا ﷻ لـە قوڕئانـدا باسـی سـەرو خـوار دەکات، لـە دروسـتکراوانی خـوای زانـاو توانـاداو، لـەو گەردوونـەدا کـە ئێسـتا هەیـە، دواییـش لـەو عالەمـەدا کـە خـوا دەیخوڵقێنـێ و دەیهێنێتـە پێـش، بـۆ ڕۆژی سـزاو پاداشـت، دیـارە سـەرێ و خوارێـی هەیـە، هەرچەنـدە ئێسـتاش ئێمـە نەزانیـن چۆنـە؟ چونکـە بـە دڵنیایـی ئـەو عالەمـەی ئـەو کاتـە دروسـت دەکرێتـەوە، جیایـە لـەوەی ئێسـتا، وەك خـوای بـێ وێنـەو تـاك لـە سـوورەتی (إبراهیـم)دا دەفەرمـوێ: ﴿ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژەی زەوی جیـا لـەم زەوییـە دەبـێ و ئاسـمانەکانیش جیـا لـەم ئاسـمانانەی ئێسـتا دەبـن و، هەموویـان بـۆ خـوای تاکـی مـل پێکەچکـەر دێنـە گـۆڕێ.

٢)- ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ﴾، ئایا چی بە تۆی زاناندوە ﴿ سِجِّينٍ ﴾، چییە؟ لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ ﴾، چی شتێك بە تۆی زاناندوە، چ شتێك وای لە تۆ کردوە بزانی: ﴿ سِجِّينٍ ﴾ چییە؟ ئەوە بۆ بە زەبەلاح و مەزن پێشاندانی ﴿ سِجِّينٍ ﴾ە، واتە: شتێکی هێندە گەورەو گرنگە، هێندە زەبەلاح و بێڕەزایە، ئەگەر خوا پێت نەفەرموێ، خۆت نازانی چییە؟ چ دوێنراو **(مخاطب)** موحەممەد ﷺ بێ، چ هەر کەسێکی دیکە بێ.

دوایی خوا بۆ خۆی پێناسەی دەکات و دەفەرموێ:

٣)- ﴿ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴾، نووسراوێکی نیشانەدار کراوە، (کتاب)، یانی: (مکتوب)، نووسراو.

کە دەفەرموێ: ﴿ مَّرۡقُومٞ ﴾، أ- بە مانای نیشانەدار کراو دێ و، ب- بە مانای شتی چنراوو، ج- بە مانای نووسینی درشت و زەقیش دێ.

بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴾، نووسراوێکە بە نووسینێکی زۆر ڕوون نووسراوەو، وەك ئەو نیشانانە وایە کە لە پۆشاکێکدا دەچێنرێن.

کەواتە: ﴿ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴾، یانی: نووسراوێکی نیشانەدار کراوی زانراو، بە جۆرێك کە کەسەکان بە هۆیەوە دەناسرێن و، هەر کامیان لەوانی دیکە جیا دەکرێتەوە.

٤)- ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت، یاخود هاوار، یان سەختترین سزا، بۆ بە درۆ دانەران، چی بە درۆ دادەنێن؟.

٥)- ﴿ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾، ئەوانەی ڕۆژی سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن.

٦)- ﴿ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ﴾، هیچ کەسیش ئەو (ڕۆژی سزاو پاداشت)ە، بە درۆ دانانێ، مەگەر هەر سنوورشکێنێکی زۆر گوناهکار.

﴿ مُعۡتَدٍ ﴾: (**الإعْتِدَاءُ: تَجَاوزُ الحَدِّ مَعَ اللهِ وَالرَّسُولِ وَالنَّاس**)، (**إعتداء**) سنوور شکاندنە لە مامەڵە لەگەڵ خواو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵ خەڵکدا.

﴿ أَثِيمٍ ﴾، واتە: زۆر گوناهکار، ڕێژگەی زێدەڕۆیی (آثم)ە، واتە: گوناهکار ﴿ أَثِيمٍ ﴾یش، واتە: زۆر گوناهکار.

٧)- ﴿ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێنەوە، دەڵێ: ئەفسانەکانی پێشینانە.

(**آیاتنا**) مەبەست پێی ئایەتەکانی قورئانە، بۆیە دەفەرموێ: بخوێنرێنەوە، ئەگەرنا وشەی: (**آیات**)، وەك چۆن بە مانای ڕستەکانی قورئان دێ، بە مانای بەڵگەو موعجیزەکانی پێغەمبەرانیش دێ و، بە مانای دیاردەو دیمەنەکانی بوونەوەرو دەوروبەریش دێ.

﴿ قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، دەڵێ: ئەفسانەی پێشینانە، ﴿ قَالَ ﴾، یانی: گوتی، بەڵام ﴿ إِذَا ﴾، کە جێبووەوەی کات (**ظرف الزمان**)ە، کە بەکاردەهێنرێ بۆ کردەوەیەك شتێکی تێدا ڕوودابێ، ئەگەر ڕابردووش بێ، مانایەکەی دەکات بە ئێستاو داهاتوو: کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێنرێنەوە: ﴿ قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، دەڵێ: ئەفسانەی پێشینانە، ﴿ أَسَٰطِيرُ ﴾، (**جَمْعُ أَسْطُورَة، وهي القِصَّةُ، وَالأَكْثَرُ عَلَى أَنَّ المرَادَ: القِصَّة المختَرَعَة الَّتِي لَمْ تَقَع**)، ﴿ أَسَٰطِيرُ ﴾، کۆی (**أسطورة**)یە، ئەویش بە مانای بەسەرهات و چیرۆك دێ، بەڵام زیاتر (زانایان ڕایان وایە) مەبەست ئەو چیرۆکەیە، هەڵبەستراوەو ڕووی نەداوە، یانی: شتێکی هەڵبەستراوە، خوای بەرزیش دەفەرموێ:

٨)- ﴿ كَلَّا ﴾، ڕاست نیە، وەك ئەوان دەڵێن، یاخود: با وازبێنن لەو بێبڕواییە.

٩)- ﴿ بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، بەڵکو ئەوەی ئەنجامی دەدەن لە کردەوە (خراپە)کانیان، ژەنگی لەسەر دڵیان پەیداکردوە.

﴿ بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم ﴾، (حفص) و هەندێك لە قوڕئان خوێنەکان وایان خوێندۆتەوە، کە: ﴿ بَلْ ﴾ و ﴿ رَانَ ﴾، لێك دەپچڕێن، بەڵام زۆربەیان ئاوایان خوێندۆتەوە: (**كَلَّا بَرَّان عَلَى قُلُوبِهِم**)، لە ڕاستییدا خوێندنەوەی دووەمیشیان خۆشترە لەسەر زمان، واتە: باواز بێنن، یان وانیە، وەك ئەوان دەڵێن، بەڵکو کردەوەکانیان ژەنگیان لەسەر دڵیان پەیدا کردوەو، کاتێك بە دڵی ژەنگاوییەوە تەماشای ئایەتەکانی خوا دەکەن، وایان دێنە بەرچاو کە ئەفسانەی پێشینانن، دڵەکەیان ئەو حاڵەتی سپیی و ڕۆشنیەی نەماوە، کە شتەکان وەك خۆیان ببینێ، وەك چۆن ئاوێنەیەك تۆزو خۆڵی دەکەوێتە سەر، ئەگەر وێنەیەکی بەرامبەری بخرێتە سەر، وەك خۆی پێشانی نادات، لەبەر تۆزو خۆڵەکە، دڵی ئەوانەش ژەنگی لێنیشتوە، بۆیە ئایەتەکانی خوا وەك خۆیان نابینن، وشەی: ﴿ رَانَ ﴾، (**الرَّين: الصَّدَءُ الَّذِي يَعْلُو الحَدِيدَ**)، (**رَيْن**)، ئەو ژەنگەیە لەسەر ئاسن دەنیشێ، ﴿ رَانَ ﴾ کرداری ڕابردووە، (**مِثْلُ عَيْب وعاب**)، (**عیب**)، کەم و کوڕیی، ناوەو (**عاب**)ش کرداری تێپەڕیوە، یانی: کردەوە خراپەکانیان دڵی داپۆشیون کە تێگەیشتن لە قوڕئانی بچێتەتێ.

١٠)- ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴾، با وازبێنن، (یاخود: ڕاست نیە، وەك ئەوان دەڵێن)، بە دڵنیایی ئەوان لەو ڕۆژەدا لە پەروەردگاریان پەردە پۆش کراون، (**الحَجْبُ: السَّتْرُ، وَيُسْتَعْمَلُ عَلَى المنْعِ مِنَ الحُضُورِ لَدَى المَلِكِ**)، وشەی (**حَجْب**) بە مانای پۆشین دێ و، دوایی بەکاردێ بۆ ڕێگرتن لە ئامادە بوون لە لای حوکمڕان، واتە: ئەوانە پەردە پۆش دەکرێن و ڕێگا نادرێن پەروەردگاریان ببینن.

١١)- ﴿ ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، دواییش بە دڵنیایی ئەوان بە شێوەیەکی تایبەت خراوەوە نێو کڵپەی دۆزەخن.

وشەی: ﴿ ثُمَّ ﴾، (**للتراخي الرُّتبيِّ**)، بۆ بە دوای یەکداهاتنی پلە پلەییە.

وشەی: (**صلي**)، ئەوەیە شتێك گەرمایی ئاگری بگاتێ بە شێوەیەکی تایبەت، وەك زۆر جار باسمان کردوە (**صلي**) ئەوە نیە هەر بسووتێ و هیچی دیکە، بەڵکو ئەوەیە لە هەر چوار دەورەوە تینی ئاگری بگاتێ و بپیشێ، یاخود ببرژێ، یانی: ئەوانە بەو شێوەیە دەخرێنە نێو کڵپەی دۆزەخەوە.

١٢)- ﴿ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾، دوایی دەگوترێ: (بەوان دەگوترێ)، ئەمە ئەوە بوو ئێوە پێی بێبڕوا بوون و بە درۆتان دادەنا.

زانایان لە بارەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەوە زۆریان قسە کردوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ١٥ ﴾، با واز بێنن، بەڵکو کردەوە خراپەکانیان کە دەیانکەن، ژەنگیان لەسەر دڵیان پەیدا کردوە، با واز بێنن، ئەوان لەو ڕۆژەدا لە پەروەردگاریان پەردە پۆش دەکرێن:

أ- هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴾، با واز بێنن ئەوان لەو ڕۆژەدا لە پەروەردگاریان پەردە پۆش دەکرێن، مەبەست ئەوەیە: پەروەردگاریان لوتفیان لەگەڵ نانوێنێ و ڕێزیان ناگرێ و پاداشتیان ناداتەوە.

**ب-** هەندێکیش گوتوویانە: بەڵکو مەبەست ئەوەیە پەروەردگاریان نابینن و بە دیداری شاد نابن.

**(الطبري)** لەو بارەوە دەڵێ: (**فَالصَّوَابُ أَنْ يُقَالَ: هُمْ مَحْجُوبُونَ عَنْ رُؤْيَتِهِ، وَعَنْ كَرَامَتِهِ، إِذْ كَانَ الخَبَرُ عَامًّا، لَا دَلَالَةَ عَلَى خُصُوصِهِ**)، واتە: نزیکترینی قسەکان لە ڕاستییەوە ئەوەیە بگوترێ: ئەوانە پەردە پۆش دەکرێن، لە دیتنی خواو لە ڕێز لێگرتنی خوا، چونکە خوا ﷻ بە گشتیی وای فەرمووەو، هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر تایبەتکردنی بە شتێکەوە، جیا لە شتەکانی دیکە، (کە مەبەستی پێ بینینە)، کەواتە: بێبڕوایان پەردە پۆش دەکرێن، لە ڕێز لێگرتنی خواو، لە دیتنی خواو، بە دیدار شادبوونی خوا، لە هەموو شتێك پەردە پۆش دەکرێن.

لە بارەی ئەو ڕستەیەی پێشەوەش: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾، سەرەتا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین، کە زۆربەی تەفسیرەکان هێناویانە:

**أ-** {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ الله ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ، صُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا، حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللهُ: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾المطففين»**} (**أخرجه التِّرمِذِيُّ: ٣٣٣٤، وقال حديث صحيح، وَحَسَّنَهُ الألباني في «صحيح الترغيب والترهيب»: ٢٤٦٩**).

واتە: ئەبوو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك بەندە گوناهێکی کرد، خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ، ئنجا ئەگەر وازی لێ هێناو داوای لێبوردنی کردو، گەڕایەوە (بۆ لای خوا) و، تۆبەی کرد، دڵی سپیی دەبێتەوە، ئەگەر گوناهەکانیشی بەردەوام بوون، خاڵە ڕەشەکان زیاد دەکەن، هەتا دەبێتە ژەنگ بەسەر دڵیەوەو تەواو کەمرەی لەسەر دەبەستێ و ئەوەیە کە خوا **عزّوجل** باسی فەرموە: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم

﴿مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ المطففين، واتـە: نەخێـر ڕاسـت ناکـەن، بەڵکـو دڵیـان بـە هـۆی گوناهەکانیانـەوە، کەمـڕەی بەسـتوەو ژەنگـی هێنـاوەو داخـراوە.

**ب-** هەر لەو بارەوە لە (**الحسن البصري**)يەوە (**الطبري**) بە ژمارە: (٣٦٧٤٠)، هێناویەتی: (**الذَّنْبُ عَلَى الذَّنْبِ، حَتَّى يَعْمَى الْقَلْبُ فَيَمُوتَ**)، واتە: گوناح لە دوای گوناح، تاکو دڵەکە کوێر دەبێ و یەکجاریی دەمرێ.

**ج-** هەر (**الطبري**) بە ژمارە: (٣٦٧٤٢)، ئەم دەقەشی هێناوە: (**عَنِ الْأَعْمَشِ، قَالَ: أَرَانَا مُجَاهِدٌ بِيَدِهِ، قَالَ، كَانُوا يَرَوْنَ الْقَلْبَ فِي مِثْلِ هَذَا، يَعْنِي الْكَفَّ، فَإِذَا أَذْنَبَ العَبْدُ ذَنْبًا ضُمَّ مِنْهُ، وَقَالَ بِأُصْبُعِهِ الْخِنْصَرِ هَكَذَا، فَإِذَا أَذْنَبَ ضَمَّ أُصْبُعًا أُخْرَى، فَإِذَا أَذْنَبَ ضَمَّ أُصْبُعاً أُخْرَى، حَتَّى ضَمَّ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا، ثُمَّ يُطْبَعُ عَلَيْهِ بِطَابَعٍ، قَالَ مُجَاهِدٌ: وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ ذَلِكَ الرَّيْنُ**).

واتـە: ئەعمـەش (کـە یەکێکـە لـە زانایانـی شـوێنکەوتووان، جیلـی دوای هـاوەڵان ڕەزاو ڕەحمەتـی خـوا لـە هەموویـان بـێ)، دەڵـێ: موجاهیـد بە دەسـتی خۆی پێشـانی دایـن، (ئـەو ژەنـگ لـێ نیشـتنەی دڵ چۆنـەو)، گوتـی: زانایـان پێیـان وابـووە دڵ بـەم شـێوەیە، وەك لەپـە دەسـتی مـرۆڤ، کاتێـك بەنـدە گوناهێـك دەکات، هەندێکـی لـێ دێتـەوە یـەك، ئنجـا پەنجـەی گچکـەی هێنایەوەیـەك، ئەگـەر گوناهێکـی دیکـەی کـرد، پەنجەیەکـی دیکەشـی هێنایـەوە لای لەپـە دەسـتی، ئەگـەر گوناهێکـی دیکـەی کـرد، پەنجەیەکـی دیکەشـی هێنایـەوە یـەك، هەتـا هـەر پێنـج پەنجـەکانی بـە لەپـە دەسـتیەوە نووسـاندن، دواییـش بـە مۆرکردنێـك مـۆر دەکـرێ، موجاهیـد گوتـی: پێیـان وابـووە مەبەسـت لـەو مـۆر کردنـە، ئـەو ژەنگەیـە لەسـەری دەنیشـێ (ڕێـی وەرگرتنی هیدایەتـی خـوای پـەروەردگاری لـێ دەگـرێ).

کورتـەو پوختـەی واتـای ئـەم ئایەتـە موبارەکانـەی، خـوا ﷻ باسـی تاوانبارانـی تێـدا کـردن، ئەوەیـە: نـووسراوی تاوانبـاران لـە: ﴿سِجِّينٍ﴾ە، کـە هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: {(سـجين): (**الأرض السَّـابعة السُّـفْلَى**)، چینـی حەوتەمینـی ژێـرەوەی زەوییـە.

ئنجا خـوا ﷻ پێناسـەی ﴿ سِجِّينٍ ﴾ی کـرد، کـە نووسراوێکـی نیشـانەدار کـراوەو، باسـی ئـەوەی کـرد کـە سـزای سـەخت بۆ بـە درۆ دانـەران، ئەوانـەی بڕوایان بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت نیـە، دوایـی خـوا ﷻ ڕایگەیانـد: تەنیـا ئەوانـە بڕوایـان بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت نیـە، کـە زۆر سـنوور بەزێـن و زۆر گوناهـکارن، بابـای گوناحـکاری سـنوور شـکێن، خـوا ﷻ خوایەتـی قیامـەت هـەر نەبـێ و لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشـت هـەر نەبـێ، ئـەو کەسـەی کاتێـك ئایەتەکانـی ئێمـەی بەسـەردا دەخوێنرێنـەوە، دەڵـێ: ئەمانـە ئەفسـانەی پێشـینانن، خـوای پەروەردگاریـش دەفەرمـوێ: نەخێـر بەڵکـو کـردەوە خراپەکانیـان ژەنگیـان لەسـەر دڵیـان پەیـدا کـردوون و، دڵیـان ژەنگاویـی بـووەو بـەو دڵـە ژەنگاوییـەوە ئـەو ئایەتانـەی خـوا وەك خۆیـان نابینیـن.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: بـا وازبێنـن ئەوانـە لـە ڕۆژی دواییـدا لـە پەروەردگاریـان پـەردە پـۆش دەکرێـن، واتـە: بـێ بـەش دەکرێـن لـە دیـداری پەروەردگاریـان و، بـێ بـەش دەکرێـن لـە پاداشـتی پەروەردگاریـان و لـە ڕێـز لێگرتنـی پەروەردگاریـان، ئنجا دوای ئـەوە دەخرێنـە دۆزەخـەوەو، بـە شـێوەیەکی تایبـەت دەسـووتێنرێن و پێشـیان دەگوتـرێ: ئەمـە بـوو ئێـوە پێـی بێبـڕوا بـوون و بـە درۆتـان دادەنـا!

کەواتـە: کـردەوە خراپـەکان دەبنـە هـۆی پەیدابوونـی ژەنـگ لەسـەر دڵ و، ئـەو ژەنـگ هێنانـەی دڵیـش دەبێتـە هـۆی بـڕوا نەهێنـان بـە ئایەتەکانـی خـواو، ئەویـش دەبێتـە هـۆی پـەردە پۆشـکران لـە دیـداری خـوا، ئنجـا دەخرێنـە دۆزەخـەوە.

خـوای میهرەبـان پەنامـان بـدات و، لـەو کەسانەشـمان بگێـڕێ کە بەهـۆی ئیمانەوە هەمیشـە دڵیـان ڕوونـاك و پرشـنگدار دەبـێ و، ئایەتەکانـی خـوای پەروەردگاریـش، وەك بـۆ ئایەتـەکان شایسـتەیە، ئـاوا دەیانبینیـن و لێیـان تێدەگەیـن.

**مەلەسەی سێیەم:**

**باسی لە: ﴿عِلِّيِّينَ﴾ بوونی نووسراوی چاکەکاران، کە نووسراوێکی نیشانەدار کراوەو، فریشتە زۆر لە خوا نیزیکخراوەکان دەیبینن و، باسی چاکەکارانیش کە لە نێو نازو نیعمەتدان و، لەسەر تەختان تەماشا دەکەن و، گەشیی و شادمانییان پێوە دیارەو، لە شیلەی سەر بەستراو کە کۆتاییەکەی میسکە، دەیاندرێتێ و، هەر ئەوەش شایستەی پێشبڕکە تێدا کردنەو، خواردنەوەکەیان لە تەسنیمی تێکەڵ دەکرێ، کە کانییەکە زۆر لە خوا نیزیکخراوان بە ڕووتیی و بێ ئەوەی هیچی لەگەڵ تێکەڵ بکرێ، لێی دەخۆنەوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١- ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ﴾، نەخێر (با وازبێنن) نووسراوی چاکەکاران لە (**عِلِّيين**)ە، وەك زۆرجار گوتوومانە: ﴿كَلَّآ﴾(**كلمة ردع وزجر وإبطال**)، لێرەدا (كلاّ): (**الردّع والزّجر عمّا كانوا عليه**)، (كلاّ) بۆ تێخوڕین و دوورخستنەوەیانە لەوەی لەسەری بوون، واتە: واز بێنن لەوەی لەسەرینی، یاخود: واز لەو جۆرە قسانە بێنن.

دەشگونجێ لێرەدا: ﴿كَلَّآ﴾، بە مانای (حَقًّا) بێ، واتە: بەڕاستیی، ﴿إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ﴾، بە دڵنیایی نووسراوی چاکەکاران لە ﴿عِلِّيِّينَ﴾ە، ﴿ٱلْأَبْرَارِ﴾، کۆی (بارّ)، یان (بَرّ)ەو هەردووکیان، یانی: (**الَّذي يَفْعَلُ الخَيْرَ**)، ئەو کەسەی چاکە دەکات، هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: (بَرَرَة)، کۆی (بَرّ)ەو،

﴿ ٱلْأَبْرَارِ ﴾، كـۆی (بـارّ)ە، هەندێكیـش گوتوویانــە: هەردووكیـان كـۆی هــەردوو ناوەكـەن.

٢)- ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانандوە، ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾ چییە؟ لە بارەی ﴿ سِجِّينٍ ﴾ەوە، زانایان هیچ ڕا جیاییان نیە كە یەك وشەیەو تەواو و نەیانگوتوە: كۆیە وەك (عِلِّيين)، بەڵكو وشەیەكەو ناوێكە بۆ شوێنێكی زۆر نزم كە لە خوارەوەی دروستكراوەكانی خوایەو، لیستی (نووسراو)ی بێبڕوایان لەوێدایە.

بەڵام بە نسبەت ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾ەوە زانایان دوو ڕایان هەن:

أ- هەندێكیان گوتوویانە: ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾، كۆی (عِلِّي)یە، یانی: ئەو كەسەی پاڵدەدرێتە لای بەرزیی.

ب- (الفَرّاء)، دەڵێ: ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾، (**عَلَمٌ عَلَى مَكَانِ الأَبْرَارِ لاَ وَاحِدَ لَهُ، فَلَيْسَ جَمْعاً**)، واتە: ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾، هەمووی ناوێكە بۆ شوێنی چاكەكاران (شوێنی لیستی كردەوەی چاكەكاران) و تاكی نیە لە خۆی و خۆیشی كۆ نیە، بەڵكو هەر ناوێكی ناسێنەر (عَلَم)ە.

هــەردوو ڕایــەكان هــەن، بــەڵام ڕای یەكەمیــان لــە ڕاســتییەوە نیزیكــترە، كــە ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾، كـۆی (عِـلِّي) بـێ، خـوا دەفەرمـوێ: چ شـتێك بەتۆی زانانـدوە ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾، چییـە؟ ئـەم شـێوازەش بـۆ گـەورەو زەبـەلاح پێشـاندانی پلـەو پێگـەی ﴿ عِلِّيُّونَ ﴾ە.

٣)- ﴿ كِتَـٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴾، نووسراوێكی نیشانەدار كراوە، یاخود: ﴿ مَّرْقُومٌ ﴾، (**أَي: المَكْتُوبُ كِتَابَةً بَيِّنَةً تُشْبِهُ الرَّقْمَ المَنْسُوج**)، ﴿ مَّرْقُومٌ ﴾، نووسراوێك بە نووسینێكی ڕوون نووسراوە، دەشوبهێتە ئەو نەخش و نیگارەی لەسەر قوماشێكی چنراو هەیە.

٤)- ﴿ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴾، زۆر نیزیكخراوەكان دەیبینن و لە لای ئامادە دەبن، (**شهِدَ**): بە مانای: زانی (**إطلع**) و، بە مانای: ئامادەبوو (**حضر**)، دێ، كەواتە: ﴿ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴾، زۆر نیزیكخراوەكان دەیبینن، یاخود لە لای ئامادە دەبن، زۆر نیزیكخراوان لە كێ؟ ئەوانەی لە خوای پەروەردگار زۆر نیزیكخراوەن، ناوی چاكەكاران لەوێدایە، بەڕێزو حورمەتەوە ناوەكانیان لەوێدا تۆمار كراون، یاخود لیستی كردەوە تۆماركراوەكانیان لەوێدایە.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴾، بە دڵنیایی چاکەکاران لە نێو نازو نیعمەت دان، (النَّعِيمُ: التَّنَعُّمُ العَظِيمُ الَّذِي لاَ يُقَادَرُ قَدْرُهُ)، (نَعِيم): بریتیە لەو خۆشگوزەرانییە مەزنەی ئەندازەکەی نازانرێ.

﴿ ٱلْأَبْرَارِ ﴾، کۆی (بارّ)، یان کۆی (بَرّ)ە، بە مانای چاکەکار، خوا دەفەرموێ: بە دڵنیایی چاکەکاران لە نێو نازو نیعمەت دان، لێرەدا: ﴿ ٱلْأَبْرَارِ ﴾، دەکەوێتەوە بەرانبەر ﴿ ٱلْفُجَّارِ ﴾، گوناهکارو تاوانباران.

٦)- ﴿ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴾، لەسەر تەختان دەڕوانن، ﴿ ٱلْأَرَآئِكِ ﴾، (جَمْعُ أَرِيكَة: الأَسِرَّةُ الَّتِي لَهَا حِجَالُ)، ﴿ ٱلْأَرَآئِكِ ﴾، کۆی (أَرِيْكَة)یەو، بریتین لەو تەختانەی پەردەیان بەسەرەوەیە، (سرير)، بە (أسرة) کۆ دەکرێتەوەو، ئەگەر پەردەی بە سەرەوە بێ، پێی دەگوترێ: (أَرِيْكَة)، ئەگەر پەردەی بە سەرەوە نەبێ، هەر پێی دەگوترێ: (سرير)، تەخت، پێشتریش چەند جارێك باسمان کردوە.

خوا دەفەرموێ: چاکەکاران لە نێو نازو نیعمەت دان لەسەر تەختەکانی خۆیانەوە کە پەردەیان بەسەر دادراون، تەماشا دەکەن، ئایا تەماشای چی دەکەن؟ خوا ﷻ ڕوونی نەکردۆتەوە تەماشای چی دەکەن:

١- تەماشای نازو نیعمەتێك دەکەن کە خوا پێیداون.

٢- تەماشای یەکدی دەکەن.

٣- تەماشای تاوانباران دەکەن، چۆن سزا دەدرێن! هەمووی دەگرێتەوە.

٧)- ﴿ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴾، لە دەم و چاویاندا گەشیی و شادمانیی نازو نیعمەت دەبینی.

وشەی: ﴿ تَعْرِفُ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (تُعْرَف)، دەناسرێ، ئەو کاتەش دەبێ بگوترێ: (نَضْرَةُ النَّعيم)، واتە: لە ڕوویاندا گەشیی نازو نیعمەت دەزانرێ و دەناسرێ، بەڵام ئەگەر بخوێنرێتەوە: ﴿ تَعْرِفُ ﴾، واتە: تۆ (ئەی دوێنراو!) ئەگەر

تەماشایان بکەی لە دەم و چاویاندا گەشەی نازو نیعمەت دەبینی، یانی: (**إِذَا رَأَيْتَهُمْ عَرَفْتَ أَنَّهُم مِنْ أَهْلِ النِّعْمَةِ لِمَا تَرَى فِي وُجُوهِهِم مِنَ النُّورِ وَالحُسْنِ وَالبَيَاضِ وَالبَهْجَةِ وَالرَّوْنَقِ**)، ئەگەر بیانبینی، دەزانی ئەوانە لەو جۆرە کەسانەن کە لە نازو نیعمەت دان، چونکە لە دەم و چاویان دا ڕووناکیی و جوانیی و سپێتیی و گەشیی و ڕەونەق دەبینی.

٨)- ﴿ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴾، پێیان دەنۆشرێ لە شیلەی سەربەستراو.

﴿ رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴾:

أ- یەکێك لە زانایان وای لێکداتەوە: (**الرَّحِيقُ: الخَمْرُ الصَّافِيَةُ الطَّيِّبَة**)، ﴿ رَّحِيقٍ ﴾: بریتیە لە شەڕابێکی ڕوونی خۆش و چاك.

ب- یەکێکی دیکە لە زانایان دەڵێ: (**الرَّحِيقُ: الخَمْرُ الَّذِي لاَ غَشَّ فِيهِ، وَلاَ شَيءَ يُفْسِدُهُ**)، ئەو مەیەیە کە هیچ فێڵی تێدا نیەو، هیچ شتێك تێکی نادات.

﴿ مَّخْتُومٍ ﴾: أ- (**الَّذِي لَه خِتَام**)، (**مختوم**) ئەوەیە کۆتاییەکی هەیە.

ب- (**أو مطويٌّ فممنوع أن تمسه يَدٌ**).

ب- یاخود: پێچراوەتەوەو ڕێ گیراوە، هیچ دەستێك بیگاتێ.

ج- هەندێکی دیکەش گوتوویانە: ﴿ مَّخْتُومٍ ﴾: واتە: دەفرەکەی بەستراوە، چونکە (مختوم) ناوی بەرکار (**اسم مفعول**)ەو لە (**ختم**)وە هاتوە، دەفرێك بە جۆرێك لە قوڕ ببەسترێ کە زۆر جیڕ بێ و، کاتێکیش وشك بێتەوە بە زەحمەت هەڵبکەنرێ و ئەگەر هەڵبکەنرێ، بزانرێ هەڵکەندراوە، واتە: لە شەڕابێکی زۆر نایابی زار بەستراوی دەست لێ نەدراو، دەیاندرێتێ.

٩)- ﴿ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ﴾، کۆتاییەکەی، بەستەرەکەی میسکە، ﴿ خِتَٰمُهُۥ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**خَاتِمُهُ**)، کۆتایی هێنەرەکەی یانی: ئەو شتەی زاری ئەو دەفرەی پێ

بەستراوە بریتیە لە میسك، یانی: ئەگەر لە دنیادا زاری دەفرەكانیان بە قوڕو شێوەكانی دەبەستن، لەوێ بە میسك بەستراوە، یاخود: كۆتاییەكەی كە دەیخۆیەوە، كۆتا تام لە دەمتدا، لە زارتدا، بۆنی میسك دەدا.

(**إبـن عاشـور**)، ئـاوا پێناسـەی میسـك دەكات، هەڵبەتـە پێشـتریش پێناسـەی میسـكمان كـرد، كـە لـە هەندێـك جـۆری ئاسـك پەیـدا دەبـێ، بـەڵام (إبـن عاشـور) جوانـتر ڕوونـی دەكاتـەوەو دەڵـێ:

**(الْمِسْـكُ: مَـادَّةٌ حَيَوَانِيَّـةٌ ذَاتُ عَـرْفٍ طَيِّـبٍ مَشْـهُورٍ طِيبُـهُ وَقُـوَّةُ رَائِحَتِـهِ مُنْـذُ الْعُصُـورِ الْقَدِيمَـةِ، وَهَـذِهِ الْـمَادَّةُ تَتَكَوَّنُ فِي غُـدَّةٍ مَمْلُـوءَةٍ دَمًـا تَخْـرُجُ فِي عُنُـقِ صِنْـفٍ مِـنَ الْغَـزَالِ فِي بِـلَادِ التِّبِيـتِ مِـنْ أَرْضِ الصِّـينِ، فَتَبْقَـى مُتَّصِلَـةً بِعُنُقِـهِ إِلَى أَنْ تَيْبَـسَ فَتَسْـقُطُ فَيَلْتَقِطُهَـا طُلَّابُهَـا وَيَتَّجِـرُونَ فِيهَـا، وَهِـيَ جِلْـدَةٌ فِي شَـكْلِ فَـأْرٍ صَغِـيرٍ وَلِذَلِـكَ يَقُولُـونَ: فَـأْرَةُ الْمِسْـكِ).**

واتـە: میسـك ماددەیەكـی ئاژەڵییـە، بۆنێكـی زۆر خۆشـی هەیـە، شـتێكی زۆر زانـراوە، هـەم بۆنەكـەی و، هـەم هێـزی بۆنەكـەی و، لـە ڕۆژگارەكانـی زووەوە میسـك هـەر هەبـووە، ئـەو ماددەیـەش لـە ئەصڵـدا لـە لوویـەك كـە پـڕە لـە خوێـن، لـە گەردنـی هەندێـك لـە ئاسـكەكان پەیدادەبـێ، زیاتـر لـە وڵاتـی (**التِّبِيـتِ**)، لەسـەر زەمینـی چیـن هەیـە، ئنجـا ئـەو لـووە دەمێنێتـەوە بـە گەردنـی ئـەو ئاسـكەوە، تاكـو وشـك دەبـێ و دەكەوێتـە خـوارو، ئەوانـەی بەدوایـدا دەگەڕێـن، هەڵیدەگرنـەوەو بازرگانیـی پـێ دەكـەن، ئـەو پێسـتۆكەش كـە بـە ملـی ئـەو جـۆرە ئاسـكانەوەیە، لـە شـێوەی مشـكێكی گچكـە دایـە، بۆیـە گوتـراوە: (**فَـأْرَةُ الْمِسْـكِ**)، واتـە: مشـكی میسـك.

١٠)- ﴿ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴾، با پێشبڕكەكاران هەر لەوەدا پێشبڕكە بكەن، **(التَّنَافُسُ: التَّشَاجُرُ عَلَى الشَّيءِ والتَّنَازُعُ فِيهِ، بِأَنْ يُحِبَّ كُلُّ وَاحِدٍ أَن يَتَفَرَّد بِهِ دون صاحبهُ يُقَالُ: نَفَسْتُ الشَّيءِ عَلَيْهِ أَنفسه نَفَاسَةً، أي: ضَنَنْتُ بِهِ[١]، وَلَمْ أُحِبْ أَنْ يَصِيرَ إِلَيْهِ)، (تنافس):** بریتیە لە ناكۆكیی لەسەر شتێك و لەسەری پێكەوە ناكۆك بوون، هەر كامێكیان بیەوێ

---

(١) ضَنَنت به: بَخِلتُ به: ڕژدییم تێداكرد، بەڵام (ظننتُ به): گومانم پێبرد.

بۆ خۆی بێ و بۆ هاوەڵەکەی نەبێ، دەگوترێ: (**نَفَسْتُ الشَّيء عَلَيْهِ أَنفسه نَفَاسَةً**)، واتە: ئەو شتە ویستم بۆ خۆم بێ و بۆ بەرامبەرەکەم نەبێ، خوا دەفەرمووێ: با هەر لەوەدا پێشبڕکەکاران پێشبڕکە بکەن، یانی: تەنیا بۆ بەدەستهێنانی ئەو نازو نیعمەتەی باسکرا، پێشبڕکە بکەن.

ئنجا خوا ﷻ هەر لەسەر باسی ئەو خواردنەوەیە بەردەوام دەبێ و، دەفەرمووێ:

**١١)-** ﴿ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ ﴾، تێکەڵەکەی، (ئەوەی تێکەڵی ئەو ﴿ رَّحِيقٍ ﴾ە، دەکرێ)، لە ﴿ تَسۡنِيمٍ ﴾ە.

ئایا: ﴿ تَسۡنِيمٍ ﴾، چییە؟! خوا خۆی ڕوونی کردۆتەوە:

**١٢)-** ﴿ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾، (ئەویش) کانییەکە زۆر نیزیکخراوان لێی دەخۆنەوە، واتە: زۆر نیزیکخراوان لە خوا، لە خودی کانییەکە دەخۆنەوە، بەڵام هەندێك لە ئاوی ئەو کانییەو ئەو خواردنەوەیەی لەو کانییە دایە، لەگەڵ ﴿ رَّحِيقٍ ﴾، تێکەڵ دەکرێ و دەدرێ بە چاکەکاران، بەڵام زۆر لە خوا نیزیکان، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لێی دەخۆنەوە، بەبێ ئەوەی شتی دیکەی لەگەڵ تێکەڵکرابێ.

وشەی: ﴿ وَمِزَاجُهُۥ ﴾، (**مَصْدَرٌ بِمَعْنى مفعول، أي مَمْزُوجُهُ**)، واتە: (**مزاج**) چاوگە بە مانای بەرکار، یانی: تێکەڵکراوەکەی، ئەوەی لەگەڵی تێکەڵ دەکرێ لە ﴿ تَسۡنِيمٍ ﴾ە.

کە دەفەرمووێ: ﴿ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾، (**عَيْناً: انْتِصَابُ «عَيْناً» عَلَى المَدْحِ، أَو عَلَى الحَالِ، أَو مَنْصُوبَةٌ ب «يَشْرَبُون» أي: يُسْقَونَ عَيْناً**)، واتە: وشەی: ﴿ عَيۡنٗا ﴾ کە (**منصوب**) بووە، لەبەر ئەوەیە کە مەدحکردنە، یان حاڵە، یان مەنصووبە بە کرداری پێشووی پێیان دەنۆشرێ (**يُسقَون**)، یان بە کرداری داهاتووی دەخۆنەوە (**يَشْرَبُون**)، کە دەفەرمووێ: ﴿ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾، واتە: (**يُسْقَونَ عَيْناً**)، لەو کانیی و سەرچاوەیە دەیاندرێتێ، یان: (**يَشْرَبُون عَيناً**) لەسەرچاوەیەك دەخۆنەوە.

وشـەی: ﴿تَسْنِيمٍ﴾: (تَسْنِيم: وَهُوَ شَرَابٌ يَنْصَبُّ مِنْ عُلوٍ، وَهُوَ أَشْرَفُ شَرَابِ الجَنَّةِ، وَأَصْلُ التَّسنِيم فِي اللُّغَةِ: الإِرْتِفَاعُ، وَمِنْهُ سَنَامُ البَعِير)، وشـەی: ﴿تَسْنِيمٍ﴾، بریتیـە لـە خواردنەوەیـەك كـە لـە سـەرێوە هەڵـدەڕژێ و باشـترین جـۆرە خواردنـەوەی بەهەشـتە، وشـەی: ﴿تَسْنِيمٍ﴾یـش، لـە زمانـدا بـە مانـای بەرزیـی دێ، (سـنام البعـير) یـش لـەوەوە هاتـوە، دونگـی حوشـتر (كـە لـە پشـتەكەی بەرزتـرەو هەڵدەتۆقـێ، بۆیە ئـەو نـاوەی لێـنراوە)، دەگوتـرێ: (سَـنَّم الـشَّيء، أي: جَعَلَـهُ كَهَيْئَـةِ السَّـنَام)، واتـە: وەك دونگـی حوشـتری لێكـرد.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿يَشْرَبُ بِهَا﴾، أ- یـان (ب)كـە زیـادە، یانـی: (يشربهـا) و (ب) زیـاد كـراوە بـۆ زیـادە جەختكردنـەوە.

ب- یاخـود (ب)كـە بـە مانـای (مِـن)ە، یانـی: (يَشْرَبُ منها ٱلْمُقَرَّبُونَ) یـانی: لێـی دەخۆنەوە.

(الطـبري)، لـە (مـسروق)ەوە هێناویەتـی بـە ژمـارە: (٣٦٨٠٨)، دەڵـێ: (فَيَـشْرَبُ بهَـا المُقَرَّبُـونَ صِرْفـاً، وَيُمـزَج بهَـا كَأس أَصْحَـاب اليَمِـيْن)، ئەوانـەی زۆر لـە خـوا نیزیكخـراوەن بـە ڕووتیـی لێـی دەخۆنـەوە، (هیـچ شـتێكی دیكـەی لەگـەڵ دا تێكـەڵ ناكـرێ لەگـەڵ تەسـنیم دا)، بـەڵام بـۆ پێـكی هاوەڵانـی لای ڕاسـت (یاخـود چاكـەكاران) تێكـەڵ دەكـرێ.

(الطـبري) بـە ژمـارە: (٣٦٨١٨)، لـە (الضحـاك)ەوە هێناویەتـی، دەڵـێ: (هُـوَ أَشْرَفُ شَرَابِ الجَنَّـةِ)، ئـەو (تسـنیم) باشـترین جـۆری خواردنـەوەی بەهەشـتە.

خوا بە بەزەیی و كەرەمی بێ سنووری خۆی بە قسمەتمان بكات.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**باسی بێبڕوایانی تاوانبار کە لە دنیادا بە بڕواداران خەنیون و، لە کاتی بە لادا ڕەتبوونیاندا ئاماژەیان بۆ یەکدی کردوە، دوایی بە دڵخۆشیی گەڕاونەوە لای کەس و کاریان و، بە بڕوا دارانیان گوتوە: ئەوانە گومڕان، هەرچەندە پارێزەریش نەبوون بەسەریانەوە، لە ڕۆژی دواییش دا، بڕواداران بە بێبڕوایان دەخەنن و، لەسەر تەختان دەڕوانن، بێگومانیش بێبڕوایان سزای ئەوەی دەیانکرد، درایانەوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)**- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی تاوانیان کرد، کاتی خۆی (لە دنیادا)، بە وانەی بڕوایان هێنابوو، پێدەکەنین، **(الطبري)** لە **(قتادة)**ەوە بە ژمارە: (٣٦٨١٩)، هێناویەتی، دەڵێ: **(فِي الدُّنْيَا، يَقُولُونَ: وَاللَّهِ إِنَّ هَؤُلَاءِ لَكَذَبَةٌ، وَمَا هُمْ عَلَى شَيْءٍ، اسْتِهْزَاءً بِهِمْ)**، لە دنیادا دەیانگوت: سوێند بە خوا ئەوانە درۆزنن و، لەسەر هیچ شتێك نین، وەك گاڵتە پێکردنیان.

**٢)**- ﴿وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ﴾، کاتێك بەلایاندا ڕەتبووبانایەش، ئاماژەیان بۆ یەکدی دەکرد.

﴿وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ﴾، دوو ئەگەری هەن:

أ- ﴿ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ ﴾، بکەری (مَرّوا) کە (و)ی کۆمەڵە، دەگەڕێتەوە بۆ تاوانباران، یانی: ئەگەر تاوانباران بە لای بڕواداراندا ڕەتبوونایە.

ب- ﴿ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ ﴾، بکەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چاکەکاران، ﴿ ٱلْأَبْرَارِ ﴾ یانی: ئەگەر چاکەکاران بەلای تاوانباران دا ڕەتبووبانایە.

﴿ يَتَغَامَزُونَ ﴾، (التَّغَامُـزُ: تَفَاعُـلٌ مِـنَ الغَمْـزِ)، (تغامـز) لـە (غمـز)ەوە هاتـوە، ئەویـش بریتیـە لـەوەی بـە دەسـت شـتێك بـە توندیـی بگـری و دەسـتی لەسـەر دابگـری، (جَـسّ النبض)یـش، ئەوەیـە دەمـاری کەسـێك بگـری و بزانـی دڵـی چـۆن لێـدەدا.

ئنجا ئایا ئەو ئاماژە بۆ یەکدی کردنە، چۆن بووە؟

دەڵێیـن: وشـەی: (غمـز)، بەکاردەهێـنرێ، بـۆ بەکارهێنانـی چـاوو لـووت و لێـوو بـرۆ، بـۆ ئـەوەی بابـای کـە لەوێ وەسـتاوە، ئـاگادار بێتـەوە، نـەوەك دیمەنێك لـە دیمەنەکانی ئـەو کەسـەی تەماشـا دەکـرێ، لێـی بفەوتـێ، لەبـەر ئـەوەی لێـی بێئـاگا بووە.

دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، وشـەی: (غمـز)ی بەکارهێنـاوە، وەك لـەو فەرمایشـتەدا هاتـوە، دەڵـێ: {**لَقَـدْ رَأَيْتُنِـي وَرَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ يُصَـلِّي وَأَنَـا مُضْطَجِعَـةٌ بَيْنَـهُ وَبَـيْنَ الْقِبْلَـةِ، فَـإِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْـجُدَ غَمَـزَ رِجْـلَيَّ فَقَبَضْتُهُـمَا**}، (**أخرجـه البخـاري: ٤٩٧**)، واتـە: خـۆم و پێغەمبـەری خـوام ﷺ دەبینـی کـە نوێـژی دەکـرد، منیـش لـە نێـوان ئـەو و قیبلـەدا ڕاکشـابووم، کاتێـك دەیویسـت کڕنـووش ببـات، (شـوێنەکەیان تەسـك بـووە)، دەسـتی دەگەیانـدە لاقـم، منیـش لاقـم هەڵدەکێشـا، {تاکـو ڕێـی هەبـێ کڕنـووش بـەرێ}.

٣)- ﴿ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ﴾، کاتێك دەگەڕانەوە بۆ لای کەس و کاریان بە دڵخۆشیی و شادمانیی دەگەڕانەوە، ﴿ ٱنقَلَبُوٓا۟ ﴾، (**الإِنْقِلَابُ: الرُّجُوع إلى الموضع الذي جيءَ مِنْهُ**)، (**إنقلاب**): بریتیە لە گەڕانەوەی ئەو شوێنەی لێوەی هاتوە،

کە دەفەرموێ: ﴿ٱنقَلَبُوا۟ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ﴾، (**أهل الرجل: الزَّوجُ والأَبناء والعَشِيرَة**)، (**أهـل**) بە مانای هاوسەرو منداڵان و خزم و کەسیش، دێ، یانی: کاتێك بۆ لای خزم و کەسیان گەڕابانەوە، بە دڵخۆشیی و شادمانیی دەگەڕانەوە.

٤)- ﴿وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ﴾، ئەگەر بینیبایانیشن (تاوانبارەکان بڕوادارانیان بینیبایە)، دەیانگوت: ئا ئەوانە گومڕان.

بێگومـان مەبەسـتیان لـە گومـڕا، کەسـێکە ڕایەکـی هەڵـەی هەیـە، بۆچوونێکـی هەڵـەی هەیـە، مەبەسـتیان ئـەو نەبـووە بـە ڕێـی خـوا نازانـن، یانـی: ئەمانـە بـە هەڵەداچـوون و، لـە سـەرگەردانیی سـەر لێشـێواویی دان.

٥)- ﴿وَمَآ أُرۡسِلُوا۟ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ﴾، (خوا دەفەرموێ:) بە پارێزەریش بەسەریانەوە نەنێردرابوون، واتە: تاوانبارەکان پارێزەر نەبوون بەسەر چاکەکارەکان، تاکو ئاوا بە کەیفی خۆیان گاڵتەیان پێبکەن و پێیان پێبکەنن و ئاماژە بۆ یەکدی بکەن و، سەرەنجامیش بە گومڕا ناوزەدیان بکەن!.

٦)- ﴿فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ﴾، ئەمڕۆش ئەوانەی بڕوایان هێنابوو (لە دنیادا بڕوایان هێنابوو، بە هەموو ئەو شتانەی پێویست بوو بڕوایان پێ بهێنرێ)، بە بێبڕوایان پێ دەکەنن.

(**ف**)ی ﴿فَٱلۡيَوۡمَ﴾، (**فـاء السَّـبَبِيّة، وَتَقْدِيـمُ «اليَـومِ» عَـلَى يَضْحَكُـون، للإهتِـمَامِ بـهِ**)، پیتـی (**ف**) بـە مانـای هـۆکارەو (**یـوم**)ش لەسـەر (**یضحکـون**) پێشـخراوە، لەبـەر گرنگیـی پێـدان، ئەمـڕۆ (ڕۆژی دوایـی)، ئەوانـەی بڕوایـان هێنابـوو (بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ) بـە بێبڕوایـەکان دەخەنـن، پێدەکەنـن.

٧)- ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾، لەسەر تەختان (لەسەر ئەو تەختانەی بە پەردان داپۆشراون) تەماشا دەکەن، واتە: تەماشای بێبڕوایان دەکەن کە سزا و ئەشکەنجە دەدرێن.

٨)- ﴿ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾، (لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:) ئایا بێبڕوایەکان پاداشتی ئەوەی دەیانکرد درایانەوە؟!.

پێشتریش باسمان کردوە: ﴿ ثُوِّبَ ﴾، لە (**ثواب**)ەوە هاتوەو بە مانای پاداشتە، کەواتە:

أ- ئەمە جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن و بە توانجەوە قسە لە بارەوە کردنیان، واتە: ئەگەر پاداشتێك هەبێ بۆ ئەوان، بریتیە لەوەی بخرێنە دۆزەخەوە، چونکە پاداشت (**ثواب**) تەنیا لەسەر چاکەیەو، ئەوانیش هیچ چاکەیەکیان نیە، تاکو پاداشتیان هەبێ.

ب- یاخود وشەی: (**ثواب**)، مانای سزاش لەسەر خراپەش دەگەیەنێ، وەك مانای پاداشت لەسەر چاکە، ئنجا ئەگەر ئەوە بێ، ئەو کاتە مانای گاڵتە پێکردن و توانج تێگرتنی لێوەرناگیرێ، واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوابوون، سزای ئەو کردەوانەی دەیانکردن، کە بریتی بوون لە:

١- گاڵتە کردن بە بڕواداران و، ٢- چاو لە یەك داگرتن و، ٣- پێخەنین و، ٤- بە سەر لێ شێواو ناوبردنیان، ئایا سزای ئەوە کردەوانەیان درایەوە؟ بە دڵنیایی بەڵێ، هەڵبەتە لێرەدا پرسیار کردنەکە، پرسیاری کردنی ڕاستەقینە نیە، کە خوای زاناو شارەزا بپرسێ: ئایا سزا درانەوە؟ یان ئایا پاداشت درانەوە؟ ئەگەر مەبەست گاڵتە پێ کردنیان بێ و، وشەی پاداشتیان بۆ بەکاربێ، بەڵکو ئەو پرسیارکردنە مەبەست پێی ئەوەیە لایەنی بەرانبەر ناچار بکەی، دانی پێدابێنێ و پرسیارکردنی: دانپێپێداهێنان (**تقريري**)ە، یاخود وشەی: ﴿ هَلْ ﴾، لێرەدا بە مانای (قد)ە، یانی: ﴿ قد ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾، هەروەك لە سەرەتای سوورەتی (**الإنسان**)دا هاتوە، ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ ﴿١﴾ ﴾، ئایا کاتێك لە ڕۆژگار، بەسەر مرۆڤدا نەهاتوە کە شتێکی باسکراو نەبووبێ؟ بە دڵنیایی: با، کەواتە: لێرەدا مەبەست پرسیار نیەو، لەوێش بە دڵنیایی مرۆڤ کاتێکی بەسەردا هاتوە، نەبووە، جاری وا هەیە مرۆڤ لە شێوەی پرسیاردا لە کەسێك دەپرسێ، بەڵام خۆی لە وەڵامەکەی دڵنیایە، بۆ وێنە:

کتێبێکت داوە بە کەسێك و دەڵێی: ئایا فڵانە ڕۆژە، فڵان کتێبەم نەدایە؟ مەبەستت ئەوە نیە بڵێ: با، یانی: خۆت ئاگاداری ئەو کتێبەم پێداوی.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾، (**الطبري**) لە (**سفيان**)ەوە هێناویەتی بە ژمارە: (٣٦٨٢٦)، دەڵێ: (**يُجَاءُ بِالْكُفَّارِ، حَتَّى يَنْظُرُوا إِلَى أَهْلِ الْجَنَّةِ فِي الجَنَّةِ، عَلَى سُرُرٍ، فَحِينَ يَنْظُرُونَ إِلَيْهِمْ، تُغْلَقُ دُونَهُمُ الْأَبْوَابُ، وَيَضْحَكُ أَهْلُ الْجَنَّةِ مِنْهُمْ**)، واتە: بێبڕوایەکان لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێن، تاکو تەماشای بەهەشتییەکان بکەن لە بەهەشتێ دا، کە لەسەر تەختان ڕاکشاون و پاڵیان داوەتەوە، کاتێك تەماشایان دەکەن، دەزانن ئەوان لە چ نازو نیعمەت و خۆشییەك دان، ئنجا دەرگایەکانیان بە ڕوودا دادەخرێن و، بەهەشتییەکانیش پێیان پێ دەکەنن، (وەك تۆڵە لێکردنەوەیەك، لەو پێ پێکەنینەی، ئەوان لە دنیادا بە ناهەق بەوان دەخەنین و، پێیان ڕادەبواردن و گاڵتەیان پێ دەکردن)، لەوێش بەو شێوەیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ﴾، وەك (**الطبري**) هێناویەتی، دەڵێ: بەو شێوەیە بێبڕوایەکان دەهێنرێن و بڕوادارانیان پێشان دەدرێن لە بەهەشتداو، دوای ئەوەی دەیانبینن، ئنجا دەرگایەکانیان بەڕوودا دادەخرێن و، بڕوادارانیش پێیان پێ دەکەنن.

بەڕێزان!

پوختەی ئەوەی لەم ئایەتە موبارەکانە وەردەگیرێ، بەمجۆرەیە - یانی: کۆی سوورەتی (**المطففين**) - لە سەرەتای سوورەتەکەوە خوای بەرزی مەزن، باسی ئەو عادەتە خراپە دەکات و، سزای سەخت بۆ ئەو کەسانە دانەنێ، ئەو عادەتە خراپەیان هەیە، کە لە کێشان و پێواندا فێڵ دەکەن لە بەرانبەرەکانیان، دوایی وەك پرسیارکردن دەپرسێ: ئایا ئەوانە پێیان وانیە زیندوو کراوەن و هەڵسێنراوەن بۆ ڕۆژێکی مەزن، کە خەڵك تییدا ڕادەوەستێ بۆ پەروەردگاری جیهانییان؟ دوایی خوا ﷻ باسی شوێنی تێدا نووسرانی کردەوەکانی بێبڕوایان و تاوانباران دەکات، دواییش باسی شوێنی تێدا نووسران و تێدا تۆمار کرانی کردەوەی چاکە

کاران دەکات، لـە کۆتاییشـدا خـوای بـەرز باسـی ئـەوە دەکات کـە چـۆن تاوانبـاران لـە دنیایـەدا بـە بـڕواداران پێکەنیـون و کاتێـك بـە لاشـیان دا ڕەت بـوون، چاویـان لـە یـەك داگرتـوەو، کاتێـك گەڕاونـەوە بـۆ لای کـەس و کاریـان، زۆر بـە دڵخۆشـیی گەڕاونـەوە، وەك شـتێکی زۆر گرنـگ و چاکیـان ئەنجـام دابـێ، کـە گاڵتەیـان بـەو ئیماندارانـە کـردوەو کاتێـک بینیوشـیانن گوتوویانـە: ئەوانـە گومـڕان! ئنجـا خـوا ﷻ باسـی ئـەوەی کـردوە کـە لـە ڕۆژی دواییشـدا خـوا بـەو شـێوەیە حەقـی ئـەو مسـوڵمانە ڕەش و ڕووت و گاڵتـە پێکراوانـە، لـەو بێبـڕوا تاوانبـارو گاڵتـە پێکەرانـە دەکاتـەوە.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسانە بگێـڕێ، کـە هەمیشـە لـە هەڵسـوکەوت و لـە ڕەفتـارو ئـاکاری ژیانـی دنیایانـدا پابەنـد دەبـن بـە سـنوورەکانی شـەریعەتەوەو، بـە پێـی بەرنامـەو شـەریعەتی خـوای پـەروەردگار بەڕێـوە دەچـن و، بـە شـێوەیەك دەژیـن هەقـی خەڵکیـان نەکەوێتـەلاو، وانەبیـن کـە لـە ڕۆژی دواییـدا شـەرمەزارو گوناهـکارو عەیبـدار بیـن، خـوا بەهـۆی ژیانـی ئیماندارانـەوە سـەر بەرزمـان بـکات و پـاك و چاکـما بـکات، ڕاسـت و سـاغمان بـکات، هەروەهـا یارمەتییشـمان بـدات، کـە هەرچـی زیاتـر لـە کۆتـا فەرمایشـتی کـە قورئانـە تێبگەیـن و تێیـدا پـێ بگەیـن و، کارلێکـی باشـی لەگەڵـدا بکەیـن، بێگومان ئـەو کۆتا فەرمایشـتەی خـوا ﷻ کـە قورئانـە، سـەرچاوەی هەمـوو خێـرو نـوورو بەرەکەتێکـە بـۆ دنیـاو بـۆ دواڕۆژو، ڕێبازەکـەی پێغەمبـەری خاتەمیـش ﷺ هـەر بریتیـە لـە بەرجەسـتەکردنی ئـەو فەرمایشـتەی خـوا لـە ژیانـی تاکیـی و خێزانیـی و کۆمەڵایەتیـی دا، خـوا تەوفیقی ئێمـەش بـدات، کـە هـەروەك پێغەمبەرەکەمـان، ئـەو قورئانـە، ئـەو فەرمایشـتەی خـوا لـە ژیانـی خۆمانـدا جێبەجـێ بکەیـن.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**المطففین**) دێنین.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ، وَأَتُوبُ إِلَيْكَ**

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کە (٢٤)ی مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر (١٥)ی تەمموز {مانگی (٧)}ی ساڵی (٢٠٢٠) زایینی، لە شاری هەولێر خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین، بەتەفسیرکردنی سوورەتی (الإنشقاق)و، سەرەتاش پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە لە حەوت بڕگەدا، دەخەینە ڕوو.

## پێناسەی سوورەتی (الإنشقاق) و بابەتەکانی

### یەکەم: نـاوی:

ئەم سوورەتە ناوی هەرە باوی بریتیە لە سوورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾، لە ڕۆژگاری هاوەڵاندا هەر بەو ناوە ناوبراوە، لەو بارەوە چەند گێڕدراوەیەك هەن، ئێمە ئاماژە بە سێیانیان دەکەین:

١- {عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﵁، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ قَرَأَ بِهِم: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾، فَسَجَدَ فِيهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَخْبَرَهُم أَنَّ رَسُولَ الله ﷺ سَجَدَ فِيْهَا} (أخرجه مالك في الموطأ: ٤٨٠).

واتە: ئەبوو سەلەمە ﵁، دەگێڕێتەوە، کە ئەبوو هورەیرە ﵁ پێشنوێژیی بۆ کردوون و سوورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾، خوێندەوەو کڕنووشی قورئانخوێندنی تێدا بردووە، کاتێك تەواو بووە، هەواڵی پێداون کە پێغەمبەری خوا ﷺ کڕنووشی تێدا بردوە.

٢)- {عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﵁، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، العَتَمَةَ فَقَرَأَ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾، فَسَجَدَ، فَقُلْتُ: مَا هذِهِ؟ قَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ، فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ} (أخرجه البخاري: ٧٣٢، ومسلم: ٥٧٨).

واتە: ئەبوو ڕافیع ﷺ، دەڵێ: لەگەڵ ئەبوو هورەیرەدا نوێژی خەوتنانم کرد، سوورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ی خوێندو کڕنووشی تێدا برد (واتە: کڕنووشی قورئانخوێندن)، گوتم: ئەوە چییە؟ گوتی: لە پشت ئەبوو قاسیمەوە (کونیەی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ) نوێژم کرد، ئەو سەجدەیەی برد، منیش لەگەڵ ئەودا سەجدەم برد (سەجدەی قورئانخوێندن)، بۆیە هەتا پێی دەگەمەوە (واتە: لە ڕۆژی قیامەتداو لە قۆناغی بەرزەخدا)، ئەو کڕنووشە دەبەم لە کاتی خوێندنی ئەم سوورەتەدا.

٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَة ﷺ، قَالَ: سَجَدْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ فِي ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾، و ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾: ١} (أخرجه مسلم: ٥٧٨ و ١٠٨، وأبو داود: ١٤٠٩، وابن ماجه: ١٠٥٨).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لە کاتی خوێندنی سوورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾، و سوورەتی: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾دا، سەجدەمان برد، (سەجدەی قورئانخوێندن).

کەواتە: هەر ڕستەکەی سەرەتای کراوە بە ناوی، بەڵام ئەم ناوانەشی بۆ بەکارهێنراون:

١/ (سورةُ الإنشقاق). ٢/ (سورة ٱنشَقَّتۡ). ٣/ (سورة الكَدْح).

## دووەم: شوێنی دابەزین:

ئەم سوورەتە بە یەکدەنگیی هەموو زانایان سوورەتێکی مەککەییەو زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان نیە، لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾، بِمَكَّـةَ}[1].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ گوتوویەتی: سوورەتی ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾، لە مەککە دابەزیوە، عەبدوڵلای کوڕی زوبەیریش (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، هەمان شتی گوتوە.

---

(١) أورده السيوطي في الدر المنثورج٨، ص٤٥٤، ونسبه لابن الضريس والنحاس وابن مردويه والبيهقي، وقال: أخرج ابن مردويه عن ابن الزبير رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا مثله. انظر: (الإستيعاب في بيان الأسباب: ج ٣، ص٥٠٤).

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

ئەم سوورەتە موبارەکە لە (**مصحف**)دا ژمارەکەی: (٨٤)ە، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزین (**ترتيب النزول**)دا، ژمارە: (٨٣)یە، ئەم سوورەتە لە ڕووی دابەزینەوە، پێش سوورەتی (**الروم**) و، دوای سوورەتی (**الإنفطار**)، دابەزیوە.

هەڵبەتە ڕیزکردنی سوورەتەکان لە (**مصحف**)داو، ڕیزبەندییەئەک کە دایانناوە بۆ دابەزینیان، بە کۆشش و بیرکردنەوەی هاوەڵان بووە (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە زۆربەی هەرە زۆریدا.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە:

دوو ژمارەیان بۆ داناون: (**أهل البصرة وأهل الشام**)، گوتوویانە: ژمارەی ئایەتەکانی (٢٣)یە، بەڵام (**أهل المدينة، والكوفة، ومكة**)، گوتوویانە: ژمارەی ئایەتەکانی (٢٥)ە، زۆربەش ئەو ژمارەیەی دوایی (واتە: ژمارەی (٢٥)یان تەبەنیی کردوە).

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتەش وەك دوو هاوەڵە پێشووەکەی (واتە: **سورة التكوير وسورة الإنفطار**) - کە سوورەتی (**المطففين**)یشیان، نێواخن کراوە - باسی ڕۆژی دواییە، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەتیشەوە، سەرزەنشتکردنی بێبڕوایانیش کراوە، کە بۆچی بڕواناهێنن و لە کاتی بەسەردا خوێندرانەوەی قوڕئانیشدا، کڕنووش نابەن، یاخود بۆ خوا ملکەچ نابن؟ لە کۆتاییشدا خوا باسی سزای سەختی خۆی بۆ بێبڕوایان و، دواییش باسی پاداشتی نەبڕاوەی خۆی بۆ بڕوادارانی کردار باش، کردوە.

ئەمە هێڵە گشتییەکان و، چوارچێوەی گشتیی ئەم سوورەتە موبارەکەیە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە:

پێنج تایبەتمەندییمان لەم سوورەتە موبارەکە کەوتوونە بەرچاو، کە جیایدەکەنەوە لە سوورەتەکانی دیکە:

١- تەنیا لەم سوورەتەدا تەعبیری: ﴿وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾، دوو جاران بۆ هەر کام لە ئاسمان و زەوی بەکارهاتوە، لە ئایەتەکانی: (٢ و ٥)دا، واتە: گوێی گرت بۆ پەروەردگاری و شایستەش بوو گوێی بۆ بگرێ.

٢- تەعبیری: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ﴾، لە ئایەتی ژمارە (١٠)دا، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە سوورەتەکانی دیکەدا لە جیاتی:

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ﴾.

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ ﴿٢٥﴾﴾ **الحاقة**، هاتوە.

واتە: بەڵام کەسێك لە پشتەوەی ڕا نامەی کردەوەکانی بدرێتەوە.

٣- تەعبیری: ﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾، ئەو پێی وابوو ناگەڕێتەوە، دوای ئەوەی دەمرێ ناگێڕدرێتەوە بۆ لای خواو، زیندوو ناکرێتەوە، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە لە ئایەتی ژمارە (١٤)دا.

٤- ئەم چوار سوێندەو وەڵامەکەیان بەس لێرەدا هاتوون: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾﴾.

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

کۆی بیست و پێنج (٢٥) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکە، دەکەینە دەرسێك، چونکە زۆر پێکەوە جۆشدراو و تێکهەڵکێشن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە کۆی بیست و پێنج ئایەتەکەی ئەم سوورەتە پێکهاتوە:

١- پێنج ئایەتی سەرەتا، ئایەتەکانی: (١ - ٥)، باسی قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی دەکەن، کە ئاسمان لەت و پەت و ملکەچ دەبێ بۆ خواو، زەویش دەکێشرێ یان پان ڕا دەخرێ و، هەرچی تێیدایەو لەسەریەتی فڕێیدەدات و، بۆ خوا ملکەچ دەبێ.

٢- دە (١٠) ئایەتی دوای وان، ئایەتەکانی: (٦ - ١٥)، باسی بانگکردنی مرۆڤ کە وریا بێ! هەتا دەگاتە خوا ﷻ ڕەنج دەدات، ئنجا باسی سەرەنجامی بڕواداران و بێبڕوایان کراوە.

٣- دە (١٠) ئایەتی کۆتایی، ئایەتەکانی: (١٦ - ٢٥)، سوێند خواردنی خوا ﷻ بە چوار شتان:

١- تروووسکایی ئێوارە یان بەیانیی، بەڵام زیاتر مەبەست پێی تروووسکایی ئێوارەیە، کە یەکسەر بە دوای ئەودا باسی هاتنی شەو دەکات.

٢- شەوگار.

٣- هەرچی شەوگار کۆی دەکاتەوە.

٤- مانگ، کاتێك جێخونکە دەکات، هەتا دەگاتە: (١٣ و ١٤و ١٥)، کە بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (بدر)و، بە کوردیی دەگوترێ: مانگ جێخونکەی کردوە.

سوێند خواردن بەو چوار شتانە، کە مرۆڤەکان حاڵەتی جۆراو جۆریان بەسەر دادێن، دوایی گلەیی کردن لە بڕوا نەهێنانی بێبڕوایان و، ملکەچ نەبوونیان بۆ خوا، یاخود کڕنووش نەبردنیان لە کاتی خوێندرانی قورئاندا، سەرەنجام هەڕەشەی سەخت لە بێبڕوایان و موژدەدان بە بڕوادارانی چاکەکار.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا ﴿١٥﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍۭ ﴿٢٥﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. هەر کات ئاسمان لەت بوو ﴿١﴾ ملکەچی پەروەردگاری بوو و شایستەش بوو (ئاوا ملکەچ بێ) ﴿٢﴾ هەر کاتیش زەوی لێککێشرا (پان ڕاخرا) ﴿٣﴾ هەرچی تێشیدابوو هاویشتی و خۆی خاڵیی کرد ﴿٤﴾ ملکەچی پەروەردگاریشی بوو و شایستەش بوو (ئاوا ملکەچ بێ) ﴿٥﴾ ئەی مرۆڤ! بێگومان تاکو دەگەیە پەروەردگارت ڕەنجدەری و پێشیدەگەی ﴿٦﴾ ئنجا هەر کەس نووسراوەکەی (لیستی کردەوەکانی) بە (دەستی) ڕاستەی بیدرێتەوە ﴿٧﴾ لەمەودوا بە لێپرسینەوەیەکی ئاسان لێی دەپرسرێتەوە ﴿٨﴾ بە دڵخۆشییش دەگەڕێتەوە لای کەس و کاری ﴿٩﴾ بەڵام هەر کەس لە دوای پشتیەوە نووسراوەکەی بدرێتەوە ﴿١٠﴾ لەمەودوا فەوتان داوا دەکات (بۆ خۆی) ﴿١١﴾ دەشخرێتە کڵپە(ی ئاگرە)وە (و تێیدا دەسووتێ و دەپیشێ)

﴿١٢﴾ چونكه ئەو (له دنیادا) له نێو كەس و كاریدا دڵخۆش و بوغڕا بوو ﴿١٣﴾ ئەو پێی وابوو ناگەڕێتەوە (بۆ لای خوا) ﴿١٤﴾ با، بێگومان پەروەردگاری بینەری بوو (چی دەكردو چۆنی دەكرد!) ﴿١٥﴾ ئنجا وا نیه (كه ئەو گومانی دەبرد) سوێند دەخۆم، به سوور و سپیی (ئێوارە) ﴿١٦﴾ هەروەها سوێند به شەوگارو، هەرچی كۆی كردۆتەوە ﴿١٧﴾ دیسان سوێند به مانگ كاتێك جێخونكه دەكات ﴿١٨﴾ (ئەی خەڵكینه!) سواری چین له دوای چین دەبن (حاڵەته جۆراوجۆرەكانتان بەسەر دێن) ﴿١٩﴾ ئەوە چییانه بڕواناهێنن! ﴿٢٠﴾ هەر كات قورئانیشیان بەسەردا خوێندرا كڕنووش نابەن (ملكەچ نابن)؟ ﴿٢١﴾ بەڵكو ئەوانەی بێبڕوان (پەیامی خوا) به درۆ دادەنێن ﴿٢٢﴾ خواش زاناترە بەوەی (له دڵ و دەروونیاندا) هەڵیدەگرن ﴿٢٣﴾ ئنجا موژدەی ئازارێكی به ئێشیان بدەیه ﴿٢٤﴾ جگه لەو كەسانەی بڕوایان هێناوەو، كردەوە باشەكانیان كردوون (ئەوانه) پاداشتێكی نەبڕاوەیان هەیه ﴿٢٥﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێک له وشەكان

(ٱنشَقَّتۡ): (الشَّقُّ: الخَرْمُ الوَاقِعُ فِي الشيءِ، انْشَقَّ أي: تَصَدَّعَ وَبَدَتْ شُقُوقُهُ)، (شَق): بریتیه له قڵیشانێ كه له شتێكدا ڕوو دەدات، دەگوترێ: (انشق: أي تَصَدَّعَ)، واته: لیكبۆوە، پارچه پارچه بوو، كەلێنەكانی دەركەوتن.

(وَأَذِنَتۡ): (أَذِنَ: اسْتَمَعَ، الإِذْنُ بالشيءِ: إِعْلَامٌ بِإِجَازَتِهِ وَالرُّخْصَةُ فِيهِ)، (أَذِنَ): گوێی گرت، گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بوو، كه دەگوترێ: (أَذِنَ بالشيءِ)، ڕێپێدانی ڕاگەیاندو مۆڵەت پێدانی ڕاگەیاند.

(وَحُقَّتۡ): (أَحْقَقْتُ كَذَا: أَثْبَتُّهُ حَقّاً، أو حَكَمْتُ بكَوْنِهِ حَقّاً)، (أَحْقَقْتُ كَذَا)، واته: وەك هەق چەسپاندم، یاخود بڕیارمدا ئەو شته هەقه، (حُقَّ لَكَ أَنْ تَفْعَل كَذَا، وَحَقِقْتَ وَحَقَّ لَهُ، أي: أَنْ يَفْعَلَ كَذَا وَهُوَ حَقِيقٌ ومَحْقُوقٌ، أي: خَلِيقٌ بِهِ وَحَقَّ أي: ثَبَتَ وَوَجَبَ)، له زمانی عەرەبیدا: (حُقَّ لَكَ أَنْ تَفْعَل كَذَا، وَحَقِقْتَ وحُقَّ له)، واته: تۆ شایسته بووی ئەو كاره ئەنجام بدەی، ئەو شایسته بوو ئەو كاره ئەنجام بدات (وَهُوَ حَقِيقٌ ومَحْقُوقٌ، أي: خَلِيقٌ

بِهِ)، واتە: ئەو کەسە شایستەی ئەوەیە ئەو کارە ئەنجام بدات، (**وَحَقَّ أي: ثَبَتَ وَوَجَبَ**)، واتە: فلان شتە چەسپاو پێویست بوو.

(مُدَّتۡ): (**أَصْلُ المدّ الجرُّ، وَالمُدَّةُ: الوَقْتُ المُمْتَدُّ**)، (**مَدّ**): لە ئەسڵی زمانی عەرەبیی دا، بە مانای ڕاکێشان و لێککێشانەوە دێ، (**مدة**)، بە مانای: کاتێکی درێژ کراوە دێ.

(وَتَخَلَّتۡ): (**خَلَّيْتُ فُلاَنَاً: تَرَكْتُهُ فِي خلاَءٍ**)، (**خَلَّيْتُ فُلاَنَاً**)، واتە: فلانکەسم لە چۆڵاییەك، لە دەشتاییەکدا بەجێهێشت، (**خَلاَ الإِنْسَانَ: صَارَ خَالِيَاً**)، واتە: فلانکەس لە شوێنێکی چۆڵ و بە تەنیا بوو.

(كَادِحٌ ): (**الكَدْحُ: السَّعِي والعَنَاءُ**)، (**كدْح**) کۆششکردن و خۆ ماندوو کردن، (**كَادِح**)، واتە: بابای تێکۆشەر و ڕەنجدەر.

(ثُبُورًا): (**الثُبُورُ: الهَلاَكُ وَالفَسَاد، المثَابِرُ عَلَى الإِتْيَانِ أي: المُوَاظِب**)، (**ثُبُور**): واتە: فەوتان لە بەینچوون و تێکچوون، (**المثَابِرُ عَلَى الإِتْيَانِ أي: المُوَاظِب**)، واتە: کەسێك سوور بێ لەسەر ئەنجامدانی کارێك، واتە: (**مواظب**)ە، لەسەر ئەو کارە بەردەوام دەبێ و لە کۆڵی نابێتەوە.

(لَّن يَحُورَ): (**لَنْ يُبْعَثَ، لَنْ يَحُور: يَعْني لَنْ يَرْجِعَ حَار يَحُورُ حَوْرَاً، أي: رَجَعَ يَرْجِعُ رُجُوعاً**)، نەگەڕێتەوە، گەڕایەوە دەگەڕێتەوە گەڕانەوە. لێرەدا مەبەست پێی زیندوو کرانەوەیە، پێی وایە زیندوو ناکرێتەوە، دوای ئەوەی خرایە نێو گۆڕ، جارێکی دیکە هەڵناسێنرێتەوە، (**يُقَالُ حَارَ المَاءُ فِي الغَدِيرِ: تَرَدَّدَ فِيهِ**)، ئاوەکە لە چاڵەکەدا تێیدا هات وچوو، سووڕا، (**وَحَارَ فِي أَمْره تَحَيَّرَ**)، لە کارەکەی خۆیدا سەراسیمە بوو، سەرسام بوو، (**المحور: العُود الَّتِي تَجْرِي عَلَيْهِ البكرة لِتَرَدُّدِهِ**)، (**محور**): سووڕگە، ئەو دارەیە، پەتێك کە لە دۆڵچەکانی ناعور خراوە، تاکو ئاوەکەی لێ هەڵێنجێ، تێیدا دەسووڕێ.

(بِٱلشَّفَقِ): (**الشَّفَقُ اخْتِلاَطُ ضوء النَّهَارِ بِسَّوَادِ اللَّيْلِ عِنْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ**)، (**شفق**)، واتە: سوورایی، یاخود سوورو سپێتیی ئێوارە، یان بەرەبەیان، کە تێکەڵبوونی ڕۆشنایی ڕۆژە لەگەڵ ڕەشایی شەودا لە کاتی خۆر ئاوابووندا.

(وَمَا وَسَقَ): (الوَسْقُ: جَمْعُ المُتَفَرِّق)، (وَسْق) ئەوەیە شتێك كە بڵاوبووبێتەوە، كۆ بكرێتەوە، (وَسَقْتُ الشَّيءَ: جَمَعْتُهُ)، شتەكەم كۆ كردەوە، (سُمِّيَ قَدْرٌ مَعْلُومٌ مِنَ الحَمْلِ كَحَمْلِ البَعيرِ: وَسْقًا وَقِيلَ: هُوَ سِتُّونَ صَاعَاً)، ئەندازەیەكی زانراو لە بار، وەك باری حوشتر پێی گوتراوە، (وسق)، هەندێكیش گوتوویانە، وەسقێك بریتیە لە شەست (٦٠) صاع، هەر صاعێكیش چوار مستە، صاع بە كوردیی ڕبەی پێ دەڵێن، كە چوار مستە، وەسقێكیش (٦٠) ڕبەیە.

(اتَّسَقَ): ( الإتِّسَاقُ: الإجْتِمَاعُ وَالإطِّراد)، مانگ كاتێك كۆ دەبێتەوە، جێخونكە دەكات، هەندێك لە زانایانی گەردووناس گوتوویانە: شەوانی: (١٣، ١٤، ١٥)ی مانگ، ئەو شەوانەی (اللّيَالُ البيض) پێ دەگوترێ، شەوە سپییەكان، كە مانگ دەگاتە حاڵەتی ئەو پەڕی تەواویی لە نێوە ڕاستی ئاسماندا.

(لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ): واتە: حاڵ لە دوای حاڵیان بەسەر دێ، دوایی زیاتر باسی دەكەغن، كە (طَبَق): بە مانای چین دێ، هەروەها بە مانای شتێكیش دێ كە بەسەر شتێك دادەرێ و بە ئەندازەی خۆیەتی، واتە: وەك چۆن شتێك چین لەسەر چین هەڵدەچنرێ، ئێوەش حاڵەت لەسەر حاڵەتتان بەسەر دێ، یان: قۆناغ قۆناغ دەچنە پێش.

(يُوعُونَ): (الوَعِيُ: حِفْظُ الشيءِ، الحَدِيث ونحوه، الإيْعَاءُ: حِفْظُ الأَمْتِعَةِ فِي الوِعَاءِ)، (يوعون): لە (وعي)یەوە هاتوە، كە بریتیە لە پاراستنی قسەو لەبەركردنی وێنەی وی، (إيعاء): بریتیە لەوەی كەل و پەلێك لە توورەكەیەك، لە زەرفێك دا كە تێیدا هەڵدەگیرێ، بپارێزرێ.

(غَيْرُ مَمْنُونٍ): ناژمێردراو، یاخود: (غَيْرُ مَحْدُودٍ وَغَيْرُ مَنْقُوص)، بڕاو و ناتەواو نیە، گوتراوە: (المِنَّةُ تَهْدِمُ الصَّنِيعَة)، منەتكردن چاكە هەڵدەوەشێنێنەوە، بەڵام لە بەرانبەریشیدا، گوتراوە: (إِذَا كُفِرَتِ النِّعْمَةُ، حَسُنَتِ المِنَّة)، هەر كاتێك چاكە نادیدە گیرا، ئەو كاتە باسكردنی و منەتكردن باشە، وەك بیر خستنەوەی بابای سپڵەو ناسوپاس.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوای بەرزو مەزن لەم سوورەتە موبارەکەدا، کە لە بیست و پێنج (٢٥) ئایەت پێکهاتوە، سێ بابەتان باس دەکات:

١- لە ئایەتەکانی: (١ - ٥)دا، بابەتێك.

٢- دوایی لە دە ئایەتەکانی: (٦ - ١٥)دا، بابەتێك.

٣- ئنجا لە دە (١٠) ئایەتی دوای وانیش دا، کە دە (١٠) ئایەتی کۆتایین، ئایەتەکانی: (١٦ - ٢٥)، بابەتێك.

سەرەتا خوای بەرزی مەزن دەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١- ئەم کارەم دەست پێدەکەم، بە ناوی خوا.

٢- بە پێی بەرنامەی خوا، ئەم کارە دەکەم.

٣- بە پشت بەستنم بە خوا، ئەم کارە دەکەم.

٤- بۆ وەدەستهێنانی پاداشت و ڕەزامەندیی خوا، ئەم کارە دەکەم.

ئنجا خوای پەروەردگار دێتە سەر بابەتی یەکەم لە سێ بابەتە سەرەکییەکەی کە ئەم سوورەتە موبارەکە دەیانگرێتە خۆی و، دەفەرموێ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾، هەر کات ئاسمان لەت بوو، (شق): بریتیە لە لەت بوونی شتێك و پارچە پارچە بوونی، هەر کاتێك ئاسمان پارچە پارچە و لەت بوو، ﴿وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ﴾، گوێی گرت بۆ پەروەردگاری و، شایستەش بوو گوێ بگرێ، یانی: گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بوو، بۆ پەروەردگاری و، شایستەی ئەوەشە گوێ بگرێ و فەرمانبەر بێ.

﴿ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ﴾، هەر کاتێك زەویش لێك کێشرایەوە، پانڕاخرا، ﴿ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ﴾، هەرچی تێیدایە، فڕێیداو خۆی خاڵیی کردەوە، خۆی بە تاڵ کردو هەرچی لە هەناویدا بوو، هەڵیدایە دەرێ، ﴿ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴾، گوێی گرت بۆ پەروەردگاری و شایستەش بوو گوێ بگرێ، لێرەدا خوای بەرزو مەزن، هەم باسی ئاسمان دەکات، کە لەت دەبێ و گوێ دەگرێ بۆ پەروەردگاری و شایستەشە گوێ بگرێ، هەم باسی زەوی دەکات کە لێك دەکێشرێتەوەو، هەرچی لە خۆیدا هەڵیگرتوە، فڕێی دەداتە دەرێ و، خۆی خاڵیی دەکاتەوە لە هەموو شتێك، بەڵام دوایی خوا ﷻ باسی نەکردوە چی دەبێ؟

واتە: (إذا)، کە تێکراو (ظرف)ی ڕوودانی شتێکەو، مانای مەرجیش دەگرێتە خۆی، وەڵامەکەی باس نەکراوە، بۆ ئەوەی زەینی بەشەر بۆ هەر شتێك بچێ، کە بگونجێ لەگەڵ نێوەڕۆك و ڕەوتی ئەو ئایەتە موبارەکانەدا، واتە: هەر کاتێك ئاسمان لەت بوو و گوێی گرت بۆ پەروەردگاری و شایستەش بوو، گوێ بگرێ، هەروەها هەر کاتێك زەوی لێك کێشرایەوەو پانڕاخراو، هەرچی لە نێو خۆیدا هەڵیگرتبوو، فڕێیدایە دەرێ و خۆی خاڵیی کردەوەو، گوێی گرت بۆ پەروەردگاری و شایستەش بوو، گوێ بگرێ: ئەی مرۆڤ! تۆ سزاو پاداشتت بۆ دێتە گۆڕێ، یان: لەو کاتەدا ئەی مرۆڤ! زیندوو دەکرێنەوەو لێت دەپرسرێتەوە.

دوایی خوا ﷻ دێتە سەر بابەتی دووەم: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾، ئەی مرۆڤ! لێرەدا هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە (**الإنسان**)، (ال)ەکەی بۆ ناساندنەو بۆ جینسەو تێکڕای مرۆڤان دەگرێتەوە، چونکە دوایی خوای زاناو شارەزا دابەشیان دەکات، بۆ کەسانێك کە بە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوەو، کەسانێك کە لە پشتەوەڕا نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، کەواتە: لێرەدا مەبەست لە (**الإنسان**) هەموو مرۆڤەکانە، ئەی مرۆڤەکان! ﴿ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴾، بە دڵنیایی تۆ ڕەنج دەدەی، تاکو دەگەیە پەروەردگارت، واتە: تۆ کە لەم ژیانە دنیاییەدا، دانراوی ڕەنج دەدەی، خۆت ماندوو دەکەی و هەوڵ دەدەی بەو شێوەیەی بۆ خۆت حەز دەکەی و، بۆ هێنانە دی ئەو ئامانجانەی حەزیان پێ دەکەی، هەتا دەگەیە پەروەردگارت، کە

مەبەست پێی کاتی مردنە لە قۆناغی بەرزەخدا، یاخود مەبەست پێی قۆناغی قیامەتە، کە لەوێ سزاو پاداشتی یەکجارەکیی مرۆڤ دەدرێتەوە، ﴿ فَمُلَٰقِيهِ ﴾، سەرەنجام پێی دەگەی، واتە: بە پەروەردگارت دەگەی، یاخود: بە بەرهەمی ڕەنج و زەحمەت و تێکۆشانەکەت دەگەی، هەردوو واتایەکە گونجاون، ئنجا خوا ﷻ ئەنجامەکە باس دەکات: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾، **(أمّا)**، وەك زۆرجار گوتوومانە: پیتێکە بۆ ڕوونکردنەوە بەکاردەهێنرێ **(حرف تفصيل)**، یانی: ئنجا هەر کەسێك بە دەستی ڕاستی نووسراوەکەی بدرێتەوە، واتە: ئەو نووسراوەی، ئەو لیستەی کردەوەکانی تێدا تۆمار کراون، ﴿ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴾، ئەوە لەمەودوا بە لێپرسینەوەیەکی ئاسان لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ، لێپرسینەوەی ئاسانیش وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی و دواییش فەرمایشتەکان دێنین ئەوەیە کە نەگوترێ: بۆچی ئەوەت کردو بۆچی ئەوەت نە کرد؟ ئەوە چۆن بوو، ئەوە چۆن نەبوو؟ بەڵکو تەنیا کردەوەکانی پێشان بدرێن، چونکە هەر کەسێك وتووێژی لەگەڵدا بکرێ و، شەڕە قسەی لەگەڵدا بکرێ، لە لێپرسینەوەدا، تووشی سزاش دەبێ.

﴿ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴾، هەر کەسێك بە دەستی ڕاستی نامەی کردەوەکانی بدرێتەوە، لێپرسینەوەیەکی سووك و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێ و، بە شادمانیی و دڵخۆشییش دەگەڕێتەوە بۆ لای کەس و کاری کە چاوەڕێی دەکەن، ئایا ئەو کەس و کارەی کێن؟ دەگونجێ مەبەست پێی ئەوانە بێ کە خوا لە بەهەشت دا بۆی داناون: حۆرییەکان و ئەو لاوو گەنجانەی تەرخانکراون خزمەتی بەهەشتییان بکەن، یاخود: ئەوانەی لە دنیادا کەس و کاری بوون، ئەوانیش هەر کامێکیان چاوەڕێی ئەوی دیکە دەکات، داخۆ چۆن دێتەوە؟.

﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴾، بەڵام کەسێك نووسراوەکەی لە لای پشتەوەی ڕا بدرێتەوە، لە پشتیەوە بیدرێتەوە، لە شوێنەکانی دیکەدا هەموویان خوا فەرموویەتی: ﴿ بِشِمَالِهِۦ ﴾، بە دەستە چەپی، زانایان گوتوویانە: لێرەدا کە دەفەرموێ: لە پشتەوەڕا، لەگەڵ ئەوەدا کە دەفەرموێ: بە لای چەپیدا، دژ ناوەستێ، واتە: بە لای پشتەوەدا،

بەڵام دەبێ بە دەستە چەپی، وەری بگرێتەوە، ئنجا هەر کەسێك بەو جۆرە نامەی کردەوەکانی بدرێتەوە: ﴿ فَسَوْفَ يَدْعُواْ ثُبُورًا ﴾، لە مەودوا لە بەینچوون بانگ دەکات، واتە: بە ئاوات دەخوازێ لە نێوبچێ و نەمێنێ، یاخود: تووشی حاڵەتێك دێ، مەرگی بە ئاوات دەخوازێ، ﴿ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴾، دەشخرێتە نێو کڵپەی ئاگری دۆزەخەوەو بە شێوەیەکی تایبەت لەوێدا دەسووتێنرێ، دەپیشێنرێ و دەبرژێنرێ، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴾، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو کەسە لە نێو کەس و کاریدا (لە دنیادا) زۆر دڵخۆش و کەیف خۆش بوو، کەیف خۆشیی و دڵخۆشیی بە ناحەق و بوغڕاو یاخیی بوونەوە، ﴿ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴾، ئەو پێی وابوو ناگەڕێتەوە، پێی وابوو کە مرد، تازە کۆتایی دێ و، جارێکی دیکە دروست ناکرێتەوەو زیندوو ناکرێتەوە، ﴿ بَلَىٰٓ ﴾، با، دەگەڕێتەوەو دروست دەکرێتەوەو زیندوو دەکرێتەوە، ﴿ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاری بینەری بوو، دەیبینی چی کردوەو چۆنی کردوە!، ئنجا چۆن دەبێ وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچێ؟

ئنجا خوای بەرز دێتە سەر بابەتی سێیەم و کۆتایی و، دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴾، وانیە (کە ئێوە دەڵێن، یاخود: وانیە کە ئێوە بیر دەکەنەوە، کە بەس لە دایك بوون و مردن هەبێ و، زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت و لێپرسینەوە نەبێ)، ﴿ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴾، سوێند دەخۆم بە زەردە، (شَفَق)، بەو سوورایيە دەگوترێ، کە بە بنی ئاسمانەوە دەمێنێ، دوای خۆرئاوابوون، زانایان دەڵێن: نوێژی خەوتنان کاتێك دەبێ، کە سوورایی و زەردایی لە ئاسۆی ئاسماندا نەما، بۆ کەوتنە نێو کاتی نوێژی خەوتنان، دەبێ نوێژی شێوان کاتەکەی کۆتایی بێ، هەندێکیش گوتوویانە: (شفق)، ئەو سوورایيیەیە کە بەبنی ئاسمانەوە دەمێنێ، بە ئاسۆوە دەمێنێ، لە کاتێکدا خۆر هەڵدێ بەر لەوەی خۆر دەربکەوێ، سوورایيیەکەش پێشێ زەردایيە دوایی وردە وردە سوور هەڵدەگەڕێ، بەر لەوەی خۆر دەربکەوێ، بەڵام لێرەدا بە پێی ڕەوتی ئایەتەکان، بۆمان دەردەکەوێ کە زیاتر مەبەست پێی بوولێڵی ئێوارەیە، ئەو کاتەی خۆرئاوا دەبێ، چونکە دوایی باسی هاتنی شەو دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴾، هەروەها سوێند دەخۆم بە

شەوگارو بەوەی شەوگار كۆی دەكاتەوە، دروستكراوەكان لە ڕۆژێ دا بڵاو دەبن، ڕۆژ ڕووناكەو خەڵك دەچێ بە دەم كارو كاسپیی خۆیەوە، مرۆڤە خاوەن عەقڵ و هەستەكان بڵاودەبنەوە بە زەویدا، بۆ داواكردنی بژیوی خوای پەروەردگار، بۆ جموجۆڵ و ئیش و كار، بەڵام لە كاتی شەودا، خەڵكەكە هەر كەسە دەچێتەوە شوێنی خۆی و، جۆرێكی دیكە لە دروستكراوانی خوا بڵاودەبنەوە، ئەگەر جندو شەیتانەكانن، ئەگەر جڕجانەوەرو دەعبان، دەرفەت وەردەگرن لە تاریكیی شەو بۆ ڕاوكردن و نێچیر پەیدا كردن و بژیو پەیدا كردن، ﴿ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴾، سوێندیش دەخۆم بە مانگ، كاتێك جێخونكە دەكات و كۆ دەبێتەوە، كە زیاتر شەوانی: (١٣ و ١٤ و ١٥)، دەگرێتەوە، سوێند بەو چوار شتانە:

﴿ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴾، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (لَتَرْكَبَنَّ)، كە ئەو كاتە مەبەست پێی مرۆڤە بە تەنیا، بەڵام: ﴿ لَتَرْكَبُنَّ ﴾، یانی: ئەی مرۆڤەكان هەمووتان سواری چین لەسەر چین، دەبن، واتە: حاڵ لەسەر حاڵتان بەسەر دێ، وەك چۆن چەند شتێك كە بە ئەندازەی یەك بن، لەسەر یەك دادەنرێن، ئێوەش حاڵ لەسەر حاڵتان بەسەر دێ.

زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان كردوە، كە دوایی زیاتر شی دەكەینەوە، هەندێك گوتوویانە:

أ- مەبەست پێی حاڵەتی (**نطفة**)یە، دوایی (**علقة**)یە، دوایی (**مضغة**)یەو... هەروەها.

ب- هەندێكی دیش گوتوویانە: مەبەست حاڵەتی منداڵییە، دوایی گەنجییە، دوایی كامڵ بوونە، ئنجا پیرییە، تاكو مردن.

ج- هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست پێی حاڵەتی دنیایە، دوایی بەرزەخە، دوایی قیامەتە، دوایی نیشتەجێ بوونە لە بەهەشتدا، یان لە دۆزەخ دا.

هەروەها مانای دیكەشیان بۆ لێداونەوە.

خوا ﷻ وەك ڕەخنەگرتن و سەرزەنشتكردن دەفەرموێ: ﴿ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەوە چییانە، بۆچی بڕوا ناهێنن، چ شتێك ڕێی لێ گرتوون؟ ئەمە سەرسوڕماندنە بە

بڕوا نەهێنانی بێبڕوایەکان، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو شتانەیان لەبەر چاون! ﴿ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ﴾، هەروەها کاتێك قورئانیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە، کڕنووش نابەن، یاخود: بۆ خوا ملکەچ نابن؟ ﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُكَذِّبُونَ ﴾، نەك هەر بڕواناهێنن و کڕنووش نابەن، لە کاتێکدا قورئانیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، بەڵکو ئەوانەی بێبڕوان بە درۆ دادەنێن، چی بە درۆ دادەنێن؟ ڕۆژی دوایی بە درۆ دادەنێن، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدرۆ دادەنێن، قورئان بە درۆ دادەنێن، هەموو ئەو شتانە بە درۆ دادەنێن کە پێویستە بە ڕاست دابنرێن و بڕوایان پێ بهێنرێ، ﴿ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴾، خواش زاناترە بەوەی هەڵیدەگرن، دەیپارێزن، واتە: لە بیرو هۆشی خۆیان و لە دڵ و دەروونی خۆیاندا، لە نیازو مەبەستەکان و خولیاو بیرو بۆچوونەکان، خوا زاناترە بەوەی هەڵیدەگرن و، لە خۆیان پێیان زاناترە، ﴿ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، ئنجا موژدەی ئازارێکی بە ئێشیان پێ بدە.

هەڵبەتە موژدە بۆ شتی باشە، بەڵام ئەمە لێرەدا:

أ- یان بە توانجەوەیە، واتە: موژدەیان پێ بدە، ئەگەر شتێکی دڵخۆشکەر هەبێ بۆ ئەوان، بەس بریتیە لە ئازاری بە ئێش.

ب- یان مەبەست ئەوەیە کە بڕواداران موژدەی بەهەشتیان پێدەدرێ و، ئەوانیش موژدەی ئازارێکی بە ئێشیان پێ دەدرێ، ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴾، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، ﴿ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، هەروەها کردەوە باشەکانیشیان ئەنجام داون، ئایا ئەوانە چۆنن؟ ﴿ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴾:

١- پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە.

٢- یاخود: پاداشتێکیان هەیە کە بە چاویان دا نادرێتەوەو، منەتیان بەسەردا ناکرێ.

٣- یاخود: پاداشتێکیان هەیە کە هیچ کەم و کوڕیی و نارێکیی و نوقصانییەکی تێدانیە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**باسی شەق و پەق بوونی ئاسمان و ملکەچبوونی بۆ پەروەردگاری و، لێککێشرانەوەی زەوی و، فڕێدانی هەرچی تێیدایەو، خۆ بە تاڵ کردنی و ملکەچبوونی بۆ پەروەردگاری و شایستە بوونیشیان بۆ ئەو ملکەچییە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ۝٢ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ۝٣ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ۝٤ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ۝٥﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾، هەر کاتێك ئاسمان لەت و پەت بوو، شەق و پەق بوو، وشەی: ﴿إِذَا﴾، وەك زۆر جاری دیکە گوتراوە: (**إذا: ظَرْف لِلْمُسْتَقْبَلِ وَالفِعْلُ الَّذِي فِي الجُمْلَةِ المضَافَةِ إِلَيْهِ، (إذا)، مؤوّل بالمسْتَقْبَلِ، وصِيغَة الماضي للتنبيه عَلَى وقوعِهِ المتَحَقّق**)، واتە: ﴿إِذَا﴾، (**ظرف**)ە بۆ داهاتوو، ئەو کردارەش کە لەو ڕستەیەدایە، ﴿إِذَا﴾ی پاڵ دەدرێتە لا {﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾}، هەرچەندە (**انشقت**) لە ئەسڵدا بە شێوەی ڕابردوو هاتوە: {واتە: لەت و پەت بوو}، بەڵام مانا دەکرێ بە داهاتوو، {﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾، هەر کاتێك ئاسمان لەت بوو، چونکە ﴿إِذَا﴾ی چۆتە سەرو ئەویش مانای ڕابردوو دەگوازێتەوە بۆ داهاتوو، بەڵام بە شێوەی ڕابردوو هاتوە، بۆ ئاگادارکردنەوە لەوەی بە دڵنیایی هەر ڕوودەدا.

شایانی باسە: ﴿إِذَا﴾ کاتێك دەچێتە سەر ڕستەیەك، ڕوودانی ئەو واتایەی لەو ڕستەیەدا هاتوە، مسۆگەر دەکات، بە پێچەوانەی (**إنْ**)ەوە کە دەیخاتە ئەگەرو نەگەرەوە.

٢)- ﴿ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴾، بۆ پەروەردگاری فەرمانبەر بوو، گوێی گرت، شایستەش بوو گوێ بگرێ، ﴿ وَأَذِنَتۡ ﴾، یانی: (سمعت)، گوێی گرت.

﴿ وَأَذِنَتۡ ﴾، (فِعْلُ (أَذِنَتْ) مُشْتَقٌّ مِنْ اسْمِ جَامِدِ (أُذُنْ)، وَالأُذُن آلَةُ السَّمْعِ بالإنْسَانِ، أَذِنَ لَهُ أي، اسْتَمَعَ لَهُ ...)، واتە: کرداری (أَذِنَت) {کە کردارێکی ڕابردوویە}، داتاشراوە لە ناوی وشك (جامد)ی (أُذن) کە بە ئەندامی بیستن لە مرۆڤدا دەگوترێ، (أَذِنَ لَهُ)، واتە: گوێی بۆ هەڵخست، گوێی خۆی دایە.

﴿ وَحُقَّتۡ ﴾، (أي: هِي مَحْقُوقَةٌ بهَذَا)، ئەویش پێی شایستە کراوە وابێ و بەوە شایستەیە.

٣)- ﴿ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ﴾، هەروەها هەر کاتێك زەوی لێککێشرایەوە، یاخود: پانڕاخرا، ﴿ مُدَّتۡ ﴾، وەك چۆن چەرم یان پێست لێك دەکێشرێتەوەو گنجی لێ ناهێڵرێ، پێستێك کە خڕکراوەتە سەر یەك و لۆچ و گنجی هەن، کە لێك دەکێشرێتەوە پانتاییەکەی زیاتر دەبێ، زەویش بەو شێوەیە لێك دەکێشرێتەوە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (طه)دا، فەرموویەتی: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡجِبَالِ فَقُلۡ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسۡفٗا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعٗا صَفۡصَفٗا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجٗا وَلَآ أَمۡتٗا ﴿١٠٧﴾ ﴾، واتە: لە بارەی چیایەکانەوە پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: پەروەردگارم بە وردو خاشکردن، وردو خاشیان دەکات، ﴿ فَيَذَرُهَا قَاعٗا صَفۡصَفٗا ﴾، لێیان دەگەڕێ، دەیانکاتە تەختاییەکی بێ گرێ و گۆڵ، ﴿ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجٗا وَلَآ أَمۡتٗا ﴾، نە هیچ لارییان تێدا دەبینی، نە هیچ بەرزاییان تێدا دەبینی، (عوج)، واتە: لاریی و خواریی، (أمت)، واتە: بەرزایی، یانی: بێ گرێ و گۆڵ دەبێ.

بە باشی دەزانم لە بارەی ئایەتی پێشەوە: ﴿ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ﴾، ئەم دوو دەقە بێنین:

یەکەمیان: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {تُمَدُّ الأَرْضُ مَدَّ الأَدِيمِ لِعَظَمَةِ الرَّحْمَنِ، فَلاَ يَكُونُ لِرَجُلٍ مِنْ بَنِي آدَمَ فِيهَا إِلاَّ مَوْضِعَ قَدَمَيْهِ} **(أخرجه الحاكم: ٨٧٠١، وقال: صحيح الإسناد على شرط الشيخين).**

واتە: زەوی لە ڕۆژی قیامەتدا لێك دەكێشرێتەوە وەك چۆن چەرمێك (پێستێك) لێك دەكێشرێتەوەو ڕادەكێشرێ، پان ڕادەخرێ، لەبەر مەزنیی خوای بە بەزەیی، دوایی هەر كام لە ڕۆڵەكانی ئادەم تەنیا بە ئەندازەی دوو پێیەكانی شوێنی دەست دەكەوێ، {ئەندازەی ئەوەی لێی بوەستێ}.

دووەمیان: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **{لَمْ يَأْذَنِ اللهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِيِّ أَنْ يَتَغَنَّى بِالْقُرآنِ، يُرِيدُ: يَجْهَرُ بِهِ}** (**أخرجه البخاري: ٧٠٤٤، ومسلم: ٧٩٢، وأبو داود: ١٤٧٣، والنسائي: ١٠١٧، وابن حبان: ٧٥٢**).

واتە: خوا ﷻ گوێی نەگرتوە بۆ هیچ شتێك بە ئەندازەی گوێگرتنی بۆ پێغەمبەرێك كە قورئان بە دەنگی خۆش دەخوێنێ: مەبەستی ئەوەیە دەنگی پێ بەرز دەكاتەوە.

(**أَذِنَ**)، یانی: (**اسْتَمَعَ**)، گوێی گرت، گوێی هەڵخست، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی قبووڵ كردن و پێخۆشبوونی خوای پەروەردگارە، بۆ دەنگی ئەو پێغەمبەرەی ﷺ قورئان دەخوێنێ و دەنگی خۆی پێ دەلارێنێتەوە.

ئەم دەقەی سوننەت تیشكمان بۆ دەخاتە سەر چەمك و واتای ئەو ڕستە موبارەكەی دەفەرموێ: ﴿وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ﴾، كە خوا عز وجل بۆ ئاسمان بەكاری هێناوە: ئاسمان گوێی گرت بۆ پەروەردگاری و فەرمانبەریی كرد، بە قسەی كرد، ﴿وَحُقَّتۡ﴾، شایستەی ئەوەش بوو گوێ بگرێ، هەروەها زەویش بە هەمان شێوە.

٤)- ﴿وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ﴾، هەرچی تێیدایە فڕێیدایە دەرو هەڵیداو، خۆی خاڵیی كردەوە، ﴿وَأَلۡقَتۡ﴾، (**أي: قَذَفَتْ وَرَمَتْ**)، واتە: فڕێیداو هاویشتی، ﴿مَا فِيهَا﴾، (**كُلَّ مَا فِي بَاطِنِهَا فَلَمْ يَبْقَ مِنْهُ شيءٌ**)، هیچ شتێكی لە خۆیدا نەهێشتەوە، هەرچی لە دەروونی دایە، هەمووی فڕێدایە دەرێ، لێرەدا مەبەست ئەو جەنازانەن كە دەخرێنە نێو زەوییەوە، هەروەها هەر شتێكی دیكەش كە لە زەوی دا هەیە، زەوی هەموو هەناوی خۆی خاڵیی دەكاتەوە، ﴿وَتَخَلَّتۡ﴾، (**التَّخَلِّي: قُوَّةُ الخُلوِّ عَنِ الشَّيءِ**)، (**تَّخَلِّي**) بە هێزیی خاڵیی بوونەوە لە شتێك دەگەیەنێ، واتە: زۆر بەهێزەوەو بە خۆهەڵتەكاندنەوە،

هەرچی لە نێو هەناویدا هەیە، فڕێیدەداتە دەرێ و هیچ شتێك لە خۆیدا ناهێڵێ، لێرەدا وەڵامەکە دیار نیە، بۆیە زانایان لە بارەی وەڵامەکەیەوە، ڕاجیاییان هەیە:

١- هەندێك گوتوویانە: وەڵامەکەی ئەوەیە کە دوایی دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴾، تاکو کۆتایی ئایەتەکان، یانی: کاتێك ئەوانە ڕوویان دا، ئەی مرۆڤ! تۆ ڕەنجدەری تاکو دەگەیەو پەروەردگارت و بە بەری ئەو ڕەنجەشت دەگەی، ئنجا کەسێك بە دەستی ڕاستی نووسراوی کردەوەکانی بدرێتەوە، بە ئاسانیی لێی دەپرسرێتەوەو، بە خۆشیی دەگەڕێتەوە بۆ لای کەس و کاری، بەڵام کەسێك لە پشتەوەڕا نامەی کردەوەکانی بدرێتەوە، لە بەینچوون بە ئاوات دەخوازێ، چونکە ژیانی دنیایدا لە نێو کەس و کاری دا دڵخۆش بووەو پێشی وا بووە، ناگەڕێتەوە بۆ لای خوا.

٢- بەڵام هەندێك گوتوویانە: وەڵامەکەی ئەوەیە: ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾، ﴿ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ﴾، یانی: کاتێك ئەو گۆڕانکارییانە لە ئاسمان و زەویدا ڕوویان دا، ئنجا هەر کەسێك بە دەستی ڕاستی نووسراوەکەی بدرێتەوە، کە کردەوەکانی تێدا تۆمار کرابوون، ئەوە حاڵی وایەو، کەسێکیش لە پشتەوەی ڕا بیدرێتەوە، حاڵی بەو شێوەیە.

## کورتە باسێک لە بارەی
## پانتایی زەوی و کیشوەرو ئۆقیانووسەکانیەوە

بەڕێـــزان!

بە پێویستم زانی لێرەدا هەندێك زانیاریی دەربارەی زەوی و پانتایی زەویی و وشکانیی زەوی و، ئۆقیانووسەکانیەوە، کورتە باسێك لە سێ بڕگەدا بخەینەڕوو:

**بڕگەی یەکەم:**

سەرەتا دەڵێین: کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ ﴾، هەر کاتێك زەوی لێککێشرایەوەو، هەرچی تێیدایە هەیە فڕێیدایە دەرێ و، خۆی خاڵیی کردەوە، **(فخرالدين الرازي)**[1]، لەو بارەوە گوتوویەتی:

وشەی: ﴿ مُدَّتْ ﴾، لە ﴿ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴾دا، دوو ئەگەری هەن:

**(الأول: مَأْخُوذٌ مِنْ مَدَتُّ الشيءَ فَامْتَدَّ، وهو أن تُزَال جبالها بالنَّسْفِ، كما تعالى:** ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ ﴾**طه، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ مُدَّتْ مَدَّ الأديمِ العُكاظي، لأن الأديم إذا مُدَّ زالَ كل انثناء فيه واستوى.**

**والثاني: أنه مأخوذ من مَدَّه بمعنى أَمَدَّهُ، أي: يُزَادُ في سعَتِهَا يوم القيامة لوقوف الخلائق عليها للحساب، واعلم أنه لا بد من الزيادة في وجه الأرض سواء كان ذلك بتمديدها أو بإمدادها، لأن خلق الأولين والآخرين لما كانوا واقفين يوم القيامة على ظهرها، فلا بد من الزيادة في طولها وعرضها).**

تەنیا لە تەفسیرەکەی **(الرازي)**دا ئەوەم بینی و قسەیەکی ژیرانەو زانستییانەشە:

---

(١) مفاتيح الغيب، المجلد: ١٦، الجزء: ٣٠، ص: ١٠٤.

واتە: وشەی: ﴿ مُدَّتْ ﴾، کە خوا بۆ زەوی بەکارهێناوە:

**١-** یان لە: (**مَدَتُّ الشَّيءَ فَامْتَدّ**) وەرگیراوە، یانی: شتەکەم لێککێشایەوەو لێککێشرایەوە، ئەویش ئەوەیە کە چیایەکانی، بە وردوخاش کردن لەسەر رووی زەوی لابچن، وەك لە سووڕەتی (**طه**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ ﴾**طه**، واتە: لە بارەی چیایەکانەوە لێت دەپرسن، بڵێ: پەروەردگارم وردو خاشیان دەکات و، زەوی دەکاتە تەختاییەکی سافی بێ گرێ و گۆڵ، کە هیچ خوار خێچیی و بەرزیی و نزمیی تێدا نابینی، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ﴿ مُدَّتْ ﴾، (**مُدَّت مدّ الأديم العُكاظي**)، زەوی لێك دەکێشرێتەوەو پان ڕادەخرێ، وەك چۆن چەرمی عوکازیی (جۆرە چەرمێك بووە فرۆشراوە، پاڵدراوەتە لای بازاڕی **عُکاظ**)، ئاوا لێك دەکێشرێتەوە.

واتای دووەمی: ﴿ مُدَّتْ ﴾، (**مَدَّه بمعنى أَمَدَّهُ، أي: يُزَادُ في سعَتِهَا**)، واتە: بۆی زیاد کرد، واتە: لە فراوانییەکەی زیاد دەکرێ لە ڕۆژی قیامەتدا، لەبەر ئەوەی هەموو دروستکراوەکان لەسەری دەوەستن، بشزانە! کە دەبێ ڕووی زەوی بۆی زیاد بکرێ، چ بەوەی لێك بکێشرێتەوە، چ بەوەی زیادەی بخرێتە سەر، چونکە دروستکراوە پێشووەکان و دروستکراوە دواییەکان، هەموویان لەسەر پشتی زەوی دەوەستن، دەبێ لە باری درێژایی و لە باری پانایی زیاد بکرێ.

بە ڕاستیی (**فخرالدين الرازي**)، پیاوێکی ڕۆشنبیر بووە و فیکرو بۆچوونەکانی ڕۆژگاری خۆی تاکو ڕاددەیەکی زۆر هەزم کردوون، زانیویەتی زەوی خڕ و هێلکەیی هەڵکەوتوە، بۆیەش هێڵی درێژی هەن و، هێڵی پانیشی هەن، هێڵە درێژەکان لە باکوورەوە بۆ باشوور دەچن و، هێڵەکانی دیکەش لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، ئنجا (**الرازي**)، وای لێکداوەتەوە کە لەسەر ئەم زەوییەی ئێمە جێی هەموو ئەو مرۆڤانە نابێتەوە، کە هەر لە سەرەتای دروست بوونی مرۆڤەوە، تاکو کۆتایی مرۆڤان، هەموویان لەسەر بووەستن،

گوتوویەتی: دەبێ لێی زیاد بکرێ، ئنجا چ بە لێککێشانەوەی بێ و ڕابکێشرێ، چ بەوە بێ زیادەی بخرێتە سەر.

**بڕگەی دووەم:**

لە تەفسیری سوورەتی (إبراهیم)دا لە لێکدانەوەی ئەو ئایەتە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی زەوی جیا لەم زەوییە دەبێ و، ئاسمانەکانیش (جیا لەم ئاسمانانە دەبن)، هەموویان بۆ خوای تاکی ملپێکەچکەر دێنە گۆڕێ، باسێکمان کردوە، کە ئەم زەوییە وەك ئێستای نامێنێ و، ئاسمانەکانیش وەك ئێستایان نامێنن، ئەم حاڵەتەی ئێستای گەردوون گۆڕانی بەسەردا دێ، وەك خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتدا باسی کردوە: ئاسمان دەقڵیشێ و شڕ دەبێ، ئەستێرەکان هەڵدوەرن، زەوی بەو شێوەیەی نامێنێ، دەریایەکان گڕ دەگرن، چیاکان و زەوی پێکدا دەدرێن و وردو خاش دەبن، بە کورتیی: ئەم حاڵەتەی ئێستای گەردوون بە ئاسمان و زەوییەوە بەو شێوەیەی ئێستای نامێنێ، لەوێ کورتە باسێکمان کردوەو پێویست ناکات، لێرە بچینەوە سەر درێژەی ئەو کورتە باسە.

با بزانین پانتایی زەوی چەندە هەمووی بە کیلۆمەتر دووجا، پاشان چەندی وشکانییەو، وشکانییەکەشی دابەش دەبێ بۆ چەند کیشوەر (**قارة**)، هەروەها چەندیشی ئاوو دەریایەو، دەریایەکانیش دابەش دەبن بۆ چەند ئۆقیانووس؟[١].

**١- ڕووبەری (پانتایی) زەوی:**

پانتایی زەوی (٥١٠٧٢٠٠٠)کم٢، زەوی هەمووی بە وشکانیی و بە دەریاوە: (پێنجسەدو دە ملیۆن و حەفتاو دوو هەزار) کیلۆمەتر دووجایە، ئنجا ئەو (پێنجسەدو دە ملیۆن و حەفتاو دوو هەزار) کیلۆمەتر دووجایە، دابەش دەبێ بۆ وشکانیی و بۆ ئاو (دەریا)، وشکانییەکەی پانتاییەکەی: (١٤٨،٩٤٠،٠٠٠)کم٢، (سەدو چل و هەشت ملیۆن

(١) ئێمە ئەم زانیارییانەمان لە (ئینتەرنێت) وەرگرتوون.

و نۆسەدو چل هەزار) کیلۆمەتر دووجایە، پانتایی ئاویش لەسەر ڕووی زەوی (واتە: ئۆقیانووسەکان)، دەوری (٣٦١،١٣٢،٠٠٠)کم٢، (سێسەدو شەست و یەك ملیۆن و سەدو سی و دوو هەزار) کیلۆمەتر دووجایە، کەناراوەکانی لە نیزیك دەریاکانەوە هەن، لە نێوان دەریاو وشکانیی دا، ئەوانیش (٣٦٥،٠٠٠)کم٢ دەبن، کۆی ڕووبەری وشکانیی کە لە پانتایی زەوی دادەیگرێ، بریتیە لە: (٢٩،١٪) لە کۆی پانتایی ڕووی زەوی، کە دابەش دەبێ بۆ حەوت کیشوەر، ئەو حەوت کیشوەرەش بەم شێوەیەن:

### ٢- حەوت کیشوەرەکەی زەوی:

١- گەورەترین کیشوەر لە وشکانیی ڕووی زەویدا کیشوەری ئاسیایە، کە ڕووبەرەکەی (٤٤،٣٩١،١٦٢)کم٢، ئەوە گەورەترین پارچە وشکانییەکە پێی دەگوترێ: کیشوەر (**قارة**) ی ئاسیاو، دەوری: (٤،٥٧٥،٦٥٢،٦٧٥) کەس لە مێژووی (٩)ی (٤)ی ساڵی (٢٠١٩)ی زایینی لەو کیشوەری ئاسیادا دەژین، یانی: (چوار ملیار و نیو) زیاتر، ئەم کیشوەرە دوو تایبەتمەندیی هەن:

أ- بەرزترین شوێنی وشکانیی لەم کیشوەرەدایە.

ب- هەروەها نزمترین شوێن لەم کیشوەرە دایە، بەرزترین شوێن بریتیە لە لووتکەی (ئیڤریست)، کە (٨،٨٦٤)م، واتە: نیزیکەی (٩)کم لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە، نزمترین شوێنیش بریتیە لە دەریاچەی مردوو.

٢- لە دوای ئاسیا کیشوەری ئەفریقیا دێ، ئەویش دووەمین کیشوەری گەورەیە لە ڕووی پانتاییەوەو ڕووبەرەکەی: (٣٠،٢٤٤،٤٩)کم٢، دانیشتوانی ئەو کیشوەرە (١،٣١٢،٤٣١،٥٨٩) کەسە، لە مێژووی (٩)ی نیسانی ساڵی (٢٠١٩)ی زایینیی دا، تایبەتمەندییەکی ئەم کیشوەرە کە دووەمین کیشوەرە لە ڕووی پانتاییەوە لە وشکانیی زەویدا، ئەوەیە کە درێژترین ڕووباری دنیای تێدایە، کە بریتیە لە ڕووباری نیل.

٣- سێیەمین کیشوەر لە وشکانییدا، بریتیە لە کیشوەری ئەمریکای باکوور، کە ڕووبەرەکەی (٢٤,٢٤٧,٣٩)کم٢، لەم کاتەدا ژمارەی دانیشتووانی ئەو کیشوەرە (کیشوەری ئەمریکای

باكوور) (٣٦٦,٤٩٦,٨٠٢) كەسە، لە (٩/ ٤/ ٢٠١٩)دا، ئیمتیازێكی ئەم كیشوەری سێیەمە لە ڕووی پانتاییەوە، ئەوەیە كە گەورەترین دەریاچەی ئاوی شیرینی لە دنیادا تێدایە، كە بریتیە لە دەریاچەی (سۆبردیور) كە گەورەترین دەریاچەی ئاوی شیرینە لە ڕووی زەویدا.

٤- كیشوەری چوارەم لە ڕووی پانتاییەوە لەسەر ڕووی وشكانیی زەوی، بریتیە لە كیشوەری ئەمریكای خواروو، كە پانتاییەكەی (١٧,٨٢١,٢٩)كم٢، لەو كیشوەرەدا (٤٣١,١٣١,٢٩٥) كەس دەژین، بەر لە مێژووی (٩)ی نیسانی ساڵی (٢٠١٩)ی زایینی، تایبەتمەندییەكی ئەم كیشوەری چوارەمە، ئەوەیە كە درێژترین زنجیرە چیای لە هەموو دنیادا تێدایە، كە بریتیە لە (چیاكانی ئەندیز).

٥- كیشوەری پێنجەم لە وشكانیی زەوی دا، بریتیە لە كیشوەری (ئەنتار تیكا)، پانتاییەكەی (١٤,٢٤٥,٠٠٠)كم٢، بەڵام بێگومان ئەم كیشوەرەی پێنجەم لە ڕووی قەبارەوە، دانیشتووانی تێدا نین، بەڵكو تەنیا چەند هەزار كەسێك لە لێكۆڵەرەوان لەوێدا جاروبار ژیان دەبەنە سەرو، دێن و دەچن لێدەكۆڵنەوە، ئەم كیشوەرەش ئیمتیازەكەی ئەوەیە هەمیشە كە بە بەفر داپۆشراوەو، ئەویش كاریگەریی تەواوی لەسەر پلەی گەرمیی و ڕێژەی شێی لەسەر خڕۆكەی زەوی هەیە، هەروەها بە گشتیی كاریگەریی هەیە لەسەر كەش و هەوای زەوی.

٦- شەشەمین كیشوەر بریتیە لە كیشوەری ئەورووپا، كە لە ڕووی پانتاییەوە شەشەمینەو ڕووبەرەكەی (١٠,٣٥٤,٦٣٦)كم٢، ئێستا لەم كیشوەرەدا (٧٤٢,٩٩٩,١٢٠) كەس ژیان دەبەنە سەر، واتە: لە (٩)ی نیسانی (٢٠١٩)ی زایینی دا، ئەم كیشوەرەش ئیمتیازەكەی ئەوەیە: كە گەورەترین و بچووكترین دوو دەوڵەتی دنیای لە ڕووی پانتاییەوە گرتوونە خۆی، كە گەورەترین دەوڵەت بریتیە لە ڕووسیا لە ڕووی پانتایی و جوگرافیاوەو، بچووكترینیشیان بریتیە لە دەوڵەتی فاتیكان.

٧- كۆتا كیشوەر، كە كیشوەری حەوتەم، كیشوەری ئوستڕاڵیایە، كە گچكەترین حەوت كیشوەرەكەی زەوییە لە ڕووی ڕووبەرو پانتایی زەوییەوەو، پانتاییەكەی نیزیكەی

(٧,٦٦٨,٨٨٤)کم٢، ئێستا دەوری (٢٥,١٥,١٤٦) کەس لەسەر ئەو کیشوەرە ژیان دەبەنە سەر، واتە: لەو مێژووەدا کە ئەو سەرژمێرە کراوە، کە (٩)ی نیسانی ساڵی (٢٠١٩)ی زایینییە، ئەوە بە نسبەت کیشوەرەکانی زەوی و، وشکانیی زەوی کە دابەش دەبێ بۆ حەوت بەش و (٢٩,١٪) هەمووی گۆی زەوی دادەگرێ.

### ٣- پێنج ئۆقیانووسەکەی زەوی:

ئاوی ڕووی زەویی، کە ئاوی ڕووی زەوی گەورەترین پانتایی لە زەویدا دادەگرێ، کە بریتیە لە: (٧٠,٩٪)، هەمووی پانتایی زەوی، گەورەترین ئۆقیانووسەکانی دەوری زەوییش ئەو پێنجەن:

١)- ئۆقیانووسی هادیی کە پانتاییەکەی (١٦٨,٧٢٣,٠٠٠)کم٢.

٢)- ئۆقیانووسی ئەتڵەسیی کە پانتاییەکەی (٨٥,١٣٣,٠٠٠)کم٢.

٣)- ئۆقیانووسی هیندیی کە پانتاییەکەی (٧٠,٥٦٠,٠٠٠)کم٢.

٤)- ئۆقیانووسی بەستەڵەکی خوارووی زەوی، کە پانتاییەکەی (٢١,٩٦٠,٠٠٠)کم٢.

٥)- ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوور، کە پانتاییەکەی (١٥,٥٥٨,٠٠٠)کم٢.

لە کۆتایی ئەم کورتە باسەدا جارێکی دیکەش دووبارەی دەکەینەوەو دەڵێین:

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (إبراهیم)دا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، ئەو ڕۆژەی نە زەوی (ئەم زەوییەی ئێستا) دەمێنێ و نە ئاسمانەکانیش و، هەموویان بۆ خوای تاکی ملپێکەچەر دێنە گۆڕێ.

یانی: خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا بە جۆرێکی دیکە، ئەم گەردوونە هەڵدەخاتەوە، نە زەوی وەك ئێستای دەمێنێ و نە ئاسمانەکانیش و، هەموویان گۆڕانیان بەسەر دادێ و، بەس خواش ﷻ خۆی دەزانێ، چ گۆڕانێکیان بەسەردا دێنێ و، چۆن هەڵدەخرێن، کە لەگەڵ واقیع و هەل و مەرجی ئەو کاتی دا، کە خوای کاربەجێ دیاریی کردوە، بگونجێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**مرۆڤ تاکو دەگاتە پەروەردگاری لە قیامەتدا، دەبێ ڕەنج بدات، ئنجا ئەگەر نامەی کردەوەکانی بدرێتەوە دەستی ڕاستی، بە ئاسانیی لێی دەپرسرێتەوەو، بە شادمانیی بۆ لای کەس و کاری دەگەڕێتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا ﴾، ئەی مرۆڤ! بە دڵنیایی تۆ ڕەنجدەری تاکو دەگەیە پەروەردگارت، بە ڕەنجدانێکی دیار، (**الكَدْحُ: السَّعِيُ وَالعَنَاءُ**)، (**كَدْح**): کۆشش و خۆماندووکردن و هەوڵدانە، (**وَالسَّعِيُ: إِتْعَابُ النَّفْسِ فِي العَمَلِ وَالكَدِّ**)، (**سعي**) خۆماندووکردنە لە کارکردن و ڕەنجداندا، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ ﴾، ئەی مرۆڤ! وەك پێشتریش گوتمان: (**أل**)ی سەر (**الإنسان**) بۆ ناساندنەو بۆ جینسە، واتە: لێرەدا خوا ﷻ تێکڕای مرۆڤان دەدوێنێ، مرۆڤەکان بە گشتیی، وەك مرۆڤ، بەبێ تێخوێندنەوەی پاشخانی نەتەوەیی و ڕەگەزیی و ئایینیی و فیکریی، ئەی مرۆڤ! وەك مرۆڤ، بێگومان تۆ تاکو دەگەیە پەروەردگارت، ڕەنجدەری، خۆماندووکەری، زەحمەتکێشی؟

٢)- ﴿ فَمُلَٰقِيهِ ﴾، بە دڵنیاییش پێی دەگەی، ئەمەش دوو واتای هەن:

أ- بە پەروەردگارت دەگەی.

ب- بە بەرهەمی کردەوەکەت دەگەی.

٣)- ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾، ئنجا هەر کەسێك نووسراوەکەی بدرێتەوە دەستی ڕاستی.

٤)- ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾، لەمەودوا لێپرسینەوەیەکی ئاسانی لەگەڵدا دەکرێ، لێپرسینەوەیەکی نەرم و ئاسان.

٥)- ﴿وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا﴾، بە دڵخۆشیی و شادمانییش دەگەڕێتەوە لای کەس و کاری، کە دەفەرموێ: (**ينقلب**): (**الإنقلابُ: هُوَ الرُّجُوعُ مِنْ حَيْثُ أَتَى**)، گەڕانەوە بەو شوێنەدا کە لێیەوە هاتوە، لە کوێوە هاتوە، بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، لە قیامەت دا ئەو خەڵکە ڕادەگیرێ، هەموو کەس و هەر کەسە بە تەنیاو یەك بە یەك یان ناوی خەڵك دەخوێندرێتەوە، ئنجا کەسێك کە نامەکەی دەدرێتەوە دەستی ڕاستی، بە دڵخۆشیی دەگەڕێتەوە لای کەس و کاری کە چاوەڕێی دەکەن.

ئنجا لێرەدا دەربارەی کەس و کاری (**أهله**)، زانایان دەڵێن:

١- یان مەبەست پێی ئەو مرۆڤانەیە، کە پێش ئەو چوونە بەهەشت.

٢- یاخود ئەوانەی چاوەڕێی دەکەن لە مەیدانی لێپرسینەوەو سزاو پاداشتدا، لە خزم و نیزیك و کەس و کاری، ئەگەر بابە، ئەگەر دایکە، ئەگەر خێزانە، ئەگەر منداڵە، هەرکەس هەیە.

٣- هەندێکیش گوتوویانە: (**أَهْلُهُ مِنَ الجَنَّةِ**)، کەس و کارەکەی لە بەهەشتدا، واتە: حۆرییەکان و ئەو گەنج و لاوان (**غلمان**)ەی خزمەتیان دەکەن، ئەوانەی خوای پەروەردگار بە تایبەتی بۆی خوڵقاندوون.

٤- مانایەکی دیکەشی کە من زیاتر ئەوەم پێ ڕاستە، ئەوەیە: کەس و کاری هەموو ئەوانەن کە چاوەڕێی دەکەن، چ مرۆڤ بن و لە دنیادا لەگەڵی بووبن، چ لە بەهەشتدا خوای پەروەردگار بە تایبەت بۆ خزمەتی بەهەشتییانی خوڵقاندبن.

لێرەدا ئەم دوو دەقە دێنین:

**١- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنْ حُوسِبَ يَوْمَ القِيَامَةِ عُذِّبَ»، فَقُلْتُ: أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۝٨﴾الإنشقاق، فَقَالَ ﷺ: «لَيْسَ ذَاكِ الحِسَابُ، إِنَّمَا ذَاكِ العَرْضُ، مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ يَوْمَ القِيَامَةِ عُذِّبَ»}** (أخرجه أحمد: ٢٥٠٠٢، والبخاري: ١٠٣، ومسلم: ٢٨٧٦، والترمذي: ٢٤٢٦، وقال: صحيح حسن).

واتە: عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لێپرسینەوەی لەگەڵ کرا لە ڕۆژی دواییدا، ئازار دراوە، (عائیشە دەڵێ:) گوتم: ئەدی خوای زاڵی پایەدار نەیفەرمووە: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۝٨﴾الإنشقاق، واتە: لەمەودوا لێپرسینەوەیەکی سووك و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێ؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئەوە ئەو لێپرسینەوەیە نیە، بەڵکو ئەوە تەنیا پێشاندانی کردەوەکانیەتی، هەرکەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا لە لێپرسینەوەدا مشت و مڕی لەگەڵدا بکرێ، ئازاردراوە.

٢- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: فِي بَعْضِ صَلَاتِهِ: «اللَّهُمَّ حَاسِبْنِي حِسَابًا يَسِيرًا»، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ! مَا الحِسَابُ اليَسِيرُ، قَالَ: أَنْ يُنْظَرَ فِي كِتَابِهِ فَيُتَجَاوَزَ عَنْه إِنَّهُ مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ يَوْمَئِذٍ يَا عَائِشَةُ هَلَكَ} (أخرجه أحمد: ٢٤٢٦١، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، والحاكم: ١٩٠، هذا حديث صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه بهذه السياقة، تعليق الذهبي في التلخيص: على شرط مسلم).

واتە: دایکمان عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە هەندێك لە نوێژەکانیدا دەیفەرموو: ئەی خوایە! بە لێپرسینەوەیەکی ئاسان لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکە، کاتێك لە نوێژەکەی بۆوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! لێپرسینەوەی ئاسان چییە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە تەماشای نووسراوەکەی بکرێ و، یەکسەر چاوپۆشیی لێ بکرێ، لێی تێبپەڕێنرێ، چونکە هەر کەسێك لە لێپرسینەوەدا، وتووێژی لەگەڵدا بکرێ {حەوت و هەشتی لەگەڵدا بکرێ}، دەفەوتێ.

### مەسەلەی سێیەم:

**هەر کەس لە لای پشتەوەی ڕا، نووسراوەکەی، لیستی کردەوەکانی، بدرێتەوە، مردن بە ئاوات دەخوازێ و، دەخرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە، بەهۆی ئەوەوە کە لە ژیانی دنیای دا هەمیشە بێباك و دڵخۆش و بوغڕا بووەو، پێشی وابووە ناگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بەڵام خوا بینەری بووو، دەیزانی چی دەکات و چۆن دەکات؟ بۆیە ناگونجێ و نەدەگونجا مرۆڤ سزاو پاداشت و لێپرسرانەوەی نەبێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا ﴿١٥﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴾، بەڵام هەر کەس نووسراوەکەی لە پشتیەوە ڕا بدرێتەوە، **(وَرَاء)**، واتە: پشت **(ظَهْر)**ە، یانی: لە دوایەوە، لە لای پشتەوەی ڕا نامەکەی بدرێتەوە، **(كِتَاب)**، واتە: نووسراو، مەبەست پێی لیست و تۆماری ئەو کردەوانەیە کە مرۆڤ ئەنجامی داون، ئەهلی ئیمان بە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، بەڵام بێبڕوایان لە هەموو قورئاندا هەر دەفەرموێ: بە دەستی چەپیان، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: لەلای پشتەوەی ڕا، نامەی کردەوەکانی دەدرێتەوە، زانایان وایان لێکداوەتەوە دەڵێن: **(مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِهِ مِن شِمَالِهِ تَحْقِيراً لَهُ)**، لە لای پشتەوەی ڕا بە دەستی چەپی، (بەوە شێوەیە نامەی کردەوەکانی دەدرێتەوە)، وەك بێ بایەخ و بە کەم تەماشا کردنی.

ئنجا هەر کەس وابێ:

**٢)-** ﴿ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴾، بە دڵنیایی مردن بانگ دەکات، **(الثبُورُ: الهَلاَكُ وَسُوءُ الحَالِ)**، **(ثُبُور)**: بریتیە لە لەبەینچوون و حاڵ شپرزە بوون، ئنجا ئایا ئەو فەوتانە چۆن داوا

دەکات؟ دەڵێ: ئەی فەوتانی من وەرە! وەك (يَا وَيْلِي، يا ويْلتي، يا وَيْلَتَا)، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە مردن بە ئاوات دەخوازێ و، حەز دەکات بمرێ و نەمێنێ، بۆ ئەوەی لەو سزایەی چاوەڕێی دەکات، دەربازی بێ.

٣)- ﴿ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ﴾، بە شێوەیەکی تایبەتیش دەخرێتە نێو کڵپەی دۆزەخەوە، ﴿ وَيَصۡلَىٰ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (وَيُصَلَّى سَعِيرًا )، دەخرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە، ﴿ وَيَصۡلَىٰ ﴾، یانی: بە جۆرێکی تایبەت دەسووتێ و، دەبرژێ، (يُصَلَّى)، واتە: دەبرژێنرێ و دەسووتێنرێ بە کڵپەی ئاگری دۆزەخ.

کە دەفەرموێ: (وَيُصَلَّى سَعِيرًا)، زانایانی ڕێزمانی عەرەبیی دەڵێن: (بِنَزْع الخَافِضِ، أي: يُصَلَّى بسَعِيرٍ)، ئەوەی بۆتە هۆی ژێردارکردن (خفض)ی کە (ب)کەیە لابراوە، واتە: بە کڵپەی ئاگری دۆزەخ بە شێوەیەکی تایبەت دەسووتێنرێ و دەپیشێنرێ، ئایا بۆچی وای لێ دەکرێ؟

٤)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ﴾، چونکە ئەو کاتی خۆی (لە ژیانی دنیای) لە نێو کەس و کاری دا زۆر دڵخۆش بوو.

هەڵبەتە زۆر دڵخۆش بوون، خراپ نیە، بەڵام دڵخۆشییەکەی ئەو بە خراپەکارییەکەی بووە، بە ستەم و زۆر و لادان و تاوانەکەی بووە، ئەگەرنا مرۆڤ ئەگەر بە چاکە دڵخۆشبێ، شتێکی باشە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ۝٥٨ ﴾يونس، بڵێ: با بە بەخششی خواو بە بەزەیی خوا، بەس بەوە زۆر دڵخۆش بن، ئەوە باشترە لەوەی کۆی دەکەنەوە (لە ماڵ و سامان)، بەڵام ئەو کەسە دیارە بە خراپەکارییەکەی و بەبێ دینیی، بە ستەم لادان و تاوان، دڵخۆش بووە.

یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان، دەڵێ: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ﴾، (مُسْتَعْمَلٌ فِي التَّعْجِيب مِنْ حَالِهِم كَيْفَ انقلب مِنْ ذَلِكَ السُّرور!)، ئەمە بەکارهێنراوە بۆ سەرسوڕماندن لە حاڵیان: چۆن حاڵیان لەو دڵخۆشییەی لە دنیادا تێیدا بوون، ئێستا گۆڕاوە بۆ ئەو ماتەمیی و دڵناڕەحەتییەی مەرگی تێدا بە ئاوات دەخوازن.

٥)- ﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾، ئەو پێی وابوو ناگەڕێتەوە، وشەی: ﴿لَن﴾: (لِتَأْكِيدِ النَّفِي وتَأْبيده)، ﴿لَن﴾، مانای جەختکردنەوەی دەگەیەنێ و، مانای کۆتایی نەهاتن و نەبڕانەوەی شتێك دەگەیەنێ، ﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾، ئەمە وەك عەزم جەزمکردنی ئەوان و دڵنیابوونیان و بڕیاردانیان لە لایەن خۆیانەوە کە هەرگیز جارێکی دیکە ناگەڕێنەوە بۆ ژیان، ﴿لَّن يَحُورَ﴾، یانی: (لَنْ يَرْجِعَ)، (حَارَ، يَحُورُ، حَوْرَاً)، یانی: (رَجَعَ، يَرْجِعُ، رُجُوعَاً)، ﴿لَّن يَحُورَ﴾، واتە: دوای ئەوەی دەمرێ و بە خاك دەسپێردرێ، جارێکی دیکە دەرنایەتەوە لە گۆڕ، وەك خاوەن ژیانێك، کە خوای کاربەجێ فەرموویەتی و پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەواڵی پێداوە.

٦)- ﴿بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا﴾، با، بە دڵنیایی پەروەردگاری بینەری وی بووە، ﴿بَلَىٰٓ﴾، لە زمانی کوردییدا بەرانبەر (با)یەو، ﴿بَلَىٰٓ﴾، بۆ لابردنی ئەو لابردنەیە کە لە ڕابردوودا بووە، یانی: (بلى) بۆ لابردنی لابردنە (بَلى لنفي النَّفي)، ئەوانە گوتوویانە: زیندوو ناکرێینەوە، خوا دەفەرموێ: با زیندوودەکرێنەوە، کەواتە: ﴿بَلَىٰٓ﴾، لێرەدا بۆ لابردنی ئەو لابردنەیە کە ئەوان لە خەیاڵیان دا بووەو، وەڵامی گومانە بە هەڵە داچووەکەیانە.

کە دەفەرموێ: ﴿بَلَىٰٓ﴾، یانی: با، زیندوودەکرێتەوە، دەگەڕێتەوە، ﴿إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاری بینەری بوو، واتە: بینەری بوو چی دەکرد، لێرەدا مەبەست لە بینین، یان هەر خودی دیتنە، چونکە بینین سیفەتێکی تایبەتی خوای پەروەردگارە، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە خوا زانیاریی تەواوی هەبووە بە حاڵی ئەو کەسە؛ چی دەکرد، چی دەگوت، چۆنی دەکردو دەگوت، بۆیەش خوایەك ﷻ کە زانیاری تەواوی پێی هەیەو، تەواو پێی ئاشنا بووەو بینیویەتی چی کردوەو چۆنی کردوە؟ موستەحیلە وازی لێ بێنێ وەك بەرزەکی بانان بۆ دەربچێ و، سزای نەدات لەسەر ئەوەی کردوویەتی و گوتوویەتی، لە قسەی خراپ و کاری خراپ.

## مەسەلەی چوارەم:

**سوێند خواردنی خوا بە زەردو سووری ئێوارێ و، شەوگاری کۆکەرەوەو، مانگی جێخونکەکەر، کە مرۆڤەکان بە حاڵە جۆراوجۆرەکاندا گوزەر دەکەن و دەڕۆن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴾، نەخێر (وانیە) سوێند دەخۆم بە زەردە (ی ئێوارێ)، ﴿ فَلَآ ﴾، یانی: وەك ئێوە دەڵێن، وانیە، یاخود: ﴿ فَلَآ ﴾، هەر جەختکردنەوەی سوێندەکەیە، بەڵام ڕاسترو باشتر وایە بۆ لابردنی قسەیەك بێ، کە لە پێشەوە کراوە، واتە: ڕاست نیە، وەك ئێوە دەڵێن، ﴿ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴾، سوێند دەخۆم بە زەردو سوور (شفق)، **(الشَّفَقُ: الحُمْرَةُ الَّتِي تظْهَرُ فِي الأُفُقِ الغَرْبِيِّ بَعْدَ الغُرُوبِ، أَو البَيَاضُ الَّذِي يَلِيَهَا، وَسُمِّيَ شَفَقاً لِرِقَّتِهِ)**، (شَفَق): بەو سوورایيە دەگوترێ، کە لە ئاسۆی ڕۆژئاوادا دوای خۆرئاوا بوون دەردەکەوێ، یاخود ئەو سپێتییە کە بەدوای دادێ، لەبەر نەرمیی و ناسکییش پێی گوتراوە: (شَفَق)، (شَفَقَة)، واتە: سۆزو پەرۆشیی مرۆڤ، بە کوردیی (شَفَق)، دەبێتە زەردو سووری ئێوارێ، ڕەنگی تیشکی خۆر لەو کاتەدا لە نێوان زەردو سوور دایە، خۆر دوای ئاوابوونی، ئەو تیشکەی دەیداتەوە بە ئاسمان، بە ئاسۆ، ڕەنگەکەی لە گۆڕانی بەردەوام دایە لە نێوان سوورو زەردو پرتەقاڵیی داو، دوایی وردە وردە سپیی هەڵدەگەڕێ، تاکو بە یەکجاریی ئاوا دەبێ.

هەڵبەتە دوای ئەوەی زەردو سووری ئێوارەێ نامێنێ و، بە تەواویی ون دەبێ لە ئاسۆی ئاسمان، ئنجا نوێژی شێوان کاتەکەی بەسەردەچێ و، نوێژی خەوتنان دەبێ.

**٢)-** ﴿ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴾، سوێند بە شەوگارو بەوەی شەوگاریش کۆی دەکاتەوە، لە شەوگاردا خەڵك دەچێتەوە ماڵ و حاڵی خۆی، دوای ئەوەی بڵاوبوون بە زەویدا بۆ کارو

کاسبیی، بۆ بازرگانیی، بۆ هەڵسوکەوتی جۆراو جۆر، کە شەو دادێ وردە وردە هەر کەسە دەگەڕێتەوە بۆ خانوو و ماڵ و شوێنی حەوانەوەی خۆی، ئەوە وەك مرۆڤەکان، بەڵام هەندێك لە دروستکراوانی دیکەی خوا، لە شەودا دێنە دەرێ، بە دەرفەتی دەزانن، جڕو جانەوەر و شەیتانەکان، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە لە دوای خۆر ئاوابوون منداڵەکانتان بێننەوە ژوور، چونکە لەو کاتەدا شەیتانەکان و جڕو جانەوەر دێنەدەر، بۆ ئەوەی تووشی زیان نەبن[1]، کەواتە: ئەوانەش دوو سوێندی دیکەن: سوێند بە شەوگار، ﴿ وَمَا وَسَقَ ﴾، بەوەی شەوگاریش کۆی دەکاتەوە.

٣)- ﴿ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴾، سوێند بە مانگیش کاتێك کۆدەبێتەوە، بە کوردیی پێی دەگوترێ: جێخونکە، مانگ کە جێخونکەی کرد، کە دەکەوێتە شەوانی: (١٣ و ١٤ و ١٥) کۆدەبێتەوەو ڕووناکییەکەی چاك دەردەکەوێ، (**إتَّسَقَ أي: اجْتَمَعَ وَتَمَّ نُورُهُ وَصَارَ بَدْرَاً، مِنَ الوَسْقِ، والجَمْعُ أوسق**)، واتە: کۆبۆتەوەو ڕووناکییەکەی تەواوبووەو بۆتە (**بَدْر**)، {(**بَدْر**)، واتە: مانگ لە (١٣ و ١٤ و ١٥)دایە، لە (**وسق**)ەوە هاتوەو، ئەویش بە (**أوسق**) کۆ دەکرێتەوە.

(**وَسْق**)یش یانی: کۆکردنەوەو خڕکردنەوە سەریەك.

٤)- ﴿ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴾، بێگومان ئێوە چین لە دوای چین سوار دەبن، وشەی: ﴿ لَتَرْكَبُنَّ ﴾، (**رَكِبَ، يَرْكَبُ، رُكُوبَاً**)، سواربوو، سوار دەبێ، سواربوون، بەڵام لێرەدا (**رکوب**) خوازراوەتەوەو بەکارهێنراوە بۆ حاڵەتی جۆراو جۆر بەسەر مرۆڤ داهاتن، ﴿ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴾، یانی: (**تَرْكَبُنَّ المَشَاقَّ وَالأَهْوَال**)، واتە: ناڕەحەتییان و سەختییان دەکێشن و دەچێژن، تووشیان دێن.

---

(١) {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: إِذَا كَانَ جُنْحُ اللَّيْلِ، أَوْ أَمْسَيْتُمْ، فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَحُلُّوهُمْ وَأَغْلِقُوا الأَبْوَابَ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ بَابًا مُغْلَقًا } أخرجه البخاري: ٥٣٠٠، ومسلم: ٢٠١٢.

وشەی: ﴿لَتَرۡكَبُنَّ﴾، بە دوو جۆر خوێنراوەتەوە:

**أ-** (**لَتَرْكَبَنَّ**) بۆ تاك، ئەی مرۆڤ! بە دڵنیایی تووش دەبی، ﴿طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾، (**أي: حَالاً بَعْدَ حَال**)، حاڵ لە دوای حاڵت بەسەر دێ، هەروەها دەشگونجێ دوێنراو پێغەمبەری خوا بێ.

**ب-** ﴿لَتَرۡكَبُنَّ﴾، بۆ كۆ، كە دەگونجێ دوێنراو بێبڕوایەكان بن، ئەی بێبڕوایەكان! ئێوە حاڵ لە دوای حاڵ تووش دەبن، لە دنیادا لە حاڵێكی ناخۆش دا دەژین، بەهۆی كوفرو بێبڕواییتانەوەو، لە قۆناغی بەرزەخیشدا، ئێوە لە حاڵێكی ناخۆش دەژین و، تووشی سزاو ئازاری خوا دەبن، لە قیامەتیشدا بە هەمان شێوەو، لە دۆزەخیشدا بەهەمان شێوە، یانی: ئەی بێبڕوایەكان! ئێوە حاڵ دوای حاڵ بەسەرتان دێ و، هەمووی چین لەسەر چینە، پێگە لەسەر پێگەیە لە ڕووی سەختییەوە، هەندێكی لەسەرووی هەندێكیەوە، مەبەستیش لە (**ركوب**)، لێرەدا تووشبوونە، ئەگەرنا (**ركوب**)، بە مانای سوار بوونە.

پێشتریش گوتمان: ئەگەر بە تاك (**لَتَرْكَبَنَّ**)، بخوێندرێتەوە، وێڕای مرۆڤ وەك تاك تاكیان، دەشگونجێ ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێ، ئەی موحەممەد! تۆ حاڵ لە دوای حاڵت بەسەر دێ، قۆناغ، قۆناغ، یاخود: ئەی مرۆڤ! بە گشتیی، تۆ لە یەك حاڵدا نامێنێ، بەڵكو حاڵ لە دوای حاڵت بەسەر دێ.

ئەگەر بە كۆ ﴿لَتَرۡكَبُنَّ﴾ بخوێندرێتەوەش، وەك چۆن دەگونجێ بۆ بێبڕوایەكان بێ، دەشگونجێ بۆ تێكڕای خەڵكی بێ، یاخود بۆ مسوڵمانان بێ، بە گشتیی، ئەی مسوڵمانان! ئێوە حاڵ لە دوای حاڵتان بەسەر دێ.

وشەی: ﴿طَبَقٍ﴾: (**الطَّبَق: اسْمٌ مُفْرَد لِلشَّيءِ المسَاوِي شَيْئَاً آخَرَ فِي حَجْمِهِ وَقَدْرِهِ، وَيُطْلَقُ اسْمَاً مُفْرَدَاً عَلى الغِطَاءِ الَّذِي يُغَطَّى بِهِ يُقَالُ: وَافَقَ شِنٌّ طبقَة، وَيُطْلَقُ اسْمَاً لِمَا يُوضَع فيهِ الفَوَاكِهُ، وَيُطْلَقُ اسْم جمعٍ لِطَبَقَةٍ، وَهِيَ مَكَان فَوْقَ مَكَان آخَر**).

(**طبق**): ناوێكی تاكە بۆ شتێك كە یەكسان بێ لەگەڵ شتێكی دیكەدا، لە قەبارەی و لە ئەندازەی دا هێندەی یەك بن، هەروەها وەك ناوێكی تاك بەكاردەهێنرێ بۆ سەر

سەرپۆشێك كە بە سەر شتێك دادەدرێ، لەوەوەش ئەو پەندە هاتوە: (**وافق شِنٌّ طبقةً**)، یانی: **شین** لەگەڵ تەبەقەدا گونجا، وەك یەك بوون {كە دوایی باسی دەكەین، مەبەستیان پێی چییە؟}، جاری واش هەیە وشەی: (**طبق**) بەكاردەهێنرێ، {دەگوترێ: ئەو شتەم بۆ بكە (**طبق**)ێك}، وەك ناوێك بۆ شتێك كە میوەی لەسەر دادەنرێ (سینی)، دیسان (**طبق**): ناوی كۆیە بۆ (**طبقة**)، واتە: چین، كە شوێنیك لەسەر شوێنێك بێ، {شتێك لەسەر شتێك بێ}، ئەو پەندەش كە دەڵێ: (**وافق شِنّ طبقة**)، لێكدانەوەكەی بە دوو جۆر لە كتێبەكانی ئەدەبی عەرەبییدا هاتوە، چونكە پەندەكە عەرەبییە:

أ- هەندێك دەڵێن: پیاوێك هەبووە بە ناوی (**شِنّ**)، ئافرەتێكیش هەبووە بە ناوی (**طبقة**)، یەكدیان گرتوەو بوونە ژن و مێردی یەكدی، ئیدی لەوەوە گوتراوە: (**وافق شنّ طَبَقة**)، شین لەگەڵ (**طَبَقة**)دا ڕێككەوتن.

ب- هەندێكی دیكە بەسەرهاتێك دێنن، دەڵێن: هۆزێك هەبووە بە ناوی (**طبقة**)، زۆر ملهوڕ و ستەمكارو خراپەكار بوون، ئنجا ڕۆژێك هۆزی شین لە ڕاستیان ڕاهاتوون و تۆڵەیان لێستاندوون و زەبریان لێوەشاندوون، لەوەوە گوتراوە: (**وافق شنّ طَبَقَة**)، یانی: شین پڕ بە پێستی (**طبقة**) بوو، واتە: تۆڵەیان لێ ستاندن و ئەو ستەم و زۆرەی لە خەڵكی دیكەیان دەكرد، ئەو حەقەیان لێكردنەوەو تەمبێیان كردن.

لە كوردەواریی خۆشماندا شێوەی ئەو پەندە هەیە: [دیزە خلۆر بۆوە، دەرخۆنەی دیتەوە] (دەرخۆنە): سەرقاپێك بووە لەسەر دیزە دایانناوە.

هەروەها پەندێكی دیكەش هەیە لەو بارەوە: (كورتە كەژێ لێك دەهەژێ)، كە ئەوە زیاتر بۆ پیاو و ئافرەت بەكاردەهێنرێ، پیاو و ئافرەتێك هاوكووفی یەكدی بن و شێوەی یەكدی بكەن، بە تایبەت لە شتی خراپدا، كورد ئەو پەندەیان بۆ بەكارهێناون، واتە: پێكەوە گونجاون و پێكەڵپێكن.

**یەکێك لە ڕوونکەرەوان[1] (مفسِّرین) ئەو ئایەتە بەمجۆرە تەفسیر کردوە:**

﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾، یانی: چین لەسەر چین سوار دەبن، دەڵێ: مەبەست پێی سوار بوونی ئەو ڕۆکێتەیە کە هەڵیانداوە بۆ سەر مانگ، چونکە ئەویش لە چەند چینێك پێك دێ و، هەر قۆناغێك کە دەڕوا چینێك فڕێ دەدا، دەڵێ: لەبەر ئەوەی لەگەڵ باسکردنی مانگ دا هاتوە!.

بەڵام پێم وانیە تەفسیرەکەی زۆر جێی خۆی بگرێ، چونکە خوا ﷻ قورئانی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی فەرمووەو، ئەو مەسەلەیەش شتێکی ئەوەندە گرنگ نیە، خوا ﷻ بیخاتە نێو کتێبی خۆیەوە، سەربارەش ئەو واتایە لەگەڵ ڕواڵەت و بێژەی ئایەتە موبارەکەکاندا ناگونجێ.

ئێستاش با ئاماژە بە قسەو بۆ چوونی چەند زانایەك بکەین لە بارەی ئەو ڕستەیەوە:

١- **(الطبري)**، لە قەتادەوە بە ژمارە (٣٦٢١٦)، دەڵێ: ﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾، **(أي: حَالاً بَعْدَ حَال وَمَنْزِلاً عَنْ مَنْزِل)**، حاڵ لە دوای حاڵ و پێگە لە دوای پێگە ئێوە تووش دێن، ئەی مرۆڤەکان!.

٢- هەروەها **(الطبري)** ئەو مانایەشی هێناوە: **(لَتَرْكَبَنَّ أَنْتَ يَا مُحَمَّد سَمَاء بَعْدَ سماءٍ)**، ئەی موحەممەد! ئاسمان لە دوای ئاسمان، سوار دەبی و دەڕۆی و پێیاندا تێدەپەڕی.

ئەوەش ئاماژەیە بە سەفەری شەوڕۆیی و بەرزبوونەوە **(الإسراء والعروج)**ی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٣- **(إبن زيد)**، کە هەر **(الطبري)**، لێوەی هێناوە بە ژمارە (٣٦٩٢٤)، دەڵێ: ﴿طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾، **(أي: الأخِرَةَ بَعْدَ الأُولى)**، لە دوای یەکەم (کە ژیانی دنیایە)، تووشی ژیانی کۆتایی دێی (کە ڕۆژی دواییە).

---

(١) بڕوانە: تفسير جزء (عمّ)، عفيف عبدالفتاح طبارة، ص٧٤، ط٣، سنة: ١٩٨٠م.

٤- دیسان (**الطبري**) دەڵێ: (**لَتَرْكَبَنَّ أَنْتَ يَا مُحَمَّد حَالاً بَعْدَ حَالٍ وَأَمْرَاً بَعْدَ أَمْرٍ مِنَ الشَّدَائِدِ، والمرَادُ النَّاسُ**)، ئەی موحەممەد! تۆ حاڵ لە دوای حاڵ و کار لە دوای کار، لە ڕووی سەختییانەوە بەسەرت دێ، مەبەستیش پێی خەڵکە.

ئەوەی لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ، ئەوەیە کە خوا ﷻ سوێند دەخوا بەو چوار شتانە:

١- بە زەردو سووری ئێوارێ.

٢- بە شەوگار.

٣- بەوەی شەوگار کۆی دەکاتەوە.

٤- بە مانگ کە جێخونکە دەکات، کە:

١- ئەی مرۆڤەکان! ﴿لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ﴾، ئێوە حاڵ لە دوای حاڵ بەسەرتان دێ و تووش دێن.

٢- یاخود: ئەی مرۆڤ! تۆ لە یەك حاڵدا نامێنی، بەڵکو لە دوای ئەو حاڵەتەت حاڵەتێکی دیکە دێ، تاکو دەگەیە کۆتایی ژیانە دنیاییەکەت، ئەوەش شتێکی زانراوو ئاشکرایە، کە مرۆڤ لە یەك حاڵدا نامێنێتەوە، بەڵکو وەك خوا ﷻ هەواڵی پێداوەو سوێندی لەسەر خواردوە، مرۆڤ حاڵەتە جۆراو جۆرەکانی بەسەر دێن، کەواتە: ئەی مرۆڤەکان! ئاگاتان لێ بێ، لەم ژیانە دنیاییەدا نامێننەوە، وەك چۆن کاتی خۆی نەبوون و خوا ﷻ دروستیکردن، ماوەیەك لە منداڵدانی دایکتاندا بوون، دوایی لە دایك بوون و کە لە دایك بوون، مەلۆتکە بوون، شیرە خۆرە بوون، دوای ئەوەش وردە وردە، هەراش و گەورە بوون، پێرۆچکە بوون، فێری قسە بوون، دوایی بوونە منداڵ، ئنجا بوونە هەرزەکار، بوونە گەنج، هەروەها کامڵ بوون و قۆناغ بە قۆناغ ژیانەکەتان بەو شێوەیە دەڕوا، ئنجا وەك چۆن ژیانە دنیاییەکەتان قۆناغ قۆناغە، بە هەمان شێوە، چەند قۆناغێکی دیکەشتان لە پێشن، سەرەتا قۆناغی ژیانی بەرزەخە، پاشان ڕۆژی دوایی و قیامەتەو، دواییش نیشتەجێ بوونە لە بەهەشتدا، ئەگەر مرۆڤ ئیماندارو چاکەکار بێ ئەگەرنا خوا پەنامان بدات لە دۆزەخ دا، ئەگەر مرۆڤ بێبڕواو خراپەکار بێ.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**سەرسوڕماندن لە هۆی بڕوا نەهێنانی بێبڕوایان و، کڕنووش نەبردنیان لە کاتی خوێندنی قورئاندا، بەڵکو بە درۆدانانیان و، ئاگاداریی خواش ﷻ لە هەموو نهێنییەکانیان و، موژدەی ئازاری بە ژان پێدانیان، جگە لە بڕوادارانی کردار باش، کە پاداشتی نەبڕاوەیان هەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٢٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەوە چییانە بڕوا ناهێنن؟ لێرەدا ئەم پرسیارە، پرسیارکردنێکی نکووڵییلێکەرانەو سەرسوڕهێنەرانەیە! واتە: زۆر جێی ڕەخنەیەو جێی سەرسوڕمانە کە ئەوانە بڕواناهێنن، وشەی: ﴿ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، دوو واتای هەن:

أ- ﴿ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، وەك کرداری لازیم مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، یانی: (**لا يَتَّصِفُون بالإِيْمَان**)، سیفەتی ئیمان لە خۆیان دا ناهێننە دی.

ب- ﴿ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، یانی: بڕوا ناهێنن بەرکار (**مفعول به**)ەکەی، قرتێندراوە: (لَا يُؤْمِنُونَ **باليوم الآخر**)، (لَا يُؤْمِنُونَ **بالنبي**)، (لَا يُؤْمِنُونَ **بالقرآن**)، ....الخ، بڕوا ناهێنن بە ڕۆژی دوایی، بڕوا ناهێنن بە پێغەمبەر ﷺ، بڕوا ناهێنن بە قورئان.....هتد.

ئەو ڕستەیە لێرەدا ئەوە دەگەیەنێ کە بڕوا نەهێنانی بێبڕوایان شتێکی زۆر بێ جێ و نالۆژیکییە، بڕوانەهێنان بە قورئانی لێوانلێو لە زانست و حیکمەت، بەو قورئانە بەرزو مەزنە، هەروەها بڕوانەهێنان بەو پێغەمبەرە ﷺ کە موحەممەد هەر تەماشای ژیان و هەڵسوکەوت و ژیان و ڕابردووی بکەی، دەزانی کە پێغەمبەری خوایە ﷺ وەك (**إبن**

**تيمية**)، (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، لە یەكێك لە كتێبەكانی دا دەڵێ: كەسێك كە دەڵێ من پێغەمبەری خوام، یان دەبێ باشترین كەس بێ، یان دەبێ خراپترین كەس بێ، بۆیە زۆر بە ئاسانیی ڕاستگۆو درۆزن لەو بوارەدا لێك جیادەكرێنەوە، چونكە ئەو كەسەی دەڵێ: من پێغەمبەری خوام یان دەبێ باشترین كەس بێ و ڕاست دەكات، یان دەبێ درۆ بكات و ئەگەر درۆش بكات، خراپترین كەسە، خواش دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ ﴿٩٣﴾ ﴾**الأنعام**، كێ ستەمكارترە لە كەسێك كە درۆ بە ناوی خواوە، هەڵدەبەستێ، یان دەڵێ: سرووشم بۆ لا كراوە، سرووشیشی بۆلا نەكراوە، یان دەڵێ: وەك ئەوەی خوا دایبەزاندوە، منیش دایدەبەزێنم.

هەر كەسێك ئەو لافانە لێ بدات، ستەمكارترین كەسە، خراپترین كەسە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، بە ڕەخنە لێگرتن و بە سەرسوڕماندنەوە دەفەرموێ: چییانە بۆچی بڕواناهێنن؟.

٢)- ﴿ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ ﴾، كاتێكیش قوڕئانیان بەسەر دادەخوێندرێتەوە، بۆچی كڕنووووش نابەن!.

لێرەدا: ﴿ لَا يَسْجُدُونَ ﴾، یان مەبەست پێی كڕنووشبردنە، ئەو كڕنووشەی دەیزانین، یان مەبەست ملكەچكردنە بۆ خوا بە گشتیی، شوێنەكانی كڕنووشبردن (**سجدة**)یش لە قوڕئان دا، كە دەوری چواردە پازدە شوێنن، لە نێوان زانایان داو لەسەر ژمارەكە ڕاجیایی هەیە:

١- هەندێك دەڵێن: دەیە.

٢- هەندێك دەڵێن: یازدەیە.

٣- هەندێكیش هەتا پازدەو شازدەیان بردوە، كە لە كاتی قوڕئان خوێندندا دەبێ كڕنووش ببردرێ و، ئێمە لە كۆتایی تەفسیری سووڕەتی (**الأعراف**)دا، لەو بارەوە كورتە باسێكمان كردوەو، ڕاجیایی زانایانیشمان لە بارەی شوێنەكانی قوڕئان كە كڕنووشیان تێدا

دەبردرێ، باس کردوە، (**یسجدون**)یش لێرەدا هەم مانای کڕنووش بردن دەگەیەنێ، یانی: بۆچی کاتێك قورئانیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، کڕنووش نابەن، هەم مانای ملکەچییش دەگەیەنێ، بۆچی کاتێك قورئانیان بەسەر دادەخوێنرێتەوە، بۆ خوا ملکەچ ناکەن و ڕادەستی خوای پەروەردگار نابن، ئنجا ئایا لێرەدا سەجدەی قورئان خوێندنی تێدا دەبردرێ، یان نابردرێ؟ زۆربەی زانایان دەڵێن: بەڵێ، ئێرە کڕنووشی تێدا دەبردرێ، بەڵام هەندێك لە زانایان ڕایان وایە، ئێرە شوێنی کڕنووشی قورئانخوێندن نیە.

٣)- ﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ ﴾، بەڵكو ئەوانەی بێبڕوان بە درۆ دادەنێن، وشەی: ﴿ بَلِ ﴾، لە زمانی کوردییدا یانی: بەڵكو، یانی: بەڵکو ئەوانەی بێبڕوان بە درۆ دادەنێن، ئەمەش لێرەدا بۆ هەڵکشینە لە سەرسوڕماندن لەوەی  بێبڕوان، یانی: نەك هەر بێبڕوان، بەڵکو بە درۆش دادەنێن، ئەوانەی بێبڕوان بە درۆ دادەنێن، چی بە درۆ دادەنێن؟، دیسان خوای زاناو توانا بەرکار (**مفعول به**)ەکەی قرتاندوە، بۆ ئەوەی هەموو شتەکان بگرێتەوە: ڕۆژی دوایی بە درۆ دادەنێن، سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن، پێغەمبەری خوا ﷺو، ئەو قورئانەی خوا بۆی ناردوەو، هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، ئەوان بە درۆیان دادەنێن.

٤)- ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴾، خواش زاناترە بەوەی هەڵیدەگرن، لە دڵ و دەروون و عەقڵی خۆیانداو پەنهانی دەکەن، بگرە خوا لە خۆشیان پێیان زاناترە.

﴿ بِمَا يُوعُونَ ﴾، (**الإِيعَاءُ: جَعْلُ الشَّيءِ فِي وِعَاءٍ وَهُوَ الظَّرْفُ، لأَنَّهُ مُجْمَعٌ فِيهِ**)، (إيعَاء): بریتیە لەوەی شتێك بخەیە نێو دەفرێك و توورەگەیەكەوە كە تێیدا هەڵدەگیرێ، چونكە تێیدا كۆ دەكرێتەوە، واتە: خوا زاناترە پێیان لەوەی هەڵیدەگرن لە دڵ و دەروونی خۆیاندا، لە بێبڕوایی و بە درۆ دانان و گومانی خراپ بردن بە پێغەمبەر ﷺ لە خۆیان پێیان زاناترە.

٥)- ﴿ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، ئنجا موژدەیان پێ بدە، بە ئازارێکی بە ئێش و ژان، ئەمە وەك زانایان گوتوویانە: (**مُسْتَعَارٌ للإِنْذَارِ عَلَى طَرِيْقَةِ التَّهَكُّم**)، خوازراوەتەوە بۆ

ترساندن لەسەر شێوەی گاڵتە پێکردن و توانج، چونکە موژدە بۆ شتی خۆش و چاکە، نەك بۆ ئازارو مەینەتیی و ناڕەحەتیی، کە لێرەدا خوا دەفەرموێ: موژدەیان پێبدە، واتە: بیانترسێنە بە ئازارێکی بە ئێش، بەڵام بۆچی وشەی: موژدەدان و دڵخۆشکردن (**تبشیر**)ی بەکارهێناوە؟!، ئەمە جۆرێکە لە گاڵتە پێ کردنیان، یاخود: یانی: ئەگەر شتێك هەبێ بۆ ئەوان موژدەیان پێ بدرێ و دڵیانی پێ خۆش بکرێ لە ڕۆژی دواییدا، ئەوەیە کە بڵێی: ئازارو سزایەکی بێڕەزا چاوەڕێتانە.

٦)- ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ﴾، بێجگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون:

أ- ئا ئەوانە پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە،

ب- یان: پاداشتێکی نەژمێردراویان هەیە،

ج- یان: پاداشتێکی منەت لەسەر نەکراویان هەیە، هەر سێ واتایەکە دەگەیەنێ.

لێرەدا کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، ئەمە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی دابڕاو (**إستثناء منقطع**)، چونکە ئەوانەی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: موژدەی ئازارێکی بە ئێشیان پێ بدە، ئەوانە بێبڕوایەکانن و، کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو چاکەکانیان کردوون، ئەو بڕوادارانە بەشێك نین لەو بێبڕوایانەی موژدەی ئازاری بە ئێشیان پێ دەدرێ، هەر کاتیش هەڵاوێردراو (**مُستَثنَى**) و لێهەڵاوێردراو (**مُسْتَثْنَى مِنْهُ**)، لێك جیابوون، پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی دابڕاو (**الإستثناء المنقطع**)، بەڵام ئەگەر هەڵاوێردراو بەشێك بێ لە لێهەڵاوێردراوەکە، پێی دەگوترێ هەڵاواردنی پەیوەست (**الإستثناء المتصل**).

کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوە، ئیمانیان بە چی هێناوە؟ دیسان بەرکارەکەی قرتێنراوە، یانی: (**آمَنُوا بِكُلِّ مَا يَجِبُ الإِيْمَانُ بِهِ**)، ئیمانیان هێناوە بە هەر شتێك کە پێویستە ئیمانی پێ بهێنرێ.

ئیمانیان بە خوا ﷻ هێناوەو، بە فریشتەكانی و، بە كتێبەكانی خواو، بە پێغەمبەران و، بە ڕۆژی دوایی و، بە نەخشەو بە ئەندازەگیریی خواو، بە هەموو ئەو شتانەی خوا بە پێغەمبەردا ﷺ ناردوونی پێمان بگەیەنێ، ئیمانیان بە هەموویان هێناوە.

﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، كردەوە باشەكانیشیان ئەنجام داون، یانی: (**وَعَمِلوا الخِصَالَ الصَّالِحَات**)، ئەو سیفەتانەی باشن ئەنجامیان داون، (**الصالحات**)، سیفەتی وەسفكراوێكی قرتێنراوە.

ئەوانە: ﴿لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾:

أ- پاداشتێكی نەبڕاویان هەیە، پاداشتێك كەم و كووڕیی تێدانیەو، كۆتایی نایەت..

ب- یاخود: پاداشتێك كە ناژمێردرێ و ژمێردراو نیە، هێندە زۆرە ناژمێردرێ، هەڵبەتە ژیانێكی نەبڕاوەو هەمیشەیی، بێگومان نازو نیعمەتێكی نەژمێردراوی تێدایە.

ج- یاخود: ﴿غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾، یانی: (**لا يُمَنُّ بِهِ عَلَيْهِم**)، ئەو چاكەو نیعمەتەی خوا پێیان دەدا، منەتیان لەسەر ناكات و بە چاویاندا ناداتەوە، بەڵام زیاتر وا پێ دەچێ: ﴿غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾، یانی: (**غَيْرُ مَقْطُوع و غَيْرُ مَنْقُوص**)، نەبڕاوەیەو كەم و كورتیی تێدانیە.

(**الزمخشري**): لێرەدا پەندێكی هێناوە كە وەك مەتەڵێك وایە، دەڵێ: (**طَعْمُ الأَلاءِ أَحْلَى مِنَ المَنِّ، وَهُوَ أَمَرُّ مِنَ الأَلاءِ مَعَ الـمَنِّ**)، تام و چێژی چاكەكان، شیرینترە لە گەزۆ، بەڵام تامی چاكە لەگەڵدا كران، لەگەڵ منەت دا لە ئالاء تاڵترە.

(**آلاء**) ڕووەكێكە بەرێكی زۆر تاڵی هەیە، وەك ژەقنەمووت، واتە: چاكە تامەكەی لە گەزۆ شیرینترە، بەڵام چاكە لەگەڵ منەت لەسەر كردن و بە چاو دادرانەوەدا، لە ژەقنەمووت تاڵترە.

خوا بە لوتف و كەرەمی خۆی ئێمە لەو كەسانە بگێڕێ، كە لە دنیادا خۆیان بە ئیمان و كردەوە باشەكان دەڕازێننەوەو شایستەی ئەوەش دەبن، كە پاداشتێكی نەبڕاوەیان

هەبێ، پاداشتێکیان هەبێ هەر لە کەرەم و بەخششی بێ سنووری خوای پەروەردگار چاوەڕێ دەکرێ.

لێرەش دا لە کۆتایی تەفسیری سوورەتی (**الإنشقاق**)دا، لە خوای بەرزی مەزن داواکارم یارمەتییمان بدات، هەرچی زیاتر چاکتر لە فەرمایشتی خوا تێبگەین و، تێیدا قووڵ ببینەوەو، تێوەی ڕامێنین و، نهێنییەکانی دەرك بکەین، خوا یارمەتییمان بدات کارلێکی لەگەڵدا بکەین، بەو شێوەیەی فەرمایشتی خوا دەفەرموێ، بەو شێوەیە مامەڵەو ڕەفتار بکەین لە ژیانی تاکییمان و، خێزانییمان و، کۆمەڵایەتییماندا، تاکو هەم لە دنیادا بەهۆی قورئانەوە سەربەرزو سەرفراز بین و شادو بەختەوەر بین، هەم لە ڕۆژی دواییشدا ڕووگەش و سەربەرز بین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کە (٢٥)ی مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچیی، بەرانبەر (١٦)ی تەمموزی، {واتە: مانگی (٧)ی} ساڵی (٢٠٢٠) زایینییە، لە شاری هەولێر، خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین، بە تەفسیرکردنی سوورەتی (البروج)، سەرەتاش پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە لە حەوت بڕگەدا، دەخەینە ڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (البروج) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

باوترین ناوی: سوورەتی (**البروج**)ەو، هەر بە ناوی خۆیەوەیەو، ڕستەی سەرەتای وەك ناو بەکارهێنراوە، وەك لەم دوو دەقەوەش دیارە:

**یەکەم:** {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** ﷺ: «**أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **كَانَ يَقْرَأُ فِي العِشَاءِ الآخِرَةِ، بِالسَّمَاءِ «ذَاتِ البُرُوجِ»، وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ**»} (**أخرجه أحمد: ٨٣١٤، قَالَ شُعَيْب الأرنؤوط: إسناده ضعيف**).

واتە: ئەبوو هوڕەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی عیشای کۆتاییدا (مەبەست نوێژی خەوتنانە)، سوورەتی: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ ﴾، {لە ڕکاتی یەکەم دا}و، ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴾، {لە ڕکاتی دووەم دا} دەخوێندن.

**دووەم:** {**عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ** ﷺ: «**أَنَّ النَّبِيَّ** ﷺ **كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعصرِ بِـ**: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴾ و ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ ﴾} (**أخرجه أبو داود: ٨٠٥، والترمذي: ٣٠٧، والنسائي: ٩٧٨، والطبراني: ١٩٦٦، وابن حبان: ١٨٢٧، وغيرهم، إسناده حسن، قال الألباني: حسن صحيح**).

واتە: جابیری کوڕی سەمورە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و ئێوارە (عصر)دا، سووڕەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾، و ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾، دەخوێندن.

دیارە هەر کامێکیانی لە ڕکاتێکدا خوێندوە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

بە یەکدەنگیی زانایان ئەم سووڕەتە مەککەییەو لە مەککە دابەزیوە، لەو بارەشەوە ئەم دەقە هەیە:

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ نَزَلَتْ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾ بِمَكَّةَ} **(أَوْرَدَهُ السّيوطِي فِي الدر المنثور: ج٨، ص٨٦١، ونسبه لابن الضريس والنحّاس والبيهقي وابن مردويه، الإستيعاب فِي بيان الأسباب: ج٣، ص٥٠٥)**.

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ، گوتوویەتی: سووڕەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾، لە مەککە دابەزیوەو هاتۆتە خوار.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سووڕەتە موبارەکە لە (مصحف)دا، ژمارەکەی: (٨٥)و، لە دابەزینیشدا ژمارە (٢٧)ە، ئەم سووڕەتە موبارەکە لە ڕووی دابەزینەوە پێش سووڕەتی **(التين)** و، دوای سووڕەتی **(والضحى)**، هاتۆتە خوارێ.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە موبارەکە، بە یەکدەنگیی ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان، بیست و دوو (٢٢)ە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

بابەت و تەوەری بنەڕەتیی هەر بیست و دوو (٢٢) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکە، باسی بەسەرهاتی کۆمەڵێکی بڕوادارە کە حوکمڕانانێکی بێبڕواو ستەمکار چاڵیان بۆ هەڵکەندوون، لە نێو چاڵەکەشدا ئاگریان کردۆتەوەو قرچ قرچ سووتاندوویانن، خۆشیان لەسەر کەناری چاڵەکان دانیشتوون و تەماشایان کردوون و تییانەوە ڕاماون، لەبەر هیچ نا، جگە لەوەی بڕوایان بە خوای زاڵی ستایشکراو هێناوە، دواییش خوای بەرزو مەزن خۆی بە حەوت لە سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی وەسف کردوە، ئنجا ئاماژەیەکی کورتیشی بە سەربازە یاخییەکان کردوە، لە نێویاندا وەك نموونە: فیرعەون و سەربازەکانی فیرعەون و، گەلی (**ثمود**)، لە کۆتاییشدا خوا باسی قوڕئانی کردوە کە خاوەن شکۆو بەرزەو لە تەختێکی پارێزراو دایە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

### دوو تایبەتمەندییم لەم سووڕەتەدا کەوتوونە بەرچاو:

**یەکەم:** ئەم سووڕەتە موبارەکە زەقترین و بەرچاوترین تایبەتمەندیی کە جیای دەکاتەوە لە سووڕەتەکانی دیکە، ئەوەیە کە بەسەرهاتی کۆمەڵێکی بڕواداری بە ناهەق کوژراو لە لایەن هاوەڵانی چاڵە پڕ ئاگر ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ﴾ەکەوەی تێدایە، کە دوایی بەسەرهاتەکەیان باس دەکەین، لە هەموو قوڕئاندا تەنیا لێرەدا ئەو بەسەرهاتە هاتوە.

**دووەم:** چەند وشەیەك تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون، وەك:

١- وشەی: ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ﴾، ﴿ٱلۡأُخۡدُودِ﴾، بە مانای چاڵێك دێ، کە هەڵکەنراوە، بە کوردیی: خەندڕك.

٢- وشەی: ﴿ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ﴾، خاوەن تەختی شکۆدار، ﴿ٱلۡمَجِيدُ﴾، هەم بە ژێر (**كَسْرة**) خوێنراوەتەوە، یانی: خاوەن عەڕشێکی شکۆدار، هەروەها (**ذو العَرْش ٱلۡمَجِيدُ**)

بۆر (ضَمَّة)یش خوێنراوەتەوە، واتە: خوا هەم خاوەن عەڕشە، هەم زۆر شکۆدارو پایە بەرزە.

٣- وشەی: ﴿ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ﴾، قوڕئانێکی خاوەن شکۆ، پایەبەرز.

٤- وشەی: ﴿ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ﴾، لە تەختێکی پارێزراودا.

(**لوح**): لە زمانی عەڕەبیدا بە مانای (تەختە) دێ، ئنجا یان خوا ﷻ ویستوویەتی ئێمە حاڵیی بکات کە زانیاریی خوا چەسپاوو نەگۆڕە، یان مەبەست ئەوەیە (لوح) شتێکە خوا قوڕئانی تێدا نووسیوە، بەر لەوەی دایبەزێنێ، گرنگ ئەوەیە قوڕئان، چ بە نەزانراویی و چ بە نووسراویی، بەر لەوەی خوا دایبەزێنێ لە زانیاریی بێ سنووری خوادا بووە.

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە کۆی ئەو بیست و دوو (٢٢) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکەو دەکەینە یەك دەرس، چونکە هەموویان لە بارەی یەك بابەتەوەن، ئەویش باسی ئەو کۆمەڵە بڕوادارە بێ دەسەڵاتەیە، کە حوکمڕانانێکی ستەمکار، دوای ئەوەی ئامادە نابن هەڵگەڕێنەوەو دەستبەرداری ئایینەکەیان ببن، دەیانسووتێنن لە چاڵێکی پڕ ئاگردا، ئەوەش پێش ئیسلام بووەو، زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەوانە شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی عیسا عليه السلام بوون و خاوەنی خوا بە یەکگرتن (**توحيد**) بوون، نەك دوای ئەوەی ئایینی عیسا تێکدراوەو، سێ پەرستراویی (**ثالوث**)ی تێدا پەیدابووە، بەڵکو ئەوانە لە شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی عیسا عليه السلام بوون، ئنجا ئایا لە حەبەشە بوون، ئایا لە چ شوێنێك بوون؟ دوایی لەو بارەوە باس دەکەین، ئنجا ئایا ئەو ستەمکارەی فەوتاندوونی کێ بووە؟ هەندێك دەڵێن: (**ذو نَوّاس**) بووە، کە جوولەکە بووەو، هەندێك دەڵێن: هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم سووڕەتە بە چوار سوێندان دەست پێدەکات، بێ ئەوەی وەڵامی سوێندەکەو، سوێند لەسەر خوراو (**مقسم علیه**)ەکە باس بکرێ، لە ئایەتەکانی: (١ - ٣)دا: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ۝١ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ۝٢ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ۝٣﴾.

ئنجا باسی ڕووداوی کوژرانی بڕوادارانێکی بێ دەسەڵات، کراوە، لە لایەن هاوەڵانی چاڵەکە ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ﴾ەوە، کە بە زیندوویی و لەبەرچاوی خۆیان سوتاندوویانن، تەنیا لەبەر ئەوەی بڕوایان بە خوا ﷻ هەبووە، ئەویش لە هەشت ئایەتەکانی: (٤ - ١١) دا، خراوەتەڕوو.

دوایی حەوت (٧) لە سیفەت و کردەوە بێ وێنەکانی خوا ﷻ پەیوەست کراون بەو ڕووداوەوە لە پێنج ئایەتەکانی: (١٢ - ١٦)دا.

ئنجا ئاماژەیەك بە سەربازانێکی لە خوا یاخیی و سزادراو، کراوەو وەك نموونە: (**فیرعەن**) و (**ثمود**) باسکراون، کەواتە: بابێبڕوایەکانی ڕۆژگاری موحەممەدیش ﷺو، ڕۆژگارەکانی دیکەش، دڵنیابن کە لەبەر دەستی خوا دەرناچن، ئەویش لە چوار ئایەتەکانی: (١٧ - ٢٠)دا.

لە دوو ئایەتی کۆتاییش (٢١ و ٢٢)دا، خوا وەسفی قورئانی کردوە بە شکۆدار (**مجید**) و، بەوە کە لە تەختێکی پارێزراو دایە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ۝١ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ۝٢ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ۝٣ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ۝٤ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ۝٥ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ۝٦ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ۝٧ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ۝٨ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطۡشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ﴿٢٠﴾ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ﴿٢١﴾ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ﴿٢٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. سوێند بە ئاسمانی خاوەنی بورجەکان ﴿١﴾ سوێندیش بە ڕۆژی بەڵێندراو (ڕۆژی دوایی) ﴿٢﴾ سوێندیش بە بینەرو بە بینراو ﴿٣﴾ هاوەڵانی چاڵەکە بە کوشت بچن ﴿٤﴾ ئاگرێکی خاوەن سووتەمەنیی (لە چاڵەکەدا کرابۆوە بۆ سووتاندنی بڕواداران) ﴿٥﴾ کاتێك خۆشیان لەسەر (قەراغەکان) ی دانیشتبوون ﴿٦﴾ لە حاڵێکدا ئەوان بینەری ئەوە بوون کە بە بڕوادارانیان دەکرد ﴿٧﴾ هیچیشیان لێ بە ڕەخنە نەگرتن، جگە لەوەی بڕوا بە خوای زاڵی ستایشکراو بێنن ﴿٨﴾ ئەو کەسەی حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی ویەو، ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکیشە ﴿٩﴾ بە دڵنیایی ئەو کەسانەی پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕواداریان ئازارو ئەشکەنجە داوەو، دوایی نەشگەڕاونەوەو پەشێمان نەبوونەوە، ئازاری دۆزەخیان هەیەو ئازاری سووتێنەریشیان هەیە ﴿١٠﴾ بێگومان ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون، باخانێکیان هەن، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، ئەوەیە بردنەوەی گەورە ﴿١١﴾ بە دڵنیایی زەبرو پەلاماری پەروەردگارت توندو سەختە ﴿١٢﴾ بێگومان هەر ئەو (دروستکراوان) پەیدا دەکات و دەگێڕێتەوە ﴿١٣﴾ هەروەها ئەو لێبوردەی خۆشویست (بۆ بەندە گوێڕایەڵەکانی) ﴿١٤﴾ خاوەن عەرشە، شکۆدارە ﴿١٥﴾ هەرچی

بیەوێ ئەنجامدەریەتی ﴿١٦﴾ ئایا هەواڵی سەرباز (و سوپای)ەکانت بۆ هاتوە! ﴿١٧﴾ فیرعەون و (گەلی) سەموود؟ (چۆن خوا سزای دان!) ﴿١٨﴾ بەڵکو ئەوانەی بێبڕوابوون لە بە درۆدانان دان ﴿١٩﴾ خواش لە پشتیانەوە دەورە دەرە (و لێی دەرباز نابن) ﴿٢٠﴾ بەڵکو ئەو (قورئان)ە خوێنراوەیەکی شکۆمەندە ﴿٢١﴾ لە تەختێکی پارێزراو دایە ﴿٢٢﴾).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْبُرُوجِ): (**القُصُورُ جَمْعُ بُرْجٍ، وَبِهِ سُمِّي بُرُوجُ السَّمَاءِ لِمَنَازِلِهَا الْمُخْتَصَّةِ بِهَا**)، (**بُرُوج**): بە مانای کۆشکەکان (**قُصُور**)ەو کۆی (**بُرْج**)ە، {(**بُرْج**) هەم بە مانای کۆشك (**قَصْر**)، دێ، هەم بە مانای قەڵا (**حِصْن**)یش دێ}، ئنجا بورجەکانی ئاسمانیش ئەو مەنزڵگایەنەن کە پێیەوە تایبەتن {زەوی پێیاندا بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە}.

(ٱلْأُخْدُودِ): (**الخَدُّ والأُخْدُودُ: شَقٌّ فِي الأَرْضِ مُسْتَطِيل غَائِطٌ، وَالجَمْعُ أخاديد، وَأَصْلُ ذَلِكَ مِنْ خَدَّي الإِنْسَانِ**)، (**خَدّ وأُخْدُود**)، بە دابڕاوەییەکی زەوی دەگوترێ، لاکێشەییەو قووڵە، کۆیەکەی (**أَخَادِيد**)ە، لە ئەسڵدا لە هەردوو ڕوومەتی مرۆڤەوە هاتوە، (**خَدّ**)، کوڵمە، یان ڕوومەت.

(وَمَا نَقَمُواْ مِنْهُمْ ): لێیان بە عەیب نەگرتن، (**وَمَا عَابُوا مِنْهُمْ، وَمَا انْتَقَدوا عَلَيْهِم**)، لێیان بە ڕەخنە نەگرتن، دەگوترێ: (**نَقِمْتُ الشَّيءَ وَنَقَمْتُهُ، أي: أَنْ أَنكَرْتُه إِمَّا بالِلسَانِ وَإِمَّا بالعُقُوبَةِ**)، (**نَقِمتُ الشَّيءَ وَنَقَمْتُهُ**)، هەردووکیان بە مانای ڕخنەم لێگرت، نکوولیم لێکرد، بە زمان، یاخود بە سزادان.

(ٱلْحَرِيقِ): (**الحَرِيقُ: النَّارُ، أَحْرَقْتُ كَذَا، فَاحْتَرَقَ**)، (**الحريق**) ئاگر، فلان شتەم سووتاند، ئەویش سووتا.

(ٱلْفَوْزُ): (**الظَّفَرُ بالخَيْرِ مَعَ السَّلاَمَة**)، (**فوز**): بریتیە لە وەدەستهێنانی چاکە لەگەڵ هەبوونی سەلامەتیی و بێ زیانییدا.

(بَطْشَ): (البَطْشُ: تَنَاوُلُ الشَّيء بصَولَةٍ)، (بَطْش): بریتیە لە پەلاماردان و داهاتنە شتێك بە توندیی و بە زەبر.

(ٱلْوَدُودُ): (الوُدُّ: مَحَبَّةُ الشَّيءِ وَتَمَنِّي كَوْنِه)، (وُدّ): بە مانای خۆشویستنی شتێك و خۆزگە بخوازی ئەو شتەت بۆ ببێ، کەواتە: (الوَدُود) یانی: (المُحِبّ)، خۆشویست، (مَحْبُوب)یش، خۆشویستراوە.

(ٱلْمَجِيدُ): (المَجْدُ: السَّعَةُ فِي الكَرَمِ وَالجَلَال)، (مَجْد): بریتیە لە فراوانیی لە بەخشین و شکۆدا، (ٱلْمَجِيدُ)، (يُجْرِي السَّعَةَ فِي البَذْلِ المخْتَصِّ بِهِ)، ئەو کەسەیە فراوانیی بەکاردێنێ، لە بەخشینی ئەو بەخششەی تایبەتە بە خۆیەوە، قورئانیش بۆیە بە (ٱلْمَجِيدُ) وەسف کراوە، (لِكَثْرَةِ مَا يَتَضَمَّنُ مِنَ المكَارِمِ الدُّنيَوِيَّةِ والأُخْرَوِّية)، چونکە قورئان زۆر خێرو چاکەی دنیاو دوارۆژی گرتوونە خۆی.

(لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ): (اللَّوحُ: وَاحِد مِنَ أَلوَاحِ السَّفِيْنَة، واللَّوْحُ مَا يُكْتَبُ فِيهِ مِنَ الخَشَبِ وَنَحْوِهِ، وَكَيْفِيَةُ اللَّوحُ المحْفُوظِ تَخْفَى عَلَيْنَا إلاَّ بقَدَرِ مَا رُوِي لَنَا فِي الأَخْبَار، وَهُوَ المُعَبَّرُ عَنْهُ بالكِتَابِ فِي قوله: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧٠﴾ الحج).

(لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ)، واتە: تەختێکی پارێزراو، (لوح)، بریتیە لە یەکێك لە لەوحەکانی کەشتیی، کە بە (أَلواح) کۆدەبێتەوە، هەروەها (لوح)، بریتیە لەوەی لەسەری دەنووسرێ لە تەختە (و لە کاغەز) و هەر شتێك، چۆنیەتیی (لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ)یش، بۆ ئێمە شێردراوەو پەنهانەو، مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی لە هەواڵەکاندا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەردا ﷺ هەواڵی پێدابین، واش پێدەچێ مەبەست (لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ)، هەر ئەوەبێ کە لە قسەی خوای بەرزو مەزن داهاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧٠﴾ الحج، ئەوە لە نووسراوێکدا هەیەو لەسەر خوا ئاسانە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەر لە مانا گشتییەکە بە باشی دەزانم ئەو بەسەرهاتەی لەو بارەوە هاتوە بیهێنین، کە ژمارەیەك لە سەرچاوەکانی سوننەت هێناویانە[1]، بەڵام هەندێك لە ڕیوایەتەکان لە هەندێك بێژەدا لە یەکدی جیان و، ئەوەی ئێستا دەیهێنین، ئەوەیە کە لە دەقی (صحیح مسلم)دا هاتوە:

{عَنْ صُهَيْبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَكَانَ لَهُ سَاحِرٌ، فَلَمَّا كَبِرَ، قَالَ لِلْمَلِكِ: إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ، فَابْعَثْ إِلَيَّ غُلَامًا أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ، فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلَامًا يُعَلِّمُهُ، فَكَانَ فِي طَرِيقِهِ، إِذَا سَلَكَ، رَاهِبٌ فَقَعَدَ إِلَيْهِ وَسَمِعَ كَلَامَهُ، فَأَعْجَبَهُ، فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَقَعَدَ إِلَيْهِ، فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ، فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ، فَقَالَ: إِذَا خَشِيتَ السَّاحِرَ، فَقُلْ: حَبَسَنِي أَهْلِي، وَإِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ، فَقُلْ: حَبَسَنِي السَّاحِرُ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَتَى عَلَى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتِ النَّاسَ، فَقَالَ: الْيَوْمَ أَعْلَمُ آلسَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمِ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ؟ فَأَخَذَ حَجَرًا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ السَّاحِرِ فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ، حَتَّى يَمْضِيَ النَّاسُ، فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا، وَمَضَى النَّاسُ، فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ: أَيْ بُنَيَّ أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّي، قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرَى، وَإِنَّكَ سَتُبْتَلَى، فَإِنِ ابْتُلِيتَ فَلَا تَدُلَّ عَلَيَّ، وَكَانَ الْغُلَامُ يُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ، وَيُدَاوِي النَّاسَ مِن سَائِرِ الْأَدْوَاءِ، فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِيَ، فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ، فَقَالَ: مَا هَاهُنَا لَكَ أَجْمَعُ، إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِي، فَقَالَ: إِنِّي لَا أَشْفِي أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِي اللَّهُ، فَإِنْ أَنْتَ آمَنْتَ بِاللَّهِ دَعَوْتُ اللَّهَ فَشَفَاكَ، فَآمَنَ بِاللَّهِ فَشَفَاهُ اللَّهُ، فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ؟ قَالَ: رَبِّي، قَالَ: وَلَكَ رَبٌّ غَيْرِي؟ قَالَ: رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ، فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلَامِ، فَجِيءَ بِالْغُلَامِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: أَيْ بُنَيَّ قَدْ بَلَغَ مِن سِحْرِكَ مَا تُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ، وَتَفْعَلُ وَتَفْعَلُ، فَقَالَ: إِنِّي لَا أَشْفِي أَحَدًا، إِنَّمَا يَشْفِي اللَّهُ، فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الرَّاهِبِ،

---

(١) أخرجه مسلم: ٣٠٠٥، والترمذي: ٣٣٤٠، والنسائي في الكبرى: ١١٦٦١، وابن حبان: ٨٧٣.

فَجِيءَ بِالرَّاهِبِ، فَقِيلَ لَهُ: ارجِعْ عَن دِينِكَ، فَأَبَى، فَدَعَا بِالمِنْشَارِ، فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ، فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ، ثُمَّ جِيءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَن دِينِكَ، فَأَبَى فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ، فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ، ثُمَّ جِيءَ بِالْغُلاَمِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِن أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا، فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ، فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذُرْوَتَهُ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ، وَإِلاَّ فَاطْرَحُوهُ، فَذَهَبُوا بِهِ فَصَعِدُوا بِهِ الجَبَلَ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ، فَرَجَفَ بِهِمِ الْجَبَلُ فَسَقَطُوا، وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللَّهُ، فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِن أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ فَاحْمِلُوهُ فِي قُرْقُورٍ، فَتَوَسَّطُوا بِهِ البَحْرَ، فَإِنْ رَجَعَ عَن دِينِهِ وَإِلاَّ فَاقْذِفُوهُ، فَذَهَبُوا بِهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ، فَانْكَفَأَتْ بِهِمِ السَّفِينَةُ فَغَرِقُوا، وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللَّهُ، فَقَالَ لِلمَلِكِ: إِنَّكَ لَسْتَ بِقَاتِلِي حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ، قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: تَجْمَعُ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، وَتَصْلُبُنِي عَلَى جِذْعٍ، ثُمَّ خُذْ سَهْمًا مِن كِنَانَتِي، ثُمَّ ضَعِ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قُلْ: بِاسْمِ اللهِ رَبِّ الْغُلاَمِ، ثُمَّ ارْمِنِي، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ قَتَلْتَنِي، فَجَمَعَ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، وَصَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ، ثُمَّ أَخَذَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ، ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِي كَبْدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قَالَ: بِاسْمِ اللهِ، رَبِّ الْغُلاَمِ، ثُمَّ رَمَاهُ، فَوَقَعَ السَّهْمُ فِي صُدْغِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ فِي صُدْغِهِ فِي مَوْضِعِ السَّهْمِ فَمَاتَ، فَقَالَ النَّاسُ: آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ، آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ، آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ، فَأُتِيَ الْمَلِكُ فَقِيلَ لَهُ: أَرَأَيْتَ مَا كُنْتَ تَحْذَرُ؟ قَدْ وَاللَّهِ نَزَلَ بِكَ حَذَرُكَ، قَدْ آمَنَ النَّاسُ، فَأَمَرَ بِالأُخْدُودِ فِي أَفْوَاهِ السِّكَكِ، فَخُدَّتْ وَأَضْرَمَ النِّيرَانَ، وَقَالَ: مَنْ لَمْ يَرجِع عَن دِينِهِ فَأَحْمُوهُ فِيهَا، أَوْ قِيلَ لَهُ: اقْتَحِمْ، فَفَعَلُوا حَتَّى جَاءَتِ امْرَأَةٌ وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَتَقَاعَسَتْ أَنْ تَقَعَ فِيهَا، فَقَالَ لَهَا الْغُلاَمُ: يَا أُمَّهْ اصْبِرِي فَإِنَّكِ عَلَى الْحَقِّ}.

واتە: صوهەیب ﷜ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، کە فەرموویەتی: لە پێش ئێوەدا حوکمڕانێك هەبوو، جادووگەرێکی هەبوو، دوای ئەوەی جادووگەرەکە کەوتە تەمەنەوە، بە پادشای گوت: من کەوتوومە تەمەنەوە، منداڵێکم بۆ بنێرە (کوڕێکی گەنج) جادووی فێر بکەم، منداڵێکی بۆ نارد (کوڕێکی گەنج) فێری بکات، ئەو کوڕە گەنجە لەسەر ڕێگایەکەی کە دەچوو بۆ لای جادووگەرەکە، بۆ ئەوەی جادووی لێ فێر بێ،

خواپەرستێك (گۆشەگیرێك) هەبوو، دانیشت و گوێی لە قسەکەی گرت و پێی سەرسام بوو، بۆیە هەموو ڕۆژێك کە دەچووە لای جادوو گەرەکەو بە لای ڕاهیبەکەدا دەڕۆیی، لە لای دادەنیشت، کاتێك چوو بۆ لای جادووگەرەکە (دیارە تۆزێك دوا کەوتوە)، لێیدا، ئەویش ئەوەی بۆ ڕاهیبەکە باسکرد، سکاڵای خۆی لای ئەو کرد، ئەویش گوتی: ئەگەر لە جادوو گەرەکە ترسای، بڵێ: لەماڵێ دوایانخستووم و، ئەگەر لە ماڵێش ترسای، بڵێ: جادووگەرەکە ڕایگرتم، ئیدی لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام بوو، ڕۆژێك ژیانداریکی مەزن هات، ڕێی بە خەڵك گرتبوو، نەیدەهێشت خەڵکەکە بڕوا، (لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، کە شێر بووە)، گوتی: ئەمڕۆ دەزانم داخۆ جادوو گەرەکە باشترە یاخود ڕاهیبەکە؟، بەردێکی هەڵگرت و گوتی: ئەی خوایە! ئەگەر ڕێبازی ڕاهیبەکە لە لای تۆ خۆشەویستترە لە هی جادووگەرەکە، بەم بەردەی دەیهاوێم ئەو ژیاندارە، ئەو دەعبایە بکوژە، بۆ ئەوەی خەڵکەکە بڕوا، ئەوە بوو بەردەکەی تێگرت و کوشتیی و خەڵك ڕۆیشت، ئەویش چووە لای ڕاهیبەکەو بۆی گێڕایەوە (ئەو کوڕە گەنجە هەواڵی پێدا)، ڕاهیبەکەش پێی گوت: ڕۆڵە! ئەمڕۆ تۆ لە من گەورەتری، کاری تۆ گەیشتۆتە ئەوەی من دەیبینم، بێگومان تۆ تاقی دەکرێیەوە، ئنجا ئەگەر تاقیکرایەوە، باسی منیان بۆ مەکە، ئیدی ئەوە بوو ئەو کوڕە گەنجە، لاڵی زگماك و بەڵەك و هەموو جۆرە نەخۆشەکانی بە فەرمانی خوای پەروەردگار، چاك دەکردنەوە، یەکێك لەوانەی هاونشینی پادشا بوو، کوێر بوو بوو، بیستی گەنجێکی وا هەیە، چوو بۆ لای و دیاریی و خەڵاتی زۆری بۆ بردن، گوتی: ئەو دیارییانەی هێناومن هەموویان بۆ تۆ، ئەگەر چاکم بکەیەوە، ئەویش گوتی: من کەس چاك ناکەمەوە، بەڵکو خوا خەڵك چاك دەکاتەوە، ئنجا ئەگەر بڕوا بە خوا بێنی، منیش لە خوا دەپاڕێمەوەو خوا شیفات دەدا، ئەو هاونیشینەی حوکمڕان ئیمانی بە خوا هێنا، ئەویش دوعای بۆ کردو خوای پەروەردگاریش شیفای داو چاك بۆوە، ئەو هاونشینەش چوو بۆ لای حوکمڕان و لە لای دانیشت وەك چۆن جاران دادەنیشت، بە چاوساغیی (دیارە کە چاوەکانی کوێر بوون، وازی لە کۆڕو مەجلیسەکەی هێناوە)، حوکمڕانەکە پێیگوت: کێ چاوتی چاك کردەوە؟

گوتی: پەروەردگارم.

گوتی: بۆچی جگە لە من پەروەردگارێکی دیکەت هەیە؟

گوتی: پەروەردگاری من و پەروەردگاری تۆش خوایە.

ئیدی حوکمڕانەکە گرتی و زۆر ئەشکەنجەیدا، تاکو لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەی زۆردا ناوی غوڵامەکەی پێ گوت، (کە ئەو کوڕە گەنجە بۆتە هۆی چاککردنەوەی من)، کوڕە گەنجەکەیان هێنا.

پادشا پێیگوت: ئەی ڕۆڵە! جادوو کردنی تۆ گەیشتۆتە ئەو ئەندازەیەی لاڵی و زگماك و بەڵەك چاك بکەیەوەو، ئاوا بکەی و ئاوا بکەی؟

کوڕە گەنجەکە گوتی: من هیچ کەس چاك ناکەمەوە، بەڵکو خوا چاکیان دەکاتەوە.

پادشاش گەنجەکەی گرت و بەردەوام ئازاری داو ئەشکەنجەی دا، تاکو لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەدا ناوی ڕاهیبەکەی پێگوت، ڕاهیبەکە هێنرا.

پێی گوترا: لە دینەکەت هەڵگەڕێوە؟

ئەویش ئامادە نەبوو هەڵبگەڕێتەوە، بۆیە مشارێکیان هێنا، لەسەر تەپڵی سەرییان داناو، دوو لەتیان کردو دوو لەتەکەی بەملاولادا کەوتن، دوایی هاونشینەکەی حوکمڕانیان هێنا، پێیگوترا: لە دینەکەت هەڵگەڕێوە!، بەڵام ئامادە نەبوو هەڵبگەڕێتەوە، بۆیە مشاریان لەسەر تەپڵی سەری ئەویش داناو ئەویشیان دوو لەت کرد، هەر لەتکەی بە لایەك دا کەوت، دوایی ئەو کوڕە گەنجەیان هێناو پێیگوترا، لە ئاینەکەت هەڵبگەڕێوە!، بەڵام ئامادە نەبوو، حوکمڕانەکەش تەسلیمی چەند کەسێکی کرد، لە هاوەڵەکانی و گوتی: بیبەن بۆ فڵان چیایەی فڵان شوێن، شوێنێکی بەرزو سەری بخەن بۆ سەرێ، هەر کاتێك گەیشتنە لووتکەکەی، ئەگەر لە ئایینەکەی هەڵگەڕایەوە، ئەگەرنا لەوێڕا فڕێی بدەنەخوار، بردیان و، چوونە سەر ئەو چیایە، ئەو کوڕە گەنجەش گوتی: ئەی خوایە! بەو شێوەیەی بۆ خۆت پێت چاکە، ئەوانەم لە کۆڵ بکەوە، چیایەکەش لەرزی و ئەوان هەموو کەوتنە خوارو، مردن، ئەویش بە ڕۆیشتن هات بۆ لای پادشا.

پادشا پێیگوت: هاوەڵەکانت چییان کرد؟

گوتی: خوا لە کۆڵی کردمەوە.

ئنجا تەسلیمی کۆمەڵێکی دی لە هاوەڵانی کردو گوتی: بیبەن سواری بەلەمێکی بکەن، یان سواری کەشتییەکی گچکەی بکەن، بیبەنە نێوەڕاستی دەریا، ئنجا ئەگەر لە ئایینەکەی هەڵگەڕایەوە، ئەگەرنا فڕێی بدەنە نێو دەریا، بردیان، بۆ نێو دەریا، گوتی: ئەی خوایە! بەو شێوەیەی بۆ خۆت پێت چاکە، ئەوانەم لە کۆڵ بکەوە.

کەشتییەکە هەڵگەڕایەوەو ئەوان هەموویان غەرق بوون، ئەویش بە ڕۆیشتن هاتەوە بۆ لای پادشا.

پادشا پێیگوت: هاوەڵەکانت چییان کرد؟

گوتی: خوا لە کۆڵی کردمەوە.

ئنجا بە پادشای گوت: تۆ ناتوانی من بکوژی، تاکو چی بۆ خۆم پێت دەڵێم، وانەکەی.

گوتی: چییە؟

گوتی: خەڵك هەمووی کۆبکەوە لە مەیدانێکدا، منیش بە قەدی دارخورمایەکەوە هەڵواسەو، لە تیر دانەکەی خۆم تیرێك دەربێنەو، بیخە نێو کەوانەوە، ئنجا بڵێ: بە ناوی خوا پەروەردگاری ئەو منداڵە، (ئەو کوڕە گەنجە)و تیرەکەم تێ بگرە، ئەگەر واتکرد، ئەو کاتە زەفەرم پێ دەبەی و دەمکوژی.

حوکمڕانەکە خەڵکەکەی کۆکردەوە لە مەیدانێکدا، ئەویشی بە قەدی دارخورمایەکی بەرزەوەی هەڵواسیی، {کە دیاربێ لە هەمووان}، دوایی تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا، {لە تیر دانی ئەو کوڕە گەنجە}و، تیرەکەی خستە نێو کەوانەوەو گوتی: (**بِاسْمِ اللهِ، رَبِّ الْغُلَامِ**)، بە ناوی خوا پەروەردگاری ئەو کوڕە گەنجەو، تیرەکەی تێگرت، تیرەکەش بە لاجانگی کەوت {(صدغ) نێوان چاوو گوێیە}، ئەو کوڕە گەنجەش دەستی خستە سەر لاجانگی خۆی {سەر برینەکەی، ئەو شوێنەی تیرەکەی تێدابوو}، وەفاتی کرد.

خەڵكیش هەموویان گوتیان: (آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ، آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ، آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ)، سێ جاران گوتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری ئەم كوڕە گەنجە هێنا، بڕوامان بە پەروەردگاری ئەم كوڕە گەنجە هێنا، بڕوامان بە پەروەردگاری ئەم كوڕە گەنجە هێنا، كەسانێك هاتن بۆ لای پادشاو پێی گوترا: بینیت ئەوەی لێی دەترسای! ئەوەی لێی دەترسای، سوێند بە خوا هاتۆتە دی و، خەڵك هەموویان بڕوایان هێناوە! ئەویش فەرمانی كرد، لە دەروازەو زاری كۆڵانەكاندا خەندەك لێدران و ئاگریشیان تێدا كرایەوە، حوكمڕانەكەش گوتی: هەر كەسێك لە دینەكەی هەڵنەگەڕایەوە، بیسووتێنن، یان: پێی بگوترێ: بچۆ نێوی، ئەوانیش بەو شێوەیان كرد، هەتا ئافرەتێك هات، منداڵێكی گچكەی پێ بوو، (لە ڕیوایەتی دیكەدا دەڵێ: منداڵەكە شیری دەخوارد، مەمكی دایكی لە زاری دابوو)، ئافرەتەكە ترساو گەڕایەوە، بەرەو دوا، منداڵەكە {كە شیرە خۆرە بوو، قسەی نە دەكرد}، پێی گوت: ئەی دایە! خۆت ڕابگرە، تۆ لەسەر هەقی (بەو شێوەیە ئەو حوكمڕانە ستەمكارە كۆتایی بەو كۆمەڵە بڕوادارە هێنا).

هەڵبەتە ئەم بەسەرهاتە تیشكی باشی بۆ خستینە سەر چەمك و واتای ئایەتە موبارەكەكان، ئێستاش مانای گشتیی ئایەتەكانی دەكەین بە كورتیی:

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١- بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، دەست بە خوێندنی ئەو سوورەتە قوڕئانییە دەكەم.

٢- تەنیا بۆ خوا دەیخوێنم و ڕەزامەندیی وی پێ دەخوازم.

٣- بە پێی بەرنامەی خوا، دەیخوێنم.

٤- بە هەوڵ و توانایەك كە خوا بۆی ڕەخساندووم، دەیخوێنم.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ ﴾، سوێند بە ئاسمانی خاوەن بورجەكان، دوایی لە بارەی بورجەكانەوە قسە دەكەین و، زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست پێیان ئەستێرەكانن، هەر كام لە ئەستێرە و كەهكەشان و گەلە كەهكەشانانە، وەك قەڵاو كۆشكی گەورە وان، ﴿ وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ ﴾، سوێندیش بە ڕۆژی بەڵێندراو، كە مەبەست

پێی ڕۆژی دواییە، کە خوا بەڵێنی داوە، بیهێنێتە دی، ﴿ وَشَاهِدٖ وَمَشۡهُودٖ ﴾، سوێند بە بینەرو بە بینراویش، یاخود بە بابای ئامادەو، کەسێك کە خەڵکی لەلا ئامادە دەبێ.

وەڵامی سێ سوێندەکان نەهاتوەو، زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەوەیە کە ڕۆژی دوایی هەقەو دێ، ئنجا خوا ﷻ بەسەرهاتی ئەو کۆمەڵە ئیماندارەی بە ستەم کوژراون، دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ﴾، هاوەڵانی چاڵەکە بە کوشت بچن، نەفرینیان لێ بێ، ﴿ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ﴾، ئاگرێکی خاوەن سووتەمەنیی کە لە نێو چاڵەکەدا کردبوویانەوە، ﴿ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ ﴾، کاتێك خۆشیان دانیشتبوون لە قەراغەکانی و دەوروبەری چاڵەکە، واتە: ئەوانەی بڕوادارانیان دەسووتاندن، خۆشیان لەو کاتەدا دانیشتبوون، ﴿ وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ ﴾، ئەوان لەسەر ئەوەی بە بڕوادارانیان دەکرد، خۆشیان بینەرو ئامادە بوون و، لەبەر چاوی ئەوان قرچ قرچ دەسووتان، ﴿ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴾، هیچیشیان لێ بە عەیب و ڕەخنە نەگرتن، ئەوە نەبێ کە بڕوایان هەبوو بە خوای زاڵی ستایشکراو، تاکە عەیب و کەم و کووڕییان لە چاوی سووتێنەرەکاندا هەر ئەوە بوو، کە ئیمانیان بە خوا هەبوو، ﴿ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەو خوایەی حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی بەس هی ئەوە، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴾، خواش بینەرو چاودێرو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکەوە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی ئازاری پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕواداریان داوەو دواییش نەگەڕاونەوە، پەشێمان نەبوونەوە، ﴿ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ ﴾، ئەوانە ئازاری دۆزەخیان بۆ هەیە، ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ ﴾، هەروەها ئازاری سووتێنەریشیان بۆ هەیە، چونکە سزای دۆزەخ مەرج نیە تەنیا سووتاندن بێ، دۆزەخ زەمهەریرو زەققووم و غیسلینیش و، قەمچی ئاسن و زنجیرو کۆت و زۆر شتی دیکەشی تێدایە، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، باخەکانیان بۆ هەن ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ﴾، ئا ئەوە بردنەوەو بە ئامانج گەیشتنی گەورەیە.

﴿ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴾، بە دڵنیایی پەلاماردان و زەبری پەروەردگارت زۆر سەخت و توندە، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴾، ئەو بەس خۆی دروست دەكات و دەشیانگێڕێتەوە، واتە: دەستپێكی دروستكراوان لە خۆیەوەو، دوای ئەوەش، دەیانمرێنێ و دەشیانگێڕێتەوە، ﴿ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴾، هەر ئەویش زۆر لێبوردەی زۆر خۆشویستە، بەندە چاكەكانی خۆی خۆشدەوێن، ﴿ ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ﴾، خاوەن تەختەو شكۆداری هەرە بەرزیشە، خوێندراویشتەوە: (ذُو ٱلْعَرْشِ **المجيدِ**)، ئەو كاتەش (**مجيد**) دەبێتە سیفەت بۆ عەڕش، واتە: خاوەن عەڕشی شكۆمەندە، ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾، ئەنجامدەری هەر شتێكە بیەوێ، هەرچی بیەوێ، ئەنجامی دەدا.

﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ﴾، ئایا باس و خواسی سەربازەكانت پێ نەگەیشتوە؟ ئەی موحەممەد ﷺ! یان ئەی هەر كەسێك! كە قورئان دەخوێنی، ﴿ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴾، وەك نموونە: فیرعەون و سوپایەكەی، هەروەها (گەلی) **ثەموود**، كە لە نیوە دورگەی عەرەبیی دا بوون، پێغەمبەرەكەیان ناوی (**صالح**) عليه السلام بوو، كە لە تەفسیری سوورەتی (**الحجر**)دا بە تەفصیل باسی بەسەرهاتەكەیانمان كرد.

﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ﴾، بەڵكو ئەوانەی بێبڕوا بوون، لە بە درۆ دانان دان، واتە: لە بە درۆ دانانی پێغەمبەردا ﷺ نغرۆ و نقووم بوون، ﴿ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ ﴾، خواش لە پشتیانەوە دەورە دەرە، خوا دەوری داون و، لە سزاو تۆڵەی خوا دەرباز نابن و دەرناچن.

﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴾، {وانیە وەك ئێوە دەڵێن: كە ئەفسانەی قورئان پێشینان بێ و موحەممەد هەڵیبەستبێ}، بەڵكو ئەوە قورئانێكی خاوەن شكۆو پایە بەرزە.

﴿ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴾، لە تەختێكدایە، پارێزراوە، واتە: لەو تەختەدایەو تەختەكەش پارێزراوە كە شەیتانەكان دەستیان بیگاتێ، خوێندراویشەتەوە: (فِى لَوْحٍ **مَحْفُوظٌ**) واتە: ئەو قورئانە لە تەختێكدایەو، قورئانەكەش خۆی پارێزراوە لەوەی هیچ كەس دەستی بیگاتێ، بە گۆڕین و دەستكاریی كردن و كەم و زیادیی تێداكردن، وەك بێبڕوایەكان گومانیان دەبرد، كە موحەممەد ﷺ بە ناوی خوای پەروەردگارەوە شتێكی گوتبێ!.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە ئاسمانی خاوەن بورجەکان و، ڕۆژی بەڵێندراو و بینەرو بینراو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ۝١ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ۝٢ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ۝٣﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾، سوێند بە ئاسمانی خاوەنی بورجەکان، ﴿ٱلْبُرُوجِ﴾، کۆی (**برج**)ە، کە لە زمانی عەرەبییدا هەم بە مانای (**قصر**) دێ، یانی: کۆشك و بینایەکی بەرزو گەورە، هەم بە مانای (**حِصْن**)، قەڵا دێ، بۆیەش خوا ﷻ ئاسمانی بەو شێوەیە وەسف کردوە، چونکە هەر کۆمەڵە ئەستێرەیەك لە ئاسماندا شێوەی قەڵاو، کۆشکێکی بەرز دەکەن.

هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: ئێمە ئێستا وشەی (**برج**) بەکاردێنین کە بە (**بروج**) کۆدەکرێتەوە، بۆ ئەو وێستگانەی کاتێك زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، هەر مانگە لە وێستگەیەکدا دەبێ و پێی دەگوترێ: (**برج**).

هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی بورجەکانی مانگە، مانگ کە بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، بیست و هەشت (٢٨) قۆناغ و بورجی هەن، هەر چۆن بێ، خوا ﷻ سوێندی خواردوە بە ئاسمانی خاوەن بورجەکان.

**٢)-** ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ﴾، سوێند بە ڕۆژی بەڵێندراو، وەك خوا ﷻ لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ۝٤٤﴾المعارج، واتە: ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە

بەڵێنیان پێدەدرا، کە ڕۆژێك دێ مرۆڤەکان تێدا هەڵدەستێنرێنەوەو زیندوو دەکرێنەوە، سزاو پاداشت ڕوویان تێدا دەکات، کەواتە: ﴿ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡمَوۡعُودِ ﴾، یانی: ئەو ڕۆژەی خوا بەڵێنی داوە، بێ، کە ڕۆژی دواییە.

٣)- ﴿ وَشَاهِدٖ وَمَشۡهُودٖ ﴾، سوێند بە شایەدو شایەدیی لەسەر دراو.

(**شَاهِد**)، کەسێکە شایەدیی دەدا، (**مَشهُود**)یش کەسێکە شایەدیی لەسەر دەدرێ، یاخود: (**شَاهِد**)، بە مانای بینەر، (**مَشهُود**)، واتە: بینراو، ئنجا ئایا مەبەست بەو بینەر و بینراوە، کێن؟

أ- هەندێك گوتوویانە: بینەرەکان فریشتەکانن و، بینراوەکان مرۆڤەکانن، هەروەها جندەکانیش کە فریشتەکان کردەوەکانیان دەبینین، تۆماریان دەکەن.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: بینەر خوای بەرزی مەزنەو، بینراوەکانیش خەڵکە، خوا دەیانبینێ و ئاگای لێیانە.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: (**شَاهِد**)، هەموو ئەوانەن کە دەتوانن ببینن و، ئامادە بن لە لای شت و ئاگاداری بن، (**مَشهُود**)یش، ئەوانەن کە دەگونجێ ببینرێن و، ئاگاداریی حاڵ و باڵیان بکرێ.

خوای پەروەردگار ئەم سێ سوێندانە دەخوات، بەڵکو چوار سوێندیشن: سوێند بە ئاسمانی خاوەن بورجەکان، سوێند بە ڕۆژی بەڵێندراو، سوێند بە بینەرو بینراو، بەڵام ئایا وەڵامی سوێندەکە چییە؟

زانایان لەو بارەوە ڕا جیاییان هەیە، چونکە وەڵامی سوێندەکە دیار نیە:

١- هەندێك گوتوویانە: وەڵامەکەی ئەوەیە: دڵنیابن کە زیندوو دەکرێنەوە.

٢- هەندێك گوتوویانە: هەر لە خودی ئایەتەکاندا دەلالەت لەسەر وەڵامی سوێندەکە هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ﴾، بە کوشت بچن هاوەڵانی چاڵەکە،

واتە: وەك چۆن ئەوان بە كوشتچوون، بێبڕوایەكانی ڕۆژگاری تۆش ئەی موحەممەد ﷺ! ئەگەر وازنەهێنن و، لەسەر كوفرو خراپەی خۆیان بەردەوام بن، ئەوانیش بەو جۆرە كوشت دەچن و سزا دەدرێن.

٣- هەندێكی دیكەش گوتوویانە: وەڵامی ئەو سوێندە ئەوەیە كە دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُواْ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ﴾، ئەوە وەڵامەكەیەتی: بە دڵنیایی ئەوانەی پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادارییان ئەشكەنجەو سزار داون، دواییش نەگەڕاونەوە، سزای دۆزەخ و سزای سووتێنەریان هەیە.

٤- هەندێكی دیكەش گوتوویانە: وەڵامی سوێندەكە ئەوەیە كە خوا دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾، بە دڵنیایی پەلامارو گرتنی پەروەردگارت زۆر سەخت و توندە.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە كە خوا سبحانەو تعالی وەڵامی سوێندەكەی نەخستۆتە ڕوو، لێرەو لە چەند شوێنی دیكەش لە قورئاندا، بۆ ئەوەی هەم ئەوانەی باسمان كردن، بگرێتەوەو، هەر شتێكی دیكەش كە لەگەڵ ڕەوتی ئایەتەكاندا بگونجێ، بیگرێتەوە.

## قسەیەكی كورت لەسەر بورجەكان

دەربارەی بورجەكان (إبن عاشور) ڕوونكردنەوەیەكی جوانی داوە، بە باشمزانی بیهێنم[١]، دەڵێ:

**(الْبُرْجُ السَّمَاوِيُّ يَتَأَلَّفُ مِنْ مَجْمُوعَةِ نُجُومٍ قَرِيبَةٍ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ، لَا تَخْتَلِفُ أَبْعَادُهَا أَبَدَاً، وَإِنَّمَا سُمِّيَ بُرْجَاً لِأَنَّ الْمُصْطَلِحِينَ تَخَيَّلُوا أَنَّ الشَّمْسَ تَحِلُّ فِيهِ مُدَّةً فَهُوَ كَالْبُرْجِ، أَيِ الْقَصْرِ، أَوِ الحِصْنِ، وَلَمَّا وَجَدُوا كُلَّ مَجْمُوعَةٍ مِنْهَا يُخَالُ مِنْهَا شَكْلٌ لَوْ أُحِيطَ بِإِطَارٍ لِخَطٍّ مَفْرُوضٍ، لَأَشْبَهَ مُحِيطُهَا مُحِيطَ صُورَةٍ تَخَيُّلِيَّةٍ لِبَعْضِ الذَّوَاتِ مِنْ حَيَوَانٍ أَوْ نَبَاتٍ أَوْ آلَاتٍ، مَيَّزُوا بَعْضَ تِلْكَ الْبُرُوجِ مِنْ بَعْضٍ بِإِضَافَتِهِ إِلَى اسْمِ مَا تُشْبِهُهُ تِلْكَ الصُّورَةُ تَقْرِيبًا، فَقَالُوا: بُرْجُ الثَّوْرِ، بُرْجُ الدَّلْوِ، بُرْجُ السُّنْبُلَةِ مَثَلاً).**

واتە: بورجی ئاسمانیی لە كۆمەڵێك ئەستێران پێك دێ، كە هەندێكیان لە هەندێكیان نیزیكن و، ماوەكانیان ناگۆڕێن و، لە یەك ئاستدا دەمێننەوە بە نسبەت، ئێمەی دانیشتووانی زەوییەوە، بۆیەش بەو كۆمەڵە ئەستێرەیە گوتراوە: (بورج)، چونكە ئەوانەی ئەو زاراوەیان بەكارهێناوە، وا هاتۆتە بەرچاویان، كە خۆر ماوەیەك لەو شوێنەدا دەمێنێتەوە، بۆیە وەك كۆشكێك، یان وەك قەڵایەك وایە، ئنجا لەبەر ئەوەی هەر كام لەو كۆمەڵە ئەستێرانە، ئەگەر بە هێڵێكی گریمانەیی بكێشرێ، وێنەكەی وەك وێنەی هەندێك لەو شتانەیە، وەك ئاژەڵ، یان ڕووەك، یاخود ئامێران، بۆیە هەندێك لەو بورجانەیان پاڵداوەتە لای ناوی، یەكێك لەو شتانەی پێی دەچێ، گوتوویانە: بورجی گا، بورجی دۆڵچە، بورجی گوڵە گەنم، یاخود گوڵە جۆ.

شایانی باسە: بورجەكان دوازدە (١٢) بورجن، كە ئەمانەن بە عەرەبیی و مانایەكانیشیان بە كوردیی:

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٢، الجزء: ٣٠، ص٤٣٨.

١- (**حَمَل**): بەرخ.

٢- (**ثَوْر**): گـا.

٣- (**جَوْزَاء**): گوێز.

٤- (**سَرَطَان**): قرژاڵ.

٥- (**أَسَد**): شێر.

٦- (**سُنْبُلَة**): گوڵە گەنم، یاخود گوڵە جۆ.

٧- (**مِيزَان**): تەرازوو.

٨- (**عَقْرَب**): دووپشك.

٩- (**قَوْس**): کەوان.

١٠- (**جَدِي**): کاریلە.

١١- (**الدَّلو**): دۆڵچە ئەوەی ئاوی پێ لە بیر هەڵدێنجن.

١٢- (**حُوت**): ماسی، یاخود نەهەنگ.

کاتی خۆیشی لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا، دیسان باسی بورجەکانمان کردوە.

## مەسەلەی دووەم:

**هەڕەشەکردن لە هاوەڵانی چاڵەکە کە ئاگری تێدا کرابۆوەو، بێبڕوایانی ستەمکار بڕوادارانیان تێدا دەسووتاندن و خۆشیان تەماشایان دەکردن، ئەوەی لێشیان بە ڕەخنە دەگرتن تەنیا بڕواهێنانیان بوو بە خوای حوکمڕانی ئاسمانەکان و زەوی، بێگومانیش ئەشکەنجەدەرانی بڕوادارانی پەشێمان نەبووەوە، سزایان دۆزەخە، بڕوادارانی کردار باشیش بردنەوەی گەورەیان بە قسمەت دەبێ، کە بە هەشتەکانی خوان ﷻ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ﴿١١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴾، هاوەڵانی چاڵەکە بە کوشتبچن.

**ئەمە** لێرەدا:

**أ**- یان هەڕەشەکردنە، واتە: بە کوشت دەچن، هەرچەندە بە ڕابردوو هێنراوە.

**ب**- یاخود: نزای خراپە لێیان و لە هەردوو حاڵەتدا واتە: ئەوان شایستەی ئەوەن بە کوشت بچن و سزا بدرێن (**دُعَاءٌ عَلَيْهِم بالهَلاَكِ وَالعَذَاب**)، نزاو تووك لێکردنیانە بە فەوتان و سزاو ئازاردران، وشەی: ﴿ ٱلْأُخْدُودِ ﴾، پێشتریش باسمان کرد، کە لە (خَدّ) ەوە هاتوە، (خَدّ وأخدود)، هەردووکیان بە مانای چاڵ دێن، کە لە کوڵمەی مرۆڤەوە هاتوون.

﴿ ٱلۡأُخۡدُودِ ﴾، چەند وشەیەکی دیکەش هەن لە زمانی عەرەبیی دا لەسەر ئەو کێشە، وەك:

١- (**أحوسي**)، نشینگەی پەڕەور، ئەو شوێنەی کە مریشك باڵندەی هێلکەکەر دەگەڕێ هەتا پەیدای دەکات تاکو هێلکەی تێدا دا بنێ.

٢- (**أُسلُوب**)، شێواز.

٣- (**أُقنُوم**)، پێکهێنەری شتێك.

٤- (**أُضْحُوك**)، جاری وایە، بۆ مێینە (**مؤنث**)یش دێ، (**أضحوكة**)، مایەی پێکەنین.

٥- (**أطروحة**)، پڕۆژەیەك، نەخشەیەک کە پێشکەش دەکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ﴾، هاوەڵانی چاڵەکە بە کوشت بچن، وشەی: ﴿ أَصۡحَٰبُ ﴾، هاوەڵان، خاوەنان، هەم ئەوانە دەگرێتەوە کە فەرمانیان کردوە بە هەڵکەندنی چاڵەکە، هەم ئەوانەی چاڵەکەیان هەڵکەندوە، هەم ئەوانەی ئاگریان تێدا کردۆتەوە، هەم ئەوانەی سەرپەرشتییان کردوەو، بڕوادارەکانیان خستوونە نێو ئەو چاڵە، ئاگر تێداکراوانەوە.

٢)- ﴿ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ﴾، {ئەو چاڵەی بریتی بوو لە} ئاگرێکی خاوەن سووتەمەنیی {کە لەوێدا کرابۆوە}، (**الوَقُودُ: اسْمُ مَا تُوقَدُ بِهِ النَّارُ مِنْ حَطَبٍ وَنَفْطٍ وَغَيْرِهِمَا**)، (**وقُود**) ئەو سووتەمەنییەیە کە ئاگری پێ دادەگیرسێ، لە دارو لە نەوت و جگە لە ئەوانەش.

بێگومان: ﴿ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ﴾، جێداری گشتگیر (**بَدَلُ آشْتِمَال**)ە، بۆ ﴿ ٱلۡأُخۡدُودِ ﴾، یانی: سەرجەم چاڵ و خندڕکەکە ئاگر بوو، پڕکرابوو لە ئاگر.

یاخود: جێگری هەندێك (**بدل البعض**)ە، واتە: هەندێك لەو چاڵە بریتی بوو لە ئاگر.

٣)- ﴿ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ ﴾، یادبکەوە! کاتێك ئەوان لەسەری دانیشتبوون، یانی: لەسەر کەنارو قەراغەکانی چاڵەکە دانیشتبوون.

ڕاناوی ئەوان ﴿ هُمْ ﴾، دەچێتەوە بۆ ﴿ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴾، واتە: هاوەڵانی چاڵەکە، هاوەڵانی چاڵەکەش ئەوانەبوون کە چاڵەکەیان هەڵقەندووەو، بڕوادارانیان تێدا سووتاندووون، ئنجا خۆشیان لەسەر چاڵەکە دانیشتوون، واتە: لە دەوروبەرو کەنارەکانی چاڵەکە.

٤)- ﴿ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴾، ئەوان لەسەر ئەوەش کە بە بڕوادارانیان دەکرد، ئامادەو بینەر بوون، واتە: لەبەر چاوی ئەوان ئەگەر پیاو بوون، ئەگەر ئافرەت بوون، ئەگەر منداڵ بوون، هەرچی بوون لەبەر چاوی ئەوان، لە نێو ئەو چاڵە ئاگرینەدا دەسووتان.

لێرەدا یەکێك پرسیارێکی بۆ دروست دەبێ کە بڵێ: ئەو بڕوادارانە چییان کردبوو، بەو شێوە دڵڕەقانەو بێڕەزایانە سزا دراون؟ خوای زاناو پەنهانزان وەڵامدەداتەوەو دەفەرموێ:

٥)- ﴿ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾، هیچیشیان لێ بە عەیب نەدەگرتن، جگە لەوەی بڕوایان هەبوو بە خوای زاڵی ستایشکراو، یانی: هیچیان لێ بە ڕەخنە نەدەگرتن کە بە حیساب عەیب و کەم و کووڕیی بێ، ئەوە نەبێ کە بڕوایان بە خوای زاڵی ستایشکراو هێنابوو! ئەمە وەك شیعرەکەی شاعیرە، شاعیرێك مەدحی قەومەکەی خۆی دەکات و دەڵێ:

لَا عَيْبَ فِيهِمْ غَيْرَ أَنَّ سُيُوفَهُمْ    بِهِنَّ فُلُولٌ مِنْ قِرَاعِ الْكَتَائِبِ

هیچ عەیبیان نیە ئەوە نەبێ کە شمشێرەکانیان پاچاونەوە، هێندەی شەڕو جەنگیان پێبکەن.

بێگومان ئەوەش کەم و کووڕیی و عەیب نیە، بەڵکو شانازییەکی زۆر گەورەشە بۆ هۆزەکەی.

٦)- ﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئەو کەسەی حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هەمووی بەس هی ئەوە.

٧)- ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾، خواش چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە، بە هەموو شتێك ئاگادارەو بینەری هەموو شتێکە، کەواتە: بڕوادارانیشی دەبینی، بڕوادارانی پیاوو ئافرەت کە سزا دەدران و، بێبڕوایەکانیشی دەبینی، کە بەو شێوەیە تێیان ڕاما بوون و تەماشایان دەکردن، لە کاتی سووتێنرانیان دا.

٨)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ ﴾، بەدڵنیایی ئەوانەی ئازاری پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕواداریان داوە، دوایش نەگەڕانەوەو پەشێمان نەبوونەوە.

٩)- ﴿ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴾، مسۆگەر ئازارو سزای دۆزەخیان بۆ هەیەو، ئازارو سزای سووتێنەریان بۆ هەیە.

توێژەرەوانی قورئان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە: بۆچی دوای ئەوەی خوا دەفەرمویّ: سزای دۆزەخیان بۆ هەیە، دەفەرمویّ: سزای سووتێنەریان بۆ هەیە؟!، وەڵامەکەشی هەر ئەوەیە:

کە سزای دۆزەخ تەنیا سووتاندن نیە، بەڵکو خوا لە قورئاندا باسی کردوە کە وێڕای ئەو سووتاندنەی خراپترین جۆری سزای دۆزەخە، بەڵام دۆزەخییەکان:

١- کێم و زووخاویشیان بە گەروودا دەکرێ: ﴿ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ ﴾إبراهیم.

٢- زەققوومیش دەخۆن: ﴿ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ ﴾الواقعة.

٣- بە قەمچی ئاسنیش لێیان دەدرێ: ﴿ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ ﴾**الحج**.

٤- لە نێو دووکەڵیشدا دەبن: ﴿ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ ﴾الواقعة.

٥- زۆریش ماندوو دەبن: ﴿ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ ﴾**المدثر**، کەبەشاخ و چیای بەرز هەڵدەگێڕدرێن، واتە: کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ﴾، ئەوانە سزای دۆزەخیان

بۆ هەیە، یانی: سزای دۆزەخ بە هەموو جۆرەکانیەوە، ﴿وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ﴾، لە نێو جۆرەکانی سزای دۆزەخیشدا، سزای سووتێنەریان بۆ هەیە.

﴿ٱلْحَرِيقِ﴾، بە مانای ئاگر دێ، ئاگرێك كە بسووتێنێ و سووتێنەربێ.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوای سبحانە و تعالی دەفەرموێ: ئەوانەی پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوداریان ئەشکەنجە داون، دواییش نەگەڕاونەوەو پەشێمان نەبوونەوە، ئازاری دۆزەخ و ئازاری سووتێنەریان هەیە، کەواتە: لەگەڵ ئەوەشدا کە بێبڕوایان دۆستانی خوایان سزاو ئازارو ئەشکەنجە داون -- کە ئەمە وەك پێشنیارکردن و ئارەزوو کردنە بۆ گەڕانەوەو پەشێمان بوونەوەیان -- خوای پەروەردگار هەر لێیان دەبووری.

١٠)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوە (بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ)، کردەوە باشەکانیشیان ئەنجام داون (بە گشتیی) ئەوانە چەندان باخیان هەن، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

١١)- ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ﴾، ئا ئەوەیە بردنەوەی گەورە، ﴿ٱلْفَوْزُ﴾، (**الظَّفَرُ بالخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلَامَةِ**)، (فوز): بریتیە لە بە ئامانج گەیشتن و بە دەستهێنانی خێرو چاکە، لەگەڵ سەلامەتیی و بێمزەڕەتییش دا.

لێرەدا خوای بەزری مەزن، کە بەسەرهاتی ئەو بڕوادارانەی هاوەڵانی چاڵەکە بەو شێوەیە کوشتوویانن و ئازاریان داون، بە ئەشکەنجەدانەوەو بە سووتاندنەوە، دەگێڕێتەوە، ئەوە لە کاتێکدا بووە کە مسوڵمانانی یەکەم لە مەککە، بە زۆر جۆر ئەشکەنجەدراون و ناڕەحەتکراون و ئازار دراون، خوای پەروەردگاریش بە مسوڵمانانی مەککە، بە پیاوو ئافرەتەوەی فەرمووە: ئێوە تەماشا بکەن! لە پێش ئێوەدا کەسانێك خراپتریش لە ئێوە ئازارو ئەشکەنجە دراون، کەچی خۆڕاگریش بوون، ئنجا ئێوەش وەك ئەوان خۆڕاگر بن، پێشتریش بەسەرهاتەکەمان باسکرد.

زانایان لە بارەی ئەو بەسەرهاتەوە زۆر قسەیان کردوە، بەڵام ئەوەی ئێمە لە (صحيح مسلم) و لە هەندێك سەرچاوەی دیکەوە هێنامان، ئەوەیە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاویەتەوە، کە لە پێش مسوڵمانان دا حوکمڕانێك هەبووە، بەو شێوەیە ئەو خەڵکەی ئازار داوە، کە ئامادە نەبوون بیپەرستن و دەستبەرداری خوا پەرستیی بن، زۆریش پێدەچێ مەبەست لەو بەسەرهاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاویەتەوە، نیوەڕۆکی ئەم ئایەتە موبارەکانە بێ، ئەویش لەگەڵ ئەو هەل و مەرج و واقیعە سەخت و دژوارەی مسوڵمانان لە قۆناغی مەککەدا کەتێیدا بوون، پڕ بە پێست و گونجاو بووە، واتە: ئێوەش ئەو جۆرە کەسانە بکەنە سەر مەشقی خۆتان و تەماشای ئەوان بکەن.

(إبن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، ناوی ژمارەیەك لە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوداری هێناوە، کە ئازارو ئەشکەنجە دراون، هەروەها ناوی چەند کەسێکی هێناوە کە هەڵگەڕاونەوە، ئەوانەی لە پیاوان ئازار دراون:

### ئەو پیاوانەی ئازاردراون:

**(بِلَالُ بْنُ رَبَاحٍ، كَانَ عَبْدًا لِأُمَيَّةَ بنِ خَلَفٍ فَكَانَ يُعَذِّبُهُ، وَأَبُو فُكَيْهَةَ كَانَ عَبْدًا لِصَفْوَانَ بنِ أُمَيَّةَ، وَخَبَّابُ بنُ الْأَرَتِّ كَانَ عَبْدًا لِأُمِّ أَنْمَارٍ، وَعَمَّارُ بنُ يَاسِرٍ، وَأَبُوهُ يَاسِرٌ، وَأَخُوهُ عَبْدُ اللَّهِ، كَانُوا عَبِيدًا لِأَبِي حُذَيْفَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ فَوَكَّلَ بِهِمْ أَبَا جَهْلٍ، وَعَامِرُ بنُ فُهَيْرَةَ كَانَ عَبْدًا لِرَجُلٍ مَنْ بَنِي تَيْمٍ)**

واتە:

١- (بِلَالُ بْنُ رَبَاح): کۆیلەی ئومەییەی کوڕی خەڵەف بوو، ئازاری دەدا.

٢- (أَبُو فُكَيْهَةَ): ئەویش کۆیلەی صەفوانی کوڕی ئومەییە بوو.

٣- (خَبَّابُ بْنُ الْأَرَتِّ): کۆیلەی ئافرەتێك بوو بە ناوی (أُمُّ أَنْمَار).

---

(١) المجلد: ١٢، الجزء: ٣٠، ص ٢٤٥ - ٢٤٦.

٤و٥و٦- (عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ، وَأَبُوهُ يَاسِرٌ، وَأَخُوهُ عَبْدُ اللَّهِ): ئەوانیش كۆیلەی (أَبُو حُذَيْفَة) بوون، ئەویش ئەبوو جەهلی لێڕاسپاردبوون، ئازارو ئەشكەنجەیان بدات.

٧- (عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَة)، ئەویش كۆیلەی پیاوێك بووە لە بەنی (تَيْم).

**ئەو ئافرەتانەی ئازادكراون:**

١- (حَمَامَةُ أُمُّ بِلَالٍ أَمَةُ أُمَيّة بْنِ خَلَفٍ): حەمامە دایكی بیلالی حەبەشەیی، كەنیزەكی ئومەییەی كوڕی خەڵەف بووە.

٢- (زِنِّيرَة): یەكێك بووە لە ئافرەتانی بڕوادار.

٣- (أُمُّ عُنَيْسٍ، كَانَتْ أَمَةً لِلْأَسْوَدِ بْنِ عَبْدِ يَغُوثَ): ئەویش كەنیزەكی (أَسْوَدِ بْنِ عَبْدِ يَغُوثَ) بووە.

٤و٥- (وَالنَّهْدِيَّةُ وَابْنَتُهَا كَانَتَا لِلْوَلِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ): نەهدییەو كچەكەی، كە هەردووكیان كەنیزەكی وەلیدی كوڕی موغیرە بوون.

٦- (لَطِيفَة): یەكێكی دیكە بووە لە ئافرەتانی بڕوادار.

٧- (لبِينَةُ بِنْتُ فُهَيْرَةَ كَانَتْ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ كَانَ عُمَرُ يَضْرِبُهَا): لبینە كچی فوهەیرە كەنیزەكی عومەری كوڕی خەتتاب، بەر لەوەی مسوڵمان بێ و ئازاری داوە.

٨- (سُمَيَّةُ أُمُّ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ كَانَتْ لِعَمِّ أَبِي جَهْل): سومەییە دایكی عەمماری كوڕی یاسیر، كەنیزەكی مامی ئەبوو جەهل بووە.

**ئەو كەسانەی كە هەڵگەڕاونەوە بە هۆی ئازاردرانەوە، ناوی چوار كەسان هاتوە:**

١- (الْحَارِثُ بْنُ رَبِيعَةَ بْنِ الْأَسْوَدِ).

٢- (أَبُو قَيْسِ بْنُ الْوَلِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ).

٣- (عَلِيُّ بْنُ أُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ).

٤- (الْعَاصِي بْنُ الْمُنَبِّهِ بْنِ الْحَجَّاجِ)، بەڵام ئایا دوایی سەرەنجامیان چۆن بووە؟ باس نەكراوە.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**باسی زەبرو هێزی خوا سبحانە و تعالی و توانای بێ سنووری و، وەسفکردنی بە حەوت لە سیفەت و کردەوە بێ وێنەکانی کە بریتین لە:**

**یەکەم: خوا زەبرو پەلاماری توندە.**

**دووەم: پەیدا کەرو گێڕەرەوەیە.**

**سێیەم و چوارەم: لێبوردەو، خۆشویستە.**

**پێنجەم و شەشەم: خاوەن عەرش و، شکۆدارە.**

**حەوتەم: ئەنجام دەرە بۆ هەرچی بیەوێ.**

**ئنجا باسی ئەو سوپاو سەربازانەی لە خوا یاخیی بوون و خواش گرتوونی، بۆ وێنە: فیرعەون و سوپایەکەی، هەروەها گەلی (ثمود)، باسی لە بەدرۆ دانان دا نغرۆبوونی کافرەکان و، دەورەدانی خوا بۆیان و، باسی قورئان کە شکۆداری پایە بەرزە لە تەختێکی پارێزراودا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ ﴿٢٠﴾ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

لێرەدا خوا خۆی بە حەوت سیفەتان دەناسێنێ:

**١)-** ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾، یەکەم: بە دڵنیایی زەبری پەروەردگارت توندو سەختە، (البَطْشُ: تَنَاوُلُ الشَّيءِ بصَوْلَةٍ)، (بطش): دەستگەیاندنە شتێکە بە توندیی، هەندێکیش

گوتوویانە: (**البَطْشُ: الأَخْذُ بالشِّدَّة**)، گرتنی توندە، پەلاماردانی توند، (**بَطْش**) ئەگەر لە کوردیی دا (زەبر) بێ: زەبری پەروەردگارت سەخت و توندە.

**٢**)- ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴾، دووەم: بە دڵنیایی هەر ئەو پەیدا دەکات (لەسەرەتاوە خەڵك و دروستکراوان پەیدا دەکات) و {دوای ئەوەی دەشفەوتێن، جارێکی دیکە} دەیانگێڕێتەوەو زیندوویان دەکاتەوە.

**٣**)- ﴿ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴾، سێیەم و چوارەم: ئەو لێبوردەی خۆشویستە، لە گوناهو تاوان و هەڵەو کەم و کوورِییەکان دەبووریْ و، بەندە فەرمانبەرەکانیشی زۆر خۆشدەوێن.

**٤**)- ﴿ ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ﴾، پێنجەم و شەشەم: خاوەن تەخت و بارەگای تایبەتی خۆیەتی، پایەدارو شکۆدارە، ئەوە ئەگەر: ﴿ ٱلْمَجِيدُ ﴾، بە بۆر (**ضم**) بخوێنرێتەوە، بەڵام ئەگەر (**المجِيد**) بە ژێر (**كسْر**) بخوێنرێتەوە: (ذُو ٱلْعَرْشِ المجيدِ) یانی: خاوەن عەرشێکی زۆر شکۆدارە.

**٥**)- ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾، حەوتەم: زۆر بە چاکیی ئەنجامدەری هەر شتێکە کە بیەوێ.

لێرەدا خوا سبحانە و تعالی کە خۆی بەو حەوت سیفەتە پێناسە دەکات، وێرِای زیاتر ناساندنی خۆی، بۆ دڵدانەوەی بڕوادارانە، کە ئەوان خوایەك دەپەرستن، خاوەنی ئەو هەمووە سیفەتانەیە، خوایەك دەپەرستن، هەموو شتێکی بەدەستە، زەبری توندە لە کاتێکدا زەبر دەوەشێنێ، هەموو شتێکی پەیدا کردووە، دوای فەوتانیشیان دەیانگێڕێتەوە، بە تایبەت ژیانداران (**أحياء**)، دوای ئەوەی دەمرن، دەتوانێ جارێکی دیکە بیانگێڕێتەوە بۆ ژیان و بیانژیەنێتەوە، هەروەها زۆر لێبوردەیە بۆ تاوان و خراپەو هەڵەو کەم و کوورِیی بڕواداران، ﴿ ٱلْوَدُودُ ﴾، دیسان زۆری خۆشدەوێن و ئەوەیان بۆ دەکات کە خۆشەویستێك بۆ خۆشویستراوەکانی خۆی دەیکات.

﴿ ذُو ٱلْعَرْشِ ﴾، هەروەها خاوەن بارەگاو تەختی هەرە مەزنە، ﴿ ٱلْمَجِيدُ ﴾، شکۆدارو پایەبەرزی بێ سنوورە لە هێزو گەورەییدا، (**المَجِيدُ: القَوِيُّ العَظِيمُ فِي نَوْعِهِ**)،

(**مجید**) بریتیە لە زۆر بەهێزی، زۆر مەزن لە جۆری خۆی، عەرەب لەو بارەوە گوتوویانە: (**فِي كُلِّ شَجَرٍ النَّارُ، وَاسْتَمْجَدَ المرْخُ والعَفَّار**)، واتە: هەموو درەختێك ئاگری تێدایە، بەڵام (**مَرْخ، وعفَّار**)، {کە بەکارهێنراون بۆ ئاگر پێکردنەوە}، ئەو دووانە زۆر مەزن و شکۆدارن، باشتر ئاگریان لێ پەیدا دەبێ.

﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾، ﴿ فَعَّالٌ ﴾، ڕێژگەی زێدەڕۆیی (**صیغة المبالغة**)ی (**فاعل**)ە، یانی: کەسێك کە زۆر ئەنجامدەری شتێکە، (**فعال لما یرید**)، واتە: زۆر ئەنجامدەری هەر شتێکە کە بیەوێ، یانی: (**يَفْعَلُ كُلَّ مَا يُرِيدُهُ حَسْبَ مَا يُرِيدُهُ**) هەر شتێك بیەوێ، دەیکات، بەو پێیەی دەیەوێ.

٦)- ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ﴾، ئایا باس و خواسی سەربازەکانت بۆ هاتوە، پێت گەیشتوە؟ (**الإِتْيَانُ: مُسْتَعَارٌ لِبُلُوغِ الخَبَرِ، وَالحَدِيثُ: الخَبَرُ، وَالجُنُودُ جَمْعُ جُنْد، وَهُوَ العَسْكَرُ المتَجَمِّعُ للقِتَالِ، وَأُطْلِقَ هُنَا عَلَى الأُمَمِ الَّتِي تَجَمَّعَتْ لِمخَاصَمَةِ الرُّسُل**)، کە دەفەرموێ: بۆت هاتوە (**إتیان**): خوازراوەتەوە بۆ گەیشتنی هەواڵ، مەبەستیش لە (**حدیث**)، هەواڵە، (جنود)یش کۆی (جند)ە، کە سوپایەکی کۆبووەوەیە بۆ جەنگ، لێرەدا مەبەست پێیان ئەو کۆمەڵگایانەن کە کۆبوونەتەوە بۆ دژایەتیی پێغەمبەران (**صلى الله علیهم وسلم**)، وەك لە سووڕەتی (ص)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: سەربازانێك لەولا تێکشکاون لە کۆمەڵەکان، یانی: لەو کۆمەڵانەی دژی پێغەمبەران کۆبوونەتەوە.

ئنجا خوای پەروەردگار، دوو وێنە لەو سەربازە تێکشکاوانە، دێنێتەوە کە سزا دراون و تێکشکاون:

٧)- ﴿ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ ﴾، فیرعەون و ثەموود، خوا ﷻ فیرعەون وەك خۆی باس دەکات، بەڵام ئاشکرایە فیرعەون خەڵك و سوپاو هێزی هەبووە، گەلی (**ثمود**)یش یەکێك لەو گەلانەیە کە فەوتاون و بنبڕکراون (**الأمم البائدة**)، لە سەرچاوە مێژووییەکاندا عەرەب دەکرێن بە سێ بەشەوە: (**العَرَب البائدة، العرب العاربة، العرب المستعربة**)، عەرەبە

قەلاچۆکراوەکان، (لەوانە گەلی عادو، گەلی ثەموود و، گەلی جەدیس)، عەرەبی عاریبە، {کە عەرەبی (**قحطاني**)ین و ئەسڵی عەرەب لەوانەوە هاتوون}، عەرەبی موستەعرەبە: {کە عەرەبی عەدنانیین، ئەوانەی لە ئەسڵ دا عەرەب نەبوون، بەڵام دوایی بوونە عەرەب و زمانی عەرەبیی فێر بوون}، پێغەمبەری خۆشمان ﷺ لەوانە، چونکە ئیبراهیم[1] عليه السلام کە هاجەری خێزانی قیبتیی بوو، میسریی بوو لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی، لە لای ئەو شوێنەی دوایی لەگەڵ ئیبراهیم دا بەیتیان لێدروست کرد، لەوێ دایانان، دوایی لەگەڵ هۆزی (**جرهم**)دا، نث هاتبوونەوێ، تێکەڵ بوون، دوایی نەسڵ و وەچەی ئیسماعیل بە تایبەت لە ڕێی عەدنانەوە، بوونە عەرەبی موستەعرەبە، یانی: ئەو عەرەبانەی بە عەرەبکراون و عەرەب نەبوون، بەڵام دوایی زمانی عەرەبیی فێر بوون.

لە تەفسیری سووڕەتەکانی دیکەدا، بە تەفصیڵ باسمان کردوە، کە فیرعەون و سوپایەکەی چۆن فەوتان! هەروەها باسی گەلی سەموودیش کە چۆن بە هاڕژن و چریکەو بڵێسەیەك لە ئاسمانەوە، فەوتان، ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الحجر)دا باسی فەوتانی گەلی سەموودمان کرد، لە تەفسیری (الأعراف) و سووڕەتی (القصص)یش دا بە تەفصیڵ بەسەرهاتی مووساو هاڕوونی برای (علیهما السلام) و هۆزی بەنوو ئیسرائیل لە لایەك و، فیرعەون و هامان و قاڕوون و دارو دەستەکەیان و سوپاو هێزەکەیان لە لایەکی دیکەوە، باسمان کردوە.

٨)- ﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ﴾، بەڵکو ئەوانەی بێبڕوان لە بە درۆ دانان دان، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فِي تَكۡذِيبٖ ﴾، واتە: ئەوانە لە بەر درۆ داناندا، نغرۆ بوون، (**إِشَارَةٌ إلى إحَاطَة التَّكْذِيب بِهِم إحَاطَةَ الظَّرْفِ بالمَظْرُوفِ**)، ئاماژەیە بەوەی بە درۆ دانان وا دەورەی داون، وەك چۆن شتێك دەخرێتە نێو توورەگەیەکەوە، توورەگەکە دەوری ئەو شتە دەدات، (**ظَرْف**) بریتیە لەو توورەگەیەی شتێکی تێدەکرێ، (**مَظْرُوف**)یش، تێکراوەکەیە، بە هەمان شێوە، بە درۆ دانانیش دەوری وانی داوەو، لە بەدرۆ دانان دا نغرۆ بوون.

---

(١) ئیبراهیم علیە السلام بابی ئیسماعیلەو، ئەویش باپیرە گەورەی عەدنان و، پێغەمبەری کۆتاییش (محمد) عەدنانییە.

٩)- ﴿ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ﴾، خواش لە پشتیانەوە دەورە دەرە، لێرەدا خوای باڵا دەستی پەروەردگار بە وێنەیەك دەیخاتە بەرچاومان، کە وەك چۆن سوپایەك دەوری کەسێك، یان کەسانێك بدات، بە دڵنیایی لە بەردەستیان دەرناچن، خوای بەرزی مەزنیش لە پشتیانەوە ئاوا دەوری داون، واتە: لە دەستی خوا قوتار نابن.

١٠)- ﴿ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ﴾، بەڵكو ئەوە خوێندراوەیەكی زۆر شكۆدارە، قورئان خۆی یانی: خوێندراوە، قورئان خوێندراوەیەكی زۆر شكۆدارە، ئەمە بۆ بەدرۆخستنەوەو بە درۆ دانانی بێبڕوایەكانە كە:

١- دەیانگوت: قورئان ئەفسانەی پێشینانە.

٢- دەیانگوت: قورئان شیعرەو موحەممەد گوتوویەتی.

٣- دەیانگوت: قورئان قسەی كاهینانە.

٤- دەیانگوت: قورئان قسەی جادووگەرانە.

٥- دەیانگوت: قورئان قسەی شێتانە! خوا دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ هُوَ ﴾، (وانیە وەك ئێوە دەڵێن)، بەڵكو ئەوە، (ئەو قورئانەی موحەممەد ﷺ هێناویەتی) خوێندراوەیەكی زۆر شكۆمەندو شكۆدارە.

١١)- ﴿ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ﴾، {جندو شەیتان و هیچ كام لەوانەی ئێوە دایاندەنێن، دەستیان ناگاتە قورئان}، لە تەختێكی پارێزراو دایە.

وشەی: ﴿ مَّحۡفُوظِۭ ﴾، بە هەم بە ژێر (**كسر**) خوێندراوەتەوە: ﴿ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ﴾، یانی: لە تەختێكی پارێزراو دایە، هەروەها ﴿ مَّحۡفُوظِۭ ﴾، بە بۆر (**رفع**)یش خوێندراوەتەوە (فِي لَوۡحٖ مَحْفُوظٌ )، ئەو كاتەش: ﴿ مَّحۡفُوظِۭ ﴾، دەبێتە سیفەت بۆ قورئان، (بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ فِي لَوۡحٖ مَحْفُوظٌ )، بەڵكو ئەم قورئانە قورئانێكی شكۆمەندەو شكۆدارە، لە تەختێكدایە، پارێزراوە، پارێزراوە لەوەی زەفەری پێ ببردرێ، شەیتانەكان ڕێی تێبەرن و، ئەگەری ئەوە هەبێ، نەك هەمووی، بەڵكو بەشێكی قورئانیش دەستی جگە لە خوای پەروەردگاری پێ گەیشتبێ.

## قسەیەک لە بارەی (لوح محفوظ)ەوە

وشەی: ﴿لَوۡحٖ﴾، لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا: (اللَّوح: **قِطْعَةٌ مِنْ خَشَبٍ مُسْتَوِيَّةٌ تُتَّخَذُ لِيُكْتَبَ فِيهَا**)، (**لوح**): بە مانای تاکی ئەو تەختانە هاتوە، کە کەشتییان لێ دروست دەکرێ و بە (**ألواح**)، کۆ دەبنەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش: بە پارچە تەختەیەك، دارێك دەگوترێ تەخت و ڕێکەو بەکاردەهێنرێ بۆ ئەوەی شتی لەسەر بنووسرێ.

ئەو شتەش لە قورئانێ دا چوار تەعبیری بۆ بەکارهێنراون:

١- لێرەدا لە سوورەتی (**البروج**)دا، دەفەرموێ: ﴿فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۢ﴾ -٢٢-.

٢- لە سوورەتی (**الواقعة**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨﴾.

٣- لە سوورەتی (یس)دا دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ١٢﴾.

٤- لە سوورەتی (ق)دا دەفەرموێ: ﴿وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ ٤﴾ ق.

١- ﴿لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۢ﴾، تەختێکی پارێزراو.

٢- ﴿كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ﴾، نووسراوێکی شێردراوە.

٣- ﴿إِمَامٖ مُّبِينٖ﴾، پێشەوایەکی ڕوون، یان ڕوونکەرەوە.

٤- ﴿وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ﴾، نووسراوێکی پارێزەرمان لەلایە.

وا پێدەچێ مەبەست لەو چوار شتانە، هەر چواریان یەك بێ:

١- بەڵام خوا سبحانە و تعالی لەو ڕووەوەی کە خەڵك پێی نازانێ، فەرموویەتی: ﴿كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ﴾، نووسراوێکی شێردراوە.

٢- لەو ڕووەوەش کە پارێزراوەو کەس دەستی نایگاتێ و زەفەری پێنابات، نە مرۆڤ و نە جند و نە هیچ کەس، فەرموویەتی: ﴿فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۢ﴾.

٣- لەو ڕووەوەش کە لە پێش دروستکراوەکانەوەیە، فەرموویەتی: ﴿إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾، پێشەوایەکی ڕوون، یاخود ڕوونکەرەوە.

٤- لەو ڕووەوەش کە پارێزەری هەموو شتێکە، فەرموویەتی: ﴿كِتَٰبٌ حَفِيظٌ﴾.

لەو بارەوەش زانایان دوو ڕای سەرەکییان هەن:

أ- هەندێکیان دەڵێن: ئەم تەعبیرانە بۆ ئەوەن خوای کارزان دەیەوێ ئێمە حاڵیی بکات، کە هەم قوڕئان، هەم زانیارییەکانی خوا، هەموویان پارێزراون، وەك چۆن ئێوە شتێك بنووسن، وەك گوتراوە: (**قيِّدوا العلم بالكتابة**)، زانیاریی بە نووسین بپارێزن و بیبەستنەوە، بە هەمان شێوەش خوا زانیارییەکانی بەو شێوەیە پارێزراون، خوا ویستوویەتی ئێمە حاڵیی بکات، ئێمەش چۆن حاڵیی دەبین؟ بەوەی بزانین شتێك ئەگەر نووسرابێتەوە لە لەوحێکداو، لە نووسراوێکداو، ئەو زانیارییانە تۆمار کرابن، گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

ب- هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: وەك جاری دیکەش باسمان کردوە خوا سبحانەو تعالی بەو تەعبیرانە باسی دروستکراوێکی خۆی دەکات، کە زانیارییەکانی ئەوی تێدا تۆمار کراون و لە نێویاندا قوڕئانە، بەڵام ئێمە نازانین چۆنە؟

هەڵبەتە بۆ خۆم زیاتر بۆچوونی یەکەم بە عەقڵ و دڵمەوە دەنووسێ، کە هەموو ئەو تەعبیرانە بەکارهێنراون بۆ حاڵیی کردنی ئێمە، نەك دروستکراوێك هەبێ خوا زانیارییەکانی خۆی تێدا تۆمار کردبن.

بەڵام ئەگەر دووەمیشیان بێ، هەرچەندە جگە لە مانای ڕواڵەتی ئایەتە موبارەکەکان بەڵگەیەکی دیکەی وا نیە، بەڵام ئاساییە، چونکە هەموو شتێك بۆ خوای بەرزومەزن ئاسانەو، ئاساییە خوا زانیارییەکانی خۆی لە دروستکراوێکی خۆیدا تۆمار کردبن و، نووسیبنی، لە نێوشیاندا ئەو قوڕئانەی ناردوویەتی و، کتێبەکانی دیکەش کە بۆ پێغەمبەرانی دیکەی ناردوون.

لێرەدا کۆتایی بە تەفسیرکردنی سووڕەتی (البروج)، دێنین و، لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە بە ناوە هەر بەرزەکانی و بە سیفەتە هەرە پەسندەکانی، کە تەوفیقمان بدات و، یارمەتییمان بدات، باشترین بەهرە وەربگرین لە قورئان، بە هۆی چاك خوێندنەوەی و، بیر لێ کردنەوەی و، تێوە ڕامانی و، پەند لێوەرگرتنی و، کارپێکردنی، لە چوارچێوەی خودی خۆمان و ماڵ و منداڵمان و کەس و کارو دەوروبەرمان و کۆمەڵگامان، لە هەموو بوارو ڕەهەندەکانی دینداریی و دنیادارییدا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێك

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کە (٢٦)ی مانگی (**ذي القعدة**)ی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچیی، بەرانبەر (٢٠٢٠/٧/١٧) زایینییە، لە شاری هەولێر، خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سوورەتی (**الطارق**).

## پێناسەی سوورەتی (الطارق) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ناوی باوتری ئەم سوورەتە: (**سُورةُ الطارق**)ە، بەڵام بە ناوی: (**سورة والسماء والطارق**) یش، ناسراوە، وەك لەو سێ گێڕدراوەیە دەفامرێتەوە، کە دووانیان پێشتریش هێنامانن:

**یەکەم:** {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي العِشَاءِ الأَخِرَة بـ ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾ و ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾**} (**أخرجه أحمد: ٨٣١٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف**).

واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ، لە عیشای کۆتاییدا (مەبەست نوێژی خەوتنانە)، هەردوو سوورەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾ و ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾، دەخوێندن، (هەر کامیان لە ڕکاتێکدا).

**دووەم:** {**عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالعَصْرِ بـ ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾، و ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾**}، (**أخرجه أبو داود: ٨٠٥، والترمذي: ١٩٠، قال الألباني:حسن صحيح**).

واتە: جابیری کوڕی سەموڕە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هەردوو نوێژی نیوەڕۆو عەصردا، سووڕەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾، و ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾ی، دەخوێندن.

دیارە ئەوانیش هەر سووڕەتە لە ڕکاتێکدا.

سێیەم: {عَن خَالِدٍ الْعَدَوَانِيِّ رضي الله عنه، أَنَّهُ أَبْصَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي مَشْرِقِ ثَقِيفٍ، وَهُوَ قَائِمٌ على قَوْسٍ أَوْ عَصًى، حِينَ أَتَاهُمْ يَبْتَغِي عِنْدَهُمُ النَّصْرَ قَالَ: فَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ: {وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ} حَتَّى خَتَمَهَا، قَالَ: فَوَعَيْتُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَأَنَا مُشْرِكٌ ثُمَّ قَرَأْتُهَا فِي الإِسْلَامِ، قَالَ: فَدَعَتْنِي ثَقِيفٌ فَقَالُوا: مَاذَا سَمِعْتَ مِنْ هَذَا الرَّجُلِ؟ فَقَرَأْتُهَا عَلَيْهِمْ، فَقَالَ مَنْ مَعَهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ: نَحْنُ أَعْلَمُ بِصَاحِبِنَا، لَوْ كُنَّا نَعْلَمُ مَا يَقُولُ حَقًّا لَاتَّبَعْنَاهُ}، (أخرجه أحمد: ١٨٩٧٨، والطبراني: ٤١٢٦ و ٤١٢٧، والبخاري في تأريخه: ٤٦٥: وقال الهيثمي في المجمع: ١١٤٨٣: فيه عبدالرحمن بن خالد ذكره ابن أبي حاتم ولم يجرحه أحد، وبقية رجاله ثقات، قلت: ابن حبانٍ يوثِّقُ المجاهيل).

واتە: خالیدی عەدوانیی (خوا لێی ڕازی بێ)، گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوای ﷺ لە بازاڕی (ثقیف)دا بینیوە، لەو کاتەدا خۆی داوەتە سەر کەوانێك، یان گۆچانێك، هاتوە بۆ لایان، داوای یارمەتیی و پشتگیریی لێ کردوون، گوێی لێ بووە کە ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾ی، خوێندوە، هەتا تەواوی کردوە، دەڵێ: منیش لە سەردەمی نەفامییدا ئەو سووڕەتەم لەبەر کرد، (دوایی کە هاتۆتە نێو ئیسلامەوەش خوێندوویەتی)، هۆزی (ثقیف) بانگیان کردم، گوتیان: وەرە چیت لەو پیاوە بیست؟ منیش سووڕەتەکەم بۆ خوێندنەوە، ئەوانەی لە هۆزی قوڕەیش لەگەڵیان بوون، گوتیان: ئێمە بە هاوەڵەکەی خۆمان ئاگادارترین، ئەگەر زانیبامان ئەوەی دەیڵێ هەقە، شوێنی دەکەوتین.

واتە: تۆش گوێی پێ مەدەو شوێنی مەکەوە، واشپێدەچێ کەوتبێتە ژێر کاریگەریی ئەوان، بەڵام دیارە ئەو سووڕەتەی لەبەر کردوەو دوایی هاتۆتە نێو ئیسلامەوەو خوێندوویەتی.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

زانایان لەسەر مەککەیی بوونی ئەم سوورەتە یەکدەنگن، لەو بارەوەش ئەم دەقە هاتوە:

**{عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، قَالَ: نَزَلَتْ ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾ بِمَكَّة} (أورده السيوطي في الدُرِّ المنثور: ج٨، ص٤٧٣، ونسبه لابن الضريس والنحاس والبيهقي وابن مردويه، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٥٠٧).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنه، گوتوویەتی: سوورەتی ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾، لە مەککە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سوورەتە لە (موصحەف)دا ژمارەکەی (٨٦)ە، لە دابەزینیشدا ژمارەکەی (٣٦)ە، لە ڕووی دابەزینەوە پێش سوورەتی: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ و، دوای سوورەتی: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ﴾، هاتۆتە خوارێ.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان، لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە حەڤدە (١٧)یە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە بە ڕاو بۆ چوونی بەندە، پێنج تەوەر دەگرێتە خۆی:

**١-** سوێند خواردن بە ئاسمان و ئەستێرەی تاریکیی کونکەر، یاخود دڕ بە تاریکییدەر، کە هەموو کەس پارێزەرێکی بەسەرەوەیە، ئایەتەکانی: (١ - ٤).

**٢-** فەرمانكردنی خوا بە مرۆڤ كە سەرنج بدات: لە چی دروست بووە؟ لە ئاوێكی بە فیچقە دەرهاتوو، لە نێوان ئێسكی پشت و سینگ دروست بووە، ئایەتەكانی: (٥ - ٧).

**٣-** توانایی خوا لەسەر زیندووكردنەوەی مرۆڤ، لە ڕۆژی دەركەوتنی نهێنییەكاندا، كە مرۆڤی بێبڕوا هیچ تواناو سەرخەری نابن، ئایەتەكانی: (٨ - ١٠).

**٤-** سوێند خواردنی خوا بە ئاسمانی گێڕەرەوەو، زەوی خاوەن قڵیش (ئامادەیە بقڵیشێ)، كە قورئان فەرموودەی لێك جیاكەرەوەیەو گاڵتە نیە، ئایەتەكانی: (١١ - ١٤).

**٥-** باسی فێڵ و پیلانی ناحەزان و، نەخشەی خوای كاربەجێ لە بەرانبەریانداو، مۆڵەتدانی بێبڕوایان بۆ ماوەیەكی كەم، ئایەتەكانی: (١٥ -- ١٧).

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی:

ئەم سێ تایبەتمەندییەم كەوتوونە بەرچاو:

**١-** لەم سوورەتەدا دوو جاران سوێند بە ئاسمان خوراوە، لە سەرەتاوە و، لە لای نێوەڕاستیشەوە.

**٢-** قورئان بە: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ ﴿١٤﴾﴾، قسەیەكی لێك جیاكەرەوەی نێوان هەق و ناهەق، ڕاست و چەوت، چاك و خراپ، ﴿وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ﴾، ئەم قورئانە گاڵتە نیە، بەوە وەسف كراوە.

**٣-** لەم سوورەتە موبارەكەدا چەند وشەو تەعبیرێك هاتوون، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

١- ﴿وَٱلطَّارِقِ﴾.

٢- ﴿دَافِقٍ﴾.

٣- ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ﴾.

٤- ﴿ رُوَيْدًۢا ﴾.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان:

ئێمە كۆی ئەو حەڤدە (١٧) ئایەتە، دەكەینە دەرسێك، چونكە هەرچەندە بابەتەكانی پێنج تەوەرو پێنج بابەتن، بەڵام زۆر تێكهەڵكێشن و پێكەوە پەیوەست و جۆشدراون و لە یەك پچڕاندنیان لە چەند دەرسێك دا پێویست ناكات.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە هەر حەڤدە (١٧) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە پێك دێ، ئایەتەکانی: (١ - ١٧)، و ئەو حەڤدە (١٧) ئایەتەی ئەم سوورەتەش، پێنج بابەتی گرنگی پێکەوە جۆشدراو دەگرنە خۆیان:

١- خوا سبحانە و تعالى سوێند دەخوا بە ئاسمان و بە ئەستێرەی کونکەر، دڕ بە تاریکیی دەر، کە هەموو کەس پارێزەرێکی بەسەرەوەیە، ئەمە لە چوار ئایەتی یەکەم (١ - ٤)دا.

٢- فەرمانکردنی خوا بە مرۆڤ کە سەرنج بدات لە چی دروست بووە؟ لە ئاوێکی بە فیچقە دەرهاتوو، لە نێوان ئێسکی پشت و سینگ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَـٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ ﴾، ئایەتەکانی: (٥، ٦، ٧).

٣- باسی توانایی خوا لەسەر زیندووکردنەوەی مرۆڤ لە ڕۆژی دەرکەوتنی نهێنییەکاندا، کە هیچ توانایەك و هیچ سەرخەری نابن: ﴿ إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾ ﴾، ئایەتەکانی (٨، ٩، ١٠).

٤- سوێند خواردنی خوا بە ئاسمانی گێڕەرەوەو، زەوی خاوەن قڵیش، کە قورئان فەرموودەیەکی لێك جیاکەرەوەیەو گاڵتە نیە: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ ﴿١١﴾ وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ ﴿١٤﴾ ﴾، ئایەتەکانی: (١١، ١٢، ١٣، ١٤).

٥- باسی پیلان و نەخشەی ناحەزان و، نەخشەی خوا لە بەرانبەریانداو، مۆڵەتدانی خوا بۆ بێبڕوایان و بوار پێدانی و، فەرمانکردنیشی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە ماوەیەکی کەم مۆڵەتیان بدات: ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا ﴿١٧﴾ ﴾. ئایەتەکانی: (١٥ و ١٦ و ١٧).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴿٢﴾ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴿٤﴾ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ ﴿٦﴾ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٞ ﴿٨﴾ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ ﴿١٠﴾ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴿١١﴾ وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ﴿١٤﴾ إِنَّهُمۡ يَكِيدُونَ كَيۡدٗا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيۡدٗا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَمۡهِلۡهُمۡ رُوَيۡدَۢا ﴿١٧﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. سوێند بە ئاسمان و بە شەوگەڕ ﴿١﴾ چیش بە تۆی زانادوە شەوگەڕ چییە؟ ﴿٢﴾ ئەستێرەیەکی (تاریکیی) کونکەر(و دڕپێدەر)ە ﴿٣﴾ هیچ کەسێك نیە مەگەر پارێزەرێکی (لە فریشتان) بەسەرەوەیە ﴿٤﴾ ئنجا با مرۆڤ سەرنج بدات لە چی دروستکراوە! ﴿٥﴾ لە ئاوێکی بەفیچقە دەرقوڵیو دروستکراوە ﴿٦﴾ کە لە نێوان پشت و ئێسکەکانی سینگ دێتە دەرێ ﴿٧﴾ بێگومان ئەو (خوا) لەسەر گێڕانەوەی (و زیندوو کردنەوەی) توانایە ﴿٨﴾ لە ڕۆژێك دا کە نهێنییەکان ئاشکرا دەکرێن ﴿٩﴾ (ئنجا مرۆڤی بێبڕوا) لەو ڕۆژەدا هیچ هێزێك و، هیچ پشیتوانێکی نیە ﴿١٠﴾ سوێندیش بە ئاسمانی خاوەن گێڕانەوە ﴿١١﴾ هەروەها سوێندیش بە زەوی خاوەن قڵیش ﴿١٢﴾ ئەو (قورئان)ە قسەیەکی جیاکەرەوەیە (بۆ هەق و ناهەق و ڕاست و چەوت) ﴿١٣﴾ ئەو گاڵتە نیە ﴿١٤﴾ بێگومان ئەوان (بێبڕوایان) پیلان دەگێڕن (لە دژی پەیامەکەم) ﴿١٥﴾ منیش نەخشە دادەنێم، چ نەخشە دانانێك! ﴿١٦﴾ دەجا (ئەی موحەممەد!) مۆڵەتی بێبڕوایان بدە (منیش) کەمە مۆڵەتێکیان دەدەم ﴿١٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلطَّارِقِ): (الطَّرْقُ كَالضَّربِ إلاَّ أَنَّهُ أَخَصُّ، لِأَنَّهُ ضَرْبٌ على صَلبٍ بِصَوتٍ، كَطَرْق الحَديدِ، وَعُبِّرَ عَن النَّجْمِ بِالطَّارِق، لاخْتِصَاصِ ظُهُورِهِ بِاللَّيْل)، (طارق): لە (طَرق)ەوە هاتوە، (طَرْق): وەك (ضَرْب) وایە، واتە: لێدان، بەڵام (طَرق): تایبەتترە لە (ضرب)، چونكە (طَرق): بریتیە لەوەی لە شتێكی ڕەق بدرێ و دەنگی لێ بێ، وشەی: (طارق)یش لێرەدا بۆ ئەستێرە بەكارهێنراوە، چونكە ئەستێرە بە شەوێ دەردەكەوێ. (چونكە بە ڕۆژ لەبەر تیشكی خۆر، ئەستێرەكان دیار نین و، دوای ئەوەی تیشكی خۆر نامێنێ، ئنجا ئەستێرەكان دەردەكەون).

(دَافِقٍ): (أَي: سَائِلٍ بِسُرْعَةٍ، يُقَالُ: جَاءُ دُفْعةً، وَمشَى الدِّفِقَ، أَي: تَصبَّبَ فِي عَدْوِهِ كَتَّصَبُّبِ المَاءِ المُتَدَفِّقِ)، (دَافِق): هەر شلەمەنییەكە بە خێرایی بڕژێ، دەگوترێ: (جاءَ دُفْقَةً)، واتە: بەخێرایی و لێكڕا هات، دەگوترێ: (مَشَى الدِّفِقَّ)، واتە: لە ڕۆیشتنەكەیدا، لە ڕاكردنەكەیدا لێژ بۆوە، وەك چۆن ئاوێكی بە خورزەم دەڕژێ و لێژدەبێتەوە.

(ٱلصُّلْبِ): لە (صَلْب)ەوە هاتوە، (الصَّلْبُ: الشَّديدُ)، (صَلْب): بە مانای پتەو، ڕەق، سەخت، دێ. (وبِاعْتِبارِ الشِّدَّةِ وَالصَّلابَةِ، سُمِّيَ الظَّهْر صُلْباً، وَصَلَبَاً)، لە ڕووی سەختیی و توندییەو پشت پێی گوتراوە: (صُلْب) و پێشی گوتراوە: (صَلَب)، (والصَّلْب: تَعْلِيقُ الإِنْسَانِ لِلْقَتلِ)، (صَلْب): بریتیە لە هەڵواسینی مرۆڤ بۆ لە سێدارەدان و كوشتنی.

(وَٱلتَّرَآئِبِ): (جَمْعُ تَرِيبَة: أَضْلاعُ الصَّدْرِ)، پەراسووەكانی سینە پێیان دەگوترێ: (تَرَائِب) و كۆی (تَريبة)ن، یانی: (ضِلْع)، (وَٱلتَّرَآئِبِ)، یانی: (أَضْلاَع)، بەڵام پەراسووەكانی كە سینە پێكدێنن.

(تُبْلَى): یانی: (تُظْهَر)، دەردەخرێن، (بَلَوْتُ فُلاَنَاً: خَبَرْتُهُ، (تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ) أَي: تُخْتَبَرُ وَتُعْرَفُ)، (بَلَوْتُ فُلاَناً) واتە: فڵانكەسم تاقیكردەوە، تاكو شارەزای بم، (تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ)، (أَي: تُخْتَبَر وَتُعْرَف)، واتە: تاقی دەكرێنەوەو دەناسرێن.

(ٱلسَّرَآئِرُ): (السِّرّ: جَمْعُهُ أَسْرَار، والسَّرِيْرَةُ جَمْعُهَا: سرائر)، (سِرّ) بە (أَسْرار) كۆدەبێتەوە، (سَرِيْرَة)، بە (سَرائِر) كۆ دەبێتەوە، هەردووكیشیان یانی: شتێك كە مرۆڤ دەیشارێتەوە، یاخود لە سینەدا هەڵیدەگرێ و خەڵك پێی نازانێ.

(ٱلرَّجْعِ): (المَطَر، أَو النَّفْعُ)، هەندێك لە زانایان وشەی: (رَجْع)یان بە مانای باران و، بە مانای سوود، لێكداوەتەوە، بەڵام (رَجْع): یانی: گەڕانەوەو چاوگە، (الرُّجُوعُ: وَهُوَ العَوْدُ إِلى مَا كَانَ مِنْهُ البَدْءُ)، (رُجُوع): بریتیە لە گەڕانەوە بەرەو ئەو شوێنەی دەستپێكەكە لەوەوە بووە، (وَسُمِّيَ المَطَر رَجْعَاً لِرَدِّ الهَوَاءِ مَا تَنَاوَلَهُ مِنَ المَاء)، بۆیە باران پێیگوتراوە: (رَجْع)، چونكە هەوا ئەو ئاوەی هەڵیگرتوە، دەیگێڕێتەوە بۆ زەوی و، دواییش تێكەڵ بە ئۆقیانووسەكان دەبێتەوە، دوای ئەوەی مرۆڤەكان پێداویستییەكانی خۆیانی پێ جێبەجێ دەكەن.

(ٱلصَّدْعِ): (الشَقُّ لِلأَجْسَامِ الصُّلْبَةِ)، (صَدْع): بریتیە لە لەت بوون و قڵیشان لە تەنە ڕەق و پتەوەكاندا.

(فَصْلٌ): (الفَصْلُ: إِبَانَةُ أَحَد الشَّيْئَين مِنَ الآخِرِ، حَتَّى يَكُونَ بَيْنَهما فُرْجَةٌ، فَصْلُ الخِطابْ: الكلام الجليُّ الذي فيه قَطْع الحُكْم، وَحُكم الفَيْصَل)، (فَصْل): بریتیە لە لێك جیاكردنەوەی دووشتان تاكو كەلێنێكیان دەكەوێتێ، (فَصْلُ الخِطَاب): بریتیە لە قسەیەك كە زۆر ڕوون بێ و بڕیارێكی یەكلاییكەرەوەی تێدابێ، دەگوترێ: (حُكْم الفَيصلُ)، واتە: حوكمێك كە لێك جیاكەرەوە بێ.

(بِٱلْهَزْلِ): (الهَزْلُ: كُلُّ كَلَامٍ لا تَحصيلَ لَهُ وَلا رَيْعَ، تَشْبيهاً بِالهُزال)، (هَزْل): بریتیە لە هەر قسەیەك كە هیچ سوودێكی نەبێ و، هیچ بەرهەمێكی نەبێ، چوێندراوە بە (هُزَال)ەوە، واتە: ئاژەڵێكی لەڕ كە گۆشتی پێوە نەبێ.

(كَيْدًا): (الكَيْدُ: ضَرْبٌ مِنَ الإِحْتِيَالِ مَذْمُوماً أَو مَمْدُوحَاً، وَمَذْمُوماً أَكْثَر)، (كَيْد): بریتیە لە جۆرێك لە فێڵ، ئنجا جاری وا هەیە سەرزەنشت كراوە، جاری واش هەیە ستایشكراوە، بەڵام بەزۆریی بۆ حاڵەتی سەرزەنشت و خراپە بەكاردێ.

(فَمَهِّلِ): بوارو مۆڵەت بدە، (المَهْلُ: التُّؤَدَةُ وَالسُّكُونُ)، (مَهْل) هێواشیی و ئارامیی (وَأَمْهَلْتُهُ: رَفَقْتُ بِهِ)، واتە: لەگەڵی دا میهرەبان بووم، (وَمَهَل فِي فِعْلِهِ وَعَمِلَ فِي مُهْلَةٍ)، واتە: لە کارەکەیدا لەسەرەخۆ بوو، یان لە مۆڵەتدا کاری کرد.

(رُوَيْدًا): (الرَوْدُ: التَّرَدُّدُ فِي طَلَبِ شَيءٍ بِرِفْقٍ، رَادَ وَارتَادَ، وَمِنهُ الرَّائِدُ لِطَالِبِ الكَلأِ)، (رَوْد): بریتیە لە هاتن و چوون لە داواکردنی شتێکدا بە نەرمیی و میهرەبانیی، دەگوترێ: (رَادَ وَارْتَادَ)، بە دوای شتێکدا چوو بە نەرمیی، (وَمِنْهُ الرَّائِدُ)، (رَائِد): کەسێکە بە دوای لەوەڕگەدا بگەڕێ، (وَمِنْهُ بُنِيَ رُوَيْدٌ)، (رويْد)یش لەوەوە بنیاتنراوە، دەگوترێ: (فُلاَنٌ يَمْشِي عَلَى رُودٍ، أي: مَهْلٍ، وَمِنْهُ قِيْلَ: الدَّهْر إِرْوَدٌ ذوُ غِيَرٍ)، (رُود): بە مانای مۆڵەتدان و لەسەرەخۆیی، لەوەوەش گوتراوە: (الدَّهر إِرْوَدٌ ذوُ غِيَرٍ)، ڕۆژگار مۆڵەت دەدات و خاوەن گۆڕانکارییە، (أَي: يَعْمَلَ عَمَلَهُ فِي سُكُونٍ لا يُشْعَرُ بِهِ)، یانی: کاری خۆی دەکات بە ئارامیی و بە مەندیی و هەستی پێناکرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١- ئەم قوڕئانخوێندنە (یان ئەم کارە) دەست پێدەکەم بە ناوی خوا.

٢- ئەم کارە بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا، دەکەم.

٣- ئەم کارە بە پێی بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەم کارە بە وزەو توانایەك کە خوا بۆی ڕەخساندووم، پێی هەڵدەستم.

**تەوەری یەکەم:** ﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ﴾، سوێند بە ئاسمان و سوێند بە (طَارِق)، (طارِق)م بە شەوگەڕ لێکداوەتەوە، چونکە هەموو زانایان دەڵێن: مەبەست لەو

ئەستێرەیە کە بە شەوێ دەردەکەوێ، ئەستێرەش هەر بە شەوێ دەردەکەون، بە ڕۆژێ لەبەر ڕووناکیی و شۆقی ڕۆژ ئەستێرەکان دیار نین، ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ﴾، چ شتێك بە تۆی زانانـدوە (طَارِق) چییە؟ ئەم پرسیارکردنە، بۆ گەورە پێشاندانی (طارق)ە، ﴿ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ﴾، ئەستێرەیەکی کونکەر(ی تاریکییە)، یانی: (النَّجْمُ المُضِيء)، ئەستێرەیەکی بە شۆقە، یاخود: (النَّجْمُ: الَّذِي يَثْقُبْ)، ئەستێرەیەکە کون دەکات، چی کون دەکات؟ تاریکیی کون دەکات و دڕ بە تاریکیی دەدا، بۆیە ئەو ڕایە ڕاسترە کە لێرەدا مەبەست کۆی ئەستێرانە، نەك ئەستێرەیەکی تایبەت چونکە هەندێك گوتوویانە: ئەستێرەی زوحەلە، یان فلان ئەستێرەیە، بەڵام خوا بە گشتیی فەرموویەتی و، هەموو ئەستێرەکانیش، بێگومان تیشك و شۆقێکیان هەیەو دڕ بە تاریکیی دەدەن. ﴿إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ﴾، هیچ نەفسێك نیە، مەگەر پارێزەرێکی بەسەرەوەیە، ﴿إِن﴾، یانی: (مَا) (ما كُلُّ نَفۡسٖ)، ﴿لَّمَّا﴾، یانی: (إلاَّ)، یانی: هیچ کەسێك نیە، مەگەر پارێزەرێکی بەسەرەوەیە. ئەمە جۆرێك لە خوێندنەوەو، بە جۆرێکی دیکەش خوێندراوەتەوە: ﴿إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَمَا عَلَيۡهَا حَافِظٞ﴾، ئەو کاتەش: ﴿إِن﴾، (مُخَفَّفَة)، دەبێ لە (مُثَقَّلَة) و (ل)ی سەر (لَما) بۆ جیاکردنەوەی (إِنْ)ی (مُخَفَّفَة)یە،کە مانای جەختکردنەوەی هەیە لە (إِنْ)ی لابەرە (نافية) و، بەمجۆرەی لێ دێ: (إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَعَلَيْها حَافِظٞ)، یانی: (ما)یەکە زیاد کراوە بۆ تۆخکردنەوەی واتایەکەی، واتە: هەموو نەفسێك پارێزەرێکی بەسەرەوەیە، (الطَّبري)، ئەم خوێندنەوەیەی هەڵبژاردوەو، خوێندنەوەکەی دیکەی زۆر لەلا بەهێز نیە، دەڵێ: مەگەر بە ڕیوایەت چەسپا بێ، ئەگەرنا ئەمە خوێندنەوەی ڕاستە.

گرنگ ئەوەیە خوا سبحانە و تعالی لە وەڵامی ئەو دوو سوێندەدا -- سوێند خواردن بە ئاسمان و سوێند خواردن بە (طارق)، کە دوایی (طارق)یش بە ئەستێرەی کونکەر لێك دەداتەوە - دەفەرموێ: هەر کەسێك پارێزەرێکی بەسەرەوەیە، یان هیچ کەسێك نیە، پارێزەرێکی بە سەرەوە نەبێ، مەبەستیشی لە پارێزەرەکان بە دڵنیاییەوە فریشتەکانن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ١٠ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ١١﴾،

واتە: بە دڵنیایی ئێوە پارێزەرانتان بە سەرەوەن، زۆر بەڕێزن، زۆر بەخشندەن، زۆر بەرزو پەسندن، ﴿كَٰتِبِينَ﴾، نووسەریشن، تۆمارکەرن بۆ هەموو هەڵسوکەوتەکانتان.

**تەوەرەی دووەم:** خوای پەروەردگار فەرمان دەکات بە مرۆڤ کە بیر بکاتەوەو تێبفکرێ و سەرنج بدات: لە چی دروست بووە؟ ﴿فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ﴾، با مرۆڤ سەرنج بدات لەچی دروست بووە، لێرەدا وشەی ئینسان بەگشتیی هاتووەو (أل)ە کە بۆ ناساندنەو، ڕاستترو باشتر وایە بگوترێ: بۆ ناساندنی جینسە، واتە: لێرەدا مەبەست پێی کۆی مرۆڤەکانە، با هەر مرۆڤێك سەرنج بدات لەچی دروست بووە؟ ﴿خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ﴾، لە ئاوێکی بە فیچقە دەرقوڵیو دروست بووە، ﴿دَافِقٍ﴾، لەسەر کێشی (فاعِل)ە، بەڵام بە مانای بەرکار (مفعول)ە، وەك (سِرٌّ كَاتِم)، واتە: نهێنییەکی شێردراوە، یانی: (سِرٌّ مَكْتُوم)، دوایی زیاتریش شیدەکەینەوە، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: مرۆڤ لە ئاوێکی بە فیچقە دەرقوڵیو دروست بووە، ئایا ئەو ئاوە لە کوێوە دێ؟ ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ﴾، لە نێوان پشت و ئێسقانەکانی سینگەوە دێ، زۆرێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە، تۆوی دەرقوڵیو لە نێوان ئێسکەکانی پشتی پیاوو ئێسقانەکانی سینگی ئافرەت دەردەچێ، یاخود: لە نێوان ئێسقانەکانی سینگ و پشت، هەم بە نسبەت پیاوەوەو هەم بە نیسبەت ئافرەتەوە[1]، دەردەچێ.

**تەوەرەی سێیەم:** ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾﴾، بە دڵنیایی ئەو (خوای باڵادەست)، لەسەر گێڕانەوەی توانایە، هەڵبەتە ناوی خوای بەرزی مەزن لەم سوورەتە موبارەکەدا نەهێنراوە، بەڵام دەزانین کە خوایە مرۆڤی خوڵقاندوە، هەر خواشە لەسەر گێڕدرانەوەی مرۆڤ بە توانایە، ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ﴾، لەسەر گێڕانەوەی واتە: دوای ئەوەی دەمرێ و دەخرێتە نێو خۆڵەوە، خوا دەتوانێ جارێکی دیکە ئەو جەستەیە زیندوو بکاتەوەو بیگێڕێتەوە بۆ ژیان.

---

(١) دوایی لەو بارەوە کورتە باسێك دەکەین.

ئایا کەنگێ ئەوە دەکات و دەیگێڕێتەوە؟

﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾، ئەو ڕۆژەی نهێنییەکان تاقیدەکرێنەوە، دەناسێنرێن، ئاشکرا دەکرێن، ﴿ٱلسَّرَآئِرُ﴾، کۆی (**سَرِيرَة**)یە، وەك چۆن (**أَسْرار**) کۆی (**سِرّ**)ەو هەردووکیشیان بە مانای نهێنیین، ئەو نهێنییەی مرۆڤ لە دڵی خۆیداو لە عەقڵی خۆیدا هەڵیدەگرێ و، بە کەسی ناڵێ، لەو ڕۆژەدا ئەو نهێنییانە هەموویان کەشف دەبن، دەردەخرێن و دەخرێنە ڕوو، ﴿فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ﴾، هیچ هێزێکی (زاتیی) نیەو، هیچ پشتیوان و سەرخەرێکی (دەرەکیی)شی نیە، مرۆڤەکان تێکڕا بێگومان هیچ هێزێکی زاتییان نیە لە بەرامبەر ئەو ڕۆژەداو، هیچ پشتیوانێکی دەرەکییشیان نیە، بەڵام واپێدەچێ زیاتر مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوابێ.

**تەوەرەی چوارەم:** ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ١١ وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ١٢ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ١٣ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ١٤﴾، سوێند بە ئاسمانی خاوەن گێڕانەوە، ﴿ذَاتِ﴾، یانی: (**صَاحِبَة**)، خاوەن، ﴿ٱلرَّجۡعِ﴾، بە مانای گێڕانەوە (**الإِعَادة**)، خوای پەروەردگار ئاسمانی وا خوڵقاندوە شتەکان بگێڕێتەوە، بەتایبەت تیشکی خۆر، لە ئۆقیانووسەکان دەداو هەڵمی ئاو بەرز دەبێتەوە، خوێ و ماددە تفتییەکە بەجێ دێڵێ لە دەریاداو هەڵمەکە بەرز دەبێتەوە، دوایی با دەیهێنێ بۆ شوێنە ساردەکان و کەڵەکە دەبێ لەسەر یەکدی و دەبێتە هەورو ئاوی لێ دێتە خوار، لە شێوەی باران و بەفرو تەرزەدا، ئەو ئاسمانە خوای کاربەجێ وای خوڵقاندوە نەهێڵێ ئەو هەڵمە بچێتە سەرێ و، لە دەست مرۆڤان بچێ، چونکە ساڵانە چەندان ملیۆن تەن ئاو بەهۆی تیشکی خۆرەوە لە دەریایەکان دەبێتە هەڵم، دوایی بەرز دەبێتەوەو دەبێتە هەورو، بە شێوەی باران و بەفرو تەرزە دادەبارێتەوە، ئێمە ئاوی شیرینمان تەنیا لەو ڕێیەوە دەست دەکەوێ، ئەگەرنا هەرچی ئاوە لە ئۆقیانووسەکاندا، کە (٤/٥) زیاتری پانتایی زەوی بە ئۆقیانووسەکان داپۆشراوە، هەموو ئاوەکەیان سوێرە، تفت و تاڵە، نەك هەر مرۆڤ ناتوانێ بیخواتەوە، بەڵکو ئەگەر بیخواتەوە، پێی دەمرێ، ئایا ئاوی شیرینمان لە چ ڕێیەکەوە

دەستدەکەوێ؟ لە ڕێی ئەوەوە کە تیشکی خۆر لە دەریاکان دەداو، هەڵمیان لێ پەیدا دەکات و، هەڵمەکە با دەیهێنێ بۆ شوێنە ساردەکان و، لەوێ دەبێتە هەورو بەشێوەی باران و بەفرو تەزرە دێتە خوار، ئێمە ئاوی شیرین و زوڵاڵمان بەس لەو ڕێیەوە دەستدەکەوێ، هەر بۆیەش کوێ بەرزتر بێ، ئاوی زیاتر لێ دێتە خوار، چ لە شێوەی بەفردا، چ لە شێوەی تەرزەدا، چ لە شێوەی باراندا، بۆ ئەوەی ئاوەکە لەو شوێنە بەرزانەدا عەمبار بکرێ، دوایی لە شێوەی کانیی و سەرچاوەدا دێتەدەرو ڕووباری لێ پەیدادەبن و، وشکانیی و سەر زەوی ئاودێر دەکرێ، بەو ڕووبارانەی لەو کانیی و سەرچاوانە پەیدادەبن، کە لە چیایەکان و لە شوێنە بەرزەکاندا هەن.

﴿وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ﴾، سوێند بە زەوی خاوەن قڵیش، ﴿ٱلصَّدۡعِ﴾، بریتیە لە شکان و لەتبوونی شتێك، لێکبوونەوەی شتێك کە دەنگی لێوە بێ، خواش زەوی وا خوڵقاندوە لێکبێتەوە، هەم ئاوی پێدا بچێتە خوارو، هەم ڕووەك و شیناورد لێی بێتەدەرێ، سوێند بەوانە: بە ئاسمانی خاوەن گێڕەرەوەو بە زەوی خاوەن قڵیش، ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ﴾، بە دڵنیایی ئەو (قورئان)ەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە، قسەیەکی لێك جیاکەرەوەیە، قسەیەکی لێك هەڵاوێرەرە، هەق و ناهەق ڕاست و چەوت، چاك و خراپ، حەڵاڵ و حەرام، لێك جیا دەکاتەوە، ﴿وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ﴾، ئەو (قورئانە) گاڵتە نیە، (**هَزْل**) یانی: گاڵتە، هەوەنتە، (**الهَزْلُ: عَكْسُ الجِدِّ**)، (**جِدّ**)، کارێکە بە گرنگیی و بایەخ پێدانەوە بکرێ، (**هَزْل**) یش، پێچەوانەی ئەوەیە.

**تەوەرەی پێنجەم و کۆتایی:** ﴿إِنَّهُمۡ يَكِيدُونَ كَيۡدٗا ١٥ وَأَكِيدُ كَيۡدٗا ١٦﴾، بە دڵنیاییەوە ئەوان (واتە: ناحەزانی تۆ ئەی موحەممەد ﷺ)، فێڵ دەکەن، بە فێڵ کردنێك کە شایستەی خۆیانە، ﴿وَأَكِيدُ كَيۡدٗا﴾، منیش پلان دادەنێم، نەخشە دادەنێم، بە نەخشە دانانێك کە شایستەی خۆمە، ﴿فَمَهِّلِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، ئنجا مۆڵەتی بێبڕوایەکان بدە، بواریان پێ بدە، لێیان گەڕێ، ﴿أَمۡهِلۡهُمۡ رُوَيۡدَۢا﴾، منیش کەمێك مۆڵەتیان دەدەم، کەمە مۆڵەتدانەکەش، ئەوەیە کە لێیان دەگەڕێ ژیانی دنیا

بگوزەرێنن و تاقیکردنەوەی خۆیان بدەن، بەو شێوەی پێیان خۆشە وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە.

یاخود کەمە مۆڵەتدانەکە، ئەو کاتەیە کە خوا لێیان دەگەڕێ بە کەیفی خۆیان بێن و بچن و هەڵسوکەوت بکەن، بەڵام دوایی هەر لە دنیادا سزایان دەدا، چ بە سزایەکی یەکجارەکیی، چ بە سزایەکی بەشیی (**جزئي**) وەك چۆن بێبڕوایەکانی سزادا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ سەرەتا لە مەککە لێیان گەڕا، بەڵام دوای دوو ساڵ لە قۆناغی مەککەو لە ساڵی دووەمی کۆچییدا، جەنگی بەدر هاتە پێش و کافرەکان لووتیان شکاو (**يَومُ الفُرقان**)، ڕۆژی لێکجیاکردنەوەی هەق و ناهەق، ڕاست و چەوت، هاتە پێش و ئەوەبوو کافرەکان حەفتایان لێکوژراو، حەفتاشیان لێ بە دیلگیرا لە گەورەو زلەزلەکانیان بە تایبەت، دوایی جەنگەکانی دیکەش هاتنە پێش: جەنگی ئوحود، دواتر جەنگی ئەحزاب، یاخود خەندەق، ئنجا جەنگی حونەین، دواییش فەتحی مەککە، هەموو ئەو ڕووبەڕوبوونەوانە هاتنە پێش و، بێبڕوایەکان بەشێك لە سزای خوای دادگەریان بینی، بەڵام بە دڵنیایی سزای گەورەو یەکلاییکردنەوەی گەورە، دادگایی کردنی گەورە، هەڵگیراوە بۆ ڕۆژی دوایی، بۆیە دەفەرموێ: مۆڵەتی بێبڕوایەکان بدەو بواریان پێبدە، ﴿أَمۡهِلۡهُمۡ رُوَيۡدَۢا﴾، منیش ماوەیەکی کەم مۆڵەتیان پێدەدەم، دوایی بە توندیی سزایان دەدەم و دەیانگرم، ئەگەر بڕوا نەهێنن.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**سوێند خواردنی خوای كاربەجێ بە ئاسمان و ئەستێرەی گەڕۆكی كونكەری تاریكیی، كە هەموو كەسێك پارێزەرێكی بەسەرەوە دانراوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴿٢﴾ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴿٤﴾﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾، سوێند بە ئاسمان و سوێند بە (طَارق)، ﴿وَٱلسَّمَآءِ﴾، (ئاسمان) وەك زۆر جاری دیكەش گوتوومانە، لە زاراوەو بەكارهێنانی قورئاندا، مەبەست پێی كۆی دروستكراوەكانی خوایە سبحانه و تعالی و، لە بەرانبەر (سَمَاء)دا، زەوی هەیە، جاری واش هەیە وشەی: (سَمَاء)، بە كۆ دێ، ﴿سَمَٰوَٰتٍ﴾، جاری واش هەیە بە ژمارەی حەوت دێ: ﴿سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾، لە بەرانبەریشیدا زەوی، هەیە.

هەڵبەتە زەوی شتێكی بچووكە، لە ڕووی قەبارەوە لە بەرانبەر ئاسمانەكاندا، یان ئاسماندا، یان حەوت ئاسمانەكاندا، بەڵام بۆ ئێمەی مرۆڤ، زەوی یەكجار بایەخدارو گرنگە، چونكە ژیانی ئێمە بە زەوییەوە بەستراوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾﴾طه، واتە: لەوێ هێناومانننە دی و، دەشتانگێڕینەوە بۆ نێو خاك، (جەستەكەتان)و، جارێكی دیكەش هەر لەوێ دەرتان دێنینەوە.

لێرەدا خوا سبحانه و تعالی كە دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾:

**(الطبري)**، ئاوا مانای ئەم ئایەتە موبارەكەی كردوە، دەڵێ: **(أَقْسَمَ رَبُّنا بِالسَّماء وَبِالطَّارِقِ الَّذي يَطْرُقُ لَيْلاً مِنَ النُّجومِ المُضيئةِ، وَيَخْفى نَهَاراً، وَكُلُّ مَا جَاءَ لَيْلاً فَقَدْ طَرَقَ)**، واتە: پەروەردگارمان سوێندی خواردوە بە ئاسمان و بە **(طارق)** كە بە شەوان دێ، لە ئەستێرە ڕۆشنەكان، بە ڕۆژێ پەنهان دەبێ، هەر شتێك بە شەوێ بێ، لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: **(طارِق)**، دەگوترێ: **(طَرَقَ، أي: جَاءَ لَيْلاً)**، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: یەكێك لە ئێوە كە لە سەفەرێكی دوورو درێژ دەگەڕێتەوە، با یەكسەر نەچێتەوە ماڵێ، ئنجا لە فەرمایشتەكەدا حیكمەتەكەی ڕوون كردۆتەوە: {**لِكَي تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ**} **(أخرجه أحمد: ١٤٢٨٧، والبخاري: ٤٧٩١، ومسلم: ٧١٥، وأبو داود: ٢٧٧٨، والنسائي في الكبرى: ٩١٤٤، والدارمي: ٢٢١٦)**، واتە: بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتەی مێردی لە ماڵ نەبووە، سەرو قژی خۆی دابێنێ و، خۆی بشوات و خۆی پاك بكاتەوە.

كەواتە: **(طارق)**، واتە: **(الآتي لَيْلاً)**، ئەوەی بە شەوێ دێ، بێگومان ئەستێرەكانیش هەر بە شەوێ دەردەكەون، چونكە بە ڕۆژ لەبەر تیشكی خۆر ئەستێرەكان هیچیان دیار نین.

دوایی خوا سبحانە و تعالی هەر بۆ خۆی دەپرسێ:

**٢)-** ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ﴾، چ شتێك بە تۆی زانیوە **(طارِق)** چییە؟ **(الطبري)**، دەڵێ: **(وَمَا أَشْعَرَكَ يَا مُحَمَّد! مَا الطَّارق الَّذي أَقْسَمْتُ بِهِ)**، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! چ شتێك بە تۆی زانیوە، چ شتێك وای لە تۆ كردوە، هەست بكەی و بزانی **(طارِق)** كە سوێندم پێخواردوە، چییە؟

ئنجا خوا هەر بۆ خۆی هەواڵ دەداو دەفەرموێ:

**٣)-** ﴿ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ﴾، ئەستێرەیەكی تیشكدەرە، یاخود ئەستێرەیەكی كونكەرە، وشەی ﴿ٱلنَّجۡمُ﴾، كە **(أل)**ی ناساندنی لەسەرە، هەندێك لە زانایان گوتویانە: مەبەست پێی **(أل)**ی ناساندنی **(عهد)**ە، واتە: ئەستێرە كونكەرەكە، ئنجا هەندێكیان گوتوویانە: **(شَعرى)** یە، واتە: گەلاوێژو، هەندێك گوتوویانە: زوحەلەو، هەندێك گوتوویانە: یەكێكی دیكەیە،

بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە کە (أل)ی سەر ﴿ ٱلنَّجۡمُ ﴾، کە بۆ ناساندنە، مەبەست پێی جینسە، واتە: ئەستێرە بە گشتیی، هەموو ئەستێرەکان.

لەبارەی وشەی: ﴿ ٱلثَّاقِبُ ﴾ەوە، **(الطبري)** چەند ڕایەکی هێناون:

**١-** یەکێکیان لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە بە ژمارە: (٣٧٠١٣)، دەڵێ: **(الثَّاقِبُ: المُضِيءُ)**، **(ثَاقِب)**، واتە: تیشکدەر، کونکەر.

**٢-** هەروەها هەر لە ئیبنو عەبباسەوە بە ژمارە: (٣٧٠١٤)، گوتوویەتی: **(هِيَ الكَواكِبُ المُضيئَةَ، وَثُقُوبُهُا إِذا أَضَاءَت)**، بریتیە لە ئەستێرە ڕۆشنەکان و، کونکردنی ئەو ئەستێرانەش کاتێکە کە تیشك دەدەن و دڕ بە تاریکیی دەدەن.

**٣-** لە عیکریمەوەش بە ژمارە: (٣٧٠١٥)، هێناویەتی، دەڵێ: **(الثَّاقِبُ الَّذي يَثْقُب)**، ئەوەی کون دەکات و دڕ بە تاریکیی دەدات.

**٤-** لە موجاهیدەوەش بە ژمارە: (٣٧٠١٦)، لە مانای **(ثاقِب)**دا، گوتویەتی: **(الَّذي يَتَوَهَّجُ)**، ئەو ئەستێرەیەی دادەگیرسێ، (تیشکێکی بەهێز دەدات و دڕ بە تاریکیی دەدا).

لێرەدا خوا سبحانە و تعالی سوێند دەخوا بە ئاسمان و بە **(طارِق)**و دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانادنوە **(طارِق)** چییە؟ واتە: تۆ نازانی مەگەر خوا پێت بفەرموێ، ئنجا بۆ خۆی مانای **(الطارق)** دەکات و دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴾، ئەستێرەیەکی تیشکدەرە، بە تیشکەکەی دڕ بە تاریکیی دەداو کونی دەکات.

کەواتە: سوێند بە دوو شتان خوراوە: بە ئاسمان و بە **(طارِق)**، وەڵامی سوێندەکەش:

**٤)-** ﴿ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴾، هیچ کەسێك نیە مەگەر پارێزەرێکی بەسەرەوەیە، ئەمە بە دوو جۆر خوێندراوەتەوە

أ- ئەوەی خوێندمەوە جۆرێکی بوو: ﴿ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴾، یانی (ما كُلُّ نَفۡسٍ إلاّ عَلَيۡهَا حَافِظٞ)، هیچ نەفسێك نیە، هیچ کەسێك نیە، مەگەر پارێزەرێکی بەسەرەوەیە.

**ب-** بە جۆرێكی دیكەش خوێندراوەتەوە: ﴿إِن﴾، (**مُخَفَّفَة**)یە لە (**مُثَقّلة**)و بۆ جەختكردنەوەیە، جیاوازییش لە نێوان ﴿إِن﴾ی (**مُخفّفة**) لە (**مُثَقّلة**)، لەگەڵ ﴿إِن﴾ی لابەرە (**نافية**)، بریتیە لە هەبوونی (ل): (**إن كُلُّ نَفْسٍ لَما عَلَيْهَا حَافِظٌ**)، یانی: (**إن كُلُّ نَفْسٍ لَعَلَيْهَا حَافِظٌ**)، واتە: (**ما**) وەك هەر نەبێ، چونكە بۆ تۆخكردنەوەی واتایەكەی زیادكراوە، (**إن كُلُّ نَفْسٍ لَمَا عَلَيْهَا حَافِظٌ**)، بە دڵنیایی هەر كەسێك پارێزەرێكی بەسەرەوەیە، كە (**الطبري**)، گوتوویەتی: (**القِرَاءَةُ الَّتِي أَختَارُهَا، ولا أَخْتارُ غَيْرَها فِي ذَلِك التَّخفيفُ - إن كُلُّ نَفْسٍ لَمَا عَلَيْهَا حَافِظٌ -**)، ئەو وای مانا كردوە، هەموو نەفسێك بە دڵنیایی پارێزەرێكی بە سەرەوەیە، بەڵام گوتوویەتی: ئەوی دیكەش ئەگەر لە ڕێیەكی چەسپاوەوە هاتبێ، هەر خوێندنەوەیەكی ڕاست و دروستە، بەڵام ئەوەی هەڵیبژاردوە ئەوەیە كە باو نیە، چونكە (ل) كە بۆ جیاكردنەوەی: ﴿إِن﴾ی (**مُخَفَّفة**)یە، لە (**مُثَقَّلة**)، لە: ﴿إِن﴾ی لابەرە (**نافية**)، (**ما**)یەكەش زیاد كراوە، بۆ بەهێزكردنی واتایەكەی.

واتە: (**لَمّا**) هەمووی یەك وشە نیە بەسەریەكەوە، بەڵكو (ل) و (**ما**)یەو دوو پیتی لە یەك جیان لە واتادا.

(**الشَّوكاني**) لە (**فَتحُ القَدير**)ەكەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

{(**إِنْ هِيَ المُخَفَّفَة مِنَ الثَّقِيْلَة، فِيْهَا ضَمِيرُ الشَّأْنِ المُقَدَّر، وَهُوَ اسْمُهَا، واللاَّم هِيَ الفارِقة، و (ما) مَزِيدَةٌ، أَي: إِنَّ شَأْنَ كُلُّ نَفْسٍ لَعَلَيْهَا حَافِظ**)}، واتە: ﴿إِن﴾ (**مُخَفَّفَة**)یە لە (**مُثَقَّلة**) {واتە: لە (**إِنَّ**)}، ئەویش بۆ جەختكردنەوەیە، ڕاناوێكی تێدا تەقدیر دەكرێ و دەبێتە ناوی و، (ل)كەش جیاكەرەوەیەو، (**ما**)ش زیادكراوە، یانی: حاڵ وایە هەموو كەسێك پارێزەرێكی بەسەرەوەیە، دوایی دەڵێ: هەر كەسێكیش بە گیرەدار (**تشدِيد**) كردنی (**لمّا**) بیخوێنێتەوە، ئەو كاتە (**إِنْ**) دەبێتە لابەرە (**نافية**)، لە جیاتی (**مُخَفَّفة**) بێ لە (**مُثَقَّلة**)، دەگوترێ: (**إن نافِيةٌ**)، یانی: (**ما كُلُّ نَفْسٍ**)، هیچ كەس نیە، لەو كاتەش (**لَمّا**) بە مانای (**إلاّ**) دەبێ، یانی: (**ما كُلُّ نَفْسٍ إلاّ عَلَيْهَا حَافِظٌ**)، واتە: هیچ نەفسێك نیە، مەگەر پارێزەرێكی

---

(١) ج٥، ص ٥١٠.

بەسەرەوەیە، هەڵبەتە چ بگوترێ: هەر نەفسێك پارێزەرێكی بەسەرەوەیە، یاخود بگوترێ: هیچ نەفسێك نیە، مەگەر پارێزەرێكی بەسەرەوەیە، لە مانادا هەر دەبنەوە بە یەك.

کەواتە: ئەمە وەڵامی سوێندەکەیە، کە بەڕاستیی وامان لێدەکات، ڕامان و هەڵوەستەیەکی باش بکەین لە بەرانبەر ئەوەدا: کە خوا سبحانه و تعالى سوێند دەخوا بە ئاسمان، بە هەموو گەردوون، بەوەی بینراوەو بە ئەوەش کە نەبینراوە، هەروەها سوێند دەخوا بە ئەستێرەکان، چونکە (ال)ی سەر (**الطارق**)، کە خوای پەروەردگار خۆی پێناسەی دەکات و دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴾، ئەستێرەی کونکەر، ئەستێرەی تیشکدەر، (ال) بۆ تێکڕا (جنس)ە، یانی: تێکڕای ئەستێرەکان، خوا سوێند دەخوا بە ئاسمان و بە تێکڕای ئەستێران، دواییش دەفەرموێ: چ شتێك بە تۆی زاناندوە (**طارق**) چییە؟ دوایی خۆیشی (**طارق**)، ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ئەستێرەی کونکەرە، وەڵامی سوێندەکەش ئەوەیە: ﴿ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴾، یان: (إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَمَا عَلَيۡهَا حَافِظٞ)، هیچ کەسێك نیە، مەگەر پارێزەرێكی بەسەرەوەیە، یان هەر کەسێك هەبێ پارێزەرێكی بەسەرەوەیە.

کەواتە: سوێند لەسەرخوراوەکە ئەوەیە کە خوا ئێمەی لەم ژیانی دونیایەدا داناوە، ئێشکچیی و پاسەوانی بەسەرەوە داناوین! ئەو ڕاستییەش وێڕای ئێرە، لە زۆر شوێنی دیکەی قوڕئاندا هاتوە: بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (**الإنفِطار**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (**الأنعام**)دا هاتوە: ﴿ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ ﴾.

٣- هەروەها لە سووڕەتی (ق)یشدا دەفەرمویٚ: ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾، کەواتە: ئێمە بەرهەڵدای ئەم ژیانە دنیاییە نەکراوین، بەڵکو چاودێرمان بەسەرەوە داندراون، بەڵێ، ئازاد کراوین و دەستمان کراوەیە، خێر دەکەین و شەڕ دەکەین، چاك دەکەین، خراپ دەکەین، ڕاست دەڕۆین، چەوت دەڕۆین، بەڵام دەبێ بزانین کە چاودێرییمان بە سەرەوەیەو، هەموو شتێکمان تۆمار دەکرێ و، دواییش لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە مرۆڤ کە سەرنج بدا لەچی دروستکراوە؟ لە ئاوێکی بە فیچقە دەرقوڵیو، کە لە نێوان پشت و سینگ دێتە دەرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴾، ئنجا با ئینسان سەرنج بدا لەچی دروستکراوە! لێرەدا دەگونجێ مەبەست لە (**الإنسان**) گشتیی بێ و (**أل**)کە بۆ جینس بێ، واتە: با هەموو مرۆڤێك سەرنج بدات لە چی دروستکراوەو هێنراوەتە دی؟ دەشگونجێ بەپێی ڕەوتی ئایەتەکان بڵێین: لێرەدا مەبەست لە وشەی: (**إنسان**)، مرۆڤی بێبڕوایە، وەك (**الطبري**) دەڵێ: (**فَلْيَنظُرِ الإنسانُ الَّذي يُكَذّب بِالبَعثِ بَعْدَ الْمَمَات، الْمُنكِرِ قُدْرَةَ اللهِ عَلَى إِحْياءِهِ بَعْدَ مَمَاتِه، مِن أَيِّ شَيءٍ خَلَقَهُ رَبُّه؟**)، با مرۆڤی بە درۆدانەری زیندووکرانەوەی دوای مردن و، نکووڵییکەر لە دەسەڵاتی خوا لەسەر زیندووکردنەوەی دوای مردنی، سەرنج بدات پەروەردگاری لە چی دروستکردووەو هێناویەتە دی؟!

پێشم وایە ڕاستتر وایە لێرەدا مەبەست کۆی مرۆڤان بێ، چونکە ئەگەر بەڵگەیەك نەبێ لەسەر تایبەتکردنی ئایەتێك بەیەکێك لە چەمکەکانیەوە، وا باشە چەمکەکەی هەر بە ڕەهایی و بە فراوانیی بهێڵدرێتەوەو (**الطبري**)یش، ڕەحمەتی خوای لێبێ زۆر داکۆکیی لەسەر ئەو بنەمایە دەکات و بنەمایەکی زۆر ڕاستیشە، بۆیە مەگەر تەماشای دوای ئایەتەکان بکەین، کە ئەو مانایە زاڵ دەکات، (**الطبري**) هەڵیبژاردوە - کە مەبەست مرۆڤی بێبڕوایە - چونکە دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ ﴿٩﴾ ﴾، ئنجا مەگەر بە پێی سەرنجدانی ئایەتەکانی دوایی، بڵێین لێرەدا مەبەست

پێی ئینسانی بێبڕوایە، ئەگەرنا وشەی: ئینسان لە قورئاندا مەبەست پێی کۆی مرۆڤانە، هەموو مرۆڤێك.

دوایی خوا ڕوونی دەکاتەوە، مرۆڤ لە چی دروستبووەو دەفەرموێ:

٢)- ﴿ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴾، (مرۆڤ) لە ئاوێکی دەرقوڵیو دروستبووە، وشەی: ﴿ دَافِقٍ ﴾، هەرچەندە لەسەر کێشی بکەر (**فاعل**) هاتوە، بەڵام مەبەست پێی بەرکار (**مفعول**)ە، (**دافِق أَي: مَدْفُوق، وَهُوَ مِمَّا أَخْرَجَتْهُ العَرَبُ بِلَفْظِ فَاعِل، وهو بِمَعْنى المَفعول: مِثْلُ سِرٌّ كاتِمٌ، وَهَمٌّ ناصِبٌ**)، (**كاتِم**)، لەسەر ڕێژگەی (**فاعِل**) هاتوە، بەڵام مەبەست پێی (**مَكْتوم**)ە، یانی: نهێنییەکی شێردراوە، (**وَهَمٌّ ناصِب**)، خەمێکی بەردەوام کە هەمیشە لەگەڵ مرۆڤدایە.

٣)- ﴿ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾، لە نێوان (ئێسکەکانی) پشت و سینگ دێتە دەرێ، (**الطبري**)، ئاوای مانا لێکداوەتەوە:

(**يَخْرج مِن صُلْبِ الرَّجُلِ وَتَرائِبِ المَرْأةِ، وَقيلَ: يَخْرُجُ مِن بَيْنِ ذلِكَ، وَمَعْنَى الكَلامِ مِنْهُما**)، واتە: لە پشتی پیاوو ئێسکەکانی سینگی ئافرەت دێتە دەرێ، گوتراویشە: لەو نێوانە دێتە دەرێ، واتە: لە هەردووکیان دێتە دەرێ.

وشەی: ﴿ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾، پێشتریش گوتمان کۆی (**تَريبَة**)یەو بە پەراسوو (**ضِلْعْ**) دەگوترێ، واتە: پەراسووەکانی کە قەفەسی سینگ پێکدێنن، مرۆڤ بیست و چوار (٢٤) پەراسووی هەیە، دوازدە (١٢) لە لای ڕاست و دوازدە (١٢) لە لای چەپ، بە هەموویان ئەو قەفەسەی سینگ پێك دێنن، کە دڵ و جگەرو پەنکریاس و سییەکان و... هتد، دەگرنە خۆیان.

(**التَّرائِبُ: مَوْضِعُ القِلادَةِ مِنَ المَرْأَةِ**)، ئەمە (**الطبري**) لە (إبن عباس)ەوە، بە ژمارە: (٣٧٠٢٤) هێناویەتی، واتە: (**ترائب**) بریتیە لەو شوێنەی ئافرەت ملوانکەی پێ هەڵدەواسێ، ئافرەت کە ملوانکە لە ملی دەکات، بە سینگی دا دێتە خوارێ، کەواتە: (ترائب)، یانی: ئێسقانەکانی قەفەسی سینگ.

**(الطبري)** دەڵێ: **(الصَّوابُ هو مَوضُع القِلادةِ مِنَ المَرأَةِ بِحَيثُ تَقَعُ عَلَيْهِ مِن صَدْرِها)**، واتە: ڕای ڕاست ئەوەیە کە (ترائب)، ئەو شوێنەیە لە سینگی کە گەردنبەندو ملوانکەی ئافرەت (کاتێك لە ملی دەکات) دەکەونە سەری، واتە: شوێنی پێکگەیشتنی پەراسووەکانی سینگ.

زانایانیش لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، کە خوا سبحانه و تعالی دەفەرموێ، ئەو ئاوە بە فیچقە دەرقوڵیوەی لە نێوان پشت و سینگ دێتە دەرێ، ئایا مەبەست پێی چییە؟ بۆیە بە باشمزانی، لەو بارەوە ئەم کورتە باسە بێنین، کە یەکسەر لە مەوسووعەی: (دەرەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر تیشکی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا)[1]، دەیگوازینەوە، بەڵام بە تۆزێك کورتکردنەوەو پوختکردنەوەوە.

(١) بڕوانە: بەرگی یەکەم، چاپی دووەم،ساڵی: ٢٠٢٠ز، لاپەڕە: ٤٥٦ - ٤٦٣.

## کورتە باسێک لە بارەی چۆنیەتیی دروستبوونی مرۆڤەوە

بەڕێـــزان!

ئێمە ئەم کورتە باسە لەبەر ڕۆشنایی ئەم سێ ئایەتەی سووڕەتی (**الطارِق**)دا دەکەین: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: با مرۆڤ سەرنج بدات لە چی دروست بووە، لە ئاوێکی دەرقوڵیو کە لە نێوان (ئێسقانەکانی) پشت و سینگ دا دێتە دەرێ.

هەروەها لە بەر ڕۆشنایی ئەو سێ ئایەتەی دیکە لە سووڕەتی (المرسلات): ﴿ أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: ئایا لە ئاوێکی بێهێزو بە کەم بایەخ تەماشا کراو، دروستمان نەکردوون، کە لە نشینگەیەکی مەحکەمدا دامانناوە، (لە منداڵدانی دایکدا)، هەتا ئەندازەیەکی دیارییکراو، ئەندازەگیرییمان کردوە، ئێمە باشترین تواناداریــن، (یاخود باشترین ئەندازەگیریین).

خوا پشتیوان بێ لە نۆ (٩) خاڵدا بە کورتیی و بە گوشراویی، چۆنیەتیی دروستبوونی مرۆڤ دەخەینە ڕوو:

**١-** دوای پێکەوە جووتبونی باب و دایك، زیندەوەرێکی وردیلەی نێو تۆوی باب، کە ژیانداری تۆوی (**حَيْوانٌ مَنَوِي**) کورتکراوەکەی (**حَيْمَن**)ی پێ دەگوترێ و، بە ملیۆنانن، یەکێك لەو زیندەوەرە وردانە، لەگەڵ زیندەوەرێکی دیکەی گچکەی نێو تۆوی دایکدا کە هێلکۆڵە (**بوَيْضة**)ی پێ دەڵێن، یەکدەگرن و، بە هەردووکیان زیندەوەرێکی دیکەی سێیەم پێکدێنن، کە تۆویلکە (**نُطفَة**)ی پێدەگوترێ و، وشەی (**نُطْفة**)ش لە زمانی عەڕەبییدا بە مانای ئاوێکی کەم (**ماءٌ قَليل**)، یاخود ئاوێکی ساغ و ساف، (**ماءٌ صافي**) دێ[1].

---

(١) (لِسان العرب)، بەرگی (١٤)، لاپەڕە: (١٨٧).

بێگومان ئەو ژیاندارە تۆویی (**حيمن**) و ئەو هێلکۆڵەیە، کە پێکەوە دەلکێن، دوای گەشەکردن دەبنە کۆرپەلە، لە چاو کۆی تۆوی باب و دایك، ئاوێکی کەم، بگرە زۆر زۆر کەمیشە، جێی سەرنجیش ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکیدا ئاماژەی پێکردوە، کە کۆرپەلەی مرۆڤ لە کەمۆکەیەکی ئاو (تۆو)ی دایك و باب دروست دەبێ، نەك لە هەموو ئاوەکە، وەك فەرموویەتی: {**مَا مِنْ كُلِّ المَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ**}، (**أخرجه مسلم**: ١٤٣٨) واتە: لە هەموو ئاوەکە مرۆڤ دروست نابێ، بەڵکو لە هەندێکی دروست دەبێ، هەر کاتێك خواش شتێکی ویست، هیچ ڕێگرێکی لەبەردەم دا نابێ.

٢- ئنجا ئەو زیندەوەرە یەك خانەییە دابەش دەبێ و دەبێتە دوو خانە، دوایی ئەو دووانەش دابەش دەبن و، دەبن بە چوار، ئەوانیش دابەش دەبن و دەبنە هەشت و، هەشت دەبن بە شازدە، دوایی دەبن بە سی و دوو و، شەست و چوارو، سەدو بیست و هەشت و، بەو شێوەیە، سەرەنجام هەموو ئەو ئەندامانەی جەستەی مرۆڤ و، هەموو کۆئەندامە سەرسوڕهێنەرەکانی، (لەو کتێبەدا کە ناومان برد ئاماژەیەکمان پێداون)، هەموویان لەو خانانە دروست دەبن، کە دەبنە هەزاران و ملیۆنان و ملیاران و، وردە، وردە، پلە پلە، بە گوێرەی سیستم و بەرنامەیەك کە خوا بۆی داناون، دروست دەبن و کۆرپەلەی مرۆڤ پێکدێنن، لە نێو منداڵدانی دایك دا.

٣- هەر خانەیەك لە جەستەی مرۆڤ، وا بەرنامەی بۆ دانراوە، کە کائینێکی دیکەی وەك خۆی لە خۆی بگرێتەوەو کۆپی بکات، کت ومت وەك خۆی، ئەوەش پێی دەگوترێ: زۆربوونی خانەیی (**التَّكاثُر الخَلَويُّ**)، هەر خانەیەك خانەیەکی وەك خۆی کت ومت بەبێ جیاوازیی لە چل و شەش (٤٦) کرۆمۆسۆمەکەوە کۆپی دەکاتەوە، سەرجەم خانە ئاساییەکانی جەستەی مرۆڤ، کە پێشتریش گوتوومانە: بە مەزەندەی زانایان سەد (١٠٠) تریلیۆن خانە دەبن، هەموویان بەو شێوەیەن.

٤- بەڵام خانە جینسییەکان (**الخلاية الجنسية**)، چ هی پیاو، کە زیندەوەری تۆویی، (**الحَيوان المنوي**)یان تێدایە، چ هی ئافرەت، کە هێلکۆڵە (**بويضة**)یان تێدایە، وانین،

بەڵکو خانەی جینسیی پیاو (٢٣) کرۆمۆسۆمی تێدایەو، هی ئافرەتیش (٢٣) و بە هەردووکیان دەبنەوە چل و شەش (٤٦)، کە پێکەوە یەکدەگرن و، خانەیەکی دیکەو زیندەوەرێکی دیکە پێکدێنن و پێی دەگوترێ: (**نُطْفة**)، تۆویلکە، کە ئەگەر هاتباو هەر یەکەو (٤٦) کرۆمۆسۆمیان پێ بووایە، وەك سەرجەم خانەکانی دیکەی جەستەی مرۆڤ، واتە: هەموو ئەو خانانەی جگە لە خانە جینسییەکەن، ئەو کاتە: (٤٦ + ٤٦ = ٩٢)، کرۆمۆسۆم، هەر خوا دەزانێ چ زیندەوەرێك و مەخلووقێکی سەرسوڕهێنەر دەردەچوو، بەڵام بەرنامەی خوای ئەوپەڕی زاناو کارزان، هەڵە قبووڵ ناکات، هەر کام لە (حەیمەن) و (هێلکۆڵە) هەر لە سەرەتاوە یەکی (٢٣) کرۆمۆسۆم لە کۆڵ خۆیان دەکەنەوەو، کاتێك پێکدەگەن: حەیمەنی پیاو و هێلکۆڵەی ئافرەت، تەنیا یەکی (٢٣) کرۆمۆسۆمیان هەیەو هی هەردووکیان دەکاتە (٤٦) کرۆمۆسۆم.

٥- ئاوی پیاو (**مَنيٌّ**) شوێنی دروستبوونی و کارگەکەی، بریتیە لە هەردوو گونەکانی پیاو، ئنجا لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾، لە نێوان (ئێسکەکانی) پشت و سینگ دێتە دەرێ، واتە: ئاوی دەرقوڵیو لە نێوان (ئێسکەکانی) پشت و سینگ دێتە دەرێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: تۆوی پیاو لە هەردوو گونەکانیدا دروست دەبێ و کارگەکەیان ئەوێیە، بەڵام زانستی پزیشکییگەریی ئێستا دەریخستوە کە کۆرپەلە (**جَنين**)، دروست دەبێ، کوڕیش گونەکانی لە نێوان ئێسکەکانی و پشت و سینگنی، هەروەها ئافرەتیش هێلکەدان (**بويضة**)ەکەی لە نێوان ئێسقانەکانی پشت و سینگنی، دوایی وردە وردە کە کۆرپەلەکە تەمەنی دەگاتە حەوت (٧) مانگیی، ئنجا چ هێلکەدانی کۆرپەلەی کچ، چ گونەکانی کۆرپەلەی کوڕ، هەردووکیان دادەبەزن بۆ شوێنی ئاسایی خۆیان.

کەواتە: ئەوەی خوا سبحانە و تعالی فەرموویەتی، ڕێك وایەو سەرچاوەی ئەسڵیی دروستبوونی مرۆڤ: ئێسکەکانی پشت و سینگن، بۆیە ئەو ڕایەی دیکەی زانایان کە دەڵێ: تۆو لە نێوان ئێسقانەکانی پشتی پیاوو سینگی ئافرەتدا دروست دەبێ، وانیە، بەڵکو هەم گونەکانی کۆرپەلەی کوڕ، هەم هێلکەدانی کۆرپەلەی کچ، ئەسڵی شوێنی دروست بوونیان نێوان ئێسقانەکانی سینگ و پشتی هەر کامێکیانە.

٦- تۆوی پیاو لە گونەکانیدا دروست دەبێ، بەڵام وەك گوتمان: لە ئەسڵدا شوێنی دروست بوونی گون و هێلکەدانی ئافرەت، نێوان ئێسقانەکانی سینگ و پشتیانە، بەڵام دوایی دادەبەزن، شایانی باسیشە: گونەکان وێڕای تۆو (مَنيّ) هۆڕمۆنی تیستۆسترۆن، کە گرنگترین هۆڕمۆنی کۆمەڵەی ئەندرۆجینە، دەردەدەن و، هانی گون دەدا بۆ بەرهەم هێنانی تۆوی پیاوو، پەیداکردنی سیفەتەکانی پیاوەتیی لە پیاودا، وەك: دەنگی گڕو بەهێز، لەشی ماسوولکەیی، ڕووانی موو لەو شوێنانەی کە پیاوان، لە ژنان جیا دەکەنەوە، وەك ڕیش و سمێڵ، هەروەها جیاوازییەکانی دیکە بە تایبەت لە ڕووی عەقڵیی و دەروونییەوە، ئەوە هەمووی کاریگەریی ئەو هۆڕمۆنەیە کە لە نێو ئاوی پیاودایەو، لە نێو گونەکاندا دروست دەبێ.

٧- ئاوی ئافرەت لە هێلکەدانەکاندا دروست دەبێ، کە ئەویش هەر تۆوی پێدەگوترێ، بەڵام ڕەنگەکەی جیایە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاوی پیاو، خەست و سپیی و، هی ئافرەت ڕوون و زەردە:

**{عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ حَدَّثَتْ أَنَّهَا سَأَلَتْ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ عَنْ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رَأَتْ ذَلِكِ الْمَرْأَةُ، فَلْتَغْتَسِلْ، فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ وَاسْتَحْيَيْتُ مِنْ ذَلِكَ قُلْتُ: وَهَلْ يَكُونُ هَذَا؟ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ نَعَمْ، فَمِنْ أَيْنَ يَكُونُ الشَّبَهُ؟، إِنَّ مَاءَ الرَّجُلِ غَلِيظٌ أَبْيَضُ، وَمَاءَ الْمَرْأَةِ رَقِيقٌ أَصْفَرُ، فَأَيُّهِمَا عَلَا أَوْ سَبَقَ، يَكُونُ مِنْهُ الشَّبَهُ}، (أخرجه مسلم: ٣١٢).**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) لە ئوممو سولەیمەوە (خوا لەویش ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە لە بارەی ئافرەتەوە کاتێك خەو دەبینێ، وەك چۆن پیاو خەون دەبینێ، {(إحتلام)ی دەبێ، حوکمی چۆنە؟} پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کات ئافرەت ئەوەی بینی، با خۆی بشوات، ئوممو سولەیم دەڵێ: شەرمم لەوە کرد، گوتم: ئایا ئەوە دەبێ؟ (واتە: ئافرەتیش ئاوی دێتەوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی بەهۆی چییەوە منداڵ وەك دایك، یان وەك بابی دەچێ؟

دوایی فەرمووی: ئاوی پیاو سپیی و خەستە، ئاوی ئافرەت ڕوون و زەردە، هەر کامێکیان ئاوەکەی سەرکەوت، یان پێشکەوت، وێنەی ئەو منداڵە، ئەو کۆرپەلەیە دەچێتەوە سەر ئەوەیان {کە ئاوەکەی پێشکەوتوە، یاخود سەرکەوتوە}.

ئنجا جێی سەرنجە کە هێلکۆڵەکان (**بوَیضات**)ی نێو ئاوی ئافرەت، کە ئافرەت دوو هێلکەدانی هەن، وەك چۆن پیاو دوولا گونی هەن، ئەو دوو هێلکەدانەی ئافرەت هەر مانگە لایەکی هێلکەدانەکە هێلکۆڵەیەك دروست دەکات و، هێلکەدانی ئافرەتیش هۆڕمۆنی مێینە دروست دەکات، کە دوو جۆرە هۆرمۆنن:

١/ ئیسترۆجین.

٢/ پڕۆجیسترۆن.

ئەوانیش کاریان ئەوەیە هانی هێلکەدانەکان دەدەن، جارێکی دیکە بۆ بەرهەم هێنانی هێلکۆڵەکان و، سیفەتەکانی مێیانەیەتییش و لە ئافرەتاندا پەیدا دەکەن و، تۆخ دەکەنەوە.

٨- (یەك سم٣) لە ئاوی پیاو سەد (١٠٠) ملیۆن زیندەوەری تۆویی (**حَیْمن**)ی تێدایە.

سەرچاوەیەکی دیکەش (**إعجازُ القُرآن فیما تُخْفیه فـي الأَرحام**)[1]، دەڵێ: (٣ ملیلتر) لە تۆوی پیاو (٣٥٠) ملیۆن حەیمەنی تێدایە.

(د. ڕاتب نابلسی)یش دەڵێ: (١سم٣) لە ئاوی پیاو (٥٠٠) ملیۆن حەیمەنی تێدایە.

واتە: ئەو زیندەوەرە بچووکانەی ئاوی پیاو پێکدێنن، چونکە مەنیی پیاو، هەمووی زیندەوەری بچووکە، بەڵام ئێمە وەك ئاو دێتە بەرچاومان، ئنجا کاتێك پیاو لەگەڵ ژندا جووت دەبێ، هەرجارە (٢ - ٤)سم٣ تۆو فڕێ دەداو، مانای وایە دەوری (٣٠٠) ملیۆن زیندەوەری تۆویی تێدا هەیە، بە پێی ئەو سەرژمێرەی ئێرە، ئەگەرنا بەپێی سەرژمێری یەکێکی دیکە لە زانایان، (٧٠٠) ملیۆن تاکو ملیارێك، زیندەوەری تۆویی (حیمن)ی تێدایە.

---

(١) ص ١١٢.

بەڵام هێلکەدانەکانی ئافرەت، لە سەرەتاوە سێ ملیۆن هێلکۆڵە (**بويضة**)یان تێدایە، هێلکۆڵەکان لە سەرەتاوە ژمارەیان زۆرە، بەڵام دوایی ئافرەت کە باڵغ دەبێ، دەمێننەوە (٥ - ٦) هەزار، ئنجا لەو (٥ - ٦) هەزارەش، تەنیا چەند سەدێکیان لێ پێدەگات، کە بگونجێ مرۆڤیان لێ دروست بێ، هەر مانگێ یەکێك لەو هێلکۆڵانە لە هێلکەدانی ئافرەتەوە دێتە نێو منداڵدانی، ئنجا ئەگەر حاڵەتی جووتبوون دروستبوو، خواش ویستی وابوو منداڵ دروست ببێ، هێلکۆڵەیەك و زیندەوەرێکی تۆویی (حیمن) یەك دەگرن و زیندەوەرێکی یەك خانەیی پێکدێنن، کە چل و شەش (٤٦) کرۆمۆسۆمی تێدایە، بۆ ئەوەی سیفەتەکانی باب و دایك لەو منداڵەدا کۆببنەوە، بەڵام ئەگەر ئەو منداڵە قەدەری وا نەبوو دروست ببێ و، ئەو هێلکۆڵەیە لەگەڵ ژیانداری تۆویی دا یەك بگرن، لە کاتی خوێنی مانگانەدا ئەو هێلکۆڵەیە دێتە دەرێ، بۆیەش ئافرەت هەموو مانگان دەکەوێتە حەیزەوە خوێنی پێدا دێ، چونکە ئەو منداڵە دروست نەبووە، ئەگەر منداڵەکە دروست ببێ، خوێنەکە نایەت و لە منداڵدان دا دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو (**نُطفة**)یە لەوێدا گەشە بکات، کە وەك حەوزێکی ئاو لەوێدا دێت و دەچێ و، گەشەی تێدا دەکات و، پێی گەورە دەبێ.

٩- هێلکۆڵە (**بويضة**) تیرەکەی (١٢٠ - ٢٠٠) مایکرۆ مەتر دەبێ، بەڵام ژیانداری تۆویی (حیمن) تیرەکەی (٥٢) مایکرۆنە، واتە: هێلکۆڵەی ئافرەت گەورەترەو دەگونجێ بەچاو ببینرێ، شێوەکەشی خڕ هەڵکەوتوە، بەڵام حەیمەن درێژکۆڵەیە و کلکێکی درێژی هەیە، نزیکەی (١١/١٢)ی درێژییەکەی هی کلکەکەیەتی، شایانی باسە: مایکرۆمەترێك بریتیە لە (١/١٠٠٠)ی ملم، واتە: (١) ملم بکەیە هەزار بەشەوە، ئنجا یەك بەشی پێیدەگوترێ: مایکرۆمەتر، کەواتە: ئێمە کە خۆمان ئاوا دەبینین، وەك مرۆڤێکی پڕ بە کراس، چ پیاو چ ئافرەت، گرنگە بزانین لە کوێوە هاتووین!

ئنجا ئێمە ستایش بۆ خوا لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**المؤمنون**)و، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەم سێ ئایەتە موبارەکەدا، کورتە باسێکمان کردوە، تێرترو درێژتر لەوەی ئێرە، لە بارەی چۆنیەتیی دروستبوونی مرۆڤەوە، ئێستاش ئەم سێ ئایەتە موبارەکە دەخوێنینەوەو، مانایەکی کورتیان دەکەین.

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾.

وەك لەم سیٚ ئایەتەدا دەبینین، خوای کارزان بە حەوت قۆناغ باسی دروستبوونی مرۆڤ دەکات:

**قۆناغی یەکەم:** ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾ بە دڵنیاییەوە ئێمە مرۆڤمان لە خوڵاصەیەکی قوڕ دروست کردوە، چونکە تۆوی پیاوو تۆوی ئافرەت لە خویٚن دروست دەبن، خویٚنیش لەو خواردن و خۆراکانەی، دەخورێن و ئەوانیش سەرجەم لە گڵ و ئاون (گڵ + ئاو = قوڕ) ئەوە قۆناغی یەکەم.

**قۆناغی دووەم:** ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾، دوایی گێڕاومانە بە تۆویلکە (**نطفة**)یەك لە نشینگەیەکی مەحکەمدا، واتە: یەکگرتنی حەیمەنێك و هێلکۆڵەیەك پێی دەگوترێ: تۆویلکە (**نطفة**) لە نێو منداڵداندا جێگیردەبێ.

**قۆناغی سێیەم:** ﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴾، دوایی ئەو تۆویلکە (**نطفة**) یە دەگۆڕین بۆ خوێنپارە (**عَلَقة**) کە زیندەوەرێکە خۆی بە دیواری منداڵداندا هەڵدەواسێ و زۆر بچووکە.

**قۆناغی چوارەم:** ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴾، دوایی خوێنپارە (**علقة**)کەش دەگۆڕین بۆ زارجوو (**مُضغَة**)، کە پارچە گۆشتێکی بە قەدەر زارجوویە، کە دەجوورێ.

**قۆناغی پێنجەم:** ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا ﴾، دوایی ئەو زارجوو (**مضغة**) یەش دەگۆڕین بۆ ئێسقان، پێنجەمین قۆناغی دروستبوونی کۆرپەلە، ئەوەیە کە ئێسقان دروست دەبێ، ئەوەی خوا فەرموویەتی، زانیاریی ئێستاش هەر ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە.

**قۆناغـی شەشـەم:** ﴿ فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ﴾، ئنجـا ئێسـکەکانیش بـە گۆشـت (ماسـوولکە) دادەپۆشـین.

**قۆناغـی حەوتـەم:** ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴾، دوایی کردمـان بـە دروسـتکراوێکی دیکـە، یانـی: تاکـو ئێسـتا تەنیـا ژیانـی هەبـوو، بـەڵام لەمـەودوا ڕووحـی بەبـەردا دەکـرێ، کەواتـە: ژیـان لـە ڕووح جیایـە، ڕووح تایبەتـە بـە مرۆڤـەوە، بـەڵام ژیـان (**حیـاة**) وانیـەو، ڕووەکیـش ژیانـی تێدایـە، زیندەوەرانیـش ژیانیـان تێدایـە، ئاژەڵانیـش ژیانیـان تێدایـە، هـەر کام لـە: (**نُطفـة**) و (**عَلَقـة**) و (**مُضغة**) یـش ژیانیـان تێدایـە، بـەڵام هەتـا دوای چـوار مانـگ و دە شـەو، ئـەو دەوروبـەرە کـە فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەر ﷺ دیاریـی دەکات، ڕووحـی بەبـەردا ناکـرێ، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: دوایـی کردمـان بـە دروسـتکراوێکی دیکـە، یانـی: دروسـتکراوێکی دیکـەی ڕووح بەبـەردا کـراو.

لە کۆتاییشدا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴾، واتە: بەرزیی و بە پێزیی و شکۆمەندیی بۆ خوای چاکترین بەدیهێنەر.

بەڕێـــــزان!

بەڵێ مرۆڤ ئاوا دروست بووە، هەر بۆیەش ئەهلی تەزکیەو عیرفان قسەیەکی جوانیان هەیە: (**مَن عَرَفَ نَفْسَهُ فَقَد عَرَفَ رَبَه**)، هەر کەسێك خۆی بناسێ، پەروەردگارو خاوەنی خۆشی دەناسێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، باش خۆمان بناسین و، چاك خوای خۆمان بناسین و، زۆر باشیش خۆمان بۆ دیداری خوا سبحانە و تعالى ئامادە بکەین.

### مەسەلەی سێیەم:

**ڕاگەیاندنی خوای بێوێنە کە لەسەر گێڕانەوەی مرۆڤ بۆ ژیان دوای مردنی توانایە، لە ڕۆژی ئاشکرابوونی نهێنییەکانداو، ئەو کاتەش بابای بێبڕوا هیچ هێزو پشتیوانێکی نیەو نابێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٞ ٨ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ٩ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ ١٠﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا

**١)-** ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٞ﴾، بەدڵنیایی ئەو (خوا) لەسەر گێڕانەوەی توانایە، بێگومان ڕاناوی سەر ﴿إِنَّهُۥ﴾، بۆ خوای بەرزو مەزن دەچێتەوە، هەرچەندە بە ئاشکرا ناوی خوای مەزن نەهاتوە، بەڵام بە سیاق و سەلیقە دیارە: ﴿عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ﴾، (رَجْع) چاوگە، بە مانای: (**إعادة و رُجوع**)ە، خوا لەسەر گێڕانەوەی ئەو مرۆڤە، ﴿لَقَادِرٞ﴾، بە توانایە، (**الطبري**) ئاوا مانای لێکداوەتەوە: (**إنَّ اللهَ عَلى رَدِّهِ الإنسانَ المَخْلوقَ مِن ماءٍ دَافِقٍ، مِن بَعْدِ مَمَاتِهِ حيّاً كَهَيْئَتِهِ قَبْلَ مَمَاتِهِ، لَقادِرٌ**)، واتە: بە دڵنیایی خوا لەسەر گێڕانەوەی مرۆڤێك کە لە ئاوێکی دەرقوڵیو دروستبووە، دوای ئەوەی مردووە، کە زیندووی بکاتەوەو، وەك حاڵەتی پێش مردنی لێ بکاتەوە، بە توانایە.

ئنجا ئایا ئەوە لە چ ڕۆژێکداو لە چ کاتێکدا؟

**٢)-** ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾، ئەو ڕۆژەی نهێنییەکان ئاشکرا دەبن، وشەی: ﴿تُبۡلَى﴾، هەر لەسەر ئەسڵی واتایەکەی خۆی بەکارهێنراوە، یانی: (**تُخْتَبَر**)، (**يَومَ تخْتَبَرُ سرائر العِبادِ، فَيَظْهَر مِنها يَومَئِذٍ مَا كانَ فِي الدُّنيا مُسْتَخْفياً عَن أَعْيُنِ العِبَادِ**)، واتە: نهێنییەکانی بەندەکان لەو ڕۆژەدا، ئەوانەی لە دنیادا لە چاوی مرۆڤان پۆشراون و پەنهانکراون، هەموویان دەکەونە گۆڕێ و ئاشکرا دەبن.

وشەی: ﴿ٱلسَّرَآئِرُ﴾ کۆی (سَریرة)یە، **(والسّريرةُ ما يُخفِيهِ الإنْسانُ وَيُسِرُّهُ مِن نَوايَاهُ، وَعَقائِدِهِ وَأَعْمَالِهِ)**، ﴿ٱلسَّرَآئِرُ﴾، کۆی (سَريرة)یە، ئەویش هەر شتێکە کە مرۆڤ پەنهانی دەکات و دەیشارێتەوە لە نیازو مەبەستەکانی و بیروبڕوایەکانی و کردەوەکانی.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾، مەبەست تاقیکردنەوەی ئەو نهێنییانەو لێکجیاکردنەوەی چاك و خراپیانەو، مەبەست پێی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت بەسەردا چەسپێنرانە.

**٣)-** ﴿فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ﴾، ئنجا (لەو ڕۆژەدا) نەهیچ هێزێکی هەیەو نە پشتیوانێك، **(الطبري)** ئاوا مانای لێکداوەتەوە: **(فَمَا لِلإِنْسَانِ الكَافِر يَوْمَئِذٍ مِنْ قُوَّةٍ يَمتَنعُ بِها مِنْ عَذَاب اللهِ، وَلا نَاصِرٍ يَنْصُرُهُ فَيَسْتَنْقِذُهُ مِمَّن نَالَهُ بِمَكْروهٍ)**، واتە: لەو ڕۆژەدا مرۆڤی بێبڕوا هیچ هێزێکی نابێ، خۆی پێ لە سزاو ئازاری خوا بپارێزێ و خۆی پێ پەنا بدات، هەروەها هیچ یارمەتییدەرێکیشی نابێ، یارمەتیی بدات، لەو کەسەی دەرباز بکات کە دەیەوێ تووشی زیان و ئازارو ناڕەحەتیی بکات.

هەڵبەتە ئەگەر بشڵێین: مەبەست لە مرۆڤ، مرۆڤە بە گشتیی، دیسان هەر مانایەکەی ڕێك و ڕاستە، چونکە هیچ مرۆڤێك لەو ڕۆژەدا نە توانایەکی زاتیی هەیە، خۆی پێ پەنا بدات، نە هیچ کەسیشی لە فریا دێ، ئەگەر خوا لە فریای نەیەت و پشتی نەگرێ و ئاگای لێی نەبێ.

## مەسەلەی چوارەم:

**سوێند خواردنی خوا بە ئاسمانی خاوەن گێڕانەوەو، زەوی خاوەن قڵیش، کە قوڕئان قسەیەکی هەق و یەکلاییکەرەوەیەو، گاڵتە نیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴿١١﴾ وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ﴿١٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴾، سوێند بە ئاسمانی خاوەن گێڕانەوە، زانایان لەو بارەوە کە ئایا ئاسمان چی دەگێڕێتەوەو، بۆچی ئاسمان بە خاوەنی گێڕانەوە پێناسەو وەسف کراوە؟ زۆر قسەیان کردوە، بۆ وێنە: **(الطبري)**، دەڵێ: **(تَرْجِعُ بِالغُيومِ وَالأَرْزاقِ على العِبادِ كُلَّ عامٍ)**، واتە: ئاسمان هەورەکان و بژیوەکان هەموو ساڵێك بۆ بەندەکان دەگێڕێتەوە، **(الطبري)** یش خۆی ئەو ڕایەی هەڵبژاردوەو لە (إبن عباس)یشەوە، رضي الله عنه، بە ژمارە: (٣٦٠٦٠) هێناویەتی، دەڵێ:

**(رَجَعَ القَطْرَ وَالرِّزْقَ كُلَّ عام)**، ئاسمان هەموو ساڵێك باران و بژیو دەگێڕێتەوە بۆ زەوی، هەروەها زانایانی دیکەش هەر وایانگوتوە، ئاسمان خوا سیفەتێکی تێدا داناوە کە بریتیە لە گێڕانەوەی ئەو شتانەی بۆ لای بەرز دەکرێنەوە، ئنجا هەڵمی ئاوە، هەر شتێکە کە بەرز دەبێتەوە بەرەو ئاسمان، ئاسمان دەیگێڕێتەوە بۆ زەوی.

هەروەها ئاسمان جگە لە ئاو، کە لە باران و بەفرو تەزرەدا بەرجەستە دەبێ، تیشکی ڕۆژیش، جۆرە تیشکەکانی دیکەش و، جۆرە شەپۆلەکانی دیکەش، بۆ زەوی دێنێتەوە.

**٢)-** ﴿ وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ﴾، سوێند بە زەوی خاوەن قڵیشان، خاوەن لەتبوون، ﴿ ٱلصَّدۡعِ ﴾، لەتبوونی شتێکی ڕەقە، کە دەنگی لێبێ، **(الطبري)** لە (إبن عباس)ەوە رضي الله عنه، بە ژمارە: (٣٧٠٦٨)، لە بارەی: ﴿ وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ﴾ەوە، هێناویەتی، دەڵێ: **(صَدْعُها**

**عَن إخراجِ النَّباتِ كُلَّ عام**)، بریتیە لە قڵیشانی زەوی بەهۆی دەرهاتنی ڕووەكەوە هەموو ساڵێك، هەرچی ڕووەك و شیناورد هەیەو تۆوەكەی و دەنكەكەی دەچێتە نێو زەوییەوە، خوای پەروەردگار زەوی وا خوڵقاندوە، بتوانێ شەق ببێ و، ئەگەر وەك ئاسن، یان مس، بووایە بە دڵنیایی شەق نەدەبوو، ئنجا سوێند بەو دووانە، بە ئاسمانی خاوەنی گێڕانەوە و، بە زەوی خاوەن قڵیش: ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە قسەیەكی جیاكەرەوەیە، قسەیەكی یەكلاییكەرەوەیە، (**إِنَّه**) ڕاناوەكەی دەچێتەوە بۆ قورئان و، دەشچێتەوە بۆ ئەو قسانەی لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوون.

**٣**- ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (ئەو قورئان)ە، قسەیەكی لێكجیاكەرەوەیە، لە نێوان هەق و ناهەق، ڕاست و چەوت، حەڵاڵ و حەڕام، چاك و خراپدا، (**الطبري**)، گوتوویەتی: (**أَي: قَولٌ يَفصِلُ بَيْنَ الحَقِّ وَالبَاطِل بِبَيَانِهِ**)، واتە: قسەیەكە هەق و ناهەق، بەهۆی ڕوونكردنەوەی خۆیەوە لێك جیادەكاتەوە.

**٤**- ﴿ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ﴾، نە یارییەو نە قسەی پووچە، (**الطبري**)، ئاوای لێكداوەتەوە: (**مَا هوَ باللّعِبِ والباطِلِ**)، نە یارییەو نە پووچە، (**هَزْل**) لە بەرانبەر (**جِدّ**)دایە، (**جِدّ**)، واتە: شتێك گرنگیی و بایەخی پێبدرێ، (**هَزل**)یش پێچەوانەی (**جِدّ**)ە، واتە: شتێكی بێبایەخ، گرنگیی پێنەدراوو گوێ پێنەدراو، شتێك بە گاڵتەو بە جەفەنگ بكرێ.

(كميت)، یەكێكە لە شاعیرەكان دەڵێ:

(**يُجَدُّ بِنا بِكُلِّ يَوْمٍ وَنَهْزِلُ** )، لە هەموو ڕۆژاندا كاری جیددییمان لەسەر دەكرێ، ئێمەش هەر گاڵتە دەكەین.

لێرەدا خوای زاناو توانا قورئان بەوە وەسف دەكات، كە قسەیەكی جیاكەرەوەیەو گاڵتەو سوعبەت نیە، جێی خۆیەتی ئەم فەرموودەیە بێنین، هەرچەندە هەندێك لە زانایان لە بارەی سەنەدەكەیەوە مشت و مڕێكیان بووە، بەڵام بەڕاستیی دەقێكی زۆر ڕوونكەرەوەیەو، دەوری حەڤدە (١٧) وەسفی قورئانی گرتوونەتە خۆی، ئەمەش دەقی ئەو فەرموودەیە:

{عَنِ الْحَارِثِ الأَعْوَرِ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَإِذَا أُنَاسٌ يَخُوضُونَ فِي أَحَادِيثَ، فَدَخَلْتُ عَلَى عَلِيٍّ، فَقُلْتُ: أَلاَ تَرَى أَنَّ أُنَاساً يَخُوضُونَ فِي الأَحَادِيثِ فِي المَسْجِدِ، فَقَالَ: قَدْ فَعَلُوهَا؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «سَيَكُونُ فِتَنٌ»، قُلْتُ: وَمَا المَخْرَجُ مِنْهَا؟ قَالَ: «كِتَابُ اللَّهِ، فِيهِ نَبَأُ مَا قَبْلَكُمْ، وَخَبَرُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، هُوَ الفَصْلُ لَيْسَ بِالهَزْلِ، هُوَ الَّذِي مَنْ تَرَكَهُ مِنْ جَبَّارٍ قَصَمَهُ اللَّهُ، وَمَنِ ابْتَغَى الهُدَى فِي غَيْرِهِ أَضَلَّهُ اللَّهُ، فَهُوَ حَبْلُ اللَّهِ الْمَتِينُ، وَهُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ، وَهُوَ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ، وَهُوَ الَّذِي لاَ يَزِيغُ بِهِ الأَهْوَاءُ، وَلاَ تَلْتَبِسُ بِهِ الأَلْسِنَةُ، وَلاَ يَشْبَعُ مِنْهُ الْعُلَمَاءُ، وَلاَ يَخْلَقُ عَنْ كَثْرَةِ الرَّدِّ، وَلاَ تَنْقَضِي عَجَائِبُهُ، وَهُوَ الَّذِي لَمْ يَنْتَهِ الجِنُّ إِذْ سَمِعُوهُ أَنْ قَالُوا: «إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً»، مَنْ قَالَ بِهِ صَدَقَ، وَمَنْ حَكَمَ بِهِ عَدَلَ، وَمَنْ عَمِلَ بِهِ أُجِرَ، وَمَنْ دَعَا إِلَيْهِ، هُدِيَ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ، خُذْهَا}، (أخرجه الترمذي: ٢٩٠٦، وقال: إسناده مجهول، والبيهقي في شعب الإيمان: ١٩٣٥، وحديث معاذ: أخرجه الطبراني برقم (١٦٠). قال الهيثمي (١٦٥/٧): فيه عمرو بن واقد وهو متروك).

واتە: حاریثی یەك چاو (نازناوەكەی وا هاتوە)، دەڵێ: (ڕۆژێ) چوومە مزگەوت تەماشام كرد، خەڵك ڕژابوونە نێو قسان، (دەبێ قسەكانیان بە دڵ نەبووبن)، چوومە لای عەلی (خوا لێی ڕازیبێ)، هەواڵم پێدا، ئەویش گوتی: ئاوایان كرد؟ من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: لە مەودوا ئاشووب و گێژاوێك دەبێ، منیش لێم پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! دەرچوون لەو گێژاوەو ئاژاوەیە، چۆنە؟ لە چ ڕێیەكەوە لێی دەربچین؟ فەرمووی: كتێبی خوا {بە هۆی كتێبی خواوە، لەو گێژاوەو ئاشووبە دەردەچن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر سەنەدی ئەم دەقە ڕاستبێ، وەسفی كتێبی خوای كردو فەرمووی}: هەواڵە گرنگەكەی پێش ئێوەی تێدایەو، باس و خواسی ئەوانەی دوای ئێوەشی تێدایە، دادوەریی ئەوەشی تێدایە كە لە نێوان ئێوەدا دەبێ لە كێشەو مشت و مڕ، ئەو (قوڕئان) یەكلاییكەرەوەو جیاكەرەوەیەو گاڵتە نیە، هەر ستەمكارێك وازی لێ بێنێ، خوا پشتی دەشكێنێ و، هەر كەسێك ڕێنمایی لە جگە لە قوڕئان بخوازێ، خوا گومڕای دەكات، ئەو (قوڕئان) بریتیە لە ڕێسمانی پتەوی خوا، {هەر كەسێك خۆی پێوە بگرێ، پێی دەرباز دەبێ لەوەی بكەوێتە چاڵ و كەندالی گومڕایی و

سەر لێشواویی}، ئەو (قورئان) بریتیە لە زیکری کاربەجێ (بیرخەرەوەی کارزانە)، ئەو ڕاستە ڕێیەیە کە ئارەزووەکان ناتوانن لای بدەن و، زمانەکان بە هۆی قورئانەوە تێك نائاڵۆزێن، (هەر کەسێك مەبەستی بێ، زۆر بە ڕێك و چاکیی دەتوانێ لە قورئان تێبگات و بیخوێنێ)، زانایان لێی تێر نابن، بە هۆی زۆر دووبارەکردنەوەوە (قورئان) کۆن و شڕ نابێ، {بۆیە پێشینان گوتوویانە: زۆر گوتن قورئان خۆشە}، شتە سەرسوڕهێنەرەکانی (قورئان) هەرگیز کۆتاییان پێ نایەت، (هەتا زانست بەرەو پێشەوە بچێ و ژیانی مرۆڤ بەرەو پێشەوە بچێ، نهێنیی زیاتر لە قورئاندا دەردەکەون)، (قورئان) ئەو کتێبەیە کاتێك جند بیستیان وازیان نەهێنا تاکو گوتیان: ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر بووە، (بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنمایی دەکات، خەڵك دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ)، هەر کەسێك بەو (قورئان) قسە بکات، (قورئان چی دەفەرمووێ ئاوا بدوێ)، ڕاستیی دەڵێ و، هەر کەسێك بە پێی وی (قورئان) دادوەریی بکات، دادگەر دەبێ، هەرکەسێك کاری پێ بکات، پاداشتی دەدرێتەوە، هەر کەسێك خەڵك بەرەو لای وی بانگ بکات، بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنمایی کراوەو خراوەتە سەر ڕاستە ڕێ، ئنجا وەریبگرە.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە باشترین بەهرە لەو کۆتا فەرمایشتەی خوای بەرزی مەزن وەردەگرن.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**باسی فێڵ و پیلانی ناحەزانی خواو پێغەمبەرەکەی و، نەخشەی خوا لە دژیان و، فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ کە مۆڵەتیان بدات، خواش ماوەیەکی کەم مۆڵەتیان دەدات و، دواییش سزایان دەدات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا ﴿١٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا﴾، بە دڵنیایی ئەوان بە پیلانگێڕانێك (کە شایستەی خۆیانە)، پیلان دەگێڕن.

(راغب الأصفهاني)، دەڵێ: (**الكَيْدُ: إِخْفَاءُ قَصْدِ الضُرِّ وَإِظْهَارُ خِلاَفِهِ، فَكَيْدُهُم مُسْتَعْمَلٌ فِي حَقِيقَتِهِ، لَكِنَّ الكَيْدَ المُسْنَدَ إِلى اللهِ، مُسْتَعْمَلٌ فِي إِمهالِهِ مَعَ إِرادَةِ الإِنْتِقام**)، واتە: (کید): (جۆرێکە لە فێڵ و پیلانگێڕان، بە شێوەیەکی پەنهان)، بریتیە لە شاردنەوەی مەبەستی زیانلێدان و، دەرخستنی پێچەوانەکەی، (واتە: ئەوە کە کەسێك لە لای یەکێکی دیکە خۆی وا پێشان بدات، دەیەوێ قازانجی پێ بگەیەنێ، بەڵام لە ئەسڵدا بیەوێ زیانی لێبدات، ئەوە پێی دەگوترێ: (کَید)).

وشەی: (کَید) کە بۆ بێبڕوایان و ناحەزانی ڕێبازی خوا بەکارهێنراوە، لە مانای ڕاستەقینەی خۆیدا بەکارهێنراوە، بەڵام وشەی: (کَید) کە پاڵ دراوەتە لای خوا سبحانە و تعالی، بەکارهێنراوە بە مانای مۆڵەتدان، لەگەڵ ویستنی تۆڵەستاندنەوەدا.

واتە: خوا مۆڵەتیان دەدا، بەڵام دەشیەوێ تۆڵەیان لێ بستێنێ، ئەوەش خوا ناوی لێناوە (کَید)، چونکە ئەوان پێیان وایە خوا تۆڵەیان لێ ناستێنێ و لێیان گەڕاوەو وازی لێهێناون، لە حاڵێکیشدا کە خوای بەرز دەیەوێ تۆڵەیان لێ بستێنێ و سزایان بدات، ئەمەش

ڕواڵەتەکەی وەك فێڵ دەچێ، بەڵام بێگومان نابێ هیچ وشەیەکی ناڕێك بۆ خوای بەرزی مەزن بەکاربهێنرێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴾، لە سووڕەتی (الأنفال) دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾، لە هەموو ئەو شوێنانەدا زانایان دەڵێن: بۆیە خوا سبحانە و تعالى لەوێ وشەی: (مَكْر)ی بۆ ناحەزان بەکارهێناوەو بۆ خۆیشی و، لێرەشدا وشەی: (كَيد)ی بۆ ناحەزانی ئیسلام و بۆ خۆیشی بەکارهێناوە: (لِلْمُشاكَلَة)، ئەوە بۆ لێکچوونە، ئەگەرنا (كيد و مكر)ی خوا سبحانە و تعالى بە دڵنیایی واتایەکی هەیە، کە شایستەی خوای پەروەردگارە، هی وانیش واتایەکی هەیە شایستەی خۆیانە.

هەندێکیش گوتوویانە: وشەی: (كَيد)، هەمان واتای کە ئەگەر مرۆڤەکان بەکاری بێنن، بۆ خوای پەروەردگاریش هەیەتی.

بێگومانیش ڕای یەکەم ڕاستەو، ئەو بێژانەی خوا بۆ وەسفی خۆی بەکاریان دێنێ، مانایەکی شایستە ئەویان هەیەو، هەموو سیفەتەکانی دیکەی خوای پەروەردگاریش هەر وان، بۆ وێنە: کاتێك دەڵێین: خوا فەرمایشت دەکات، فەرمایشتکردنی خوا وەك هی ئێمەی مرۆڤ نیە، هەروەها کاتێك دەڵێین: خوا دەبینێ، ئێمە بە کۆئەندامی چاو دەبینین، کاتێك دەڵێین: خوا دەبیستێ، ئێمە بە کۆئەندامی بیستن، دەبیستین، بەڵام خوای پەروەردگار پێویستیی بە ئەندامەکان نیە، بیستنی خوا، دیتنی خوا، ویستنی خوا، لێرەش نەخشەدانانی خوا، هەموو ئەو سیفاتەنەی بە شێوەیەکن، شایستەی خوای بەرزو مەزن بن.

٢)- ﴿ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴾، منیش بەفێڵکردن فێڵ دەکەم، (نەخشە دادەنێم بە نەخشەدانانێکی مەحکەم)، فێڵ یانی: نەخشەدانان، یان: فێڵێك چەمك و واتایەکەی شایستەی خوای بەرز بێ.

٣)- ﴿ فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ ﴾، ئنجا مۆڵەتی بێبڕوایەکان بدە، (**التَّمْهِيلُ مَصْدَرُ مَهَّلَ، بِمَعْنى أَمْهَلَ، وَهُوَ الإِنْظارُ إِلى وَقْتٍ مُعَيَّنٍ، أَوْ غَيْرِ مُعَيَّنٍ**)، وشەی: (تَمْهيل) چاوگی (مَهَّلَ)یە، (مَهَّل)، بە مانای

(أَمْهَلَ)یە، (إمهال)یش بەمانای (إنظار)ە، چاوەڕێکردن، واتە: مۆڵەتیدان، چاوەڕێیکردن، بواری پێدان، تاکو کاتێکی دیارییکراو، یاخود تاکو کاتێکی دیاریی نەکراو.

٤)- ﴿ أَمۡهِلۡهُمۡ رُوَيۡدَۢا ﴾، منیش کەمێك مۆڵەتیان دەدەم، وشەی: ﴿ رُوَيۡدَۢا ﴾، **(تَصْغِيرُ رُودْ، وَهُوَ المَهْلُ وَعَدَمُ العَجَلَةِ، وَهُوَ مَصْدَرٌ مُؤَكِّدٌ لِفِعلِ أَمْهِلْهُم، وتَصْغيرٌ لِلدَّلالَةِ عَلَى التَّقْلِيلِ أَي: مُهْلَةً غَيْرَ طَويلةٍ)**.

﴿ رُوَيۡدَۢا ﴾، گچکە کردنەوەی (**رُود**)ە، (**رُودْ**)یش، بریتیە لە مۆڵەتدان و پەلە نەکردن، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ أَمۡهِلۡهُمۡ رُوَيۡدَۢا ﴾، (**رُویدا**) دەبێتە چاوگێکی جەختکەرەوە بۆ کرداری ﴿ أَمۡهِلۡهُمۡ ﴾، واتە: من مۆڵەتیان دەدەم بە مۆڵەتدانێکی کەم، وشەی: ﴿ رُوَيۡدَۢا ﴾یش، لە (رود)ەوە هاتوە، بۆیەش گچکە کراوەتەوە، هەتا بزانرێ ماوەیەکی کەم مۆڵەتیان دەدات، نەك مۆڵەتێکی درێژ، دەشگونجێ: ﴿ رُوَيۡدَۢا ﴾، لێرەدا ناوی کردار (**إسم فعل**)بێ بۆ فەرمان (**أَمْر**)، وەك: ١- (**صَهْ**)، یانی: (**اسْكت**)، بێدەنگ بە، ٢- (**مَه**)، یانی: وازبێنە، ٣- (**إِلَيْك**)، یانی: (**إبتعِد**)، دوور بکەوە، ٤- (**عَلَيْك**) یانی: (**إِفْعَل**)، بیکە، ئەوانە هەموویان (**إسم الفِعل**)ن، یانی: ناون بەڵام بەمانای کردار دێن، لێرەشدا (**رُوَيدَك**)، یانی: ڕاوەستێ، بۆ ماوەیەك چاوەڕێبە.

کەواتە: لێرە خوا سبحانە و تعالی بە پلەی یەکەم ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، هەڵبەتە هەموو قورئانیش بە پلەی یەکەم خوا، موحەممەدی ﷺ پێ دواندوەو دایبەزاندۆتە سەر دڵی موبارەك و ساغ و ساف و بێگەردی ئەو، ئنجا لە دوای ئەویشەوە هاوەڵەکانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، مسوڵمانانێك کە لە خزمەتی دابوون، دوای وانیش پشت و جیلەکانی دیکە، ئەوانەی بڕوایان بە قورئان و بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەیە، تاکو دنیا کۆتایی پێ دێ.

لێرەدا خوا سبحانە و تعالی ڕوو دەکاتە پێغەمبەرەکەی ﷺ و پێی دەفەرموێ: دوژمنان و ناحەزانی تۆ فێڵ دەکەن، نەخشە دادەنێن، پیلان دەگێڕن، بە پیلانگێڕانێکی شایستەی خۆیان، ﴿ إِنَّهُمۡ يَكِيدُونَ كَيۡدٗا ﴾، فێڵ دەکەن بە فێڵکردنێکی گرنگ، فێڵ کردنێك

كە شایستەی خۆیانە، ﴿ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴾، منیش نەخشە دادەنێم نەخشەو پلانێك كە شایستەی خۆم بێ، ﴿ فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، ئنجا مۆڵەتی كافرەكان بدە، بواریان پێبدەو لێیان گەڕێ، وازیان لێ بێنە، ﴿ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا ﴾، منیش كەمێك مۆڵەتیان دەدەم و بواریان دەدەم.

ئەو مۆڵەتە ماوە كەمەش دوو واتای هەن:

یەكەمیان: مەبەست كۆی ژیانی دنیایە، واتە: من لە ژیانی دنیادا لێیان گەڕاوم و لەسەر خراپەكانیان سزایان نادەم، لەسەر شیرك و كوفر سزایان نادەم و، لەسەر لادان و تاوانیان سزایان نادەم، لێیان گەڕاوم، چونكە لێرەم داناون، لەم ژیانی دنیایەدا بۆ تاقیكردنەوە، بۆیە دەبێ لێیان گەڕێم، بە كەیفی خۆیان وەڵامی پرسیارەكان بدەنەوەو هەڵسوكەوت بكەن، وەك لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾ ﴾**الغاشية**.

واتە: بیریان بخەوە، تۆ تەنیا تۆ بیرخەرەوەی، تۆ بەسەردا زاڵبوویان نی، (دڵیان ناچار بكەی ئیمان و ئیسلامی تێبخەی)، مەگەر كەسێك پشت هەڵبكات و بێبڕوا بێ، ئنجا كەسی وا خوا سزای هەرە گەورەی دەدا، بە دڵنیایی گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیەو، ئنجا لێپرسینەوەشیان لەسەر ئێمەیە. ﴿ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾یش، جیاكردنەوەی پچڕاو (**إِسْتِثناء مُنقَطِع**)ە، چونكە كەسێك كە پشت هەڵدەكاو بێبڕوا دەبێ، بەشێك نیە لەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەڵاتی بەسەردا هەبن، كە دەفەرموێ: ﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾، وەنەبێ كەسێك پشت هەڵبكاو بێبڕوا بێ، پێغەمبەر ﷺ بەسەریدا زاڵ بێ و وای لێ بكات بڕوا بێنێ! نەخێر، بەڵام كەسێك پشت هەڵبكاو بێبڕوا بێ: ﴿ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴾، ئنجا خوا سزای گەورەترینی دەدا، بێگومان لە ڕۆژی دواییدا، وەك لە سووڕەتی (**السجدة**)دا، خوا باسی سزای گەورەتر دەكات، لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە دنیادا هەرچی بەسەریبێ، هەر بە سزایەكی گچكە

دادەنرێ، لە سووڕەتی (**السجدة**)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە سزای کەمترین و نزیکترینیان دەدەین، جگە لە سزای گەورەتر، ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾، بەڵکو بگەڕێنەوە، بەڵام سزای گەورەتر، بێگومان لە ڕۆژی دواییدایە.

لێرەش خوای باڵادەست فەرمان بە پێغەمبەر دەکات، کە تۆ لێیان گەڕێ، من کەمێك مۆڵەتیان دەدەم، کە مەبەست لە کەمێك، ژیانی دنیایە بە گشتیی.

دووەمیان: دەشگونجێ مەبەست لە کەمێك (**رويدا**) ئەوەبێ تۆ لێیان گەڕێ، دوای ماوەیەکی دیکەی کەم، ئەوانە ئەو کوفرو زوڵم و خراپەیەی دەیکەن، بەشێك لە سزای ئەوە دەچێژن، ئەویش مەبەست پێی ئەوەیە هەندێك بەڵایان بەسەردێن، چ گرانیی بێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لێکردن: {**أَللَّهُمَّ اجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ**} (**أخرجه البخاري**: ٩٦١)، واتە: خوایە ساڵانێکیان بۆ بنێرە، وەك ساڵەکانی یوسوف عليه السلام، ئەو حەوت ساڵە گرانییەی بەسەر خەڵکی میسردا هاتن، لە ڕۆژگاری یوسوف دا کە لە میسر بوو.

یاخود مەبەست سزادرانی بێبڕوایەکان بێ، لە جەنگ و بەرەنگارییەکانی نێوان خەڵکی ئیسلام و خەڵکی کوفردا، بۆ وێنە: لە جەنگی بەدردا حەفتا (٧٠) لە بڕیار بەدەستەکانیان لێ کوژران و، حەفتاشیان لێ بەدیل گیران، هەروەها لە جەنگەکانی دیکەشدا کەم و زۆر تووشی زیان و زەرەرە بوون، تاکو یەکجاریی کوفرو شیرك لە نیوە دورگەی عەرەبییدا دەسەڵاتی نەما، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست واتای یەکەمیان بێ، کە بۆ ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ و، بۆ ئێستاش و، بۆ دوای ئێستاش هەروایە، خوا سبحانە و تعالى کەمێك مۆڵەتی مرۆڤەکان دەدا بەگشتیی، بەتایبەت بێبڕوایان ژیانی دنیا بەو شێوەیە بگوزەرێنن، کە خۆیان حەزی لێ دەکەن، دوایی خوا سبحانە و تعالى لە کاتی خۆیدا، بە پێی ئەو سیستمەی دایناوە لە ڕۆژی دواییدا، سزاو پاداشتیان بەسەردا جێ بەجێ دەکات، هەر کەسە بەپێی خۆی.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ بە شێوەیەك ژیانی دنیامان بگوزەرێنین، شایستەی ئەوە بین پاداشتمان بداتەوە، بە هۆی لە خزمەت قورئاندا ژیانەوە، ژیانمان ڕێك و ڕاست و پاك و ساغ بكات، ژیانی دنیامان ژیانێكی بەختەوەرانەو پاك و ڕاست بكات، تاكو سەرەنجامیشمان بەو شێوەیە بێ، چونكە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك لە سەرچی بژی، لەسەر ئەوەش دەمرێ و، لەسەر چیش بمرێ، لەسەر ئەوەش زیندوودەبێتەوە[1].

لێرەدا كۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**الطارِق**) دێنین.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.**



(١) {يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ} أخرجه عبد بن حميد: ١٠١٣، ومسلم: ٢٨٧٨، وابن حبان: ٧٣١٩، والحاكم: ٣٦٨٨.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ (٢٨)ی مانگی (**ذي القعدة**)، {واتە: مانگی (١١)ی} ساڵی (١٤٤١)ی كۆچیی، بەرانبەر (١٩)ی تەممووز، {واتە: مانگی (٧)ی} ساڵی (٢٠٢٠) زایینییە، لە شاری دێرینی هەولێر، خوا پشتیوانبێ دەست دەكەین بە تەفسیركردنی سوورەتی (**الأعلى**).

## پێناسەی سوورەتی (الأعلى)و بابەتەكانی

### یەكەم: ناوی ئەم سوورەتە:

زۆربەی هەرەزۆری ڕوونكەرەوانی قورئان، ناوی: (**سورة الأعلى**)یان بۆ بەكارهێناوە، بەڵام وێڕای ئەوە ناوی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾شیان بۆ بەكارهێناوە، وەك لە چەند دەقێكەوە دیارە، بۆ وێنە:

**١)- {عَنِ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ فَجَعَلَا يُقْرِئَانِنَا الْقُرْآنَ، ثُمَّ جَاءَ عَمَّارٌ وَبِلَالٌ وَسَعْدٌ، ثُمَّ جَاءَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فِي عِشْرِينَ، ثُمَّ جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَمَا رَأَيْتُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ فَرِحُوا بِشَيْءٍ فَرَحَهُمْ بِهِ حَتَّى رَأَيْتُ الْوَلَائِدَ وَالصِّبْيَانَ يَقُولُونَ: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ جَاءَ، فَمَا جَاءَ حَتَّى قَرَأْتُ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، فِي سُوَرٍ مِثْلِهَ} (أخرجه البخاري: ٤٦٥٧، والنسائي: ٦٨٦).**

واتە: بەڕائی كوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: یەكەمین كەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ كە هات بۆ لامان (بۆ شاری (**یثرب**))، موصعەبی كوڕی عومەیر لەگەڵ ئیبنو ئوممی مەكتووم بوون، (هەندێك گوتوویانە: ناوی عەبدوڵڵایە، هەندێكیش گوتوویانە ناوی: عەمرە)، ئەو دووانە قورئانیان پێ دەخوێندین، دوایی عەممارو بیلال و سەعد،

(خوا لێیان ڕازی بێ) هاتن، دوایی عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) لەگەڵ بیست کەسدا هات، دواییش پێغەمبەر ﷺ هات، خەڵکی مەدینەم نەبینیوە، دڵخۆش بن بە هیچ شتێك بە ئەندازەی دڵخۆشییان بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەنانەت کچانی گچکەو کوڕانی گچکەم دەبینین، دەیانگوت: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ هات، ئنجا پێغەمبەر نەهات تاکو من سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾م خوێند، (واتە: لەبەرم کرد)، لەگەڵ چەند سووڕەتێکی دیکەی هاو وێنەیدا.

کەواتە: وێڕای ناوی (الأعلى)، ناوی (سَبِّح اسْمِ رَبِّكَ الأَعلى)یشی بۆ بەکارهاتوە.

**٢)- {عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى} (أخرجه مسلم: ٨٧٨، وأبو داود: ١١٢٢، والترمذي: ٥٣٣، والنسائي: ٨٦٥).**

واتە: جابری کوڕی سەمورە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆدا سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ی، دەخوێند.

**٣)- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِي الله عَنْها، قالَت: كَانَ النَّبِيُّ يَقْرَأُ فِي الوَتْرِ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَفِي الثَّانِيَةِ بِقُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، وَفِي الثَّالِثَةِ بِقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ} (أخرجه أبو داود: ١٤٢٤، والترمذي: ٤٦٣، وابن ماجه: ١١٧٣، والحاكم:** ج١، ص٣٦٥، **وصححه الحاكم على شرطهما، ووافقه الذهبي).**

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی وەتردا، (ئەو سێ ڕکاتەی کە دەکەونە دوای شەونوێژ، ئەگەر کەسێك لە خۆی ڕاببینێ شەو خەبەری دەبێتەوە بۆ شەونوێژ، ئەگەرنا دەشگونجێ پێشیان بخات، واتە: پێش خەوتن ئەنجامیان بدا)، لە ڕکاتی یەکەمدا، سووڕەتی ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ی دەخوێندو، لە ڕکاتی دووەمدا: ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾و، لە ڕکاتی سێیەمیشدا: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، لەگەڵ (مُعَوِّذَتَيْن)، {واتە: سووڕەتی (الفَلَق) و (النَّاس)}ی دەخوێندن.

**٤)- {عَن أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ يُوتِرُ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَقُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، وَقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} (أخرجه أبو داود: ١٤٢٣، والنسائي: ج٣ ص٢٢٤، وإبن ماجه: ١١٧٣، والحاكم: ج٢، ص٢٥٢، وصححه الحاكم ووافقه الذهبي).**

واتە: ئوبەیی کوڕی کەعب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی وەتری دەکرد، بەو سێ سوورەتانە: لە ڕکاتی یەکەمدا، سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ی دەخوێندو، لە ڕکاتی دووەمدا: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾و، لە ڕکاتی سێیەمیشدا: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾.

کەواتە: وێڕای (**سورة الأعلى**)، ناوی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾یشی بۆ بەکارهاتوە، یانی: ئایەتەکە هەمووی.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

بە ڕای زۆربەی زانایان ئەم سوورەتە مەککەییە، بەڵام (**الضحّاك**) بە مەدینەیی داناوە، لەو بارەوەش کە مەککەییە، بەڵگە زۆرن، ئێمە وەك نموونە ئەم دەقە دێنین:

**{عَن عَبدِ اللهِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ سَبِّحِ اسْمِ رَبِّكَ الأَعْلَى بِمَكَّةَ} (أورده السيوطي فِي (الدرُّ المنثور)، ج٨، ص ٤٧٨، ونَسبَهُ لابنِ الضّرِيس، وَالنحّاس، وابن مَردَوَيه، والبيهقي، وَقَالَ: أخرج ابن مردويه عن عبدالله بن الزبير، وقال: نَزَلَتْ سُورَةُ سبح اسم ربك الأعلى بمكة، الإستيعاب فِي بيان الأسباب: ج٣، ص٥٠٨).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنه گوتوویەتی: سوورەتی ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾، لە مەککە هاتۆتە خوار.

هەروەها (**السيوطي**)، پاڵیداوەتە لای (**إبن مُردَوَيْه**)و گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریش رضي الله عنهما هەمان شتی گوتوە، کە ئەم سوورەتە لە مەککە دابەزیوە.

هەڵبەتە مەككەیی بوونی ئەم سوورەتە، وێڕای ڕیوایەتەكان، زۆر ئاشكراو دیارە، وەك پێشتریش زۆرجار باسمان كردوە، سرووشتی قورئانی مەككەیی ئاشكرایەو، سرووشتی قورئانی مەككەییش زۆر ڕوونە لەم سوورەتە موبارەكەدا.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سوورەتە لە موصحەفدا ژمارەكەی: (٨٧)ەو، لە دابەزینیشدا لە لای جابیری كوڕی زەید، ژمارەكەی (٨)ە، بەڵام لە ئیبنو عەبباس و عیكریمەو حەسەنی بەسڕاییەوە هاتوە كە (٧)ەمین سوورەتەو، ڕستەی: ﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾ش، بەڵگەی زوو دابەزینی ئەم سوورەتە موبارەكەیە.

ئنجا ئەگەر ئەم سوورەتە موبارەكە (٧ یان ٨)ەمین بێ، گرنگ ئەوەیە یەكێكە لەو سوورەتە موبارەكانەی زوو دابەزیون و، ئەو ڕستەیەش كە دەفەرموێ: ﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾، ئێمە قورئانت پێ دەخوێنین و لە بیرت ناچێ، موژدەیەكی خۆش و گەورەی تێدابووە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ كە نەخوێندنەوەی هەبووە، نە نووسینی هەبووە: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ٤٨ ﴾**العنكبوت**، واتە: تۆ پێش وی (قورئان)، نە هیچ كتێبێكت خوێندۆتەوەو نە هیچ شتێكت بە دەستی ڕاستت نووسیوە، ئەگەرنا ئەوانەی لەسەر ناهەقن دەكەوتنە دوو دڵییەوە، ئەگەر خوێندن و نووسینت هەبووایە، بەڵام ئێستا كە خوێندن و نووسینت نیە، ئەو قورئانەش بەو شێوەیە بەوان ڕادەگەیەنی، كەواتە: دیارە خوا ﷻ فێری كردووی، ئنجا كە خوا پێی فەرموو: قورئانت پێ دەخوێنین و لە بیریشت ناچێ، بێگومان دڵخۆشیی و موژدەیەكی گەورە بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

بەیەكدەنگیی ژمێرەرانی ئایەتەكانی قورئان، ئەم سوورەتە موبارەكە، نۆزدە (١٩) ئایەتە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سووڕەتە وێڕای کورتییشی، شەش تەوەری جۆراوجۆری گرتوونە خۆی، کە ئەمانەن:

١- فەرمانکردن بەپاکگرتنی ناوی خواو، ناساندنی خوا، لە میانی پێنج لە کارە ناوازەکانیدا.

٢- دڵنیاکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە خوا قورئانی فێر دەکات و، لە بیریشی ناچێتەوە، بۆ چاکەش ئاسانی دەکات.

٣- فەرمانکردن بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە هەر کات زانیی ئامۆژگاریی سوودی هەیە، بیکات، هەر کەس سام و هەیبەتی خوای لە دڵدا هەبێ، بەهرەمەند دەبێ و، بابای خراپەکاریش دووچاری ئاگری هەرە گەورە دەبێ، کە نەمر نەژی تێیدا دەبێ، ئەو جۆرە کەسەش خۆی لێ بە دوور دەگرێ.

٤- ڕاگەیاندنی سەرفرازیی بابای خۆ تەزکیەکاری ناوی خوا هێنەری نوێژکەر.

٥- سەرزەنشتکردنی خەڵك لەسەر هەڵبژاردنی دنیا، هەرچەندە دوارۆژ لە خودی خۆیدا باشترەو بەردەوامیشە.

٦- ڕاگەیاندنی ئەوەی ئەو ڕاستییانە لە نامەو پەڕاوە پێشووەکانیشدا هەن، کە خوا بۆ پێغەمبەرانی پێشووی ناردوون، بە تایبەتی هی ئیبراهیم و مووسا (سەلامی خوایان لێ بێ).

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

چوار تایبەتمەندیی لێ دەخەینە ڕوو:

١- دەست پێکردنی بە وشەی: (سَبِّح)، پێشتریش گوتوومانە: حەوت سووڕەت بە پاکگرتنی خوا دەست پێدەکەن: یەکەمیان سووڕەتی (**الإسراء**)ە: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ ﴾.

**دووەم:** سووڕەتی **(الحديد)**ە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝١﴾.

**سێیەم:** سووڕەتی **(الحشر)**ە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝١﴾.

**چوارەم:** سووڕەتی (الصف)ە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝١﴾.

**پێنجەم:** سووڕەتی **(الجمعة)**یە: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ۝١﴾.

**شەشەم:** سووڕەتی **(التغابن)**ە: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ۝١﴾.

**حەوتەم:** سووڕەتی **(الأعلى)**یە: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾.

ئەو حەوت سووڕەتەی باسمان کردن:

**١-** سووڕەتی **(الإسراء)** بە چاوگی: **(تَسبيح)** دەستی پێکردوە: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ۝١﴾.

**٢و٣و٤-** سووڕەتەکانی: **(الحديد و الحشر و الصف)**، بە کرداری ڕابردوو دەستیان پێکردوە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ﴾.

**٥و٦-** هەردووك سووڕەتی: **(الجمعة و التغابن)**یش بە کرداری داهاتوو: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾.

**٧-** ئەم سووڕەتە موبارەکەش بە کرداری فەرمان: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢﴾.

٢- تایبەتمەندیی دووەمی ئەم سووڕەتە، ئەم تەعبیرەیە: ﴿ فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴾، وەبیریان بخەوەو ئامۆژگارییان بکە، ئەگەر ئامۆژگاریی سوودی هەبوو، دوایی باسی دەکەین کە ئەوە مەبەست پێی چییە؟

٣- تایبەتمەندیی سێیەم، ئەو تەعبیرەیە: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ١٨ صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ١٩ ﴾الأعلى، کە تەنیا لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوە.

٤- تایبەتمەندیی چوارەم، وشەی: (غُثَآءً أَحۡوَىٰ)، (**غثاء**)، واتە: گیاو گۆڵ، کە دەبێتە پووش و پەڵاش و وشك دەبێ، (**أَحْوى**)، واتە: ڕەشداگەڕاو، ڕەشهەڵگەراو، ئەمیش تەنیا لێرەدا هاتوە.

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە کۆی نۆزدە (١٩) ئایەتەکان، کە شەش تەوەر دەگرنە خۆیان، دەکەینە یەك دەرس، لەبەر ئەوەی ئەو شەش تەوەرە هەموویان تێکهەڵکێشن، وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەست و جۆشدراون.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەر نۆزدە (١٩) ئایەتەکە دەگرێتەوە، ئایەتەکانی: (١ - ١٩)، پێشتریش باسمانکرد: لەو نۆزدە ئایەتەدا، خوای بەرزو مەزن شەش تەوەر دەخاتە ڕوو، کە پێشتریش قسەمان لێکردن و بە خێرایی باسیان دەکەینەوە:

١- فەرمانکردنی خوا ﷻ بە بەپاکگرتنی ناوی خواو ناساندنی خوا، لە میانی پێنج لە کارەکانیدا، لە پێنج ئایەتی سەرەتادا (١ - ٥).

٢- دڵنیاکردنەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە خوا قورئانی فێر دەکات و لە بیریشی ناچێتەوە، بۆ چاکەش، یان بۆ بەرنامەی ئاسانکراوی خواش، وەریدەچەرخێنێ و ئاسانی دەکات، ئەمیش لە هەر سێ ئایەتی: (٦، ٧، ٨)دا.

٣- فەرمانکردن بە پێغەمبەر ﷺ کە هەر کات زانی ئامۆژگاریی سوودی هەیە، ئامۆژگارییەکەی بکات و، بشزانێ هەرکەس سام و هەیبەتی خوای لە دڵ دابێ، بەهرەمەند دەبێ، بابای خراپەکاریش کە دووچاری ئاگری گەورەتری خوای دادگەر دەبێ، نە تێیدا دەژی، نە تێیدا دەمرێ، ئەمیش لە پێنج ئایەتەکانی: (٩ - ١٣)دا.

٤- ڕاگەیاندنی سەرفرازیی بابای خۆ تەزکیەکاری، ناوی خوای هێنەری، نوێژکەر، ئەمیش لە دوو ئایەتەکانی: (١٤، ١٥)دا.

٥- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا سبحانە و تعالی سەرزەنشتی مرۆڤەکان بە تایبەت دنیا ویستەکانیان دەکات، کە دنیا هەڵدەبژێرن، هەرچەندە دواڕۆژ باشترەو، بەردەوامیشە، لە هەردووك ئایەتی: (١٦ و ١٧)دا.

٦- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە ئەوەی گوترا -- بە تایبەت لە ئایەتەکانی کۆتاییدا -- لە نامە پێشووەکانی پەیامی پێغەمبەرانیشدا هاتوە، بە تایبەت نامەو پەیامی هەردوو

پێغەمبەری پایە بەرزی خوا: ئیبراهیم و مووسا سەلامی خوایان لەسەر بێ، لە هەردووك ئایەتی: (١٨ و ١٩)دا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٨﴾ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بەپاك بگرە ﴿١﴾ ئەو کەسەی دروستیکرد (هەموو شتێك)، ئنجا ڕێك و پێکی کرد ﴿٢﴾ ئەو کەسەش کە ئەندازەگیریی (هەموو شتێکی) کرد، ئنجا ڕێنمایی کرد ﴿٣﴾ ئەو کەسەش کە ڕووەك و لەوەڕگای دەرهێنا (لە زەوی) ﴿٤﴾ ئنجا کردیە پووش و پەڵاشێکی ڕەشهەڵگەڕاو ﴿٥﴾ (ئەی موحەممەد! ئەو قورئانەی بۆمان ناردووی) لەمەودوا پێت دەخوێنین، ئنجا لە بیریشت ناچێ ﴿٦﴾ مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، بێگومان ئەو ئاشکراو ئەوەی پەنهانیش دەبێ دەیزانێ ﴿٧﴾ ئاسانیشت دەکەین بۆ (گرتنی ئایینی) ئاسان ﴿٨﴾ لەمەودوا هەرکەس سام و هەیبەتی هەبێ (بەرانبەر بە خوا) پەند (لە بیرخستنەوەکەت) وەردەگرێ و دێتەوە یادی ﴿٩﴾ ئەو کەسەش کە ملهوڕو بێخێرە، خۆی لێ دوور دەگرێ

﴿١١﴾ ئەو کەسەی بە ئاگرە هەرە گەورەکە (ی خوا) سزا دەدرێ و (بە شێوەیەکی تایبەت) دەسووتێنرێ ﴿١٢﴾ دواییش نە تێیدا دەمرێ و نە دەشژی ﴿١٣﴾ بە دڵنیایی هەر کەس خۆی پاك و چاك کرد، سەرفرازو بە مراد گەیشتوویە ﴿١٤﴾ هەروەها (کەسێك) ناوی پەروەردگاری یادو باس کرد، ئنجا نوێژی کرد ﴿١٥﴾ بەڵکو (زۆربەتان) ژیانی نیزیکتر (ی دنیا) هەڵدەبژێرن ﴿١٦﴾ (مەنزڵگای) کۆتاییش باشترو بەردەوامترە ﴿١٧﴾ ئەمە لە پەڕاوە یەکەمەکاندا هەیە ﴿١٨﴾ پەڕاوەکانی ئیبراهیم و مووسا ﴿١٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(سَبِّحِ): بە پاك بگرە، (**السَّبْحُ: المَرُّ السَّريع فِي الماءِ أَوْ فِي الهَواء**)، (**سَبْح**): بریتیە لە ڕۆیشتنی خێرا بەنێو ئاودا یان بە هەوادا، بە کوردیی مەلەی پێ دەڵێن، مەلەکردن. (**والسَّبحُ: تَنْزيهُ الله**)، (**سَبْح**): بۆ بەپاکگرتنی خواش بەکاردەهێنرێ، (**وَالمَرُّ السَّريعُ فِي عِبادَةِ الله**)، ڕۆیشتنی خێرا لە بەندایەتییکردن بۆ خوادا.

(فَسَوَّىٰ): (**تَسْويَةُ الشَّيءِ: جَعلهُ سَواءً**)، (**تَسْوية**)ی شتێك بریتیە لە ڕێکخستنی و ڕێك و پێك کردنی.

(قَدَّرَ): (**القَدَرُ: التَّقْديرُ، تَبيينُ كَمِّيَّةِ الشَّيْءِ، قَدَّرْتُهُ وَقَدَرْتُهُ**)، واتە: (قَدَّرَ)، لە (**قَدَر**)وە هاتوە، (**تَقْدير**): بریتیە لە دیارییکردنی ئەندازەی شتێك، دەگوترێ: (**قَدَرْتُهُ**) و (**قَدَّرْتُهُ**): هەردووکیان بە یەك واتان، واتە: ئەندازەگیرییەکەیم، دیارییکرد، ئەندازەگیرییم کرد.

(الْمَرْعَىٰ): لە (**رعي**)یەوە هاتوە، (**الرَّعيُ: حِفْظُ الحَيْوانِ، إمَّا بِالغِذَاءِ الحَافِظِ لِحَياتِهِ، وَإمَّا بِذَبِّ العَدوِّ عَنْهُ**)، (**رَعي**): بریتیە لە پاراستنی ئاژەڵ، یان بەو خواردنەی ژیانی دەپارێزێ، یاخود بەوەی دوژمنی لێ دووربخرێتەوەو بپارێزرێ، (**المرعى: مَكَانُ الرَّعيِ**)، شوێنی تێدا لەوەڕان، شوێنێ کە ئاژەڵ لەوەڕی تێدا بخوات.

(غُثَآءً أَحۡوَىٰ): (الغثاءُ: غُثاءُ السَّيْلِ وَالقِدْرِ)، (غُثَاءْ): پووش و پەڵاش و کەف و کوڵ، چ ئەوەی لەسەر لافاوو لێزماو پەیدادەبێ، چ ئەوەی لەسەر مەنجەڵێك کە دەکوڵێنرێ، ئەو کەفەی دەکەوێتە سەری، پێی دەگوترێ: (غُثَاء).

(أَحۡوَىٰ): (الأَحْوَاءُ، أَي: شَديدُ السَّواد)، واتە: زۆر ڕەش، (والحُوَّةُ: شَديدةُ الخُضْرَة)، (حُوَّة)، واتە: زۆر سەوز، سەوزیش کە زۆر تۆخ بۆوە بە لای ڕەشییدا دەشکێتەوە.

(لِلۡيُسۡرَىٰ): (اليُسر: السَّهْلُ، واليُسْرُ، ضِدُّ العُسْرِ)، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ ﴾، واتە: تۆ ئاسان دەکەین بۆ گرتنی ڕێی ئاسان، کە ڕێی خوایە، ئنجا (لِلۡيُسۡرَىٰ): بە مانای ئاسان دێ، ئاسانیش (يُسْر) پێچەوانەی (عُسْر)ە، (يُسْر)، ئاسان و سێنا، (عُسْر)، واتە: زەحمەت و قورس.

(سَيَذَّكَّرُ): وەبیری دێتەوە، یاخود: پەند وەردەگرێ، (الذِّكْرَى: كَثْرَةُ الذِّكْرِ وَهوَ أَبْلَغُ مِنَ الذِّكْرِ)، (ذِكْرَى): بە مانای زۆر یادکردن، یاخود زۆر باسکردن، مانایەکەی بەهێزترە لە (ذِكْر)، (ذِكْر) یانی: یادکردن، باسکردن، بەڵام (ذِكْرَى)، واتە: زۆر یادکردن، یاخود زۆر باسکردن.

(ٱلۡأَشۡقَى): (أَشْقَى)، ڕێژگەی زێدەڕۆییە لە (شَقَاوَة)وە هاتوە، (الشَّقَاوَةُ: خِلَافُ السَّعَادَة)، واتە: بەدبەختیی، پێچەوانەی بەختەوەرییە، (ٱلۡأَشۡقَى): کەسێکی زۆر بەدبەخت و بێبەش، کە بۆ خۆی وای لە خۆی کردوە.

(تُؤۡثِرُونَ ): (أَيْ: تُفَضِّلونَ وَتَخْتَارون، وَالإِيْثَار هوَ: الإِخْتيارُ بَيْنَ مُتَعَدِّدٍ)، (تُؤْثِرُونَ) واتە: هەڵدەبژێرن، (إِيْثَار): بریتیە لە هەڵبژاردنی شتێك لە نێو چەند شتێکدا.

(صُحُفِ ): (الصُّحُفُ: جَمْعُ صَحِيفَة، وَهيَ المَبْسوطُ مِنَ الشَّيْءِ، وَالصَّحِيْفَةُ مَا يُكْتَبُ فِيْهَا، والجَمْعُ صُحُف وصَحَائِفْ)، (صُحُف) کۆی (صَحِيفَة)یە، ئەویش هەر شتێکە شتی تێدا بنووسرێ و، بڵاوبکرێتەوە، وشەی (صَحِيفَة) بە (صُحُف)و (صحائف)، کۆ دەکرێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

خوای بەرز لە سەرەتای ئەم سووڕەتەدا دەفەرموێ: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، وەك زۆرجار گوتوومانەو دووبارەی دەكەینەوە، هەر كاتێك مرۆڤ دەڵێ: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، ئنجا چ بۆ قورئانخوێندن بێ وەك ئێستا، چ بۆ هەر كارێكی دیكەی گرنگ، كە ناوی خوای لێ دێنێ، پێویستە بەلای كەمەوە چوار واتایان لە عەقڵ و دڵی خۆی دا ئامادە بكات:

١- ئەم كارە بەناوی خواوە ئەنجام دەدەم.

٢- ئەم كارە بە پێی بەرنامەی خوا، ئەنجام دەدەم.

٣- ئەم كارە بەمەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەم كارە بە هەوڵ و توانایەك كە خوا بۆی ڕەخساندووم، ئەنجام دەدەم.

**تەوەری یەكەم:** خوا سبحانە و تعالى فەرمان بە پێغەمبەرەكەی ﷺ دەكات: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴾، ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، بەبێ خەوش بگرە، دووری بخەوە لە هەر لەكەو هەڵەو پەڵەو كەم و كوورییەك، دوایی چەمكەكەی زیاتر ڕوون دەكەینەوە لەكاتی خستنەڕووی مەسەلە گرنگەكاندا، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا وشەی: (**إسم**)، تێخزێنراو (**مُقَحَّم**)ە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا ئاوایە: پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، بەڵام وێڕای ئەوەی بە پاكگرتنی پەروەردگار هەیە، بە پاكگرتنی ناوی پەروەردگاریش سبحانە و تعالى هەیە، بە پاكگرتنی ناوی پەروەردگاریش زۆر بوارو ڕەهەندی هەن:

١- یەكێك لە بوارو ڕەهەندە گرنگەكانی ئەوەیە، ناوی خوا لەگەڵ ناوەكانی جگە لە خوادا تێكەڵ نەكرێ.

٢- هیچ ناوێکی خوا بۆ جگە لە خوا بەکارنەهێنرێ.

٣- هیچ ناوێك بۆ خوا بەکارنەهێنرێ، ئەگەر خوا بۆ خۆی یان پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆی بەکارنەهێنابێ.

٤- هەروەها ناوی خوای پەروەردگار پێویستە بە ڕێزو بە حورمەتەوە بهێنرێ.

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴾، (ئەو پەروەردگارە هەرە بەرزەت) کە هێناویەتە دی و ڕێك و پێکی کردوە، ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴾، یانی: (**خَلَقَ الخَلْقَ**)، ﴿ فَسَوَّىٰ ﴾، یانی: (**فَسَوّاهُ**)، ئەو پەروەردگارە هەرە بەرزەت کە هەموو دروستکراوەکانی هێناونە دی و پەیدای کردوون، ﴿ فَسَوَّىٰ ﴾ ڕێکیخستوون و ڕێك و پێکی کردوون، بۆیەش بەرکاری (**خَلَقَ**) و (**سَوَّى**) قرتێنراون، چونکە بە سیاق و سەلیقە دیارە، کە مەبەست پێیان هەموو شتێکە، خوا هەموو شتێکی خوڵقاندوە، هەموو شتێکیشی ڕێك و پێك کردوەو ڕێکیخستوە، ﴿ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴾، لێرەش دیسان بەرکاری ﴿ قَدَّرَ ﴾ و بەرکاری ﴿ فَهَدَىٰ ﴾، هەردووکیان قرتێنراون، ﴿ وَٱلَّذِى قَدَّرَ ﴾، ئەو پەروەردگارە هەرە بەرزەت کە هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردوە، (**قَدَّر كُلَّ شَيءٍ**)، ﴿ فَهَدَىٰ ﴾، ئنجا هەموو شتێکیشی ڕێنمایی کردوە (**فَهَدى كُلَّ شَيء**).

﴿ وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ﴾، ئەمە سیفەتی پێنجەمی پەروەردگاری هەرە بەرزە، یان کاری پێنجەمیەتی، ئەو زاتەی لەوەڕگای دەرهێناوە، بێگومان لەوەڕگای لە زەوی دەرهێناوە، ﴿ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ ﴾، دوایی گێڕاویەتی بە پووش و پەڵاشێکی ڕەشهەڵگەڕاو، یاخود: گێڕاویەتی بە پووش پەڵاشێکی سەوزی تۆخ، بەڵام زیاتر مەبەست پێی ڕەشهەڵگەڕاوو ڕەشداگەڕاوە.

ئەمە تەوەری یەکەم کە لەم پێنج ئایەتە موبارەکەدا خراوەتە ڕوو، کە بریتیە لە فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺو، بە هەر کەسێك لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ دەڕوات، ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزی بە پاك بگرێ، کە ئەو پێنج کارەی ئەنجامداون:

١- هەموو شتێکی هێناوەتە دی.

٢- هەموو شتێکی ڕێکخستوە.

٣- هەموو شتێکیشی ئەندازەگیریی کردوە.

٤- هەموو شتێکیشی ڕێنمایی کردوە.

٥- لەوەڕگای لە زەوی دەرهێناوەو واشی لێکردوە، ڕەشهەڵگەڕێ دوای ئەوەی وشك دەبێ.

**تەوەری دووەم:** ﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾، ئێمە لەمەودوا بە تۆ دەخوێنین (واتە: قورئانت پێ دەخوێنین، قورئانت فێر دەکەین)، لە بیریشت ناچێ، پێغەمبەری خوا ﷺ وەك لە سووڕەتی **(القيامة)**شدا باسمان کردو، لە تەفسیری سووڕەتی **(طه)**شدا، جاری وا هەبووە پەلەی کردوە کە قورئانی بۆ دابەزیوە، زوو گوتوویەتەوە، نیگەرانی ئەوە بووە نەوەك وشەیەکی لە بیر بچێ.

لێرەدا خوا سبحانه و تعالى، دڵنیای دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ سَنُقۡرِئُكَ ﴾، قورئان بە تۆ دەخوێنین، ﴿ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾، لە بیریشت ناچێ، ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ ﴾، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، ئەمە وەك زۆر لە ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە، تەنیا بۆ دەرخستنی ڕەهایی ویستی خوای باڵا دەستە، ویستی خوای بەرزو مەزن هیچ کۆت و بەندێکی لەسەر نیە، یاسایەکانی خوا **(سنن الله)** نابنە پەرچ و کۆسپ لە بەردەم ویستی ڕەهای خوای تاك و پاك دا، خوا ﷻ خۆی یاسایەکانی داناون و، هەر کاتێك ویستیشی ئەو یاسایانە لادەباو، بە پێی یاسایەکی دیکە، مامەڵە دەکات، چونکە هیچ شتێکی خوا ﷻ گۆترەکاریی و بێ یاسایی نیە.

﴿ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ ﴾، بە دڵنیایی خوا ئاشکرا دەزانێ، ﴿ وَمَا يَخۡفَىٰ ﴾، هەروەها ئەوەش کە پەنهانیش دەبێ، ئەوەی دەشاردرێتەوە، ئەوەش دەزانێ، ﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ ﴾، تۆش ئاسان دەکەین بۆ ڕێی ئاسان، ڕێی ئاسانیش بریتیە لە کۆتا پەیامی خوای پەروەردگار، هەموو پەیام و بەرنامەکانی خوا، ئاسان بوون، بە تایبەت دوا پەیامی خوا، کە بۆ کۆی مرۆڤایەتیی ناردوە، نەك وەك کاردانەوەی هەندێك بارودۆخی تایبەت، وەك خوا

سبحانه و تعالى ئینجیلی ناردبوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەندێك لەو سزایانەو، لابردنی هەندێك یاسا كە خوا بەسەر گەلی جوولەكەدا سەپاند بوونی، لەسەر زێدەڕۆیی و تاوان و لادانیان، ئیسلام وەك حاڵەتی كاردانەوە نەهاتوە، بەڵكو وەك بەرنامەیەكی گشتیی هاتوە، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی.

**تەوەری سێیەم:** ئەمیشیان لە پێنج ئایەت: (٩ - ١٣) پێك دێ: ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، ئەگەر بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی كردن، سوودی هەبوو، ئامۆژگاریی بكەو بیریان بخەوە، دوایی ئەوە زیاتر ڕوون دەكەینەوە: ئەگەر سوودی هەبوو، یانی چی؟ یەكێك لە واتایەكانی ئەوەیە كە ئەگەر بزانی قسەكەت جێناگرێ، مەیكە، پێشینان گوتوویانە: (قسە بكە، جێ بگرێ، ڕبە بپێوە سەر بگرێ)!

قسەیەك كە بزانێ جێ ناگرێ، نەیكەی باشە، ئامۆژگاریی كردنێك بزانی شوێنی خۆی نیەو كاتی خۆی نیەو گونجاو نیە، نەیكەی باشە، بۆ ئەوەی قسەكەت خەسار نەبێ، ﴿ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴾، بە دڵنیایی هەر كەس ترس و سام و هەیبەتی (خوای) لە دڵدا هەبێ، پەندو ئامۆژگاریی وەردەگرێ، ﴿ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴾، كەسێكیش زۆر بەدبەختە، ئەو كەسەی زۆر خراپەكارو تاوانبارە، خۆی لێ بەدوور دەگرێ، ﴿ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴾، ئەو كەسەی سزا دەدرێ بە ئاگری هەرە گەورە، ﴿ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا ﴾، دواییش نەتێیدا دەمرێ، دەربازی بێ، ﴿ وَلَا يَحْيَىٰ ﴾، نە تێشیدا دەژی، ژیانێك پێی بگوترێ: ژیان.

**تەوەری چوارەم:** ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴾، بە دڵنیایی كەسێك خۆی پاك و چاك كردوە، سەرفرازە، ﴿ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴾ هەروەها كەسێكیش كە ناوی پەروەردگاری خۆی هێناوە، نوێژی كردوە.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ ﴾، مەبەست پێی: (**ألله أكبر**)ی نوێژی دابەستنە، ﴿ فَصَلَّىٰ ﴾، ئنجا نوێژی كردوە، گرنگ ئەوەیە خوای پەروەردگار ئەو سێیەی پێكەوە هێناون و، سەرفرازیی و بردنەوەی كردۆتە بەرهەمی ئەو سێیانە:

**یەکەم:** خۆ پاك و چاككردن.

**دووەم:** ناوی پەروەردگار هێنان.

**سێیەم:** نوێژ كردن.

**تـەوەری پێنجـەم:** ﴿ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴾، ﴿ بَلْ تُؤْثِرُونَ ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (بَـلْ يُؤْثِـرُونَ)، بەڵكـو ئەوانـە ژیانـی نیزیكـتر (دنیـا) هەڵدەبژێـرن، ﴿ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴾، لـە حاڵێكـدا قۆناغـی كۆتایـی، یانـی: (**المَنْزِلَـةُ الآخِـرَة، الحَيَـاةُ الآخِـرَة**)، مەنزڵـگای كۆتایـی، ژیانـی كۆتایـی باشتریشـەو زیاتریـش دەمێنێتـەوە، كەچـی ئـەوان ژیانـی دنیـا هەڵدەبژێـرن، لەبـەر ئـەوەی ئێسـتا لەبەردەسـتە.

**تـەوەری شەشـەم و كۆتایـی:** ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ ﴾، زۆرێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: ئەمـە (**هـذا**) دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەم چەند ئایەتە: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ ﴾، ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەمـە لـە پـەڕە پێشووەكانیشـدا هەیـە، واتـە: لـەو پەیـام و بەرنامانـەدا كـە خوا پێشتر ناردوونـی، بـۆ نموونـە: ﴿ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴾، نامـەو بەرنامەكانـی، پەڕاوەكانـی ئیبراهیـم عليه السلام (**خَليـلُ اللـه**) و مووسـا (**كَليـمُ اللـه**)، صـەڵات و سـەڵامی خـوا لەسـەر هەردووكیـان بـێ، واتـە: ئـەوەی باسـكرا لـە بەرنامـەی ئـەو دوو پێغەمبەرەشـدا صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ، هەبـووە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزی بە پاك بگرێ، کە هەموو شتێکی دروستکردوەو ڕێك و پێك کردوە، هەروەها هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردوەو، ڕێنمایی کردوە، گیاو گۆڵ و لەوەڕگاشی دەرهێناوەو، گێڕاویەتی بە پووش و پەڵاشێکی وشکی ڕەشهەڵگەڕاو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾﴾

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا

١)- ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾، ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بەپاك بگرە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ٱلْأَعْلَى﴾، دەچێتەوە بۆ (إِسْم)، واتە: ناوی هەرە بەرزی پەروەردگارت بە پاك بگرە، بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە کە: ﴿ٱلْأَعْلَى﴾، سیفەتی (رَبّ)ە، واتە: ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، بێخەوش تەماشای بکە، ناوی پەروەردگارت دوور بخەوە لە هەر لەکەو پەڵەو کەم و کووڕییەك، (**التّسبيحُ: التَّنْزيهُ عَنِ النَّقَائِصِ وَهوَ مِنَ الأَسْماءِ الَّتي لاتُضافُ لِغَيْرِ اسْمِ اللهِ تَعَالى**)، وشەی: (تَسْبيح)، ڕیشە زمانەوانییەکەی بە مانای: (**المَرُّ السَّريعُ في المَاءِ أَوِ الهَواء**)، ڕۆیشتنی خێرا بە نێو ئاوو، بە نێو هەوادا، واتە: مەلەکردن، بەڵام وشەی: (تَسْبيح)، بە پاکگرتن لە کەم و کووڕییان لەو ناوانەیە کە تەنیا پاڵ دەدرێتە لای ناوی خوای بەرز سبحانە و تعالی، واتە: بۆ جگە لە خوا سبحانە و تعالی ئەو ناوە بەکار نایەت، (**الطبري**) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، ئەم ئایەتە موبارەکە ئاوا مانا دەکات و دەڵێ: (**نَزِّه اسْمَ رَبِّكَ أَنْ تَدْعُوَ بِهِ الآلِهَةَ وَالأَوْثَان**)، ناوی پەروەردگارت

دوور بخەوە و بەپاکی بگرە لەوەی پەرستراوەکان و بتەکانی پێ بانگ بکەی، واتە: ناوی پەروەردگارت بۆ جگە لە پەروەردگارت بەکار مەهێنە.

{**عَن ابْنِ عُمَر رضي الله عنه، أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ سَبِّحِ اسْمِ رَبِّكَ الأَعْلى، فَيَقولُ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلى} الطبري:** (٣٧٠٨٣)، واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە خوا لێیان ڕازیبێ، هاتوە، کاتێك ئەمەی دەخوێندەوە: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾، دوای ئەوەی یەکسەر دەیگوت: (**سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى**)، وەك جێبەجێکردنی فەرمانی خوا.

هەروەها (**الطبري**)، لە قەتادەوە کە یەکێکە لە زانایانی جیلی دوای هاوەڵان، واتە: شوێنکەوتووان (تابعین) هێناویەتی، گوتوویەتی: (**ذُكِرَ لَنَا أَنَّ نَبِيَّ اللهِ ﷺ كَانَ إِذا قَرَأَها، قال: سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلى**) (جامع البيان: ٣٧٠٨٦).

قەتادە گوتوویەتی: بۆمان باسکراوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە، دەیفەرموو: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلى**)، پاکیی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرز.

ئنجا خوا سبحانه و تعالی پێناسەی خۆی دەکات بە پێنج سیفەتی بەرزو ناوازە:

**٢)-** ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾، ئەو کەسەی هەموو شتێکی هێناوەتە دی، ئنجا ڕێکیخستوە، ﴿خَلَقَ﴾، بەرکارەکەی دیار نیە، ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ﴾، یانی: (**خَلَقَ الخَلْقَ**) یان (**خَلَقَ الأَشْياءَ**) یان (**خَلَقَ المَوجودات**)، ئەو زاتەی هەموو شتێکی هێناوەتە دی.

﴿فَسَوَّىٰ﴾، ڕێکیخستوەو ڕێك و پێکی کردوەو سیستماتیکی کردوە، (**الطبري**)، دەڵێ: (**الَّذي خَلَقَ الأَشْياءَ فَسَوّى خَلْقَها وَعَدَّلَها، وَالتَّسْوِيَةُ: التَّعديلُ**)، ئەو زاتەی هەموو شتەکانی هێناونەدی و ڕێکیخستوون، (دروستکرانیانی ڕێك و پێك کردوە)و، هاوسەنگی کردوون، (**التسوية**)، یانی: (**التَّعديل**)، هاوسەنگکردن و ڕێك و پێك کردن.

ئەوانە سیفەتی یەکەم و دووەم بوون، ئنجا سیفەتەکانی سێیەم و چوارەم دەخاتە ڕوو:

**٣)-** ﴿وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾، هەروەها کەسێکیش کە ئەندازەگیریی (هەموو شتێکی) کردوە، ئنجا ڕێنمایی (هەموو شتێکیشی) کردوە، (وَٱلَّذِي قَدَّرَ) ئەو زاتەی هەموو شتێکی

ئەندازەگیریی کردوە، خوێندراویشەتەوە: (قَدَرَ)، (قَدَرَ) و (قَدَّرَ)ش، یانی: دیارییکردنی ئەندازەو قەبارەو چۆنیەتیی و چەندێتیی شتێك.

﴿ فَهَدَىٰ ﴾، هەموو شتێکیشی ڕێنمایی کردوە، ڕێی پیشانداوە، خستوویەتە سەر ئەو ڕێیەی پێیدا بڕواو، ئەو ئەرك و کارەی بۆی دیارییکردوە، بەو شێوەیە ئەنجامی بدات، کە کەم و کووڕیی تێدا نەبێ، (**التَّقْديرُ: وَضْعُ المِقْدارِ وَإِيجادُهُ فِي الأَشْياءِ فِي ذَوَاتِهَا وَقِواهَا**) (**تقدير**)، بریتیە لە دانانی ئەندازەی شتێك و پەیداکردنی ئەندازە لە شتەکاندا، هەم لە خودیان دا، هەم لە هێزە پەنهانەکانیاندا، کە دەفەرموێ: (**فَهَدى**)، (**أَي: هَدى كُلَّ ما قُدِّرَ إِلى مَاقُدِّرَ لَهُ**)، هەر ئەندازەگیرییکراوێکی ڕێنمایی کردوە، بۆ ئەوەی بۆی ئەندازەگیریی کراوە، یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێ: (**قَدَّرَ الأَشْياءَ كُلَّهَا فَهَداهَا إِلى أَداءِ وَظَائِفها**)، هەموو شتەکانی ئەندازەگیریی کردوون، ڕێنمایی کردوون، بۆ ئەوەی ئەرکەکانی خۆیان بەو شێوەیەی خوا بۆی داناون، جێبەجێ بکەن.

ئنجا سیفەتی پێنجەم دەخاتەڕوو:

٤)- ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ ﴾، ئەو کەسەی لەوەڕگای (لە زەوی) دەرهێناوە، (**المَرْعى: النَّبْتُ الَّذي تَرْعَاهُ السَّوائِمُ، وأَصْلُهُ إِمَّا مَصْدَرٌ ميمي، أَوْ اسمُ مَكانِ الرَّعْي**)، ﴿ ٱلۡمَرۡعَىٰ ﴾، بریتیە لەو ڕووەکەی ئاژەڵ دەیخۆن، ﴿ ٱلۡمَرۡعَىٰ ﴾ش، یان چاوگێکی میمییە، یاخود ناوی شوێنی تێدا لەوەڕانە، لەوەڕگا، ﴿ ٱلۡمَرۡعَىٰ ﴾، بە کوردیی هەر دەڵێین: لەوەڕگا، زۆرجاریش مەرعا (**مَرعى**) بەکاردەهێنرێ، بە تایبەت ئەو شوێنەی ماڵات و ئاژەڵ تێیدا دەلەوەڕێ.

ئەمانە پێنج سیفەت بوون کە خوا خۆی پێ وەسف و پێناسە کردوون.

٥)- ﴿ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ﴾، ئنجا گێڕاویەتی بە پووش و پەلاشێکی ڕەشهەڵگەڕاو، (**الغُثاءُ: اليابِس مِنَ النَّبَاتِ، وَالأَحْوَى: المَوصُوفُ بالحُوَّةِ وَهِي مِنَ الأَلْوانِ سَمُرَةٌ تَقْربُ إِلى السَّواد**)، (**غُثاءْ**): ڕووەکی وشك هەڵگەڕاوە، (**أَحْوى**)ش واتە: ئەوەی وەسف دەکرێ بە (**حُوَّة**)، ئەویش لە ڕەنگاندا جۆرێکە مەیلەو بۆرەو لە ڕەشیی نیزیك دەبێتەوە، لێرەدا خوا سبحانه و تعالى خۆی بەو پێنج سیفەتە دەناسێنێ و، پێشتریش فەرموویەتی: ناوی

پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، یانی: ئەو پەروەردگارەت كە ئەوانە كارەكانێی:

١- هەموو شتێكی هێناوەتە دی.

٢- هەموو شتێكی ڕێك و پێك كردوە.

٣- هەموو شتێكی ئەندازەگیریی كردوە.

٤- ڕێی بە هەموو شتێك نیشان داوە چۆن بەڕێوەبچێ؟

٥- لە نێو شتەكانیش دا باسی لەوەڕگا دەكات و، دەفەرموێ: لەوەڕگای هێناوەتە دەرێ، دواییش گێڕاویەتی بە پووش و پەڵاشێكی ڕەشداگەڕاو.

زانایان لەو بارەوە كە ئایا خوا سبحانه و تعالى مەبەستی چی بووە، كە لە نێو هەموو دروستكراوەكاندا بە تایبەت باسی لەوەڕگا دەكات، دواییش دەفەرموێ: لەوەڕگایەكەش دوای ئەوەی دەری هێناوە، گێڕاویەتی بە پووش و پەڵاشێكی وشكی ڕەشهەڵگەڕاو و ڕەشداگەڕاو؟:

١- هەندێك گوتوویانە: مەبەست لێرەدا ئەوەیە خوا ژیانی دنیامان دەخاتەوە یاد، كە ژیانی دنیای ئێوەش، وەك ئەو گژوگیاو پاوان و لەوەڕگایە وایە، سەرەتا سەر دەردێنێ، دوایی پێدەگات و هەراش دەبێ، دواییش لە سەوزییان ڕەش هەڵدەگەڕێ، بەڵام دوایی دەبێتە پووش و پەڵاش و وشك دەبێ و كۆتایی دێ، ژیانی ئێوەش بەو شێوەیەو ئاگاتان لە خۆتان بێ، ئێوە بۆ ئەم سەر زەوییە دروست نەكراون، بەڵكو لێرەدا دانراون بۆ تاقیكردنەوە.

٢- هەندێكیش گوتوویانە: خوا سبحانه و تعالى دەیەوێ ئەو گۆڕانكارییەمان تێ بگەیەنێ كە بەسەر ڕووەك و دارو درەخت و گژوگیاو لەوەڕو زەمەندی دا هێناوەو، كردوویەتی بە خەڵووزی بەرد، بەڵكو هەندێك لە زانایانی جیۆلۆجیا دەڵێن: نەوت و غازیش هەر دەگەڕێنەوە بۆ ئەو دارو درەخت و ڕووەكانەی، كاتی خۆی ملیۆنان ساڵ لەمەو پێش بوون، بەر لەوەی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی دروست بێ، چەندان گۆڕانكاریی بەسەر

ئەم زەوییەدا هاتوون، لەوەڕگاو دارستان و ئاژەڵی گەورە گەورەی، وەك دیناصۆرەکان بوون، دوایی گۆڕانکاریی بەسەر زەویدا هاتوەو، ئەوانە کەوتوونە بن زەوی، سەرەنجام کارلێکی کیمیایی لە جەستەیاندا بووەو، بوون بەو نەوت و گازو خەڵووزی بەردو ... هتدەی ئێستا لێیان بەهرەمەندین.

هەرچۆن بێ، بۆ ئێمە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، چ مەبەست پێی ئەوەی ڕابردوو بێ، یاخود مەبەست پێی ئێستاش بێ، دارو درەخت و گژو گیاو لەوەڕو پاوان و لەوەڕگا، دوای ئەوەی وشك دەبن، ڕەش هەڵدەگەڕێن و، جارێکی دیکە دەبنەوە پەین بۆ زەوی، زەوی بەپیزو بەهێز دەکەنەوەو، ساڵێکی دیکە، دووبارە سەوز دەبنەوە.

## کورتە باسێک لە بارەی
## ڕێک و پێکیی و ڕێنمایی خواوە لە دروستکراوەکانیدا

بە باشی دەزانم لێرەدا کورتە باسێك لە بارەی ڕێك و پێكیی و ڕێنمایی خوای پەروەردگارەوە لە دروستكراوەكانیدا بخەمە ڕوو[1].

لە دە (١٠) خاڵ دا ئەم کورتە باسە دەخەینەڕوو، بە شێوازی خۆم ئەو قسانە دەخەمە ڕوو، هەندێكیان زیاتر تیشكیان دەخەمە سەرو، هەندێكیشیان كورت دەكەمەوەو، هەندێكیشیان شی دەكەمەوە.

خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣﴾، ئەو پەروەردگارەت کە هەموو شتێکی هێناوەتە دی، ڕێك و پێكی كردوە، هەموو شتێكی ئەندازەگیریی كردوەو ڕێنمایی كردوە.

با بزانین ئەو ڕێك و پێكییەی خوا لە دروستكراوەكانیدا دایناوە، ئەو ئەندازەگیرییەی دایناوە، ئەو ڕێنماییەی بۆی داناون، چییەو چۆنە؟ لە دە (١٠) نموونەدا، چەمكی ئەوەی گوتمان دەخەینەڕوو:

**یەكەم:** گڵ (**تراب**) دوای ئەوەی بەهۆی ئاوەوە دەتوێتەوەو شیی دەبێتەوە، ئەو هەموو ڕووەكە جۆراوجۆرانە لەو گڵە دێنە دەرێ، ئایا ئەگەر هەندێك ئاو بێنین، شەكرو خوێ و ماددەیەكی صابوونیی و ماددەیەكی لیمۆیی و ...هتدی، تێبكەین، دوایی هەندێك لە دەزوولەی موویی بێنین، هەندێك بۆڕی گچكەی وەك دەزوولە، ئایا دەگونجێ ئەو دەزوولانە یەكێكیان تەنیا خوێیەكە بمژێ و، یەكێكیان تەنیا شەكرەكەو، ئەوی دیكە تەنیا ئاوە لیمۆییەكە؟ نەخێر بێگومان ئەوە موستەحیلە، بەڵكو ئەو بۆڕیچكانە ئاوەكە

---

(١) ئەم كورتە باسە لەبەر ڕۆشنایی هەندێك لە قسەكانی دكتۆر (محمد راتب النابلسي)، لە تەفسیرەكەی (تفسير النابلسي)، بەرگی (١٠)، لاپەڕە: (٣١٧ - ٣١٨)دا، دەخەینەڕوو.

هەمووی دەمژن بەیەکسانیی، چونکە بۆڕییەکان نازانن ئەو ئاوە چۆنەو ئەو تامە چییە؟ بەڵکو ئەو تامانەی لەنێو ئاوەکەدان هەموویان بە یەکسانیی دەیانمژن، بەڵام بەپێی سیستمی خوای کاربەجێ لە یەك زەویدا هەمووی وەك یەکە، سێو دەڕوێ، بەهێ دەڕوێ، خۆخ دەڕوێ، ترێ، زۆرجارانیش جگە لەوانە، تەڕەکارو شووتیی و کاڵەك و خەیارو ترۆزیی، هەروەها جگە لەوانەش جاری وا هەیە، جۆرەکانی سەوزە: کەوەر، توور، کەرەوز، پیاز، سیر، دیسان جگە لەوانەش: دانەوێڵە، گەنم، جۆ، نۆك، نیسك، هەرزن، ئایا چۆنە سەرجەم ئەو شتە جۆراو جۆرانە لە یەك گڵی وەك یەکدا دەڕوێن و، هەر کامێکیشیان بەرەکەی و میوەکەی، تامێکەو ڕەنگێکەو بۆنێکەو شێوەیەکە؟ وەك خوا سبحانە و تعالی لە سووڕەتی **(الرعد)**دا کە کاتی خۆی تەفسیرمان کردوە، دەفەرموێ: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٤ ﴾، واتە: لە زەوی چەند پارچە زەوییەکی بەسەر یەکەوە هەن، هەروەها چەند باخێك لە ترێیەکان و کشت و کاڵەکان و درەختی خورمای یەك بنکی دوو قەدو یەك قەد بە یەك جۆرە ئاو، ئاودەدرێ، بەڵام هەندێکی بەسەر هەندێکیدا (لە تام و بۆن و خۆشییدا) هەڵدەبژێرین، بەڕاستیی لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بفامن.

ئنجا ئایا ئەوە چۆن ڕوودەدا؟ لە وەڵام دا دەڵێین: خوا ﷻ لە نێو ڕەگە وردەکانی ئەو ڕووەکانەدا، واتە: ئەو دەزوولانەی لە نێو ڕەگەکاندان و خواردنەکان دەمژن، سیستم **(نظام)**ێکی وای داناوە: یەکێکیان (پۆتاس) بمژێ و، ئەوی دیکە (ئاسن) و، ئەوی دیکە (فۆسفۆر)و، ئەوی دیکە (کالیسیۆم)، ئەوی دیکە ... هتد، هەر کام لەو توخمانەش یەکێکیان بەو ئەندازەیەو، یەکێکی دیکە بەو ئەندازەیە، بەڵام مرۆڤ ناتوانێ شتی وا بکات و، ئەوە تەنیا بە خوا دەکرێ.

ئەوە نموونەی یەکەم، بۆ ئەوە کە خوا ﷻ هەرچی دروستیکردوە، ڕێکیشیخستوەو، هەرچی ئەندازەگیرییشی کردوە، فێریشی کردوە چۆن بەڕێوەبچێ؟!

**دووەم:** ماسیی سەلەموون جۆرە ماسییەکی تایبەتە، کە لە سەرچاوەی ڕووبارەکانی ئەمریکاوە دێ، دوایی کۆچ دەکات، هەتا نێوەڕاستی ئۆقیانووسی ئەتڵەسیی و لەوێدا دەمرێ، ئنجا ئایا بەچکەکانی چۆن جارێکی دیکە لەوێوە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتوون، ئەو ڕووبارانەی کاتی خۆی باب و دایکیان، لێیانەوە هاتوون؟ ئەو بەچکانە کە لە نێوەڕاستی زەریای ئەتڵەسییدا، وەك گەرایەك دایکیان دایاندەنێ، دەچنەوە بۆ ئەوێ، دوایی کە لەوێدا گەورە دەبن و گەشە دەکەن، جارێکی دیکە دێنەوە بۆ ئەو شوێنەو، دووبارە گەرایەکانیان دادەنێن و، کە گەورە بوون دەچنەوە بۆ ئەوێ، جاری وا هەیە سەدان، بەڵکو هەزاران کیلۆمەتریان بەینە!!

**سێیەم:** هەندێك لە باڵندەکانیش جاری وا هەیە نشینگەیان شوێنێکی تایبەتە، بەڵام دەچن لە شوێنێکی دیکەی دوور، هێلانە دەکەن و هێلکانیان تێدا دەکەن و، دەترووکێن و دەبنە بەچکەو هەراشیان دەکەن، زۆرێك لە باڵندەکاندا گەرمێن و کوێستان دەکەن، بۆ وێنە: پەڕەسێلکەو حاجی لەق لەق و، قازو قورینگ، لە وڵاتی خۆماندا هەن، ئەو باڵندانە گەرمیان و کوێستان دەکەن، لە شوێنێك کە لێین، دوای ئەوەی کەشی ساڵ گەرم دەبێ، دەچن بۆ کوێستان و، کە ئەوێش زۆر سارد دەبێ، دێنەوە بۆ گەرمێن، زۆرجارانیش ئەو بەچکانەی دایاندەنێن، بۆ وێنە: حاجی لەق لەق، دوای ئەوەی بەچکەکانی باڵە فڕەدەبن و گەورە دەبن و پێدەگەن، لەگەڵ خۆیان دەیانبەن بۆ ئەو شوێنەی دیکە، جاری وا هەیە هەندێ لەو باڵندانە بە چکەکانیان لە شوێنێك دادەنێن، کە ئەو بەچکانە بە ژیانیان شوێنی دایك و بابیان نەبینیوە، کەچی دوایی کە گەورە دەبن، دەچنەوە بۆ ئەوێ! چونکە خوا سبحانە و تعالی هەرچی دروستیکردوە، ڕێك و پێکی کردوەو، هەرچی ئەندازەگیریی کردوە، ڕێشی پێشانداوە.

**چوارەم:** هەنگ: ئەگەر تەماشای مێشەنگوینە بکەین، وەك لە تەفسیری سوورەتی (النحل) دا کورتە باسێکمان لە بارەی هەنگ و هەنگوینەوە کردوە، ئەوەی زۆر سەرنجڕاکێشە، لە ژیانی هەنگدا ئەوەیە خانووەکەی کە دروستی دەکات خانەکان (کەلووەکان)ی، شەش پاڵوویین، نە چوار گۆشەن، نە سێگۆشەن، نە بازنەیین، نە لاکێشەن، بەڵکو شەش

پاڵووین، شەش گۆشەن، ئەوەش وایکردوە کە هەنگ بە ئەندازەیەکی زۆر کەمیش لەو پانتاییەی ماڵەکەی لێ دروست دەکات، لێی خەسار نەبێ و، ئەگەر سێگۆشە یان بازنەیی یان لاکێشەیی یان چوار گۆشە بوونایە، ئەندازەیەکی لێ خەسار دەبوو، بەڵام بە شێوەی شەش گۆشە، هیچی لێ خەسار نابێ و هەمووشیان دەکەونە پاڵ یەك، ژیانی هەنگ پێویست بەوە دەکات کتێبی تایبەتی لەسەر دابنرێ:

**١-** ژمارەیەك لە هەنگەکان بەس پاسەوانی دەرگان.

**٢-** هەندێکیان دەفڕن و دێن و دەچن، بۆ ئەوەی سەرماو گەرمای ژوورەکە لە یەك ئاستدا ڕابگرن، چونکە ئەو گەرایەی دایانناوە، ئەگەر هەوایەکە گەرمتر، یان ساردتربێ، دەمرن.

**٣-** هەندێکیان تەنیا کاریان ئێشکچێتییەو ئەگەر دوژمنێك، ناحەزێك بێتە کولانەکەیانەوە، ڕێی لێدەگرن، بگرە ئەگەر ڕێیان بۆ نەگیرا خۆشیان بە کوشت دەدەن و دوای ئەوەی ناحەزێك دەچێتە نێو کولانەکەیانەوە، ئەگەر مشك یان مار بێ، یان هەر شتێك بێ، زۆر پێوەی دەدەن هەتا هەموویان دەمرن، دوایی دەورەکەی بە مێو دەتەنن، بۆ ئەوەی بۆن و پیسیی لاشەی ئەو ئاژەڵە زیان بە گەرایەکان و هەنگوینەکەشیان نەگەیەنێ.

**پێنجەم:** باڵندەیەك لە ناوچەی خۆشمان هەیە پێی دەڵێن: (کەندەسمە)، یاخود: دارکۆڵە (**نَقَّارُ الخَشَب**)، جۆرێکی هەیە تەنیا لەسەر درەختی سنەوبەر و ئەو کرمەی لە نێو درەختی سنەوبەردا هەیە دەژی، جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا ﷻ دەندووکێکی بۆ خوڵقاندوە، دەوری دوازدە (١٢ سم) درێژە، هەر کاتێك ویستی ئەو کرمە بخوات، لەسەر قەدی ئەو درەختە ڕادەوەستێ و بەو دەندووکەی کونی دەکات، هەتا دەگاتە سەر ئەو کرمەی لەنێو هەناوو جەرگەی ئەو درەختەدا هەیە، دەڵێی تیشکی لێزەری پێیە، یان تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، یاخود ژێر سووری پێیە، کە شوێنی ئەو کرمە بزانێ، بەڵام خوا ڕێنمایی کردوەو، کە دروستیکردوە، ئەندازەگیرییشی کردوە، چۆن بژی؟.

**شەشەم:** مار لە تاریکایی زۆر ئەنگوستەچاودا دەتوانێ مشك بدۆزێتەوەو بیخوات! جارێك بۆ تاقیکردنەوە مارێکیان هێناوە مێویان لەسەر چاوەکانی داناوەو چاوەکانیان نوساندوون

و لە ژوورێکی تاریکدا دایانناوە، مشکێکیشیان لەوێ داناوە، بەڵام ڕێك چووە مشکەکەی خواردوە، دوایی تەماشایان کردوە دووچاڵی گچکە هەن لەسەریداو بەهۆی تیشکی ژێر سوورەوە شتەکان دەبینێ، دوایی کە هاتوون ئەو دوو چاڵە گچکەیان کە تیشکی ژێر سووریان لێوە دەردەچێ، گرتوویانن، ئنجا نەیتوانیوە نێچیرەکەی خۆی بدۆزێتەوە.

**حەوتەم:** جۆرێك لە زەردەواڵە و ژەنگەسووره هەیە، چاڵێك لە زەویدا لێدەدا، دوایی قالۆنچەیەك دەگرێ، لە شوێنێکی تایبەتدا، جۆرێك لە ژەهری خۆی تێدا دادەنێ بێهۆش (تَخدیر)ی دەکات، واتە: ئەوە نیە یەکجاریی بیکوژێ، بەڵکو بێهۆشی دەکات، تاکو بەچکەکانی کە لە دایك دەبن و دێنە دەرێ، یەکسەر خواردنێکی تەڕو تازەیان لەبەردەست دابێ، لاشەی ئەو قالۆنچەیە تەڕو تازەبێ، چونکە ئەگەر بمرێ، وشك هەڵدەگەڕێ، بەڵام هەر بە تەڕو تازەیی دەمێنێتەوە، چونکە جۆرێك لە بەنجی دەکات.

**هەشتەم:** حەیمەنی پیاو، ژیانداری تۆویی، وەك پێشتریش باسمان کرد، دوای ئەوەی لەگەڵ هێلکۆڵەی نێو ئاوی ئافرەتدا یەك دەگرن، سەرەتا یەك خانەیە، ئنجا دەبێتە دوو، دووەکان دەبنە چوار، چوارەکان دەبنە هەشت، هەشتەکان دەبنە شازدە، دەبنە سی و دوو، دەبنە شەست و چوار، سەدو بیست و هەشت، ...هتد، بەو شێوەیە تاکو دەبن بە هەزاران، بەڵکو بە ملیۆنان، ئنجا ئەو خانانە هەر کۆمەڵەیان دەچن ئەندامێك و، کۆئەندامێك لە جەستەی مرۆڤدا دروست دەکەن، هەندێکی دەچێ مێشك دروست دەکات، هەندێکێ دەچێ دڵ دروست دەکات، هەندێکی ماسوولکەکان دروست دەکات، هەندێکی پێست دروست دەکات، هەندێکی ئێسقان دروست دەکات، هەندێکی چاو دروست دەکات، هەندێکیان خانەی دەماریین و، هەندێکیان خانەی پێستیین و، هەندێکیان خانەی موویین، هەتا هەموو ئەندام و کۆئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ دروست دەکەن، ئنجا بەڕاستیی زۆر جێی سەرسوڕمانە کە ئەو خانانە، وەك سوپایەکی مەشق پێکراو ملیۆنانیان دەچن ئەو ئەندامە دروست دەکەن و، ملیۆنانی دیکە دەچن ئەو ئەندامەی دیکە دروست دەکەن، هەمووشیان لە یەك کاتدا، کارەکانیان لە نێو خۆیاندا دابەشکردوون.

**نۆیەم:** لە نێوان خانەکان و خوێندا پەردەیەك هەیە، وەك ئەوە وایە کۆمەڵە باڵەخانەیەکی بەرز لە لای ڕاست و، کۆمەڵێکی دیکە لە لای چەپ بن، ئنجا دیوارێك هەبێ ڕێ نەدات هیچ کەس لە شەقامەکەوە بچێتە نێو ئەو بینایانەو، لە بینایەکانەوەش بچێتە نێو ئەو شەقامەوەی کە بە نێوەڕاستیاندا دەڕوا، خانەکانیش کە خوا ﷻ لەجەستەی مرۆڤدا خوڵقاندوونی، ماددەی پۆتاسیان تێدا هەیە، ئەو ماددەیەش ئەو جەستەیە پێویستیی بە هەر شتێك هەبێ، وا دەکات، ئەو دەرگایە بە ئەندازەی ئەوەی ئەو پێویستیی پێیەتی، بکرێتەوە، واتە: ئەو خوێنەی دێت و دەچێ بە جەستەدا، خانەکان دەرگایان هەیەو داخراون، بەڵام هەر خانەیەك پێویستیی بەچی بێ، دەرگای خۆی دەکاتەوەو بە ئەندازەی ئەو پێویستییەی لەو خوێنە وەردەگرێ، بۆ وێنە: پەنکریاس پێویستیی خۆی وەردەگرێ و، زراو پێویستیی خۆی وەردەگرێ و، جگەر پێویستیی خۆی وەردەگرێ و، ئەو لووانەی فرمێسك پێویستیی خۆیان وەردەگرن و، لیك پێویستیی خۆی وەردەگرێ، هەر ئەندامێك پێویستی خۆی وەردەگرێ، دواییش دەرگای خۆی دادەخات! کە بەڕاستیی ئەوە هەر بیر لێکردنەوەی ئینسان زۆر دەتاسێنێ، چ جای بە واقیعیی و کردەیی بیزانێ.

**دەیەم:** مرۆڤ کاتێك زیاد لە ئەندازەی پێویستی خۆی دەخوات، ئەو خواردنە زیادە -- هەڵبەتە بۆ هەندێ کەس نا بۆ زۆر کەس یەکسەر دەبێتە پاشەڕۆك و فڕێی دەدا، بەڵام بۆ هەندێ کەس خواردنە زیادەکە، وزە زیادەکە کۆدەکرێتەوە لە جەستەداو، دەڵێن: فلانکەس قەڵەو بووە، بەڵام کاتێك مرۆڤ بیەوێ خۆی دابەزێنێ، هەموو ئەو چەورییە، هەموو ئەو وزە زیادە، هەموو ئەو کالۆرییە لە لاشەدا کەڵەکە کراوە، دەتوێتەوە، نەك لاشە بچێ ئێسقان و ماسوولکە و گۆشت بتوێنێتەوە، بەڵکو تەنیا ئەو ماددە چەورییە زیادە کە لە لاشەدا کەڵەکە بووەو، پێویستی پێی نیە، بۆ کاتی تەنگانە هەڵیگرتوە، ئەوە دەتوێنێتەوە.

### بەسەرهاتێك:

دەگێڕنەوە جارێك شاندێك دەچن بۆ لای عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، کە یەکێك بووە لە حوکمڕانەکانی بەنی ئومەییە، گەنجێکی کەم تەمەنیان تێدا دەبێ، ئەو سەرەتا

دێتە ژوورێ، عەبدوملەلیك گلەیی و سەرزەنشت لە دەرگەوانەکە دەکات و دەڵێ: ئەوە چییە هەر کەسێك ویستی دێ بۆ لامان، تەنانەت منداڵیش هەر دێن؟ کوڕە گەنجەکە پێی دەڵێ: (**أَيُّهَا الأَمير! إِنَّ دُخُولِي عَلَيْكَ لَمْ يَنْقُص قَدْرَكَ، وَلكِنَّهُ شَرَّفَني، أَصابَتْنا سَنَةٌ أَذابَتِ الشَّحْمَةَ، وَسَنَةٌ أَكَلَتِ اللَّحْمَةَ، وَسَنَةٌ دَقَّتِ العَظْمَةَ، وَبيَدِكُم فُضُولُ مالٍ، فَإِن كَانَت لِلّهِ، فَعَلى مَا تَحْبِسَنَّهَا عَن عِبَادِهِ، وَإِن كانَتْ لَكُم، فَتَصَدَّقوا بِهَا عَلَيْنا، وَإِنْ كانَتْ لَنَا فَأَعْطُونا إِيَّاهَا**).

واتە: ئەی فەرماندە! هاتنی من بۆ لای تۆ، لە ڕێزو پایەی تۆی دانەشکاندوە، بەڵام منی ڕێزدار کردوە، ساڵێکمان گرانیی بەسەرهات، چەوریی و بەزی تواندەوە، ساڵێکی دیکەش گۆشتەکەی خوارد، ساڵێکی دیکەش ئێسکیشی باریك کرد، ئێوەش ماڵ و سامانی زیادەتان لەبەر دەستدا هەیە، ئنجا ئەگەر هی خوایە، بۆچی لە بەندەکانی حەپس دەکەی، (بیدە بە بەندەکانی) و، ئەگەر هی خۆشتانە، چاکەو خێرمان لەگەڵ بکەن و، ئەگەر هی خۆشمانە، بمادەنێ.

واتە: ئەو ماڵ و سامانەی لەبەر دەستی تۆدا هەیە، ئەی عبدوملەلیکی کوڕی مەڕوان! کە جگە لە عومەری کوڕی عەبدولعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، ئەوانی دیکە هەموویان وابوون، خوا لێیان خۆش بێ، ئەو ماڵ و سامانە لە سێ حاڵ بەدەر نیە: أ- یان بە هی خوای دەزانن، کە هەمووشی لە ئەسڵدا هی خوایە، ئنجا ئەگەر هی خوایە، بیدەن بە بەندەکانی، ب- یان بەهی خۆتانی دەزانن، ئەگەر بەهی خۆشتانی دەزانن، خێرمان پێ بکەن، ج- یان هی خۆمانەو دەستتان لێ بەسەردا گرتووین، ئەگەر هی خۆشمانە بماندەنەوە، عەبدوملەلیکی کوڕی مەڕوان پێی سەرسام دەبێ، ئنجا تێدەگات ئەو شاندەی ئەو کوڕە گەنجەیان کردوە بە دەمڕاست و قسەکەری خۆیان، پێکاویانە.

مەبەستم لێرەدا ئەوەبوو کە ئەو کوڕە گەنجە ئاماژە بەوە دەکات، گرانیی و برسییەتی ساڵێك بەزی تواندەوەو، ساڵی دوایی گۆشت، ئنجا ساڵی ئایندە ئێسك، خوای پەروەردگاریش جەستەی مرۆڤی وا خوڵقاندوە، کە ئەگەر مرۆڤـ خواردنی نەبوو و دەستی نەکەوت، یان ئەگەر ویستی خۆی دابەزێنێ، پێشێ چەوریی دەتوێتەوە، دوایی

دەگاتە گۆشت، دوایی دەگاتە ئێسك، ئنجا ئەوە ئەگەر خوا ﷻ ڕێکی نەخستبایەو ڕێنمایی نەکردبایە، هەر لە سەرەتادا ئێسکەکە توابایەوە، یاخود ماسوولکەو گۆشتەکە توابایەوە، پێش چەورییەکەی، بێگومان حاڵ بە جۆرێکی دیکە دەبوو.

## مەسەلەی دووەم:

**ڕاگەیاندنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە لەمەودوا قوڕئانی پێدەخوێنێ و فێری دەکات و، لە بیریشی ناچێ -مەگەر خوا بیەوێ- ئەو (خوا) ئاشکراو پەنهان دەزانێ، بۆ شوێنکەوتنی بەرنامەی ئاسانی خۆی، ئامادەو ئاسانی دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا

**١)-** ﴿سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، لەمەودوا قوڕئانت پێ دەخوێنین، لە بیریشت ناچێ، مەگەر ئەوەی خوا ویستبی، **(إِسْنادُ الإِقْراءِ إِلى اللهِ مَجازٌ عَقْلِيٌّ، لِأَنَّهُ جاعِل الكَلامِ المَقْروءِ وَآمِرٌ بِإِقْرائِهِ)**، قوڕئان پێخوێندن، پاڵدانی بۆ لای خوا، مەجازێکی عەقڵییە، چونکە لە ئەسڵدا خوا ﷻ وشە خوێندراوەکەی فەرمووەو، فەرمانیشی کردوە پێی بخوێنرێ (لەڕێی جبریلەوە)، کە دەفەرموێ: ﴿سَنُقْرِئُكَ﴾، پێت دەخوێنین، یانی: فێرت دەکەین و شارەزات دەکەین لە فەرمایشتی خۆمان، ﴿فَلَا تَنسَىٰٓ﴾ لە بیریشت ناچێ لەوە دڵنیابە، **(نِسیان)**: بریتیە لەوەی زانراوێکی پێشتر، کە لە مێشکی مرۆڤدا پارێزراوە، ماوەیەکی کەم، یاخود ماوەیەکی زۆر لە هۆشدان **(ذاکرة)**ی مرۆڤدا نەمێنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، **(المَقْصودُ بِهَذا، شيئان: إِذا شَاءَاللهُ نَسَخَ تِلاوَةَ بَعْضِ ما أَنْزَلَ عَلَى النَّبيِّ، أَمَرَهُ بِتَرْكِ قِراءَتِهِ، ومَا يَعرِض نِسْيانَهُ لِلنَّبِيِّ مُؤَقَّتاً)**، مەبەست لەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، مەگەر خوا بیەوێ، دوو شتن:

**أ-** ئەگەر خوا ویستی هەندێك لە خوێندنەوەی ئەوەی دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەر ﷺ، هەڵیبوەشێنێتەوە، فەرمانی پێ دەکات نەیخوێنێ (و مسوڵمانانیش نەیخوێنن).

**ب-** ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ جاری وابووە شتێکی بە شێوەیەکی کاتیی و بۆ ماوەیەکی کەم، لەبیر چووە (و دوایی هاتۆتەوە بیری)، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَنسَىٰٓ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، یانی: (**إلاَّ الَّذِي شَاءَ اللهُ أَنْ تَنْسَاهُ**)، مەگەر ئەوەی خوا ویستبی لەبیرت بچێ، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾، لابردن (**نفي**) نیە، بەڵکو نەهێشتن (**نهي**)ە، یانی: (**فَلا تَنْسى**)، یانی: ئەلیفەکەی لەبەر ئەوەی کۆتایی ئایەتە، بۆیە بەو شێوەیە هاتوە، واتە: لەبیرت نەچێ!، ﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾، پێت دەخوێنین لە بیرت نەچێ، ئەگەرنا لە ئەسڵدا بەمجۆرە بووە: (**فلا تنْسَ**)

بەڵام ئەو جۆرە خوێندنەوەیە زانایان ڕایان لەسەری نیەو، هەر ئەوەیە کە ئەوە موژدەیەکە خوا بە پێغەمبەری ﷺ داوەو هاتۆتەدیش و ئەوە ئیعجازێکی مێژووییشە، چونکە هەرچی خوا ﷻ فێری پێغەمبەری ﷺ کردوە، لەبیری نەچووە، یەکێك لە زانایان دەڵێ: (**وَعْدٌ مِنْهُ لِنَبِيِّهِ أَن يُمَكِّنَه مِنَ القُرآنِ وَحِفْظِهِ عَلَى مَا أُنْزِلَ، بِحَيْثُ يَرْتَفِعُ عَنْهُ النِّسيانُ، يَقْرَأُهُ كَمَا أُنْزِلَ**)، ئەمە بەڵێنە لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کە یارمەتیی دەدات و وای لێ دەکات زانیاریی بە قورئان و بە لەبەرکردنی قورئان هەبێ، بەو شێوەیەی دایبەزاندوە، بە شێوەیەك هیچ شتێکی لەبیر نەچێ و، هیچ شتێکیشی لێ لەدەست نەچێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، (**إسْتِثْناءٌ مُفِيدٌ لِبَقاءِ قُدْرَةِ اللهِ عَلَى إِطْلاقِهِ، وَذلِكِ لأَنَّ كُلَّ إنسانٍ لا يَنْسى إلاَّ مَا شاءَاللهُ نِسيانَهُ**)، ئەمە بۆ هێشتنەوەی دەسەڵات و ویستی خوایە بە ڕەهایی، چونکە هەر کەسێك هەر شتێکی لەبیر دەچێ، بەس ئەوەی لەبیر دەچێ کە خوا ویستوویەتی.

لە ئایەتەکانی دیکەی قورئانیشدا وێنەی ئەمە هاتوە، بۆ وێنە:

**أ-** لە سووڕەتی (**القيامة**)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾، وەك کاتی خۆی تەفسیرمان کرد.

**ب-** هەروەها لە سووڕەتی (**طه**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمًا ﴿١١٤﴾ ﴾.

لێرەش دا خوا ﷻ دڵنیایی داوەتە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە ئەوەی فێری دەکات، لە بیری ناچێ، کەواتە: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، تەنیا بۆ دەرخستنی ئەوەیە کە ویستی ڕەهای خوای پەروەردگار، هیچ شتێك ڕێی لێ ناگرێ و، ئەگەر خوا بیەوێ لە بیرت باتەوە، لە بیرت دەباتەوە، بەڵام خوا نەیویستوە لەبیرت بچێتەوە، بۆیەش لە بیرت نەچۆتەوە.

٣)- ﴿إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ﴾، بە دڵنیایی ئەو ئاشکراو، ئەوەش کە پەنهان دەبێ، دەیزانێ، (**الجَهْرُ**): بریتیە لە دەرکەوتنی تەواو بۆ هەستی بینین، یاخود هەستی بیستن، لێرەدا (**جهر**)، وەك حاڵەتی لەبیر بوونە، (**يَخْفَى**)ش، وەك حاڵەتی لە بیرچوونە، خوا ﷻ ئاگای لە هەردووك لایان هەیە.

٤)- ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ﴾، ئاسانیشت دەکەین بۆ (ڕێی) ئاسان، یان بۆ (شەریعەتی) ئاسان، چونکە وشەی ﴿لِلْيُسْرَىٰ﴾، (**مُؤَنَّثُ الأَيْسَرِ وَهوَ صِفَةٌ لِمَوْصوفٍ مَحْذوفٍ: الطَّرِيقَةِ اليُسْرى أَوِ الشَّرِيعَةِ اليُسْرى**)، ﴿لِلْيُسْرَىٰ﴾، بە مانای ئاسانتر، مێینەی (**أَيْسَرَ**)ە، (**أَيْسَر**)، واتە: ئاسانتر بە باری نێرینەدا، بەڵام (**يُسْرى**)، یانی: ئاسانتر بەباری مێینەدا، لێرەدا (**يُسْرى**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، وەك ڕێبازی ئاسانتر، بەرنامەی ئاسانتر.

خاوەنی تەفسیری (**الميزان**)، دەڵێ: (**مُقْتَضى الظَّاهِرِ وَنُيَسِّرُ لَكَ اليُسْرى، لَكِنَّ المَقْصودَ أن يُهَيِّئَه وَيُجهِّزَهُ لِتَأْدِيَةِ الرِّسَالَةِ**)، واتە: ڕواڵەت خوازیاری ئەوەیە بگوترێ: ئاسانت بۆ سێنا دەکەین، (ڕێی ئاسان بۆ تۆ ئاسان دەکەین)، بەڵام بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ﴾، چونکە ئامانج ئەوەیە ئامادەو سازی بکات، کە بتوانێ ئەو پەیامە ئاسانەی خوا بگەیەنێ.

(**فخرالدين الرازي**)، لە بارەی حیکمەتی ئەو تەعبیرەوە، دەڵێ: (**الفِعْلُ فِي نَفْسِهِ ماهِيَةٌ مُمْكِنَةٌ قَابِلَةٌ لِلْوجودِ، وَالعَدَمِ، عَلَى السَّوِيَّةِ، ولكِن إِذَا صَارَ الفَاعِلُ مُيَسَّراً لِلْفِعلِ، يَفْعَلُه**)، هەر کردەوەیەك لە خودی خۆیدا چییەتێکی گونجاوە بۆ بوون و بۆ نەبوون، بەڵام ئەگەر بکەر وا بوو ئەنجامی بدات، ئەو کاتە ئەو کردەوەیە (کە لە ئەسڵدا بۆ هەردووك لای بوون و نەبوون گونجاوە)، حاڵەتی بوونی بەسەر نەبوونیدا زاڵ دەبێ و دەیکات.

کەواتە: ﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴾، تۆ ئاسان دەکەین بۆ ئەو ڕێیە، یانی: ئەو شەریعەت و بەرنامە ئاسانەی خوا ﷻ دایبەزاندوە.

کۆتایی ئەم مەسەلەیەش بەم دەقەی سوننەت دێنین:

**{عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَقْرَأُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: رَحِمَهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً، أَسْقَطْتُهُنَّ مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا} (أخرجه أحمد: ٢٤٣٨٠، والبخاري: ٤٧٥٥، ومسلم: ٧٨٨).**

واتە: (دایکی ئیمانداران) خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو لە مزگەوتێ، بە شەو قورئانی دەخوێند، دوایی فەرمووی: خوا بەزەیی پێدا بێ، فڵان ئایەت و فڵان ئایەتەی خستنەوە بیرم، کە کەواندبوومن، (لە بیرم برابوونەوە) لە سوورەتی فڵان و فڵان.

کەواتە: بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی ئاسایی بووە، جارجار ئایەتێکی لەبیر بچێ، بەڵام یەکێك لە هاوەڵان خستوویەتەوە بیری، یان دوایی جیبریل سەلامی خوای لێبێ کە هەمیشە قورئانی لەگەڵدا دەورکردۆتەوە، خستوویەتەوە یادی، کەواتە: ڕەوایە بشڵێین: ﴿ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ٦ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، یانی: پێت دەخوێنین لە بیرت ناچێ، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، واتە: خوا بیەوێ بە شێوەیەکی کاتیی لە بیرت بچێ، بۆ ماوەیەکی کەم، بەڵام دوایی بێتەوە یادت، مەگەر ئەوە، ئەگەرنا ئەوەی خوا فێرت دەکات، لە عەقڵ و دڵتدا خوا دەیچەسپێنێ و لە بیرت ناچێ.

## مەسەلەی سێیەم:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ کە ئامۆژگاریی بکات، مادام سوودی هەبێ، کە بابای ترس و سامدار بەرانبەر بە خوا پەندی لێ وەردەگرێ و، بیری دێتەوە، بابای بەدبەختی خراپەکاریش کە دەخرێتە ئاگری هەرە گەورەوەو نە تێیدا دەمرێ، نە تێیدا دەژی، خۆی لەو ڕێنمایی و ئامۆژگارییەی پێغەمبەر ﷺ بە دوور دەگرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، ئنجا بیربخەوە (ئامۆژگاریی بکە) ئەگەر بیرخستنەوە سوودی گەیاند، لێرەدا پیتی: (ف) لە: ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، پێی دەگوترێ: (**فَاءُ التَّفْرِيع**)، واتە: ئەو ڕستەیەی لێرەدا هاتوە، دەیگێڕێتەوە بۆ ڕستەکانی پێشێ، یانی: بینا لەسەر ئەوەی باسکرا، کەواتە: ئەگەر بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی، سوودی هەبێ، بیریان بخەوەو ئامۆژگارییان بکەو، ڕێنماییان بکە، زانایان لە بارەی ئەم ڕستە موبارەکەوە زۆریان قسە کردوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، ئەمە بەرانبەرێکی هەیە، بەڵام قرتێنراوە، وەك چۆن خوا ﷻ لە سووڕەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴿٨١﴾ ﴾، یانی: (**تَقِيكُمُ الحَرَّ وَالبَرْدَ**)، لێرەش: ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، (**وَإِن لَمْ تَنْفَع**)، ئەگەر بیرخستنەوە سوودی هەبوو، یان نەیبوو، بیرخستنەوەی خۆت و ئامۆژگاریی خۆت هەر بکە.

ب- هەندێکی دیکە گوتوویانە: کە دەفەرموێ: ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ﴾، ﴿ إِن ﴾ لێرەدا (**إِنِ الشَّرطِيَّة**)یەو بۆ مەرجە، یانی: ئەگەر سوودی هەبوو بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی،

ئامۆژگاریی بکەو بیریان بخەوە، بەڵام ئەگەر زانیت سوودی نیە، لێی گەڕێ، بێگومانیش ڕای دووەمم پێ ڕاستەو، ئەم مەرجە مەرجێکی ڕاستەقینەیە، چونکە بیرخستنەوەو ئامۆژگارییەك بزانی شوێنی خۆی نیەو کاتی خۆی نیە، حاڵەکە گونجاو نیەو قسەکەت بێ هوودە دەبێ، بێگومان چ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، چ هەر کەسێکی دیکە پێویستە لەو حاڵەتەدا ئامۆژگاریی نەکات و بیرخستنەوەیەك ئەنجام نەدات، کە بزانێ بێسوودە، دەشتوانین بە چەند ئایەتێك لەو بارەوە، بەڵگە بێنینەوە، بۆ وێنە:

خوای بەرز لە سووڕەتی (النجم)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: پشت هەڵبکە لە کەسێك کە ڕوو لە بەرنامەو یادی ئێمە وەردەگێڕێ و تەنیا ژیانی دنیای دەوێ، واتە: ئەگەر بزانی کەسێك قسەکەت لەگەڵیدا بێسوودە، قسەی بۆ مەکە، کەواتە: ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، لێرەدا بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکەوێتە بەر ئیجتیهادو تێفکرینی خۆی، یانی: ئەگەر زانیت بیرخستنەوەو ئامۆژگارییەکەت، سوودی هەیە، بیکەو، ئەگەر زانیت سوودی نیە، لێی گەڕێ، چونکە مرۆڤی مسوڵمان دەبێ خۆی لە لەغو بپارێزێ و، قسەیەکیش سوودی نەبێ، مانای وایە لەغوویە، خوای پەروەردگاریش بڕواردارانی بە گشتیی بەوە پێناسە کردوون کە خۆیان لە لەغوو دەپارێزن: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ ﴾، چ جای پێشەواو ڕابەرو سەرووەریان پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ!!.

٢)- ﴿ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴾، بە دڵنیایی کەسێك ترس و سام و هەیبەتی (خوای) لە دڵدا بێ، پەندو ئامۆژگاریی وەردەگرێ، یانی: **(سَيَذَّكَّرُ بِالقُرآنِ وَيَتَّعِظُ مَنْ فِي قَلْبِهِ شَيْءٌ مِنْ خَشْيَةِ الله)**، کەسێك شتێك ترس و سام و هەیبەتی خوای لە دڵدا هەبێ، بەهۆی قورئانەوە پەندو ئامۆژگاریی وەردەگرێ، بیری دێتەوە.

وشەی: ﴿ مَن ﴾ لێرەدا بۆ تاکێك نیە، بەڵکو بۆ جینسە، چونکە **(مَن)** مانای تاك و مانای کۆش دەگەیەنێ، واتە: ئەوانەی ترس و سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا لە دڵدا هەیە، ئەوانە پەند وەردەگرن و، لەو ئامۆژگارییەی تۆ بەهرەمەند دەبن.

٣)- ﴿وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى﴾، هەرە خراپ و بێمرادیش لێی دوور دەکەوێتەوە، ﴿ٱلۡأَشۡقَى﴾ش دیسان لێرەدا بۆ جینسە، یانی: تێکڕای ئەوانەی زۆر خراپەکارن و بەدبەختن، **(الأَشْقى: شَديدُ الشَّقْوَة، وَالشَّقَاءُ فِي لِسانِ الشَّرْعِ حَالَةٌ نَاشِئَةٌ فِي الآخِرَةِ عَنِ الكُفْرِ مِن حَالَةِ الإِهَانَةِ وَالتَّعْذيبْ)**، ﴿ٱلۡأَشۡقَى﴾، واتە: زۆر خراپ، زۆر خراپەکار، **(الشَّقَاء)**: لە زاراوەی شەرعدا، حاڵەتێکە لە ڕۆژی دواییدا لە کوفر پەیدادەبێ، کە بریتیە لەوەی مرۆڤ ڕیسوا بێ، سزاو ئازار بدرێ، ئنجا کەسێك بەو شێوەیە بێ، ﴿وَيَتَجَنَّبُهَا﴾، **(يَتَبَاعَد)** یانی: خۆی لەو ئامۆژگاریی کردنە، لەو بیرخستنەوەیە، دوور دەگرێ.

**(أَصْلُ التَّجَنُّبِ تَفَعُّلٌ لِتَكَلُّفِ الكَيْنونَةِ لِجَانِبٍ مِنَ الشَّيء)**، **(تَجَنُّب)**: لەسەر کێشی **(تَفَعُّل)**ەو بریتیە لەوەی کەسێك زۆر لە خۆی بکات، لە تەنیشت شتێکەوە بێ و ڕووی تێ نەکات و خۆی لێ لابدات.

ئنجا ئایا ئەو زۆر بەدبەخت و زۆر خراپەکارە، کێیە؟

٤)- ﴿ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾، ئەو کەسەی دەسووتێنرێ (دەپیشێنرێ) بە ئاگری هەرە گەورە، **(نَارُ جَهَنَّم وَالَّتي هِيَ نَارٌ كُبْرى بِالقِياسِ إِلى نَارِ الدُّنيا)**، ئاگری دۆزەخ بە بەراورد لەگەڵ ئاگری دنیادا، ئاگری گەورەترو گەورەترین ئاگرە.

٥)- ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ﴾، ئنجا نە لەوێدا دەمرێ و نەدەشژی، ﴿ثُمَّ﴾، لێرەدا **(لِلتَّرْتيبِ وَالتَّراخي)**، بۆ ڕیزبەندیی و بەدواداهاتنە، چونکە مرۆڤ کە دەخرێتە نێو ئاگرەوەو پێی دەپیشێنرێ و دەسووتێنرێ، وەك زۆرجار گوتوومانە: **(صَلي)**، ئەوەیە کەسێك بخرێتە نێو ئاگرەوەو لە هەموو لاوە تینی ئاگرەکەی بۆ بێ، نەك هەر لە لایەکەوەو تێیدا بپیشێنرێ و ببرژێنرێ، ئنجا چوونە نێو ئاگری مرۆڤ بەو شێوەیە، ئاسانترە لەوەی نە تێیدا بمرێ و نە تێیدا بژی، بۆیە ﴿ثُمَّ﴾، **(لِلتَّرْتيبِ وَالتَّراخي)**، بۆ ڕیزبەندیی و بەدواداهاتنە، چونکە مردنەکەی لەوێداو، ژیانەکەشی لە ئاگرەکەدا، ناخۆشترەو خراپترە لە چوونە نێوی، مرۆڤ جاری وایە تووشی بەڵایەك دێ، بەڵام دوایی لێی دەرباز دەبێ، یاخود گیان دەسپێرێ و ئازارەکەی لە کۆڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەو کەسە: ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ﴾، لەوێدا نامرێ بەو واتایەی هەمیشە هەر هەست دەکات بە ئازارەکە، ﴿وَلَا يَحۡيَىٰ﴾، ژیانێکیش ناژی پێی بگوترێ: ژیان، ژیانێك تام و چێژو خۆشییەکی تێدابێ.

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾، ئەو کەسەی دەپیشێ، دەبرژێ بە ئاگری گەورەتر، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ فەرموویەتی: {**نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ، جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ**}، (**أخرجه أحمد**: ١٠٢٠٤، **والبخاري**: ٣٠٩٢، **ومسلم**: ٢٨٤٣). واتە: ئەم ئاگرەتان کە ئادەمیزاد دایدەگیرسێنێ، بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، واتە: ئاگری دۆزەخ بکەیە حەفتا بەشەوە، یەك بەشی ئەم ئاگرەی دنیایە، ئەویش واپێدەچێ بۆ دیارییکردن (**تحديد**) نەبێ، کە هەر ئەوەندە بێ، بەڵکو وەك عادەتی عەرەب و جگە لە عەرەبیش وایە، وشەی: (حەفتا، یان حەوت، یان دە) بەکاردێنن بۆ زێدەڕۆییکردن لە شتێکدا، ئنجا مەرج نیە هەر حەفتا بێ، دەگونجێ حەفتاش زیاتر، یاخود کەمتر بێ.

کەواتە: لێرەدا خوای بەرزی مەزن فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺو، هەر کەسێکیش دەکات کە لە ڕێی ویەوە دەڕوات، هەر کاتێك زانی بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی و پەندادانی خەڵك، سوودی هەیە، بە ئەرکی خۆی بزانێ بیریان بخاتەوەو ئامۆژگارییان بکات، بەڵام ئەگەر زانی بێسوودە، مرۆڤ دەبێ، قسەی خۆی خەسار نەکات و، لە شوێنێك، لە حاڵێك، لە کاتێکدا، کەسێك نەدوێنێ و قسەی بۆ نەکات و ئامۆژگاریی نەکات کە بزانێ سوودی نیە، ئەمەش بێ ئەوەی بەڵگەی نەقلیی لەسەر بێنینەوە، هەر بە عەقڵیش دیارە، چونکە ئینسانی مسوڵمان دەبێ لێزان و دانا بێ و، حیکمەت و لێزانییش ئەوەیە قسەی خۆت خەسار نەکەی و قسە بۆ کەسێك نەکەی، لێی بەهرەمەند نەبێ، بەڵام بێگومان مرۆڤ لەوە دڵنیا نیە، داخۆ کێ بەهرەمەند دەبێ و کێ بەهرەمەند نابێ، بۆیەش مرۆڤ بە زۆریی دەبێ قسەی خێری خۆی بکات، ئنجا کەسێك لێی بەهرەمەند بوو، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ﴾، خۆی قازانجی کردوەو کەسێکیش بەهرەمەند نەبوو و خۆی لێ دوورگرت، بێگومان خۆی زیانی کردوە، بەڵام بۆ دەرکەوتنی ئەوە: کێ ترس و سام و هەیبەتی خوای لە دڵدا هەیەو، کێش بەدبەختەو خۆی بە دوور دەگرێ؟ تاکو ئامۆژگارییەکەت نەکەی، ئەو خەڵکەت بۆ دەرناکەوێ، بەڵام ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بزانی کەسێك گوێت لێ ناگرێ و، قسەکەت جێ ناگرێ، نابێ قسەی خۆت زایە بکەی و بە فیڕۆ بدەی.

### مەسەلەی چوارەم:

**بە جەختکردنەوەوە ڕاگەیاندنی سەرفرازیی بابای خۆ پاك و چاککەر و، ناوی پەروەردگاری هێنەرو نوێژکەر:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوو بڕگەدا:

**١)-** ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ﴾، بە دڵنیایی کەسێك کە پاك و چاك بووە، سەرفراز بووە، (**قَدْ**) کە دەچێتە سەر کرداری ڕابردوو، مانای ساغکردنەوەو چەسپاندن دەگەیەنێ، (**قد للتَّحقِيقِ وَالتَّأْكيد**)، یانی: بە دڵنیایی سەرفرازو خۆشبەخت و بە مراد گەیشتوویە، کەسێك کە خۆی پاك و چاك کردوە.

**٢)-** ﴿وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ﴾، هەروەها (کەسێک سەرفرازە کە) ناوی پەروەردگاریشی هێناوەو نوێژی کردوە، (**الفَلاحُ: نَجَاحُ المَرءِ فيمَا يَطْمَحُ إِلَيْهِ**)، (**فَلاح**): بریتیە لە سەرکەوتنی مرۆڤ لە شتێکدا کە هەوڵی بۆ دەدات، چاوی تێیەوەیەتی هەندێکیش دەڵێن: (**فَلاحُ**): بریتیە لە وەدەستهێنانی شتێکی داواکراو لە خێرو چاکە، وشەی: (**تَزْكية**) وەك زۆرجار گوتوومانە: سێ واتایان دەگرێتەخۆ:

**١-** پاکبوون (**الطَّهارَة**).

**٢-** گەشە کردن (**النُّمو**).

**٣-** چاکبوون (**الصَّلاَحُ**).

(**التَّزَكِّي: السَّعْي لِنَيلِ الطَّهَارَةِ، وَالنَّمُوِّ، وَالصَّلاح**)، (**تَزَكِّي**) واتە: هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی پاکیی و گەشە کردن و چاکیی، ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ﴾، هەر کەسێك هەوڵبدات خۆی پاك و چاك بکات و گەشە پێبدات، بە دڵنیایی سەرفرازو بە ئامانج گەیشتوویە.

﴿ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴾، یانی:

أ- کەسێك کە ناوی پەروەردگاری دێنێ و، نوێژ دەکات.

ب- کەسێك کە لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە.

بەڵام لێرەدا زیاتر وا پێدەچێ، ﴿ فَصَلَّىٰ ﴾ بە مانای: نوێژی کرد.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ ﴾، **(الذِّكْرُ مِنَ الذِّكْرِ اللِّسَانِيِّ، وَالمَقْصُودُ بِاسْمِ رَبِّهِ ذِكْرُ أَسْماءِ اللهِ للتَّعظيم)**، **(ذِكْر)**: مەبەست پێی باسکردنی بە زمانە (باسکردنی بە زمانیش کاتێك سوودی هەیە، لە دڵیشدا هەبێ)، مەبەست لە ناوی پەروەردگار باسکردنیش، باسکردنی ناوە بەرزەکانی خوایە بۆ بە مەزنگرتن.

﴿ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ ﴾، لێرەدا **(ذِكْر)**، دەگونجێ لە **(ذِكْر)**ەوە بێ، واتە: (باسکردنی بەزمان) و دەشگونجێ لە **(ذُكْر)**ەوە بێ، واتە: یادکردن.

**(ذُكْر: حُضُورُ الشَّيْءِ فِي نَفْسِ الذَّاكِرَ)**، **(ذُكْر)**: بریتیە لە ئامادەبوونی شتێك لە نەفسی مرۆڤدا، لە دڵ و هۆشی مرۆڤدا.

**(فَتَكُونُ كَلِمَةُ اسْم مُقَحَّمَةً لِتَدُلَّ عَلى شَأْنِ اللهِ وَصِفَاتِ عَظَمتِهِ، لأنَّ أَسْماء اللهِ أَوْصافُ كَمَالٍ)**، ئەو کاتە وشەی ناو **(إسم)** لێرەدا تێخزێنراوەو خزێنراوەتە ئێرە تاکو پێگەو پایەی بەرزیی خواو سیفەتە مەزنەکانی خوا بگەیەنێ، چونکە ناوەکانی خوا، سیفەتە تێرو تەواوەکانی خوان.

شایانی باسە: هەندێك لە زانایان ئەم دوو ئایەتەیان کردوونە بەڵگەی ئەوە کە ئەم سووڕەتە مەدینەییەو، گوتوویانە: مەبەست لەم ئایەتە موبارەکانە زەکاتدانەو، خوێندنی زیکرەکانی دوای نوێژەکانە بە تایبەت جەژنی ڕەمەزان، بەڵام لە ڕاستییدا مەبەست لە: یادی خوا کردن و نوێژ کردن، بەر لەوەش زەکات، مانای گشتیی ئەو وشانەیە:

١- **(تَزَکِّي)**، بە مانای خۆ پاك و چاککردنە، نەك زەکاتدان.

٢- (**ذكر الرب**) ناوی پەروەردگار هێنانیش، چەمكە گشتییەكەی مەبەستە، نەك زیكرێكی تایبەت.

٣- (صَلاة) نوێژیش، نوێژكردنە بە گشتیی، نەك نوێژێكی تایبەت، بێگومان ئەم سێیەش پێكەوە تێكهەڵكێشن:

١- كاتێك مرۆڤـ خۆی پاك و چاك كرد.

٢- ئنجا شایستەی ئەوە دەبێ ناوی پەروەرگار بهێنێ.

٣- دوای ئەوەش شایستەی ئەوە دەبێ نوێژ بكات، دەبێ پێشێ مرۆڤ هەوڵبدات، خۆی پاك و چاك بكات، ئنجا شایستەی ئەوە دەبێ لەگەڵ خوادا پەیوەندیی بگرێ و ناوی خوا بهێنێ، دوایيش بەندایەتیی بۆ خوای بەرزی مەزن ئەنجام بدات.

## مەسەلەی پێنجەم:

**هەڵبژاردنی زۆربەی مرۆڤان بۆ ژیانی دنیا بەسەر دوا ڕۆژدا، هەرچەندە ژیانی ڕۆژی دوایی، لە خودی خۆیدا چاکترە، بێگومان نەبڕاوەشەو، بەردەوامتریشە لە ژیانی دنیا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾﴾

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا﴾، بەڵکو (ئەی مرۆڤینە!) ئێوە ژیانی دنیای نزیکتر هەڵدەبژێرن، (دنیا)، (**مُؤَنّث**)ی (**أَدْنَى**)یە، (**أَدْنَى**) واتە: (**أَقْرَبْ**)، وشەی (**دُنیا**)ش مێینەی مەجازییە، واتە: ئەو ژیانەی لێتان نیزیکترە، کە ژیانی دنیایە.

(**إِيثار**) هەڵبژاردنی شتێك لە نێو کۆمەڵێك شت دا.

٢)- ﴿وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾، لە حاڵێکدا مەنزڵگای کۆتایی، باشترەو بەردەوامتریشە، (**الأخرة: الحَيَاةُ الآخِرَة**)، یان (**المَنْزِلَةُ الآخِرَة**)، ژیانی دوایی، مەنزڵگای دوایی، باشترە لە خودی خۆیداو بەردەوامتریشە، وشەی: ﴿تُؤْثِرُونَ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**يُؤْثِرونَ**)، واتە: ئەو مرۆڤە بێبڕوایانە ژیانی دنیا هەڵدەبژێرن بەسەر ژیانی دواییدا، لە حاڵێکدا مەنزڵگای کۆتایی باشترەو بەردەوامتریشەو زیاتر دەمێنێتەوە.

وشەی: ﴿بَلْ﴾، بەڵکو:

أ- (**إِضْرَابٌ عَنْ حِكايَةِ أَحْوالِ الفَرِيْقَيْنِ بِالإِنْتِقَالِ إِلى تَوْبِيخِ أَحَدِ الفَرِيْقَيْنِ وَهُوَ أَشْقَى**)، گواستنەوەیە لە باسکردنی حاڵی دوو کۆمەڵەکە، (ئەوانەی سام و ترسی خوایان لە دڵدا هەیەو، ئەوانەش کە لە خوا بێترس و بێباکن)، بۆ سەرزەنشتکردنی یەکێك لەو دوو کۆمەڵە کە ئەوانەن ترس و سامی خوایان، لە دڵ و دەروونیاندا نیە.

**ب-** یاخود: گواستنەوەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی قسەی خوای بەرز گرتنیە خۆی، کە فەرمووی: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: بەڵکو ئەوانە لەوە دوورترن کە گومانی ئەوەیان پێ ببردرێ، پێشبڕکە بکەن لە بەدەستهێنانی سەرفرازییدا، چونکە ژیانی دنیا هەڵدەبژێرن بەسەر ڕۆژی دواییداو، ئەسڵەن لەو مەیدانەدا هەر نین، واتە: لە مەیدانی داواکردنی سەرفرازییدا هەر نین، تاکو پێشبڕکە بکەن، چونکە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیەو، دنیاو ژیانی دنیا هەڵدەبژێرن.

## مەسەلەی شەشەم و كۆتایی:

**ئەو ڕاستییە لە كتێبە پێشووەكانیشدا هەیە، كتێبی ئیبراهیم و مووسا سەلامی خوا لە هەردووكیان بێ:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

**١)-** ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴾، بە دڵنیایی ئەمە لە پەڕە پێشووەكان دا هەیە، یانی: ئەوەی پێشتر باسكرا، بە تایبەت ئەوەی لە چوار ئایەتەكانی: (١٤، ١٥، ١٦، ١٧)دا هات، زۆربەی هەرەزۆری ڕوونكەرەوانی قوڕئان گوتوویانە: ئەم ناوی ئاماژەیە (**هذا**) بۆ ئەوێ دەچێتەوە، ﴿ إِنَّ هَٰذَا ﴾، ئەوەی باسكرا پێشتر، ﴿لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴾، لە پەڕە پێشووەكاندا هەیە، (**صُحُف**) كۆی (**صَحيفَة**)یە، لە ئەسڵدا (**صَحيْفَة**)، بە (**صَحَائِف**) كۆدەكرێتەوە، بەڵام بە (**صُحُف**)یش كۆدەكرێتەوە.

كە دەفەرمویٚ: ﴿لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴾، لە پەڕاوە پێشووەكاندا هەیە، واتە: بە نسبەت قوڕئانەوە، لە ڕووی كاتییەوە لە پێش قوڕئاندا بوون، نەك ئەو پەڕاوانەی كە هیچ كتێب و پەڕاوی دیكەیان پێش نەكەوتبێ، چونكە بە دڵنیایی خوای بەرزی مەزن، وەك چۆن بۆ ئیبراهیم و بۆ مووسا پەیام و كتێبی ناردوە، كتێبەكەی مووسا ئەوە دیارە تەوڕاتە، كتێبەكەی ئیبراهیمیش (**صُحُف**)ە، ئنجا لە پێش ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزەشدا، خوا كتێب و پەیام و بەرنامەكانی خۆی بۆ پێغەمبەرانی دیكە هەر ناردوون.

لە كۆتایی تەفسیركردنی ئایەتە موبارەكەكانی ئەم سوورەتەدا، سێ دەقی سوننەت دێنین:

**١-** دەقی یەكەمیان: {**عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ فِي الْعِيدَيْنِ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ، وَإِنْ وَافَقَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَرَأَهُمَا جَمِيعًا**} (**أخرجه مسلم: ٨٧٨، وأبو داود: ١١٢٢، والترمذي: ٥٣٣، والنسائي: ١٥٦٨، وإبن ماجه: ١١٨١**).

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو جەژنەکاندا (جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان و لە ڕۆژی جومعەشدا) لە ڕکاتی یەکەمیاندا: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ی دەخوێند، لە دوای سووڕەتی (**الفاتحة**)و، لە ڕکاتی دووەمیشدا سووڕەتی: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ﴾ی دەخوێند، ئەگەر ڕۆژی جومعەش هەر ئەو ڕۆژەی جەژن بووایە، دیسان هەر ئەو دوو سووڕەتەی دەخوێندن (لە نوێژی جەژنداو لە نوێژی جومعەشدا).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە نوێژی جەژنی دەکرد، یان نوێژی جومعەی دەکرد، ئەو دوو سووڕەتە موبارەکەی لە دوو ڕکاتەکانیان دا دەخوێندن، چونکە لە هەندێك فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە ئەگەر هاتباو یەکێك لە دوو جەژنەکان کەوتبایە ڕۆژی جومعەوەو، مرۆڤ نوێژی جەژنی کردبایە، وەبری جومعەش دەکەوێ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوەی ڕەنگە خەڵکێك بۆ نوێژی جەژنەکەی نەهاتبێ، بۆ ئەوەی جومعەکەی نەچێ، هەردووکیانی کردوون.

**٢**- دەقی دووەم: {**عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اجْعَلُوهَا فِي رُكُوعِكُمْ، فَلَمَّا نَزَلَتْ: سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى قَالَ اجْعَلُوهَا فِي سُجُودِكُمْ**} (**أخرجه أبو داود: ٨٦٩، وابن ماجه: ٥٨٧، والدارمي: ١٣٠٥، إسناده حسن**).

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی (خوا لێی ڕازیبێ)، دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە موبارەکە دابەزی: ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ۝٥٢﴾ **الحاقة**، (کە لە سووڕەتی (**الواقعة**)داو، لە سووڕەتی (**الحاقة**)شدا هاتوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾، بیخەنە ڕکووعەکەتانەوە.

(هەڵبەتە لە ڕکووع دا ناگوترێ: ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾، چونکە خوا فەرمانی کردوە، بەڵکو دەڵێی: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ العَظيم**)، پاکیی بۆ پەروەردگاری مەزنم، لە هەندێك ڕیوایەتاندا (**وَبِحَمْدِه**)یشی بۆ زیاد کراوە، (**سُبْحَانَ رَبِّيَ العَظيم وَبِحَمْدِه**)، پاکیی بۆ

پەروەردگاری مەزنم و ستایشکردنیش هەر بۆ وی)، کاتێکیش: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ دابەزی، فەرمووی: بیخەنە کڕنووش بردنتانەوە، (واتە: بڵێن: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَىَ**)، (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَىَ وَبِحَمْدِهِ**)، پاکیی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم، یاخود: پاکیی و ستایشکردن بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم.

٣- دەقی سێیەم: ئەم دوو دەقەی ڕابردوو لە ڕووی سەنەدەکەیانەوە گرفت و ئیشکالیشیان نیە، بەڵام هی سێیەم تاڕاددەیەك گرفت و ئیشکالی هەیە، بەس هەر هێنام، لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك زانیاریی و، چەمك و واتای زۆر گرنگی گرتوونە خۆی:

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسولَ الله ﷺ! كَمْ أَنْزَلَ اللهُ مِن كِتَابٍ؟ قَالَ: مَائَةَ كِتَابٍ وَأَرْبَعة كُتُبٍ، أَنْزَلَ اللهُ عَلَى شِيثْ خَمْسِينَ صَحِيفَة، وَعَلَى إِدْرِيس ثَلاَثِينَ صَحِيفَة، وعَلى إِبْرَاهِيم عَشْرَ صَحَائِف، وَعَلَى مُوسى قَبْل التَّوْرَاةِ عَشْرَ صَحَائِفْ، وَأَنْزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنْجِيلَ وَالزَّبورَ وَالفُرقَان، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسوُلَ الله! مَا كَانَتْ صُحُفُ إِبْرَاهِيم؟ قَالَ: كَانَتْ أَمْثَالاً كُلَّهَا: أَيُّها المَلِكُ المُسَلَّطُ المُبْتَلَى المَغرُور، إِنِّي لَمْ أَبْعَثْكَ لِتَجْمَعَ الدُّنيا بَعْضَها عَلَى بَعْض، وَلكِنْ بَعَثْتُكَ لِتَرُدَّ عَنِّي دَعْوَةَ المَظْلومِ، فَإِنِّي لاَ أَرُدُّهَا وَلَوْ كَانَتْ مِنْ كَافِرٍ، وَكَانَ فِيها: وَعَلى العَاقِلِ أَنْ تَكُونَ لَهُ سَاعَاتٍ سَاعَةٌ يُنَاجِي فِيهَا رَبَّهُ، وَسَاعَةٌ يُحَاسَبُ فِيهَا نَفْسَهُ، وَسَاعَةٌ يَتَفَكَّرُ فيهَا فِي صُنْعِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَسَاعَةٌ يَخْلُو فِيهَا لِحَاجَتِهِ مِنَ الحَلالِ، وَعَلَى العَاقِلِ أَن لا يَكونَ ظَاعِناً إِلاَّ لِثَلاثٍ: تَزَوُّدٌ لِمَعَاد، أَوْ مَرَمَّةٌ لِمَعاشٍ، أَوْ تَلَذُّذٍ فِي غَيْرِ مَحْرَمٍ، وَعَلَىَ العَاقِلِ أَنْ يَكُونَ بَصيراً بِزَمانِه، مُقْبِلاً عَلَىَ شَأْنِه، حَافِظاً لِلِسَانِهِ، وَمَن حَسَبَ كَلاَمَهُ مِن عَمَلِهِ، قَلَّ كَلامُهُ، إِلاَّ فيمَا يَعْنيهِ، قُلْتُ: يَا رَسولَ الله! فَمَا كَانَتْ صُحُف مُوسى؟ قال: كانَت عَبراً كُلّها: عَجِبْتُ لِمَن أَيْقَنَ بِالمَوْتِ كَيْفَ يَفْرَح؟ وَعَجِبْتُ لِمَن أَيْقَنَ بِالقَدَرِ ثُمَّ يَنْصِبُ، وَعَجِبْتُ لِمَن رَأَى الدُّنيا وَتَقَلُّبِهَا ثُمَّ اطْمَأَنَّ إِلَيْها، وَعَجِبْتُ لِمَنْ أَيْقَنَ بِالحِسابِ غَداً، ثُمَّ لا يَعْمَل، قُلْتُ: يَا رَسولَ الله! وَهَلْ كانَتْ فِي الدُّنيا شَيءٌ لِما فِي يَدِ إِبْرَاهِيم وَموُسَى، مِمَّا أَنْزَلَ اللهُ عَلَيْك؟ قَالَ: نَعَمْ، إِقْرَأْ يا أَبا ذر: (قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى) ثم قال: قلت يا رسول الله! أوصني قال: أُوصيك بتقوى الله، فإنه رأس أمرك، قلت: زدني؟ قال: عليك بتلاوة القرآن وذكر الله، فإنه ذكر لك في السماء وذخر لك في الأرض، قلت: يا رسول الله! زدني قال: وإياك وكثرة الضحك، فإنه يميت القلب، ويذهب بنور الوجه، قلت: يا رسول الله! زدني، قال: عليك بالجهاد،

فإنه رهبانية أمتي، قلت: يا رسول الله! زدني، قال: عليك بطول الصمت إلا من خير، فإنه مطردة للشيطان عنك، وعون لك على أمر دينك}[1].

واتە: ئەبوو زەڕی غیفاریی (خوای لێ ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! خوا چەند کتێبی دابەزاندون؟ فەرمووی: سەدو چوار (١٠٤) کتێب، پەنجا (٥٠) پەڕی دابەزاندوە بۆ سەر (**شیث**)، [(**شیث**) ناوی یەکێکە لە پیغەمبەران و پێش ئیدریس بووە]، سی (٣٠) پەڕیشی دابەزاندوە بۆ ئیدریس، هەروەها بۆ سەر ئیبڕاهیم دە (١٠) پەڕی دابەزاندوون و، بۆ سەر مووساش، پێش تەوڕات دە (١٠) پەڕی دابەزاندوون، [ئەمە سەد (١٠٠)]، تەوڕات و ئینجیل و زەبوورو فورقانیشی دابەزاندوون، [ئەمە سەدو چوار (١٠٤)] ئەبوو زەڕ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! پەڕەکانی ئیبڕاهیم عليه السلام چییان تێدابوو؟ فەرمووی: هەموویان پەند بوون، (ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو پەندانە هەندێکیان وەك نموونە باس دەکات:)

ئەی حوکمڕانی دەسەڵاتداری لە خۆبایی! تۆم نەناردوە تاکو دنیا هەندێکی خڕبکەیەوە سەر هەندێك، بەڵکو تۆم ناردوە تاکو پاڕانەوەی بابای ستەملێکراو لەمن بگێڕیەوەو نەیەت بۆ لام، چونکە من ستەم لێکراو، ئەگەر بێبڕواش بێ، پاڕانەوەکەی ڕەت ناکەمەوە، (پاڕانەوەکەی وەردەگرم).

هەروەها لە پەڕەکانی ئیبڕاهیمدا هەبوو: لەسەر مرۆڤی عاقڵ پێویستە چەند سەعاتێکی هەبن:

أ- سەعاتێك (کاتێك) تێیدا ڕازو نیاز لەگەڵ پەروەردگاری دەکات.

ب- هەروەها کاتێك کە تێیدا لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا دەکات.

ج- هەروەها کاتێك کە تێیدا بیر لە دروستکراوەکانی خوا عزوجل دەکاتەوە.

د- هەروەها کاتێك کە تێیدا بەهرە وەردەگرێ لە خواردن و خواردنەوە.

---

(١) أخرجه السيوطي في «الدر المنثور»: ج٦، ص٥٧١، وعبد بن حميد وابن مردويه، وابن عساكر، وذكره ابن حبان في «الثقات»: ج٢، ص١٢٠، وأبو الشيخ في «العظمة»: ج٥ ص١٦٠٢.

مرۆڤی عاقڵ مەگەر بۆ سێ شتان: ئەگەرنا سەفەر ناکات: ١- بۆ ڕۆژی دوایی خۆی سەفەر بکات، (دەچێ بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، یان هەر خوا پەرستییەك)، ٢- یان بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانی خۆی دابین بکات، (ئەو کەسەش کە مەسرەفی لەسەریەتی)، ٣- یاخود چێژێك وەربگرێ، بێ ئەوەی تووشی حەڕام بێ.

مرۆڤی عاقڵ دەبێ شارەزای ڕۆژگاری خۆی بێ و، خەریکی کاری خۆی بێ و، پارێزەری زمانی خۆی بێ، هەر کەسێك قسەکەی لە کردەوەکەی حیساب بکات، قسەی کەم دەبن، مەگەر لە شتێکدا کە پێویست بێ قسە بکات.

ئەبوو زەڕ دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەدی پەڕەکانی مووسا چییان تێدابوو، فەرمووی: هەموویان پەندو عیبرەت بوون، (ئنجا چەند پەندو عیبرەت وەك نموونە باس دەکات):

١- سەرم سوڕما لە کەسێك دڵنیایە کە دەمرێ، ئەدی چۆن زۆر دڵخۆش دەبێ بە دنیا؟.

٢- سەرم سوڕما لە کەسێك بڕوای بە ئەندازەگیریی و نەخشەی خوا هەیە، دواییش خۆی ماندوو دەکات! (واتە: خۆی زۆر ماندوو دەکات و دڵی زۆر بە دنیاوە خەریك دەکات).

٣- سەرم سوڕما لە کەسێك کە دنیا دەبینێ، چۆن خەڵك هەڵدەسووڕێنێ سەرو خواریان دەکات، دوایی دڵ بەدنیا دەبەستێ!.

٤- سەرم سوڕما لە کەسێك کە دڵنیایە لە ڕۆژی دوایی دا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ، دواییش کار ناکات بۆ ڕۆژی دوایی!.

دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئایا لە دنیادا لەوەی خوا بۆ ئیبراهیم و موسای ناردوە، هیچ شتێك خوا بۆ تۆی دابەزاندوە؟ دەڵێ: فەرمووی: بەڵێ: ئەی ئەبوو زەڕ! بخوێنەوە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٧﴾﴾، دوایی ئەبوو زەڕ دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئامۆژگارییم بکە! فەرمووی: ئامۆژگارییت دەکەم بە پارێزکاریی بەرانبەر بەخوا عزوجل، چونکە ئەوە سەری هەموو کاروبارێکتە.

گوتم: بۆم زیاد بکە (لە ئامۆژگارییکردن)، فەرمووی: قورئان بخوێنەوەو یادی خوا ﷻ بکە، چونکە ئەوە بۆ تۆ لە ئاسمان دەبێتە مایەی ئەوەی باس بکرێی لەلای فریشتەکان و، بۆ تۆ دەبێتە ڕۆشنایی.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بۆم زیاد بکە، فەرمووی: خۆت لە زۆر پێکەنین بپارێزە، چونکە دڵ دەمرێنێ، گەشیی و ڕووناکیی دەم و چاویش لادەبات.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بۆم زیاد بکە، فەرمووی: جەنگ و جیهاد بکە لە پێناوی خوادا (تێکۆشان بکە)، چونکە ئەوە ڕەبەنایەتیی ئۆممەتی منە.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بۆم زیاد بکە، فەرمووی: با زۆر سیفەتی بێدەنگییت هەبێ، مەگەر لە خێردا، ئەگەرنا قسە مەکە، چونکە بێدەنگیی دەبێتە مایەی دەرکردنی شەیتان و، هاوکارت دەبێ لەسەر کاروباری دنیات.

ئەم دەقە هەرچەندە لە ڕووی سەنەدیشەوە، هەندێك لە زانایان ئیشکالیان هەیە تییدا، بەڵام شتی زۆر گەورەو بەکەڵکی تێدا هەن، خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، ئەو ئامۆژگارییە بەرزو مەزنانە کار پێ بکەین.

لێرەدا کۆتایی بە تەفسیر کردنی سوورەتی **(الأعلى)** دێنین، لە خوای بەخشەر داواکارین تەمەنمان پڕ بەرەکەت بکات و، یارمەتییمان بدات بە لوتف و کەرەمی خۆی، هەرچی زیاتر لە خزمەت کۆتا فەرمایشتیدا بین، قورئانی مەزن، قورئانی بە پێزو، لە ژێر سایەی ڕێبازی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ ڕێ بکەین و بڕۆین، تاکو هەم لە دنیادا سەر بەرزو ڕێك و ڕاست و پاك و چاك بین و، هەم لە ڕۆژی دواییشدا سەربەرزو سەرفراز بین، کاتێك بە خزمەتی خواو بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێغەمبەرانی دیکەو، دۆستانی خوا دەگەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

# دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمــڕۆ (٢٩)ی مانگــی (ذي القَعــدة)، {واتــە: مانگــی (١١)}ی ســاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی، بەرانبـەر (٢٠)ی تەممـووز، {واتـە: مانگـی (٧)}ی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زایینییـە لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الغاشية)، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت بڕگەدا دەخەینـە ڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الغاشية) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

نـاوی باوتـری ئـەم سـوورەتە بریتیـە لە: (سـوُرةُ الغَاشـية)، هـەردووك نـاوی: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَـٰشِيَةِ﴾ و ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ﴾شـی بـۆ بەکارهێـنراون، بـەڵام زیاتـر هـەر بـە: (سـوُرَةُ الغَاشـية) نـاسراوە.

### دووەم: شوێنی دابەزین:

بـە ڕای تێکـڕای زانایـان ئـەم سـوورەتە مەککەییـەو، لـە شـاری مەککـە دابەزیـوە، لـەو بـارەوەش ئـەم گێڕدراوەیـە هەیـە:

(عَـن عَبـدِ اللـهِ ابْـنِ عَبَّـاس ﷺ، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ الغَاشِـية بِمَكَّـة} (أورده السـيوطي فِي الـدر المنثـور: ج٨، ص٤٩٠، ونسـبه لابـن الضَّريـس وَالنحَّـاس والبَيهقـي وابـن مُردَوَيْـه،

**وَقـال: أخـرج ابـن مَرْدَوَيـه عَـن عَبْـدِ الله ابْـنِ الزُّبَـيرِ رضي الله عنهـما مثلـه، الإسـتِيعاب فِي بَيـان الأَسـباب:** ج٣، ص٥١١).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﷺ گوتوویەتـی: سـوورەتی **(الغاشـية)** لـە مەککـە هاتۆتـە خـوار.

هەروەهـا **(السيوطي)**، گوتوویەتـی: **(إبـن مُرْدَوَيـه)** هەمـان قسـەی لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـرەوە (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) هێنـاوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە **(مُصْحَـف)**دا، ژمارەکـەی: (٨٨)ە، لـە سـوورەتی **(الفاتحـة)** کـە دێـی لـە لای ڕاسـتەوە (٨٨)مین سـوورەتە، لـە ڕیزبەندیی دابەزینیشـدا، ژمارەکـەی (٦٧)ە، پێـش سـوورەتی **(الكَهْف)** و، دوایی سـوورەتی **(الذَّاريات)** دابەزیوە، بـە ڕای ژمارەیـەك لـە زانایـان، چونکـە وەك زۆرجـاران گوتوومانـە: دەگونجـێ زانایـەکی دیکـە بڵـێ: نەخێـر ژمـارە (٦٠)ە، یەکێـکی دیکـە بڵـێ: نەخێـر ژمـارە (٧٠)یـە، ئـەوە شـتێکی ئیجتیهادییـەو زانایـان بەکۆششـی خۆیـان ڕیزبەندیـی سـوورەتەکانیان دانـاوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی بە یەکدەنگیی زانایان: بیست و شەش(٢٦) ئایەتە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە موبارەکە چوار تەوەری سەرەکیی گرتوونە خۆی، کە ئەمانەن:

١- لە حەوت ئایەتەکانی: (١ - ٧)دا، باسی هاتنی ڕۆژی دوایی و، خراپیی حاڵ و باڵی بێبڕوایان و، ئازارو ئەشکەنجەو مەینەتییەکانیان لە دۆزەخدا، لە ڕۆژی دواییدا، کراوە.

٢- لە نۆ ئایەتەکانی: (٨ - ١٦)دا، باسی بڕوادارانی چاکەکارو نازو نیعمەتێك کە لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێیان دەکات و، لێی بەهرەمەند دەبن، کراوە.

٣- لە چوار ئایەتەکانی: (١٧ - ٢٠)دا، باسی سەرنج ڕاکێشانی خوا سبحانە و تعالی بۆ مرۆڤەکان کراوە، کە سەرنج بدەنە چوار لە دروستکراوە سەرسوڕهێنەرەکانی:

١- حوشتر، یان حوشترەکان.

٢- ئاسمان.

٣- چیایەکان.

٤- زەوی.

٤- لە شەش ئایەتەکانی: (٢١ - ٢٦)دا، باسی فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە لەسەر ئەرك و کاری خۆی، کە بیر خستنەوەو ئامۆژگارییە بەردەوام بێ، ئەو لەسەری پێویست نیەو، ئەرکی نیە، هیدایەتی خوا بسەپێنێ و ناشیسەپێنێ، گەڕانەوەش بۆ لای خوایە، لێپرسینەوەش بەس کاری خوای بەرزی مەزنە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

سێ تایبەتمەندیی سەرەکییمان لەم سوورەتە موبارەکەدا، کەوتوونەتە بەرچاو، کە جیاکەرەوەینی لە سوورەتەکانی دیکە:

١- یەکسەر خستنەڕووی سەرەنجامی کۆمەڵێکی شووم و بێخێرو، کۆمەڵێکی گەش و دڵخۆشی ڕۆژی دوایی، کەسانیك، بێئەوەی ناویان بهێنرێ، بەڵام دەزانرێ کە کۆمەڵی یەکەم بێبڕوایانن و، کۆمەڵی دووەمیش بڕوا دارانن، ئەمە لە ئایەتەکانی: (١ - ١٦)دا، هاتوە.

٢- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە موحەممەد ﷺ بەس بیرخەرەوەیە، لێپرسینەوەو سزاو پاداشت بەس هی خوایە، ئەمیش لە ئایەتەکانی: (٢١ - ٢٦)دا، هاتوە.

٣- چەند وشەو تەعبیرێك تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون:

١- (نَّاصِبَةٌ).

٢- (ضَرِيعٍ).

٣- (وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ).

٤- (وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ).

٥- (أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ).

٦- (لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ).

٧- ( فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ).

٨- (إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ).

## حەوتەم و كۆتایی: دابەشكردنی ئایەتەكان:

ئێمە كۆی ئەو بیست و شەش (٢٦) ئایەتە، دەكەینە دەرسێك، بە هەر چوار تەوەرو بابەتەكەیەوە، چونكە تەوەرو بابەتەكانی ئەم سووڕەتە موبارەكە، زۆر تێكهەڵكێشن و وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك یەكدی دەبەستنەوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە کۆی بیست و شەش (٢٦) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکە، پێك دێ، ئەو (٢٦) ئایەتە موبارەکەش، چوار تەوەری بنەڕەتیی دەگرنە خۆیان:

**تەوەری یەکەم:** کە حەوت ئایەتەکانی: (١ - ٧) دەگرێتەوە، حەوت ئایەتی سەرەتا: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِى مِن جُوعٍ ﴿٧﴾﴾، یەکسەر باسی هاتنی ڕۆژی دوایی، دوایی یەکسەر باسی خراپیی حاڵ و باڵی بێبڕوایان و، ئازارو ئەشکەنجەو مەینەتییەکانیان، لە ڕۆژی دواییدا و، هەم لە نێو دۆزەخدا، خوا پەنامان بدات.

**تەوەری دووەم:** کە نۆ ئایەتەکانی: (٨ - ١٦) دەگرێتە خۆی، باسی بڕوادارانی چاکەکارو، نازو نیعمەت و خێرو خۆشییەك کە لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێیان دەکات: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِىُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾﴾، کە باسی نشینگەو شوێنی نیشتەجێبوونی بڕواداران و، باسی ئەو کەل و پەل و پێداویستییانەی بەکاریان دێنن، کراوە.

**تەوەری سێیەم:** کە لە چوار ئایەتی (١٧ - ٢٠) دایە، سەرنجڕاکێشانی خوا سبحانه و تعالی بۆ مرۆڤەکان، کە ڕامێنن و تەماشا بکەن و سەرنج بدەن، لە چوار لە دروستکراوە سەرسوڕهێنەرەکانی:

**١-** حوشترەکان، چۆن دروستکراون!.

**٢-** ئاسمان چۆن بەرز کراوەتەوە!.

٣- چیایەکان چۆن چەسپێنراون و داکوتراون بە زەویدا!.

٤- زەوی چۆن پانڕاخراوە!.

﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾﴾.

تەوەری چوارەم: کە لە شەش ئایەتی کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکە دایە، ئایەتەکانی: (٢١ - ٢٦)، فەرمانکردنی خوا سبحانە و تعالی بە پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ کە لەسەر ئەرك و کاری خۆی، کە بیرخستنەوەو ئامۆژگارییە، بەردەوام بێ و، لەسەری پێویست نیە هیدایەتی خوا بسەپێنێ بەسەر خەڵکداو، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش کە گەڕانەوەی هەموو مرۆڤەکان و هەموو دروستکراوەکان، تەنیا بۆلای خوایەو، لێپرسینەوەش تەنیا کاری خوایەو، خوا سبحانە و تعالی تەنیا خۆی لە مرۆڤەکان دەپرسێتەوەو دەپێچێتەوە، سزاو پاداشتیان بۆ دیاری دەکات: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾﴾.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِى مِن جُوعٍ ﴿٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِىُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ

رُفِعَتۡ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ﴿٢٠﴾ فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ﴿٢١﴾ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَكۡبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيۡنَآ إِيَابَهُمۡ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. ئایا باس و خواسی (قیامەتی) داپۆشەرت بۆ هاتوە! ﴿١﴾ رووانێك لەو رۆژەدا بزركاوو زەبوونن ﴿٢﴾ ئیشكەری ماندوو (و رەنجەڕۆ)ن ﴿٣﴾ بە ئاگرێكی (یەكجار) گەرم (دەپیشێنرێن و) دەسووتێنرێن ﴿٤﴾ لە كانییەكی ئەوپەڕی گەرم، پێیان دەنۆشرێ ﴿٥﴾ خواردنیان نیە، جگە لە حوشتر خۆركە ﴿٦﴾ نە (مرۆڤ) قەڵەو دەكات و، نە برسیەتیی لادەبات (و نە سوودێك دەگەیەنێ) ﴿٧﴾ رووانێك لەو رۆژەدا گەش و بەدەون ﴿٨﴾ لە كۆششی (دنیایی) خۆیان ڕازیین ﴿٩﴾ لە باخێكی بڵند دان ﴿١٠﴾ هیچ قسەیەكی پووچی تێدا نابیستن ﴿١١﴾ سەرچاوەیەكی لەبەر ڕۆیشتووی تێدایە ﴿١٢﴾ تەختە بەرزكراوەكانی تێدان ﴿١٣﴾ هەروەها دەفرە (پێخۆرەوە) دانراوەكان ﴿١٤﴾ دیسان باڵنجە ڕیز كراوەكانیش ﴿١٥﴾ هەروەها فەرش و بەڕە بڵاو كراوەكانیش ﴿١٦﴾ ئایا لە حوشترانەوە ڕانامێنن، چۆن دروستكراون؟ ﴿١٧﴾ هەروەها لە ئاسمانەوەش، چۆن بڵند كراوە؟ ﴿١٨﴾ دیسان لە چیایەكانیش، چۆن چەسپێنراون؟ ﴿١٩﴾ هەروەها لە زەویش، چۆن پانڕاخراوە؟ ﴿٢٠﴾ دەجا بیریان بخەوە، بێگومان تۆ تەنیا بیرخەرەوە (و ئامۆژگار)ی ﴿٢١﴾ تۆ بەسەریانەوە سەپێنەری (هیدایەتی خوا) نی ﴿٢٢﴾ جگە لە كەسێك كە پشتی هەڵكردو بێبڕوا بوو ﴿٢٣﴾ ئەو خوا ئازاری هەرە گەورەی دەدات ﴿٢٤﴾ بە دڵنیایی گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای ئێمەیە ﴿٢٥﴾ دوایی لێپرسینەوەشیان بەس لەسەر ئێمەیە ﴿٢٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکانە

(ٱلْغَٰشِيَةِ): (غَشِيَهُ غِشَاوَةً وَغِشَاءً: أَتَاهُ إِتيَانَ مَا قَدْ غَشِيَهُ، وَغَشِيَهُ: سَتَرَهُ، وَالغِشَاوَةُ: مَا يُغَطَّى بِهِ الشَّيْء، وَالغَاشِيَةُ: نَائِبَةٌ تَغْشَاهُ)، وشەی (غَاشِيَة) لە (غَشِيَه) ەوە هاتووە، (غَشيَهُ، غِشَاوَةً، غِشَاءً)، واتە: داپۆشی، (أَتَاهُ إِتيَانَ مَا قَدْ غَشِيَهُ)، بە شێوەیەك بۆی هات، وەك هاتنی شتێك كە دایدەپۆشێ، (وَغَشِيَهُ: سَتَرَهُ، والغِشَاوَةُ: ما يُغَطَّى بِهِ الشَّيْء)، غَشِيَهُ: داپۆشیی (غِشَاوَة): هەر شتێكە شتێكی دیكەی پێ داپۆشرێ (وَالغَاشِيَةُ: نائِبَةٌ تَغْشَاهُ) بەڵایەك كە دایاندەپۆشێ و هەموویان دەگرێتەوە.

(عَامِلَةٌ): ئیشكەر، یان: ئەو كەسانەی ئیشكەرن، (العَمَلُ: كُلُّ فِعْلٍ يَكُونُ مِنْ حَيَوانٍ بِقَصْدٍ فَهُوَ أَخَصُّ مِنَ الفِعْلِ)، (عَمَل): بریتیە لە هەر كردەوەیەك لە ژیانداریك كە بە مەبەستەوە ئەنجام بدرێ، بۆیە (عَمَل) لە (فِعْل) تایبەتترە، (فِعل) پاڵدەدرێتە لای جگە لە ژیانداریش، با بە مەبەستەوەش نەبێ، بەڵام (عَمَل) ئەوەیە نیاز و مەبەستێكی لە پشتەوە بێ، بە زۆرییش پاڵدەدرێتەوە لای ژیانداران.

هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: (عَامِلَةٌ): ئەوانەن لە دنیادا كار دەكەن، بەڵام بە جگە لە ڕێی خواداو، تەنیا ماندووبونیان پێ دەبڕێ.

هەندێكیش وایان لێكداوەتەوە: (عَامِلَةٌ)، یانی: لە دۆزەخدا كار دەكەن و بێگاریان پێ دەكرێ، وەك دوایی باسی دەكەین.

ئێمەش مانای دووەمیان هەڵدەبژێرین و لەگەڵ ڕەوتی ئایەتەكاندا دەگونجێ.

(نَّاصِبَةٌ): (النَّصْبُ وَالنَّصَبُ: التَّعَبْ)، (نَصْب ونَصَبْ)، هەردووكیان بە مانای ماندوبوونن، دەگوترێ: (أَنْصَبَنِي كَذَا، أَيْ: أَتْعَبَنِي وَأَزْعَجَنِي)، واتە: ماندووی كردم

و بێـزاری کـردم، (**فَهُـوَ نَصِبٌ وَناصِبٌ**)، ئـەو ماندووویـە، (**نَصيب**)یشـی بـۆ بـەکاردێ و (**ناصِبِ**)یشـی بـۆ بەکاردەهێـنرێ، کـۆی (**ناصِب**)یـش، (**نَاصِبَة**)یـە، واتـە: مانـدووەکان، ڕەنجەڕۆیـەکان، کـە مانـدوو و بێـزار دەبـن و، نارەحـەت دەبـن.

(تَصۡلَىٰ): (**أَصْـلُ الصَّـلِي: الإِيْقَـادُ بِالنَّـارِ، صَـلِيَ بِالنَّـارِ وَبِكَـذا: بُـلِيَ بِهَـا وَاصْطَـلَى بِهَـا، وَصَلَيْـتُ الشَّـاةَ أَيْ: شَـوَيْتُهَا وَهِـيَ مَصْلِيَّـةٌ**)، وشـەی: (**صَـلِي**) لـە ئەسـڵدا بـە مانـای ئاگردانەبـەرە، شـتێك ئاگـری بدەیـە بـەرێ، دەگوتـرێ: (**صَـلِيَ بِالنَّـارِ وَبِكَـذَا، أَي: بُـلِيَ بِهَـا**)، واتـە: پێـی ئـازاردرا، پێـی نارەحـەت کـرا، بـە ئاگـر یـان بـە هـەر شـتێکی دی، (**وَاصْطَـلى بِهَـا**)، بـە هەمـان شـێوە: پێـی ئـازاردرا، پێـی نارەحـەت بـوو، (**وَصَلَيْـتُ الشَّـاةَ: شَـوَيْتُها**)، واتـە: مەڕەکـەم برژانـد، (**وَهـيَ مَصْلِيّـةٌ**)، ئـەو برژێنـدراوە، بـەڵام بـە شـێوەیەکی تایبـەت، (**شـاةٌ مَصْليَّـة**) وەك زانایـان بـە تایبـەت (**فَخْـرَ الدِّيـن الـرَّازي**) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا، دەڵـێ: ناگوتـرێ، (**شَـاةٌ مَصْلِيَّـة**)، هەتـا نەخرێتـە نێـو کۆمەڵێـك پشـکۆی ئاگـرەوە لـە هـەر چـوار دەورەی، پشـکۆ ئاگـرەکان تینـی بـۆ بێنـن، یـان ببیشـێ، یـان لـە هەمـوو لاوە بـبرژێ، ئنجـا پێـی دەگوتـرێ: (**مَصْلِيَّـة**).

(حَامِيَةً): (**الحَمِـيُ: الحَـرَارةُ المُتَوَلِّـدَةُ مِـنَ الجَوَاهِـرِ المَحْمِيَّـةِ كَالنَّـار وَالشَّـمْسِ، وَحَامِيَـةٌ أَي: حَـارَّةٌ**)، (**حَمِـي**): بـە گەرمییـەك دەگوتـرێ، لـەو شـتانەی لـە خـودی خۆیانـدا گەرمـن، وەك ئاگـرو خـۆر، پەیدا دەبـێ (**حَامِيَةٌ أَيْ: حَـارَّةٌ**)، گـەرم، ﴿ تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴾، ئاگـر هـەر گەرمـە، خـوا کـە دەفەرمـوێ: ئاگرێکـی گـەرم، مانـای وایـە گەرمییەکـەی ئـەو گەرمییـە نیـە، کـە ئێمـە دەیزانیـن.

(ءَانِيَةٍ): (**أَنَى الـشَّيءُ وَءانَ، أَيْ: قَـرُبَ إِنَـاهُ**)، واتـە: کاتـی گەیشـتنی، شـتەکە هـات، یانـی: (**قَـرُبَ إِنَـاهُ، أَيْ نَضْجُـهُ**)، کاتـی کوڵینـی، کاتـی برژانـی، کاتـی پێگەیشـتنی نیزیـك بۆتـەوە، (**حَميـمٍ آنٍ، أَي: بَلَـغَ إِنَـاهُ مِـنْ شِـدَّةِ الحَـرِّ**)، ئاوێـك کـە گەیشـتۆتە ڕادەی کوڵیـن، ئەوپـەڕی کوڵیـن و پێگەیشـتنی لەبـەر زۆر گەرمیـی.

(ضَرِيعٍ): (يابس، الشِّبْرِق أَوْ نَبَاتٌ أَحْمَرٌ، يَرْمِي بِهِ البَحْرُ)، (ضَرِيعٍ): هەندێك گوتوویانە: (شِبريق) بە كوردیی (حوشترخۆركە)ی پێ دەڵێن، گیایەكی دڕكاوییە بەس حوشتر دەیخوات، ئەویش بەتەڕیی كە وشك بۆوە نایخوات، بە وشكیی پێی دەگوترێ: (ضَرِيعٍ)، بەڵام بە تەڕیی پێی دەگوترێ: (شِبْرق)، هەندێكیش گوتوویانە: (ضَرِيعٍ)، ڕووەكێكی سوورە، دەریا فڕێی دەدات، تاڵ و ژەهراوییەو ناخورێ.

(نَّاعِمَةٌ): (نَعَّمَهُ تَنْعِيماً وتَنَعَّمَ: جَعَلَهُ فِي نِعْمَةٍ، أَيْ: لِيْنِ عَيْشٍ، وَطَعَامٌ نَاعِمٌ وَجَارِيَةٌ نَاعِمَةٌ)، واتە: (نَعَّمَهُ تَنْعِيْماً)، نازداری كرد، خۆشیی و لەززەتی پێدا، (فَتَنَعَّمَ)، ئەو بەهرەمەندە، (جَعَلَهُ فِي نِعْمَةٍ)، خستیە نێو نازو نیعمەت و خۆشییەوە، كە بریتیە لە ژیانێكی نەرم و خۆش، (طَعَامٌ نَاعِم)، خواردنێكی خۆش و بەتام و چێژ، (وَجَارِيَةٌ نَاعِمَة)، كەنیزەكێك جەستەی نەرم و ناسك بێ.

(لَٰغِيَةً): (اللَّغو مِنَ الكَلَامِ: مَا لا يُعْتَدُّ بِهِ)، (لَٰغِيَةً)، (لاغِية): بە مانای قسەی پووچە، ئەو قسەیەی گرنگیی و بایەخی پێ نادرێ، (لَٰغِيَةً): (أَيْ: لَغو، مِثْلُ كَاذِبَة بِمَعْنى الكَذِبْ)، (لَٰغِيَةً): بە مانای قسەی پووچە، وەك چۆن (كَاذِبَة)، بە مانای (كَذِبَ) درۆیە.

(راغب الأَصفهاني)، دەڵێ: (اللغو: هُوَ صَوتُ العَصَافِير)، (لغو) دەنگی پاساریی و چۆلەكەیە، بۆ ئێمە هەر جریوە جریوەو هیچ مانایەكی نیە، بەڵام بێگومان بۆ خۆیان مانای هەیە، هەموو ئەو باڵندەو زیندەوەرانە دەنگیان هەیەو بێگومان پێی لێك تێدەگەن، بە ئەندازەی ئەوەی كاروباری نێو خۆیان بەڕێوە بەرن.

(وَنَمَارِقُ): (جَمْعُ نُمْرُقَة، وَهِيَ وِسَادَةٌ صَغِيرَةٌ، وَالنِّمْرِقَةُ لُغَةٌ)، (نمارق) كۆی (نُمْرُقة) یەو بریتیە لە باڵنجی گچكە، شانی لەسەر دادەنرێ، بە (نِمْرِقة)ش هاتوە، لە زارێكی دیكەدا، ﴿ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴾، واتە: باڵنجە ڕیزكراوەكان، ئەو شوێنانەی هی خەڵكی ئاسوودەو خۆشگوزەرانن، باڵنج بەڕیز دادەنرێن و خەڵكەكە شانیان لەسەردا دەدات.

(وَزَرَابِيُّ ): (جَمْـعُ زَرْبِيّ، وَهـوَ البِسَـاطُ، أَوِ الطُّنْفُسـةُ فَـوْقَ الرَّحْـل)، (بِسَـاط) واتـە: بـەڕەو فـەڕش، یـان (طُنْفسَـة) پۆشـاكێكی نەرمـە لەسـەر كورتـان دادەنـرێ و پێـی دەگوتـرێ: سـەرجل، (طِنْفِسَـة وَ طَنْفُسـة وَ طَنْفِسة)شـی، پێدەگوتـرێ، لـە بـارەی ( وَزَرَابِيُّ )ەوە زانایـان زۆر قسـەیان لێوەكـردوەو، دواتریـش مـن قسـەیەكی لـە بارەوە دەكـەم.

گوتوویانـە: ( وَزَرَابِيُّ ): (جَمْـعُ زَرِيـب، وَهُـوَ ضَرْبٌ مِـنَ الثِّيَـابِ مُطَـرَّزٌ مَنْسـوبٌ إِلى مَوْضِـعٍ)، (وَزَرَابِيُّ) كـۆی (زَرِيبَة)یـە، جۆرێكـە لـە پۆشـاك دەچـنرێ و دەڕازێنرێتـەوە، پاڵدراوەتـە لای شـوێنێك ئەمـە ڕایەكـی زانایانـە.

بـەڵام دوایـی ڕای خـۆم دێنـم و دەری دەخـەم كـە (زَرَابِيُّ) ئەسـڵێكی نیـە لـە زمانـی عەرەبیـی دا، چونكـە وشـەیەكی فارسـیی، یاخـود كوردییە.

(بِمُصَيْطِرٍ ): (مُصَيْطِـر) به (ص) و (مُسَـيْطِر) به (س)، بـە هەردووكیان خوێنراوەتەوە، {مُسَـيْطِر أي: قَـامَ عَلَيْـهِ قِيَـامَ سَـطْرٍ}، وەك چـۆن دێڕێـك ڕاسـت دەكـرێ، بەسـەریەكەوە ڕێـك وەسـتاوە، ئـاوا بەسـەریەوە وەسـتا، وەك خـوای مـەزن دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴿٣٣﴾ ﴾المدثـر، واتـە: ئایـا ئـەو كەسـەی ڕاوەسـتاوە بەسـەر هـەر كەسـێكەوە، داخـۆ چـی دەكات! كـە خـوای پـەروەردگارە و، خۆشـی ئـاگاداری هەمـوو شـتێكەو، فریشتەكانیشـی بەسـەریەوە وەك چاودێـر دانـاون.

(إِيَابَهُمْ ): (آبَ أَوْبـاً، وإِيَابـاً وَمَآبـاً، أَيْ: رَجَـعَ)، آب: گەڕایـەوە، (أَوْبـاً، وإِيَابـاً، وَمَآبـاً) هەرسـێكیان چاوگـن، یانـی: گەڕانـەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا سـبحانه و تعالـی دەفەرمـوێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، ئەمـەش یـانی:

١- خوێندنی ئەم سوورەتە دەست پێدەکەم و بە ناوی خوا دەیخوێنم.

٢- بەپێی بەرنامەیەك کە خوا دایناوە، دەیخوێنم.

٣- بۆ خوا دەیخوێنم و، چاوەڕێی پاداشتەکەی لە خوا دەکەم.

٤- بە هەوڵ و توانایەك کە خوا بۆی ڕەخساندووم، دەیخوێنم.

﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ﴾، ئایـا بـاس و خـواسی داپۆشـەرت بـۆ هاتـوە؟ گومانـی تێـدا نیـە، ڕووی دوانـدن لـە پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ بەپلـەی یەکـەم، لـە دوای ئەویشـەوە ڕوو لـە هـەر کەسـێکە بـە ڕێـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺدا دەڕوات و، هـەر کەسـێك کـە قوڕئـان دەخوێنـێ و، شایستەی ئەوەیە خـوا بیدوێنـێ، ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ﴾ ئایـا بـاس و خواسـی داپۆشـەرت بـۆ هاتـوە، واتـە: ئایـا بـاس و خواسـی ئـەو ڕووداوەی هەمـوو شـتێك دادەپۆشـێ، بـە تـۆ گەیشـتوە؟ ﴿أَتَىٰكَ﴾، (أَيْ بَلَغَـكَ)، پێـت گەیشـتوە، بێگومـان مەبەسـت لـە: ﴿ٱلْغَٰشِيَةِ﴾ ڕۆژی دواییـەو، یەکێکـە لـە ناوەکانـی ڕۆژی دوایـی، لەبەرئـەوەی ڕۆژی دوایـی، بـەو هەمـوو ناڕەحەتیـی و دژواریـی و سـەختییانەی تێیـدان، هەمـوو شـتێك دادەپۆشـێ و، هەمـوو کەسـێك دادەپۆشـێ، بۆیـە خـوا سـبحانه و تعالـی ئـەو نـاوەی لێنـاوەو، کاتـی خۆیشـی ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (القيامـة)دا، کورتـە باسـێکمان لـە بـارەی ڕۆژی دواییـەوە کـرد، ڕۆژی دوایـی بـە هـەردووك قۆناغـی: تێکچوونـی ئـەم گەردوونـە (سـاعة)و، دووبـارە زیندووکرانـەوەی خەڵـك و هەڵسـێنرانەوەیان (قیامـة)، ئاخیـر زەمـان و قیامـەت، کـە هـەر کامێکیـان لـەو دوو قۆناغـە، خـوا چەنـدان نـاوی بـۆ بەکارهێنـاون و، لـەو کورتـە باسـەدا هێناومانـن[1].

---

(١) بـاس و خـواس و لێکۆڵینـەوەی تێـرو تەسەلیشـمان لـە بـارەی ڕۆژی دوایـی (اليـوم الآخر)ەوە

ئنجا یەكێك لەو ناوانەی ڕۆژی دوایی، بریتیە لە: ﴿ٱلۡغَٰشِيَةِ﴾ داپۆشەر، ئایا باس و خواسی داپۆشەرت بۆ هاتوە، ئنجا خوا سبحانه و تعالی كە ئەمەمان بە یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی ئەم سوورەتە موبارەكە دانا یەكسەر دێتە سەر پۆلێنكردنی خەڵك لەو ڕۆژەدا بۆ دوو بەش:

بەشی یەكەمیان: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ﴾، ڕووانێك (كەسانێك) لەو ڕۆژەدا بزركاوو زەبوون و شپرزن، وشەی: (خُشوع)، بە مانای ملكەچیی و زەبوونیی دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای هەڵبزركان و ترس و لەرز لێنیشتن و مات و مەلوول بوونە، ﴿عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ﴾، ئیشكەری ڕەنجەڕۆن، ئیشكەری ماندوون، ﴿عَامِلَةٞ﴾ كۆی (عامل)ە، واتە: ئیشكەر، (عاملة)ش كۆیە، ئەو ڕووانە، خاوەنانی ئەو ڕووانە ئیش دەكەن، ﴿نَّاصِبَةٞ﴾ كۆی (ناصِب)، یان (نَصِبْ)ە، یانی: ماندوو، ئیش دەكەن و ماندوون، ڕوونكەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست كەسانێكە كە لە دنیادا بە جۆرێك خۆیان ماندوو دەكەن و كار دەكەن بۆ خوا، بەڵام چونكە بە ڕێی خوادا نیەو خوا لێی ڕازی نیە، بۆیە ماندوو دەبن و كار دەكەن، بەڵام بەس ماندوو بوون و ڕەنج دانیان پێدەبڕێ.

بەڵام باشتر وایە وا لێكبدرێتەوە كە هەر لە ڕۆژی دواییدا، وەك چۆن هەڵبزركان و مات و مەلوول بوون، ڕوو لە دەم و چاویان دەكات، بەهەمان شێوە، لە دۆزەخیشدا هەر ئیش دەكەن و زۆریش ماندوو دەبن، ئیشكردنەكەشیان ئەو سۆغرەو بێگارەیە، كە پێیان دەكرێ لە دۆزەخدا و، ئیشەكەیان هیچ سوودێكی بۆ ئەوان نیە، بەس ماندوبوون و ڕەنج دانە.

﴿تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ﴾ بە شێوەیەكی تایبەت - كە پیشان و برژانە - دەسووتێنرێن بە ئاگرێكی زۆر گەرم، ئاگر بۆ خۆی هەر گەرمە، بەڵام كە خوا دەفەرموێ: ﴿نَارًا حَامِيَةٗ﴾، ئاگرێكی گەرم، مانای وایە گەرمییەكەی گەرمییەكی نائاساییەو،

---

لە كتێبی هەشتەمی: (موسوعة: الإسلام كما يتجلىّ في كتاب الله)، (الإيمان باليوم الآخر)دا كردوە.

ئـەو گەرمییـە نیـە کـە ئێمـە دەیزانیـن، پێشـتریش باسـمان کـرد، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: {إِنَّ نَارَكُـمْ هَـذِهِ جُـزْءٌ مِـنْ سَـبْعِينَ جُـزْءًا مِـنْ نَـارِ جَهَنَّـمَ} (أخرجـه أحمـد: ٧٣٢٣)، واتـە: ئـەو ئاگـرەی ئێـوە بەشـێکە لـە حەفتـا بـەش لـە ئاگـری دۆزەخ، واتـە: ئاگـری دۆزەخ حەفتـا هێنـدە گەرمـە، ﴿تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ﴾، لـە کانیـی و سـەرچاوەیەك کـە ئاوەکـەی ئەوپـەڕی داغ و گەرمـە، پێیـان دەنـۆشرێ، ﴿ءَانِيَةٍ﴾، دەگوتـرێ: (أَنى وَآنَ الطَّعَـامُ أَي: نَضُـجَ)، خواردنەکـە پێگەیشـت و کوڵیـی، ئـەدی خۆراکیـان چییـە؟ ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾، خواردنیـان نیـە مەگـەر لـە حوشتر خۆرکـە: ﴿ضَرِيعٍ﴾، ئەمیـش بـە: (يَابِـسُ الشِّـبْرِقِ)، مانـا کـراوە، حوشـترخۆرکەی وشـك، ڕووەکـی حوشـترخۆرکە، کـە وشـك دەبـێ پێـی دەگوتـرێ: ﴿ضَرِيعٍ﴾، حوشـترخۆرکەش تەنیا حوشـتر دەیخـوا، بۆیـە ئـەو نـاوەی لێنراوە، گیایەکـی دڕکاویـی و تـاڵ و ناخۆشـە، بـە زۆریـی لـە بیابـان دەڕوێ، ئـەوان خواردنیـان تەنیـا ئەوەیـە.

یەکێـك بـۆی هەیـە بڵـێ: ئـەدی بۆچی لـە شـوێنی دیکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ۝٣٦﴾ الحاقة، خواردنیـان نیـە مەگـەر لـە کێـم و زووخاو ﴿غِسْلِينٍ﴾؟!.

وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە دۆزەخ شـوێن شـوێنەو، لـە شـوێنێك دا تەنیـا: ﴿غِسْلِينٍ﴾ دەخـۆن و، لـە شـوێنێك دا تەنیـا: ﴿ضَرِيعٍ﴾، دەخـۆن و، لـە شـوێنێکی دیکـەدا: ﴿زَقُّومٍ﴾، دەخـۆن.

یاخـود حاڵـەت حاڵەتـەو، خـوای کارزان و دادگـەر خواردنەکانیـان بـۆ جـۆراو جـۆر دەکات و، ماوەیـەك ﴿ضَرِيعٍ﴾یـان پێـدەدەن و، ماوەیـەك ﴿غِسْلِينٍ﴾یـان پێـدەدەن و، ماوەیـەك ﴿زَقُّومٍ﴾یـان پێـدەدەن، ماوەیـەك شـتێکی دیکەیـان پێـدەدەن، ﴿لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ﴾، ئـەو خواردنـە نـە قەڵـەو دەکات، نـە کەلێنـی برسـییەتییش دەگـرێ، واتـە: نـە برسـێتیی لە مـرۆڤ دوور دەخاتەوەو، نـە دەبێتە هـۆی قەڵەوبوونی مرۆڤیـش، نـە گۆشـتی پێدەگـرێ و، نـە برسـێتییشـی لادەبـات، ئـەو خۆراکـە هیـچ سـوودێکی نیـە، ئـەوە کۆمەڵـێ یەکـەم، کـە لـە ڕۆژی هاتنـی ئـەو بـەڵا داپۆشـەرەدا، خەڵـك دەبنـە ئـەو دوو کۆمەڵـە.

کۆمەڵی دووەم: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴾، خوا سبحانه و تعالی بە (و)ی بادانەوە (**واو العطف**) ئەم کۆمەڵەی نەگێڕاوەتەوەو با نەداوەتەوە سەر کۆمەڵەی یەکەم، چونکە زۆر لێك دوورن و لێك جیان، ئەوان لە عالەمی دۆزەخ داو، ئەمان لە عالەمی بەهەشتدا، زۆر لێك جیان، ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴾، ڕووانێك هەن لەو ڕۆژەدا زۆر شادو گەش و بە دەون.

﴿ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴾، لە هەوڵ و کۆششی خۆیان - کە لە دنیادا ئەنجامیان داوە - ڕازیین، زۆر دڵشادو ڕازیین لەو هەوڵ و کۆششەی خۆیان کە کردوویانەو بە ئێرەی گەیاندوون، کە بەهەشتە، ﴿ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴾، لە باخێکی بەرزدان، ﴿ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَاغِيَةً ﴾ لەوێدا (لەو باخەدا) قسەی پووچ نابیستی، قسەیەك کە سوودی نەبێ، چ جای قسەی خراپ! ﴿ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴾، لەوێدا (لەو باخە بەرزەدا) کانیی و سەرچاوەیەکی لە بەر ڕۆیشتووی تێدایە، بەردەوام ئاوی لەبەر دەڕوات.

کە دەفەرموێ: ﴿ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴾، ئەمە مانای ئەوە وانیە تەنیا یەك سەرچاوەی تێدایە، بەڵکو یانی: ئەو سەرچاوانەی تێیدان، ئاوەکەیانیان لەبەر دەڕوات، ﴿ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴾، تەختە بەرزکراوەکانی - لە ڕووی مەعنەویی و ماددییەوە - تێدان، خوا ﷻ دوو جاران وشەی: ﴿ فِيهَا ﴾ی هێناوە، جارێکیان: ﴿ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴾ جاری دووەم: ﴿ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴾، ئنجا ئەوانەی دیکەی هەموویان هێناوە: ﴿ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ ﴾، بۆچی؟

وەڵام:

﴿ فِيهَا ﴾ی یەکەم، باسی کانیی و سەرچاوەو مێرگ و سەوزاییە، ئەمە باسی ژینگەکەیانە.

﴿ فِيهَا ﴾ی دووەم، باسی تەخت و شوێنی ئیسڕاحەت و پشوودانیانە، ئەمەش باسی ماڵ و حاڵ و شوێنی تایبەتییانە، بەڵام ئەوانی دیکە هەموویان کەل و پەل و پێداویستییەکانیانن و، هەر لەو ژینگەو ماڵ و حاڵەشیان دان!! ﴿ سُرُرٌ ﴾ کۆی

(سَرِير)ە‌و، ئەویش ئەو تەختەیە کە خەڵك لەسەری پاڵ دەکەوێ، یان لەسەری شان دەداو، ئیسراحەت دەکات، بەڵام ئەو تەختانە بەرز کراونەوە، ئەمەش هەم بەرز کردنەوەی ڕواڵەتیی دەگەیەنێ و، هەم بەرز کردنەوەی مەعنەوییش، یانی: هەم لە ڕووی ڕواڵەتییەوە بەرزن، هەم لە ڕووی مەعنەویشەوە زۆر نایاب و بە نرخ و چاکن.

﴿ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴾، هەروەها لەو باخەدا دەفرە دانراوەکان هەن، ﴿ وَأَكْوَابٌ ﴾، کۆی (كُوب)ە، زانایان دەڵێن: دەفرێکە هەنگڵی نەبێ، قوڵفی نەبێ، لەو بارەوە زۆر قسەیان کردووە، گرنگ ئەوەیە: ﴿ وَأَكْوَابٌ ﴾، شلەمەنیی پێ دەخورێتەوە، ئنجا: ئاوە، شەڕابە، هەنگوینە، شەربەتە، هەرچی هەیەو دەخورێتەوە، ﴿ مَّوْضُوعَةٌ ﴾، دانراون، ڕۆنراون تاکو پێیان بخورێتەوە.

﴿ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴾، (نَمَارِق) کۆی (نُمْرُقَة) یان (نِمْرِقة)یە، کە بە مانای سەرین و باڵنج دێ، ئەوەی خەڵك شانی لەسەر دادەدا، واتە: باڵنجی ڕیزکراو لەوێدا هەن.

﴿ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ﴾، (زَرَابِيُّ)، زانایان لە بارەی ڕیشەکەیەوە، ئایا لە کوێوەو لە چییەوە هاتوە؟ ڕاجیاییان هەیە، بەڵام وەك پێشتریش گوتوومانە: وا پێدەچێ لە: (زیربی)وە هاتبێ، (زیربی)ش لە ئەسڵدا (ژێرپێ)یە، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا نە پیتی (ژ) هەیە، نە پیتی (پ)، بۆیە (ژێرپێ) بۆتە: (زِيربِي)، وەختێ (ژ)یەکە ببێتە (ز)، (پ) یەکە ببێتە (ب)، دەبێتە (زِيربِي)و کە کۆ دەکرێتەوە دەبێتە (زَرَابِيُّ)، یانی: ئەو بەڕانەی خەڵك پێیان لێ دەنێ و ڕادەخرێن و، پێویست ناکات پێڵاو دابنرێ، کە لەم ڕۆژگارەدا وشەی (کۆمبار) بەکاردێ، بەڵکو ئێستا کەسانێك کە زۆر خۆشگوزەرانن و زێدەڕۆیی دەکەن، لەسەر حیسابی خەڵك و میللەت، فەرشی زۆر نایاب و بە نرخ ڕادەخەن و پێی لێ دەنێن.

﴿ مَبْثُوثَةٌ ﴾ بڵاوکراوەن، لە هەموو شوێنان بڵاو کراون، ئەو بەڕەو ڕایەخانە.

ئنجا خوا سبحانه و تعالی سەرنجی مرۆڤان ڕادەکێشێ بۆ چوار لە دروستکراوەکانی خۆی:

﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾، ئایا سەرنجی حوشترانیان نەداوە چۆن دروستکراون؟، ﴿وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ﴾، هەروەها تەماشای ئاسمانیان نەکردوە چۆن بەرز کراوەتەوە؟ ﴿وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ﴾، دیسان سەرنجی چیایەکانیان نەداوە، چۆن چەقێنراون و چەسپێنراون؟ ﴿وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾، هەروەها تەماشای زەوییان نەکردوە، چۆن پانڕاخراوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا کە خڕو هێلکەییە، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر گەورەیە، وا دەکەوێتە بەرچاو، پانڕاخرابێ.

خوا لە کۆتاییدا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ﴾ بیریان بخەوە تۆ تەنیا بیرخەرەوەی، ئامۆژگارییان بکە، تۆ تەنیا ئامۆژگارییکاری، ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾، دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە، بەسەریاندا دەسەڵاتدار نەکراوی، بە زۆر ئیمان بخەیە دڵیانەوە، ﴿إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ﴾، مەگەر کەسێك پشت هەڵبکاو بێبڕوا بێ، کەسێك پشت هەڵبکاو بێبڕوا بێ: ﴿فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ﴾، خوا سزای هەرە گەورەی دەدا، زانایان دەڵێن: (إلاَّ) لێرەدا بە مانای (لَكِنْ)ە، (لكِنْ مَنْ تَوَلَّى وَكَفَر)، بەڵام کەسێك پشت هەڵبکاو بێبڕوا بێ، خوا سزای هەرە گەورەی دەدا، ﴿إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ﴾ بە دڵنیایی گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیە، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم﴾، دواییش لێپرسینەوەیان تەنیا لەسەر ئێمەیە، کەواتە: تەنیا بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوەو، بۆ هیچ شوێنێکی دیکە ناچن، لێپرسینەوەشیان تەنیا لەسەر ئێمەیەو، لێرە لە قیامەت لەگەڵیاندا یەکلایی دەکەینەوەو، تەسفیەی حیسابیان لەگەڵدا دەکەین، کەواتە: تۆ ئەی موحەممەد! تەنیا پەیامی خوایان پێ دەگەیەنی و، ئەرکی تۆ نیە پەیامی خوایان لەسەر فەرز بکەی، کە لە ڕاستییدا نە پەیامی خواو، نە هیچ بەرنامەیەکی دیکەش، ناگونجێ لەسەر هیچ کەسێك فەرز بکرێ، کەسێك بە زۆر شتێکی لەسەر فەرز بکرێ و، ئەویش ملی بۆ کەچ بکات، ئەوە هەر ملکەچکردنێکی ڕواڵەتییەو، لە حاڵەتی کوفری ئاشکراوە، بردراوە بۆ حاڵەتی کوفری پەنهان، کە نیفاقە، خوای پەروەردگاریش ڕێ نادات لە ئایین و بەرنامەی خۆیدا، خەڵك ناچار بکرێ لەسەر نیفاق و کوفری ئاشکرا یان پەنهان!.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ناوبردنی قیامەت بە داپۆشەرو، باسی هەڵبزرکان و زەبوونیی ڕووی بێبڕوایان و دووچاری کارو بێگارو ماندووبوونی زۆربوونیان و، لە دۆزەخدا بە ئاگرێکی زۆر گەرم و، ئاوێکی یەکجار داغ سزادرانیان و، جگە لە ڕووەکی حوشترخۆرکەش خواردنێکی دیکەیان نیە، ئەویش هیچ سوودێکی نیە، نە بۆ قەڵەو بوون، نە بۆ لابردنی برسیەتیی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَـٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴿٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ﴾ ئایا باس و خواسی داپۆشەرەکەت، بۆ هاتوە؟ ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ و لە پشت ئەویشەوە، هەر کەسێك بشێ بۆ دواندن.

پێشتریش گوتوومانە: ﴿أَتَىٰكَ﴾، یانی: (جَاءَكَ)، لێرەش دا ﴿أَتَىٰكَ﴾ یانی: (بَلَغَكَ)، ئایا پێتگەیشتوە، ﴿حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ﴾، یانی: (خَبَرُ حَدِيثِ الغَاشِيَةِ)، هەواڵ و باس و خواسی داپۆشەرەکە ﴿ٱلْغَـٰشِيَةِ﴾.

کە دەفەرموێ: ﴿هَلْ﴾، ئایا، ئەم پرسیارکردنە، پرسیارکردنە بۆ سەرسوڕمان و مەزن پێشاندان، واتە: باس و خواسی ئەو داپۆشەرە - کە یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی - باس و خواسێکی زۆر گەورەو گرنگەو زۆر جێی سەرسوڕمانە،

(الغَاشيَةُ مِن أَسْماءِ القِيامَةِ، وهي الدَّاهيَّةُ الَّتي تُغَطِّي عَلَى غَيْرِهَا)، ﴿ٱلْغَـٰشِيَةِ﴾ یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، واتە: ئەو بەڵاو گرفتارییەی هەموو شتێك دادەپۆشێ، ئنجا خوای بەرزو مەزن دوای ئەوەی بەو شێوەیە دەستی پێکرد، یەکسەر دێتە سەر پۆلێنکردنی خەڵك لەو ڕۆژەدا بۆ دوو پۆل، دوو کۆمەڵ:

٢)- ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَـٰشِعَةٌ﴾، ڕووانێك لەو ڕۆژەدا هەن، دەم و چاوانێك هەن، ترس و لەرزو سام و بیمیان لێ نیشتوە، هەڵبزڕکاون و داماون، وشەی: ﴿خَـٰشِعَةٌ﴾ ئەو واتایانە هەموویان دەگرێتەوە، زانایان بە: (ذَليلَةٌ ضَعيفَة) مانایان لێکداوەتەوە، واتە: هەم زەبوونن، هەم بێهێزن، بەڵام وێڕای ئەوە: هەڵبزڕکان و ترس و لەرزداگرتن و سام و هەیبەت لێنیشتن، ئەوانەش هەموویان دەگرێتەوە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ﴾، ڕووانێك هەن لەو ڕۆژەدا، واتە: لەو ڕۆژەدا کە داپۆشەرەکە ﴿ٱلْغَـٰشِيَةِ﴾ دێ، بەو شێوەیەن، هەڵبزڕکاون و، ترس و لەرز لێنیشتوون، بە دڵنیایی مەبەست تەنیا ڕووەکان نیە، بەڵکو مەبەست پێی کەسانێکە کە ڕوویان بەو شێوەیە.

ئنجا خوا دێتە سەر چۆنیەتیی سزادرانیان لە دۆزەخداو دەفەرموێ:

٣)- ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾، ئیشکەری ماندووبوون، واتە: لە دۆزەخدا ئیش و کار دەکەن، بێگاریان پێ دەکرێ، وەك چۆن لە دنیاش دا ئەو جۆرە سزایە هەیەو دەگوترێ: فلانکەس بە دە ساڵ زیندانیی حوکم درا، لەگەڵ کارە قورسەکانیش دا (مَع الأَعْمال الشَّاقَّة)، واتە: وێڕای سجن کران، بێگاریشیان پێدەکەن.

واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە ئەو جۆرە کەسانەی ڕوویان هەڵدەبزڕکێ و کزو داماوو مات و مەلوول دەبن لە ڕۆژی دوایی دا، لە دنیادا کاریان کردوە، بەڵام تەنیا ماندووبوونیان پێبڕاوەو، ڕەنجەڕۆ بوون.

﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾، (عَامِل) کە بە ﴿عَامِلَةٌ﴾ کۆکراوەتەوە، واتە: ئیشکەرن، ﴿نَّاصِبَةٌ﴾ش کۆی (ناصِب)ە، واتە: ماندوون، یانی: تەنیا ماندووبوون و ڕەنجدانیان پێبڕاوە، لەو کردو کۆششەی لە دنیادا کردوویانە، چونکە لە ڕێیەکی ڕاستەوە

نەبـووە، وەك خـوای دادگـەر لـە سـوورەتی (الفرقـان)دا دەفەرمـویّ: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾، واتـە: ئـەو کردەوانـەی کردبوویانـن ڕووەمـان تێکـردن و کردمانـن بـە تـۆزو گـەردی بـڵاو.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (إبراهیـم)دا خـوای کاربەجـێ دەفەرمـویّ: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْۖ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيْءٍۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٨﴾ ﴾، واتـە: ئەوانـەی بێبڕوابـوون کردەوەکانیـان لـە ڕۆژیـی دواییـدا وەك خۆڵەمێشـێکە بایەکـی تونـدو بەهێـز لێـی دەدات، ئـەوەی وەدەسـتیان هێنـاوە، دەسـەڵاتیان بەسـەر هیچیـدا نابـێ، ئائەوەیـە گومڕایـی دوور.

بـەڵام وەك پێشـتریش گوتمـان: مانـای یەکەمیـان بەهێزتـرەو، مەبەسـت ئەوەیـە کـە لـە دۆزەخـدا سـزا دەدرێـن، بێگاریـان پێدەکـریّ و کاری قورسـیان پێدەکـریّ، ڕەنـج دەدەن و زۆریـش مانـدوو دەبـن، بەڵگەشـمان لەسـەر ئـەوە کـە ئـەو مانایـە بەهێزتـرە، زۆرن، بـۆ وێنـە:

ئیبنـو تەیمییـە (ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ) لـە: (**مَجمـوع الفَتاوى**)کـەی دا، کـە (**الشـنقيطي**) خـاوەنی: (**أَضْـواءُ البيـان**)[1]، لێـی خواسـتۆتەوە، حـەوت بەڵگـە لـەو بارەوە دێنێتـەوە، منیـش بـە تۆزێـك ڕوونکردنـەوەو دەسـتکارییکردنەوە دەیانخەمـەڕوو:

---

(١) ج٨، ص: ٥١١ - ٥١٣

## کورتە باسێک

## حەوت بەڵگە لەسەر ئەوە کە مەبەست لە: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾، بێگار پێکرانی بێبڕوایانە لە دۆزەخ دا:

### بەڵگەی یەکەم:

لـە ڕووی ڕێزمانـی عەرەبییـەوە وا باشـترە تێدابـوو (**ظَـرف**)، واتـە: ئـەو کاتـەی یاخـود ئـەو شـوێنەی شـتێکی تێـدا ڕوودەدا، پەیوەسـتبێ بـە نزیکتریـن باسـکراو لـە خۆیـەوە، نیزیکتریـن باسـکراویش لـە: (عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ)وە بریتیـە لـە: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ ۝٢﴾، لـەو ڕۆژەدا، لـە ڕۆژێکـدا کـە داپۆشـەرەکە (**غَاشِيَة**) دێ، ڕووانێـك هەڵبـزڕکاوو مەلـوول و دامـاوو کـزن، کەواتـە: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾، هـەر پەیوەسـتە بـەڕۆژی هاتنـی داپۆشـەرەکەوە، کـە ڕۆژی دواییـە، نـەك مەبەسـت ئەوەبـێ، کـە لـە دنیـادا وابـوون.

### بەڵگەی دووەم:

خـوا سـبحانه و تعالـی لـە ئایەتەکانـی دواییـدا، باسـی ڕووەکانـی دیکەشـی کـردوە: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ۝٨ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ﴾، ڕووانێـك لـەو ڕۆژەدا نـەرم و نیـان و خۆشـگوزەرانن، لـە هـەوڵ و کۆششـەکەیان ڕازییـن، باسـی ئەوانیشـی کـردوە، کەواتە: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ، عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾، ڕووانێـك لـەو ڕۆژەدا کـزو دامـاوو مـات و مەلـوول و هەڵبـزڕکاون، ئیشـکەرو مانـدوون، واتـە: لـە دۆزەخـدا، وەك چـۆن ئـەوەی دیکـەش: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ۝٨ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ۝٩ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾، هەمـووی هـەر باسـی ڕۆژیـی دوایـی و بەهەشـتە، لێـرەش دەبـێ هەمـووی هـەر باسـی ڕۆژی دوایـی و دۆزەخ بـێ.

### بەڵگەی سێیەم:

خـوا سـبحانه و تعالـی لـە چەنـد شـوێنێکی دیکـەی قورئانـدا، بـەو شـێوەیە دابەشـکردنی دیکـەی هێنـاوە، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (القيَامـة)دا، خـوای بەخشـەر دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣) وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ (٢٤) تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ (٢٥)﴾.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (عبس)یشـدا لـە ئایەتەکانـی: (٣٨ - ٤٢)دا، دیسـان خـوای بـەرزی مـەزن باسـی هـەردوو جـۆرە کەسـەکان دەکات، واتـە: هـەم باسـی خاوەنـانی ئیـمان، هـەم باسـی خاوەنـانی کوفـر، کـە ڕوویـان چـی لێـدێ، لـە بـارەی بڕوادارانـەوە دەفەرمـوێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ (٣٨) ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ (٣٩)﴾ لـەو ڕۆژەدا ڕووانێـك هـەن، سـپیی و گـەش و جوانـن، دەم بـە پێکەنیـن و دڵخۆشـن، هەروەهـا لـە بـارەی بێبڕوایانیشــەوە دەفەرمـوێ: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ (٤٠) تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ (٤١) أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ (٤٢)﴾، ڕووانێکـی دیکـەش لـەو ڕۆژەدا هـەن، تـۆزو خۆڵـی خـەم و مەراقیـان لێنیشـتوە، دووکـەڵ و ڕەشـایی خەمباریـی و مەینەتباریـی دایگرتـوون و چۆتـە سـەریان، ئائەوانـەن بێبـڕوا تاوانبـارەکان، کەواتـە: لێـرەش خـوا سـبحانه و تعالـی هەمـوو سـیفەتەکانی دوو کۆمەڵەکـە لـە یـەك ڕەوتـدا دێنـێ و، هەمووشـیان پەیوەندییـان بـە ڕۆژی دواییـەوە هەیـە.

### بەڵگەی چوارەم:

خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾، ئەگـەر بڵێین: مەبەسـت پێی سیفەتێکیانە لـە دنیـادا، کـە لـە دنیـادا کاریـان کـردوە، بـەڵام تەنیـا مانـدوو بوونیـان پێبـڕاوە، ئـەو کاتـە ئـەوە گلەیـی و زەم و سەرزەنشـت ناگەیەنـێ، بەڵکـو ئـەوە زیاتـر مـەدح و سـتاییش دەگەیەنـێ، ئـەو پەڕەکـەی ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾ دەبـوو بـە سـیفەتێکی هاوبـەش لـە نێـوان بـڕواداران و بێبڕوایـان دا، ئنجـا ئەگـەر گریـمان مەبەسـت دنیـا بووایـە، خـوا دەیفەرمـوو: (**خَاشِعَةٌ لِلْأَوْثَانْ، عَامِلَةٌ لِغَيْرِي، نَاصِبَةٌ فِي طَاعَةِ الشَّيْطَان**)،

ڕووانێك هەن لەو ڕۆژەدا داماوو ملکەچن بۆ بتەکان، کاریان کردوە بۆ جگە لە من، ماندوو بوون لە فەرمانبەریی شەیتاندا، بەڵام لە هەموو قورئاندا، شتێکی وا نابینین خوا سبحانه و تعالی زەمی کەسانێکی کردبێ، کە لە دنیادا خوایان پەرستوە، با بە هەڵەش بووبێ و لەسەر ئەوە هەڕەشەی لێ کردبن!

**بەڵگەی پێنجەم:**

ئەگەر ئەوە بکرێتە سیفەتی دنیایان، واتە: لە دنیادا کاریان کردوە، بەڵام تەنیا ماندوبوونیان پێبڕاوە، کاریان کردوە بۆ خواو لە دینداریيدا، بەڵام تەنیا ماندووبوون و ڕەنج کێشانیان پێبڕاوە، تایبەت دەبێ بەهەندێك لە بێبڕوایەکانەوە، نەك هەموویان. واتە: تەنیا تایبەت دەبوو بەو کەسانەیانەوە کە خوا پەرستییان کردوە، بەڵام بەشێوەیەکی هەڵە، بەڵام ئەوانەی ئەسڵەن خوایان نەپەرستوە، نەیدەگرتنەوە، بەڵام ئێستا کە دەگوترێ: بێبڕوایان لە ڕۆژی دواییدا لە دۆزەخدا بێگاریان پێ دەکرێ و، ماندووبونیان پێ دەبڕێ، هەموویان دەگرێتەوە.

**بەڵگەی شەشەم:**

ئەگەر ئەوە بکرێتە سیفەتی دنیایان، ئەوکاتە دژ دەوەستێ لەگەڵ ئەوەدا کە لە سیرەو سوننەتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ کە فەرمانی کردوە بە خۆ پاراستن و، واز لێهێنانی ئەوانەی خوا پەرستیی و گۆشەنشینیی دەکەن (**أَصْحَابُ الصَّوَامِعْ**) ئەوانەی لە پەرستگا تایبەتەکاندا خواپەرستیی دەکەن، ئەگەر تەماشای قورئانیش بکەین دەبینین، بەگشتیی پەرستنی خوای پەروەردگار، شتێکی ڕێز لێگیراوە، بەڕاست بێ، یان بە هەڵە بێ، وەك لە سوورەتی (**الحج**)دا خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾﴾، واتە: ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵکی بێبڕواو خراپەکاری بەر پەرچ نەدابایەوە، بە هەندێك خەڵکی دیکە، بە خەڵکی باش و

تێکۆشەرو فیداکار، ﴿ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ ﴾، صەومیعەکان و کڵێسایەکان (ی نەصرانییان)و، کەنیشتەکان (ی جوولەکان) و مزگەوتەکان، کە زۆر یادی خوایان تێدا دەکرێ، تێکدەرووخێنران....

کەواتە: خوا سبحانه و تعالى پێیخۆشە، خوا بپەرسترێ، جەنگ و جیهاد بکرێ، بۆ ئەوەی پەرستگایەکان، کە خوایان تێدا دەپەرسترێ، ئەگەر بە ڕاست بن، ئەگەر بە هەڵە، پارێزراو بن و حورمەتیان نەشکێنرێ.

**بەڵگەی حەوتەم:**

ئەگەر بگوترێ: ئەوانە کەسانێك بوون، لە دنیادا خوایان پەرستوە، بەڵام بە شێوەیەکی هەڵەو تەنیا ماندوبوونیان پێبراوە، ئەمە وەك دەستکارییکردنی فەرمایشتی خوایەو، لێبارکردنی واتایەکە، کە ڕواڵەتەکەی نایگەیەنێ، هەڵبەتە فەرمایشتی خواش سبحانه و تعالى پێویستیی بەوە ناکات، ئێمە مانای دیکەی لێ بار بکەین، ئنجا: ﴿ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴾ یەکسەر لە دوای ﴿ خَاشِعَةٌ ﴾وە هاتوە: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ ۝٢ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴾، بۆیە کافرەکان لە کوێ هەڵبزڕکان و داماویی و کزیی و مات و مەلوولییان تووش دێ، هەر لەوێش کارکردن و ڕەنجەڕۆیی و ماندوو بوونیان بەسەر دێ، کە بریتیە لە ڕۆژی دوایی و دۆزەخ.

٤)- ﴿ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴾، بە شێوەیەکی تایبەت لە ئاگرێکی گەرم دا دەسووتێن، خوێندراویشەتەوە: (**تُصْلَى** نَارًا حَامِيَةً)، واتە: دەسووتێنرێن، بە ئاگرێکی زۆر گەرم، پێشتریش باسمانکرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاگرەکەی ئێوە بەشێکە لە حەفتا بەش، لە ئاگری دۆزەخ، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴾ یانی: دەچێتە نێو ئاگرێکی گەرم، (**تُصْلى**) واتە: دەخرێتە نێو ئاگرێکی گەرم، پێشتر باسی (**صَلِّي**)یمان کرد، کە جیایە لە چوونە نێو، (**صَلِي**) بریتیە لەوەی شتێك بخەیە نێو کۆمەڵێك پشکۆوە بە هەر چوار دەورەیداو بپیشێ، یاخود ببرژێ، واتە: (**صلي**) سووتانێکی تایبەتە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ نَارًا حَامِيَةً ﴾، بێگومان ئاگر هەر خۆی گەرمە: (**الحَمْيُ مِن لَوازِمِ مَاهِيَّةِ النَّار**)، گەرمیی

لە پەیوەستەکانی چییەتی ئاگرە، کەواتە: ئەو ئاگرە گەرمییەکەی گەرمییەکی تایبەتە، جیایە لەو گەرمییەی ئێمە لە دنیادا دەیزانین، هەروەك فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوە ڕوون دەکاتەوە.

٥)- ﴿تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ﴾، پێیان دەنۆشێنرێ لە سەرچاوەیەکی ئەوپەڕی گەرم و داغ، دەگوترێ: (أَنَى المَاءُ وَ آنَ المَاءُ، أَي: بَلَغَ شِدَّةَ الحَرَارَة)، گەیشتە ئەوپەڕی گەرمیی، (آنَى الطَّعامُ وَآنَ الطَّعَامُ)، یانی: (نَضُجَ)، خواردنەکە ئامادەبوو، کوڵیی.

٦)- ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾، خۆراکیان نیە، جگە لە حوشترخۆرکە: ﴿ضَرِيعٍ﴾، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: بەزاری هەندێك لە هۆزەکانی عەرەب (ضريع) هەر (شِبْرِق)ە، یانی: حوشتر خۆرکە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ضَرِيعٍ﴾یش، هەر بریتیە لە (شبرق)، بەڵام دوای ئەوەی وشك دەبێ.

ئنجا حوشترخۆرکەش بە زۆریی لە دەشت و بیاباندا هەیەو، لە هەندێك شوێنی وڵاتی ئێمەشدا هەیە، گیایەکی دڕکاوییە تەنیا حوشتر دەتوانێ بیخوا، ئەویش بەتەڕیی و کە وشك بوو دەبێتە گیایەکی ژەهردارو حوشتریش نایخوات، خوا دەفەرموێ: خۆراکیان نیە جگە لە: ﴿ضَرِيعٍ﴾، ئایا ئەو ﴿ضَرِيعٍ﴾ە، چۆنە؟!.

٧)- ﴿لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ﴾، نە قەڵەو دەکات، نە برسێتییش لادەبات، واتە: نە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ برسێتیی پێ لابچێ و، نەدەبێتە هۆی قەڵەو بوونیش، (السَّمَنُ: وَفْرَةُ اللَّحْمِ وَالشَّحْمِ لِلْحَيْوان)، (سَمَن)، بریتیە لە زۆربوونی گۆشت و چەوریی لە ژیانداردا، (وَالإِغْنَاء: الإِكْفَاءُ وَدَفْعُ الحاجَة)، (إغناء) بریتیە لە پێویستیی جێبەجێ کردن، کە دەفەرموێ: ﴿مِن جُوعٍ﴾، (أَيْ: غَنَاءً بَدَلاً عَنِ الجُوعِ)، واتە: بێنازییەك کە بچێتە شوێنی برسێتیی، ئەو سوودەشی نیە.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێ: خوا دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾، لە شوێنی دیکەش خۆراکێکی دیکە دەفەرموێ، بۆ نموونە:

أ- لە سووڕەتی (**الحَاقَّة**)، لە ئایەتەكانی: (٣٥ - ٣٧)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾﴾، واتە: (ئەو كەسەی تووشی سزای خوا دێ)، ئەمڕۆ هیچ دۆست و نزیكێكی نیە (دڵسۆزو خۆشەویستێكی دڵسووتاوی نیە)، هەروەها هیچ خۆراكێكی نیە جگە لە زووخاو {﴿غِسْلِينٍ﴾: (**صَدِيدُ أَهْلِ النَّار**)، ئەو كێم و زووخاوەیە كە لە برینی جەستەی دۆزەخییەكان دێتەخوار}، ﴿لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾﴾، واتە: تەنیا گوناهباران و تاوانباران دەیخۆن.

ب- لە شوێنی دیكەش دا باسی ﴿زَقُّومٍ﴾ دەكات: ﴿لَأَكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾﴾، ئایا وەڵامی ئەوە چییە؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: أ- كە دۆزەخ شوێن شوێنەو، تەنیا یەك شوێن نیە، ئەو هەموو ملیاران خەڵكەی دەچنە نێو دۆزەخ، هەمووی شوێن شوێنەو پلە پلەیە، وەك دوایی لە كاتی تەفسیركردنی سووڕەتی (الفجر)دا، كورتە باسێك لە بارەی دۆزەخەوە دەكەین و، كورتە باسێك لە بارەی بەهەشتەوەش دەكەین، كەواتە:

أ- لە هەندێ شوێن تەنیا حوشترخۆركە ﴿ضَرِيعٍ﴾ دەخۆن.

ب- لە هەندێك شوێن تەنیا ژەقنەمووت ﴿زَقُّومٍ﴾ دەخۆن.

ج- لە هەندێ شوێن تەنیا زووخاو ﴿غِسْلِينٍ﴾، ب- وەڵامێكی دیكەش ئەوەیە كە خوای دادگەر بۆ زیاتر سزادان و ئازار دانیان، ماوەیەك ﴿ضَرِيعٍ﴾یان دەداتێ و، ماوەیەك ﴿غِسْلِينٍ﴾و ماوەیەكی دیكەش ﴿زَقُّومٍ﴾.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی ڕوو خۆشیی و گەشیی بڕواداران لە بەهەشتداو، ڕازیبوونیان لە هەوڵ و کۆششی خۆیان و، نیشتەجێ بوونیان، لە باخی بەرزدا، کە قسەی پووچی تێدا نابیستن و، کانیی و سەرچاوەی بەردەوام و، تەختە بەرزکراوەکان و، دەفرەکانی پێخواردنەوەو، باڵنجە ڕیزکراوەکان و، فەڕش و ڕایەخە بڵاو کراوەکان، لەوێدا هەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَاغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ (٩) بڕگەدا:

دوای ئەوەی خوای کارزان و دادگەر لە ئایەتەکانی پێشێدا، باسی سەرەنجامی مەینەتبارو شەرمەزارانەو، ڕیسوابووانەی دۆزەخییەکانی کرد، کە چۆن بڵێی وەزعیان ناخۆشە، بەو شێوەیەن، ڕوویان زەبوون و هەڵبزڕکاوەو، بێگاریان پێ دەکرێ لە دۆزەخداو، تەنیا ماندوبوونیان پێدەبڕێ و، دەچنە نێو ئاگرێکی یەکجار گەرمەوەو، لە سەرچاوەیەکی یەکجار داغ و گەرم پێیان دەنۆشێنرێ و، خواردنیشیان تەنیا حوشترخۆرکە ﴿ضَرِيعٍ﴾یە، کە نە مرۆڤ قەڵە دەکات، نە برسێتییشی لێ لا دەبات، دوای ئەوە یەکسەر خوا سبحانە و تعالی بەبێ بەکارهێنانی ئامرازی بادانەوەی، وەك: (ثُمَّ)، یاخود (و) یاخود (ف)، دەفەرموێ:

١)- ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ﴾، ڕووانێك هەن لەو ڕۆژەدا زۆر پڕ نازو نیعمەتن.

بنەچەکەی وشەی: ﴿نَّاعِمَةٌ﴾ دوو ئەگەری هەن:

أ- (مُشْتَقٌّ مِن نَعُمَ يَنعُمُ نُعومَة، وَهِيَ اللِّيْنُ وَهيَ بَهْجَةُ المَنظَر)، ﴿نَّاعِمَةٌ﴾، لە وشەی: (نُعومَة) داتاشراوە: (نَعُمَ يَنعُمُ، نُعُومَة)و بریتیە لە ژیانێکی خۆش و دیمەنێکی جوان و شادمانیی و بەختەوەریی.

ب- (أَو مُشْتَقٌّ مِن نَعِمَ يَنْعُمُ نَعْمَةً، مِثْل: حَضَرَ يَحْضَرُ حَضْرَةً، أَي: صَارَ ذا نَعْمَةٍ، وَهيَ حُسْنُ العَيْشِ وَالتَّرَف)، یان لە: (نَعِمَ يَنَّعُمُ نَعْمَةً)وە هاتوە، وەك (حَضَرَ، يَحْضُرُ، حَضْرةً)، یانی: بووە خاوەن نەعمەت، ئەویش بریتیە لە ژیانی خۆش و خۆشگوزەرانیی و پڕ نازو نیعمەتیی، لێرەدا زانایان پرسیاریان کردوە: بۆچی خوا لە شوێنەکانی دیکە (و)ی بادانەوە (عطف)ی بەکارهێناوە، وەك: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾﴾القیامة، هەروەها: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾﴾، بەڵام لێرەدا (و)ی بادانەوە (عَطْف)ی بەکارنەهێنراوە؟ زانایان زۆر قسەیان لەو بارەوە کردوون و، ئەو قسەیانم بە دڵە، کە دەڵێ: (لَمْ تُعْطَف هَذِهِ الجُمْلَةُ عَلى سَابِقَتِهَا، لِلدَّلَالَةِ عَلى كَمَالِ البَوْنِ بَيْنَهُما)، ئەم ڕستەیە بۆیە بانەدراوەتەوە سەر ڕستەی پێشێ، تاکو ئەوە بگەیەنێ کە یەکجار زۆر لێك دوورن و زۆر جیاوازن، بۆیە خوا سبحانە و تعالی کۆی نەکردوونەوە سەریەك بە (و)ی بادانەوە.

٢)- ﴿لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ﴾، لە کۆششی خۆیان ڕازیین، یانی: لە هەوڵدانی خۆیان لە دنیادا کە کردوویانە زۆر ڕازیین، ستایشی خوا دەکەن کە لە دنیادا یارمەتیی داون، ڕێی ڕاست بگرن، ئەو ڕێیە ڕاستەی بەو شوێنە خۆشەی گەیاندوون، نەك ڕێی چەوت بگرن و، دوایی بە دۆزەخیان بگەیەنێ، وەك پێشینانی خۆمان گوتوویانە: (ڕاستی ڕەفتی، چەوتی کەوتی).

٣)- ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾، لە باخێکی بەرزدا، باخ بەپێی زانیاریی ئێمەو لە دنیادا خواش بە پێی عەقڵی ئێمە قسە دەکات ئەو باخانەی شوێنیان بەرزە، تیشکی خۆر لە هەموو شوێنانەوە پێیان دەکەوێ و، بایان تێدەکەوێ، بەزۆریی وایە درەختەکانیان باشترن و میوەکانیان چاکترن، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ ﴿٢٦٥﴾﴾، وەك باخێکە لە بەرزاییەکدا.

٤)- ﴿ لَّا تَسۡمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةٗ ﴾ لەوێدا قسەی پووچ نابیستی، ﴿ لَٰغِيَةٗ ﴾، یانی: (لغو): **(اللَّغْو مَا لا فَائِدَةَ فِيهِ مِنَ الكَلامِ وَلا يُعْتَدُّ بِهِ)**، قسەیەکە سوودی نەبێ و، گرنگیی و بایەخی پێ نەدرێ، لە ئەسڵدا ئەوە واتایەکەیەتی، لە ڕووی ڕێزمانییەوەش، ﴿ لَٰغِيَةٗ ﴾ سێ حاڵەتی هەن:

١- بە مانای (لَغْو)ە، وەك خوای زاناو شارەزا وشەی: ﴿ كَاذِبَةٌ ﴾ی بەکارهێناوە بە مانای: درۆ (كَذِب): ﴿ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ۝٢ ﴾الواقعة، یانی: درۆ لە ڕوودانیدا نیە.

٢- ﴿ لَٰغِيَةٗ ﴾، سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: **(لا تَسْمَعُ فِيهَا نَفْساً لاغِيَةً تَلغُوا)**، هەرگیز لەوێدا گوێبیستی بابایەکی لەغووکەر نابی، لەغوو بکات، قسەی پووچ بکات.

٣- ﴿ لَٰغِيَةٗ ﴾، یانی: **(كَلِمَةً ذَاتَ لَغْوٍ)**، وشەیەکی خاوەنی پووچیی **(لَغْو)** نایبیستی.

٥)- ﴿ فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ ﴾، لەوێدا سەرچاوەیەکی (لەبەر) ڕۆیشتووی لێیە، یانی: **(فِيهَا عَيْنٌ جَارِيةٌ أَيْ: تَجْرِي عَلى الدَّوامِ فَلاَ تَنْقَطِعُ أَبَداً)**، سەرچاوەیەکی تێدایە بەردەوام ئاوی لەبەر دەڕوا.

پێشتریش گوتمان: مانای وانیە، تەنیا یەك کانیی و سەرچاوەیە، بەڵکو واتە: ئەو سەرچاوانەی لە بەهەشتدا هەن، هەمیشە ئاویان لەبەر دەڕواو وەك هی دنیا نین وشك بکەن، یاخود ئاویان کەم بێ و زۆربێ.

٦)- ﴿ فِيهَا سُرُرٞ مَّرۡفُوعَةٞ ﴾، لەوێدا (لەو باخەدا) تەختە بەرزکراوەکان هەن، ﴿ سُرُرٞ ﴾، کۆی (سَرِير)ە، **(هُوَ مَا يُجْلَسُ عَلَيْهِ وَيُضْطَجَعُ)**، (سَرِير) ئەوەیە لەسەری دابنیشێنرێ و لەسەری پاڵ بکەوێنرێ، مرۆڤ شانی لێدا بدات و پاڵ بکەوێ و، ئیسڕاحەتی لەسەر بکات، کە دەفەرموێ: ﴿ مَّرۡفُوعَةٞ ﴾، **(أَيْ: مَرفوعَةٌ عَلى سَطحِ الأَرْض)**، بەرزکراوەنەوە لە ئاستی زەوی، وەك قەرەوێڵەو چوار پایەو شوێنی لەسەر خەوتن و ئیسڕاحەت، شایانی باسە: لەم ئایەتە موبارەکانەدا دووجاران خوا فەرموویەتی: ﴿ فِيهَا ﴾: یەکەمیان: ﴿ فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ ﴾، دووەمیان: ﴿ فِيهَا سُرُرٞ مَّرۡفُوعَةٞ ﴾، بەڵام شتەکانی دیکە: ﴿ وَأَكۡوَابٞ مَّوۡضُوعَةٞ ۝١٤ وَنَمَارِقُ مَصۡفُوفَةٞ ۝١٥ وَزَرَابِيُّ مَبۡثُوثَةٌ ۝١٦ ﴾، ﴿ فِيهَا ﴾یان بۆ بەکارنەهێنراوە،

هۆكارەكەش ئەوەیە كە ئەو دوو جارە، باسی هەردوو بەشە سەرەكییەكەی نازونیعمەتی بەهەشت كراوە: یەكەم: كانیی و سەرچاوەو جۆگەو جۆبارو باخ و باخات، دووەم: تەخت و شوێنی تێدا پشوودان، هەردووكیشیان پێویستن بۆ ژیانێكی خۆشگوزەرانانەی بەتام و چێژ، بەڵام شتەكانی دیكە كەل و پەل و پێداویستییەكانن.

٧)- ﴿وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ﴾، هەروەها دەفرە ڕۆنراوەكانیش هەن، یانی: (**وَفيهَا أَكْوَابٌ مَوْضُوعَة**)، لەو باخەدا بۆیان هەیە كووپە داندراوەكان، (**الكُوبُ إِنَاءٌ لِلْخَمْرِ لَهُ سَاقٌ وَلا عُرْوَةَ لَهُ**)، كوپ دەفرێكە شەڕابی تێدا دەخورێتەوە، بنكی هەیە، بەڵام هەنگڵی نیە، وەك گۆزە، كە دەگونجێ وەك پەرداخ بێ، یاخود جۆرێكی دیكە بێ، چونكە خوا سبحانە وتعالی (**إِبريق**)یشی بەكارهێناوەو (**كوب**)یشی بەكارهێناوەو (**كَأْس**)یشی بەكارهێناوە، كە بە دڵنیایی (**إبريق**) لەجێی سوڕاحیی و گۆزەیەو خواردنەوەی تێدا هەڵدەگیرێ، (**أَكوَاب**) ﴿وَأَكْوَابٌ﴾یش پێدەچێ لەوە گچكەتر بێ، وەك دەفرو جام، (كأس)یش ئەوەیە كە پێی دەخورێتەوە: پەرداخ، كە دەفەرموێ: ﴿مَّوْضُوعَةٌ﴾، واتە: داندراون، داندراون بۆ خواردنەوەو لا نابرێن و، هەمیشە لەبەر دەستن.

٨)- ﴿وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ﴾، هەروەها باڵنجە ڕیزكراوەكانیش هەن، ﴿وَنَمَارِقُ﴾ كۆی (**نُمْرُقَة**) یان (**نِمْرِقَة**)یە، (**النِّمرِقَةُ، والنُّمْرقَةُ: الوِسَادَةُ الَّتي يُتَّكَأُ عَلَيْهَا عِنْدَ الجُلوُس**)، باڵنج، ئەوەی پاڵی وێدەدرێ لە كاتی دانیشتنداو شانی دەدرێتە سەر، ﴿مَصْفُوفَةٌ﴾، بەڕیز دانراون لەو شوێنەدا بۆ شان لەسەر دادان و پاڵ لەسەر دانەوە.

٩)- ﴿وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ﴾، بەڕەو ژێرپێ بڵاوەكانیش هەن، هەروەها لەو باخەدا ﴿وَزَرَابِيُّ﴾ ژێرپێ و بەڕەكان بەڕەو فەڕشی نایاب (**مبثوثة**) كە بڵاوكراوەن، (**أَي: مُنْتَشِرَةٌ عَلَى الأَرْضِ، وَهُوَ كِنَايَةٌ عَنِ الكَثْرَةِ**)، یانی: بڵاو كراونەوە بە زەویدا، مەبەست پێی زۆرییە، ﴿وَزَرَابِيُّ﴾، پێشتریش باسمان كرد، كە زانایان زۆر قسەیان لە بارەوە كردوە، لە چییەوە هاتوە؟ بەڵام وا پێدەچێ و ئەو ڕایەم پێ ڕاستە كە: (**زرابي**) لە ئەسڵدا كۆی (**زَرْبِي**) بێ.

(**زيربي**)یش لە ئەسڵدا: (ژێرپێ)یەو، ئەو بەڕەیە کە دەخرێتە ژێرپێ و پێویست ناکات خەڵك پێڵاوان دابنێ، بەڵکو بە پێڵاوەوە بەسەریدا دەڕۆن، وەك ئێستاش باوە: کۆمبارێك، بەڕەیەك، فەرشێك ڕادەخرێ، هەر بۆیەش زانایان لە ڕیشە زمانەوانییەکەیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە، چونکە ئەسڵەکەی وشەیەکی عەرەبیی نیەو لە (زێربێ)وە هاتوە، واتە: (ژێرپێ)، بەڵام چونکە پیتی (ژ) هەروەها پیتی (پ) لە زمانی عەرەبییدا نین، بۆیە (ژ) بۆتە (ز) و (پ)یش بۆتە (ب) و لە (ژێر پێ)وە بۆتە (**زيربي**)، ئنجا کە کۆکراوەتەوە، کردوویانەتە: (**زَرَابِي**)، هەر بۆیە پسپۆڕو شارەزایانی زمانی عەرەبیی هەرچەندە گەڕاون، لە زمانی عەرەبییدا ئەسڵ و بنەمایەکیان بۆ ئەم وشەیە نەدۆزیوەتەوەو، هەندێکیان گوتوویانە: ئەم وشەیە یانی: (ئازربایجانیی) و جۆرە فەرشێك بووە لە ئازربایجان دروستکراوە، بەڵام دوایی هەندێك شتیان لێ کردۆتەوەو خولاصە بۆتەوەو بۆتە: (**زربية**) و (**زرابي**)! بەڵام بە بۆچوونی من لە (ژێرپێ)وە هاتوەو وشەیەکی فارسییە، فارسیی و کوردیی بە دڵنیایی وشەی هاوبەشیان هەن، بە فارسیی دەڵێن: (زیر پا)، بەکوردیی دەڵێن: (ژێرپێ)، کوردیی و فارسییش لە ئەسڵدا دەبنەوە بەزمانێك، بگرە هەموو زمانە هیندو ئەورووپییەکان لە ڕیشەدا دەچنەوە سەر یەك بنەڕەت.

کەواتە: ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکانە بکەین، دەبینین: لە بەهەشتدا، ئەو بەهەشتەی بۆ بڕواداران دانراوە، وێڕای ژینگەیەکی هەرەباش، هەموو جۆرەکانی کەلوپەلی نایاب و، هەموو جۆرە نازو نیعمەتەکان لەوێدا هەن، لە خواردن و خواردنەوە، جێگاو ڕێگا، فەرش و ڕایەخ، تەختی پشوو لەسەردان، چۆن مرۆڤ بە خەیاڵی دادێ، خۆش و چاکبێ، لە بەهەشتدا هەیە، هەڵبەتە لێرە خوای پەروەردگار بەکورتیی باسی کردوەو، ئێمە لە تەفسیری زۆرێك لە ئایەتەکاندا، کە کاتی خۆی تەفسیرمان کردن، بە تایبەتی لە تەفسیری سوورەتی (الرحمن) و، تەفسیری سوورەتی (**الواقعة**)دا، خوای پەروەردگار درێژتر باسی

نـازو نیعمەتەکانـی بەهەشـتی کـردوە، هەروەهـا باسـی مەینەتییەکانـی دۆزەخیـشی کـردوە، بـە تایبەتـی لـە سـوورەتی (**الواقعـة**)دا.

خـواش پشـتیوان بـێ لـە کاتـی تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الفجـر)دا، کورتـە باسـێك لەبـارەی دۆزەخـەوە دەکەیـن، لەچەنـد بڕگەیەکـدا، هەروەهـا کورتـە باسـکێکیش لـە بـارەی بەهەشـتەوە دەکەیـن، ئەویـش لەچەنـد بڕگەیەکـدا، ئـەو دوو کورتـە باسـەش لـە کتێبـی هەشـتەمی مەوسـووعەی: (**الإسـلام كَـمَا يَتَجَـلَّى فِي كِتَـابِ اللـه**) وەردەگریـن، بۆیـە لێـرە هـەر بـە ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـای ئایەتـەکان وازمـان هێنـا، درێژەی باسـی دۆزەخ و مەینەتییەکانـی دۆزەخ و دۆزەخییـەکان و، باسـی بەهەشـت و نـازو نیعمەتەکانـی بەهەشـت و بەهەشـتییەکان هەڵدەگریـن بـۆ ئـەو دوو کورتـە باسـە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**سەرنج ڕاکێشانی خوا سبحانه و تعالی بۆ چوار لە دروستکراوەکانی: حوشترەکان، ئاسمانی بەرز، چیا داکوتراوەکان، زەوی ڕاخراو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾، ئایا تەماشای حوشتران ناکەن، چۆن دروستکراون؟ (إِبْل) ناوی کۆیە، بۆ ئەو ئاژەڵەی پێی دەگوترێ: حوشتر، نێرەی حوشتر پێی دەگوترێ: (**جَمَل**) و مێیەکەی پێی دەگوترێ: (**نَاقَة**)، (**بَعِيْر**)یش بۆ هەردووکیان (نێرو مێ) بەکاردەهێنرێ و بە (**أَبْعار**) کۆ دەکرێتەوە، هەروەها بە (**أَبْعُر**)یش کۆ دەکرێتەوە، لێرەدا خوا دەفەرموێ: ئایا تەماشای حوشتران ناکەن چۆن دروستکراون؟ کە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ﴾، وشەی: ﴿يَنظُرُونَ﴾، کە بە (**إِلى**) بەرکاری خواستوە، بەڵگەیە لەسەرئەوە کە مەبەست لە ڕوانین (**نظر**)، وێڕای ڕوانینی چاو، سەرنجدان و لێوردبوونەوەو تێوڕامانیشە (**أي: أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ هَيَّئْتُ خَلْقَها**)، ئایا سەرنجی حوشتران نادەن چۆن دروستبوونەکەیم سازکردوە؟.

**٢)-** ﴿وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ﴾، هەروەها ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن، چۆن بەرزکراوەتەوە؟ وشەی: ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾، (**السَّماءُ: كُلُّ مَا عَلاَكَ، كُلُّ مَا فَوْقَك**)، هەرچی لە سەرەوەتە، هەرچی لەباڵای تۆیە، پێی دەگوترێ: ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾، ئێمە کە تەماشای سەرێ دەکەین، گومبەزێکی شین دەبینین، ئەوە ئاسمان ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾ە، لە شوێنی دیکەدا باسمان کردوە کە: ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾، بە مانای سەقفی خانووش هاتوە، هەروەها بەمانای هەوریش هاتوە، بە مانای هەواو جەوویش هاتوە، ئەوەی لە سەرووەوەیە، لێرەش دا:

﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾، واتە: ئەو دروستكراوە مەزنەی لە سەرووتانەوەیەو لە گومبەزێك شین دەچێ، ئایا تەماشای ناكەن چۆن بەرز كراوەتەوە؟.

٣)- ﴿ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴾، ئایا سەرنجی چیایان نادەن، چۆن چەقێنراون، داكوتراون؟ (**النَّصْبُ: الرَّفْعُ وَالرُّسُوخُ**)، (**نَصْب**) بە مانای بەرز كردنەوەو چەقاندن و داكوتان دێ.

٤)- ﴿ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴾، ئایا سەرنجی زەوی نادەن، چۆن پانكراوەو ڕاخراوە؟ (**سَطَحَ الشَّيءَ: سَوَّاهُ، وَمِنْهُ سَطْحُ الدَّار**)، واتە: شتەكەی ڕێكخست، لەوەوەش (**سَطْحُ الدَّار**)، سەربانی خانوو، پێی دەگوترێ: (**سَطْح**).

ئێمە بە نسبەت ئاسمانەوە، لە چەند شوێنێك، قسەمان لە بارەوە كردوە، بە تایبەت لە تەفسیری سوورەتی (**الرَّحمن**)دا: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴿٧﴾ ﴾، باسێكی تایبەتمان لە بارەی گەردوون و ئاسمانەوە كردوە، لە بارەی چیایەكانیشەوە زۆرجاران باسمان كردوەو، لە بارەی زەویشەوە دیسان لە چەند جێیەك دا باسمان كردوە، بە تایبەت لە تەفسیری سوورەتی (یونس)داو، لە تەفسیری سوورەتی (فصلت)داو، لە چەند شوێنێكی دیكەشدا، لێرەش كورتە باسێك لە بارەی حوشترەوە دەكەین:

## کورتە باسێک لە بارەی
## تایبەتمەندییەکانی حوشترەوە

بەڕێـــزان!

بـۆ ئـەوەی فەرمانـی خـوای بـەرزو مەزنمـان جێبەجـێ بکەیـن، کورتەیـەك لـە بـارەی تایبەتمەندییەکانـی حوشـترەوە دەخەینـە ڕوو، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾، واتـە: ئایـا تەماشـای حوشـتران ناکـەن، چـۆن دروسـتکراون؟ ئایا سـەرنجیان نەداونێ و لێیـان ورد نەبوونـەوەو تێیانـەوە ڕانەمـاون؟ ئنجـا بـا تۆزێـك لـە حوشـترەوە ڕامێنیـن:

بـە سـەرنجدانی تەفسـیرەکان و، کۆمەڵێـك سـەرچاوەی دیکەی تایبەت، پـازدە (١٥) تایبەتمەندییـم لـە حوشـتراندا بەدیکـردوون، پێـش ئـەوەی بێمـە سـەر خسـتنەڕووی پـازدە تایبەتمەندییـەکان، دەڵێـم: خـوا سـبحانە و تعالـی لێـرەدا دوای ئـەوەی باسـی هاتنـی ڕۆژی داپۆشـەری کـرد، خەڵکـی پۆلێـن کـرد، بـۆ دوو کۆمـەڵ:

کۆمەڵـی یەکەم: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴿٧﴾﴾.

دوایـی یەکسـەر هاتـە سـەر بـاسی کۆمەڵـی دووەم: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾﴾.

ئنجـا یەکسـەر فەرمووی: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾﴾، زانایـان لـە بـارەی چۆنیەتیـی پێکـەوە پەیوەسـتبوونی ئـەم ئایەتانـە، بـە ئایەتەکانـی پێـش خۆیانـەوە، زۆر قسـەیان کـردوون و، وا پێدەچـێ باشـترین قسـە ئەوەبـێ:

دوای ئـەوەی خـوا باسـی ئـەو ڕۆژە دەکات، کـە نـاوی نـاوە: داپۆشـەر (**غاشـية**) و، هەمـوو شـتێك دادەپۆشـێ، باسـی کۆمەڵـی یەکەمـی کـرد لـە مرۆڤـەکان، کـە تووشـی مەینەتیـی و سـزاو ئـازار دێـن، دوایـی باسـی کۆمەڵـی دووەمـی کـرد، کـە لـە نـازو نیعمـەت و خۆشـییدا دەبـن، ئنجـا باسـی ئـەوەی کـرد کـە ئێمـە چـۆن و بـە چ ڕێیەکـدا لـەو مەینەتییانـە دەپارێزرێیـن، کـە ئەهلـی دۆزەخ تووشـیان دێـن و، چـۆن لـەو نـازو نیعمەتانـە بەهرەمەنـد دەبیـن کـە خـوای پـەروەردگاری بەخشـەر، بـە بڕوادارانیـان دەبەخشـێ؟ بێگومـان سـەرەتا بـەوەی بـە ڕاسـت و دروسـتی خـوا بناسـین و، خـواش سـبحانه و تعالـی لـە ڕووی دوو کتێبەکەیـەوە دەنـاسرێ:

أ- کتێبی خوێندراوەی کە قورئانە.

ب- کتێبی بینراوی کە گەردوونە، خوا لە کتێبە خوێندراوەکەشیدا زۆر باسی کتێبە بینراوەکەی دەکات، باسی دیاردەو دیمەنەکانی دەکات، چۆنیەتیی پێکەوە پەیوەستبوونی ئەم کۆمەڵە ئایەتە موبارەکەو، ئایەتەکانی پێشوو، بەم شێوەیە.

ئێستاش با بێینە سەر خستنە ڕووی تایبەتمەندییەکانی حوشتر، لە پازدە خاڵ دا:

**یەکەم:** مرۆڤ کاتێك سەرنجی حوشتر دەدات، بەلای کەمەوە: شەش سوودان دەبینێ، هەڵبەتە زیاتریش هەن، بەڵام ئەو شەشەیان سەرەکیین:

١/ حوشتر گۆشتەکەی دەخورێ.

٢/ حوشتر شیرەکەی دەخورێتەوەو، بەرهەمی جۆراو جۆریشی لێ دروست دەکرێن.

٣/ حوشتر بۆ سواربوون بەکاردێ.

٤/ حوشتر بۆ بار لێنان بەکاردێ.

٥/ حوشتر جوانیی و ڕەونەقی تێدایە.

٦/ حوشتر تووك(وَبَرْ)ەکەشی بەسوودە، هەم جل و بەرگ و پۆشاك و، هەم کەلوپەلی دیکەی لێ دروست دەکرێ، وەك: بەڕەو فەڕش و گوریس و خورجێن و جەواڵ و ڕەشماڵ و...هتد.

بەڵکـو لـە هەندێـك لـە فەرمایشـتەكانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دا هاتـوە، كـە حوشـتر میزەكەشـی وەك جۆرێـك لـە چارەسـەر بـۆ هەندێـك نەخۆشـیی پێسـت، بەكاردەهێـنرێ.

كەواتـە: یەكەمیـن تایبەتمەندیـی حوشـتر ئەوەیـە، كـە هەمـوو شـتێكی بـەكاردێ، بگـرە پاشـەڕۆكی حوشـتر قشـپلەكەی ئەویـش وەك سـووتەمەنیی بەكاردەهێـنرێ و، ئاگـری پـێ دەكرێتـەوە، كەواتـە: حوشـتر هەمـوو شـتێكی بـەكاردێ: گۆشـتی، شـیری، میـزی، پاشـەڕۆكی، بارلێكردنـی، سـوار بوونـی، تووكـی، جوانیـی.

**دووەم:** حوشتر قەبارەكەی گونجاوە لەگەڵ ئەو ژینگەیەی تێیدا دەبێ، حوشتر بە زۆریی لە بیابان و دەشت و چۆڵایی دەبێ، كە ئاوەدانیی كەمتر لێیە، بۆیەش خوا سبحانە و تعالی حوشتری وا دروستكردوە: قەبارەیەكی گەورەی هەبێ و، قەبارەكەشی گونجاوە لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا كە تێیدایە، ئەگەرنا ئەسپ و ماین و گوێدرێژو هێستر، لە بیابانی لماویی دا جاری وایە كە گەردەلوول هەڵدەكات، كوێرو كوتر دەبن و هەر ناتوانن بە ڕێدا بڕۆن.

**سێیەم:** حوشتر دەتوانێ: (١٧٠ - ٢٠٠) كیلۆ هەڵبگرێ، باری گەورەو قورس هەڵبگرێ و بە خێراییش پێوەی بڕوات.

**چوارەم:** خێرا ڕۆیشتنی حوشتر، سەرسوڕهێنەرە، لە ڕۆژێدا بەلای كەمەوە چل (٤٠) كم ڕێگا دەبڕێ بە بارەوە، بە بارێكی (١٧٠-٢٠٠) كیلۆیی و، لە هەر سەعاتێكدا چوار كیلۆمەتر دەبڕێ، واتە: ئەگەر ڕۆژی دە (١٠) سەعاتان ڕێ بكات چل (٤٠)كم ڕێ دەبڕێ، بەڵام ئەو حوشترانەی بۆ سواریی بەكاردێن، چوار هێندە خێران و شازدە (١٦)كم لە سەعاتێكدا دەبڕن!

**پێنجەم:** حوشتر یان ئارەق هەر ناكات، یان بە كەمیی ئارەق دەكات و، لووتی حوشتر بە زاریەوە پەیوەستەو، كاتێك هەناسە دەدا، زاری ئەو تەڕاییەی لە هەناسەیدا هەیە، حەپسی دەكات، بۆ ئەوەی تەڕایی لە جەستەی نەچێتە دەر.

**شەشەم:** منداڵێکی گچکە دەتوانێ حوشتر یەخ بکات و باری بکات، ئەو ئاژەڵە گەورەیە خوا وای خوڵقاندوە، بە ئاسانیی دێتە ژێر بار، منداڵێکی گچکە دەتوانێ یەخی بدات، واتە: بیخات و باری بکات و، بچێتە سەر پشتی و بەکاری بێنێ.

**حەوتەم:** حوشتر هەموو شتێك دەخوات لە بیابان، تەنانەت شیبریقیش، ئەو ڕووەکەی کاتێك وشك دەبێ، پێی دەگوترێ: ﴿ضَرِيعٍ﴾، هەندێك لە زانایان دەڵێن: شیبریق و ﴿ضَرِيعٍ﴾ هەریەکن و هۆکاری ئەوە جیاوازیی زارەکانی زمانی عەرەبیی (**إِخْتِلاف لَهْجات العَرَبِيَّة**)ە، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە حوشتر هەم زاری، هەم ددانەکانی، هەم لێوەکانی، بەجۆرێکن هەموو جۆرە ڕووەکێکیان پێدەخورێ، تەنانەت حوشترخۆرکەش و هەر جۆرە ڕووەکێکی دیکەش، کە بە تەصەووری تۆ دادێ و لە بیاباندا هەیە، حوشتر هیچی لەبەر عاسێ نابێ، هەموو شتێکی بۆ دەخورێ، چونکە خوا سبحانە و تعالى ژینگەی حوشتری کە گێڕاوە بە بیابان، هەرچی لە بیاباندا هەیە، حوشتر دەتوانێ بیخوات و لێی بەهرەمەند ببێ، هەر بۆیەش عەرەب بە حوشتریان گوتوە: (**سَفِينَةُ الصَّحْراء**) وەك چۆن کەشتیی لەنێو ئاوو دەریادا هەیە، حوشتریش ناویان ناوە: کەشتیی بیابان.

**هەشتەم:** برژانگ و پێڵووەکانی چاوی حوشتر ڕوونن، بۆیەش کاتێك لە بیاباندا گەردەلوولی زۆر گەورە هەڵدەکات، حوشتر پێڵووەکانی چاوی و برژانگەکانی دا دەداتەوەو، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێیە دەبینێ، چونکە برژانگ و پێڵووەکانی چاوی ڕوونن، واتە: ڕێیە دەبینێ، بەڵام بە لێڵیی، گرنگ ئەوەیە ڕێگا دەبینێ، کەچی ئاژەڵەکانی دیکە، ئەگەر چاویان بنووقێنن، ڕێ نابینن، ئایا حوشتر بۆچی خوا وای خوڵقاندوە؟ چونکە خوا سبحانە و تعالى دەزانێ کە لە بیاباندا گەردەلوول هەڵدەکات، باوو بژ هەڵدەکات و ئەو لمە لەگەڵ خۆی دەبات، جاری وایە چاو چاو نابینێ، ئنجا خوا حوشتری وا خوڵقاندوە، بەوە ڕانەوەستێ و پەکی نەکەوێ، مرۆڤ دەتوانێ چاوی بنووقێنێ و سواری حوشترەکەی ببێ، یاخود دەستی بە حوشترەکەیەوە بێ و بشڕوا، بەڵام حوشتر ئەگەر ڕاوەستابووایە، لەوێ بە هیلاك دەچوون، بۆیە حوشتر چاو دەنووقێنێ و پێڵووەکانی چاوی ڕوون (**شفاف**)ن و، لە پشت پێڵووەکانیشەوە چاوی دەبینێ، تەنیا حوشتریش بەو شێوەیە.

**نۆیەم:** حوشتر، هەر کاتێك ویستی: هەم لووتی دادەخات، هەم گوێیەکانی دادەخات، هەم چاوەکانیشی دادەخات، بۆچی؟ لە کاتێکدا گەردەلوول بە تۆزو خۆڵ و لمەوە، هەڵدەکات، ئەگەر حوشتر لووت و گوێ و چاوەکانی دانەخات، بێگومان پڕ دەبێ لە لم و تۆزو خۆڵ.

**دەیەم:** پێیەکانی حوشتر کە خوفیان پێ دەگوترێ، لە گۆشت و چەرم پێکهاتوون، واتە: پێیەکانی حوشتر ئێسقانیان تێدانیە، مەگەر لە دیوی نێوێدا، بۆیەش کاتێك حوشتر پێ دادەنێ، پێیەکەی بڵاودەبێتەوە، بە پێچەوانەی کەرو هێسترو وڵاخەبەرزەوە، ئەوانە لەبەر ئەوەی (سم)یان هەن و، پێیان دەگوترێ: یەك سم، هەروەها ئاژەڵەکانی دیکەش: گاو مانگاو گامێش و مەڕو بزن، پێیان دەگوترێ: دوو سم، ئەوانە لە لم دەچەقن، بەڵام حوشتر کە پێیەکەی دادەنێ، بەهۆی نەرمییەوە پان دەبێتەوە، تاکو بە لم دا نەچێتە خوار.

**یازدەیەم:** کڵاوەی ئەژنۆی حوشترو، بەرسکی حوشتر، پێستێکی ڕەق و وشکی هەیە، لە کاتی یەخ بووندا، کاتێك حوشتر خۆی دەخاتە سەر زەوی، لەسەر ئەژنۆی و سینگی، پێستێکی قایم و پتەوو ڕەق و وشك بە بەرسکی و ئەژنۆیەکانیەوە هەیە، بۆ ئەوەی نەسووتێ و، بەرگەی گەرمایی و قورساییش بگرێ.

**دوازدەیەم:** لەسەر دونگی حوشتر چل (٤٠) کیلۆ چەوریی هەیە، ئنجا ئەو دونگەی لەسەر پشتیەتی لە کاتی برسێتییدا، ئەو چەورییەی دێتەوە نێو خوێنی و بەکاری دێنێ، بۆ ئەوەی پەکی نەکەوێ، کاتێك خواردنی دەست نەکەوت.

**سێزدەیەم:** لە کاتی تینوویەتییدا، حوشتر دەتوانێ سەدو سیی (١٣٠) لیتر لە ماوەی دە (١٠) خولەکدا، ئاو بخواتەوە، واتە (١/٣)ی هەموو کێشی خۆی، حوشتر دەتوانێ (١/٣)ی کێشی خۆی ئاو بخواتەوە، کە (١٣٠) لیترە! بۆ ئەوەی دوایی کە دەڕوات بە بیاباندا و ئاو نیە، چەند ڕۆژان دەڕۆن و ئاو نیە، پەکی نەکەوێ، چونکە ئاوی زۆری هەڵگرتوە لە جەستەیدا.

**چواردەیەم:** حوشتر لاقەکانی و ملیشی زۆر درێژن، بۆ بڕینی ڕێگاو بان و بەهۆی گەرمیی بیابانەوە نەسووتان، هەر بۆیەش خوا حوشتری وا خوڵقاندوە کە یەخ ببێ، هیچ وڵاخێکی دیکە یەخ نابێ بۆ بار، نەکەرو نە هێسترو نە وڵاخەبەرزە، ئەوانە هیچیان یەخ نابن، ئەگەر گریمان یەخیش ببن، لەوانەیە بە بارەکەیانەوە هەڵنەستنەوە، بەڵام حوشتر یەخیش دەبێ و، دەشتوانێ بەبارەوە هەڵیشستێتەوە، بە شێوەیەکی زۆر ڕێك و ئەندازەیی (**هندسي**) هەڵدەستێتەوە، نەك زۆر خۆی خوار بکاتەوەو بارەکە بەسەر ملی دابێ، یاخود خۆی بەسەر پشتی دا بدات و بارەکە بەسەر کلکیدا بێتە خوارێ، بەڵکو بەڕێکیی هەڵدەستێتەوە.

**پازدەیەم:** گەدەی حوشتر چوار بۆشایی هەن، بۆیەش حوشتر زۆر بە خێرایی ئاڵف و گیا دەخوات، بەڵام دوایی کاوێژ دەکات کە بە عەرەبیی (**إِجْتِرار**)ی پێ دەڵێن، واتە: ئەو خواردنەی بە خێرایی خواردوویەتی، دوایی بە شێنەیی دەیهێنێتەوەو جارێکی دیکە دەیجوێ، بۆ ئەوەی باش هەرس ببێ، حوشتر دەتوانێ (٦ - ١٠) ڕۆژ بەبێ ئاوو خواردن بژی و بە بیاباندا بڕوات، کاتی خۆی لە جەنگی یەرمووکدا خالیدی کوڕی وەلید خوا لێی ڕازیبێ سوپایەکەی لە عێراقەوە برد بۆ شام، بە سواری حوشترەکانیان، دیارە حوشترەکانیان تینوو کردوون و دوایی ئاویان داون و، خواردنیان پێداون، ئنجا ڕۆیشتوون و دە (١٠) ڕۆژیان پێچوون، لە نێوان عێراق و شام دا، تاکو گەیشتنە مەنزڵ، بێ ئەوەی ئەو حوشترانە ئاو بخۆنەوە، یاخود خواردنێك بخۆن.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴾، ئایا سەرنجی حوشترەکان نادەن، چۆن دروست بوون؟ ئێمە ئەو پازدە (١٥) خاڵەمان وەك پازدە تایبەتمەندیی خستوونەڕوو، کە تەنیا لە حوشتردا هەن، بەڵام بێگومان دەگونجێ لە بارەی حوشترەوە تایبەتمەندیی دیکەش بخرێنەڕوو.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە بەردەوام بێ لەسەر ئامۆژگاریی کردن و بیر خستنەوەی خۆی، چونکە ئەو دەسەڵاتی بەسەریاندا نیە، بە زۆر مسوڵمانیان بکات، ئەوەی بێبڕواش بێ، خوا سزای هەرە گەورەی دەدات، گەڕانەوەش تەنیا بۆ لای خوایەو، لێپرسینەوەش تەنیا مافی خوایە سبحانه و تعالی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ (٢١) لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ (٢٢) إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ (٢٣) فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ (٢٤) إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ (٢٥) ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم (٢٦)﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ﴾، بیریان بخەوەو ئامۆژگارییان بکە، تۆ تەنیا بیرخەرەوەی، خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرمووێ: ﴿فَذَكِّرْ﴾، ئنجا بیریان بخەوەو، ئامۆژگارییان بکە، ڕێنماییان بکات، ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ﴾، تۆ تەنیا بیرخەرەوەو ئامۆژگارییکارو ڕێنماییکاری، لێرەدا پیتی (ف) لە ﴿فَذَكِّرْ﴾دا: (**فَصِيحَةٌ تَفْرِيعٌ عَلَىَ مُحَصَّلِ مَا سَبَقَ مِنْ أَوَّلِ السُّورَةِ، وَالْأَمْرُ مُسْتَعْمَلٌ فِي طَلَبِ الإِسْتِمْرارِ وَالدَّوام**)، (ف) ڕوونکەرەوەیەو ئەوەی دێ، بنیاتی دەنێتەوە لەسەر ئەوەی ڕابردوە، هەر لە سەرەتای سووڕەتەکەوەو، فەرمانەکەش بۆ داواکردنی بەردەوامییە، یانی: حاڵ کە بەو شێوەیە باسمان کرد، تۆ بەردەوامبە لەسەر بیرخستنەوە، چونکە تەنیا ئەرکت بریتیە لە بیرخستنەوەو ئامۆژگارییکردن.

٢)- ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾، تۆ زاڵ و باڵادەست نی بەسەریانەوە، ئەمە بە دوو جۆر خوێندراوەتەوە، هەم بە (ص) هەم بە (س): ﴿بِمُصَيْطِرٍ﴾ و (مُسَيْطِر)، ﴿لَّسْتَ

عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴾، (أَيْ: لَسْتَ عَلَيْهِم مُهَيْمِناً وَلاَ مُجْبِراً وَلاَ مُكْرِهاً)، تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیەو ناچارکەرو زۆر لێکەریان نی، بەڵکو تۆ تەنیا ئەرکت ئەوەیە بیریان بخەیەوەو ئامۆژگارییان بکەی، وریایان بکەیەوەو تێیان بگەیەنی.

لە قورئاندا وشەکانی: (ذِكْر و تَذْكِير و ذِكْرى و تَذْكِرَة) زۆر هاتوون، جارانی دیکەش باسمان کردوە، کە حیکمەتەکەی ئەوەیە خوای کاربەجێ مرۆڤی وا خوڵقاندوە، ئەو ڕاستییانەی دوایی لە ڕێی وەحییەوە دەیاننێرێ و دایاندەبەزێنێ، ناخ و زگماکی مرۆڤ پێیان ئاشنایە، کەواتە: پێغەمبەران و جێگران و شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، ئەرکیان ئەوەیە ئەو ڕاستییانە بیر خەڵك بخەنەوەو، بیخەنەوە بەرچاویان، چونکە زگماك و ناخیان بەو ڕاستییانە ئاشنایە دەیانناسێ، گرنگ ئەوەیە ئەو ڕاستییانەیان بخرێنەوە بەرچاو، بەڵام بێگومان کە خوارسك و زگماکی مرۆڤ ڕاستییەکانی کە لە ڕێی وەحییەوە دێن، دەیانناسێ، بە شێوەی گشتیی دەیانناسێ و، مانای وانیە - وەك بە هەڵە بەشێك لە ئەهلی تەصەووف گوتوویانە ئەگەر بێت و مرۆڤ خۆی پاك و چاك بکات، پێویستیی بە وەحیی ناکات! بەڵکو مرۆڤ کاتێك خۆی پاك و چاك دەکات، ئامادەیی تەواوی دەبێ، کە ئەوەی وەحیی دەیفەرموێ، وەریبگرێ، نەك ئەوەی وەحیی دەیفەرموێ، بیزانێ، بەڵێ، بنچینەو ڕیشەکانی ئەو ڕاستییانەی وەحیی دەیانفەرموێ، خوارسك و ناخی مرۆڤ پێیان ئاشنایە، بەڵام وردەکارییەکانی و درێژەکەی، تەنانەت پێغەمبەرانیش کە خاوەنی پاکترین زگماك و ناخ بوون، پەییان بەو ڕاستییانە نەبردوە کە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ، نازانرێن.

٣)- ﴿ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾، مەگەر کەسێك کە پشتی هەڵکردوەو بێبڕوا بووە.

ئەمە زانایان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

**یەکەم:** گوتوویانە: ﴿ إِلَّا ﴾، بە مانای بەڵام (لَكِن)ە، یانی: (**لَكِنْ مَنْ تَوَلَّى وَاسْتَمَرَّ عَلَى كُفْرِهِ يُعَذِّبُهُ اللهُ العَذَابَ الشَّدِيد**)، بەڵام کەسێك کە پشتی هەڵکردوەو لەسەر بێبڕوایی بەردەوام بووە، خوا سزای هەرە سەختی دەدا.

بەم واتایەش ئەو هەڵاواردنە دەبێتە هەڵاواردنێکی دابڕاو (إِسْتِثْناءٌ مُنْقَطِع)، یانی: تۆ بەسەریانەوە زۆرلێکار نی و، ناتوانی بەزۆر بڕوایان پێ بهێنی، جگە لەوەی پشت هەڵدەکاو بێبڕوا دەبێ، ئنجا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لەوان دەکات؟ نەخێر، بۆیە هەڵاوێردراو (مستثنى) بەشێك نیە لە لێهەڵاوێردراو (مُسْتَثْنى مِنْه)، چونکە پێغەمبەر ﷺ کە بە گشتیی زۆرلێکاری خەڵك نیە، ئەوانەی کە پشت هەڵدەکەن و بێبڕوا دەبن، زۆر لێکاری ئەوانیش هەر نیە، کەواتە: ئەوان بەشێك نین لەوانەی پێشێ، بۆیە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنێکی دابڕاو.

**دووەم:** گوتوویانە: (إلاّ) هەر ئامرازی هەڵاواردنەو هەڵاواردنێکی پەیوەست (إِسْتِثْناءُ مُتَّصِل)ە، (مُستثنى مِنَ المَفْعولِ المَحْذوفِ فِي فَذَكِّرْ، والتَّقديرُ فَذَكِّرِ النَّاسَ، إلاَّ مَنْ تَوَلَّى وَكَفَرَ، إِذْ تَذْكِرَتُهُ لاَ فَائِدَةَ فِيها فَهِيَ لَغْوٌ)، واتە: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴾، دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴾، ئەمە ڕستەیەکی نێواخنە، (جُمْلَة مُعْتَرَضَة)، ئنجا وەك تەواوکردنی چەمك و واتای: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴾، فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾، هەڵاواردنەکە لە بەرکاری قرتێنراوی (ذَكِّر)ە، کە بەمجۆرەیە: (فَذَكِّرِ النَّاسَ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ)، خەڵك ئاگاداربکەوەو وریایان بکەوە، بیر خەڵك بهێنەوە، جگە لەوانەی پشتیان هەڵکردوەو بێبڕوان (ئەوانە لێیان گەڕێ) چونکە بیرخستنەوەی وان سوودی نیەو شتێکی پووچەو، کاتی خۆت بەوانەوە بەفیڕۆ مەدە، وەك لە سووڕەتی (النجم)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: پشت هەڵبکەو وازبێنە لەوانەی پشت لە بەرنامەو یادی ئێمە دەکەن و، تەنیا ژیانی دنیایان دەوێ، واتە: لێکدانەوەی دووەم وەك چەمك و واتای ئەو ئایەتەی سووڕەتی (النجم) وایە.

منیش ئەم واتایەی دووەمم زیاتر بە دڵەوە دەنووسێ: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴾، ئنجا: ﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴾، ئەمە ڕستەیەکی نێواخن کراوە، ئنجا: ﴿ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾، واتە: جگە لەوەی پشتی هەڵکردوەو بێبڕوایە وازی لێ بێنەو بۆ خوا لێی گەڕێ.

٤)- ﴿ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴾، خوا سزای هەرە گەورەی دەدا.

لە کۆتایی دا خوای بەرزو باڵادەست دەفەرموێ:

٥)- ﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴾، بە دڵنیایی گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای ئێمەیە، **(الإِيَابُ: الرُّجوعُ، آبَ يَؤُبُ أَوْباً، وَإِياباً)**، واتە: گەڕایەوە، دەگەڕێتەوە، گەڕانەوە، گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای ئێمەیە.

٦)- ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴾، ئنجا بە دڵنیایی لێپرسینەوەشیان تەنیا لەسەر ئێمەیە، لێرەدا: ﴿ ثُمَّ ﴾: **(للتَّراخِي الرُّتْبي، فَمُحَاسَبَتُهُم تُشْبِهُ حَقّاً أَوْجَبَهُ اللهُ عَلى نَفْسِهِ)**، ﴿ ثُمَّ ﴾ بۆ بەدواهاتنی پلەپلەییە، چونکە لێپرسینەوەی وان (هی مرۆڤەکان)، وەك هەقێکە خوا لەسەر خۆی پێویستی کردبێ.

## چوار هەڵوەستە لە ئاقار ئەو شەش ئایەتەی کۆتایی (الغاشیة)دا:

**یەکەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا ئەرکی گەیاندنی پەیامی خوایە: خوا سبحانه و تعالی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴾، مادام حاڵ بەو شێوەیە کە باسمانکرد لە ڕابردوودا، تۆ لەسەر بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی و ڕێنمایی کردنی خۆت بەردەوام بە، چونکە تۆ تەنیا ئەرکت ئەوەیە، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ:

أ- ﴿ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ﴿٤٨﴾ ﴾**الشورى**، واتە: تۆ تەنیا ڕاگەیاندنت لەسەرە.

ب- یان دەفەرموێ: ﴿ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾**النور**، پێغەمبەر تەنیا ڕاگەیاندنی ڕوونی لەسەرە.

ج- یان دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ ﴾**النحل**، ئایا پێغەمبەران تەنیا گەیاندنی ڕوونیان لەسەر نیە؟

﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴾، تۆ بەسەر ئەواندا زاڵ نی، واتە: تۆ ناچارکەرو زۆر لێکەریان نی، بەسەردا سەپێنەریان نی، ئیمان و ئیسلامیان بەسەردا بسەپێنی،

ئـەوە ئەركـی تـۆ نیـە، كەواتـە: تـۆ بیریـان بخـەوەو تەنیـا بیرخـەرەوەی، ﴿ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾، جگـە لەوانـەی پشـتیان هەڵكـردوەو بێبـڕوا بـوون، واتـە: لەسـەر پشـتهەڵكردن و ڕووو وەرچەرخانـدن لـە پەیامـی خـواو، لـە تـۆ، بەردەوامـن، لەسـەر بێبڕوایـی بەردەوامـن، ئەوانـە بـۆ خـوا لـێ گـەڕێ، ﴿ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَكۡبَرَ ﴾، خـوا سـبحانە و تعالـی سـزای گەورەتـری دەدا، سـزای گەورەتریـان دەدا.

**دووەم:** سزای گچكەو گەورەتر چین؟

سـزای گچكـە لـە ژیـانی دنیاشـدا دەگونجـێ هەبـێ، كـە بریتیـە لـە نەخۆشـیی و ئـازارو ناڕەحەتیـی، هەروەهـا ئـازاردران و سـزادرانیان بـە دەسـتی مسـوڵمانان لـە كاتـی ڕوو بـەڕوو بوونـەوەدا، لـە سـووڕەتی: **(السـجدة)**ش دا خـوای پـەروەردگار باسـی سـزای گچكـەو سـزای گـەورە دەكات، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی لـە ئـازاری گچكەیـان پـێ دەچێژیـن، پێـش سـزادانی گەورەتـر، {سـزادانی نیزیكتریـان دەدەیـن، (هـی گچكـە)، پێـش سـزادانی گەورەتـرو دوور، كـە لـە ڕۆژی دواییدایـە}، بەڵكـو بگەڕێنـەوە.

ئێمـە كاتـی خـۆی لـە تەفسـیركردنی سـووڕەتی: **(السـجدة)**دا باسـمان كـردوە، كـە دەگونجـێ سـزادانی گچكـە مەبەسـت پێـی نەخۆشـیی بـێ، ناخۆشـیی بـێ، گرفتاریـی و ناڕەحەتییـەكان بـن، كـە لـە دنیـادا دێنـە ڕێـی مرۆڤـەكان، یاخـود مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ كـە بێبڕوایان بـە دەسـتی خەڵكی ئیسـلام لـە كاتـی جەنـگ و ڕووبەڕووبوونـەوەدا، تووشـی سـزاو ئـازارو مەینەتیـی بـبن، كـە ئەمـەش دەبێتـە ئیعجازێكـی مێژوویـی و هەواڵـدان بـە نادیـار، كـە مسـوڵمانان لـەو كاتـەدا لـە مەككـەدا چەوسـێنراونەوە، خـواش فەرموویەتـی: كاتێـك دێ ئێمـە سـزای نیزیكـترو گچكەتریـان پـێ بچێژیـن، پێـش سـزای گەورەتـر، كـە لـە ڕۆژی دواییـدا بۆیـان دێتـە پێـش!.

**سێیەم:** گەڕانەوە بەس بۆ لای خواو لێپرسینەوەش هەر لەسەر ویە:

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾ ﴾، بەدڵنیایـی گەڕانەوەیـان تەنیـا بـۆ لای ئێمەیـە (بـە هیـچ لای دیکـەدا نـاڕۆن) و لێپرسینەوەشـیان تەنیـا لەسـەر ئێمەیـە، کەسـی دیکە لێیـان ناپرسـێتەوە، تەنیـا بەدیهێنەرو پـەروەردگارو خاوەنیـان لێیـان دەپرسـێتەوە.

وەك لـە هەندێـك لـە کتێبەکانـی خۆمـدا باسـم کـردوە[1]، ئـەم ڕاسـتییە زۆر گرنگـە خەڵکـی ئیسـلام لـە عەقـڵ و دڵیانـدا زۆر درەوشـاوە بـێ و، وا نەزانـن ژیـانی دنیـا جێـگای ئەوەیـە تەصفییـەی حیسـابی تێـدا بکـرێ و، جێـی ئەوەیـە هـەر کەسـێك خراپەیەکـی کـرد، کوفـری کـرد، شـیرکی کـرد، نیفاقـی کـرد، تاوانـی کـرد، لـەو تاوانانەی کـە پەیوەندییـان بـە نێـوان خـۆی و خـواوە هەیـە، نـەك زیانیـان بـۆ خەڵـك هەبـێ، ئـەوە دەبـێ سـزا بـدرێ! چونکـە جگـە لـەو تاوانانـەی زیانیـان بـۆ خەڵـك هەیـەو کۆمەڵـگا دەشـێوێنن، ئیسـلام سـزای دنیایـی دانەنـاوە بـۆ هیـچ کام لـەو گوناهانـەی دیکـە، بـەڵام:

١- کەسێك کە ژینی خەڵك بخاتە مەترسییەوە، خوا سزای بۆ داناوە: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ ﴿١٧٩﴾ ﴾البقرة.

٢- کەسێك ماڵ و سامانی خەڵك بخاتە مەترسییەوە، خوا هەم سزای ڕێگریی، هەم سزای دزیی بۆ داناوە.

٣- کەسێك وەچەو نامووسی خەڵك بخاتە مەترسییەوە، خوا سزای زینای بۆ داناوە.

٤- کەسێك زیان بگەیەنێ بە ئابڕوو و کەڕامەتی خەڵك، خوا سزای بوختانکردن بە داوێنپیسیی بۆ داناوە.

---

(١) بڕوانـە: کتێبـی دوازدەیـەم لـە: (موسـوعة: الإسـلام کـما یتجـلّي في کتـاب اللـه)و، کتێبـی: (چەند مەسـەلەیەکی بـاوی سـەردەم)، بـەشی یەکـەم: بنەمایـەکانی تەبایـی و پێکـەوە ژیـان لـە قوڕئـان دا، چاپی شەشـەم

٥- کەسێك هێمنیی و ئاسایشی خەڵك بخاتە مەترسییەوە خوای دادگەر سزای بۆ داناوە.

هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: سزای مەیخۆرییش خوای کاربەجێ دایناوە، لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە کە ئەوە زیاتر بە کۆشش و ئیجتیهادو تێفکرینی هاوەڵان بووە، بۆیە پێشێ چل (٤٠) قامچییان لێداوە، دوایی کردوویانەتە هەشتا (٨٠)، دوای ئەوەی خەڵك لەسەری بەردەوام بووە.

کەواتە: ئەو سزایە ملکەچە بۆ سیاسەت و تێگەیشتنی حوکمڕانان، ئەوانەی کۆمەڵگای مسوڵمان بەڕێوە دەبەن، بەڵێ جگە لەو تاوانانەی زیان دەگەیەنن بە ڕووحی خەڵك، بە ماڵ و سامانی خەڵك، بە نەسل و وەچەیان، بە ئابڕوو و کەرامەتیان، بە هێمنیی و ئاسایشیان، جگە لەوانە، خوا بۆ هیچ گوناهێك سزایەکی دیکەی دیاریکراوی دانەناوە لە قورئاندا، هەروەها پێغەمبەریش ﷺ لە ڕێبازی خۆیدا، ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (**النور**)دا لە بارەی سزای داوێنپیسییەوە قسەمان کردوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی خۆی کەسانێك کە زینایان کردوە، بەرد بارانی کردوون تاکو مردن، بەڵام پێم وایە ئەو ڕایە ڕاسترە کە دوایی حوکمی یەکجارەکیی لە ئیسلامدا لە بارەی سزای زیناوە، ئەوەیە کە خوا لە سووڕەتی (النور)دا باسی کردوە: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٖ ۝٢ ﴾.

بۆ مەسەلەی هەڵگەڕانەوەش لە ئیسلام دا، لە تەفسیری سووڕەتی (محمد) و، لە هەندێك شوێنی دیکەشدا باسمان کردوە، سزایەکی دیاریکراوی نیە لە قورئانداو، لە سوننەتی پێغەمەریش ﷺ سزایەکی قەتعیی و دیاریکراوی نیە، بۆیە زانایان ئیجتیهادیان کردوە، بە نسبەت سزای کەسانێکەوە کە لە ئیسلام هەڵگەڕاونەوە، لە شوێنی خۆیدا بە درێژیی باسمان کردوە، لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلي في كتاب الله**)[1]دا.

---

(١) ج ١٢، چاپی دووەم.

کەواتـە: پێویسـتە ئەوەمـان لەبەرچاو ڕوون بـێ، کـە ئیسـلام هاتـوە کۆمەڵگایەکـی پـاك و چـاك و ڕاسـت، دروسـت بـکات و، سـزا بسـەپێنێ بەسـەر ئەوانـەدا کـە زیـان بـە ژیانـی خەڵـك دەگەیەنـن، بـە نەسـل و وەچـەی خەڵـك، بـە ئابـڕوو و کەرامەتـی خەڵـك، بـە مـاڵ و سـامانی خەڵـك، بـە هێمنیـی و ئاسایشـی خەڵـك، بـەڵام شـتەکانی دیکـە، خـوای پـەروەردگار خەڵکیـان پـێ تاقـی دەکاتـەوە، ئەگـەر بێـت و ئەوانـە پارێـزراو نەبـن: ژیـانی خەڵـك نامووسـی خەڵـك، ئابـڕوو و کەرامەتیـان، مـاڵ و سـامانیان، هێمنیـی و ئاسایشـیان، کۆمەڵـگا تێکدەچـێ، بـەڵام خەڵـك بـە کوفـرو ئیمانـەوە پێکـەوە دەژیـن، بۆیـە لەسـەر بیرووایـی ئیسـلام سـزایەکی دیارییکـراوی نیـەو، لـە کۆمەڵگای یەکەمـی پێغەمبەریـش ﷺدا جوولەکـەکان هەبـوون، هەندێـك نەصڕانیـی هەبـوون، هەندێـك لـە هاوبەشـدانەران هەبـوون، مونافیقـەکان هەبـوون، شـان بـە شـانی مسـوڵمانان و پێکـەوەش دەژیـان.

حاڵـەتی تەباییـش بـەردەوام بـوو، هەتـا جوولەکـەکان پەیمانیـان شـکاندو پەیمانیـان هەڵوەشـاندەوە، پێغەمبەریـش ﷺ ئـەوەی پەیمانـی دەشـکاند، سـزای دەدات، لەسـەر پەیـمان شـکاندنی، نـەك لەسـەر کوفـری، ئەگەرنـا ئەگـەر لەسـەر کوفـر بووایـە لـە سـەرەتاوە سـزای دەدان، ئەمـە ڕاسـتییەکی گرنگـە، پێویسـتە بیزانیـن و خـوای پـەروەردگار لێرەداو لـە چەنـد جێیـەکی دیکـەی قورئانـدا ڕوونـی کردۆتـەوە.

**چوارەم:** ناگونجێ ئەو ئایەتە نەسخ کرابێتەوە:

ئـەوەی لـە هەندێـك لـە تەفسـیرەکاندا هەیـە، کـە ئـەم ئایەتـە نەسـخ کراوەتـەوە، بـە ئایەتـی شمشـێر (سَـيْف)، کـە ئایەتـی (سَـيف) لـە قورئانـدا هـەر نیـەو، وشـەی (سَـيف) لـە قورئانـدا هـەر نەهاتـوە و، مەبەسـتیان لـە ئایەتـی ژمـارە (٥)ی سـوورەتی (التوبة)یـە، کـە لـە کاتـی تەفسـیرکردنی ئـەو سـوورەتەدا، بـە تەفصیـڵ قسـەمان لێکـردوەو گوتوومانـە: سـەرجەم ئـەو قسـانەی کـە فـڵان ئایەتـە نەسـخ بۆتـەوە،

چونکە باسی ئەوە دەکات: لێبوردنت هەبێ، چاوپۆشییت هەبێ، سنگ فراوان و لێبوردە بە! ئەو قسانە هیچیان پشت ئەستوور نین بە هیچ بەڵگەیەك، ئەم قورئانەی ئێستا لەبەر دەستی ئێمە دایە، ئەم موصحەفە موبارەکە، یەك ئایەتیشی تێدانیە، بگرە یەك ڕستەشی تێدانیە، کاری پێنەکرێ، زانایانیش کە کاتی خۆی ئیبنو عەبباس و جگە لە ئەویش (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، وشەی: نەسخ (نسخ)یان بەکارهێناوە، وەك لە کتێبی قورئانی مەزن (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا)[1] گوتوومانە، مەبەستیان چەند شتێک بووە:

**١-** حوکمێك کە بە گشتیی **(عام)** هاتوە، دوایی تایبەتکراوە بە هەندێك لە چەمکەکانیەوە.

**٢-** حوکمێك کە بە ڕەهایی **(مطلق)** هاتوە، دوایی بەنددار **(مقیَّد)** کراوە.

**٣-** مەبەستیان پێی ڕوونکردنەوەی حوکمێك بووە، کە پێشتر بە کورتیی هاتوە.

**٤-** مەبەستیان پێی پلە پلەیی **(تدّرج)** بووە.

بەڵام مەبەستیان ئەوە بێ کە ئایەتێك هاتوە، دوایی ئایەتێکی دیکە ئەوەی لابردوە، شتی وا لە قورئان دا نیەو، گریمان هاوەڵێکیش، یاخود زانایەکیش شتێکی وای گوتبێ، ڕای خۆی بووەو، ڕای ڕاست، ڕایەك کە پێمان وایە لەگەڵ پێگەی بەرزی قورئاندا بگونجێ، هەر ئەوەیە کە ئەم قورئانە، ئەم موصحەفەی ئێستا لەبەر دەستمان دایە، یەك ئایەت و یەك ڕستەشی تێدانیە، کاری پێنەکرێ و حوکمەکەی هەڵوەشابێتەوە.

لە خوای بەرزی مەزن داواکارین هەرچی زیاتر یارمەتییمان بدات، قووڵترو فراوانترو باشترو ڕاستتر، لە قورئان تێبگەین و، چاکتر بە ڕێبازی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ پابەند بین، بێگومان ڕێبازی پێغەمبەریش ﷺ هەر بریتیە لە بەرجەستە کردنی قورئان لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی

(١) شایەنی باسە ئەو کتێبە لە چاپی دووەم دا کراوەتە (پێشەکی گشتیی) کۆی ئەم تەفسیرە و دەخرێتە بەرگی یەکەمەوە.

و خۆیدا، خـوای بەخشـەر یارمەتیـی ئێمـەش بـدات هەرچـی زیاتـر کارلێك بکەیـن لەگـەڵ قورئانـدا، تاکـو لـە دنیـادا ژیانێکـی پـاك و چـاك و ڕاسـت و دروسـتمان هەبـێ و، لـە دواڕۆژیشـدا سـەربەرزو سـەرفراز بیـن.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی **(الغاشية)** دێنین.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.**

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢)ی مانگـی (**ذي الحِجَّـة**)، واتـە: مانگـی (١٢)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیی، بەرانبـەر (٢٣)ی تەممـووز، واتـە: مانگـی (٧)ی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زایینییـە، خوا پشـتیوان بـێ، دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الفَجـر**).

سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت بڕگـەدا دەکەیـن، وەك چوارچێـوەو هێڵـە گشـتییەکانی و، ناساندنی، بـەر لـەوەی بچینـە نێـو وردەکارییەکانـی شـیکردنەوەو ڕوونکردنـەوەی چەمـکی ئایەتـە بـە پێزەکانـی:

## پێناسەی سوورەتی (الفجر) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیـا نـاوی سـوورەتی (**الفَجـر**)ی، بەبـێ پیتـی (و) بـۆ بەکارهێنراوە، چونکـە سـوورەتەکە ئـاوا دەسـت پێـدەکات: ﴿ وَٱلۡفَجۡرِ ١ ﴾، بـەڵام لـە ناوەکەیـدا (و)ەکـە نەهاتـوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

تێکـڕای زانایـان لەسـەر مەککەیـی بوونـی یەکدەنگـن، تەنیـا (**إبـنُ عَطيَّـة**)، لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا: (**التَّحريـرِ الوَجيـز في تَفْسـيرِ كِتـابِ اللـهِ العَزيـز**) لـە (**أَبـو عَمْـرو الدَّاني**)یـەوە هێناویەتـی، کـە هەندێـك لـە زانایـان ئـەم سـوورەتە موبارەکەیـان بـە

مەدینەیی داناوە، بەڵام بەڵگەیەکی وا ئەم قسەیە پشتڕاست ناکاتەوە، لەو بارەوەش کە ئەم سوورەتە موبارەکە لە مەککە دابەزیوە، ئەم گێردراوەیە هەیە:

**{عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ وَالفَجْر بِمَكَّة} (أورده السيوطي في «الدرُّ المَنثور»: ج٨، ص ٤٩٧، ونسبه لابن الضريس والنحاس وابن مردويه والبيهقي، وقال: وأخرج ابن مردويه عن عبدِ الله بن الزبير ، قال: أنزلت والفجر بمكة، وأخرج عن عائشة ر ضي الله عنها، قالت: أُنْزِلَتْ سورَةُ الفَجْر بِمَكَّة، الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٣، ص ٥١١).**

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ، گوتوویەتی: سوورەتی **(والفجر)** لە مەککە دابەیوە.

هەروەها **(السيوطي)** پاڵیداوەتە لای **(إبن مُرْدَويه)** کە هەمان قسەی لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە  هێناوەو گوتوویەتی: سوورەتی **(والفجر)** لە مەککە دابەزیوە، دیسان **(إبنُ مُردويه)** لە دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هێناویەتی، گوتوویەتی: سوورەتی **(الفَجر)** لە مەککە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سوورەتە موبارەکە **(الفَجر)**، لە (مصحف)دا ژمارەکەی (٨٩)یەو، لە دابەزینیشدا ژمارەکەی (١٠)یە، پێش سوورەتی **(الضُّحى)**و، دوای سوورەتی **(اللَّيْل)** دابەزیوە، ئەوە ڕای ژمارەیەکی زۆر لە زانایانە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

زانایان سێ ژمارەیان بۆ داناون: أ- **(أَهْل الكُوفَة وَالشَّام)**، گوتوویانە: سیی (٣٠) ئایەتە.

ب- بەڵام (**أَهْلُ المَدينَة وَمَكَّة**) زانایانی ئەو دوو شارە موبارەكە، گوتوویانە: سیی و دوو (٣٢) ئایەتە.

ج- (**أَهْلُ البَصرة**)ش بە بیست و نۆ (٢٩)یان داناوە.

بەڵام زیاتر ژمارەی سیی (٣٠) تەبەننیی كراوە، بۆ ئایەتەكانی ئەم سوورەتە موبارەكە.

## پێنجەم: نێوەڕۆكی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە چوار تەوەران دەگرێتە خۆی:

١- پێنج سوێندی خوای بەرزی مەزن لە ئایەتەكانی: (١ - ٥) دا: ﴿وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾﴾.

٢- باسی فەوتێنرانی هەرسێك گەلی: عادو سەموودو فیرعەون و شوێنكەوتووەكانی، دوای یاخیبوون و سەركێشییان، خوا ﷻ سەرو قامچییەكی لە سزای خۆی لێداون، ئەمەش نۆ ئایەتەكانی: (٦ - ١٤)ی گرتۆتەوە.

٣- باسی مرۆڤی بێبڕواو دوور لە خوا، لە كاتی هات و نەهاتی دنیاییداو، سەرزەنشتی خوا ﷻ بۆی، لەسەر بیركردنەوەی چەوت و هەڵەی، كە ئەگەر هاتی بوو، پێی وایە خوا لێی ڕازییەو، ئەگەر نەهاتی بوو - لە ڕووی ماددییەوە - پێی وایە خوا لێی توورەیە، خواش ﷻ بەرپەرچی ئەو بیرو بۆچوونە هەڵانە دەداتەوە، ئەمەش شەش ئایەتەكانی: (١٥ - ٢٠)ی گرتۆتەوە.

٤- باسی ئاخیر زەمان و قیامەت و، سەرەنجامی هەر كام لە مرۆڤی بێبڕواو، مرۆڤی بڕواداری دڵ و دەروون ئۆقرە گرتوو و دامەزراو لەسەر بەندایەتیی بۆ خوا، ئەمیش دە (١٠) ئایەتەكانی كۆتایی: (٢١ - ٣٠)ی گرتۆتەوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

چەنـد شـتێك ئـەم سـووڕەتە جیادەکەنـەوە لـە سـووڕەتەکانی دیکـەو، کەسـایەتییەکی تایبەتـی پێدەبەخشـن، ئێمـەش حـەوت تایبەتمەندییـمان تێیـدا. کەوتوونـە بەرچـاو:

١- ئەو پێنج سوێندە تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون، ئەو پێنج سوێندەی لە ئایەتەکانی: (١ - ٥) داهاتوون.

٢- پێناسەی گەلی عاد بە (إِرَمْ)، کە دەفەرموێ: ﴿ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴾، لە ئایەتی ژمارە (٧)دا تەنیا لەم سووڕەتەدا بەو شێوەیە هاتوە، ئەگەرنا باسی فەوتێنرانی عاد دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا هوود ﷺ، بۆ لایان ڕەوانکراوە، لە زۆر لە ئایەتەکانی قوڕئاندا هاتوە.

٣- وەسفی فیرعەون بە: ﴿ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ﴾، لە ئایەتی ژمارە (١٠)دا، واتە: فیرعەونی خاوەن وەتەدەکان، کە دوایی باس دەکەین: ﴿ ٱلْأَوْتَادِ ﴾ چەند واتایەکی هەن:

أ- دەگونجێ مەبەست پێیان هەڕەمەکانی میسڕ بێ.

ب- دەگونجێ مەبەست پێیان سینگ و گوڵمیخ بێ.

ج- دەگونجێ مەبەست پێیان سەربازەکان سوپایەکەی فیرعەون بێ.

٤- باسی مرۆڤی بێبڕوا لە کاتی هات و نەهاتدا، کە لە کاتی هاتی ماددییدا، زۆر دڵخۆش دەبێ و پێی وایە خواش لێی ڕازییە، بەڵام لە کاتی نەهاتدا، دڵـتەنگ دەبێ و پێی وایە خوا ڕیسوای کردوە، ئەویش لە دوو ئایەتەکەی: (١٥ و ١٦)دا.

٥- باسی ئەوەکە هیچکەس وەك خوا کافر سزا نادات و کەلەپچە ناکات، لە دوو ئایەتەکەی: (٢٥ و ٢٦)دا.

٦- بانگکردنی مرۆڤی بڕودار بە نەفسی ئارامگرتوو: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴾، لە ئایەتی: (٢٧)دا.

٧- چەند وشەو تەعبیرێکی تایبەت بەم سووڕەتە، کە تەنیا لێرەدا هاتوون و، ئێمە ئەم پازدە (١٥) وشەو تەعبیرەمان کەوتوونە بەرچاو:

١- (وَلَيَالٍ عَشْرٍ)، سوێند بە دە شەوەکان.

٢- (وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ)، سوێند بە جووت و تاك.

٣- (وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ)، سوێند بە شەوگار کە دەڕواو ڕادەبرێ.

٤- (هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ)، ئایا لەوەدا سوێند خواردن هەیە بۆ خاوەن عەقڵ؟

٥- (جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ)، بەردیان قەڵاشتوە، بەردیان داتاشیوە لە شیو (واد)دا.

٦- (سَوْطَ عَذَابٍ)، قامچییەك ئازارو سزا.

٧- (أَكْرَمَنِ)، ڕێزی لێگرتووم.

٨- (أَهَٰنَنِ)، ڕیسوای کردووم.

٩- (وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا)، میرات دەخۆن بە لرف لێدان و بە کۆکردنەوەوە، هەمووی پێکەوە دەخۆن، هی خۆتان و هی خەڵکیش.

١٠- (حُبًّا جَمًّا)، خۆشویستنێکی زۆر.

١١- (دَكًّا دَكًّا)، کوتران لەسەر کوتران، یاخود وردو خاش کران.

١٢- (لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ)، وەك سزادانی خوا، کەس ئاوا سزا نادات.

١٣- (وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ)، وەك کەلەپچە کردنی خوا (بۆ بابای بێبڕوا) کەس وا کەس کەلەپچە ناکات.

١٤- (يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ)، ئەی نەفسی ئۆقرەو ئارامگرتوو.

**١٥-** (جَنَّتِي)، باخەکەم، لە هەموو قورئاندا کە خوا بە هەشتی پاڵ دابێتە لای خۆی، تەنیا لێرەدایە، (جَنَّتِي) ئەو باخ و بەهەشتەی دامناوە بۆ دۆستانی خۆم .

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە کۆی سیی (٣٠) ئایەتە موبارەکەکەی ئەم سوورەتە، دەکەینە دەرسێك، چونکە هەرچەندە لە چوار بابەت و چوار تەوەر پێکدێ، بەڵام هەموویان تێکهەڵکێشن و پێکەوە پەیوەستن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەر سی (٣٠) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکەی (**الفَجر**) پێکهاتووەو، چوار تەوەری سەرەکیی دەگرێتە خۆی، کە پێشتریش باسمان کردن:

١- پێنج ئایەتی یەکەم: ﴿وَٱلۡفَجۡرِ ١ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ٢ وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ ٤ هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ ٥﴾، ئەم پێنج ئایەتە موبارەکە تەوەری یەکەمی ئەم سوورەتە موبارەکە پێکدێنن، خوا ﷻ سوێند دەخوا بە بەرەبەیان و، دە شەوەکان و، بە جووت و بە تاك و، بە شەوگار کە دەڕوات، کەواتە: خوا سوێندی بە پێنج شتان خواردوە، دوایی فەرموویەتی: ﴿هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ﴾، ئایا لەوەدا سوێند هەیە بۆ خاوەن عەقڵ، واتە: ئایا ئەو پێنج شتە شایستەی ئەوەن سوێندیان پێ بخورێ، بێگومان بەڵێ، بۆیەش خوا ﷻ سوێندی پێ خواردوون.

٢- باسی فەوتێنرانی هەرسێ گەلی: (عادو سەموود و فیرعەون)، دوای یاخیبوونیان و سەرکێشییکردنیان لە بەرانبەر خواو، بەندەکانی داو سزادانی خوا بۆیان و، یەك قامچیی لێدانی هەر کامێکیان، لە سزای خۆی: ﴿فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ﴾، کە بەنسبەت گەلی عادەوە فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ٦ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ٧ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ٨﴾.

دوایی بە نسبەت گەلی سەموودەوەش فەرموویەتی: ﴿وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ﴾، واتە: ئەو گەلی سەموودەی بەردیان قەڵاشت و داتاشی، لە (واد)دا، کە دۆڵ و شیوێکە زۆربەی زانایان دەڵێن: (**وَادي القُرى**)یە.

بەنسبەت فیرعەونیشەوە فەرموویەتی: ﴿وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ﴾، فیرعەونی خاوەن سینگ و گوڵمیخەکان، ئنجا بەگشتیی لە بارەیانەوە فەرمووی: ﴿ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ١١ فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ١٢﴾، ئەوانەی لە وڵاتاندا سنووریان

بەزاند، هەڵگەڕانەوە لە خواو یاخیبوون و، خراپەکاریی و تێکدانیان تێدا زۆر کرد، ﴿ فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴾، پەروەردگاریشت سەرو یەك قامچی لە سزاو ئازاری خۆی بەسەردا ڕشتن، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت لە بۆسەدایە، چاودێریی بەندەکانی دەکات و هەرکامێکیان سەرەڕۆیی و زێدەڕۆیی بکات، بە شێوەیەك کە ژیانی خەڵك تێکبدات لەسەر زەوی، سزای دەدات.

٣- باسی مرۆڤی بێبڕواو دوور لە خوا، لە کاتی هاتوونەهاتی دنیاییدا، کە پێی وایە: هەرکات خوا ﷻ نازو نیعمەتی پێدا، خۆشیدەوێ و ڕێزی لێ دەگرێ و، هەرکات بژیویشی لێوە وەتەنگ هێنا، ڕیسوای کردوە، لێرەدا خوای پەروەردگار بەگشتیی باسی مرۆڤ دەکات، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕواو خراپەکارە، ﴿ فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾، وشەی: (**الإنسان**)، (**ال**)ی ناساندنی لەسەرەو بە پێی ڕای زۆربەی زانایان (**أَل**)ەکە بۆ (**عهد**)ە، یانی: مرۆڤ بێبڕوایەکە، دەشگونجێ بگوترێ: (**أَل**) ەکە بۆ ناساندنی جینسە، جینسی مرۆڤ، چونکە ئەو کاتەی قورئانی تێدا دابەزیوە، جینسی مرۆڤەکان بەتێکڕا لەو جۆرە بوون: ﴿ فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ﴾، مرۆڤ (واتە: مرۆڤی بێبڕوا)، کاتێك پەروەردگاری تاقیکردەوە، ڕێزی لێگرت و نازو نیعمەتی پێدا، دەڵێ: پەروەردگارم ڕێزی لێگرتووم، بەڵام ئەگەر تاقیکردەوەو بژیوی لێ وەتەنگ هێنا، دەڵێ: پەروەردگارم منی ڕیسوا کردوەو سووکایەتیی پێکردووم!

خواش ﷻ بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ كَلَّاۖ بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ﴿٢٠﴾ ﴾.

٤- باسی ئاخیر زەمان و قیامەت و سەرەنجامی هەرکام لە مرۆڤی بێبڕواو، بابای بڕواداری دڵ و دەروون ئۆقرە گرتوو، بە بەندایەتیی بۆ خواو، بە یادی خوا: ﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا دَكّٗا ﴾، ئەوە ئاخیر زەمانە، ئنجا: ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ﴿٢٢﴾ ﴾.

ئەمەش باسی قیامەتەو لە درێژەی ئەو باسەدا دەفەرموێ: ﴿ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾ ﴾.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَٱلۡفَجۡرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ ﴿٤﴾ هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ ﴿٥﴾ أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴿٧﴾ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١١﴾ فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّاۖ بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ﴿٢٠﴾ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا دَكّٗا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ﴿٢٢﴾ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

(بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە . سوێند بە سپێدە (بەیانیی) ﴿١﴾ سوێندیش بە دە شەوەکان ﴿٢﴾ سوێندیش بە جووت و بە تاك ﴿٣﴾ سوێندیش بە شەو کە ڕادەبرێ (دەڕوات) ﴿٤﴾ ئایا لەوانەدا سوێند(ی پێویست) هەیە بۆ (مرۆڤی) خاوەن عەقڵ؟ ﴿٥﴾ ئایا نەتدی (بە چاوی عەقڵ) پەروەردگارت چی و چۆنی بە (گەلی ملهوڕی) عاد کرد ﴿٦﴾ ئیرەمی خاوەن کۆڵەگان ﴿٧﴾ کە وێنەی وی لە وڵاتان دا دروست نەکرابوو؟ ﴿٨﴾ (گەلی) سەموودیش کە (بۆ خانوو و بەرەیان) بەردی ڕەقیان لە دۆڵەکەدا بڕیبوو (تراشیبوو) ﴿٩﴾ فیرعەونی خاوەن گوڵمیخەکانیش ﴿١٠﴾ ئەوانەی لە وڵاتاندا (لە خوا) یاخیبوون ﴿١١﴾ ئنجا زۆریان تێکدان و خراپەکاریی تێداکردن ﴿١٢﴾ پەروەردگاریشت قەمچییەك ئازارو سزای بەسەردا ڕشتن ﴿١٣﴾ بە دڵنیایی پەروەردگارت (بۆ سزادانی تێکدەرو خراپەکاران) لە بۆسەدایە ﴿١٤﴾ کەچی مرۆڤ (ی بێبڕوا)یش هەرکات پەروەردگاری تاقیکردەوە، ئنجا ڕێزی لێگرت و چاکەی لەگەڵدا کرد (بەهرەمەندی کرد)، یەکسەر دەڵێ: پەروەردگارم ڕێزی لێگرتم ﴿١٥﴾ بەڵام ئەگەر (خوا) تاقیکردەوە، ئنجا بژیوی لێ وەتەنگ هێنا، یەکسەر دەڵێ: پەروەردگارم ڕیسوای کردم ﴿١٦﴾ وانیە، (کە گومان دەبەن) بەڵکو ئێوە ڕێزی هەتیو ناگرن ﴿١٧﴾ یەکدیش هان نادەن لەسەر خواردن (پێدان)ی نەدار ﴿١٨﴾ میراتیش بە لرف لێدان دەخۆن (و بەشی ئافرەت و هەتیوانی لێنادەن) ﴿١٩﴾ سامانیشتان بە خۆشویستنێکی زۆر (و بێ تام) خۆشدەوێ ﴿٢٠﴾ وا مەکەن، هەر کات زەوی بە کوترانێکی یەك لە دوای یەك کوترا (وردو خاش کرا) ﴿٢١﴾ پەروەردگاریشت و فریشتەکانیش ڕیز ڕیز هاتن ﴿٢٢﴾ دۆزەخیش هێنرا، لەو ڕۆژەدا مرۆڤ (ی بێبڕوا) بیری دەکەوێتەوە، بەڵام لە کوێ و چۆن یادکردنەوەکەی (سوودی) دەبێ؟! ﴿٢٣﴾ دەڵێ: ئەی خۆزگە پێشمخستبایە (ئیمان و کردەوەی باش) بۆ ژیان (ی ئێستا)م ﴿٢٤﴾ لەو ڕۆژەدا

هیچکەس وەك ئازاردانی وی (خوا) سزاو ئازار نادات ﴿٢٥﴾ هەروەها هیچکەس وەك کەلەپچەکردنی وی، کەلەپچە ناکات ﴿٢٦﴾ ئەی نەفسی ئۆقرە گرتوو! ﴿٢٧﴾ بۆ لای پەروەردگارت بگەڕێوە، بە ڕازیی و پەسندکراویی ﴿٢٨﴾ ئنجا بچۆ نێو (ڕیزی) بەندە (چاکە)کانم ﴿٢٩﴾ هەروەها بچۆ بەهەشتەکەمەوە ﴿٣٠﴾).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**وَٱلْفَجْرِ**): (**الفَجْرُ: شَقُّ الشَّيْءِ شَقًّاً وَاسِعَاً**)، (**فَجْر**): بریتیە لە لەتکردنی شتێك بە شێوەیەکی فراوان، واتە: بە فراوانیی لێکیبکەیەوە، (**وَالْفَجْرُ: الصُّبْحُ لِأَنَّهُ فَجَرَ اللَّيْلَ**)، هەروەها (**فَجْر**) بە سپێدەو بەیانیی دەگوترێ، چونکە شەوگار شەق دەکات، دڕ بە تاریکیی شەو دەدا.

(**وَٱلشَّفْعِ** ): (**الشَّفْعُ: ضَمُّ الشَّيْءِ إِلَى مِثْلِهِ**)، (**شَفْع**): بریتیە لەوەی شتێك وێنەی خۆی بێتەلاو جووت ببێ، (**وَالشَّفْعُ: المَخلوُقات، مِنْ حَيْثُ أَنَّها مُرَكَّبَاتٌ**)، (**شفع**) دروستکراوەکانن لەو ڕووەوەی پێکهاتەن، لە چەند بەشێك پێکهاتوون.

(**وَٱلْوَتْرِ**): (**الوَتْرُ: هُوَ اللهُ، لِأَنَّهُ لَهُ الوَحْدَةُ مِنْ كُلِّ وَجْهٍ**)، (**وَتْر**): مەبەست پێی خوایە ﷻ، چونکە تاکێتیی بۆ هەیە، لە هەموو ڕوویەکەوە، (**وَتْر**) و (**وِتْر**) دەگوترێن.

(**حِجْرٍ**): (**العَقْلُ، لِأَنَّهُ يَحْجُرُ أَي: يَمْنَعُ صَاحِبَهُ عَمَّا تَدْعُ إِلَيْهِ نَفْسُهُ مِنَ الشَّرِّ**)، (**حِجْر**)، واتە: عەقڵ لەبەر ئەوەی ڕێ لە خاوەنەکەی دەگرێ، لە شتێکدا کە نەفسی داوای دەکات، لە شتی خراپ.

(**جَابُواْ** ): (**الجَوْبُ: قَطْعُ الجَوْبَةِ، وَهِيَ كَالغَائِطِ مِنَ الأَرْض**)، (**جوب**): بریتیە لە بڕینی (**جَوْبَة**)، (**جَوْبَة**)ش دابڕاوەییەکە لە زەوییدا، دالانێك، دابڕاوییەك، خەندەکێك لە زەویدا.

(ٱلصَّخْرَ): (الصَّخْـرُ: الحَجَـرُ الصَّلْـبُ)، (صَخْـر): بریتیـە لـە بـەردی ڕەق، یـان بـەردی، چیـای ڕەقـی سـەخت.

(ذِى ٱلْأَوْتَادِ): (الأَوْتَـادُ جَمْـعُ وَتِـدْ، أَوَ الوَتَـدْ)، (ٱلْأَوْتَادِ) كـۆی (وَتِـد) یـان (وَتَـد)ە، واتە: گوڵمیـخ، سـینگ، بەشـێك لـە زانایـان گوتوویانـە: ﴿ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ﴾ مەبەسـت هەڕەمەكانـی میـصرە، بـا ئـەو فیرعەونـەی مووسـاش دروسـتی نەكردبـن، بـەڵام ئـەو وڵاتـەی فیرعـەون بەسـەری ڕاگەیشـتوە، ئـەو هەڕەمانـەی تێدابـوون.

(طَغَوْا ): (الطُّغيَـانُ: تَجَـاوُزُ الحَـدِّ فِي العِصْيَـانِ)، (طُغْيَـان): بریتیـە لـە سـنووربەزێنیی لـە سـەرپێچییدا.

(ٱلْفَسَادَ): (خُـروجُ الـشَّيْءِ عَـنِ الإِعْتِـدَالِ قَلِيْـلاً أَوْ كَثِيراً، وَيُضَـادُّهُ الصَّـلاَحُ)، (فَسَـاد): (تێكـدان و خراپەكاریـی) بریتیـە لـە دەرچوونـی شـتێك لـە حاڵەتـی هاوسـەنگیی، زۆر یـان كـەم، دژو پێچەوانـەی (فَسَـاد)یش بریتیـە لـە (صَلَاح)، واتـە: چاكیـی و چاكسـازیی.

(فَصَبَّ عَلَيْهِمْ ): بەسـەریدا ڕژانـدن، (صَـبُّ المَـاءِ: إِرَاقَتُـهُ مِـنْ أَعْلى، صَبَّـهُ فَانصَـبَّ، وَصَبَبْتُـهُ فَتَصَبَّـبَ)، (صَـبُّ المَـاء): ئەوەیـە ئـاو لـە سـەرەوە ڕا بڕژێنـرێ، دەگوتـرێ: (صَبَّهُ فَانْصَـبَّ)، ڕشـتی و ئەویـش ڕژا، (وَصَبَبْتُـهُ فَتَصَبَّـبَ)، ئاوەكـەم ڕشـت، ئنجـا ڕژا.

(سَوْطَ عَذَابٍ): (السَّـوْطُ: الجِلْـد المَضْفُـورُ الَّـذِي يُـضْرَبُ بِـهِ)، (سـوط): بریتیـە لـە چەرمێـك كـە لـە چەنـد زوێڵـە چەرمێـك دەهۆندرێتـەوە، پێـی لـە خەڵـك دەدرێ، بـە كوردیـی قەمچیـی پـێ دەڵێیـن، كاتـی خـۆی لـە چەنـد زوێڵـە[1] چەرمێـك، دروسـتكراوە، زوێڵـە چەرمـەكان بـە باریكیـی، بـڕدراون و دوایـی وەك چەنـد داوە بەنێك پێكـەوە هۆنراونـەوەو، قەمچییـان لـێ دروسـتكراوەو پێیـان لـە خەڵكـی دراوە.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴾، (تَشْبيهَاً بِالـضَّرْبِ بِالسَّـوْطِ، أَوْ مَـا خُلِـطَ لَهُـمْ مِـنْ أَنـوَاعِ العَـذَاب)، ئـەو سـزایەی خـوا چوێـنراوە بـە قەمچییەكـەوە

(١) زوێڵە چەرم: پارچەی بڕدراوی چەرم و پێست بە باریكیی.

کـە پێـی لـە خەڵـك دەدرێ، یاخـود مەبەسـت پێـی تێکەڵەیەکـە لـە جۆرەکانـی سـزاو ئـازار.

(لَبِٱلۡمِرۡصَادِ): (الرَّصَـدُ: الإِسْـتِعْدَادُ لِلتَّرَقُّـبِ)، (رَصَـد): بریتیـە لـە ئامـادە بـوون بـۆ چاودێریـی کـردن، (وَالمِرْصـادُ: المَـكَانُ الَّـذي اخْتُـصَّ بِالتَّرَصُّـدْ) (مِرصـاد) ئـەو شـوێنەیە کـە تایبەتـە بـە چاودێریـی لێکردنـەوە.

کەواتــە: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ﴾ بێگومــان پــەروەردگارت لــەو شــوێنەیە کـە چاودێریـی تێـدا دەکـرێ، یاخـود پـەروەردگارت لـە حاڵەتـی چاودێریـی کردندایـە بـۆ مرۆڤـەکان.

(فَأَكۡرَمَهُۥ): (الإِكْـرامُ والتَّكْريـمُ: إِيْصـالُ الإِكْـرَامِ، أَيْ: نَفْـعٍ لايَلحَقَـهُ فِيـهِ غَضَاضَـةٌ، أَوْ إِيصَـالُ الكَريـمِ الشَّريـف)، (إِكْـرَام وَتَكْريـم) هەردووکیـان بریتیـن لـە گەیاندنـی ڕێـز لێگرتـن، واتـە: سـوودێك کـە هیـچ کـەم و کووڕیـی و داشـکاندنی تێـدا نەبـێ، یاخـود گەیاندنـی شـتێکی نایـاب و پەسـند لـە جـۆری خـۆی.

(وَنَعَّمَهُۥ): (النِّعْمَـةُ: الحَالَـةُ الحَسَـنَة)، (نِعْمَـة)، واتـە: چاکـە، یـان حاڵەتـی بـاش، (وَالنَّعْمَـةُ: التَّنَعُّـم) (نَعْمَـة): بـە سـەری نوونەکە واتە: خۆشـگوزەرانیی، خۆشـلێگوزەران و نـازو نیعمـەت، (نَعَّمَـهُ: أَيْ جَعَلَـهُ فِي نِعْمَـةٍ، أَوْ جَعَلَـهُ فِي نَعْمَـةٍ)، (نَعَّمَـهُ)، واتـە: ئـەو کەسـەی خسـتە نێـو نـازو نیعمـەت، یاخـود وای لێکـرد خـاوەن نـازو نیعمـەت بـێ.

(فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ): بژیوەکـەی لـێ وەتەنـگ هێنـا، (قَـدَرْتُ عَلَيْـهِ الـشَّيءَ: ضَيَّقْتُـهُ كَأَنَّمَـا جَعَلْتُـهُ بِقَـدْرٍ، بِخِـلافِ مَـا وُصِـفَ بِغَـيْرِ حِسَـابٍ)، (فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ): بژیوکـەی لـێ وەتەنـگ هێنـا، وەك وای لێکردبـێ بـە ئەنـدازە بـێ، بـە پێچەوانـەی ئـەوە کـە وەسـفکراوە: بەبـێ بـۆ ژمـاردن بـێ.

(أَهَٰنَنِ): (الهَـوَانُ عَـلَى وَجْهَـيْنِ، تَذَلُّـلُ الإِنْسَـانِ فِي نَفْسِـهِ لِـمَا لا يُلْحِـقُ بِـهِ غَضَاضَـةً، وَهَـذا مَـدْحٌ، وَتَذَلُّـلِ الإِنْسانِ مِـنْ جِهَـةٍ مُتَسَـلِّطٍ يَسْـتَخِفُّ بِـهِ، فَيُـذَمُّ بِـهِ)، (هَـوَانْ): لـە

دوو ڕووەوەیە، ڕووێکیان ئەوەیە مرۆڤ لە خودی خۆیدا خۆی نەرم ونیان و هێمن و میهرەبان بکات، بە جۆرێك کەم و کوڕیی نەیەتەوە سەرێ، ئەوەیان پێی مەدح دەکرێ، دەگوترێ: فلانکەس مرۆڤێکی نەرم و نیانە، هێمنە، بێ زەرو زیانە، جۆرێکی دیکەش لە (هَوَان)، ئەوەیە کە دەسەلاتدارێك بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو گاڵتەی پێبکات و، بە کەم تەماشای بکات، ئەوەش بەدڵنیایی لەو حاڵەتەدا بۆ ئەو کەسە بە نوقصانیی دادەنرێ و، بەوە لۆمەی دێتە سەرێ.

(تَحَٰٓضُّونَ ): (الحَضُّ: التَّزيينُ كَالحَثِّ)، (حَضّ): بۆ جوانکردنە، وەك (حَثّ)، واتە: هاندان، (تَحَٰٓضُّونَ ) (تفاعُلٌ مِنَ الحَضِّ) (تَحَٰٓضُّونَ )، لەسەر کێشی (تفَاعُل)ەو لە (حَضّ)ەوە هاتوە، واتە: یەکدی هان نادەن لەسەر خواردندان بە نەدار.

(ٱلتُّرَاثَ ): (الوِرَاثَةُ وَالإِرْثُ: إنْتِقَالُ قِنْيَةٍ إلَيْكَ مِنْ غَيْرِكَ مِنْ غَيْرِ عَقْدٍ، مِيرَاثٌ وَإِرْثٌ) (وِرَاثَة وإِرْثٌ) هەردووکیان بەمانای ئەوەن کەل و پەل و ماڵێك لە جگەلە تۆ بۆ تۆ بێ، بەبێ هەبوونی گرێبەستێك، واتە: بە کڕین و فرۆشتن نا، میرات سێ وشەی بۆ بەکاردەهێنرێن: (مِیراث، تُرَاثْ، إِرْث) هەر سێکیان بە مانای میراتن.

(لَّمّٗا): ﴿وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا﴾، (لَمَمْتُ الشَّيءَ: جَمَعْتُهُ وَأَصْلَحْتُهُ، يُقَالُ: لَمَمْتُ شَعْثَهُ)، (لَمَمْتُ الشَّيءَ)، ئەو شتەم کۆکردەوەو چاکم کرد، دەگوترێ: (لَمَمْتُ شَعْثَهُ) شتێك کە پرژو بلاو دەبێ، کۆی بکەیەوە سەریەك (شَعْث)، واتە: پرژو بلاوبوونەوەی شتێك.

(جَمّٗا ): (أَيْ: كَثيراً مِن جَمَّةِ المَاءِ أَيْ: مُعْظَمِهِ وَمُجْتَمَعِهِ الَّذِي جُمَّ فِيهِ المَاءُ عَنِ السَّيَلان)، (جَمّ): یانی: زۆر، لە: (جَمَّةُ المَاء)ەوە، هاتوە، یانی: زۆرینەی ئاو و کۆبوونەوەی ئاو لە شوێنێك کە ئاوی لێ کۆکراوەتەوەو ڕێی لێگیراوە بڕژێ و لەبەری بڕوا.

(**دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ**): (**الـدَّكُّ: الأَرْضُ اللَّيِّنَـةُ السَّـهْلَةُ، دَكَّـهُ دَكَّاً: جَعَلَهُ بِمَنْزِلَـةِ الأَرْضِ اللَّيِّنَة**)، (**دَكّ**)، زەوییەکـی نەرمـی ئاسـانە، دەگوتـرێ: (**دَكَّـهُ دَكَّاً: جَعَلَـهُ بِمَنْزِلَـةِ الأَرْضِ اللَّيِّنَـة**)، واتـە: کوتـای وەك زەوییەکـی نـەرم و ئاسـانی لێکـرد، شـتی ڕەق ئەگـەر بکوتـرێ، دەشـکێ و ورد دەبـێ، دوایـی نـەرم و تەخـت دەبـێ، وەك زەوییەکـی ئاسـان، ئەگەرنا وشـەی (**دَك**): لـە ئەسـڵدا بەمانـای هاڕیـن و کوتـان و شـکاندنە.

(**وَلَا يُوثِقُ**): (**أَوْثَقْتُـهُ أَي: شَـدَدْتُهُ، وَالوَثَـاقُ وَالوِثَـاقُ: إِسْـمَانِ لِـمَا يُوثَـقُ بِـهِ الـشَّيءُ، أَوْثَقْتُـهُ أَيْ: شَـدَدْتُهُ**)، واتـە: تونـدم کـرد، قایمـم کـرد، بەسـتم، (**وَثَـاقْ و وِثَـاقْ**)، هەردووکیـان نـاون بـۆ ئـەوەی شـتێکی پـێ دەبەسـترێ و تونـد دەکـرێ.

(**ٱلْمُطْمَئِنَّةُ**): (**الطُّمَأْنِيْنَـة وَالإِطْمِئْنَـانُ: السُّـكُونُ بَعْـدَ انْزِعَـاجٍ**)، هـەردوو وشـەی: (**طُمَأْنِيْنَـة وإطْمِئْنَـان**)، بریتیـن لـە هێمـن بـوون و ئـارام بـوون دوای بێزاریـی و ناڕەحەتیـی.

(**رَاضِيَةً**): (**رِضَى العَبْـدِ مِـنَ اللهِ، أَلاَّ يَكْـرَهَ مَـا يَجْـرِي بِـهِ قَضَـاؤُه، وَرِضَى اللهِ عَـن عَبْـدٍ، هُـوَ أَن يَـراهُ مُؤْتَمِـراً لِأَمْـرِهِ وَمُنْتَهِياً عَـنْ نَهْيِـهِ**)، ڕازیبوونـی بەنـدە لـە خـوا ئەوەیـە پێـی ناخـۆش نەبێ بڕیـاری خـوا جێبەجـێ ببێ بەسـەریدا، ڕازیبوونـی خـواش لـە بەنـدە، ئەوەیـە کـە ببینـێ فەرمانەکـەی جێبەجـێ دەکات و، خـۆی لـە قەدەغەکراوەکانـی دەپارێزی.

(**مَّرۡضِيَّةً**): لێڕازیبـوو، پەسـند کـراو، (**أَيْ: مَحَـلُّ الرِّضى**)، شـوێنی ڕەزامەندیـی، بێگومان بەئەنـدازەی ئـەوە کـە مـرۆڤ پابەنـد دەبـێ بـە بەرنامـەی خـوای پـەروەردگارەوە، هـەم لـە خـوا ڕازی دەبـێ و، هـەم لـە ئەنجامـی ئـەوەدا خـوای میهرەبانیـش لێـی ڕازی دەبـێ و پەسـندی دەکات و، دەیـکات بـە شـوێنی ڕەزامەندیـی و پەسـندیی خـۆی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا دەفەرموێ:

﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

**١-بە** ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، دەست دەکەم بە خوێندنی ئەم سوورەتە موبارەکە، - یان کردنی ئەم کارە - نەك بە ناوی هەر کەس و هەر شتێکی دیکە.

**٢-** بەپێی بەرنامەی خوا، ئەم کارە دەکەم.

**٣-** بەمەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا، ئەم کارە دەکەم.

**٤-** بە هەوڵ و توانایەك کە خوا بۆی ڕەخساندووم، ئەم کارە دەکەم.

خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا - وەك پێشتریش پێناسەمان کرد - سەرەتا سوێند دەخوات بە پێنج شتان: ﴿ وَٱلۡفَجۡرِ ١ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ٢ وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ ٤ هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ ٥ ﴾.

واتە: سوێند بە (فَجْر)، (فَجْر)، بە کوردیی پێی دەڵێین: بەیانیی، سپێدە، بەرەبەیان، ئایا (فجر) لە چییەوە هاتوە؟ (**فجر**) بە مانای شەقکردن و لەتکردنی شتێك دێ بە فراوانیی، ئنجا لەبەر ئەوەی بەرەبەیان دڕ بەتاریکیی شەو دەداو دنیا ڕووناك دەبێتەوە، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوەو خوا سوێندی پێخواردوە، ئایا مەبەست لە (**فجر**) بەیانییەکی تایبەتە، یان هەر بەیانییەکە؟ هەردوو واتایەکە دەگرێتەوە.

﴿ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ﴾ سوێندیش بە دە شەوەکان، ئەمیش ئایا مەبەست پێی دە شەوی تایبەتن، یان هەر دە شەوێك؟ شێوەی داڕشتنەکە ئەوە دەگەیەنێ کە

مەبەست دە شەوی تایبەت بن، بۆیە زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی دە شەوەکانی سەرەتای مانگی (**ذي الحِجَّة**)یە، کە کۆتاییەکەیان، شەوو ڕۆژی دەیەم، بریتیە لە جەژنی قوربانیی (**عيد الأَضْحى**)، ئەو ڕۆژەی قوربانیی تێدا سەر دەبڕێ.

﴿ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴾ سوێندیش بە جووت و بە تاك، هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: جووتەکە مەبەست پێی ڕۆژی دەیەم، (١٠)ی (**ذي الحجة**)یە، تاکەکەش مەبەست پێی ڕۆژی نۆیەمە: ڕۆژی عەرەفە (**يَومُ العَرَفَة**)ە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴾ یانی: هەر جووتێك و هەر تاکێك. (**الطبري**) گوتوویەتی: واباشە ئەو واتایەی لێ بگیرێ.

هەندێکیش گوتوویانە: (**شَفع**) واتە: دروستکراوەکانی خوا، کە هەموویان جووتن، هەر لە گەردیلەوە بگرە کە بارگەی ساردو گەرمی هەیە، هەتا هەموو دروستکراوەکانی دیکە: ڕووەکەکان، زیندەوەرەکان، ئاژەڵەکان، هەموو دروستکراوەکانی دیکەی خوا جووتن، ئاسمان و زەویی، تاریکیی و ڕووناکیی، دنیاو دواڕۆژ، چاك و خراپ، ساردو گەرم، هەمووی جووتە، تەنیا خوا تاکەو وێنەی نیە.

﴿ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴾ سوێند بەشەوگار کە ڕادەبرێ و دەڕوات ﴿ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴾ خوا دەپرسێ و دەفەرموێ: ئایا لەوەدا کە باسکرا (لەو پێنج شتانەدا) سوێند خواردن هەیە بۆ بابای خاوەن عەقڵ؟ ﴿ لِّذِى ﴾، یانی: (**صاحِب**)، خاوەن، ﴿ حِجْرٍ ﴾ واتە: عەقڵ، (**لأَنَّهُ يَحْجُرُ صَاحِبَهُ عَنِ الشَّرِّ**) لەبەر ئەوەی عەقڵ خاوەنەکەی لە خراپە دەگێڕێتەوە، لێرەدا وەڵامی سوێندەکە نەهاتووە لە چەند شوێنێکی قورئاندا، وەڵامی سوێندەکە نایەت، بۆیەش خوا وەڵامەکەی نافەرموێ، تاکو مرۆڤ بە هەڵهێنجانی خۆی دیاریی بکات، ئەگەر خوا فەرمووبای، یەك شتی دەفەرموو، بەڵام ئێستا بە هەڵهێنجانی خۆمان دەگونجێ بڵێین:

**١-** سوێند بەوانە، ئەی مرۆڤەکان! لێتان دەپرسرێتەوە.

**٢-** یان ئەی مرۆڤەکان! زیندوو دەکرێنەوەو سزاو پاداشت هەیە.

**٣-** یان ئەی مرۆڤەکان! ئەگەر خوا نەپەرستن بەدبەخت دەبن و، ئەگەر خوا بپەرستن بەختەوەر دەبن، دەگونجێ زۆر شت دابنرێ، لەوانەی لەگەڵ ڕەوتی ئایەتەکاندا دەگونجێن.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ ﴾، ئایا نەتبینی (واتە: بە چاوی عەقڵ و دڵ)، چونکە کەس لەوێ نەبووە، کاتێك خوا ئەو گەلانەی فەوتاندوون تاکو بە چاوی سەر بیبینێ، ئایا بە چاوی عەقڵ و دڵ نەتبینی: ﴿ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴾ پەروەردگارت چی بە عاد کرد، چۆنی پێ کرد، چۆنی سزادا؟ ئەگەر مەبەست لە دیتنی چاویش بێ: ئایا شوێنەوارەکانی گەلی عادت نەبینیون، خوا چی پێکردوون؟

﴿ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴾، وشەی ﴿ إِرَمَ ﴾، (**عَطْفُ بَيَانٍ لِعَادٍ**)، واتە: مەبەست لەگەلی عاد، گەلی ﴿ إِرَمَ ﴾ی خاوەن کۆڵەکەکان ﴿ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴾ە، ئەو کۆڵەگانەش:

**أ-** یان پایەبەرزەکانی بینایەکانیان بوون.

**ب-** یاخود ئەوانە ئاژەڵدار بوون و گەرمیان و کوێستانیان کردوە، کۆڵەکەیان وەبەر ڕەشماڵەکانیان داون.

**ج-** یاخود مەبەست پێی هێزو تواناو دەسەڵاتە.

﴿ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴾ ئەو گەلی عادەی وەك وی لە وڵاتاندا دروست نەکرابوون، زۆر بەهێز بوون، وەك لە سوورەتی (**فُصِّلَت**) لە کاتی تەفسیرکردنیدا باسمان کرد کە گوتوویانە: ﴿ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ﴿١٥﴾ ﴾، کێ لە ئێمە بەهێزترە؟

﴿ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ ﴾، هەروەها گەلی سەموود کە بەردیان داتاشی لە شیوو دۆڵەکەدا، یانی: (**وَادي القُرَى**).

﴿ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ﴾، هەروەها فیرعەونی خاوەن کۆڵەگەکان، یاخود فیرعەونی خاوەن هەرەمەکان، یاخود فیرعەونی خاوەن سەربازەکان، یاخود فیرعەونی خاوەنی سینگ و گوڵمیخەکان، کە ئەگەر ویستبای کەسێك سزاو ئازار و ئەشکەنجە بدات، چوار مێخەی دەکێشا، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: چوار مێخەی کێشاوە، واتە: بەدیوارێکەوە ڕایگرتوە، گوڵمیخێك لەسەر ئەو دەستەی، یەکێ لەسەر ئەو دەستەی، یەکێ لەسەر ئەو پێیەی و یەکێك لەسەر ئەو پێیەی دیکەی، بەو شێوەیە کردوویەتی بە ڕەسم بە دیوارەوە، هەتا ڕووحی دەرچووە، ئەوەش خراپترین جۆری ئەشکەنجەدانە، ﴿ ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِى ٱلْبِلَـٰدِ ﴾ ئەوانەی لە وڵاتاندا یاخیببوون، لە سنوور دەرچوون، ﴿ فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ﴾ ئنجا پڕیان کرد لە تێکدان و خراپەکاریی، هەمیشە خراپەکاریی و تێکدان، بەرهەمی یاخیببوونە لە خوا، هەر کەسێك لە خوا یاخیببوو، مافی ئەوانەی دیکە پێشێل دەکات و وڵات تێکدەداو خراپەکاریی تێدا دەکات، بەڵام ئایا وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێ؟ نەخێر: ﴿ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴾ پەروەردگاریشت یەك قەمچیی ئازاری بەسەردا ڕژاندن، یاخود: سزاو ئازارێکی جۆراو جۆری دان و، هەر کامێکیانی بەجۆرێك سزادا، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت لە بۆسەدایە، چاودێریی مرۆڤەکان دەکات و لێیان ئاگادارە، هەر کامێکیان زۆر لە خەت دەرچوو، سزای دەدا، بۆ ئەوەی بیکاتە مایەی پێ تەمبێبوونی خەڵکی دیکەش.

ئنجا خوای پەروەردگار دێتە سەر باس و بابەتێکی دیکەو دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَـٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴾، خوای کاربەجێ بەو جۆرەی ڕابرد، لەگەڵ کەسانێکدا کە لە خوا یاخیی دەبن مامەڵە دەکات، بەڵام مرۆڤی بێبڕوا کاتێك پەروەردگاری تاقیکردەوەو ڕێزی لێگرت، نازو نیعمەتی پێدا، دەڵێ: پەروەردگارم ڕێزی لێگرتم، وادەزانێ خوا ﷻ چونکە لە ڕووی ماددییەوە بەهرەمەندی کردوەو نازو نیعمەتی بۆ ڕەخساندوە، لە ڕووی مەعنەوییشەوە، هەر لەلای پەسندەو چاکە! ﴿ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَـٰنَنِ ﴾، بەڵام هەرکات پەروەردگاری تاقیکردەوەو بژیوی لێ وەتەنگ هێنا، پێشێ بەهات

تاقیکـردەوە، ئنجـا بەنەهـات، پێشـێ بـە هەبـوون، ئنجـا بـە نەبـوون، پێشـێ بـە دەوڵەمەندیـی، ئنجـا بـە ئاتاجیـی و نەداریـی، ئـەو کاتـە دەڵـێ چـی؟ ﴿فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ﴾، دەڵـێ: پـەروەردگارم سـووکی کـردم، ڕیسـوای کـردم، وا دەزانـێ وەك چـۆن لـە ڕووی مادديیـەوە خـوا بژیـوی لـێ وەتەنـگ هێنـاوە، لـە ڕووی مەعنەوییشـیەوە لـەلای خـوا سـووکەو کەمـە! خـواش بەرپەرچـی ئـەو جـۆرە بیرۆکەیـە دەداتـەوە، بـە داخـەوەش کاتی خـۆی کـە خـوا ﷻ دايبەزانـدوە سـەردەمی نەفامیـی بـووەو، خەڵـك وای بیـر کردۆتـەوە، بـەڵام ئێسـتاش خەڵکێکـی زۆر هـەر وایـە، لەبـەر ئـەوەی خەڵـك بـەرەو نەفامیـی چوونـەوە، ئنجـا خـوای کاربەجـێ و دادگـەر لـە بـەر پەرچدانـەوەی هەڵگـرانی ئـەو جـۆرە بیرۆکەیدا دەفەرمـوێ: ﴿كَلَّا﴾ وانیـە کـە ئێـوە بیـر دەکەنەوە: هـەر کـەس خـوا موڵـك و سـامانی پێـدا، لـەلای بەڕێـز بـێ و، هەرکەسـیش بژیـوی لـێ وەتەنـگ هێنـا، لـە لای خـوا بێڕێـز بـێ، نەخێـر، بەڵکـو بەڕێزیـی و بێڕێزیـی لای خـوا، بـەوە دەردەکـەوێ: کـێ پابەنـدە بـە شـەریعەتی خـواوەو، کـێ لادەدا لـە شـەریعەتی خـوا؟ ﴿بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ﴾، بەڵکـو - خـوا ڕێـزی لـە ئێـوە گـرت و نـازو نیعمەتـی پێـدان بـەڵام - ئێـوە ڕێـز لـە هەتیـو ناگـرن، هەتیویـش منداڵێکـە باڵغ نەبـوو بـێ و بابـی نەمابـێ، ﴿وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ﴾، یەکدیش هان نـادەن لەسـەر خـواردن دان بەبابـای نـەدارو ئاتـاج و بـێ دەرەتـان، ﴿وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا﴾، کاتێـك میراتیـش دەخـۆن، هەمـووی پێکـەوە دەخـۆن، واتـە: بەشـی ئافـرەت و هەتیـوو کەسـانی بـێ دەسـتەڵات، نـادەن، ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا﴾، مـاڵ و سامانیشـتان لـە ڕاددەبـەدەر خۆشـدەوێ، بێتـام مـاڵ و سامانیشـتان خۆشـدەوێ، ئەگەرنا مـرۆڤ ئەگـەر مـاڵ و سـامانی دونیـای خۆشـبوێ، تاکـو چاکـەی پـێ بـکات، چاکـە: (**نِعـمَ المَـالُ الصَّالِـح لِلمَـرءِ الصَّالِـح**) باشـترین شـت ماڵـی حەڵاڵـە بـۆ مرۆڤـی بـاش، (چونکـە چاکـەی پـێ دەکات).

بـەڵام لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿حُبّٗا جَمّٗا﴾ خۆشویسـتنێکی زۆر و لـە سـنووربەدەر، ﴿كَلَّآ﴾ وازبێنـن لـەو جـۆرە بیرکردنەوەیـە، لـەو جـۆرە مامەڵـە و ڕەفتـار کردنـە،

لەگەڵ نەدارو هەتیوو، بێچاران دا، ﴿إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا دَكّٗا﴾ هەر کاتێك زەوی جار لە دوای جار کوترا، کوتران دوای کوتران، کوترا، شکێندران دوای شکێندران، شکێنرا، واتە: وردوخاش کراو تەختکرا، ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا﴾ پەروەردگاریشت و فریشتەکانیش ڕیز ڕیز هاتن.

ڕووداوی یەکەمیان: ﴿إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا دَكّٗا﴾ باسی یەکێکە لە نیشانەکانی ئاخیر زەمان، کە ئەم زەوییە، دەکوترێ و دەشکێنرێ، تەخت دەکرێ و بەرزیی و نزمیی تێدا ناهێڵدرێ.

دوایی یەکسەر دێتە سەر باسی قیامەت: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا﴾، پەروەردگاریشت هات بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیەو، فریشتەکانیش ڕیز بە ڕیز هاتن، ﴿وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَ﴾، لەو ڕۆژەدا دۆزەخیش هێنرا، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ٩١﴾الشعراء، دۆزەخیش ئاشکرا کراو هێنرایە گۆڕێ بۆ بێمرادان، ﴿يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ﴾، لەو ڕۆژەدا مرۆڤ (مرۆڤی بێبڕوا) وەبیری دێتەوە، بەڵام کوا وەبیر هاتنەوەکەی سوودی بۆی هەیە؟

﴿يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي﴾ (لەو ڕۆژەدا مرۆڤ) دەڵێ: خۆزگە بۆ ژیانی ئێستام شتێکم پێشخستبایە، لە کردەوەی باش، یاخود: خۆزگە لە کاتی ژیانی دونیامدا کردەوەی باشم پێشخستبایە بۆ ئێستا، ﴿فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ﴾، لەو ڕۆژەدا هیچکەس وەك وی (خوا) سزاو ئازار نادات، ﴿وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ﴾ هیچ کەسیش وەك وی (خوا) خەڵك کەلەپچەو زنجیر پێچ ناکات، ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ﴾، ئەی ئەو نەفسەی ئۆقرەو ئارامت گرتوە، هێمن و هێدیی و مەندیی لەسەر ڕاستە ڕێی خوا، بەهۆی بەندایەتیی بۆ خواوە، ﴿ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ﴾ بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، ﴿رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ﴾ ڕازیی و پەسندکراویشی، یانی: خواش لە تۆ ڕازییە، ﴿فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي﴾، دەجا بچۆ نێو بەندەکانمەوە، ﴿وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي﴾، هەروەها بچۆ نێو باخەکەمەوە، کە تایبەتە بە دۆستەکانم،

ئەوانـەی هەمیشـە دڵیـان بە خـواوە پەیوەسـتەو، لە دنیاو لـە دوارۆژدا ئـارام و هێدیی و مەنـدن، بـە هـۆی بەندایەتییـان بـۆ خـواوەو، دەچنـە نێـو بـاخ و بەهەشـتەکانیەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سـوێند خواردنـی خـوا ﷻ بـە بەرەبەیـان و، بـە دە شـەوەکان و، بـە جـووت و بـە تـاك و، بـە شـەوگار کـە ڕادەبـڕێ و، پرسـینی: ئایـا ئـەوە سـوێندی تێدایـە بـۆ خـاوەن عەقـڵ؟**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَالْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِي ذَلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ ﴿٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَالْفَجْرِ﴾، سوێند بە سپێدە، پیتی (و) بۆ سوێند پێخواردنە (**الفَجْر: إِسْمٌ لِوَقْتِ إِبْتِدَاءِ الضِّيَاءِ فـي أَقْصَى المَشْرِقْ، وَهُوَ ابْتِدَاءُ ظُهُورِ النُّورِ بَعْدَ مُضِيِّ اللَّيْل**)، (**فَجْر**): ناوە بۆ سەرەتای ڕووناکیی لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتەوەو ئەوە سەرەتای دەرکەوتنی ڕووناکییە، دوای تێپەڕبوونی شەوگار، خوا سوێندی پێ دەخوات.

(**الفَجْر**)یـش کـە (ال)ی ناسـاندنی لەسـەرەو (ال)ی ناسـاندنیش دەگونجـێ بـۆ تێکـڕا (جنـس) بـێ، ئنجـا لێـرەدا واتـە: سـوێند بەهەمـوو بەرەبەیانـەکان، بەهەمـوو سـپێدەکان، دەشـگونجێ (ال) ناسـاندنەکە بـۆ (عَهْـد) بـێ، واتـە: سـوێند بـە بەرەبەیانەکـە، ئنجـا ئەگـەر مەبەسـت پێـی بەرەبەیانێکـی تایبـەت بـێ، زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان دەڵێـن: (**هُـوَ فَجْـرُ يَـومِ النَّحْـرِ**)، بریتیـە لـە بەرەبەیانـی ڕۆژی قوربانیـی سـەربڕین، زۆربـەی ڕوونکەرەوانـی قوڕئـان ئـەو ڕایەیـان هەڵبـژاردوە کـە

مەبەست لە بەرەبەیان، بەرەبەیانی ڕۆژی دە (١٠)ی (**ذي الحِجَّة**)یە، کە ڕۆژی سەربرین (**يَوْمُ النَّحْرِ**)ی پێ دەڵێن و، (**يَوْمُ الأُضْحِيَة**) ڕۆژی قوربانیی و (**عِيدُ الأَضْحَى**) جەژنی قوربانیشی پێ دەڵێن، بەڵام دەشگونجێ مەبەست پێی کۆی بەیانییەکان بێ و، ئەو ڕایەش هەر هەیە، خوای پەروەردگاریش دیاریی نەکردوە.

**٢)-** ﴿وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾، سوێند بە دە شەوەکانیش، واتە: ئەو دە شەوانە، دە شەوی ناوازەو دیارن، ئنجا ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لە دە (١٠) شەوەکان، دە شەوەکانی سەرەتای (**ذي الحِجَّة**)ن و، شەوی دەیەمیان شەوی (**عيد الأُضْحيَة**) جەژنی قوربانە، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست دە شەوەکانی سەرەتای هەر مانگێکە.

بەڵام وا زیاتر دێتە عەقڵ و دڵمەوە کە لێرەدا مەبەست لە: (**فَجْر**)، بەرەبەیانی (١٠)ی (**ذي الحجة**) بێ و، ﴿وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ یش ئەو دە شەوانەبن، کە دەکەونە سەرەتای مانگی (**ذي الحجة**)، چونکە: لەو دە شەوەی سەرەتادا، خوا پەرستییەکانی حەج دەست پێدەکەن، بەڵکو لەو دە شەوەدا، زۆرێك لە خواپەرستییەکانی حەج دەکرێن، باتۆزێك ئەوە ڕوون بکەینەوە: کەسێك کە دەچێ بۆ حەج، بەتایبەتی ئەگەر جۆری حەجی (**تَمَتُّع**) بکات (واتە: نیەت بە عومرە بێنێ و عومرەکەی تەواو بکات و ئیحرامەکەی بشکێنێ، دوایی دووبارە ئیحرام ببەستێتەوە بە حەج) ڕۆژی هەشتەم کە (**يومُ التَّرْوِيَة**)ی پێ دەڵێن، چونکە کاتی خۆی ئاویان هەڵگرتوەو ڕۆیشتوون بەرەو عەرەفات، ئنجا حەجکەران شەو لە مینا دەمێننەوەو، بەرەبەیانییەکەی زوو دەچن بەرەو عەرەفات و، ڕۆژی نۆیەم لەوێ دەبن، ئێوارەی ڕۆژی نۆیەم، دوای خۆر ئاوا بوون، بەرەو موزدەلیفە شۆڕ دەبنەوە: ﴿فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِۖ ۝١٩٨﴾البقرة، ﴿ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِ﴾ شوێنێکە هەر لە لای موزدەلیفەیە، ئنجا دواییش هەر لە ڕۆژی دەیەمدا دێن قوربانیی سەر دەبڕن و، سەری خۆیان دەتاشن، یاخود کورت دەکەنەوە، هەروەها دەچن حەوت وردکە بەرد بە (**جَمْرة**)ی گەورەتر (**الجَمْرَة الكُبْرى**) دادەن، ئنجا کە ئەو

خواپەرستیی (منسك) یەنەیان ئەنجام دان، دەتوانن ئیحرامی گچکە بشکێنن. (**التَّحَلُّلُ الأَصْغَر**)و، تەنیا ئافرەتیان بۆ حەڵاڵ نابێ، ئەگەرنا بەرگ گۆڕین و، خۆ شۆردن و، بۆنی خۆش لە خۆدان و، ئەوانەیان بۆ ڕەوا دەبن، دوایی دەچن تەواف دەکەن و تەوافی پایە (**طواف الركن**)و، هاتن و چوونی نێوان صەفاو مەڕوە دەکەن، دواییش دەمێننەوە بۆ بەرد پێدادانی سێ جەمرەکان لەسێ ڕۆژی یەك لە دوای یەکدا، ڕۆژەکانی: (١١ و ١٢ و ١٣)دا، کە لە سووورەتی (**البقرة**)دا، خوای پەروەردگار باسی کردوون، ئێمەش لە کاتی تەفسیرکردنی سووورەتی (**البقرة**)دا لەو بارەوە قسەمان لێکردوە، هەروەها لە کاتی تەفسیرکردنی سووورەتی (**الحج**) یشدا، کورتە باسێکمان لە بارەی چۆنیەتیی ئەنجامدانی حەج و عومرەوە کردوە، ئنجا خوا ﷻ سوێند دەخوات بە دوو شتی دیکەش:

٣)- ﴿وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ﴾، سوێند بە جووت و بە تاك، (**الشَّفْعُ: مَا يَكونُ ثَانياً لِغَيْرِهِ**)، (**شَفْع**) ئەوەیە کە دەبێتە دووەم بۆ جگەلە خۆی، یاخود وێنەی خۆی دێتە پاڵی (**يُضمُّ إِلَيْهِ مِثْلُهُ**)، بەهەردووکیان دەبنە (**شَفْع**) جووت، (**وَتر**)یش کە بە (**وِتر**)یش دەگوترێ و بە (**وَتْر**)یش دەگوترێ، (**الوِتْرُ وَالوَتْرُ: المُفْرَد**)، واتە: تاك، هەر کام لە جووت (**شَفْع**) و تاك (**وتر**)یش، سیفەتن بۆ وەسفکراوێکی قرتێنراو، یاخود خوا ﷻ هەر بە گشتیی فەرموویەتی: سوێند بە هەموو جووتێك و بە هەموو تاکێك، ئەگەر سیفەتیش بن بۆ وەسفکراوێکی قرتێنراو: (**شَفْع**)، یانی: (**يَوْم النَّحر**)، ڕۆژی دەیەم کە جووتەو، (**وَتْر**)یش یانی: (**يَوْمُ عَرَفَة**) لەبەر ئەوەی وەك ژمارە تاکە، دەشگونجی مانایەکە یان گشتیی بێ، (**الطبري**) ئەو ڕایەی زیاتر پێ پەسند بووەو، گوتوویەتی: خوا بە گشتیی فەرموویەتی و واباشە ئێمەش هەر بە گشتیی مانایان بکەین، منیش ئەو ڕایەی (**الطبري**)یم بەدڵە، بەڵام بەنسبەت (**الفجر**) و (**ليال عشر**)ەوە لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە ڕێباز (**سُنَّة**)دا لەو بارەوە چەند دەقێکمان هەن، دیاریی دەکەن کە مەبەست لە (**فجر**) بەرەبەیانی ڕۆژی جەژن و، (**ليال عشر**) دە شەوەکانی سەرەتای مانگی (**ذي الحِجَّة**)ن، بۆیە زۆربەی زانایان وایان تەفسیر کردوون.

٤)- ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ ﴾ سوێندیش بە شەوگار کاتێك ڕادەبرێ (دەڕوات)، وشەی: ﴿ يَسۡرِ ﴾، بە دوو جۆر خوێندراوەتەوە:

أ- (يَسْر)، ئەگەر لەسەری بوەستێ، دەڵێی: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ ﴾، چونکە ژێرە (كَسْرة) لە وەستاندا لە کاتێکدا دەوەستی، دەڕوات.

ب- (يسري)، ئەگەر لە سەر خوێندن بڕۆی و بەردەوام بی (ي)ی (يَسْري) دەردەکەوێ: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ ﴾.

٥)- ﴿ هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ ﴾، ئایا لەوەدا (لەو پێنج شتەدا کە باسکران)، سوێند هەیە بۆ خاوەن عەقڵ؟ واتە: ئایا ئەو پێنجە شایستەی ئەوەن خوا سوێندیان پێ بخوات؟ لێرەدا پرسیار کردن، بۆ دانپێپێداهێنانە (الإِسْتِفهام ُللتَّقرِير)، یانی: بە دڵنیایی لێرەدا ئەو پێنج شتە شایستەی ئەوەن خوا سوێندیان پێ بخوات، کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ بێگومان ئەوە ناوی ئاماژەیەو دەگەڕێتەوە بۆ شتێك کە باسکراوەو سوێندی پێ خوراوە، یانی: (هَلۡ فِي ذَٰلِكَ المَذْكُورِ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ)، ئایا لەو شتە باسکراوەدا سوێند پێخوران هەیە، شایستەیی سوێند پێخوران هەیە، بۆ خاوەن عەقڵ؟ ﴿ لِّذِي حِجۡرٍ ﴾، (ذِي) یانی: خاوەن (حِجْر) یانی: عەقڵ، (الحِجْرُ: العَقْلُ لأَنَّهُ يَحْجُرُ صَاحِبَهُ عَن ارْتِكابِ مِا لا يَنْبَغي)، بۆیە یەکێك لە ناوەکانی عەقڵ بریتیە لە (حِجْر)، چونکە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە لەوەی شایستە نیەو خراپە.

پیتی (ل) لە وشەی: ﴿ لِّذِي حِجۡرٍ ﴾دا، بۆ هۆکار دۆزیی (تعليل)ە، یانی: ئایا لەوەدا سوێند هەیە لەبەر خاتری کەسێکی خاوەن عەقڵ؟ پرسیار کردنەکەش بۆ پێ چەسپاندنە بە بەرانبەر، کە بڵێ: بەڵێ.

ئێستا با چەند دەقێك بێنینەوە لە بارەی ئەو چەند ئایەتە موبارەکەوە:

١)- {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵁، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ أَيَّامٍ، العَمَلُ الصَّالِحُ فِيهَا أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الْأَيَّامِ، يَعْنِي أَيَّامَ الْعَشْرِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَلَا الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: وَلَا

**الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلَّا رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَمْ يَرْجِعْ مِن ذَلِكَ بِشَيْءٍ} (أخرجه أحمد: ٣٢٢٨، والبخاري: ٩٢٦).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ ڕۆژانێك نین کردەوەی باش تێیاندا لەلای خوا خۆشەویستتربێ، لەم ڕۆژانە، واتە: (**أَيَّامِ العَشْر**)، [دە ڕۆژەکانی دە شەوەکان، چونکە ئەگەر (**عَشْر**)، پەیوەست با بە (**أَيَّام**)ەوە، دەیفەرموو: (**الأَيَّام العَشْرَة**)، بەڵام (**أَيَّامُ العَشْر**)، یانی: (**أَيَّامُ اللَّيَالِي العَشْر**)، واتە: ڕۆژەکانی ئەو دە شەوانەی خوا ﷻ سوێندی پێ خواردن]، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! جەنگ و تێکۆشان لە پێناوی خواشدا (گەورەتر نیە لەوە)؟ فەرمووی: تێکۆشان لە پێناوی خواشدا، مەگەر پیاوێك نەفس و ماڵی خۆی بردبێتە دەرێ، بەڵام دوایی هیچیانی نەهێنابێتەوە، واتە: ماڵەکەشی ڕۆیبێ و، سەریشی لەسەر ڕێبازی خوا دانابێ.

**٢)- (الطَّبَري)** ئەو ڕایە زیاتر پەسند دەکات، کە مەبەست لە دە شەوەکان، دە شەوەکانی سەرەتای مانگی (**ذي الحِجَّة**)ن، لەو بارەوەش چەند شتێك دێنێ:

**أ-** بەژمارە: (٣٧١٧٤): (**عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَبَّاسٍ** ﷺ، **قالَ: إِنَّ لَيَالِي عَشْرٍ الَّتِي أَقْسَمَ اللهُ بِهَا، هِيَ لَيَالِي العَشْرِ الأَوَّلُ مِن ذي الحِجَّة} (إسناده صحيح على شرط الشيخين).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ، گوتوویەتی: ئەو دە شەوانەی خوا سوێندی پێخواردوون، دە شەوەکانی سەرەتای مانگی (**ذي الحِجَّة**)ن.

**ب-** هەر (**الطبري**)، لە (**إبن الزبير**)یشەوە (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، خوا لێیان ڕازی بێ، هێناویەتی بە ژمارە: (٣٧١٧٦): (**أَوَّلُ ذِي الحِجَّة إِلى يَوْمِ النَّحْر**).

واتە: مەبەست لە دە شەوەکان ڕۆژی یەکەمی (**ذي الحِجَّة**)ن، تاکو ڕۆژی قوربانیی تێدا سەربڕین، واتە: ڕۆژی دەیەم.

**ج-** هەر (**الطبري**) بە ژمارە: (٣٧١٨٣)، لە (مجاهد)ەوە هێناویەتی: {**لَيْسَ عَمَلٌ فِي لَيَالِي السَّنَة أَفْضَلُ مِنْهُ فِي لَيَالِي العَشْرِ، وَهِيَ عَشْرُ مُوسى الَّتي أَتَمَّها اللهُ لَهُ**}.

واتە: هیچ کردەوەیەك لە شەوەکانی ساڵدا، پاداشتی گەورەتر نیە، لە دە شەوەکان، ئەو دە شەوانەی خوا ژوانگەکەی مووسای پێ تەواو کردن، پێشێ مانگێکی بۆ دانا، دوایی بە دە ڕۆژی دیکە تەواوی کردن و بوونە چل شەو: ﴿وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَاتُ رَبِّهِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ١٤٢﴾ **الأعراف**، ئنجا ئایا ئەو دە شەوانەی ژوانگەکەی مووسا، هەر دە شەوی سەرەتای مانگی (**ذي الحِجَّة**) بوون؟ وا پێدەچێ و، ئەو ڕایە زۆربەی زانایان پەسندیان کردوە.

هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست لەو دە شەوانە، دە شەوی سەرەتای مانگی (**مُحَرَّم**)ن.

ڕایەکی دیکەی سێیەمیش هەیە دەڵێ: دە شەوەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزانن.

**٣)-** لە بارەی (**شَفْعُ ، وَترَ**)ەوە (**الطبري**) لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) بە ژمارە: (٣٨١٨٨)، هێناویەتی: (**الوَتْرُ: يَوْمُ عَرَفَة، وَالشَّفْعُ: يَوْمُ الذَّبْحِ**) (**إسنادٌ صحيحٌ على شَرطِهما**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: وەتر ڕۆژی عەرەفەیە (لەبەر ئەوەی تاکە، ڕۆژی نۆیەمی (**ذي الحِجَّة**)یە) (**شَفْع**)یش ڕۆژی قوربانیی سەر بڕینە (لەبەر ئەوەی جووتەو ڕۆژی دەیەمە).

بەڵام (**الطبري**) ڕایەکی دیکەی زیاتر پەسند کردوە لە چەمك و واتای (**شَفْعُ**) و (**وَتْر**)داو دەڵێ: (**الأَفضل: عَدَمُ تَحدِيدِ الشَّفْعِ وَالوَتْر**)، واتە: وا باشترە چەمك و واتای جووت و تاك دیاریی نەکرێ (بەو دوو ڕۆژانەو بە هیچ ڕۆژانێکی دیکەوە، چونکە خوا بە گشتیی فەرموویەتی).

لەو بارەشەوە (**الطبري**) لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، بە ژمارە: (٣٧٢٠٠) ئەمەی هێناوە، دەڵێ: (**أَللهُ وَتْرٌ وَأَنْتُم شَفْعٌ**) واتە: خوا تاکەو ئێوش جووتن، ئەی مرۆڤەکان! ئەی دروستکراوەکان!

وەڵامی سوێندەکەش قرتێنراوە، بەڵام ڕەوتی ئایەتەکان دەیگەیەنێ، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، وەك:

**أ-** زیندوو دەکرێنەوەو لێتان دەپرسرێتەوە.

**ب-** یاخود ئەو قوڕئانەی دامانبەزاندوە هەقە.

**ج-** یاخود موحەممەد ﷺ ڕەوانە کراوەو کۆتا ڕەوانە کراوو، پێغەمبەری منە بۆ لای مرۆڤایەتیی، هەروەها هەر شتێکی دیکە کە لەگەڵ ڕەوتی ئایەتەکاندا بگونجێ.

## مەسەلەی دووەم:

**سەرنجڕاکێشانی خوا ﷻ بۆ مرۆڤەکان، کە چۆن سزای هەرکام لە گەلی عادو گەلی سەموودو فیرعەونی دا، دوای ئەوەی یاخیبوون و خراپەرکاریی و تێکدانیان لە وڵاتدا کردو، خواش هەمیشە لە بۆسەدایە بۆ ستەمکاران و، قەمچییەك لە سزای خۆی بەسەردا ڕژاندن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴾، ئایا نەتبینی خوا چی و چۆنی بە گەلی عاد کرد؟ لێرەدا (**الإِسْتِفهامُ تَقْرِيرِيٌّ**)، پرسیار کردنەکە بۆ پێچەسپاندنە، واتە: بەرانبەرەکە دانی پێدا دێنێ و دەیچەسپێنێ (**والرُّؤْيَةُ فِي: أَلَمْ تَر، قَلْبِيَّةٌ**)، بینینەکەش لە ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾دا مەبەست پێی بینینی عەقڵ و دڵە، لەبەر ئەوەی کەس لەو کاتەدا لەوێ نەبووە، ببنێ خوا چۆن گەلی عادی سزادا! بەڵام دوای ئەوەی خوا بۆمان دەگێڕێتەوەو شوێنەوارەکانیان دەبینین، ئنجا دەزانین خوا چۆن چۆنی جێگایەکانیانی بەسەریەکدا ڕووخاندوون! چۆن بایەکی بەهێزی بۆ ناردوون، کە لە چەند جێیەکی قورئان دا خوا ﷻ باسی کردوە،

دەشگونجێ بڵێین: بینین لێرەدا بینینی چاوە، بە چاوی سەر، بەڵام نەك ببینێ: خوا ﷻ چی پێکردوون! بەڵکو بەهۆی شوێنەوارەکانیانەوە، ئەگەر شوێنەوارەکانیان ببینێ، دەزانێ خوا چۆنی لە بەین بردوون؟

شایانی باسە: ئێمە گەلی عادو چۆنیەتیی فەوتێنرانیانمان لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی (هود)دا، بە تەفصیل لەوێدا قسەمان لە بارەوە کردوون، گەلی

عادیش، گەلێك بوون وا پێدەچێ پێش نووسرانەوەی مێژوو، بووبن، چونكە بەپێی ئەوەبێ كە دوایی باسی دەكەین، دەبێ بە سێ چوار پشتان بچنەوە سەر نووح ﷺ، كەواتە: لەو گەلانە بوون كە پێش ئەوەی مرۆڤ نووسین دابهێنێ، ژیاون و، شوێنی گوزەران و ژیانیشیان لە نێوان عومان و حەزرەمەوت دا بووە، وەك لە كاتی تەفسیركردنی سوورەتی (**الأحقاف**)دا باسمان كرد: ﴿ وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: یادی برای عاد بكەوە (كە هوودە) كاتێك گەلەكەی خۆی ترساندو وریای كردنەوەو لە پێش وانیش دا ترسێنەران ڕابردبوون، پێیگوتن: خوا بپەرستن، من مەترسیی ڕۆژێكی مەزنم لێتان هەیە، (**أحْقاف**) كۆی (**حِقْف**)ە، كە بە كۆ لمێك دەگوترێ درێژكۆڵە بێ، بەڵام بەرز بووبێتەوە، لم لە بیابان دا، جاری وایە با بەباری درێژییدا كۆی دەكاتەوە سەر یەك، ئەوانیش شوێنە جوگرافییەكەیان بیانێكی لماویی بووە، ئنجا خوا ﷻ بۆ ئەوەی زیاتر بە گەلی عاد ئاشنا بین، دەفەرموێ:

٢)- ﴿ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴾، ئیرەمی خاوەن كۆڵەگەكان، یانی: ئەو گەلی عادەی خوا لێرەدا ﷻ مەبەستیەتی: ﴿ إِرَمَ ﴾ی خاوەن كۆڵەكەكانە، ﴿ إِرَمَ ﴾ یان ناوی شارێكە، یاخود ناوی هۆزێكە.

زانایان دەڵێن لێرەدا: ﴿ إِرَمَ ﴾ (**عَطْف بَيَانٍ لِعَاد**)، ﴿ إِرَمَ ﴾ مانای وشەی (عاد)مان زیاتر بۆ ڕووندەكاتەوە، كە دەفەرموێ: ﴿ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴾ یانی: (**صَاحِبَةِ العِمَاد، وَالعِمَاد جَمْعُ عَمَدْ: والعَمَدُ: مَا عُمِّدَ بِهِ الخِيَامُ مِنَ الخَشَبِ وَالسَّوارِي الَّتي يُحْمَلُ عَلَيْهَا البِنَاء**)، (عَمَد): ئەوەیە كە چادرو ڕەشماڵی پێ هەڵدەدرێ لە دارو درەختە، هەروەها ئەو كۆڵەگەیە، یان ئەو دینگەیە خانوو و بینای لەسەر ڕاوەدەستێ.

٣)- ﴿ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴾، ئەوەی وێنەی وی لەوڵاتان دا دروست نەكرابوو، یانی: ئەو گەلی عادە، ئەو ﴿ إِرَمَ ﴾ە، خاوەن كۆڵەگەو پایە، وێنەی وان لە وڵاتاندا

دروست نەكرابوو، ﴿ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا ﴾، ڕاناوی (هـا) دەگەڕێتەوە بۆ (عاد)، یاخود دەگەڕێتەوە بۆ ﴿ إِرَمَ ﴾، عاد كۆمەڵێك بوون، ﴿ إِرَمَ ﴾یش یان ناوی دووەمی گەلی عادە، یاخود ناوی هۆزێكە لە گەلی عاد كە لە نێویاندا دیار بوون، بە پێی ڕای هەندێك لە زانایان، كە دەفەرموێ: وێنەی وان لە وڵاتاندا دروست نەكرابوو، یانی: لە كەلەش گەورەییدا، لە هێزو تواناادا، لە دڵڕەقیی و زەبر وەشاندندا، وەك لە شوێنەكانی دیكەدا خوای باڵادەست باسی كردوون.

وشـەی: ﴿ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴾، چەمك و واتـای عادمـان بـۆ ڕووندەكاتـەوە، چونكـە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوە كـە عـاد ئـەو هۆزەیـە باپیـرەی نیزیكیـان بریتیـە لـە: (عَـاد) كـوڕی (عِـوَض) كـوڕی (إرم)، كـە بـە ﴿ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ۝٥٠ ﴾النجـم، وەسـف كـراوە، ﴿ إِرَمَ ﴾یـش نـەوەی نووحـە: ئیـرەم كـوڕی سـام كـوڕی نـووح كـە باپیـرەی گـەلی عـادە، چونكـە: عـاد كـوڕی عیـوەز كـوڕی ئیـرەم كـوڕی سـام كـوڕی نـووح، كەواتـە: گەلـی عـاد بـە چـوار پشـت چوونـەوە سـەر نـووح عليه السلام.

ئنجـا خـوا سبحانه وتعالى بـۆ ئـەوەی لێـمان تێكنەچـێ و پێـمان وابـێ گـەلی عـاد، گەلێكـی دیكـەن، بەڵكـو هـەر ئـەو گەلـەن كـە دەچنـەوە سـەر نـووح بـە چـوار پشـتان، واتـە: عـادی كـوڕی عیـوەزی كـوڕی ئیـرەم كـوڕی سـام كـوڕی نـووح، بـە چـوار پشـتان چوونـەوە سـەر نـووح، بۆیـە لێـرەدا بـە (إرَم) باسـی كـردوون.

بـەڵام ئـەوەی لێـرەدا لەلایـەن زۆر لـە ڕوونكەرانـەوە باسـكراوە، گوایـە (إرَم) شـارێك بـووە لـە بیابانـدا، گوایـە ئەعرابییـەك بـە نـاوی عەبدوڵـڵای كـوڕی قولابـە، لـە ڕۆژگاری موعاویـەدا دەچێتـە مەجلیسـی موعاویـەوەو دەڵـێ: مـن حوشـترم لـێ بەرهەڵـدا بـوو بـوون، بەدوایـان كەوتـم و چوومـە بیابـان، لـەوێ ئـەو شـارەم بینـی، گوایـە دوایـی لەگەڵـی دەچـن بـۆ بیابـان بـەڵام ئـەو شـارە نابینـن! ئـەوە هەمـووی لـە بازنـەی ئەفسـانەدایە، هەرچەنـدە بـە داخـەوە زۆر لـە تەفسـیرەكان هێناویانـەو، ئێسـتاش لەگەڵدابـێ لـە نێـو هەندێـك لـە ئەدەبیاتـی كوردیشـدا هـەر هەیـەو، لـە نێو

ئەدەبیاتی عەرەبیی و فارسییشدا هەیە، گوایە: (باخی ئیرەم)، باخێکی زۆر خۆش و عەجایب و سەرسوڕهێنەر بووەو، هەر بەو ناوەش شارێکی زۆر سەرسوڕهێنەر هەبووە! بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە هەمووی ئەفسانەیەو ﴿ إِرَمَ ﴾، باپیرەی نیزیکی گەلی عادە و نەوەی نووحە، بە پێی ئەوەی زانیاری ڕەچەڵەکناسیی (**علم النَّسب**)، هێناویەتی.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴾ ﴿ ٱلۡعِمَادِ ﴾ کۆی (**عَمَد**)ە، ئەویش بە مانای کۆڵەگەو دینگەیەکە، کە دەدرێتە بەر ڕەشماڵ و چادر کاتێك هەڵدەدرێ، یاخود ئەو پایەو کۆڵەکەی دەدرێتە بن خانووبەرە، چ پایەو کۆڵەگەی داربێ، چ بەرد بێ، کە کاتی خۆی دروستکراون.

لەو بارەوەش کە ئایا بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴾ ئیرەمی خاوەن عیماد، خاوەن کۆڵەگەکان؟ زانایان سێ وەڵامیان هێناون:

١- لەبەر ئەوەی ئەو خەڵکە خاوەن ئاژەڵ بوون، هەرچەندە شارێکیان هەبووە تێیدا نیشتەجێ بوون، بەڵام وێڕای شارنشینیی، ڕەوەندو ئاژەڵداریش بوون ئنجا حوشتر بووە، ڕەشە وڵاخ بووە، مەڕو بزن بووە، بردوویانە بۆ کوێستان بۆ لەوەڕو دواییش گەڕاونەوە بۆ شارەکەیان، بۆیەش کۆڵەکەیان هەبوون و داویاننە بەر ڕەشماڵ و چادرەکانیان کە هەڵیانداون، ﴿ ٱلۡعِمَادِ ﴾یش کۆی (**عَمَد**)ە، ئەویش بە مانای ئەو کۆڵەگەو دارەیە کە دەدرێتە بەر ڕەشماڵ و تاوڵ، کاتێك هەڵدەدرێ.

٢- وشەی: ﴿ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴾ وشەیەکە خوازراوەتەوە بۆ تەعبیرکردن لە هێزو دەسەڵات و تواناو، ئەم وشەیە لە زمانی عەرەبییدا بۆ ئەو واتایە بەکاردێ.

٣- دەشگونجێ مەبەست لە (**عماد**) ئەو شوێنە بەرزانەو ئەو بەرزاییانە بن کە گەلی عاد دروستیان کردوون، بۆ ئەوەی خەڵك ڕێی لێ تێکنەچێ، یاخود دروستیان کردوون بۆ شانازیی بە خۆوە کردن، کە ئەوانە شوێنەواری گەلی عادن، وەك لە سوورەتی (**الشعراء**) دا خوای تاك و پاك دەفەرموێ: ﴿ أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعۡبَثُونَ ١٢٨ ﴾، ﴿ رِيعٍ ﴾،

یانی: بەرزایی، ئایا لە هەر بەرزاییەك نیشانەیەك دروست دەكەن، وەك گاڵتەكردن و بێ ئەوەی ئامانجێكی ڕاست و دروستی لە پشتەوە بێ، تەنیا بۆ خۆ هەڵكێشان؟ وەك چۆن هەڕەمەكانی میسڕ، فیرعەونەكان دروستیان كردوون، وەك گۆڕ بۆ خۆیان و، سۆغرەو بێگاریان بە هەزاران كەس كردوە، بەس خوا بزانێ هەر هەڕەمێك چەند كەس لە سۆغرەو بێگارەكەیدا مردوون؟ چونكە فیرعەونێك گۆڕێك بۆ خۆی دروست دەكات!

٤)- ﴿وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ﴾، هەروەها (ئایا نەتبینی خوا چیكرد) بە (گەلی) ثەموود كە لە شیوو دۆڵەكەدا بەردیان داتاشی، (خانوو بەرەیان تێدا دروست كرد)؟ ﴿جَابُواْ﴾، یانی: دەیانبڕیی و دەیانتاشی، (**جَابَ يَجُوبُ جَوْباً: قَطَعَ يَقْطَعُ قَطْعَاً**)، بڕی، دەیبڕێ، بڕین، ﴿بِٱلۡوَادِ﴾ بەدووجۆر خوێندراوەتەوە:

أ- ﴿بِٱلۡوَادِ﴾، بە ژێر (**كسرة**).

ب- هەروەها (**بِالوادي**)، بە (**ي**).

(**الـوَاد: اسْـمُ الأَرْضِ الكَائِنَـةِ بَـيْنَ الجَبَلَـيْنِ مُنْخَفِضَـةٌ**)، (**واد**): لـە ئەسـڵی زمانـی عەڕەبییـدا یانـی: شـیوو، دۆڵ، نـاوی زەوییـەكی نزمـی نێـوان دوو چیایانـە.

دوو چیا، یان دوو گرد نێوە ڕاستەكەیان كە دابڕاوابیە، (**وادي**) دۆڵ و شیوی پێدەگوترێ.

(**وَالـوَادِي: عَلَـمٌ بِالغَلَبَـةِ عَـلَى مَنَـازِلِ ثَمُـودْ، وَيُسَـمَّى: وَادِي القُـرَى، ويُسَـمَّى: الحِجْـر، وَهُـوَ وَادٍ بَـيْنَ خَيْـبَرَ وَتَيْـمَاء فِي طَرِيـقِ المـاشِي مِـنَ المَدِينَـةِ إلى الشَّـام**)، وشـەی: (**وادي**) وەك ناوێكـی زاڵكـراوە بـۆ مەنزڵگاكانـی گەلـی سـەموود كـە پێـی دەگوتـرێ، (**وادي القـرى**)، ئێسـتاش هـەر هەیـە، هەروەهـا پێشـی دەگوتـرێ: (**حِجْـر**)، كـە دۆڵێكـە لـە نێـوان خەیبـەرو تەیـماءدا، كەسـێك كـە لـە مەدینـەوە دەچـێ بـۆ شـام، دەكەوێتـە سـەر ڕێـی.

٥)- ﴿وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ﴾، هەروەها (ئایا نەتبینی خوا چی كرد) بە فیرعەونی خاوەن كۆڵەگەكان!

ئایا مەبەست لە کۆڵەگەکانی فیرعەون چی بووە؟ ئەمیش دیسان زانایان چەند ڕایەکیان لە بارەیەوە هەیە:

١- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لە کۆڵەگەکان، ئەوە بووە کە فیرعەون هەرکەسێکی ویستبێ بە ئەشکەنجە بیکوژێ، چوار مێخە کێشاویەتی بە دیوارێکەوە، یاخود بە درەختێکی گەورەوەو، لەسەر هەردوو دەستی و هەردوو پێی، چوار گۆڵمیخی داکوتاون و کردوویەتی بە ڕەسم بەو دارەوە، یاخود بەو دیوارەوە، تاکو گیانی داوە.

٢- هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ گوڵمیخەکان، مەبەست پێیان هەرەمەکانی میسرن، کە مرۆڤ ئەگەر لە دوورەوە تەماشایان بکات، وەك گوڵمیخ دیارن، گوڵمیخیش سەرەکەی باریك دەبێتەوەو لای خوارێی ئەستوورە، هەرەمەکانیش لە دوورەوە وەك گوڵمیخ کە داکوترابن لە زەویدا دیارن، ئنجا هەرچەندە خۆی دروستی نەکردوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەو شوێنە بوون، کە ئەو دەسەڵاتی بەسەردا بووە.

٣- هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ وشەیەکە خوازراوەتەوە بۆ هێزو دەسەڵات، واتە: خاوەن هێز، ئایا نەتبینی خوا چی کرد بەو سێ کۆمەڵە؟ بە گەلی عادو بە گەلی سەموودو فیرعەونی خاوەن کۆڵەگەکان؟!

ئایا ئەوانە چییان کردبوو خوای دادگەر ئاوا سزای دان؟!

٦)- ﴿ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾، ئەوانە کە لە وڵاتاندا، (هەر کامێکیان لە وڵاتی خۆیدا) یاخیبوون، لە سنوور دەرچوون، بوغڕابوون، (**الطُّغيَانُ: شِدَّةُ العِصْيَانِ وَالظُّلْم**)، (**طُغْيَان**): بریتیە لە ئەوپەڕی سەرپێچیی و ستەم و خراپە.

٧)- ﴿فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ﴾، ئنجا خراپەکاریی و تێکدانیان تێدا زۆر کرد، هەر کامێکیان وڵاتی خۆی پڕکرد لە تێکدان و خراپەکاریی و، ستەم لە خەڵك، کردن و سۆغرەو بێگار پێکردنیان و، کوشتنیان بەناهەق، هەروەها ستەم لێکردنیان لە ڕووی نەتەوەییەوە، وەك فیرعەون بە وەچەی ئیسرائیلی کرد، یاخود ستەمی ئابووریی و ماڵ و سامان لێ زەوت کردنیان، هەروەها گەلەکانی دیکەش هەرکامیان بە شێوەی خۆی ستەم و خراپەو لادان

و تاوانی کردوە، سەرەنجام: ﴿ فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ﴾، زۆر خراپەکاریی و تێکدانیان تێداکرد، (الَفسَادُ: سُوءُ حَالِ الشَّيء وَلِحَاقُ الضُّرِّ بِهِ)، (فساد): بریتیە لەوەی شتێك حاڵی خراپ بێ و زیانی تووشبێ.

٨)- ﴿ فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴾، ئنجا پەروەردگارت قەمچییەك لە ئازاری بەسەردا ڕژاندن، (الصَّبُّ: إِفْرَاغُ مَا فِي الظَّرْفِ) شتێك کە شتێکی تێدایە، توورەکەیەك شتێکی تێدابێ، هەڵیبڕێژی و هیچی تێدا نەمێنێ، پێی دەگوترێ: (صَبّ)، (صَبّ) بریتیە لە ڕژاندنی ئاو لە سەرێوە، خوا ﷻ ئەو سزایەی بۆ ئەوانەی ناردوە، وەك ئاوێك چۆن بەسەر کەسێکدا دەڕێژرێ، بە خورزەم دێتە خوارێ، ئاوا وێنای دەکات، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴾، (سَوْط)، بە مانای قەمچیی دێ، کە بریتی بووە لەوەی چەند زوێڵە چەرمێکیان بڕیون باریك باریك، ئنجا ئەو زوێڵە چەرمانەیان پێکەوە هۆنیونەوە بە شێوەیەکی تایبەت و قەمچییان لێ دروستکردوون، کە بۆ لێدان زۆر دێشێنێ، خوای بێ نیاز سزایەکەی خۆی چواندوە بە قەمچییەوە، واتە: ئەو سزایە تەنیا قەمچییەك بووە لە سزای خوا.

یاخود بۆیە دەفەرموێ: ﴿ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴾، چونکە قەمچیی چەند زوێڵە چەرمێکی تێکەڵەو پێکەوە هۆندراونەوە، ئەو سزایەش کە خوا ناردوویەتی بۆ ئەو سێ گەلەو گەلانی دیکەش، هی هەرکامێکیان سزایەکی تایبەت بووە، کەواتە: خوا کۆمەڵێك سزاو ئازاری ئاوێتەو تێکەڵی ناردوون، بۆ فەوتاندنی ئەو گەلانە.

٩)- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴾، بە دڵنیاییەوە پەروەردگارت لە بۆسەدایە، لە چاوەڕوانییدایە (بۆ ستەمکاران) واتە: ئاگای لێیانە چی دەکەن و چۆن دەکەن؟ سەرەنجام لە کاتێکدا کە خۆی بە پێویستی بزانێ، سزایان دەدات.

ئێمە درێژەی بەسەرهاتی گەلی سەموودیشمان لە کاتی تەفسیر کردنی سووڕەتی (الحِجر)دا، هێناوە کە پێغەمبەرەکەیان ناوی صاڵیح ؊ بووە،

بەسەرهاتی فیرعەون و خراپەکارییەکانی و ستەمکارییەکانیشی بە سێزدە بەش هێناومانە، هەشت بەشیمان لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی **(الأعراف)** دا هێناوەو، پێنج بەشیشی لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی **(القَصَص)**دا، لە سەرەتایەکەیەوە.

لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ و، لە دوای ئەویشەوە لە هەرکەسێکە لە دوای پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ دەڕوات، کە بشێ بۆ ئەوەی خوا بیدوێنێ: ئایا نەتبینی خوا چی بە گەلی عاد کرد، ئیرەمی خاوەن کۆڵەگەکان، کە وێنەی ئەوان لە وڵاتاندا دروست نەکرابوو؟

هەروەها گەلی سەموود کە لە شیوو دۆڵەکەدا خانوویان لە بەرد داتاشیبوون، ئێستاش شوێنەوارەکانیان ماون.

هەروەها فیرعەونی خاوەن گوڵمیخەکان، یاخود: خاوەن هەڕەمەکان، یاخود: خاوەن هێزو توانا؟ کە لە وڵاتاندا لە خوا یاخیبوون، خراپەرکایی و تێکدانیان تێدا زۆر کرد.

کەواتە: یاخیبوون **(طغیان)** لە بەرانبەر خوادا، یەکسەر دەرهاویشتەکەی بریتیە لە خراپەکاریی و تێکدان لە زەویدا، ئایا کێ تێکدان لە زەویدا دەکات؟ پێشینانی خۆمان گوتوویانە: (لەو کەسە بترسێ، کە لە خوا ناترسێ).

هەر کەسێك لەگەڵ خوادا بەینی تێکدا، مسۆگەر لەگەڵ بەندەکانی خواشدا تێکیدەدات، هەموو ئەو کەسانەی لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا حوکمڕانیی دەکەن بەسەر مسوڵمانان دا، بەسەر هەموو ئەو گەلانەدا کە ژێر دەست و ژێر چەپۆکن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو حوکمڕانانە لە خوا یاخیین، دەیانبینین لە خەڵکیش عاسێ بوون و، خراپەکاریی و تێکدان دەکەن، لە وڵات دا، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿ فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴾، پەروەردگارت قەمچییەك لە سزای خۆی بەسەردا ڕژاندن، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت

لـە بۆسـەدایە، یـانی: لـە چاوەڕانیـی دایـە بـۆ سـزادانی ئەوانـەی لـە خـوا یاخیـی دەبـن و، تێکـدان و خراپەرکاریـی لـە زەویـدا دەکـەن.

کەواتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ و هاوەڵەکانـی! ئێـوە کـە ئێسـتا لـە مەککـە دەچەوسـێنرێنەوە بـە دەسـت ئـەو زۆردارانـەو ئەشـکەنجەو ئازارتـان دەدەن، ئازاردانـی جەسـتەیی و مەعنەویـی، دڵنیابـن کـە خوایـەك ﷻ گەلـی عـادو گەلـی سـەموود و فیرعـەون و گەلەکـەی لـە بەیـن بـردوەو، سـزای داون، ئـەو خـوا پـەروەردگارە بـۆ ستەمکارانی ڕۆژگاری ئێـوەش هـەر لـە بۆسـەدایە، ئەگـەر دەسـت هەڵنەگـرن لـە ستەم و خراپەیـان، ئەوانیـش وەك پێشـووەکانیان سـزا دەدا، کـە هـەر واشـبوو خـوا ﷻ سـزای دان، چ لـە کاتـی ڕووبـەڕوو بوونەوەکانـدا لـە جەنگـی بـەدرو ئوحـودو جەنگەکانـی دیکـەداو، ئەوەبـوو ئـەو وڵاتـە هەمـوو کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیسـلامەوە، بەڵکـو وڵاتانێـك کـە لـە ژێـر دەسـەڵاتی دەوڵەتـی زلهێزانـی ئەوسـای ڕۆم و فـارس دابـوون، ئەوانیـش کەوتنـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیسـلام و مسـوڵمانانەوە، ئـەوەی خـوا ﷻ هەڕەشـەی پـێ لـە زۆردارانـی ئەوسـا کـرد، دوایـی لـە واقیعـی مێژووییـدا بەرجەسـتە بـوو و هاتـەدی.

ئنجـا ئـەوە وەك چـۆن ئـەو کاتـە دڵدانـەوە بـووە، بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ و هاوەڵانـی، بـۆ ئێمـەش هـەر دڵدانەوەیـەو، ئێسـتاش ئێمـە کـە ئـەو ئایەتانـە دەخوێنیـن، بێگومـان ئـەو خوایـەی کاتـی خـۆی گەلـی عـادو گـەلی سـەموودو گـەلی فیرعـەون و کـێ و کێـی لـە بەیـن بـردوون، ئـەو خـوا باڵادەسـتە هـەر هەیـەو، هـەر لـە بۆسـەدایەو، سزایەکەشـی هـەر مـاوە!

کەواتـە: بـا دڵنیا بیـن: ئـەو کەسانەی سـتەم دەکـەن لـە خەڵـك، لـە مرۆڤـەکان و دەیانچەوسـێننەوە، وەك بەرزەکـی بانـان بـۆی دەرناچـن، ئەگـەر تەماشـای مێـژووش بکەیـن، هەروایـەو هیـچ کام لەوانـەی سـتەم و خرپەیـان کـردوە، دوایـی سـەلامەت نەبـوون و، وەك بەرزەکـی بانـان بـۆی دەرنەچـوون، بەڵکـو تووشـی سـەرەنجامێکی

تاڵ و دژوار بوون، ئەوانەش کە تاڕاددەیەك دادگەرانە حوکمڕانیی دەکەن، با نامسوڵمانیش بن، دەبینین، بە ڕێزو حورمەتەوە لە کورسی دێنە خوارو، سەرۆك کۆماری پێشوو و پێشووترو پێشووتریش هەن! کەچی لە زۆربەی وڵاتانی مسوڵماننشیندا سەرۆك کۆماری پێشوو، بوونی نیە، چونکە هەمووی لەسەر کورسی دەمێنێتەوە، تاکو تێیهەڵدەدەن و فڕێی دەدەنە خوارێ، یاخود دەمرێ و دواییش ناوی بە ڕەشیی لە مێژوودا تۆمار دەکرێ.

کەواتە: ئەو یاسایەی خوا ﷻ لێرەدا بەیانی دەکات، تەنیا بۆ ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووە، بەڵکو بۆ ئێمەومانانیشەو، بۆ دڵدانەوەی هەموو ستەملێکراوان و چەوساوانانە.

خوا لە بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، زیاتر و ڕاستتر لە فەرمایشتەکەی تێبگەین و، چاکتر پێوەی پابەند بین و، خۆمانی پێ پاك و چاك بکەین لە دنیادا، تاکو سەرەنجام ئەو موژدە خۆشانەی خوا بەو کەسانەیان دەدات، کە بەندەی بۆ خوا صوڵحاوو پاك و چاك بوون لە دنیادا، ئەو موژدە خۆشانە بە ئێمەش ببڕێن، چ لە دنیاداو چ لە دواڕۆژیش دا کە شاد بووغانە بە ڕەزامەندیی خواو، بە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی خوا.

## مەسەلەی سێیەم:

**باسـی مرۆڤـی بێبـڕوا، کـە هـەرکات خـوا پێیـدا دەڵـێ: خـوا ڕێـزی لێگرتـم و، هەر کاتیـش خـوا لێـی گرتـەوە، بژیـوی لێوەتەنـگ هێنـا، دەڵـێ: خـوا ڕیسـوای کـردم! واش نیـە، بەڵکـو ئـەوان زیـاد لـەو بیرکردنـەوە چەوتـە، ڕێـزی هەتیویـش ناگـرن و، هانـی یەکدییـش نـادەن بـۆ هاوکاریـی و خـواردن پێدانـی بابـای نـەدار، میراتیـش هەمـووی پێکـەوە لـرف لێـدەدەن و، سامانیشـیان لـە ڕاددەبـەدەر خۆشـدەوێ:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ ﴾، بەڵام مرۆڤـ هەر کات پەروەردگاری تاقیکردەوە، ڕێزی لێگرت و بەهرەمەندی کرد.

٢)- ﴿ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴾، دەڵێ: پەروەردگارم ڕێزی لێگرتووم!

٣)- ﴿ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴾، بەڵام ئەگەر (پەروەردگاری) تاقیکردەوە، بژیوی لێوەتەنگ هێناو کەمکردەوە، دەڵێ: پەروەردگارم منی ڕیسوا کردوە، سووکایەتیی پێکردووم!

خواش ﷻ بەرپەرچی ئەو بیرکردنەوە چەوتەیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

٤)- ﴿ كَلَّا ﴾، وانیە (وەك ئێوە بیردەکەنەوەو دەڵێن).

دوایی چەند شتێکی دیکەشیان دەخاتە بەرچاو، کە ئێوە وێڕای ئەو بیرکردنەوە چەوتەتان کۆمەڵێك سیفەتی دیکەی خراپیشتان هەن، ئنجا خوا ﷻ چواریان لێ دەژمێرێ:

٥)- ﴿ بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ ١٧ ﴾، (وانیە وەك ئێوە دەڵێن: كە بابای بێبڕوا كاتێك خوای بژیوی بۆ زۆر دەكات، دەڵێ: خوا ڕێزی لێگرتووم، بەڵام كاتێك لێی وەتەنگ دێنێ، دەڵێ: خوا ﷻ سووكایەتیی پێكردووم، ڕیسوای كردووم) بەڵكو ئێوە ڕێز لە هەتیو ناگرن.

ئێستاش با ئەم ئایەتە موبارەكانە تۆزێك شی بكەینەوە:

**١-** پیتی (ف)، كە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾، پسپۆڕان گوتوویانە: (**دَلِيلٌ عَلَى اتِّصَالِ الكَلَامِ وَتَفَرُّعِهِ عَن سَابِقِهِ، وَأَمَّا حَرفُ تَفصيلٍ: مَهْمَا يَكُنْ مِنْ شَيْء**)، ﴿ فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾، پیتی (ف) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم قسەیە بە قسەی پێشیەوە پەیوەستەو لەسەر قسەی پێشێ هەڵدەستێ، (دوایی ئەمە زیاتر ڕوون دەكەینەوە) وشەی: (**أَمَّا**)ش پێی دەگوترێ: (**حَرْفُ تَفصيل**) بۆ ئەوەیە كە پێشێ قسەیەك بكرێ، دوایی بێیە سەر درێژەكەی، یانی: (**مَهْمَا يَكُنْ مِنْ شَيْء**)، هەر شتێك ببێ.

لێرەدا كە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ ﴾ ئەمە وا پێدەچێ پەیوەست بێتەوە بەو ئایەتە موبارەكەوەی خوا پێشتر فەرمووی: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت لە بۆسەدایە، لە چاودێریی دایە، بۆ سزادانی ئەوانەی تێدەپەڕێنن، واتە: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴾، (**فَأَمَّا الإِنْسَانُ الكَافِرُ يَتَوَهَّمُ خِلافَ ذَلِكَ إِذْ يَحْسَبُ أَنَّ ما يَنَالُهُ مِنْ نِعْمَةٍ وَسَعَةٍ فِي الدُّنيا، تَكْرِيمُ اللهِ لَهُ، وَمَا يَنالُهُ مِنْ ضَيقِ عَيشٍ، إهَانَةٌ أَهَانَهُ اللهُ بِهَا**)، ئاوا پێكەوە پەیوەست دەبنەوە، ئەم كۆمەڵە ئایەتە لەگەڵ كۆمەڵە ئایەتی پێشێ دا، واتە: پەروەردگارت لە بۆسەدایەو چاودێریی بەندەكان دەكات، بەڵام مرۆڤی بێبڕوا خەیاڵەكەی پێچەوانەی ئەوەیەو، پێچەوانەی ئەوە گومان دەبا، چونكە پێی وایە نازو نیعمەتێك كە خوا پێیدەداو، فراوانییەك كە خوا بۆی دەڕەخسێنێ، لە ژیانی دنیادا، ڕێزگرتنی خوایە بۆی، بەڵام ئەگەر ژیانی لێوەتەنگ بێ و بژیوی كەم بێ، خوا سووكایەتیی پێكردوەو ڕیسوای كردوە (كە واش نیە).

٢- کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ﴾ (مَا) بۆ تۆخکردنەوەی مانایەکەیەتی، ئەگەرنا لە ئەسڵدا ئاوایە: (إِذاَ اُبْتَلاَهُ رَبُّهُ) کاتێك پەروەردگاری تاقیکردەوە، (الإِبْتِلاءُ أي: الإِخْتِبارُ بالخَيرِ والشَّرّ)، (إبْتِلاء) تاقیکردنەوەیە بە خۆشیی و بە ناخۆشیی، بە شتێك کە مرۆڤ پێی چاکەو، شتێکیش کە پێی خراپە.

٣- (أَكْرَمَهُ) ڕاغیبی ئەسفەهانیی دەڵێ: (إكْرَام): بریتیە لە گەیاندنی کەرامەت بە مرۆڤ ئەویش ئەوەیە سوودێکی پێ بگات، بێ ئەوەی کەم و کوڕیی و زەبوونیی تێدابێ.

٤- ﴿وَنَعَّمَهُۥ﴾، (أَيْ: جَعَلَهُ فِي نِعْمَةٍ وَهِيَ طِيبُ عَيْشٍ)، (نَعَّمَهُ) واتە: خستیە نێو نیعمەتەوە کە مەبەست پێی ژیان و گوزەرانی خۆشە.

٥- بێگومان (ال)ی سەر (الإنْسان)، بۆ جینسە، بەڵام جینسی عورفیی، واتە: ئەو کۆمەڵە ئینسانەی ئەو کاتە بوون، ئینسانانی هاوبەش بۆ خوا دانەر، ئینسانانی بێبڕوا، چونکە ئینسانی بڕوادار وا بیر ناکاتەوە، ئەگەر خوا تاقیکردەوە، بەوەی سوودی پێ گەیاندو خستیە نێو نازو نیعمەتەوە، یەکسەر بڵێ: پەروەردگارم ڕێزو حورمەتی لێگرتووم، بەڵام ئەگەر پەروەردگاری بە تەنگدەستیی و نەداریی تاقیکردەوە، [﴿فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ﴾ خوێنراویشتەوە: (فَقَدَّر)، (قَدَرَ) و (قَدَّرَ)، هەردووکیان بەیەك واتان، بژیوەکەی لێ تەنگ و کەمکردەوە] یەکسەر بڵێ: پەروەردگارم منی سووك و، ڕیسوا کردوە، سووکایەتی پێکردووم، وشەی: ﴿رَبِّيٓ﴾ لە هەردوو ئایەتە موبارەکەکەدا:

أ- ﴿فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكْرَمَنِ﴾، خوێندراویشەتەوە: (رَبِّيَ أَكْرَمَن).

ب- هەروەها ئەوی دیکەش: ﴿فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ﴾، خوێندراویشتەوە: (رَبِّيَ أَهانَنْ)، بە هەردوو شێوەکە خوێندراوەتەوە، (إهانة)ش بریتیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسێکدا، بە جۆرێك بە سووك دابنرێ و زەبوون و بێڕێز بکرێ.

بەڵکو مرۆڤ بڕوادار وابیردەکاتەوە: بۆ ئەوەی بزانێ ئایا لەلای خوا ڕێزی هەیە یان نا؟ دەبێ تەماشا بکات بە پێوەری دیکە ئەوە هەڵسەنگێنێ، ئەو

مەسـەلەیە پێـوەری دیکـەی هەیـە، ئەویـش ئەوەیـە: ئایـا تـا چ ڕادەیـەك بەندایەتیی بـۆ خـوا دەكات و، پابەنـدە بـە شـەریعەتی خـواوە، بـە ئەنـدازەی پابەندیـی بـە شـەریعەتی خـواوە، مـرۆڤ ڕێـزو حورمەتـی پەیدادەبـێ و، بـە ئەنـدازەی لادان و تاوانیـش، سـووكایەتیی بـە خـۆی دەكات.

٦- كە دەفەرموێ: ﴿بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ﴾ وشەی: ﴿بَل﴾ (بەڵكو) لە زمانی عەرەبییدا بۆ (**إِضْرَابٌ**)ە، واتە: گواستنەوە لە حاڵەتێكەوە بۆ حاڵەتێكی دیكە، یانی: ئەو حاڵەتە لێگەڕێ، وەرە تەماشای ئەمە بكە!

(بَـلْ) لێـرەدا بـۆ گواسـتنەوەیە لـە مەبەسـتێكەوە بـۆ مەبەسـتێكی دیكـەو، ئـەو خاڵـە هاوبەشـەی لـە نێوانیانـدا هەیـە، بریتیـە لـەوەی خـوا ﷻ پێیـان دەفەرمـوێ: ئەگـەر ئێـوە كاتێـك خـوا مـاڵ و سـامانتان بـۆ زۆر دەكات، ئـەوە بـە ڕێزگرتنـی خـوا لێیـان، دادەنێـن، بـەڵام ئێـوە بـەو مـاڵ و سـامانەی خـوا پێیـداون، - كـە خـوا ڕێـزی پـێ لـە ئێـوە گرتـوە، بـە پێـی لێكدانـەوەی خۆتـان - ڕێزتـان لـە هەتیـو نەگرتـوەو هاوكارییتـان نەكـردوە.

هەڵبەتـە ڕێزگرتـن لـە هەتیوییـش فراوانـترە لـە یارمەتییدانـی، بـۆ مانـای وشـەی: ﴿ٱلۡيَتِيمَ﴾یـش گوتـراوە: (**الصَّبِـيُّ وَالصَّبِيَّـةُ: اللَّذَيْـنِ مَـاتَ أَبُوهُـمَا قَبْـلَ البُلُـوغِ**)، (**يتيم**) بـۆ كـوڕو كـچ بەكاردەهێـنرێ، كـە بەرلـەوەی باڵـغ بووبـن، بابیـان مردبـێ.

٧- (ال)ی سەر: ﴿ٱلۡيَتِيمَ﴾، هەروەها دواتر (أل) سەر: ﴿ٱلۡمِسۡكِينِ﴾، بۆ ناساندنە، ناساندنی جینس، واتە: تێكڕای هەتیوان و تێكڕای نەداران.

٦)- ﴿وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ﴾، یەكدیش هان نادەن لەسەر خواردندان بە بابای نەدارو ئاتاج.

٧)- ﴿وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا﴾، میراتیش هەمووی لرف لێدەدەن و پێكەوە دەیخۆن، (**التُّرَاثُ: المَالُ المَوْرُوث وَالتَّعْرِيف فيهِ عِوَضٌ عَنِ المُضَافِ إِلَيْهِ**)، یانی:

(**وَتَأْكُلونَ تُراثَكُم**) میراتەکەتان ئەوەی لە کەسێکی نیزیکتانەوە بۆتان دێ، کە دەمرێ، میراتی لێدەگرن، هەمووی پێکەوە دەخۆن. ﴿ أَكۡلٗا لَّمّٗا ﴾، یانی: ماڵی میراتگرەکانی دیکەش دەخەنە سەر ئەوەی خۆتان و، هەمووی پێکەوە دەخۆن.

٨)- ﴿ وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ﴾، ماڵ و سامانیشتان بە خۆشویستنێکی زۆر خۆشدەوێ.

(**الجَمُّ: الكَثير جَمَّ المَاءُ في الحَوْضِ أَي: كَثُرَ، أَي تُحِبُّونَ المَالَ حُبّاً مُفْرِطاً**) (**جمّ**) بە مانای زۆر دێ، دەگوترێ: ئاوەکە زۆربوو لە گۆمەکەدا، واتە: ئێوە ماڵ و سامانی دنیاتان زۆر خۆشدەوێ و لەوەدا تێتان پەڕاندوە.

**چوار وردە سەرنجی دیکە لەم ئایەتانە:**

١- ﴿ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ ﴾، ئەم ڕاناوی (**هُـ**)ی، ﴿ رِزۡقَهُۥ ﴾ دەگونجێ بۆ خوای پەروەردگار بچێتەوە، یانی: خوا بژیوەکەی خۆی لێ کەمکردەوە، (**فَقَدَرَ أَيْ: فَضَيَّقَ، قَدَرَ وَقَدَّر**)، (**قدر وقَدَّر**) هەردووکیان یانی: لێی کەمکردەوە، لێی تەنگ کردەوە.

یاخود: ﴿ رِزۡقَهُۥ ﴾، بژیوەکەی مرۆڤەکە خۆی، واتە: ڕاناوەکە بۆ (**الإنسان**) دەچێتەوە.

٢- ئەو چوار وشانە: ﴿ بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ ﴾، ﴿ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴾، ﴿ وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا ﴾، ﴿ وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ﴾، هەر چواریان وەك چۆن بە (ت)ی دوێنراو (**مخاطَبْ**) خوێنراونەوە: ﴿ تُكۡرِمُونَ ﴾، ﴿ تَحَٰٓضُّونَ ﴾، ﴿ وَتَأۡكُلُونَ ﴾، ﴿ وَتُحِبُّونَ ﴾، بە (**ي**)ی نادیار (**غائب**)یش خوێنراونەوە: (بَل لَّا **يُكرمونَ** ٱلۡيَتِيمَ)، (وَلاَ يَحاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ)، (وَيَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا)، (وَيُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا)، وشەی: ﴿ تَحَٰٓضُّونَ ﴾ لە (**حَضّ**)ەوە هاتوە، یانی: هاندان و تیژکردنی کەسێك لەسەر شتێك، ئنجا وەك چۆن بە: ﴿ تَحَٰٓضُّونَ ﴾، خوێنراوەتەوە، بە (**تَحُضُّون**)یش خوێنراوەتەوە، هەروەها بە حاڵەتی نادیاریش بە هەردووك جۆر خوێنراوەتەوە: (**يَحَاضُّون**) و (**يَحُضُّون**).

**٣-** ئەو ئایەتانەی دوایی کە خوا ﷻ وەك گواستنەوە (**إِضْراب**)ێك لە قسەکەی پێشێیان، چوار تاوانی دیکەشیان دەداتە پاڵ، ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، کە خوا ﷻ ئەو جۆرە بیرو بۆچوونەیان: هەر کەسێك خوا بژیوی بۆ زۆر کرد، ڕێزی لێ گرتبێ و، ئەوەی بژیوی وەتەنگ هێنا، ڕێزی لێ نەگرتبێ، هەڵدەوەشێنێتەوە، ئنجا لێرەدا دەبێ ورد سەرنج بدەین: خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ ﴾ یانی: خوا بۆ خۆی وشەی: (**إِكْرَام**)، بەکاردێنێ، کەچی دوایی کە ئەو مرۆڤە دەڵێ: ﴿ رَبِّيٓ أَكْرَمَنِ ﴾، پێچەوانەکەشی: ﴿ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ﴾، خوا ئەوە هەڵدەوەشێنێتەوە لێرەدا هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەیەك کە خوا ﷻ وەك بیرو بۆچوونێکی چەوتی ئەوان، ڕەخنەی لێگرتوە، لەگەڵ ئەوەدا کە خوا بۆ خۆی دەیچەسپێنێ، لە یەك جیان، چونکە ئەو بێژەیەی خوا بەکاری هێناوە: (**أَكْرَمَهُ**) مەبەستی پێ ماڵ و سامان پێدانەو ﴿ وَنَعَّمَهُۥ ﴾ش، مەبەستی پێ خۆشگوزەران کردن و بەهرەمەند کردنە، بەڵام ئەوەی هەڵیوەشاندۆتەوە، کە بەهەمان بێژە (**لفظ**)ش هاتوە: (**ربِّي أكرمن**) ئەوەیە کە پێی وابووە لە ڕووی مەعنەوییەوە خوا ڕێزی لێگرتوە، دواییش کە خوا بژیوی لێ وەتەنگ هێناوە، گوتوویەتی: خوا لە ڕووی مەعنەوییەوە سووکایەتیی بە من کردوەو ڕێزی لێ نەگرتووم، خوا ئەوەی هەڵدەوەشێنێتەوە، واتە: ئەوەی چەسپاوە، جیایە لەوەی هەڵوەشاوە، دەبێ وا نەزانرێ کە تێکدەگیرێن، ئەوەی خوا چەسپاندوویەتی ئەوەیە کە لە ڕووی مادییەوە، بژیوی بۆ فراوان کردوە و ماڵ و سامانی پێداوەو بەهرەمەندی کردوە، ئەوەی هەڵیشیوەشاندۆتەوە، ئەوەیە کە هەر کەسێك خوا ماڵ و سامانی پێدا، بیکاتە بەڵگەی ئەوەی خوا لە ڕووی مەعنەوییشەوە ڕێزی لێگرتوە، کە نەخێر مەرج نیە، بەو شێوەیە بێ، خوا ﷻ ماڵ و سامان دەدات بە چاك و بە خراپ، بە کەسانێك کە خۆشیدەوێن و، بە کەسانێك کە خۆشیی ناوێن، بۆ تاقیکردنەوە، ئیمان و تاعەت و خۆشویستنی خواش بۆ مرۆڤێك پەیوەندیی نیە بە ماڵ و سامانەوە، بەڵکو پەیوەندیی هەیە بە ئەندازەی پابەندیی ئەو کەسەوە بە بەرنامەو شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە.

**٤-** بیرۆکەی ماڵ و سامان هەبوون کردنە بەڵگەو نیشانەی ئەوەی ئەو مرۆڤە لەلای خوا بە ڕێزو حورمەتەو، هەژاریی و نەداریی کردنە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو مرۆڤە

کەم بایەخە، ئەو بیرۆکەیە کاتی خۆی لە سەردەمی نەفامییدا بووە، بەڵام ئێستاشی لەگەڵدابێ لە ئەنجامی ئەوەدا کە مسوڵمانان لە قورئان دوور کەوتوونەوە، ئەو بیرە چەوتە هەر باوەو، کاتی خۆی یەکێك لەوانە کە بە زەندیق (ملحد) ناسراوە، بە ناوی **(أحمد الراوندي)** کە لە ساڵی (٢٥٠)ی کۆچیی دا مردوە، شیعرێکی هەیە، دەڵێ:

**كَمْ عَاقِلٍ عَاقِلٍ أَعْيَتْ مَــذَاهِبُهُ    وَجَاهِلٍ جَاهِلٍ تَلْقَاهُ مَرزُوقــاً**

**هَذا الَّذي تَـرَكَ الأَفْـهَامَ حَـائِـرَةً    وَصَيَّرَ العَالِمَ النِّحْرِيرَ زِنـدِيـقاً**

واتە: زۆر کەسی عاقڵ و فامیدە هەیە، بەڵام ماندوو بووە نازانێ چۆن خۆی بژیەنێ و بژیو پەیدا بکات! کەچی بابایەکی زۆر نەفام و نەزانیش دەبینی بژیوێکی باشی دراوە، ئا ئەوەیە کە عەقڵەکانی سەرسام کردوون و، ئەوەشە زانای بلیمەتی کردوە بە زەندیق و بێدین.

بەڵام بێگومان کەسێك بەهۆی ئەو حاڵەتەوە بێدین دەبێ، زانای بلیمەت نیە، بەڵکو نەزانێکی خاوەن نەزانیی خەست و خۆڵە، چونکە کەسێك بزانێ خوا لە دنیادا بۆ تاقیکردنەوە دایناوە، کەواتە: دەبێ چاوەڕێ بکات، خوا ﷻ بە هەبوون و بە نەبوون تاقی بکاتەوە، هەروەها بە ساغیی و بە نەخۆشیی، بە خۆشیی و بە ناخۆشیی، بەڵام کەسێك لەو حیکمەتە حاڵیی نەبێ، کە خوا مرۆڤی لەسەر زەوی بۆی داناوە، ئەوە کە مەسەلەی هەبوون و نەبوون، دەکاتە بەڵگەو نیشانەی ئەوەغ لەلای خوا بەڕێزە، یاخود بێڕێزە، وەك ئەو مرۆڤە بێبڕوایەی خوا ﷻ ڕەخنەی لێ دەگرێ.

هەڵبەتە مەرج نیە کەسێکی دیارییکراویش بووبێ، چونکە (أل)ی سەر **(الإنسان)** بۆ جینسی ئەو جۆرە کەسەیە، کە ئینسانی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەرە.

### مەسەلەی چوارەم:

**بەرپەرچدانەوەی خوا بۆ بێبڕوایان و باسی ڕۆژی دوایی و، وردوخاش بوونی زەوی و، هاتنی خوا ﷻ و، هاتنی فریشتەکان بەڕیزو، هێنانی دۆزەخ و، بیرهاتنەوەی مرۆڤ «بێ سوود»و، خۆزگە خواستنی کە کردەوەی باشی بۆ ژیانی دواڕۆژی پێشخستبایەو، هەواڵدانی خوا کە هیچکەس وەك وی سزا نادات و، هیچکەسیش وەك وی کەلەپچە ناکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى قَدَّمْتُ لِحَيَاتِى ﴿٢٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ كَلَّآ ﴾، وانیە وەك ئێوە دەڵێن، یاخود: وازبێنن لەو کردەوانەتان، کە ڕێز لە هەتیو ناگرن و، هانی یەکدی نادەن بۆ خواردن پێدانی بابای نەدارو ئاتاج و، کاتێك میرات دەخۆن هەمووی پێکەوە دەخۆن، هەقی خۆتان و خەڵکیش و، ماڵ و سامانتان لە ڕاددەبەدەر خۆشدەوێ، زیاد لە ئەندازەی ڕەوا، هەروەها واز لەو کردەوە چەوتانەی پێشێش بێنن.

وشەی: (كَلاَّ) بۆ تێوەخوڕین و بەرپەرچدانەوەیە لەو کردەوانەی پێشتر باسکراون، بەڵکو لە بیرو بۆچوونە هەڵەکەش کە مرۆڤ پێی وابێ هەرکات خوا ﷻ ماڵ و سامانی بۆ زۆر کرد، لە لای بەڕێزە، ئەگەرنا لە لای بێ ڕێزە! خوا ﷻ بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە، دوایی دەفەرموێ:

٢)- ﴿ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴾، هەر کات زەوی کوترا، کوترا، (**الدَّكُّ: الحَطْمُ وَالكَسْرُ، أَيْ: دَكٌّ يَعْقُبُ بَعْضُهُ بَعْضاً**)، (**دَكّ**): بە مانای شکاندن و تێکهاڕینە، واتە: جار لە دوای جار کوتراو تێکهاڕدراو، تێکشکێنرا، بێگومان ئەوە لە ئاخیر زەماندا ڕوو دەدا، لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدا.

٣)- ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴾، پەروەردگاریشت هات و، فریشتەکانیش ڕیز ڕیز، ئەوەش بێگومان لە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییدا، کە قیامەتە ڕوودەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ صَفًّا صَفًّا ﴾، بەدڵنیایی وشەی: ﴿ صَفًّا صَفًّا ﴾، کە دووبارە بۆتەوە، حاڵە بۆ وشەی (مَلَك)، واتە: فریشتەکان ڕیز، ڕیز دێن، هاتنی خوای پەروەردگاریش زانایان زۆر قسەیان لە بارەوە کردوە، زۆربەیان هەمیشە گوتوویانە: فەرمانی خوا دێ، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ﴾، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ ﴾، پەروەردگاریشت هات، هەروەها لە سووڕەتی (البقرة)ش دا فەرموویەتی: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾ ﴾، واتە: ئایا چاوەڕێی چی دەکەن، جگە لەوەی خوا لە سێبەرێك، لە هەورەکاندا بێ و فریشتەکانیش بێن و، کارەکە تێکبپەڕێ و کاروبارەکانیش بۆ لای خوا بگێڕرێنەوە! بەڵام بەدڵنیاییەوە ڕای ڕاست و بێ گرێ و گۆڵ لەو بارەوە هەر ئەوەیە کە بگوترێ: هاتنی خوا ﷻ هەروەك چوونە سەر عەرشی خواو، هەموو سیفاتەکانی دیکەی خوا، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیەو ئێمە چۆنیەتییەکەی نازانین، هەروەك چۆن ئێمە چۆنیەتیی زۆرێك لە دروستکراوەکانی خواش نازانین، بۆ وێنە: نازانین هێزی کێشندە کە ئەو هەموو گەردوونەی ڕاگرتوە چییەو چۆنە؟ بگرە چییەت (ماهية)ی ماددەو، ڕووحەکەی خۆمان کە لە نێوان دوو تەنیشتەکانمان دایە، چۆنیەتییەکەیان نازانین! کەواتە: ئەمەیان پێویست بە تەئویل ناکات، بەڵێ هەندێکجار زانایانی پێشین و دوایین (سَلَف وخَلَف) هەندێك ئایەتیان تەئویل کردوون، بۆ وێنە، ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ﴿٤﴾ ﴾، الحديد، هەموو زانایان تەئویلیان کردوەو گوتوویانە: واتە: خوا لە گەڵتانە، بە زانیاریی و بە دەسەڵات، نەك بەزاتی خۆی لەگەڵتان بێ لێرە، بەڵام لێرەدا پەکمان لەسەر تەئویل کردنی نەکەوتوە، چونکە خوا لە قیامەتدا دێ، بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، وەك سەرجەم سیفەتەکانی دیکەی.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴾، (الطبري)، ئاوای لێکداوەتەوە، دەڵێ: (إِذَا رُجَّتِ الأَرْضُ وَزُلْزِلَتْ زَلْزَلَةً بَعْدَ زَلْزَلَة، وَحُرِّكَتْ تَحْرِيكاً بَعْدَ تَحريك)،

واتـە: کاتێـك زەوی ڕاتەکێنـدراو لـە رزێندرایـەوە، لەرزینـەوە لـە دوای لەرزینـەوەو، جوۆڵێنـدرا، جووڵانـدن لـە دوای جووڵانـدن، وشـەی: (دَكّ)، وەك (دَقّ) بـە مانـای: (لێـدان و کوتـران و هـاڕدران و شـکێنرانە)، ئـەوەش لـە قۆناغـی یەکەمـی ڕۆژی دوایـی دەبـێ، کـە ئاخیـر زەمانـە، بـەڵام لـە قۆناغـی دووەم دا کـە قیامەتـە، خـوای پـەروەردگار دێ و فریشـتەکان بەڕیـز دێـن.

٤)- ﴿ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ ﴾، لەو ڕۆژەدا دۆزەخیش هێنرا، یانی: دۆزەخیش ئامادەکراو هێنرا.

٥)- ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، لەو ڕۆژەدا مرۆڤ بیری دەکەوێتەوە، بەڵام چۆن بیری دەکەوێتەوەو، چۆن لێی بەهرەمەند دەبێ؟ ئەوەی پێشێ باسکرا، هەمووی ڕێ خۆشکردن بوو بۆ ئەوەی دوایی باس دەکرێ:

لـەو ڕۆژەدا مـرۆڤ بیـری دەکەوێتـەوە، بـەڵام بیرکردنـەوە لـەوێ لـەو کاتـەدا، کـوا بـۆی دەڕەخسـێ؟ (الطَّبَري)، دەڵـێ: (يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ ) (**تَفْريطَـهُ فِي الدُّنيـا فِي طَاعَـةِ اللـهِ، وَفيـمَا يُقَـرِّبُ إِلَيْـهِ مِـنْ صَالـِحِ العَمَـلْ**)، لـەو ڕۆژەدا مـرۆڤ کەمتەرخەمیـی و بـە زایەدانـی خـۆی بیـر دەکەوێتـەوە، لـە فەرمانبەریـی خـواداو، لـە کردەوەیـەك دا کـە لـە خـوای نیزیـك بخاتـەوە.

﴿ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، (**الطَّبَري**) لـە ئیبنـو عەبباسـەوە خـوا لێیـان ڕازی بـێ، بـە ژمـارە: (٣٧٣١١) هێناویەتـی، دەربـارەی: ﴿ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، گوتوویەتـی:

أ- (**وَكَيْفَ لَهُ**)، واتە: چۆن وەبیری دێتەوە.

ب- یاخود: چۆن بیرهاتنەوە سوودی پێ دەگەیەنێ؟ ئەگەرنا لەو کاتەدا مرۆڤ هەموو شتێکی دێتەوە یاد، بەڵام بێگومان سوودی نیە، لەو ڕۆژەدا هاتنەوە بیر و پەند وەرگرتن، چ سوودێکی هەیە؟

ج- یاخود: ﴿ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، (ذكرى) ئەگەر بە مانای پەند وەرگرتن بێ، واتە: چۆن پەند وەردەگرێ؟ لەوێ پەند وەرناگرێ، بەڵام ئەگەر (ذكرى) بەمانای: وەبیر هاتنەوە بێ، کوا وەبیر هاتنەوەکەی لەوێ سوودی بۆی هەیە؟

٧)- ﴿ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي ﴾، دەڵێ: ئەی خۆزگە (کردەوە باشم) بۆ ژیانم پێشم خستبایە، ﴿ يَٰلَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي ﴾، (ل)ی سەر (حَيَاتِي)، دوو واتای هەن:

أ- (ل)ی کات دیارییکردن (توقيت)ە، خۆزگە کاتی خۆی لە ژیانمدا، ژیانی یەکەمم، ژیانی دنیامدا، کردەوەی باشم پێشخستبایەو، لەو کاتەدا کردەوەی باشم کردبانایە.

ب- (ل)ی هۆکار دۆزیی (تعليل)ە، یانی: کردەوەی باشم پێشخستبانایە بۆ ئەم ژیانەی ئێستام، بێگومان درەختی خۆزگەو بریا بۆ کەس بەری نەگرتووە بۆ ئەویش بەر ناگرێ.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ:

٨)- ﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴾، لەو ڕۆژەدا هیچکەس وەك وی (خوا) سزاو ئازار نادات.

٩)- ﴿ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴾، هیچکەسیش وەك وی (خوا) (تاوانباران) کەلەپچە ناکات و نابەستێ و شەتەك نادات، وشەی: ﴿ يُعَذِّبُ ﴾، و ﴿ يُوثِقُ ﴾ هەردووکیان خوێندراونەوەش: (لايُعَذَّبُ عَذابَهُ أَحَد)، (ولا يوثَقُ وثاقَه) واتە: لەو ڕۆژەدا هیچکەس وەك ئەو سزا نادرێ (وەك ئەو بێبڕوایە)و، هیچکەس وەك ئەو کەلەپچە ناکرێ و نابەسترێ، وشەی (عَذاب) و شەی (وَثَاق)، هەردووکیان چاوگن، (عَذاب) چاوگی (عَذَّب) یە، (عَذَّبَ يُعَذِّبُ عَذاباً وتَعْذيباً) ئازاری دا ئازاری دەدا ئازاردان و سزادان، (وَثَاق)یش، چاوگی (أَوْثَقَ)یە، (أَوْثَقَ، يُوثِقُ، وَثَاقاً)، بەستی، دەیبەستێ، بەستن، (الوَثَاقُ: الرَّبْطُ وَيُجْعَلُ لِلأَسيرِ وَالمَقُودِ إِلى القَتْلِ)، (وَثَاق)، بریتیە لە بەستن کە بۆ بابای دیل و، کەسێك کە پەلکێش دەکرێ بۆ لە سێدارەدان و کوژران، دەبێ، تاکو خۆی نەجووڵێنێ.

لە بارەی هێنانی دۆزەخەوە، پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: {يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا} (أخرجه مسلم: ٢٨٤٢، والترمذي:

٢٥٧٣). واتە: دۆزەخ دەهێنرێ لەو ڕۆژەدا، حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، لەگەڵ هەر جڵەوێکدا، حەفتا هەزار فریشتە هەن ڕایدەکێشن.

(**الطَّبري**)، بە ژمارە: (٣٧٣١٠)، لە قەتادەوە هێناویەتی، گوتوویەتی: (**جيئَ بِهَا مَزْمومَةً**)، دۆزەخ هێنرا بە جڵەوکراویی.

بەدڵنیایی دۆزەخ عالەمێکە، جیهانێکی یەکجار فراوانە، جێی ئەو هەموو بێبڕاو و تاوانبارو خراپەکارانەی تێدا ببێتەوە، دیارە یەکجار زۆر فراوانە، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوای باڵادەست دەفەرموێ: لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێ، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ڕادەکێشرێ و حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، هەر جڵەوێکیان حەفتا هەزار فریشتە ڕایدەکێشن! لێرەش دا بەر لەوەی بچینە سەر مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی، بە باشی دەزانم کورتە باسێك لەبارەی دۆزەخ و دۆزەخییانەوە لە بیست و یەك (٢١) بڕگەدا بکەین.

## کورتە باسێک لە بارەی دۆزەخ و دۆزەخییەکانیەوە

بەڕێـــــزان!

کورتـە باسـێك لەبـارەی دۆزەخ و دۆزەخییانـەوە لـە بیسـت و یـەك (٢١) بڕگـەدا دەکەیـن، ئەویـش ڕاسـتەوخۆو بـە کورتکراوەیـی و گوشراویـی لـە مەوسـووعەی: **(الإسـلام كـما يَتَجَـلَّى فـي كِتـابِ اللـه، الكتـاب الثامـن: الإيمـان باليَـوْمِ الآخِـر، وَمَبْحَـثٌ مُخْتَـصَرٌ حَـوْلَ القَـدَر)** وەریدەگەریـن[1].

بڕگەی یەکەم: وەك چۆن بەهەشت پلە پلەیە بەرەو سەر، دۆزەخیش پلە پلەیە، بەڵام بەرەو خوار، دۆزەخ حەوت دەرگای هەن، پلەکانی دۆزەخ بەرەو خوار، ئەو فەرمایشتەی خوا ﷻ دەیگەیەنێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾النساء، واتە: بە دڵنیایی مونافیق و دەغەڵەکان لە پلەی هەرە خواری ئاگر (ی دۆزەخ)دان و، تۆ هیچ یارمەتییدەرێکت بۆ ئەوان چنگ ناکەوێ.

ئنجـا ئەگـەر مونافیقـەکان لـە تەختـی بنـی دۆزەخدابـن، لـە پلـەی خـواری خـوارەوەی، مانـای وایـە پلـەی دیکەشـی هـەن و، ئـەوەش هیـچ گومانـی تێـدا نیـە، کـە دۆزەخ حـەوت دەرگای هـەن، وەك لـە ئایەتـی ژمـارە: (٤٤)ی سـوورەتی **(الحجـر)**دا، خـوا بـە ڕاشـکاویی فەرمویەتـی: ﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾﴾، واتـە: دۆزەخ حـەوت دەرگای هـەن، بـۆ هـەر دەرگایـەك لـەوان (لـە بێبڕوایـان و تاوانبـاران) بەشـێکی دیارییکـراو هەیـە، یـانی: تەنیا لـەو دەرگایـەوە دەچنـە نێـو دۆزەخـەوە.

---

(١) بڕوانـە: بابـەتی: (جهنّـم ومـا فيهـا مـن صنـوف العـذاب) المجلـد الثامـن، ص ١٥٣ – ٢٠٠، الطبعة الثانية/ ٢٠١٨م.

بڕگەی دووەم: دەرگایەکانی ئاسمان بەستراون لە بەردەم ڕووحی بێبڕوایانداو بەرەو سەر ناچن، وەك خوای پەنهانزان لە سووڕەتی **(الأعراف)** لە ئایەتی ژمارە (٤٠)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بە ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوابوون و لە بەرانبەریان دا خۆیان بە زلگرت، دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێنەوەو، ناچنە بەهەشت، هەتا حوشتر بە کونی دەرزییەوە نەچێ، بەو شێوەیەش سزای تاوانباران دەدەین.

پێغەمبەری خاتەم ﷺ چۆنیەتیی ڕێبەسترانی ئاسمان لە ڕووحی کافرەکانی، ڕوونکردۆتەوە، لە کاتێکدا کە گیانیان دەکێشرێ، لە فەرمایشتێکی درێژدا، کە هەرکام لە: **(أبو داود والحاكم والطيالسي وأحمد والآجري)** هێناویانە، هەروەها: **(قال الحاكم: صحيح على شرط الشيخين، وأقرّه الذهبي، وصحّحه ابن القيم في إعلام الموقعين، وتهذيب السنن، والألباني في أحكام الجنائز وبدعها، ص (١٩٨- ٢٠٢).)** بەندەش لە کتێبی پێنجەمی: (مەوسووعەی: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا هێناومە.

بڕگەی سێیەم: بەهەشت قەدەغەیە لە بێبڕوایان و هەرگیز نایچنەتێ، ئایەتەکەی لە بڕگەی پێشێدا هێنامان، بەڵگەی ئەوەیە، ئایەتی ژمارە (٤٠) لە سووڕەتی **(الأعراف)**: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾، بێگومان لێرەدا خوا کە چوونە بەهەشتی کافرانی بەستۆتەوە، بەوەی حوشتر لە کونی دەرزییەوە بچێ، چونکە وشەی (جمل) بە مانای حوشترە، ڕایەکی دیکەش هەیە، کە **(جَمَّلْ)** بریتیە لەو پەت و گووشە زۆر ئەستوورەی کەشتیی پێ ڕادەگیرێ، بەڵام (جمل) زیاتر مانای حوشتر دەگەیەنێ، کە هەرگیز بە کونی دەرزییەوە ناچێ و، ئەوەش لە عورفی هەموو زمانەکاندا هەیە، وەك یەکێك بەیەکێك دەڵێ: فڵان کارە ناکەم، هەتا شیر ڕەش نەبێ، یاخود: هەتا قیر سپیی نەبێ، یاخود: هەتا شیر نەچێتەوە نێو گوان، کە مەبەست پێیان

نەکردنی ئەو کارەیە، خواش دەفەرموێ: ئەوانەی بێبڕوان هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە، هەتا حوشتر بە کونی دەرزییەوە نەچێ.

بڕگەی چوارەم: ئاگری دۆزەخ لە هەردوو لای سەرێ و خوارێوە، بەسەر بێبڕوایانی دۆزەخیی دا، زاڵ دەکرێ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی **(الأعراف)** ئایەتی ژمارە (٤١) دا دەفەرموێ: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴿٤١﴾﴾، واتە: بۆیان (بێبڕوایان) هەیە ڕاخراوێك لە ئاگرو چەند پۆشاکێك لە سەروویانەوە (دیسان لە ئاگر) هەر بەو شێوەیەش سزای ستەمکاران دەدەین، وشەی: ﴿مِهَادٌ﴾ کە بە **(مُهُد)**، کۆ دەکرێتەوە، وەك: **(كتاب و كُتُب)**، ئەو شوێنەیە کە ئامادە دەکرێ، تاکو مرۆڤ لەسەری دابنیشێ و پشووی لەسەر بدات، (غواش)یش کۆی **(غاشية)**یە و، پۆشاکێکە کاتێك مرۆڤ دەخەوێ و پشوو دەدات، بەسەر خۆیدا دەدات، کەواتە: هەم بنەوەی بێبڕوایان ئاگرە، هەم سەرەوەشیان ئاگرە، ئەو ڕاستییەش لە زۆر شوێنی دیکە لە قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾ **التوبة**، بەدڵنیایی دۆزەخ دەورە دەری بێبڕوایانە، هەروەها لە سوورەتی (الزمر) لە ئایەتی ژمارە (١٦)دا: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِ عِبَادَهُ ۚ يَا عِبَادِ فَاتَّقُونِ ﴿١٦﴾﴾، بۆ ئەوان لە سەروویانەوە سێبەر هەن لە ئاگر، هەروەها لە ژێرەوەشیان سێبەر هەن...

بڕگەی پێنجەم: ڕووی بێبڕوایان لەڕۆژی دواییدا، زەبوونیی و شەرمەزاریی و ڕیسوایی دایدەپۆشێ و، ڕەش هەڵدەگەڕێ بە تۆخترین ڕەنگی ڕەش، وەك لە سوورەتی (یونس) ئایەتی ژمارە (٢٧)دا، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٧﴾﴾، واتە: ئەوانەی خراپەکانیان وەدەست هێناون، سزای هەر خراپەیەك، خراپەیەکە، وەك خۆی، ئەوانە زەبوونیی دایاندەپۆشێ، لە لایەن خواوە هیچ پارێزەرێکیان نیە، وەك ڕوویان بە پارچان لە شەوی زۆر تاریك داپۆشرابێ، ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن و، لەوێدا دەمێننەوە.

هەروەها لە شوێنی دیکەش دا خوای دادگەر باسی ئەوەی کردوە، بۆ نموونە:

أ- خوای بێنیازو جێی نیاز دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾، ئەو ڕۆژەی ڕوانێك سپیی و گەش دەبن و ڕوانێك ڕەش و تاڵخ دەبن.

ب- هەروەها لە سووڕەتی (عبس)دا دەفەرموێ: ﴿ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾ ﴾، ڕوانێك لەو ڕۆژەدا تۆزو خۆڵیان لێ دەنیشێ، دووکەڵ دەچێتە سەریان، ئەوانە بێبڕوا تاوانبارەکانن.

بڕگەی شەشەم: دۆزەخییەکان بەرگی ئاگرینی سووتێنەریان لەبەر دەکرێ، وەك خوا لە سووڕەتی (**الحج**) ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ ﴾، ئەوانە دوو کۆمەڵن لە بارەی پەروەردگاریانەوە کەوتوونە کێشەوە، (کۆمەڵێك بڕوایان پەروەردگارەو بەس ئەو دەپەرستن، کۆمەڵێکیش پشت لە پەروەردگاریان دەکەن) ئەوانەی بێبڕوان بەرگیان لە ئاگر بۆ بڕاوە، ئاوی داغ و کوڵاوییانیش بەسەر (تەپڵی) سەردا دادەکرێ. هەروەها لە سووڕەتی (إبراهيم)، ئایەتەکانی: (٤٩ - ٥٠)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ النَّارُ ﴿٥٠﴾ ﴾، لەو ڕۆژەدا تاوانباران دەبینی دوو دوو جووت کراون لە زنجیرو کەلەپچان دا.

پۆشاکەکانیان لە قەتران[1]، [(**سَرابيل**)، کۆی (**سِرْبال**)ە، ئەو پۆشاکەی لەبەریان دەکرێ]، ئاگریش دەچێتە سەر دەموچاویان.

(**قَطران**) ماددەیەکی ڕەشی لینجە لە خەڵووزی دارو درەخت و تەختە دەردەهێنرێ، حوشتری پێ دەهەنوورێ[2]، حوشتر تووشی جۆرە دەردێك دەبێ، پێستەکەی خرووی تێدادەبێ و قەترانی تێدەدەن و تێیهەڵدەسوون بۆ ئەوەی خووەکەی بشکێ.

---

(١) قەتران ماددەیەکی سووتێنەری یەکجار گەرمە.

(٢) هەنوون: تێدان، پێ چەورکردن، تێهەڵسوون. بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص ٧٤٤.

بڕگەی حەوتەم: بێبڕوایەکان ئاوی کوڵاوو داغیان بەسەر سەردا دەکرێ، ئەو ئاوە کوڵاوو داغە، هەرچی لە هەناویان دایە، هەروەها پێستەکەشیان هەمووی دەتوێنێتەوەو قاڵی دەکاتە، وەك لە ئایەتەکانی پێشێ دا، ئایەتەکانی: (١٩ - ٢٠)ی سوورەتی (**الحج**)دا، هاتوە: ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: ئەمانە دوو کۆمەڵن لە بارەی پەروەردگاریانەوە کەوتوونە مشتومڕو کێشەوە، ئەوانەی بێبڕوان لە ئاگر پۆشاکیان بۆ دابڕاوە، ئاوی داغ و کوڵیویش بەسەر تەپڵی سەریان دادەکرێ، هەرچی لە هەناویاندا هەیە دەیتوێنێنەوە، هەروەها پێستەکەشیان دادەماڵێ و دەیتوێنێتەوە.

بڕگەی هەشتەم: بێبڕوایەکان بە قەمچیی ئاسن لێیان دەدرێ و، هەر کاتێك ویستیان لە دۆزەخ بچنە دەرێ، بە دڵتەنگیی و ماتەمینییەوە دەگێڕدرێنەوە بۆ نێو دۆزەخ، هەر لە سوورەتی (الحج)، ئایەتەکانی: (٢٢ - ٢٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ ﴾، ئەوانە قەمچیی ئاسنیان بۆ هەیە، پێی لێیان دەدرێ، هەر کاتێك بە غەم و پەژارەوە ویستیان لێی بچنە دەرێ، دەگێڕدرێنەوە نێوی، پێشیان دەگوترێ: سزای سووتێنەر بچێژن. (**مَقَامع**)، کۆی (**مقمعة**)یە، بە عەرەبیی (**مِطْرَقة**)شی پێ دەڵێن، کە جۆرێکە قەمچیی، یان کوتەکی ئاسن.

بڕگەی نۆیەم: هەر کاتێك پێستی دۆزەخییەکان سووتاو بووبە بە ڕەژوو، پێستیان بۆ تازە دەکرێتەوە، بۆ ئەوەی بەردەوام سزاو ئازاری دۆزەخ بچێژن، خوا لە سوورەتی (**النساء**) ئایەتی (٥٦)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بە ئایەتەکانمان بێبڕوان، لەمەودوا دەیانخەینە نێو ئاگرێکەوە، هەر کات پێستەکانیان کوڵین، (تەواو بوون و بوونە ڕەژوو) پێستی تازەیان بەبەردا دەکەین تاکو سزاو ئازار بچێژن، بێگومان خوا زاڵی کارزانە.

بڕگەی دەیەم: خواردنەوەی بێبڕوایان لە دۆزەخدا بریتیە لە ئاوی داغ و کوڵاوو کێم و زووخاو،

أ- وەك خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (**النبأ**)، لە ئایەتەکانی: (٢٤ - ٢٦)دا، دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: تێیدا ناچێژن، نە فێنکایەتیی و نە خواردنەوە، جگە لە ئاوی کوڵاوو کێم و زووخاو، ئەوەش سزایەکی پڕ بە پێستە.

ب- هەروەها لە سووڕەتی (إبراهیم) ئایەتەکانی: (١٥-١٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱسْتَفْتَحُوا۟ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: داوای یارمەتییان کردو هەر خۆسەپێنێکی کەللە ڕەق، بەدبەخت و بێمراد بوو، لە پشتیەوە دۆزەخ هەیە، لە ئاوێك دەیدرێتێ، کێم و زووخاوە، قوم قوم قووتی دەدا، خەریکە بۆی قووت نەچێ، مردن لە هەموو لایانەوە بۆی دێ، بەڵام نامرێ و، لە دوایەوە ئازارێکی زۆر بێڕەزاو زبرو سەخت هەیە.

ج- دیسان لە سووڕەتی (**محمد**) ئایەتی (١٥)دا دەفەرموێ: ﴿ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ ﴾، (ئایا کەسێك لەو نازو نیعمەتە دایە کە بەهەشتییەکان تێیدان) وەك کەسێك وایە کە لە ئاگردا هەمیشەیی دەبێ، ئاوێکی کوڵاو و داغیشی پێ دەنۆشرێ، ڕیخۆڵەکانی دەپچڕێ؟!

بڕگەی یازدەیەم: خواردنی بێبڕوایان لە دۆزەخدا بریتیە لە سێ شت، وەك خوا لە قوڕئاندا باسی کردوە:

١- (**زقوم**). ٢- (**ضريع**). ٣- (**غسلين**).

أ- (زقوم) خوا ﷻ لە زۆر شوێنان باسی کردوە، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (**الواقعة**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ

مِنۡهَا ٱلۡبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرۡبَ ٱلۡهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمۡ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ ﴾، واته: ئنجا ئێوه ئەی گومڕا بە درۆ دانەرەکان! لە درەختێك دەخۆن لە زەققووم، ورگی خۆتانی لێ دەئاخنن، دوایی لە ئاوی کوڵاوو داغی لەسەر دەخۆنەوە، وەك حوشتراتێك كە تووشی نەخۆشی تێر ئاو نەخواردنەوە بوون، ئاوا ئاو دەخۆنەوە، ئا ئەوە میوانداریيەكەیانە، لەو ڕۆژەدا.

ب- دەربارەی (**ضَريع**)یش، خوای زاڵی زانا دەفەرموێ: ﴿ لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ﴿٦﴾ لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ ﴿٧﴾ ﴾**الغاشية**، واته: خواردنیان نیه، مەگەر لە (**ضريع**)، ئەویش نە قەڵەو دەكات، نە كەلێنی برسێتییش پڕ دەكاتەوە.

ج- دەربارەی (غسلين)یش خوا لە سووڕەتی (الحاقة)دا دەفەرموێ: ﴿ فَلَيۡسَ لَهُ ٱلۡيَوۡمَ هَٰهُنَا حَمِيمٞ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنۡ غِسۡلِينٖ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأۡكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾ ﴾، واته: ئەمڕۆ (ئەو بێبڕوایە) هیچ دۆستێكی نێزیكی نیه، خواردنیشی نیه جگە لە (**غسلين**)، تەنیا تاوانبارانیش دەیخۆن.

كەواتە:

١- (زَقُّوم)، خواردنی سەرەكیی بێبڕوایانە لە دۆزەخدا، هەندێك لە زانایان دەڵێن: درەختێكە لە دۆزەخداو وێنەی نیە لە دنیادا، هەندێكی دیكە دەڵێن: بەڵكو درەختێكە لە دنیاش دا هەیەو گەڵایەكی وردی هەیە، بەرێكی زۆر تاڵ و ناخۆشی هەیە.

٢- (**ضَريع**)یش بوخاريی دەڵێ: (**نَبْتٌ يُقَالُ لَهُ الشِّبْرِق، يُسَمِّيهِ أَهْلُ الحِجَازِ: الضَّرِيع، إِذَا يَبِسَ وَهو سُمٌّ**)، (**ضريع**)، ڕووەكێكە پێی دەگوترێ: شیبریق خەڵكی حیجاز كاتێك وشك دەبێ پێی دەڵێن: (**ضريع**)، ڕووەكێكی ژەهراوییە.

٣- (**غسلين**)یش هەر بوخاريی دەڵێ: (**هوَ القَيْعُ والصَّديدُ، وَمَا يَخْرُجِ مِنَ الثَّوْبِ بعد الغَسْل**)، (**غِسلين**)، بریتیە لە كێم و زووخاو، هەروەها كە بەرگ و پۆشاكێك دەشۆررێ، چڵكاوەكەی كە دوایی لێی دێتە خوارێ، ئەوە غیسلینە. كەواتە: ئەوە خواردنە

سەرەکییەکانی بێبڕوایانن لە دۆزەخ دا: (**زَقُّوم**) و (**ضَريع**) و (**غِسلين**)، خوای میهرەبان پەنامان بدات لە دۆزەخ و، لەوەی دۆزەخییەکانی پێ سزا دەدرێن.

بڕگەی دوازدەیەم: دۆزەخییەکان کۆت و پێوەند دەخرێتە گەردنیان و، دەست و پێیان کەلەپچە دەکرێن و، بە زنجیریش دەپێچرێن، لە سوورەتی (الإنسان)، ئایەتی (٤)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ ﴾، واتە: ئێمە بۆ بێبڕوایان ئامادەمان کردوە، دامانناوە، زنجیرەکان و پێوەندەکان و، ئاگری کڵپەدار.

لە سوورەتی (المزمل) ئایەتەکانی: (١٢ - ١٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا ﴿١٢﴾ وَطَعَامٗا ذَا غُصَّةٖ وَعَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٣﴾ ﴾، بەدڵنیایی لەلای ئێمە هەیە پێوەندەکان و کڵپە (ی ئاگر). هەروەها خواردنێکی خاوەن گیربوون و ئازارێکی بە ئێش. (**أَنْكَال**)، کۆی (**نِكْل**)ە، ئەویش ئەو پێوەندەیە پێیەکانی مرۆڤێکی پێ دەبەسترێن. لە ئایەتی پێشێدا فەرمووی: ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ بێبڕوایان: زنجیرەکان و کۆتەکان و بڵێسە: ﴿ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ﴾، (**سلاسل**) کۆی (**سِلْسِلة**)یە، یانی: زنجیر، زنجیری ئاسن، ﴿ وَأَغۡلَٰلٗا ﴾، کۆی (**غُلّ**)ەو بریتیە لەو کۆتەی لە گەردنی مرۆڤ دەکرێ، زۆرجار دوو دەستیشی لەگەڵیدا کۆدەکرێنەوە، بە جۆرێك مرۆڤ، نە دەتوانێ دەستی بجووڵێنێ، نە دەتوانێ سەریشی بەملاولا بجووڵێنێ، دەبێ ڕێك بوەستێ.

هەروەها بە زنجیریش دەپێچرێن، وەك لە سوورەتی (**الحَاقَّة**) ئایەتەکانی: (٣٠، ٣١، ٣٢)دا هاتوە: خوا دەفەرموێ: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ ﴾ واتە: بیگرن و کۆتی بخەنە گەردن، دوایی بیخەنە نێو کڵپە (ی دۆزەخ) ئنجا بە زنجیرێك کە درێژییەکەی حەفتا باسکە بیپێچن.

واتە: زنجیرەکەی بە دەوردا بپێچن، نەك وەك هەندێ لە ڕوونکەرەوانی قوڕئان گوتوویانە: زنجیرەکەی بخەنە نێو، گوایە دەیخەنە زاری و لە دواوەی دەردەچێ،

نا، ئەو تەعبیرە نە شایستەی قورئانەو، نە خوای پاك و تاكیش وایفەرمووە، خوا نەیفەرمووە: (فَٱسْلُكُوهَا فِيهِ)، زنجیرەكەی بخەنە نێو بەڵكو فەرموویەتی: ﴿فَٱسْلُكُوهُ﴾ واتە: ئەوكەسە بخەنە نێو زنجیر، ئنجا مرۆڤ كاتێك دەخرێتە نێو زنجیر، كە زنجیرەكەی بە دەوردا بپێچرێ، زنجیرێك درێژییەكەی حەفتا (٧٠) باسك بێ، بۆ ئەوەی بەشی بكات، هەر چواردەوری بپێچێ و وەك قاڵبێكی ئاسن بخرێتە نێوی.

سێزدەیەم: دۆزەخییەكان لە نێو صندووقی درێژكراودا دەبن، لە شوێنێك داو دەرگاكانیشیان لەسەر داخراون، وەك خوا لە سوورەتی (**الهمزة**)دا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ﴿٩﴾﴾، واتە: دۆزەخ لەسەریان داخراوە، گاڵە دراوە، لە نێو كۆڵەگە درێژكراوەكان دا. ﴿عَمَدٍ﴾، كۆی (عمود)و (عماد)ە، كە بە تابووتی ئاسن یاخود بە صندووقی ئاسن دەگوترێ، یانی: لە نێو صندووقە ئاسنە درێژكراوەكان دا دانراون، لە شوێنێكدا كە شوێنەكەشیان لەسەر داخراوەو گاڵە دراوە، خوا پەنامان بدات، كە هەر هێنانە بەرچاوی خەیاڵیشی قورسە، چ جای ئەوەی كەسێك ئەو حاڵەی بەسەر بێ!

چواردەیەم: دۆزەخییەكان فڕێ دەدرێنە نێو ئاگرێكی كڵپە سەندووەوەو بە تێكشاندن تێكیان دەشكێنێ و، دەچێتە سەر عەقڵ و دڵیان، واتە: ئاگرەكە ڕێك كاریگەریی دەخاتە سەر عەقڵ و دڵیان، وەك خوا عزوجل لە سوورەتی (**الهمزة**)دا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾﴾، واتە: نەخێر واز بێنن، فڕێ دەدرێنە نێو ئاگرێكی تێكشكێنەرەوە، ئایا چی بە تۆی زاناندوە، ئاگری تێكشكێنەر چییە؟ ئاگرێكی خوایە هەڵكراوە، دەچێتە سەر عەقڵ و دڵەكان. ﴿ٱلْأَفْـِٔدَةِ﴾، كۆی (**فُؤاد**)ە، كە لە قورئاندا ناوە بۆ عەقڵ و، هەندێك جار بۆ دڵیش بەكاردەهێنرێ، ئەو ئاگری دۆزەخە دەچێتە سەر عەقڵ و دڵی مرۆڤ، ئنجا مرۆڤ كاتێك پێستی بسووتێ هێندە بە ئازارە، چ جای عەقڵ و دڵی بسووتێ! خوا دەفەرموێ: ﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ﴾ ئاگری هەڵایسێنراوی خوا، واتە: جیایە

لەو ئاگرەی دنیا، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**نَارُكُمْ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ**} (**أخرجه أحمد: ١٠٢٠٤، والبخاري: ٣٠٩٢**)، واتە: ئاگرەکەی ئێوە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، واتە: ئاگری دۆزەخ شەست و نۆ (٦٩) هێندەی دیکە گەرمە، ئەگەر مەبەست لە ژمارە کە حەفتا (٧٠) بێ بە دیارییکراویی، ئەگەر بۆ زۆرییش بێ، دەگونجێ سەدان و هەزاران جاریش لە ئاگری دنیا گەرمتر بێ.

پازدەیەم: دۆزەخییەکان لە ژینگەیەکدا کە بایەکی زۆر گەرمی پڕووکێنەری تێدایەو، ئاوێکی کوڵاوو داغ و، سێبەرێکی لە دووکەڵێکی خنکێنەر، لە شوێنێکی ئاوادا دەژین، ئەمەش لە سووڕەتی (**الواقعة**)دا، خوا دەیفەرموێ: ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ ﴾، هاوەڵانی چەپە، هاوەڵانی چەپە چیین؟ لە نێو گڕە باو ئاوی کوڵاوو داغ و لە نێو سێبەرێك لە دووکەڵدان، نەساردە، نە هیچ ڕێزو حورمەتێکیشی تێدایە. یان: نە ساردە، نە هیچ سوودێکی تێدایە.

هەروەها لە سووڕەتی (المرسلات)یش لە ئایەتەکانی: (٣٠ - ٣٤)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: دەربچن بە خێرایی بەرەو سێبەرێك کە سێ پارچەیە (سێ بەشی لێ بوونەوە) نەسێبەرە، نەسوودیشی هەیە لە گڕو بڵێسە (ی دۆزەخ)، بەڵکو پارچان فڕێدەدا، وەك کۆشك وان، وەك ڕەوە حوشتری زەردن، سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ بە درۆ دانەران.

شازدەیەم: خەڵکی دۆزەخ سزایان لەسەر سووك نابێ، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو بەردەوام سزایان لەسەر توند دەکرێ، ئەمیش لە زۆر ئایەتی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُواْ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾الزخرف، واتە: بە دڵنیایی تاوانباران لە ئازاری

دۆزەخ دا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، لەسەریان سووك ناكرێ، لەوێدا نائومێد دەبن، ستەمیشمان لێ نەكردوون، بەڵكو خۆیان ستەمكار بوون.

٢- لە سوورەتی (**فاطر**)، لە ئایەتی (٣٦)دا دەفەرمویٰ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ ٣٦ ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان ئاگری دۆزەخیان بۆ هەیە، كۆتاییان پێ ناهێنرێ، كە بمرن و ببڕێنەوە و كۆتاییان پێ بێ، لە ئازارەكەشی لەسەریان سووك ناكرێ، ئاوا سزای هەر سپڵەو نا سوپاسێك، یان: هەر بێبڕوایەك دەدەینەوە.

٣- لە سوورەتی (غافر)، لە ئایەتەكانی: (٤٩ - ٥٠)دا خوا دەفەرمویٰ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٤٩ قَالُوٓاْ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُواْ بَلَىٰ قَالُواْ فَٱدْعُواْ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ٥٠ ﴾، واتە: ئەوانەی لە ئاگری دۆزەخدان بە دۆزەخەوانەكانیان گوت: بۆمان لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە، یەك ڕۆژ سزامان لەسەر سووك بكات! دۆزەخەوانەكان پێیان گوتن: ئایا پێغەمبەرانتان نەدەهاتنە لاتان، بەبەڵگە ڕۆشنەكانەوە؟ گوتیان: با، دۆزەخەوانەكان پێیان گوتن: دە بیچێژن، داواكردنی بێبڕوایان هەر لە گومڕایی و لە زایە بووندایە.

٤- لە سوورەتی (**النبأ**)دا خوا دەفەرمویٰ: ﴿ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ٣٠ ﴾، واتە: بیچێژن هەر سزاو ئازارتان بۆ زیاد دەكەین.

٥- لە سوورەتی (**الإسراء**)دا خوا دەفەرمویٰ: ﴿ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ٩٧ ﴾، واتە: جێگەو ڕێگەیان - هی بێبڕوایان - دۆزەخە، هەر كە ئاگرەكە خەفە بوو، دووبارە كڵپەی دەدەینەوە بەرێ ( و ئاگرەكەیان بۆ خۆشدەكەین).

حەڤدەیەم: فریشتە دۆزەخەوانەكان زۆریش دڵـڕەقن، زۆریش بەهێزن و، فەرمانەكانی خوا بەوردیی جێبەجێ دەكەن، لە سوورەتی (التحریم)دا، خوا دەفەرمویٰ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا

﴿يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان و خێزان کەس و کارتان، لە ئاگرێك بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی خەڵکەو بەردە، فریشتە زەبەلاحە دڵڕەقەکانی بەسەرەوەن، سەرپێچیی لە فەرمانەکانی خوا ناکەن، هەرچی پێیان بگوترێ وەك خۆی ئەنجامی دەدەن.

هەڵبەتە کەسێکیش کە کەسێك ئازارو ئەشکەنجە دەدا، هەتا دڵی ڕەقتربێ و، جەستەی بەهێزتر بێ، بێگومان چاکتر دەتوانێ بابای ئەشکەنجەدراو ئەشکەنجە بدات.

هەژدەیەم: دۆزەخییەکان مردنیان لە هەموو لایانەوە بۆ دێ، بەڵام نامرن، مردن بە ئاوات دەخوازن، بەڵام بە نسیبیان نابێ، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (إبراهیم)دا کە پێشتریش هێنامان، خوا فەرموویەتی: ﴿وَيَأۡتِيهِ ٱلۡمَوۡتُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٖۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٞ ١٧﴾، واتە: لە هەموو شوێنێکەوە مردنی بۆ دێ، بەڵام نامرێ، لە پشتیانەوە ئازارو ئەشکەنجەیەکی زبرو زەبەڵاح هەیە.

٢- لە سووڕەتی (**فاطر**)یش ئایەتی (٣٦)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ ٣٦﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان ئاگری دۆزەخیان بۆ هەیە، کۆتاییان پێ ناهێنرێ بمرن، ئازارەکەشیان لەسەر سووك ناکرێ، ئاوا سزای هەر سپڵەیەك یاخود: هەر بێبڕوایەك دەدەینەوە.

٣- لە سووڕەتی (النبأ)یش لە ئایەتی ژمارە (٤٠)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنذَرۡنَٰكُمۡ عَذَابٗا قَرِيبٗا يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ٤٠﴾، واتە: ئێمە ترساندوومانن بە سزاو ئازارێکی نیزیك، ئەو ڕۆژە مرۆڤ تەماشا دەکات، دوو دەستەکانی چییان پێشخستوە؟ بابای بێبڕواش دەڵێ: خۆزگە گڵ بوومایە.

٤- لە سووڕەتی (الزخرف)یش ئایەتی (٧٧)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَنَادَوْاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتە: دۆزەخییەكان هاواریان كرد ئەی مالیك! (مالیك ئەو فریشتەیە سەرپەرشتیی هەموو دۆزەخ دەكات)، با پەروەردگارت كۆتاییمان پێبێنێ، فەرمووی: ئێوە ماوەوەن!

٥- لە سووڕەتی (**طه**)ش دا خوا دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی هەركەسێك بە تاوانباریی بێتە لای پەروەردگاری، دۆزەخ شوێنیەتی، نەتێیدا دەمریّ و نەتێیدا دەژیی، واتە: نە كۆتایی پێدیّ، دەربازی بێ لە ئازارو ئەشكەنجەو، نە دەشژیەت ژیانێك پێی بگوتریّ: ژیان.

نۆزدەیەم: دۆزەخییەكان لە خوای بەرز دەپاڕێنەوەو داوا دەكەن بیانگێڕێتەوە بۆ دنیا، یان بیانگێڕێتەوە بۆ ژیانێكی دیكە، هی تاقیكردنەوە، تاكو ئەوەی لە دەستیان چووە، قەرەبووی بكەنەوە، بەڵام وەڵامی ئەوەیان نادرێتەوە، بەڵكو زۆر بە توندییش سەرزەنشت دەكرێن، وەك:

١- لە سووڕەتی (**فاطر**)دا خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: ئەوان لە دۆزەخدا هاوارو بڕۆیانە، دەڵێن: پەروەردگارمان! دەرمان بێنە كردەوەی باش دەكەین، جیا لەوەی - پێشتر لە دنیادا - دەمانكرد، (خوا پێیان دەفەرمویّ یان فریشتەكان): ﴿ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ ﴾، ئایا بایی ئەوەندە تەمەنمان پێنەدان، كە ئەگەر كەسێك ویستبای بیری بكەوێتەوە، بیری دەكەوتەوەو پەندی وەردەگرت، ﴿ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ﴾، ترسێنەرو وریاكەرەوەشتان بۆ هات؟ ﴿ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾، بیچێژن، ستەمكاران هیچ هاوكارو یارمەتییدەرێكیان نیە.

٢- لە سووڕەتی (**المؤمنون**)یش ئایەتەكانی: (١٠٦، ١٠٧، ١٠٨)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿ قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ

عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ ﴾، واتە: (دۆزەخییەکان) گوتیان: پەروەردگارمان! ئێمە بەدبەختیی بەسەرمان دا زاڵ بوو و کۆمەڵێکی گومڕاو لە ڕێ لادەر بووین، پەروەردگارمان! دەرمان بێنە، ئەگەر جارێکی دیکە گەڕاینەوە، بەدڵنیایی ستەمکارین (دەرمان بێنەو بمانبەوە بۆ تاقیکردنەوە) ﴿ قَالَ ٱخْسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾، (خوا) فەرمووی: بێدەنگ بن و مەمدوێنن. ﴿ ٱخْسَـُٔواْ ﴾، واتە: بێدەنگ بن و وشەیەکە بۆ تێخوڕینە، (**خَسَأَ بِمَعْنى بَعُدَ وَذَلَّ، وَكَلَّ وَأَعْيا**)، (**خَسَأَ**): بە مانای دوور کەوتەوە، زەبوون بوو، ماندو بوو، شەکەت بوو.

بیستەم: دۆزەخییەکان لە دیداری خوای بەرز، بێبەش دەبن، بەڵکو خوای بەرز هەر تەماشایان ناکات و نایاندوێنێ و، پاك چاکیشیان ناکات، وەك:

١- لە سوورەتی (**المُطَفِّفين**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُواْ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ﴾، با واز بێنن، یان ئەوەی دەیڵێن ڕاست نیە، بێگومان ئەوان لەو ڕۆژەدا لە پەروەردگاریان پەردەپۆش دەکرێن (دەخرێنە پشت پەردەو، پەروەردگاریان نابینین) دواییش ئەوان دەخرێنە نێو کڵپە (ی دۆزەخە)وە.

٢- لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بە پەیمانی خواو سوێندەکانیان نرخێکی کەم دەکڕن، ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا، هیچ پشك و بەشێکی باشیان نیە، خوا نایاندوێنێ و تەماشایان ناکات لە ڕۆژی قیامەتداو، پاك و چاکیان ناکات و، ئازارێکی بە ئێشیشیان هەیە.

جێی سەرنجە خوا لە سوورەتی (**المطففين**)دا، دوای ئەوەی لە ئایەتی (١٥)دا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴾، واتە: نەخێر، ئەوان لە پەروەردگاریان لەوڕۆژەدا پەردە پۆش دەکرێن، ئنجا لە ئایەتی دوایی دا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُواْ ٱلْجَحِيمِ ﴾، دوای ئەوەش دەخرێنە نێو دۆزەخەوە،

کەواتــە: بێبــەش کرانیــان لــە دیــداری خــوا، لــە ســەریان قورســترە لــە چوونــە نێــو دۆزەخـــەوە!

بیست و یەکەم: ت خوا ﷻ نەفرین لە بێبڕوایان دەکات، لە دۆزەخداو بە هەمیشەیی دەیانهێڵێتەوەو، لە وێدا زۆر پەشێمانیی دەردەبڕن، کە فەرمانبەریی خوایان نەکردوەو، بە پێچەوانەوە فەرمانبەرییان کردوە بۆ گەورە سیاسییەکانیان و گەورە کۆمەڵایەتییەکانیان و، لاسایی ئەوانیان کردۆتەوە.

لــە ســوورەتی (**الأحــزاب**) لــە ئایەتەکانــی: (٦٤ - ٦٨)دا، خــوا ئەمــە هەمــووی ڕوون دەکاتــەوە، دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ ﴾، خــوا ﷻ لــەم چەنــد ئایەتــە موبارەکــەدا، هەشــت ڕاســتیی مــەزن لــە بــارەی دۆزەخییەکانــەوە دەخاتــەڕوو:

**١و٢-** خوا دۆزەخییەکانی لە بەزەیی خۆی دوورخستوونەوەو، ئاگری کڵپەداری بۆ داناون: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴾.

**٣-** بێبڕوایان لە ئاگری دۆزەخدا، بە هەمیشەیی و بەردەوام دەمێننەوە، بەبێ بڕانەوە: ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾، تێیدا دەمێننەوە هەتا هەتایە، بەبێ کۆتایی.

**٤-** بێبڕوایانی هەرماو لە دۆزەخدا، هیچ سەرپەرشتیارێکیان دەست ناکەوێ، سەرپەرشتییان بکات و، هیچ یارمەتییدەرێکیان نیە یارمەتییان بدات: ﴿ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾.

**٥-** بێبڕوایان دەم و چاویان بە پێی ئاگرەکە دەسووڕێنرێ، تاکو ئاگرە ٥ لە هەموو لایانەوە لێیان بدات: ﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ ﴾، ئەو ڕۆژەی دەم و چاویان لە ئاگردا دەسووڕێنرێ، واتە: بۆ ئەوەی ئاگر لە هەموو شوێنانیان بدات.

٦- لەو ڕۆژەدا بێبڕوایان زۆر پەشێمان دەبنەوەو داخ و خەفەت دەچێتە دڵیانەوە، کە فەرمانبەریی خوایان نەکردو، فەرمانبەریی پێغەمبەریان ﷺ نەکردوە: ﴿ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾، دەڵێن: هەی خۆزگە فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرمان کردبایە ﷺ.

٧- بێبڕوایان دان بەوەدادەنێن کە هۆی بێبڕواییەکەیان ئەوە بووە فەرمانبەریی گەورە سیاسییەکانیان و، دەمڕاستە کۆمەڵایەتییەکانیان کردوە: ﴿ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾، گوتیان: پەروەردگارمان! ئێمە بە قسەی گەورە سیاسییەکانمان و دەمڕاستە کۆمەڵایەتییەکانمان کرد، ئەوانیش لە ڕێ لایانداین... پایەدارترو، (**سادَة**)، کۆی (**سَيِّد**)ەو (**كُبَرَاء**)یش کۆی (**كَبِير**)ە، ئەوانەی پایەدارتر و بەتەمەن ترو بەڕێ و جێتربوون لە ڕووی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە، ئەوان ئێمەیان لە ڕێ لادا.

٨- ڕاستییەکی دیکەش کە لەم ئایەتە موبارەکانەدا وەردەگیرێ، ئەوەیە کە ئەوانە داوا دەکەن: بڕیار بەدەست و سەرکردەکانیان کە لە دنیادا گومڕایان کردوون، خوا زیاتر سزایان بدات: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴾، پەروەردگارمان! با سزای ئەوان دوو قاتی ئێمە بێ (یاخود: چەند قاتی ئێمە بێ) بە نەفرینکردنێکی گەورەش نەفرینیان لێبکە!

### لە کۆتایی باسی دۆزەخ دۆزەخییەکان دا، بەکورتیی دوو مەسەلە دەخەمە ڕوو:

**یەکەم:** بێگومان هەر کەسێك تەماشای ئەو ئایەتە موبارەکانە بکات، کە من مەگەر بە دەگمەن، فەرمایشتێکم هێنابێ، ئەگەرنا بەس ئایەتەکانم هێنان، چونکە ئایەتەکانی قورئان لەوبارەوە زۆرن و، هەموو شتێکیان لە بارەی دۆزەخەوە باسکردوەو، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ باسی کردوە، هەندێك درێژەو وردەکارییە بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی بەشێکی کەم لە ئایەتەکان، ئنجا هەر کەسێك تەماشای ئەو ئایەتانە بکات و، بڕواشی پێیان بێ، بێگومان خۆی لە هەموو ئەو کردەوانە دەپارێزێ، کە بەرەو دۆزەخی دەبەن، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {**حُفَّتْ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ وَحُفَّتْ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ**} (**أخرجه**

**البخاري: ٦١٢٢)** واتە: ئاگر بە ئارەزووان دەورە دراوەو، بەهەشت بە ناڕەحەتییان.

یانی: کەسێك بەدوای ئارەزووان بکەوێ، بە دوای ئاگری دۆزەخ دا دەچێ و، کەسێك بیەوێ بەرەو بەهەشت بچێ، دەبێ ناڕەحەتییان تەحەممول بکات.

**دووەم:** ڕەنگە لێرەدا پرسیارێك لە عەقڵ و دڵی هەندێك کەس دا، سەرەتاتکە بکات: ئایا ئازارێکی بێکۆتایی بەو هەموو جۆرانەیەوە، بەرانبەرو بارتەقایە لەگەڵ تەمەنێکی کەموکورتی بابای بێبڕوادا، کە لە دنیادا بە کوفر گوزەراندوویەتی؟

بۆیەش هەندێك لە زانایان ڕایەکی وایان هەیە - کە بەدڵنیایی ڕایەکی ڕیزپەڕە - دەڵێ: کاتێك دێ دۆزەخ کەسی تێدا نامێنێ و لە بەیندەچێ و ئەوانەش کە لە دۆزەخدان، لە بەیندەچن، هەروەها هەندێکیش گوتوویانە: کاتێك دێ، ئەوانەی دۆزەخیش خوای پەروەردگار بەزەیی پێیان دادێ و دەیانخاتە بەهەشت، بەڵام لە ڕاستییدا ئەو دوو ڕایە لە گەڵ دەقی ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ، تێکدەگیرێن و دژ دەوەستن.

وەڵامی ئەو پرسیارو ئیشکالەش ئەوەیە، دەڵێین:

**١-** هەر کەسێ بزانێ بێبڕوایی و دان نەهێنان بە پەروەردگارێتیی خواو، پەرستراوێتیی خواو، بە ناوو سیفەتەکانی خواو، بە خاوەندارێتیی خوادا، چەند تاوانێکی گەورەیە، دەزانێ کە ئەو سزایەش پڕ بە پێستە لەگەڵ ئەو تاوانە گەورەیەدا.

**٢-** لەلایەکی دیکەشەوە: خوا بێ سنوور مەزن و بەرزو گەورەیە، کەسێکیش سەرپێچیی لە بەرانبەر خوادا بکات، سەرپێچییەك بە مانای فراوانی سەرپێچیی: لە خوا هەڵگەڕێتەوەو، حیساب بۆ خوا نەکات و، لە بەرانبەر خوادا خۆی بە زلبگرێ، بێگومان بە ئەندازەی بەرزیی و مەزنیی و خوا، گەورەیی خوا، ئەویش شایستەی سزادرانە.

**٣-** هەروەها لەلایەکی دیکەشەوە: لە هەر بێبڕوایەك بپرسی: ئایا ئەگەر تۆ تەمەنێکی زۆرت ببێ، تەمەنێکی تاهەتاییت هەبێ، لەسەر بێبڕوایی دەمێنیەوە؟ بێگومان دەڵێ:

بەڵێ، چونکە قەناعەتم وایەو هەر لەسەر ئەوە دەمێنمەوەو ئەوەم پێ ڕاستە، کەواتە: بەپێی قەناعەت و نیەتەکەی خۆی خوای دادگەریش سزای دەدا.

ئەوەی لە ڕواڵەتی ئایەتەکان و، لە ڕواڵەتی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەردەگیرێ، ئەوەیە کە سزای دۆزەخییەکان، هەتا هەتاییەو، بڕانەوەی تێدا نیە، هەندێك لەو ئایەتانەش کە جۆرێك لە سنووردار بوون و کاتیی بوونی سزای خوا، دەگەیەنن، بۆ وێنە:

أ- لە سووڕەتی (هود)دا خوا دەفەرموێ: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾﴾.

ب- هەروەها لە سووڕەتی (**الأنعام**)دا دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ **الأنعام**.

دیسان لە سووڕەتی (**النبأ**)دا دەفەرموێ: ﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾﴾، ئەوانە هەمووی لە کاتی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتە موبارەکانەدا، وامانامان کردوون، کە خوا ﷻ بە پێی عەقڵی ئێمە، ئێمە دەدوێنێ، ئێمە ئەگەر شتێك زۆربێ دەڵێین: هەتا دنیا دنیایە، ئنجا ئەو ئەبەدیی و نەبڕانەوەیەش هەر کاتی بە دوای یەکدا هاتوون، ﴿أَحْقَابًا﴾، یانی: کاتە بەدوای یەکدا هاتووەکان، بەڵام بەبێ کۆتایی.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**بانگکردنی مرۆڤی بڕوادار بە: ئەی نەفسی ئۆقرە گرتوو! بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، تۆش لەو ڕازیی و ئەویش لێت ڕازییە، بچۆ نێو بەندەکانم و بچۆ بۆ بەهەشتەکەمەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴾، ئەی نەفسە ئۆقرەگرتووەکە! پێشتر باسمان کرد، کە مەبەست لە نەفس لێرەدا خود (**ذات**)ە، لە قورئاندا وشەی (**نَفْس**) بە دوو واتایان بەکارهاتوە.

**١-** وەك ڕووح لە بەرانبەر جەستەدا.

**٢-** هەروەها نەفس بەکارهاتوە، وەك خودی ئەو شتە بە ڕووح و جەستەوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**الزمر**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾، (**نفس**) یانی: کەسێك، واتە: بۆ ئەوەی کەسێك نەڵێ: ئەی داخ و خەفەت بۆ من کە لە بەرانبەر خوادا کەمتەرخەمییم کرد، بەدڵنیاییش من لە گاڵتە پێکەران بووم، کەواتە: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ﴾، یانی: کەسێك (بە ڕووح و جەستەوە)، ﴿ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴾، ئۆقرە گرتوو، (**المُطْمَئِنَّة إِسْمُ فَاعِلٍ مِن اطْمَأَنَّ، إذا كَانَ هَادِئاً غَيْرَ مُضْطَرِبٍ، ولا مُنزَعِجٍ**)، ﴿ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴾، ناوی بکەرە لە کرداری (**اطْمَأَنَّ**)وە هاتوە، واتە: هێدیی بوو، ئۆقرەی گرت، ئەگەر هێدیی بێ، جووڵەو جووڵ و بێزاریی تێدا نەبێ.

**٢)-** ﴿ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ ﴾، بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، بێگومان لێرەدا کە دەفەرموێ: بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگار خوازراوەتەوە، بۆ ئەوەی: بچۆ بەهەشتەوە.

٣)- ﴿رَاضِيَةً مَّرۡضِيَّةً﴾، تۆش ڕازیی لە خواو، ئەویش لە تۆ ڕازییە، (رَاضِيَةً: **الَّتي رَضَتْ بِمَا أُعْطِيَتْهُ مِنْ كَرَامَةٍ، وَهُوَ كِنَايَةٌ عَنْ إِعْطَائِهَا كُلَّ مَا كَانَ تَطْمَعُ إِلَيْهِ**)، (رَاضِيَةً)، واتە: بەوە ڕازی کە پێتدراوە لە ڕێزلێگرتنی خوا، لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە: هەرچی خواستوویەتی و لە دڵیدا ئاواتی بووە، خوا پێیداوە.

(رَاضِيَةً) نـاوی بکـەر (**إِسْـم فاعِـل**)ە، بـەڵام (مَّرۡضِيَّةً) نـاوی بـەرکار (**إِسـم مَفْعـول**)ە، یانـی: (**مَـرْضِيٌّ عَنْهَـا**)، لێرازیبـوو، خـوا لـە تـۆ ڕازییـەو، تـۆش پەسـندکراوی لـەلای خـوا.

٣)- ﴿فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي﴾، بچۆ نێو بەندەکانمەوە، واتە: لەگەڵیاندابەو بچۆ نێو ڕیزی بەندەکانم.

٤)- ﴿وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي﴾، بچۆ بەهەشت و باخەکەشمەوە، لێرەدا بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي﴾ دوایی فەرموویەتی: ﴿وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي﴾و نەیفەرمووە: (**فَادْخُلِي جَنَّتِي**)، بۆیە بە (و) گێڕدراوەتەوە بۆ سەر ڕستەی پێشێ، تاکو ئەوە بگەیەنێ کە هەردووك خرانە نێوەکان، چ کە دەخرێتە نێو بەندەکانی خواوە، چ کە دەخرێتە نێو باخ و بەهەشتی خواوە، هەردووکیان چاکەو نیعمەتێکی سەربەخۆن و، پێکەوە پەیوەست نین.

شـایانی باسـە: لـە هەمـوو قورئانـدا تەنیـا لێـرەدا وشـەی: ﴿جَنَّتِي﴾، هاتـوەو بەهەشـت بەتـاك، پاڵدراوەتـە لای خـوای بـەرزی مـەزن.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ، کـە بـە هـۆی ئیـمان و تاعـەت و بەندایەتییـەوە بـۆ خـواو، بەهـۆی پابەندیـی بـە شـەریعەتی خـواوە، دەبنـە خـاوەن کەسـایەتییەکی ئارامگرتـوو، هێمـن، دامـەزراو، ئۆقـرە گرتـوو، ئۆخـژن بـۆ هاتـوو، دڵنیـا، بەرچـاو ڕوون، هەمـوو ئـەو واتایانـەش وشـەی: ﴿ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ﴾ دەیانگرێتـەوە.

خـوا بـە بەزەیـی و چاکـەی خـۆی ڕۆژ بـەڕۆژ ئیمانمـان کامڵـترو دامەزراوتـر بـکات، بەهـۆی باشـترو زیاتـر قوڵبوونـەوەوە بـە قورئانـداو، کارلێککـردن لەگـەڵ قورئانـداو،

بەهـۆی زیاتـر تێگەیشـتن و پێگەیشـتن بەهـۆی قورئانـەوە، بێگومـان خـوا ﷻ ئـەم کۆتـا فەرمایشـتەی خـۆی نـاردوە، تاکـو مرۆڤـەکان بەهۆیـەوە تێروتەواویـی وەدەسـت بێنـن، نەلەخشـاویی وەدەسـت بێنـن، ئۆقرەیـی و سرەوتـن وەدەسـت بێنـن، خـوا لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە باشـترین بەهـرە لـە فەرمایشـتی خـواوە وەردەگـرن، لـە ژیانـی تاکییـان داو، لـە ژیانـی خێزانییـان و، لـە ژیانـی کۆمەڵایەتییانـداو، لـە ژیانـی سیاسـییان دا.

خـوا لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە بـە شـوێن پێـی پێغەمبـەری خاتەمـدا ﷺ، بـە دوای قورئـان دەکـەون و، بـە پێـی ڕێبازەکـەی وی لەگـەڵ کتێبـی خـوا و کۆتـا فەرمایشـتی خـوادا، مامەڵـە دەکـەن.

لێرەشـدا کۆتایـی بـە ڕوونکردنـەوەی مانـاو مەبەسـتەکانی سی (٣٠) ئایەتـە بـە پێزەکانـی سـووڕەتی (الفجـر)، دێیـن. دوای ئـەوەی (کورتـە باسـێك لـە بـارەی بەهەشـتەوە) دەکەیـن، وەك چـۆن کورتـە باسـێکمان بـۆ بـاسی دۆزەخ تەرخانکـرد.

## کورتە باسێک دەربارەی
## بەهەشت و ئەو نازو نیعمەتانەی تێیدان بۆ بەهەشتییان[1]

بەڕێـــزان!

خـوا پشـتیوان بـێ لـە بیسـت و پێنـج (٢٥) بڕگـەدا، باسـی بەهەشـت دەکەیـن و ئـەو بیسـت و پێنـج (٢٥) بڕگەیەش هەمـووی لەبەر ڕۆشـنایی قورئانـدا دەخەینەوەڕوو، جاروبارێکیـش ئاماژەیـەك دەکەیـن بـە هەندێـك لـە فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ:

**بڕگـەی یەکـەم:** بەهەشـت هەتـا بڵێـی فراوانـەو، پێکهاتـە سەرەکییەکانیشـی بریتیـن لـە: باخـە چڕوپـڕەکان، ڕووبـارو جۆگـەو جۆبـارە ڕۆیشـتووەکان، کۆشـك و تـەلارە بـەرزەکان.

ئەگـەر تەماشـای چەنـد ئایەتێـك بکەیـن، ئـەوەی گوتمـان: هـەم فراوانیـی بەهەشـت، تاکـو ئەوپـەڕی فراوانیـی، هـەم پێکهاتـە سەرەکییەکانیشـی، زۆر بەڕوونیی دیـارە:

**یەکەم:** یەکەمین ئایەت کە لەوبارەوە دەیهێنین، ئایەتی ژمارە (٢١)ە، لە سووڕەتی (الحدید) کە خوا دەفەرموێ: ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢١﴾﴾، واتە: پێشبڕکە بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوەو، باخێك (یان بەهەشتێك) کە پانایییەکەی بە ئەندازەی پانایی ئاسمان و زەوییە، بۆ

---

(١) ئـەم کورتـە باسـە بـە گوشراویـی و پوختەکراویـی لە کتێبی هەشـتەمی مەوسـووعەی (الإسـلام کـما يتجـلَّى في کتـاب اللـه) وەردەگیـرێن، بـە ناوونیشـانی: (الإيمـان بِاليَـوْمِ الآخِـر، وبَحْـثٌ مُخْتَـصَرٌ حَـوْلَ القَـدَر)، کـە لاپـەڕەکانی: (٢٠١ - ٢٨٣)ی گرتۆتـەوە. بڕوانـە: الطبعـة الثانيـة/ ٢٠١٨م.

ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرانی هێناوە، ئامادەکراوە، ئا ئەوەش بەخششی خوایە، دەیدا بەهەر کەسێك بیەوێ و، خوا خاوەنی بەخششی مەزنە.

**دووەم:** لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣﴾، واتە: خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوەو، باخێك (یان بەهەشتێك) کە پانییەکەی بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە، بۆ پارێزکاران دانراوە.

**سێیەم:** لە سووڕەتی (الزمر)یشدا، خوا دەفەرموێ: ﴿لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ مَّبۡنِيَّةٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ ٱلۡمِيعَادَ ٢٠﴾. واتە: بەڵام ئەوانەی پارێزیان لە پەروەردگاریان کردوە، ژووری بەرزیان هەن لە سەروویانەوە ژووری بەرز هەن (باڵەخانەن) دروستکراون ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، ئەوە بەڵێنی خوایە، بەدڵنیایی خوا بەڵێن زایەناکات.

ئەم سێ ئایەتە موبارەکە، ئەوەی گوتمان و کردوومانە بە ناوونیشان بۆ ئەم بڕگەیە، زۆر بە ڕوونیی تێیدا دیارە:

**١)** بە نسبەت فراوانیی بەهەشتەوە، تاکو ئەوپەڕی فراوانیی، کە لە خەیاڵ و عەقڵ و ئەندێشەدا جێی دەبێتەوە، ئایەتی ژمارە (٢١) لە سووڕەتی (**الحدید**)و، ئایەتی ژمارە (١٣٣) لە سووڕەتی (**آل عمران**) دەیگەیەنن، کە خوای پەروەردگار تێیان دا ڕوونی دەکاتەوە: پانایی بەهەشت[1]، بە ئەندازەی پانایی ئاسمانەکان و زەوییە، هی هەردووکیان، بۆیەش پانییەکەی باسکراوە، چونکە عادەت وایە پانایی شتێك لە درێژایی کەمتر بێ، خوای پەروەردگاریش بەپێی عەقڵی ئێمە، ئێمە دەدوێنێ، ئنجا ئەگەر پاناییەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوی بێ، دەبێ درێژییەکەی چەند بێ؟!

---

(١) (عَـرْض وعُـرض)، پانیـی ئەوەیـە کـە لـە بەرانبـەر (طول)دایـە، واتـە: درێژیـی، وەك لـە (مُخْتـار الصِّحـاح)و فەرهەنگەکانـی زمانـدا هاتوە.

**٢)-** بە نسبەت پێکهاتە بنەڕەتییەکانی بەهەشتەوە، کە بریتین لە: باخ و گوڵ و گوڵزاری چڕوپڕ، ڕووبارو کانیی و سەرچاوەی لەبەر ڕۆیشتوو، کۆشکە بەرزو بڵندەکان، بەڵگەمان لەسەری ئەوەیە:

**أ- پێکهاتەی یەکەم:** خوا ﷻ هەر باسی بەهەشت بکات، باسی باخ (**جَنَّة**) باسی دەکات: ﴿ جَنَّٰتٌ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿١١﴾ ﴾**البروج**، واتە: چەند باخێك ڕووبارەکانیان بەژێردا دەڕۆن، (**جَنَّة**)یش بریتیە لە باخ و بێستانێك، کە چڕوپڕو، لێك ئاڵاو بێ، سێبەرەکانی داکەوتبن، بۆیەش باخ پێی دەگوترێ: (**جَنَّة**)، چونکە ژێر خۆی دەشارێتەوە لەبەر چڕیی و پڕیی دارو درەختەکانی، وەك لە سووڕەتی (**النبأ**)یشدا لە ئایەتی ژمارە (١٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا ﴿١٦﴾ ﴾ باخە چڕوپڕ و لێکئاڵاوەکان.

**ب- پێکهاتەی دووەم:** ﴿ ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾یش کۆی (**نَهَر**)ە، کە بە مانای ڕووبار دێ، ڕووباری گەورە، هەروەها بە مانای شاجۆگەو جۆگەلەش دێ.

**ج- پێکهاتەی سێیەم:** کۆشکە بەرزەکانن، ئەمیش لە قورئاندا لە زۆر شوێندا باسکراوە، بۆ وێنە:

**١-** لە ئایەتی ژمارە (٢٠)ی سووڕەتی (الزمر)دا، کە پێشتر خوێندمانەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ ﴾ واتە: بۆ ئەوان ژووری بەرز هەن، لە سەرووی ئەوانەوە ژووری بەرزی دیکە هەن، لە کوردیدا پێی دەڵێن: باڵەخانەو کۆشك، خانووی چەند قات.

**٢-** هەروەها لە سووڕەتی (الفرقان)، ئایەتی (٧٥)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ ﴿٧٥﴾ ﴾، (ٱلۡغُرۡفَةَ) یانی: کۆشکی بەرز.

**٣-** لە سووڕەتی (العنكبوت)، ئایەتی (٥٨)دا، دەفەرموێ: ﴿ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا ﴾، کە کۆی (**غُرفة**)یەو بە (**مَنازل رفيعة**) ماناکراوە.

٤- لە سووڕەتی (الفرقان)، ئایەتی ژمارە (١٠)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًا ﴾ کە کۆی (قَصْرٌ)ە، یانی: کۆشك و باڵەخانە.

٥- لە سووڕەتی (التوبة) ئایەتی (٧٢)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّٰتِ عَدْنٍ ﴾.

هەروەها سووڕەتی (الصف)، ئایەتی ژمارە (١٢)ی بەهەمان شێوە: ﴿ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّٰتِ عَدْنٍ ﴾، واتە: لە نشینگە پەسندەکان دا لە باخە هەمیشەییەکان دا.

لە فەرهەنگەکانی زماندا هاتوە: (**الغُرْفَةُ: وَجَمْعُهَا غُرُفات، وَغُرَفْ، هِيَ العُلِّيَّة، المَنْزِلُ الرَّفِيعُ العَالِيَ**)[1]، واتە: بریتیە لە خانوویەکی بەرزو بڵند، واتە: کۆشك، باڵەخانە.

ئەم سێ پێکهاتەیە هەرسێکیان، واتە: ١- باخ و چڕ و پڕەکان. ٢- ڕووبارەکان. ٣- کۆشکە بەرزو بڵندەکان، لە هەردوو ئایەتەکانی: (٥٤ و ٥٥)ی سووڕەتی (القَمَر)دا هاتوون، کە کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی پارێزکاران لە نێو باخ و ڕووباراندان، لە نشینگەیەکی ئەوپەڕی پەسند، لە لای حوکمڕانی توانادار (کە خوای پەروەردگارە).

لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە، کە بەهەشت هەشت (٨) دەرگای هەن، دەفەرمویٚ: {**فِي الْجَنَّةِ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابٍ، فِيهَا بَابٌ يُسَمَّى الرَّيَّانَ، لَا يَدْخُلُهُ إِلَّا الصَّائِمُونَ**} (**أخرجه البخاري: ٣٠٨٤**)، واتە: بەهەشت هەشت دەروازەی هەن، دەرگایەکی تێدایە پێی دەگوترێ: (**الريان**) تەنیا ڕۆژووەوانان (ئەوانەی زیاتر بەڕۆژووبوون) لەو دەرگایەوە دەچنە ژووری.

---

(١) المعجم الوسيط، ص ٦٥٠.

دۆزەخ حـەوت دەرگای هـەن، وەك لـە دەرسـی پێشـوودا باسـمان کـرد، بـەڵام بەهەشــت هەشــت دەرگای هــەن.

**بڕگەی دووەم:** میوەکان (**فواكه**) خواردنی سەرەکیی بەهەشتییەکانن

خـوا ﷻ لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا باسـی میـوەی کـردوە، کـە لـە بەهەشـتدا هەیـە، هەروەهـا جۆرەکانـی میـوە، چونکـە میـوە کەسـێك دەیخـوات کـە برسـی نەبێ، بـە زۆریـی وایـە میـوە لەسـەر تێریـی دەخـورێ و بـۆ خۆشـیی دەخـورێ، تەنیا بـۆ چێـژ وەرگرتـن دەخـورێ، بـا سـەرنجی هەندێـك لـە ئایەتـەکان بدەیـن:

١- لە سوورەتی (الزخرف) لە ئایەتەکانی: (٧٢ - ٧٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾، واتە: ئەو بەهەشتەی ئێوە بە میراتتان گرتوە، بەهۆی ئەوەوەغ دەتانکرد، بۆ ئێوە لەوێدا میوەی زۆر هەیە، لێی دەخۆن.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (یس)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، واتە: هاوەڵانی بەهەشت ئەمڕۆ سەرقاڵی نازو نیعمەت و خۆشیی و لەززەت وەرگرتنن، خۆیان و هاوسەرانیان لە سێبەرەکانی بەهەشتدا (لە سێبەرەکانی دارو درەخی بەهەشتدا) لەسەر تەختان پاڵیانداوەتەوە، میوە لەوێدا بۆ ئەوان هەیەو هەرشتێك داوای بکەن (هەیە).

٣- هەروەها لە سووڕەتی (الرحمن)دا، دەفەرموێ: ﴿ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ ﴾. واتە: لە هەردووکیان دا هەیە، دوو جووت میوە.

٤- لە سووڕەتی (الرحمن)دا، دیسان دەفەرموێ: ﴿ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ ﴾. واتە: لە هەردووکیان دا میوەو خورماو هەنار هەیە.

٥- لە سووڕەتی (**الواقعة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: هەر میوەیەك لەوەی تێیدا هەڵدەبژێرن.

هەروەها: ﴿ وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ٣٢ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ٣٣ ﴾. واتە: میوەی زۆریش (هەیە). نەبڕاوەو نەڕێلێگیراوە.

٦- لە سووڕەتی (**الحاقة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ٢٢ قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ٢٣ ﴾، (**قُطُوفْ**) کۆی (**قِطْفَ**)ە، چنراو، واتە: لە باخێکی بەرزدا. میوەو چنراوەکانی نیزیکن.

٧- لە سووڕەتی (**الإنسان**)یش دا دەفەرموێ: ﴿ وَدَانِيَةً عَلَيۡهِمۡ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتۡ قُطُوفُهَا تَذۡلِيلٗا ١٤ ﴾. واتە: سێبەرەکانیان لێیانەوە نیزیکن و، میوە چنراوەکانیشی ملکەچ کراون.

٨- لە سووڕەتی (محمد)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ ١٥ ﴾ واتە: هەموو جۆرە میوەکانی بۆ وان تێدان و لێبوردنێك لە پەروەردگاریانەوە.

ئنجا میوە کە خواردنی سەرەکیی بەهەشتییەکانە لە بەهەشت دا، خوا بە هەشت سیفەت وەسفی کردوە:

١- ئەو میوانەی لە بەهەشتدا هەن، شێوەی میوەکانی دنیا دەکەن، وەك لە سووڕەتی (**البقرة**) ئایەتی (٢٥)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا ٢٥ ﴾، واتە: میوەیان بۆ هێنرا، وێکچوویە، واتە: لە میوەکانی دنیا دەچن، چونکە مرۆڤ سرووشتی وایە لە شتێك دەسڵەمێتەوە کەپێی ئاشنا نەبێ، بەڵام بێگومان میوەکانی بەهەشت کە وەك میوەکانی دنیا دەچن، مانای وانیە وەك یەکن، وەك ئیبنو عەبباس ﵄، قسەیەکی هەیە دەڵێ: (**لَيْسَ فِي الجَنَّةِ شَيءٌ مِمَّا فِي الدُّنيا إلاَّ الأَسْمَاء**)، (**أخرجه الضياء المقدسي: ٦، وغيره، وصحَّحه الألباني في «صَحيح الجامع»: ٥٠١٠**)، واتە: لەوەی لە بەهەشتدا هەیە، لە چاو ئەوەی لە دنیادا هەیە، تەنیا لەناودا یەکن، واتە: شێوەو ناویان یەکە، بەڵام جیاوازیی نێوەڕۆکیان ئاسمان و ڕێسمانە.

٢- میوەکانی بەهەشت زۆرن و، لە هەموو کاتێکدا چنگ دەکەون: ﴿ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ ٧٣ ﴾الزخرف، ﴿ وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ٣٢ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ٣٣ ﴾ **الواقعة**.

**٣و٤)** میوەکانی بەهەشت لە هەموو کاتاندا هەن و، لە هەموو حاڵانیشدا چنگ دەکەون، وەك میوەی دنیا نین، بە پێی کەشەکانی ساڵ هەبن، ئنجا جاری وایە میوە هەیە، بەڵام ئەو مرۆڤە دەستی ناکەوێ، میوەکانی هەمیشە هەن و، هەمیشەش بەردەستن بۆ بەهەشتییان، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ۝٣٢ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ۝٣٣﴾**الواقعة**، واتە: میوەی زۆریش، نە بڕدراوەو نە قەدەغەکراویشە.

**٥-** بەهەشتییەکان بەویست و ئارەزووی خۆیان لێی هەڵدەبژێرن، وەك لە سووڕەتی **(الواقعة)** لە ئایەتی (٢٠)دا دەفەرموێ: ﴿وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ۝٢٠﴾، میوە لەوەی خۆیان گوڵبژێری دەکەن، هەڵیدەبژێرن.

**٦-** بە ئاسانیی دەستیان دەگاتێ: ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ۝٢٣﴾**الحاقة**، چنراوەکان (ی باخەکانی بەهەشت) نیزیکن، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ۝٥٤﴾الرحمن، واتە: ئەوەی لە دووباخەکان دەچنرێ و لێ دەکرێتەوە، نیزیکەو بە ئاسانیی دەستیان دەیگاتێ.

**٧-** لە هەموو جۆرە میوەکان دوو جووت هەن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ زَوۡجَانِ ۝٥٢﴾الرحمن، لەو بەهەشتەدا هەیە، لەو باخەدا، لە هەر میوەیەك جووتێك.

**٨-** هەموو جۆرە میوەکان لە بەهەشتدا هەن: ﴿يَدۡعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ۝٥٥﴾الدخان، واتە: لە هەموو جۆرە میوەیەك لێی داوا دەکەن، زۆر دڵنیاو هێمنیشن، ئەو میوانەش کە لە بەهەشتدا هەن و، خوای پەروەردگار باسیکردوون، بەپێی زانیاریی بەندە، چوارن:

**١: التَّمْر** (خورما).

**٢: العِنَبْ** (ترێ).

**٣: مُواز** (مۆز).

**٤: الرُّمَّان** (هەنار).

وەك خـوا بەنسـبـەت خورمـاو هەنـارەوە فەرموويـەتی: ﴿ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ ﴾. بەنسـبەت ترێوەش، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ ﴾.

بـە نسـبەت مۆزیشـەوە فەرموويـەتی: ﴿ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتـە: مـۆزی ڕیزكـراو (مـۆزەكان كـە لەسـەر يـەك ڕيـز بـوون).

**بڕگەی سێیەم:** جگە لە میوە، لە خواردنی بەهەشتییەكان گۆشتە.

خـوای میهرەبـان لـە زۆر جێیـان دا باسـی گۆشـتی كـردوە بـۆ بەهەشـتییان، بـۆ نموونـە:

**أ-** لە (**الطور**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾**الطور**، واتە: پێماندان لە میوەو لە گۆشتێك كە خۆیان ئارەزووی دەكەن.

**ب-** هەروەها لە سوورەتی (**الواقعة**)دا هاتوە: ﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ گۆشتی باڵندەش لەوەی ئارەزووی دەكەن.

لـە سـوورەتی (**الواقعـة**)دا دەفەرمـوێ: گۆشـتی باڵنـدەو پـەڕەوەر، بـەڵام لـە سـوورەتی (**الطـور**)دا بەگشـتیی باسـی گۆشـتی كـردوە، تاكـو گۆشـتی باڵنـدەو جگـە لـە باڵنـدەش بگرێتـەوە.

**بڕگـەی چـوارەم:** خواردنـەوەی بەهەشـتییەكان لـە بەهەشـتدا، هەمـوو خواردنـەوە بـە چێژەكانـن بـە تایبـەت لـە نێوانـدا: ئـاوو شـیرو شـەڕاب و هەنگویـن.

خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (محمـد)دا ئـەو چـوارەی پێكـەوە باسـكردوون، لـە ئایەتـی ژمـارە (١٥)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ ﴾، واتـە: وێنـەی ئـەو بەهەشـتەی بەڵێنـدراوە بـە پارێـزكاران، ڕووبارەكانـی

ئاوی بۆن نەکردووی تێدان و، ڕووبارەکانی شیری تام نەگۆڕاوو، ڕووبارەکانی مەیی کە هەر چێژە بۆ خۆرەوانی (ئازارو سەرئێشەی نیە) و، ڕووبارەکانی هەنگوینی پاڵاوتە، هەروەها بۆ ئەوان هەیە، لەهەموو جۆرە میوەکان و لێبوردنێك لە پەروەردگاریانەوە...

خوای بەخشەر باسی ئەو چوار جۆرە خواردنەوەیە دەکات: ئاوو، شیرو شەراب و هەنگوین، بەڵام واپێدەچێ خواردنەوەی بنەڕەتیی بەهەشتییەکان بریتی بێ لە شەراب، خوا ﷻ بە سێزدە (١٣) وەسفان باسی شەرابەکەی بەهەشت دەکات:

**١/** ئەو شەرابە لاوانی تازە پێگەیشتوو دەیگێڕن، کە لەو تەمەنەدا دەمێننەوەو خوا بەس بۆ خزمەتی بەهەشتییان دروستیکردوون، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ ﴾**الواقعة**.

**٢/** ئەو شەرابە لە دەفری گەورەدایە، کە خوای میهرەبان بە (**أَباريق**) و (**آنية**)، ناوی دەبا، (**أَباريق**) کۆی (**إبريق**)ەو (**آنية**)ش کۆی (**إناء**) ەو (**أواني**)یش کۆی کۆیە، (**إناء**)، یانی: گۆزە، شەربە، سوڕاحیی، کە بۆیان لە بەرداخ دەکرێ، ئەمە لە ئایەتی (١٨)ی سووڕەتی (**الواقعة**) و، ئایەتی (١٥)ی سووڕەتی (الإنسان)دا، خوای بەخشەر باسی کردوە.

**٣/** ئەو شەرابە لە ڕووبارو کانیی و سەرچاوەیەکی بەرچاو، هەڵدەهێنجرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴾ ئەمە لە ئایەتی ژمارە (١٨)ی سووڕەتی (**الواقعة**)و، لە ئایەتی (٤٥)ی سووڕەتی (**الصَّافات**)دا هاتوە، واتە: پەرداخێك، کووپێك لە کانیی و سەرچاوەیەکی بەرچاو، یاخود: ئاو لەبەر ڕۆیشتوو وەردەگیرێ.

**٤/** شەرابی بەهەشت هیچ ئازارێکی تێدانیەو، هیچ زیانێکی تێدانیە، نە بۆ جەستە، نە بۆ عەقڵ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾الصافات.

هەروەها لە سووڕەتی (**الواقعة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ کەواتە: سەرئێشە و سەرخۆش بوون و عەقڵ لەلا نەمان، بەهۆی شەرابی بەهەشتەوە لە مرۆڤەکان دا پەیدانابێ.

**٥/** ئەو شەڕابە زۆر سپییەو زۆریش بەچێژە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە، وەك خوا لە سوورەتی (الصافات)دا، دەفەرمووێ: ﴿ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾، سپییە و زۆریش بە چێژە، بۆ خۆرەوانی.

**٦/** ئەو شەڕابە (**كافور**) یاخود (**زَنْجَبيل**)، یاخود (**تَسْنيم**)ی لەگەڵ تێكەڵ دەكرێ، وەك خوا دەفەرمووێ:

أ- ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴾**الإنسان**،

**ب-** هەروەها هەر لە سوورەتی (**الإنسان**) ئایەتی ژمارە (٧)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴾، (**مِزاج**)، واتە: ئەوەی لەگەڵی دا ئاوێتە دەكرێ، جارێك (كافور)ی لەگەڵ دا ئاوێتە دەكرێ و، جارێك (زنجبيل).

**ج-** هەروەها خوا لە سوورەتی (**المطففين**) ئایەتەكانی: (٢٧ - ٢٨)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئەوەی لەگەڵی تێكەڵ دەكرێ لە (**تسنيم**)ە، كە سەرچاوەیەكە زۆر نیزیكخراوان (لە خوا) (بەبێ تێكەڵكران) لێی دەخۆنەوە.

**٧/** شەڕابی بەهەشت ساغ و سافە، ئەو دەفرانەش كە تێیان كراوە، بەستراون، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾، **المطففين**، واتە: پێیان دەنۆشێنرێ لە شیلەیەكی دەم بەستراو، كە بە میسك بەستراوە، با هەر لەوەدا ئەوانەی پێشبڕكە دەكەن، پێشبڕكە بكەن.

(**رَحيق**) لە هەر شتێك بریتیە لە شیلەو پوختەكەی، كە هیچی دیكەی لەگەڵ تێكەڵ نەكرابێ، وەك فەرهەنگەكانی زمان دەڵێن، (**مَختوم**)یش واتە: بەستراو.

**٨/** خەڵكی بەهەشت بە كەیفی خۆیان مامەڵە دەكەن لەگەڵ كانیی و سەرچاوەكانی شەڕابی بەهەشت داو، بۆ كوێیان بوێ بۆ وێی دەبەن: ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ ﴾الإنسان،

واتە: چاکەکاران لە پێکێك دەخۆنەوە کافووری لەگەڵ تێکەڵ کراوە، سەرچاوەیەکە بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوە، بۆ هەر شوێنێکیشیان بوێ، ئاوەکەی ڕادەکێشن.

٩/ ئەو سەرچاوەیەی شەڕابی بەهەشتییانی لێ هەڵدەقوڵێ، پێی دەگوترێ: (سَلْسَبِيل): ﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ﴾، دیارە (سَلْسَبِيل) بریتیە لە ناو بۆ خواردنەوەیەکی شیرینی بەئاسانیی و خێرایی لە گەروو چووە خوار، کە گیرو تفت و تاڵ و ناخۆش نەبێ.

١٠/ قاپ و قاچاغ و دەفرەکان کە ئەو شەڕابەیان پێ دەگێڕدرێ، لە شێوەی شووشەدان و لە سپێتیی زیودا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ ﴾الإنسان.

١١/ ئەو گەنج و لاوانەی ئەو شەڕابە دەگێڕن، بەسەر بەهەشتییانەوە، ئەندازەگیریی دەکەن، هەر کەسە بە ئەندازەی خۆی، نە زیاد، نە کەم، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَوَارِيرَا مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴾الإنسان: ١٦، واتە: ئەندازەگیرییان کردوە بە ئەندازەگیرییەکی ڕێك.

١٢)- بەهەشتییەکان کە شەڕابی بەهەشت دەخۆنەوە، جاری وایە لەوێدا پێکی شەڕاب لە یەکدی وەردەگرن، وەك خۆشیی و گاڵتەو سوعبەت، بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەکیان لێ دەربچێ، پووچ و بێ واتاو ناڕێك بێ، وەك خوا لە سووڕەتی (الطور)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَتَنَازَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: لەوێدا پێك لە دەستی یەکدی دەڕفێنن و وەردەگرن، بەڵام هیچ قسەیەکی پووچ و گوناهبارکەری تێدا نیە.

١٣/ نایابترین شەڕاب و خواردنەوەی بەهەشت، بریتیە لەو خواردنەوە پاك و پاککەرەوەیەی، لەلایەن پەروەردگاریانەوە پێیان دەدرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴾الإنسان: ٢١.

واتە: پەروەردگاریشیان خواردنەوەیەکی پاك و پاککەرەوەی پێ نۆشکردن[١].

---

(١) (المِصبَاحُ المُنير) لەلاپەڕە (١٩٦)دا دەڵێ: (الطَّهُور في اللُّغَةِ: الطَّاهِرُ والمُطَهِّرُ)، (طَهور): پاك و پاك کەرەوەیە.

**بڕگەی پێنجەم:** بەهەشتییەکان لە باشترین جۆرە پۆشاك دەپۆشن، بەجوانترین خشڵ دەڕازێنەوە.

ئەمیش لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

١- خوا لە سوورەتی (**الإنسان**)دا دەفەرموێ: ﴿ عَٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: پۆشاکی ئاوریشمی تەنکی سەوزو ئەستوور (ی سەوز)یان لەسەرەوەیەو، بەبازنەی زێڕ دەڕازێنرێنەوەو، پەروەردگاریشیان خواردنەوەیەکی پاك و پاككەرەوەی پێدان.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**فاطر**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾ ﴾، چەند باخێکی هەمیشەیی دەیانچنەتێ، لەوێدا دەڕازێنرێنەوە بە بازنی زێڕو گەوهەرو، پۆشاکەکەشیان لەوێدا ئاوریشمە.

**بڕگەی شەشەم:** جێگاو ڕێگاو خانووبەرەی بەهەشتییەکان، بریتین لە باڵەخانەکان و کۆشکە بەرزەکان، کە بە باشترین کەل و پەل تەجهیز کراون، ئەو کەلوپەلانەی پێویستیانن، وەك: تەخت و، قاپ و قاچاغ و سەرجەم ئەو شتانەی بەکاریان دێنن:

خوا لە زۆر شوێنی قورئان دا باسی ئەوەی کردوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**الغاشية**)دا دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ ﴾.

جێی مەبەستمان ئەوەیە کە دەفەرموێ:

١- ﴿ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴾ تەختە بەرزەکانی تێدان.

٢- ﴿ وَأَكۡوَابٞ مَّوۡضُوعَةٞ ﴾، پەرداخە دانراوەکانیش.

٣- ﴿ وَنَمَارِقُ مَصۡفُوفَةٞ ١٥ ﴾ باڵنجە ڕیزاوەکانیش.

٤- ﴿ وَزَرَابِيُّ مَبۡثُوثَةٌ ﴾، فەرش و بەڕە بڵاو کراوەکانیش.

**بڕگەی حەوتەم:** خزمەتکرانیان لەلایەن گەنجانی تازە پێگەیشتووەوە: بەهەشتییەکان گەنجانی کەم تەمەن کەبە: ﴿ غِلۡمَانٞ ﴾ و ﴿ وِلۡدَٰنٞ ﴾ ناویان هێنراوە، خزمەتیان دەکەن، ﴿ غِلۡمَانٞ ﴾، کۆی (**غُلام**)ەو ﴿ وِلۡدَٰنٞ ﴾یش کۆی (**وَلید**)ە، واتە: گەنجی تازە پێگەیشتوو، بەڵام هەر لەو تەمەنەی تێیدان دەهێڵرێنەوە، وەك خوا دەفەرموێ:

أ- ﴿ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ١٧ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ١٨ ﴾ **الواقعة**، بەسەریانەوە دەگەڕێن لاوانی بەلاویی هێڵدراوە، بە پەرداخ و سوڕاحیی و پێکێکی پڕ لە شەڕابەوە.

ب- هەروەها لە سوورەتی (الإنسان)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيۡتَهُمۡ حَسِبۡتَهُمۡ لُؤۡلُؤٗا مَّنثُورٗا ١٩ ﴾، لاوانی تازە پێگەیشتووی لەو تەمەنەدا هێڵدراوە، بەسەریانەوە دەگەڕێن، ئەگەر بیانبینی وادەزانی گەوهەرو مرواریین بڵاو کراونەوە.

ج- لە سوورەتی (**الطور**)یش ئایەتی (٢٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ كَأَنَّهُمۡ لُؤۡلُؤٞ مَّكۡنُونٞ ٢٤ ﴾، بەسەریانەوە دەگەڕێن لاوانێکی خۆیان (خوا بۆ خزمەتی ئەوان خوڵقاندوونی) وەك گەوهەری شێرراوە [ی نێو قۆزاخەن تۆزو خۆڵیان لێ نەنیشتوە].

**بڕگەی هەشتەم:** بە هەشتییەکان لە ئاسوودەیی دان و، سەرقاڵ نین بە جگە لە چێژو لەزەت وەرگرتن و، ژیانی خۆشیی و بەختەوەرانە:

أ- وەك خوا لە سوورەتی (یس)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ٥٥ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ٥٦ ﴾، واتە: بێگومان ئەمڕۆ هاوەڵانی بەهەشت چێژوەرگرن لە سەرقاڵییدا. خۆیان و هاوسەرانیان لە سێبەران دا لە سەر تەختان شانیان داداوە.

**ب-** لە سووڕەتی (**الواقعة**)ش دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَـٰبِلِينَ ﴿١٦﴾ ﴾، واتە: لەسەر تەختە چنراوەکان (بە زێڕو گەوهەرو مرواریی) ن، پاڵیان داوەتەوە ڕووبەڕووی یەکدیی.

**برگەی نۆیەم:** خەڵکی بەهەشت لە هەرجۆرە خەم و خەفەت و دڵتەنگیی و ناڕەحەتییەك دوورن و، ئەوپەڕی دڵخۆشن، ڕوویان درەشاوەو گەشاوەیە، لە ئەنجامی ئەو خۆشیی و بەختەوەرییەدا کە تێیدان، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

١- ﴿ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ﴿٣٤﴾ ﴾**فاطر**، (بەهەشتییەکان) گوتیان: سوپاس بۆ ئەو خوایەی ناڕەحەتیی و دڵتەنگیی لێ لابردین (کە لە دنیادا هەیانبووە).

٢- لە سووڕەتی (**المطففين**)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: چاکەکاران لە نازو نیعمەت دان، لەسەر تەختان تەماشا دەکەن، لە ڕوویاندا گەشیی و جوانیی نازو نیعمەت دەبینی.

٣- لە سووڕەتی (**الغاشية**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا ڕوانێك زۆر پڕ نازو نیعمەتن، لە هەوڵ و کۆششی خۆیان ڕازیین (کە لە دنیادا بە شێوەیەکی باش هەوڵیانداوە).

٤- لە سووڕەتی (الإنسان)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ ﴾ واتە: خوا لە خراپەو زیانی ئەو ڕۆژە چەپاڵەی دان، گەشیی و دڵخۆشیی پێدان، هەروەها لە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا، خوای کاربەجێ باسی ئەو شادیی و دڵخۆشیی و دووریی لە خەم و پەژارەیەی بەهەشتییانی کردوە.

**برگەی دەیەم:** خەڵکی بەهەشت هەرچی بیانەوێ، بۆ ئەوان لە بەهەشتدا هەیەو، هەرچی داوای بکەن بۆیان هەیەو، هەرچی چاویان چێژی لێ وەربگرێ، بۆیان هەیە:

بـــۆ وێنـــە:

١- لە سووڕەتی (الزخرف) ئایەتی (٧١)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ ﴾، واتە: بەسەریانەوە دەگێڕدرێ، قاپی زێڕین و پەرداخەکانیش، لەوێدا هەیە، هەر شتێك نەفسەکان ئارەزووی بکەن و، چاوەکان لە بینینی چێژوەربگرن و، ئێوە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

٢- لە سووڕەتی (فصلت)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾، بۆ ئێوە هەیە هەرشتێك نەفستان ئارەزووی بکات و هەرشتێك داوای بکەن، ئەوەش میوانداریيە لە لایەن (خوای) لێبوردەی بەبەزەییەوە ﷻ.

**برگـەی یازدەیـەم:** بەهەشـت هیـچ قسـەیەکی ئـازاردەرو بێزارکـەری، وەك قسـەی پـووچ و ناشـیرین و خراپـی لـێ نابیسـترێ و، خەڵکـی بەهەشـت سـەرقاڵی بـە پاکگرتنـی خـواو، ستایشـکردنی خـواو، سـەلام لـە یەکـدی کردنـن:

١- وەك خوا لە سووڕەتی (**الغاشية**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً ﴿١١﴾ ﴾. واتە: ڕووانێك لەو ڕۆژەدا بەنازونیعمەتن. لە هەوڵ و کۆششیان ڕازیین. لە باخێکی بەرزدان، قسەی پووچی تێدا نابیستی.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (**الواقعة**)دا، دەفەرموێ، ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: لەوێدا قسەی پووچ و قسەی گوناحبارکەر نابیستن، جگە لە سەلامی بەردەوام و پەیتا پەیتا.

٣- لە سووڕەتی (**الطور**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ﴾، پێشتریش هێنامان.

٤- لە سووڕەتی (یونس) ئایەتی (١٠)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، واتە:

لەوێدا داواکردنیان، (یاخود: پاڕانەوەیان) هەر بریتیە لە: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ) پاکیی بۆ تۆ ئەی خوایە! سڵاو لە یەکدیی کردنیشیان بریتیە لە سەلام و، کۆتا پاڕانەوەشیان، (یان کۆتا داواکردنیشیان ئەوەیە کە دەڵێن:) ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

**بڕگـەی دوازدەیـەم:** جـەوی بەهەشـت و کـەش و هـەوای کـە بەهەشـتییەکان تێیـدان، پلـەی گەرمییەکـەی هاوسـەنگە، نـە گەرمـەو نـە سـاردە.

ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین، زۆر بەڕوونیی ئەمە دیارە، بۆ وێنە:

١- پەروەردگار لە سووڕەتی (الإنسان)، لە ئایەتی (١٣)دا، دەفەرموێ: ﴿ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴾، واتە: لەسەر تەختان پاڵیان داوەتەوە (شانیان داداوە) نەخۆری تێدا دەبینن، نە سەرماو زوقم، (**زَمْهَرِير**) بریتیە لە سەرماو زوقمێکی زۆر.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (الرعد) ئایەتی (٣٥)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۖ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ۚ تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ۖ وَّعُقْبَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴾، واتە: وێنەی ئەو بەهەشتەی بەڵێندراوە بە پارێزکاران، ڕووبارەکانیان بە ژێردا دەڕۆن، میوەکانی بەردەوامن و، سێبەرەکەشی بەردەوامە، ئائەوە سەرەنجامی ئەوانەیە کە پارێزیان کردوەو، سەرەنجامی بێبڕوایانیش ئاگرە.

٣- لە فەرمایشتی پێغەمبەری خواش ﷺ داهاتوە، دەفەرموێ: {**إِنَّ هَوَاءَ الجَنَّةِ سَجْسَجٌ**[١] **لا حَرٌّ وَلاَ بَرْدٌ**}[٢].

واتـە: هـەوای بەهەشـت (**سَجْسَجَ**)ە، نەگەرمـەو نەسـاردە، خاوەنی (**صَفوةُ البيان**)، دەڵـێ: (**سجسج**)، بریتیـە لـەو سـێبەرەی درێـژ دەبێتـەوە لـە کاتێـك دا خـۆر هەڵـدێ، هەتـا خـۆر دەردەکـەوێ، واتـە: لـە سـپێدەی بەرەبەیانـەوە تاکـو خـۆر دەردەکەوێ.

---

(١) (سَجسَـجْ)، (إِسـمٌ لِلظِّـلِّ المُمتَـدِّ مَـا بَـيْنَ الفَجْـرِ إِلى طُلُـوْعِ الشَّـمْسِ، وَهـوَ أَطْيَـبُ الأَوقـاتِ وَأَصفَاهَـا، لِـذَا شَـبَّهَ بِـهِ النَّبِـيُّ رِيـحَ الجَنَّـةِ المبـارَكِ الطَّيِّـب) (صفـوة البيـان لمعـاني القـرآن، ص٧٦٩).

(٢) أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٥١٠٣ موقوفاً.

**برگـەی سـێزدەیەم:** خـوا ﷻ بـۆ بەهەشـتییەکان نیزیکەکانیـان کۆدەکاتـەوە: هاوسـەرانیان، وەچەیـان، بـاب و دایکیـان و ئەوانـەی لێیـان نیزیکـن.

ئەمیش لە چەند شوێنێك لە قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (**الطور**)، ئایەتی (٢١)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو وەچەکەشیان، (کوڕان و کچانیان و نەوەکانیان) کە بە ئیمانەوە شوێنیان کەوتوون، پێیان دەگەیەنین (با پلەیان نزمتریش بێ لە بەهەشتدا)و لە کردەوەی وان (باب و دایکیان) کەم ناکەینەوە (تاکو منداڵەکانیان بگەینە پلەی ئەوان) هەر کەسە بارمتەی کردەوەی خۆیەتی.

٢- لە سووڕەتی (الرعد) لە ئایەتی (٢٣)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴾، واتە: چەندان باخی هەمیشەیین دەیانچنەتێ و هەر کەسێك چاك بێ، لە باب و باپیرانیان و هاوسەرانیان و وەچەکانیان، (باب و باپیرانیان، دایك و نەنك و ئەوانەشیان دەگرێتەوە) فریشتەکان لە هەموو دەرگایەکەوە لێیان دەچنە ژوور (سڵاویان لی دەکەن)...

٣- هەروەها لە سووڕەتی (غافر)دا هەمان مەبەست هاتوە، لە ئایەتی (٨)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، [فریشتەکان بۆیان دەپاڕێنەوە بۆ بەهەشتیەکان و دەڵێن]: پەروەردگارمان! بیانخە ئەو باخە هەمیشەییانەوە کە بەڵێنت پێداون، هەر کەسێکیش کە چاکە لە باب و باپیرانیان و هاوسەرانیان و وەچەو منداڵەکانیان، بێگومان هەر تۆی زاڵی کارزان.

بەدڵنیایـی ئـەوەش کـە خەڵـکی بەهەشـت لەگـەڵ خزمـان و نیزیکانیـان دا پێکـەوە کۆببنـەوە، یەکێکـە لـە نیعمەتـە زۆر گرنـگ و گـەورەکان، بگـرە لە دنیـاش دا مـرۆڤ لەگەڵ خـزم و نیزیکانـی نیزیـك بـێ و پێکـەوە بـێ، هـەر وایـە، چ جـای لـە بەهەشـتدا.

لەو بارەوە ئەم گێڕدراوەیە هەیە، هەرچەندە لە ڕووی سەنەدەکەیەوە مشت و مڕێك هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ - ئەگەر سەنەدەکەی ڕاست بێ - دەفەرموێ: {إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ الْجَنَّةَ سَأَلَ عَنْ أَبَوَيْهِ وَزَوْجَتِهِ وَوَلَدِهِ؟ فَيُقَالُ: إِنَّهُم لَمْ يَبْلُغُوا دَرَجَتَكَ، وَعَمَلَكَ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ قَدْ عَمِلْتُ لِي وَلَهُم، فَيُؤْمَرُ بِإِلْحَاقِهِم بِهِ} **(أخرجه الطبراني في الكبير: ١٢٢٤٨، وفي الصغير: ٦٤٠، قال الهيثمي (١١٤/٧): فيه محمد بن عبد الرحمن بن غزوان، وهو ضعيف، والديلمي: ١١٥٣، وضعفه الألباني في «ضعيف الجامع» ٤٨٥)**.

واتە: دوای ئەوەی پیاو دەچێتە بەهەشت، لە باب و دایکی و لە هاوسەری و ڕۆڵەکانی دەپرسێ؟ پێی دەگوترێ: ئەوان نەگەیشتوونە پلەی تۆو کردەوەی تۆ (لە بەهەشتدان بەڵام لە خوارەوەن) ئەویش دەڵێ: پەروەردگارم من بۆ ئەوانیش و بۆ خۆشم کارم کردوە، ئیدی فەرمان دەکرێ ئەوانیش دەگەیەنرێنە لای وی.

**برگەی چواردەیەم:** خەڵکی بەهەشت، خوای بەرز دڵ و دەروونیان لە چڵك و چەپەری ڕق و کینەو حەسەدو غەرەز پاك دەكاتەوە، کە لە دنیادا، لە نێو خۆیاندا بوویانەو، لە بەهەشتدا پێکەوە دەبنە دۆست و خۆشەویستی یەکدی و، پێکەوە دادەنیشن ڕوو بەڕووی یەکدیی، هەرچی مایەی پێکەوە نیگەران بوونیان بووە، بە دڵ و دەروونیانەوە نامێنێ:

ئەوەش لە چەند شوێنێکی قورئان دا هاتوە:

**١-** خوا لە سوورەتی **(الحِجر)** لە ئایەتەکانی: (٤٤ - ٤٧)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾، واتە: بە دڵنیایی پارێزکاران لە نێو باخان و کانیی و سەرچاوان دان، ﴿ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾، پێیان دەگوترێ: بە دڵنیایی و بە سەلامەتیی بچنە نێو ئەو بەهەشتانەوە، ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، هەرچی کینەش هەبووە لە دڵیان دامانڕنیوە، برایانە لەسەر تەختان ڕووبەڕووی یەکدی دانیشتوون.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (**الأعراف**)یشدا هەر هەمان ڕاستیی باس کراوە: ﴿ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردووە، ئێمە لە هیچ کەس داوا ناکەین، مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیە، ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، هەرچی کینە هەبووە لە دڵ و دەروونیان، دامانڕنیوە (دڵیانمان پاك کردوونەوە) ڕووبارەکانیان بەژێردا دەڕۆن.

٣- لە سووڕەتی (الزخرف)یش ئایەتی (٦٧)دا، خوا دەفەرموێ:﴿ الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا ئەوانەی لە دنیادا دۆست و خۆشەویستی یەکدی بوون، هەموویان دەبنە دوژمن، جگە لە پارێزکاران.

پارێزکاران خۆشەویستیی و دۆستایەتییەکەیان لەبەر ئەوەی بۆ خوا بووەو لە پێناوی خوادا بووە، لە بەهەشتیشدا هەر بەردەوام دەبێ.

**برگەی پازدەیەم:** پیاوان کە دەخرێنە بەهەشتەوە، هاوسەردار دەکرێن بە حۆرییەکان، کە خوا ﷻ بە تایبەت لە بەهەشتدا دەیانخوڵقێنی، وێڕای هاوسەرانی دنیا:

مەسەلەی حۆرییەکان و، ئەوە کە پیاوانی بڕوادار خوای کاربەجێ لە بەهەشتدا ئافرەتانێکی تایبەت کە بە (**الحورُ العِين**)، وەسفی کردوون، لە زۆر شوێنی قورئاندا باس کراوە، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (**الطور**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَاكِهِينَ بِمَا ءَاتَاهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَاهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِئِينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ ﴾، شوێنی مەبەستمان ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴾، هاوسەرداریشمانکردن بە ئافرەتانی سپیی چاو گەش و گەورەو جوان.

٢- لە سوورەتی (الرحمن)دا، خوای پەروەردگار ئاوا باسی ئەو ئافرەتانە دەکات، کە تایبەت بۆ پیاوانی بڕوادار لە بەهەشتدا دەیانخولّقێنی، دەفەرموێ: ﴿ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتە: لەو بەهەشتانەدا هەن، ئافرەتانێك کە چاوی خۆیان کورتکردۆتەوە لەسەر مێردیان (یاخود: هەرکەسێك تەماشایان بکات، چاویان لەسەر لانادات، ئەوەندە پێیان سەرسام دەبێ) پێش ئەوان نە مرۆڤ نە جند دەستی نەگەیاندوونێ، بە کام لە چاکەکانی خوا بێبڕوا دەبن، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ؟ ﴿ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴾، هەر دەڵێی مرواریی و مەرجانن، [کە دوو جۆرە بەردی زۆر بە نرخ و جوانن].

٣- هەروەها لە سوورەتی (الصافات)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: لەلایان هەن ئافرەتانێکی نیگای خۆ کورتکەرەوە (یاخود: هەرکەسێك تەماشایان بکات، نیگای لەسەر ئەوان کورت دەکاتەوەو چاوی لانادات) چاوگەش و گەورەو جوانن، ﴿ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴾، وەك هێلکەی شێردراوەن.

بە تایبەتی هێلکەی حوشترمەل کە دەیشارێتەوە، هیچ تۆزو گەردێکی لێ نانیشێ.

خوا ﷻ ئەو ئافرەتانەی بە تایبەت دەیانخولّقێنێ بۆ پیاوانی بڕوادار لە بەهەشتدا، بە کۆمەڵێك وەسفی نایاب وەسفیان دەکات، کە من پازدە (١٥) یانم لێ کەوتوونە بەرچاو:

١- وەسفی یەکەمیان: ﴿ حُورٌ ﴾: (**حور**) کۆی (**حَوراء**)ە، کە بریتیە لە ئافرەتی سپیی و جوان.

٢- وەسفی دووەمیان: ﴿ عِينٌ ﴾، کە کۆی (عَيْنَاءَ)ەو، بریتیە لە ئافرەتی چاو گەش و گەورەو جوان.

٣- وەسفی سێیەمیان: ﴿ قَـٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ ﴾، (طَرْف)، نیگای چاوە، واتە: نیگای خۆ کورتکەرەوە لەسەر هاوسەرەکانیان، یاخود: هەر کەسێك تەماشایان بکات، چاوی خۆییان لەسەر کورت دەکانەوەو چاوی لانادا.

٤- وەسفی چوارەم: ﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ ﴾الرحمن، واتە: پێش ئەو بروادارانەی کە دەیاندرێنێ و دەکرێنە هاوسەریان، نە مرۆڤ دەستی گەیاندوونێ (بە شێوەی لەگەڵ جووتبوون) نە جند.

٥- سیفەتی پێنجەم: ﴿ كَأَمْثَـٰلِ ٱللُّؤْلُوِ ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ ﴾، وێنەی گەوهەری شێردراوەن، واتە: لەو ڕووەوە کە زۆر ساف و جوان و پاك و دەست پێنەگەیشتوون.

٦- وەسفی شەشەم: ﴿ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ ﴾الصافات، دەڵێی هێلکەی شێردراوەن، لەوەدا کە زۆر ساف و جوان و بێگەردن.

٧- وەسفی حەوتەمیان: ﴿ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ ﴾الرحمن، شێوەی یاقووت و مەرجان دەکەن، یاقووت لە سووریێتییداو، مەرجان لە سپێتییدا، ئەوانیش دوو جۆرە بەردی زۆر بە نرخن.

٨- وەسفی هەشتەمیان: ﴿ خَيْرَٰتٌ ﴾الرحمن، سووککراوی (خَيِّرَاتٌ)ە، کە کۆی (خَيِرة)یە، واتە: زۆر چاکن لە ڕووی ڕەوشت و ئاکاری مەعنەوییەوە.

٩- وەسفی نۆیەم: ﴿ حِسَانٌ ﴾، کۆی (حُسنى)یە، ئەویش مێینەی مەجازیی (أَحْسَن)ە، واتە: لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەوەو لە ڕووی جوانییەوە، لەوپەڕی چاکیی و تەواوییدان.

١٠- وەسفی دەیەم: ﴿ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ ﴾ ص، کۆی (تِرْب)ە، واتە: هاوتەمەن لەگەڵ هاوسەرانیان دا.

١١- وەسفی یازدەیەم: (عُرُباً) **الواقعة -٣٧-**، (عُرُب) کۆی (عَرُوب)ە، ئەویش ئەو ژنەیە خۆی لە لای مێردەکەی خۆشەویست دەکات و، چاك هاوسەردارىی دەکات.

**١٢-** وەسفی دوازدەیەم: ﴿وَكَوَاعِبَ﴾النبأ -٢٢-، كۆی (**كاعبة**)یە و ئەو ئافرەتەیە تازە مەمك دەكات و مەمكەكانی شۆڕ نەبوونەوە.

**١٣-** وەسفی سێزدەیەم: ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ٣٥﴾**الواقعة**، ئیمە بە داهێنان دروستمان كردوون، واتە: خوا لە بەهەشتدا لە ڕۆژی دوایی دا دروستیان دەكات بە تایبەت.

**١٤-** وەسفی چواردەیەم: ﴿فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ٣٦﴾**الواقعة**، گێڕاومانن بە كچ، ﴿أَبۡكَارًا﴾، كۆی (**بِكْر**)ە، ئەو ئافرەتەیە وەك خۆی ماوەتەوە، دەستی نەگەیەندراوەتێ و كچێتیی لانەچووە.

**١٥-** وەسفی پازدەیەم: ﴿أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ **البقرة** - ٢٥ -، هاوسەرانێكی پاككراوە، واتە: خوا چ لە ڕووی جەستەییەوە، چ لە ڕووی مەعنەوییەوە، پاك و چاكی كردوون.

**بڕگەی شازدەیەم:** خەڵكی بەهەشت یادی دنیا دەكەنەوەو، باسی ئەوە دەكەن كە لە دنیادا لێیان ڕووی داوە، دۆزەخییەكانیش دەبینن و، لەنێوان بەهەشتییان و دۆزەخییاندا، وتوێژو دیالۆگ و گفتۆگۆ ڕوودەدا:

ئەوەش لە چەند شوێنێكی قورئاندا باسكراوە، بۆ وێنە:

**أ-** لە ئایەتەكانی: (٢٥ - ٢٨)ی سوورەتی (**الطور**)دا، كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ٢٥ قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبۡلُ فِيٓ أَهۡلِنَا مُشۡفِقِينَ ٢٦ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ٢٧ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلُ نَدۡعُوهُۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ٢٨﴾، واتە: هەندێكیان ڕوویان لە هەندێكیان كرد، پرسیاریان لە یەكدی دەكرد، گوتیان: ئێمە پێشتر (لە دنیادا) لە نێو ماڵ و خێزانی خۆماندا، ترس و سام و هەیبەتمان بەرانبەر بە خوا هەبوو، پەرۆشیی خۆمانمان بوو، خواش چاكەی لەگەڵ دا كردین و لە ئازاری گڕەبا چەپاڵەی داین، ئێمە پێشتر لێی دەپاڕاینەوە، بەڕاستیی ئەو زۆر چاكەكاری میهرەبانە.

**ب-** شوێنی دووەم كە وتووێژی نێوان خەڵكی بەهەشت و خەڵكی دۆزەخەو خوای بەرزی مەزن باسی كردوە، لە سوورەتی (الصافات)، دوازدە ئایەتەكانی: (٥٠ - ٦١)دا، خوا ﷻ بە درێژیی باسی كردوە، دەفەرموێ:

﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

واتـە: ئنجـا هەندێكیـان ڕوویـان لـە هەندێكیـان كـرد، پرسـیاریان دەكـرد، بێژەرێـك لـەوان گوتـی: مـن هاونشـینێكم هەبـوو، (كەسـێكی نیزیكـم هەبـوو لـە دنیـادا)، بـە منـی دەگـوت: ئایـا تـۆ لـە بەڕاسـتدانەرانی؟ ئایـا ئێمـە ئەگـەر مردیـن و بووینـەوە خـۆڵ وئێسـكەكان (گۆشـتەكەمان بووبـە خـۆڵ و، پەیكـەری ئێسـكییمان بـوو بـە ئێسـكە پڕتـووكاوەكان) ئایـا ئێمـە (زینـدوو دەكرێینـەوەو) سـزاو پاداشـت دەدرێینـەوە؟ (دوایـی هـەر بـۆ خـۆی ئـەو بێـژەرە) گوتـی: ئایـا ئامـادەن تەماشـا بكـەن! یەكسـەر لەوێـوە ڕوانـی، ئنجـا لـە نێوەڕاسـتی دۆزەخـدا بینـی، پێیگـوت: بـە خـوا خەریـك بـوو منیـش وەك خـۆت بفەوتێنـی! ئەگـەر چاكـەی پـەروەردگارم نەبووایـە، منیـش ئێسـتا لـە ئامـادە كـراوان، دەبـووم، (لـە دۆزەخـدا) ئنجـا ئایـا ئێمـە نامریـن، جگـە لـە مردنەكـەی یەكەمـمان؟ ئایـا ئێمـە سـزاو ئـازار نادرێیـن؟ بەڕاسـتیی ئەمەیـە بردنـەوەی مـەزن، بـا كاركـەران هـەر بـۆ ئـەوە كار بكـەن.

### پوختەی ئەم برگەی شازدەیەمە ئەوەیە:

بـە بەهەشـتییەكان كاتێـك لـە بەهەشـتدا سـەقامگیر دەبـن، یـادی دنیـا دەكەنـەوە، هەمـوو شـتێكیان لەبیـرە، كـە پێكـەوە دادەنیشـن، هـەم لەنێـو خۆیانـدا قسـەو باسـی خۆیـان دەكـەن، هـەم خۆشـیان لەگـەڵ دۆزەخییەكانـدا، ئەوانـەی لەدنیـادا ناسـیویانن، كەسـێك دوكانـی هەبـووە لـە شـوێنێك و ڕەفیقـە دوكانێكـی هەبـووە، كەسـانێك پێكـەوە قوتابیـی بـوون، یـان بەیەكـەوە كارو كەسـابەتێكیان كـردوە، یـان بەیەكـەوە كارمەندبـوون لـە فەرمانگەیـەك، یـان بەشـێوەیەك لـە شـێوەكان خـزم و

نیزیکی بووه، برادەری بووه، بەڵام ئەو لە بەهەشتێ و ئەوان لە دۆزەخن، ئەو کەسەی نیزیکی بووەو لە دۆزەخ دایە، بەهەشتییەکە لەوێڕا دەیدوێنێ!

هەڵبەتە ئێستا کە تەکنولۆژیای مەعلووماتیی بەرەو پێش چووە، بەشەر توانیویەتی ئینتەرنێت دابهێنێ، ئەگەر خەڵکێك لەسەر مانگ بێ یەکێك لێرەوە بە ئاسانیی لەگەڵیاندا قسە دەکات، هەروەها ئەگەر لە کیشوەری ئەمریکاو ئوستڕالیا بن، دەتوانێ بە دەنگ و وێنەوە بیاندوێنێ، بەڵێ ئێستا ئەوە بۆ ئێمە زۆر ئاسان بووە، تێبگەین داخۆ چۆن لە بەهەشتەوە لەگەڵ خەڵکی دۆزەخدا قسە دەکەین؟ چونکە بەهەشت زۆر زۆر فراوانەو دۆزەخیش زۆر زۆر فراوانە، دوو جیهانی زۆر فراوانن، ئەدی چۆن لەوێڕا ئەو دەنگ و قسەکەی دەبیستێ، بگرە بە وێنەو دەنگەوە، بیدوێنێ لەنێوەڕاستی دۆزەخ دا؟ وەڵامی ئەوە ئێستا ئاسانە، هەڵبەتە مرۆڤی ئیماندار بێ ئەوەی ئینتەرنێتیش هەبێ، دەزانێ بۆخوا ئاسانە بەهەشتییەکان ئامرازی وایان بۆ بڕەخسێنێ، لەگەڵ دۆزەخییەکان دا قسە بکەن، بەڵام ئێستا تەکنولۆژیای زانیاریی، بە تایبەت ئینتەرنێت کە بەهۆیەوە خەڵك دەتوانن لە دوورەوە پێکەوە قسە پێکەوە بکەن، بە وێنەو بە دەنگەوە، زۆر ئاسانی کردوە کە لەو ئایەتانە باشتر تێبگەین.

**بڕگەی حەڤدەیەم:** خەڵکی بەهەشت خوای پەروەردگار لێیان ڕازی دەبێ و، ئەوانیش لە خوا ﷻ ڕازی دەبن:

ئەمەش لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (البَیّنة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ۞ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ۞ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، ئەوانە باشترینی دروستکراوانی خوان، پاداشتیان لەلای پەروەردگاریان باخە هەمیشەییەکانن، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بە

هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە بێ کۆتایی، خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازین، ئەوەش بۆ کەسێکە سام و هەیبەتی بەرانبەر پەروەردگاری هەبێ.

٢- لە سووڕەتی (التوبة) ئایەتی (٧٢)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾، واتە: خوا بەڵێنی بە پیاوانی بڕواداران و بە ئافرەتانی بڕوداران داوە، بە باخانێك ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، هەروەها نشینگە بەرزو پەسندو خۆشەکان، لە باخە هەمیشەییەکانداو، ڕەزامەندیی لە خواوە، لە هەموو شتێك گەورەترە، ئا ئەوەیە بردنەوەی مەزن.

٣- لە سووڕەتی (الفجر)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾﴾، واتە: ئەی نەفسی ئۆقرە گرتوو! بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت تۆش (لەو) ڕازی و، پەسندکراویشی (ئەویش لە تۆ ڕازییە) بچۆ نێو بەندەکانمەوەو بچۆ باخ و بەهەشتەکەمەوە.

٤- لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواش ﷺ دێنین: {**عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ** رضي الله عنه، **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ: **إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لِأَهْلِ الْجَنَّةِ، يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لَا نَرْضَى، وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِن ذَلِكَ، قَالُوا: يَا رَبِّ وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلَا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَداً**} **(أخرجه أحمد: ١١٨٥٣، والبخاري: ٦١٨٣، ومسلم: ٢٨٢٩)**.

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا سبحانه وتعالى بە خەڵکی بەهەشت دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! دەڵێن: لە خزمەتداین ئەی پەروەردگارمان بەختەوەرین لە خزمەتتدا، دەفەرموێ: ئایا ڕازیین؟ دەڵێن: ئنجا بۆچی ڕازیی نەبین، ئەوەی پێتداوین بەهیچ کام لە

دروستکراوەکانی خۆتت نەداوە! ئەویش دەفەرمووێ: باشتر لەوەی پێمداون، پێتان دەدەم، دەڵێن: ئەی پەروەردگار! چ شتێك باشترە لەوەی پێتداوین، دەفەرمووێ: ڕەزامەندیی خۆمتان بەسەردا دەڕژێنم، هەرگیز لەمەودوا لێتان تووڕە نابم.

**بڕگەی هەژدەیەم:** خەڵکی بەهەشت خوا تبارك و تعالى سەلامیان لێ دەكات:

وەك لە سوورەتی (یس)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾﴾، واتە: بە دڵنیاییی هاوەڵانی بەهەشت ئەمڕۆ سەرقاڵی لە ززەت وەرگرتن و خۆشیی و ڕابواردنن، خۆیان و هاوسەرانیان لە سێبەراندا لەسەر تەختان پاڵیان داوەتەوە، (شانیانداداوە)، بۆ ئەوان هەموو جۆرەکانی میوە هەن و هەرشتێك داواشی بكەن، هەروەها سەلام كردن، گوتراوێکە لەلایەن پەروەردگاری میهرەبانەوە.

گومانیشی تێدانیە، سڵاو لێکردنی خوا لە خەڵکی بەهەشت لە هەموو نیعمەتەکان بەرزترو چاکترو گەورەترە.

**بڕگەی نۆزدەیەم:** خەڵکی بەهەشت بە دیداری خوای بەرز دەگەن، خوای بێ وێنەو هاوەڵ دەبینن:

وەك لە سوورەتی **(القیامة)**دا هاتوە: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا ڕووانێك زۆر گەش و جوانن، تەماشاكەری پەروەردگاریانن.

هەر لەو بارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ دێنین: **{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ أُنَاسٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ! هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ القِيَامَةِ؟ فَقَالَ: هَلْ تُضَارُّونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ؟ قَالُوا: لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: هَلْ تُضَارُّونَ فِي الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، لَيْسَ دُونَهُ سَحَابٌ؟ قَالُوا: لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} (أخرجه أحمد ١٠٩١٩، والبخاري: ٧٧٣، ومسلم: ٢٩٦٨).**

واتــە: ئەبــوو هوڕەیــڕە ﷺ، دەڵــێ: کۆمەڵێــك کــەس گوتیــان: ئــەی پێغەمبــەری خــوا ! ئایــا لــە ڕۆژی قیامەتــدا پەروەردگارمــان دەبینیــن؟ ئەویــش فەرمــووی: ئایــا زیانتــان پێــدەگات لــە بینینــی خــۆردا، کاتێــك هــەوری لەبــەر نەبــێ؟ گوتیــان: نەخێــر، فەرمــووی: ئایــا زیانتــان پێــدەگات لــە بینینــی مانگــدا، هــەوری لەبــەر نەبــێ، لــە شــەوی بــەدردا؟ گوتیــان: نەخێــر ئــەی پێغەمبــەری خــوا، فەرمــووی: ئێــوەش ڕۆژی قیامەتــدا (بــەو شــێوەیە، وەك چــۆن لــە ڕۆژێــدا خــۆر دەبینــن و لــە شــەوی بــەدردا مانــگ دەبینــن، بــێ ئــەوەی هــەوری لەبــەر بــێ) ئــاوا خــوای بــەرزی مــەزن دەبینــن.

**بڕگـەی بیسـتەم:** خەڵکـی بەهەشـت وێـڕای ئـەوەی هەرچـی بیانـەوێ و ئـارەزووی بکـەن بۆیـان هەیـە، خـوای پـەروەردگار بەردەوامیـش لـە بەخشـش و چاکـەی خـۆی کـە بـێ سـنوورە، بۆیـان زیـاد دەکات:

ئەمیـش لـەو پێنـج ئایەتـەی سـوورەتی (ق)دا زۆر بـە ڕوونیـی خراوەتـەڕوو، خـوا دەفەرموێ: ﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتـە: بەهەشـت نزیکخرایـەوە بـۆ پارێـزکاران لێیـان دوور نیـە ئەمـەش ئەوەیـە کـە بەڵێـن دەدرێ بەهـەر زۆر بـۆلا خـوا گەڕاوەیەکـی پارێـزەر، (کـە خـۆی پاراسـتوە لـە گوناهـو تـاوان و لادان)، کەسـێك کـە سـام و هەیبەتی بەرانبـەر بەخـوای بـە بەزەیـی هەیـە بـە پەنامەکیـی و، بـە دڵێکـی گـەڕاوەوە هاتـوە بـۆ خزمـەت خـوا، بچنـە نێـو بەهەشـتەوە بـە سـەلامەتیی ئائـەوە ڕۆژی هەمیشـە مانەوەیـە، بـۆ ئـەوان لەوێـدا هـەر شـتێك هەیـە کـە بیخـوازن و، زیادەشـمان لـە لایـە.

بەردەوام خوا ﷻ لە چاکەو بەخششی بێ سنووری خۆی، بۆیان زیاد دەکات.

بڕگـەی بیسـت و یەکـەم: خەڵـکی بەهەشـت هەموویـان یـەك پلـە نیـن، بەڵکـو بەرزیـی و نزمییـان لـە بەینـدا هەیـەو، چەنـدان پلـەو پێگـەی جـۆراو جۆریـان هـەن، هـەر کەسـە بەپێـی ئیمانەکـەو پارێزکارییەکـەی، کـە بوویەتـی لـە دنیـادا:

لە زۆر شوێنی قورئاندا، خوا ئەم ڕاستییە مەزنەی خستۆتەڕوو، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٢١)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴾ واتە: سەرنج بدە! چۆن هەندێکیانمان بەسەر هەندێکان دا هەڵبژاردوە.

واتە: هەیانە سامانی زیاترمان داوەتێ، هەیانە جەستەی بەهێزترە، هەیانە جوانترە، هەیانە زانیاریی زیاترە، هەیانە عەقڵی باشترە، خوای پەروەردگار نیعمەتەکانی لە دنیادا بەرزیی نزمیی پێکردوون، بەڵام نەك لەسەر بناغەی ئەوەی کێ زۆری خۆشدەوێ، نیعمەتی زۆری بداتێ و، کێ کەمی خۆشدەوێ، کەمی بداتێ! نەخێر، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴾ مەنزڵگای کۆتاییش پلەکانی تێدا زیاترن و بەرزیی و نزمییشی تێدا زیاترە.

٢- لە سوورەتی (الواقعة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَاثَةً ﴿٧﴾ فَأَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ ﴿٩﴾ وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ ﴿١٠﴾ أُولَٰئِكَ الْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: ئێوە دابەش دەکرێن بۆ سێ پۆڵ (سێ کۆمەڵ):

١)- هاوەڵانی لای ڕاستە (کە بە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە) هاوەڵانی لای ڕاستە چین؟ یانی: مەگەر خوا بۆت باس بکات، ئەگەرنا پێگەکەیان ئەوەندە بەرزە تۆ نازانی.

٢)- هاوەڵانی چەپ، هاوەڵانی لای چەپە چین؟

٣)- کۆمەڵی سێیەم: پێشکەتووەکان، پێشکەوتووەکان، ئا ئەوانە زۆر نیزیکخراوەن لە خوا، لە باخە پڕ نازو نیعمەتەکاندان.

٤)- لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ: {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْد رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُول الله ﷺ: إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ الْغُرَفَ فِي الْجَنَّةِ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الكَوْكَبَ فِي السَّمَاءِ} (أخرجه أحمد: ٢٢٩٢٧، والدارمي: ٢٨٣٠، والبخاري: ٦١٨٨، ومسلم: ٢٨٣٠).

واتە: سەهلی كوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: بێگومان خەڵكی بەهەشت تەماشای كۆشكە بەرزەكان دەكەن لە بەهەشت دا، وەك چۆن ئێوە لە دنیادا تەماشای ئەستێرە دەكەن لە ئاسمان.

وەك چۆن ئێمە تەماشای ئەستێرەیەكی بەرز دەكەین، فڵانە ئەستێرە بە شەوقترە لە فڵان، لە بەهەشتیشدا بەهەشتییەكان ئاوا، هەندێكیان تەماشای شوێنی بەرزی هەندێكیان دەكەن.

**برگەی بیست و دووەم:** پوختەو گوشراوی ئەوەی بەهەشتی پێ وەسف دەكرێ، ئەوەیە كە نازو نیعمەتێكی بەردەوامە، پاداشتێكی مەزنە، موڵك و حوكمڕانییەكی گەورەیە، وەك چییەتی خۆی، تەنیا خوا تبارك و تعالى دەزانێ چۆنە؟ ئەمیش لە زۆر ئایەتان وەردەگیرێ، بۆ وێنە:

١- خوا لە سوورەتی **(السجدة)** ئایەتی (١٧)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، واتە: هیچكەس نازانێ چی بۆ پەنهانكراوە لەوەی پێی دڵخۆش دەبن، وەك پاداشت بۆ ئەوەی كردوویانە.

یانی: هیچكەس نازانێ ئەوەی خوا بۆی پەنهان كردوون لەوەی مایەی شادمانیی و دڵخۆشییانە، لە بەرانبەر كردەوەكانیاندا كە كردوویانن.

٢- لە سوورەتی **(الإنسان)**، ئایەتی (٢٠)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴾، واتە: ئەگەر ئەوێ ببینی، نازو نیعمەتێك و حوكمڕانییەكی زۆر گەورە دەبینی.

٣- لە سوورەتی **(التوبة)**دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: پەروەردگاریان موژدەیان پێدەدات بە بەزەییەك و ڕەزامەندییەك لەلایەن خۆیەوەو، بە باخانێك كە نازو نیعمەتێكی هەمیشەو بەردەوامیان تێدایە. بەهەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە بێ كۆتایی، بێگومان خوا پاداشتی مەزنی لەلایە.

٤- فەرمایشتێکی پێغەمبەریش ﷺ هەیە لە خوای بەرزەوە دەیهێنێ، واتە: فەرموودەکە قودسییەو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیهێنێ بەبێژەی خۆی، بەڵام مانایەکەی هی خوایە:

**{عَـن عَـن أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ قَـالَ اللَّـهُ: أَعْـدَدْتُ لِعِبَـادِي الصَّالِحِـينَ: مَـا لَا عَـيْنٌ رَأَتْ، وَلَا أُذُنٌ سَـمِعَتْ، وَلَا خَطَـرَ عَـلَى قَلْـبِ بَشَرٍ، فَاقْـرَءُوا إِنْ شِـئْتُمْ: فَـلَا تَعْلَـمُ نَفْـسٌ مَـا أُخْفِـيَ لَهُـمْ مِـنْ قُـرَّةِ أَعْيُنٍ} (أخرجـه أحمـد: ٨١٢٨، والبخـاري: ٣٠٧٢، ومسـلم: ٢٨٢٤)**، واتـە: ئەبـوو هورەیـرە رضي الله عنه دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: خـوا فەرموویەتـی: بـۆ بەنـدە چاکەکانـم (بـە نێـرو مـێ وە) شـتێکم ئامـادە کـردوە، کـە نـە هیـچ چاوێـك دیویەتـی، نـە هیـچ گوێیـەك بیسـتوویەتی، نـە بەخەیـاڵ و ئەندێشـەی هیـچ مرۆڤێکـدا هاتـوە، ئەگـەر دەتانـەوێ ئـەوە بخوێننـەوە: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ واتـە: هیـچ کەسـێك نازانـێ ئـەوەی بـۆی پەنهانکـراوە لـەوەی مایـەی دڵخۆشـییەتی، وەك پاداشـت بـۆ ئـەوەی کردوویانـە.

بێگومـان هەرشـتێك هەبـێ، یـان مـرۆڤ خـۆی دەیبینـێ، یـان ئەگـەر خـۆی بەچاو نەیبینـێ بـۆی بـاس دەکـەن و بەگـوێ دەیبیسـتێ، یـان ئەگـەر بۆشـی بـاس نەکـەن، مـرۆڤ دەتوانـێ بیهێنێتـە بـەر خەیاڵـی خـۆی.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ئـەوەی بـۆ بەنـدە چاکەکانـم ئامـادەم کـردوە، نەچـاو بینیویەتـی، نەگوێـش بیسـتوویەتی، نـە بـە خەیاڵـی کەسـیش داهاتـوە.

کەواتـە: ڕاسـتە ئـەوەی دەبێتـە باشـترین پێناسـە بـۆ بەهەشـت، ئەوەیـە کـە: وەك چییەتـی خـۆی، بـەس خـوا دەزانـێ چییـەو چۆنـە؟

بڕگـەی بیسـت و سـێیەم: خەڵکـی بەهەشـت هەرگیـز بـێ تاقـەت و بێـزار نابـن، هەرچەنـدە بەبـێ کۆتایـی تێـدا دەمێننـەوەو، هەرگیـز خۆزگـە ناخـوازن بچنـە دەرێ، چونکـە هیـچ شـتێك لـە بەهەشـت چاکـتر، بەڵکـو وەك ئـەو و وێنـەی ئەویـش نیـە: ئەمیـش لـە چەنـد شـوێنێك لـە قورئـان دا هاتـوە:

**١-** ئەو دوو ئایەتەی سوورەتی **(الكهف)**، کە خوا تێیان دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا ١٠٧ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ١٠٨ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە (بە هەموو ئەوشتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ) و کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، باخەکانی فیردەوسیان بۆ دەکرێتە شوێنی میوانداریی، (یان: ئەوەی بۆ میوان دادەنرێ) تێیان دا هەرماوی هەمیشەیی دەبن، حەز ناکەن بەجێی بهێڵن (حەز ناکەن ئەوێ واز لێ بێنن، بچن بۆ شوێنێکی دیکە).

**٢-** هەر لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ دێنین لە بارەی فیردەوسەوە، کە فیردەوس بەرزترین شوێنی بەهەشتە، دەفەرموێ: **{مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَأَقَامَ الصَّلَاةَ، وَصَامَ رَمَضَانَ، كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، هَاجَرَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَو جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَفَلَا نُنَبِّئُ النَّاسَ بِذَلِكَ؟ قَالَ: إِنَّ فِي الجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ، كُلُّ دَرَجَتَيْنِ مَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الجنَّة} (أخرجه أحمد: ٨٤٥٥، البخاري: ٢٦٣٧، وابن حبان: ٤٦١١).**

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرەکەی بێنێ و، نوێژ بەرپا بکات و، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ، لەسەر خوا پێویستە بیخاتە بەهەشت، (خوا لەسەرخۆی پێویستی کردوە) لە پێناوی خوادا کۆچ بکات، یاخود لەسەر زەمینەکەی خۆی دابنیشێ، کە تێیدا لە دایك بووە، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەو هەواڵە بدەینە خەڵك؟ فەرمووی: بزانن لە بەهەشتدا سەد (١٠٠) پلە هەیە، خوا بۆ تێکۆشەرانی ڕێی خۆی ئامادەی کردوون، لە نێوان هەردوو پلەدا، بە ئەندازەی دووریی نێوان ئاسمان و زەوییە، بۆیە ئەگەر داواتان لە خوا کرد، داوای فیردەوسی لێ بکەن، چونکە نێوەڕاستی بەهەشتەو بەرزترین پلەی بەهەشتەو لە سەرووی فیردەوسەوە، عەرشی (خوای) بەبەزەیی هەیە، لە فیردەوسیشەوە هەموو ڕووبارەکانی بەهەشت دێن.

هەڵبەتە ئەو ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿ لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴾، خۆزگە ناخوازن بە هەشت جێبهێڵن، وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە کە ڕەنگە لە مێشکی هەندێ کەسدا بێ: ئەگەر هەتا هەتایە مرۆڤ لە بەهەشتدابێ، ئایا بێ تاقەت و بێزار نابێ؟ خوای میهرەبان وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە.

دەڵێم: لە ڕاستییدا لە بەهەشتدا کات (زَمَن) دەوەستێ، ئێمە لە دنیادا دەژین، لەسەر خڕۆکەی زەوی و، زەوی هەر (٢٤) سەعات جارێك بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە خێرایی (٣٠)کم لە خولەکێك داو، ئەوە دەبێتە هۆی پەیدابوونی شەوو ڕۆژ، ئەو ڕووەی زەوی کە ڕووی لە خۆرە دەبێتە ڕۆژ، دیوەکەی دیکەشی دەبێتە شەو، هەروەك زەوی لەساڵێکیشدا خولێك دەخوات و جارێك دەسووڕێتەوە بە دەوری خۆردا، بە خێرایی (٣٠)کم لە چرکەیەکدا، واتە: شەست (٦٠) ئەوەندە خێراتر کە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە، لە ئەنجامی ئەوەشدا ساڵ و کەشەکانی ساڵ پەیدادەبن، کەواتە: ئێمە لەسەر زەوی هەست دەکەین، بە شەوو ڕۆژ و مانگ و ساڵ و هەفتە، بەڵام لە بەهەشتداو لە دۆزەخدا، کات دەوەستێ، ئەو چەمك و واتایەی ئێستا ئێمە بۆ کات دەیزانین، بەو شێوەیە نامێنێ.

**بڕگەی بیست و چوارەم:** بەهەشتییەکان شوێنی خۆیان، لە نێو ئاگری دۆزەخدا دەبینن، کە ئەگەر بێبڕوابوونایەو خراپەیان کردبایە، دەیچوونەتێ، تاکو سوپاسگوزاریی بۆ خوا زیاد بکەن:

ئەمیش لە ئایەتی (٩) ی سوورەتی (التغابن)دا، ئاماژەیەکی پێکراوە، بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺدا بەڕوونی باسکراوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی (خوا) کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی کۆکردنەوە، ئەوکاتە ڕۆژی

زیان لە یەکدی دانە (لە تەفسیری سووڕەتی (**التَّغَابُن**)دا، بەتەفصیل قسەمان لە بارەی (**تغابن**)ەوە کردوە، هەر کەسێك بڕوا بێنێ و کردەوەی باش بکات، خوا خراپەکانی لێ دەسڕێتەوەو دەیخاتە باخانێکەوە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی هەتا هەتایە تێیان دەمێننەوە، ئا ئەوەیە بردنەوەی مەزن.

فەرمایشتێکی پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی لەو ئایەتەدا ئاماژەی پێکراوە، ڕوونی دەکاتەوە:

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا يَدْخُلُ أَحَدٌ الْجَنَّةَ إِلَّا أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، لَوْ أَسَاءَ لِيَزْدَادَ شُكْرًا، وَلَا يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ، إِلَّا أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، لَوْ أَحْسَنَ لِيَكُونَ عَلَيْهِ حَسْرَةً} (أخرجه البخاري: ٦٢٠٠).**

واتە: ئەبوو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت، مەگەر نشینگەی خۆی لە ئاگردا پێشان دەدەن، ئەگەر خراپەی کردبایە (دەڵێن: هاتوویە ئێرە، بەڵام بۆ زانیارییت ئەگەر بێبڕوا بووای، ئائەوە شوێنەکەت بوو) تاکو سوپاسگوزاریی بۆ خوا زیاد بکات، (بڵێ: سوپاس بۆ تۆ خوایە! کە هیدایەتت دام، ڕێی ڕاست بگرم و هاتمە ئێرەو نەچوومە ئەوێ) هیچ کەسیش ناچێتە نێو ئاگری دۆزەخ، مەگەر نشینگەکەی خۆی لە بەهەشت دا پێشان دەدەن، ئەگەر چاکەی کردبایە، تاکو زیاتر خەفەت بخوات، (مەینەتیی و نارەحەتیی زیاتر بچێتە دڵیەوە، کە خوایە! بۆچی ڕێی ڕاستم نەگرت، تاکو بچمە ئەوێ و، نەهاتبامە ئێرە لە دۆزەخدا؟!

**بڕگەی بیست و پێنجەم:** بەهەشتییەکان ستایشی خوای بەرز دەکەن، لەسەر ئەوەی لە دنیادا ڕێی ڕاستی پێشان داون و، خەم و ماتەمی لە دڵدا لابردوون و، بەهەشیتشی کردۆتە میراتیان:

لە چەند شوێنێکی قورئاندا خوای زاناو توانا ئەم ڕاستییانەی خستوونەڕوو، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەش کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، ئێمە هیچکەس زیاد لە توانای خۆی لە سەری پێویست ناکەین، ئا ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، هەرچی کینە هەبووە لە سینەکانیاندا دامانڕنی دەرمان هێنا، ڕووبارەکان بە ژێریاندا دەڕۆن، گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی ڕێنمایی کردین بۆ ئەم ڕێیە، ئێمە ڕێی ڕاستمان نەدەگرت، ئەگەر ئەو ڕێنمایی نەکردباین، بەڕاستیی پێغەمبەران هەقیان لە پەروەردگارمان بۆ هێنابووین، بانگکران: ئەو بەهەشتانە کراون، بە میراتی ئێوە بەهۆی ئەوەوە کە دەتانکرد.

واتە: چۆن کە میراتێکت بۆ دێ، دەبێتە موڵکی تۆ، ئەو بەهەشتەش ئاوا دەبێتە موڵکی ئێوە.

٢- لە سووڕەتی (**فاطر**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: (بەهەشتییەکان) گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی خەمباریی و دڵتەنگیی لێ لابردین، بە دڵنیایی پەروەردگاری ئێمە زۆر لێبوردەی سوپاسگوزارە، ئەو کەسەی ئێمەی خستۆتە مەنزڵگای تێدامانەوە، لە بەخششی خۆیەوە، لە وێدا نە ماندوێتییمان تووش دێ، نە هیچ ئازارو ناڕەحەتییەکمان بەسەر دێ.

٣- لە سووڕەتی (الزمر)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ

طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی پارێزیان لە پەروەردگاریان کردبوو، کۆمەڵ کۆمەڵ بەڕێکران بەرەو بەهەشت، هەتا کاتێك گەیشتنە لای (بەهەشت) و دەروازەکانیشی کرابوونەوە، (پێش ئەوەی بچن) دەرگاوانەکانی بەهەشت پێیان گوتن: سەلام لەسەر ئێوە بێ، ئێوە پاك و چاك بوون بچنەتێی (بەهەشت) تێیدا هەمیشەیی وهەرماون. ئەوانیش گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی بەڵێنی لەگەڵ ڕاست بردینەسەر، [ئەو بەڵێنەی پێی دابووین، ڕاستی بردە سەر] سەر زەوی (بەهەشتی) پێداین لە هەر شوێنێك لەوێدا (لە بەهەشت دا) بمانەوێ تێیدا نیشتەجێ دەبین، باشترین پاداشت، پاداشتی ئەوانەیە کاریان (بۆ خوای بەرزی مەزن) کردوە.

لە کۆتایی ئەم کورتە باسەدا دەڵێین:

باسی بەهەشت، هەروەها باسی دۆزەخ، کە پێشتر باسی دۆزەخمان کرد، زۆر زۆری بە بەرەوەیەو، خوای پەروەردگار زۆر بەوردیی باسی دۆزەخی کردوەو زۆریش بەوردیی باسی بەهەشتی کردوە.

بەڵام من هەوڵمدا: باسی دۆزەخ لە بیست و یەك (٢١) بڕگەداو، باسی بەهەشتیش لەم بیست وپێنج (٢٥) بڕگەیەدا بخەمە ڕوو - وەك پێشتریش گوتم - بە پلەی یەکەمیش پشتم بە قورئان بەستوەو جارجاریش هەندێ لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ یشم هێناون، چونکە خوای بەرزی مەزن وەك لە سەرەتای مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله**)دا گوتوومە: هەرچی شتی بنەڕەتیی و سەرەکییە لە دینداریی دا، لە مسوڵمانێتییدا، لە قورئاندا باسی کردوە، بەڵام هەندێك درێژە پێدان و ڕوونکردنەوە، پێغەمبەری خاتەم ﷺ باسی کردوە، بۆیەش هەر بابەتێك بمانەوێ مادام بابەتێکی ئیسلامیی بێ، دەبێ تەماشای قورئان بکەین و، مادام شتێکی گرنگ و سەرەکیی بێ، لە قورئاندا خوای

پـەروەردگار باسـی کـردوە، هەڵبەتـە وێـڕای قورئـان، ئـەوەش کـە بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ نێـردراوەو سرووشـکراوە، ئەویـش هـەر وەحییـە، بـەڵام بێگومـان هەمـوو ئـەو شـتانەی بنەڕەتیـی و سـەرەکیین لـە قورئانـدا بـاس کـراون، هـەر بۆیـەش ڕای هەندێـك لـە زانایـان وایـە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەوەی فەرموویەتـی، هـەر لەبـەر ڕۆشـنایی قورئانـدا فەرموویەتـی، وەك ئیـمام شـافیعیی (ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ) لـە کتێبـە ناودارەکـەی خـۆی (**الرسـالة**)دا باسـی کـردوە.

خـوا بـە بەبەزەیـی و لوتـف و کەڕەمـی بـێ سـنووری خـۆی یارمەتییـمان بـدات، خۆمـان بپارێزیـن لـە هەمـوو ئـەو شـتانەی بـەرەو دۆزەخـمان دەبـەن و خـوا تەوفیقـمان بـدات و دڵـمان وەربچەرخێنـێ، بـۆ پەرسـتن و تاعەتـی خـۆی و، بـۆ هەمـوو ئـەو کردەوانـەی بـەرەو بەهەشـت و ڕەزامەندیـی خوامـان دەبـەن، خـوا ئـەو بەهەشـتەش کـە باسـمان کـرد، بـە قسـمەت و نسـیبی هەمـوو لایەکـمان بـکات.

لێـرەش کۆتایـی بـە ئـەم کورتـە باسـە، دێنیـن و، کۆتاییـش بە تەفسـیری سـوورەتی (**الفجـر**) دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێك

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کە (٦)ی مانگی (ذي الحِجَّة)ی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر (٢٧/٧/٢٠٢٠)ی زایینی، لە شاری دێرینی هەولێر، خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین بە ڕوونکردنەوەی چەمك واتای ئایەتە بە پێزەکانی سووڕەتی (**البَلَد**).

سەرەتاش پێناسەو نێوەڕۆکیی ئەم سووڕەتە موبارەکە لە حەوت بڕگەدا، دەخەینەڕوو:

## پێناسەی سووڕەتی (البلد) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ناوی باوتری ئەم سووڕەتە موبارەکە بریتیە لە: (**سورة البلد**)، بەڵام ناوی: (**سورة لا أقسم**)یشی، بۆ بەکارهێنراوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان بە مەککەییان داناوە، هەندێکیش بە مەدینەیی، بەهۆی ئایەتی: ﴿ وَأَنتَ حِلٌّ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴾ و تەفسیرکردنی بەوە، کە: تۆ ئەی موحەممەد ﷺ! ئێستا ئەم وڵاتەت بۆ حەڵاڵە، چی تێدا دەکەی! گوایە لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا دابەزیوە، بەڵام ئەو ڕایە بێهێزەو، ڕای ڕاست هەر ئەوەیە کە ئەم سووڕەتە مەککەییە، لەو بارەشەوە ئەم دەقە دێنین: {**عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ عَبَّاس** رضي الله عنه، **قَال: نَزَلَتْ سُورَةُ لاَ أُقْسِمُ بِهَذاَ البَلَدْ، بِمَكَّة**}[1].

---

(١) أورده السيوطي في «الدر المنثور»: ج٨، ص٥١٦، ونسبه لابن الضريس، والنحاس، والبيهقي،

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ، گوتوویەتـی: سـووڕەتی ﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ لـە مەککـە دابەزیـوە، هەروەهـا (**السیوطي**)، گوتوویەتـی: ئیبنـو موڕدەوەیـە لــە عەبدوڵــڵای کــوڕی زوبەیــرەوە  هەمــان شــتی هێنــاوە، گوتوویەتــی: ئــەم ســووڕەتە لــە مەککــە دابەزیــوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە، لـە (موصحـەف)دا، ژمارەکـەی: نـەوەد (٩٠)ە، کـە لـە سـووڕەتی (**الفاتحة**)وە دێـی، لـە دابەزینیشـدا زۆرێـك لـە زانایـان ژمـارەی سی و پێنج (٣٥)یـان بـۆ دانـاوەو، پێـش سـووڕەتی (**الطارق**)و دوای سـووڕەتی (ق)، دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمێرەرانــی ئایەتەکانــی قوڕئــان، لەســەر ئــەوە یەکدەنگــن کــە ئــەم ســووڕەتە موبارەکــەی (البلــد)، بیســت (٢٠) ئایەتــە، نــە کەمــترو نــە زیاتــر.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە بـە هـەر بیسـت (٢٠) ئایەتەکەیـەوە، یـەك بابەتـی چڕو پـڕی تێکهەڵکێشـە، بـەم شـێوەیە: خـوای کارزان و میهرەبـان دوای سـێ سـوێندان، ڕایدەگەیەنـێ، کـە مرۆڤـی لـە گرفـت و ناڕەحەتییـدا هێناوەتـە دی، پاشـان باسـی مرۆڤـی دەسـتی هیدایەتـی خـوا پێنەگەیشـتوو دەکات، کـە خـۆی بـە خەرجکردنـی مـاڵ و سـامانی لەسـەر یـەك کەڵەکـە بـووەوەی هەڵدەکێشـێ.

---

وابـن مردویـه، وقـال وأخـرج ابـن مردويـه عَـن عبـد اللـه بـن الزبـير مثلـه رَضي اللـهُ عَنهُـما، الإسـتيعاب فِي بيـان الأسـباب: ج٣، ص٥١٣.

دوایی خوا باسی چوار لە نیعمەتە گەورەو سەرەكییەكانی خۆی بۆ دەكات، هەر دوو چاوی، زمانی و دوو لێوی و، هەردوو ڕێ پێشاندرانی، ڕێی ڕاست و ڕێی چەوت.

ئنجا سەرزەنشتی دەكات لەسەر نەبڕینی دەرووی سەخت، دواییش دەرووی سەخت بە ئازادكردنی كۆیلەیەك و تێركردنی برسییەك، كە ئەویش هەتیوێكی خزم، یاخود نەدارێكی پەككەوتوو بێ، تەفسیر دەكات، وێڕای بڕواهێنان و یەكدی سپاردن بە خۆڕاگریی و، بە بەزەیی و سۆز لەگەڵ یەكدیدا نواندن.

دواییش خوا ڕایدەگەیەنێ كە ئەوان (ئەوانەی بەو جۆرەن)، هاوەڵانی دەستی ڕاستن و، بێبڕوایانیش بە ئایەتەكانی خوا، هاوەڵانی چەپەن و، لە ئاگرێكی دەرگا لەسەر گاڵەدراودا دەبن، ئاگرێك لە شوێنێك دا كە دەرگاكانی لەسەریان داخراون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی:

سێ تایبەتمەندییمان لەم سوورەتە موبارەكەدا كەوتوونە بەرچاو:

١- تەنیا لەم سوورەتەدا دروستكردنی مرۆڤ لە ڕەنج و زەحمەتییدا، ڕاگەیەنراوە، لە ئایەتی ژمارە (٤)دا: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤمان لە نارەحەتیی و ڕەنج دا هێناوەتە دی.

٢- تەنیا لەم سوورەتەدا دەرووی سەخت بڕین بە: ئازادكردنی كۆیلەو تێركردنی برسیی تەفسیر كراوە، لە ئایەتەكانی: (١١ - ١٦)دا: ﴿ فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾.

٣- چەند وشەو تەعبیرێك تایبەتن بەم سوورەتەوە، كە ژمارەیان یازدەیە:

١- ﴿ وَأَنتَ حِلٌّ بِهَذَا الْبَلَدِ ﴾، كە وەك دوایی دەیگەینێ زانایان سێ تەفسیریان بۆ كردوون.

٢- ﴿وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ﴾، سوێند بە باب و ڕۆڵە.

٣- ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ﴾، بەدڵنیایی ئینسانمان لە ڕەنج و نارەحەتیی دا هێناوەتە دی.

٤- ﴿يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا﴾، دەڵێ: ماڵێکی لەسەر یەك كەڵەکە بووم خەرج کردوە.

٥- ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾﴾، ئایا دووچاومان بۆ نەڕەخساندوون و، زمانێك و دوو لێوو و، دوو ڕێیەکانیشمان پێشان نەداون؟

٦- ﴿فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ﴾، ئەو دەرووی سەختی نەبڕیوە.

٧- ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ﴾، ئازادکردنی گەردنێك، واتە: کۆیلەیەك.

٨- ﴿يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ﴾، ڕۆژێکی خاوەن برسێتیی.

٩- ﴿يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ﴾، هەتیوێکی (منداڵێکی بێ بابی) خاوەن خزمایەتیی، نیزیك.

١٠- ﴿أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ﴾، نەدارێکی خاوەن گڵ و خۆڵ، واتە: هیچی نەبێ و لەسەر گڵ و خۆڵ دانیشتبێ.

١١- ﴿بِٱلْمَرْحَمَةِ﴾، بە بەزەیی نواندن.

ئەم وشەو تەعبیرانە، بەم جۆرەی لەم سوورەتەدا هاتوون، لە هیچ کام لە سوورەتەکانی دیکەدا، نە هاتوون.

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە کۆی بیست (٢٠) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە دەکەینە دەرسێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــــزان!

پێشتریش گوتمان ئەم سوورەتە هەمووی یەك بابەتی چڕو پڕە، سەرەتا خوا ﷻ سێ سوێندان دەخوات: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾﴾.

دوایی ڕایدەگەیەنێ کە مرۆڤی لە گرفت و ڕەنج و میحنەت دا خوڵقاندوە: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ﴾.

ئنجا باسی مرۆڤی لە هیدایەتی خوا دوور، یان دەستی هیدایەتی خوا پێنەگەیشتوو، دەكات: ﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾﴾، ئەو جۆرە کەسە خۆی هەڵدەکێشێ و دەڵێ: ماڵێکی لەسەریەك کەڵەکە بووم خەرجکردوە، کە بێگومان لە حەڕام و خراپەشدا خەرجی کردوە، ئایا پێی وایە کەس نەیبینیوە لە چیدا خەرجی کردوە؟!

ئنجا خوا ﷻ باسی چوار لە نیعمەتە سەرەکییەکانی خۆی دەکات، بۆ ئەو مرۆڤەو بۆ هەموو مرۆڤەکانی دیکەش: ﴿أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ﴿١٠﴾﴾، ئایا دووچاومان بۆ نەڕەخساندوون، کە مامەڵەیان پێ لەگەڵ دەوروبەریدا دەکات، ﴿وَلِسَانٗا﴾ زمانێك کە مامەڵەی پێ لەگەڵ خەڵك دا دەکات و دەیاندوێنێ ﴿وَشَفَتَيۡنِ﴾، دوو لێوەکان، ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾ دوو ڕێیەکانیشمان پێشان نەداون؟ کە هەردووك ڕێی ڕاست و چەوتن؟

ئنجا خوا ﷻ ئەو مرۆڤە سەرزەنشت دەکات لەسەر ئەوەی دەرووی سەختی نەبڕیوە: ﴿فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ﴾، دەرووە سەختەکەی نەبڕیوە، ﴿ٱلۡعَقَبَةَ﴾ بریتییە لە دەروویەکی سەخت کە مرۆڤ لە چیاو شاخ پێیدا دەڕوات و بە تەنیا نەبێ

ناتوانێ پێیدا بڕوات، دوایی خوا ئەو دەرووە سەخت بڕینە، تەفسیر دەکات بە دوو شت: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴾، ئەو دەروو سەختە چییە؟ کێ بە تۆی زانانــدوە چییە؟ ﴿ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴾ ئازادکردنی کۆیلەیەکە، ﴿ أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ ﴾، یاخود خواردن پێدانە لە ڕۆژێکی خاوەن برسیەتییدا، بە کێ؟ ﴿ يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ ﴾، بە هەتیوێك کە خاوەن نیزیکایەتییە (یَتیم) لە زاراوی قورئاندا، منداڵێکە باڵغ نەبووەو بابی مردوە، لە عورفی کوردەواریی خۆمان دا دەڵێن: (ئاژەڵ بە دایك هەتیو دەبێ، بەڵام مرۆڤ بە باب هەتیو دەبێ)، ﴿ أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ ﴾، یان: نەدارێکی بە گڵەوە نووساو، ئنجا ئایا بەوەندە دەرووی سەخت دەبڕدرێ؟ نەخێر، ﴿ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، دواییش لەوانەبێ کە بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، ﴿ ثُمَّ ﴾ لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی کاتیی نیە، بەڵکو بۆ ڕیزبەندیی گرنگییەتییە، واتە: لەوەش گرنگتر بریتیە لە ئیمان، چونکە بەهۆی ئیمانەوە مرۆڤ بەزەیی دەبێ و کۆیلە ئازاد دەکات و هاوکاریی هەتیوو هەژارو نەدار دەدات.

﴿ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ﴾ هەروەها یەکدیش ڕاسپێرن بە خۆڕاگریی و، یەکدیش ڕاسپێرن و ئامۆژگاریی یەکدی بکەن بە ڕەحم و بەزەیی، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾، ئا ئەوانە هاوەڵانی ڕاستەن، بەدەستی ڕاست، نامەکانیان دەدرێنەوە، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، ئەوانەش کە بە ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوا بوون، نیشانەکانی خوای پەروەردگاریش چ ڕستەکانی قورئان بن، چ دیاردەو دیمەنەکانن بن، کە لە گەردووندا خوڵقاندوونی، ئەوانەی کە بە ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوا بوون، ﴿ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴾ ئەوانە هاوەڵانی چەپەن، بە دەستی چەپیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، ﴿ عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ ﴾، ئاگرێکیان لەسەرە کە دەرگاکانیانی لەسەر گاڵەدراون و داخراون.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ ﴿٢٠﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، وانیە (کە ئێوەی بێبڕوا دەڵێن) سوێند دەخۆم بەم وڵاتە ﴿١﴾ تۆش حەڵاڵکراوی لەم وڵاتەدا (لە لایەن بێبڕوایەکانەوەو ئازارت دەدەن) ﴿٢﴾ سوێندیش بە باب و بەوەش کە لێیبووە ﴿٣﴾ بە دڵنیایی مرۆڤمان لە سەختیی دا دروستکردوە ﴿٤﴾ ئایا پێی وایە هیچکەس (پێی ناوێرێ و) توانای بەسەریدا ناشکێ؟ ﴿٥﴾ دەڵێ: سامانێکی لەسەریەك کەڵەکە کراوم خەرجکردوە ﴿٦﴾ ئایا پێی وایە هیچکەس نەیدیوە؟ (چۆن ئەوماڵەی پەیدا کردوەو چۆنیشی خەرج کردوە؟) ﴿٧﴾ ئایا دوو چاومان بۆی نەڕەخساندوون! ﴿٨﴾ هەروەها زمانێك و دوو لێو ﴿٩﴾ (ئایا) دوو ڕێیەکانیشمان پێشان نەداون (ڕێی ڕاست و ڕێی چەوت)؟ ﴿١٠﴾ کە چی ئەو دەرووی سەختی نەبڕیوە ﴿١١﴾ چیش بە تۆی زانانـدوە دەرووی سەخت چییە؟ ﴿١٢﴾ ئازادکردنی کەسێك (ی کۆیلە) ﴿١٣﴾ یان خواردن پێدان لە ڕۆژێکی خاوەن برسیەتیی دا ﴿١٤﴾ بە

هەتیوێکـی خـاوەن خزمایەتیـی (و نیزیکیـی) ﴿١٥﴾ یـان نەدارێکـی (زۆر ئاتاجـی) خـاوەن گڵ و خـۆڵ ﴿١٦﴾ ئنجـا لـەو کەسـانەش بـێ کـە بڕوایـان هێنـاوەو، یەکـدی ڕادەسـپێرن بـە خۆڕاگریـی و، یەکـدی ڕادەسـپێرن بـە بەزەیـی نوانـدن (بەرانبـەر بـە خەڵـك) ﴿١٧﴾ ئەوانـە هاوەڵانـی ڕاسـتەن (کـە بـە دەسـتی ڕاسـتیان نامـەی کردەوەکانیـان دەدرێتـەوە) ﴿١٨﴾ ئەوانـەش کـە بـە ئایەتەکانمـان بێبڕوابـوون، ئەوانـە هاوەڵانـی چەپـە (و نەگبەتیـی)ن ﴿١٩﴾ ئاگرێکـی (دەرگا) داخراویـان لەسـەرە ﴿٢٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**ٱلۡبَلَدِ**): (**المَكَان المُحيطُ المَعْدودُ المُتَأَثِّرُ بِاجْتِماع قُطَّانِهِ وَإِقَامَتِهِم فِيهِ، وَالجَمْعُ بِلاَدْ وَبُلْدان**)، (**بلد**): شـوێنێکی دەورەدراو و کارتێکـراوە بەوانـەی تێیـدا نیشـتەجێ بـوون و، لێـی کۆبوونـەوە، واتـە: خەڵکەکـەی، بـە: (**بِلاد**) و (**بُلْدان**) کۆدەکرێتـەوە.

(**حِلٌّ**): (**حَلَلْتَ أَيْ: نَزَلْتَ، أَصْلُهُ مِنْ حَلِّ الأَحْمَالِ عِنْدَ النُّزُولِ، ثُمَّ جُرِّدَ اسْتِعْمَالُهُ لِلنُّزُولِ فَقِيلَ: حَلَّ يَحِلُّ حُلولاً وَأَحَلَّ غَيْرَهُ**)، دەگوتـرێ: (**حَلَلْتَ**) واتـە: تـۆ دابـەزی لـەو شـوێنە، لـە ڕیشـەدا لـەوەوە هاتـوە کاتـی خـۆی کەسـێك کـە بـە میوانیـی چـووە بـۆ شـوێنێك بـاری پـێ بـووە، ئنجـا کـە بارەکـەی کردۆتـەوە، مانـای وایـە خەڵـکی ئـەو شـوێنەی کردۆتـە خانـە خوێـی خـۆی، دوایـیـش وشـەی: (**حَلَّ**) بەکارهێـنراوە بـۆ دابەزیـن و نیشـتەجێ بـوون لـە شـوێنێك، دەگوتـرێ: (**حَلَّ يَحِلُّ حُلُولاً**)، واتـە: نیشـتەجێ بـوو، نیشـتەجێ دەبـێ، نیشـتەجێبوون، (**وَأَحَلَّ غَيْرَهُ**) جگەلـە خـۆی نیشـتەجێ کـرد.

کەواتـە: (**أنت حِلٌّ بِبَلَدِ كَذا، أي: مُقِيْمٌ فِيهِ**)[1]، تـۆ لـەو شـوێنە نیشـتەجێی، بـەڵام وێـڕای ئـەوە (**حِلّ**) دوو واتـای دیکەشـی هـەن:

(١) المُعْجَم الوَسِيط: ص١٩٤.

**واتای یەكەم:** تۆ حەڵاڵ كراوی لەو وڵاتەدا، واتە: بێبڕوایەكان هەموو شتێك لەو وڵاتەدا بە قەدەغە دەزانن، كەچی ئازاردانی تۆ كە پێغەمبەری خوای، بە حەڵاڵ دەزانن!

**واتای دووەم:** بۆ تۆ حەڵاڵ كراوە لەو وڵاتەدا، كە لە سیاقی ئەم سوورەتە موبارەكەدا، ئەو واتایە ناگەیەنێ، بەڵام ئەوە لە فەرمایشتێكی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ كە فەرموویەتی: ئەم وڵاتە هەموو شتێكی تێدا قەدەغەیە، تەنیا سەعاتێك لە ڕۆژێ بۆ من حەڵاڵ كرا لە كاتی ئازادكردنی مەككەدا، بەڵام دوایی چۆتەوە سەر ئەسڵی قەدەغە بوونی خۆی.

(كَبَدٍ): (المَشَقَّةُ: تَنْبِيهاً أَنَّ الإِنْسَانَ خَلَقَهُ اللهُ تَعَالى فِي حَالَةٍ، عَلَى حَالَةٍ مَا يَنْفَكُّ مِنَ المَشَاقِّ مَا لَم يَقْتَحِمِ العَقَبَة، وَيَسْتَقِرُّ بِهِ دَارَ القَرار)، (كَبَد): بە مانای ناڕەحەتیی و ڕەنج دێ، ئەمە بۆ ئاگاداركردنەوەی ئەوەیە كە مرۆڤ خوای بەرز خوڵقاندوویەتی، بە جۆرێك كە هەرگیز لە ناڕەحەتییان بەدەرنابێ، هەتا دەرووی سەخت نەبڕێ و لە مەنزڵگای كۆتاییدا نیشتەجێ نەبێ (كە بەهەشتە).

(أَهْلَكْتُ): (أَهْلَكَ مَالَهُ: أَيْ بَاعَهُ أَوْ أَنْفَقَهُ)، دەگوترێ: (أَهْلَكَ مَالَهُ) ماڵەكەی فرۆشت، یاخود خەرجی كرد.

(لُّبَدًا): (جَمْعُ لِبْدَة، كَالُّبَد المُلبَد، أَي: المُجْتَمِع، لُبَداً، أَيْ: كَثِيراً مُتَلَبِّداً)، (لُبَد) كۆی (لِبْدَة)یە، (اللِّبَدُ المُتَلَبِّدُ: المُجْتَمِعْ)، واتە: پەستراوی كۆبووەوە سەریەك، (لبَاد): كە لە خوریی دروستی دەكەن، لەسەریەك دەیپەستن، پێی دەگوترێ: (لبَاد)، لەبەر ئەوەی خورییەكە پەستراوەتە سەر یەك، كۆكراوتەوە سەریەك.

كەواتە: كە دەڵێ: ﴿يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا﴾، (أَيْ: كَثِيراً مُتَلَبِّداً)، ماڵ و سامانێكی زۆری لەسەر یەك كەڵەكە بوو.

(**ٱلنَّجۡدَيۡنِ**): (**النَّجْـدُ: المَـكَانُ الغَليـظُ الرَّفِيـعُ، وَذَلِـكَ مَثَـلٌ لِطَرِيقَـي الحَـقِّ وَالبَاطِـلِ فِي الإِعْتِقَـاد**)، (**نَجْـد**): بـە شـوێنێکی بـەرزی زبـر دەگوتـرێ، ئـەوەش وێنەیـە بـۆ هـەردوو ڕێـی هـەق و ناهـەق لـە بڕواهێنانـدا.

(**ٱقۡتَحَمَ**): (**الإِقْتِحَـامُ: تَوَسُّـطُ شِـدَّةٍ مُخِيفَـةٍ**)، (**إقتحـام**): بریتیـە لـە چوونـە نێـو سـەختییەکی ترسناکەوە، (**يقـال: قَحَّـمَ فُـلاَنٌ نَفْسَـهُ فـي كَذا مِـنْ غَـيْرِ رَوِيَّـةٍ**)، دەگوترێ: فڵانکـەس خـۆی پەسـتایە نێـو فـڵان شـت، بەبـێ بیـر لێکردنـەوە، خـۆی تێهاوێشـت.

(**ٱلۡعَقَبَةُ**): (**طَرِيـقٌ وَعِـرٌ فِي الجَبَـل**)، (**عَقَبَـة**): ڕێیەکـی سـەختە لـە چیـادا، بـە کوردیـی پێـی دەڵێـن: دەروو، واتـە: ئـەو شـوێنەی تاکـە ڕێیـەو تەنیـا مرۆڤێـك دەتوانـێ لێـی سـەرکەوێ و، زۆرجاریـش بـە زەحمـەت سـەردەکەوێ.

(**فَكُّ**): (**فَـكُّ الرَّهـنِ: تَخْلِيصُـهُ**)، کەسـێك بارمتەیەکـی لـەلای کەسـێك دانـاوە لـە بەرانبـەر پارەیـەك دا، کـە لێـی وەرگرتـوە، بـۆ وێنـە: زەوییـەك یـان خانوویـەك، ئنجـا هـەرکات پارەکـەی بـۆ بـردەوە، ئـەو شـتەی بارمتـە بـووە لـەلای بەرانبەرەکـەی، لێـی وەردەگرێتـەوە، ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: (**فَـكُّ الرَّهـن**)، دەربازکردنـی بارمتەکـە، (**فَـكُّ رَقَبَـةٍ: عِتْقُهَـا**)، (**رَقَبـة**) بـە مانـای گـەردن دێ، دوایـی بەکاریـان هێنـاوە، بـۆ کـۆی مـرۆڤ.

کەواتـە: ﴿ **فَكُّ رَقَبَةٍ** ﴾، یانـی: ئازادکردنـی گەردنێـك کـە مەبەسـت پێـی ئازادکردنی مرۆڤێکـە، کۆیلەیەکـە، (**الرَّقَبَةُ:اسْـمٌ لِلْعُضْـو المَعْـرُوفِ، ثُـمَّ يُعَـبَّرُ بِهَـا عَـنِ الجُمْلَـةِ، وَجُعِـلَ فِي التَّعَـارُفِ إِسْـمَاً لِلْمَمَالِيـك**)، (**رَقَبَـة**): نـاوە بـۆ ئـەو ئەندامـەی ئێمـە دەیزانیـن، واتـە: گـەردن، مـل، ئەسـتۆ، دوایـی تەعبیـری پێکـراوە لـە کـۆی مـرۆڤ، یەکێـك بـە یەکێـك دەڵـێ: گەردنـم ئـازاد بکـە، واتـە: مـن ئـازاد بکـە، نـەك هـەر ملـی بـە تەنیـا، دواییـش لـە عورفـی نێـو خەڵـك دا وشـەی (**رَقَبَةٍ**)، بـۆ کۆیلـە بەکارهێـنراوە، کەواتـە: ﴿ **فَكُّ رَقَبَةٍ** ﴾، یانـی: (**تَحْرِيـرُ رَقِيـقٍ أو تَحْرِيـرُ عَبْـدٍ**) ئازادکردنـی کۆیلەیـەك.

(مَسۡغَبَةٍ): (السَّغَبُ: الجُوعُ مَعَ التَّعَبْ)، (سَغَبْ): بریتیە لە برسێتیی لەگەڵ ماندوبووندا، کەواتە: ﴿فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ﴾ ڕۆژێك کە خەڵك تێیدا برسیشەو ماندووشە.

(ذَا مَتۡرَبَةٖ): (ذا) یانی: (صَاحِب) خاوەن.

(مَتۡرَبَةٖ): یانی گڵ، (ذَا مَتْرَبَةٍ: مُلْصَقٍ بالتُّرابِ لِفَقْرٍ)، کەسێك کە بە گڵەوە نووسابێ لەبەر هەژاریی، کەسێك کە زۆر هەژارو نەداربێ، بەڕەو فەڕشی نیە ڕایخا، شتێکی نیە لە ماڵدا، لەسەر گڵە، ئنجا ئەم وشەیە وشەیەکی سەیرە لە زمانی عەرەبییدا، (تَرِبَ) یانی: هەژار کەوت، بە گڵەوە نووسا، بەڵام (أَتْرَبَ)، یانی: (إِسْتَغْنى)، دەوڵەمەندبوو، بێ نیاز بوو.

(بِٱلۡمَرۡحَمَةِ): (الرَّحْم) بەزەیی.

(ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ): (الشُّؤْمُ أَوْ اليَسَارُ)، (مَشْئَمَة) واتە: نەگبەتیی، یان: لای چەپ، (شُؤْم)، بە مانای خراپەو زیان دێ.

(مُّؤۡصَدَةُۢ): (أَصَدَ البَابَ يَأصُدُ أَصْداً، وَإِصَاداً، أَغْلَقَهُ، وَآصَدَهُ، إِيصَاداً: أَصَدَهُ)، (أَصَدَ البَابَ)، واتە: دەرگایەکەی داخست، (يَأْصُدُ أَصْداً، وَإِصَاداً) (أَغْلَقَه) دایخست، دایدەخات، داخستن، هەروەها (آصَدَهُ إِيصَاداً)، دایخست، داخستن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای بـەرزو مـەزن لـە سـەرەتای ئـەم سـوورِتە موبارەکـەدا بـە نـاوی پـاك و تاكی خـۆی دەسـت پێـدەكات و دەفەرمـوێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

١- خوێندنی ئەم سوورەتە بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە دەست پێدەکەم.

٢- ئەم سوورەتە بە پێی بەرنامەی خوا دەخوێنم.

٣- ئەم سوورەتە بە مەبەستی ڕەزامەندیی خوا دەخوێنم.

٤- ئەم سوورەتە بە هەوڵ و توانایەك كە خوا بۆی ڕەخساندووم، دەخوێنم.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾، وانیـە، سـوێند دەخـۆم بـەم وڵاتـە، هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: ئەمـە بـۆ سـوێند نەخواردنـە كـە لێـرەش هاتـوەو، لـە سـەرەتای سـوورەتی (**القيامة**)شـدا هاتـوە: ﴿لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ و لـە نێـو سـوورەتی (**الواقعة**)شـدا هاتـوە: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾﴾، بـەڵام ئێمـە پێشـتر لـەو بـارەوە زۆر دواویـن، بـە تایبـەت لـە كاتـی تەفسـیركردنی سـوورەتی (**الواقعـة**)دا، گوتوومانـە: هەمـوو ئـەو: ﴿لَآ﴾یانـەی لـە پێـش سـوێندەكانەوە هاتـوون، بـۆ لابردنـی قسـەیەكن، كـە پێشـتر بێبڕوایـان كردوویانـە، یاخـود بەپێـی ڕەوتـی ئایەتـەكان دەردەكـەوێ، لێـرەش: ﴿لَآ﴾، واتـە، وانیـە وەك ئێـوە دەڵێـن و گومـان دەبـەن، ﴿أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾، سـوێند دەخـۆم بـەم وڵاتـە، كـە بێگومـان مەبەسـت پێـی مەككەیـە، حەرەمـی مەككـەو دەوروبـەری مەككـە، بـە پانتایـی چەند كیلۆمەترێـك زانایـان لـەو بـارەوەش قسـەیان كـردوەو ڕاجیاییشـیان لەسـەری هەیـە، ﴿وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾، لـە حاڵێكیشـدا كـە تـۆ لـەم وڵاتـەدا حـەڵاڵ كـراوی، واتـە: ئازاردرانـی تـۆ بـە ڕەوا دانـراوە، لـە حاڵێكـدا لـەم مەككەیـەدا كـە (**البلـد الحـرام**)ە،

هەمـوو شـتێك قەدەغەیـە، گوناهـەكان لـە هەمـوو شـوێنێك گوناهـن، بـەڵام لـەوێ گوناهـترن، هەندێـك شـتی دیكـەش لـە شـوێنەكانی دیكـە گونـاح نیـە، بـەڵام لـەوێ گوناحـەو نابـێ بكـرێ، كەچـی تـۆ كـە پێغەمبـەری خـوای، ئازاردانـی تۆیـان بۆخۆیـان ڕەوا كـردوە.

یاخـود: ﴿ وَأَنتَ حِلٌّ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴾ سـوێند دەخـۆم بـەوم وڵاتـە، لـە كاتێكـدا كـە تـۆ لـەم وڵاتـەدا نیشـتەجێی، ئـەم دوو واتایـە لەگـەڵ ڕەوتـی ئایەتەكانـداو، لەگـەڵ ئـەم سـووڕەتە موبارەكـەدا گونجـاون، بـەڵام مانایەكـەی دیكـە: ﴿ وَأَنتَ حِلٌّ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴾ تـۆ لـەم وڵاتـەدا بـۆت حـەڵاڵ كـراوە، كـە هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: ئەمـە هەواڵدانێكـە بـە داهاتـوو و ئیعجازێكـی مێژووییـە، یـانی: ئێسـتا ئـەوان تۆیـان حـەڵاڵ كـردوە لـەم وڵاتـەدا، بـەڵام كاتێـك دێ ئـەم وڵاتـە بـۆ تـۆ ڕەوا دەبـێ، هەرچـی تێـدا بكـەی، و لەكاتـی ئازادكردنـی مەككـە لـە سـاڵی هەشـتەمی كۆچییـدا.

ئـەم مانایە-بـەڕای بەنـدە- زۆر ڕێـی تێناچێ و بەگونجـاوی نازانـم و، دوو مانایەكی پێشـووتر ڕاسـتر و گونجاوترن.

أ- تۆش لەم وڵاتەدا نیشتەجێی.

ب- لەم وڵاتەدا ئازاردانی تۆ ڕەوا كراوە، لە لایەن هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانەوە.

﴿ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ﴾، ئەمانـەش سـوێندی دووەم و سـێیەم: سـوێند بـە بـاب و، بەوەی لێـی بـووە، سـوێند بـە بـاب و بـە ڕۆڵـە.

ئایا ئەو بابە مەبەست پێی كێیەو ئەوەی لێشیبووە، كێیە؟

هەندێـك لـە زانایـان دەڵێـن: ( **والـد وماولـد**) مەبەسـت پێیـان ئادەمـەو هەرچـی لـە ئـادەم بـووە.

بـەڵام هەندێـك گوتوویانـە: (**والـد**) مەبەسـت پێـی (**إبراهیـم**)ەو، ﴿ وَمَا وَلَدَ ﴾، مەبەسـت پێـی ئیسـماعیلە، چونكـە (ئیبڕاهیـم) و (ئیسـماعیل) ئـەم وڵاتەیان ئـاوەدان

کردۆتـەوەو، کەعبەیـان لەوێـدا بنیـات نـاوەو، دوایـی ئاوەدانیـی لـێ پەیـدا بـوو، **ئیبراهیـم** عليه السلام هاجـەرو ئیسـماعیلی کـوڕی لـەوێ دانـان، دوایـی هـۆزی جورهـوم هاتـن و لـەوێ نیشـتەجێ بـوون، ئنجـا ئیسـماعیل هاوسـەرگیریی لێکـردن و زمانـی ئـەوان فێـر بـوو، لـەوەوەش کۆمەڵـی سـێیەمی عـەرەب پەیـدا بـوون، کـە پێیـان دەگوتـرێ: (**العَـرَبُ المُسْـتَعْرَبة**)، عەرەبـە بـە عەرەبکـراوەکان، لـە ئەسـڵدا عـەرەب نەبـوون، بـەڵام بـوون بـە عـەرەب.

مێژوو زانان گوتوویانە: گەلی عەرەب سێ کۆمەڵی سەرەکیی بوون:

١- کۆمەڵی یەکەمی عەرەب: (**العَرَبُ البَائِدَة**) عەرەبە فەوتاوەکان، وەك هۆزی (**عاد و ثمود**)و ئەوانی دیکە، کە کتێبە مێژوییەکان باسیان کردوون، بەڵام ئەو دووانە لە قورئاندا ناویان هاتوە.

٢- کۆمەڵی دووەم: (**العَرَبُ العَارِبَة**)، عەرەبە ئەسڵییەکان، کە عەرەبەکانی یەمەن و، عەرەبی (**قحطاني**)یشیان پێ دەگوترێ.

٣- کۆمەڵی سێیەم: (**العَرَبُ المُسْتَعْرَبة**)، عەرەبە بە عەرەبکراوەکان، کە عەرەبە عەدنانییەکان، یاخود ئیسماعیلییەکانن و دەچنەوە سەر ئیسماعیل عليه السلام.

هەندێکیـش لـە زانایـان گوتوویانـە: ﴿وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ﴾، واتـە: سـوێند بـە هـەر بابێـك و بـە هـەر ڕۆڵەیـەك، هـەر کەسـێك کـە لێـی بـووە، بـەڵام وا پێدەچـێ زیاتـر مەبەسـت پێـی ئیبراهیـم بـێ، ﴿وَوَالِدٍ﴾ سـوێند بـە بابێـك، کـە ئیبراهیمـە (**وَمَا وَلَدَ**) بـەوەش کـە لێـی بـووە کـە ئیسـماعیلە، بـە بەڵگـەی ئـەوەی ئـەوان ئـەم وڵاتەیـان ئـاوەدان کردۆتـەوەو، کەعبەیـان لـەوێ بنیاتنـاوە.

سـوێند بـەو سـێ شـتانە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ بـە دڵنیایی مرۆڤـمان لە ڕەنج و نارەحەتیـی و میحنەتـدا هێناوەتـە دی، واتـە: مـرۆڤ هـەر لـە سـەرەتاوە کـە دروسـت دەبـێ لـە ڕەنـج و میحنـەت و نارەحەتیـی دا دروسـت دەبـێ، هەتـا ژیانی کۆتایـی پێدێ، هـەر لـە سـەرەتاوە لـە دوو بـەش پێکـدێ: أ- زینـدەوەری تۆویـی (حەیمـەن) نێـو ئـاوی

بابی، کە زیندەوەرێکی بچووکەو بەچاو نابینرێ، لەهەر دڵۆپێکیدا ملیۆنان هەیە، زانایان دەڵێن: بە مەزەندە هەر کاتێك کە پیاو لەگەڵ هاوسەریدا جووت دەبێ، ئەوەندە ئاوەی دێ، کە تێکڕا سانتیمەترێك یان دوو سانتیمەتر سێجا (١ سم³)یە، ئەندازەی سێسەد (٣٠٠) ملیۆن، تاکو پێنجسەد (٥٠٠) ملیۆن دانە زیندەوەری تۆویی لەو ئاوەدا هەیە، ئنجا یەکێك لەو زیندەوەرە گچکانە دەچێ لەگەڵ زیندەوەرێکی دیکەی گچکەی نێو ئاوی دایکدا کە پێی دەگوترێ: هێلکۆکە (**بُوَيْضَة**) جووت دەبێ، کە ئەویش هەر زیندەوەرێکی گچکەیە، بەڵام بەچاو دەبینرێ، ئیدی لەو دوو زیندەوەرە، زیندەوەرێکی دیکە پێك دێ، پێی دەگوترێ: تۆویکە (**نُطْفة**)، ئنجا ئەو (**نُطْفة**)یە دەگۆڕدرێ بۆ خوێنپارە (**عَلَقَة**)، دوایی بۆ زارجوو (**مُضْغَة**)، دوایی قۆناغ بە قۆناغ تاکو دەبێتە کۆرپەلەو، ژیانی نێو منداڵدان (**رحم**) تەواو دەکات بە نۆ (٩) مانگ، دوایی لە منداڵدانی دایکی دێتە دەرێ، ئنجا هەر کە لە دایك دەبێ، دەچریکێنێ و کە چریکاندی، مانای وایە زیندوویە، چونکە کە چریکاندی دەرگای هەناسەی دەکرێتەوە، ئەگەرنا لە نێو سکی دایکیدا هەناسە نادات، سەرەتا کۆئەندامی هەناسەدانی دەکەوێتە کار، ئنجا ئەندامەکانی دیکەی دەکەونە کار، هەڵبەتە دڵی لەوێشدا هەر لێ دەدات، بەڵام کۆئەندامی هەرسی دەکەوێتە کارو کۆئەندامی میزی دەکەوێتە کار، ئنجا گوێی، دوایی چاوی، هەمووی بە میانی ڕەنج و بە میحنەت و زەحمەتدا دێ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ﴾، ئایا ئەو پێی وایە (مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوایە) کەس پێی ناوێرێ و توانای بە سەریدا ناشکێ، نازانێ لە چییەوە هاتوە؟ مرۆڤ ئەگەر تەماشای ڕابردووی خۆی بکات، سەری سوڕدەمێنێ! لە کوێوە هاتوە؟ لە زیندەوەرێکی گچکە کە بە چاو نابینرێ و، نۆ (٩) مانگان لە نێو حەوزێکی خوێندابووە لە منداڵدانی دایك دا، ئنجا قۆناغ بە قۆناغ، گەشەی کردووەو لەڕێی نێوکەوە کۆرپەلە خواردنی بۆ دەچێ و، لە جەستەی دایکی دەخوات، هەتا لە دایك دەبێ، کە لە دایك بوو، ئنجا ڕێی نێوکی دەبڕن و، خوا دوو ڕێی دیکەی بۆ کردوونەوە، کە بریتین لە هەردوو مەمکی

دایکی، دوایی کە قۆناغی شیر خواردنیشی بەسەر دەچێ، ئنجا خوا سی و دوو (٣٢) ددانی بۆ دەڕوێنێ.

کەواتە: ئەی مرۆڤ! تۆ قۆناغ بەقۆناغ هاتووی و، خوای میهرەبان ڕۆژ بەڕۆژ کەرەمی خۆی لەگەڵ تۆدا زیاد کردوە، لە دنیاداو کە دنیاش بە جێ دێڵی، دەچیە قۆناغی بەرزەخەوە، لەوێش خوا کەرەمی خۆیت بۆ زیاد دەکات و، هەر بەرەو زیادیی و فراوانیی دەچی.

ئەبوو حامیدی غەززالیی (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، دەڵێ: منداڵدانی دایك چەندە لەچاو ژیانی دنیا، ژیانی دنیاش لەچاو قۆناغی بەرزەخ ئەوەندەیەو، قۆناغی بەرزەخیش لە چاو قیامەت، ئەوەندەیە، ئێمە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو فراوانیی دەچین!

﴿ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴾، مرۆڤ (مرۆڤی بێبڕوا)، دەڵێ: ماڵێکی زۆرو زەوەندو لەسەر یەك کەڵەکە بووم، خەرج کردوە، ﴿ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴾، ئایا پێی وایە کەس نەیبینیوە؟ کەس نەیبینیوە کە ئەو مرۆڤە دنیا پەرستە، ماڵ و سامانەکەی لەچیدا خەرج کردوە، لە تاوان و خراپە و تێکدان دا خەرجی کردوە، هەروەها ئایا کەس نەیبینیوە، ئەو ماڵەی چۆن کۆ کردۆتەوە؟

ئنجا خوا ﷻ چوار لە نیعمەتە سەرەکییەکانی خۆی دەخاتە بەرچاوی ئەو مرۆڤەو، هەر مرۆڤێکی دیکەش: ﴿ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴾، ئایا دوو چاومان بۆ نەڕەخساندوون[1]، ﴿ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴾، هەروەها ئایا زمانێکمان بۆ نەڕەخساندوون کە وێڕای شت پێخواردن قسەشی پێدەکەن؟! شارەزایانی زمانەکان[2] (**لغات**) دەڵێن: ئێستا نزیکەی چوار هەزار (٤٠٠٠) زمان لە دنیادا هەیە کە

---

(١) لە مەسەلە گرنگەکاندا کورتە باسێك لە بارەی چاوەوە دەکەین، کە چۆن زانستی سەردەم ئەو نهێنییانەی لە چاودا هەن، هەندێکیانی دەرخستوون.

(٢) لە کوردیی دا زمان بۆ زمانی گۆشتیین و زمانی قسەکردنیش بەکاردێ، بەڵام لە عەرەبیی دا: (لِسان) زمانی گۆشتیین و، (لغة) زمانی پێدوان، هەرچەندە لە قوڕئان دا بۆ هەردووکیان (لِسان) بەکارهاتوە.

مرۆڤەکان، قسەیان پێدەکەن، کە یەکێکیان زمانی کوردییەو، زمانی کوردییش بۆ خۆی چەند زارو لەهجەیەکی هەن: لە هجەی گۆران، لەهجەی بادینی و کرمانجیی و، لەهجەی (سۆرانیی) و، لەهجەی هەورامیی، ئنجا لەهجەی لەك و لوور، چەندان زار هەن، هەموویان هەر یەك زمانن، کە زمانی کوردییە، ئنجا زمانی عەرەبیی، زمانی ئینگلیزیی، زمانی ئیسپانیی، زمانی ئەڵمانیی، زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا: هیندیی و چینیی و مالنزیی و...هتد، هەر بەو تاکە زمانە، ئەو هەموو زمانانە گۆ دەکرێن، ﴿ وَشَفَتَيْنِ ﴾ هەروەها دوو لێویشمان بۆ خوڵقاندوون و، بە هۆی دوو لێوەکانەوە نەبێ، مرۆڤ قسەی بۆ ناکرێ، بەڵکو ئەگەر لێوی تووشی ئازارێك و دەردێك ببێ، قسەی بۆ ناکرێ، ﴿ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴾ هەروەها دوو ڕێیەکانیشمان پێشانداون، (واتە: ڕێی ڕاست و ڕێی چەوت)، مەبەست لە پێشاندانیش ئەوەیە کە خوا ﷻ لە عەقڵ و هۆشی مرۆڤداو، لە ناخ و زگماکی مرۆڤدا وای کردوە، مرۆڤ هەست بە ڕاست و چەوت بکات، هەست بە حەڵاڵ و حەڕام بکات، هەست بە چاك و خراپ بکات، بەڵام بێگومان ئەو هیدایەتە تێرو تەواوەی بە تەواویی مرۆڤ ڕاست و چەوتی بۆ لێك جیا بنەوە، تەنیا لە ڕێی وەحییەوە دێ و لە وەحییەوە سەرچاوە دەگرێ، ئایا هەموو ئەوانەمان بۆ نەکردوون؟

﴿ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴾، کەچی (ئەو مرۆڤە) ئەو دەرووە سەختەکەی نەبڕیوە، نەچۆتە نێو دەرووی سەختەوە.

﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴾ چ شتێك بە تۆی زانانـدوە دەرووی سەخت چییە؟ ﴿ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴾ ئازادکردنی کۆیلەیەکە، ﴿ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴾ یاخود خواردن پێدانە لە ڕۆژێکی خاوەن برسێتییدا، ئەو خواردن پێدانە بەکێ؟ ﴿ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴾، بە هەتیوێکی خاوەن خزمایەتیی، ﴿ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴾ یاخود نەدارێکی خاوەن گڵ و خۆڵ، کە هیچ شتێکی نیەو بە گڵەوە نووساوە لە هەژاریی و نەدارییدا، ﴿ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، دوایی لەوانەش بێ کە بڕوایان هێناوە، بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ

بهێـنرێ، ﴿وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْمَرْحَمَةِ﴾، یەکدییـش ڕاسـپێرن و ئامۆژگاریـی یەکـدی بکـەن بـە خۆڕاگریـی و، یەکدیـش ڕاسـپێرن بـە بەزەیـی نوانـدن.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ﴾، ئـا ئەوانـە هاوەڵانـی لای ڕاسـتن، یاخـود هاوەڵانـی خێـرو خۆشـیین، ﴿ٱلْمَيْمَنَةِ﴾، هـەم بـە مانـای (يَمِـيْن) دێ، لای ڕاسـت، هـەم بـە مانـای (يُمْـن) دێ، واتـە: خێـرو خۆشـیی و پیـت و پێـزو بەرەکـەت.

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾، ئەوانـەش کـە بـە نیشـانەکانی ئێمـە بێبـڕوا بـوون، نیشـانەکانی ئێمـە (**آياتنا**) هـەم ڕستەکانی قوڕئـان دەگرێتـەوە، کە بە پێـی ڕەوتی ئەم ئایەتانـە زیاتـر ئایەتەکانـی قوڕئـان دەگرێتـەوە، هـەم دیاردەو دیمەنەکانـی کـە خـوا لـە دەوروبـەرو گەردوونـدا خوڵقاندوونـی، هـەم ئـەو موعجیزانـەی بـە پێغەمبەرانـی داون، ئەوانـەی بـە نیشـانەکانی ئێمـە بـە هەمـوو جۆرەکانیانـەوە بێبـڕوان، ﴿هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ﴾، ئـا ئەوانـە هاوەڵانـی لای چەپـەن، ﴿ٱلْمَشْـَٔمَةِ﴾ش هـەم بـە مانـای: چـەپ (**شِـمال**) دێ، هـەم بـە مانـای (**شـؤم**)یش دێ، واتـە: نەگبەتیـی و بـێ خێریـی، یـانی: هاوەڵانـی نەگبەتییـن، شـتێك هەیانبـێ و لەگەڵیـان بـێ، بریتیـە لـە نەگبەتیـی و بێخێریـی، ﴿عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ﴾ (لـە ڕۆژی دواییـدا) ئاگرێکـی داخراویـان بـە سـەرەوەیە، واتـە: ئاگرێـك کـە دەرگاکانییـان بەسـەردا گاڵـە دراون، وەك لـە سـووڕەتی (**الهمـزة**)دا دەفەرمـوێ:

﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ ﴿٩﴾﴾.

واتە: ئاگرەکە بەسەریاندا داخراوە، لە نێو کۆڵەگەو لوولە درێژکراوەکان دا.

کەواتـە: ئەوانـەی بێبڕوان بـە ئایەتەکانی خوای پـەروەردگار، ئا ئەوە سـەرەنجامیانەو، ئەوانـی دیکـەش کـە خـوا ﷻ سیفەتەکانی ژمـاردن و، دەبـێ خۆیـان بـەو سـیفەتانە بڕازێننـەوە، ئنجـا شایسـتەی ئـەوە دەبـن. بـە دەسـتی ڕاستیان نامـەی کردەوەکانیـان بدرێتـەوەو، بـە بەزەیـی و بەخششـی خـوای میهرەبـان بگـەن لـە ڕۆژی دواییـدا.

خوا بەبەزەیی و بەخششی بێ سنووری خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سـوێند خواردنـی خـوا ﷻ بـە شـاری مەککـەو دەوروبەری، لـە حاڵێکدا ئـازاردرانی موحەممـەد ﷺ تێیـدا ڕەوا کـراوە لەلایەنـی بێبڕوایەکانـەوەو، سـوێند خـواردنی بـە بـاب و بـەوەی لێیبـووە، کـە خـوا مرۆڤـی لـە ڕەنـج و زەحمەتیـی دا دروسـتکردوە، کەچـی بابـای بێبـڕوا پێـی وایـە کـەس توانـای بەسـەریدا ناشـکێ، دەڵـێ: ماڵـی زۆرو کەڵەکەبـووم سـەرف کـردوە، ئایـا پێـی وایـە کـەس نەیبینیـوە؟!:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ۝١ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ۝٢ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ۝٣ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ۝٤ أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ ۝٥ يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا ۝٦ أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ۝٧﴾

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)-** ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ﴾، وانیە (کە دەڵێن) سوێند دەخۆم بەم وڵاتە، پێشتریش گوتمان: ﴿لَآ﴾ لێرەدا بۆ لابردنی شتێکە، کە بە سەلیقەو بە ڕەوتی ئایەتەکان دەزانرێ، یان پەیوەندیی بە لابردنی شتێکەوە هەیە، کە لە ڕابردوودا هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بوویانە، واتە: وانیە وەك ئێوە دەڵێن، کە موحەممەد پێغەمبەری خوا نەبێ، یاخود: وانیە وەك ئێوە دەڵێن، ئەوەی دەیڵێ، کە قورئانە، هەڵیبەستبێ، یان: وانیە وەك ئێوە دەڵێن، زیندوو کرانەوە نەبێ، هەتا کۆتایی، هەموو ئەو شتانەی بێبڕوایەکان گوتوویانن.

﴿أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ﴾، سـوێند دەخـۆم بـەم وڵاتـە، **(الطبري)**، گوتوویەتـی: **(أُقْسِـمُ يَـا مُحَمَّـدُ بِهَـذا البَلَـدِ الحَـرَام وَهـوَ مَكَّـة)**، ئـەی موحەممـەد! سـوێند دەخـۆم بـەم وڵاتـە، هەمـوو شـت تێـدا قەدەغـە کـراوە، کـە بریتیـە لـە مەککـە.

**٢)-** ﴿ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴾، لە حاڵێك دا تۆڕەواكراوی (ئازاردانت ڕەواكراوە) لەم وڵاتەدا، پێشتریش گوتمان: ئەم ڕستەیە سێ واتایان هەڵدەگرێ:

**یەكەم:** لە حاڵێكدا كە تۆ ڕەواكراوی لەم وڵاتەدا، واتە: ئازاردانی تۆو هاوەڵانت لەلایەن ناحەزانتەوە، بە شتێكی ڕەواو حەڵاڵ دانراوە.

**دووەم:** لە حاڵێكدا كە تۆ لەم وڵاتەدا نیشتەجێی.

**سێیەم:** یاخود لە حاڵێكدا ئەم وڵاتە بۆ تۆ ڕەوا كراوە چی تێدا دەكەی، یانی: ماوەیەكی كەم، سەعاتێك، لە كاتی ئازادكرانی مەككە لە ساڵی هەشتەمی كۆچیی دا.

ئەوەی زیاتر بە عەقڵ و دڵەوە دەنووسێ:

**أ-** یان ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە وێدا ڕەواكراوە ئازار بدرێ.

**ب-** یاخود مەبەست پێی ئەوەیە لە حاڵێكدا تۆ لەم وڵاتەدا نیشتەجێی.

**(الطبري)**، دەڵێ: (**أَنْتَ فيهِ حَلاَلٌ تَصْنَعُ فيهِ مِنْ قَتْلِ مَن أَرَدْتَ قَتْلَهُ، وَأَسْرِ مَنْ أَرَدْتَ أَسْرَهُ، مُطْلِقٌ ذَلِكَ لَكَ**) واتە: تۆ لەم وڵاتەدا بۆت ڕەوایە هەرچی دەكەی، لە كوشتنی كەسێك دەتەوێ كوشتنیت دەوێ، بیكوژی و، كەسێك بتەوێ بەدیلی بگری، بەدیلی دەگری، ئەو شتانە هەموویان بۆ تۆ ڕەوان.

**(إبن عاشور)**یش ئاوای لێكداوەتەوە: (**جَعَلَكَ أَهْلُ مَكَّةَ حَلالاً بِهَذا البَلَدِ الَّذي يَحْرُمُ أَذَى صَيْدِهِ**)، خەڵكی مەككە تۆیان لەم وڵاتەدا ڕەوا كردوە كە ئەزیەتت بدەن، لە حاڵێكدا ڕاوكردنی نێچیری ئەم وڵاتە، (مەككەو دەوروبەری) قەدەغەیە!

**٣)-** ﴿ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ﴾، سوێند بە باب و بەوەی لێی بووە.

مانایەكەی سێ ئەگەری هەن:

**١-** هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی ئادەم و وەچەكەیەتی، سوێند بە ئادەم و بەو وەچەیەی لە ئادەم بووە، یان ئادەم وایكردوە پەیدا بێن.

٢- مەبەست پێی ئیبراهیم ﷺ و ئیسماعیلی کوڕیەتی عليه السلام.

یان مەبەست پێی ئیبراهیم و وەچەکەیەتی بە گشتیی، هەم ئیسماعیل و هەم ئیسحاق و کوڕانی دیکەشی، کە لە پەیمانی کۆندا باسکراون.

٣- مەبەست پێی هەر باب و، هەر ڕۆڵەیەکە، بەڵکو جاری وا هەیە وشەی: ﴿ وَوَالِدٍ ﴾ بۆ بابیش و دایکیش بەکاردەهێنرێ، بۆیە دەگوترێ: **(والِدَين)** یانی: هەردووك كەس كە ئەو منداڵەیان بووە، کە باب و دایکن.

بەڵام ئەوەی زیاتر بە عەقڵ و دڵەوە دەنووسێ، ئەوەیە کە مەبەست پێی ئیبراهیم و ئیسماعیل بێ، یاخود ئیبراهیم و وەچەکەی بێ، بە نیشانەی ئەوەی باس باسی مەککەیە، ئەو وڵاتەی هەموو شتێك تێیدا قەدەغەکراوە، ئەو وڵاتە و ئەو شارەش ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی بوونە هۆی ئەوەی بنیات بنرێ، بەهۆی دروستکرانی کەعبەوە لەو شوێنەدا.

ئنجا بەپێی ئەم مانایە، ئەمە جۆرێکە لە توانجدانیش لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە لە ڕێی ئیبراهیم عليه السلام لایانداوە، ئیبراهیم وەك هەموو پێغەمبەرانی خوا، تەنیا خوا پەرست و خوا بەیەکگر **(موحِّد)** بووە، ئەوانەش لاف لێ دەدەن کە بە دوای ئیبراهیم دەکەون، کەچی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن!

٤)- ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤمان لە ڕەنج و ناڕەحەتیی دا هێناوەتە دی، وشەی: ﴿ ٱلْإِنسَٰنَ ﴾، (أل)ی ناساندنی لەسەرەو بۆ جینسە، یانی: هەموو مرۆڤێکمان لە ناڕەحەتیی و ڕەنج و زەحمەتیی دا، خوڵقاندوە، چونکە ئەوە تایبەت نیە بە هەندێك لە مرۆڤەکانەوە جیا لە هەندێکیان، بەڵکو هەموو مرۆڤەکان وەك یەك، خوا سبحانه وتعالى بە چەند قۆناغێك لە نێو منداڵدانی دایکیاندا دەیانخوڵقێنێ، دواییش لە دایك دەبن و گەشە دەکەن و پێدەگەن، هەموویان وەك یەك بە پێی سیستمێك کە خوا سبحانه وتعالى دایناوە.

٥)- ﴿ أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ ﴾ ئایا پێی وایە کەس پێی ناوێرێ، کەس توانای بەسەریدا ناشکێ، لە ژێر ڕکێفی کەس دا نیە؟ یاخود: ئایا پێی وایە توانامان بەسەریدا ناشکێ، دوای ئەوەی جەستەکەی لەبەین دەچێ و دەپووکێتەوەو دەبێتەوە بەخۆڵ، ناتوانین زیندووی بکەینەوە؟

هەندێك لە زانایان باسی یەك دوو کەسیان کردوە لە مەککە، یەکێك لەوانە: (**أَبو أَشَد الجُمَحِيُّ**) و یەکێکی دیکەش، زۆر بەهێزو بە توانابوون، یەکیان لە سەر پێستی ڕەشە وڵاخ ڕاوەستاوەو گوتوویەتی: وەرن ئەو پێستەم لەبن پێ دەربێنن، ئنجا کە ڕایانکێشاوە ئەویان پێ لەسەر ئەو پێستە پێ لانەچووەو، پێستەکەیان بە دەستەوە هاتوەو ئەوەی ژێر پێی ماوەتەوە، ئەوەندە قورس و بە هێزو زەبەلاح بووە، گوتوویانە: مەبەست پێی ئەو ئینسانەیە!

بەڵام ڕای ڕاست هەر ئەوەیە کە وشەی: ﴿ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴾، مەبەست پێی مرۆڤە بە گشتیی، نەك (أل) ە کە بۆ (عهد) بێ: ئایا مرۆڤەکە کە (**أَبو أَشَدّ الجُمَحيّ**) ە، یاخود مرۆڤیکی دیکەیە، پێی وایە کەس پێی ناوێرێ؟ بەڵێ مرۆڤێکی واش هەبووەو، چەمکی ئایەتەکە ئەویش دەگرێتەوە، بەڵام هەموو مرۆڤەکانی دیکەش دەگرێتەوە.

ئەم ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ﴾، شێوەی ئەو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (التين)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ٤ ﴾، مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەدا هێناوەتە دی، وەك چۆن لەوێ گشتییە، لێرەش دروستکردنی مرۆڤەکان: لە ڕەنج و زەحمەت و ناڕەحەتییدا، هەموویان تێیدا وەك یەکن و هەر گشتییە، کە دەشفەرموێ: ﴿ أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ ﴾، ئایا پێی وایە کەس توانای بەسەریدا ناشکێ؟ چ لە دنیادا، چ مەبەست ئەوە بێ، توانای بەسەریدا ناشکێ کە زیندووی بکاتەوە، دیسان ئەویش هەر گشتییە بۆ هەموو مرۆڤەکان.

٦)- ﴿يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا﴾، دەڵێ: سامانێکی کەڵەکە بوو (زۆر)م سەرفکردوە، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست ئەوەیی فڵانکەسێك لە هاوبەشدانەرەکان کە زۆر ماڵی خۆی خەرج دەکرد، خۆی پێوەیە هەڵدەکێشا، بێگومان ئەو جۆرە کەسە دەگرێتەوە، بەڵام هەر کەسێکی دیکەش دەگرێتەوە کە ماڵ و سامانی هەیە، بە حەڵاڵ و حەرام وەسەرێکی ناوەو کەڵەکەو پەزمەندەی کردوەو، دواییش هەر بە ویست و خواست و ئارەزووی خۆی خەرجی دەکات، بێ ئەوەی گوێ بداتە سنوورەکانی شەریعەت.

بێگومانیش ئەمە ئەوانەی لە کۆمەڵگای پێغەمبەری خوا ﷺ دابوون لە مەککە، لە هۆزی قورەیش و جگەلە قورەیش دەیانگرێتەوە و، ئەوانەی لە هەموو کۆمەڵگاکانی دیکەش دابوون، تێکڕایان دەگرێتەوە، مادام ئەو سیفەتەیان تێدا بووبێ و تێدابێ.

٧)- ﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾، ئایا پێی وایە هیچکەسێك نەیبینیوە (ئەو ماڵەی چۆن پەیدا کردوەو چۆنیشی خەرجکردوە)؟ هەردوو پرسیارکردنەکان بۆ سەر زەنشتکردن و بۆ بە هەڵە دانان (**للتَّوبيخِ والتَّخطِئة**)ن، واتە: ئایا پێی وایە کەس توانای بەسەریدا ناشکێ؟ ئایا پێی وایە کەس نەیبینیوە (ماڵەکەی چۆن پەیدا کردوەو چۆن سەرف کردوە)؟ وشەی: ﴿ٱلْإِنسَٰنَ﴾، لێرەدا گشتییەو (أل)ە کە بۆ جینسە، بەڵام جینسی عورفیی، واتە: بەنسبەت ئەوکاتەوەی خەڵکەکە تێکڕا هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون.

لەو بارەوەش ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین، کە دەفەرموێ:

**{لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ، عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ؟ وَعَن عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِن أَيْنَ اكْتَسَبَهُ، وَفِيمَ أَنْفَقَهُ؟ وَعَن جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ؟} (أخرجه الترمذي: ٢٤١٧، والدارمي: ٥٣٧، وصححه الألباني).**

واتە: دوو پێی هیچ بەندەیەك لە ڕۆژی قیامەتدا، بەولاولادا ناچن، هەتا (لە چوار شتان) لێی نەپرسرێتەوە: تەمەنی لە چیدا بە ڕێی کردوە؟ لە بارەی زانیارییەکەشیەوە چەندە کاری پێکردوە؟ لە ماڵ و سامانەکەشی چۆنی کۆکردۆتەوەو لەچیدا سەرفی کردوە؟ لە جەستەکەیشی بە چی لەنێوی بردوە؟

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنەڕووی چوار لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا لە ژیانی هەر مرۆڤێکدا، کە بریتین لە: هەردوو چاوەکانی و زمانی و، هەردوو لێوەکانی و، ڕێی ڕاست و چەوت پێشاندانی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ﴾، ئایا دوو چاومان بۆ نەڕەخساندوون؟ ئەو مرۆڤەی ئاوا خۆی هەڵدەکێشێ بە خەرجکردنی ماڵ و سامانیەوە، ئایا دوو چاومان بۆ نەڕەخساندوون؟ دوو چاو کە هەموو شتیان پێ دەبینێ، هەرچی بە ڕێکردنی ژیانی دنیای پێویستیی پێی بێ، ببینێ؟

٢)- ﴿وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ﴾، هەروەها زمانێك و دوو لێویش؟ زمان ئەو پارچە گۆشتە ماسوولکەییەی بە کەیفی خۆی هەڵیدەسووڕێنێ و پێی دەدوێ، هەروەها دوو لێویش کە جوانیی بە دەم و چاوی دەدەن و، بۆ قسەکردنیش بەکاریان دێنێ و، بۆ خواردن بەکاریان دێنێ و هەم دەروازەشن بۆ زاری.

٣)- ﴿وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ﴾، دوو ڕێیەکانیشمان پێشان داون، دەڵێ: (**النَّجْدُ: الأَرْضُ الْمُرْتَفِعَةُ ارْتِفَاعاً دونَ الجَبَلِ أي: طَرِيقَانِ نَجْدان مُرْتَفِعان**)، (**نَجْد**): بە مانای زەوییەکە بەرز بووبێتەوە، بەڵام بەرزییەك کەمتر لە بەزریی چیا، وەك گردۆلکەیەك، دووڕێی بەرزو دیار، مەبەستیش پێیان ڕێی ڕاست و ڕێی چەوتە.

ئایا ئەو پێشاندانەی خوا ﷻ بۆ ئەو دوو ڕێیانە چۆنە؟

أ- ئەو هیدایەتە عەقڵ دەگرێتەوە، کە خوا عەقڵێکی داوە بە مرۆڤەکان، هەموویان لە هەندێ شتدا کۆکن: بۆ نموونە:

١- هەموو خاوەن عەقڵێك دەزانێ (٢ + ٢) دەكاتە (٤).

٢- هەموو خاوەن عەقڵێك دەزانێ هەموو لە بەشێكی ئەو هەمووە گەورەترە (**الكُلُّ أَكْبَرُ مِنَ جُزْئِهِ**).

٣- هەموو خاوەن عەقڵێك دەزانێ دوو شتی پێكەوە دژو پێچەوانە لە یەك كات و شوێندا، پێكەوە كۆنابنەوە، ناگونجێ شتێك هەشبێ و نەشبێ.

ب- هەروەها وێڕای هیدایەتی عەقڵ، هیدایەتی دڵ و دەروون و ناخ و زگماكیش دەگرێتەوە، هەموو مرۆڤەكان بۆ خوا تێنوون، هەموو مرۆڤەكان شەیداو عەودالی دادگەریی و پاكیی و چاكیی و جوانیین، خوا هەموو مرۆڤەكانی وا خوڵقاندوە.

ج- هەروەها هیدایەتی پێنج هەستەكانیش دەگرێتەوە، هەموو مرۆڤەكان بە چاو دەبینن، بەگوێ دەبیستن، بۆن دەكەن، تام دەكەن، دەست لە شتەكان دەدەن.

د- هەروەها هیدایەتی وەحیی و پەیامی خواش دەگرێتەوە، ئەوەش تەواوترین جۆری هیدایەت و ڕێنمایی خوای پەروەردگارەو، بەو هیدایەتە، بەڵگە لەسەر خەڵك تەواو دەكرێ و خەڵك بیانوو بڕاو دەكرێ.

زانایان لەو بارەوەش زۆریان قسە كردوە، كە ئایا مەبەست لە: ﴿ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾، چییە ؟

أ- ئایا مەبەست پێی ڕێی خواپەرستیی و پێچەوانەكەیەتی؟

ب- یان مەبەست پێی خواناسیی و پێچەوانەكەیەتی؟

ج- یان مەبەست پێی بڕواو بێبڕواییە.

د- یاخود مەبەست پێی چاكەو خراپەو ڕاست و چەوت و حەڵاڵ و حەڕامە؟

من وای تێدەگەم هەموویان دەگرێتەوە، واتە: خوا سبحانەو تعالى لە ڕێی ئەو هێزانەوەی بە مرۆڤی داون:

**١-** ئەو توانا عەقڵییەی کە بە مرۆڤی داوە.

**٢-** ئەو زگماك و ناخە پاكەی پێیداوە.

**٣-** هەروەها پێنج هەستەكانی.

**٤-** دواییش لە ڕێی وەحییەوە خوا عز وجل ئیمان و كوفری بۆ خەڵك دیارییكردوون و، خوا بەیەكگرتن و هاوبەشدانان (**توحيد وشرك**)ی بۆ لێك جیاكردوونەوە و، حەڵاڵ و حەڕام و، چاكەو خراپەو ڕاست و چەوت، هەمووی بۆ لێك جیا كردوونەوە.

شایەنی باسە:

هەندێل لەڕوونكەرەوانی قورئانیش ﴿ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾ یان بەدوو مەمكەكانی دایک لێكداوەتەوە، چونكە دوای باسی زمان و لێوەكان هاتووە، منیش ناڵێم ئەو مانایەش گونجاو نییە، بەڵام مانایەكەی دیكە گونجاو ترو فراوان ترە.

## کورتە باسێک دەربارەی
## کۆئەندامی بینین و سەرنجدانێکی زمان و لێوەکان

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ ۝٨ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ ۝٩﴾، واتــە: ئایــا دووچاومــان بــۆ نەڕەخســاندوون، زمانێــك و دوو لێــوەكان؟ ئێســتاش بــا ســەرەتا ســەرنجی چــاو بدەیــن[1]، ئــەم باســەش ڕاســتەوخۆ لــە مەوســووعەی: (درەوشاوەیی ئیــمان و پووچەڵیــی ئیلحــاد، لەبــەر تیشــكی زگــماك و عەقــڵ و زانســت و وەحیــی دا) وەردەگــرم:

١- زمـــــــان:

زمــان ئــەو پارچــە گۆشــتە ماســوولكەییەیە كــە خــوا سبحانە و تعالی خســتوویەتە نێــوان دوو شــەویلاگەكانی مرۆڤــەوەو لــە نێــو زاردایــە، زمــان لــە جووڵــەدا زۆر خێــراو چالاكــە، هــی وا هەیــە بــە خێرایــی قســەی بــۆ ناكــرێ و زمانــی تەپــە، ئــەوە حاڵەتێكــی نەخۆشــییەو حاڵەتێكــی دەگمەنــە، بــەڵام بــە زۆریــی وایــە زمــان خێرایــە، هــەم بــۆ خــواردن هەڵگێــرو وەرگێركــردن، هــەم بــۆ قســە كــردن، ئــەو زمانــە كوێــت بــوێ لــەوێ ئامــادە دەبــێ بــۆ دەربڕینــی پیتــەكان، بــۆ نموونــە: دەتــەوێ پیتــی (ت) دەرببــڕی، یەكســەر زمــان دێتــە ســەر ددانەكانــی پێشــەوە، یــان (ث) و (س) و (ش)، هەروەهــا هەندێــك لــە پیتــەكان بــە لێــوەكان دەردەبڕێــن، وەك: (م) و (ف).

بەڵــێ زمــان وێــڕای ئەوەی خــواردن هەڵگێڕو وەرگێــڕ دەكات و، بەبێ زمان ئینســان خواردنــی بــۆ قــووت ناچــێ، هەروەها زمــان پیتەكانیــش و دەنگەكانیــش دەردەچوێنێ، ئنجــا لــە نێــو زارو زمانــدا لیكێــك هەیــەو بەگوێــرەی پێویســت دێتــەدەرێ، تاكــو ئــەو پــاروە ســەرو بــەر بكــرێ و بجــوورێ و بگونجــێ قــووت بــدرێ.

---

(١) بڕوانــە: مەوســووعەی ئیــمان و ئیلحــاد، بەرگــی یەكــەم، لاپــەڕە: ٤٤٢ - ٤٤٩، چاپــی دووەم: ٢٠٢٠ ز - ١٤٤١ك.

## دوو لێوەکان:

خـوای زانـاو کارزان دوو لێویشـی بـۆ مـرۆڤ خوڵقانـدوون، کـە هـەم جوانیـی بـە دەم و چـاوی مـرۆڤ دەدەن، بیهێنـە بەرچـاوی خـۆت کەسـێك دەم و چـاوی بسـووتێ و لێوەکانـی هەڵقرچابـن ونەمابـن، چەنـد دیمەنێکـی سـەیری هەیـە، ددانەکانـی پێشـەوە هەموویـان لـە دەرەوەن، بـەڵام ئـەو دوو لێوانـە جوانیـی بـە دەم و چـاو دەدەن، هـەر کاتێـك مـرۆڤ ویسـتی دوو لێـوەکانی دادەخـات، ماسـوولکەکانی دوو لێـوەکان لاسـتیکیی و بازنەییـن، مـرۆڤ دەتوانـێ دەمـی بکاتـەوەو، ئەگـەر بیـەوێ پارووویـەك قـووت بـدات و دەتوانـێ دەمـی بێنێتـەوە یـەك، هەروەهـا ئـەو دوو لێوانـە زۆریـش یارمەتییـدەرن بـۆ قسـە کـردن، ژمارەیـەك لـە پیـت و دەنگـەکان بـە لێـوەکان دەردەهێنرێـن، وێـڕای ئەوەش دوو لێـوەکان و زمـان و زار و ددانـەکان و مەڵاشـوو، لەگـەڵ گـەروو، ئـەو دەروازەیـەن کە هـەر شـتێك مـرۆڤ بیـەوێ بیخاتـە نێـو جەسـتەیەوە، دەبـێ لەوێـوە بچـێ، خـواردن بێ، شـلەمەنیی بـێ، هـەوا بـێ، بـەڵام هـەوا بەشـێکی لـە لووتـەوە دەچـێ و دواییـش هـەر دەچێتـەوە ئـەو ڕێگایـەی خـواردن و خواردنـەوەی پێـدا دەچـێ، بۆیـەش خـوا ﷻ زمانـە بچکۆڵـەی دانـاوە لـە نێـوان دوو بۆڕیـی و دەروازەکـەی کـە بـۆ کۆئەندامـی هـەرس و، کۆئەندامـی هەناسـە دەچـن، لـەوێ هـەر کاتێـك مـرۆڤ خـواردن و خواردنە بخـوات، ئەو زمانـە بچکۆڵەیـە بـۆڕی لای هەناسـە دەگـرێ، تاکـو ئـەو خواردنـەوەو خواردنـە نەچێتـە شـوێنی هەناسـەدانەوە، هەرکاتێـك مـرۆڤ بـە پەلـە پـەل شـتێك بخـوات و، حاڵەتێکـی نائاسـایی بـێ و، هەندێـك لـە خـواردن بچێتـە نێـو بـۆڕی کۆئەندامـی هەناسـەدانەوە، هـەر دەکۆکێـت تاکـو دێتـە دەر، چونکـە چۆتـە شـوێنێکەوە هـی خـۆی نیـە.

کەواتـە: خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾ ﴾، واتـە: ئایـا دوو چاومـان بـۆ (مـرۆڤ) نەڕەخسـاندوون؟ هەروەهـا زمانێـك و دوو لێـو؟ دوو ڕێیەکانیشـمان پێشـان نـەداون؟ مـرۆڤ دەبـێ ئـاوا سـەرنج بـدات و لێـی ورد بێتـەوەو لێـی بکۆڵێتـەوە، ئێسـتاش زانسـت کـە بـەرەو پێشـەوە چـووە، زۆر یارمەتییـدەری ئینسـانی مسـوڵمانە، تاکـو زیاتـر بتوانـێ ئـەو فەرمانانـەی خـوای پـەروەردگار جێبەجـێ بـکات.

### مەسەلەی سێیەم:

**سەرزەنشتکردنی خوا بۆ مرۆڤ کە دەرووی سەختی نەبڕیوە، کە ئازادکردنی کۆیلەو تێرکردنی برسییە، پاشان بڕواهێنان و یەکدی ڕاسپاردنە بە خۆڕاگریی و بەزەیی نواندن، تاکو سەرەنجام ئەوجۆرە مرۆڤانە ببنە هاوەڵانی ڕاستە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَـٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

دوای ئایەتەکانی پێشێ کە خوا ﷻ باسی جۆرێك لە مرۆڤی بێبڕوای خۆهەڵکێش بە ماڵ و سامان خەرجکەرەوەی کردو، چوار لە نیعمەتەکانی خۆی خستنەوە یادی: هەردوو چاوەکانی و، زمان و، دوو لێوەکانی و، دوو ڕێی ڕاست و چەوت پێشاندانی، ئنجا دەفەرموێ:

**١)-** ﴿ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴾، کەچی ئەو دەرووی سەختی نەبڕیوە.

(ف)ی سەر (لا)، بۆ لق لێکردنەوە (**تَفْرِيعَ**)یە، لەسەر ڕستەی: ﴿ وَهَدَيْنَـٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴾، واتە: ئێمە دوو ڕێیەکامان پێشان داون، بەڵام ئەو ڕێی ڕاستی نەگرتوە، یانی: ﴿ وَهَدَيْنَـٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴾، بەڵام ئەو: ﴿ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴾، دەرووە سەختەکەی نەبڕیوە، کە ڕێی ڕاست بگرێ، یاخود لق لێکردنەوە (**تَفريعَ**)یە، لەسەر ڕستەی: ﴿ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴾، واتە: (**هَلاّ أَهْلَكَ مَالَهُ فِي الخَيْرِ، لا فِي الخَمْرِ والشَّرِّ**)، دەبووایە ماڵ و سامانەکەی لە چاکەدا سەرف کردبایە، نەك لە شەڕاب خۆریی و تاوان و خراپەدا.

(**الإقتِحام: تَوَسُّطُ الشِّدَّةِ المُخيْفَةِ**)، (**إقْتِحام**): بریتیە لە چوونە نێوەڕاستی شتێکی مەترسییدارەوە، بە کوردیی دەڵێن: خۆ پێدادان و خۆ تێڕاکردن.

(عَقَبـة: طَرِيـقٌ وَعِـرٌ فِي الجَبَـلِ) (عَقَبـة): ڕێیەکـی عاسـێیە لـە چیـادا، (عَقَبـة) بـە کوردیـی دەبێتـەوە: دەرووی سـەخت، کـە مـرۆڤ بـە تەنیا نەبـێ ناتوانـێ پێیـدا بـڕوا، خـوا ﷻ لێـرە دەفەرمـوێ: ئـەو کەسـە دەرووی سـەختی نەبڕیـوەو، نەچۆتـە نێـو ئـەو دەرووە سـەختەوە، تاکـو بیبـڕێ.

٢)- ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانـاندوە ئەو دەرووە سەختە چییە؟

ئنجا خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوەو دەفەرموێ:

٣)- ﴿ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴾، ئازاد کردنی کۆیلەیەکە.

٤)- ﴿ أَوْ إِطْعَـٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴾، یاخود خواردن پێدانە لە ڕۆژێکی خاوەن برسیەتییدا، وشەی: ﴿ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴾، ئازادکردنی گەردنێك، یانی: کۆیلەیەك، کە خوێندراویشەتەوە: (فَكَّ رَقَبَةً)، کەسێك کە کۆیلەیەکی ئازاد کردوە، هەروەها: ﴿ إِطْعَـٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴾ خوێندراویشەتەوە: (أَو أَطْعَمَ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ)، خواردنی داوە لە ڕۆژێکی خاوەن برسێتیی دا، (فَكٌّ): بریتیە لە وەرگرتنی شتێك لە دەستی کەسێك کە بۆخۆی گریداوەو لە لای خۆی هێشتوویەتەوە، هەروەها وشەی (فكّ) ئەسڵی واتایەکەی ڕزگارکردن و دەربازکردنە. (رَقَبَة)یش بە مانای گەردن دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای کۆی جەستەی مرۆڤەو، زیاتر بۆ کۆیلان بەکارهاتوە.

ئنجـا ئایـا ئەوکەسـە ئـەو خواردنـەی لـە ڕۆژێکـی برسـیەتیی و قـات و قڕیـی و گرانییـدا، بەکـێ داوە؟!

٥)- ﴿ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴾، هەتیوێکی خاوەن نیزیکیی و خزمایەتیی.

٦)- ﴿ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴾ یان نەدارێکی خاوەن گڵ و خۆڵ.

ئـەو دوو جـۆرە کەسـە لـە هەمـوو کـەس ئاتاجـترن: هەتیوێـك کـە خـاوەن خزمایەتیـی بـێ و، نەدارێـك کـە خـاوەن گڵ و خـۆڵ بـێ، یـانی: جگەلـە گڵ هیچـی دیکـەی نەبـێ و کەوتبێتـە سـەر زەوی.

﴿ذَا مَتۡرَبَةٖ﴾، یانی: (ذا حَاجةٍ)، ئایا لە چییەوە هاتوەوە؟ دەگوترێ: (تَرِبَ أَيْ: نامَ عَلى التُّرابِ)، لەسەر گڵ و خۆڵ نووست، واتە: کەسێك کە هیچ شتێکی بەدەستەوە نەماوە.

(یَتیم)یش (الشَّخص الَّذي لَیسَ لَهُ أَبٌ وَهوَ دوُنَ البُلوغِ)، کەسێك بابی نەمابێ و خۆشی باڵغ نەبووبێ، ﴿يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ﴾، (المَقْرَبَة: قَرابَةُ النَّسَب)، یانی: نیزیکیی ڕەچەڵەك و خزمایەتیی.

٧)- ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئنجا لەو کەسانەش بێ کە بڕوایان هێناوە، ﴿ثُمَّ﴾، لێرەدا بۆ بەدوای یەکداهاتنی ڕیزبەندییە، واتە: بڕوای هێناوە بە پاداشتی چاکی ئەو کردەوە چاکانە، ئەگەرنا پێشێ دەبێ بڕوا بە خواو بە پایەکانی دیکەی ئیمان هەبێ، ئنجا ئەو ئیمانە مرۆڤ پاڵ پێوە دەنێ بۆ هاوکارییکردنی هەتیوو هەژارو نەدار.

کەواتە: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەگەر ﴿ثُمَّ﴾ بۆ ڕیزبەندیی بەدوای یەکداهاتن بێ، یانی: لەو کەسانەش بێ کە بڕوای هەیە بەپاداشتی چاکی ئەو کردەوانە، بەڵام ئەگەر: ﴿كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ مەبەست ئەوەبێ ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە خوا ﷻ و بەڕۆژی دوایی و، پایەکانی دیکەی ئیمان، ئەو کاتە ﴿ثُمَّ﴾، بۆ ڕیزبەندیی باسکردن (للترتیب الذكري)ە، نەك ڕیزبەندیی پلە پلەیی (الترتیب الرتبي)، چونکە بڕوا بەخواو بەڕۆژی دوایی و بە کتێبەکانی خواو و بە فریشتەکان و بە پێغەمبەران، لە دوای هاوکارییکردنی هەتیوو هەژارو نەدارەوە نایەت، بەڵکو لە پێشیانەوە دێ، بەڵام لە باسکردندا خراوەتە دواوە، هەروەك لە سووڕەتی (آل عمران)یشدا خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ ١١٠﴾، واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ مرۆڤایەتیی پەیدا کراون، فەرمان بە پەسند دەکەن و ڕێ لە ناپەسند دەگرن و، بڕوا بە خوا دێنن، بێگومان بڕوا بە خوا هێنانە، مرۆڤ پاڵ پێوەدەنێ، فەرمان بەچاکە بکات و ڕێ لە خراپە بگرێ، بەڵام لەوێ لە ڕووی باسکردنەوە خراوەتە دوایە، بۆچی؟

تاكو بزانرێ بڕوا بە خوا هێنان كاتێك بەڕاستیی بە ئیمان لە قەڵەم دەدرێ، كە خاوەنەكەی وا لێ بكات، لەگەڵ چاكە دابێ و دژی خراپە بێ و، هەوڵ بدات پەسند بچەسپێنێ و ناپەسند ڕیشەكێش بكات، كۆمەڵگاو دەوروبەری خۆی لێ بژار بكات.

٨)- ﴿ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ ﴾، (هەروەها ئەو كەسانە لەوانەش بن كە) یەكدی ڕادەسپێرن بە خۆڕاگریی، (**تَواصي بالصبر**)، واتە: یەكدی ڕاسپاردن و ئامۆژگاریی یەكدی كردن، ڕێنمایی یەكدی كردن، هاندانی یەكدی بۆ خۆڕاگریی.

٩)- ﴿ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴾، هەروەها یەكدی ڕادەسپێرن و ئامۆژگاریی یەكدیش دەكەن بە بەزەیی نواندن.

خۆڕاگریی و بەزەیی نواندن، دوو سیفەتی زۆر مەزنن، لە پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانداو، مرۆڤ بەبێ خۆڕاگریی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی ڕاست بۆ بەڕێوە ناچن و، بەبێ بەزەییش بێگومان لە پەیوەندییەكانی دا وەك پێویست نابێ، ئەم دوو سیفەتە زۆر گرنگن، بۆیەش خوا ﷻ لە دوای ئیمانەوە باسی كردوون.

١٠)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴾، ئا ئەوانە هاوەڵانی خێرو چاكەن، یاخود: هاوەڵانی لای ڕاستن، ﴿ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴾، دوو واتای هەن:

أ- لای ڕاست. ب- خێردارو پیرۆزدار.

(**يَمَّنَهُ: أ- جَعَلَهُ عَلى يَمِينِهِ. ب-يَمَّنَهُ اللهُ يُمْنَاً: بَارَكَهُ**).

﴿ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴾، یان لە (**يَمَّنَهُ**)وە هاتوە، واتە: خستیە لای ڕاستی، یاخود (**يَمَّنَهُ اللهُ يُمْنَاً، أَيْ بَارَكَهُ**). یانی: خوا پیرۆزی تێخست و بەرەكەتدارو خێرداری كرد.

كەواتە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴾ یانی: ئەوانە هاوەڵانی لای ڕاستن، یاخود: ئەوانە هاوەڵانی خێرو چاكەن، بە پێچەوانەی ئەوانی دیكەوە كە هاوەڵانی

لای چەپەن، یاخود: هاوەڵانی نەگبەتیی و بێ خێریین، کە خوا ﷻ لێرەدا باسی کردوە: بڕینی دەرووی سەخت بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلەو، خواردن پێدانی نەدار، ئەو نەدارەش یان هەتیوێکی خزمە، یاخود نەدارێکی بەخاك و خۆڵەوە نووساوە، لەو بارەوە ئەم دوو فەرموودەیە دێنین:

١- فەرموودەی یەکەم: **{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُول اللَّهِ ﷺ! إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بنَ جُدْعَانَ كَانَ فِي الجَاهِلِيَّةِ يَقْرِي الضَّيْفَ، وَيَفُكُّ الْعَانِيَ، وَيَصِلُ الرَّحِمَ، وَيُحْسِنُ الْجِوَارَ، فَأَثْنَيْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ يَنْفَعُهُ ذَلِكَ؟ قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ: لَا إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا قَطُّ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي يَوْمَ الدِّينِ} (أخرجه أحمد: ٢٤٩٣٦، ومسلم: ١١٤، وإبن حبان: ٣٣٠، وأبو يعلى: ٤٢٤).**

واتە: دایکمان خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! عەبدوڵلای کوڕی جودعان لە سەردەمی نەفامییدا، ڕێزی میوانی دەگرت و، دیلی ئازاد دەکردو، پەیوەندیی خزمایەتیی دەگەیاندو، چاکەکار بوو لەگەڵ دراوسێ دا، بە چاکە باسم کرد، ئایا ئەوانە هیچ سوودی پێدەگەیەنن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، چونکە ئەو ڕۆژێك لە ڕۆژان نەیگوتوە: ئەی پەروەردگارم! لە ڕۆژی سزاو پاداشت دا، لە گوناهەکەم ببوورە! (واتە: بۆ خوای ئەنجام نەداون، بۆیە پاداشتی نیە).

٢- هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە، کە بە ڕواڵەت پێچەوانەی فەرموودەکەی پێشێیە:

**{عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الجَاهِلِيَّةِ مِن صَدَقَةٍ، أَوْ عَتَاقَةٍ، وَصِلَةِ رَحِمٍ، فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَجْرٍ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ} (أخرجه البخاري: ١٣٦٩، ومسلم: ١٢٣).**

واتە: حەکیمی کوڕی حیزام (خوا لێی ڕازی بێ) - دوای ئەوەی مسوڵمان بووە - دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! لە سەردەمی نەفامییدا هەندێك کردەوەم دەکردن، وەك خواپەرستیی، بۆ خۆ لە خوا نیزیك خستنەوە، لە

بەخشین و ئازادکردنی کۆیلەو گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، ئنجا ئایا هیچ پاداشت هەیە (لەو کردەوانەمان دا؟) فەرمووی: کاتێك مسوڵمان بووی، شتی خێرو چاکەت پێشخستوە، واتە: ئەو کردەوانەی دیکەشت بۆ حیسابن.

ئەم دوو فەرمایشتە کەسێك بەڕواڵەت تەماشایان بکات، دەڵێ: تێکدەگیرێن، لە فەرمایشتی یەکەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**إِبْن جُدعان**) هیچ بەهرە وەرناگرێ لە کردەوەکانی، کە لەسەردەمی نەفامییدا کردوونی، بەڵام لە فەرموودەی دووەمدا بە حەکیمی کوڕی حیزام دەفەرموێ: مسوڵمان بووی و چاکەت پێشخۆت خستوون، واتە: ئەو کردەوە چاکانەشت بۆ حیسابن کە لە سەردەمی نەفامییی دا کردووتن!

وەڵامەکەشی هەر ئەوەیە کە حەکیمی کوڕی حیزام دوای ئەوەی مسوڵمان بووە، ئەوەی پرسیوە، بەڵام ئەوەی دیکە مسوڵمان نەبووە، ئەمەش وەڵامێکی ڕێکە، چونکە کەسێك مسوڵمان بێ، کردەوە چاکەکانیشی کە پێش مسوڵمانبوونی کردوونی، لێیان بەهرەمەند دەبێ، بەڵام کەسێك مسوڵمان نەبێ خراپەکانی لەسەر حیسابن و کردەوە چاکەکانیشی جێی بۆ ناگرن، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾الفرقان، ڕوومان کردە ئەو کردەوانەی کردبوویانن (کردەوە چاکەکانیان) و کردمانن بە تۆزو گەردی بڵاو.

## مەسەلەی چوارەم و كۆتایی:

**بەڵام بێبڕوایان بە ئایەتەكانی خوا، هاوەڵانی چەپەو بێخێرن و، ئاگرێكی قەپات و دەرگا گاڵە دراویان لەسەر دەبێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا هُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ  ﴾

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا هُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ﴾، ئەوانەش كە بە نیشانەكانی ئێمە بێبڕوابوون، ئەوان هاوەڵانی چەپەن، یاخود: هاوەڵانی خاوەنی نەگبەتیی و بێخێریین.

٢)- ﴿عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ﴾ ئاگرێكی (دەرگا) داخراویان بەسەرەوەیە.

**(الطبري)** لە **(قتادة)**وە بە ژمارە: (٣٧٤٧٧)، هێناویەتی، دەڵێ: ﴿مُّؤْصَدَةٌۢ﴾، **(أَيْ: مُطْبَقَةٌ أَطبَقَهَا اللهُ عَلَيْهِم، فَلا ضَوءَ، وَلا فَرَجَ، وَلاَ خُروجَ مِنْهَا آخِرَ الأَبَد)**، واتە: ئەو ئاگرە خوا دەرگایەكانی لەسەریان داخستوون و گاڵەی داون، ڕۆشنایی و، دەروو لێ كرانەوە و، لێ هاتنە دەر نیە تاكو هەرە كۆتایی.

هەروەها **(الطبري)** لە **(الضَّحَّاك)**ەوە بە ژمارە: (٣٧٤٧٨) هێناویەتی، لە بارەی مانای: ﴿عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ﴾ەوە، دەڵێ: **(أَي: مُغْلَقَةٌ عَلَيْهِم)**، ئاگرەكەیان لەسەر داخراوە، واتە: ئەوانە لە شوێنێكدان، دەرگاكانییان لەسەر داخراون و، لە نێو ئەو شوێنەی تێیدان، بە ئاگریش سزا دەدرێن و دەسووتێنرێن، خوا پەنامان بدات.

وەك چۆن: ﴿ٱلْمَيْمَنَةِ﴾، بە مانای لای ڕاست **(يمين)** دێ و، بەمانای چاكەو خێر **(يُمْن)**ش دێ، ﴿ٱلْمَشْـَٔمَةِ﴾ ش بە هەمان شێوە: بە مانای لای چەپ **(شمال)** دێ و، بە مانای نەگبەت و بێ خێر **(شؤم)**یش دێ.

## هەڵوەستەیەک لە بەرانبەر
## نەهێشتنی ستەمی سیاسیی و ئابووریی دا

لە کۆتایی تەفسیرکردنی ئەم سوورەتە موبارەکەدا هەڵوەستەیەك دەکەین، لە بەرانبەر ئەو شەش ئایەتە موبارەکەدا، کە خوا تێیان دا دەفەرمووێ:

﴿ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴾، ئەو دەرووە سەختەکەی نەبڕیوە، ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴾، چی پێی زانانەدووی دەرووە سەختەکە چییە؟ کە هەرکات ئینسان بڕی، ئنجا بەرەو بەهەشت دەچێ؟ ﴿ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴾، ئازادکردنی کۆیلەیەك ﴿ أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ ﴾، یاخود خواردن پێدان لە ڕۆژێکی قات و قڕیی و گرانییدا، ﴿ يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ ﴿١٥﴾ ﴾، بە هەتیوێك (منداڵێك کە باڵغ نەبووەو، بابی مردووە) کە خاوەن نزیکایەتییشە: ﴿ أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ ﴾، یاخود نەدارێك کە خاوەنی گڵە و بە خۆڵەوە نووساوەو، هیچی نیە، هەڵبەتە مانای وانیە کە ئەو خواردن پێدان و ماڵ بەخشینە، تەنیا بۆ ئەو دووانەیە، بەڵام یانی: ئەو دووانە لە نێو کۆمەڵگادا لە هەموو توێژەکان ئاتاجترن، بۆیە خوای بەبەزەیی ﷻ وەك دوو نموونەی زەقی کە دەبێ هاوکاریی بکرێن و خواردنیان پێ بدرێ و مشووریان لێبخورێ، هێناونی.

وەك دەبینین: لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ چوونە بەهەشت بەهۆی دەرووی سەخت بڕینەوە، لە دوو کاردا خوڵاصە دەکاتەوە:

**یەکەم:** ئازادکردنی کۆیلەیەك.

**دووەم:** خواردن پێدانی کەسێکی ئاتاج، وەك هەتیوو نەدارو هەژار.

کەواتە: لە ڕاستییدا هەوڵدانی مسوڵمانان بۆ ئەوەی مرۆڤەکان سەربەست و ئازاد بن و، کەس بندەست و ژێر دەست نەبێ و کۆیلەو چەوساوە نەبێ، بەڵکو

هـەر بـە ئازادیـی بمێننـەوە، وەك چـۆن خـوا ﷻ بـە ئازادیـی خوڵقاندوونـی، وەك عومـەری کـوڕی خەتتـاب خـوا لێـی ڕازی بـێ، لـە بۆنەیەکدا بـە کەسـێك دەڵـێ: کـە سـتەمی کـردوە لـە هاوڵاتییەکـی خۆیـان هـەر لەبـەر ئـەوەی مسـوڵمان نیـە: (مَتـى اسْـتَعْبَدْتُمُ النَّـاسَ، وَقَـدْ وَلَدَتْهُـم أُمَّهَاتُهُـم أَحْـرَاراً؟!)، لـە کەیـەوە خەڵکتـان کردۆتـە کۆیلـە، کـە دایکیـان بـە ئازادیـی هێناونیـە دنیـاوە، واتـە: مرۆڤـەکان هەموویـان بـە ئازادیـی لـە دایـك دەبـن، کەواتـە: کـە دوایـی مرۆڤێـك، یاخـود کۆمەڵـە مرۆڤێـك، یـان نەتەوەیـەك ژێـر دەسـت دەکـرێ و دەچەوسـێنرێتەوە، ئـەوە پێچەوانـەی ئـەو حاڵەتـە ئاسـاییی و سرووشـتییەیە کـە خـوا لەسـەری خوڵقانـدوە، کـە بریتیـە لـە ئازادیـی و سەربەسـتیی، بۆیـەش خـوای دادگـەر ﷻ چوونـە بەهەشـتی بەسـتۆتەوە بـەوەوە کـە مـرۆڤ دەبـێ دەرووی سـەخت ببـڕێ، ئنجـا بڕینـی دەرووە سەختەکەشـی بـەوە داناوە کـە بریتیـە لـە: ئازادکردنـی کۆیلەیـەك، یـەك مرۆڤـی کۆیلـەو ژێـر دەسـت، لـە ژێـر دەسـتیی و کۆیلایەتیـی، دەری بێنـی و ڕزگارو ئـازادی بکـەی، مانـای وایـە بەهـۆی ئـەوەوە نیـوەی ئـەو دەرووە سـەختەت بڕیـوەو، نیوەکـەی دیکـەشی ئەوەیەکـە:

لـە ڕۆژێکـی برسـیەتیی و قـات و قڕیـی و گرانییـدا، خـواردن بـدەی بـەو کەسـانەی پێویسـتییان پێیەتـی، بـە تایبـەت منداڵێکـی بـێ بـاب، هەروەهـا نەدارێـك کـە بـە گڵ و خۆڵـەوە نووسـاوەو، هیچـی نیـە.

ئنجـا ئەگـەر دەرووی سـەختبڕین، بریتـی بـێ لـە ئـازاد کردنـی کۆیلەیـەك، هەروەهـا تێرکردنـی برسـییەك، ئایـا ئازادکردنـی نەتەوەیـەك کـە زەبـوون و ژێـر دەسـتکراوەو، خاوەنـی زەوی خـۆی نیـە، خاوەنـی ئیـرادەی خـۆی و قـەوارەو ئیـدارەی خـۆی نیـە، خاوەنـی چارەنـووسی خـۆی نیـە، هەروەهـا دەربازکردنـی میللەتێـك و کۆمەڵگایـەك لـە برسـیەتیی و قـات و قڕیـی، دەبـێ چەنـد خێـر بـێ؟ بێگومـان خێرێکـی زۆر گەورەیـە، بۆیـەش خـوا ﷻ کردوویـەتی بـە سـەنگی مەحەکـی دینداریی و ئیمانداریـی و مسـوڵمانێتیی.

لێرەدا دەپرسین: بۆچی خوا فەرموویەتی: ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾﴾؟! تاكو بزانین: ئازاد کردنی کۆیلەیەکیش ئەوەندە خێرو پاداشتی هەیە، چ جای سەدان و هەزاران کۆیلە، هەروەها تێرکردنی هەتیوێکی ئاتاج و برسیی، هەروەها نەدارێکی برسییش ئەوەندە خێرو پاداشتەی هەیەو هێندە شتێکی گرنگە، چ جای کۆمەڵە خەڵکێك و کۆمەڵگایەك کە تووشی قات و قڕیی و برسێتیی بووە!

بۆیە پێویستە وەك مسوڵمان و خەڵکی ئیسلام، زۆر هەستیار بین بەرانبەر بە ئازادیی مرۆڤەکان، هەروەها بەرانبەر بە تێرییان، بەرانبەر بە ئەمانیان و بەرانبەر بە نانیان، بەرانبەر بەوەی مرۆڤەکان خوا خوڵقاندوونی، کە ئازادو سەربەست بن و، ئازادانەو سەربەستانە تاقیکردنەوەی بەندایەتیی خۆیان بدەن لەسەر زەوی، هەروەها خوا مرۆڤەکانی خوڵقاندوون و دنیاشی بۆ پڕ کردوون لە نازو نیعمەت، تاکو تێر بن و برسیی نەبن، چونکە مرۆڤی کۆیلەو مرۆڤی برسیی، مسۆگەر بیر کردنەوەشی ڕاست و دروست نابێ، بۆیە پێویستە ئێمە وەك مسوڵمانان و خەڵکی ئیسلام بزانین، کە دینەکەمان دینی ئازادیی و سەربەستییە بۆ هەمووکەس، لێرە خوا ﷻ نەیفەرمووە: ئەو کۆیلەیەی ئازاد دەکرێ، مسوڵمانە، یان نامسوڵمانە، ڕەش، یان سپییە، خوێندەوارە، یان نەخوێندەوارە، کوردە، یان عەرەبە، یان چ گەلێکە، یان چ زمانێکە، هەر کەسێك کۆیلە بێ، دەبێ کار بکەی بۆ ئازادکردنی ئەو کۆیلەیەو، هەرکەسێك برسیی بێ، دەبێ کار بکەی بۆ تێر کردنی ئەو برسییە.

ئنجا ئەگەر تەماشای بارودۆخی ئێستای دنیاش بکەین، بەڵێ بە فەرمیی کۆیلایەتیی لە سەدەی نۆزدەیەمەوە نەماوە، بەڵام هەر فەرمیی و ڕواڵەتیی، ئەگەرنا لە حەقیقەتدا بە تایبەت ئەگەر تەماشای بارودۆخی مسوڵمانان بکەی، هەروەها گەلانی دیکەی ژێر دەست، دەبینین زلهێزەکان بە چاوی کۆیلە تەماشایان دەکەن، وەك خزمەتکار تەماشایان دەکەن و، مامەڵەیان لەگەڵدا

دەکـەن و، ئەمـەش حاڵەتێکـی نائاسـاییەو، حاڵەتـی ئاسـایی و سرووشـتیی ئەوەیـە کـە مرۆڤـەکان هەموویـان ئـازادو سەربەسـت بـن، خاوەنـی زەوی و خاکـی خۆیـان و، بوونـی خۆیـان و، ئیـدارەی خۆیـان بـن، ئـەوە حاڵەتـی ئاسـاییە، هەروەهـا نـازو نیعمەتـی وڵاتـی خۆیـان، خۆیـان خاوەنـی بـن، نـەك زلـهێزێك بـێ، بـە زۆر خۆییـان بەسـەر دا بسـەپێنێ و، نەوتەکەیـان بـە تـاڵان بـەرێ و، غازەکەیـان بـە تـاڵان بـەرێ و، خێـرو بێـری دیکەیـان بەتـاڵان بـەرێ! ئـەوە حاڵەتێکـی ڕەفـز کـراوە، لـە شـەریعەتی خـوای دادگـەرو کارزان داو، مسـوڵمانانیش دەبـێ بـە ئەرکـی سەرشـانی خۆیانـی بزانـن، ئەگـەر بیانـەوێ دەرووی سـەخت ببـڕن و سـەرکەون و بچنـە نێـو بەهەشـتی خـواوە، زۆر بەجیددیـی خـەم و مشـوور بخـۆن لـە ئازادکردنـی کۆیلـەکان و، تێـر کردنـی برسـییەکان.

خـوای پـەروەردگار لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە بـەو شـێوەیە دەبـن و، هەمـوو توانایەکانـی خۆمـان بخەینـە گـەڕ بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئـەو ئامانجـە شـەرعییانەی خـوا ﷻ ئـاوا گرنگیـی و بایەخـی پێـداون، لـە دوا فەرمایشـت و پەیامـی خـۆی دا بـۆ مرۆڤایەتیـی.

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیر کردنی سووڕەتی (البلد)، دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێــــزان!

ئەمـڕۆ (٧)ی مانگـی (**ذي الحِجَّة**)، واتـە: مانگـی (١٢)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچـی، بەرانبـەر (٢٨)ی تەممـوز، واتـە: مانگـی (٧)ی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زاینیـە، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الشَّـمس**)، پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الشمس) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە نـاوی (**سـورة الشَّـمسَ**)ە، بـەڵام بوخـاری لـە کتێبـە ناودارەکـەی خۆیـدا (**الجَامِـع الصَّحيح**) بـە نـاوی سـوورەتی (**سُـورَةُ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا**) هێناویەتـی.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بەیـەك دەنگـی زانایـان ئـەم سـوورەتە مەککەییـە، لـە مەککـە دابەزییـوە، لـەم بارەشـەوە ئـەم دەقـە دێنیـن.

(**عَنْ عَبدِ اللهِ ابْنِ عَبَّاس رضي الله عنه، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَة وَالشَّمْسِ وَضُحها بِمَكَّة**)[1].

---

(١) ذَكَـرَهُ السـيوطي فِي الـدُّرّ المنثـور: ج٨، ص٨٢٧، ونسـبه لابـن الضُّريْـس وَالنَّحَّـاس، وابـن مَردَويـه، والبيهقـي وقـال: وأخـرج ابـن مردويـه عَـن عَبْـدِ اللـهِ ابـن الزبير مِثْلَـهُ، الإسـتيعاب فِي بيـان الأسـباب: ج٣، ص٥١٤.

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس رضي الله عنه، گوتوویەتـی: سـوورەتی ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾، لـە مەککـە دابەزیـوە.

هەروەهـا ئیبنـو مـوڕدەوەی، لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـرەوە رضي الله عنه، بەهەمـان شـێوە، ئەویـش گوتوویەتـی: {نَزَلَـت سُـورة ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾ بِمَكَّةَ}. ئـەم سـوورەتە لـە مەککـە دابەزیـوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

ڕیزبەندیـی لـە (مصحـف)دا ژمـارە: (٩١)ە، لـە (الفاتحـة)ەوە کـە دێیـن، ئەمـە (٩١)یەمیـن سـوورەتە، لـە ڕیزبەندیـی هاتنـە خـواردا (٢٦)ەمیـن سـوورەتە، پێـش سـوورەتی (الـبروج) و دوای سـوورەتی (القَـدر)، دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە:

لـە لای زۆربـەی زانایـان پـازدە (١٥)، لـە لای ئەهلـی مەککـە شـازدە (١٦) ئایەتـن، بـەڵام زیاتـر پازدەکـە تەبەننیکـراوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە موبارەکە دوو بابەتی سەرەکیی گرتووونە خۆی:

١- لە ئایەتەکانی: (١ - ١٠)، یازدە (١١) سوێند خواردنی خوا سبحانه وتعالى لەسەر سەرفرازبوونی بابای تەزکیەکارو، بێمرادیی و پەشێمانیی بابای خۆ بن چڵك و چەپەڵی گوناهدەر.

٢- لە ئایەتەکانی: (١١ - ١٥)، کە دەکاتە (٥) ئایەتی کۆتایی، باسی گەلی سەموود کە لە قسەی پێغەمبەرەکەیان صاڵح عليه السلام دەرچوون و سەرەنجام خوا سزایەکی توندیان دوای ئەوەی حوشترەکەی صاڵحیان- کە خوا وەك موعجیزەیەك لە شاخێك، لە تاتە بەردێکی گەورە بۆی دەرهێنابوون - پەییان کردو[1] کوشتیان، خوا سبحانه وتعالى سزای دان.

---

(١) پەییان کرد: چوارپەکیان بڕین، پەیکردن، پەیکردن: چوار پەل بڕین.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لەم سووڕەتەدا دوو تایبەتمەندیمان کەوتوونەتە بەرچاو:

**١-** سوێند خواردنی خوا ﷻ بە یازدە (١١)، یان بەلای کەمەوە بە حەوت (٧) شت، کە زۆرترین ڕێژەی سوێند خواردنە، ئەوانی دیکە، خوا یان سوێندی بە شتێك خواردوە، یان بە دووان، یان سێیان، یان بە چواران، یان بە پێنج، هیچ کام لە سووڕەتەکانی دیکە سوێندەکانیان لە پێنج تێنەپەڕیون، بەڵام ئەم سووڕەتە دەگونجێ بڵێین: خوا سوێند بە حەوت (٧) شتان خواردوە، دەشگونجێ بڵێین: سوێندی بە یازدە (١١) شت خواردوە.

**٢-** چەند وشەیەك کە تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون:

(جَلَّىٰهَا) واتە: دەریخستوە.

(طَحَىٰهَا) واتە: پان ڕایخستوە.

(فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا) واتە: تاوانباریی و پارێزکاریی فێرکردوە، شارەزای کردوە.

(خَابَ مَن دَسَّىٰهَا) واتە: پەشێمان و بێمرادە ئەو کەسەی نەفسی خۆی پەنهان کردوە، لە بن چڵکی گوناهاندا.

(فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ) واتە: خوا ﷻ لەرزاندنیەوە، یان تەختی کردن، یەکسانی کردن لەگەڵ خاکدا.

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە کۆی پازدە (١٥) ئایەتەکان دەکەینە یەك دەرس، لەبەر ئەوەی هەموویان پێکەوە تێکهەڵکێشن، هەرچەندە دوو بابەتن، بەڵام بابەتی دووەمیشیان هەر تەواوکەری بابەتی یەکەمە.

کەواتە: دێینە سەر بڕگەکانی ئەم دەرسە کە کۆی پازدە (١٥) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکە پێکدێنێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە ئـەم سـوورەتە هەمـووی یانـی: هـەر پـازدە (١٥) ئایەتەکـەی دەگرێتـەوە، ئـەو (١٥) ئایەتـەش دوو تـەوەری سـەرەکیین:

یەکـەم: لـە ئایەتەکانـی: (١ - ١٠) دا، خـوا ﷻ یـازدە (١١) سـوێندان دەخـوات بـە یـازدە (١١) شـتان، وەڵامـی سـوێندەکەش بریتیـە لـەوە کـە مـرۆڤ بەهـۆی خـۆ پـاك چاککردنـەوە سـەرفراز دەبـێ، بـەڵام بەهـۆی نەفسـی خـۆ پەنهانکـردن لـە بـن کەمـڕەو چڵکـی گوناهانـدا، پەشـیمان و بەدبەخـت و بێمـراد دەبـێ.

دووەم: لـە پێنـج ئایەتـی کۆتایی دا: ئایەتەکانی: (١١ - ١٥) باسـی گەلی سـەموودە، کـە پێغەمبەرەکەیـان صاڵـح ؑ بـووە و، ئێمـە لـە کاتـی تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الحِجر**)دا، باسـی گەلـی سـەموود و پێغەمبەرەکەیـان (صاڵح)مـان کـرد، کـە دوای ئـەوەی لـە قسـەی صاڵـح دەردەچـن و، ئـەو حوشـترەی خـوا وەك موعجیزەیەکـی تایبـەت بـە صاڵحـی داوە و، لـە بەردێـك بـۆی دەرهێنـاوە، کـە خەڵکەکـە داوایـان لێکـردوە بەڵگەیەکیـام بـۆ بێنێـت، وەك کاتـی خـۆی لـە بەسـەرهاتەکەیدا باسـمان کـردوە، دوای ئـەوەی حوشـترەکە پەیـی دەکـەن، پێشـێ چوارپەلەکان دەبـڕن و دوایی سـەری دەبـڕن، خـوا ﷻ سـێ ڕۆژ مۆڵەتیـان بـۆ دادەنـێ، دوای سـێ ڕۆژەکـە ئـەو بەڵا گەورەیـان بـە مـل دادێ، کـە بریتـی بـووە لـە هەڕژنـگ و دواتـر لەرزینەوەیـەك، بریتـی بـووە ، کـە بەهۆیـەوە هەموویـان لەگـەڵ زەویـدا تەخـت و یەکسـان دەبـن.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴿١﴾ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴿٢﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ﴿٤﴾ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ﴿٥﴾ وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا ﴿١٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا ﴿١١﴾ إِذِ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُمْ بِذَنْبِهِمْ فَسَوَّاهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا ﴿١٥﴾ ﴾

## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . سوێند بە خۆرو بە تیشکەکەی ﴿١﴾ سوێند بە مانگ، کاتێك بە دوای (خۆردا) دێ ﴿٢﴾ سوێند بە ڕۆژگار کاتێك ڕۆشنی کردەوە ﴿٣﴾ سوێند بە شەوگار کاتێك دایدەپۆشێ ﴿٤﴾ سوێند بە ئاسمان و بەوەی بنیاتی ناوە ﴿٥﴾ سوێند بە زەوی و بەوەی ڕایخستوەو لێکی وەدوورخستوە ﴿٦﴾ سوێند بە نەفس و بەوەی ڕێکیخستوە ﴿٧﴾ ئنجا خراپەکاریی و پارێزکاریی فێر کردوە ﴿٨﴾ مسۆگەر سەرفرازە کەسێك پاکو چاکی کردوە ﴿٩﴾ مسۆگەریش بێمرادە کەسێك (لە بن کەمرەی گوناهان دا) پەنهانی کردوە ﴿١٠﴾ (گەلی) سەموود بە هۆی یاخیبوونیانەوە بە درۆیان دانا ﴿١١﴾ کاتێك خراپترین کەس بە خێرایی دەرچوو (بۆ پەیکردنی حوشترەکە) ﴿١٢﴾ پێغەمبەر خواش (صالح) پێیگوتن: وریای حوشترەکەی خواو ئاو خواردنەوەکەی بن! ﴿١٣﴾ کەچی بەدرۆیان داناو پەییان کردو (سەریان بڕی)و پەروەردگاریشیان بە هۆی گوناهەکەیانەوە، بەڵایەکی بەسەردا گشتاندن ئنجا ختی کردن، ﴿١٤﴾ لەسەرەنجامەکەشی ناترسێ ﴿١٥﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَضُحَىٰهَا): (الضُّحَى: إِنْبِسَاطُ الشَّمْسِ وَامْتِدَادُ النَّهَارِ، وَسُمِّيَ الوَقْتُ بِهِ)، (ضُحَى): بریتیە لە بڵاوبوونەوەی تیشكی خۆرو درێژە كێشانی ڕۆژ، بەكاتی چێشتەنگاوییش گوتراوە: (ضُحى).

(جَلَّىٰهَا): (أَصْلُ الجَلْوِ: الكَشْفُ الظَّاهِرُ وَالتَّجَلِّي: الظُّهُور)، (جَلْو): لە ئەسڵدا بە مانای دەرخستن و ئاشكرا كردنە، (تَجَلِّي)ش بە مانای دەركەوتنە.

(طَحَىٰهَا): (الطَّحو كَالدَّحْوِ وَهُوَ بَسْطُ الشَّيْءِ وَالذَّهَابُ بِهِ)، (طَحو)، وەك (دَحُو) وایە لە واتادا، بەڵام (دَحُو)، بە مانای پانڕاخستن، بەڵام (طَحُو) بریتیە لە ڕاستن، وێڕای دوورخستنەوەش.

(سَوَّىٰهَا): (تَسْوِيَةُ الشَّيءِ جَعَلَهُ سَوَاءً)، واتە: شتێك ڕێك بێت، چاك بێت، ڕێكوپێك بێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَسَوَّىٰكَ ﴿٧﴾﴾الإنفطار، (أَيْ جَعَلَ خِلْقَتَكَ عَلى ما اقْتَضَّ الحِكْمَة)، واتە: دروستكرانی تۆی وا لێكردوە وەك حیكمەت دەیخوازێ.

(فَأَلْهَمَهَا): واتە: فێری كرد، (الإِلْهامُ: إِلقَاءُ الشَّيْءِ فِي الروُّعِ وَيَخْتَصُّ ذَلِكَ بِمَا كَانَ مِن جِهَةِ اللهِ أَوْ جِهَةِ المَلأَءِ الأَعْلى)، (إِلهام): بریتیە لە خستنە نێو دڵ و عەقڵ، ئەویش تایبەتە بەوەی لەلایەن خواوە، یاخود لەلایەن فریشتەكان كە لە بەرزیین، دێ.

(فُجُورَهَا): (الفَجْرُ: الشَّقُّ شَقًّا وَاسِعاً)، (فَجْر)، بریتیە لە لەتكردنی شتێك بەفراوانیی، (وَالْفُجُور: شَقُّ سَتْرِ الدِّيانَةِ)، (فُجور): بریتیە لە لەتكردنی پۆشاكی دینداریی و مسوڵمانێتیی و چوونە نێو گوناهو تاوانەوە.

(خَابَ): (الخَيْبَـة: فَـوتُ الطَّلَـبِ)، (خيبـة): بريتيـە لـە بێمراديـی، بـەدوای دادەچـی لـە، دەسـتت بچـێ.

(دَسَّىٰهَا): (أَيْ: دَسَّسَـهَا فِي المَعَـاصِي، فَأَبْـدَلَ مِـنْ إِحْـدَى السِّينَاتِ يَـاءً مِثْـلُ: تَظَنَّيْـتُ أَي: تَظَنَّنْـتُ)، (دَسَّـاهَا)، لـە ئەسـڵدا، (دَسَّـسَ)ە بـووە، واتـە: نەفسـی خـۆی لـە نێـو گوناهانـدا پەنهـان کـردوە، ئنجـا یەکێـك لـە سینەکان کـراوە بـە (ی) وەك: (تَظَنَّنْـتُ)، دوایـی کـراوە بـە (تَظَنَّيْـتُ)، واتـە: گومانـم بـرد.

(بِطَغْوَىٰهَآ): (طَغَـوْتُ، وَطَغَيْـتُ، طِغْوَانـاً، وَطُغْيَانـاً، وَأَطْغَـاهُ كَـذَا: حَمَلَـهُ عَـلَى الطُّغيانِ، وَالطُّغيـانُ تَجَـاوزُ الحَـدِّ فِي العِصْيَـان)، (طَغَـوْتُ) و، (طَغَيْـتُ)، وەك کـرداری ڕابـردوو هاتـوون، (طُغْـوان) و (طُغْيـان)، وەك چـاوگ هەردووکیـان هاتـوون، (وَأَطْغَـاهُ كَـذَا حَمَلَـهُ عَـلى الطُّغيَـان)، واتـە: وای لێکـرد (طُغيـانِ)ی ببـێ، (طُغيَـان) چیـە؟ (تَجـاوزُ الحَـدِّ فِي العِصيـان)، سـنووربەزاندن لـە سـەرپێچییدا.

(ٱنۢبَعَثَ): (الإِنْبِعَـاثُ: التَّوجُّـهُ وَالمُـضِيّ وَالبَحْـثُ إِثَـارَةُ الـشَّيءِ وَتَوْجِيهُـهُ)، (إِنْبِعـاث): بريتيـە لـە ڕووکردنە شـتێك، ڕۆیشـتن بـەرەو شـتێك، (بعـث): بريتيە لە هەڵگیرسـاندنی شـتێك، ناردنـی شـتێك و ئاڕاسـتە کردنـی بـەرەو لایـەك.

(أَشْقَىٰهَا): (الشَّـقَاوَةُ: خِـلَافُ السَّـعَادَة، وَأَشْـقَاهَا، أَيْ أَتْعسُـها)، (شَـقَاوَة): بێبەختـی، ڕۆژ ڕەشـی، نەگبەتـی، پێچەوانـەی (سَعَادَة)ە، واتـە: بەختـەوەری، ئنجـا (أَشْـقَاهَا أَيْ: أَتْعسُـها)، واتـە: لـە هەموویـان خراپـترو نەگبەتـر.

(وَسُقْيَٰهَا): (السَّـقْيُ وَالسُّـقْيَا: أَنْ يُعطِيَـهُ مَـا يَـشْرَبْ)، (سُـقْي، سَـقْيا)، هەردووکـی ئەوەیـە ئـەوەی دەیخواتـەوە پێـی بـدرێ.

(فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ): (أَيْ: أَهْلَكَهُـم، وَقِيـلَ: الدَّمْدَمَـةُ: حِكَايَـةُ صَـوْتِ الهَـدَّةِ) (دَمْـدَمَ عَلَيْهِـم) واتـە: فەوتاندنـی، گوتـراوە: (دَمْدَمَـة) گێڕانـەوەی دەنگـی کەوتنـە خـوارو ڕاشـەقێنرانە، گوتـراوە: (دَمْـدَمَ) (أَيْ غَضِـبَ)، توورەبـوو، (دَمْـدَمَ عليهـم أَيْ: طَحَنَهُـم

**فَأَهْلَكَهُـم**)، هارِینـی و کۆتایـی پێهێنـان، هەروەهـا (**دَمْـدَمَ عَلَيْهِـم أَي: أَطْبَـقَ عَلَيْهِـم**)، واتـە: سـزاکەی وا بـۆ ناردوون دەورەیـان بـدات و هیچ دەرفەتـی هەڵاتـن و ڕاکردنیان نەبـێ.

(**فَسَوَّىٰهَا**): (**جَعَلَهَـا سَـوِيّاً، سُـوِّيَتْ عَلَيْـهِ وَبِـهِ الأَرْض، أَيْ هَلَـكَ فِيهَـا**)، (**فَسَوَّىٰهَا**)، چاکیکـرد، ڕێکـی کـرد، ئـەوە واتایەکـی، بـەڵام لێـرەدا (**فَسَوَّىٰهَا**): واتـە: هەموویانـی تەختکـرد، یاخـود سـەرزەمینەکەیان و شـارەکەیانی تەختکـرد، بەرزیـی و نزمیـی تێـدا نەمـا، دەگوتـرێ: (**سُـوِّيَتْ عَلَيْـهِ الأَرْضُ وَسُـوِّيَتْ بِـهِ الأَرْض**)، هەردووکیـان بـە مانـای (**هَلَـكَ فيهـا**)، کـە بگوتـرێ: سـەر زەوی لەسـەر تەخـت کـرا، یـان سـەر زەوی پـێ تەخـت کـرا، لەگـەڵ زەویـدا تەختکـرا، واتـە: لـەوێ فەوتـا.

(**عُقْبَـٰهَا**): (**العُقْبـى: الآخِـرَة**)، (**عُقْبـى**): بەمانـای مەنزڵـگای کۆتایـی و گەڕانـەوە دێ، کۆتایـی هـەر شـتێك و سـەرەنجامی هـەر شـتێك پێـی دەگوتـرێ: (**عُقبـى**) (**وَالعُقْبـى البَـذْلُ**)، جێگـرەوەی کارێـك.

کەواتـە: ﴿ وَلَا يَخَافُ عُقْبَـٰهَا ﴾، واتـە: لـە سـەرەنجام و سـزای ئـەو بەڵایـەی بەسـەری هێنـان (خـوای پـەروەردگار) بێبـاك و بێـترس بـوو.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا دەفەرمویٚ:

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١- ئەم قورئانخوێندنە بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە دەست پیٚ دەکەم، نەك بەناوی هەر کەسێك و هەر شتێکی دی.

٢- ئەم قورئان خوێندنە بۆ خوا دەستی پێدەکەم.

٣- ئەم قورئان خوێندنە بە پێی بەرنامەی خوا، جێبەجیٚ دەکەم.

٤- ئەم قورئان خوێندنە بە هێزو توانایەك کە خوا بۆی ڕەخساندووم، ئەنجام دەدەم.

﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴾، سوێند بە خۆرو بە تیشکەکەی، ﴿ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴾، سوێند بە مانگ کە بەدوای دادیٚ، واتە: بە دوای خۆر دادیٚ، مانگ ئەو کاتەی سەرەتای مانگە، کاتێك خۆر ئاوا دەبیٚ، سەرەتای مانگ دەبیٚ لەو کاتەدا بۆی بگەڕێی واتە: مانگی یەك شەوە، ئنجا ئەگەر بەیەك شەوە دەرنەکەویٚ، بە دوو شەوە دەردەکەویٚ، دوای خۆر ئاوابوون، کەواتە، دوای ئەوەی خۆر ئاوا دەبیٚ، ئنجا مانگ دەردەکەویٚ، ئەوە لە ڕوویەکەوە، لە ڕوویەکی دیکەشەوە: مانگ بە دوای خۆر دادیٚ لە تیشکدا، دیارە خۆر تیشکەکەی زاتییە وەک دوایی، کورتە باسێك لە بارەی خۆرەوە دەکەین، بەڵام مانگ تیشکەکەی وەدەستهێنراوە (كَسْبي) ەو، لە خۆرەوە تیشکی بۆ دیٚ، کەواتە: لە ڕووی تیشکەوە مانگ لە دوای خۆر دیٚ، لە ڕووی کاتیشەوە بە هەمان شێوە: ﴿ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴾ سوێند بە ڕۆژگار کاتێك کە دەیدرەوشێنێتەوە، چی دەدرەوشێنێتەوە؟ ڕۆژگار زەوی

دەدرەوشێنێتەوە، ڕاناوەکەی بۆ زەوی دەچێتەوە، هەرچەندە هەندێك گووتویانە: بۆ خۆر دەچێتەوە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە خۆرە ڕۆژگار پەیدا دەکات، نەك ڕۆژگار بێ خۆر بدرەوشێنێتەوە، بۆیە ڕاناوەکە بۆ زەوی دەچێتەوە هەرچەندە باسی زەوی نەکراوە، بەڵام هەمموو ئەو شتانەی بەسیاق و سەلیقە دەزانرێ، خوای پەروەردگار ڕاناویان بۆ لا دەگێڕێتەوە، ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ﴾ سوێند بە شەوگاریش کاتێك دایدەپۆشێ، زەوی دادەپۆشێ، ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴾ سوێند بە ئاسمان و بەو کەسەی کە بنیاتی ناوە، ئەگەر (مَا)، (مَوْصولة) بێ، یانی: (وَٱلسَّمَآءِ وَالَّذي بَنَىٰهَا)، سوێند بە ئاسمان و سوێند بەو کەسەش کە بنیاتی ناوە، بەڵام ئەگەر (ما) لێرەدا (مَصْدَريَّة)، چاوگ بێ، یانی: (وَٱلسَّمَآءِ وبناءها)، سوێند بە ئاسمان و سوێند بە بنیاتنانی ئاسمانیش، ئاسمان هەمموو ئەوەی پێی دەگوترێ: گەردوون و بوونەوەر هەمووی دەگرێتەوە، ﴿ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴾ سوێند بە زەوی و بەو کەسەش کە زەوی ڕاخستووە، یاخود سوێند بە زەوی و بە ڕاخستنی زەویش، بەپان ڕاخستن و دوور خستنەوەی زەوی، ﴿ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴾، سوێند بە نەفس، بەو کەسەی ڕێکیخستوو، یاخود ئەگەر (ما) لێرەدا چاووگ، (مَصْدَريَّة) بێ، یانی: سوێند بە نەفس و بە ڕێکوپێك کردنەکەی، بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر دێتە عەقڵ و زەینەوە، سوێند بە نەفس و بە ڕێکخەری نەفس، ﴿ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ﴾ هەم تاوانباریی و خراپەکاریی فێر کردوە، هەم پارێزکاریشی فێر کردوە، واتە: خوا نەفسی بەشەری وا خوڵقاندوە بتوانێ خراپەش بکاو چاکەش بکات، چەوتیش بڕواو، ڕاستیش بڕوا، ئەگەر واش نەبووا بە کەڵکی تاقیکردنەوە نەدەهات، فریشتەکانی بە کەڵکی تاقیکردنەوە نایەن، بۆچی؟ چونکە ناتوانن خراپە بکەن، ﴿ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦ ﴾التحريم، هەروەها هەندێك لە دروستکراوەکانی دیکە، ئاژەڵ و ڕووەك و زیندەوەرو پەڕەورو ماددەی بێ ژیان بە کەڵکی تاقیکردنەوە نایەن، چونکە خێرو شەڕیان لە دەست نایەت، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ بەرەو سەربچێ بەهۆی

تەقـواوە و، دەتوانـێ بـەرەو خـوار بچـێ، بەهـۆی تـاوان و خراپـەو لادانـەوە، ئنجـا وەڵامـی ئـەو سـوێندانە کـە یـازدە (١١) سـوێندن، یاخـود (٧) سـوێندن، ئەگـەر بڵێیـن: خـۆرو تیشـکەکەی هەمـووی یەکـە و، مانـگ کـە بـەدوای دادێ ئـەوە دوو، ڕۆژگار کـە ڕۆشـنی دەکاتـەوە، ئـەوە سـێ و، شـەوگار کـە دادەپۆشـێ واتـە: زەوی دادەپۆشـێ ئـەوە چـوار و، ئاسـمان و بنیاتنانەکـەی، یاخـود بنیاتنەرەکـەی ئـەوە پێنـج، و زەوی و ڕاخەرەکـەی لێـك دوورکەوتنەوەکـەی، یاخـود ئـەوەی لێکـی دوورخسـتۆتەوە، ئـەوە شـەش، ئنجـا نەفـس و ئـەوەی ڕێکوپێکـی کـردوە، دەبـن بەحـەوت سـوێند، بـەڵام ئەگـەر خـۆرو تیشـکەکەی دووان بـن، مانگیـش ئـەوە سـێ و، ڕۆژگار کـە زەوی دەردەخـا ئـەوە چـوار و، شـەوگار کـە دایدەپۆشـێ ئـەوە سـوێندی پێنجـەم، (واتـە: زەوی دادەپۆشـێ)، ئاسـمان و ئـەوەی کەسـەری ئاسـمانی بنیاتنـاوە، ئـەوە شـەش و حـەوت، زەوی و ئـەوەی زەوی پانڕاخسـتوە، ئـەوە هەشـت و نـۆ و، نەفـس و ئـەوەی نەفسـی ڕێکـو پێـك کـردوە ئـەو دەو یـازدە، کەواتـە: بوونـە (١١) سـوێند، جـا وەڵامـی ئـەو (١١) سـوێندانە ئەوەیـە:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾، بەڕاسـتیی سـەرفرازە، ﴿ قَدْ ﴾ کـە دەچێتـە سـەر کـرداری ڕابـردوو، مانـای سـاغکردنەوەو جەختکردنـەوە دەگەیەنـێ، ﴿ أَفْلَحَ ﴾، بەڕاسـتیی سـەرفراز و خۆشـبەختە و بـە ئامانـج گەیشـتوویە، ﴿ مَن زَكَّىٰهَا ﴾، ئـەو کەسـەی ئـەو نەفسـەی چـاك و پـاك کـردوە، ئێمـە دوایـی لـە کۆتایـی تەفسـیرکردنی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، کورتـە باسـێك لـە بـارەی تەزکییەی نەفسـەوە دەکەیـن، بـەڵام (**تزكية**)، سـێ واتـای هـەن:

**یەکەم/** پاك بوون.

**دووەم/** چاك بوون.

**سێیەم/** گەشە کردن.

**(الطَّهارَةُ والنّمُوُّ وَالصَّلاح).**

کەواتە: ئەو کەسە سەرفرازە و بە ئامانج گەیشتوویە کە خۆی بژار کردوە و لە سیفەتە خراپەکان، پاکی کردۆتەوە و گەشەی بەخۆی داوە، سیفەتی تەقوای لەخۆیدا زیاد کردوەو گەشەی پێداوە و، خۆشی چاك کردوە، کە لە ئەنجامی پاك بوون و گەشە کردندا، نەفسی مرۆڤ چاك دەبێت.

﴿ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾ بە دڵنیاییش پەشێمان بێمراد و، دۆڕاوە، ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی شاردۆتەوە، واتە: وەبن گوناهانی خستوە، لە جیاتی ئەوەی گەشەی پێبداو بەرزی بکاتەوە، وەبن چڵك و چەپەرو کەمڕەی گوناهان خستوە، ئەمە وەڵامی ئەو (١١) سوێندەیە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر تەوەری دووەم: ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴾ گەلی سەموود بە هۆی یاخیی بوونیەوە بەدرۆی دانا، چی بەدرۆ دانا؟ ڕۆژی دوایی بە درۆی دانا، پێغەمبەرەکەی کە صالحە بەدرۆی دانا، پەیامی خوای بەدرۆ دانا، هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام بەهۆی چییەوە ئەو بەدرۆ دانانە پەیدا بوو، بەهۆی یاخیی بوونیەوە، ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴾، بەهۆی یاخیی بوون و لە سنوور دەرچوونیەوە، بێبڕوا بوو و، بەدرۆی دانا، ﴿ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴾، یاد بکەوە کاتێك خراپترینی گەلی سەموود دەرچوو، بە پرتاو دەرچوو، بە خێرایی ڕۆیی، بۆچی ڕۆیی؟ ڕۆیی تاکو حوشترەکە پەیی بکات، واتە: لاقەکانی ببڕێ و بریندار بکات، بۆ ئەوەی بکەوێ، دوایی سەری ببڕێ، ﴿ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ ﴾، ڕەوانەکراوی خوا پێی گوتن: ﴿ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا ﴾، ئاگاتان لە حوشترەکەی خوا بێ و ئاگاتان لەئاو خواردنەوەکەشی بێ، واتە: نە زیان بە حوشتری خوا بگەیەنن، هەموو حوشترەکان حوشتری خوان، بەڵام ئەو حوشترە خوا بە شێوەی تایبەت دروستی کردبوو، بە دوعای صالح، لەسەر داوای خەڵکەکەی گوتیان: موعجیزەیەکمان بۆ بێنە لەلای چیایەك وەستا بوون، گوتی: موعجیزەکە چیتان بۆ بێنم؟ گوتیان: با لەو چیایە حوشترێك بێتە دەرێ و بە چکەکەشی لەگەڵیدابێ، ئەویش لە خوا پاڕایەوە، ئیدی ئەو چیایە لەرزی، ئەو شاخە لەرزی

و حوشترێکی لێ هاتەدەر بەچکەکەشی لەگەڵیدابوو، بەڵام حوشترێکی زۆر گەورە و، زۆر جوان، کە بە تەنیا یەك ڕۆژ ئاوی بیرەکەیانی هەموو دەویست، بەڵام دوایی خۆیان هەموو خەڵکی هۆزەکە هۆزی سەموود شیریان لەو حوشترە دەدۆشی و، بەشی هەموانیشی شیر پێ بوو، ئنجا پێغەمبەرەکەیان پێی گوتن: ئاگاتان لە حوشترەکەی خوا بێ و، ئاگاشتان لە ئاو خواردنەوەکەشی بێ، لە نۆرە ئاوی خۆیدا لێی تێك مەدەن، کاتی خۆی لە بەسەرهاتەکەیدا بەدرێژیی باسمان کردوە، بەڵام: ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا ﴾، ئەوان یەکسەر بەدرۆیان دانا و پەییان کرد، (عَقْر): بریتیە لە بڕینی پێیەکانی پێشەوەی حوشتر، چونکە حوشتر سەر نابڕدرێ، ئەگەر پەیی نەکرێ، دەبێ پێشێ پێیەکانی ببردرێن و، بکەوێتە زەوی، ئنجا دەتوانرێ سەر ببڕدرێ، ﴿ فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا ﴾، پەروەردگاریان بە هۆی گوناهەکەیانەوە بەڵایەکی بەسەردا گشتاندن، تەختی کرد، واتە: زەوییەکەیانی تەخت کرد، بەرزیی و نزمیی تێدا نەهێشت، شار و ئاوەدانییەکەیانی تەخت کرد، یاخود: ﴿ فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ ﴾، یانی: (أَطْبَقَ عَلَيْهِم)، خوا بەڵایەکی دەورەدەری بۆ ناردن، بەهۆی گوناهەکەیانەوەو شوێنەکەیانی تەختکرد، لە شوێنی خۆیدا باسمان کردوە، کە خوا چریکەو هاڕژنێکی گەورەی بۆ ناردن، بڵێسە ئاگرێکی گەورەی تێدابوو، لە رزینەوەی لێ پەیدابوو، سەرەنجام کەسیان نەما، هەموویان فەوتان، ﴿ وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا ﴾، لە سەرەنجامەکەشی ناترسێ، خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى لە سەرەنجامی ئەو بەڵایەی بەسەر گەلی سەموودی هێنا، بێ باك و، بێ ترسە، چونکە خوا خاوەنی ئەو پەڕی دەسەڵاتە، بێگومان هیچ کەسیش سزا نادات، مەگەر شایستەی سزا بێ، بۆیە لێرەش دەفەرموێ: ﴿ فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ ﴾، خوا بەهۆی گوناهەکەیانەوە بەڵایەکەی بۆ ناردن و بەسەردا گشتاندن و تەختی کردن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنـی خـوا ﷻ بـه خـۆرو تیشـکەکەی و، مانـگ کـه بـه دوایـدادێ و، ڕۆژگار کـه سـەر زەوی دەردەخـات و، شـەوگار کـه زەوی دادەپۆشـێ و، ئاسـمان و بنیاتنەرەکـەی و، زەوی و لێـك كێشـەرەوەكەی و تەختكەرەكـەی و، نەفـس و ڕێـك و پێكخەرەکـەی، ئەمـە (١١) شـت، کـە خراپەکاریـی و پارێزکاریـی و فێـری نەفـس کـردوە و، مسـۆگەر بابـای خـۆ پـاك و چاککـەر سـەرفرازە و، بابـای خۆوەبـن کەمـڕەو چڵکـی گوناهـان ھاندەریـش، بێمـرادو پەشـێمانە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ١ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ٥ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ١٠﴾

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾، سوێند بە خۆرو بە تیشکەکەی، ئێمە دوایی کورتە باسێك لە بارەی خۆرەوە دەکەین، (ضُحَى): بریتیە لەکاتی بەرزبوونەوەی خۆر لە ئاسۆی خۆرھەڵاتەوە کە بابای بینەر وای دێتە بەرچاو بە ئەندازەی ڕمێکە، وشەی: (ضُحى) جگە لە چێشتەنگاو بە مانای تیشکی خۆریش ھاتووە، ئەم ئایەتەش سێ واتایان بۆ لێك داونەوە:

أ- وێند بە خۆر و بە تیشکەکەی.

ب- سوێند بە خۆرو بە چێشتەنگاوەکەی کە بەھۆی خۆرەوە پەیدا دەبێ.

**ج-** سوێند بەخۆرو بە ئەو دنیا ڕووناککردنەوەو وڵات گەرم داهێنانەی لە ئەنجامی خۆردا پەیدادەبێ.

(**الضَحْوَةُ أَوَّلُ النَّهَارِ**)، (**ضَحْوَة**)، بە سەرەتای ڕۆژ دەگوترێ، (**وَالضُّحى: بَعْدَ ذَلِكَ**)، (**ضُحى**) چێشتەنگاو دوای ئەوەیە، ئنجا (**مَا بَعْدَهُ إِلى قَرِيبِ الزَّوالِ ضَحاء**)، دوای چێشتەنگاو تاکو ئەو نیزیك لەوەی کە خۆر لە نێوە ڕاستیی ئاسمان لابدات، هەمووی پێی دەگوترێ: (**ضَحاء**).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ)، هاتوە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتوویەتی: {**والشَّمْسِ وَضَوْئُهَا**} (**أخرجه الحاكم: ٣٠٩٣٨، وقال صحيح على شرط الشيخين، ولم يخرجاه**)، واتە: سوێند بەخۆرو بەتیشکەکەی، یاخود بە ڕووناکییەکەی.

**٢)-** ﴿ وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴾، سوێند بە مانگ کاتێك بە دوای دادێ، دەڵێ: (**التُّلُوُّ الطَّبَعُ**)، (**تُلُوّ**): بە مانای بەدواکەوتن و شوێنکەوتن، (ها) کە ڕاناوە دەچێتەوە بۆ خۆر، واتە: مانگ کە بەدوای خۆر دا دێ، ئنجا ئەمە سێ واتایان بۆ لێکداونەوە:

**یەکەم:** مانگی یەك شەوی دوای خۆرئاوا بوون، مانگ بەیەك شەویی دەردەکەوێ.

**دووەم:** کاتێك کە مانگ نیزیك دەبێتەوە لە چوونە حاڵەتی (بدر)، واتە: (١٤، ١٥)وە، بە دوای خۆر دادێ.

**سێیەم:** یاخود دوای ئەوەی دەبێتە (١٤و ١٥).

لە ڕاستییدا لە یەك کاتدا هەرسێکیشیان پێکەوە گونجاون، هەم کە مانگی یەك شەوەو، هەم شەوانی (١٤و١٥ )، هەم دوای (١٤و ١٥)ش، بێ خواش ﷻ وایکردوە، کە مانگ کاتێك بەرەو حاڵەتی (بدر) بوون دەچێ، زیاتر بە ئاسمانەوە دەبێ، واتە: بە شەودا، چونکە ئەو کاتە دنیا زیاتر ڕووناك دەکاتەوە.

**٣)-** ﴿ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ﴾، سوێند بە ڕۆژگار کاتێك کە دەری دەخا، ئەمیش سێ واتایان بۆ لێکداونەوە:

**یەکەم:** گوتوویانە: ﴿ جَلَّىٰهَا ﴾، ڕاناوەی (ها)، دەچێتەوە بۆ زەوی، واتە: کاتێك زەوی دەردەخات.

**دووەم:** هەندێك گوتوویانە: ﴿ جَلَّىٰهَا ﴾، ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ (شمس) بۆ خۆر، کاتێك خۆر دەردەخات.

**سێیەم:** هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ جَلَّىٰهَا ﴾، واتە: دنیا، کە ئەوەیان لەگەڵ یەکەمیان هەر دەبێتەوەیەک.

بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێ زەوی بێ، چونکە زەوی لە ئەنجامی ڕۆژدا زەوی دەردەکەوێ.

٤)- ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ﴾، سوێند بە شەوگار کاتێك دایدەپۆشێ، ئەویش دیسان واتە: زەوی دادەپۆشێ، خۆر دادەپۆشێ، یاخود دنیا دادەپۆشێ، بەڵام داپۆشینی زەوی نیزیکترە لەواتایەکەیەوە، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە بە نسبەت ڕۆژگارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ﴾، بە کرداری ڕابردوو هێناویەتی، بەڵام بۆ شەوگار ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ﴾، سوێند بە شەوگار کاتێك کە دادەپۆشێ بە کرداری (**مُضارِع**)، یەکێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێ: بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەو واقیعەیە کە ئەو کاتە وا بووە، واتە: ئەو کاتە کوفرو شیرك و بێبڕوایی و خراپەکاریی هەبووەو، دنیای داپۆشیوە.

٥)- ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴾، سوێند بە ئاسمان و بە بنیاتنەرەکەی، (**مَا**) دەگونجێ (**مَوصُولة**) بێ، یانی: (**الذي بَنَىٰهَا**) کە خوای پەروەردگارە، هەروەها (ما) دەگونجێ (**مَصْدَرِيَّة**) بێ، یانی: (**وَٱلسَّمَآءِ بناءَهَا**)، سوێند بە ئاسمان و بە بنیاتنانەکەی، بەڵام هەم لێرەداو هەم لە شوێنەکانی دیکەدا، (ما)، (**مَوصوُلة**) بێ نیزیکترە.

٦)- ﴿ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴾، سوێند بە زەوی و بە پانڕاخەری زەوی، لێك دوورخەرەوە و لێککێشەرەوەی زەوی، کە خوای پەروەردگارە، دەشگونجێ (ما): (**مَصْدَرِيّة**) بێ، واتە: سوێند بە زەوی و بە پانڕاخستن و لێککێشانەوەکەی، (**الطَّحو: البَسْطُ والتَّوْطِئَة وَالقَذْفُ**

**وَالدَّفْعُ**)، (**طَو**): بە مانای پانڕاخستن و، هەم بە مانای ئامادە کردن، هەم بە مانای هاویشتن و، بە مانای پاڵ پێوەنانیش دێت.

٧)- ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴾، سوێند بەنەفس و بە (**نَكِرة**)، هاتوە، بە نەناسراو (**نكرة**) هاتووە؟ ئەمە بۆ جۆرە، واتە: سوێند بە جۆری نەفس، (**تَسْوِيَةُ النَّفس**)، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴾، واتە: ڕێك و پێك دروست کردن.

٨)- ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴾، تاوانبارییەکەی خۆی و پارێزکارییەکەشی فێر کردوە، (**إلْهَام: إيْقاعُ الشَّيء فِي الرُّوعِ فَيَخْتَصُّ ذَٰلِكَ بِمَا كَانَ مِنْ جِهَةِ اللهِ أَو جِهَةِ المَلأَ الأَعْلى**)، (**إلهام**): بریتیە لە خستنە نێو دڵ، ئەوەش تایبەتە بەوەی لە لایەن خواوەبێ، یان لە لایەنی فریشتە بەرزو باڵاکانەوە بێت.

٩)- ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾، بەڕاستیی سەرفرازە ئەوەی کە پاك و چاکی کردوە و، پەشێمان و بەدبەختە ئەو کەسەی لە بن چڵکی گوناهاندا پەنهانی کردوە، ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ﴾: (**الفَلاَحُ: النَّجَاحُ بِحُصُولِ المَطْلُوب**)، (**فَلاَح**): بریتیە لە سەرکەوتن و بە دەستهێنانی ئەو شتەی بەدوایدا چووی، داوات کردوەو بەدوایدا گەڕاوی، (**التَّزكِيَةُ: الطَّهَارَة وَالنُّمو وَالصَّلاح**)، پێشتریش باسمان کرد، (**تزكية**)، هەم بەمانای پاکیی، هەم بە مانای گەشە کردن، هەم بە مانای چاك بوون دێ، کەواتە: کەسێك خۆی پاك کردوە، گەشەی پێداوە، چاك کردوە، واتە: سیفەتە خراپەکانی لە خۆیدا لابردوە و، خۆی بژارکردوە و، سیفەتە باشەکانی لە خۆیدا گەشە پێداوەو چەسپاندوە، ئەو کەسە سەرفرازە.

١٠)- ﴿ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾، پەشێمان و بەدبەختیش ئەو کەسەیە کە خۆی، نەفسی خۆی پەنهان کردوە، (**الخَيْبَةُ: حِرْمانُ الطَّالِبِ مِنْ مَطْلوبِهِ**)، (**خَيْبَة**): بریتیە لەوەی کەسێك بە دوای ئامانجێکدا بڕوا، بەڵام لێی بێبەش بێت و، دەستی پێنەگات.

(**وَالتدسيَةُ: مِنْ فِعْلِ دَسَّى، وَأَصْلُهُ مِنْ دَسَّسَ: أَدْخَلَ شَيْئاً تَحْتَ شَيْء فَأَخْفَاهُ**)، (**تَدسِية**): لە کرداری (دَسَّىٰهَا) هاتوە، ئەویش لە ئەسڵدا (**دَسَّسَ**)یە، بەڵام (س)

ێکیان کراوە بە (ي)، (دَسَّسَ)، واتە: شتێکی خستە بن شتێك و پەنهانی کرد.

بێگومان کە دەفەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾، بەڕاستی بە ئامانج گەیشتوویە کەسێك خۆی پاك و چاك کردوە و، بە ڕاستیی پەشێمان و بەدبەختە کەسێك خۆی لە بن چڵکی گوناهاندا شاردۆتەوەو، پەنهان کردوە، ئەمە وەڵامی ئەو یازدە (١١) سوێندەیە، کە پێشتر هاتوون.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: بۆچی خوا ﷻ بۆ ئاسمان و بۆ زەوی و بۆ نەفس، بۆ هەر سێکیان فەرموویەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ۝٥ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ۝٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧﴾، بۆچی نەیفەرمووە: (وَٱلسَّمَآءِ وَمَن بَنَىٰهَا)، ئەگەر (مَا مَوصُولة)یە و، مەبەست پێی خوای پەروەردگارە؟ (وَٱلۡأَرۡضِ وَمَنْ طَحَىٰهَا)، ( وَنَفۡسٖ وَمَنْ سَوَّىٰهَا)؟

وەڵامەکەی هەندێك لە شارەزایانی ڕێزمانی عەرەبیی وایان لێکداوەتەوە، دەڵێن:

بۆیە (ما) بەسەر (مَن)دا هەڵبژێردراوە، چونکە (ما) جۆرێك لە (إبْهام) و جۆرێك لە سەرسوورمانی تێدا هەیە و، ماناکەی ئاوای لێدێتەوە: (أُقْسِمُ بِالسَّمَاءِ وَالشَّيءِ القَويِّ العَجيبِ الَّتي بَنَاها)، سوێند بە ئاسمان دەخۆم و بەو شتە بە هێزو سەرسووڕهێنەرەی ئاسمانی بنیاتناوە، هەروەها سوێند دەخۆم بە زەوی و بەو شتە بەهێزو سەرسوڕهێنەرەی کە پانی ڕاخستوە و، سوێند دەخۆم بەنەفس و بەو شتە سەرسوڕهێنەرە بەهێزەی ڕێك وپێکی کردوە، کە مەبەست پێی خوای پەروەردگارە.

بە نسبەت وشەی: (إِلْهَام) ەوە، زانایان زۆریان قسە لە بارەوە کردوە:

**أ-** یەکێکیان دەڵێ: (**يُطْلَقُ الإِلْهَامُ عَلَى حُدوثِ عِلمٍ فِي النَّفْسِ بِدُونِ تَعْليمٍ وَلاَ تَجْرِبَةٍ وَلاَ تَفْكيرٍ**)، (إلهام): بەکاردەهێنرێ بۆ پەیدابوونی زانستێك لە نەفسی مرۆڤدا، بەبێ فێرکردن و بە بێ ئەزموون و بەبێ بیرکردنەوە، ڕێك زانیارییەکە لە دڵیدا پەیدا دەبێ، (إلهَام) لە (لَهْم)ەوە هاتوە، (لَهْم)، بریتیە لەوەی شتێك یەکسەر قووت بدەی، زانیارییەکیش کە

بە هۆی (إلهَام)ەوە دێتە عەقڵ و دڵی مرۆڤەوە، یەکسەر دێتە نێو عەقڵ و دڵی مرۆڤ بەبێ پێشەکیی و پێوەخران.

**ب-** یەکێکی دیکە لە زانایان دەڵێ: (**إلْهام**): بریتیە لە خستنە نێو عەقڵ و هۆشی مرۆڤ، کە ئەویش لە هەڵڕشتنی خوای پەروەردگارە، کە زانیارییەکان لە وێنەی وێنا کردن (**تصور**) یاخود بە ڕاست دانان، دەیانخاتە نەفسی بەشەرەوە و، مەبەست پێی ئەوەیە خوا نەفسی بەشەری، هەروەها جندیشی وا خوڵقاندوە، بتوانێ خێرو شەڕ، چاکەو خراپە لێك جیابکاتەوەو، ئەوەش لە پێکهاتەکانی نەفسی بەشەرە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴾، دەڵێ: (**إلْهَامُ الفُجُورِ وَالتَّقْوَى: إفْهَامُهُمَا وَإعْقالُهُما وَأَنَّ أَحَدُهُما حَسَنٌ وَالآخَرَ قَبيحٌ، وَتَمْكِينُ مَنِ اخْتار مَاشَاءَ مِنْهُما**)، کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴾، فێرکردنیی تاوانباریی پارێزکاریی، واتە: خوا ﷻ وای لە مرۆڤ کردوە، کە تێیان بگات و بیانزانێ، بزانێ کە یەکێکیان کە (فجور) ە، خراپە و (تقوی)کەش باشە و، بشتوانێ یەکێکیان هەڵبژێرێ، واتە: (**إلهام**) لێرەدا تەنیا فێرکردنی تیۆریی نیە، بەڵکو تواناداركردنی مرۆڤیشە کە لە نێوان خێرو شەردا، لێکیان بکاتەوە، کە ئەمە خێرەو ئەمە شەڕە، ئەمە تاوانبارییە، ئەمە پارێزکارییە، ئنجا بشتوانێ یەکێکیان هەڵبژێرێ بەویستی خۆی.

ئەم ئایەتە موبارەکە لەشێوەی ئەم ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (الروم)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: ڕووی خۆت ڕاست بکە بەرانبەر بە ئاینی ڕاست، ﴿ حَنِيفًا ﴾، واتە: لابدە لە چەوتی بەرەو ڕاستیی، ﴿ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ﴾، ئەو ئایینەی خوا دەفەرموێ: ڕووی خۆتی لەگەڵ ڕاست بکە، هەمان زگماك و خوارسکە کە خوا خەڵکی لەسەر هێناوەتە دی، ﴿ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ﴾، گۆڕین نیە بۆ دروستکراوی خوا، یانی: ئەو خوارسك و زگماکە، وەك خۆی دەمێنێتەوە بەڵێ: ژینگەو دەوروبەر

باب و دایك كۆمەڵگا، كاریگەری چاك، یان خراپی لەسەری دەبێ، بەڵام هەر دەمێنێتەوە كە مرۆڤ هەر كاتێك ئیرادە بكات و بیەوێ دەتوانێ بچێتە سەر ئەو ئەسڵە و، ئەو حاڵەتەی خوا ئەوی لەسەری خوڵقاندوە.

لەبەر ڕۆشنایی یەكەمین ئایەتی ئەم سووڕەتە موبارەكەدا: ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾، كورتە باسێك لە بارەی خۆرەوە دەكەین، دواییش خوا پیشتوان بێ، دێینە سەر مەسەلەی دووەم و كۆتایی و، كورتە باسێكیش لە بارەی (**تزكية النفس**)ەوە دەكەین.

## کورتە باسێک دەربارەی
## خۆر و پەیوەست بوونی ژیانی مرۆڤ پێیەوە.

سەرەتا لەیازدە خاڵدا باسی خۆر دەکەین، دواییش پەیوەست بوونی ژیانی مرۆڤ لەسەر خڕۆکەی زەویی، بە کۆمەڵەی خۆر بەگشتیی و بە خۆرەوە، دەخەینە ڕوو:

### أ- خــــۆر:

**١)**- خۆر (**شَمْس**) یەکێکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان (**مَجَرَّة دَربِ التبَّان**)، ئەو کەهکەشانەی ئێمە ئەستێرەکانی بە یەك تریلیۆن، یەك دوازدە سفری لە پێشەوە بێ: (٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ ١٠٠٠) مەزەندە دەکرێ، واتە: (١٠٠٠) ملیار، گەردووناسان دەڵێن: مەزەندە دەکرێ لە نێو گەردووندا زیاتر لە (٢٠٠) ملیار کەهکەشان هەبێت، بەڵکو هەندێکیان دەڵێن: یەک تریلیۆن کەهکەشان ڕەنگە لە هەموو گەردووندا تا ئێستا هاتبێتە بەرچاوی دووربین و تەلسکۆبەکان.

**٢)**- تیرە (**قُطْر**)ی گەردوون بە (١٣ - ١٤) ملیار ساڵی تیشکیی مەزەندە دەکرێ، واتە: ئەوەی بە تەلیسکۆبەکان دەیبینین، نەشیان گوتوە، ئەوە کۆتایی گەردوونە، بەڵکو گوتوویانە: ئەوە ئەو سنوورەیە کە ئامێرەکانی ئێمە تاکو ئێستا دەیبینن، لە زەوییەوە کە دەست پێ دەکات، تاکو ئەوپەڕی کە دێتە بەرچاوی تەلیسکۆبەکان بە هەردوو دیووی زەویدا بە: (١٣) ملیارو (٧٠٠) یاخود (٨٠٠) ملیۆن ساڵ، یانی: (١٣) ملیار تاکو (١٤) ملیار ساڵی تیشکی مەزەندە دەکرێ، کە زۆرجار باسمان کردوە، ساڵی تیشکییش بریتیە لەو ماوەیەی تیشکێك لە ساڵێکدا دەیبڕێ، کە تیشك لە هەر چرکەیەکدا (٣٠٠,٠٠٠)کم دەبڕێ، بۆ ئەوەی لە خولەکێکدا بزانین دەبێ: (٣٠٠,٠٠٠) جارانی (٦٠) بکەین، ئنجا ئەنجامەکەی دەردەچێت لە خولەکێکدا، دوایی ئەویش جارانی (٦٠)ی دەکەین، ئەنجامەکەی لە

سەعاتێکدا دەردەچێ، دوایی جارانی (٢٤)ی دەکەین لە شەوو ڕۆژێکدا، دەردەچێ، پاشان جارانی (٣٦٥)ی دەکەین، لە ساڵێکدا، ئەنجامەکەی.

**٣)-** خۆر بارستاییەکەی (٣٣٣٠٠٠) جار لە بارستایی زەوی گەورەترە و، خۆر (١٥٠) ملیۆن کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە.

**٤)-** پێکهاتەی خۆر بە پێی ڕای بەشێك لە گەردوون ناسان، لە (٨١,٧٦٪) هایدرۆجین پێکی دێنێ، وە (١٨,١٧٪) هێلیۆم پێکی دێنێ، ئەمە: (د. زغلول النجار) لە کتێبی **(السماء**[1]**)** ئەو ڕایە دێنێ، بەڵام هەندێکی دیکە لە گەردووناسان دەڵێن: نەخێر، بەڵکو لە (٧١٪)ی خۆر گازی هایدرۆجین پێکی دێنێ و، (٢٧٪)ی هێلیۆم و (٢٪)یشی توخمە قورسەکانی وەك: کاربۆن و ئاسن پێکی دێنن.

**٥)-** خۆر (شمس) لە هەر چرکەیەکدا (٦٥٥) ملیۆن تەن لە گازی هایدرۆجین دەسووتێنێ و دەیگۆڕێ بۆ گازی هیلیۆم، دەیگۆڕێ بۆ (٦٥٠) ملیۆن تەن گازی هێلیۆم، ئەو پێنج (٥) ملیۆن تەنەی کەم دەکات، دەبێتە تیشك و وزە و لە خۆر جیادەبێتەوە، بەرەو کۆمەڵەی خۆر دێ، کە یەکێك لە نۆ خڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر ئەو زەوییەی ئێمەیە.

لە هەر چرکەیەکدا زەوی (٥) ملیۆن تەن لە وزەی خۆی دەبەخشێ و، هەندێکی بۆ ئێمەی دانیشتووانی خڕۆکەی زەوی دێ.

**٦)-** پێویستە بزانرێ کە ماددە لە نێوجەرگەی خۆردا جیایە لە سێ حاڵەتەکەی ماددە کە ئێمە دەیان بینین، ئێمە ماددە لە سێ حاڵەتدا دەبینین، ڕەقی **(صَلْب)**وە، شلی **(سائِل)** و، حاڵەتی گازیی **(دُخان)** دەیبینین، بەڵام حاڵەتی ماددە لە نێو خۆردا و بەهەمان شێوە لە نێو ئەستێرەکانی دیکەشدا، پێی دەگوترێ: حاڵەتی پلازمایی.

ئەویش ئەوەیە کە پێکهاتەکانی گەردیلەکان هەڵدەوەشێنەوەو دەبنە نێوکی ڕووت، ئەلیکترۆنەکان ئازاد دەبن و، نێوکی گەردیلەکان کە پرۆتۆن و نیوترۆنە ڕووت دەبنەوە، واتە: لێك جیا دەبنەوەو لێك هەڵدەوشێنەوە ولەگەڵ

---

(١) لەپەڕە (٤٤١)

ئەلیکترۆنـەکان پێکـەوە نامێنـن، مـاوەی نێـوان پێکهاتەکانـی یەکەمـی مـاددە گەردیلـە دەبێتـە (١/١٠٠,٠٠٠)ی ئـەوەی لـە گەردیلەکانـی لای ئێمـە هەیانـە، (١/١٠٠,٠٠٠)، واتـە: چڕیـی (**كَثَافـة**)ی مـاددە لـە نێـو جەرگـەی خـۆرو ئەسـتێرەکاندا زۆر زۆرە و چڕیـی مـاددە لێـرە بریتیـە (١/١٠٠,٠٠٠)ی چـڕی مـاددەی ئـەوێ، ئنجـا حاڵەتـی پلازمایـی لـە نێـو خـۆردا شـێوەیەکە لـە شـێوەکانی مـاددەی زۆر زۆر چڕ، بە شـێوەیەك کـە (١) سـانتیمەتر سـێجا (١٠٠) ملیـۆن تـەن قـورس دەبێ،یانـی: بەئەنـدازەی سـەرە پەنجەیـەك (١٠٠) ملیـۆن تـەن قورسـە!

**٧)-** خۆر بەردەوامیش لە کشاندایە لە ئەنجامی ئەو تەقینەوە بەهێزە نێوکییانەی لە نێویدا ڕوو دەدەن و، ئەگەر وا نەبووایە وەك قومبەلەیەکی هایدرۆجینیی گەورە دەتەقییەوە.

**٨)-** ئەگەر یەکێك بڵێ: چۆن وزەی خۆر تەواو نابێ!

دەڵێیـن: بارسـتایی خـۆر (**كُتْلَـةُ الشَّـمس**)، بـە (٢٠٠٠) تریلـۆن تریلـۆن تـەن مەزەنـدە دەکـرێ، واتـە: ژمـارە یـەک (١) بیسـت و حـەوت (٢٧) سـفری لـەلای راسـتەوە بـێ: (٢٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠) ئەوەنـدە تـەن بارسـتایی و قورسـیی خـۆر پێکدێنێـت، کـە زۆر زۆرە.

**٩)-** هێزی کێشکردنی خۆر بیست و هەشت (٢٨) هێندەی هی زەوییە، واتە: ئەگەر شتێك لێرە کیلۆیەك بێ لەسەر خۆر ئەو شتە (٢٨) کیلۆیە.

**١٠)-** بێگومان ئەگەر خۆر ئەو هەمووە هایدرۆجینەی تێدا نەبووایە و، بارستاییەکەی هێندە گەورەو بێ ڕەزا نەبووایە، یاخود ڕێژەیەکی زیاتری سووتاندبایە، کە لە هەر چرکەیەکدا (٥) ملیۆن تەن دەسووتێنێ و، سەرف دەکات و، لە دەستی دەدا، ئەو کاتە لە مێژبوو کۆتایی پێ هاتبوو، ئەگەر گەورەتریش بووایە دیسان هاوکێشەکە هەر دەگۆڕا.

**١١)**- خۆر (١٥٠) ملیۆن کیلۆمەترە لە ئێمەوە دوورە- وەک پێشتریش گوتمان- ئنجا ئەگەر دوورتر بووایە، بێگومان ئەو ئەندازە تیشك و گەرمیی و وزەیەی دەمانداتێ، نەیدەداینێ.

ئـەو کاتـەش هێندەمـان نەدەگەیشـتێ و سـەرەنجام یـان ژیـان نەدەبـوو، یانیش بە جۆرێکـی دیکـە دەبـوو، ئەگـەر نیزیکتریـش بووایـە، بێگومـان زیاتـر وزەو گەرمیمیـان دەگەیشـتێ و دیسـان ژیـان نەدەبـوو، بەڵکـو هەندێـك لـە زانایـان ئەندازەیەکیـان دیاریکـردوە دەڵێـن: ئەگـەر خـۆر ئەوەنـدە لـە ئێمـە نیزیـك بووایـە، سـەر زەوی هەمـوو دەبـوو بـە خۆڵـە مێـش و دەسـووتا، هەروەهـا ئەگـەر بـە بارەکـەی دیکەشـدا دوورتـر بووایـە، سـەر زەوی هەمیشـە هەمـووی بەسـتەڵەك دەبـوو و ژیانـی تێـدا نەدەگونجـا.

پەیوەسـت بوونـی ژیانـی مـرۆڤ لەسـەر زەوی بەکۆمەڵـەی خـۆرەوە بەگشـتیی و بەخـۆرەوە بەتایبـەت:

ئەمـە وەك پێناسـەیەکی کورتـی خـۆر بەپێـی ئـەو ڕۆژگارەی ئێمـەدا کـە زانسـت پێـی گەیشـتوە، پەیوەسـت بوونـی ژیانـی مـرۆڤ لەسـەر زەوی بژیانـی مـرۆڤ لەسـەر زەوی، بـە کۆمەڵـەی خـۆر و بەخـۆرەوە، لـە حـەوت (٧) خاڵـدا دەخەینـەڕوو:

**١-** ژیانی بەشەرو هەموو ژیاندارەکانی کە لەسەر زەویین، بێگومان پەیوەستە بە تیشك و ڕووناکییەک کە لە خۆرەوە بۆمان دێ و، ئەگەر خۆر نەبووایە و، ئەو تیشك و گەرمیی و ڕووناکییەمان بۆ نەهاتبایە، ئێمە لەم سەر زەوییە نەدەبووین، نەك ئێمە بەڵکو سەرجەم ژیاندارانی دیکەش.

**٢-** هەموو جۆرەکانی خواردن بە هۆی ڕووناکیی خۆرەوە بۆ ئێمە دەستەبەر دەبن، نەك هەر ڕووەك و ژیانداران کە خۆراکی ئێمە ئەوان پێکی دەهێنن، ڕووەك بە هەموو جۆرەکانیانەوە، دانەوێڵە، میوە، سەوزەو تەڕەکان، هەروەها ژیاندارانیش بە هەموو جۆرەکانییەوە هەوایی و دەریایی و خاکیی، نەك هەر ئەوان پەکییان لەسەر تیشکی

خۆر کەوتوە، بەڵکو تەنانەت ئەو ڕووەك و ژیاندارانەی لە قوڵایی ئۆقیانووسەکانیشدان، ئەوانیش دیسان بە شێوەیە لە شێوەکان لە تیشکی خۆر بەهرەمەند دەبن و، ئەگەر تیشکی خۆر نەبووایە نەیاندەتوانی ژیان لە قووڵایی ئۆقیانووسەکانیشدا بەسەر بەرن، چونکە ئەوانیش ئەو گیایانەی لە ئۆقیانووسەکان دان و، کەم و زۆر تیشکیان پێدەگات، لێیان بەهرەمەند دەبن.

٣- تێکڕای ڕەنگەکان و هەموو جوانییەکان و هەموو درەوشاوەییەکان کە لە دەورو بەرو لە سرووشتدا دەیان بینین، هەموویان بە جۆرێك لە جۆرەکان پەیوەستن بە تیشکی خۆرەوەوە، ئەمە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، کە ئەگەر تیشکی خۆرو ڕووناکی خۆر نەبووایە، ئێمە هیچ ڕەنگێك و هیچ جوانییەك و هیچ درەوشاوەیەکمان لەسەر زەوی نەدەدیت.

٤- ئەو ئاوەی دەبارێ چ باران، چ بەفر، چ تەزرە، هەورەکان کە ئاومان بۆ دادەبەزێنن، ئاومان بۆ دەبارێنن، هەورەکان لە ئەسڵدا بریتیە لە هەڵمی ئاو کە تیشکی خۆر لەسەر دەریایەکان پەیدای کردوە و، دوایی ئەو هەڵمە دێت، بەرەو شوێنە ساردەکان دێ، دوای ئەوەی کە لەسەر یەك کەڵەکە و، موتوربە دەبێ، سەرەنجام هەورەکان پێکدێنن، هەورەکانیش باران و بەفرو تەزرەمان بۆ دەبارێنن.

٥- هەروەها بایەکان دەبنە هۆی پیتاندن لە ڕووەکەکاندا، لە درەختەکاندا، دیسان با دەبێتە هۆی پاککردنەوەی زەوی و، با دەبێتە هۆی فێنککردنەوەی زەوی و، وە با دەبێتە هۆی ئەوەی هەورەکانمان بۆ دروست بێن، ئەمەش هەمووی دیسان پەیوەستە بە خۆرەوە، چونکە تیشکی خۆر کە لە هەوا دەدا، هەوا لە هەندێك شوێن دا دەکشێ و، لەو شوێنەدا قەبارەی زۆر دەبێ و پەستان دروست دەبێ و لەوێ جێی نابێتەوە و، دەچێ بۆ شوێنی دیکە کە پەستانی هەوای کەمتر لێیە، لە ئەنجامی ئەو جێگۆڕکە کردنەدا، لە ئەنجامی ئەوەدا کە هەوا لە شوێنێك دەکشێ و لە شوێنێك کە گەرمایی دەگاتێ لێك دەکشێ قەبارەکەی دەبێ، بەرەو شوێنێکی دیکە کە قەبارەکەی کەمترە

دەچێ، لە ئەنجامی ئەوەدا بایەکان دروست دەبن، کەواتە: ئەویش دیسان پەیوەستە بە خۆرەوە.

هەروەها تێکڕای وزەکان هەمـوو ئـەو وزانـەی لەسـەر زەوی هـەن، چ ئەوانـەی کـە ڕاسـتەوخۆ تیشـکی خـۆر وەردەگـرن، چ ئـەوەی بـە هـۆی تاڤگەکانـەوە بەهـۆی بەنداوەکانـەوە تیشـکی وزەی کارەباییـمان بـۆ بەرهـەم دێ، هەروەهـا ئـەوەی کـە لـە ژێـر زەویـدا هەیـە لـە نـەوت و غـازو ئەوانـە، هەروەهـا خەڵـوزی بـەرد، هەمـوو ئەوانـە پەیوەسـتن بـە خـۆرەوە، چ بـە ئێسـتای خـۆرەوە، چ بـە تەمەنـی ڕابـردووی خـۆرەوە کـە بێگومـان وزەیـان لـە خـۆرەوە وەرگرتـوە، ئەگـەر ڕووەك بـوون یـان ژیانـدار بـوون، کەوتوونـە بـن زەوی و ئێسـتای سـەرچاوەی نـەوت و غـازو خەڵـووزی بەردیـان بـۆ ئێمـە پێکهێنـاوە، گرنـگ ئەوەیـە هەمـوو ئـەو وزەیـەی دەماندەنـێ، کاتـی خـۆی لـە خـۆر وەریانگرتـوە.

٦- مانەوەی کۆمەڵەی خۆر، واتە: زەوی و مەریخ و موشتەری و زوحەڵ و هەر نۆ خڕۆکەکەی بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە و پێیان دەگوترێ: کۆمەڵەی خۆر، هەموو ئەوانە پەیوەستن بە خۆرەوە و، خۆر بە لای خۆیدا کێشیان دەکات، ئەوانیش پاڵ بە خۆرەوە دەنێن و، لە ئەنجامی ئەوەدا خولانەوەیان بۆ دروست دەبێ بە دەوری خۆردا، کەواتە: ئەگەر خۆر نەبووایە، ئێمە کۆمەڵەی خۆریشمان کە لە نێویاندا خڕۆکەی زەوییە، نەدەبینی، بۆیەش ئەوە دەمانگەیەنێ بەو ئەنجامە ژیانی ئێمەو ژیانی ژیانداران، بەڵکو بوونی نۆ (٩) خڕۆکەکان هەموویان بە خۆرەوە پەیوەستن.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی گەلی سەموود کە بەهۆی لە خوا یاخیبوونیانەوە بە پێغەمبەرەکەیان صالح ﷺ بێبڕوابوون و، بە درۆیان دانا، هەرچەندە ترساندنی و هۆشداریی پێدان، بەڵام حوشترە تایبەتەکەی خوای پەروەردگاریان پەییکردو سەربڕی، خواش سزایەکی سەختی بەسەردا سەپاندن و تەختیکردن و، لەسەرەنجامەکەیشی بێباك بوو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴿١١﴾ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَـٰهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَـٰهَا ﴿١٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ﴾، سەموود بە هۆی یاخیبوونەکەیەوە بێبڕوا بوون، (**الطَّغْوى، وَالطُّغيان، مَصْدَرانِ لطَّغى، وَالطُّغيَانُ مُجَاوَزَةُ الحَدِّ فِي العِصْيَان**)، (**طَغْوى**) و (**طُغْيان**)، هەردووکیان چاوگن بۆ (**طَغَى**)، واتە: لە سنوور دەرچوو، یاخیی بوو، (**طُغْيان**) بریتیە لە سنوورشکاندن و سنووربەزاندن لە سەرپێچییدا.

خوا ﷻ دەفەرموێ: گەلی سەموود بەهۆی لە خوا یاخیی بوونیانەوە بە درۆیان دانا، پێغەمبەری خوایان صالح بەدرۆ دانا، ڕۆژی دوایی و دیداری خوایان بە درۆ دانا، پەیامی خوایان بە درۆ دانا، هەموو ئەوانەی دەبوو بڕوایان پێ بێنن، بە درۆیان دانان لەبەر ئەوەی لە بەرانبەر خوادا یاخیی بوو بوون.

**٢)**- ﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا﴾، کاتێك خراپترینی گەلی سەموود، بە خێرایی ڕۆیی، دەڵێ: (**إِنْبَعَثَ: مُطَاوِعُ بَعَثَ بَعثْتُهُ فَانبَعَثَ**)، ناردم ئەویش ڕۆیشت، ﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا﴾، کاتێك کە خراپترینی گەلی سەموود ڕۆیی، هەموو سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: کابرایەك

بووه ناوی قوداری کوڕی سالیف بووه، ڕۆیشتوه بۆ سەربڕین و پەییکردنی حوشترەکەی صالّح، کە خوا بەشێوەیەکی تایبەت بۆی خوڵقاندبوون.

٣)- ﴿ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا ﴾، ڕەوانەکراوی خوا پێی فەرموون: وریای حوشترەکەی خواو ئاوخواردنەوەکەشی بن! پێغەمبەرەکە لێرە ناوی نەهێناوە، بەڵام لە سووڕەتەکانی دیکەدا ناوی هاتوە و بەسەرهاتەکەیان لە شوێنەکانی دیکەدا بە درێژی هاتوە، بەڵام لێرە هەروا بە کورتی ئاماژەی پێ دەکات، چونکە درێژەکەی لە سووڕەتەکانی دیکە هاتوە، پێغەمبەرەکە ناوی صالّح ﷺ بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ئاگاتان لە حوشترەکەی خوا، لە ئاو خواردنەوەکەشی بێ، ﴿ نَاقَةَ ٱللَّهِ ﴾، یانی: (**إِحْذَرُوا** نَاقَةَ ٱللَّهِ)، وریای حوشترەکەی خوا بن، ﴿ وَسُقْيَٰهَا ﴾، (**أَيْ: وَاْحْذَروا شُرْبَهَا**)، لە ئاو خواردنەوەکەشی، وریایین و نۆرەکەی لێ تێکمەدەن.

٤)- ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا ﴾، گەلی سەموود (پێغەمبەری خوا صالّح یان بە درۆ، حوشترەکەیان پەیی کرد، (**عَقْر**) لە زمانی عەرەبییدا: بریتیە لە پەییکردن، بریندارکردنی یان بڕینی پێیەکانی پێشەوەی حوشتر تاکو یەخ ببێ و، بکەوێتە سەر زەوی، دوایی لە گەردنی بدەن، ئەگەرنا دەستیان ناگاتە گەردنی، چونکە حوشتر دوای ئەوەی پەیی دەکرێ، ئنجا دوایی سەر دەبڕدرێ.

جێی سەرنجە کە خوا ﷻ پێشێ دەفەرموێ: خراپترینی گەلی سەموود کە قوداری کوڕی سالیفە ڕۆیشت، بەڵام دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَعَقَرُوهَا ﴾، هەموویان سەریان بڕی، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە بە فەرمانی هەموویان، بووە و هەموویان ڕازی بوون ئەو حوشترە سەر ببڕێ، بۆیە سەر بڕینەکەی پاڵداوەتە لای هەموویان.

٥)- ﴿ فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴾، یەکسەر پەروەردگاریان بەهۆی گوناهەکانیانەوە بەڵایەکی بەسەردا گشتاندن تەخت و وڵاتەکەی یەکسان کرد. ﴿ فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ ﴾، یانی: أ- (**عَمَّ عَلَيْهِمُ العَذَاب**)، خوا بەڵای بەسەردا گشتاندن،

ئەوە واتایەکی، یاخود ب- (أَطْبَقَ عَلَيْهِم)، بەڵایەکی بۆ ناردن چواردەوری گرتن.ج- هەندێکیش گوتویانە: ﴿فَدَمْدَمَ﴾، دەنگی کەوتنەکە دەنگێکی گەورەیە ئەو هاڕژنەی، کە خوا بۆی ناردوون، دەنگێکی گەورەی لێ پەیدابووە، پەروەردگاریان سزایەکی ئاوای بەسەردا گشتاندن، بەهۆی گوناهەکەیانەوە: ﴿فَسَوَّىٰهَا﴾، واتە: تەخت و یەکسانی کرد، شوێنەکەیان و، شارە، وڵاتەکەیانی، تەخت و یەکسان کرد.

٦)- ﴿وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا﴾، لە سەرەنجامەکەشی ناترسێ، عادەت وایە کەسێك کەسێك سزا بدات، زیان بە کەسێك بگەیەنێ، دوایی بابای زیان پێگەیەنراو یان سزادراو، یان کەس و کارەکەی، هەوڵدەدەن تۆڵەی بستێننەوە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: خوا لە سەرەنجامەکەی بێباك بوو، نەترسا، کێ هەیە لە دروستکراوەکانی خوا تۆڵە لە خوا ﷻ بستێنێتەوە؟!

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا﴾، ئەمە بە جۆرێکی دیکەش خوێندراوەتەوە: (فَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا)، لە جێی (و)، (ف) بەکارهێنراوە، ئەم جۆرە خوێندنەوانە هەن، بەڵام خوێندنەوەی ناودارتر ﴿وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا﴾یە.

(**العُقْبَى: مَا يَحْصُلُ عَقِبَ فِعْلٍ مِنَ الأَفْعَالِ مِن تَبِعَةٍ لِفَاعِلِها أَوْ مَثُوبَةٍ**)، (**عُقْبَى**): بریتیە لەو سەرەنجامەی پەیدادەبێ لە ئەنجامی کاری بکەرێك دا، وەك سزا، چ وەك پاداشت، واتە: خوا لە دەرەنجامەکەی بێ باك بوو نەترسا.

کە دەفەرموێ: ﴿فَسَوَّىٰهَا﴾، یانی: (**سَوَّتْ الدَّمْدَمَةُ عَلَيْهِم، كُلَّهم**)، ئەو (**دَمْدَمَة**)کە نارد، ئەو هاڕژنە و بومەلەرزەیە و، ئەو تەختکرانە، بەسەر هەمووانیدا گشتاند. ب- یاخود: ﴿فَسَوَّىٰهَا﴾، یانی: خوا ﷻ زەوی لەگەڵدا تەخت و یەکسان کردن، کە جەستەکانیان دیار نەبوون و، شارو ئاوەدانییەکانیشیان دیار نەبوون، لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین:

{**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنِ زَمْعَةَ رضي الله عنه، قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ النَّاقَةَ وَذَكَرَ الَّذِي عَقَرَهَا، فَقَالَ: إِذْ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا، قال: فَبَعَثَ بِهَا رَجُلٌ عَزِيزٌ عَارِمٌ مَنِيعٌ**

**فِي رَهْطِهِ مِثْلُ أَبِي زَمْعَةَ}** (**أخرجه البخاري: ٣٣٧٧، ومسلم: ٢٢٥٥، والترمذي: ٣٤٤٣، والنسائي: ٦٩٥**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا، باسی حوشترەکەی کرد، (حوشترەکەی صاڵح) باسی ئەو کەسەشی کرد کە حوشترەکەی پەیی کردو سەری بڕی، فەرمووی: ﴿ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا ﴾، کاتێك خراپترینی گەلی سەموود چوو بۆ حوشترەکە، دەرچوو، دوایی فەرمووی: پیاوێکی دڕی باڵادەستی خۆ پارێز لە نێو گەلەکەی خۆیدا کە وەك ئەبوو زەمعە وابوو (لە نێو هۆزی قوڕەیشدا)، چوو [ئەو حوشترەی سەرەتا پەیی کرد (واتە: پێیەکانی بڕی بۆ ئەوەی بکەوێتە زەوی)، دواییش سەری بڕی].

وەك پێشتریش گوتمان، بێگومان ئەوەی کەتنەکەی کردووەو حوشترەکەی سەر بڕیوە، یەك کەس بووە، بە ناوی قودداری کوڕی سالیف، بەڵام خوا پاڵی داوەتەوە لای هەموویان، لەبەر ئەوەی هەموویان ڕازی بوون بەوەی ئەو کابرایە بە ناوی هەموویانەوە و بەنوێنەرایەتیی هەموویانەوە ئەو حوشترەی صاڵح ﵇ کە خوا بە شێوەی تایبەت بۆ صاڵحی، وەك موعجیزەیەك ڕەخساند بووی، سەرببڕێ و بیفەوتێنێ.

ئێمە بەسەرهاتی صاڵح و گەلەکەی سەموودمان لە سوورەتی (الحجر)دا بە تەفصیل باس کردوە، بۆیە لێرە هەروا بە کورتیی بە ئەندازەی ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئایەتە بە پێزەکان، قسەمان لەسەر کرد.

## کورته باسێک دەربارەی تەزکییە

لـە چەنـد بەرهەمێکـی خۆمانـدا باسـی تەزکیـەی نەفسـمان کـردوە: ١-کتێبـی (ڕێگای صالـح بـوون و بـەرەو خـوا چـوون)، کـە تاکو ئێسـتا شـەش جاران چـاپ کراوە و، بەتەمـای چاپـی شەشـەمینین، ٢- کتێبـی (گیانـی ژیـان)، ٣-کتێبـی :(خواپەرسـتیی، تەزکییـە تەقـوا) یەکێکـە لـە کتێبەکانـی: (مەوسـووعەی بـەرەو باشـتر تێگەیشـتن و پێگەیشـتن)، بـە درێژیـی لـە بـارەی تەزکییـەوە قسـەمان کـردوە.

ئـەوەی لێـرە دەیهێنیـن باسـێکە ڕاسـتەوخۆ لـە مەووسـوعەی: **(الإِسْلام كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَـابِ اللـه)** لـە کتێبـی نۆیەمـی وەریدەگریـن، **(الفَصـل الرَّابـع: تَزْكِيـةُ النَّفْـس)**، نەفـس پـاك و چـاك کـردن[1] لـە لاپـەڕە: ئێمـە لـە چـوار تـەوەردا باسـی تەزکیـە دەکەیـن:

**١)**- مانای تەزکیەی نەفس.

**٢)**- پێگەی تەزکیەی نەفس و بەرهەمی تەزکیەی نەفس.

**٣)**- خۆ پاك و چاككردن چۆن ئەنجام دەدرێ و ئامرازەکانی چین؟

**٤)**- چەند ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی قوتابخانەکانی تەزکیەی نەفس و، ڕێبازەکانی تەسەوفەوە.

ئـەوەی لـە سـەرچاوەی ئامـاژە پێکـراودا هێناومانـە، لێـرەدا زۆر بـە کورتیـی و گوشراویـی دەیهێنیـن.

### تەوەری یەکەم: مانای تەزکیەی نەفس:

لـەڕووی زمانـەوە وشـەی: **(تَزكِيـة)**، لـە **(زَكَّى، يَزْكُـو، زَكَاةً، وَتَزْكِيَةً)** هاتـوە، دەگوترێ: **(زَكَى الـزَّرْعُ إذا نَمَـى وَتَرَعْـرَعَ)**، واتـە: کشـتوکاڵەکە، ڕووەکەکـە گەشـەی کـردو هـەراش

---

(١) لەپەڕە (١٢٩-١٩٧)، جاپی دووەمی ئەو مەوسووعەیە ساڵی (٢٠١٩)ی زاینی.

بـوو، وێـڕای مانـای: (گەشـە کـردن) و (هـەراش بـوون)، وشـەی: (تَزكِيَـة) (زَكَاة)، مانـای پاكبوونـەوەو، چاكبوونیـش دەگرێتـەوە.

واتـە: وشـەی (تَزكِيَـة) وەك فەرهەنگەكانـی زمـان[1]، دەڵێـن: وشـەی (زَكَى، يَزْكُـو، زَكَاةً)، سـێ مانایـان هەڵدەگـرێ: یەكـەم: (طَهُـرَ)، پـاك بـۆوە، دووەم: (نَمَـى) گەشـەی كـرد. (صَلـحَ) یـان (صَلُـح)، واتـە: چـاك بـوو.

شـایانی باسـە لـە سـوورەتی (الشـمس)دا كـە پێشـتر تەفسـیرمان كـرد، خـوا ﷻ لـە دە (١٠) ئایەتـی سـەرەتای ئـەو سـوورەتە موبارەكـەدا، سـوێند دەخـوا بـە یـازدە شـتان، وەڵامـی سـوێندەكەش ئەوەیـە: كـە هـەر كەسـێك خـۆی پـاك و چـاك بـكات، سـەرفرازە و، هـەر كەسـێك خـۆی لەبـن گوناهانـدا پەنهـان بـكات، پەشـێمانەو بەدبەختـەو دۆڕاوە: ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴿١﴾ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴿٢﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ﴿٤﴾ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ﴿٥﴾ وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾﴾، ئەمـە یـازدە (١١) سـوێندەكە، وەڵامەكەشـیان ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ﴿١٠﴾﴾، بێگومـان خـوا ﷻ سـوێند بخـوات بـە یـازدە (١١) لـە دروسـتكراوەكانی خـۆی، كـە لـە نێویانـدا، (نفـس)ە، واتـە: ڕۆحـی بەشـەر، كـە وا پێدەچـێ جندیـش هـەر بگرێتـەوە، ئـەوە كـە خـوا عـز وجـل، وەك پێشـتر باسـمان كـرد، توانـای پێـداوە جیاوازیـی بـكات، لـە نێـوان خێـرو شـەڕدا، ڕاسـت و چـەوت دا، حـەق و ناحـەق دا، وە توانـای ئەوەشـی پێـداوە چاكـە بـكات خـۆی لـە خراپـە دوور بگـرێ، چاكـە هەڵبژێـرێ و خراپـە پـاڵ پێوەنـێ، یاخـود بـە پێچەوانـەوە خراپـە هەڵبژێـرێ و چاكـە پشـتگوێ بخـات، ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ كـە بەڕاسـتیی خـۆ پـاك و چاككـردن، لـە ئیسـلامدا، (تَزْكِيَـةُ النَّفـس) شـتێكی زۆر گـەورەو گرنگـە، هـەروەك پێچەوانەكەشـی، شـتێكی زۆر جێـگای مەترسـییە، كـە بریتیـە لـەوەی مـرۆڤ خـۆی ئیهـمال و، پشـت گـوێ بخـا گوێنـەدا بەخـۆی و خـۆی پـاك و چـاك نـەكات، بـە

---

(١) (المختار الصحاح) لاپەڕە: (٢٤٨)، و (المعجم الوسيط) لاپەڕە: (٣٦٦- ٣٦٧).

پێچەوانەوە تاوانباریی لە خۆیدا بەهێز بکات، پارێزکاریی لە خۆیدا خەفە بکات و بێ شۆقی بکات وخۆی بخاتە ژێر کەمەڕەو چڵك و ژەنگی گوناهو تاوانەوە.

کەواتە: بۆ پێناسەی تەزکیەی نەفس، دەتوانین ئاوا بڵێین: (**تَزكيةُ النَّفْسِ هِيَ إِنْمَاءُ بَذْرَةِ التَّقوَى المودعة فِيها ثُمَّ التَّمكِينُ لَها فيها، إلى أن تنشأ وَتَرَعْرَعَ، وتُثْمِرَ وفِي الوَقْتِ نَفْسِهِ جذر الفُجورِ فيها، وَتَطْهِيرُها مِنْها**)، واتە: تەزکیەی نەفس بریتیە لە گەشەپێدانی تۆوی پارێزکاریی کە لە نەفسدا دانراوە، دواییش تواناداركردنی پارێزکاریی تاکو گەشە دەکات، هەراش دەبێ، بەرو میوە دەردەکات، لە هەمان کاتیشدا بریتیە لە ڕیشەکێشکردنی ڕەگ و ڕیشەکانی تاوانباریی و پاککردنەوەی نەفس لێیان.

کەواتە: (**النَّفْسُ الزَّكِيَّة**) نەفسی تەزکیەکراو، بریتیە لە نەفسێکی پارێزکاری چاك، هەروەك نەفسی خۆپەنهانکەر (**النَّفْسُ المُتَدَسِّيَّة**) بریتیە لە نەفسێکی گوناهکاری تاوانباری خراپەکار.

شایانی باسە وشەی: (**تزكية**) وەك هەموو وشەکانی: (**إيمان و عبادة و تقوى وبر وطاعة**) هەر کاتێك بە تەنیا بێ لە ڕەوتێکدا، مەفهوم و چەمکەکەی زۆر فراوان دەبێ تاکو دین هەمووی دەگرێتەوە، چ لە باری ئەرێنییدا، کە بریتیە لە فەرمانبەریی کردنی خوا، چ بەباری نەرێنییدا کە بریتیە لە خۆ دوورگرتن لەسەر پێچیی خوا ﷻ، هەر بۆیەش بەو چەمکەیەتی کە خوا ﷻ سەرفرازی بە تەزکیەی نەفسەوە بەستۆتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴾، هەروەها دەشفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾**الأعلى**، بەڵام کاتێك تەزکیەی نەفس، لەگەڵ وشەکانی دیکەدا بەراورد دەکرێ، ئەو کاتە ماناو چەمکەکەی قەتیس دەبێ لەو بوارەدا کە بواری مەعنەویی، ڕووحییە و بواری ئاکاریی و ڕەوشتییە.

## تەوەری دووەم: پێگەو بەرهەمی تەزکیەی نەفس:

لەبارەی بەرهەم و پێگەی تەزکیەی نەفسەوە دەتوانین زۆر شت بڵێین، بەڵام ئێمە لە حەوت (٧) بڕگەدا، باسی پێگەو بەرهەم و میوەی خۆ پاك وچاك كردن، (**تزكية النفس**) دەكەین.

١- (**التزكية النفس**) واتە: خۆ پاك و چاك كردن، یەكێكە لە چوار ئەركەكەی كە پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ پێیان ڕەوان كراوە، هەروەك هەركام لە ئایەتەكانی: (١٢٩ و ١٥١)، لە سوورەتی (**البقرة**) و، ئایەتی (١٦٤) لە سوورەتی (**آل عمران**)و، ئایەتی (٢) لە سوورەتی (**الجمعة**) دەیگەیەنن، كە ئێمە بۆ نموونە ئایەتی: (٢)ی سوورەتی (**الجمعة**) دێنین، كە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ ﴾، كەواتە: چوار ئەركەكەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ كە لە چوار ئایەت لە قورئاندا هاتوون، بریتین لە خوێندنەوەی ئایەتەكانی خوا، پاكو چاككردنی خەڵك و لتێب و حیكمەت و فێركردنیان.

هەڵبەتە لەشوێنی خۆیدا باسمان كردوە كە مەبەست لە كیتاب، واتە: بەرنامە و، شەریعەتی خوا، (**حكمة**)یش بریتیە لەو ڕەوشت و ئاكارە بەرزو پەسندانەی دەبێ كۆمەڵگا خۆیانیان پێ بڕازێنێتەوە، یاخود بریتیە لە چۆنێتی جێبەجێكردنی یاساكانی شەریعەت، هەركامیان لە شوێنی خۆیداو لەكاتی خۆیدا، بە شێوازی خۆی.

٢- بەڵگەیەكی دیكەی گرنگیی پێگەی تەزكیەی نەفس و بەرهەمەكەی، ئەوەیە كەهەر كەسێك خۆی پاك و چاك بكات، سەرفرازیی ڕەهای بۆ دەستەبەر دەبێ، كە لە ڕازیبوونی خواو چوونە بەهەشتدا بەرجەستە دەبێ، هەروەك ئایەتەكانی ژمارە: (٧٥ و ٧٦) لە سوورەتی (**طه**) و، وە ئایەتەكانی: (١ - ٤) لە سوورەتی (**المؤمنون**) و، ئایەتی (٤) لە سوورەتی (**الأعلی**) و، ئایەتی (٩) لە سوورەتی (**الشمس**) دەیگەیەنن:

بـۆ نموونـە لـە ئایەتەکانـی: (١ - ٤) لـە سـوورەتی (المؤمنـون)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾، واتـە: بەدڵنیایـی بـڕواداران سـەرفرازن. ئەوانـەی لەنوێژەکانیـان دا ملکەچـن و، ئەوانـەی پشـتێکردووی، ئەوانـەی ئەنجامـدەری تەزکییـەن. لێـرەدا زەکات مەبەسـت پێـی خـۆ پاکـو چـاك کردنـە.

٣- خوا ﷻ تەزکیەی نەفسی کردوە بە گەورەترین شوێنەوار بۆ شوێنکەوتنی ئایین و بەرنامەکەی و، شوێنکەوتنی پێغەمبەرانی خوا، وەك لە ئایەتەکانی: (١٥ - ١٩) لە سوورەتی (النازعات)دا هاتوە، هەروەها ئایەتەکانی: (١ - ٤) و (٥ - ٧)، لە سوورەتی (عبس)دا، لە بارەی بەسەرهاتەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئومی مەکتوومەوە و، ڕۆیشتنی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوێ بۆگرتنی و، ڕوو لێوەرگێڕانی پێغەمبەر ﷺو، خۆ لێگرژکردنی بەهۆی سەرگەرم بوونی بەقسە کردن، بۆ کۆمەڵێك لە زلەزلانی قورەیش وە، پاشان گلەییکردنی خوای پەروەردگار لێی: ﴿ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ ﴾.

کەواتـە: تەزکیـەی نەفـس بەهـۆی ڕووکردنـە خـواو بڕواهێنـان بـە خـواو شـوێن پێهەڵـگرتنی پیغەمبـەری خـوا وە ﷺ پەیدادەبـێ.

٤- خوا تبارك و تعالى وەدەستهێنانی مرۆڤ بۆ تەزکیەی نەفسی کردوە، بە دەرەنجامێك بۆ بەخشش و چاکەی خوا لەگەڵیدا و، بەزەیی خوا بەرانبەری، وەك لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٢١)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا نەبووایە لەسەر ئێوە، هیچ کام لە ئێوە پاك وچاك نەدەبوون، بەڵام خوا هەر کەسێکی بیەوێ پاکو چاکی دەکات، خوا بیسەری زانایە، دەزانێ کێ شایستەی ئەوەیە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ بکات کە: پاکوچاکی بکات.

٥- خوا ﷻ تەزکیەبوونی نەفسی کردوە بە دژو پێچەوانەی شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان، وەك لە ئایەتی (٢١) لە سوورەتی (النور)دا ئەمە زۆر ئاشکرا دیارە، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون و، هەر کەسێك شوێن هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ، بە دڵنیایی ئەو فەرمان دەکات بە شتی ناقۆڵاو خراپ، ئەگەر بەخشش و بەزەیی خواش نەبووایە لەسەرتان، هیچ کامتان پاکوچاك نەدەبوون، بەڵام خوا کەسێکی بوێ پاك و چاکی دەکات، کەواتە: پاك و چاکبوون ڕێك پێچەوانەی شوێنکەوتنی شەیتان و شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیتانە.

٦- خوا ﷻ هەرکام لە یەحیای کوڕی زەکەرییاو عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوایان لێبێ)، بە تەزکیەی نەفس باسکردوون، وەك لە ئایەتەکانی: (١٣ و ١٩) لە سووڕەتی (مریم)دا، بۆ هەردووکیان وشەی (**زكاة**)ی بەکارهێناوە: ﴿ وَزَكَوٰةًۖ وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ ﴾، شایانی باسیشە: عیساو یەحیا (سەلامی خوایان لەسەر بێ)، لە قوڕئاندا هیچ هەڵەو کەموکوڕییەکەیان پاڵ نەدراوەتەلا، وەک ئەوەی پاڵدراوەتە لای پێغەمبەرانی دی، کە ئەمەش سیفەتێکی بەرزە لەواندا بە هۆی بەخششی خواوە، بەڵام بێگومان ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە لە پێغەمبەرانی دیکە پایەدارترن، بەڵام ئەمە تایبەتمەندییەکی ئەوانە، واش پێدەچێ کە وەسفکردنی ئەوان لە نێو هەموو پێغەمبەراندا بە (**زَكَاءُ النَّفس**) واتە: ڕووحی پاك و چاك، ئەوەیە کە هیچ هەڵەو کەم و کوڕی لێیرووونەداون، بەڵام پێغەمبەرانی دی، خوا هەڵەو کەموکوڕیی پاڵداونە لا، ئەو هەڵەو کەم وکوڕییانەش ئەوە نین، کە بە چەمك و واتای ئێمە بە گوناح لە قەڵەم بدرێن، پێغەمبەران پارێزراو بوون لە هەڵەو کەموکوڕیی و، هەرگیز شتێکیان نەکردوە، کە زانیبییان گوناحەو ئەنجامیان دابێ، بەڵام جاری وایە لە شتێکدا نەیانپێکاوە.

٧- لەبەر ئەوەی، ئەو خۆ پاك و چاککردنە، هەرکەسێك لافی پاك و چاکبوونی لێدابێ بەبێ ئەوەی شایستە بێ، خوا سەرزەنشتی کردوە بەدرۆ هەڵبەستەر ئاوزەوی کردوە، وەك لە ئایەتی (٣٢)، لە سووڕەتی (النجم)دا و، لە ئایەتەکانی: (٤٩ و ٥٠) لە سووڕەتی

(النساء)یش دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾﴾، هەروەها لە سووڕەتی (النجم) ئایەتی (٣٢)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾﴾، خۆتان پاك وچاك مەكەن [بە قسە، بە کردەوە خۆت پاك وچاك بکە، بەڵام بە کردەوە لاف لێ مەدە]، خوا زاناترە بەوەی کێ پارێزی کردووە.

کەواتە: لە ئەنجامی پەیدابوونی تەقوادا نەفس تەزکیە دەبێ و، لە ئەنجامی خۆ پاك وچاککردندا تەقوا میوانی دڵ و دەروونی مرۆڤ دەبێ، ئنجا خۆ پاك وچاککردن بەقسە چەندە خراپە، بە پێچەوانەوە بەکردەوە ئینسان خۆی پاکوچاك بکات، بەبێ ئەوەی بانگەشە بکاو لاف لێبدات، ئەوەندە چاکەو، هێندە گەورەو گرنگە.

## چۆن تەزكیەی نەفس ئەنجام دەدرێ و ئامرازەكانی چین؟

كەواتە: ئێمە لە دوو خاڵدا ئەم تەوەری سێیەمە دەخەینە ڕوو:

١- چۆن پرۆسەی تەزكیەی نەفس ئەنجام دەدرێ؟

٢- ئامرازەكانی تەزكییەی نەفس چین؟

### یەكەم: چۆن پرۆسەی تەزكیەی نەفس ئەنجام دەدرێ ؟

وشەی نەفس بەلایەنی مەعنەویی لە مرۆڤدا دەگوترێ، ڕووحیی، نابەرهەست، چونكە مرۆڤ لە دوو پێكهاتەی سەرەكی پێكهاتووە: جەستەیەكی خاكیی و، ڕووحێكی خوایی.

هەڵبەتە هەردووكیان دروستكراوی خوان، بەڵام ڕووح دروستكراوێكی سەرووی ماددییە، خوا هەمیشە ڕووح پاڵدەداتە لای خۆی: ﴿ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴿٢٩﴾ ﴾**الحجر**، ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي ﴿٨٥﴾ ﴾**الإسراء**، ئنجا ئەمە لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتووە، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾**الحجر**، هەروەها لە سوورەتی (**الإسراء**)دا ئایەتی (٨٥) دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي ﴿٨٥﴾ ﴾.

كەواتە: مرۆڤ لە جەستەیەكی خاكیی و ڕووحێكی خوایی ﷻ ڕووحێكی ڕەبیانیی، دروست بووە، كە هەردووكیان دروستكراوی خوان، بەڵام ڕووح بۆ ئێمە شتێكی زانراوو دیار نیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: لە بارەی ڕووحەوە پرسیارت لێدەكەن، بڵێ: كاری پەروەردگارمەو كەمێكیش نەبێ زانیارییتان پێنەدراوە، واتە: بەو ئەندازە كەمە زانیارییە ناتوانن دەركی چییەتی

ڕووح بکـەن، ئنجـا تەزکیـەی نەفـس لـە میانـی کارکردنـی مـرۆڤ و هەوڵدانـی مرۆڤـدا بـۆ ملپێکەچکردنـی نەفسـی بـۆ ئـەوەی شـەریعەت داوای لـێ دەکات لـە پابەندییـەکان، چ بەبـاری ئەرێنییـدا، بـە ئەنجامدانـی فەرمانـەکان و ئەرکـەکان، چ بەبـاری نەرێنیـدا بـە خـۆ دوورگرتـن لـە قەدەغـەکان، لەمیانـی ئـەوەدا تەزکیـەی نەفـس ئەنجـام دەدرێ.

مـرۆڤ لـە پڕۆسـەی خـۆ پاکوچاککردنـدا بـە زۆر قۆناغانـدا دەڕوات، بـەڵام بـە گشـتیی، سـێ قۆناغـن:

**قۆناغـی یەکـەم:** لـە ئەسـڵدا نەفس زۆر فەرمـان دەکات بـە خراپـە: ﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓ ﴿٥٣﴾﴾ یوسـف، ئەمـە قسـەی یوسـوفە لـە سـووڕەتی (یوسـف)دا، بەدڵنیایـی نەفـس زۆر فەرمـان دەکات بەخراپـە، مەگـەر پـەروەردگارم بەزەیـی بنوێنـێ.

نەفـس لـە ئەسـڵی سوررشـتی خۆیـدا، خـوا ﷻ وای خوڵقانـدوە، کـە زۆر فەرمـان دەکات بـە خاوەنەکـەی بـە خراپـەو بـە دووریـی لـە بەندایەتیـی بـۆ خـوا.

**قۆناغـی دووەم:** ئەوەیـە کـە دوای ئـەوەی مـرۆڤ لەگـەڵ خۆیـدا خەریـك دەبـێ، خـۆی وا لێـدەکات جارجـار ملکـەچ بـکات بـۆ شـەرع و، جارجاریـش لابـدات، ئەمـەس قۆناغـی (لَوّامـة)ی پـێ دەڵێـن: ﴿وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾﴾. واتـە : نەخێـر سـوێند بـە نەفسـی زۆر ڕەخنەگـر _لەخـۆی- دەخـۆم.

**قۆناغـی سـێیەم:** کـە قۆناغـی کۆتایـی تەزکیـەی نەفسـە، بریتیـە لـە وەی نەفـس دەچێتـە حاڵەتـی ئۆقرەگرتـن و سـەقامگیربوون لەسـەر جـادەی شـەرع، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرۡضِيَّةً ﴿٢٨﴾﴾ الفجـر، کەواتـە: تەزکیـەی نەفـس و چۆنیەتیـی ئەنجامدانەکـەی ئەوەیـە کـە مـرۆڤ لەگـەڵ خۆیـدا خەریـك بـێ، کار لەسـەر خـۆی بـکات، نەفسـی لـە حاڵەتـی ( لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ ) زۆر فەرمانکـەر بـە خراپـەوە بگوازێتـەوە بـۆ قۆناغێکـی دیکـە، قۆناغـی

خۆ سەرکۆنەکردن (ٱللَّوَّامَةِ)، دوایی لەوێشەوە بیگوازێتەوە بۆ قۆناغی ئارامگرتن (ٱلْمُطْمَئِنَّةُ)، وای لێ بێ نەفسی ملکەچ بێ بۆ فەرمانەکانی خوا و، مووی لێ نەلەخشێ و مووێ نەپسێنێ لە فەرمانبەرییکردن بۆ خوای بەرزی مەزندا.

بێگومان خۆ پاك و چاك کردن زۆر گرنگە بە کردەوە، بەڵام خۆ بە پاك و چاك دانان بە قسە، یەکجار خراپە، بۆیەش خوا ﷻ لە سوورەتی (النجم) لە ئایەتی ژمارە (٣٢)دا، مرۆڤی قەدەغە کردوە لەوەی بەقسە خۆی بە پاکوچاك لە قەڵەم بدات: ﴿ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴾، خۆتان پێ پاکو چاك نەبێ بەقسە، چونکە خوا زاناترە بەوەی کێ پارێزی کردوە لە خوا، کەواتە: بەهۆی پەیدابوونی تەقواوە، نەفس حاڵەتی پاکیی و چاکیی بۆ دروست دەبێ.

هەروەها لە سوورەتی (النساء)یش کە پێشتریش ئاماژەمان پێدا لە ئایەتی ژمارە (٤٩)، دەفەرمووێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە خۆیان پاك و چاك پێشان دەدەن، (بەقسە خۆیان پاکوچاك دەکەن) بەڵکو خوا هەر کەسێکی بیەوێ پاك و چاکی دەکات، سەرنج بدە چۆن درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستن، ئەوەش گوناهێکی ئاشکرایە، بەڵام لە حاڵێکدا مرۆڤ بەکردەوە خۆی پاك وچاك بکات، خوا سەرفرازیی دنیاو دوارۆژی پێوە بەستۆتەوە: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾الشمس، ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾**الأعلى**، کە خوا ﷻ بە هەردوو حاڵەتی ڕابردوو و ئێستا هێناونی.

## دووەم: ئامرازەکانی تەزکیەی نەفس:

بە کورتیی دەتوانین بڵێین: ئامرازەکانی خۆ چاك و پاککردن، هەموو ئەوانەن کە پارێزکاریی لە مرۆڤدا دێننە دی، چونکە پارێزکاریی بناغەی تەزکیەیەوە، لە

لـە ئەنجامـی پارێزکارییـدا، تەزکیـە پەیدادەبێ، هەڵبەتـە دەشـگونجێ بڵێیـن: هەرکاتـێ مـرۆڤ خـۆی تەزکیـە کـرد، ئنجـا تەقـوای تێـدا پەیدادەبـێ و، تەقـوا بناغەیـە بـۆ تەزکیەبوونـی نەفـس، مـرۆڤ بـە ئەنـدازەی ئـەوەی تەقـوا لە خۆیـدا پەیـدا دەکات، ڕوو لـە چاکـە دەکات، ڕوو لـە خـوا دەبـێ، پشـت لـە خراپـەو تـاوان و لادان دەکات.

ئنجا ئێمە نۆ (٩) هۆکارەکان هێناون لەوانەی دەبنە هۆی پاکوچاك بوونی نەفس:

هۆکاری یەکەم: ئاگاداربوون لە ئایەتە بە پێزەکانی خوا، چ وەك خوێندن، چ وەك گوێ گرتن: چونکە خوا ﷻ لە چوار شوێنی قورئاندا چوار ئەرکە سەرەکییەکەی پێغەمبەری خاتەمی ﷺ بەو چوارە داناون: ﴿ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٢٩ ﴾، واتە: ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە و تەزکیەیان دەکات و کتێبیان فێر دەکات و حیکمەتیان فێر دەکات.

ئنجـا لەهـەر چـوار شـوێنەکاندا خـوا ﷻ خوێندنـەوەی ئایەتەکانـی پێـش خسـتوە: ﴿ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ ١٦٤ ﴾ **الجمعة**، لـە هـەر چـوار شـوێنەکاندا ئەمە پێشـخراوە، کەواتـە: شـارەزابوون بـە ئایەتەکانـی خـوا و پەیبـبردن، ئاگاداربـوون لـە ئایەتەکانـی خـوا، بناغـەی تەزکیـەی نەفـس و پـاك وچـاك بوونـە.

هۆکاری دووەم: ئیمان: بێگومان لەڕووی ڕیزبەندیی کاتییەوە، ئیمان لە پێشەوەیە، چونکە مرۆڤ دەبێ ئیمانی هەبێ، ئنجا هەوڵدەدا خۆی پاك و چاك بکات، سیفەتی پارێزکاریی لە خۆیدا بێنێتە دی، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئایەتەکانی (١ - ٤)ی سوورەتی (**المؤمنون**)ە: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ٣ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ٤ ﴾، خوا ﷻ پێناسەی بڕواداران دەکات بە سەرفرازیی، دوایی بەوە پێناسەیان دەکات و وەسفیان دەکات کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچن بۆ خوا، خۆیان لە قسەی پووچ و لە کرداری پووچ دەپارێزن، زەکات ئەنجام دەدەن، مەبەست لە زەکات کە دەفەرموێ: ﴿ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴾، تەزکیەیە، چونکە زەکاتی ماڵ و سامان دەدرێ، نەك ئەنجام بدرێ.

هۆكاری سێیەم: سام و هەیبەت بەرانبەر بە خوای بەرزی مەزن:

وەك لە سووڕەتی (**فاطر**)دا، دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾﴾، واته: بێگومان تۆ تەنیا ئەوانە وریا دەكەیەوە، (وریاكردنەوەیەك كە لێی بەهرەمەند بن) كە سام و هەیبەتیان بە پەنامەكیی بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، [كاتێك كە كەسی لێ نیە، تەنیا خۆیان و خوان، لەو كاتەدا سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان پەیدادەبێ] و نوێژیان بەرپا كردوەو، هەر كەسێكیش خۆی چاك و پاك بكات، بۆخۆی خۆی چاك و پاك كردوە.

كەواتە: لە ئەنجامی سام و هەیبەت بەرانبەر بەخوا ﷻ و، نوێژ بەرپاكردن دا، دەگونجێ نەفس كە پاك و چاك ببێ.

هۆكاری چوارەم: بەرپاكردنی نوێژ:

بێگومان بەرپاكردنی نوێژ، هۆكارێكی یەكجار كاریگەرە بۆ چاك و پاك و گەشەكردنی نەفس، وەك لە سووڕەتی (**فاطر**) دا، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾﴾ واته: نوێژیان بەرپا كردوە و هەركەسێكیش خۆی پاك و چاك بكات، خۆ پاك و چاك كردنەكەی سوودەكەی بۆ خۆیەتی.

هۆكاری پێنجەم: یادی خوا تبارك و تعالى:

لە سووڕەتی (الزمر)، ئایەتی (٢٣)دا كە وەك نموونەیەك دەیهێنین، خوا دەفەرمووێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَـٰبًا مُّتَشَـٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾﴾، واته: خوا باشترین فەرمایشتی دابەزاندوەو كتێبێكی وێكچوویە، مەبەستەكان تێیدا دووبارە دەبنەوە، ئەوانەی ترس

و سامیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، پێستیان ڕێك دێ، (تەزوویان پێدا دێ)، دوایی پێستیان و دڵیان بۆ لای یادی خوا نەرم دەبێ، ئەوەش ئەو ڕێنماییەی خوایە، هەر کەسێکی بیەوێ پێی ڕاستەڕێ دەکات و، هەر کەسێك خوا ڕێی لێ تێکبدات، هیچ ڕێنماییکارو بە ئامانج گەیەنەرێکی نیە.

بێگومان مرۆڤ لە ئەنجامی ئەوەدا کە پشت لە هیدایەتی خوا دەکات، خوای دادگەریش گومڕای دەکات، وەك دەرەنجامێکی لۆژیکیی کەسێك ژەهر بخوات دوایی دەرهاوێشتەی ژەهرەکە دەبێتە دەردو نەخۆشیی، کەسێك هیدایەتی خوا ڕەفز بکات، بێگومان بەپێی یاسایەك و سستمێك کە خوا دایناوە لە ژیانی بەشەردا، ڕێی گومڕایی دەگرێتە بەر، بەڵام خوا پاڵیداوەتە لای خۆی، بۆ ئەوەی بزانین کە هیچ شتێك لەم گەردوونەدا بەبێ ویستی خوا و توانای خوا و زانیاریی خوا ئەنجام نادرێ.

هەروەها لە سووڕەتی (**الأعلى**)شدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: بەدڵنیایی سەرفرازە ئەو کەسەی خۆی پاك و چاك کردوەو، ناوی پەروەردگاری هێناوەو نوێژی کردوە، کەواتە: یادی پەروەردگارکردن، چ بە زمان، چ بە دڵ، چ بە هەردووکیان، بێگومان هۆکارێکی کاریگەرە بۆ پاك وچاك بوونی نەفس.

ئێستاس بۆ زیاتر تیشک خستنەسەر چەمک و مانای یادی خوا (ذکر الله) هەڵوەستەیەکی کورتی لەبەرسنبەردا دەکەین:

## هەڵوەستەیەک لە بارەی یادی خواوە ئەم هەڵوەستەیە لە چوار

### ١- یادی خوا چییە؟

وشەی: **(ذِکر)** بریتییە لەوەی شتێك بخەیە سەر زمانت و نێو دڵت، لێی بێئاگا نەبی و وازی لێ نەهێنی، ئنجا چ لەگەڵ دڵدا زمانیش ئامادەبێ، چ تەنیا دڵ ئەو خستنەوە یادەی تێدابێ، وشەی زیکر لە ئەسڵدا بەو مانایەیە، **(ذکر)**، پێچەوانەی **(نسیان)** لە بیرچوونەوەیە و پێچەوانەی بێ ئاگاییە، شوێنی ئەسڵی یادی خوا کردن، بریتییە لە دڵ و دەروون.

### ٢- گرنگیی یادی خوا:

یادی خوا کردن گشتییترینی پەرستشەکانە و هیچ کاتێك نیە، خوا فەرمانی پێ نەکردبێ، خوا ﷻ نەیبەستۆتەوە بە حاڵەتێکی تایبەت، یان کاتێکی تایبەت، یان کەسانێکی تایبەت، بەڵکو گشتاندوویەتی بەسەر هەموو کەسەکاندا و، لەهەموو کاتەکاندا، بۆ وێنە خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ **العنكبوت**، یانی: یادی خوا گەورەترە لە هەموو ئەو شتانەی دیکە کە باسکران، هەروەها خوا ﷻ وشەی: **(ذِکْر)**ی فەرمان پێکردوە بە گشتیی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەباسکردنێکی زۆر، یان بە یادکردنێکی زۆر، یادی خوا بکەن.

### ٣- جۆرەکانی یادی خوا:

جۆرەکانی یادی خوا ﷻ ئێمە هەشت (٨)یانمان لێ هێناون:

١)- خوێندنەوەی کتێبی خوای بەرز.

٢)- بە پاکگرتن و ستایشکردنی خوا (**التسبيح والتحميد**).

٣)- پاڕانەوە لە خوا (**الدعاء**).

٤)- داوای لێبوردن کردن لە خوا ﷻ.

٥)- گوتنی (**اللهُ أَكْبَر**)، خوا گەورەترە.

٦)- خوا بە یەکگرتن، (**التوحيد**)، گوتنی: (**لا إله الا الله**).

٧)- سەڵات و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

٨)- یادی خوا کردن لە حاڵە جۆراو جۆرەکان دا.

ئەوەش باسێکی زۆر دوور و درێژە.

## ٤- چۆن یادی خوای بەرز دەکەین:

بێگومان یادی خوای بەرز وەك لە چەند ئایەتێکی قورئاندا دیارە، چەند ئەدەبێکی هەن و دەتوانین بڵێین: شەشیان ئەو ئەدەبە سەرەکییانەن کە دەبێ ڕەچاو بکرێن لە کاتی یادی خوای بەرزی مەزن دا:

١- یادی خوا بکرێ، بە کڕوزانەوەو لالانەوەو ملکەچییەوە: ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا ﴿٢٠٥﴾ ﴾**الأعراف**.

٢- یادی خوا بکرێ لە حاڵێکدا کە مرۆڤ سام و هەیبەتی خوای بەرز دایدەگرێ، هەست دەکات بە بەزریی و شکۆی بێوێنەی خوا: ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً ﴾، بە ترسەوە.

٣- زمانیش هاوبەش بێ لەگەڵ دڵدا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ ﴿٢٠٥﴾ ﴾**الأعراف**، بەبێ دەنگ بەرز کردنەوە.

٤- یادی خوا کردن بە دەنگ بەرزکردنەوەو هاوارو دەنگ هەڵهێنان نەبێ، بەڵکو بە دەنگێکی کپی نزم بە کرووزانەوەو لاڵانەوە بێ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ ﴿٢٠٥﴾﴾، هەروەها: ﴿إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ﴿٣﴾﴾.

٥- مرۆڤ بچێتە نێو یادی خواوەو کارلێکی لەگەڵ بکات، خۆی بەرەو خوای پەروەردگار دابڕێ و، هەست بە شهوودیی خوای بەرزی مەزن بکات و (**جَمَال و جَلال وعَظَمَة**)و هەیبەت و کەماڵی خوای پەروەردگار هەست پێ بکات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴿٨﴾﴾المزمل.

٦- لە ئەنجامی یادی خوادا، دڵ ڕاچڵەکین و موچڕکە پێداهاتن و هەست و نەست جووڵان بێ، وەك لە سووڕەتی (الحج)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكٗا لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۗ فَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَلَهُۥٓ أَسۡلِمُواْۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾﴾، واتە: بۆ هەر کۆمەڵێك خوا پەرستییەکمان داناوە، تاکو یادی خوا بکەن، لەسەر ئەوەی پێیداون لە ئاژەڵەکان، ئنجا پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، بۆ ئەو ملکەچ بن و موژدە بدە بە ملکەچان و نەرم و نیانان (لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا)، ئەوانەی کاتێ یادی خوا دەکرێ، دڵییان ڕادەچلەکێ و خۆڕاگرن لەسەر ئەوەی تووشیان دێ و نوێژ بەرپاکەران و ئەوانەی لەوەی پێمان داون دەبەخشن.

هۆکاری شەشەم: بەخشین لەڕێی خوادا.

وەك خوا سبحانەو تعالى لە سووڕەتی (**التوبة**)دا دەفەرموێ: ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡ ﴿١٠٣﴾﴾، واتە: لە ماڵەکانیان خێرو صەدەقەك وەربگرن، کە بەهۆیەوە پاکیان بکەیەوە و گەشەیان پێ بدەی و صەڵاتیان لەسەر بدە..

هەروەها لە سووڕەتی (الليل)، ئایەتەکانی: (١٧ - ١٨)دا، دەفەرموێ: ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلۡأَتۡقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾﴾، واتە: لێی دوور دەخرێتەوە.

[لەو ئاگرە گەورەیەی خوای] هەرە پارێزگار (کەسێك لە هەموو کەس پارێزکارترە) ئەو کەسەی ماڵ و سامانی خۆی دەدات و خۆی پاکوچاك دەکات.

هۆکاری حەوتەم: ئامرازی حەوتەم: پابەندیی بە شەریعەت و ئەدەبە بەرزەکانییەوە، لە بواری هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکاندا؛ ئەمیش دەتوانین زۆر بەڵگەی لە قورئان لەسەر بێنینەوە، کە خۆ ڕازاندنەوە بە ئەدەب و ڕەوشتەکان، لە بواری هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکان دا دەبێتە هۆی تزکیەی نەفس، بۆ وێنە: لە سوورەتی (النور)، ئایەتەکانی: (٢٧ و ٢٨)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! مەچنە ماڵانێك جگە لە ماڵەکانی خۆتان تاکو مۆڵەت وەرنەگرن، بزانن پێیان خۆشە و، ئاسوودەن بەچوونتان و، سڵاو لە دانیشتووەکانی ئەو ماڵانە نەکەن، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، بەڵکو پەند وەربگرن (یان بیرتان بکەوێتەوە)، ئەگەر کەستان تێدا نەبینی، مەیانچنەتێ هەتا مۆڵەتتان دەدرێ، ئەگەر پێشتان گوترا بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە، ئەوە بۆ ئێوە پاك و چاکترە، خوا بەوەی دەیکەن زانایە، کەواتە: یەکێك لە هۆکارەکانی تەزکییەبوونی نەفس ئەوەیە کە مرۆڤ لە هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆی بڕازێنێتەوە بەئەدەب و ڕەوشتە بەرزو جوانەکان، لەنێوانیشیاندا چۆنییەتی سەردان و هاموشۆ.

هۆکاری هەشتەم: خۆ دوورگرتن لە گوناهان بەگەورەو گچەکەوە:

وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٣٠)دا دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾، واتە: بە پیاوانی بڕوادار بڵێ: لە نیگای چاویان بگرنەوە و داوێنی خۆشیان بپارێزن، ئەوە بۆ ئەوان پاك و چاکترە، بێگومان خوا بەوەی کە وردەکارانە دەیکەن، شارەزایە [دەزانێ چی دەکەن و چۆنی دەکەن؟]

هۆكاری نۆیەم و كۆتایی: داواكردن لەخوای بەرز، هاوار تێبەستن لە بەزەیی و بەخششەكەی:

چونكە لە سووڕەتی (النور) ئایەتی (٢١)دا دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾﴾، واتە: ئەگەر بەخششی خواو بەزەیی خوا نەبووایە لەسەرتان، هیچ كام لە ئێوە پاكو چاك نەدەبوون، بەڵام خوا هەر كەسێك بیەوێ پاك وچاكی دەكات، خوا بیسەری زانایە.

بۆیەش دەڵێین: نۆیەم هۆكار لە هۆكارەكانی خۆ پاك و چاككردن، پەنا بەخوا بردن و داوا لە خوا كردن و هاوار لە خوا بەستنە، چونكە پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ هەر وای كردوە، وەك لەم دەقەوە دیارە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **{اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا} (أخرجه أحمد: ١٩٣٢٧، ومسلم: ٢٧٢٢، والنسائي: ٥٤٥٨، والطبراني: ٥٠٨٦).**

واتە: ئەی خوایە! پارێزكاری بەنەفسم ببەخشە و، پاكوچاكی بكە، تۆ باشترین كەسێكی پاك وچاكی بكەی، تۆ سەرپەرشتیارو مشورخۆری نەفس منی.

## ٤- چەند تێبینییەك لەسەر قوتابخانەكانی تەزكییەی نەفس و ڕێبازەكانی تەصەووف:

ئەم بابەتە لە چوار خاڵدا دەخەینەڕوو:

١- پێویستە جیاوازیی بكەین لە نێوان تەزكیەی نەفس و، قوتابخانەو ڕێبازەكانیدا.

٢- تەزكیە بە چەمك و واتا تایبەتییەكەی، بەشێك و لایەنێك لە لایەنەكانی ئیسلام.

٣- دامەزرێنەرانی قوتابخانەكان تەزكیە، ئەوانەی ڕێبازەكانی تەصەووفیان پاڵ دەدرێنەلا، زانایانی ئیسلام پێشەوایانی مسوڵمانان بوون.

٤- قوتابخانەكانی تەزكیەو ڕێبازەكانی تەصەووف تەنیا ئەزموون و كۆششی زانایان و پێشەوایان بوون لەو بوارەدا، بۆیە بەپێی تەرازووی قورئان و سوننەت لێیان وەردەگیرێ و، لێشیان ڕەفز دەكرێ، ئەوەی لەگەڵ قورئان و سوننەتدا نەیەتەوە.

یەكەم: پێویستە جیاوازیی بكرێت لەنێوان تەزكیەی نەفس و، قوتابخانەكان و ڕێبازەكان، تەزكیەی نەفس دا واتە: خۆ پاك و چاككردن لە زاتی خۆیدا، لایەنێكی زۆر گەورەو گرنگی ئیسلامە، كە باسمان كرد، لە تەوەرەكانی ڕابردوودا خوا ﷻ سەرفرازیی و بەختەوەریی و بە مراد گەیشتنی دنیاو دوارۆژی بە خۆ پاك و چاككردنەوە بەستۆتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤﴾ **الأعلى**، هەروەها ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩﴾ **الشمس**، تەزكییە لە زاتی خۆیدا لە هەموو حاڵاندا لایەنێكە لە لایەنەكانی ئیسلام، بەڵكو لایەنی زۆر گەورەو گرنگی دینداریيە بەبێ ئەوە مرۆڤ هیچ بەهیچ ناكات لە بواری خواپەرستییدا، بەڵام قوتابخانەكانی تەزكیە، ڕێبازەكانی تەصەووف، ئەوانە هەموویان ئەزموونن و، بۆچوونی زانایانن، كۆششی ئەوانن لەو بوارەدا، بۆیە ئەگەر كەم و كوڕییەكمان لە قوتابخانەیەكی تەزكیەدا بینی، یان لە ڕێبازێكی تەصەووفمان بینی، نابێ كۆی ئەو لایەنەمان لەبەرچاو ببێزرێ و، لەبەرچاومان بكەوێ یاخود نیشانەی پرسیاری بخەینە سەر،

چونكە وەك چۆن ئیمان و عەقیدە بەشێكی گەورەو گرنگی دینداریی مسوڵمانانە و، بناغەی دینداریی و مسوڵمانێتییە، هەروەها پەرستشەكان لایەنی پەروەردە، لایەنی حوكم و سیاسەت و لایەنی جەنگ و جیهاد، ئنجا ئەگەر كەسێكمان بینی بە هەڵە باسی ئیمان و عەقیدەی كردیان، بە هەڵە پەرستشێكی ئەنجامدا، بە هەڵە لە بواری حوكم و سیاسەتدا شتێكیی گوت، یان بە هەڵە لە بواری جەنگ و جیهادا مومارەسەیەكی هەڵەی كرد، نابێ ئەو لایەنەمان لەبەرچاو بكەوێ، دەبێ بڵێین: ئەو كەسە یان ئەو لایەن و خەڵكە، لەو ڕووەوە، لەو بوارەدا هەڵەو كەموكوڕییان هەیە، بەهەمان شێوەش تەزكیەی نەفس لەزاتی

خۆیدا لایەنێکی گەورەو گرنگی دینداریی و مسوڵمانێتیە، نابێ تێبینیمان لەسەر قوتابخانەکانی تەزکیەی نەفس و ڕێبازەکانی تەصەووف وامان لێ بکات، ئەو لایەنە نادیدە بگرین، یاخود بە کەم تەماشای بکەین.

دووەم: تەزكییە بە چەمك و واتا تایبەتەكەی، تەنیا بریتیە لە لایەنێك لە لایەنەكانی ئیسلام، بۆیەش دەڵێین: بە چەمك و واتا تایبەتییەكەی، واتە: گرنگییدان بە ڕووحیی و، مەعنەویی، لایەنی پەنهان و نەبینراوی مسوڵمانێتی، تەنیا لایەنێکە لە لایەنەکانی ئیسلامەتی، وە ئیسلام هەمووی لەوەدا خولاصە نەبۆتەوە.

تەزكیەش زۆرجاران وشەی: (تصوف)ی بۆ بەكاردەهێنرێ، بەڵام من پێم خۆشە وشەی: تەزكییە بەكاربهێنرێ، چونكە وشەیەكی قورئانییە، هەڵبەتە ئەوانەش كە لە ئەو بوارەدا وا مامەڵە دەكەن كە بریتیە لە هەموو ئیسلام و دینداریی و مسوڵمانێتی لەوەدا خولاصە دەبێتەوە، بە هەڵە داچوون، تەزكیەی نەفس بە واتا تایبەتەكەی بریتیە لە خۆ پاك وچاككردن و نەفسی خۆ بژاركردن لە سیفەتە خراپەكان و، ڕازاندنەوەی بە سیفەتە باشەكان، ئەمە پێناسەیەكی زۆر جوانی تەزكیەی نەفسە: (**التَّخْلِيَةُ مِنَ الرَّذَائِل، وَالتَّحلِيَةُ مِنَ الفَضَائِل**)، خۆ بژاركردن لە سیفەتە نزم و پەستەكان و، خۆڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەكان، بەو واتایەش بێگومان لایەنێكە و، بەشێكە لە دینداریی و مسوڵمانێتی و مسوڵمانێتی زۆر لەوە فراوانترە.

سێیەم: دامەزرێنەرانی قوتابخانەكانی تەزكیە و ئەوانەی ڕێبازەكانی تەصەووفیان پاڵ دەدرێنە لا، لە زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی مسوڵمانان بوون، گرنگە ئەوە بزانین كە هەموو ئەوانەی لەو بوارەدا كاریان كردوە، بۆ وێنە: (شێخ عەبدولقادری گەیلانی، سەید ئەحمەدی سەرهەندیی، شێخ جونەید، ئەبو سولەیمانی دارانی، حاریسی موحاسیبی، ئەبوو حامیدی غەززالیی و....هتد) هەموو ئەوانە زانایانی مسوڵمانان و پێشەوایانی مسوڵمانان بوون، مەرجیش نیە خۆیان ناویان لەو ڕێبازەی خۆیان نابێ، تەریقەتی فلان، (شێخ عەبدولقادر) نەیگوتوە: بێنن بە دوای عەبدولقادر بكەون و ئەوە تەریقەی

قادرییە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ)، بەڵکو هەموو کتێبەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، بۆ نمونە: (**الفَتْحُ الرَّبَّانِي وَالفَيْضُ الرَّحْماني**)، هەروەها (**الغُنية لِطَالِبِ طَرِيقِ الحَق**)، هەروەها (**فُتوح الغَيث**)، کتێبەکانی دیکەی تەماشا بکەین هەر باسی قوڕئان و سوننەت دەکات، ڕۆژێك لە ڕۆژان شێخ عەبدولقادری گەیلانی، نەیگوتووە: بەدوای من بکەون ئەوە ڕێبازی منە، گوتوویەتی: وەرن ئایەتی خوا وا دەفەرموێ، فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرموێ، بە ئەندازەی ئەوەی کە خۆیان لە قوڕئان و سوننەت تێگەیشتوون، خەڵکیان بۆ قوڕئان و سوننەت بانگ کردوە، خەڵك لە دوای خۆیان ناوی لێناون ڕێبازی قادریی و ڕێبازی نەقشبەندیی و ڕێبازیی بەدەویی و ڕێبازی ڕیفاعیی و ڕێبازیی چەشتیی و کوبرەویی و ڕێبازی فڵان و ڕێبازی فلان، ئەمە وەك ڕێبازەکانی تەصەووف.

وەك قوتابخانەکانی تەزکیەش بەهەمان شێوە، هەندێك لە زانایان ناویان وەك دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تەزکیەی نەفس دەرچووە، هەندێکیان ناویان وا دەرنەکەوتوە، بەڵام کاری زۆرشیان لەوبارەوە کردوە، وەك هەر کام لە ئیبنو تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێ، هەروەها ئیبنو قەییمی جەوزیی کە قوتابی ئیبنو تەیمیە بوەو، کۆمەڵێکی زۆر کتێبیان هەن لە بارەی تەزکیەی نەفسەوە لە بارەی خۆ پاکو چاککردنەوە، لە حاڵێکدا وەك هەندێك لە زانایانی دیکەی ئەو بوارە ناویان وا دەرنەکردوە، بەڵام کاری زۆریشیان کردوە لەسەر مەسەلەی تەزکیەی نەفس.

پێم وایە هیچ زانایەکی ئیسلام و هیچ پێشەوایەکی ڕەسەن نەبووە، کە پشکو بەشی باشی نەبووبێ، لە مەسەلەی تەزکیەی نەفسداو، کاری زۆر لەو بارەوە نەکردبێ، بۆچی؟

چونکە جددیی ئەگەر بەچەمکە گشتییەکەی تەماشای تەزکییە بکەین، خۆ پاك وچاككردن هەموو بوارەکانی دینداریی دەگرێتەوە و، ئەگەر بە چەمکە تایبەتییەکەشی تەماشای بکەین، تەزکیەی نەفس ئەو لایەنە گەورەو گرنگەی

دینداریـی دەگرێتـەوە کـە لایەنێکـی پەنهانـە، پەیوەندیـی بـە ڕووح و ناخـی مرۆڤەوە هەیـە، ئنجـا هیـچ کەسـێك ناگونجـێ دیندارێکـی ڕاسـت و ڕەسـەن و سـاغ و پـاك و چـاك بـێ و، مشـوورێکی زۆربـاش لـەو لایەنـەی خـۆی نەخـوات.

٤- قوتابخانەکانی تەزکیەو ڕێبازەکانی تەصەووف، تەنیا ئەزموون و کۆشش و بۆچوونی زانایان و پێشەوایان بوون، بۆیە لە قوتابخانەکانی تەزکیەو، لە ڕێبازەکانی تەصەووف وەردەگیرێ، کە پێمان وایە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دەگونجێ و بەپێی تەرازووی قورئان و سوننەت، ڕاستە و، ئەوەش ڕەفز دەکرێ کە پێمان وابێ لەگەڵ قورئان و سوننەتدا ناگونجێ، لە دەرەوەی قورئان و سوننەتە، یان لەگەڵیاندا تێکدەگیرێ، ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە کە قوتابخانەکانی تەزکیەی نەفس و ڕێبازەکانی تەسەوف وادائەنێین کە دینی تایبەتن و، نابێ هیچکەس هیچ شتێکیان بەسەر خاوەنەکانیاندا بداتەوە،! پێشەوایانێك کە ئەو ڕێبازانەیان پاڵدراوەتە لا، یاخود ئەو قوتابخانانەی تەزکیەی نەفسیان دامەزراندوون، هەرگیز هیچ کام لافیی ئەوەی لێ نەداوە، کە هەرچی دەیڵێ ڕاستە و، هەرگیز هیچ کام لەوانە نەیگوتوە: پارێزراوم لە هەڵە، بۆیە شوێنکەوتووانیشیان، دەبێ زۆر وریا بن، پارێزراوان لە هەڵە تەنیا پێغەمبەرانن (**علیهم الصلاة والسلام**)، ئەویش لە هەڵەی بە ئانقەست، واتە: شتێك بزانن گوناهەو بیکەن لەوە پارێزراون، بەڵام لەوەدا کە بۆچوونێکیان ببێ نەیان پێکابێ، پارێزراونەبوون، پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)، هەموویان لە قورئاندا خوای پەروەردگار هەڵەی پاڵ داونە لا، بۆ چوونێکیان بووە، هەڵهێنجانێکیان بووە، نەیان پێکاوە، بەتایبەت پێغەمبەری سەرووەرییان گەورەو پێشەوای پێغەمبەران موحەممەد ﷺ خوا لە چەند شوێن لە قورئاندا هەندێك شتی پاڵداوەتە لا، کە کردوویەتی نەدەبوو کردبای، فەرموویەتی نەدەبوو فەرمووبای، خواش بۆی ڕاست کردۆتەوە، بۆ وێنە:

﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ﴿٤٣﴾ ﴾**التوبـة**، واتـە: خـوا لێتبـبووری بۆچـی مۆڵەتتـدان (هـی دڵ نەخۆشـەکان)؟ مۆڵەتـت نەدابـان نەیـەن بـۆ جەنگـی تەبـووك.

٢- هەروەها: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴿٦٧﴾ ﴾ **الإسراء**، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نییە، دیلی هەبن هەتاكو كافران خەست و خۆڵ نەكات لە كوشتنیاندا، دەبێ زۆریان لێ بكوژێ لە پەل و پۆیان بخات، ئنجا ئەگەر دوایی دیلیان لێ بگرێ، بەو واتایە نا كە دەبوو دیلەكان بكوژن، واتە: بە تەماعی ئەوەی كە دوایی فەرەبوویان لێوەربگرن، نەدەبوو بەدیلیان بگرن.

هەروەها: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ ﴾عبس، واتە: ڕووی خۆی گرژ كردو، ڕووی وەرچەرخان، كاتێك پیاوە كوێرەكە هات بۆ لای، لێرەدا خوا ڕەخنە لە پێغەمبەر ﷺ دەگرێ كە نەدەبوو وات بكردبایە، بۆچی؟ پێغەمبەر ﷺ ئیجتیهادێكی كردوەو نەیپێكاوە، بەڵام بێگومان پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ هیچ شتێكیان نەكردوە نە گوتوەو كە زانیبوویان گوناهەو گوتبیان یان كردبیان، بەڵام جاری وا هەیە ئیجتیهادییان كردوە لە بۆ چوونێك لە بارەی شتێكەوە هەڵسو كەوتێكیان كردوە نەیانزانیوە گوناهە، یان نەیان پێكاوە، خوای پەروەردگار بۆی ڕاست كردوونەتەوە.

ئنجا ئەگەر پێغەمبەران وابوون، شوێنكەوتووانی پێغەمبەران كە زۆر لە خوار ئەوانەوەن بە پێچەوانەی ئەوەی كە موحیەددینیی ئیبنو عەرەبی لە هەندێك لە كتێبەكانیدا باس دەكات، كە هەندێك لەدۆستانی خوا ڕەنگە لە هەندێك شتدا، لە پێش پێغەمبەرانەوە بن، ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نییە، ئەفسانەیەكە خۆی دایهێناوە، باسی (خاتم **الأولياء**)و (خاتم **الأنبياء**) دەكات، هەر ئەفسانەیەكە خۆی دایهێناوە، هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیە، ئەوە ئەوەی لێ بەرە دەرێ، هەموو ئەوانەی غەیری پێغەمبەرانن لە خوار پێغەمبەرانن لە هەموو ڕوویەكەوە لە ڕووی زانیارییەوە لە ڕووی تەقواوە، لە ڕووی پەرستشەكانەوە، لە ڕووی تێگەیشتنەوە، لەڕووی پابەندییەوە، لە هەموو ڕوویەكانەوە لە خوار پێغەمبەرانەوەن، بۆیە ئەگەر پێغەمبەران لە هەڵەو لە بۆچوونی هەڵە لە كۆششكردنی هەڵە پارێزراو نەبووبن، غەیری پێغەمبەران لێی پارێزراو نین.

پێویستە ئاوا تەماشای قوتابخانەکانی تەزکیەو ڕێبازەکانی تەصەووف بکەین، کە ئەزموون و تاقیکردنەوەو بۆچوونی زاناو پێشەوایان بوون لەو بوارەدا، بۆیە ئەوەی کە پێمان وابێ لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دژ دەوەستێ، ڕەتی دەکەینەوە، ئەوەش کە پێمان وابێ بە تەرازووی شەریعەت لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا ڕاست و دروستە، وەریدەگرین و سوپاسیشیان دەکەین، داواش دەکەین خوا پاداشتیشیان بداتەوە.

بەڵام بێگومان نابێ هیچ کام لەو زانا پێشەوایانە نەڕێبازەکەی، نە کتێبەکانی، نە قەسەکانی وا تەماشا بکرێن، کە ئەوە بەفری بێ پەڵەو فریشتەی بێ هەڵەیەو، هەموو شتێکی لێ وەردەگیرێ، ئەوە تەنیا بۆ پێغەمبەری خاتەم وایە ﷺ، تەنیا پێغەمبەری خاتەم پارێزراو بووە لە هەڵەو کەموکوڕیی، چ لە ڕووی زانیارییەوە چ لە ڕووی کردەوە. وە لێرەشدا کۆتایی بەم کورتە باسە دێنین لە بارەی تەزکیەی نەفسەوە.

هەروەها کۆتایشش دێنین بەکۆی تەفسیری سووڕەتی (الشمس) خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتیمان بدات، هەرچی زیاتر بە قورئاندا قوڵبینەوەو لێی وردبینەوە و، لێی تێبگەین و، بەهۆیەوە پێبگەین، تاکو بەهۆی ئەوەوە لە دنیادا، ژیانێکی دروست و ساغ و پاك و چاك بگوزەرێنین و، سەرەنجامیش لە ڕۆژی دواییدا شایستەی ئەوە بین خوا ﷻ بمانخاتە ژێر سایەی بەزەیی خۆیەوە و، پێغەمبەری خاتەم ﷺ موحەمەدیش بە شوێنکەوتووی خۆی لە قەڵەممان بدات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ (٩)ی مانگـی (**ذي الحجـة**)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی، بەرانبـەر (٣٠)ی تەممـووز، [واتـە: مانگـی (٧)]ی سـاڵی (٢٠٢٠) زاینییـە، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کردنـی سـووڕەتی (**اللَّيل**)، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـەڕوو، بـۆ ئـەوەی چوارچێـوەی ئـەو سـووڕەتە موبارەکـەو هێڵـە گشـتییەکانیمان لەبەرچـاو بـن، بـەر لـەوەی بچینـە نێـو وردەکارییەکانـی واتـاو مەبەسـتی ئایەتـە بـە پێـزەکان.

## پێناسەی سووڕەتی (الليل) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە سێ ناوی بۆ بەکارهێنراون:

**یەکەم:** (**سُورَةُ اللَّيْل**).

**دووەم:** (**سُورَةُ وَاللَّيْل**).

**سێیەم:** (**سورةُ** ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾).

بەڵام ئەو ناوەی لە هەموویان زانراوترەو باوترە، بریتیە لە: (**سورةُ اللَّيْل**).

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بـەڕای زۆربـەی زانایـان ئـەم سـووڕەتە مەککەییـەو لـە مەککـە دابەزییـوە، هەندێکیـش بەمەدینەیـی دادەنێـن، لەبـەر بەسـەرهاتی کڕانـی دارخورمایەکـە کـە

دوایـی باسـی دەكەیـن، لـە هـۆی هاتنـە خـواری هەندێـك لـە ئایەتەكانـی ئـەم سـوورەتە موبارەكـەدا، بـەڵام هـەر ڕای یەكەمیـان ڕاستەو، گومانـی تێدانیـە كـە ئـەم سـوورەتە موبارەكـە مەككەییـە، لـەم بارەشـەوە ئـەم دەقـە دێنیـن:

**(عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ {واللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى} بِـمَكَّةَ)، ذَكَرَهُ السيوطي فِي الدُّرُّ المَنْثور:** ج٨، ص٥٣٢، **ونَسبه لابن الضريس والنَّحَّاس، وابن مَرْدَوَيه، والبيهقي، الإستيعاب فِي بيَان الأسباب:** ج٣، ص٥١٥).

واتـە: عەبدوڵڵای كـوڕی عەبباس ﵄، گوتوویەتـی سـوورەتی: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾ لـە مەككـە دابەزیـوە.

بـە سـەرنجدانی ئایەتەكانـی ئـەم سـوورەتە موبارەكـەو، تێوەڕامانی سروشتەكەشـی بـە ئاشـكرا، دیـارە كـە سـوورەتێكی مەككییـەو لـە قوڕئانـی مەككەییە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لـە ڕیزبەندیـی موصحەفـدا ژمارەكـەی نـەوەدو دوو (٩٢)یـە، واتـە: نـەوەد و یـەك سـوورەت لـە پێـش ئـەم سـوورەتەدا ڕیزبەندكـراون لـە موصحەفـدا، لـە دابەزینیشـدا ژمـارە نـۆ (٩)ی بـۆی دانـراوە، واتـە: لـە سـوورەتە سـەرەتاییەكانە كـە دابەزیـون، پێـش سـوورەتی **(الفجـر)** و، دوای سـوورەتی **(الأعـلى)** دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی ئەم سوورەتە:

ژمـارەی ئایەتەكانـی ئەم سـوورەتە موبارەكە بیسـت و یـەك (٢١)ە، بـە یەكدەنگیی هەمـوو ژمێرەرانی ئایەتەكانـی قوڕئان.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە بەهـەر بیسـت و یـەك (٢١) ئایەتەکەیـەوە لـە بـارەی بابەتێکەوەیە، ئەویـش ئەوەیـە: خـوا ﷻ سـوێند بـە شـەو و ڕۆژ و، بـە بەدیهێنـەری نێـرو مێیـان دەخـوات، کـە هـەوڵ و کۆششـی مرۆڤـەکان جـۆراو جـۆرن، دوایـی باسـی بابایەکـی بەخشـەری پارێـزکارو بـە ڕاسـتدانەری پاداشـتی باشـتر دەکات، کـە خـوا بـەرەو خێـر ئاسـانی دەکات و وەریدەچەرخێنـێ، دوایـی بـە پێچەوانـەوە: باسـی بابایەکـی ڕژدو بێبـاك لەخـواو بەدرۆدانـەری پاداشـتی چاکـترو، ئاسـانکردنی بـەرەو قورسـیی و ناڕەحەتیـی و، سـوود پـێ نەگەیاندنـی سـامانەکەی، دەکات، دوایـی باسـی خاوەنداریێتیی ڕەهـای خـوا ﷻ دەکات بـۆ دواڕۆژو دنیـا، ئنجـا ترسـاندنی ئـەو جـۆرە مرۆڤـەش یـان مرۆڤـەکان بـە گشـتیی لـە ئاگرێکـی بڵێسـەدار، کـە تەنیـا خراپتریـن کەسـی بـەدرۆ دانـەرو پشـت هەڵکـەری دەچێتـێ و، بابـای پارێـزکاری سـامانی خـۆ بەخشـەر بـەس لەبـەر خـوا، لێـی دوور دەبـێ، خـوای پەروەردگاریـش ئـەو جـۆرە کەسـە ڕازی و شـادمان و بەختـەوەر دەکات، ئەوەنـدەی پاداشـتی بـەرزو مـەزن پـێ دەدات.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لەم سووڕەتەدا چوار تایبەتمەندییمان کەوتوونەتە بەرچاو:

١- ئەو سێ سوێندەی لە سەرەتاوە هاتوون: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ٢ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ٣ إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ ٤﴾، لە هەموو قوڕئاندا تەنیا لەم سووڕەتەدا ئاواهاتووە، واتە: سوێند بە شەوگار کە دادەپۆشێ و، سوێند بەڕۆژگار کە دەردەکەوێ و دەدرەوشێتەوەو، سوێند بەوەی نێرو مێی هێناونە دی، هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە.

٢- هەردوو تەعبیری:

أ- ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ (٧)﴾

ب- ﴿وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ (٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ (١٠)﴾

ئەم دوو تەعبیرە لە بارەی ناساندنی دوو جۆرە کەسایەتیی، کە یەکێکیان ئەوپەڕی چاکە و ئەوی دیکەشیان ئەو پەڕی خراپە، تەنیا لەم سوورەتەدا بەم شێوەیە هاتوون.

٣- چوونە دۆزەخی خراپترین کەس و، لێ دوور بوونی پارێزکارترینیان: ﴿لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى (١٥) الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ (١٦)﴾، ئەوی دیکەش: ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى (١٧) الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ (١٨) وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَىٰ (١٩) إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ (٢٠) وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ (٢١)﴾.

٤- ئەم تەعبیرە: ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَىٰ (١٩)﴾، بۆ هیچکەس چاکەیەك لە لای وی نەبوو، پاداشت بدرێتەوە، واتە: ئەوەی کردی تەنیا بۆ ڕەزامەندیی خوا کردی، نەك هەقی کەسێکی بەسەرەوە بووبێ، یان چاکەیەکی کەسێکی لە چاودا بووبێ.

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە کۆی بیست و یەك (٢١) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکە، دەکەین بە یەك دەرس، لەبەر ئەوەی هەموویان پەیوەست و پێکەوە تێکهەڵکێشن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەر بیست و یەك (٢١) ئایەتەكەی سوورەتی (اللیل) پێك دێ، پێشتریش باسمان كرد، كە ئەم سوورەتە موبارەكە هەمووی یەك بابەت باس دەكات، بەمجۆرە: دوای ئەوەی خوا ﷻ سوێند دەخوات بە شەوگار كە دادەپۆشێ، واتە: ڕووی زەوی دادەپۆشێ و، بە ڕۆژگار كە دەدرەوشێتەوە، ڕۆژگار خۆشیی و پانتایی زەوییش ڕووناك دەكاتەوەو دەدرەوشێنێتەوەو، بەو زاتەی نێرو مێی هێناونە دی، وەڵامی سوێندەكەش ئەوەیە كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ﴾، هەوڵ و كۆششەكەی ئێوە جۆراو جۆرە، یەك بەو لادا، یەك بەملاداو،....هتد.

دوایی خوا ﷻ دێتە سەر ڕوونكردنەوەی جۆراوجۆر بوونی هەوڵ و كۆششەكان و، دەیانكاتە دوو جۆری سەرەكیی: ﴿فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ۝٧﴾، ئنجا كەسێك كە ببەخشێ، چی ببخەشێ؟ هەرچی هەیەتی لە پێناوی خوادا ببەخشێ بە خەڵك، لێرەدا هەرچەندە بە پلەی یەكەم شتی ماددیی دەگرێتەوە، بەڵام شتی مەعنەوییش دەگرێتەوە: زانست ببەخەشێ، عەقڵ ببەخشێ، لە ڕێزو مەكانەتی خۆی ببەخشێ، صوڵح و چاكە بكات، ﴿وَٱتَّقَىٰ﴾، خۆشی بپارێزێ، پارێز لە خواش بكات، ﴿وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ﴾، پاداشتی هەرە باشیش بەڕاست دابنێ و بڕوای پێ بێنی، ﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ﴾، (كەسێكی ئاوا) ئاسانی دەكەین بۆ ڕێبازی هەرە ئاسان، كە بریتیە لە ئیسلامەتیی و دینداریی، كە لەگەڵ ناخ و زگماكی مرۆڤدا گونجاوو تەبایە، یاخود ئاسانی دەكەین بۆ هەموو شتێكی ئاسان، بۆ هەموو خێرو چاكەیەك.

﴿وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ۝١٠﴾، بەڵام كەسێك چرووكیی بنوێنێ و، لە جیاتی ئەوەی پارێزیش لە خوا بكات، بێباك و بێ منەت بێ، بێ نیازیی پێشان بدات بەرانبەر بە خوا، ﴿وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ﴾، بە

پاداشتی هەرە چاکیش بێبڕوابێ و بە درۆی دابنێ، ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ﴾، ئەویش ئاسان دەکەین بەرەو سەغڵەتیی و نارەحەتیی و قورسیی، کە یان مەبەست پێی ژیانی نامسوڵمانانەی دنیایەتی، کە ژیانێکی قورس و بە زەحمەتەو، پڕە لە دڵەڕاوکەو نارەحەتیی و ڕەشبینیی، یان مەبەست پێی ئەوەیە لە ڕۆژی دواییدا تووشی ژیانێکی قورس و زەحمەت دێ لە دۆزەخدا.

﴿ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴾ کاتێکیش دەکەوێتە نێو دۆزەخەوە، یان کاتێکیش دەخرێتە نێو گۆڕەوە، یان کاتێکیش کە لە بەین دەچێ، ماڵ و سامانەکەی هیچ دادی نادات و سوودی پێ ناگەیەنێ.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لَنَا لَلۡأٓخِرَةَ وَٱلۡأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرۡتُكُمۡ نَارٗا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾، بە دڵنیایی مەنزڵگای کۆتایی و ژیانی یەکەم (کە دنیایە) هی ئێمەن، بۆیەش ئێوەم ترساندوەو ئاگادارم کردوونەوە لە ئاگرێك کە کڵپە دەستێنێ، ﴿ تَلَظَّىٰ ﴾، واتە: کڵپە دەستێنێ و بڵێسەی بەرزدەبێتەوە، ئایا کێ بۆ ئەو ئاگرە دانراوە؟ ﴿ لَا يَصۡلَىٰهَآ إِلَّا ٱلۡأَشۡقَى ﴾، پێی ناسووتێنرێ جگە لە بابایەکی زۆر خراپەکار، (الْأَشْقى) واتە: زۆر بەدبەخت و خراپەکار، یانی: (الْأَشَدُّ شَقَاوَةً)، یانی: لە هەموو کەس خراپترو بەدبەختتر بێ، ﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلۡأَتۡقَى ﴾، لێشی وەدووردەخرێ، بابایەکی زۆر پارێزکار، ئەوپەڕی پارێزکار ﴿ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴾، ئەو کەسەی ماڵ و سامانی خۆی دەبەخشێ، خۆی پاك و چاك دەکات، ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٖ تُجۡزَىٰٓ ﴾، بۆ هیچکەسیش چاکەیەك نیە لە لای وی، کە پاداشت بدرێتەوە، (واتە: ئەو ماڵ و سامانەی دەبەخشێ لە بەرانبەر چاکەیەکدا نیە لەگەڵیدا کرابێ)، ﴿ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴾، هیچ هاندەرو پاڵنەرێکی نیە، جگە لە داواکردنی ڕووی پەروەردگاری هەرە بەرزی، واتە: بۆیە ماڵ و سامانەکەی دەبەخشێ، کە بە دیداری خوا شاد بێ و، ڕەزامەندیی خوا بەدەست بێنێ، ﴿ وَلَسَوۡفَ يَرۡضَىٰ ﴾، لەمەودواش بە دڵنیایی ڕازی دەبێ، خوا ئەو پاداشتەی دەیداتێ، پێی شادمان و بەختەوەرو ڕازیی دەبێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ﴿١﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴿١١﴾ إِنَّ عَلَيۡنَا لَلۡهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلۡأٓخِرَةَ وَٱلۡأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرۡتُكُمۡ نَارٗا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصۡلَىٰهَآ إِلَّا ٱلۡأَشۡقَى ﴿١٥﴾ ٱلَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلۡأَتۡقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٖ تُجۡزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوۡفَ يَرۡضَىٰ ﴿٢١﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، سوێند بە شەوگار کاتێك (زەوی) دادەپۆشێ ﴿١﴾ سوێندیش بە ڕۆژگار کاتێك ڕوونبۆوەو دەرکەوت ﴿٢﴾ سوێندیش بەوەی نێرو مێی دروست کردوون ﴿٣﴾ بێگومان هەوڵ و کۆششەکەتان جۆراو جۆرو جیاجیایە ﴿٤﴾ ئنجا هەر کەس بەخشیی و پارێزی کرد ﴿٥﴾ باشترین (پاداشت)یشی بە ڕاست دانا ﴿٦﴾ بێگومان بەرەو (بەرنامەی) ئاسانترین ئامادەو سێنای دەکەین ﴿٧﴾ بەڵام هەر کەس چرووکیی کردو (لە خوا) بێنیاز بوو ﴿٨﴾ باشترین (پاداشت)یشی بە درۆ دانا (پێی بێبڕوا بوو) ﴿٩﴾ بەرەو هەرە قورسیی و زەحمەت، سێناو سازی دەکەین ﴿١٠﴾ سامانەکەیشی دادی نادات (لە بەرانبەر دۆزەخ دا) کاتێك تێیکەوت ﴿١١﴾ بە دڵنیایی ڕێنمایی کردن لەسەر ئێمەیە ﴿١٢﴾ (مەنزڵگای) کۆتایی و یەکەمیش تەنیا هی ئێمەیە ﴿١٣﴾ ئنجا لە ئاگرێك دەتانترسێنم بڵێسە دەدات ﴿١٤﴾ جگە لە بێبڕواترین (کەس) پێی ناسووتێ ﴿١٥﴾ ئەو کەسەی (ئەوەی پێغەمبەر هێناویەتی) بەدرۆی داناو پشتی هەڵکرد ﴿١٦﴾

پارێزکارترین (کەس)یش لێی دوورەدەخرێتەوە ﴿١٧﴾ ئەو کەسەی سامانەکەی (لە ڕێی خوادا) دەدات، خۆی پێ پاك و چاك دەکات ﴿١٨﴾ چاکەی هیچکەسیشی لەلا نیە (و لە چاودا نیە) پاداشت بدرێتەوە ﴿١٩﴾ جگە لە داواکردنی ڕووی پەروەردگاری هەرە بەرزی (هیچ پاڵنەرێکی دیکەی نیە) ﴿٢٠﴾ لەمەودواش ڕازی دەبێ (بە پاداشتی بەرزی پەروەردگاری) ﴿٢١﴾ }.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَغْشَىٰ): (أَيْ: يَسْتُرُ وَيُغَطِّي)، واتە: دەپۆشێ و دادەپۆشێ و پەنهان دەکات.

(تَجَلَّىٰ): (أَصْلُ الجَلْو: الكَشْفُ الظَّاهِرُ، جَلا لِيَ الخَبَرُ، وَخَبَرٌ جَلِيٌّ، وَقِيَاسٌ جَلِيٌّ) (تَجَلَّى) لە (جَلْو)ەوە هاتوە، (أَصْلُ الجَلْو الكَشْفُ الظَّاهِرُ) وشەی: (جَلْو) لە بنەڕەتدا بە مانای دەرخستنێکی ئاشکرایە، دەگوترێ: (جَلا لِيَ الخَبَرُ)، هەواڵەکە بۆ من ئاشکرا بوو، (وَخَبَرٌ جَلِيٌّ) هەواڵێکی ئاشکرا، (وَقِيَاسٌ جَلِيٌّ) پێوانەکردنێکی ئاشکرا، کەواتە: (تَجَلَّىٰ)، یانی: (ظَهَرَ) دەرکەوت، ئاشکرا بوو.

(سَعْيَكُمْ): (السَّعْي: المَشْيُ السَّرِيعُ، وَيُسْتَعْمَلُ لِلْجِدِّ فِي الأَمْرِ خَيْراً كَانَ أَوْ شَرّاً)، (سَعْي): بەمانای ڕۆیشتنی خێرا دێ، بەڵام دوایی بەکارهێنراوە بۆ ئەنجامدانی کارێك بە جیددیی، چ کارێکی باش بێ یان خراپ.

(لَشَتَّىٰ): (الشَّتُّ: تَفْرِيقُ الشَّعْبِ، شَتَّ جَمْعُهُم، وَجَاءُوا أَشْتَاتاً أَي: مُتَفَرِّقُوا النِّظَام، وَشَتَّى أَيْ: مُخْتَلِفَةُ الأَنْوَاع)، (شَتّ): لێك بڵاوکردنی گەل و نەتەوەیەکە، (شَتَّ جَمْعَهُم)، واتە: کۆمەڵەکەیانی پرژو بڵاو کرد، (وَجَاءُوا أَشْتَاتاً)، واتە: لە حاڵێکدا هاتن سیستم و ڕێك و پێکییان هەڵوەشابوو، (شَتَّى)، واتە: جۆراو جۆرن، جۆرەکانیان زۆرن.

(وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ): (الحُسْنَى مُؤَنَّثُ الأَحْسَن، أي: المَثُوبَةُ الحُسْنَى)، (صَدَّق) یانی: بەڕاستی داناوە، (الحُسْنى)، پاداشتی هەرە باش، (الحسنى)، مێینەی (أَحْسَن)ە، یانی: باشتر، (حُسنى)یش، یانی: باشتر بەڵام بە باری مێینەدا، (حُسنى)، سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، (أَيْ المَثُوبَةُ الحُسنى)، پاداشتی هەرە چاك.

(فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ): ئاسانی دەکەین بۆ ئاسانتر، (إِسْتَيْسَرَ أَي: اسْتَسْهَلَ، وَالْيُسْرى السَّهْلُ، وَيَسَّرْتُ أَيْ: سَهَّلْتُ)، (إِسْتَيْسَرَ)، بە مانای (اسْتَسْهَلَ)، ئاسان بوو، یاخود زۆر ئاسان بوو، (لِلْيُسْرَىٰ)، ئەمیش دیسان بە باری مێینەدایە لە بەرانبەر (أَيْسَر) دا، (أَيْسَر) ئاسانتر، (يُسرى)ش، ئاسانتر، (هَذَا أَيْسَرُ مِنْ هَذا)، ئەمە لەوە ئاسانترە، (يُسرى)ش بە باری مێینەدا، هەمان واتای هەیە، واتە: ئاسانتر، مەبەست پێی ئەو ڕێبازەی خوای میهرەبانە کە لەگەڵ خوارسك و عەقڵ و ناخی مرۆڤدا گونجاوە، (وَيَسَّرْتُهُ لَهُ: أَيْ سَهَّلْتُ لَهُ)، کارەکەم بۆ ئاسان کرد.

(وَٱسْتَغْنَىٰ): (أَغْنَاهُ أَيْ: كَفَاهُ، وَاسْتَغْنَى بِهِ: اكْتَفَى، وَأَغْنى الشَّيْءُ أَي: كَفَى)، (أَغْنَاهُ) بە مانای (كَفَاهُ)، واتە: بەشی کرد، بۆوی بەس بوو، (اسْتغنى بِهِ)، (أَيْ اكْتَفى بِهِ)، واتە: ئەو شتەی بەس بوو، بەشی دەکرد، (أَغْنى الشَّيْءُ أَي: كَفَى)، شتەکە بەشی کردو بۆ ئەو بەس بوو، کەلێنی بۆ پڕ کردەوە.

(وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ): (الحُسنى: مُؤَنَّثُ الأَحْسَن)، (الحُسنى) باری مێینەی (الأَحْسَنَ) ە، هەرە باش، یان باشترین، (وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ)، واتە: پاداشتی هەرە باشی بەدرۆ دانا، چونکە (الحُسْنَى) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، (أَي: العَاقِبَةُ الحُسْنى، أَو المَثوبَةُ الحُسْنى) سەرەنجامی هەرەباش، یاخود پاداشتی هەرەباش.

(لِلْعُسْرَىٰ): (العُسْرَى: الأَمْرُ الصَّعْبُ الشَّدِيد)، کارێکی قورسی سەخت، (وَالعُسرى الخَصْلَةُ المُؤَدِّيَةُ إِلى العَذَابِ، وَالأَمْرِ العَسِير)، سیفەتێکی گەیەنەر بەسزاو بە بارودۆخێکی سەخت و دژوار.

(تَرَدَّىٰ): (رَدَى، يَـرْدَى، رَدَىً، أَيْ: هَلَـكَ يَهْلِـكُ هَـلاكاً)، فەوتـا، دەفەوتـێ، فەوتـان، واتایەکـی دیکەشـی: (رَدَى فِي الهُـوَّةِ أَي: سَـقَطَ، فَهُـوَ رَدٍ)، (رَدَى) کەوتـە نێـو چاڵەکـە، (فَهُـو رَدٍ) ئـەو تێکەوتوویـە.

(تَلَظَّىٰ): (تَلَظَّـى لَظَـاً، أَيْ: الْتَهَبَـت)، ئاگـر کـە بڵێسـەی سـتاندو کڵپـەی لـێ بـەرز بـۆوە، پێـی دەگوتـرێ: (تَلَظَّىٰ)، دەگوتـرێ: (لَظِيَـتِ النَّـارُ تَلَظَّـى لَظَـاً أَيْ: التَهَبـتْ)، ئاگرەکـە بڵێسـەی لـێ بەرزبـۆوە، بڵێسـەی لـێ بەرزدەبێتـەوە، (لَظَـاً)، واتـە: بڵێسـە لـێ بـەرز بوونـەوە، (اللَّظَـى: لَهَـبُ نَـارٍ خَالِـصٍ، لاَ دُخَـانَ فيـهِ)، (لَظَـى): بریتیـە لـەو بڵێسـەیەی ئاگـر کـە سـاغەو هیـچ دووکەڵـی تێـدا نیـەو بڵێسـە شـینەکەیەتی.

(ٱلْأَشْقَى): (الشَّـقِيُّ: التَّعِيسُ غَـيْرُ السَّـعِيد، (ٱلْأَشْقَى): الأَكْثَرُ شَـقَاءً)، (الشَّـقِيُّ): نەگبەت، بێخێـر، (ٱلْأَشْقَى) کەسـێك کـە لـە خەڵکـی دیکـە بەدبەختـترو خراپـترە، (الشَّـقَّاءُ: العُسْرُ وَالشِّـدَّةُ)، (شَـقَاءْ): بەمانـای زەحمەتیـی و مەینەتیی و قورسـیی دێ.

(ٱبْتِغَآءَ): (الإِجْتِهَـادُ فِي طَلَـب الخَـيْرِ أَوِ الـشَّرّ)، (ابتغـاء): بریتیـە لـە هەوڵـدان و کۆششـکردن لـە داواکـردن دا، چ بـۆ چاکـە بـێ، چ بـۆ خراپـە، (بَغَـى) یانـی: (طَلَـبَ)، داوایکـرد، (إِبْتَغـى)، زۆری داواکـرد، (زِيَـادَةُ المَبْنَـى تَـدُلُّ عَـلَى زِيـادَةُ المَعْنـى)، بێژەیـەك پیتەکانـی زیاتربـن، مانایەکەشـی بەهێزتـر دەبـێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١- سەرەتا ئەم ڕیوایەتە دێنین، هەرچەندە سەنەدەکەی بێهێزە، بەڵام تیشکێکی باشمان بۆ دەخاتە سەر چەمك و واتای ئەم ئایەتە بە پێزانە، مەرجیش نیە هەر گێڕدراوەیەك سەنەدەکەی بێهێز بوو، لە ڕووی نێوەڕۆکیشیەوە وابێ، دەگونجێ هۆکارێك بووبێ ئەو گێڕدراوەیە بە سەنەدێکی ڕاسترو ڕێکتر نەگەیشتبێتە ئێمە، بەڵام مەرج نیە ئەو ڕووداوە، نەبووبێ، بە تایبەت کە لەگەڵ چەمك و واتای ئایەتەکاندا بێتەوەو بگونجێ:

{عَـن اِبْـنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُـلاً كَانَـتْ لَـهُ نَخْلَـة فَرْعُهـا فِي دَارِ رَجُـلٍ فَقـيرٍ ذِي عِيـالٍ، فَكَانَ الرَّجُـل إِذَا جَـاءَ فَدَخَـلَ الـدَّارَ فَصَعَـدَ إِلَى النَّخْلَـةِ لِيَأْخُـذَ مِنْهَـا الثَّمَـرَة، فَرُبَّمَـا تَقَـعُ ثَمَـرَةٌ فَيَأْخُذَهَا صِبْيَـانُ الفَقـيرِ، فَيَنْـزِلَ مِـنْ نَخْلَتِـهِ فَيَأْخُـذَ الثَّمَـرَةَ مِـن أَيْدِيهِـم، وَإِنْ وَجَدَهَـا فِي فَـمِ أَحَدِهِـم أَدْخَـلَ أُصْبعَـهُ حَتَّـى يُخْـرِجَ الثَّمَـرَةَ مِـن فِيـهِ، فَشَـكَى ذَلِـكَ الرَّجُـلُ إِلَى النَّبـيِّ ﷺ فَقَـالَ: اِذْهَبْ، وَلَقِـيَ النَّبِـيُّ ﷺ صَاحِـبَ النَّخْلَـةِ فَقَـالَ لَـهُ: أَعْطِنِـي نَخْلَتَـكَ المَائِلَـةَ الَّتِـي فَرْعُهـا فِي دَارِ فُـلانٍ، وَلَـكَ بِهَـا نَخْلَـةٌ فِي الجَنَّـةِ، فَقَـالَ لَـهُ الرَّجُـل: لَقَـدْ أَعْطَيْـتُ وَإِنَّ لِي لَنَخْـلاً كَثِـيراً، وَمَـا فِيـه نَخْـلٌ أَعْجَـبَ إِلَيَّ ثَمَـرَةً مِنْهَـا، ثُـمَّ ذَهَـبَ الرَّجُـلُ وَلَقِـيَ رَجُـلاً كَانَ يَسْـمَعُ الـكَلاَمَ مِـن رَسُـولِ اللـهِ ﷺ لِصَاحِـبِ النَّخْلَـةِ، فَأَتَى رَسُـولَ اللـهِ: فَقَـال: تَعْطِنِـي مَـا أَعْطَيْـتَ الرَّجُـلَ إِنْ أَنَـا أَخَذْتُهَـا؟ قَـالَ: نَعَـم، فَذَهَـبَ الرَّجُـلُ، فَلَقِـيَ صَاحِـبَ النَّخْلَـةِ وَلِكِلَيْهِـمَا نَخْـلٌ، فَقَـال: لَـهُ صَاحِـبُ النَّخْلَـةِ: أَشَـعَرْتَ أَنَّ مُحَمَّـدَاً أَعْطَـانِي بِنَخْلَتَـيْ المَائِلَـةَ إِلى دَارِ فُـلانٍ نَخْلَـةٌ فِي الجَنَّـةِ، فَقُلْـتُ: لَقَـدْ أَعْطَيْتُ وَلكِـن يُعْجِبُنـي ثَمَرُهـا وَلِيَ نَخْـلٌ كَثِـيرٌ مَـا فِيـه نَخْلَـة أَعْجَـبَ إِلَيَّ ثَمَـرَةً مِنْهَـا، فَقَـالَ لَـهُ الآخَـر: أَتُرِيـدُ بَيْعَهَـا؟ فَقَـال: لاَ إِلاَّ أَنْ أُعْطَـىَ بِهـا مَـا أُرِيـدُ، وَلاَ أَظُـنُّ أُعْطَـى، قَـال: فَكَـمْ تُؤَمِّـلُ فِيهَـا؟ قَـال: أَرْبَعِـينَ نَخْلَـة، فَقَـال لَـهُ الرَّجُـل: لَقَـدْ جِئْـتَ بِأَمْـرٍ عَظِيـمٍ، تَطْلُـبُ بِنَخْلَتِـكَ المَائِلَـةَ أَرْبَعِينَ نَخْلَـة؟ ثُـمَّ سَـكَتَ عَنْـهُ، فَقَـالَ: أَنَـا أُعْطِيـكَ أَرْبَعِـينَ نَخْلَـةً، فَقَـالَ لَـهُ: إِشْـهَدْ إِنْ كُنْـتَ صَادِقـاً، فَأَشْـهَدَ لَـهُ بِأَرْبَعِـينَ نَخْلَـة بِنَخْلَتِـهِ المَائِلَـةَ، فَمَكَـثَ سَـاعَةً ثُـمَّ قَـالَ: لَيْـسَ بَيْنِـي وَبَيْنَـكَ بَيْـعٌ لَمْ نَفْـتَرِق، فَقَـال لَـهُ الرَّجُـل: أَوَلَسْـتَ بِأَحَـقَّ حِـينَ أَعْطَيْتُـكَ أَرْبَعِـينَ نَخْلَـةً بِنَخْلَتِـكَ المَائِلَـةَ؟ فَقَـالَ لَـهُ: أُعْطِيـكَ عَـلَى أَنْ تُعْطِيَنِـي كَـمَا أُرِيـدُ، تَعْطِينَهَـا عَـلَى سَـاقٍ، فَسَـكَتَ عَنْـهُ، ثُـمَّ قَـالَ: هِـيَ لَـكَ عَـلى سَـاقٍ، قَـالَ: ثُـمَّ ذَهَـبَ إِلَى النَّبِـيِّ ﷺ فَقَـالَ لَـهُ: يَـا رَسُـولُ اللـه إِنَّ النَّخْلَـةَ قَـدْ صَـارَتْ لِي فَهِـيَ لَـكَ، فَذَهَـبَ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ إِلى صَاحِـبِ الـدَّارِ، فَقَـالَ: النَّخْلَـةُ لَـكَ وَلِعِيَالِـكَ، فَأَنْـزَلَ اللـهُ (وَاللَّيْـلِ إِذَا يَغْشَى) إِلى آخِـرِ السـوُرة}[1].

---

(١) أخرجـه الحافـظ ابـن أبي حاتـم في تفسـيره، كـما في تفسـير القـرآن العظيـم لابـن كثـير، ج٤، ص٥٥٥، والواحـدي في الوسـيط ج٤ ص٥٠٢، وأسـباب النـزول ص ٤٢٩، قلنـا: وهـذا إسـنادٌ ضعيـف، فيـه حفـص وهـو ضعيـف، كـما في التقريـب، قـال حافـظ ابـن كثـير رواه ابـن أبي حاتـم وقـال: حديـث غريـب جداً، وقـال السـيوطي في الـدر المنثـور ج٨ ص٥٣٢ سـند ضعيـفٌ، الإسـتيعاب فـي بيـان الأسـباب ج٣ ص٥١٥-٥١٦.

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: پیاوێـك دارخورمایەکی هەبـوو لقێکـی کەوتبـووە ماڵـی پیاوێکـی هـەژاری خـاوەن خێزانـەوە، خـاوەن دارخورمایەکـە کاتێـك دەهـات، دەچـووە نێـو خانووەکـەو سـەردەکەوتە سـەر دارخورمایەکـە بـۆ ئـەوەی میوەکـەی (واتـە: خورمایـەکانی) لـێ بچنـێ، جـاری واهەبوو میوەیەکـی (واتـە: خورمایەکـی)، یـان چەنـد خورمایەکـی دەکەوتنە خـوار، منداڵەکانی بابـای هـەژار هەڵیـان دەگرتنـەوە، ئەویـش لـە دار خورمایەکـەی دادەبـەزی و میوەکـەی لـێ دەسـتاندنەوە، لەدەسـتی وەردەگرتنـەوەو، ئەگـەر دیتبـای یەکێکیـان خسـتوویەتە نێـو زاریشـی پەنجـەی لـە زاری[1] ڕادەکـردو دەنکـە خورمایەکـەی لـە زاری دەردەهێنایـەوە، ئـەو پیـاوە هـەژارە خـاوەن منداڵـەش سـکاڵای خـۆی بـردە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: بـڕۆ، دوایـی پێغەمبـەر ﷺ بـە خـاوەن دارخورمایەکـە گەیشـت و پێـی فەرمـوو: ئـەو دارخورمایـەی لار بۆتـەوەو لقێکـی چۆتـە ماڵـی فـلان کەسـەوە، بمدەیـە، لـە بەرانبـەردا داراخورمایەکـت هەبـێ لـە بەهەشـتدا؟ پیاوەکـە پێیگـوت: زۆرم بەخشـیوە، دارخورماشـم زۆرن، بـەڵام هیـچ دارخورمایەکـم نیـە میوەکـەی سەرسـامم بـکات، وەك ئـەو دارخورمایـەی لار بۆتـەوە، دوایـی پیاوەکـە ڕۆیـی و گەیشـتە پیاوێـك کـە گوێـی لـە فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو، (واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ چـی بـەو پیـاوە گوتبـوو ئەوەی بیسـتەوە)، ئـەو پیـاوەی دووەم چـوو بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی گـوت: ئایـا ئـەوەم دەدەیـە کەداوتـە بـەو پیـاوە، ئەگـەر ئـەو دارخورمایـەم وەرگـرت؟ پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: بەڵـێ، (تـۆش دارخورمایەکـت دەبـێ لـە بەهەشـتدا لـە بەرانبەریـدا)، پیاوە دووەمەکـە ڕۆیـی گەیشـتە کابـرای خـاوەن دارخورمـا، هەردووکیـان خـاوەن باخـی خورمـا بـوون، کابـرای خـاوەن دارخورمـا لارەکـە پێیگـوت: دەزانـی کـە موحەممـەد بـۆ دار خورمـا لارەکـەم، کـە لار بۆتـەوە بـۆ نێـو ماڵـی فلانکـەس، دارخورمایەکـی لـە بەهەشـتدا داومـێ، منیـش گوتوومـە: زۆرم بەخشـیوە، بـەڵام زۆر سەرسـامم بـە

---

(١) پەنجەی لە زاری ڕادەکرد: پەنجەی دەخستە نێو دەمی.

میـوەی (واتـە: بەخورمـای) ئـەو دار خورمایـەو، دارخورمـای دیکـەم هـەن، بـەڵام هیـچ کامیـان بـەرو میوەکـەی سەرسـامم نـاکات وەك هـی ئـەو دارخورمـا لارە، پیـاوە دووەمەکـە پێیگـوت: دەتـەوێ بیفرۆشـی؟ گوتـی: نەخێـر، مەگـەر ئـەوەی دەمـەوێ لـە بەرانبەریـدا بمدرێتـێ، پێشـم وانیـە بمدرێتـێ، پیـاوە دووەمەکـە پێیگـوت: بەهیوای چەنـدت بدرێتـێ؟ گوتـی: چـل بنکـە دارخورمـا، پیاوەکـە پێـی گـوت: شـتێکی زۆر مـەزن داوا دەکـەی، لـە بەرانبـەر دارخورمـا لارەکـەت دا چـل دارخورمـا وەردەگـری؟ دوایـی لێـی بێدەنـگ بـوو، پاشـان پیـاوە دووەمەکـە گوتـی: مـن چـل بنکـە دار خورمـات دەدەمـێ، کابـرای خـاوەن بنکـە دارخورمـای لار گوتـی: شـایەد بگـرە، ئەگـەر ڕاسـت دەکـەی، ئەویـش شـایەدی بـۆ گـرت، کـە چـل بنکـە دارخورمـای بداتـێ لـە بەرانبـەر ئـەو بنکـە دارخورمـا لارەدا، ماوەیـەك مایـەوە لـەوێ، دوایـی خـاوەن دارخورمـای لار گوتـی: جـارێ لـە یـەك جیـا نەبووینـەوەو هیـچ کەسیشـمان لـە بەیـن دانیـە، مـن ئـەو دارخورمایـەت نادەمـێ، مەگـەر ئـەو چـل دارخورمایـەی دەمدەیـە تەنیـا میوەکەیـان نەبـێ، بەڵکـو دارخورمایەکانیشـم بدەیـە! ئەویـش لێـی بێدەنـگ بـوو، دوایـی پێیگـوت: باشـە، بـە هەمـوو شـتێکەوە ئـەو چـل دارخورمایـە بـۆ تـۆ، دوایـی ڕۆیشـت چـوو بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ، گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەو بنکـە دارخورمـا لارە، بۆتـە هـی مـن، ئێسـتاش مـن دەیـدەم بـە تـۆ، پێغەمبەریـش ﷺ چـوو بـۆ لای خاوەنـی خانووەکـە، گوتـی: ئـەو بنکـە دارخورمایـە لارەی هاتۆتـە نێـو ماڵەکـەی تـۆوە، بـۆ خـۆت و مـاڵ و خێزانـت، ئیـدی خـوای پـەروەردگار لـەو بـارەوە ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەی دابەزانـد.

**٢-** هەر لەو بارەوە ئەم گێڕدراوەیەش هەیە: {**عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما **قَالَ: إِنِّي لَأَقُولُ: هَذِهِ سُورَةٌ نَزَلَتْ فِي السَّمَاحَةِ وَالبُخْلِ**}[(١)].

---

(١) ذكـره السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٣ ص٥١٦، ونسـبه إلى ابـن مردويـه، الإسـتيعاب فِي بيـان الأسـباب: ج٣، ص٥١٦.

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس ، گوتوویەتـی، مـن دەڵێـم: ئـەم سـوورەتە لـە بـارەی بەخشـین و چرووکییـەوە دابەزیوە.

(**سَمَاحة**)، یانی: دڵکراوەیی و بەخشین، (**بُخْل**)یش، واتە: چرووکیی و ڕژدیی.

**٣-** لە بارەی دابەزینی ئەم ئایەتانەوەش: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ ﴿١١﴾ ﴾، تاکو کۆتایی سوورەتەکە، ئەم گێڕدرایەوە دێنین:

**(عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ الزُّبَير رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة في أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقْ)**[1].

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، گوتوویەتـی: ئـەم ئایەتـە (ئایەتەکانـی دواییشـی) لـە بـارەی ئەبـوو بەکـری صیددیقـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دابەزیـوە.

**٤-** هەر لە بارەی ئەو ئایەتە بەپێزانەوە، ئەم گێڕدراوەیەش دێنین، هەرچەندە سەنەدەکەی بەهێز، بەڵام تیشکی زیاترمان بۆ دەخاتە سەر، چەمکی ئایەتەکان:

**{عَـن عُـروةَ بـن الزبـير رضي اللـه عنهـما، أَنَّ أَبَـا بَكْـر الصِّدِّيـق أَعْتَـقَ سَـبْعَةً كُلُّهُـم يُعَـذَّبُ فِي اللهِ: بِـلال، وَعَامِـر بِـن فُهَـيْرة، والنَّهْدِيَّـة وَابْنَتَهـا، وَزِنّـيْرَة، وَأُمُّ عيـسى، وأمـة بنـي المؤمـل، وَفيـه نَزَلَـت (وَسَـيُجَنَّبُها الأَتْقـى) إِلى آخِـرِ السُّـورة}**[2].

---

(١) أخرجـه البـزار: ٢٨٠٩، والآجـري في الشريعـة: ١٣٥٠، والطـبري في جامـع البيـان: ج٣٠، ص٤٤٦، والطـبراني في الكبـير، وابـن عـدي في الكامـل ج٦ ص ٢٣٥٩، والواحـدي في الوسـيط ج٤، ص٥٤٦، وذكـره السـيوطي في الـدر المنثـور ج٨ ص٥٣٨، وزاد نسـبته لابـن المنـذر وابـن مردويه وابن عسـاكر، وأخرجـه أحمـد بـن حنبـل في فضائـل الصحابـة: ٦٦، وابنـه عبـد اللـه في الزوائـد الفضائـل:٩٩١، قلنـا: وهـذا إسـناد حسـن، قـال الحاكـم: وهـذا إسـناد صحيـح عـلى شرط مسـلم ووافقـه الذهبـي، قلنـا: لم يخـرج مسـلم لابـن إسـحاق إلا متابعـةً، الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب).

(٢) ذكـرده السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٨، ص٥٣٧، لبـاب النقـول ص ٢٣٠، ونسـبه لابـن أبي حاتـم، قلنـا: هـو ضعيـف لإرسـاله، الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب، ج٣ ص ٥١٩.

عـوڕوەی کـوڕی زوبەیـر (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازیبـێ)، (کـە لـە دایکییـەوە دەبێتـەوە بـە نـەوەی ئەبـوو بەکـری صیددیـق، کـوڕی ئەسـمائە، بابیشـی زوبەیـرە، خـوا لێیـان ڕازیبـێ)، دەڵـێ: ئەبـوو بەکـری صیددیـق (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، حـەوت کەسـی ئـازاد کـردن هەموویـان لـە پێنـاوی خـوادا ئـازارو ئەشـکەنجە دەدران: بیلالـی حەبەشـەیی، عامیـری کـوڕی فوهەیـڕە، ئەلنەهدییـەو کچەکەشـی (واتـە: ئافرەتێـك بـووە لەگـەڵ کچەکەشـی) و، زەنیـرە، (ئافرەتێکـی دیکـەی کۆیلـە بـووە)و، ئوممـو عیسـا، (ئەویـش ئافرەتێکـی دیکـە بـووە)و، کەنیـزەکی بەنـی موئەممیـل، هـەر حەوتیـان ئەبـوو بەکـر (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، ئـازادی کـردوون، کڕیونیـەوە بـە پـارەی زۆرو ئازادیشـی کـردوون.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا لەم سوورەتە موبارەکەدا دەفەرموێ:

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١- ئەم قورئانخوێندنەم بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە دەست پێدەکەم.

٢- ئەم قورئانخوێندنەم بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوایە.

٣- ئەم قورئانخوێندنەم بەپێی ئایین و بەرنامەی خوایە.

٤- ئـەم قورئانخوێندنـەم بەهـەوڵ و توانایـەك کـە خـوا بـۆی ڕەخسـاندووم، ئەنجامـی دەدەم.

﴿ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴾، سـوێند بـە شـەوگار کـە دادەپۆشـێ، چـی دادەپۆشـێ؟ بـە دڵنیایـی شـەوگار ڕووی زەوی دادەپۆشـێ، واتـە: دنیـا، ﴿ وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴾، سـوێند بـە ڕۆژگاریـش کـە دەدرەوشـێتەوە، ڕوون دەبێتـەوە، ڕۆژگار بریتیـە لـە دەرکەوتنـی

زەوی لە خۆر، زەوی کە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە لە بەرانبەر خۆردا، ئەو ڕووەی دەکەوێتە بەرانبەری، دەبێتە ڕۆژو دەدرەوشێتەوەو ڕوون دەبێتەوە، بۆیە ڕوونبوونەوەکە بۆ ڕووی زەوییە، ﴿ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴾، سوێند بەو کەسەی نێرو مێی هێناونە دی، (ما)، کەم وایە بۆ خاوەن عەقڵ و شعورو ویستان بەکاربهێنرێ، زیاتر بۆ شتی بێ گیان و بێ ژیان بەکاردێ، بەڵام جاری واش هەیە بە پێچەوانەوە بۆ ژیاندار بەکاردێ، ئەویش نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی تێدایە، لێرەدا بۆچی خوا نەیفەرمووە: (وَمَنْ خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ)، واتە: سوێند بەو کەسەی نێرو مێی هێناونە دی؟ چونکە ئەگەر فەرمووبای: (مَن)، واتە: ئەو کەسە، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: (ما)، واتە: ئەو زاتە سەرسوڕهێنەرە خاوەن دەسەڵات و بە توانایەی نایەتە وەسفکردن، نایەتە پێناسە کردن، ئەو نێرو مێیەی هێناونە دی.

سوێند بەو سێ شتانە: بە شەوگار کە دادەپۆشێ و، بە ڕۆژگار کە دەدرەوشێتەوەو، بەو زاتەی نێرو مێی هێناونە دی، کە خوای بەرزو مەزنە، ﴿ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴾، بە دڵنیایی هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە، (سَعْي): لە ئەسڵی زماندا بە مانای (السَّيْرُ السَّريعُ أو المَشْيُ السَّريع)، ڕۆیشتنی خێرا، یان ڕێکردنی خێرا، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر کارێك، کە مرۆڤ بە جیددیی و بە بایەخ پێدان و بە گرنگیی پێدانەوە بیکات، هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراوجۆرە، (شَتَّى) کۆی (شَتّ)، یان (شَتِيتَ)ە، بە مانای لێك بڵاو، یان جۆراوجۆر، هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراوجۆرەو لێك بڵاوە، ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر ڕوونکردنەوەو تەفصیلّ پێدانی ئەو کۆششە جۆراو جۆرو جیاوازە، دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴾، ئنجا هەر کەس بەخشیی و پارێزی کرد، (أَمَّا) لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (حَرْفُ تَفْصيلٍ)، پیتێکە بۆ درێژ کردنەوەو ڕوونکردنەوەی مەبەستێك بەکاردەهێنرێ، پیتی (ف)ش بە زۆر واتایان دێ، بەڵام لێرەدا دەگونجێ بۆ بادانەوە (عَطْف) بێ و، ئەم قسەیە دەگێڕێتەوە بۆ سەر قسەی پێشێ، دەشگونجێ بۆ (تَفْريع) بێ، واتە: ئەم قسەیە بنیاتدەنرێ لەسەر قەسەیەکی پێشتر، یاخود

(**الفَصيحة**)بێ، یانی: دەلالەت لەسەر قسەیەك بكات، كە پێشتر نەگوتراوە، بەڵام لێی دەفامرێتەوە، واتە: حاڵ كە بەو شێوەیەو هەوڵ و كۆششی ئێوە جۆراو جۆرو جیاوازە، ئنجا: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ﴾، هەر كەسێك بەخشیی ﴿وَٱتَّقَىٰ﴾، پارێزیشی كرد.

﴿أَعْطَىٰ﴾، بەخشیی و دای، كە بە دڵنیایی بە پلەی یەكەم مەبەست پێی ماڵ و سامانە، ئنجا ئەو ماڵ و سامانە، چ پارەی نەقدینە بێ، چ ئاژەڵ بێ، چ دانەوێڵە بێ، چ كەلوپەلی بازرگانیی بێ، هەموو ئەو شتانەی خەڵك پێویستییان پێیانە، پێیان ببەخشێ، ﴿وَٱتَّقَىٰ﴾، پارێزیش بكات، واتە: خۆی بپارێزێ لە لێپرسینەوەو گلەیی و سزای خوای دادگەر، ﴿وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ﴾، پاداشتی هەرەباشیشی بەڕاست دانا، (**الحُسْنى**)، لە هەموو حاڵاندا سیفەتی وەسفكراوێكی قرتێندراوە، (**حُسْنى**)، واتە: هەرە باش، باشترین، لە بەرانبەر (**أَحْسَن**) دایە، بەڵام (**حُسْنى**)، بۆ باری مێینەیەو (**أَحْسَن**) بۆ باری نێرینەیە، ئنجا ﴿وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ﴾، واتە: بڕوابێنێ بە وشەی هەرە باش، (**بالكلمة الحُسْنى**) كە وشەی خوا بە یەكگرتن (**توحيد**)ە، بەڵام زۆربەی ڕوونكەرەوانی قورئان گوتوویانە: (**الحُسْنى: المَثُوبَةُ الحُسْنى**) پاداشتی هەرە باش، كە لە بەهەشتی خوادا خۆی دەنوێنێ، بڕواش بەوە بێنێ و بەڕاستی بزانێ، كەسێك ئەو سێ سیفەتەی تێدا بن: ﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئاسانی دەكەین، بۆ ڕێی هەرە ئاسان، واتە: بەرەو هەق ڕووی پێوەردەچەرخێنین و، لەسەرشانی سووك دەكەین، لە قالبی خۆش دێنین، چی؟ (**اليُسْرى**)، واتە: گرتنی ڕێی هەرە ئاسان كە ڕێی بەندایەتیی بۆ خواو خواپەرستییە، چونكە ئەو ڕێیە لەگەڵ عەقڵی ڕاست و زگماكی ساغ و بەرژەوەندیی دنیاو دواڕۆژی مرۆڤدا، پێكەڵپێك و گونجاوە، یانی: ئێمە ئاسانی دەكەین بۆ گرتنی ئەو ڕێیە هەرە ئاسانە.

ئەوە جۆرێك لە هەوڵ و كۆشش و، ئەوەش جۆرێك لە سەرەنجام و دەرئەنجام، ئنجا دێتە سەر جۆرێكی دیكە:

﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴾، بەڵام کەسێك چرووکیی نواند، ﴿ بَخِلَ ﴾ ڕێك پێچەوانەی ﴿ أَعۡطَىٰ ﴾یە، ﴿ أَعۡطَىٰ ﴾ یانی: بەخشیی، ﴿ بَخِلَ ﴾، واتە: نەیبەخشی، چرووکیی و ڕژدیی کرد، ﴿ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴾، بێنیازیی پێشان دا، (**إِسْتَغْنى**)، لە چەند ڕوویەکەوە دەکەوێتەوە بەرانبەر (**إِتَّقى**):

أ- (**إِتَّقى**) خۆی پاراست و پارێزکاریی کرد لە بەرانبەر خوادا، (**إِسْتَغْنى**) بێنیازیی پێشاندا بەرانبەر بە خوا.

ب- (**إِتَّقى**) خۆی پاراست لە لێپرسینەوەو سزای خوا، (**إِسْتَغْنى**) بێ نیاز بوو، بێ باکیی و بێ منەتیی پێشاندا بەرانبەر بە لێپرسینەوەو سزای خوا.

﴿ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾، بە پاداشتی هەرە باشیش بێبڕوابوو، بە درۆی دانا، یاخود: بە وشەی هەرە باشیش بێبڕوا بوو، کە وشەی خوا بەیەکگرتنە، کەسێك ئەو سێ سیفەتە خراپەشی تێدابن: ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ﴾، بە دڵنیایی ئاسانی دەکەین، بەرەو حاڵەتی هەرە قورس و زەحمەت، ئەوەش دەگونجێ مەبەست پێی ژیانی دنیا بێ، واتە: ژیانێکی تەنگ و سەغڵەت و ناڕەحەتی دەبێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەستی پێ ڕۆژی دوایی بێ، واتە: ئێمە ئاسانی دەکەین، بەهۆی ئەو کردەوە خراپانەیەوەو سەری پێ دەگەیەنین بە حاڵەتێکی زۆر ناخۆش، کە بریتیە لە ژیانی نێو دۆزەخ.

﴿ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴾، ماڵ و سامانەکەشی دادی نادات:

أ- کاتێك دەکەوێتە خوار.

ب- یاخود کاتێك دەفەوتێ.

ج- یان کاتێك کە دەخرێتە گۆڕەوە.

د- یان کاتێك کە دەخرێتە نێو دۆزەخەوە، ﴿ تَرَدَّىٰٓ ﴾، هەم بە مانای فەوتا (**هَلَكَ**) دێ، هەم بە مانای کەوتەخوار (**سَقَطَ**) دێ.

ئنجا خوا لە هەمان بابەت دا، مەسەلەیەكی دیكە دەخاتە ڕوو:

﴿ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴾، بە دڵنیایی لەسەر ئێمەیە ڕێنمایی كردن و ڕێ پێشاندان ﴿ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴾ بە دڵنیاییش مەنزڵگای كۆتایی و مەنزڵگای یەكەمیش هی ئێمەن، (الآخِرَة)، لە: ﴿ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴾دا، دیسان سیفەتی وەسفكراوێكی قرتێنراوە، یانی: (وَإِنَّ لَنَا للدَّارَ الآخِرَة)، یان (المَثُوبَةَ الآخِرَة) مەنزڵگای كۆتایی، یان پاداشتی كۆتایی هی ئێمەیە، ﴿ وَالْأُولَىٰ ﴾، هەروەها یەكەمیش، كە مەبەست پێی ژیانی دنیایە، واتە: دنیاو دواڕۆژ هەموویان لەبەر دەستی ئێمەن و موڵكی ئێمەن.

﴿ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴾، ئنجا ئێوەم ترساند، هۆشدارییم پێدان و وریام كردنەوە، لە ئاگرێك كە كڵپە دەستێنێ، بڵێسەی لێ بەرز دەبێتەوە، ﴿ لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ﴾، ناچێتە نێو ئەو ئاگرەوەو بە شێوەی تایبەت پێی ناسووتێنرێ، مەگەر مەینەتبارترین كەس، زۆرجار گوتوومانە: (صَلِي)، ئەوەیە كە شتێك بخرێتە نێو ئاگرێكەوەو، لە هەر چوار دەوری تینی بۆ بێ و، ببیشێ یاخود ببرژێ، بێگومان خراپترین كەسیش نەبێ ناچێتە نێو ئەو ئاگرەوەو بەو شێوەیە پێی ناسووتێ، ﴿ الْأَشْقَى ﴾، (أَيْ الأَشَدُّ شَقاءً) كەسێك كە لە هەموو كەسێك مەینەتبارترە، (شَقي) پێچەوانەی (سَعيد)ە، واتە: بەختەوەر، (شَقي)یش، یانی: بەدبەخت و پەشێمان و خراپەكار.

﴿ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴾، ئەو كەسەی بەدرۆی داناو پشتی هەڵكرد، واتە: لە ڕووی تیۆرییەوە ئایین و بەرنامەو پەیامی خوای بەدرۆ داناو، لە ڕووی كردەییشەوە پشتی تێكردو ڕووی لێوەرگێڕا، ئا ئەوە نەبێ ناچێتە نێو ئەو ئاگرەوە.

لە لایەن زانایانەوە مشتومڕی زۆر لەسەر ئەم ئایەتەو ئایەتی دواییشی كراوە، چۆن خوا دەفەرموێ: خراپترینی كەس نەبێ ناچێتە نێو ئەو ئاگرە، ئەدی ئایا بەندە خراپەكارەكانی دیكە دەچنە كوێ؟ دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا

زیاتر تیشك دەخەینە سەر چەمك و واتای ئەم ئایەتە بە پێزە، بەڵام ئەوەی لێرەدا دەیڵێین، ئەوەیە: واتە: بەشێوەی تایبەت بەو ئاگرە ناسووتێنرێ، جگە لە خراپترین کەس، کە بێبڕوایەو بە درۆی دادەنێ، واتە: هەموو ئەوەی لە خواوە هاتوە بە درۆی دادەنێ و، پشتیشی هەڵکردوە، ئەو کەسە شایستەی ئەوەیە بەو شێوەیە تایبەتە بەو ئاگری دۆزەخە سزا بدرێ.

﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴾، لێشی وە دوور دەخرێ، بابایەکی زۆر پارێزکار، هەرە پارێزکار، لێرەش نەیفەرمووە: (**المُتَّقي**)، پارێزکار یان (**التَّقي**)، فەرموویەتی: ﴿ ٱلْأَتْقَى ﴾ هەرە پارێزکار، لەو ئاگرە وەدوور دەخرێ، ﴿ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴾ ئەو کەسەی ماڵی خۆی دەبەخشێ، خۆی پاك و چاك دەكات، خۆی لە سیفەتی ڕژدیی و چرووکیی پاك دەکاتەوە، خۆی لە خۆشویستنی ماڵی دنیا زیاد لە پێویست، پاك دەکاتەوە.

﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴾، هیچ کەسیش لە لای وی چاکەیەکی نیە، پاداشت بدرێتەوە، واتە: کە ماڵ و سامانی خۆی دەبەخشێ، لەبەر ئەوە نیە چاکەیەکی بابای چاکە لەگەڵ کراوو، ماڵ پێ بەخشراو، لە چاوی ویدا هەبێ، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: دوای ئەوەی ئەبوو بەکر، بیلال ئازاد دەکات و دەیکڕێتەوە، بە پارەیەکی زۆر ئازادی دەکات، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پڕو پاگەندە دەکەن، دەڵێن: کاتی خۆی بیلالی چاکەیەکی لەگەڵ ئەبوو بەکردا کردوە، بۆیە ئێستاش ئەبوو بەکر ئەو چاکەیەی لەگەڵ ئەودا کردوەو کڕیویەتەوەو ئازادی کردوە!.

دەڵێن: ئەمە بەر پەرچدانەوەی ئەو پڕو پاگەندانەیە، دەڵێم: وێڕای بەرپەرچدانەوەی ئەو پڕوپاگەندانە، مانا گشتییەکەی کە بۆ هەموو حاڵان و بۆ هەموو کەس گشتگیرە، ئەوەیە: هیچ کەسیش چاکەی لە چاوی ئەودا نیە، پاداشت بدرێتەوە، کە ئەو ماڵەی دەبەخشێ، ئەدی بۆچی دەیبەخشێ؟

﴿إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾، نایبەخشێ مەگەر بە مەبەستی وەدەستهێنانی ڕووی پەروەردگاری هەرە بەرزی، کە بە دیداری پەروردگاری شاد بێ، یاخود ڕەزامەندیی پەروەردگاری وەدەست بێنێ، ﴿وَجۡهِ﴾ وێڕای: ڕوو، بە مانای دیدار دێ و، بە مانای ڕەزامەندییش دێ، ﴿وَلَسَوۡفَ يَرۡضَىٰ﴾ بە زوویش ڕازی دەبێ، واتە: ئەوەی چاوەڕوانی کردوە لە خوا ﷻ، خوا پێی دەدات، هێندەی پێ دەدات، تاکو ڕازی دەبێ و شادمان دەبێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمەش لەو کەسانە بگێڕێ کە خۆیان بەو ڕەوشتە بەرزو جوانە دەڕازێننەوەو، سەرەنجام شایستەی ئەوە دەبن، خوای کارزان و میهرەبان ئاوا ڕازییان بکات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سـوێند خواردنـی خـوا ﷻ بـە شـەوگاری داپۆشـەرو، بـە ڕۆژگاری ڕوون و، بەبەدیهێنـەری نێـرو مـێ، کـە هـەوڵ و کۆششـی مرۆڤـەکان جۆراوجـۆرە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ٢ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ٣ إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ ٤ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ﴾، سوێند بە شەوگار کە دادەپۆشێ، (و)ی ﴿ وَٱلَّيۡلِ ﴾، واوی سوێند پێخواردن (**وَاو القَسَم**)ە، ئایا شەوگار چی دادەپۆشێ؟ لێرەدا: (**حُذِفَ المَفْعُولُ لِتَنْزِيلِ الفِعْلِ مَنْزِلَةَ اللاَّزِمِ لِأَنَّ العِبْرَةَ بِغِشَايَةِ كُلِّ مَا تَغْشاهُ ظُلْمَتُهُ**)، بەرکارەکە بۆیە قرتێنراوە، تاکو کرداری ﴿ يَغۡشَىٰ ﴾، وەك کرداری لازیم مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، کە پێویستیی بە بەرکار نیە، {وەك (**غَرِقَ السفينة**)، کەشتییەکە نقووم بوو، نغرۆ بوو}، چونکە مەبەست هەر شتێکە کە تاریکیی شەو دایدەپۆشێ و، هەموو شتێك دەگرێتەوە، کەواتە: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ﴾، یانی: (﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ **وَجْهَ الأَرْضِ**، إِذَا يَغۡشَىٰ **الدُّنيا**، إِذَا يَغۡشَىٰ **كُلَّ شَيءْ**)، سوێند بە شەوگار کاتێك ڕووی زەوی دادەپۆشێ، کاتێك دنیا دادەپۆشێ، کاتێك هەموو شتێك دادەپۆشێ.

٢)- ﴿ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴾، سوێند بە ڕۆژگاریش کاتێك دەرکەوت، درەوشایەوە، (**التَّجلِّي: الضَّوءُ، وَتَجَلِّي النَّهَارِ: وُضوءُ ضِيائِهِ**)، (**تَجَلِّي**): بریتیە لە ڕوونیی و ئاشکرا بوون، تەجەللیی ڕۆژگار بریتیە لە دەرکەوتنی ڕۆشنایی ڕۆژگار، ئاشکراشە زەوی بۆ خۆی هەمیشە تاریکە، بەڵام کە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە خێرایی سیی (٣٠) کم لە خولەکێك دا لە بەرانبەر خۆردا، ئنجا ئەو ڕووەی دەکەوێتە بەرانبەر خۆر دەبێتە ڕۆژ، دوایی وردە وردە

دەڕوا، هەتا ئەو ڕووەی لە بەرانبەر خۆردا بووە، دەکەوێتە ئەو دیوو دەبێتە شەوو، ڕووەکەی دیکەی دێ، بۆیە هەمیشە لەسەر خڕۆکەی شەوو ڕۆژ بەدوای یەکدا دێن.

لێرەدا خوا ﷻ بۆ شەوگار بە کرداری ئێستا (**مُضَارع**) دەیهێنێ: ﴿ وَالَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴾، سوێند بە شەوگار کە دادەپۆشێ، ڕووی زەوی دادەپۆشێ، بەڵام بۆ ڕۆژگار بە کرداری ڕابردوو هێناویەتی: ﴿ وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴾، سوێند بە ڕۆژگار کە ڕوونبوو و درەوشایەوە، ئنجا یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان وەك لە سوورەتی (الشمس)یشدا باسمان کرد، دەڵێ: بۆیە بەم شێوەیە هاتوە بۆ ئاگادار کردنەوە لەو واقیعەی ئەو کاتە دنیای تێدا بووە، کە وەك چۆن شەوگار بەردەوام ڕووی زەوی دادەپۆشێ، بە هەمان شێوە کوفرو شیرکیش بە بەردەوامیی ڕووی دنیای داپۆشیوە.

بۆ ڕۆژگاریش لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ۝٣ ﴾الشمس، لێرەو لەوێش بە ڕابردوو هێناویەتی، چونکە خۆری خوا بە یەکگرتن، (**توحيد**) کت و پڕ دەردەکەوێ، ڕوون و ئاشکرا دەبێ و، دنیا ڕووندەکاتەوە.

٣)- ﴿ وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴾، سوێند بەوەی نێرو مێی هێناونە دی.

وشەی: (ما) لێرەدا دوو ئەگەری هەن:

**یەکەم:** کە (ما)، (**موصولة**)بێ، یانی: (**وَالَّذي** خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ)، سوێند بەو کەسەی نێرو مێی هێناونە دی.

**دووەم:** دەشگونجێ (ما)، (**مصدريَّة**)، بێ، یانی: (**خَلْقُ الذَّكَرِ وَالأُنْثى**) سوێندیش بە دروستکرانی نێر و مێ.

بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر بەعەقڵەوە دەنووسێ، کە (ما) لێرەدا (**مَوصولة**) بێ، هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: بۆچی خوا ﷻ سوێند خواردن بە خۆی خستۆتە دوایی و، خۆی لە پێشەوە باس نەکردوە؟

دەڵێین: خوای پەروەردگار کە باسی دروستکراوەکان دەکات، دروستکراوەکانیش هەر هی خۆینی، ناوەکانی خوا ﷻ و سیفەتەکانی لە دروستکراوەکانیدا دەدرەوشێنەوە.

هەروەها لە سوورەتی (الشمس)یشدا: ﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧﴾، سوێند بە نەفس و بەو کەسەی ڕێکیخستوەو ڕێك و پێکی کردوە، لەوێش خوای کاربەجێ ئەگەر (ما)، بە مانای (**الَّذي**) بێ خستوویەتە دوایی، هەندێکیش گوتوویانە: لەوێشدا (ما) (**مَصْدَرِيَّة**)یە، واتە: سوێند بە نەفس و بە ڕێکخستنەکەی.

خوا دەفەرموێ: سوێند بەو سێ شتانە: بە شەوگار کە دادەپۆشێ و، بە ڕۆژگار کە ڕوون بۆوەو، بەو زاتەی نێرو مێی هێناونە دی، یاخود بەدروستکرانی نێرو مێ:

٤)- ﴿إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ﴾ بە دڵنیایی هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە.

پێشتریش باسی حاڵەتی نێرو مێمان کردوەو لێرەش دا: ﴿وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ﴾، هەموو شتێك دەگرێتەوە، مرۆڤ و جندو ئاژەڵ و زیندەوەرو پەڕەورو کشت و کاڵ و دارو درەخت، بەڵکو بە چەمك و واتایەکی گشتییتری: ﴿ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ﴾، دەگونجێ ماددەی بێ ژیانیش بگرێتەوە، نێوکی ماددە کە لە پرۆتۆن و نیوترۆن پێك دێ، پرۆتۆن بارگەیەکی موجیبی هەیەو، نیوترۆن بێ بارگەیە، ئەلیکترۆنیش بارگەیەکی سالیبی هەیە، بۆیە ئەوانیش دەگونجێ وەك نێرو مێ، وەك جووت دابنرێن، حاڵەتی نێرو مێ یاساو سیستمێکە خوا لە نێو سەرجەم دروستکراوەکاندا دایناوەو هەموویان جووتن، خوا تەنیا خۆی تاکە، خۆی بێ هاوەڵەو بێ وێنەیە، خوا دەفەرموێ: سوێند بەو سێ شتانە ﴿إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ﴾، بە دڵنیایی هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە، (**السَّعْيُ: المَشْيُ القَوِيُّ الحَثِيثُ، وَهُنَا مُسْتَعَارٌ لِلْعَمَلِ وَالكَدِّ**)، (**سَعي**): بریتیە لە ڕۆیشتنێکی بەهێزی خێرا، بەڵام لێرە خوازراوەتەوە بۆ هەوڵ و کۆشش.

(**شَتَّى**): جمع شَتيتْ: **مِثْلُ مَرْضَى وَمَريض، وَقَتْلى وَ قَتِيل، مُشْتَقٌّ مِنَ الشَّتِّ وَهُوَ التَفَرُّقُ الشَّديد**)، (**شَتَّى**) كۆی (**شَتيت**)ە، وەك چۆن (**مَرضى**) نەخۆشەكان، كۆی (**مريض**)ە، نەخۆش و، (**قَتْلى**) كوژراوەكان، كۆی (**قَتيل**)ە، كوژراو، (**شَتَّى**)، لە (**شَتّ**)ەوە هاتوە، كە بریتیەلە لێكجیاكردنەوەو لێك پرژو بڵاوكردنێكی بەهێز، كەواتە: خوا ﷻ لێرەدا سێ سوێندی خواردوون، دواییش وەڵامی سوێندەكە هاتوە، كە هەوڵ و كۆششی ئێوە زۆرو جۆراو جۆرە. لە ئایەتەكانی دواییشدا جۆراوجۆریی هەوڵ و كۆششەكانی مرۆڤەكان ڕوونكراونەتەوە.

**مەلەسەی دووەم:**

**هەر کەس بەخشەرو پارێزکارو بە ڕاستدانەری باشترین پاداشتی خوا بێ، خوا بەرەو خێرو چاکەو، ڕێی هەرە ئاسان وەری دەچەرخێنێ و، ڕێی بۆ ئاسان دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ 

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴾، ئنجا هەر کەسێك بەخشیی و پارێزی کرد.

هەر کەسێك بەخشی، واتە: ماڵ و سامانی و، هەرچی هەیەتی، بەخشیی لە پێناوی خوادا، ﴿ وَٱتَّقَىٰ ﴾، پارێزیشی کرد، واتە: خۆی پاراست لە خوا ﷻ کە گلەیی لێ بکات و لێی ناڕازی بێ و سزای بدات.

یاخود: ﴿ وَٱتَّقَىٰ ﴾، یانی: خۆی پاراست لە لادان لە بەرنامەی خواو، لە هەموو ئەو شتانەی پێیان گوناهبارو عەیبدار دەبێ، لە دنیاو دواڕۆژدا.

وەك پێشتریش گوتمان، پیتی (ف) لە ﴿ فَأَمَّا ﴾دا، بۆ (تَفريعَ)ە، واتە: ئەم قسەیە لەسەر قسەکەی پێشێ هەڵدەستێنرێ، کە خوا فەرمووی: هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە، ئنجا خوا ﷻ ئەوە ڕوون دەکاتەوە، ئەو هەوڵ و کۆشش جۆراوجۆربوون و، ئەو سەرەنجام جۆراو جۆر بوونە، چۆنە؟ ڕوونی دەکاتەوە:

وشەی (**أَمَّا**) پیتی درێژەپێدان (**حَرْف تَفْصيل**)ە، و لە زمانی عەرەبیی دا یانی: (**مَهْمَا يَكُن مِنْ شَيءٍ**)، هەر شتێك ببێ، ئەوە ئەسڵی واتایەکەیەتی و، بۆ درێژە پێدان و ڕوونکردنەوەی مەبەستێك بەکاردەهێنرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ ﴾ ئنجا هەر کەسێك بەخشیی، لێرەدا وشەی: ﴿ أَعۡطَىٰ ﴾، (**نُزِّلَ مَنْزِلَةَ اللاّزِمِ، لِأَنَّهُ مَشْهورٌ لِإِعْطاءِ المَالِ**)، (أَعۡطَىٰ)، وەك کرداری (لازم) مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، ئەگەرنا خۆی تێپەڕکەر (**متعدِّي**)ە، چونکە زۆر ناودارە بۆ بەخشینی ماڵ و سامان، بۆیە بەرکارەکەی باس نەکراوە، یانی: (فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ **المَالَ**) ئنجا هەر کەس سامانی بەخشیی، یان: (فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ **النِّعمةَ الَّتي أَنْعَمَ اللهُ بِها عَلَيْهِ**)، ئنجا هەر کەسێك ئەو چاکەیەی خوا پێیداوە، بەخشیی.

﴿ وَٱتَّقَىٰ ﴾، پارێزیشی کرد، کە زیاتر مانایەکەی وایە: پارێزی لە خوا کرد: (**اتَّقى الله**)، (**الطَّبَري**) لە قەتادەوە بە ژمارە: (٣٧٥٥٥)، هێناویەتی، دەڵێ: (**إِتَّقى، أَي: إِتَّقى مَحَارِمَ اللهِ الَّتي نَهَى عَنْهَا**)، خۆی لەو قەدەغە کراوانەی خوا پاراست، کە قەدەغەی کردوون.

هەروەها (**الطبري**) لە ئیبنو عەبباسەوە هێناویەتی، دەڵێ: (**إِتَّقى: أَيْ إِتَّقى اللهَ**) خۆی لە خوا پاراستوە، واتە: پارێزکاریی کردوە بەرانبەر بە خوا، شتێك نەکات خوا لێی نارازیی بێ و تووشی سزاو جەزرەبەی خوا ببێ.

**٢)-** ﴿ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾، ئەوەی هەرە باشیشە بەڕاستی زانی، پێشتریش گوترا: (**الحُسْنى**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراو (**صفة موصوف محذوف**)ە، ئنجا (**الحُسْنَى**)، لە بەرانبەر (**أَحْسَنَ**)ە، (**الحُسْنَى**)، بۆ مێینەو (**الأَحْسَن**) بۆ نێرینەیە، واتە: (**المَثُوبَةَ الحُسْنى**) یان: (**الكَلِمَةَ الحُسْنى**) یان: (**الدَّارَ الحُسنى**)، بەڕاستی زانیی:

**أ-** پاداشتی هەرە باش، وەك (**الطبري**) لە (**إبن عباس**)ە هێناویەتی، بە ژمارە: (٣٧٥٥٩) و (**مخرِّج**)ی تەفسیری (**الطبري**)یش سەنەدەکەی بە ڕاست داناوە، گوتوویەتی: (**صدَّق بالخَلَفِ من الله**) واتە: پاداشتدانەوەی چاکەی لە خواوە بەڕاست داناوە.

**ب-** یان وشەی هەرە باش، (کە وشەی خوا بە یەکگرتن (**لا إِلَه اِلاَّ الله**)ە)، وەك (**الطبري**) بە ژمارە: (٣٧٧٥١) لە (**الضحاك**)ە هێناویەتی، گوتوویەتی: [**صدَّق ب(لا إِلَه اِلاَّ الله)**].

**ج-** یاخود مەنزڵگای هەرە باش، کە مەنزڵگا کۆتایی و بەهەشتەو لە ڕۆژی دواییدا خوای پەروەردگار دەیڕەخسێنێ، ڕاستتریش ئەوەیە بگوترێ: خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا، بڕوادارانی دەخاتە نێو، چونکە بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان بەهەشت و دۆزەخ ئێستا هەن.

**٣)-** ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئاسانی دەکەین، بۆ ڕێی هەرە ئاسان، (**التَيسيرُ: جَعْلُ الشَّيءِ يَسير الحُصول، وَمَفْعُول فِعلُ التَّيسير، هو شَيءٌ صَعْبٌ**)، (**تَيْسير**): بریتیە لەوەی شتێك وا لێ بکەی بە ئاسانیی پەیدابێ، بەرکاری کرداری (**تَيْسير**) ئاسانکردن، بریتیە لە شتێکی بە زەحمەت، ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ﴾، یانی: ئێمە شتێك کە بە زەحمەتەو قورسە، بۆی ئاسان دەکەین، (**يُسرى**)، واتە: هەرە ئاسان، (**اليُسْرى: مَا لا مَشَقَّةَ فيهِ وَتَأْنيثُها بِتَأْويلِ أولاً: الحَالَةُ الَّتي لا تَشُقُّ عَلَيْهِ فِي الآخِرَةِ: حَالَةَ النَّعيم، ثانياً: المَكانَة**)، واتە: (**يُسرى**): ئەوەیە کە زەحمەتیی و قورسیی تێدا نەبێ، کە بە مێینەش دانراوە، دوو ئەگەری هەن:

**١)-** ئەو حاڵەتەی لە ڕۆژی دواییدا لەسەری قورس نابێ، کە حاڵەتی پڕ نازو نیعمەتی بەهەشتە.

**٢)-** ئەو پلەو پایەو پێگەیەی لە ڕۆژی دواییدا پێی دەدرێ، هیچ زەحمەتیی و سەر ئێشەو ماندوبوونی تێدا نیە، کە پێگەی بڕودارانە لە بەهەشتەکانی خوای بەرزی مەزندا.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هەر کەسیش چرووك بێ و، بێنیازیی بەرانبەر بە خوا بنوێنێ و، بە پاداشتی هەرە چاکیش بێبڕوا بێ، خوا بەرەو حاڵەتی هەرە قورس و زەحمەت وەریدەچەرخێنێ و، سامانەکەیشی لە کاتی کەوتنە دۆزەخیدا دادی نادات و بە کەڵکی نایەت:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴿١١﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

لە ئایەتەکانی پێشێدا، باسی کەسێکی کرد کە دەبەخشێ و پارێز لە پەروەردگاری دەکات و، بڕواشی بە پاداشتی هەرە چاك یان مەنزڵگای هەرەباش هەیە، یاخود: بە وشەی هەرە چاك هەیە، کە وشەی خوا بە یەکگرتنە، ئنجا خوا ﷻ وەك بەراوردکردن لەگەڵ ئەوەی پێشێدا، دەفەرموێ:

١)- ﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴾، بەڵام کەسێك چرووکیی و ڕژدیی بنوێنێ و، نەبەخشێ، بێنیازیش بێ، بێنیازیی پێشان بدات بەرانبەر بە خوا، لە جیاتی پارێزکاریی.

٢)- ﴿ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾، وشەی هەرە چاکیش بە درۆ دابنێ، لە جیاتی بڕواهێنان بە وشەی هەرەچاك، یان باشترین مەنزڵگا، یان پاداشتی هەرە باشی خوا، پێی بێبڕوابێ و بە درۆی دابنێ، هەر کەسێك وابێ:

٣)- ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بەرەو قورسیی و زەحمەتیی وەریدەچەرخێنین.

٤)- ﴿ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴾، ماڵ و سامانەکەشی دادی نادات و سوودی پێ ناگەیەنێ، کاتێك دەکەوێ.

## کورتە باسێک: شەش وردە سەرنج

١- کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴾، ئیبنو عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، وەك (**الطبري**)، بە ژمارە: (٣٧٥٨١)، لێیەوە هێناوە، بە سەنەدێکی ڕاست و دروست، دەڵێ: (**مَنْ بَخِلَ بِالفَضْلِ وَاسْتَغْنى عَن رَبِّهِ**)، واتە: هەر کەسێك چرووکیی بنوێنێ، لە بەخشینی شتێکدا کە لە خۆی زیادەو، لە پەروەردگاریشی بێنیازیی دەربڕێ.

(**الطبري**) هەر لە ئیبنو عەبباسەوە بە ژمارە: (٣٧٥٨٠)، بە سەنەدێکی باش (**حَسَن**) هێناوەیەتی: (**مَنْ بَخِلَ بِمَا عِنْدَهُ، وَاسْتَغْنَى فِي نَفْسِهِ**)، واتە: هەر کەسێك لەوەدا کە لەلایەتی، چرووکیی بکات و نەیبەخشێ، لە دەروونی خۆشیدا خۆی پێ بێنیاز بێ.

من ئەو مانایەی دووەمیانم زیاتر بە دڵەوە دەنووسێ، چونکە خوا نەیفەرمووە: (**مَنْ بَخِلَ بِالفَضْلِ مِنْ مَالِهِ**)، کەسێک چرووکی بکات لەوەدا کە لێی زیادە، بەڵکو: خوا بە گشتیی باسی چرووکیی و ڕژدیی و نەبەخشینی کردوە.

هەروەها ﴿ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴾، بەڵێ بەپێی ڕەوت و بە سەلیقە دەتوانین بڵێین، یانی: (**وَٱسۡتَغۡنَىٰ عَنْ رَبِّهِ**)، لە پەروەردگاری بێنیاز بوو، بەڵام دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە لە دەروونی خۆیدا، خۆی پێ بێنیازو بێباکەو پێی وایە پێویستیی بە کەس نیە.

٢- ﴿ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾، لێرەدا زۆربەی زانایان گوتوویانە: (**كَذَّبَ بِالخَلَفِ مِنَ الله**)، یانی: ئەو کەسەی بێبڕوایە بە پاداشتی باش لە خواوە، لە بەرانبەر بەخشین و پارێزکارییدا، بەڵام وێڕای ئەو مانایە مانایەکانی دیکەشی هەن کە پێشتر هێنامانن.

٣- ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ﴾، (**العُسْرى**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (**لِلْعاقِبَةِ العُسْرى**) یان (**لِلْخَصْلَةِ العُسرى**)، بەرەو سەرەنجامی زۆر قورس و زەحمەت، بەرەو سیفەتی هەرە قورس و زەحمەت.

ئیبنو عەبباس بە ژمارە: (٣٧٥٩٩)، (الطبري) لێیەوە هێناوەو سەنەدەکەشی ڕاستە، دەڵێ: ﴿لِلْعُسْرَىٰ﴾، (أي: شَرٍّ مِنَ الله)، بەرەو زیان و خراپەیەك لە لایەن خواوە کە بەسەری دێ.

کەواتە: (العُسْرى) دوو واتای هەن:

أ- حاڵەتی قورس و زەحمەت و مەینەتیی (حالة العسر و الشدّة).

ب- پێگەی خراپ و سەخت کە دۆزەخە (المكانة السيئة الصّعبة وهي جهنَّم).

٤- کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ﴾، یانی: ماڵ و سامانەکەی سوودی پێ ناگەیەنێ، کاتێك دەکەوێ، (التَّرَدِّي: السُّقُوطُ مِن عُلوٍ إلى سُفْلٍ)، (تَرَدِّي): بریتیە لەبەربوونەوە لەسەرێوە بۆ خوارێ، زانایانیش سێ واتایان بۆ ئەو کەوتنە خوارەوە داناون:

أ- هەندێکیان بە مردنیان لە داناوە: (تَرَدَّى: أَيْ مَاتَ).

ب- هەندێکیان بە خرانە نێو گۆڕیان داناوە: (تردَّى أَيْ أُدْخِلَ فِي القَبْرِ).

ج- هەندێکیشیان بە کەوتنە نێو دۆزەخیان داناوە: (تردَّى: سَقَطَ فِي جَهَنَّم)، کە (الطبري): ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە، چونکە (رَدِيَ: أَيْ: مَاتَ)، (التَّرَدِّي: السُّقُوط)، (رَدِيَ) بە مانای مرد، (التَّرَدِّي)، واتە: کەوتن، (الطبري) لە (قەتادة)وە بە ژمارە: (٣٧٦٠٣)، هێناویەتی: (إِذَا تَرَدَّى فِي النَّارِ)، کاتێك کە دەکەوێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

٥- ﴿فَسَنُيَسِّرُهُ﴾، لەمەودوا ئاسانی دەکەین، یەکێك لە ڕوونکەرەوان گوتوویەتی: (نُيَسِّرُهُ: أَيْ نُدْرِجُهُ فِي عَمَلَي السَّعَادَةِ وَالشَّقَاوَة، فَالأَعْمَالُ الصَّالِحَةُ هِيَ يُسْرى، أَوَّلاً: فِي نَفسِهَا لِمُواءَمَتِها لِلْفِطْرَة، ثانياً: لِعَاقِبَتِهَا الأُخْرَوِيَّة)، واتە: وای لێدەکەین، هەردوو کرداری بەختەوەرانەو بەدبەختانەشی لە دەست بێن، کردەوە باشەکان، خوا بە (يُسْرَى) پێناسەی کردوون، لەبەر ئەوەی: أ- لە خودی خۆیان دا ئاسانن و، لەگەڵ زگماك و ناخی مرۆڤیشدا گونجاون.

**ب-** بۆیە پێیان گوتراوە: (**يُسْرَى**)، لەبەر سەرەنجامە چاکەکەی دوارۆژیان.

هەروەها گوتوویەتی: (**ووصفت السَّيِّئَات بالعُسرى لسببين:** )، کردەوە خراپەکانیش بە (**عُسرى**) پێناسە کراون؟ ئەویش لەبەر دوو هۆکاران:

**یەکەم:** (**هي صعبة فِي نَفْسِهَا، لِمُخَالَفَتِهَا لِلْفِطْرَة**)، لە خودی خۆیاندا کردەوە خراپەکان قورسن، چونکە پێچەوانەی زگماك و ناخی مرۆڤن.

**دووەم:** (**لِعَاقِبَتِهَا السَّيِّئَة فِي الآَخِرَة**)، لەبەر سەرەنجامە خراپەکەیان لە ڕۆژی دواییدا.

**٦-** (**أل**)ی سەر (**العُسْرى**) و (**اليُسْرى**) دوو ئەگەریان هەن:

دەگونجێ بۆ تێکڕا (**جنس**) بن، واتە: ئاسانی دەکەین، بۆ کۆی زەحمەتیی و ناڕەحەتییەکان لە دنیاو دوارۆژدا.

یاخود: ئاسانی دەکەین بۆ کۆی ئاسانییەکان لە دنیاو دوارۆژدا.

بەڵام دەشگونجێ بۆ (**عهد**) بن، یانی: بۆ ئاسانییەکە ئاسانی دەکەین، یان بۆ قورسەکە ئاسانی دەکەین، ئاسانییەکە وەك پێشتریش باسمان کرد واتە: ئەو شەریعەتەی خوای پەروەردگار کە ئاسانەو لەگەڵ عەقڵ و فیترەتدا، گونجاوە.

(**عُسرى**)ش واتە: بەرەو ڕێیەك کە قورسەو زەحمەتە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ فیترەت و ناخیدا نەگونجاوەو سەرەنجامیشی خراپە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە موبارەکەدا، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین:

**{عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَبِيَدِهِ عُودٌ فَنَكَتَ فِي الْأَرْضِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَفَلَا نَتَّكِلُ؟ قَالَ: لَا، اعْمَلُوا وَلَا تَتَّكِلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ: فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى، وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى}** (أخرجه أحمد:

**١٠٦٧، والبخاري: ٤٦٦٥، ومسلم: ٢٦٤٧، وأبو داود: ٤٦٩٤، والترمذي: ٣٣٤٤، وقال: حسن صحيح، وعبد بن حميد: ٨٤، وأبو يعلى: ٥٨٢).**

واتە: عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبووین بە داروو‌چکەیەك لە زەوییەوە دەژەنی، {وەك داڵغە لێدانێك و بیرکردنەوەیەك}، دوایی سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: هیچ کام لە ئێوە نیە مەگەر نشینگەکەی لە بەهەشتداو، نشینگەکەی لە دۆزەخدا بۆ دیاریکراوە (بۆی نووسراوە)، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا پشت نەبەستین بەو نووسینە؟ فەرمووی: نەخێر، کردەوە بکەن و پشت بەو نووسینە مەبەستن (چونکە نازانن چیتان بۆ نووسراوە)، هەر کامێك لە ئێوە ئاسانکراوە، واتە: ئاسان دەکرێ بۆ ئەو شوێنەی بۆی دروستکراوە، دوایی ئەو ئایەتە موبارەکانەی خوێندنەوە: (**فأما من أعطى...**).

مەبەستی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوە بووە کە بزانن خوا هەموو شتێك دەزانێ، دوایی کە گوتوویانە: (**أَفَلا نَتَّكِلُ**)، ئایا پشت نەبەستین؟ واتە: واز نەهێنین لەوەی خوا چی نووسیوەو چی دەوێ؟ فەرمووی: نەخێر، کار بکەن و پشت بەوە مەبەستن، چونکە هەر کامێك لە ئێوە ئاسان دەکرێ، بۆ ئەو شوێنەی بۆی نووسراوە، واتە: ئەگەر بۆ بەهەشت نووسرا بێ، کردەوەی بەهەشتییان دەکات و، ئەگەر بۆ دۆزەخ نووسرابێ، کردەوەی دۆزەخییانە ئەنجام دەدات.

کەواتە: دەتوانین بڵێین: (**العَمَلُ الصَّالِحُ عِنْوانٌ عَلى العَاقِبَةِ الحَسَنة، وَالعَمَلُ السَّيِّئُ عِنْوَانٌ لِلعَاقِبَةِ السَّيِّئَة**)، کردەوەی باش، ناوونیشانی سەرەنجامی باشەو، کردەوەی خراپیش ناوونیشانی کردەوەی خراپە.

وەك من لە هەندێك لە کتێبەکانی خۆم دا، بە تایبەت مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا)، باسم کردوە کە قەدەری خوا بۆ ئێمە پەنهانە، بەڵام کردەوەکانی خۆمان ئاوێنەیەکن، ئێمە سەرەنجامی

خۆمانیـان تێـدا دەخوێنینـەوەو قـەدەری خواشـیان تێـدا دەبینیـن، ئەگەرنـا ئێمـە نازانیـن خـوا ﷻ چـی نووسـیوە، بـەڵام ئەگـەر کـردەوەی بـاش ئەنجـام بدەیـن، مانـای وایـە سـەرەنجامت خێـرەو، ئەگـەر کـردەوەی خراپیـش ئەنجـام بـدەی، سـەرەنجامت خراپـە، چونکـە بەهـۆی کردەوەکانـەوە، مـرۆڤ دەچێتـە بەهەشـت، یاخـود دەچێتـە دۆزەخ.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**خـوا ڕێنمایـی کردنـی، لەسـەر خـۆی پێویسـت کـردوەو، دواڕۆژو دنیـاش هـی ویـن، هەمـوو لایەکیشـی لـە ئاگری بڵێسـەدار ترسـاندوە، کـە خراپەکارانـی بێبـڕوای پشـت هەڵکـەری دەچنـێ و، پارێزکارانـی خـۆ پـاك و چاککـەری بەخشـەر لێـی دووردەبـن، ئەوانـەی سامانی خۆیـان تەنیـا بـە پاڵنـەری دەستخسـتنی دیـداری خـوا دەبەخشـن و، چاکـەی هیچکەسیان لـە چـاودا نیـەو، خـوای پەروەردگاریـش ڕازییـان دەکات:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ﴿١٥﴾ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ﴿١٧﴾ الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴾، (خوا ﷻ دەفەرموێ:) بە دڵنیایی ڕێنمایی کردن لەسەر ئێمەیە، (هُدى): لێرەدا بە مانای ڕێ پیشاندان و ڕێنمایی کردن و بەرچاو ڕوونکردنەوەیە، کە ئەوە ڕێگای ڕاستەو خوا پەسندی دەکات.

(الطبري) لـە قەتـادەوە بـە ژمـارە: (٣٧٦٠٧)، هێناویەتـی، کـە گوتوویەتـی: (عَلَى اللهِ البَيَانُ، بَيَانُ حَلالِهِ وَحَرامِهِ وَطَاعَتِهِ وَمَعْصِيَتِهِ)، ڕوونکردنـەوە لەسـەر خوایـە، ڕوونکردنـەوەی ئـەوەی ڕەواو حەڵاڵـی کـردوەو، ئـەو شـتەی قەدەغـەی کـردوەو، فەرمانبەرییەکـەی و سـەرپێچییەکەی، خـوا ﷻ لەسـەر خـۆی پێویسـت کـردوە بۆمـان ڕوون بکاتـەوە.

٢)- ﴿ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ ﴾، بە دڵنیایی (مەنزڵگای) کۆتایی و یەکەمیش هی ئێمەن، (آخِرَة)، هاوەڵناوو سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (لَلدَّارُ الآخِرَة) یان (لَلْعَاقِبَةُ الآخِرَة)، یان (لَلْمَنْزِلَةُ الآخِرَة)، واتە: ماڵی کۆتایی، یاخود پاداشتی کۆتایی، یاخود سەرەنجامی کۆتایی، هی ئێمەیە، ﴿ وَٱلْأُولَىٰ ﴾ هەروەها هی یەکەمیش، واتە: مەنزڵگای یەکەمیش، کە ژیانی دنیایە، واتە: دوارۆژو دنیا هەردووکیان هەر هی ئێمەن، (الطبري)، ئەمەی بەمجۆرە مانا کردوە: (وَإِنَّ لَنَا مُلْكَ مَا فِي الدُّنيا وَالآخِرَة، نُعْطِي مِنْهَا مَنْ أَرَدْنَا مِنْ خَلقِنَا وَنَحْرِمُهُ مَن شِئْنا)، حوکمڕانیی دنیاو دوارۆژ هەر هی ئێمەیە، هەر کەسێك بمانەوێ لە دروستکراوەکامنان، پێی دەدەین، هەر کەسێکیش بمانەوێ، بێبەشی دەکەین و پێی نادەین.

٣)- ﴿ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴾ ئنجا من دەتانترسێنم لە ئاگرێك کە بڵێسە دەدات، ﴿ تَلَظَّىٰ ﴾ (الطَّبَري) بە ژمارە: (٣٧٦٠٨) لە موجاهیدەوە هێناویەتی: (أَيْ: تَوَهَّج)، کڵپەو بڵێسە دەدات، (أَصْلُهُ تَتَلَظَّى، حُذِفَتْ إِحْداهُما لِلإختصار)، ﴿ تَلَظَّىٰ ﴾، لە ئەسڵدا (تَتَلَظّى) یە، بەڵام یەکێك لە (ت)ەکان قرتێنراوە بۆ کورتبوونەوە، واتە: ئێوەم ترساندوەو وریام کردوونەوە لە ئاگرێك کە بڵێسەو کڵپە دەدات.

٤)- ﴿ لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ﴾، نایچێتە نێو مەگەر کەسێك خراپترین بێ، ﴿ ٱلْأَشْقَى ﴾: (الأَشْقَى مِنْ غَيْرِهِ هُوَ الكَافِرُ، أَمَّا غَيْرُهُ مِنَ الأَشْقِيَاءِ فَلَيْس كَذَلِك)، کەسێك کەلە جگە لە خۆی خراپترە، بێبڕوایە، بەڵام بەدبەختەکانی دیکە، مادام بێبڕوا نەبن، بە ئەندازەی ئەو خراپ نین، کەواتە: کەسێك لە هەموو کەس خراپترە، ئەو کەسەیە کە بێبڕوایە[1].

ئنجا خوا دەفەرموێ: نایچێتە نێو، یان بەشێوەی تایبەت پێی ناسووتێنرێ، مەگەر خراپترین کەس، چونکە: ﴿ ٱلْأَشْقَى ﴾، ڕێژگەی هەڵبژاردنە، بۆ (شَقي)، واتە: بەدبەخت و خراپەکار، ﴿ ٱلْأَشْقَى ﴾، واتە: بەدبەختترو خراپتر.

---

(١) دوایی ئەو ئیشکالەی لەسەر ئەو ڕستەیەو، ڕستەی دواتریش کە دەفەرموێ: ﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴾، لێی دوور دەخرێتەوە کەسێك کە پارێزکارترینە، هەڵدەگیرسێنرێ، قسەی لێ دەکەین و وەڵامی زانایانیش دێنین.

٥)- ﴿ ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴾، ئەو كەسەی بێبڕوابووەو، پشتیشی هەڵكردوە، بێبڕوا بووە لە ڕووی بڕواهێنانەوەو بە درۆی داناوە، ﴿ وَتَوَلَّىٰ ﴾، پشتیشی هەڵكردوە لە ڕووی كردەوەوە.

٦)- ﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴾، لێشی وەدوور دەخرێ پارێزكارترین.

ئنجا دوایی پارێزكارترین پێناسەو مانا دەكات:

٧)- ﴿ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴾، ئەو كەسەی ماڵی خۆی دەبەخشێ، خۆی پاك و چاك دەكات، یەكێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان ئاوا مانای لێك داوەتەوە، دەڵێ: **(الَّذي يُعْطِي مَالَهُ فِي الدُّنيا فِي حُقُوقِ اللهِ الَّتِي أَلْزَمَهُ إِيَّاها يَتَطَهَّرُ بِذَلِكَ مِنْ ذُنُوبِهِ)** واتە: ئەو كەسەی لە دنیادا ماڵ و سامانەكەی خۆی لە مافەكانی خوادا، كە پێوەیانی پابەند كردوە، دەبەخشێ و، بەهۆی ئەو ماڵ و سامانە بەخشینەوەیە، خۆی لە گوناهەكانی پاك دەكاتەوە.

٨)- ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴾، هیچ كەسێكیش چاكەیەكی لە لای نیە، تاكو پاداشت بدرێتەوە، وشەی: **(مَا)**، لابەرە **(نَافية)**یەو بۆ لابردنە، ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ ﴾، **(مِنْ زَائِدَةٌ لِلتَّأكيد)**، **(مِن)**یش، بۆ جەختكردنەوە زیاد كراوە.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴾، یانی: هیچ كەسێك هیچ جۆرە چاكەیەكی لە لای نیە، پاداشتی بداتەوە لەسەری و، هیچ چاكەیەك لە كەسێكەوە بۆ وی نەهاتوە، كە ئەویش چاكەی بداتەوە، بەڵكو تەنیا بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕووی خواو، ڕەزامەندیی خواو، دیداری خوا، ئەو ماڵەی خۆی دەبەخشێ.

٩)- ﴿ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾، جگە لە داواكردنی ڕووی پەروەردگاری هەرە بەرزی، ئەم هەڵاواردن **(إستثناء)**ە، هەڵاواردنێكی دابڕاو **(إستثناء منقطع)**ە، چونكە داواكردنی ڕووی پەروەردگاری هەرە بەرز، بەشێك نیە لە چاكەی كەسێك لە لای.

﴿ ٱبْتِغَآءَ ﴾یش: **(الطَّلَبُ بِجِدٍّ، لأَنَّهُ أَبْلَغُ مِنَ البَغْي، البَغْيُ: الطَّلَبُ)**، ﴿ ٱبْتِغَآءَ ﴾: بریتیە لە داوا كردنێكی زۆر بە گرنگیی پێدانەوەو بەهێزترە لە **(بَغي)** كە بە مانای داواكردنە.

١٠)- ﴿ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴾، بەدڵنیاییش لەمەودوا ڕازیی دەبێ، (ل)ی (لسوف): (لام الإبْتِدَاءِ لِتَأكيد الخَبَر، ﴿ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴾)، لامی دەستپێکردنە بۆ جەختکردنەوەی هەواڵەکە.

کە دەفەرموێ: (سَوْفَ يَرْضَىٰ)، (سَوْفَ: لِتَحقُّقِ الوَعْدِ بِالمُسْتَقْبَلِ، مِثْلُ: سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُم رَبِّي)، (سَوف) بۆ ساغكردنەوەی هاتنە دی ئەو بەڵێنەیە لە داهاتوودا، وەك یەعقووب ﷺ کە کوڕەکانی داوایان لێکرد، داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکات، فەرمووی: ﴿ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيٓ ﴿٩٨﴾ ﴾یوسف، واتە: لەمەودوا بە دڵنیایی داوای لێبوردنتان بۆ لە پەروەردگارم دەکەم.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴾، پیتی (ف)، لە: (فأنذرتكم)دا دوو ئەگەری هەن:

**یەکەم:** (لِمُجَرَّدِ التَّفريعِ الذِّكْري)، بەس بۆ لق لێکردنەوەی باسکردنە، چونکە جاری وایە پیتی (ف) دێ، بەس بۆ باسکردن و، پەیوەست کردنەوەی قسەیەك کە ئێستا دەکرێ بە قسەیەکەوە کە پێشتر کراوە.

**دووەم:** (لِلتَفريعِ المَعْنَوِيِّ فَهُوَ تَفْريعٌ عَلى جُمْلَةِ (إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ) وَالمَعنى هَدَيْتُكُم فَأَنذَرْتُكُمْ إِبْلاغاً فِي الهُدى)، ئەمە بۆ لق لێکردنەوەو جیاکردنەوەی مەعنەوییە لە ڕستەیەکی پێشتر، ئەویش بریتیە لە ڕستەی: (إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ)، بە دڵنیایی ڕێنماییکردن لەسەر ئێمەیە.

ئنجا لێرە دەفەرموێ: ﴿ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴾، واتە: من ڕێنمایيم کردوون و ترساندوومن و ئاگاداریشم کردوونەوە، بۆ ئەوەی زۆر ڕێنماییتان بکەم و ڕێتان پێشانبدەم، ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْءَاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾، کەواتە (ف) ئەم ڕستەیە دەبەستێتەوە بە ڕستەی: (إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ)ەوە، کە پێشتر هاتوە.

## کورتە باسێک: چوار جۆرە وەڵامی ئیشکالێک

چـوار جـۆرە وەڵامـی زانایـان بـۆ ئیشـکال و پرسـیارێك کـە بریتیـە لـەو ئیشـکالەی لـە هـەردووك ڕسـتەی: ﴿ لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ﴾و، ڕسـتەی: ﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴾، سـەرهەڵدەدات، واتـە: (صَلِي) ناکـرێ بـەو ئاگـرە، جگـە لـە خراپتریـن کـەس و، لێـی دەپارێـزرێ، پارێزکارتریـن کـەس.

بـە پێـی ڕواڵەتـی ئـەم دوو ڕسـتە قوڕئانییـەی ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـە: کـەس ناچێتـە دۆزەخ مەگـەر خراپتریـن کـەس بـێ و، کەسـیش لـە دۆزەخ ناپارێـزرێ، مەگـەر باشـترین کـەس بـێ، کـە پارێزکارترینـە، لـە حاڵێکـدا ئێمـە دەزانیـن: هـەم کەسـێك کـە خراپتریـن بـێ و، هـەم کەسـێك کـە خراپیـش بـێ، دەگونجـێ سـزا بدرێـن، خراپتریـن بـێ واتـە: بێبـڕوا بـێ، خـراپ بـێ، واتـە: بڕوادارێکـی تاوانبـارو خەتـاکار بـێ، دیسـان: پارێزکارتریـن دەچێتـە بەهەشـت، بـەڵام پارێزکاریـش هـەر دەچـێ بـۆ بەهەشـت، ئایا وەڵامـی ئـەوە چۆنـە؟

سـەرنجی ئـەو تەفسـیرانەم دا کـە لەبـەر دەسـتمن هـی زۆربەیـان، چـوار وەڵامیان داونـەوە، هـەر کامێکیـان لـە شـوێنی خۆیـداو بـە شـێوەی خـۆی، بەبـۆ چوونـی مـن هەرکامیـان وەڵامێکـی باشـە:

١- (الطبري) دەڵێ: (**وَوُضِعَ أَفْعَلَ مَوْضِعَ فَعيل، الأَشْقَى: الشَّقِي أو الشَّديدُ الشَّقَاء، الأَتْقَى: التَّقي، أَوِ الشَّدِيد التَّقْوى**)، واتە: لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ﴾، وشەی: ﴿ ٱلْأَشْقَى ﴾، ئەوپەڕی بەدبەخت، لەسەر کێشی (**أَفْعَل**) دانراوە لە شوێنی (**شَقِيّ**) لەسەر کێشی (**فعيل**)، واتە: کەسێك کە بەدبەخت و خراپەکارە، ﴿ ٱلْأَتْقَى ﴾یش دیسان لە شوێنی (**التَّقي**) دانراوە، ﴿ ٱلْأَتْقَى ﴾، واتە: کەسێك کە زۆر خۆپارێزە، بەڵام لێرەدا هەر بە مانای (**تقيّ**)یە، واتە: پارێزگار.

٢- (الزَّجَّاج) دەڵێ: {هذِهِ الآيَةَ هِيَ الَّتي مِنْ أَجْلِهَا، قَالَ أَهْلُ الإِرْجَاءِ بِالإِرْجاء، فَزَعَمُوا أَنَّهُ لا يَدْخُلِ النَّارَ إلاَّ كَافِرٌ؛ وَلِأَهْلِ النَّارِ مَنَازِل، فَمِنْهَا أَنَّ المُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّار، وَاللهُ سُبْحَانَهُ كُلُّ مَا وَعَدَ عَلَيْهِ بِجِنْسٍ مِنَ العَذَاب، فَجَدِيرٌ أَنْ يُعَذِّبَ بِهِ، وَقَدْ قَالَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾﴾النساء، فَلَوْ كَانَ كُلُّ مَنْ لَمْ يُشْرِكْ، لَمْ يُعَذَّبْ لَمْ يَكُن فِي قَوْلِهِ: ﴿وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾﴾، فائِدَة}(فتح القدير: ج٥، ص٥٥٦).

واتـە: بەهـۆی ئـەم ئایەتەوەیـە[1] کـە مورجیئـە کـردەوە لـە ئیمان دوادەخـەن، (بـە بەڵگەیـان هێناوەتـەوە)، پێیـان وابـووە، تەنیا بابـای بێبـڕوا دەچێتـە نێـو ئاگـری دۆزەخـەوە، {(الزجّاج)یـش وەڵام دەداتـەوەو دەڵـێ:} بـەڵام خەڵکـی دۆزەخیـش پلـە پلـەن، بـۆ وێنـە مونافیقـەکان لە پلـەی خـوارەوەی ئاگـردان: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾النسـاء، واتـە: بـە دڵنیایـی مونافیـق و دەغەڵـەکان لـە پلـەی ژێرەوەتـری ئاگـر دان، {کەواتـە: دۆزەخ پلـەی خوارێـی هەیـەو، پلـەی سەرتریشـی هەیـە}، بـەو شـێوەیەش خـوا بەڵێنـی بـە هـەر جـۆرە سـزایەك دابـێ، بێگومـان شایسـتەی ئەوەیـە ئـەو بەڵێنـەی خـۆی بەرێتـە سـەرو پێـی سـزا بـدات، ئنجـا خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾﴾النسـاء، واتـە: بـە دڵنیایـی خـوا لـەوە نابـوورێ هاوبەشـی بـۆ دابـنرێ، بـەڵام جگـە لـە هاوبـەش بـۆ دانـان، هـەر کەسـێکێ بیـەوێ لێیدەبـوورێ، (واتـە: بەبـێ گەڕانـەوەش، ئنجـا دەڵـێ:) ئەگـەر هـەر کەسـێك هاوبەشـی بـۆ خـوا دانەنابایـە، سـزا نەدرابایـە، ئـەو کاتـە ئـەو فەرمایشـتەی خـوا (کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾﴾، واتـە: لـە جگـە لـەوە، (جگـە لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان) هـەر کەسـێك بیـەوێ لێـی دەبـوورێ)، سـوودی نەدەبـوو.

چونکـە هـەر لـە ڕێـوە دیـارە ئـەوەی خـاوەنی کوفـر نەبـێ، کـە شـیرکیش جۆرێکـە لـە کوفـر، سـزا نـادرێ! ئـەدی وەڵامەکـەی چۆنـە؟

(١) یانی: بە هەڵە لێتێگەیشتنی ئەو ئایەتەوە.

{أَي: لايَصْلاَهَا صَلْياً لاَزِماً عَلَى جِهَةِ الخُلُودِ إلاَّ الأَشْقى، وَهُوَ الكَافِرُ، وَإِنْ صَلِيَهَا غَيْرُهُ مِنَ العُصَاةِ، فَلَيْسَ صَلْيُهُ كَصَلْيِهِ} واتە: پێی ناسووتێنرێ بەو ئاگرە، پێ سووتاندنێك كە پێوەی پەیوەست بێ و بە هەمیشەیی تێیدا بمێنێتەوە جگە لە: ﴿ٱلۡأَشۡقَى﴾، خراپترین كە بریتیە لە بابای بێبڕوا، بەڵام جگە لە بێبڕوا لە گوناهباران و تاوانبارانی بڕواداریش بەو ئاگرە، سزا دەدرێ، بەڵام سزادانەكەی وەك سزادانەكەی كافر نیە، كەواتە: ﴿لَا يَصۡلَىٰهَآ إِلَّا ٱلۡأَشۡقَى﴾، یانی: پێی ناسووتێنرێ سووتاندنێكی پەیوەست كە تێیدا هەمیشە ببێ، جگە لە كەسێك كە خراپترینە.

٣- (الزَّمَخْشَرِيُّ) دەڵێ: {الْآيَةُ وَارِدَةٌ فِي الْمُوَازَنَةِ بَيْنَ حَالَتَيْ عَظِيمٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَعَظِيمٍ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَأُرِيدَ أَنْ يُبَالَغَ فِي صِفَتَيْهِمَا الْمُتَنَاقِضَتَيْنِ، فَقِيلَ: الْأَشْقَى، وَجُعِلَ مُخْتَصًّا بِالصَّلْيِ، كَأَنَّ النَّارَ لَمْ تُخْلَقْ إِلَّا لَهُ، وَقَالَ: الْأَتْقَى، وَجُعِلَ مُخْتَصًّا بِالنَّجَاةِ، وَكَأَنَّ الْجَنَّةَ لَمْ تُخْلَقْ إِلَّا لَهُ، وَقِيلَ: هُمَا أَبُو جَهْلٍ، أَوْ أُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ، وَأَبُو بكر الصديق رضي الله تَعَالَى عَنْهُ}.

واتە: ئەم ئایەتە لە بارەی بەراوردی نێوان دوو حاڵەتی دژ بەیەك و لێك جیاوازی مەزنێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەران و، مەزنێك لە بڕوادارانەوە هاتوە، ئنجا ویستراوە زێدەڕۆیی لە دەرخستنی سیفەتەكەیاندا بكرێ، سیفەتە دژو پێچەوانەی یەكدییەكە، بۆیە گوتراوە: ﴿ٱلۡأَشۡقَى﴾، بەدبەختترین، تایبەتیشكراوە بە (صَلِيّ)، وەك ئەوەی ئاگر(ی دۆزەخ) تەنیا بۆ وی دروست كرابێ، هەروەها گوتراوە: ﴿ٱلۡأَتۡقَى﴾، پارێزكارترین، تایبەتیشكراوە بە دەرباز بوونەوە، وەك بەهەشت تەنیا بۆ وی دروست كرابێ، هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست لە: ﴿ٱلۡأَشۡقَى﴾، پیاوە كافرە مەزنەكە ئەبوو جەهل، یاخود ئومەییەی كوڕی خەڵەفەو، مەبەستیش لە: ﴿ٱلۡأَتۡقَى﴾، پارێزكارترین ئەبوو بەكری صیددیقە.

٤- (الشَّوكاني) لە (فَتْح القَدير)ەكەی خۆیدا،[1] دەڵێ:

{وَالأَوْلَى حَمْلُ الأَشْقَى وَالأَتْقَى عَلَى كُلِّ مُتَّصِفٍ بِالصِّفَتَيْنِ المَذْكُورَتَيْنِ، وَيَكونُ المَعْنَى أَنَّهُ لاَ يَصْلاَهَا صَلْياً تَامّاً إلاَّ الكَامِلَ فِي الشَّقَاءِ، وَهُوَ الكافِر، وَلاَ يُجَنَّبُها وَيُبْعَدُ عَنْهَا تَبْعِيداً كَامِلاً إلاَّ الكَامِلَ فِي التَّقْوَى}.

---

(١) بەرگی (٥) لاپەڕە (٥٥٦).

ئەمیش وەڵامێکی چاکە، بە عەقڵ و دڵەوە دەنووسێ، دەڵێ:

باشتر وایە وشەی: ﴿ٱلۡأَشۡقَى﴾ و ﴿ٱلۡأَتۡقَى﴾، مانا بکرێن بە دوو کەسێك کە ئەو دوو سیفەتەیان لە خۆیان دا هێناونە دی و، مانایەکەی ئاوا لێ دێتەوە: بە شێوەی تایبەت و تەواو بەو ئاگرە ناسووتێنرێ، مەگەر کەسێك لە خراپەکارییدا تەواو بووبێ، کە بریتیە لە بابای بێبڕوا، لێشی وەدوورناخرێ بە لێوە دوورخستنێکی تەواو، مەگەر کەسێك لە پارێزکارییدا تەواوی کردبێ.

کەواتە: (لايَصلاها)، واتە: پێی ناسووتێنرێ بەپێی سووتاندێکی تێرو تەواو، مەگەر کەسێك لە خراپەکارییدا تەواوی کردبێ کە بابای بێبڕوایە، بەتەواوییش لێی وەدوورناخرێ، لێوە دوورخستنێکی تێرو تەواو، کە هیچ لەو ئاگرەی نەگاتێ، مەگەر کەسێك کە لە پارێزکارییدا، تەواوی کردبێ، بۆیە دەگونجێ بە شێوەیەکی ناتەواو بسووتێنرێ بەو ئاگرە، کەسێك کە: بەدبەختترین ﴿ٱلۡأَشۡقَى﴾ش نەبێ و، هەر بەدبەخت و خراپەکار (شَقي) بێ، هەروەها دەشگونجێ دیسان لێی وەدوورنەخرێ لەو ئاگرە، کەسێك کە پارێزکارترین ﴿ٱلۡأَتۡقَى﴾ نەبێ، بەڵکو بەس پارێزکار (تَقي) بێ، کە لە هەندێك شت خۆی پاراستوە، بەڵام لە هەندێك شت خۆی نەپاراستوە، ئنجا بە ئەندازەی خۆ نەپاراستنەکەی، بەو ئاگرە سزا دەدرێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری خۆی ئێمەش بپارێزێ لەوەی خۆمان گرفتار بکەین بەو سیفەتە خراپەوانەوە، کە بەرەو دۆزەخمان دەبەن و، تەوفیق و یارمەتییمان بدات کە خۆمان بڕازێنینەوە بەو سیفەتە بەرزو چاکانەی، بەرەو بەهەشت و پاداشتی هەرە باشی خوای پەروەردگارمان دەبەن.

لێرەش کۆتایی بە تەفسیری سووڕەتی (الليل) دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ (١١)ی مانگـی (**ذي الحِجَّة**)یـە، {مانگـی (١٢)ی} سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی، بەرانبـەر (١)ی ئـاب، {مانگـی (٨)ی} سـاڵی (٢٠٢٠) زایینـی، لە شـاری دێرینی هەولێر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الضحى**)، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، لـە حـەوت بڕگـەدا، دەخەینـە ڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الضحى)و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە بـە سـوورەتی (**الضُّحـى**) نـاسراوە، بـەڵام لـە (**صحيـح البخـاري**)دا، ناوەکـەی بـە سـوورەتی (وَٱلضُّحَىٰ)، هاتـوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بـە یەکدەنگیـی زانایـان ئـەم سـوورەتە لـە مەککـە دابەزیـوە، لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە هەیـە:

**{عَـنْ عَبْـدِ اللـهِ بـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورةُ الضُّحَـى بِمَكَّـة} (ذكـره السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٨، ص٥٣٩، ونسـبه لابـن الضريـس والنحـاس وابـن مردويـه والبيهقـي).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، گوتوویەتـی: سـوورەتی ﴿وَٱلضُّحَىٰ﴾، لـە شـاری مەککـە دابەزیوە.

### سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لە ڕیزبەندیی موصحەف دا ژمارەکەی: (٩٣)یەو، لە دابەزینیشدا ژمارە (١١) یان بۆ داناوە، ئەم سوورەتە سەرەتای سوورەتەکانی: (**قِصارُ المُفَصَّل**)ە، ئەمەش زاراوەیەکەو، زانایان چەند زاراوەیەکیان بۆ سوورەتەکانی قورئان لە ڕووی قەبارەیانەوە بەکارهێناون، وەك: (**السَّبْعُ الطّوال**)، ئنجا (**المِئِين**)، دوایی (**المُفَصَّل**)، دوایی (**قِصارُ المُفَصَّل**)، واتە: سوورەتە کورتەکان، ئەم سوورەتە موبارەکە، پێش سوورەتی (**الإنشراح**)و، دوای سوورەتی (**الفَجر**) دابەزیوە.

### چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە یازدە (١١)یە، بەیەکدەنگیی هەموو ژمێرەرانی قورئان.

### پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە خوا ﷻ لە سەرەتایەکەیەوە سوێندی خواردوە بە: چێشتەنگاوو بە شەوگار، کە دادەپۆشێ، یاخود دادەسەکنێ، کە پەروەردگاری موحەممەد ﷺ وەك هاوبەشدانەرەکان لافیان لێدەدات و بانگەشەیان دەکرد، وازی لێ نەهێناوەو لێی زویر نەبووە، بەڵکو لە داهاتوودا، هەتا موحەممەد ڕازی دەبێ، خوا پاداشتی پێ دەدات، یاخود لە دنیادا خوا سەرکەوتن و پێشکەوتنی بۆ دەڕەخسێنێ و، لە دواڕۆژیشدا پاداشتی پێ دەدات، دواییش خوا بیری دەخاتەوە، کە کاتی خۆی هەتیو بووەو خوا پەنای داوەو، گومڕا بووەو خوا ڕێنمایی کردوەو، ئاتاج بووەو خوا بێ نیازی کردوە، بۆیەش فەرمانی پێدەکات، کە ستەم لە هەتیو نەکات و، لە سواڵکەر تووڕە نەبێ و، یادی چاکەی خوا بکاتەوەو باسی بکات.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئـەم سـوورەتە تێیـدا باسـی ژمارەیەك لـە تایبەتمەندییەکانـی پێغەمبـەر موحەممەد ﷺ کـراوە، کـە تەنیـا لـەم سـوورەتەدا هاتـوون، ئەوانیـش پێنج شـتن:

١- سوێند خواردنی خوا بە چێشتەنگاو و بە شەوی هێمن، کە پەروەردگارت وازی لێ نەهێناوی و لێشت تووڕە نەبووە، ئەمە لە ئایەتەکانی: (١ و ٢ و ٣)دا هاتوە.

٢- دواڕۆژ لە دنیا بۆ تۆ باشترە، لە ئایەتی (٤)دا.

٣- خوا هێندەت دەداتێ لە دنیاو لە دواڕۆژدا، هەتا ڕازیی دەبی، لە ئایەتی (٥)دا.

٤- باسی هەتیویی و نەشارەزایی و نەداریی موحەممەد ﷺ و، گۆڕینیان بە حەوێنرانەوەی و، ڕێنماییکرانی و، بێنیازکرانی، لە ئایەتەکانی: (٦ و ٧ و ٨) دا.

٥- فەرمان پێکردنی لە بارەی هەتیوو هەژارو باسی چاکەی خوا کردنەوە، لە ئایەتەکانی: (٩ و ١٠ و ١١)دا.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمـە کـۆی یـازدە (١١) ئایەتەکـەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەکەینـەوە بـۆ یـەك دەرس.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە كـۆی یـازده (١١) ئایەتەكـەی ئـەم سـوورەتە موبارەكـە دەگرێتـەوە، كـە وەك گوتمـان خـوا ﷻ لـەم سـوورەتە موبارەكـەدا، سـەرەتا سـوێند دەخـوا بـە دوو شـتان:

**یەكەم:** بە چێشتەنگاو، یاخود بە تیشكی خۆر: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴾ بە چێشتەنگاو دەگوترێ، كە خۆر لە چاوی مرۆڤدا بە ئەندازەی ڕمێك بەرز دەبێتەوە لە ئاسۆی خۆرهەڵاتەوە، هەروەها ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴾، بە تیشكی خۆریش دەگوترێ.

**دووەم:** ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴾، سوێند بە شەوگاریش كاتێك ئارام و، هێمن دەبێ، كاتێك سەقامگیر دەبێ، یاخود كاتێك دادەپۆشێ، ئەو واتایانەی هەموو بۆ دانراون.

خـوا سـوێند بـەو دوو شـتانە دەخـوات، لەسـەرچی؟ ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ٣ ﴾، ئەمـە وەڵامـی سـوێندەكەیە، پـەروەردگارت خواحافیزیـی لـە تـۆ نەكـردوە و، تـۆی بەجێنەهێشـتوە، ﴿ وَمَا قَلَىٰ ﴾، یانـی: (وَمَـا قَـلاَكَ)، تۆشـی نەبوغزانـدوەو لێـت زویـر و تـووڕە نیـە، ﴿ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ﴾، مەنزڵـگای كۆتاییـش بـۆ تـۆ لـە مەنزڵـگای یەكـەم كـە دنیایـە باشـترە.

ئنجـا خـوا بەڵێنـی پێـدەدا، كـە لەمـەودوا هێنـدەی پێـدەدا لـە بەخششـی خـۆی، لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا تاكـو ڕازی دەبـێ ﴿ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴾، ئەمـەش بـە ڕاسـتیی موژدەیەكـی یەكجـار خۆشـبووە بـۆ سـەر دڵـی موبارەكـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، كـە خـوا هێنـدەی پێـدەدات تاكـو ڕازی دەبـێ، نەشـیفەرمووە: لـە دنیـا یـان لـە دواڕۆژدا، بۆیـە هـەم دنیـا دەگرێتـەوە، هـەم دواڕۆژ دەگرێتـەوە، یانی: هـەم لـە دنیـادا سـەركەوتنی بـۆ دەڕەخسـێنێ و، كاری خێـری بـۆ دەڕەخسـێنێ، چاكـەی بـۆ دەڕەخسـێنێ، تاكـو ڕازی دەبـێ، هـەم لـە ڕۆژی دواییشـدا، هێنـدەی پاداشـت دەداتـێ تاكـو ڕازی دەبـێ.

ئنجا خوا ﷻ سێ لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی دەخاتەوە یادی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ: ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ﴾، ئایا خوا تۆی بە هەتیوو لێ هەڵنەکەوت، پەنای دای؟ ﴿ يَجِدْكَ ﴾، یانی: (أَلَمْ يُصَادِفْكَ) ئایا خوا تۆی بەهەتیو لێ هەڵنەکەوت، ئایا تۆ بێ باب نەبووی؟ بەڵکو بێ دایکیش بووی، (فَآوَى) تۆی حەواندەوە، تۆی پەنادا، پەنایەکی بۆ ڕەخساندی، ﴿ وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَىٰ ﴾، هەروەها ئایا خوا تۆی گومڕا نەبینی، بەڵام ڕێنماییکردی، (ضَلال) لێرەدا بە مانای نەزانینی هیدایەتی خوایە، نەك بە مانای کوفرو شیرك و تاوان و لادان بێت، نەخێر، ئایا خوا تۆی لێ هەڵنەکەوت کە بەڕێت نەدەزانی، ﴿ فَهَدَىٰ ﴾، یانی: (فَهَدَاكَ)، بەڵام تۆی ڕێنماییکردو خستیەتە سەر ڕێی ڕاست؟

ئنجا: ﴿ وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَىٰ ﴾، ئایا خوا تۆی بە نەدارو ئاتاج لێ هەڵنکەوت، بێ نیازی کردی، تۆ نەدارو ئاتاج بووی، بەڵام خوا تۆی بێ نیاز کرد، بە تایبەت بە هۆی هاوسەرگیرییت لەگەڵ خەدیجەوە (خوا لێی ڕازی بێ)؟ ئنجا مادام خوا ﷻ بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ تۆدا کردوە، ﴿ فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴾، تۆش منداڵی بێباب، چ کوڕ بێ، چ کچ بێ، ستەمی لێ مەکە، لێی تووڕە مەبە، مەیچەوسێنەوە، ﴿ وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴾ بابای سواڵکەریش کە داوات لێ دەکات، لێی تووڕە مەبە، تێوەی مەخوڕە، ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾ چاکەی پەروەردگاریشت باس بکەو، یادی بکەو، بیخەڕوو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَالضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴿٩﴾ وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾

## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە . سوێند بە چێشتەنگاو ﴿١﴾ سوێند بە شەویش کاتێك (تاریك داهات و) هێمن بوو ﴿٢﴾ پەروەردگارت وازی لێ نەهێناوی و لێشت نیگەران نەبووە (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿٣﴾ (مەنزڵگای) کۆتاییش بۆ تۆ لە (مەنزڵگای) یەکەم (ژیانی دنیا) باشترە ﴿٤﴾ بە دڵنیاییش بەمزووانە خوا (لە چاکەکانی خۆی) پێت دەبەخشێ، ئنجا ڕازی دەبی ﴿٥﴾ ئایا (خوا) تۆی هەتیو لێ هەڵنەکەوت، ئنجا پەنای دای و حەواندیەوە؟ ﴿٦﴾ هەروەها ئاتاجی بینی و بێنیازی کردی؟ ﴿٧﴾ هەروەها گومڕای بینی و ڕێنمایی کردی؟ ﴿٨﴾ ئنجا تۆش ستەم لە هەتیو مەکە (و مەیڕەنجێنە) ﴿٩﴾ هەروەها لە سواڵکەریشەوە مەخوڕە (و مەیڕەتێنە) ﴿١٠﴾ چاکەی پەروەردگاریشت باس بکە ﴿١١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلضُّحَىٰ): (**الضُّحى: إنْبِسَاطُ الشَّمْسِ وَامْتِدَادُ النَّهَارِ، وَسُمِّيَ الوَقْتُ بِهِ**)، (**ضُحَى**): بریتیە لە بڵاوبوونەوەی خۆر و درێژبوونەوەی ڕۆژگار، کاتێکی دیارییکراویش بە (**ضحى**) ناونراوە، کە بریتیە لە کاتی چێشتەنگاو، کاتێك خۆر لە چاوی مرۆڤدا بە ئەندازەی ڕمێك، لە کاتی هەڵهاتنیدا، لە ئاسۆی خۆرهەڵات، بەرزدەبێتەوە.

(سَجَىٰ): (**سَجَى البَحْرُ سَجْواً أَيْ: سَكَنَ، سَكَنَتْ أَمْواجُهُ، وَمِنْهُ اسْتُعِيرَ تَسْجِيَةُ المَيِّتِ**)، (سَجَىٰ)، بە مانای (**سَكَن**)، واتە: هێمن بوو، ئارام بوو، دەگوترێ: (**سَجَى البَحْرُ سَجْواً**) واتە: دەریایەکە شەپۆلەکانی ئارام و هێمن بوون، ئاڵۆز نەبوون، دوایی لەو وشەیەوە داپۆشینی مردوو (**تَسْجِيَةُ المَيِّت**) خوازراوەتەوە، مردوو کە دەمرێ، پۆشاکێکی بەسەر هەڵدەکێشن و جەنازەکەی دادەپۆشن.

(**مَا وَدَّعَكَ**): (**الدَّعَةُ: الخَفْضُ يُقالُ: وَدَّعْتُ كَذا أَدَعُهُ وَدْعاً، نَحْوَ تَرَكْتُهُ وادِعاً، وَالتَّودِيعُ أَصْلُهُ الدُّعَاءُ أَنْ تَدْعُوَ لِلْمُسافِرِ بِالدَّعَةِ**)، وشەی: (**دَعَة**): بە مانای (**خَفْض**) ە، واتە: ژیانێکی نەرم و خۆش، دەگوترێ: (**وَدَعْتُ كَذا أَدَعَهُ وَدْعاً**)، فڵان شتەم واز لێهێنا، وازی لێ دەهێنم بە واز لێهێنان، (**نَحْوَ تَرَكْتُهُ وادِعاً**)، واتە: وازم لێهێناو بە هێمنیی لێی گەڕام، (**وَالتَّودِيعُ أَصْلُهُ الدُّعَاءُ أَنْ تَدْعُوَ لِلْمُسافِرِ بِالدَّعَةِ**) (**تَوْدِيع**): لە ئەسڵدا ئەوەیە کە بۆ بابای ڕێبوار بپاڕێیەوە، خوا ژیانی خۆشی بە نسیب بکات لەو سەفەرەیدا تووشی گرفت و کێشەو کۆسپ و تەگەرە نەبێت.

(**وَمَا قَلَى**): (**القِلَى: شِدَّةُ البُغْضِ، يُقالُ: قَلاَهُ يَقْلِيهِ وَيَقْلُوهُ**)، (**قِلَى**): بریتییە لە زۆر ڕق لێ هەڵسان، دەگوترێ: (**قَلاَهُ يَقْليهِ وَيَقْلُوهُ**)، ڕقی لێ هەڵسا، ڕقی لێ هەڵدەستێ، هەم بە (**يَقْليهِ**)، هەم بە (**يَقْلُوهُ**)، هەردووکیان هاتوون، واتە: ڕقی لێ هەڵدەستێ.

(**فَـَٔاوَىٰ**): (**أَوَى إِلى كَذَا: انْضَمَّ إِلَيْهِ يَأْوي أُوِيّاً وَمَأْوَى، وَآوَاهُ غَيْرُهُ يُؤْوِيهِ إِيوَاءً**)، (**أَوى**) پەنای بۆ فڵان شتە برد، چووە تەنیشتی (**يَأْوي**) پەنای پێ دەبا (**أُوِيّا وَمَأْوَى**) هەردووکیان چاوگن، (**وَآوَاهُ غَيْرُهُ**) واتە: جگە لە خۆی ئەوی پەنادا (**يُؤْويهِ إِيوَاءً**) دەیحەوێنێتەوە، یان پەنای دەدا بە پەنادان.

(**ضَآلًّا**): (**الضَّلاَلُ: العُدولُ عَنِ الصِّرَاطِ المُسْتَقيم، وَيُضَادُّهُ الهِدَايَةُ، أَيْ: غَيْرُ مُهْتَدٍ لِما سِيقَ إِلَيْكَ مِنَ النُّبُوَّةِ**)، (**ضَلال**): لادانە لە ڕێی ڕاست، پێچەوانەکەی بریتییە لە هیدایەت واتە: بەڕێی ڕاست زانین، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴾، واتە: تۆی لێ هەڵکەوت کە بەڕێت نەدەزانی.

یاخود: (**غَيْرُ مُهْتَدٍ لِما سِيقَ إِلَيْكَ مِنَ النُّبُوَّةِ**)، ئەوەی دوایی بەهۆی پێغەمبەرایەتییەوە بۆت هێنرا، دەتزانی.

مەبەست ئەوەیە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە خوا لێرەدا بە (**ضال**) پێناسەی دەکات، وەك دوایی باس دەکەین، پێویست بەو هەموو پینەو پەڕۆیانە ناکات،

کـە بەشـێك لـە ڕوونکەرەوانـی قوڕئـان کردوویانـە، چونکـە حاڵەتـی گومڕابوونـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ واتـە: بەڕێـی ڕاسـتی نەزانیـوە، نـەك بـەو واتایـەی هەڵگـری کوفـرو شـیرك بووبـێ، چونکـە ناسـینی خـواو، خواناسـین، شـتێکی ڕیشـەدارە لـە نـاخ و زگماکـی هەمـوو مرۆڤەکانـدا، پێغەمبـەران و جگـە لـە پێغەمبـەران، بۆیـە پێویسـت نـاکات ئـەو گومانانـە بـبردرێ، پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ وەك دوایـی باسـی دەکەیـن، خـوا پارسـتوویەتی پێـش پێغەمبەرایەتیـش لـە شـتی ناشـیرین، وەك پێغەمبەرانـی دیکەشـی پاراسـتوون، بەڵکـو جـاری وایـە خـوا جگـە لـە پێغەمبەرانیـش دەپارێـزێ لـە کاتێکیـدا کـە شـارەزاش نیـن، بـەڵام خـوا لـە شـتی ناشـیرین و ناڕێـك دەیانپارێـزێ، چ جـای پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، سـەروەری پێغەمبـەران و باشـترین ئینسـان و چاکترینـی بەندەکانـی خـوا ﷻ.

(**عَآئِلًا**): (**أَيْ: أَزَالَ عَنْـكَ فَقْـرَ النَّفْـسِ وَجَعَـلَ لَـكَ الغِنَـى الأَكْبَرْ، وَعَـالَ أَي: افْتَقَـرَ فَهُـوَ عَائِـلٌ**)، خـوا هەژاریـی نەفسـیی لـە تـۆ دوورخسـتەوەو بێنیازیـی گـەورەی بـە تـۆ بەخشـیی، کـە لەدڵـدا دەوڵەمەندبـی.

(**عَـال**)، یانـی: ئاتـاج و نـەدار بـوو، (**فَهُـوَ عَائِـلٌ**) ئـەو نـەدارە، (**عائِـل**)، کەسـێکە کەسـانێکی دیکـەی بـە ئەسـتۆوە بـن، بەخێویـان بـکات و، مەسرەفیـانی بـۆ نەکێشرێ، لـەوەوە هەمـوو هـەژارو نەدارێـك نـاوی لێنراوە: (**عائِـل**).

(**فَأَغْنَىٰ**): (**أَغْنَـى عَـنْ كَـذَا أَيْ: كَفَـاهُ**)، واتـە: تـۆی بێنیـاز کـرد، خـوا ﷻ کەلێنـی ئاتاجیـی و نەداریـی لـە تـۆدا نەهێشـت.

(**فَلَا تَقْهَرْ**): (**القَهْـرُ: الغَلَبَـةُ وَالتَّذْلِيـلُ مَعَـاً**)، (**القَهْرُ**): بریتیە لـە زاڵبوون و زەبوونکردن پێکـەوە، (**وَيُسْـتَعْمَلُ فِي كُلِّ وَاحِـدٍ مِنْهُـمَا**)، لـە هـەر کامێکیشـیاندا بەکاردەهێنرێ، هـەم لـە بەسـەردا زاڵبوونـدا، هـەم لـە زەبـوون کردنـدا، واتـە: کـە لەگـەڵ هەتیـودا مامەڵـە دەکـەی، وای مامەڵـە لەگەڵـدا مەکـە، بەسـەریدا زاڵبـی و زەبوونـی بکـەی.

(وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ): (تَنْهَـرْ: النَّهْـرُ وَالإِنْتِهَـارُ: الزَّجْـرُ بِمُغَالَظَـةٍ، نَهَـرَهُ وانْتَهَـرَهُ)، (نَهْـر وَانْتِهـار)، هەردووكیـان، یانـی: تێوەخوڕیـن بـە زبریـی لـە كەسـێكەوە، (انْتَهَـرَهُ)، مانایەكـەی بەهێزتـرە لـە (نَهَـرَهُ)، چونكـە پیتەكانـی زیاتـرن و مانایەكەشـی بەهێزتـرە.

(فَحَدِّثْ): یانـی: (أُذْكـر) بـاس بكـە (التَّحدیـثُ: الإِخْبـارُ)، (تَحدیـثٌ): بـە مانـای هـەواڵ پێـدان (أَيْ أَخْـبِرْ بِمَـا أَنْعَـمَ اللـهُ عَلَیْـكَ اعْتِرَافـاً بِفَضْلِـهِ وَذلِـكَ مِـنَ الشُّـكْر)، ئـەوەی خـوا ﷻ پێیـداوی، باسـی بكـە، وەك دان پێداهێنـان بەچاكـەی ئـەودا، ئـەوەش بەشـێكە لـە سوپاسـگوزاریی بـۆ خـوا.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

لەوبارەوە چەند ڕیوایەتێك هاتوون:

١- {عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: احْتَبَسَ جِبْرِيلُ «عَلَيْهِ السَّلاَمَ» عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ امْرَأَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ: أَبْطَأَ عَلَيْهِ شَيْطَانُهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ ﴾}. رواه البخاري: ٤٩٨٣، و مسلم: ١٧٩٧.

واتـە: جونـدوبی كـوڕی عەبدوڵـڵا (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: جیبریـل «علیـه السـلام» ماوەیـەك لـە پێغەمبـەر ﷺ دواكـەوت، نەهـات بـۆ لای، ئافرەتێـك لـە هـۆزی قوڕەیـش گوتـی: شـەیتانەكەی لێـی دواكەوتـوە، نەهاتـوە بـۆ لای، خـوا ﷻ لـەو بـارەوە ئـەم ئایەتـە موبارەكانـەی دابەزانـدن.

٢- {عَنْ جُنْدُب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: أَبْطَأَ جِبْرِيلُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: الْمُشْرِكُونَ قَدْ وُدِّعَ مُحَمَّدٌ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ ﴾ } أخرجه الطبري في جامع البيان ٣٠١/ ١٣٨.

واتـە: جونـدوب (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: جیبریـل سـەلامی خـوای لێبـێ ماوەیـەك پێیوەخـرا، نەهـات بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ، هاوبـەش بـۆ خـوا

دانــەرەکان، گوتیــان: موحەممــەد وازی لێهێــنراوە، خــوا عزوجـل ئەمــەی دابەزانــد: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ ﴾.

**٣- {عَنْ جُنْدُب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، يَقُولُ اشْتَكَى النَّبِيُّ ﷺ فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَةً أَوْ لَيْلَتَيْنِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا مُحَمَّدُ مَا أُرَى شَيْطَانَكَ إِلَّا قَدْ تَرَكَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى)}.** الطبراني: ١٧٠٩.

واتــە: جونـدوب (خــوا لێــی ڕازی بــێ) دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ نەخــۆش بــوو، شــەوێك یــان دوو شــەوان، هەڵنەســتا بــۆ پەرســتش و نوێــژ، ئافرەتێــك هــات بــۆ لای، گوتــی: ئــەی موحەممــەد پێــم وایــە شــەیتانەکەت وازی لــێ هێنــاوی، خــوا عــز وجـل ســەرەتای ئــەم ســوورەتە موبارەکــەی دابەزانــد.

**٤- {عَنْ جُنْدُبٍ الْبَجَلِيِّ رضي الله عنه، قَالَ كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَارٍ فَدَمِيَتْ أُصْبُعُهُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ هَلْ أَنْتِ إِلَّا إِصْبَعٌ دَمِيتِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ، قَالَ: وَأَبْطَأَ عَلَيْهِ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام، فَقَالَ: الْمُشْرِكُونَ قَدْ وُدِّعَ مُحَمَّدٌ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى}**[1]. أخرجه الترمذي: ٣٣٤٥ وقال: حديث حسن صحيح.

واتــە: جوندوبــی بەجەلیــی (خــوا لێــی ڕازی بــێ) دەڵــێ: لــە خزمــەت پێغەمبــەردا بــووم ﷺ لــە ئەشــکەوتێکدا پەنجەیەکــی برینداربــوو، (ئایــا بەبــن بەردێــك کەوتــوە، یــان بەردێکــی پــێ کەوتــوە)، پێغەمبەریــش ﷺ تەماشــای پەنجــەی خــۆی کــردو فەرمــووی: ئایــا تــۆ تەنیــا پەنجەیــەك نــی کــە خوێنــت پێداهاتــوە لــە پێنــاوی خــوادا، ئــەوەی تووشــت بــووە، بەســەرت هاتــوە! ئنجــا جیبریلــش ماوەیــەك لێــی دواکــەوت و نەهــات بــۆ لای، هاوبــەش بــۆ خــوا دانــەرەکان گوتیــان: موحەممــەد ﷺ وازای لێهێــنراوە، خــواش ﷻ ئــەم ئایەتــە موبارەکــەی دابەزانــد: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴾.

---

(١) ئەم چوار گێردراوەیە لە (الإستيعاب فِي بيان الأسباب: ج ٣، ص٥٢٠ و ٥٢١)دا هاتوون.

ئەم چوار گێڕدراوەیە هەر چواریان ڕاست و دروستن لە ڕووی سەنەدەوە.

٥- ئنجا با لەو بارەوە چەند دەقێکی دیکەش بێنین:

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: عُرِضَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ مَا هُوَ مَفْتُوحٌ عَلَى أُمَّتِهِ مِنْ بَعْدِهِ كَفْراً كَفْراً، فَسُرَّ بِذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ٥ ﴾ فَأَعْطَاهُ فِي الجَنَّةِ أَلْفَ قَصْرٍ، فِي كُلِّ قَصْرٍ، مَا يَنْبَغِي مِنَ الوِلْدَانِ وَالخَدَمِ} (أخرجه الطبري: ج٣٠ ص ٤٤٩، وابن أبي حاتم، وابن كثير في تفسير القرآن العظيم ج٤ ص ٥٥٨، والطبراني في المعجم الكبير: ١٠٦٥٠، والحاكم في المستدرك ج٢ ص ٦٦٤، والبيهقي في دلائل النبوة: ج٧، ص ٦١، والواحدي في أسباب النزول ص٣٠٢، والوسيط ج٤ ص ٥٠٩، وأبو نعيم في حلية الأولياء ج٣ ص ١١٢، قال مؤلِّفا الإستيعاب في بيان الأسباب: قلنا هذا حديث صحيح رجاله ثقات).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄، دەڵێ: پێشانی پێغەمبەری خوا ﷺ درا ئەوەی لە دوای خۆی ئۆممەتەکەی پێی دەگات، شوێن شوێن پێشانی دران، ئەویش زۆر بەوە دڵخۆش بوو، ئنجا خوا عزوجل ئەم ئایەتە موبارەکەی دابەزاند: ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾، لەمەودوا پەروەردگارت هێندەت پێدەدا، تاکو ڕازی دەبی، ئنجا لە بەهەشتدا هەزار کۆشکی پێدا، لە هەر کۆشکێکدا ئەوەی تێدایە کە پێویستە تێیدا بێ، لەو لاوانەی خزمەت دەکەن، لە خزمەتکاران و، لەو نازو نیعمەتانەی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دانراون.

٦- هەر لەو بارەوە ئەم گێڕدراوەیەش دێنین، کە گێڕدراوەیەکی (مُرْسَل)ەو، سەنەدەکەی وەك هی ئەوانەی پێشێ بەهێز نیە، بەڵام هەندێك وردەکاریی زیاتر دەگرێتە خۆی:

{عَنْ زَيدِ بْنِ أَرْقَم رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ٢ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ٣ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ٤ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ٥ ﴾، قَال فَقِيلَ لامْرَأَةِ أَبِي لَهَبٍ: إِنَّ مُحَمَّداً قَدْ هَجَاكِ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَهُوَ جَالِسٌ فِي المَلأِ فَقَالَتْ: يَا

مُحَمَّدُ عَلى ما تَهْجُونِي؟ قَال فَقَالَ: إِنِّي وَاللهِ مَا هَجَوْتُكِ مَا هَجَاكِ إِلاَّ اللهَ، قَالَ: فَقَالَتْ: هَلْ رَأَيْتَنِي أَحْمِلُ حَطَباً أَوْ رَأَيْتُ فِي جِيدِي حَبْلاً مِنْ مَسَدٍ؟ ثُمَّ انْطَلَقَتْ فَمَكَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَيَّاماً لاَ يَنْزِلُ عَلَيْهِ، فَأَتَتْهُ، فَقَالَتْ: يَا مُحَمَّد! مَا أَرَى صَاحِبَكَ إِلاَّ وَقَدْ وَدَّعَكَ وَقَلاَكَ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣﴾} (أخرجه الحاكم: ج٢، ص٥٢٦، قال مؤلفا الإستيعاب: قلنا وهذا إسناد ضعيف، وقال الحاكم: هذا إسناد صحيح).

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هاتووە، دوای ئەوەی سووڕەتی: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ۝٣ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ۝٤ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۢ ۝٥﴾، بۆ پێغەمبەری خاتەم دابەزی ﷺ، بە خێزانی ئەبوو لەهەب گوترا، {کە ناوی (ئوممو جەمیل) بووە}: موحەممەد هێرشی کردۆتە سەرت، قسەی پێگوتووی، ئەویش هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە حاڵێکدا دانیشتبوو لەگەڵ کۆمەڵێکدا، لە کەسانی قسە بەدەست و قسە ڕۆیشتوو، گوتی: ئەی موحەممەد! بۆچی هێرشم دەکەیە سەر؟ ئەویش فەرمووی: سوێند بەخوا من هێرشم نەکردۆتە سەرت، تەنیا خوا ﷻ هێرشی کردۆتە سەرت، ئنجا خێزانی ئەبوو لەهەب گوتی: ئایا بینیوتە کۆڵەدار هەڵبگرم، یاخود بینیوتە پەتێکی هۆندراوەم لە گەردندا بێ، (وەك ئایەتەکە دەفەرموێ؟) دوایی ڕۆیشت، پێغەمبەری خواش ﷺ چەند ڕۆژێك مایەوە، قورئانی بۆ دانەبەزی، ئەو ئافرەتەش جارێکی دیکە هاتەوە بۆ لای، گوتی: ئەی موحەممەد! وا هەست دەکەم هاوەڵەکەت وازی لێ هێنابێ و لێت نیگەران بووبێ، ئیدی خوا عز وجل ئەم سووڕەتەی دابەزاند، بە تایبەت هەرسێ ئایەتی: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣﴾.

وەك پێشتریش گوتم، لە ڕووی سەنەدەوە بەڵێ زانایان گرفتێکیان لە سەنەدەکەیدا هەیە، بەڵام مانایەکەی هەروەك مانای گێڕدراوەکانی پێشییە.

٧- کۆتا دەق کە لەوبارەوە دەیهێنین:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: سَأَلْتُ رَبِّي شَيْئاً وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ سَأَلْتُهُ، قُلْتُ: يَا رَبِّ كُلُّ الأَنْبِياءِ أُعطوا أشياء فَذُكِرَ سُلَيْمان بِالرِّيح، وَذُكِرَ مُوسى، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ٦﴾} (ذكره السيوطي فِي الدرّ المنثور: ج٨، ص٥٤٤، ونسبه لابن مردويه).**

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شتێکم لە پەروەردگارم داوا کرد، حەزم دەکرد لێم داوا نەکردبایە، گوتم: ئەی پەروەردگار! هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێ، هەریەکەی شتێکیان پێدراوە، دوایی باسی ئەوەی کردوە کە سولەیمان بای بۆ دەستەمۆو ملکەچ کراوە، دوایی باسی موسای کردوە، (وا پێدەچێ باسی پێغەمبەرانی دیکەشی کردبێ)، خواش عز وجل بۆی دابەزاند: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ٦﴾، ئایا تۆش هەتیو نەبووی خوا تۆی پەنادا، هەژار نەبووی (خوا) تۆی دەوڵەمەندو بێنیاز کرد، بە ڕێ نەزان نەبووی خوا تۆی ڕێنمایی کردو بەرچاو ڕوونیی بە تۆدا؟

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا سبحانه وتعالى لەم سوورەتە موبارەکەدا دەفەرمویٚ:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، واتە:

١- خوێندن و تێڕامانی ئەم قورئانە بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە دەست پێدەکەم.

٢- کارەکەم بۆ خوا ئەنجام دەدەم، نەك بۆ جگە لە خوا.

٣- کارەکەم بەپێی بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- کارەکەم بەپێی توانا و وزەیەك كە خوا بۆی ڕەخساندووم ئەنجام دەدەم.

﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴾، سوێند بە (ضُحى)، ئەم وشەیە بە تیشكی خۆر دەگوترێ و، بە چێشتەنگاویش، ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴾ سوێند بە شەوگار كاتێك كە ئارام دەبێ، هێمن دەبێ، یاخود كاتێك دادەپۆشێ، ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴾، پەروەردگارت نە وازی لێت هێناوە، نە لێشت نیگەرانەو لێشت زویر بووە، ﴿ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ﴾، بەدڵنیایی كۆتایی، (مەنزڵگاو پێگەو پاداشتی كۆتایی) بۆ تۆ لە هی یەكەم باشترە، واتە: لە دنیاشدا خوا ﷻ نازو نیعمەتت پێدەدا، نازو نیعمەتی مەعنەویی و، بۆت دەڕەخسێنێ، سەركەوتن لە دوای سەركەوتن، بەڵام ژیانی دواڕۆژو پاداشتی دواڕۆژ بۆ تۆ لە هی دنیا باشترە، ﴿ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴾ بە دڵنیایی پەروەردگارت بە زوویی پێت دەدات، ئنجا ڕازی دەبی، واتە: هەم لە دنیادا پێت دەدا، نیعمەتی مەعنەویی، ئایین و پەیامەكەی كە پێیدا ناردووی بۆت سەقامگیرو دەستڕۆیشتوو دەكات و بڵاودەكاتەوە، لە دواڕۆژیشدا بە جۆرێ پاداشتت دەداتەوە پێی ڕازی دەبی.

ئنجا خوا ﷻ سێ لە چاكە بنەڕەتییەكانی خۆی دەخاتەوە بیری موحەممەد ﷺو دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ يَجِدۡكَ يَتِيمٗا فَـَٔاوَىٰ ﴾ ئایا (خوا) تۆی هەتیو لێ هەڵنەكەوت، بەڵام حەواندیەوە، یانی: (فَآوَاكَ)، ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلّٗا فَهَدَىٰ ﴾ هەروەها ئایا تۆی گومڕاو بەڕێ نەزان لێ هەڵنەكەوت، بەڵام ڕێنماییكردیی و بەرچاوی ڕۆشن كردیەوە؟ ﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلٗا فَأَغۡنَىٰ ﴾، هەروەها ئایا تۆی هەژارو نەدارو ئاتاج لێ هەڵنەكەوت، بەڵام بێنیازی كردی، سەروەت و سامانی بۆ ڕەخساندی؟ ﴿ فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ ﴾، ئنجا مادام خوا ﷻ هەموو ئەوانەی بۆ تۆ كردوون، تۆش لە منداڵی هەتیوی بێباب تووڕە مەبە، مەیچەوسێنەوەو، ستەمی لێ مەكە، ﴿ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ ﴾ لە سواڵكەرو داواكەریش مەخوڕەو سەرزەنشتی مەكەو، دەری مەكە، ﴿ وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ ﴾، چاكەی پەروەردگاریشت باس بكە، یاخود: یادی بكە.

هەڵبەتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لەگەڵ هەتیوو منداڵی بێبابدا، زۆر بە لوتف و میهرەبان بووە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَقْهَرْ ﴾، ئەوە توانج تێگرتنی ئەوانەیە کە ستەم لە هەتیو دەکەن، واتە: تۆ وەك کەسانێك مەبە کە ستەم لە هەتیو دەکەن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەرگیز لە سواڵکەرو ئاتاج تووڕە نەبووەو، سەرزەنشتی نەکردوەو دەری نەکردوەو، بەڵام دیسان ئەوەش توانج گرتنە لە کەسانێك کە بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ سواڵکەرو داواکاردا دەکەن، یانی: تۆ وەك وان مەکە.

﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾ چاکەی پەروەردگاریشت یاد بکە، یاخود باسی بکە، یادکردنەوەی لەبیر بوونیەتی و باسکردنەکەشی ئەوەیە کە ئەو ئایین و پەیام و بەرنامەیە خوا پێیدا ناردوە بڵاوی بکاتەوەو، ڕایبگەیەنێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنـی خـوا سبحانه و تعالـی بـە چێشـتەنگاوو بـە شـەوگاری هێمـن و داپۆشـەرو، جموجـۆڵ تێـدا وەسـتاو، کـە پێغەمبـەری خـۆی واز لـێ نەهێنـاوەو، لێـی قەڵـس نەبـووە، مەنزڵـگاو پێگـەی دوارۆژیشـی لـە هـی دنیـای باشـترەو، هێندەشـی پـێ دەبەخشـێ تاکـو ڕازی دەبـێ:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴿٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا

١)- ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴾ خوای پەروەردگار دوای: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، سوێند دەخوات بە (ضُحى)، پێی (و)، لێرەدا بۆ سوێند پێخواردنە، لە زمانی عەرەبییدا سێ پیت هەن سوێندیان پێ دەخورێ، (و، ب، ت)، (وَالله، بِالله، تَالله)، لێرە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴾، سوێند بە (ضُحى)، (ضُحى)ش زانایان بە چەند واتایەك تەفسیریان کردوە:

**یەکەم:** (**صَدْرُ النَّهَارِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ وَتُلْقِي شُعَاعَهَا**)، سەرەتای ڕۆژ کاتێك خۆر بەرز دەبێتەوەو، تیشکەکەی دەهاوێ.

**دووەم:** (**النَّهَارُ كُلُّهُ بِدَلِيلِ جَعْلِهِ فِي مُقَابَلَةِ اللَّيْلِ**): ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: (ضُحى) بە هەموو ڕۆژگار دەگوترێ، بە بەڵگەی ئەوەی لەگەڵ شەوگاردا بەراوردی پێکراوە.

**سێیەم:** کە لە هەموو واتایەکانی باوترە، بریتیە لە چێشتەنگاو، نوێژێکی سوننەت هەیە پێی دەگوترێ: (**صَلاةُ الضُّحى**)، کە لەو کاتەدا دەکرێ، خۆرهەڵدێ و بە ئەندازەی ڕمێك

لە خۆرهەڵاتەوە، لە چاوی مرۆڤدا بەرز دەبێتەوە، هەرچۆنیش بێ: (**ضُحى**) چ مەبەست پێی سەرەتای ڕۆژگار بێ، کە خۆر بەرزدەبێتەوە تاکو لای نیوەڕۆ، چ هەموو ڕۆژگار مەبەست بێ، چ مەبەست کاتی چێشتەنگاوبێ بە تایبەت، گرنگ ئەوەیە خوا سوێندی پێ خواردوە.

**٢)-** ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴾، سوێند بەشەوگار، کاتێك هێمن دەبێ و ئارام دەگرێ، (سجى) ش سێ مانای هەن:

**یەك:** (**أَيْ سَكَنَ، أَوْ رَكَدَ، أَوْ هَدَءَ**) ئەو سێ وشەیەش مانایەکانیان لێك نیزیکن: کاتێك شەوگار سەقامگیر دەبێ، ئارام دەبێ، هێمن دەبێ.

**دوو:** ﴿ سَجَىٰ ﴾: (**أَظْلَمَ**)، ﴿ إِذَا سَجَىٰ ﴾، یانی: (**إِذَا أَظْلَمَ**)، سوێند بە شەوگار کاتێك تاریك دادێ.

سێ: مانای سێیەمی: ﴿ إِذَا سَجَىٰ ﴾: (**إِذَا غَطَّى**) کاتێك دادەپۆشێ، لێرەدا پێویستە ئەوە بزانرێ، کە خوا دەفەرموێ: سوێند بە شەوگار، کە ئارام دەگرێ، هێمن دەبێ، واتە: خەڵکەکەی تێیدا ئارام دەگرن، وەك (**الطَّبَري**)، گوتوویەتی: (**وَاللَّيْلِ إِذَا سَكَنَ بِأَهْلِهِ وَثَبَتَ بِظَلَامِهِ كَمَا يُقَالُ: بَحْرٌ سَاجٍ إِذَا كَانَ سَاكِنَاً**)، واتە: سوێند بەشەوگار کە خەڵکەکە تێیدا ئارام دەگرن و، هێمن دەبن، تاریکییەکەی دەچەسپێ، هەروەك گوتراوەو دەگوترێ: (**بَحْرٌ سَاجٍ**)، واتە: دەریایەکی هێمن و ئارام، کە شەپۆلەکانی بوەستن، کەواتە: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴾ ئەمە لەڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، پێی دەگوترێ: پاڵوەلادانی مەجازیی (**إسنادٌ مجازيٌّ**)، دەگوترێ: (**سَجى، يَسْجو، سَجواً**)، واتە: ئارام و هێمن بوو، بێ دەنگ بوو، بە ئارام بوون و بێدەنگ بوون و هێمن بوون، ئنجا لێرەدا کە خوا (**سَجو**)ی پاڵداوەتە لای شەو، پێی دەگوترێ: پاڵوەلادانێکی مەجازیی، چونکە ئەوانەی هێمن دەبن و ئارام دەگرن لە شەودا، شەوەکە خۆی نیە، بەڵکو خەڵکەکەیە کە لە شەودا بەهۆی تاریکییەکەیەوە ئارام و هێمن و بێ دەنگ دەبن، پشوو دەدەن، دەخەون.

٣)- ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴾، پەروەردگارت نە وازی لە تۆ هێناوە، نە لێشت زویر بووە، ﴿ وَمَا قَلَىٰ ﴾، یانی: (**وَمَا قَلاكَ**)، لە تۆش زویرو نیگەران نەبووە، (**الطَّبَري**)، دەڵێ: (**مَا تَرَكَكَ وَمَا أَبْغَضَكَ**)، وازی لە تۆ نەهێناوەو، ڕقیشی لە تۆ هەڵنەستاوە، لێت نیگەران و زویر نەبووە، وەك بێبڕوایەكان بانگەشەیان دەكرد، پێشتر لە بڕگەی هۆی هاتنە خواردا، لەو بارەوە چەند ڕیوایەتێكی جۆراو جۆرمان هێنان، لێرە خوای بەرزی مەزن ڕاناوی (ك)ی، خستۆتە سەر: ﴿ مَا وَدَّعَكَ ﴾، یانی: (**ما تَرَكَكَ**)، پەروەردگارت وازی لە تۆ نەهێناوە، خوا حافیزی لە تۆ نەكردوە، بەڵام: ﴿ وَمَا قَلَىٰ ﴾، ڕاناوی (ك)ی نەخستۆتە سەر وشەی: (**قَلَىٰ**)، چونكە پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (**القِلَى: أَشَدُّ البُغْضِ**) (**قِلَى**) یانی: زۆر ڕق لێ هەڵسان، ئەوەش بەرپەرچدانەوەی نەیارەكانی پێغەمبەرە ﷺ كە دەیانگوت: پەروەردگاری زۆر لێی نیگەران و تووڕەو لێی پەست بووە!

خوا دەفەرموێ: نەخێر، پەروەردگارت نە وازی لە تۆ هێناوە، نە لێشت تووڕەو نیگەران بووە، ئنجا بۆیە (ك)ی نەخستۆتە سەر (قلى) تاكو تووڕەییەكە پەیوەست نەكرێتەوە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺو وشەی پێشتریش (ك)ی پێوە لكێنراوە، قەرەبووی (ك) پێوە لكاندنی ئێرەش دەكاتەوە.

٤)- ﴿ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ﴾، مەنزڵگای كۆتاییش بۆ تۆ باشترە لە هی یەكەم، (**الطَّبَري**) ئاوای لێكداوەتەوە، (**وَلَلْآخِرَةُ: مَا أَعَدَّ لَكَ فيهَا، خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الدَّارِ الدُّنيا وَمَا فِيهَا**)، واتە: مەنزڵگای كۆتایی و ئەوەی پەروەردگارت بۆی سازو ئامادە كردووی لەوێدا، بۆ تۆ چاكترە، لە مەنزڵگای دنیاو لەوەی تێیدا هەیە، (**فَلاَ تَحْزَن عَلَى مَا فَاتَكَ فِيهَا، فَإِنَّ الَّذي لَكَ عِنْدَ اللهِ، خَيْرٌ لَّكَ مِنْها**) ئنجا ئەگەر لە دنیادا شتێكت لە دەست چوو، دڵتەنگ مەبە، چونكە ئەوەی بۆ تۆ هەیە لەلای خوا لە ڕۆژی دواییدا باشترە، لەوەی لە دنیادا هەیە.

٥)- ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت هێندەت پێدەدا، تاكو ڕازی بی، (**الطَّبَري**)، ئاوای لێك داوەتەوە: (**وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ يَا مُحَمَّد! رَبُّكَ فِي الآخِرَةِ مِنْ فَضَائِلِ نِعَمِهِ حَتَّى تَرْضَى**)، لەمەودوا ئەی موحەممەد پەروەردگارت لە ڕۆژی دواییدا هێندەت لەبەخشش و چاكەكانی خۆی پێدەدا، تاكو ڕازی دەبی.

وشـەی: ﴿ وَلَسَوْفَ ﴾، دیـارە (و) بـۆ بادانـەوەو گێڕانەوەیـە، بـەڵام (ل)ی سـەر (سَـوف): (**الـلاَّمُ لِلإبْتِـدَاءِ دَخَلَـتْ عَـلى الخَـبَرِ لِلتَّأكِيـدِ عَـلَى مَضْمُـونِ الجُمْلَـةِ، وَالمُبْتَـدَأُ مَحْـذوفٌ، تَقْدِيـرُهُ: وَلَأَنْـتَ سَـوْفَ يُعْطِيـكَ رَبُّـكَ فَـتَرْضَى**)، (ل) بـۆ دەسـت پێکردنـە، چۆتـە سـەر هـەواڵ، بـۆ جەختکردنـەوە لەسـەر نێوەڕۆکـی ڕستەکە، گـوزارە (**مُبْتَـدَأ**) ەکـەش قرتێـنراوە، بـەو شـێوەیە: (**وَلَأَنْـتَ سَـوْفَ يُعْطِيـكَ رَبُّـكَ فَتَرْضَى**)،تۆش بـە دڵنیایی پـەروەردگارت هێنـدەت پێـدەدا، تاکـو ڕازی دەبـی، ئەمـە ئەگەرێـك بـۆ (ل)ەکـە.

بـەڵام (**أبـو عـلي الفـارسي**)، دەڵـێ: (**الـلاَّمُ هِـيَ الَّتـي فِي قَوْلِـكَ: لَأَقُومَـنَّ، وَنَابَـتْ سَوْفَ عَنْ إِحْدَى نُونَيْ التَّوْكِيـدِ فَكَأَنَّـهُ قَـالَ: وَلَيُعْطِيَنَّـكَ**)، واتـە: (ل)، وەك ئەوەیـە کـە دەچێتـە سـەر قسـەی تـۆ کـە دەڵێـی: (**لَأَقُومَـنَّ**)، بـە دڵنیایـی هەڵدەسـتم، (**سـوف**)ش لەجێـی یەکێـك لـە دوو نـوون (ن)ەکانـە کـە بـۆ جەختکردنـەوە دێـن، وەك ئـەوەی فەرمووبێتـی: (**وَلَيُعْطِيَنَّـكَ**) بـە دڵنیایـی پێتدەبەخشـێ.

بـەڵام لێـرەدا زانایـان لـەو بـارەوە گوتوویانـە: ئایـا ئـەوەی خـوا سـبحانە و تعالـى مەبەسـتیەتی کـە بـە پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ دەبەخشـێ، تاکـو ڕازی دەبـێ چیبـەو چۆنە؟

دواتـر قسـەی لـێ دەکەیـن، بـەڵام پێـش ئـەوە ئـەو قسـەیەی (إبـن عبـاس رضي الله عنهما) دێنیـن کـە (**الطَّبَري**)، بـە ژمـارە: (٣٧٦٢٣) لێیـەوە هێنـاوە، کـە لـە تەفسـیری: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴾دا، گوتوویەتـی: (**مَاتَـرَكَكَ رَبُّـكَ وَمَـا أَبْغَضَـكَ**)، پـەروەردگارت نـە وازی لـە تـۆ هێنـاوەو نـە لێشـت نیگـەران بـووەو، لێشـت قەڵـس بـووە.

لـە بـارەی ئـەوەوە کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾ لەمـەودوا پـەروەردگارت هێنـدەت پێـدەداو پـێ دەبەخشـێ، تاکـو ڕازی دەبـی، زانایـان چـوار ڕایـان هێنـاون:

١- (**يُعْطِيكَ رَبُّكَ الفَتْحَ فِي الدُّنيا وَالثَّوابَ فِي الآخِرَةِ فَتَرْضَىٰٓ**)، پێم وایە ئەمە لە هەموویان گشتگیرترە، واتە: پەروەردگارت لە دنیادا سەرکەوتنت پێدەدا و، لە دواڕۆژدا پاداشتت پێدەدا، تاکو ڕازی دەبی.

**٢-** ئەوەی خوا پێی دەدا: (**الحَوْضَ وَالشَّفَاعَةَ**)، حەوزی کەوسەرو تکاکردنی پێغەمبەرە ﷺ بۆ مرۆڤایەتیی کە دەست بکرێ بە لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، دواییش بۆ ئۆممەتی بە تایبەت.

**٣-** ئەوەی خوا پێی دەدا، (**أَلْفَ قَصْرٍ مِن لُؤْلُؤٍ أَبْيَضٍ تُرابُهُ المِسْك**)، وەك پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەکەشی دا هێنامان، هەزار (١٠٠٠) کۆشك لە گەوهەری سپیی، خۆڵەکەی بریتیە لە میسك.

**٤-** (**يُعْطِيهِ مِنْ خَيْرِ الدُّنيَا وَالآخِرَة، مَا يَرْضِي بِهِ**)، خوا لە چاکەی دنیاو ڕۆژی دوایی پێیدەدا، ئەوەندە کە پێی ڕازی بێ، ئەمە وەك ڕای یەکەم وایە و، لەو گشتگیرتریشە.

لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین:

**{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَلَا قَوْلَ اللَّهِ عَزَّوَجَلَّ فِي «إِبْرَاهِيمَ»: ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٦﴾، وَقَالَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَام: ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١١٨﴾، فَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَقَالَ: اللَّهُمَّ أُمَّتِي أُمَّتِي وَبَكَى فَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ فَسَلْهُ مَا يُبْكِيكَ؟ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام فَسَأَلَهُ: فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَا قَالَ: وَهُوَ أَعْلَمُ فَقَالَ اللَّهُ: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ، فَقُلْ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلَا نَسُوءُكَ} (أخرجه مسلم: ١٦١).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرمایشتەی خوای لە سوورەتی (إبراهيم) دا خوێندەوە، کە ئیبراهیم ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٦﴾، واتە: هەر کەسێك شوێنم بکەوێ، لە منەو، هەر کەسێکیش سەرپێچیم لێ بکات، تۆ لێبووردەی میهرەبانی، هەروەها قسەی عیسای ﷺ، لە سوورەتی (المائدة)دا، خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١١٨﴾، واتە: ئەگەر ئازاریان

بـدەی بەنـدەی خۆتـن و، ئەگـەر لێشـیانببووری هـەر تـۆی زاڵـی کارزان، ئنجـا پێغەمبـەر ﷺ (دوای ئـەوەی ئـەو قسـانەی ئـەو دوو پێغەمبـەرەی خوێندنـەوە)، دەسـتەکانی بـەرز کردنـەوەو، فەرمـووی: پـەروەردگارم! ئۆممەتەکـەم، ئۆممەتەکـەم و گریـا، خـواش سـبحانە و تعالـی فەرمـووی: جبریـل بچـۆ بـە موحەممـەد بڵـێ: ئێمـە لـە بـارەی ئۆممەتەکەتـەوە ڕازییـت دەکەیـن و کارێـك ناکەیـن بـۆ تـۆ خـراپ بـێ، (پێـت ناخۆشـبێ و مایـەی نیگەرانیـی و دڵتەنگیـی تـۆ بـێ).

**مەسەلەی دووەم:**

**بیرخستنەوەی خوا سبحانە و تعالى بۆ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ کە بە هەتیویی حەواندوویەتەوە، بەڕێی نەزانیوەو لە ڕێی بەندایەتیی بۆ خوا، شارەزای کردووەو ڕێنمایی کردوە، لە هەژاریی دەربازو بێنیازی کردوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ﴾، ئایا (خوا) تۆی بە هەتیویی لێ هەڵنەکەوت، تۆی بە هەتیوی نەبینی، ئنجا حاواندیەوە؟ ﴿فَـَٔاوَىٰ﴾، یانی: (فَآوَاكَ)، خوا تۆی حاواندەوە، تۆی لە پەنای خۆی گرت، ﴿يَجِدْكَ﴾، (**مُضَارِع وَجَدَ أَيْ أَلْفَى وَصَادَفَ، وَيَتَعَدَّى إِلَى مَفْعُولٍ وَاحِدٍ، وَمَفْعُولُهُ ضَمِيرُ المُخَاطَبِ**)، ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ﴾، (يَجِدْكَ) بە (لَم) (مجزوم)ەو، کرداری ئێستای (**مُضَارِع**)ەو، لە (**وَجَدَ**)وە هاتوە، (**وَجَدَ أَلْفَى وَصَادَفَ**). یانی: تووشی بوو، لێی هەڵکەوت، (**وَجَدَ وَيَجِدُ**)، تەنیا بەرکارێك دەخوازێ، بەرکارەکەشی لێرەدا بریتیە لە ڕاناوی دواندن، ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ﴾، پیتی (ك) بەرکاری (**يَجِد**)ە، ئایا تۆی لێ هەڵنەکەوت بە هەتیویی، تۆی بە هەتیویی نەبینی، ﴿فَـَٔاوَىٰ﴾ ئنجا تۆی پەنادا، (**الإِيوَاءُ: مَصْدَرُ أَوَى، وَالإِيوَاءُ: الإِرْجَاعُ إِلَى المَسْكَنِ، أَيْ: جَعَلَهُ آوِياً، وَأُطْلِقَ الإِيواءُ عَلَى الكَفَالَةِ وَكِفَايَةِ الحَاجَةِ**)، (**إِيوَاء**)، لە (**أَوى**)وە هاتوە، (**أَوَى**)، یانی: (**لَجَأَ**)، پەنای برد، بەڵام (**آوَى**) یانی: پەنایدا، (**ضَمَّهُ إِلَى نَفْسِهِ**)، (**الإِيواءُ: الإِرْجَاعُ إِلَى المَسْكَن**)، (**إِيوَاءْ**): گێڕانەوەی کەسێکە بۆلای نشینگەکەی خۆی، (**أَيْ: جَعَلَهُ آوِياً**)، واتە: وای لێکرد، پەنای بدرێ، بحەوێنرێنەوە، وشەی (**إِيوَاءْ**): بەکارهێنراوە بۆ کەفالەت و جێبەجێکردنی پێداویستیی کەسێك، پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە سکی دایکی دابووە، کە بابی مردووە، لە دوای بابی باپیری وەئەستۆی گرتووە، ئنجا دواتر باپیریشی مردوەو، تەمەنی شەش ساڵییدا دایکیشی مردوە، دواتر

دایكیشی مردوە، چۆتە لای مامی ئەبوو تاڵیب و ئەو بەخێوی كردوە، سەرپەرشتیی كردوە، بۆیە خوا سبحانە و تعالی ئەوە دەخاتەوە بیری پێغەمبەر ﷺ تۆ بێ باب بووی، بەڵام خوا تۆی حەواندەوە، سەرەتا بە هۆی باپیرتەوە، دواییش بە هۆی مامتەوە.

٢)- ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴾، یانی: (**وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَاكَ**)، هەروەها (خوا) تۆی گومڕا بینی، ڕێنمایی كردی، ڕێی پێشاندای، (**الضَّلَالُ: عَدَمُ الإِهْتِدَاءِ إِلَى الطَّرِيقِ المُوصِلِ إِلَى المَكَانِ المَقْصودِ، وَلَيْسَ المُرادُ بِهِ هُنَا: اِتِّبَاعَ البَاطِلِ**)، (**ضَلال**): لێرەدا بەمانای شارەزا نەبوونە لە ڕێیەك كە مرۆڤ بگەیەنێتە شوێنی مەبەست، مەبەست لە (**ضَلال**)، شوێنكەوتنی باتیڵ و ناهەق نیە، وەك شیرك و كوفرو لادان و تاوان، چونكە پیتی (و) ی ﴿ وَوَجَدَكَ ﴾، ئەم ڕستەیە دەگێڕێتەوە بۆ حوكمی ڕستەی پێشێ: ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴾، مانایەكەی ئاوای لێ دێتەوە: (**أَلَمْ يَجِدْكَ ضَآلًّا فَهَدَاكَ**)، ئایا خوا تۆی گومڕا لێ هەڵنەكەوت، ڕێنمایی كردی؟ واتە: بە ڕێیەت نەدەزانی و ڕێی پێشاندای، ڕێی دینداریی و خواپەرستیی، ڕێی ئەوەی كۆمەڵگایەكەی خۆت بهێنیە سەر ڕاستە ڕێیەك لە خوایان نزیك بخەیەوەو، لە زەلكاوی كوفرو گومڕایی و شیرك و بتپەرستیی و ستەم و خراپەو لادان و تاوان دەریانبێنی.

٣)- ﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴾، هەروەها ئایا (خوا) تۆی ئاتاج لێ هەڵنەكەوت، ئنجا دەوڵەمەندو بێ نیازی كردی؟ ﴿ فَأَغْنَىٰ ﴾، یانی: (**فَأَغْنَاكَ**)، (**العَائِلُ: الَّذي لاَ مَالَ لَهُ، وَالفَقْرُ: العَيْلَة**)، (**عائِل**)، كەسێكە ماڵ و سامانی نەبێ و، هەژاریی لە قورئاندا بە مانای (**عَيْلَة**)یە، ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً ﴾**التوبة: ٢٨**، واتە: هەر كەسێك لە ئێوە لە هەژاریی ترسا، بۆیەش بابای نەدار پێی گوتراوە: (**عائِل**)، چونكە بە زۆریی وابووە ئەوانەی ماڵ و منداڵیان هەبووەو، ماڵ و منداڵەكەیان بۆ بەخێو نەكراوە، ئەوانە زیاتر هەژاریی و ئاتاجییان پێوە دیار بووە، كە ماڵ و منداڵیان بێ بەرگ و بێ خواردن و بێ جێگاوڕێگا كەوتۆتە گۆڕێ.

ئنجا لـەوەوە بەهـەر هـەژارو نەدارێکیـان گوتـوە: (عَائِـل)، هـەر کام لـە بـەرکار (**مَفْعـول بـهِ**)ی، (**آوى، هَـدىَ، أَغْنَـىَ**)، قرتێنـدراون کـە بریتیـە لـە (ك)، لەبەرئـەوەی زانـدراون، بەهـۆی ڕاناوەکانـی دواندنـی پێشـەوەوە کـە خـوا سـبحانه و تعالـی فەرموویەتـی: ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ﴾، ئنجـا دوایـی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴾، یانـی: (فَـآوَاكَ)، ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴾، یانـی: (فَهَـداكَ)، ﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴾، (فَأَغْنَـاكَ)، خـوا سبحانه و تعالـی لەبـەر ئـەوەی زانـراوە کـە ڕووی دوانـدن لـە پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ، بۆیـە بـەرکاری هـەر سـێك وشـەکانی قرتانـدوە.

## قسەیەکی کورت لەبارەی
## (ضلال) پاڵدانە لای پێغەمبەری خواوە ﷺ

لێرەدا زانایان زۆریان قسە کردوە لە بارەی ئەوەوە کە خوا سبحانە و تعالی وشەی: (ضَلاَل)ی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەکارهێناوە، پێیان وابووە ئەوە ناگونجێ، چونکە جۆرێکە لە کەم و کوڕیی پاڵدانە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیەش:

هەندێکیان گوتوویانە: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا ﴾، پێغەمبەری خاتەم ﷺ، جارێك پێش پێغەمبەرایەتیی، ڕێی لێ ونبووە لە شوێنێك و دوایی دۆزیویانەتەوە!

ئەوەش هۆکارەکەی ئەوەیە کە زۆرجار عاتیفە بەسەر عەقڵدا زاڵ دەبێ، ئەگەرنا پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) پێش پێغەمبەرایەتییش گومانی تێدانیە کە خوا سەرپەرشتیی کردوون و پاراستوونی لە شتی ناشیرین و لە لادان و تاوان، کەواتە: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴾ مەبەست پێی ئەوە نیە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، خوا ئەوی بە گومڕاو سەرگەردان، وەسف کردوە بەو واتایەی خوای نەناسیبێ و تووشی شیرك و کوفر و بتپەرستیی بووبێ، ئنجا ڕێنمایی کردبێ! نەخێر.

بەڵام پێغەمبەران پێش ئەوەی دەستی هیدایەتی خوایان پێبگات، وەك خەڵکی دیکە بوون، لەڕووی بەڕێی هەق و ڕاست نەزانین و باش بەندایەتیی نەکردنەوە بۆ خوا، بەڵێ خاوەنی مەعدەنێکی ئەوپەڕی پاك و سرووشتێکی یەکجار چاك بوون و، خوا پاراستوونی لە هەر شتێك کە پێی ناشیرین و عەیبدار بن، بەڵام دوای ئەوەی خوا هیدایەتی داون و پەیامی خۆی بۆ ناردوون، زۆر جیابوون لەوەی پێش ئەوەی پەیامی خوایان بۆبێ، پێش ئەوەی پەیامی خوایان بۆبێ، وەك ئەو خەڵکە

بیریـان کردۆتـەوە لـە زۆر شـتدا، بـەڵام خـوا پاراسـتوونی لـەو شـتانەی دژو پێچەوانـەی زگماکـی سـاغی مـرۆڤ و عەقڵـی تێـرو تـەواوی مرۆڤـن کـە بریتیـە لـە: شـیرك و کوفـرو لادان و تاوانـی گـەورە، بـەڵام ئەگـەر عاتیفـە بەسـەر عەقڵمانـدا زاڵ بـێ و، بڵێیـن:

موحەممـەد ﷺ پێـش ئـەوەی خـواش وەحیـی بـۆ بنێـرێ، هـەروەك ئەو کاتـە بووە کـە خـوا وەحیـی بـۆ نـاردوەو، هەمـوو شـتێکی تێـرو تـەواو بـووە، ئـەوە پێچەوانـەی واقیعـەو، ئـەو پرسـیارەش بـێ وەڵامـە: ئایـا بۆچـی موحەممـەد ﷺ بـەر لـە تەمەنـی چـل سـاڵیی بانگـی کەسـی نەکـرد بـۆ تەنیـا خواپەرسـتیی؟ بەڵـێ، خـۆی تەنیـا خـوای پەرسـتوە، بـەو شـێوەیەی لـە کلتـوورو فەرهەنگـی کۆمەڵگایەکـەی، دابـووەو، ئەوەنـدەی عەقڵـی سـەلیمی و، زگماکـی سـاغی پەسـندی کـردوە، وەریگرتـوە، بـەڵام بەدڵنیایـی بەرنامەیەکـی لەبـەر دەسـتدا نەبـووە، خەڵکـی بـۆ بانـگ بـکات: خەڵکینـە وەرن ئـاوا خواپەرسـتن و، بـەو شـێوەیە بـن لـە ڕووی ڕەوشـتیی و ئاکارییـەوە ڕەفتـار بکـەن و، بـەو شـێوەیە لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوەو، بەو شـێوەیەین لە ڕووی سیاسـیی و حوکمڕانییـەوە، ئەوانـەی نەزانیـون، ئـەو ئایەتـەی ئێـرەو، ئایەتـی ژمـارە (٥٢) لـە سـووڕەتی (الشـوری)، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾، خـوا پێشـێ باسـی چۆنیەتیـی ناردنـی وەحیـی دەکات و، جۆرەکانـی هاتنـی وەحیـی، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ هـەر بـەو جـۆرەی بـۆ پێغەمبەرانمـان نـارد، بۆ لای تـۆش سروشـمان کـردوە، وەحییمان بـۆ لای تـۆ نـاردوە، خـوا چـی بـۆ نـاردوە؟ ﴿رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا﴾، ڕووحێـك لـە لایـەن خۆمانـەوە، ﴿مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ﴾، پێشـتر نەتدەزانـی کتێـب چییـە، واتـە: بەرنامـە، ﴿وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ﴾، هەروەهـا نەشـتدەزانی ئیمانیـش چییـە.

بـەڵام هەندێـك لـە زانایـان، خـوا عەفوویـان بـکات و لێیـان خۆشـبێ، ئیـمان و خواناسـییان لـێ تێکـەڵ بـوون و، وایانزانیـوە هـەر کەسـێك ئیـمانی نەبـوو، یانـی: خـواش ناناسـێ، بـەڵام نـا!

خواناسیی شتێکی خوارسکە، خوا لە زگماك و ناخی مرۆڤدا داینـاوە، مرۆڤەکان بەڵکو هەموو دروستکراوەکان، خوای خۆیان دەناسن، بەڵام ئیمان تەنیا بریتی نیە لە خواناسین، بەڵکو ئیمان بریتیە لە:

خواناسیی + بەندایەتیی بۆ خوا، ئەو بەندایەتییکردنەش بۆ خوا دەبێ لە هەر چوار هێزە سەرەکییەکەی مرۆڤ دا بەرجەستە ببێ:

١- لە هێزی عەقڵ و ئیدراکی دا، کە خوا ﷻ بناسێ، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست، سیفەتەکانی خواو ناوەکانی خوا.

٢- لە هێزی دڵ و دەروونیدا، ئەو خوایەی ناسیویەتی، ئەوپەڕی خۆشویستن و، بەبەرزگرتن و، بە مەزنگرتن و، سام و هەیبەت لە بەرانبەردا کردن و، پشت پێ بەستن و، مل بۆ کەچکردنی، بۆی هەبێ.

٣- لە هێزی دەربڕینیداو، دانی پێدابنێ.

٤- لە هێزی جێبەجێکردنی ئەندامەکانیداو جێبەجی بکات، هەروەها تێکڕای ئەو کردەوەو بەرهەمانەی ئیمان لە مرۆڤ دا پەیدایان دەکات، ئا بەو شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمانی نەزانیوە، بەڵام کە ئیمانی نەزانیوە بە دەقی ئایەت، مانای وانیە خوای نەناسیوە، خوای ناسیوەو، هەموو جارێ کە چووە بۆ ئەشکەوتی (حِرَّاء)، لەوێدا پەرستشی بۆ خوا کردوە، کەواتە: خوای ناسیوە، بەڵام وردەکارییەکانی ئیمان و وردەکارییەکانی حەڵاڵ و حەرام و شەریعەت، کە دوایی خوا بەهۆی قورئانەوە فێری کردوە، بە دڵنیایی نەیزانیون، ئنجا لێرە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴾، واتە: خوا تۆی نەشارەزاو سەرگەردان بینی، لەو ڕووەوە کە چۆن خوا بپەرسترێ، چۆن بەندایەتیی بۆ بکرێ، چۆن کۆمەڵگا ڕێك بخرێ و، ئیدارە بدرێ، لەو ڕووانەوە، تۆ بە ڕێت نەدەزانی و شارەزا نەبووی و خوا، تۆی شارەزا کردو ڕێنمایی کردی.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴾، هەروەها (خوا) تۆی نەدارو ئاتاج لێ هەڵکەوت، بەڵام بێ نیازی کردی، بێنیاز کردنەکەی پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ

ئەوە بووە کە بەهۆی هاوسەرگیریی کردنیەوە لەگەڵ خەدیجەدا (خوا لێی ڕازی بێ)، کە هاوسەرگیرییان کرد، بە دەستپێشخەریی خەدیجە، خەدیجە لە تەمەنی چل (٤٠) ساڵییداو، موحەممەد ﷺ لە تەمەنی بیست و پێنج (٢٥) ساڵییدا، پازدە ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە، ئنجا کە هاوسەرگیریی لەگەڵ موحەممەد ﷺدا دەکات، خەدیجە ماڵ و سامانی زۆری بووەو، موحەممەد ﷺ بازرگانیی و سەوداو مامەڵە بە ماڵەکەی دەکات و، دەبێتە خاوەنی ئەو سەروەت و سامانەی خەدیجە، لەوەوەش لەو ئاتاجیی و نەدارییەی تێیدا بووە، خوای بەخشەر پەروەردگار دەربازی دەکات و بێ نیازی دەکات، یەکێك لە زانایان دەڵێ: (**أَغْنَاهُ اللهُ غِنَائَيْنِ، غِنَى القَلْبِ، وَهُوَ أَعْظَمُهُمَا، وَغِنَى المَالِ حِينَ أَلْهَمَ خَدِيجَةَ مُقَارَضَتَهُ فِي تِجَارَتِهَا**)، واتە: خوا دوو بێ نیازیی بە موحەممەد ﷺ بەخشیین:

**یەکەمیان:** کە گەورترینیانە بریتیە لە بێنیازیی دڵ و دەروون، خوا دڵ و دەروونی موحەممەدی ﷺ وا لێکرد، هەمیشە بەرچاو تێرو، بە قەناعەت و، خۆ پێ دەوڵەمەند بێ.

**دووەمیان:** ئەوە بوو خوای بەرز خورپەی خستە دڵی خەدیجەوە، کە بازرگانیی لەگەڵ موحەممەدا ﷺ بکات، بەر لەوەی کە هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات.

خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێ) ئافرەتێکی زۆر فامیدەو عاقڵ بووە، مەیسەرەی غوڵامی خۆی لەگەڵ موحەممەد ﷺدا نارد بۆ شام، بە ماڵ و سامان و کاروانەوە، ماڵ و سامانی خەدیجە، کاتێك مەیسەرە دەگەڕێتەوە باسی ڕەوشت و ئاکاری موحەممەد ﷺ بۆ خەدیجە دەکات، خەدیجە زۆر دڵی پێیدا دەچێ، کە هێندە پیاوێکی ڕاست و ساغ و پاك و چاکە، ئنجا پێشنیار دەکات شووی پێ بکات، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ ڕاوێژ بە خزمەکانی دەکات و، پێشنیارەکەی خەدیجە سەر دەگرێ، دەبێتە یەکەمین هاوسەری و، گەورەترین و چاکترین هاوسەری پێغەمبەری خاتەم ﷺو، ماڵ و سامانەکەی خۆشی لە خزمەت موحەممەد ﷺدا دادەنێ، بۆیەش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: خوا تۆی ئاتاج لێ هەڵکەوت، بەڵام تۆی دەوڵەمەند و بێنیاز کرد.

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمانكردنی خوای كاربەجێ بە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ، كە ستەم لە هەتیو نەكات و، سەرزەنشتی سواڵكەر نەكات و، باسی چاكەی پەروەردگاری بكات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

دوای ئەوەی خوا سێ لە چاكە بنەڕەتییەكانی خۆی خستنەوە یادی موحەممەد ﷺو فەرمووی: ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾، ئنجا لەم سێ ئایەتەی كۆتاییدا، سێ ڕێنمایی و ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەكات لەبارەی هەتیوەوە و، لەبارەی سواڵكەرو داواكەرەوەو، لە بارەی مامەڵەكردنیەوە لەگەڵ چاكەو نیعمەتەكانی پەروەردگاریداو، بە نسبەت مامەڵەكردن لەگەڵ هەتیو، دەفەرموێ:

١)- ﴿ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴾ [ئنجا كە ئاوایە] هەرچی هەتیوە ستەمی لێ مەكە، مەیچەوسێنەوە، پیتی (ف) كە كەوتۆتە سەر (أَمَّا)، پێی دەگوترێ: (فَصِيْحَةٌ)، یانی: (تُفْصِحُ عَمَّا قَبْلَهَا) شتێك كە لە پێش خۆیدا باس نەكراوە، بەهۆی ئەم (ف)ەوە دێتە زەینەوە، ڕوونی دەكاتەوە، مانایەكەی ئاوای لێ دێ: (إِذَا كُنْتَ تَعْلَمُ ذَلِكَ وَأَقْرَرْتَ بِهِ، فَعَلَيْكَ شُكْرُ ذَلِكَ، وَبَيَّنَ لَهُ الشُّكْرَ بِقَوْلِهِ: ﴿ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾).

واتە: ئەوەی باسكرا، مادام زانیت و دانت پێدا هێنا (زانیت كە هەتیو بووی و خوا تۆی حەواندەوەو، گومڕا بووی و بە ڕێت نەدەزانی و، خوا تۆی ڕێنمایی كردو، نەدارو ئاتاج بووی و خوا تۆی دەوڵەمەندو بێنیاز كرد، مادام ئەوەت زانی.

کەواتـە: تـۆ ئێسـتا سوپاسـگوزاریی بۆ خـوا ئەنجام بدە، ئنجـا سوپاسـگوزارییەکەش بـەوە دەبـێ مـادام تـۆ هەتیـو بـووی و خـوا بـە هەتیویـی حەواندیـەوەو پەنـای داوی، کەواتـە: تـۆش ئـاگات لـە هەتیـوان بـێ و، سـتەمیان لـێ مەکـە.

(ال)ی سـەر ﴿ ٱلۡيَتِيمَ ﴾، دواییـش: ﴿ ٱلسَّآئِلَ ﴾، بـۆ ناسـاندنەو، ناسـاندنەکەش مەبەسـت پێـی جینسـە، واتـە: سـتەم لـە هەتیـوان مەکـە بـە گشـتیی، ﴿ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ ﴾، هەروەهـا دواکـەر سـواڵکەریش تێیـوەی مەخـوڕە، لێـی تـووڕە مەبـە، ﴿ وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ ﴾، چاکـەی پەروەردگاریشـت بـاس بکـەو، یـادی بکـە.

لێـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ ﴾، بێگومـان پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ ڕەوشـتی و ئـەدەبی و پێـش ئـەوەش نـاخ و زگماکـی زۆر لـەوە پاکـترو چاکـتر بـووە کـە سـتەم لـە هەتیـو بـکات، بـەڵام بۆچـی خـوا ئـەم تەعبیـرەی بەکارهێنـاوە؟ دواتـر حیکمەتەکـەی ڕوون دەکەینـەوە.

(**القَهْرُ: الغَلَبَـةُ والإِذْلال**)، (**قَهْـر**): بریتیـە لەبەسـەردا زاڵبـوون و زەبـوون کـردن، ئنجـا ئایـا ئـەوە کـەی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەشـاتەوە؟ بێگومـان هەرگیـز، بـەڵام دوایـی حیکمـەت و هـۆکاری بەکارهێنرانـی ئـەو تەعبیـرە ڕووندەکەینـەوە.

موجاهیـد، بـە ژمـارە (٣٧٦٤٣)، (**الطَّبَري**)، لێـوەی هێنـاوە، گوتوویەتـی: (**أَنْ تَغمِصَهُ حَقَّـهُ أَوْ تَحْقِـرَهُ**)، کـە مافەکـەی لـێ زەوت بکـەی و لـێ کـەم بکەیـەوە، یـان بـە سـووك تەماشـای بکەی.

**٢)**- ﴿ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ ﴾، هەروەها لە سواڵکەریشەوە مەخوڕەو مەیڕەتێنە، (**النَّهْرُ: الزَّجْرُ بِالقَوْلِ**)، (**نَهْر**): بریتیە لە لێتووڕە بوون بە قسە، تێوەی مەخوڕەو، مەیڕەتێنە، وەك ئەوەی بڵێی: (**إِلَيْكَ عَنِّي**) لێم دووربکەوەوە! ئایا حیکمەتی ئەوە چییەو بۆچی خوا سبحانە و تعالى ئەو دوو تەعبیرەی بەکارهێناون؟ بە نیسبەت هەتیوەوە ستەمی لێ مەکەو، مەیچەوسێنەوەو، بەکەم تەماشای مەکە، بە نیسبەت سواڵکەریشەوە: لێی تووڕە مەبەو، مەیڕەتێنەو، دەری مەکە!

دەڵـــێـم:

نەمبینیـوە لـە تەفسـیرەکاندا ئـەوە بـاس بکـرێ، بـەڵام هەرکەسـێ سـەرنجی ڕەوشـت و ئەدەبـی بـەرزی موحەممـەد ﷺ بـدات، پێـش پێغەمبەرایەتییش، چ جـای دوای وەحیـی بـۆ هاتنـی و پێغەمبەرایەتیـی، دەزانـێ کـە ئـەم تەعبیرانـە مەبەسـت پێیـان ئەوەنیـە خـوا بفەرمـوێ: ئـەی موحەممـەد ﷺ! تـۆ تاکـو ئێسـتا هەتیـوت سـتەم لـێ کـردوەو چەوسـاندۆتەوەو، لەمـەودوا زوڵمـی لـێ مەکـەو مەیچەوسـێنەوە! یان تۆ هەتـا ئێسـتا سـواڵکەرو داواکـەرت دەرکـردوون و لێیـان تـوورە بـووی و ڕەتاندووتـن، لەمـەودوا مەیانڕەتێنـە، نەخێـر، بەڵکـو مەبەسـت لـەو تەعبیرانـە:

**یەك:** وێڕای ڕێنماییکردن و ئامۆژگارییکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕێنماییکردن و ئامۆژگارییکردنی مسوڵمانانێکیشە کە شوێنی دەکەون.

**دوو:** لەبەر ڕاهاویشتن و بە کنارە قسە گوتنە بە هاوبەشدانەرو بێبڕواو بێدینەکان، کە ئێوە هەتیو دەچەوسێننەوە ستەمی لێ دەکەن و مافەکەی زەوت دەکەن و، سواڵکەریش دەردەکەن و دەیڕەتێنن و دەیڕەنجێنن.

واتـە: مسـوڵمانینە! ئێـوە وەك ئـەو بێبـڕواو هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـە مەکـەن، کـە سـتەم لـە هەتیـو دەکـەن و دەیچەوسـێنەوەو بـە کـەم تەماشـای دەکـەن و بابـای سـواڵکەرو داواکەریـش دەڕەتێنـن و دەڕەنجێنـن و تیـوەی دەخـوڕن، مەبەسـت ئەوەیـە ئـەی مسـوڵمانینە! ئێـوە کـە شـوێنکەوتەی موحەممـەدن ﷺ ئاگاتـان لـێ بێ لـە مامەڵە کـردن لەگـەڵ هەتیـوو، داواکـەرو سـواڵکەرداو، هەمـوو لایـەك بزانـن کـە موحەممـەد ﷺ خـوا ڕەفتارێکـی لـێ قەدەغـە کـردوە کـە، لـە کۆمەڵگایەکەیـدا هەبـووە، کـە بریتیە لـە چەوسـاندنەوەی هەتیـوو، سـتەم لێکـردن و مـاف خواردنـی و، دەرکردنـی سـواڵکەرو داواکـەرو پێنـەدانی و لـێ تـووڕە بـوون و تێوەخوڕینـی.

٣)- ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾، بە نسبەت چاکەی پەروەردگاریشتەوە، یادی بکە، زۆرجاران گوتوومانە: (**أَمَّا: حَرْفُ تَفْصِيلٍ**)، (أمّا) پیتێکە بۆ درێژەپێدانی قسە، پێشێ

قسەیەك دەكەی، دوایی دەتەوێ درێژەی پێ بدەی و ڕوونی بكەیەوە، بۆ وێنە: سێ نەفەر دێن بۆ لات، دەڵێی: هەمووتان لە لام بەڕێزن، ئەمما تۆ ئاوا بووی و، تۆش ئاواو تۆش ئاواو، دەرێژە بە قسە لەبارەكردنیانەوە دەدەی.

بە عەرەبیی (**أَمَّا**)، مانایەكەی دەبێتە: (**مَهْمَا يَكُن مِنْ شَيْءٍ**)، هەر شتێك ببێ، كە دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾، بەڵام چاكەی پەروەردگارت باس بكەو، یادبكە، ﴿فَحَدِّثْ﴾، (**التَّحْدِيثُ: الإِخْبَار**) هەواڵ پێدان، یانی: ڕای بگەیەنە.

(**الطَّبَرِي**)، بە ژمارە (٣٧٦٤٥)، لە (**أَبِي النَّضْر**)ەوە هێناویەتی، گوتوویەتی: (**إِنَّ مِنْ شُكْرِ النِّعَمِ أَنْ يُحَدَّثَ بِها**)، لە سوپاسگوزارییە بۆ چاكەكان(ی خوا ) كە باس بكرێن، قسەیان لەبارەوە بكرێ.

كەواتە: خوای پەروەردگار لە كۆتایی ئەم سوورەتە موبارەكەدا، كە زۆر تایبەتە بە موحەممەدە ﷺ لە كۆتاییدا بە سێ شتان ئامۆژگاریی دەكات:

أ- بە نسبەت هەتیوەوە كە لەگەڵیدا چاك بێ و، بە پێچەوانەی عادەت و نەریتی نەفامانەی كۆمەڵگایەكەیەوە، ستەم لە هەتیو نەكات و، نەیچەوسێنێتەوەو، بەكەم تەماشای نەكات و، مافەكەی لێ زەوت نەكات، بەڵكو بەچاكە مامەڵەی لەگەڵدا بكات.

ب- بە نسبەت سواڵكەرو داواكەرەوەوە، كەسێك كە بە زمانی حاڵ و بە زمانی وتار بە شێوەیەك لە شێوەكان، داوا دەكات، تێوەی نەخوڕێ و نەڕەتێنرێ و دەرنەكرێ و نەڕەجێنرێ.

ج- بەنسبەت چاكەكانی خواوە سبحانە و تعالى كە لەگەڵی دا كردوون، باسیان بكات و ڕایانبنوێنێ[1] و هەواڵیان پێ بدات.

---

(١) ڕایانبنوێنێ: بیخاتەڕوو، پیشانیان بدات.

## چەند دەقێكی سوننەت لەبارەی
## هەتیوو سواڵكەرو باسكردنی چاكەی خواوە

لەبارەی هەر كام لەو سێیانەوە، پێغەمبەری خاتەم ﷺ فەرمایشتی هەن، بۆ وێنە:

**یەكەم:** لەبارەی هەتیوەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**١-** {**أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى**} (**أخرجه أحمد: ٢٢٨٧١، والبخاري: ٥٦٥٩، ومسلم: ٤٢، وأبو داو: ٥١٥٠، والترمذي: ١٩١٨**)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاستی پێكەوە ڕاگرتن و ئاماژەی پێكردن و فەرمووی: من و كەسێك كە سەرپەرشتیی هەتیو دەكات، لە بەهەشتدا بەو شێوەین.

پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە بارەی هەتیوەوە فەرمایشتی زۆرن، كە دەبێ بە شێوەیەكی باش مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، (**القُرْطبي**)، بە ژمارە (٦٣٦٩) ئەم دەقەی هێناوە:

**٢-** {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، أَنَّ رَجُلاً شَكَا إِلى النَّبِيِّ ﷺ قَسْوَةَ قَلْبِهِ؛ فَقَالَ: إِنْ أَرَدْتَ أَنْ يَلِينَ قلبكَ، فَامْسَحْ رَأْسَ اليَتِيمِ، وَأَطْعِمِ المِسْكِينَ**} (**أخرجه أحمد: ٩٠٠٦، قال الهيثمي (١٦٠/٨): رجاله رجال الصحيح**).

واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێك سكاڵای بردە لای پێغەمبەر ﷺ كە دڵی ڕەقە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ویستت دڵت نەرم بێ، دەست بەسەری هەتیو دابێنەو، خواردن بدە بە نەدار.

دەست بەسەرداهێنان، هەرچەندە دەست بەسەرداهێنانی ڕواڵەتیش دەگرێتەوە، بەڵام وێڕای ئەوە چاك مامەڵە كردن لەگەڵ هەتیویشدا بەشێوەی باشترو لەپێشتر دەگرێتەوە، لەگەڵیدا، چاك بە لە باوەشی بگرە، ماچی بكە، ئامۆژگاریی بكە، دڵی بدەوە، هاوكاریی بكە.

هەروەها ئەو فەرموودەیەی پێشتر هێنامان، بەو شێوەیەش هەر هاتوە:

**٣- {كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى} (أخرجه مسلم: ٢٩٨٣).**

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من و کەسێك کە سەرپەشتیی هەتیوێك دەکات، هی خۆی یان هی جگە لە خۆی، (هی خۆی ئافرەتێك کە مێردی دەمرێ، سەرپەرشتیی منداڵەکان دەکات، ئەوە هی خۆی، هی جگە لە خۆی، ماڵێك منداڵێکی دیکەی بێباب دێنن، لەگەڵ منداڵەکانی خۆیان دا پەروەردەی دەکەن، سەرپەرشتیی دەکەن، دەفەرموێ:) هەردووکمان لە بەهەشتدا ئاواین، ئاماژەی کرد بەپەنجەی شایەدمان و پەنجەی نێوەڕاستی.

**دووەم:** دەربارەی سواڵکەرو داواکەر، کەسێك کە دێ داوای شتێکت لێ دەکات، لەو بارەشەوە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ زۆرن، بۆ نموونە:

**١-** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **{لِلسَّائِلِ حَقٌّ وَإِنْ جَاءَ عَلَى فَرَسٍ} (أخرجه أحمد: ١٧٣٠، والطبراني: ٢٨٩٣، وابن أبي شيبة: ٩٨٢٣، وأبو داود: ١٦٦٥، وأبو يعلى: ٦٧٨٤)**، واتە: بابای داواکەر، سواڵکەر، مافی پێ بەخشینی هەیە ئەگەر بە سواریی ئەسپیش بێ.

واتە: کەسێك کە داوای شتێکت لێ دەکات، داوای هاوکارییت لێ دەکات، ئەگەر بە ڕواڵەت دەوڵەندیش بێ و، بە سواریی ئەسپیش هاتبێ، ئەسپ ئەو کاتە وەك سەیارەی مۆدێل بەرزی ئێستا وابووە، مادام داوای لێ کردی و، ڕووی لێ نای، هاوکاریی بکەو شتێکی پێ بدە.

ئنجا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە، بەڵام ئەوەش هەر هەیە، کەسێك کە بزانی قۆڵبڕو، ساختەچییە، بابای واش دەبێ بەپێی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکەی.

**٢-** هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش دێنین، کە ئەمیان باسی داواکەر دەکات، بەڵام داواکەری زانست، چونکە هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا

﴿ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ﴾، ﴿ٱلسَّآئِلَ﴾، داواكەر، تەنیا كەسێك نیە كە ماڵ و سامان داوا بكات، جاری وایە كەسێك زانیارییت لێ داوا دەكات، یان شتێكی دیكەت لێ داوا دەكات و تۆش پێت دەكرێ، واتە: شتی مەعنەویی، ئنجا لەو بارەوەش ئەم دەقە هەیە:

{عَنْ أَبِي هَارون العبدي قَالَ: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا أَبَا سَعِيدٍ يَقُول: مَرْحَبَاً بِوَصِيَّةِ رَسُوْلِ اللّهِ ﷺ، إِنَّ رَسُوْلَ اللهِ ﷺ قَال: «إِنَّ النَّاسَ لَكُمْ تَبَعٌ وَإِنَّ رِجَالاً يَأْتُوْنَكُمْ مِنْ أَقْطَارِ الأَرْضِ يَتَفَقَّهُونَ، فَإِذَا أَتَوْكُمْ فَاسْتَوْصَوْا بِهِم خَيْراً»} (أخرجه الترمذي: ٢٦٥٠، وابن ماجه: ٢٤٩، والطبراني في الشاميين: ٤٠٥، وضعفه الألباني).

واتە: ئەبوو هارووني عەبدیی دەڵێ: ئێمە كە دەچووینە لای ئەبوو سەعید (یەكێكە لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ)، دەیگوت: سڵاو لە ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی كردووین، بەخێریان بێنین و ڕێزیان لێ بگرین، بەخێربێن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خەڵك شوێن ئێوە دەكەون و، پیاوانێك لە گۆشەو كەنارەكانی دنیاوە دێن بۆ لای ئێوە، فێری زانستی شەرعیی بن و شارەزا بن، ئنجا هەر كاتێك هاتن بۆ لاتان زۆر بە جیددیی ئامۆژگاریی خێریان بكەن، (ئەوەی دەزانن لە خێرو چاكە فێریان بكەن).

كەواتە: ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ﴾، بابای داواكەر دەرمەكەو تێوەی مەخوڕە، واتە: چ هاوكاریی ماددییت داوا لێ بكات، چ هاوكاریی كۆمەڵایەتیی یان مەعنەویی لە تۆ داوا بكات، بە تایبەتی فێركردنی زانست و ئایین و پەیامی خوا سبحانه و تعالى.

٣- ئەم دەقەش هەرچەندە پێشتر لە هۆی هاتنە خواریشدا ئاماژەیەكمان پێدا، بەڵام لێرە بە شێوەی تێرو تەواوتر دەیهێنین، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

{سَأَلْتُ رَبِّي مَسْئَلَةً وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَسْأَلْهَا: قُلْتُ: يَا رَبِّ اتَّخَذْتَ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً، وَكَلَّمْتَ مُوسى تَكْلِيماً، وَسَخَّرْتَ مَعَ دَاودَ الجِبَالَ يُسَبِّحْنَ، وَأَعْطَيْتُ فُلاناً كَذَا، فَقَال عَزَّ وَجَلَّ: أَلَمْ أَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَيْتُك؟ أَلَمْ أَجِدْكَ ضَالاً فَهَدَيْتُك؟ أَلَمْ أَجِدْكَ عَائِلاً

فَأَغْنَيْتُكْ؟ أَلَمْ أَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ؟ أَلَمْ أُوتِكَ مَا لَمْ أُوتَ أَحَداً قَبْلَكَ: خَواتِيمَ سُورَةِ البَقَرَةِ، أَلَمْ أَتَّخِذْكَ خَلِيلاً، كَمَا اتَّخَذْتُ إِبْراهِيمَ خَلِيلاً؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَبِّ»} (أخرجه الحاكم: ٣٩٤٤، من حديث ابن عباس رضي الله عنه، ذكره الهيثمي في المجمع، ج٨ ص ٢٥٣-٢٥٤، وقال رواه الطبراني في الكبير والأوسط وفيه إبن السائب قد إختلط).

واتە: داوایەكم لە پەروەردگارم كرد، خۆزگە داوام نەكردبایە، گوتم: ئەی پەروەردگار! ئیبڕاهیمت كردە خەلیلی خۆت، مووسات كردە دوێندراوی خۆت و قسەت لەگەڵ كرد، بۆ داوود چیایەكانت ملكەچ كردن، خوایان بە پاك دەگرت، فڵانە كەست ئاوات پێدا، [دیارە ژمارەیەكی دیكەی لە پێغەمبەران باس كردوون]، خوا عز وجل، فەرمووی: ئایا تۆم هەتیو لێ هەڵنەكەوت، پەنام دای و، حەواندمیەوە؟ ئایا گومڕا نەبووی ڕێنماییم كردی؟ نەدار نەبووی بێ نیازم كردی؟ ئایا سینەتم گوشادو فراوان نەكرد؟ ئایا شتێكم پێت نەدای كە لە پێش تۆدا نەمداوە بە هیچ كەس، كۆتاییەكانی سوورەتی (البقرة)، ئایا تۆشم نەكردە خەلیلی خۆم، وەك چۆن ئیبڕاهمم بە خەلیل گرتبوو، گوتم: با، ئەی پەروەردگارم!

**سێیەم:** لە بارەی ئایەتی كۆتایی كە دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾، لەو بارەوەش چەند دەقێك دێنین، یەكێكیان ئەمەیە كە دەفەرموێ:

**١)- {مَنْ أُبْلِيَ بَلَاءً فَذَكَرَهُ، فَقَدْ شَكَرَهُ، وَإِنْ كَتَمَهُ، فَقَدْ كَفَرَهُ} (أخرجه أبو داود: ٤٨١٤، والترمذي: ٢٠٣٤، وابن حبان: ٤٣١٥، وصححه الألباني).**

واتە: هەر كەسێك چاكەیەكی لەگەڵدا كراو باسی كرد، ئەوە سوپاسی خوای لەسەر كردوە، (لەسەر ئەو چاكەیە)، بەڵام ئەگەر شاردیەوەو پەنهانی كرد، ئەوە سپڵەیی و بێ نمەكیی بەرانبەر (بە خواو بەرانبەر بە چاكەی خوا) كردوە.

**٢)- {مَنْ أُوْلِي مَعْرُوفاً، فَلْيُكَافِئْهُ، فَإِنْ لَمْ يَقْدِرْ عَلَيْهِ، فَلْيَذْكُرْهُ، فَمَنْ ذَكَرَهُ، فَقَدْ شَكَرَهُ} (أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٩١١١، وغيره).**

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: هـەر کەسـێك چاکەیەکـی لەگـەڵ دا کـرا، بـا پاداشـتی بداتـەوە، ئەگـەر نەیتوانـی، بـا باسـی بـکات، چونکـە هـەر کەسـێك باسـی چاکەیەکـی کەسـێکی کـرد، سوپاسـی ئـەو کەسـەی کـردوە.

**٣)- {مَنْ لَمْ يَشْكُرِ القَلِيلَ لَمْ يَشْكُرِ الكَثِير، وَمَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللهَ، وَالتَّحَدُّثُ بِنِعْمَةٍ شُكْرٌ، وَتَرْكُهَا كُفْرٌ، وَالجَمَاعَةُ رَحْمَةٌ وَالفِرْقَةُ عَذَاب} (أخرجه عبد الله بن أحمد في زوائده: ١٩٣٧٠، والبيهقي في شعب الإيمان: ٩١١٩، وأخرجه الطبراني كما في مجمع الزوائد (٢١٧/٥) قال الهيثمي: رواه عبد الله بن أحمد والبزار والطبراني ورجالهم ثقات).**

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: هـەر کەسـێك سوپاسـی کـەم نـەکات، سوپاسـی زۆریـش نـاکات، (ئـەوەی بـە کـەم نەزانـێ، بـە زۆریـش نازانـێ)، هـەر کەسـێك سوپاسـگوزاریی بـۆ خەڵـك نـەکات، سوپاسـگوزاریی بـۆ خـواش نـاکات، باسـکردنی چاکـە، بریتیـە لـە سوپاسـگوزاریی، بـەڵام واز لێهێنانـی باسـکردنی چاکـە، نادیـدە گرتنـی سـپڵەیی و بـێ نمەکییـەو، کۆبوونـەوەی مسـوڵمانان ڕەحمـەت و بەزەییـە، بڵاوبـوون و پەرتەوازەییـان دەردو مەینەتیـی و ئـازارە.

**٤)- {عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه، قَالَ كُنْتُ جَالِسَاً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَآنِي رَثَّ الثِّيَابِ، فَقَالَ: أَلَكَ مَالٌ؟ قُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ مِنْ كُلِّ الْمَالِ، قَالَ: فَإِذَا آتَاكَ اللَّهُ مَالاً، فَلْيُرَ أَثَرُهُ عَلَيْكَ} (أخرجه النسائي: ٥٢٢٣، وَصححه لألباني).**

واتـە: ئەبـوو لئەحـوەص دەگێڕێتـەوە لـە بابیـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا ﷺ دانیشـتبووم، بینیمـی بەرگـم شـڕ و دڕاو بـوو، فەرمـووی: مـاڵ و سـامانت هەیـە؟ گوتـم: بەڵـێ، ئـەی پێغەمبـەری خـوا لـە هەمـوو جۆرەکانـی مـاڵ و سـامان هەیـە، (لـە ڕیوایەتـی دیکـەدا هاتـوە، گوتوویەتـی: حوشـترم هەیـە، مـەڕم هەیـە، بزنـم هەیـە)، پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: ئەگـەر خـوا مـاڵ و سـامانی پێـدای، بـا شـوێنەواری مـاڵ و سـامانەکە لەسـەر تـۆ دیـار بـێ.

واتە: کەسی دەوڵەمەندو هەبوو، با خۆی ڕووت و ڕەجاڵ و بەرگ شڕ پێشان نەدا، ئەوە سەرسواڵکەریی دەگەیەنێ، مادام هەتە، با پێتەوە دیار بێ، هەیە نیشیەتی بەرگ و پۆشاکی جوان لەبەر دەکات، بۆ ئەوەی لە چاوی خەڵکدا وانەبێ، جێی بەزەیی و پەرۆش بێت! چ جای هەتبێ، بۆچی خۆت وا پێشان دەدەی خەڵك بەزەیی پێتدا بێت؟!

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ یان خوای پەروەردگار خستوویەتە دڵی، یان شارەزای بووە کە هەیەتی، بۆیە کە بەرگەکەی شڕ بینیوە، پێی شتێکی نائاسایی بووەو فەرموویەتی: ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟ مادام کە هەتە با پێتەوە دیار بێ.

# حوکمی گوتنی (الله أکبر) لە کۆتایی خوێندنی بیست و دوو سوورەتەکەی کۆتایی قورئان دا

لە کۆتایی تەفسیرکردنمان بۆ سوورەتی (**الضُّحى**)، مەسەلەیەك باس دەکەین، کە هەموو تەفسیرەکان کەم و زۆر ئاماژەیان پێداوە، سەرەتا با ئەم دەقە بێنین کە (**القُرْطبي**)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ:

**{فَصْلٌ: يُكَبِّرُ القَارِئُ فِي رِوَايَةِ البَزِّيِّ عَن اِبنِ كَثِير، وَقَدْ رَواهُ مُجَاهِد عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَن أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذَا بَلَغَ آخِرَ (وَالضُّحَى) كَبَّرَ بَيْنَ كُلِّ سُورَةٍ تَكْبِيرَةً، إِلى أَنْ يَخْتِمَ القُرآنْ، وَلاَ يَصِلُ آخِرَ السُّورَةِ بِتَكْبِيرِهِ؛ بَلْ يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِسَكْتَةٍ. وَكَأَنَّ المَعْنَى فِي ذَلِكَ أَنَّ الوَحْيَ تَأَخَّرَ عَنِ النَّبِي ﷺ أَيَّامَاً، فَقَالَ نَاسٌ مِنَ المُشْرِكِين: قَدْ وَدَّعَهُ صَاحِبُهُ وَقَلاَهُ؛ فَنَزَلَتْ هَذِهِ السُّورَة، فَقَال: «اللّه أَكْبَر». قَالَ مُجَاهِد: قَرَأْتُ عَلى ابْن عَبَّاسٍ، فَأَمَرَنِي بِهِ، وَأَخْبَرَنِي بِهِ عَن أُبَيّ عَنِ النَّبِي ﷺ وَلاَ يُكَبِّرُ فِي قِرَاءَةِ البَاقِينَ؛ لأَنَّهَا ذَرِيعَةٌ إِلىَ الزِّيَادَةِ فِي القُرْآنْ}.**

واتە: قورئانخوێن، لە ڕیوایەتی بەززیی لە (**إبن كثير**)ەوە، هێناویەتی، هەروەها موجاهیدیش لە ئیبنو عەبباسەوە، ئەویش لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە خوا لە هەموویان ڕازیبێ، {(**الطبري**)یش، بە ژمارە: (٦٣٨١) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، هێناویەتی} لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە کاتێك گەیشتۆتە کۆتایی سوورەتی (**وَالضُّحى**) لە نێوان هەر سوورەتێك و ئەوی دیکەدا (**أَللهُ أَكبَر**)ی کردوە، هەتا قورئانی تەواو کردوە، کۆتایی سوورەتەکەی لەگەڵ (**الله أكبر**)ەکەدا، پەیوەست نەکردوە، بەڵکو ماوەیەك وەستاوە، ئنجا (**الله أكبر**)ەکەی کردوە.

---

(١) ج٢٠، ص٧٨ و ٧٩.

(القرطبي)، دەڵێ: لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە وەحیی لە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ڕۆژێکان دابڕاوە، کۆمەڵێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، (وەك پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا چەند ڕیوایەتێکمان هێنان)، گوتوویانە: هاوەڵەکەی وازی لێهێناوەو لێی زویر و نیگەران بووە، ئنجا ئەم سوورەتە کە دابەزیوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اللـه أكبر)، خوا گەورەترە، (قسەو بانگەشەی بێبڕوایەکان درۆ بوو).

موجاهید دەڵێ: قورئانم لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ) خوێند، فەرمانی پێکردم بە گوتنی: (اَللهُ أكبَر)و، هەواڵی پێدام لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە (اللـه أكبَر)ی کردوە، بەڵام لە قورئان خوێندنی قورئان خوێندنەکانی دی، هیچیان ئەو (اللـه أكبر)ەیان، نەگوتوەو، گوتوویانە: ئەوە بیانوویەکە بۆ زیادکردن لە قورئاندا.

ئنجا با جارێ قسەکەی (القرطبي) تەواو بکەین، کەدەڵێ:

{قُلْتُ: القُرآنُ ثَبتَ نَقْلاً مُتَوَاتِراً سُوَرُهُ وَآيَاتُهُ وَحُرُوفُهُ؛ لاَ زِيَادَةَ فِيهِ وَلاَ نُقْصَان؛ فَالتَّكْبِيرُ عَلَى هَذا لَيْسَ بِقُرْآنٍ، فَإِذَا كَانَ بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم المَكْتوبِ فِي المُصْحَفِ بِخَطِّ المُصْحَفِ لَيْسَ بِقُرْآنْ، فَكَيْفَ بِالتَّكْبِيرِ الَّذي هُوَ لَيْسَ بِمَكْتُوب! أَمَّا أَنَّهُ ثَبتَ سُنَّةً بِنَقْلِ الآحَادِ، فَاسْتَحَبَّهُ اِبْنُ كَثير، لا أَنَّهُ أَوْجَبَهُ، فَخَطَّأَ مَن تَرَكَهُ. ذَكَرَ الحَاكِم أَبو عَبْدِالله مُحَمَّد بنِ عَبْدِ الله، الحَافِظ فِي كِتابِ المُسْتَدْرَك لَهُ عَلَى البُخَاري وَمُسْلِم: حَدَّثَنَا أَبُو يَحْيَى مُحَمَّدْ بْنِ عَبْدِ الله بْنِ مُحَمَّد بْنِ عَبْدِ الله بْنِ يَزِيد، المُقْرئ الإمامِ بِمَكَّة، فِي المَسْجِدِ الحَرَام ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبو عَبْدِ الله مُحَمَّد بْنِ عَلِي بْنِ زَيْدٍ الصَّائِغ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَد بنِ مُحَمَّد بنِ القَاسِمِ بْنِ أَبِي بَزَّة: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ بنِ سُلَيْمَان يَقُول: قَرَأْتُ عَلَى إِسْمَاعِيل بنِ عَبْدِ الله بنِ قُسْطَنْطِين، فَلَمَّا بَلَغْتُ {وَالضُّحَى} قَالَ لِي كَبِّر عِنْدَ خَاتِمَةِ كُلِّ سُورَةٍ حَتَّى تَخْتِم، فإِنِّي قَرَأْتُ عَلَى عَبْدِ الله ابْنِ كَثير فَلَمَّا بَلَغْتُ {وَالضُّحَى} قَالَ: كَبِّر، حَتَّى تَخْتِمْ. وَأَخْبَرَهُ عَبْدِ الله ابْنُ كَثيرٍ، أَنَّهُ قَرَأَ عَلى مُجاهِد،

**وَأَخْبَرَهُ مُجَاهِد أَنَّ ابن عَبَّاس أَمَرَهُ بِذَلِك، وَأَخْبَرَهُ ابْنِ عَبَّاس أَنَّ أُبَيّ بْنِ كَعْب أَمَرَهُ بِذَلِكَ، وَأَخْبَرَهُ أُبَيّ بْنِ كَعْبْ أَنَّ رَسولُ اللّهِ ﷺ أَمَرَهُ بِذَلِك}** (**أخرجه الحاكم: ٥٣٢٥، وقال: هَذا حديث صحيح ولم يخرجاه**).

واتە: قورئان بە شێوەیەکی موتەواتیر چەسپاوە (کۆمەڵێك لە پێغەمبەریان بیستوە، ئەوانیش گەیاندوویانە بە کۆمەڵێك لە دوای خۆیان، ئەوانیش هەروا تاکو گەیشتۆتە ئێمە، ئەوە تەواتورە، کە نەگونجێ ئەو کۆمەڵە لەسەر درۆ کۆببنەوە، ئاوا بە ئێمە گەیشتوە)، هەم ئایەتەکانی، هەم سوورەتەکانی، هەم پیتەکان، کەمیی و زیادیی تێدانیە، بۆیە (**الله أکبر**) کردن لە کۆتایی سوورەتی (**الضُّحى**)وە، تاکو سوورەتی (**النَّاس**) ئەمە بەشێك نیە لە قورئان.

ئنجا (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، لە موصحەفەکانیشدا نووسراوە، لە سەرەتای هەر سوورەتێکەوە نووسراوە، {جگە لە سوورەتی (**التوبة**)}، ئەگەر ئەوە بە قورئان دانەنرێ، چۆن ئەو (**الله أکبر**) گوتنە کە نەشنووسراوە، بە بەشێك لە قورئان دادەنرێ؟

{دەڵێم: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، بێگومان ئایەتێکە لە قورئان، ئەگەرنا هاوەڵان نەیاندەخستە نێو موسحەفەوە، ڕایەکی بێهێز هەیە لەوبارەوە کە: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، تەنیا بۆ لێکجیاکردنەوەی سوورەتەکانە، ئەگەرنا بەشێك نیە لە هیچ کام لە سوورەتەکان، بەڵام ئەوە ڕایەکی بێهێزە.

ئنجا ئەو (**الله أکبر**) گوتنە، بە شێوەی (**آحاد**) نەقڵ کراوەو (**إبن کثیر**)، (کە یەکێکە لە حەوت قورئانخوێنەکان)، بە چاکی زانیوە، بەڵام بە پێویستی نەزانیوەو، کەسێك وازی لەو (**الله أکبر**) گوتنە هێنابێ، بەهەڵەی دانەناوە، ئنجا (**قرطبي**) دوایی ئەو دەقە دێنێ لە (**الحاكِم**)ەوە (**أبي عبد الله محمد بن عبد الله الحافظ**) لە کتێبەکەی (**المستدرك على الصحيحين**)ەوە، دەڵێ: ئەبوو یەحیا موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی

یەزید، کە قورئان خوێن و ئیمام بووە لە مەککە، پێشەوای هەموو قورئان خوێنەکان بووە لە مزگەوتی حەرام دا، گوتوویەتی: ئەبوو عبدولڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی زەیدی صائیغ، بۆی باسکردووین، ئەویش گوتوویەتی: ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی قاسغم لە ئەبی بەززەوە، بۆی باس کردووین، کە گوێی لە عیکریمەی کوڕی سولەیمان بووە گوتوویەتی: قورئانم لەسەر ئیسماعیلی کوڕی عەبدولڵای کوڕی قوستەنتین خوێند، کاتێك گەیشتمە (**والضُّحی**)، پێی گوتم: (**الله أكبر**) بکە لە کۆتایی هەر سوورەتێك تاکو کۆتایی قورئان، چونکە من قورئانم لەسەر عەبدولڵای کوڕی **کثیر**، خوێند، کاتێك گەیشتمە (**والضحی**)، گوتی: (**الله أكبر**) بکە تاکو قورئان تەواو دەکەی، ئەویش عەبدولڵای کوڕی **کثیر**یش هەواڵی پێداوە کە قورئانی لەسەر (موجاهید) خوێندوە، موجاهیدیش گوتوویەتی: منیش لەسەر (إبن عباس)م خوێندوە، فەرمانی بەوە پێکردووم، ئەویش هەواڵی پێداوەو، گوتوویەتی: قورئانم لەسەر ئوبەیی کوڕی کەعب خوێندوە ئەویش بەوە فەرمانی پێکردووم، ئوبەیی کوڕیی کەعبیش گوتوویەتی: قورئانم لەسەر پێغەمبەر ﷺ خوێند بەوە فەرمانی پێکردم، (**الحاكِم**)، گوتوویەتی: ئەمە فەرموودەیەکە سەنەدەکەی ڕاستە، بەڵام بوخاریی و موسلیم نەیان هێناوە.

بەڵێ: ئەم دەقە هەیەو، با منیش ڕای خۆم لەوبارەوە بڵێم:

پێم وایە وەك (**القرطبي**)یش گوتوویەتی، ئەوە ڕای یەکێکە لە حەوت قورئان خوێنەکان (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ)، هەڵبەتە قورئانخوێنەکانیش تەنیا حەوت نەبوون، وەك لە باسێکی تایبەت لە بارەی قورئانەوە لە کۆتایی ئەم تەفسیرەدا باس دەکەین[1]، بەڵام ئەو حەوتە هەڵبژێردراون لە لای یەکێك لە زانایانەوەو زیاتر ناودار بوون، ئەگەرنا وێڕای حەوتەکان سێی دیکەش هەن پێکەوە پێیان دەگوترێ:

---

(١) خوا پشتیوان بێ لە چاپی دووەمی ئەم تەفسیرەدا ئەو بابەتە کە زۆر فراوانە دەیکەینە پێشەکی کۆی تەفسیرەکەو دەیخەینە بەرگی یەکەمیەوە.

(دە قورئانخوێنەکان)، بەڵکو هەندێکیان دەیانگەیەننە چواردەش.

منیش ڕام وایە مادام ئەمە تەنیا ڕای (**إبن كثير**)ە، با (**حاکِم**)یش ئەو دەقەی لە بارەوە هێنابێ، وا باشترە پابەندیی بکرێ، بەڕای زۆرینەی قورئانخوێنان و زانایانی قورئان خوێنەوەو، ئەو (**الله أكبر**)انە، لە کۆتایی سووڕەتەکاندا نەگوترێن و ئەگەر کەسێکیش گوتی، بایی ئەوە شتێکی بە دەستەوە هەیە،بۆ چۆنیەتیی گوترانی: (الله أكبر)یش، زانایان ڕاجیاییان هەیە، هەندێکیان گوتوویانە: (**الله أكبر كبيرا**)، هەندێکیش هەر گوتوویانە: (**الله أكبر**)، هەندێکیشیان بە شێوەیەکی دیکە گوتوویانە، بۆیەش وام پێ باشترە ئەو (**الله أكبر**)انە نەگوترێن، تاکو کەسێك وا نەزانێ شتێك لە قورئان زیاد کراوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری خۆی، وەك چۆن بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەو هەموو ڕاستییانەی خستوونەڕوو و ئەو هەموو چاکانەی لەگەڵدا کردوون، تەوفیقی ئێمەش بدات، بە دوای پێغەمبەری کۆتایی ﷺو سەروەری پێغەمبەراندا بڕۆین و، پشك و بەشی ئێمەش بخاتە نێو ئەو نازو نیعمەتانەوە کە بە پێغەمبەری خۆی ﷺ داون لە دنیاو لە دوارۆژداو، پشك و بەشی ئێمەش بخاتە نێو ئەو دینداریییە ڕاست و ساغەوە، کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کردوویەتی، کە ئەویش بە دڵنایی بە هۆی ئەم قورئانەوە کە هیدایەتی خوایەو دایبەزاندوەتە سەر دڵی موبارەکی پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ، ئەو نازو نیعمەتانەی دنیاو دوارۆژی پێبڕاون.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری سووڕەتی (**الضحى**) دێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێک

بەڕێــزان!

ئەمڕۆ کە (١٣)ی (ذي الحجة)ی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر (٢٠٢٠/٨/٣)ی زایینیی، لە شاری هەولێر، خوا پشتیوان بێت دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سووڕەتی (الشرح)، وەك عادەتی خۆشمان پێشەکی پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە دەخەینەڕوو لە حەوت بڕگەدا:

## پێناسەی سووڕەتی (الشرح) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە سێ ناوی بۆ بەکارهێنراون:

١- (سُورَةُ الإنشراح).

٢- (سُورَةُ الشرح).

٣- (سُورَةُ أَلم نشرح).

بەڵام زیاتر بە (سُورَةُ الشرح) ناسراوە، ئەگەرنا ئەو دوو ناوەی دیکەش بەکارهاتــوون.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سووڕەتە بەیەکدەنگیی هەموو زانایان، سووڕەتێکی مەککەییەو، لەوبارەوە ئەم دەقە دێنین:

{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَة: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ۝١﴾ بِمَكَّـةَ} (أخرجـه السـيوطي فِي الـدر المنثـور: ج٨، ص٥٤٧، وابـن الضُّريـس والنحـاس و ابـن مردويـه والبيهقي، وقال عائشـة وابـن الزبـير  مثلـه)، واتـه: لـه عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـەوە  گێڕدراوەتـەوە گوتوویەتـی: سـووڕەتی ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ۝١﴾ لـە مەککـەدا دابەزیـوە.

هەروەهـا (السـیوطي)، لـە سـەرچاوەی ناوبـراودا یانـی: (الـدر المنثـور)، هەمـان شتیشـی پاڵداوەتـە لای عائیشـەو عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر ، ئەوانیـش هەمـان شـتیان گێڕاوەتـەوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لـە موصحـەف دا ژمارەکـەی نـەوەدو چـوار (٩٤)ەو، لـە دابەزینـدا دوازدەیەمیـن سـووڕەتە، پێـش سـووڕەتی (العـصر)و، دوای سـووڕەتی (الضحـی) دابەزیـوە، ئـەوەش بۆچوونـی ئیبنـو زەیـدو هەندێـك لـە زانایانـە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمـارەی ئایەتەکانـی ئـەم سـووڕەتە هەشـت (٨)ە، بەبـێ ڕاجیایـی لـە نێـوان زانایـانی ژمێـرەری ئایەتەکانـی قورئانـدا.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

بابەتـی سـەرەکیی ئـەم سـووڕەتە بریتیـە لـە دەرخسـتنی لوتـف و میهرەبانیـی خوا لەسـەر پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺو، لابردنـی خـەم و پـەژارەی و، کار بـۆ ئاسـانکردنی و، سـینە بـۆ فراوانکردنـی و، ناوبەرزکردنـەوەی و، گفـت پێدانـی بـۆ سـێنا

کـردنی کاروبـاری هـەرکات زەحمـەت بـوو، هەروەهـا فەرمـان پێکـردنی بـۆ ڕەنجـدانی لـە بەندایەتییکردنیـداو، ئارەزوومەندیـی پـتری بـەرەو لای خـوای پـەروەردگار.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لـەم سـوورەتەدا دڵدانەوەیەکـی زۆری پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەیـەو، لـەو بـارەوە تاکـە سـوورەتە کـە: قورسـایی لەسـەر لابـران و، ناوبەرزکرانـەوە و، کاری قـورس ئاسـانکران بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لـەم سـوورەتەدا خراونـەڕوو، ئـەم سـوورەتە موبارەکـە نێواخـن و نێوەڕۆکەکـەی زۆر وەك سـوورەتی پێـش خـۆی (**سـورة الضحـى**) دەچـێ، بۆیـەش هەندێـك لـە زانایـان بـە یـەك سـوورەتیان دانـاون و، بـە یەکـەوە خوێندوویـانـن، بـەڵام ڕای ڕاسـت هـی زۆربـەی زانایانـە کە دوو سـوورەتی جیـاوازن و، وێکچوونیـان لـە نێوانـدا هەیـە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی:

ئێمە کۆی ئەم هەشت ئایەتەی ئەم سوورەتە موبارەکە، دەکەینە یەك دەرس.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە کـۆی ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە: (١ - ٨)، پێکـدێ، پێشـتریش باسـمان کـرد کـە لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا خـوا ﷻ میهرەبانیـی و بەخشـشی بـێ سـنووری خـۆی بـۆ کۆتـا پێغەمبـەری خـۆی ﷺ دەردەخـات، سـەرەتا دەیدوێنـێ و دەفەرمـوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، ﴿ أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ ۝١ ﴾، ئایـا سینەتمان بـۆ گوشـادو فـراوان و ئـاوەڵا نەکـردی، ﴿ وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ ۝٢ ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ ۝٣ ﴾، ئـەو کۆڵـە قورسـەی لەسـەر پشـت بـوو لامـان نەبـرد، کـە پشـتتی وەجیڕەجیـڕ خسـتبووی، وەك چـۆن کەسـێك کۆڵێـکی قورسـی لەسـەر دابـنرێ، بـە هـۆی قورسـییەوە کۆڵەکـە جیـڕەی دێ، ئـەو کۆڵـەش پشـتی گـران کردبـووی و، چەماندبـووی و، پشـتت جیـڕەی دەهـات لـە بـن ئـەو کۆڵـە قورسـەدا، ﴿ وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ ۝٤ ﴾، هەروەهـا ئایـا نـاوی تۆمـان بـەرز نەکـردەوە؟ دوایـی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ۝٥ إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ۝٦ ﴾، بەدڵنیایـی لەگـەڵ سـەغڵەتیی و ناڕەحەتییـدا ئاسـانیی هەیـە، (جارێکـی دیکـەش بـۆ جەختکردنـەوە) بەدڵنیایـی لەگـەڵ سـەغڵەتیی و ناڕەحەتییـدا ئاسـانیی و فەڕحانیـی هەیـە، ﴿ فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ ۝٧ ﴾، ئنجـا هـەرکات لێبوویـەوە، پـێ بچەقێنـە، واتـە: هـەرکات لـە کارێـك بوویـەوەو دەسـت بـە تـاڵ بـووی، پـێ لـە کارێـکی دیکـەدا بچەقێنـەو، خـۆت مانـدوو بکـە بـە کارێکـی دیکـە، ﴿ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرۡغَب ۝٨ ﴾، هەمیشـەش هەوڵبـدە جـار بـۆ جـار پـتر ئارەزوومەنـدی دیـداری پـەروەردگارت بـە، بـەرەو لای پـەروەردگارت بجووڵـێ، پاداشـت و ڕەزامەندیـی زیاتـری پـەروەردگارت وەدەسـت بێنـە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَب ﴿٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . (ئەی موحەممەد!) ئایا سینەتمان بۆت فراوان نەکرد؟ ﴿١﴾ قورساییشتمان لەسەرت لانەبرد؟ ﴿٢﴾ ئەوەی لەبەر گرانیی پشتتی وەجیرە خستبوو ﴿٣﴾ باس و ناوباگیشتمان بۆ بەرزنەکردیەوە؟ ﴿٤﴾ جا بێگومان لەگەڵ زەحمەت و سەغڵەتییدا ئاسانیی هەیە ﴿٥﴾ بە دڵنیایی لەگەڵ زەحمەت و سەغڵەتییدا ئاسانیی هەیە ﴿٦﴾ ئنجا هەر کات لە کارێك لێبوویەوە، بۆ کارێکی دیکە خۆت ماندوو بکە ﴿٧﴾ بەرەو لای پەروەردگاریشت ئارەزوو بکە ﴿٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(نَشْرَحْ): (أَصْلُ الشَّرْحِ بَسْطُ اللَّحْمِ وَنَحْوِهِ، وَشَرْحُ الصَّدْرِ: بَسْطُهُ بِنُورٍ إِلَهِي وَسَكِينَةٍ مِنْ جِهَةِ اللهِ وَرُوحٍ مِنْهُ)، (شرح) لە ڕیشەدا بە مانای بڵاوکردنەوەو یەکلاکردنەوەی گۆشت و وێنەی گۆشتە، مەبەست لە (شَرْحُ الصَّدْر) سینەفراوان بوونە بە ڕووناکییەکی خوایی و ئۆخژنێك کە لەلایەن خواوە دێ.

(وِزْرَكَ): (الوِزْرُ: الثِّقَلُ، تَشْبِيهاً بِوَزْرِ الجَبَلِ، وَيُعَبَّرُ بِذَلِكَ عَنِ الإِثْمِ)، (وزر): بە مانای قورساییە، چوێنراوە بە پەناگە لە چیاداو، تەعبیریشی پێدەکرێ لە گوناح.

(أَنقَضَ ظَهۡرَكَ): (النَّقْضُ: إنْتِشَارُ العَقْدِ مِنَ البِنَاءِ وَالحَبْلِ، نَقَضَهُ: كَسَرَهُ حَتَّى صَارَ لَهُ نَقِيضٌ)، (نقض) واتە: بڵاوبوونەوەی گرێ، لە دیوارو گوریس (کە گرێ دەدرێ، دوایی گرێیەکەی ببێتەوە)، دەگوترێ: (نَقَضَهُ) واتە: شکاندی تاکو دەنگی هات، کەواتە: (أنقض ظهرك) دەنگی لە پشتت هێنابوو، یاخود پشتتی چەماندبوو، کە بێگومان مەبەست پێی کۆڵی قورسی مەعنەوییە.

(وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ): (الذكر) بە مانای ناووناوبانگ و باس و خواسە، ناوبانگتمان بۆ بەرزکردیەوە.

(فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا): بەدڵنیاییی لەگەڵ سەغڵەتیی و قورسایی دا سێنایی هەیە، دەگوترێ: (عَسَرَ الزَّمَانُ يَعْسِرَ عَسْرَاً، أي: اشْتَدَّ) ڕۆژگارەکە سەخت بوو، نارەحەت بوو، ئەگەر (عَسَرَ) بێ، بەڵام (عَسِرَ) یانی: (صَعُبَ وَاشْتَدَّ، فَهُوَ عَسِرٌ) واتە: قورس بوو، زەحمەت و سەخت بوو، ئەو شتە زۆر قورس و سەختە، مانایەکەیان لە یەکدی نیزیکە.

(يُسۡرًا): (يَسَرَ الشَّيءُ يَيْسَرُ يَسْرَاً: سَهُلَ وَأَمْكَنَ، ولاَنَ وانْقَادَ)، (يَسَرَ الشَّيءُ يَيْسَرُ يَسْرَاً) واتە: شتە ئاسان بوو، ئاسان دەبێ، ئاسان بوون، (لاَنَ وانْقَادَ) نەرم بوو، ملکەچ بوو، ئەو کارەی کە دەویسترا ئەنجامبدرێ، ئاسان بوو.

(فَرَغۡتَ): (فَرَغَ الشَّيءُ يَفْرغُ فَرَاغَاً، أي: خَلا)، واتە: شتەکە بۆش بوو، (يَفْرغُ فَرَاغَاً): بۆش دەبێ، بۆش بوون.

(فَٱنصَبۡ): (نَصِبَ يَنْصَبُ أي: تَعِبَ وأعيا، أو جَدَّ واجتهد فهو ناصبٌ)، (نَصِبَ يَنْصَبُ) دوو واتای هەن، یەکەمیان: ماندوو بوو، دووەمیان: هەوڵیدا و خۆی ماندوو کرد، ئەو خۆماندووکەرو ڕەنجدەرە.

(فَٱرۡغَب): (رَغِبَ يَرْغَبُ رَغْبَةً وَرَغْبَاً ورُغْبَةً: حَرِصَ عَلَى شَيءٍ وَطَمَعَ فِيهِ)، ئارەزووی کرد، ئارەزوو دەکات (رَغْبَةً وَرَغْبَاً ورُغْبَةً) هەرسێکیان چاوگن، واتە: سووربوون لەسەر شتەکە، تەما پێی هەبوون، تەماع تێیدا هەبوون.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ وەك سـوورەتی (الضحـی) لەم سـوورەتە موبارەکەشـدا ڕوو لـە پێغەمبەری خاتـەم ﷺ دەکات و دەفەرمـوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

١- ئەم سوورەتە موبارەکە دەخوێنم بە ناوی خوا وەك پەرستشێك، یان دەستپێکردنی خوێندنی ئەم سوورەتەم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەیەز

٢- بە پێی بەرنامەی خوا دەیخوێنمز

٣- بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیخوێنمز

٤- بە مەبەستی ڕازییکردنی خوا دەیخوێنم.

ئنجـا خـوا ﷻ ڕوو دەکاتـە پێغەمبەرەکـەی ﷺو دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ ﴾، ئایـا سـینەتمان بـۆت فـراوان نەکـرد؟ سـینەتمان بـۆت گوشـاد نەکـرد؟ سـینەتمان بـۆت ئاوەڵانەکـردەوە؟ لێـرەدا ئـەو هەمزەیـە (أ) بـۆ پرسـیارکردنە، پرسـیارکردنی دانپێداهێنـان، واتـە: شـتەکە هێنـدە ڕوونـە، بەرانبەرەکـەت ناچـارە دانـی پێدابێنـێ، ئەگـەر پەرداخێـك ئـاو لـە پێشـت بـێ و، بڵێیە کـەسی بەرانبـەرت: ئایا ئەوە پەرداخێـك ئـاو نیـە؟! مەبەسـتت ئەوەیـە ناچـاری بکـەی دانـی پێدابێنـێ، لێـرەش خوا کـە بـەو جـۆرە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەدوێنـێ، مەبەسـتی ئەوەیـە، چونکـە پرسـیار کردنەکـە بـۆ لابـردن (نفي)یـەو، ڕسـتەکە ئەگـەر هەمـزە (أ)ی پرسـیارکردنی لەسـەر لابـەری لابـردن (نفي)یـە، ئاوایـە: (لَـمْ نَـشْرَح لَـكَ صَـدْرَك)، سـینەتمان بـۆ گوشـاد نەکـرد، بـەڵام بـە هـۆی پرسـیارکردنەکەوە خـوا نکووڵیـی دەکات لـەوەی سینەی وی گوشـاد نەکردبـێ، بەڵکـو سـینەی بـۆ گوشـاد کـردوە، تاکـو سرووشی خـوا وەربگـرێ، وەك لـە سـوورەتی (الشـعراء)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ١٩٣ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ١٩٤ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ١٩٥ ﴾، واتـە:

هەروەهـا ئـەم (قورئـان)ە بـە دڵنیایـی دابەزێـنراوی پـەروەردگاری جیهانییانـە . ڕووحـی ئەمینـدار دایبەزاندۆتـە . سـەر دڵـت، تاکـو لـە ترسـێنەران و هۆشـیارکەرەوان بـی. (ئـەم قورئانـە) بـە زمانێکـی عەرەبیـی ڕوون و ڕۆشـنکەرەوەیە.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ ﴾، ئـەم (و) واوی بادانـەوە (**واو العاطفـة**) یـە، ڕسـتەکە دەگێڕێتـەوە بـۆ سـەر ڕسـتەی پێشـێ، واتـە: هەروەهـا ئایـا ئـەو کۆڵـە قورسـەی لەسـەرت بـوو، لەسـەرمان لا نەبـردی؟ (**وِزْر**) بـە مانـای قورسـاییە، هـەر لـەوەوەش خوازراوەوەتـەوە بـۆ گونـاح، چونکـە گونـاح شـانی مـرۆڤ قـورس دەکات، بەڵام بـە دڵنیایـی لێـرەدا مەبەسـت پێـی گونـاح نیـە، چونکـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بـەر لـەوەی خـوا بـە پێغەمبـەر ﷺ هەڵیبژێـرێ گوناهـی لەسـەر حیسـاب نەکـراوەو، گونـاح لەسـەر هیچکـەس حیسـاب ناکـرێ تاکـو خـوا پەیامـی خـۆی دەنێـرێ، پێغەمبەرانیـش صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەربێ، پاش نێردرانیـان خـوا دەیانپارێـزێ لـە گونـاح و سـەرپێچییان، وەك کوفـر و شـیرك تـاوان و سـتەم و شـتی ناپەسـند.

کەواتـە: مەبەسـت پێـی ئـەو حاڵەتـە دەروونییەیـە کـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ هەسـتی بـە قورسـایی و سـەغڵەتیی کـردوە، بـەوەی کە لـە نێـو هـۆز و کۆمەڵگایەکەیدا گـوزەراوە: جگـە لـە خـوا دەپەرسـتن، لـە ڕووی سیاسـییەوە بـێ سـەروبەرن، لـە ڕووی ئابوورییـەوە قڕیـی و پڕیـی و چینایەتیـی هەیـە، لـە ڕووی ڕەوشـتییەوە داڕووخـاون، لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە هەڵوەشـاون، لـە ڕووی خێزانییـەوە .... هتـد، موحەممەدیـش بـە عەقڵـە سـاغ و سرووشـتە پاکەکـەی خـۆی زانیویەتـی، ئـەو خەڵکە لـە گومڕایـی و، لادان و سەرلێشـێواویی دان، هـەر بۆیـەش جارجـار چـووە بـۆ ئەشـکەوتی حیـڕا، بـەر لـەوەی خـوای پـەروەردگار وەحییشـی بـۆ بنێـرێ و خـۆی دوورگرتـوە لـەو کۆمەڵگایـە، زانیویەتی ئەوانـە لـە گومڕایـی دان لـە ڕووی عەقیـدەوە، لـە ڕووی هەڵسـوکەوتەوە، لـە زۆربـەی ڕەهەندەکانـی ژیانیانـدا، خـوا ڕێنمایـی ئـەوی کـردو، فێریشـی کـرد چـۆن ڕێنمایـی ئـەو خەڵکـە گومـڕاو نەزانـە بـکات و، لـەو زەلـکاوی بتپەرسـتیی و نەفامییـە ڕزگاریـان بکات.

﴿ ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ ﴾، (**نقیـض**) دەنگـی جیڕەجیـڕە، کاتێـك کۆڵێکی قـورس دەخەیە سـەر پشـتت، یـان یـان بارێـکی قـورس دەخەیـە سـەر پشـتی وڵاخێـك، جیڕەی لـێ دێ،

واتە: ئەو کۆڵەگرانەی پشتی تۆی وەجیڕە خستبوو، پشتی تۆی قورس کردبوو، هەندێك گوتوویانە: پشتی تۆی چەماندبوو، ئەوەش مانایەکی خوازراوە بۆ ئەم وشەیە، ئەگەرنا وشەی (**أنقض**) یانی: وایلێکردبوو (**نقیض**)ی هەبێ، (**نقیض**)یش بریتیە لە جیڕەو دەنگێك کە لە کۆڵ و باری قورس دێ.

﴿ وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ ﴾، دیسان (و)ەکە واوی بادانەوەو گێڕانەوەیە، واتە: ئایا ناوبانگ و باس و خواسی تۆمان بەرزنەکردەوە؟ ئەوانە هەموویان پرسیارکردنی دانپێداهێنانن، یانی: بە دڵنیایی وامان بۆ کردی.

﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ﴾، ئنجا لەگەڵ زەحمەتیی و قورسیی دا ئاسانیی و سێنایی هەیە، ئەو سەغڵەتییەی تۆ تێیکەوتووی بە هۆی پێغەمبەرایەتییەوە، ئاسانییشی بە دوادا دێ، چ لە دنیادا چ لە دوارۆژدا.

﴿ إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ﴾، بێگومان لەگەڵ زەحمەتیی و قورسیی دا، ئاسانیی و سێنایی هەیە، (العسر) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، لە هەردووکیاندا یەکە، بەڵام (یسر) بە نەناسراو (**نکرة**) هاتوە، بۆیە (**یُسْر**) ەکان جیان، لەبەر ئەوەشە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (**لن یغلب عُسْرٌ یسرین**) زەحمەتیی وماندووبوونێك بەسەر دوو ئاسانییاندا زاڵ نابێ.

﴿ فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ ﴾، بۆیە هەر کاتێك لێبوویەوە لە کارێك بوویەوە، پێ بچەقێنەو، خۆت ماندووبکە بۆ کارێکی دیکە، (فَٱنصَبۡ) بە مانای دەست بەکاربوون لە کارێکی دیکەدا و، بە مانای خۆماندوو کردن و زەحمەتکێشانیش دێ، (**نَصِبَ يَنْصَبُ أي: تَعِبَ وأعيا، أو جَدَّ واجتهد فهو ناصبٌ**)، (**نَصِبَ يَنْصَبُ**) دوو واتای هەن، یەکەمیان: ماندوو بوو، دووەمیان: هەوڵیدا و خۆی ماندوو کرد، ئەو خۆماندووکەرو ڕەنجدەرە.

﴿ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرۡغَب ﴾، ئارەزووی لای پەروەردگارت بکە، یانی: چ شتێك لە خوات نیزیك دەخاتەوە بەرەو پەروەردگارت دەبات، ئەو کارە ئەنجام بدە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیانـدنی خـوای میهرەبـان بـۆ پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەد ﷺ، کـە سینەی فراوانکردووەو، باری سەرشانی لابردوە کە پشتی وەجیرە خستبوو، ناوو شۆرەتیشـی بەرزکردۆتـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ۝١ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ۝٢ الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ ۝٣ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ۝٤﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾، ئایا سینەتمان بۆت گوشاد نەکرد؟ پێشتر باسمان کرد، کە لێرەدا هەمزەی پرسیارکردن بۆ پرسیارکردنی دانپێداهێنان **(همزة الإستفهام التقريري)** ە، **(تقرير)** واتە: وا بکەی بەرانبەرەکەت دانی پێدابێنێ، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ئایا سینەتمان بۆت گوشادو فراوان نەکردوە؟ یانی: وامان کردوە، چونکە لە ڕێزمانی هەموو زمانان‌دا وایە، کە لابردنی لابردن **(نفي النفي)** دەبێتە هۆی چەسپاندن، لێرەشدا: **(لَمْ نَشْرَح لَكَ صَدْرَك)** لابردنە، بەڵام هەمزەکە کە دەچێتە سەری: (أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ) پرسیارکردن هەمزەکە، لابردنەکەی دیکە لادەبات، واتە: **(شَرَحْنَا لَكَ صَدْرَكَ)** سینەتمان بۆت فراوان کرد.

(الـشَّرْحُ: **فِي أَصْلِ اللُّغَةِ بَسْطُ اللَّحْمِ وَنَحْوِهِ**) (شرح) لـە بنەڕەتی زمانـدا یەکاڵاکردنی گۆشـت و وێنـەی گۆشـتە، دوایـی خوازراوەتـەوە بۆ فـراوان کردن.

یەکێـك لـە ڕوونکـەرەوانی قورئـان دەڵـێ: **(شَرْحُ صَـدْرِهِ، كِنَايـةٌ عَـنِ الإنْعَـامِ عَلَيْـهِ بكُلِّ مَـا تَطْمَـعُ إلَيـهِ نَفْسـهُ مِـنَ الكَـمَالاَتِ وَإعْلاَمـه برِضَـا اللـهِ عَنْـهُ وَبَشَـارَته بنَـصره فِي الدُّنيَـا)**،

واتـە: سـینەفراوانکردنی پێغەمبـەر ﷺ مەبەسـت پێـی چاکـە لەگەڵـدا کـردنی خوایـە بـۆی، بـە هەمـوو ئـەوەی کـە نەفسـی ئـارەزووی کـردوە لـە شـتە بـاش و تـەواوەکان و ئاگادارکردنەوەیەتـی لـە ڕازیبوونـی خـوا لێـی و، مـوژدە پێدانیەتـی بەسـەرکەوتنی بەسـەر کۆسـپ و تەگـەرەکان و ناحـەزو دوژمنەکانیـدا.

کـە بێگومـان ئـەو سـینەفراوانییە، زیاتـر مەبەسـت پێـی لایەنـە مەعنەوییەکەیەتی، بـەڵام لـە ڕووی جەستەییشـەوە، دیسـان چەنـد جارێـك سـینە گوشـاد کـران و دڵپـاك کرانـەوەی بـۆ هاتۆتـە پێـش، وەك دوایـی ئامـاژە دەکەیـن بـە سـێ دەق کـە لـەو بـارەوە هاتـوون.

٢)- ﴿وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ﴾، هەروەها ئەو قورساییەی لەسەرت بوو لەسەرمان لابردی، (**الوِزْرُ: الثِّقلُ وَالحَرَجُ، وَالمقْصُودُ بالوِزْرِ كُلُّ مَا فِي الجَاهِلِيَّةِ فِي العَقَائِدِ وَالعَادَاتِ المنَاقِضَةِ للفِطْرَة**) (**وزر**): بە مانای قورسایی و سەغڵەتیی دێ و، بە مانای گوناهیش دێ، کە مەبەست پێی هەرچییە کە لە بیروباوەڕەکان و داب و نەرێتەکان لە سەردەمی نەفامیی دابوون و، پێچەوانەی زگماك و ناخی پاکی هەر مرۆڤێکن، بە تایبەت هی پێغەمبەری خاتەم ﷺ].

هەروەهـا (**الـوزر: الحمـل الثِّقـل**) (**وِزْر**) بـە مانـای بـاری قـورس دێ، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی ئـەو حاڵەتەیـە کـە پێغەمبـەر ﷺ پێـش پێغەمبەرایەتیـی هەسـتی بـە نارەحەتیـی و بارقورسـیی و سـەغڵەتییەکی زۆر کـردوە لـە کۆمەڵگاکـەی خۆیـدا، زانیویەتـی کـە لـە ڕووی بووناسـییەوە، لـە ڕووی بیـرو بـڕواوە، لە ڕووی پەرستشـەوە، لـە ڕووی کۆمەڵایەتیـی و خێزانییـەوەو ... هتـد، تـووشی لادان و تاوانێکی زۆر بـوو ون.

ئنجا خوا باسی ئەو بارو کۆڵە قورسە دەکات:

٣)- ﴿ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ﴾، کە پشتیی وەجیڕە خستبوو، (**أَنْقَضَ: أي: جَعَلَ الشَّيءَ ذَا نَقِيض**) شتەکەی وا لێکرد خاوەنی (**نقیض**) بێ، (**والنقيض: صوت صرير المحمل والرَّحل، وصوت عظام المفاصل**) (**نقیض**)یش بریتیە لە دەنگی جیڕەی بارو کۆڵ ئەو جلەی

دەیخەنە سەر پشتی وڵاخ، هەروەها دەنگی ئێسقانی جومگەکانیشە، جاری وایە مرۆڤ جومگەکانیشی قرچەیان لێ دێ.

٤)- ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴾، هەروەها باس و خواسی تۆو، ناوناوبانگی تۆمان بەرزکردەوە، هەڵبەتە بەرزکردنەوەی ناوبانگ و باس و خواسی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی ئەوەوە بوو کە خوا کردی بە هەڵگری کۆتا پەیامی خۆی، هەروەها خوا ناوی پێغەمبەری ﷺ خستۆتە گەڵ ناوی خۆی، لە بانگ و قامەت و تەحییات و وتارەکاندا بە گشتیی و، لە چەندان شوێنی قورئاندا، بەڵام وێڕای ئەمە، ئەوەش دەگەیەنێ کە خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى خستوویەتە دڵی هەموو ئەوانەوەی خاوەنی ئیسلام و ئیمانن، بە تایبەت و، جندو، مرۆڤەکان بە گشتیی، کە ناوی پێغەمبەری خاتەم بەرز ڕابگرن.

دەربارەی سینە گوشاد کرانی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ، کە وەك گوتمان مەبەست پێی حاڵەتی مەعنەوییە، چونکە مرۆڤ کاتێك هیدایەت دەچێتە نێو دڵ و دەروونی، هەست دەکات سینەی فراوان دەبێت و، کاتێك خەمێك، نارەحەتییەك، گرێ و گۆتاڵێك ڕووی تێدەکات، هەست دەکات دڵی تەنگ و بچووك دەبێتەوە، ئنجا ئەو حاڵەتی دڵ گوشادکرانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە خوای بەرز بە سینە بۆ گوشادو فراوانکران باسی کردوە، لە ئەسڵدا مەبەست حاڵەتی مەعنەوییەتی، هەروەها مەسەلەی کۆڵ لەسەر پشت لابرانیشی، دیسان مەبەست پێی حاڵەتی مەعنەوییەتی، کە هەستی بە سەغڵەتیی و دڵتەنگیی کردوە لە کۆمەڵگایەکەی خۆیدا، بە هۆی بێبڕوایی و بتپەرستیی و ستەم و خراپەو لادان و تاوانیانەوە.

ئەوەی دیکەش کە دەفەرموێ: کۆڵەکەت پشتی وەجیرە خستبووی، پشتی چەماندبووی، بۆ ئەوەیە بۆمان وێنا بکات وەك چۆن بارێکی قورس دەخەیە سەر پشتی ئاژەڵێك جیرەی لێ دێت، ئاوا نارەحەت بووە.

ناو بۆ بەرزکرانەوەش مەبەست پێی ناووناوبانگی پێغەمبەری خوایە ﷺ، کە لە لای فریشتەکان و لەلای بڕواداران، پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە هەڵگری کۆتا پەیامی پەروەردگار بووە، ناووناوبانگی بەرز بووەو، ڕێز لێگیراوە.

بەڵام وێڕای ئەوە، سێ گێڕدراوەش دێنین دەربارەی سینە بۆ گوشادکرانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی جەستەییەوە:

یەکێکیان لە تەمەنی دووساڵییدا بووە، یەکێکیان لە تەمەنی دە ساڵییدا بووە، یەکێکیان لە کاتی سەفەری شەووڕۆ بەرزکرانەوەی دا، بەلای کەمەوە ئەو سێجارە پێغەمبەری خاتەم ﷺ سینەی بۆ گوشاد کراوە، واتە: بە ڕواڵەتیی و جەستەیی.

## حاڵەتی یەکەم:

کە لە بەرگی یەکەمی **(السيرة النبوية لابن هشام)**[1] و تەفسیری **(روح المعاني)**[2]دا هاتووە، لە شیرپێدەرەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ حەلیمەی سەعدییە، دوای ئەوەی موحەممەد دەبات بۆ لای خۆیان، وەك عادەتی عەرەبەکان کە منداڵی گچەکەیان داوەتە دایەن، بۆ ئەوەی لە بیابان و دەشت و سارای چۆڵ بە خێو بکرێ، نەك لە نێو شاردا، کە چاکتر پەروەردە دەبێ و زمانی ڕەوان و پاراوتر دەبێ، ئەو کاتەش موحەممەد بابی نەمابوو، حەلیمە دەڵێ[3]:

دوای ئەوەی موحەممەدمان بردە لای خۆمان، لەلایەن خوای بەرزەوە هەر زێدەیی و چاکەمان دەبینی، تاکو دوو ساڵەکەی تەواوبوون و لە شیرم بڕیەوە، ئنجا ئەو بە زوویی پێدەگەیشت و گەورە دەبوو، وەك پێگەیشتن و گەورەبوونی منداڵەکانی دیکەدا نا، دوو ساڵی تەواو نەکردبوون، بوو بە منداڵێك پێویستیی

---

(١) ص

(٢) ج١٥، ص٤٨٩ و ٤٩٠.

(٣) یەکسەر وەرگێڕاوە کوردییەکەی دێنین.

بە شیر نەما، ئێمەش بردمانەوە بۆ لای دایکی و، زۆریش سوور بووین لەسەر ئەوەی لەلامان بمێنێتەوە، چونکە بە هۆی ئەوەوە پیزی زۆرمان دەبینی، بە دایکیمان گوت: ئەگەر لێیگەڕێی لەلامان بمێنێتەوە هەتا گەورەو پتەو دەبێ، چونکە ئێمە مەترسیی دەردو نەخۆشیی مەککەمان لێی هەیە، ئیدی هەر لەگەڵیدا خەریك بووین، هەتا لەگەڵ ئێمەدا ناردیەوە، ئێمەش بردمانەوە، سوێند بە خوا دوای ئەوەی بردمانەوە، لە نێوان مانگێك بۆ سێ مانگ دەبوو، لەگەڵ برایە شیرییەکەی لە کەپرێکی پشت ماڵماندا بوون، برایەکەی هات ڕایدەکرد، گوتی: ئەو برا قورەیشییەم دوو پیاو هاتن بەرگی سپییان لەبەر دابوو پاڵیان خست و سکیان هەڵدڕی! من و بابیشی بەرەو لای وی چووین، بینیمان ڕاوەستابوو، ڕەنگی بزڕکابوو، بابی لە باوەشی گرت و گوتی: ڕۆڵە گیان چیتە؟ گوتی: بابە گیان! دوو پیاو هاتن بەرگی سپییان لەبەردا بوو، منیان پاڵخست و سکیان هەڵدڕیم، شتێکیان لێ دەرهێناو فڕێیاندا، دوایی سکمیان وەك خۆی لێکردەوە! ئێمەش بردمانەوە بۆ ماڵ.

بابی گوتی: حەلیمە! من مەترسییم هەیە لەم کوڕە، کە تووشی دەست لێوەشاندن بووبێ، بیبەوە بۆ لای کەس و کاری بەر لەوەی ئەوەی مەترسییمان لێی هەیە، لێی دەربکەوێ، کە جندار بوون و شێت بوونە.

حەلیمە دەڵێ: بردمانەوە بۆ لای دایکی.

دایکی گوتی: ئەوە چۆنە هێناتانەوە، خۆ ئێوە زۆر سووربوون کە لەلاتان بمێنێتەوە؟

گوتمان: ترسیاین لە ڕووداوان و لە گرفت و کێشە.

گوتی: پێم وانیە ئەوە ڕاست بێ، ڕاستییم پێ بڵێن.

ئیدی وازی نەهێنا تاکو هەواڵەکەیمان پێدا.

ئەویش گوتی: لە شەیتان لێی ترسان؟ سوێند بە خوا شەیتان ڕێی تێنابات و دەستەڵاتی بەسەریدا ناشکێ، ئەم کوڕەم حاڵەت و کارێکی تایبەتی دەبێ، بیبەنەوە با لەلاتان بێت.

## حاڵەتی دووەم:

**{عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رضي الله عنهما: كَانَ جَرِيًّا عَلَى أَنْ يَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَشْيَاءَ لاَ يَسْأَلُهُ عَنْهَا غَيْرُهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَوَّلُ مَا رَأَيْتَ فِي أَمْرِ النُّبُوَّةِ؟ فَاسْتَوَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسًا، وَقَالَ: لَقَدْ سَأَلْتَ أَبَا هُرَيْرَةَ، إِنِّي لَفِي صَحْرَاءَ ابْنُ عَشْرِ سِنِينَ، وَإِذَا أَنَا بِكَلاَمٍ فَوْقَ رَأْسِي، وَإِذَا أَنَا يَقُولُ لِرَجُلٍ: أَهُوَ هُوَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَاسْتَقْبَلاَنِي بِوُجُوهٍ لَمْ أَرَهَا لِخَلْقٍ قَطُّ، وَأَرْوَاحٍ لَمْ أَجِدْهَا مِنْ خَلْقٍ قَطُّ، وَثِيَابٍ لَمْ أَرَهَا عَلَى أَحَدٍ قَطُّ، فَأَقْبَلاَ إِلَيَّ يَمْشِيَانِ حَتَّى أَخَذَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِعَضُدِي لاَ أَجِدُ لأَحَدِهِمَا مَسًّا، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: أَضْجِعْهُ، فَأَضْجَعَانِي بِلاَ قَصْرٍ، وَلاَ هَصْرٍ، وَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: إِفْلِقْ صَدْرَهُ، فَهَوَى أَحَدُهُمَا إِلَى صَدْرِي فَفَلَقَهَا، فِيمَا أَرَى بِلاَ دَمٍ، وَلاَ وَجَعٍ، فَقَالَ لَهُ: أَخْرِجِ الْغِلَّ وَالْحَسَدَ، فَأَخْرَجَ شَيْئًا كَهَيْئَةِ الْعَلَقَةِ، ثُمَّ نَبَذَهَا فَطَرَحَهَا، فَقَالَ لَهُ: أَدْخِلِ الرَّأْفَةَ وَالرَّحْمَةَ، فَإِذَا مِثْلُ الَّذِي أَخْرَجَ يُشْبِهُ الْفِضَّةَ، ثُمَّ هَزَّ إِبْهَامَ رِجْلِيَ الْيُمْنَى، فَقَالَ: اغْدُ وَاسْلَمْ، فَرَجَعْتُ بِهَا أَغْدُو رِقَّةً عَلَى الصَّغِيرِ، وَرَحْمَةً لِلْكَبِيرِ} (أخرجه عبد الله بن أحمد في زوائده على المسند: ٢١٢٩٦، قال الهيثمي (٨/٢٢٣): رجاله ثقات وثقهم ابن حبان، والضياء: ١٢٦٤).**

واتە: ئوبەیی کوڕی کەعب گێڕوایەتەوە کە ئەبوو هوڕەیرە (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆ پرسیارکردن لە پێغەمبەری خوا لە هەندێك شتان کە جگە لەو لێی نەدەپرسیی، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لە کاروباری پێغەمبەرایەتیی دا یەکەمین شت کە بینیوتە چی بووە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو ڕێك دانیشت فەرمووی: پرسیارت کرد ئەی ئەبوو هوڕەیرە! من لە بیابان بووم تەمەنم دە ساڵ بوو، لەسەروومەوە گوێم لە پیاوێك بوو، بە پیاوێکی دیکەی گوت: ئەوە خۆیەتی؟ گوتی: بەڵێ، ئنجا بە ڕووێکەوە بەرەو لام هاتن، ئەو ڕووانەم هەرگیز

نەبینیبوون لە هیچ دروستکراوێکداو، بە بۆنێکی خۆشەوە بۆ لام هاتن، ئەو بۆنە خۆشەم لە هیچ دروستکراوێك نەکردبوو و، بە بەرگ و پۆشاکێکەوە بۆ لام هاتن، ئەو بەرگ و پۆشاکەم لەبەر هیچ کەسێکدا نەبینیبوو، بۆ لام هاتن دەڕۆیشتن هەتا لێم نیزیککەوتنەوە، هەر کامێکیان قۆڵێکی گرتم، کە هەستم بە گرتنیان بۆ قۆڵم نەدەکرد، یەکێکیان بە ئەوەی دیکەی گوت: سینەی بقڵیشێنە، ئەوەی دیکە داهاتەوەو سینەی منی قڵیشاند، وەك دەمبینی بێ ئەوەی خوێنی لێ بێ و، بێ ئەوەی ئازاریشی هەبێ، پێی گوت: کینەو حەسوودیی لە دڵی دەربێنە، ئنجا داهاتە سینەم و شتێکی وەك خوێنپارەی لە سینەم دەرهێناو فڕێیدا، دوایی پێیگوت: بەزەیی و پەرۆشیی بخە دڵ، شتێك بوو بە ئەندازەی پارچە زیوێك (خستییە سینەمەوە)، دوایی پەنجە گەورەی پێی ڕاستمی گرت و گوتی: بڕۆ و سەلامەت بە، ئیدی گەڕامەوە، دڵم پڕ بوو لە نەرمی و میهرەبانیی بۆ کەم تەمەن و، بەزەییش بەرانبەر بەهی بە تەمەن.

### حاڵەتی سێیەم:

ئەو کاتە بووە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ سەفەری شەوڕۆو بەرزبوونەوە **(الإسراء والعروج)**ی کردوە:

**{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ رَجُلٍ مِنْ قَوْمِهِ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَمَا أَنَا عِنْدَ الْبَيْتِ بَيْنَ النَّائِمِ وَالْيَقْظَانِ، إِذْ سَمِعْتُ قَائِلًا يَقُولُ: خُذْ بَيْنَ الثَّلَاثَةِ، فَأُوتِيتُ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ فِيهَا مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ»، قَالَ: «فَشُرِحَ صَدْرِي إِلَى كَذَا وَكَذَا» -قَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ: مَا يَعْنِي بِهِ؟ قَالَ: إِلَى أَسْفَلِ بَطْنِهِ -«فَاسْتُخْرِجَ قَلْبِي، فَغُسِلَ بِمَاءِ زَمْزَمَ، ثُمَّ أُعِيدَ مَكَانَهُ، ثُمَّ حُشِيَ إِيمَانًا وَحِكْمَةً، ثُمَّ أُوتِيتُ بِدَابَّةٍ أَبْيَضَ يُقَالُ لَهُ الْبُرَاقُ، فَوْقَ الْحِمَارِ وَدُونَ الْبَغْلِ، يَقَعُ خُطَاهُ أَقْصَى طَرْفِهِ، فَحُمِلْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ انْطَلَقْتُ حَتَّى أَتَيْنَا السَّمَاءَ الدُّنْيَا...}**[1].

---

(١) أخرجه مسلم: ٤٣٤.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە مالیکی کوڕی صەعصەعە پیاوێك بوو لە قەومەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە کاتێکدا من لەلای کەعبە لە نێوان خەوتوو و بێداردا بووم، گوێم لە کەسێك بوو گوتی: یەکێك لەو سێیانە بگرە، تەشتێکی زێڕی بۆ هێنام، ئاوی زەمزەمی تێدابوو، فەرمووی: سینەمی هەڵدڕی تاکو فلانە شوێن، -قەتادە گوتی: مەبەستی چی بوو؟ گوتی: هەتا خوار سکی- دڵم دەرهێنراو بە ئاوی زەمزەم شۆردرا، پاشان گێڕدرایەوە شوێنی خۆی، دوایی پڕکرا لە ئیمان و حیکمەت و دانایی، پاشان ئاژەڵێکی سپییان بۆ هێنام، پێی گوترا: بوراق لە گوێدرێژ بەرزتر بوو لە ئێستر بچووکتر بوو، بە هەنگاوێك دەگەیشتە ئەو جێگایەی چاوی بڕ بکات، سواری ئەو بوراقە کرام، پاشان دەرچووین (لەگەڵ جبریلدا) تاکو گەیشتینە ئاسمانی دنیا، (دوایی باسی ئاسمانەکانی دیکەش دەکات).

هەموو ئەو حاڵەتانەش ئەوە دەگەیەنن کە خوا لە ڕووی جەستەییشەوە کاری لەسەر پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کردوە، کە زیاتر ئامادەی بکات بۆ وەرگرتنی پەیامەکەی و، شایستەی ئەو نوورو بەرەکەت و هیدایەتە بێت.

**مەسەلەی دووەم:**

**بێگومان لەگەڵ سەغڵەتیی و قورسییدا ئاسانیی هەیە، بە دڵنیاییی لەگەڵ سەغڵەتیی و قورسییدا سێنایی هەیە، ئنجا خوا بە پێغەمبەری کۆتایی فەرمووە: دوای تەواوکردنی کارێك، یەکسەر کارێکی دیکە بکە ئەی موحەممەد ﷺ! هەمیشەش بەرەو لای خوا ئارەزوومەندبە:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾، بە دڵنیایی لەگەڵ سەغڵەتیی و قورسییدا، ئاسانیی هەیە، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (ف: **فصيحة تُفْصِحُ عن كلامٍ مُقدَّرٍ يدلُّ عليه الإستفهام التقريريُّ هنا أي: إذا علمت هذا وتقرَّر، فاعلم أن مع العسر يسراً**)، (ف): پێی دەگوترێ: (فصيحة) چونکە قسەیەك کە ئەندازەگیریی کراوە، پیتی (ف) ڕوونی دەکاتەوە، کە پرسیارکردنە دانپێداهێنانەی پێشێ دەیگەیەنێ، واتە: ئەگەر ئەوەت زانی کە باسکراو چەسپا، بزانە لەگەڵ زەحمەتیی و قورسییدا کە دێتە ڕێت لە پێناوی خوادا، ئاسانیی و فەڕحانییش هەیە.

**٢)-** ﴿ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾، بە دڵنیایی لەگەڵ سەغڵەتیی و قورسییدا ئاسانیی هەیە، وشەی (مع) بە مانای (لەگەڵ) دێ، بەڵام لێرەدا لە هەردوو ڕستەکاندا بەکارهێنراوە، بە مانایەکی جیاواز لە مانا ڕاستەقینەکەی، چونکە زەحمەتیی و ئاسانیی پێکەوە لە یەك کاتدا نابن و، ناگونجێ پێکەوە بن، بەڵام یانی: نیزیکە لە دوای زەحمەتیی و قورسیی، ئاسانیی پەیدابێ، بۆیەش فەرموویەتی: (مع) (لەگەڵ) یانی: هێندە لە یەکدی نیزیکن، وەك پێکەوەبن وان.

٣)- ﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴾، کەواتە: تۆ هەر کاتێك لێبوویەوە، دەست بە تاڵبووی، خۆت ماندووبکە، یاخود کۆششی زیاتر بکە، چونکە (**فانصب**) بە مانای: خۆت ماندوو بکە و، بە مانای: هەوڵبدەو کۆشش بکە، دێ.

ئایا مەبەست لە لێبوونەوەو دەست بە تاڵبوون، چییە؟

هەرچەندە ئێمە دوایی چەند وردە سەرنجێك لەو ئایەتانە دەدەینەوە، بەڵام (**الطبري**) دەڵێ: مەبەست پێی ئەوەیە: هەر کاتێك ئەو کارەی تێیدا دەست بە کاری، لێیبوویەوەو تەواوت کرد، لە کارێکی دیکەدا خۆت ماندوو بکەو ڕامەوەستە.

٤)- ﴿ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴾، بەرەو لای پەروەردگاریشت ئارەزوومەندبە.

وشەی: (**رغبة**) بۆیە لێرەدا بە پیتی (**إلى**) بەرکاری خواستوە، تاکو مانای ڕووتێکردن و گرنگیی پێدانی بخرێتە نێو.

واتە: بەرەو لای پەروەردگارت زیاتر ئارەزوو بکەو، ڕووی تێبکە، چ شتێك زیاتر لە خوات نیزیك دەخاتەوە، ڕەچاوی بکە.

## حەوت وردە سەرنج لەو ئایەتانە:

١- جارێ کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝٥ ﴾، وشەی: (**العسر**) کە (**أل**)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ (**عهد**)ە، واتە: ئەو زەحمەتیی و نارەحەتییەی دەیزانی، وەك شارەزایانی زمانی عەرەبیی کووفەنشین گوتوویانە: (**الألف واللام عِوَض عن المضاف إليه**)، ئەلیف و لام قەرەبووی پاڵاوەلادراو دەکەنەوە، واتە: ئەو زەحمەتیی و نارەحەتییەی تۆ پێی ئاشنای، لەگەڵ ئەودا ئاسانیی هەیە، یانی: (**فَإِنَّ مَعَ عُسْرِكَ يُسْرًا**) لەگەڵ زەحمەتیی و قورسیی تۆدا، ئاسانییش هەیە، هەمیشە تۆ بەبەر هەورازەوە نابی، پێشینان گوتوویانە: (لە دوای هەورازان نشێوە)، هیچ هەورازێك نیە تاکو سەر بەردەوام بێت.

٢- ئایا مەبەست لە وشەی (عسر) چییە؟ (عسر): بریتیە لە زەحمەتیی و قورساییەك لە بەدەستهێنانی شتێكدا كە ئارەزووی دەكرێ و، كردەوەیەك كە بە ئامانج گیراوە، لەوەدا مرۆڤ ماندوو ببێ و تووشی زەحمەتیی و نارەحەتیی بێ.

ئایا مەبەست لە (یسر) چییە؟ (یسر): بریتیە لە ئاسانیی لە بە دەستهێنانی شتی ئاسانكراودا، كە مرۆڤ تێیدا ماندوو نابێ، یان بە ئامانج گەیشتنەكە، ماندووبوونەكەی لە بیر بباتەوە.

٣- كە خوای بەرز دووبارەی كردۆتەوە: ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝٥ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝٦﴾، (**المقصود بالتكرار التأكيد على تحقيق هذا الوعد وتعميمهِ**)، مەبەست لە دووبارە كردنەوە، جەختكردنەوەی هێنانەدی ئەو بەڵێنەو گشتاندنیەتی.

٤- كە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ۝٧ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ۝٨﴾، (**الرَّغْبَةُ: الحُصُولُ عَلَى مَا هُوَ مَحْبُوبٌ، وَأَصْلُهُ تَعْدِيته بنَفْسِه، يُقَالُ رَغِبَ فِيهِ، وَعَكْسُهُ: رَغب عَنْهُ أي: صرف رَغْبَتَهُ عَنْهُ**)، (**رغبة**): بریتیە لە ویستنی وەدەستهێنانی شتێك كە خۆشویستراوەو، لە ئەسڵدا وشەی (**رغب**) بۆ خۆی بەركار دەخوازێ، (**رَغِبَ فِيهِ**) واتە: ئەو شتەی ویست، یان ئەو شتەی ئارەزوو كرد، (بەڵام لێرەدا كە بە (إلى) بەركاری پێخوازراوە، بۆ ئەوەیە مانای ڕووتێكردن و گرنگیی پێدانی بخرێتە نێو)، بۆ پێچەوانەكەیشی دەگوترێ: (**رَغِبَ عَنْهُ**) واتە: ئەو شتەی نەویست، ئارەزووی نەكردو، خۆی لێ لادا.

٥- (**الشوكاني**) لە (**فتح القدير**)[1] دا دەڵێ: (**فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً أَيْ: إِنَّ مَعَ الضِّيقَةِ سَعَةٌ، وَمَعَ الشِّدَّةِ رَخَاءٌ، وَمَعَ الْكَرْبِ فَرَجٌ، وَفِي هَذَا وَعْدٌ مِنْهُ سُبْحَانَهُ بِأَنَّ كُلّ عسر يَتَيَسَّرُ، وَكُلَّ شَدِيدٍ يَهُونُ، وَكُلَّ صَعْبٍ يَلِينُ**)، واتە: لەگەڵ هەر تەنگانەیەكدا فەرحانیی هەیەو، لەگەڵ هەر سەختییەكدا خۆشیی هەیەو، لەگەڵ هەر خەمێكدا دەرووكرانەوە هەیە، لەمەدا بەڵێن هەیە لە خوای پاك و بێگەردەوە، كە هەموو شتێكی بە زەحمەت ئاسان دەبێ و، هەموو شتێكی سەخت دوایی سێنا دەبێ و، هەموو شتێكی قورس دوایی نەرم دەبێ.

٦- كە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ۝٧﴾، زانایان زۆریان قسە لێكردوە:

---

(١) ج٥، ص٥٦٩.

أ- هەندێك گوتوویانە: ئەگەر لە نوێژی فەڕز تەواو بووی، ئنجا نوێژی سوننەت بکە.

ب- هەندێك گوتوویانە: ئەگەر لە نوێژەکەت تەواو بووی، ئنجا دەست بە بانگەواز بکە.

ج- هەندێك گوتوویانە: ئەگەر لە بانگەواز تەواو بووی، ئنجا دەست بکە بە نزاو بپاڕێوە.

بەڵام وەك **(الطبري)** دەڵێ: خوا بە گشتیی فەرموویەتی و، هیچ کۆت و بەندێکی نەخستۆتە سەری، بۆیە ﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ ﴾، واتە: لە هەر کارێك کە تێیدای، پەیوەندیی بە دینداریيەوە هەبێ، یان دنیاداریيەوە، کە لەو کارە بوویەوە، دەست بە کارێکی دیکە بکەو، زەحمەت بکێشە و ڕەنج بدە.

٧- کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرۡغَب ٨ ﴾، یانی: هەموو کارو جموجۆڵەکانت کە دەیانکەی، با بە هاندەری بەرەو خوا چوون بن و، بە ئارەزووکردنی لای خواو نزیکیی لای خوای پەروەردگاربن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمەش لەو کەسانە بگێڕێ، کە بە شوێن پێی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ هەنگاو دەنێن و، وەك پێغەمبەری خاتەم دەکەن و، لەو نیعمەتانەمان بۆ بڕەخسێنێ کە بۆ پێغەمبەری خاتەمی ڕەخساندوون، وەك: سینەفراوانیی و، باری شان سووك بوون و، کۆڵی قورس و گران لاچوون و، ناووناوبانگی باش و، باس و خواسی باشمان پێ بدات و، یارمەتییمان بدات بۆ ئەوەی هەرچی زیاترو باشتر سەرگەرمی بەندایەتیی بۆ خوابین، دینداریی و دنیاداریيەکی ڕێ و ڕاست بکەین بە ڕاستەڕێی خوای پەروەردگاردا، تاکو تەمەنە کاتیی و ئەمانەتییەکەمان لەم ژیانی دنیایەدا کۆتایی پێ دێنین و، بەسەربەرزیی دەچینەوە خزمەت خوای بەرزی مەزن.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری سووڕەتی (الشرح) دێنین.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ (١٤)ی مانگـی (**ذي الحجـة**)ی سـاڵی (١٤٤١) كۆچییە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٨/٤) زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەكەیـن بـە تەفسـیركردنی سـوورەتی (التیـن).

سـەرەتا پێناسـەو نێوەڕۆكـی ئـەم سـوورەتە موبارەكـە لـە حـەوت برگـەدا دەخەینە ڕوو، بـۆ ئـەوەی بـەر لـەوەی بچینـە سـەر ڕوونكردنـەوەی چەمـك و واتـای ئایەتـە بـە پێزەكانـی، سـیمای گشـتیی و هێڵـە سـەرەكییەكان و چوارچێـوەی فراوانـی ئـەم سـوورەتە موبارەكەمـان لەبەرچـاو بـێ.

## پێناسەی سوورەتی (التین) و بابەتەكانی

### یەكەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە بـە سـوورەتی (والتیـن)، هەروەهـا بـە (**سـورة التـین**) نـاسراوە، بەهـەردوو نـاوەكان نـاسراوە، لـەو بارەشـەوە ئـەم فەرموودەیـە دێنیـن:

**{عَـنِ الْـبَرَاءِ بـن عـازِبٍ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ، قَـالَ سَـمِعْتُ النَّبِـيَّ ﷺ يَقْـرَأُ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُـونِ فِي الْعِشَـاءِ، وَمَـا سَـمِعْتُ أَحَـدًا أَحْسَـنَ صَوْتًـا مِنْـهُ أَوْ قِـرَاءَةً} (أخرجـه البخـاري: ٧٥٤٦، ومسـلم: ١٧٧)**.

واتـە: بەڕائـی كـوڕی عازیـب (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: گوێـم لـە پێغەمبـەری خــوا ﷺ بــوو، لەنوێــژی خەوتنانــدا لەیەكێــك لــە ڕكاتەكانــدا ســوورەتی (**وَالتِّـينِ**

**وَالزَّيْتُونِ**)ی خوێند، گوێم لە هیچ کەسێك نەبووە دەنگی لەو خۆشتربێ، یان چاکتر لەو بخوێنێ.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

بەبۆچوونی زۆربەی زانایان ئەم سوورەتە مەککەییەو لە شاری مەککە دابەزیوە، لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەدا بووە، بەر لە کۆچ کردنی بۆ مەدینە. لەوبارەوەش ئەم دەقە دێنین:

(**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنه، **قَالَ: أُنزِلَتْ سُورَةُ وَالتِّينِ بِمَكَّةَ**) (**أورده السيوطي في الدر المنثور: ج٨، ص٤٥٣، ونسبه لابن الضريس والنحاس والبيهقي، وقال: أخرج ابن مردويه عن عبد الله بن الزبير مثله، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٥٣٠**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنه، گوتوویەتی: سوورەتی (والتين) لە مەککە دابەزیوە، سیوتیی کە ئەمەی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە هێناوە، گوتوویەتی: ئیبنو موردەوەی هەمان شتی لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریشەوە خوا (لێیان ڕازی بێ) هێناوە، کە گوتوویەتی: ئەو سوورەتە لە مەککە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی ئەم سوورەتە لە موصحەف و دابەزیندا:

ئەم سوورەتە موبارەکە لە (مصحف)دا ژمارەکەی (٩٥)ەو، لە دابەزینیشدا ژمارەکەی بیست و هەشت (٢٨)ە، پێش سوورەتی (الإيلاف) و دوای سوورەتی (البروج) دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە هەشت (٨)ە، بەبێ ڕاجیایی لەنێو زانایانی ژمێرەری ئایەتەکانی قورئاندا.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە خـوای پـەروەردگار لەسـەرتایەکەیەوە سـوێند بەچوار شـتان دەخـوات: (هەنجیـر، زەیتـوون، کێـوی سـینا، وڵاتـی هێمـن و پـڕ ئاسـایش «مەککـە»)، وەڵامـی سـوێندەکەش ئەوەیـە کـە مرۆڤـی لەسـەر باشـترین پێکهاتە لە ڕووی جەسـتەیی و مەعنەوییـەوە پێکهێنـاوە، دوایـی گێڕاویەتـەوە بـۆ ژێـری هەمـوو ژێـران، بـۆ خـواری خـوارەوە، جگـە لـە بڕوادارانـی کـردار بـاش، کـە پاداشـتی نەبڕاوەیـان هەیـە، دوای ئـەوەش خـوای زانـاو توانـا ڕایگەیانـدوە، کـە هیـچ پاڵنەرێکی بێبڕوایی بەسـزاو پاداشـت نیـە، خـواش دادگەرتریـن و کارزانترینـی دادوەران و حوکمڕانانـە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

سێ تایبەتیی ئەم سوورەتە بەپێزە دەخەینەڕوو:

**١)-** خوای پەروەردگار سوێندی خواردوە بەچوار شتان، یاخود بەچوار شوێنان، وەك دوایی درێژەکەیان باس دەکەین، کە مرۆڤـ لە چاکترین شێوەو پێکهاتەی مەعنەویی و ڕواڵەتییدا هێنراوەتە دی.

**٢)-** گێڕانەوەی خوا بۆ مرۆڤ، بۆ پلەی هەرە خوارو نزم، بەهۆی دوورلەخوایی و بێبڕواییەوە: ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ ﴾ **التين.**

**٣)-** ڕاگەیانرانی کارزانترو دادگەرتر بوونی خوا لە حوکمیدا: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾ ﴾.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمـە هـەر هەشـت ئایەتەکـەی ئـەم سـوورەتە دەکەینـە دەرسـێك، چونکـە هەموویـان پێکـەوە پەیوەسـتن و لەبـارەی بابەتێکـەوە دەدوێـن.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە کـۆی هەشـت ئایەتەکـەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە پێـك دێ، ئایەتەکانـی: (١-٨)، پێشـتریش باسـمان کـرد، کـە لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا خـوای کاربەجـێ لەسـەرەتایەکەیەوە سـوێند دەخـوات بـە چـوار شـتان: هەنجیـرو زەیتـوون و کێـوی سیناو، ئـەم وڵاتـە پـڕ ئاسایش و هێمنییـە، کـە مەبەسـت پێـی شـاری مەککەیە.

وەڵامـی سـوێندەکەش ئەوەیـە کـە مرۆڤـمان لـە باشـترین پێکاتـەدا هێناوەتـە دی، چ پێکهاتـەی بەرچـاوو، چ نابەرهەسـت، لـەڕووی ڕووحیـی و لـەڕووی جەسـتەییەوە، مرۆڤـ باشـترین حاڵـەت و پێکهاتـەی هەیـە، بـەڵام دوایـی خـوا دەیگێڕێتـەوە بـۆ نزمـی هـەرە نزمـان، هەڵبەتـە خـوای دادگـەر کـە مرۆڤـی لـە باشـترین پێکهاتـەو شـێوەدا هێناوەتـە دی، خـۆی نایگێڕێتـەوە بـۆ پلـەی هـەرە نـزم، بەڵکـو ئـەوە مرۆڤـە وا لـە خـۆی دەکات، بـە بەڵگـەی ئـەوەی دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴿٦﴾ ﴾، (ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ) کـرداروبکـەر (**فعـل و فاعـل**)ە، یـانی: ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، کەواتـە: مرۆڤـەکان کـە بڕوادێنـن، خۆیـان بڕوادێنـن، (وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ) ئەمیـش دیسـان: کارو بکـەرو بـەرکار (**فعـل وفاعـل ومفعـول بـە**) یـانی: کـردەوە باشـەکانیان ئەنجـام داون، کەواتـە: مرۆڤـ خـۆی کـردەوە باشـەکان ئەنجـام دەداو پەیدایـان دەکات.

بۆیـە کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ ﴾، خـوای پـەروەردگار تەعبیـر دەکات لـە ویسـتی گشـتیی خـۆی و، لـە سیسـتمێك کـە دایناوە لەژیانـی بەشـەردا، کـە مـرۆڤ ئەگـەر ڕوو لـە ئیـمان و کـردەوەی بـاش نـەکات، لـەو حاڵەتـە هـەرە چاکـەی خـوا تێیـدا دایناوە، نامێنێتـەوە، بەڵکـو دەچێتـەوە خواری خـوارێ، خوا لـە سـەرەوەی دروسـتکراوەکان دایناوە، بـەڵام بەهـۆی بـێ ئیمانیـی و خوانەناسیی و دوور لـە خواییـەوە، دەچێتـەوە خـواری خـوارێ.

ئنجا لەبەر ئەوەی بەپێی سیستمێك كە خوا دایناوە ئەوە دێتە دی و، بە پێی ویستی خوای باڵادەست ئەوە دێتە دی، بۆیە خوای پەروەردگار پاڵیداوەتە لای خۆی، ئەگەرنا خوا مرۆڤەكانی چاك خوڵقاندوون و پێی خۆشە بەرز بن، بەرنامەو هیدایەتی بۆ ناردوون، تاكو بەرزیان بكاتەوەو، عەقڵ و زگماكی ساغ و باشی پێداون، تاكو بەهۆیانەوە بەرز ببنەوە، بەڵام كە خۆیان لەخۆیان نەگەڕێن، لەو پێگە بەرزەوەی خوا تێیدا دانیاون، خۆیان لێژ بكەنەوەو سەرەو ژێر بكەنەوە، بێگومان ئەوە بەپێی سیستم و ویستی خوای پەروەردگارە، ئەگەرنا خۆیان وا لەخۆیان دەكەن.

دوایی خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ﴿٧﴾ ﴾، چ شتێك دوای ئەوە، دوای ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییە مەزنانە، وا لە تۆ دەكات بێبڕوابی بە سزاو پاداشت، یان بێبڕوا بی بە ئایین و بەرنامەی خوا؟ ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴿٨﴾ ﴾، ئایا خوا دادگەرترینی دادوەرەكان نیە، یاخود ئایا خوا كاربەجێترینی دادوەرەكان نیە؟ بۆیە واباشە بگوترێ: (**بَلَى، وَأَنَا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِين**) با، من لەسەر ئەوەش لە شایەدانم، ئەمە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، بەسەنەدێك كە مشت و مڕی پسپۆڕانی بواری فەرموودەناسیی (**علم الحديث**)ی لە سەرە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴿٨﴾ ﴾ **التين**.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. سوێند بە هەنجیرو بە زەیتوون ﴿١﴾ سوێندیش بە کێوی سینا ﴿٢﴾ سوێندیش بەم وڵاتە هێمنە ﴿٣﴾ بە دڵنیایی مرۆڤمان لە چاکترین شێوەو پێکهاتەدا دروستکردوە ﴿٤﴾ دوایی گێڕامانەوە بۆ ژێری هەرە ژێرەوان ﴿٥﴾ بێجگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوون، ئەوانە پاداشتی نەبڕاوەیان هەیە ﴿٦﴾ ئنجا (ئەی مرۆڤ! دوای ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە مەزنانە) چی وات لێدەکات سزاو پاداشت بەدرۆ دابنێی ﴿٧﴾ ئایا خوا کارزانترینی دادوەران نیە؟ ﴿٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**التِّينُ**): هەنجیر، (**شَجَرٌ مِنْ الفَصيلةِ التُّوتيَّةِ، وَالتِّينُ: ثَمَرُ ذَلِكَ الشَّجَر**) درەختێکە لە جۆری درەختە توویەکان، بە بەرو بوومی ئەو درەختەش دەگوترێ: (التين). بەهەمان شێوە زەیتوونیش بەدرەختەکەی دەگوترێ: زەیتوون، بەبەرەکەشی هەر دەگوترێ: زەیتوون. بەڵام خورما، بەدرەختەکەی دەگوترێ: (نخل)و بەبەرەکەی دەگوترێ: (تمر).

(**وَالزَّيْتُونِ**): (**شَجَرٌ مُثْمِر زَيْتِيٌّ، تُؤكَلُ ثِمَارُهُ بَعْدَ مَلْحِهَا، وَيُعْصَر مِنْها الزَّيْت، والزَّيتُونُ ثَمَر شَجَر الزَّيتونِ**)، زەیتوون دەرختێکی بەردارە، لە جۆری زەیتییە، میوەکەی دوای ئەوەی سوێر دەکرێ دەخورێ و، ڕۆنیشی لێ دەگووشرێ و، بەبەرەکەشی هەر دەگوترێ: زەیتوون.

(وَطُورِ سِينِينَ): (**جَبَلُ سَيْنَاء، الطُّورُ: الجَبَلُ، وَالطُّور جَبَلٌ يُنْبِتُ الشَّجَر**)، لە قورئاندا (سینین) هاتوە، (سَيْناء) یش هاتوە، کە بیابانێکە لە نێوانی میصرو فەڵەستیندا، ئەو چیایەی لە بیابانی سینایە، بە (سینین) هاتوە و، بە (**سَيْناء**)یش هاتوە.

هەندێك گوتوویانە: (**طور**) چیایەکە درەخت سەوز دەکات.

چونکە هەندێك چیا هەن درەختیان لێ سەوز نابێ، هیچ ڕووەك و گیایەکیان لێ نیە، بەڵام هەندێك چیای دیکە هەن، ڕووك و گیایان لێ سەوز دەبێ.

(وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ): ئەم وڵاتە هێمنە، پڕ ئاساییش، کە مەبەست پێی مەککەیە، مەککەی ڕێز لێگیراو.

(تَقْوِيمٍ): (**قَوَام أَي: عَدْل، وَقِوَام الأَمْرِ: مَا يَقُومُ بِهِ**) (**قَوَام**): بەمانای ڕێك و ڕاست، (**قِوَام**) بەمانای سیستم و بناغەی کارێك، (**والقَوِيم: المُعْتَدِلُ، حَسَنُ القَامَة**) (**قويم**) کەسێکە قەدو قیافەی ڕێك و ڕاست بێ.

(سَٰفِلِينَ): (**سَفَلَ يَسْفُل سُفُولاً وَسَفَالَةً: ضِدُّ عَلاَ**)، (**سَفَلَ يَسفُل**) واتە: نزم بوو نزم دەبێ، (**سُفُولاً وَسَفَالَةً**) هەردووکیان چاوگن، واتە: نزم بوون، پێچەوانەی (**علا**)یە، واتە: بەرز بوو، (**عَلاَ يَعْلو عُلوّاً**) واتە: بەرز بوو، بەرز دەبێ، بەرزیی، (**سَفُلَ يَسْفُلُ سَفَالَةً: خَسَّ وَنَذَلَ**)، (**سَفَلَ يَسْفُل صارَ فِي سُفْلٍ**) واتە: چووە خوار، دەچێتە خوار، بەڵام (**سَفُلَ يَسْفُل سَفَالَةً**) واتە: کەم بایەخ و بێنرخ بوو، (**السُّفلُ: ضِدُّ العُلْوِ**، (**السُّفلُ**) پێچەوانەوەی (**العُلْو**)ە، یەکەمیان یانی: نزمیی و ئەوەی دیکەیان یانی: بەرزیی.

(فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ): ئایا دوای ئەوە چ شتێك وات لێ دەکات سزاو پاداشت بەدرۆ دابنێی، پێی بێبڕوابی؟ یاخود ﴿ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ ﴾ یانی: دوای ئەوە چ شتێك وات لێ دەکات درۆ بکەی بەهۆی بەدرۆدانانی ڕۆژی سزاو پاداشتەوە؟ هەر کەسێك شتێکی ڕاست بەدرۆ دابنێ، خۆی درۆی کردوە.

(﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾): ئایا خـوا دادگەرترینـی دادوەران، یاخـود: حوکمڕانـان نیـە؟ یاخـود ئایا خـوا کاربەجێترینـی دادوەران و حوکمڕانـان نیە؟ لەوەڵامـدا دەگوترێ: (**بَلى وأنا على ذلك من الشاهدين**) با، منیـش لەسـەر ئـەوە لەشـایەدانم. (**حَكَمَ أَيْ مَنَعَ مَنْعاً لإِصْلاحٍ، وِمِنه سُمِّيَتِ اللِّجامُ: حَكَمَةَ الدَّابَّةِ**) واتـە: ڕێگریـی بـە ڕێگرتـن بـۆ چاکبـوون، هـەر بۆیـە لغاوی ئـاژەڵ پێـی دەگوتـرێ: (**حكمة**) ئـەو لغاوەی دەخرێتـە زاری ئاژەڵـەوە، بـۆ ئـەوەی لـەوەڕی بـۆ نەخـورێ، پێـی دەگوتـرێ: (**حَكَمَـةُ الدَّابَّـةِ**) چونکـە ڕێـی لـێ دەگـرێ لـە لەوەڕخـواردن تاکـو بـڕوات و مەحتـەل نەبـێ. (**وَالحُكْمُ بِالـشَّيْءِ: أَنْ تَقْـضِيَ بِأَنَّـهُ كَـذَا، أَوْ لَيْـسَ بِكَـذَا**) (**حكـم**) ئەوەیـە تـۆ بڕیـار بـدەی ئـەو شـتە وایـە، یـان وانیـە.

وشـەی ﴿بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ یـان لـە (**حُكـم**)ەوە هاتـوە، یـان لـە (**حِكْمـة**)ەوە هاتـوە، ئەگـەر لـە (حُکـم)ەوە هاتبـێ، واتە: ئایا خـوا قسـە ڕۆیشـتووترینی حوکمڕانان یاخـود دادوەران نیـە؟ لەهەمـوو کـەس باشـتر قسـەی نـاڕوا، بڕیـاری بڕشـتی نیـە؟ بێگومـان بـا، ئەگـەر لـە (**حكمة**)یشـەوە هاتبـێ، واتـە: ئایـا خـوا کاربەجێتریـن و کارزانترینـی دادوەران و حوکمڕانـان نیـە؟ بێگومـان بـا.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بـە نـاوی خـوای بەبەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

١- بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە دەست بە خوێندنی ئەم سووڕەتە موبارەکە دەکەم، نەك بەناوی هەرکەس و هەرشتێکی دیکە.

٢- ئەم سووڕەتە بەپێی ئایین و بەرنامەی خوا دیخوێنم.

**٣-** ئەم سووڕەتە بەمەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا دەیخوێنم.

**٤-** ئەم سووڕەتە بەهەوڵ و تواناو بڕستێك كە خوا بۆی ڕەخساندووم دەیخوێنم.

﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ لە سەرەتای خوێندنی قورئانەوە، ئەم سووڕەتە یان هەر سووڕەتێكی دیكە، ئەو چوار واتایەی بۆ لە عەقڵ و دڵ دەگیرێن، هەروەها ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، لەسەرەتای هەر كارێكی دیكەشەوە بكرێ بگوترێ، پێویستە بەلای كەمەوە ئەو چوار واتایەی بۆ لە عەقڵ و دڵ بگیرێن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ۝١ وَطُورِ سِينِينَ ۝٢ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ۝٣ ﴾ خوای بەرزی مەزن لێرەدا سوێند دەخوات بەچوار شتان دەفەرموێ: سوێند بە هەنجیرو بە زەیتوون و، بەكێوی سینین، هەروەها سوێند بەم وڵاتە هێمن و پڕ ئاسایشە.

كەواتە: خوا سوێندی بەچوار شتان خواردوە:

**١و٢-** دوو میوەو بەری دوو لە درەختەكان، كە هەنجیرو زەیتوونن.

**٣و٤:** سوێندیشی خواردوە بەدوو شوێنان، یەكەم: كێوی سینا، ئەو كێوەی لەدەشتی سینایە، كە بیابانێكە دەكەوێتە نێوان میسڕو فەڵەستینەوە، شوێنی دووەم: ئەم وڵاتە ئەمینە، (**أمین**) كە لەسەر كێشی (**فعیل**)ە، بەمانای (**مُفعل**) واتە: هەركەسێك لێی بێ، ئەمینی دەكات، دڵنیاو بێترسی دەكات.

یاخود (**أمین**) لەسەر كێشی (فعیل)ە، بەڵام بەمانای (مأمون)ە، واتە: (**مَأْمُوْنٌ مَنْ فِيهِ**) ئەوانەی تێیدان لەخۆیان بێترس و دڵنیادەبن. كەواتە: خوا سوێندی بە بەری دوو ڕووەكان خواردووە: هەنجیرو زەیتوون، هەروەها بەدوو شوێنانیش: كێوی سیناو مەككە، كە وڵاتێكی پڕ هێمن و ئاسایشە، دەشگونجێ بگوترێ: خوای كاربەجێ سوێندی بە سێ شوێنان خواردوە:

**١-** شوێنێك هەنجیرو زەیتوونی زۆری لێیە، كە شامە.

٢- ئەو شوێنەی کێوی **طووره** لە دەشتی سینا.

٣- سوێندیشی بە مەککە خواردوە، ئنجا ئەگەر بڵێین: مەبەستی ئەو سێ شوێنەیە، مانای وایە سێ شوێنی سێ لە پێغەمبەرە پایە بەرزەکانی خوان (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) کە پەیام و بەرنامەکەیان ماوەو شوێنکەوتووانیان هەن:

١- هەنجیرو زەیتوون لە شامن و عیساش (سەلامی خوای لێ بێ) زیاتر لە شام بووە.

٢- مووسا (سەلامی خوای لێ بێ) و گەلەکەی خوا ڕزگاری کردن لەدەستی فیرعەون و لەدەشتی سینا گیرسانەوەو لەوێش تەوڕاتی پێ دراوە.

٣- ﴿ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ۝٣ ﴾، مەککەش کە نشینگەی پێغەمبەری کۆتایی مەحەممەدە ﷺ.

هەندێکیش لە زانایان - وەك دواتر لە مەسەلە گرنگەکان زیاتر تیشکی دەخەینە سەر - گوتوویانە:

١- هەنجیر مەبەست پێی شوێنی ئەو پەرستگایەیە، کە نووح لەسەر کێوی جوودیی دروستی کرد.

٢- زەیتوونیش ئەو ڕووەکەیە، کە لە فەڵەستین دەڕوێ و شوێنی عیسایە.

٣- کێوی سیناش لەو بیابانەیە کە مووساو قەومەکەی لێیبوون.

٤- ئەو وڵاتە پڕ هێمن و ئاسایشەش، بەدڵنیایی مەککەیە، شوێنی پێغەمبەری کۆتایی موحەمەد.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: مرۆڤ بە چوار قۆناغدا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەکەم:** کاتێك ئادەم و حەووا لە درەختە قەدەغە کراوەکەیان خوارد، دوایی بە گەڵایان خۆیان داپۆشی، زانایان دەڵێن: ئەو گەڵای درەختەی خۆیان پێ داپۆشیوە، هی هەنجیر بووە.

**قۆناغی دووەم:** نووح سەلامی خوای لێبێ دوای ئەوەی تۆفان کۆتایی هاتوە، باڵندەی ناردوە بزانێ: ئایا لەکوێ زەوی دەرکەوتۆتەوە؟ ئنجا ئەو باڵندەیەی ناردوویەتی کۆتر بووە، هەرچی بووە، چڵە زەیتوونێکی سەوزی بۆ هێناوە، ئەوەش نیشانەی ئەوەبووە سەرزەوی دەرکەوتۆتەوە.

**قۆناغی سێیەم:** هاتنی مووسایە کە لە سەر کێوی **طوور** لە دەشتی سینادا تەوراتی پێ درا.

**قۆناغی چوارەم:** هاتنی موحەممەدە ﷺ کە لە شاری پڕ هێمنیی و ئاسایشی مەککە سەری هەڵدا.

خوای پەروەردگار دوای سوێند خواردن بەو چوار شتانە، دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۝٤﴾، بەدڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەدا هێناوەتە دی، یەکێك لە مانایەکانی (تقویم) بریتیە لە: (تعدیل) یانی: ڕاستکردن و چاککردنی شتێك، وای لێبکەی ڕێك و ڕاست و هاوسەنگ بێ.

لێرەدا خوای پەروەردگار باسی ئینسان دەکات بەهەموو شتێکیەوە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ﴾ بۆیە زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئان کە زەینیان بەلای جەستەی مرۆڤدا چووە، لەڕاستییدا تێگەیشتنەکەیان نیوەچڵ بووە، چونکە مرۆڤ تەنیا جەستە نیە، بەڵکو جەستە بەس دیکۆرو ڕواڵەتی مرۆڤە، وەك یەکێك لە شاعیران دەڵێ:

**عَلَيكَ بِالرُّوحِ فَاسْتَكْمِل فَضَائِلَهَا - فَأَنْتَ بِالرُّوحِ لاَ بِالجِسْمِ إِنْسانٌ**

واتە: سەرگەرمی ڕووحت بەو سیفەتە بەرزەکانی تێدا بەرجەستە بکە، چۆنکە تۆ بە ڕووحت مرۆڤی نەك بە جەستە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۝٤﴾، بەڕاستیی مرۆڤمان لەباشترین شێوەو پێکهاتەدا هێناوەتە دی، ئەمە دیوی مەعنەویی و نەبینراوی دەگەیەنێ و، دیوی بەرجەستەو بەرهەستیشی دەگەیەنێ، لەڕاستییدا مرۆڤ

بە ڕووحەکەی مرۆڤەو، بەدیوی پەنهانی لە جگەلە خۆی لە دروستکراوەکانی دیکە جیا دەبێتەوە، ڕووحەکەشە مرۆڤی شایستەی ئەوە کردوە، فریشتەکان کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ ببەن و سڵاوی لێ بکەن، هەروەها هەر بەهۆی ئەو ڕووحەشەوە بووە کە مرۆڤ دەتوانێ بەرز بێتەوە تاکو ئەو شوێنەی خوا دەیەوێ، هەروەها نزمیش بێتەوە تاکو ئەو شوێنەی خوا دەیەوێ.

دەتوانێ بەهۆی ئەو ڕووحەوە بچێتە بەرزی هەرە بەرزان (**أعْلى عليِّين**)و، دەشتوانێ بچێتە نزمی هەرە نزمان (**أسفل سافلين**).

لێرەدا خوای کاربەجێ دوای ئەو چوار سوێندە، ڕایدەگەیەنێ کە مرۆڤی لە باشترین پێکهاتەی ماددیی و مەعنەویی و ڕواڵەتیی و ڕووحییدا هێناوەتە دی[1].

﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴾ دوایی گێڕامانەوە بۆ نزمی هەرەنزمان.

ئەمە لە سوورەتی (ص)یش دا هاتوە[2].

---

(١) باشترین شێوەی مەعنەویی کە ڕووحەکەیەتی و پڕە لە نهێنیی و تەنیا خوا دەزانێ چۆنە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء، لەبارەی ڕووحەوە لێت دەپرسن، بڵێ: ڕووح لەکاری پەروەردگارمەو ئەندازەیەکی کەم نەبێ زانیارییتان پێ نەدراوە، واتە: بەو ئەندازە کەمە زانیارییە ناتوانن دەرکی چییەتی ڕووح بکەن. هەروەها خوای پەروەردگار لەچەندان شوێن دا کە باسی دروستکردنی ئادەم دەکات، هەروەها باسی دروستکردنی وەچەی ئادەم دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى ﴿٢٩﴾ ﴾ الحجر، هەر کاتێك ڕێکمخست، جەستەکەیم ئامادەکرد و لە ڕووحێك کە تایبەتە بەخۆمەوە، دروستکراوێکی تایبەتی خۆمە، فووم بەبەردا کرد.

(٢) بەڵام ئەوە کە خوای زانا وشەی ڕووحی بەکارهێناوە بۆ وەچەی ئادەم، بەپێی زانیاریی من تەنیا لە سوورەتی (السجدة)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە هەرشتێك دروستیکردوە بەباشترین شێوە دروستیکردوە، دەستپێکی دروستکردنی مرۆڤیشی لە قوڕەوە هێناوە، واتە: جەستەکەی، دواییش وەچەکەی (لەڕووی جەستەییەوە) لە پوختەیەك، لە

کەواتــە: کــە دەفەرمــوێ: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ٤﴾، بەدڵنیایــی مرۆڤــمان لــە باشــترین پێکاتــەدا هێناوەتــە دی، بــەر لــەوەی جەســتەکەی بگەیەنــێ، مەبەســت ڕووحەکەیەتــی، چونکە لە جەســتەدا مرۆڤــ لەگەڵ دروســتکراوەکانی دیکەدا بەشــدارەو خاڵــی هابەشــیانە، بــەڵام بــە ڕووح جیادەبێتــەوە لــە دروســتکراوەکانی دیکــە، بــەو ڕووحــەی خــوا نــاوی لێنــاوە: ڕووحــی خــۆم، یــانی: دروســتکراوی تایبەتــی خــۆم.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ ٥﴾، دوایی گێڕامانەوە ژێری هەرە ژێران، خوارەوەی هەرە خوارەوان، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو مرۆڤە ئەو پێگە بەرزەی خوا پێیداوەو ئەو ڕێزو حورمەتەی خوا لێیناوە، دەتوانێ بەهۆی ئیمان و خواناسیی و پەیوەندیی بەخواو بەندایەتیی بۆ خواوە پارێزگاریی لێ بکات، بەڵام پارێزگاریی لێ نەکردوە، لەو پێگە بەرزە، نزم بۆتەوە بۆ خواری خوارێ، پێشێ خوا لەسەری سەرەوەی داناوە، کە دەیتوانی بمێنێتەوەو بەرزتریش بێتەوە، بەڵام بەهۆی بڕوا نەهێنان و پەیوەندیی پچڕانی لەگەڵ خواوە، کەوتۆتە خواری خوارێ، چونکە مرۆڤــ بە پێچەوانەی دروستکراوەکانی دیکەوە، دەتوانێ زۆر سەرکەوێ و دەشتوانێ زۆر داکەوێ، بەڵام دروستکراوەکانی دیکە وانین، بۆ وێنە: شەیتان هەر شەیتانە، فریشتە هەر فریشتەیە، ئاژەڵ هەر ئاژەڵە، بەرد هەر بەردە، ڕووەک هەر ڕووەکە، بەڵام مرۆڤــ دەتوانێ زۆر بەرز بێتەوەو دەشتوانێ زۆر نزم بێتەوە، بۆ وێنە: لەڕووی نەفامیی و کەم هۆشییەوە کەر وێنەی پێ دەهێنرێتەوە، دەگوترێ: فڵانکەس وەک کەر وایە، یان کەرە! یانی: کەم هۆش و کەم عەقڵە، ئنجا کەر هەر دەتوانێ کەر بێ، بەڵام مرۆڤــ دەتوانێ لە نەفامییدا وەک کەر بێ و، لە فێڵبازییدا وەک ڕێوی بێ و، لەدڕندەییدا وەک گورگ بێ و، لە لاساییکردنەوەدا وەک مەیموون، بێ و، لە ئارەزووپەرستییدا وەک بەراز بێ و ... هتد.

---

ئاوێکــی بێهێــزەوە هێنــاوە، دوایــی جەســتەکەی (وەچــەی ئادەمــی) ڕێکخســتوەو لــە ڕووحــی خــۆی فــووی بەبــەردا کــردوە، واتــە: لــەو ڕووحــەی تایبەتە بــە خۆیــەوەو دروســتکراوێکی تایبەتی خۆیەتــی و، تەنیــا خــۆی چییەتەکــەی دەزانــێ، هەروەهــا بیســتن و چــاوەکان و عەقڵەکانــی بــۆ ڕەخســاندن، بــەڵام بەکەمیــی سوپاســگوزاریی بــۆ خــوا ئەنجــام دەدەن.

لەیەک کاتدا مرۆڤ دەتوانێ سیفەتە خراپ و نزمەکانی کۆمەڵێک لە دڕندەو ئاژەڵان لە خۆیدا کۆ بکاتەوە، بۆیە مرۆڤ کاتێک پەیوەندیی لەگەڵ خوادا نامێنێ و دەپچڕێ، دەچێتەوە خواری خوارێ، ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴿٦﴾ ﴾، بێجگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، ﴿ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ ﴾، ئەوانە ناچنەوە خواری خوارێ، بەڵکو بەهۆی ئیمان هێنانەوە بەهەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ و، ئەنجامدانی کردەوە باشەکانەوە، ئەو ڕێزو پێگەو حورمەتەی خوا پێیداون، دەیپارێزن، بۆیە ئەوانە: ﴿ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ ﴾ لەڕۆژی دواییدا پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە.

﴿ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ ﴿٧﴾ ﴾ ئەمە لەڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە پێی دەگوترێ: ئاوڕدانەوە (**إلتفات**) پێشێ خوا بەشێوەی نادیار لەبارەی مرۆڤەوە قسەی کرد، ئنجا ڕوو لە مرۆڤ دەکات و دەفەرموێ: چ شتێک وات لێ دەکات بێبڕوا بی بە ڕۆژی سزاو پاداشت، ئەگەر وشەی (دین) مانای (**جزاء**) بێت، دەشگونجێ (دین) مەبەست پێی بەرنامەی خوا بێ، واتە: چ شتێک وات لێ دەکات بێبڕوا بی، بەرانبەر بەرنامەی خواو بەدرۆی دابنێی، دوای ئەوەی خوای کاربەجێ ئەو ڕاستییە مەزنانەی بۆ خستیە ڕوو، چ شتێک پاڵت پێوەدەنێ بێبڕوا بی بە سزاو پاداشت، یان بە بەرنامەی خوا؟!

یاخود ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ، یانی: ئەی موحەممەد ﷺ! دوای ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە مەزنانە، چ شتێک وا لەنەیارانت دەکات تۆ بەدرۆ دابنێن، بەهۆی بێبڕواییان بە سزاو پاداشتەوە، واتە: تۆ بەدرۆ دابنێن بەهۆی ئەوەوە کە بڕوایان بەڕۆژی سزاو پاداشت نیەو تۆش دەڵێی: سزاو پاداشت هەیە؟!

واتایەکی دیکەشی ئەوەیە: ئەی مرۆڤ! چ شتێک وات لێ دەکات دوای ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە مەزنانە، درۆ بکەی بەهۆی بەدرۆدانانی ڕۆژی سزاو پاداشتەوە؟! ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾ ﴾، ئەمە پرسیارکردنی دانپێپێداهێنان (**إستفهام تقريري**)ە، واتە: ئایا خوا دادگەرترینی دادوەران نیە؟ یاخود: ئایا خوا کارزانترینی حوکمڕانان و دادوەران

نیە؟ ئەمە پرسیارکردنێک نیە تاکو وەڵامەکەی بزانی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ وەک دوایی دەیهێنین، لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا فەرموویەتی: (**بَلَىٰ وَأنا عَلَى ذَٰلِكَ مِنَ الشَّاهدين**) با، (خوا دادگەرترین و کارزانترینی دادوەران و حوکمڕانانەو)، منیش لەوبارەوە لە شایەدانم، شایەدیی دەدەم.

بەڵێ ئەوە ئەوپەڕی دادگەرییە، ئەوپەڕی کارزانییە بۆ خوای بەرز، کە مرۆڤێک بخوڵقێنێ لە باشترین شێوەداو، بە هۆی ئیمان و کردەوەی باشەوە، ئەو باشترین شێوەو، ئەو پێگە بەرزە لە خۆیدا بپارێزێ، بەڵام بەهۆی لادان و تاوانەوە، لەو پلەو پێگەو مەقامە بەرزە داکشێتە خوارێ، داپەڕێتە خوارێ، خواری هەرە خوارێ!

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سوێندخواردنی خوا بە هەنجیرو زەیتوون و کێوی سیناو وڵاتی هێمن و ئاسایش، شاری مەککە، کە مرۆڤی لە باشترین شێوەو پێکهاتەی ماددیی و مەعنەوییدا هێناوەتە دی، دوایی گێڕاویەتەوە پلەی خواری خوارێ، جگە لە بڕوادارانی کردار باش، کە پاداشتی نەبڕاوەیان هەیە:**

وەک دەفەرموێ: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ١ وَطُورِ سِينِينَ ٢ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ٣ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ٤ ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ ٥ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ٦﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە حەوت بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ١﴾ سوێند بە هەنجیرو بەزەیتوون، (و) لە وشەی (والتين) دا بۆ سوێندە، سوێند بە هەنجیر، هەروەها (و)ی دووەمیش دیسان هەر بۆ سوێندە، سوێند بە زەیتوونیش، دیارە هەنجیرو زەیتوون دوو دەرختن، هەم بە درەختەکەیان دەگوترێ: هەنجیرو زەیتوون، هەم بە میوەکەشیان هەمان ناو دەگوترێ، (تين) واتە: هەنجیر، کە دەخورێ و لە درەختی هەنجیر دەکرێتەوە، زەیتوونیش ئەو زەیتوونەیە کە لە درەختی زەیتوون پەیدادەبێ، هەم بەکاڵیی دەخورێ، هەم ڕۆنی لێ پەیدا دەبێ و، بەزۆر شێوە بەهرەی لێ وەردەگیرێ.

زمانە بیانییەکان بۆ (تین) هەر (angeer)یان بەکارهێناوە، دیارە وشەیەکی هاوبەشی کۆمەڵێک لە زمانەکانە، کە بۆ ئەو جۆرە درەختەو ئەو جۆرە میوەیە بەکاردەهێنرێ.

ئنجا شتی سێیەم دێ کە خوا سوێندی پێ دەخوات:

**٢)-** ﴿وَطُورِ سِينِينَ ۝٢﴾ سوێندیش بەکێوی سینین، (**طور**) بە مانای (جبل) چیا، دێ، (سینین) لە وشەی (سَيناء)ەوە هاتوە، لە سوورەتی (**المؤمنون**)داو (سینین) و (سَيناء) هەر یەکن و ناوی بیابانێکەو دەشتێکە دەکەوێتە نێوان فەڵەستین و میسرەوە، ئنجا لەبەر ئەوەی ئەو چیایە دەکەوێتە بیابانی سیناوە، بۆیە گوتراوە: (**طور سنین**)، لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا دەفەرموێ: ﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْـَٔاكِلِينَ ۝٢٠﴾.

ئنجا چوارەم شت دێ کە خوا سوێندی پێ دەخوات:

**٣)-** ﴿وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ۝٣﴾ سوێند بەم وڵاتە هێمن و پڕ ئاسایشە، کە بەدڵنیاییەوە مەبەست پێی مەککەیە، بەڵام وشەی (**الأمين**) دوو واتای هەن:

یەکەمیان: (**سُمِّيَ الأَمين، لأَنَّ مَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنَاً، فَالأَمِين فَعيلٌ بِمَعْنَى مُفْعِل**) واتە: بۆیە ناونراوە (**أمين**) چونکە هەرکەس دەچێتە ئەو شوێنە دڵنیاو بێ ترس دەبێ، هێمن دەبێ، کەواتە: (أمين) لە سەرکێشی (فعيل)ە، بەڵام بە مانای (مُفْعِل)ە، واتە: دڵنیاکەر، هێمنکەر.

دووەمیان: (أمين) لەسەر کێشی (فعيل)ە، بەڵام بەمانای (مفعول)ە، (**أَي: المأْمونِ سَاكِنوهُ**)، واتە: نیشتەجێبووەکانی ئەمینن، دڵنیان، لە خۆیان ناترسن.

**٤)-** ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۝٤﴾، بەدڵنیایی مرۆڤمان لەباشترین شێوەدا، لەباشترین پێکهاتەدا هێناوەتە دی. ئەمە وەڵامی سوێندەکەیە.

**٥)-** ﴿ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ۝٥﴾، دوایی گێڕامانەوە بۆ ژێری هەرە ژێران، خواری هەرە خواران، بۆچی دەفەرموێ: گێڕامانەوە؟ چونکە بەپێی سیستمێک کە خوا لەژیانی بەشەردا دایناوە، مرۆڤ ئەگەر پەیوەندیی لەگەڵ خوادا هەبێ، ئیمانی هەبێ و کردەوەی چاکی هەبێ، ئەو ڕێزو حورمەت و پێگە بەرزەی خوا پێیداوە، دەیپارێزێ.

بەڵام ئەگەر پەیوەندیی لەگەڵ خوادا پچڕا، خۆی لێ ون دەبێ و شۆڕ دەبێتەوە بۆ خواری خوارێ.

دوایی خوای پەروەردگار کەسانێک هەڵداوێرێ، لەو شۆڕبوونەوەو کەوتنە خوارە جیایان دەکاتەوەو دەفەرموێ:

٦)- ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ﴿٦﴾ ﴾، بێجگە لەوانەی بڕوایان هێناوە (بەهەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ) و کردەوە باشەکانیشیان ئەنجام داون، ئەوانە بەدڵنیایی پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: ﴿ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ﴾، واتە: منەتیان لەسەر ناکرێ، بەڵام وا پێدەچێ زیاتر (ممنون) بەمانای (**مقطوع**) بێ، (**منَّ الحَبلَ: أي قَطَعَهُ**) پەتەکەی پچڕاند، واتە: پاداشتەکەیان بێ کۆتاییەو نەبڕاوەیە.

ئنجا با چەند سەرنجێکی وردتر لەو ئایەتە موبارەکانە بدەین، سەرەتاش دەڵێین: دواتر کورتە باسێک لەبارەی هەنجیرەوە دەکەین، کاتی خۆیشی لەتەفسیری سووڕەتی (النحل)دا کورتە باسێکمان لەبارەی زەیتوونەوە کردوە، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

شایانی باسە: ئەم ئایەتانە بە چەند جۆرێک ماناکراون:

**مانای یەکەم:** دەپرسین: ئایا خوای پەروەردگار سوێندی خواردوە بەو دوو درەختەو بە بەرەکەیان، یاخود مەبەست لە باسکردنی ئەو دوو درەختە شوێنەکەیانە، واتە: ئەو شوێنەی ئەو دوو درەختەی زیاتر لێ دەڕوێن؟ زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست پێی شامە.

هەردوو واتایەکەی هەن، ئەگەر مەبەست هەردووک درەختەکەو ئەو دوو جۆرە ڕووەکە بێ، بەڕاستیی هەنجیروزەیتوون دوو میوەی زۆر بەسوودن و سەرسوڕهێنەرن، وەک کاتی خۆی باسی زەیتوونمان کردوە، دوایی باسی هەنجیریش دەکەین، ئەگەر مەبەستیش شوێنەکەیان بێ، ئەو شوێنەی هەنجیرو زەیتوونی لێ دەڕوێن، کە شامەو

شوێنی عیسایە (سەلامی خوای لێ بێ)، ئەو زیاتر لەوێ بووە، هەروەک کێوی سینا شوێنی مووسایە (سەلامی خوای لێ بێ)، مووساش زانراوە کە خوا لەسەر کێوی تووڕ دواندوویەتی و تەوراتی پێداوە، بۆیە ئەو شوێنەش بە نشینگەی مووسا دادەنرێ، ﴿وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ۝٣﴾ ئەم وڵاتە هێمن و پڕ ئاسایشە، یان: ئەم وڵاتە ئاسایشکەرەو خەڵک هێمنکەرە، کە شوێن و نشینگەی موحەممەدە ﷺ.

**مانای دووەم:** هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: خوای پەروەردگار لێرەدا باسی چوار شوێن و چوار قۆناغ لە ژیانی بەشەر دەکات و ئاماژەیان پێ دەکات:

**قۆناغی یەکەم:** ئادەم و حەووا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ لەبەهەشت بوون، چ ئەو بەهەشتەی خوا بۆ بڕوادارانی داناوەو لەڕۆژی دواییدا دەیچنەتێ، چ مەبەست پێی باخێک بێ لە شوێنێکی بەرز، لەسەر زەوی، ئەوەش ڕایەکە.

ئنجا لەوێ کە لە درەختە قەدەغەکەیان خواردوە، ئەو درەختەش کە لێیان خواردوە وابووە پاشەڕۆکی هەبێ و، پەییان بردوە بە عەورەتی خۆیان و، گەڵای درەختیان بەخۆیانەوە لکاندوە، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ ۝٢٢﴾ **الأعراف**، ئنجا زانایان بەشێکیان دەڵێن: ئەوە گەڵای هەنجیر بووە بە خۆیانەوە لکاندوە، کەواتە: ﴿وَٱلتِّينِ﴾، ئاماژەیە بۆ قۆناغی یەکەمی ژیانی بەشەر، کە ئادەم و حەووان.

**قۆناغی دووەم:** ﴿وَٱلزَّيۡتُونِ﴾، زەیتوونیش ئاماژەیە بۆ قۆناغی دووەم لە ژیانی بەشەر، چونکە نووح سەلامی خوای لێبێ دوای ئەوەی کەشتییەکەی لەسەر چیای جوودیی نیشتۆتەوە - وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّ ۝٤٤﴾ **هود**، چیایەکەش دەکەوێتە باکووری کوردستان و لەلای جەزیرەیە - کۆتری ناردوە، یان باڵندەیەکی دیکەی ناردوە، بۆ ئەوەی سۆراغ بکات بزانێ: ئەو تۆفانەی دنیای داگرتوە، ئایا وشکانیی دەرکەوتۆتەوە؟ ئەویش چڵە زەیتوونێکی بۆ هێناوە، لەوەوە گەیشتوونە ئەو قەناعەتە کە وردە وردە وشکانیی دەرکەوتۆتەوە، ئنجا فەرمانی بە سواربووانی کەشتییەکەو سەرنشینانی کردوە کە دابەزنە خوار.

زەیتوونیش ئاماژەیە بە قۆناغی دووەمی ژیانی بەشەر، کە لە نووحەوە دەست پێدەکاتەوە، بۆیەش بە نووح گوتراوە: دووەمین بابی مرۆڤایەتیی.

**قۆناغی سێیەم:** ﴿ وَطُورِ سِينِينَ ۝٢ ﴾ کێوی **طووریش** ئاماژەیە بە قۆناغێکی دیکەی ژیانی بەشەر، دوای ئەوەی خوای کاربەجێ بەنوو ئیسرائیلی لە دەستی فیرعەون لە میسر دەرباز کردن و هێنانی بۆ دەشتی سیناو، خوای باڵادەست و بەبەزەیی دەریای سووری بۆ شەق کردن و لە دەشتی سینا جێگیر بوون، ئنجا خوا تەوراتی بە مووسادا سەلامی خوای لێبێ، واتە: شەریعەت و بەرنامە بۆ ئەوەی ژیانی کۆمەڵگایەکەی خۆی پێ ڕێک بخات، ئەویش قۆناغێکی دیکەی سێیەمە لە ژیانی بەشەر.

**قۆناغی چوارەم و کۆتایی:** لە ژیانی بەشەر لەڕووی ڕێنماییکرانەوە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، ئەو قۆناغەیە کە لەسەر دەستی موحەممەد ﷺ دەستی پێکرد: ﴿ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ۝٣ ﴾، ئەم وڵاتە پڕ هێمن و ئاسایشە، یان ئەم وڵاتە ئاسایشکەرە، کە مەککەیە، ئەمەش قۆناغی کۆتایی پەیوەندیی مرۆڤەکانە لەگەڵ خواداو کۆتا بەرنامەی خۆی دابەزاندە سەر موحەممەد ﷺ، بەدرێژایی زەمان و بە پانایی زەمین، بۆ هەموو بەشەر.

**مانای سێیەم:** هەندێکی دیکەش گوتوویانە: بەڵێ: مەبەست پێیان چوار قۆناغەکەی ژیانی بەشەرە، بەڵام مەبەست ئەو چوار پەیامەیە کە خوا ناردوونی بۆ بەشەر:

**١-** پەیامەکەی بووزا کەوەک لە ژیانیدا هاتوە، لە کاتی پەیام بۆ هاتنی دا لەژێر درەختێکی هەنجیردا بووە، دیارە بەپێی ئەو ڕایەی بووزاش یەکێک بووە لە پێغەمبەران، بەڵام دوایی بەرنامەکەی گۆڕدراوەو دەستکاریی کراوە.

**٢-** پەیامەکەی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)، کە زەیتوون تەعبیر دەکات لە شوێنەکەی عیسا کە شامە و ئینجیلی لەوێ بۆ هاتوە.

**٣-** پەیامەکەی مووسا، کە کێوی تووڕ تەعبیر لە شوێنەکەی دەکات.

**٤-** پەیامەکەی ﷺ کە قورئان و ئیسلامە و وڵاتی هێمن و هێمنکەر ئاماژەی پێ دەدات.

هەموو ئەمانە بە جۆرێک لە جۆرەکان پێدەچن، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست لە هەنجیر هەر ئەو هەنجیرەبێ کە دەخورێ و، زەیتوونیش بەهەمان شێوە، ﴿وَطُورِ سِينِينَ ۝٢﴾، یش هەر دیارە کە کێوی سینایە، ﴿وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ۝٣﴾، ئەم وڵاتە پڕ هێمن و ئاسایشەش دیارە کە شاری مەککەیە.

**مانای چوارەم:** دەشگونجێ بڵێین: ئەمە ئاماژەیە بە سێ ئایینەکەی خوای پەروەردگار کە شوێنکەوتووانیان هەن:

**أ-** (التين والزيتون) ئاماژەیە بە ئایینی مەسیح، عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)، کە شوێنەکەی شام بووە.

**ب-** ﴿وَطُورِ سِينِينَ ۝٢﴾، ئاماژەیە بەو پەیام و ئایینەی خوا بۆ مووسای ناردوە.

**ج-** ﴿وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ۝٣﴾، ئاماژەیە بە کۆتا پەیامی خوا. ئێستاش ئەم سێ ئایینە وەک ئایینی ئاسمانیی شوێنکەوتوانیان هەن: ئەوانەی شوێن عیسا دەکەون و، ئەوانەی شوێن مووسا دەکەون و، ئەوانەی شوێن موحەممەد دەکەون، (صەڵات و سەلامی خوا لە هەرسێکیان بێ).

سوێند بەمانە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۝٤﴾، بەدڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین شێوەو پێکهاتەدا، هێناوەتە دی، (**التَّقويم جَعْل الشَّيء في قَوامٍ، وَالقَوامُ: هوَ العَدْلُ وَالتَّسويَةُ**) (**تقويم**) بریتیە لەوەی شتێک بخرێتە حاڵەتی (**قَوام**)، ئەمیش واتە: دادگەریی و ڕێک و ڕاستیی.

کە دەفەرمووێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ﴾، (أل)ی سەر (الإنسان) بۆ ناساندنەو ناساندنەکەش بۆ جینسە، واتە: کۆی مرۆڤانمان بەو شێوەیە خوڵقاندوە، یاخود بۆ ناساندنی چییەتە، نەک مرۆڤەکان هەموویان تێیدا لە بەرچاوبگیرێن، بەڵکو چییەت و حەقیقەتی مرۆڤی تێدا لەبەرچاو گیراوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ۝٥ ﴾، (ثُمَّ) بێگومان بۆ ڕیزبەندیی و بەدوایەکداهاتنە، یانی: دوایی مرۆڤمان گێڕایەوە بۆ ژێری هەرە ژێران، ئەمە زانایان چ لە ڕووی ڕێـزمانییەوە، چ لەڕووی واتایەکەیەوە، زۆر قسەیان لەسەر کردوون، هەندێکیان گوتوویانە: (**أَسفَلَ إِسْم تفضيل، أَي: أَشَدّ سَفَالةً، وَسافِلِين مَوْصوفِينَ بِالسَّفَالة، والسَّفالَةُ إنْخِفاضُ مَكانٍ، وَتُطْلَق مَجازاً لِلخِسَّةِ وَالحَقارةِ في النَّفْس**) واتە: (**أَسفَلَ**) لەڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە پێی دەگوترێ: (**إِسْم تَفضِيل**) ناوی هەڵبژاردن، واتە: نزمتر، شۆڕتر، (**سافلين**) ئەوانەن کە بە سەفالەت وەسف دەکرێن، سەفالەتیش بریتیە لە نزمبوونی شوێن، بەڵام دوایی بە مەجاز بەکارهێنراوە بۆ بێنرخیی و بێبایەخیی نەفسێک کە بێڕێزەو کەم نرخە.

١- هەندێک گوتوویانە: ﴿ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴾ (**حَالٌ مِنَ المَفعولِ أي: رددناه حَالَ كَونِهِ أَسْفَل السَّافلين**) لە حاڵێکدا کە ئەو لە ژێری هەرە ژێرەکان بووە.

٢- یەکێکی دیکە لەزانایان دەڵێ: (**صِفة لِمَوصوف مَحذوفٍ، أَي: مَكاناً أَسْفَل السَّافِلِين**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: بۆ شوێنێک کە نزمترینی نزمەکانە.

٣- هەندێکی دیکە گوتوویانە: (**صَيَّرناهُ أَسْفَلَ مِنَ الحَيواناتِ الَّتي كَانَت أَسْفَل مِنْهُ**) گێڕامان بە نزمتر لەو ئاژەڵ و ژیاندارانەی لەو نزمتر بوون، کەچی دوایی ئەو چووە خواری خوارەوەیان.

٤- یەکی دیکەیان دەڵێ: (**ثُمَّ جَعلْناهُ مِن أَهْلِ النَّارِ الَّذي هُم أَقْبَحُ مِنْ كُلِّ قَبيح**) دوایی گێڕامان لە خاوەنانی ئاگر، کە لە هەموو ناقۆڵایەک ناشیرینترن.

٥- (عبدالرحمن بن ناصر السعدی) دەڵێ: (**أَسْفَل سَافِلِين، أَي: أَسْفَل النَّارِ، مَوضِع العُصَاةِ المُتَمَرِّدِينَ عَلَى رَبِّهِم**) ژێرەوەی ئاگر کە شوێنی سەرپێچییکاران و هەڵگەڕاوانە لە پەروەردگاریان.

٦- (**الزمخشري**) دەڵێ: (**أَنْ رَدَدْنَاهُ أَسْفَل مِن سَفَلَ خُلْقاً وَتركِيباً، يَعني: أَقْبَحَ مِن قَبُحَ صورَةً وَأَشْوَهَهُ خِلْقَةً، وَهُم أَهْلُ النَّار**) نزمتر لە هەرکەسێک کە نزمە لەڕووی پێکهاتەوەو، ناشیرینتر لە هەرکەسێک کە ناشیرینە لەڕووی شێوەوە، کە بریتیە لە دۆزەخییەکان.

**٧- (ابن عجيبة)** لە **(أبو العبّاس المرسي)** دەگێڕێتەوە (کە یەکێکە لە عاریفەکان)، گوتوویەتی: سووڕەتی (التین)م خوێند، دوایی شەو لەخەودا لەوحی مەحفووزیان پێشاندام، نووسرابوو: **(أحسن تقويم: أي عقلاً وروحاً، ثُمَّ رَدَدناهُ أَسْفَل سافِلين: أَي نَفْساً وَهَوىً)** لەڕووی عەقڵ و ڕووحەوە لە باشترین شێوەدا هێناومانەتە دی، بەڵام نزممان کردنەوە بۆ پلەی هەرە خوارێ لەڕووی نەفس و ئارەزووەکانەوە.

ئەم مانایانەش هەر کامێکیان بە شێوەی خۆی جۆرێک لە گونجاوییان تێدایە.

﴿أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ﴾، **(ظَرفٌ أَي مَكاناً أَسْفَلَ مَا يَسْكُنُه السَّافِلون، فإضافة أسفل إلى سافلٍ، إِضَافَةُ الظَّرْفِ إلى الحالِّ فيهِ)**، واتە: ئەمە زەڕفە، ناوی شوێنە، یانی: شوێنێک کە نزمترە لە هەموو ئەوەی خەڵکی نزم تێیدا نیشتەجێ دەبن، **(أسفل)** پاڵدراوەتە لای **(سافلين)** ئەمە پاڵدانی شوێنە بۆ لای کەسێک لەو شوێنەدا نیشتەجێیە، واتە: ئەوانەی نیشتەجێن لە شوێنی هەرە نزمدا.

زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە **(أسفل)** (منصوب)ە لەبەر ئەوەی زەڕفە، یانی: **(مكاناً أسفل)**، یاخود بە داڕنینی ژێردارکەر **(نزع الخافض)** و لە ئەسڵ دا ئاوایە: **(إلى أسفل سافلين)**، بەڵام (إلى)یەکەی لابردراوە، بۆیە پێی دەگوترێ: **(منصوب بنزع الخافض)**، یانی: ئەوەی ژێرداری دەکرد لابردراوەو لێی داڕنراوە، بۆیە مەنسووب بووە.

٦- ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوە (بەهەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ) و کردەوە چاکەکانیشیان ئەنجام داون.

٧- ﴿فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ٦﴾، ئەوان پاداشتێکی نەبڕاوەیان بۆ هەیە.

لەبارەی ئەوەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ٤﴾، لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: **{فَإِنَّ اللَّهَ خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ، وَفِي روايةٍ: عَلَى صورةِ الرَّحْمنِ}** **(أخرجه أحمد: ٨١٥٦، والبخاري: ٥٨٧٣، ومسلم: ٢٨٤١)**، واتە: خوای بەرز ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست کردوە، لە گێڕدراوەیەکدا دەفەرموێ: ئادەمی لەسەر شێوەی (الرحمن) دروست کردوە.

هەڵبەتە شێوە مەبەست پێی شێوەی مەعنەوییە، واتە: ئەو سیفەتانەی خوای بەرزو مەزن هەینی، لەجۆری ئەو سیفەتانەش بەشی بەشەرانی داوە، زانیاریی و بینین و بیستن و قسەکردن و بەزەیی و، ...هتد، هەموو ئەو سیفەتانەی لە مرۆڤەکاندا هەن، خوای پەروەردگار لەو سیفەتانەی خۆی بەشی مرۆڤیشی داوە، مەبەست پێی ئەوەیە ئەگەرنا خوا وێنەکەی دیار نیە، تاکو بزانین وێنەی خوا چۆنە، ئنجا بگوترێ: مرۆڤی لەسەر وێنەی خۆی دروستکردوە، خوای بێ وێنە لە سەرووی دروستکراوەکانەوەیەو، لەسەرووی ئەوەوەیە وێنەی هەبێ، وەک دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ١١﴾الشورى، واتە: هیچ شتێک وەک وێنەی خوا نیە.

کەواتـە: فەرموودەکـە مەبەسـتی پـێ وێنـەی مەعنەوییـە، واتـە: لـەڕووی مەعنەوییـەوە، لـەڕووی سـیفەت و ئاکارەکانـەوە، خـوا ئادەمـی لەسـەر شـێوەی خۆی، هەمـان ئـەو سـیفەتانەی خـۆی هەینـی، بەشـی ئادەمیشـی لێـداون، لەقـەدەر خـۆی.

مەسەلەی دووەم:

**ئایا دوای ئەوە چ شتێك مرۆڤ بێبڕوات دەكات بە سزاو پاداشتی خوا؟ ئایا خوا دەستڕۆیشتووترین و كارزانترین دادوەر نیە؟**

وەك دەفەرموێ: ﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴿٨﴾﴾.

شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ﴿٧﴾﴾، چ شتێك دوای ئەوە وا لە تۆ دەكات بێبڕوابی بە سزاو پاداشت، یان: بە ئایین و بەرنامەی خوا؟ پیتی (ف)، (**الفَاء لِلتَّفرِيعِ عَلى جَمِيعِ مَا ذُكِرَ، لأَنَّ مَا بَعْدَ الفَاءِ مُسَبَّبٌ عَن البَيان الَّذي قَبْلَهَا**) لێرەدا (ف) بۆ بنیاتنانە، لەسەر تێكڕای ئەوەی پێشتر باسكرا، چونكە هەمیشە ئەوەی لەدوای (ف)ەوە دێ، پەیداكراوە لەو ڕوونكردنەوەیەی پێشێ باسكراوە.

واتە: دوای ئەوەی ئەو شتانە باسكران، چ شتێك وا لە تۆ دەكات بێبڕوا بی و سزاو پاداشت بەدرۆ دابنێی؟ وشەی (ما) دوو حاڵەتی هەن و سەرجەم ئەم ئایەتە چوار مانای دەبن:

١- (**إِسْتِفْهامِيَّة تَوبيخيَّة، أي: مَا الَّذي يَجْعَلُك مُكَذِّباً، فَلا عُذْرَ لَكَ فِي تَكذيبِكَ بالدِّين**) واتە: چ شتێك وا لەتۆ دەكات بەدرۆ دانەر بی، هیچ پۆزشێكت نیە بۆ بەدرۆ دانانی سزاو پاداشت.

٢- یاخود (**ما موصولة**) بەواتای (**مَن**) (**أي: مَنِ الَّذي يَنْسِبُك إلى الكَذِب بسبب مَا جِئْتَ بِهِ مِنَ الإِسْلامِ أَو الجَزاء؟**) ئەگەر (ما) (**موصولة**) بێ دەبێ ڕووی دواندن لە پێغەمبەر ﷺ بێ، واتە: چ كەسێك تۆ پاڵدەداتە لای درۆ، بەهۆی ئەوەوە كە ئیسلامت هێناوە، یاخود سزاو پاداشتت ڕاگەیاندوە، كە خوا سزاو پاداشتی هەیە ئەی موحەممەد؟

٣- واتایەكی دیكەی: (**ما سَبَب تكذيبِكَ بَعدَ هَذا البَيَان؟**) دوای ئەم ڕوونكردنەوەیە چ

شتێك وا لەتۆ دەكات بیبڕواو بەدرۆدانەر بی بەسزاو پاداشت، دوای ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییە مەزنانە؟

٤- واتایەكی دیكەی: (**مَا الَّذي جَعَلَك كَاذِباً بِسَبَبِ تَكذيبِكَ بِالدِّين؟**) واتە: چ شتێك وا لە تۆ دەكات درۆ بكەی بەهۆی بەدرۆدانانی سزاو پاداشتەوە؟ چونكە هەر كەسێك شتێكی ڕاست بەدرۆ دابنێ، درۆی كردوە.

ئـەو ئایەتـە ئـەو چـوار واتایـەی هـەن و، دیـارە هەندێكیـان لـە هەندێكیـان بەهێزتــرن.

لە كۆتایی دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

٢)- ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾ ﴾، ئایا خوا دادگەرترینی، یاخود كارزانترینی دادوەران نیە؟

ئـەم پرسـیاركردنە بـۆ دان پێپێداهێنـان (**الإسْـتفهام للتَقريـر**)ە، یـانی: بەدڵنیایـی خـوا دادگەرترینـی دادوەرانـە، خـوا كارزانترینـی دادوەرانـە، بۆچـی ئـەو دوو واتایەمـان هەردووكیـان بەكارهێنـاوە؟ چونكـە وشـەی (**أَحْكَـم**) یـان لـە (**حُكْـم**)ەوە هاتـوە، واتـە: بڕیـاردان و جێبەجـێ كـردن، خـوا دەستڕۆیشـتووترینی دادوەرانـە، یاخـود لـە (**حكمة**)ەوە هاتـوە.

ئنجـا ئەگـەر لـە (حكـم)ەوە هاتبـێ، ئـەوە بـە مانـای هەڵبـژاردن (**تفضيـل**)ە، یـانی: بڕیـارو حوكمـی خـوا ڕاسـترەو باشـتریش جێـگا دەگـرێ.

بـەڵام ئەگـەر لـە (**حكمـة**)ەوە هاتبـێ، (**أَي: أَقْـوى الحَاكِمـينَ حِكْمَـةً**) خـوا حیكمەتەكـەی لـە هـی هەمـوو دادوەرەكان بەهێزتـرە لـە بڕیاردانیـدا، بەشـێوەیەك كـە كەمتەرخەمیـی و بەزایـەدان بـۆ بەرژەوەندیـی، تێكـەڵ بـە حوكـم و بڕیارەكـەی نابـێ. بۆیـە خـوا باشـترینی ئەوانەیـە كـە دادوەری دەكـەن و حوكـم دەكـەن.

لـە شـوێنەواردا هاتـوە: {كَانَ إِذا قَرَأَهـا قَـالَ: بَـلى وَأَنَـا عَـلَى ذَلِـكَ مِـنَ الشَّـاهِدِين} **(أخرجـه ابـن ماجـه: ٨٨٧، والترمـذي: ٣٣٤٧، وَضَعَّفَـهُ كُل مِـن الألبـاني و شـعيب الأرنؤوط).**

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کاتێـك ئـەم سـوورەتە موبارەکـەی دەخوێنـدو دەگەیشـتە ئـەو ئایەتـە: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ۝٨ ﴾، ئایـا خـوا دادگەرترینـی دادوەران نیـە، کارزانترینـی دادوەران نیـە؟ دەیفەرمـوو: بـا، مـن لـەو بـارەوە لـە شـایەدانم.

## کورتە باسێک لەبارەی هەنجیرەوە[1]

بەڕێـــــــزان!

لەدوو تەوەردا باسی هەنجیر دەکەین:

### تەوەری یەکەم: چەند زانیارییەك لەبارەی درەختی هەنجیرەوە:

**١)-** درەختی هەنجیر یەکێکە لەو درەختە بە پێزانەی خوای میهرەبان لە قوڕئاندا باسی کردوون و، تاکە شوێنێك لە قوڕئاندا ناوی هەنجیری تێدا هاتبێ ئەم سووڕەتەیە، درەختی هەنجیر لە کۆنترینی ئەو درەختانەیە کە مرۆڤ لەسەر زەوی دۆزیونەیەوەو لێیان بەهرەمەند بووە، ئەم درەختە یەکێکە لە درەختە زۆر بەتەمەنە بەردارەکان و، لەگەڵ هەرسێ درەختەکەی دیکە: (زەیتوون، خورما، ترێ) چوارینەیەك پێکدێنن، چوار دەرختن کە مرۆڤ بە گشتیی لەسەر زەوی زۆرترین بەهرەی لێیان وەرگرتوە، ئەم درەختە لە ماوەی هەزاران ساڵدا میوەی تەڕو تازەی لە هاویناندا بۆ مرۆڤ بەرهەم هێناوەو، هەنجیری وشك کراوەو خەزن کراویش لەماوەی ساڵدا، خەڵك هەنجیر وشك دەکاتەوە دەیکاتە خەرواو بە چەند جۆرێك لێی بەهرەمەند دەبن، درەختی هەنجیر کاتی خۆی فینیقییەکان و فیرعەونییەکان و گریکییەکان هەم وەك خواردن، هەم وەك چارەسەرو دەرمان، بەکاریانهێناوە.

**٢)-** زۆربەی لێکۆڵەرەوان پێیان وایە نشینگەی ئەسڵی هەنجیر - بەپێی ڕای ئەو نووسەرە - نیوەدوورگەی عەرەبیی بووە، دوایی گواستراوەتەوە بۆ ئاسیای بچووك لە ئەنادۆڵ و تورکیاو ئەفغانستان، دوایی لەڕێی گریگیی و فینیقییەکانەوە گواستراوەتەوە بۆ ئەورووپا، ئنجا کە ئیسلام هاتوە، ئەم درەختە گواستراوەتەوە بۆ زۆبەی وڵاتانێك

---

(١) ئـەم کورتـە باسـەمان لـە ئینتەرنێـت وەرگرتـووە، لـە چەنـد پێگەیـەك، یەکێـك لـەو پێگانـە بەنـاوی: (ثَقِّـفْ نفسـك) واتـە: خـۆت ڕۆشـنبیر بکـە!

کە دەسەڵاتی ئیسلامی پێگەیشتوە، جارێکی دیکەش لەڕێی تورکیاوە بڵاو بۆتەوە بۆ ئەورووپاو ڕۆژئاوا، هەروەها لە سەدەی چواردەمی زایینی دا گەیشتوە بە هیند، هەروەها لەسەدەی شازدەی زایینیدا لە چین بڵاوبۆتەوە، هەندێك لە شوێنەوارەکان دەگەڕێنەوە بۆ دوو هەزار (٢٠٠٠) ساڵ پێش زایین و دەڵێن: درەختی هەنجیر یەکێك بووە لە کشتوکاڵە سەرەکییەکان لە وڵاتانی ئاسیای بچووك و، وشك کردنەوەو ناردنی یەکێك بووە لە بازرگانییە گرنگەکان کە لەو ڕۆژگارانەدا کراون.

٣)- هەنجیر زۆر لەمێژە هەیەو مرۆڤ لێی بەهرەمەند بووە، پشکنەرەکان هەنجیری بەبەردبوویان دۆزیوەتەوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (٩٤٠٠ - ٩٢٠٠) ساڵ پێش زایین، لە ئاوەدانییەك لەسەردەمی چاخی بەردیندا لە شیوی (بوردن)دا، بگرە شارەزای شوێنەوارەکان (کریس هێرس) دەڵێ: هەنجیر پێنج هەزار ساڵ پێش زایین بەهرەی لێ وەرگیراوە.

گۆڤاری (سادرن لیڤینج) دەڵێ: هەنجیر وێڕای ئەوەی میوەیەکی زۆر خۆشە، درەختی زۆر جوانیشی هەن، لە نێوەڕاست و خواروو و دامێنەکانی، شوێنە ئیستیواییەکانی هێڵی یەکسانیی دا بڵاوبۆتەوەو، هەنجیر یەکێکە لەو درەخت و میوانەی کەیفیان بەگەرما دێت.

٤)- سرووشتی هەنجیر وایە زیاتر لەو شوێنانە دەڕوێ و دەکرێ کە ئاووهەوایان هاوسەنگە، هەر چەندە حەزیشی بە گەرما دەکات، بەڵام ئەو جێیەی هاوکۆی شێی زۆرە هەنجیر لەوێ چاك نابێتێ و، ئەگەر بشبێ بەرەکەی باش نابێ، بۆیە هەنجیر وێڕای ئەوەی لە پێدەشتەکان دا دەبێ، لە چیایەکانیشدا هەر دەبێ.

٥)- هەنجیر پێی خۆشە بەدرێژایی ڕۆژ تیشکی خۆری لێ بدات، بۆ ئەوەی میوەکەی باشتر بێ.

٦)- واباشە لەژێر درەختی هەنجیرداو لە دەوروبەرو نیزیکی هیچ شتێکی دیکە نەکرێ، واتە: کشتوکاڵی دیکە، چونکە زیانی پێ دەگەیەنێ.

٧)- درەختی هەنجیر هەندێ كرم كە پێیان دەگوترێ: **(الديدان الخيطية)** كرمە دەزوويیەكان، لێی دەدەن، هەرچەندە بەرگرییش لەخۆی دەكات و، خوای پەروەرگار وای كردوە كە ئەو زیندەوەرانە بفەوتێنێ.

٨)- گرفتێكی دیكەی درەختی هەنجیر بریتیە لە ژەنگ هێنانی گەڵایەكانی، ئەوەش وا دەكات گەڵایەكانی بەزوویی بوەرن و سەرەنجام بەرهەمی هەنجیرەكەش كەم دەبێتەوە، لەكاتێكدا كە باران زۆر بارێ، ئەو نەخۆشییە لە درەختی هەنجیر دەدا.

٩)- هەنجیر كاتێك بەرەكەی پێدەگات، شۆڕ دەبێتەوەو، واباشە هەنجیر هەر بەنەرمیی و لە باریی لێ بكرێتەوە، بەڵكو باشترە ئەگەر دەستكێشیش لەدەست بكرێ، بۆ ئەوەی كەسانێك كە هەستیارییان هەیە بە شیری هەنجیر، تووشی زیان نەبن.

## تەوەری دووەم: سوودەكانی هەنجیر:

سوودەكانی هەنجیر زۆر زۆرن و ئێمە بەخێرایی هەندێكیان دەخەینەڕوو:

١)- خواردنی هەنجیر ڕێ دەگرێ لەبەرز بوونەوەی گوشار **(ضغط)**ی خوێن، چونكە ئەندازەیەكی زۆر پۆتاسیۆم و، ئەندازەیەكی كەم لە سۆدیۆم لە هەنجیردا هەیە، بۆیە ئەوانەی تووشی گوشاری بەرزی خوێن دەبن، هەنجیر دەبێتە هۆی ڕێكخستنی گوشاری خوێن و دابەزاندنی.

٢)- بۆ كەسانێك كە لەڕووی جینسیەوە گرفتیان هەیە، هەنجیر هۆكارێكی باشە بۆ چارەسەری ئەو نەخۆشییە، كە دوو تاكو سێ هەنجیر بخرێنە نێو شیرەوەو بەیانیان بخورێ، ئەوە ئەو گرفت و كێشەیەی پیاوان تاكو ڕاددەیەك چارەسەر دەكات.

٣)- خواردنی هەنجیر ڕێ دەگرێ لە سەرەتانی پڕۆستات، پڕۆستات ئەو لووەیە كە تەنیا پیاوان هەیانەو، تووشی شێرپەنجە دەبێ، ئەو ڕیشاڵانەی لە هەنجیردا هەن ڕێ دەگرن لە تووشبوونی شێرپەنجەی پڕۆستات، چونكە زۆر پێكهاتەی بەهێزی تێدا هەن كە دژی ژەنگهێنان (أَكْسَدة)ن كە هۆكارێكی سەرهەڵدانی شێرپەنجەیە.

٤)- خواردنی هەنجیر ڕێگە دەگرێ لە توشبوون بە نەخۆشییەکانی دەماری سەرەکیی دڵ، لەبەر ئەوەی هەنجیر ئەندازەیەك ترشەڵۆکی تینۆك و ئۆمێگا سێی تێدایە، هەروەها ئۆمێگا شەشی چەوری تێدایە، ئەو ترشەڵۆکانەش یارمەتی دەدن کە نەخۆشییەکانی دەمارەکانی دڵ کەم ببنەوەو، ڕێژەی چەوریی سێیی لە خوێندا کەم دەکەنەوە.

٥)- پیاوانێك کە دووچاری نەزۆکیی بوون خواردنی هەنجیر چارەسەرە بۆ ئەوە، ئەگەر هەنجیر بە شێوەیەکی باش بەکاربێنن، حاڵەتی نەزۆکیی لە پیاواندا کەم دەکاتەوە، یاخود لایدەبات.

٦)- هەنجیری وشککراوە ژمارەی ژیاندارە تۆییەکان **(الحيوانات المنوية)**لە تۆوی پیاوان دا زیاد دەکات و تەندروستتریان دەکات و، وایان لێدەکات دووربن لە حاڵەتی شێوێندران، بۆیە خواردنی هەنجیری وشك بۆ بەرهەمدارکردنی پیاوان کاریگەرە.

٧)- هەنجیر لە هەندێك لە شوێنەکان، بەتایبەت نیوەدوورگەی هیندیی و، لە هەندێ شوێنی دیکەی دنیادا، وەك چارەسەرێك بەکاردێ بۆ نەخۆشییە زاووزێییەکان، ئەو نەخۆشییانەی دووچاری ئەندامانی زاووزێ دەبن.

٨)- خواردنی هەنجیر ئەندازەی شەکر لە خوێندا ڕێك دەخات، چونکە بێگومان نەخۆشیی شەکرە کاریگەریی دەخاتە سەر هەموو ئەندامەکانی دیکەی جەستە، لەبەر ئەوەی هەنجیر ئەندازەیەکی زۆر لە ڕیشاڵە خۆراکییەکانی تێدا هەن، چ میوەی هەنجیر، چ گەڵایەکانی هەنجیر ئەندازەیەك لە هۆڕمۆنی ئەنسۆلین کە لە جەستەدا هەیە، کەمی دەکاتەوەو ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی ڕێژەی شەکر لە خوێندا دابەزێ.

٩)- خواردنی هەنجیر ڕێژەی کۆلسترۆڵ لە خوێندا دادەبەزێنێ، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئەندازەیەك ماددەی بەکتینی تێدایە، کە جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕیشاڵی خواردن و لە نێو خواردن دا دەتوێتەوەو دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو ئەندازە زیادەی لە کۆلسترۆڵ لە جەستەو خوێندا هەیە، بیخاتە دەرێ، وێڕای ئەوەی بەکتین دەبێتە هۆی ئەوەی

ڕیخۆڵەکان هان بدات لەسەر جموجۆڵ، بۆیە خواردنی هەنجیر بۆ قۆڵۆن باشە تاکو مرۆڤ تووشی قەبزیی نەبێ.

١٠)- خواردنی هەنجیر دەبێتە هۆی دابەزاندنی کێش و ڕێگرتن لە قەڵەویی، بەڵام ئەگەر هەنجیر لەگەڵ شیردا بخورێ، لەوانەیە ببێتە هۆی قەڵەو بوون، چونکە شیر ماددەی چەوریی تێدایەو هەنجیریش ماددەی شیرینیی تێدایەو بەیەکەوە دەبنە مایەی قەڵەویی، بەڵام ئەگەر بەتەنیا بخورێ، مرۆڤ تێر دەکات و وای لێدەکات خواردنی دیکەی زۆر پێ نەخورێ.

١١)- خواردنی ئێسقان بەهێز دەکات، لەبەر ئەوەی ڕێژەیەکی زۆر ماددەی کالیسیۆمی تێدایە، ئەویش یەکێکە لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی ئێسقان، هەروەها هەنجیر لە مەترسیی توشبوونی ئێسکەنەرمە، یاخود بێهێزبوونی ئێسقان، کەم دەکاتەوە، چونکە ئەندازەیەك کانزای فۆسفۆڕی تێدایەو، هەروەها وەك پێشتریش گوتمان ئەندازەیەك کالیسیۆمیشی تێدایە.

١٢)- خواردنی هەنجیر هۆکارە بۆ چارەسەری شێرپەنجەی قۆڵۆن، چونکە ئەو ڕیشاڵە خۆراکییانەی لە هەنجیردا هەن، دەبنە هۆی ئەوەی جووڵە بە ڕیخۆڵەکان بکەن و زووتر لە بەدەن جیابێتەوەو بچێتە دەر.

١٣)- خواردنی هەنجیر ڕێگە دەگرێ لە قەبز بوون و، خەستبوونەوەی پاشەڕۆك لە جەستەداو، نەچوونەدەری، هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی پاشەڕۆك بە ئاسانیی لە جەستەدا بچێتەدەر، ڕیخۆڵەکان جموجۆڵی زیاتر بکەن - وەك پێشتریش گوتیان -.

١٤)- خواردنی هەنجیر ڕێگە دەگرێ لە توشبوونی نەخۆشیی زەهایمەر، کە تووشی مێشك دێت، هەنجیر ڕێگە دەگرێ لە توشبوونی ئەو نەخۆشییە.

١٥)- هەنجیر چارەسەرە بۆ هەوکردنی سیکڵدانۆچکە هەواییەکانی نێوسییەکان، ئەو ماددە کیمیاییە سرووشتییانەی لە هەنجیردا هەن، بەتایبەت لە گەڵاکەیدا، ئەگەر

جۆرێك لە چای لێ دروست بكرێ و بكوڵێنرێ و بەكاربهێنرێ، ڕێ دەگرێ لە هەوكردنی سیكڵدانۆچكەكانی نێو سییەكان و ڕیش دەگرێ لە نیشانەكانی هەناسە بڕكە **(ربُو)**.

**١٦)**- خواردنی هەنجیر پارێزگاریی دەكات لە تەندروستی موو و پێست، لەبەر ئەوەی هەنجیر ئەندازەیەكی زۆر (فلافۆنیودی) تێدایە، هەروەها پێكهاتەكانی دیكەی وەك (دینۆل) كە دژی ئەكسەدەن، دژی ژەنگ گرتنن و، دەبنە هۆی ئەوەی مووەكانی مرۆڤ چاكتر بن و پێستیش سەلامەتتر بێ.

**١٧)**- بەردو لـمێك كە لە گورچیلەدا هەیە، ئەگەر ڕۆژانە هەنجیری وشك بخرێتە نێو پەرداخێك ئاوو بخورێتەوە، بۆ لابردنی زۆر بەسوودە.

**١٨)**- لەبەر ئەوەی هەنجیر ئەندازەیەكی زۆر پۆتاسیۆمی تێدایە، خواردنی دەبێتە هۆی كەمكردنەوەی ئەنسۆلین لە خوێندا، وەكو پێشتریش باسمان كرد، ئەمەش یارمەتییدەرە بۆ ئەوانەی تووشی نەخۆشیی شەكرە بوون.

**١٩)**- هەنجیر بۆ چارەسەری هەوكردنی گەروو، لەكاتێكدا لەگەڵ هەنگویندا تێكەڵ بكرێ، زۆر بەسوودە.

**٢٠)**- هەنجیر هەندێك ماددەی تێدان دژی ئەكسەدەن، یانی: ژەنگگرتنی دەمارەكان و، هۆكار دەبن بۆ دەربازكردنی جەستە لەو ژەهرانەی تێیدەكەون.

**٢١)**- هەنجیر ئەگەر بهاڕدرێ و لەسەر پێست دابنرێ، چارەسەرە بۆ ئەو زیبیكانەی لەدەم و چاوی گەنجان دێن، هەروەها ئەو خاڵە ڕەشانەی لەسەر پێست پەیدادەبن.

**٢٢)**- هەنجیر مرۆڤ دەپارێزێ لە نیشانەكانی پیریی لە دەم وچاوداو ئەو چرچ و لۆچانەی پەیدادەبن و ئەو خاڵە سپییانەی پەیدادەبن، ڕێیان لێ دەگرێ.

**٢٣)**- هەنجیر بەكاردەهێنرێ بۆ چارەسەری نەخۆشییەكانی ئاوڵە لە قۆناغەكانی یەكەمیدا.

**٢٤)**- هەنجیر هەمیشە پێست بە تەڕو تازەیی ڕادەگرێ، لەبەر ئەوەی کە هەردوو ڤیتامینی: (**b - a**)ی تێدان و فۆسفۆڕو پۆتاسیۆم و هەندێ کانزای وەك کالیسیۆم و مەگنیسیۆم و ترشە ئەمینییەکانی تێدان، هەروەها ئۆمێگا سێی تێدایە.

**٢٥)**- سوودێکی دیکەی هەنجیر ئەوەیە لێکۆڵینەوەکان دەڵێن: جوینی دوو تاکو سێ گەڵای هەنجیر و غەرغەرە پێکردنیان بەئاو، بۆنی ناخۆشی زار ناهێڵێ و، ئەگەر لەنێو زاردا جۆرێك لە برین هەبێ بۆ ئەوەش چاکە.

**٢٦)**- لەبەر ئەوەی هەنجیر ڕێژەیەکی زۆر ڤیتامینەکان و کانزایەکانی تێدا هەن کە دەبنە هۆی بەهێزکردنی مووەکان و، پاراستنیان لە لەبەین چوون و کەوتنە خوار، بۆ بەهێزکردنی مووەکان بەسوودە، هەروەها دەبێتە هۆی پارێزگاریی لە تووکی سەر، لەخوران و سووربوونەوە، لەبەر ئەوەی ئەندازەیەکی زۆر کالیسیۆمی تێدایە، کە دەبێتە هۆی دروستبوونی (کۆلاجین) ئەویش بەسوودە بۆ قژ.

**٢٧)**- ئەو کرێژو توێژەی لەسەردا پەیدا دەبێ، خواردنی هەنجیر دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو کرێژە کەم بێتەوە یاخود نەمێنێ.

# نێوەڕۆک


لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر